# پوختەی

# (مَدارِجُ السّالِكين)



## بە کوردی

نووسینی:
إبن قيّم الجوزيّة

وەرگێڕانی:
عبدالكريم فتّاح

# پوختەی

# (مدارج السالكين)

## بە كوردی

نووسینی: ابن قیم الجوزیة

وەرگێڕانی: عبدالكریم فتاح

چاپی یەكەم ١٤٣٦ك - ٢٠١٥ ز

**ناوی کتێب:** پوختەی (مدارج السالکین) بە کوردی.

**نووسینی:** ابن قیم الجوزیة.

**پوختەکردنی:** عبدالمنعم صالح العیلی العزي.

**وەرگێڕانی:** عبدالکریم فتاح.

**نەخشەسازی ناوەوە:** هەردی زیاد صالح.

**تایپ:** نووسەر.

**نۆرەو ساڵی چاپ:** یەکەم ٢٠١٥ زایینی.

**تیراژ:** (٢٠٠٠) دانە.

**بە سەر پەرشتی:** نهرو محمود عبد الله

**چاپخانە:** کرین کلوري ـ لبنان

**ژمارەی سپاردن:** (١٣٨)ی ساڵی ٢٠١٥ لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکانی دراوەتێ.



٤

نووری

حەقیقەت

Nuri.haqeeqat@gmail.com

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ
ٱلْعَٰلَمِينَ ٢ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٣ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ
٤ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ٥ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ
ٱلْمُسْتَقِيمَ ٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ
عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ٧﴾

**الفاتحة: ١ – ٧**

# ناوەرۆك

۞ ۞ ۞

# پێشەکی وەرگێڕ

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

بە ناوی خودای خاوەن میهر و بەزەیی و دلۆڤان

قَالَ تَعَالَى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا۟ ۚ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٠٣﴾ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُوا۟ وَٱخْتَلَفُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٥﴾﴾ آل عمران: ١٠٢ – ١٠٥

حەمد و سەنا بۆ خودای موتەعال، ئەو پەروەردگارەی ئێمەی بە مرۆڤ دروست کرد، لە رۆحی خۆی کردین بە بەردا و رێزی لێناین و داوای لە فریشتەکان کرد سوژدە بۆ باوکە گەورەمان ئادەم ببەن، شوکری پەروەردگار دەکەین پێغەمبەرانی بۆ رەوانە کردین و ئێمەی گێڕا لە شوێنکەوتەی دوایین پێغەمبەر محمد دروود و سەلامی خودای لەسەر بێت، سوپاسگوزاریی نیعمەتەکانی خودامان پێ تەواو نابێت(**يا رب لك الحمد كما ينبغي لجلال وجهك وعظيم سلطانك**)، صەلات و سەلام بۆ سەر گیانی پاکی پێغەمبەری ئازیزمان محمد، ئەو پێغەمبەرەی لە پێناوی گەیاندنی پەیامی خودادا شانی دایە ژێر هەموو جۆرە ئازارێك و لە ماوەی بیست و سێ ساڵدا نە پڕ بە سکی خۆی نانی خوارد و نە پڕ بە چاوەکانی خەوی کرد و نە تاوێك خەمساردی لە گەیاندنی پەیام رووی تێکرد(**أللهم صل على محمد وعلى آل محمد كما صليت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم، أللهم بارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم في العالمين إنك حميد مجيد**)، درووود و سەلام بۆ سەر گیانی پاکی ئەهل و بەیتی پێغەمبەر و بۆ سەر گیانی یار و یاوەرانی و ئەوانەی شوێنی کەوتن و شوێنی دەکەون تا رۆژی دوایی.

کتێبی (مدارج السالكين) یەکێکە لەو کتێبانەی کە زانایانی کۆن و نوێی ئوممەتی ئیسلام شایەتی گرنگی و بەپێزی بۆ دەدەن، ئەم کتێبە مەزنە کە سەرچاوەیەکە بۆ

باوەڕ و ئەخلاق زۆرینەی مەداریسە ئیسلامییەکان سوودیان لێبینیوە، دەتوانم بڵێم کتێبی (مدارج) ئەو ئەڵقە گەیەنەرەیە قوتابخانە ناکۆك بە یەك و تاکولۆکان لە یەکتر نزیك دەکاتەوە، وەك چۆن لای مەدرەسەی فەرموودە و پیاوانی فەرموودە گرنگی خۆی هەیە بە هەمان شێوە لە لای مەدرەسەی ئەهلی تەصەوف و ئەهلی فیقە بە ڕێزەوە هەڵسەنگاندنی بۆ دەکرێت، ئەمەش بۆ دوو هۆ دەگەڕێتەوە:

**یەکەم:** سەرچاوەی باس و لێکۆڵینەوەی کتێبەکەیە کە بە قورئان و فەرموودەی شیرین ریشەدار کراوە لەگەڵ هێنانی قسە و وتەی بەپێزی کۆمەڵێك لە زانایان و عاریفان کە لە زانستی قورئان و فەرموودەدا قووڵ بوونەتەوە.

**دووەم:** گرنگی کەسایەتی شێخی هوری و شێخی ئیبن قەیم کە دوو کەسایەتین لەپاڵ زانستی قورئان و فەرموودەدا وردەکارییەکانی ڕۆح و نەفس و دڵ و بیریان لە قوتابخانەی تەصەوفەوە وەرگرتووە و خۆیان بەدوور گرتووە لە هەر ورێنە و زیادەڕەوی و بیدعە و نەزانییەك کە هەندێك لە شوێنکەوتووانی تەصەوف رووبەڕووی بوونەتەوە، بەڵکو ئەو دوانە قورئان و فەرموودەیان کردووە بە حەکەم بەسەر تەصەوف و بیروبۆچوونی مەدرەسەکانی تردا نەك بە پێچەوانەوە مەزهەب و بیروبۆچوونی پیاوان و ورێنە و بیدعە لە جێگەی شەرع و دین دابنرێن.

ئەم کتێبەی ئیبن قەیم کە ناوی (مدارج السالكين)ە لە کتێبی (منازل السائرين)ی شێخی هوروی وەرگیراوە و دواتر بانگخوازی دونیای ئیسلام "عبدالمنعم صالح العلي" پوختەی کردووە و ناوی ناوە (تهذيب مدارج السالكين)، ئێمە بە وەرگێڕانی ئەو پوختەیە هەستاوین.

ئەوەی پاڵنەری هەڵبژاردنی ئەم کتێبە بوو بۆ وەرگێڕان: جگە لە گرنگی و بەپێزی کتێبەکە و دانەرەکەی پێویستیی زۆری موسڵمانانە بە گشتی و گەنج و لاوی ئەم وڵاتە بە تایبەتی بە مەسەلەکانی ئیمان و ئەخلاق و ژیانەوەی ڕۆح و نهێنییەکانی بەرەوخوداچوون و مەعریفەی سەیر و سلوك.

وەرگێڕانی کتێبەکە بۆ زمانی کوردی کارێکی ئاسان نەبوو، چونکە تەعبیردان لەو وشە و زاراوە قووڵ و پڕ مانانە بە زمانێکی تر جگە لە زمانی عەرەبی کارێکی ئەستەم و گرانە، زمانی عەرەبی لەبەر ئەوەی زمانی قورئان و فەرموودەیە دەتوانێت زۆرێك لە

مانا ورد و بەرز و بڵندەکان تەعبیر لێبدات، بەڵام کە دەتەوێت ئەو مانانە بۆ زمانێکی تر وەربگێڕیت ئەوا ڕووبەڕووی زۆرێك لە ئاستەنگی زمانەوانی دەبییەوە، بۆیە هەندێ جار ناچاربووم چەند وشەیەکی زمانی کوردی بخەمە پاڵ یەکتر تاکو تەعبیر لە مانای وشە عەرەبییەکە بکات، یاخود وشەیەکی ترم لەنێوان دوو کەواندا بەکارهێناوە تاکو خوێنەر بتوانێت لە ڕێگەی ئەو دوو سێ وشەوە وێنای ڕاستەقینەی ماناکەی لا دروست ببێت، هەندێ جار ناچاربووم لە پاڵ وەرگێڕانە کوردییەکەدا وشە عەرەبییەکەی بە وشەیەك یان بە چەند وشەیەك لەنێوان دوو کەواندا بنووسم، ئەمە جگە لەوەی جاری وابووە وشە عەرەبییەکەم بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك بە ڕەنگێکی تر لە وەرگێڕانەکەدا وەك خۆی دەنووسییەوە تاکو وشەیەکی گونجاوم دەبینییەوە و لە جێگەی دامدەنا.

لەم وەرگێڕانەدا هەوڵمداوە ئەو دوو ڕێچکەیەی وەرگێڕان لە خۆمدا کۆبکەمەوە و بیکەم بە ڕێچکەی سێیەم، ڕێچکەی یەکەم ئەو جۆرە وەرگێڕانەیە کە دەست بە وشە بە وشەی دەقەکەوە دەگرێت و وەریدەگێڕێتە سەر زمانەکەی تر، هەڵبەت لەگەڵ دروستیی تەعبیر لە دەبڕینی ڕستەکاندا، ئەم جۆرە وەرگێڕانە بە وەرگێڕانی حەرفی ناوزەد کراوە، جۆری دووەم لە وەرگێڕان وەرگێڕانە بە وەرگرتنی مانا و کرۆکی ڕستە و پەرەگرافەکان، لەم جۆری دووەمەدا دانە دانەی وشەکان مەبەست نین، بەڵکو ئەو مانا و مەرامەی کۆی وشەکان لە ڕستەیەکدا یان لە پەرەگرافێکدا لەئامێزی دەگرن، من هەوڵمداوە هەردوو ڕێچکەکە لە یەك ڕێچکەدا کۆبکەمەوە، ئەویش خوێندنەوە و تێڕامان لە دانە بە دانەی وشەکان و دواتر تێڕامان لەو مانا گشتییەی لە کۆی وشەکانەوە سەرهەڵدەدات پاشان وەرگێڕانی ئەو ڕستەیە بە سەرنجدانی وشەکان و مانا گشتییەکەی، واتە لە یەك کاتدا یەك بەیەکی وشە عەرەبییەکان وشەیەکی کوردی بۆ دانراوە و لە هەمان کاتدا ئەو وشە کوردییانە تەعبیر لە مانا گشتییەکەی ڕستەکە یان پەرەگرافەکە دەکەن، ئەمەش تەنها وەك تەوفیقێکی خودایی تەماشای دەکەم و نایدەمە پاڵ نەفسێکی تەمبەڵ و نەزان.

لە وەرگێڕانی ئەم کتێبەدا زۆرێك لە کۆمەکی خوداییم بۆ خۆم هەست پێکرد، جاری وا هەبووە ڕستەیەك چەندین جار دەمخوێندەوە و وشە وشەی ڕستەکەم لە فەرهەنگی

زمانی عەرەبیدا تەماشا دەکرد، بەڵام لە مانای رستەکە تێنەدەگەیشتم، پاش کەمێك دوعا و پاڕانەوە لە خزمەتی خودادا مانای رستەکەم بۆ دەکرایەوە و بە باڵاترین مانا و جوانترین دەربڕین وەرگێڕانی بۆ ئامادە دەبوو، ئەمەش دوای بەزەیی خودا بۆ بەرەکەتی کتێبەکە و ئیخلاصی دانەرەکەی(ئیبن قیم) دەگەڕێتەوە.

دڵنیام ئەم کتێبە دوای چەند چاپێك هەڵە و کەموکورتییەکانی بنبڕ دەکرێت و دەتوانرێت هەندێ پەراوێزی بۆ دروست بکرێت خزمەت بە خوێنەر بکات، تا ئەو کاتە پێویستە بۆ هەڵە و ناتەواوییەکان داوای لێخۆشبوونم لە خودا بۆ بکەن.

داوا لە خوێنەر دەکەم بە خوێندنەوەیەکی خێرا و سەرپێیی بەسەر دێڕەکاندا گوزەر نەکات، چونکە یەك بەیەکی وشەکان پێویستی بە تێڕامان و بیرکردنەوە هەیە، ئەم کتێبە کتێبێك نییە لە سەرەتاوە بەری پێدابگیرێت و بخوێنرێتەوە، بەڵکو کتێبێکە پێویستە بکرێتە مەنهەجی کارکردن بۆ پاڵفتەکردنی دڵ و رۆح و سەیر و سلوکێکی دروست بەرەو خودای موتەعال، بۆیە گەر لە رۆژێکدا تەنها یەك لاپەرە بخوێنێتەوە و بیری لێبکاتەوە و کاری پێ بکات لە خوێندنەوەی سەد لاپەرە باشترە کە تەنها وەك زانیارییەکی زەینی وەریبگرێت، بەندە بۆخۆم لە سەرەتای نەوەدەکانەوە ئاشناییم لەگەڵ کتێبی (مدارج)دا پەیدا کردووە، لەگەڵی ژیاوم و سوودێکی زۆرم لێبینیوە، بەڵام هەوڵم نەداوە خوێندنەوەم بۆ ئەم کتێبە تەنها وەرگرتنی زانیاری بێت، بەڵکو چەندەم توانیبێت کارم بە ناوەڕۆکەکەی کردووە و هەوڵمداوە لە ماناکانی بەهرەمەند ببم.

لە دوای کتێبی (مدارج) تەنها چەند سەرچاوەیەکی تر بوونیان هەیە کە خزمەت بەم لایەنە گرنگەی موسڵمان بکات، بۆیە بە تامەزرۆیی و لێبڕانەوە رووی لێ بکە و هەوڵ بدە بیکەی بە وەسیلەیەك-لەدوای قورئان و فەرموودە- بۆ گەشتی بەرەو خوداچوون و بەدەستهێنانی رەزامەندی خودا.

ئەم کتێبە تەنها خۆی بۆ ئەوانە دەکاتەوە کە بە باوەڕێکی راستەقینەوە شوێنپێی پێغەمبەری خودایان هەڵگرتووە و بڕیاریان داوە سەفەرێك بۆ لای خودا دەست پێبکەن، بەڵام ئەوانەی خۆیان بۆ خودا ساغ نەکردۆتەوە و پێغەمبەر ناکەن بە ئیمام و پێشەوای خۆیان و بڕیاری تەوبە و گەڕانەوە بۆ لای خودا نادەن ئەوە لەم کتێبە بەهرەمەند نابن و کتێبەکەش خۆی بۆ ئەوان ناکاتەوە.

لە كۆتاییدا داوا دەكەم لە پەروەردگار ئەم وەرگێڕانەم لیّ قبوولّ بفەرمویّ و بیكات بە نوور و رۆشنایی بۆ خوشك و برا موسڵمانەكانم، دووبارە داوامە لە قاپی بەزەیی پەروەردگار لە هەڵە و ناتەواوییەكانم ببورێت و لەسەرم نەنوسێت.

ماوە بڵێم دەستخۆشی لەو كۆمەڵە برا دەكەم كە بە چاپكردنی ئەم كتێبە هەستان و كۆمەكی منیان كرد لە بەچاپ گەیاندنی، خودا دڵیان رۆشن و ژیانی دونیا و دوارۆژیان پڕ لە ئارامی و سوكنایی و بەختەوەری بكات و لێیان رازی ببێت و هیممەت و لێبڕانیان بۆ خزمەت بە ئیسلام و موسڵمانان زیاد بكات.

**عبدالكريم فتاح**

**كوردستان - سلێمانی**

١٣/ ٢/ ٢٠١٥

❁ ❁ ❁

# ئەم پوختەیە

## پێشەکی:

سوپاس و ستایش بۆ خودای موتەعال، ئەو خودایەی ڕێگەی هیدایەتی لە تووڵەڕێی وێڵی و گومڕایی جیاکردۆتەوە، جوانییەکانی ئەخلاقی ئیمانیی خستۆتە ڕوو، کردوونی بە پێپلەی بەرزەوە بوو بۆ بەهەشت، ئەو پێپلانەی کە کراوەن لەبەردەم لێبڕاوان لە بەندەکانی خودادا.

دیسان شوکر و ستایشی خودا دەکەین، صەلات و سەلامیش لەسەر پێغەمبەرمان محمد باشترین و پاکترین کەسێك کە لەسەر ئەو ئەخلاقانە پێداگری دەکرد، بۆیە خێراترین ڕێبواری ڕێگە و یەکەمین کەسێك بوو کە بە مەنزڵ گەیشت.

خودا لە سەرجەم هاوەڵانی پاك و بێگەردی پێغەمبەری خودا ڕازیبێت، ئەوانەی بەباشی شوێنی پێغەمبەر کەوتن و فەرمانەکانیان جێبەجێ کرد و خۆیان لە زرقوبرقی دونیا بەدوور گرت و بۆ بەندایەتی و جیهاد یەکلابوونەوە، تا بوون بە باشترین نموونەی پەروەردەی پڕ لە بەخشندەیی پێغەمبەر(ﷺ)، ڕەزامەندی خودا لەسەر شوێنکەوتووان و ئەوانەی شوێنی ئەوان کەوتن لە سەدەکانی سەرەتای ئیسلامەوە، هەروەها لەسەر ئەوانەی ڕێگەی ئەوانیان گرتەبەر و دەستیان بە هیدایەتی ئەوانەوە گرت لە پێشینانی چاك و پاك، هەروەها لەسەر هەموو ئەوانەی بەدرێژایی سەدەکان بەوان گەیشتوون، لە فەقیهان و زاهیدان و بانگکەرانی خاوەن کار و پێشەوا لێبڕاوەکان.

لە ئەمڕۆدا لەناو پیاوانی ئیسلامدا خێر و فەڕ ماوە و لە ئێمەوە سەلام و نزایان بۆ دەکرێت.

**پاشان:**

بێداری ئیسلامیی سەردەم كە لەگەڵ سەرەتای سەدەی كۆچی نوێی پڕ فەڕدا دەستی بە بڵاوبوونەوە كرد (سەدەی پازدەی كۆچی) بە یەكێك لە هەرە گرنگترین ڕووداوەكانی ئەم سەردەمە دادەنرێت، لە بەرینی و جۆشوخرۆشیدا ڕێگە خۆش دەكات بۆ دڵسۆزانی دەرخەری مەشخەڵی ڕابردووی ئیسلام تاكو بیكەن بە تاجەگوڵینەی ئەو كارە مەزنانەی لە سەدەی چواردەهەمدا بانگەوازی ئیسلامی پێشكەشی كرد، هەر بەو جۆرە ویست و لێبڕان و هۆشیاری پیاوانی بانگەوازی ئیسلام بە پێویستیی كاری سەرومڕ بۆ چارەسەری ئەو ناتەواویانە بەشێوەیەكی تر ڕێگە بۆ كەسی گەشبین خۆش دەكات بە مژدەی حەقیقەتێكی دابنێت، ئەوەش بوونی داهاتووە بۆ ئەم ئایینە بێگەردە لە سەدەی پازدەی كۆچیدا بە پشتیوانی خودا.

ڕابوونێك ئەمە شان و شكۆی بێت لە جوانكردنی میراتی پێشین و نزیكردنەوەی داهاتووی لێو بە خەندە ماق ئەو ڕابوونە لەسەر ئێمە ئەوەیە دەستبدەینە چاودێریكردن و گەشەپێدان و دامەزراندن و توندوتۆڵكردنی پرۆسە پەروەردەییەكەی كە هیوای ئەوەی لێ دەكرێت ئاستی شوێنكەتووانی بەرز بكاتەوە و پێدان و بەخشینی زۆرتریان لێ وەربگرێت، كڵپەیەك لە جۆشوخرۆش و ئازایەتی لە دڵ و بیریان بەربدات، هەروەك چۆن بیروباوەڕی بێگەردیان هەمان جۆش و خرۆشیان پێ دەبەخشێت، ئەمەش بە گێڕانەوەیان بۆ سنووری پێشینانێكی ڕەسەن بەبێ بیدعەی بێبنەما، هەروەها گێڕانەوەیان بۆ جوانی ڕەوشت بە: زیندووكردنەوەی جوامێری و پیاوەتی و كرداری باشی دڵ بەبێ زۆر لەخۆكردن، هەروەها ڕۆشنی فیقە بە گێڕانەوەیان بۆ سەر دەقەكان و فتوای جمهوری زانایان بەبێ لادان و تاكبوونەوە، هەر بەو جۆرە هوشیارییەكی هەمەلایەن بە دروستكردنی تەبایی لەنێوان هونەری كرداری و عورفی كۆمەڵگەكانی سەردەم و ڕەهەندە شارستانییەكەیان.

كۆششی ئێمە لەم پێناوەدا هەڵبژاردنی كتێبی ((پوختەی مەداریجی سالكین لە نێوان مەنزڵگای "**إياك نعبد وإياك نستعين**")) و هەستان بە پوختەكردنی و پێشكەش كردنی بە لاوانی ئیسلام، وەك ناونیشانێك بۆ بەشداربوون لە پەرەپێدانی پرۆسەی پەروەردە و پاشكۆی كتێبی ((پوختەی "شرح العقيدة الطحاوية")).

تـەنها ئەوانــە نــرخ و بــەهای کتــێبی "پوختــەی مــەداریجی ســالکین" دەزانــن کــە بەرزبووبنــەوە بــە پلــەکانی بــاوەڕدا، ئــەم کتێبــەی "إبــن القــیم" کارکردنــە بــۆ ئــەو بەرزبوونەوەیە، لێوانلێوە بە سوود، دەرهێنانی مانای وردی ئیمـانی و ئامـاژەی ناسـکی دڵی تێدایە کە لە کتێبەکانی تـردا نـابینرێن، تەنانـەت نووسـینەکانی تـری "إبـن القـیم" ناتوانن پێشبڕکێی ئەم کتێبەی بکەن، وەك ئەوەی ببینم "إبـن القـیم" ئـەم کتێبـەی لـە گەشترین ڕۆژەکانی تەمەنی و لـەکاتی گەیشـتن بـە لوتکـەی پـاکی و پاڵفتـەبوونی ژیـان نووسیبێت، هەر چاکساز و دانەر و شاعیرێك یەك جار لە تەمەنی دەگاتـە لوتکەیـەك کـە لەوانەیە جارێکی تر دووبارە نەبێتەوە، کتێبی "مەداریجی سالکین" بەرهـەمی تێرامـانی ئەو ڕۆژە بەرز و بڵندانەن لە ژیانی "إبن القیم"دا، تەنانەت خـۆی نـەیتوانیوە پارێزگـاری لەو ئاستە باڵا بکات کاتێك پوختەی "مدارج"ی کردووە و ناوی ناوە "طریـق الهجـرتین"، جیاوازییەکی فرە هەیە لەنێوان ئەو دوو شێوازە و ئەو دوو ڕۆحەدا.

### ۞ مەنزڵگای بەرە و خوداچوون... و ترازووی میانگیری

ئەوەی بنچینەی قسەکانی "إبن القیم"ی ڕێکخستووە بریتییە لـە ((منازل السـائرین))ی **"شیخ الإسلام أبي إسماعیل عبدالله بن محمد بن علي الأنصاري الهروي الحنبلـي الصـوفي"** کـە ساڵی ٤٨١هـ کۆچی دوایی کردووە، ڕێگـەی بەرەوخوداچـوونی بـاوەڕداری کـردووە بـە "سەد" بەشەوە، هەر بەشێك وێستگەیەکی وەرگرتنی توێشووی ڕێگەی دووروودرێـژە، یاخود مەنزڵگای چین لەسەر چین و پلەی بەرزبوونەوە و پێپلەی گوزەرکردنن، یەك لە دوای یەك بەدوای یەکتردا دێن، بۆ هەر مەنزڵگایەك تێگەیشتن و سنوورێکی داناوە کـە شایستەی موسڵمانان بێت بەگشتی و تێگەیشتنێکیش بۆ باوەڕدارانی تایبەت، پاشـان بۆ تایبەتانی ناو تایبەتەکان کە ناچاری کردووە زۆرلەخۆکردنی مەعنەوی و گـوزارەیی ئەنجام بدات کە لەگەڵ سروشتی ئارامیی باوەڕدا بە باش نابینرێت.

لای "إبن القیم" شوێنکەوتنی شێخی "الهروي" ئامانج نەبووە و ئامانجی ئێمـەش نییـە، بەڵام هەندێ لە بیدعەچییەکانی بینیوە بانگەشەیان بۆ هەڵەگـەلێك کـردووە کـە شـێخی "هــەروی" تێیکــەوتووە، هــەروەها ورێنــە و ئەندێشــەگەلێك کــە بــەهۆی مەشــرەبە سۆفییەکەیەوە ڕووی تێکردوون، سەرەڕای ئـەوەی شـێخی هـەروی لـە شـوێنکەوتووانی

باوەڕ و فیقه و ڕێگەی سلوکی ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بووە بەشێوەیەکی گشتی، ئیبن قەیم ئەو هەڵانەی وەلاناوە و ئەندێشەکانی ڕۆشن کردۆتەوە، بەرپەرچدانەوەکان و ڕۆشنکردنەوەکانی ئیبن قەیم لە دووتوێی قسە و باسەکانی خۆیدا پڕن لە قسە و گفتوگۆی دڵئامێز کە بەسوودتر و گرنگترن لە بەرپەرچدانەوەکانی، ئەو خستنەڕووانەی ئیبن قەیم مەبەستی ئێمەن، ئەمەش بەهۆی بەپێزییانەوە لەڕووی پەروەردەوە، هەر ئەوەشە ئەم پوختەکردنە لەسەری دەوەستێت.

شێخی هەروی لە مەزنترین ئیمامانی پێشینە، بەڵام خودا نایەوێت هیچ کەس لە هەڵە بێگەرد بێت.

**ئیبن قیم دەڵێت:**

(خاوەنی "منازل السائرین" لەو کەسانە بوو زۆر بە توندی پێداگری دەکرد لەسەر جێگیرکردنی ئەسمائو صیفاتی خودای موتەعال، لە هەموو ڕوویەکەوە دژی جەهمییەکان بوو، کتێبێکی هەیە بەناوی ((الفاروق)) کە فەرموودەکانی صفات و شوێنەواری صفات بەتێروتەواوی لەئامێز دەگرێت و نموونەی کەمە، هەروەها کتێبی ((ذم الکلام و أهله)) ڕێگە و شێوازی شێخ لەم کتێبەدا باشترین ڕێگەیە، هەروەها کتێبێکی تری لەسەر "أصول الدین" کە ڕێگەی ئەهلی جێگیرکردن و دانپیانانی ئەسمائو صیفاتی تیادا گرتۆتەبەر، لە ڕووبەڕووبوونەوەی جەهمییەکاندا هەڵوێستی مەزن و ئاماژەبۆکراوی هەیە، چەندین هەوڵیاندا تاکو بتوانن بە دەسەڵاتداران بەکوشتی بدەن، خودا هەموو جارێک ئەوی دەپاراست، تۆمەتباریان کردووە بە چواندن و بەرجەستەکردن (التشبیە و التجسیم)، وەك عادەتی جەهمی و موعتەزیلە لە دروستکردنی بوختان بۆ ئەهلی سوننەت و فەرموودە، ئەوانەی لایەنگیری هیچ بیروبۆچوونێك ناکەن جگە لەوەی قورئان و فەرموودە ئاماژەی پێکردووە)

ئیبن قەیم پێداگری لەوە دەکات کە شێخی هەروی (بەریی بووە لەو تۆمەتی "چواندن و بەرجەستەکردن"ە کە ناحەزانی لە جەهمییەکان دەیاندایە پاڵی، هەروەك عادەتیان لە تۆمەتبارکردنی ئەهلی فەرموودە)، (ئەویش"واتە شێخی هەروی" لەڕووی ژیری و ئایین و حاڵ و مەعریفەوە لەوان بەریی بوو)، لە هەندێك لە

قسەکانی شێخی هەرویدا هاتووە کە (بەڵگەیە لەسەر قووڵی زانستی ئەو و وەستانی لەبەرەی ئەهلی سوننەتدا، هەروەها قووڵی فیقه و تێگەیشتنی لەم مەیدانەدا)

ویژدانی ئیبن قەیم جێگەی ڕێز و سەرسامی ئێمەیە کە خاوەنی ترازووی میانەگیری بووە و وای لێکردووە پێداگربێت لە سوودگەیاندن بە موسڵمانان لە چاکەی چاکەکارێکەوە کە ڕاستەکانی بە هەڵە تێکەڵ دەبن، ئیبن قەیم وادەبینێت ئەوەی شێخی هەروی تێیکەوتووە لە نەپێکانی ڕاستی بریتییە لە (ورێنەگەلێك کە بە چاکەی زۆری ئەو جێگەی لێبوردنی خوداییە و هەڵەکان لە کەماڵی ڕاستگۆییدا نغرۆ دەبن، هەروەها دروستیی مامەڵەی ئەو و هێزی دڵسۆزی و نێتپاکی و ڕووتبوونەوە لە یەکتاپەرستیدا نیشان دەدات، بێگەردی و هەڵەنەکردن لەدوای پێغەمبەر بۆ هیچ کەسێك دەستەبەر نەبووە)

ژیاننامەی شێخی هەروی بە توندی شفاعەتی بۆ دەکات، هەڵوێستەکانی بە گومانی باش ڕاست دەکەنەوە و ئەو باوەڕە دروست دەبێت کە شێخی هەروی قوربانیی دەستی ئەو تەئویلانەیە هەڵەی کردووە تیایاندا (شێخ الإسلام "إبن تيمية" ڕەحمەتی خودای لێبێت دەیفەرموو: کردارەکانی شێخی هەروی لە زانستەکەی باشتر بوون)

ئیبن قەیم دەفەرموێ "شيخ الإسلام إبن تيمية" -ڕەحمەتی خوای لێبێت- ڕاستی فەرمووە، ژیاننامەکەی لە فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە و جیهادی ئەهلی بیدعەت هیچ تەمومژێکی تێدا نییە، بۆ سەرخستنی خودا و پێغەمبەر چەندین هەڵوێستی بەناوبانگی هەیە، خودا نەیویستووە پۆشاکی بێگەردی و بێگوناهی بە بەر هیچ کەسێکدا بکات جگە لە ڕاستگۆی بەڕاستزانراو(پێغەمبەر) کە لە ئارەزووەوە هیچ شتێك بەسەر زمانیدا تێنەپەڕیوە(ﷺ))

باشترە بۆ خوێنەر بە سینەسافی بمێنێتەوە و خۆی بەدووربگرێت لەو لێڵبوونەی کە بەهۆی باسکردنی هەڵەکانی "شێخی هەروی"یەوە سەرهەڵدەدات، بەسە بۆ ئەو شوێنی ئیبن قەیم بکەوێت لە ویژدانیدا و کارکردن بە ڕێسای "هەڵسەنگاندن و بەراورد پێکردنی ڕاست و هەڵەی پیاوانی ئیسلام، زانستەکەیان و کردارەکانیان"، باشترە بۆی نزای خێر بۆ شێخی هەروی و ئیبن قەیم بکات و بڵێت (خودا پاداشتی هەوڵ و کۆششی شيخ الإسلام (شێخی هەروی) بداتەوە، پلە و پایەی بەرزڕابگرێت، باشترین پاداشتی بۆ بنووسێت، ئێمە و ئەو لە بەهەشتی بەریندا کۆبکاتەوە)

## پەیڕەوی ئەم پوختەکردنە

ئەوپەڕی هەوڵمانداوە لەم پوختەکردنەدا کتێبی "مدارج" لە هەرچی ناباشە پاڵفتە بکەین کە خوێنەر دادەبڕێت لە بەردەوامی و تێکەڵبوون بەدڵ لەگەڵ مانای وشەکانی ئامۆژگاریکەردا، هەڵەکانی شێخی هەروی و هەوڵی بیدعەچییەکان بۆ برەودان بەو هەڵانە "ئیبن قەیم"ی ناچار کردووە کە لە زۆر بابەتدا بۆ هەڵوەشاندنەوەی باوەڕی "یەکێتی بوون (وحدة الوجود)"نەفەسی درێژبێت، هەروەها بێمانایی بۆچوونی ئەوانەی "هۆ و هۆکار" نەرێ دەکەن بخاتە ڕوو، ئێمەش هەوڵمانداوە هەموو ئەوانە لابدەین تەنها کەمێکی زۆر کەمی نەبێت، ئەمەش بەهۆی کەمی پێویستی موسڵمانان بۆ قوڵبوونەوە لە بەرپەرچدانەوەیان لەم سەردەمەدا، دیسان بەهۆی بەرتەسکی بازنەی ناوهێنانی ئەوانە و قرکردنی ئەو جۆرە لە بیدعەچی لە زۆربەی وڵاتانی دونیای ئیسلام و دەرکەوتنی جۆرێکی تر لە بیدعە، کتێبی "مەداریجی سالکین" بەردەوام ئەو نوورە هەڵکراوە دەبێت کە یارمەتی هەموو ئەوانە دەدات بیانەوێت بەرپەرچی "یەکێتی بوون و نەرێکەرانی هۆ و هۆکار" بدەنەوە گەر لێرە و لەوێ یەکێکیان سەری دەرهێنا.

هەروەها لەو شتانەی لامداوە و سڕیومەتەوە: زۆرێك لە قسەکانی "شێخی هەروی"یە کە زۆرلەخۆ کردنیان پێوە دیارە، نەك تەنها دەربڕینە هەڵەکانی، وام بەباشزانی قسەکەمەکانی شێخی هەروی لەگەڵ قسەکانی ئیبن قەیم تێکەڵ بکەم بەبێ ئەوەی بە کەوانە جیایان بکەمەوە، تا وای لێهاتووە خوێنەر جیایان ناکاتەوە جگە لە چەند شوێنێکی زۆر کەمدا نەبێت، لەوانەیە هەندێ لە وشەکانیم بە وشەی ڕۆشنتر گۆڕیبێت، ئەمەم وەك ئیجتیهادێك کردووە بە مەبەستی تەواوکردن و بەردەوامی و ڕێگەبڕینەوە لە دابڕان و تێهەڵچوونەوە، لەو کارەدا خراپەیەکی گەورەم نەبینی، لە کاتێکدا ئەو کەسەی دەیەوێت وشەکانی شێخی هەروی بناسێتەوە دەتوانێت گەڕانەوە بکات بۆ دەقە بنچینەییە پوختەنەکراوەکە تاکو بەتەواوی و بەدرێژی بەرچاوی بکەوێت.

بە هەمان پێوەر مامەڵەم لەگەڵ پەراوێزەکاندا کردووە کە شێخ محمد حامد فەقێ –ڕەحمەتی خودای لێ بێت– لە تەحقیقی کتێبەکەدا خستوویەتە سەری، ئەمەشم بەزۆری لاداوە، یان بەهۆی دووبارەبوونەوەی مانا یان ڕەقی و وشکی وشەکان و توندی

رەخنەكەی، بەشێكی بەسوود و پێویستم هێڵاوەتەوە، بەڵام لە پەراوێزدا نەمهێڵاون و بەرزم كردوونەتەوە بۆ شوێنی شایستەی خۆیان لەنێوان قسەكانی "ئیبن قەیم"دا بەبێ دابڕان، بۆ جیاكردنەوەیان بەپیتی بچووكتر جیا لە پیتی كتێبەكە چاپمان كردووە.

هەر بەو جۆرە لادانی والاكردنە زمانەوانییەكان و بەڵگە شیعرییەكان و وشە نامۆكان كە لە ئەمڕۆدا بەكارناهێنرێن، هەروەها زاراوە تەمومـژدارەكانی ئەهلی تەسەوف و فەرموودەی لاواز و شوێنەواری ئیسرائیلیات و قسەی زاهیدانی رەخنەلێگیراو و مانای دووبارەوە بوو و ئەو مەنزڵگانەی شێخی هەروی گومانی بردووە مەنزڵگەی باوەڕ بن، بەڵام وەرنەگیراون و دەقی قورئان و فەرموودە و ئادابی پێشینانیان لەسەر نییە.

هەندێ جار چەندین دێڕم لاداوە بۆ كورتكردنەوە لەو شوێنانەی درێژەی پێدراوە، هەروەها هەندێ رستە كە بە چێژ و ئەزموونی خۆم هەستم دەكرد لادان و بێنیازبوون لێیان دروستە، هەروەها چەندین دێڕە هۆنراوە كە ئیبن قەیم خۆی دایڕشتووە بەهۆی لاوازی مەلەكەی شیعری تیایاندا و ساردی لە زۆربەیاندا.

تاكە كارێكی ناباش نەمتوانی خۆمی لێ رزگار بكەم ئەوەیە لە راڤەكردنەكەی "ئیبن قەیم"دا هاتووە و ناچاری كردووە خۆی بگونجێنێت لەگەڵ "شێخی هەروی"دا لە بەكارهێنانی زاراوەگەلی گرنگی ئەهلی تەسەوف، وەك "السالك و المريد و الحال و المقام، هی تریش"، هێڵانەوەیانم بە خراپ نەبینی، لە كاتێكدا مانای هەڵە هاوملی ئەم زاراوانە ناكرێت، ئەم كتێبە كتێبێكی پێشینە لەسەر پەیڕەوی ئەهلی فەرموودە، ماناكانیم بە زاراوەگەلێكەوە گرێداوە كە دەتوانین لە دیدگای ئەو مانانەوە مانای دروست -كە دەق رەدی ناكاتەوە- تێبگەین، هەرچەند هەندێ كەس مەبەستیان پێی مانای تایبەت بووە.

شتێكی تر هاوشانی ئەم كارە ناباشە دەبێت: ئەویش تەحقیق نەكردنی ئەو بڕە لە فەرموودە یان دانەپاڵیان بۆ لای راویەكانیان، هۆی پەلەكردن لە دەرهێنانی كتێبەكە رێگەی نەدا ئەو كارە بكەین، رەچاوكردنی سوودەكانی كتێبەكە بۆ چاو بە دونیا هەڵهێنان وایكرد پەلەی تێدا بكەین، هەرچەند لەمەدا شتێك شفاعەتمان بۆ دەكات، ئەویش ئەوەیە كە زۆربەی فەرموودەكان فەرموودەی دروست و بەناوبانگن (صحيح و مشهور) و كەسی بەدواداچوو دەتوانێت بە ئاسانی لە "سەحیحی ئیمامی بوخاری و

مسلم و چوار سونەنەکە و مەسنەدی ئیمام ئەحمەد"دا بیانبینێتەوە، ئیبن قەیم بۆ خۆی لە زۆر شوێن و بابەتدا ئاماژەی بە دروستی و باشی ئەو فەرموودانە کردووە.

بەرانبەر ئەم سڕینەوانە: هەرچی ناونیشانی ناوەندی و بەشەکی دیارە بە بازنەی بچووك و رەش لە نێوان ناوەندە سەردێڕەکاندا ئامادەم کردووە و خستوومەتە سەری، جوانترین دەستەواژەم بۆ داناون کە گونجاوبێت لەگەڵ دووتوێی بابەتەکە، ئەمەش وادەبینم خستنەسەرێکی گرنگ بێت، روونی و رۆشنی زیاتر دەکات، و ماناکان دەردەخات، سەرنجێکی بەردەوام و دانەبڕاو بۆ خوێنەر دروست دەکات، پەنابردن بۆ هەندێ پێشخستن و دواخستن یارمەتی گەیشتن بە روونیی و رۆشنیی بابەتەکان داوە، گواستنەوە لە بابەتێکەوە بۆ بابەتێکی تر و لە بەشێکەوە بۆ بەشێکی تر مانا هاوشێوەکانی لە یەك شوێندا کۆکردۆتەوە، پاشان دەرخستنی رێکخەری سەرەتای بەشەکان و مەنزڵگاکان و ژمارە بۆ دانان و رێکخستنی بالآیان زیاتر رۆشنیی داوە بە کتێبەکە.

بەم جۆرە کتێبی "مەداریجی سالکین" کە کتێبێکی گرانی لەیەکتر دابڕاو بوو بەم پوختەکردن و بەش بەشکردنە بوو بە کتێبێکی سادەی رەوانی نزیك لە هەموان، شایستە بوو بەوەی وەك پەیرەوێکی تێروتەواو هەڵبژێرم بۆ وانەی ئەخلاقی ئیسلامی لە پاڵ وانەی باوەڕدا لە کۆلیژەکانی شەریعەت و پەیمانگا ئاینییەکان و سەرجەم قوتابخانەکانی وەزارەتی پەروەردە بۆ وانەوتنەوە تاکو شانی لەسەر دابدەن، هەر بەو جۆرە ئەم کتێبە دەبێتە سەرچاوەیەکی سەرەکی بۆ کۆمەك کردنی واعیزان و وتارخوێنی هەینی و ئیمامانی مزگەوت، گونجاوە بکرێتە پەیرەوێکی ئەدەبدادان بۆ گەنجانی بانگەوازی ئیسلامی بەگشتی، لە ئێستایدا بەم شێوە پوختەکراوەیەوە باشترین شتێکە بخوێنرێتەوە بەسەر ئەهلی مەجلیسی پیاوە گەورەکانی شار و میوانانی دیوەخانی سەرۆك هۆزی لادێکان، وەسێتم بۆ بانگکەرانی ئیسلام بەتایبەتی جار لەدوای جار بیخوێننەوە و بیخوێننەوە و بیخوێننەوە، دێڕە گرنگەکانی و بەڵگە هێنراوەکان لە قورئان و فەرمووده لەبەربکەن، گەر ئەو کارە بکەن بەرزدەبنەوە بۆ بەرزترین توانای ئامۆژگاری و وتارخوێنی و گەیاندن و کارتێکردن و قەناعەت پێکردنی کەسی بەرانبەر.

## ❁ چێژی ڕەوانبێژی زمانی عەرەبی

لەوانەیە وەرگێڕانی ئەم کتێبە بۆ زمانەکانی تر زۆر بەسوودبێت، بۆ ئەوەی ئەوانەی عەرەبی نازانن ئەم مانا بنچینەیی و گرنگانەیان پێ بگات، بەڵام چێژوەرگرتنیان لێی وەك چێژوەرگرتنی خوێنەری زمانی عەرەبی نابێت، زۆر دوورە ئەم ڕەوانبێژییە بالآ وەرگیراوە لە چرای بەیانی عەرەبی قورئانی بگوێزرێتەوە بۆ زمانێکی تر بەبێ ونکردنی بەشێك لە گەشی و جوانییەکەی، شێخی هەروی لە وشەکانیدا زۆر هونەرمەندە، هەر بەو جۆرە ئیبن قەیم لە ئەوپەڕی نوقمبوونی باوەڕدا بووە کاتێك راڤەی کتێبەکەی کردووە، بۆیە دەربڕینەکانی ئاسان و جوان و خاوەن ڕووپۆشێکە ئەستەمە بۆ وەرگێڕان بەبێ *کەمبوونەوەی* بەهاکەی، ئەم دیاردەیە لە زۆر کتێبدا دووبارە دەبێتەوە، بۆیە باشە موسڵمانانی گەلانی ناعەرەب بە وردی زمانی عەرەبی فێربن تاکو بتوانن لە مانا وردەکان تێبگەن و چێژی لێ ببینن کە لە ڕێگەی وەرگێڕانەوە کەمتر بەرچنگیان دەکەوێت.

## ❁ بەرهەڵستکارییەك... بەڵام

هەندێك کەس بەرهەڵستکاری دەکەن و ڕەخنە لەو پلانە دەگرن کە لە پوختەکردنی ئەم کتێبە بەپێزەدا گرتوومەتەبەر، کەسی بەرهەڵستکار بەڵگە دەهێنێتەوە لەسەر عورفی خەڵکی لە پوختەکردن و کورتکردنەوەدا، یاخود لە لۆژیکی جۆشوخرۆشەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بیدعەچی دەست پێدەکات، بەڵام ئەزموونم لە مەیدانی پەروەردەدا ڕێگەیەکم بۆ ناهێڵێتەوە لەو باوەڕەم دابەزم کە ئەم بڕەی هەڵمبژاردووە لە کتێبەکە بەم ڕێکخستن و دەرهێنانەوە، چەندەها جار باشتر و بەسوودترە بۆ گەنجانی ئیسلام لە مەتنی تەواوی کتێبەکە، ژمارەی ئەوانەی لەم پوختەکردنە تێدەگەن چەند بەرانبەری ژمارەی ئەوانەیە لە مەتنە بنچینەییەکە تێدەگەن لەگەڵ چێژی زیاتر و تێکەڵبوونی زۆرتر لەگەڵ ئەم دێڕانەی کە ماونەتەوە، لە بەردەوامبوونێکی ئارامدا دڵان نەرم دەکاتەوە کە مەتنە بنچینەییەکە ئەوەی تێدا نەدەبوو بەهۆی تێکەڵبوونی گفتوگۆکان بە باسوخواس لەگەڵ فەیلەسوفان و بیدعەچییەکان، یان بەهۆی دابڕانی باسەکە لە

یەكتر بە لق لێكردنەوەی زۆر و بابەتی لاوەكی و پەراوێز و جیاكردنەوەی قسەكانی "شێخی هەروی" و راڤەكردنەكەی ئیبن قەیم.

بەڕاستم نەزانی عورفی "دانەر"ان ببێتە پەردەیەك و نەهێڵێت كتێبی "پوختەی مەداریجی سالیكین" ببێتە جاڕنامەیەكی پەروەردەیی دروست لەدەستی لاوانی موسڵماندا، ئەوانەی كتێب پوختە دەكەن پێداگری دەكەن لەسەر هەموو ماناكان لە دەقە بنچینەییەكەیەوە، بەڵام بە دەربڕینێكی كەم و كورت، ئێمە ئەوەمان ناوێت، بەڵكو ئامانجمان یارمەتیدانی گەنجی موسڵمانە لە پاكژكردنەوەی دڵ و دەروونیان و ئاوادانكردنەوەیان بە ئەخلاقی باوەڕئامێز، بەبێ دروستكردنی نیگەرانی بۆی لە باسكردنی بیدعە و بەربەرچدانەوەی، زۆربەی ئەو بیدعانە لە ئەمڕۆدا خەریكە شوێنكەوتەیان بۆ نامێنێت، جگە لە كەمینەیەك كە لە بازنەی زۆر تەسكدا خۆیان سنووردار كردووە، ئەوەش لە هەندێ وڵاتدا بوونیان هەیە و هەندێكی تر نە، هەموو ئەمانە وای لێكردین بەباشی بزانین بیستنی گەنجی موسڵمان بەدوور بگرین لەو تێكەڵكردنەی كە ئیبن قەیم رسوای كردووە، هەروەها لێگەڕێین دڵ و بیری لاوان تەبا بن لەگەڵ شیرینی یادخستنەوەدا، بەبێ كێشمەكێشێك كە لێڵی و تەمومژ بەدوای خۆیدا دەهێنێت، هەركەس لەسەر ئەم شێوازی پوختەكردنە لەگەڵماندایە ئەوە رازیبوونەكەی بەڵگەیە لەسەر نزیكی ئەزموونی پەروەردەیی ئەو لەگەڵ ئەزموونی ئێمە، هەركەس پشت هەڵكردن و وەلانان و گۆڕینەكەی ئێمەی بە خراپ زانی بانگی دەكەین و پێی دەڵێین وا دابنێ "پوختەی مەداریجی سالكین" كتێبێكی نوێیە و كتێبی "مدارج السالكین" تەنها سەرچاوەیەكی بووە، پێمان خۆش نییە روواڵەتگەرایی نەهێڵێت سوودەكان گشتگیر بكرێن، گرنگ ئەوە نییە شكۆمەندی ئیبن قەیم پارێزگاری لێ بكەین بە جیاكردنەوەی دەربڕینەكانی یان پێشڕەوی بدەینە پاڵ "شێخی هەروی" و سەربەخۆبوونی وشەكانی بپارێزین، ئەو دووانە (شكۆمەندی ئیبن قەیم و پێشڕەوی شێخی هەروی) لە چاپی "المدارج"دا بەتەواوی پارێزگاریان لێكراوە، بەڵكو گرنگ ئەوەیە پوختەیەكی پەروەردەییانە بخەینە بەردەم كەسی پەروەردەكار و شاگردان، تاكو یارمەتیان بدات لە نەرمكردنی دڵیان و پاكژكردنەوەی دەروونیان،

گەر ئەم كارەی من لەگەڵ كتێبێكی مەختوتـە(مخطوطة)دا كـە پێشـتر بڵاونەكراوەتـەوە ئـەنجام بدرابایـە ئـەو بەرهەڵسـتكارییە رەوا بـوو، بـەڵام هیچـم نـەكردووە جگـە لـە هەڵگۆزینی پەیرەوێك لە ئەسڵێكی چاپكراوی بەردەستی خەڵكی كە ڕێگەخۆشدەكات بۆ قوتابی تاكو لە دەقە تەواوەكە تێبگات.

## ۞ سەلەفی... و سۆفی... پێكەوە

وەك ئەوەی ئەم كتێبە گەر خودا بیەوێت كۆكەرەوە بێت، دڵی كەسانی مەشرەب جیا لە موسڵمانان لەسەری كۆببنەوە، ئەم كتێبە كۆمەڵێك مانا و راگەیەنراوی سەلەفییە و راڤەكراوە و بە زمانێكی سۆفیانە پێشكەش كراوە.

پەلە مەكە و بەناڕاسـتمان مەزانـە گـەر كتێبەكـەمان لـە زمـان و زاراوەی سـۆفیگەری پاڵفتە نەكردبێت، خوێنەری لەسەرخۆ و وردی ئەم كتێبە بەنرخە پەی بـەوە دەبـات– وەك پەیمان پێبرد– لە بـاڵاترین كـتێبی دانـراوی قوتابخانـەی سـەلەفییە و ناتوانرێـت هەمان ئەو شتەی ئـیبن قـەیم بخرێتـە روو ئەگـەر شـێوازەكەی لـە زاراوەكـانی ئـەهلی تەسـەوف رووتبكەینـەوە، بۆیـە لـە هاوتـەریب بـوونی لەگـەڵ "شـێخی هـەروی"دا لـە هێڵانەوەی زاراوەكانی تەسەوف هیچ ناباشییەكمان تێـدا نـەبینی، چـونكە ئـیبن قـەیم لەم كتێبە و سەرجەم كتێبـەكانی تـردا سـەركەوتوو بـووە لـە خسـتنەڕووی گەمـژەیی بیدعە و چواندن و تەئویل و لەكارخستن.

لە كۆتاییدا هەست دەكەم فەزڵی خودا زۆرە لەسەرم بەوەی ئیلهامی كردم بـۆ براكـانم (بانگخوازانی ئیسلام و تەواوی عابیدان) هەستم بە پوختەكردنی "مدارج السـالكين" و سەرپەرشتی چاپەكەی بكەم، چەندین ساڵە و بەر لە چـاپكردنی كتێبەكـە هەوڵمـداوە رەواج بەم كتێبە بدەم و هانی خەڵكی بدەم بۆ خوێندنەوەی، كاتەكانیانم بە سوود و بـیر و ئەندێشـەی قازانبـەخش پڕكـردەوە، زمانیـانم راهێنـا لەسـەر وتـەی جـوان و ئامۆژگاری ناسك، هەستام بە بەرتەسك كردنەوەی كەلەبەری وەسوەسـەی خـراپ كـە مرۆڤ لێیەوە دەچێتە ژوورەوە، ئەوەش نیعمەتێكە دەبێت شـوكری بكـەم، چاكەیەكە خودا تیایدا كۆمەكم بوو و مافی خۆمە بەهۆیەوە دڵم پڕ بێـت لـە خۆشـی، هیـوام وایـە

هەر كەس سوود لەم كتێبە دەبينێت نزای خێری زۆرم بۆ بكات، بەوەی لەلای منەوە ڕێگەی بۆ خۆشكرا لێيەوە هەڵبێت بۆ لای خودا، هەروەها سوپاسی "وەزارەتی داد و كاروباری ئيسلامی و ئەوقاف لە دەوڵەتی ئيماراتی عەرەبی يەككرتوو" بكات بۆ ئەو ئاهەنگە مەزنەی بە بۆنەی هاتنی سەدەی پازدەی كۆچی پيرۆزەوە ئەنجاميان دا و پێداگرييان لەسەر ڕێخۆشكردن بۆ ساليكان كرد لەڕێگەی هەستان بە چاپی يەكەمی ئەم پێشەكييە بۆ پلەكانی باوەڕ كە بالآترين ڕێگەيە و دەمانگەيەنێتە خۆبەكەمزانين و سوژدە و راخستنی باڵی بەزەيی و دڵنەرمی.

لە هەر كۆتاييەكدا پەروەردگاری خاوەن ميهر و بەزەيی شايستەی ستايشكردنە.

عبدالمنعم صالح العلي العزي

شارەزای باس و لێكۆڵينەوەی ئيسلامی

لە وەزارەتی داد و كاروباری ئيسلامی و ئەوقاف

لە دەوڵەتی ئيماراتی عەرەبی يەككرتوو

محرم الحرام ١٤٠٢هجري

## وەرگێڕاو لە پێشەکییەکەی (شێخ محمد حامد فەقێ)

الحمد لله رب العالمين، الرحمن الرحيم، مالك يوم الدين، والعاقبة للمتقين، ولا عدوان إلا على الظالمين، و صلى الله و سلم على خاتم المرسلين و إمام المهتدين، من اصطفاه الله ربنا فأرسله رحمة للعالمين، و أحسن قدوة للمتقين، عبدالله و رسوله محمد، وعلى آله أجمعين و جعلنا من آله و حزبه المفلحين في الدنيا و يوم الدين.

**پاشان:**

ئەمە کتێبی "مدارج السالكين"ە لە دانراوی شيخ الإسلام والمسلمين هەستاو بە بەیانی حەق و سەرخەری ئایین، پارێزەر–بەو هێزەی پێیدرابوو– لە سوننەتی پێغەمبەر، وەشێنەری نووکی قەڵەمی تیژ لە سنگی بیدعەکاران، سەربڕی گەردنی خەرەفاوان، وەرگێڕی قورئان، خاوەن هونەری داهێنانی جوان، ئیلهامکراو لەلایەن خوداوە بە هەستان لە گەیاندنی هیدایەت و بەیان، پشتیوانکراو لەلایەن خوداوە بە ڕۆشنی بەڵگە و درەوشانەوەی بورهان، "أبي عبدالله محمد بن أبي بكر بن أيوب بن سعد بن الزرعي الدمشقي" ناسراو بە هەڵوێستە ئەمرەکانی:

## ئیبن قەیمی جەوزی

خودا لە ئێمە و ئەو و هەموو باوەڕداران ببوورێت، لە بەهەشتی بەریندا نیشتەجێی بکات، ئێمەش لەسەر صدقی باوەڕ بەو بگەیەنێت، ئیبن قەیم رەحمەتی خودای لێبێت هەوڵیداوە لەم کتێبەدا کتێبی "منازل السائرين"ی أبي إسماعيل، عبدالله بن محمد بن علي الهروي الحنبلي کۆچکردوو لە ساڵی ٤٨١ی کۆچی، بکات بە ئاسۆیەکی نوورین تاکو هیدایەت بێت بۆ رێگەی گەیشتنە کەماڵ و رێنوماکارێك بێت بۆ سەر رێگەی راست و دروست.

ئەم ئیسلامە بۆ هەمووان بە هەموو تایبەتمەندییەکانییەوە لەسەر بەندایەتی تەواو بۆ خودا وەستاوە، کەسی باوەڕدار دەبێت لە هەڵوێستەکانیدا راستگۆ بێت بە هەموو ملکەچی و خۆشەویستی و خۆڕادەست کردن و ملدان و شوێنکەوتن و گوێڕایەڵییەکەوە بۆ خودای موتەعال، پەروەردگاری هەموو جیهانان، ئەو کەسەی کەسی لێ نابێت و لە کەس نەبووە و هاوشانی بۆ نییە ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشورى: ١١، نەزان مەبە، بێئاگا مەبە و لەبیرت نەچێت، شتێك لەسەر خودا و بۆ خودا مەڵێ کە خودا و پێغەمبەر نەیانفەرموو بێت، شوکری خودا بکە بۆ ئەو نیعمەتەی بەسەر مرۆڤایەتی بیسەر و بینەر و خاوەن ژیری جیاکەرەوە و بەخشندەوە هەیەتی، شوکری خودا بکە لەسەر هیدایەتی فیترەت و هیدایەتی پەیامی خودا، تا ئەوپەڕی هەوڵ هەوڵبدە ماف بە هەموو خاوەن مافەکان بدەی، باوەڕت بەوە هەبێت کە خودا ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە بە هەوانتە دروستی نەکردووە، بەڵکو هەرچی شتە بە حەقێکی جێگیر و نەگۆڕ دروستی کردوون کە بە ئارەزوو و نەزانی مرۆڤ و خۆزگەی پووچی ئەو گۆڕانی بەسەردا نایەت. پەروەردگارمان حەقە و بەڵێنەکانی راستە و قسەکانی دروست و کتێبەکانی حەق و بڕیارەکانی دادپەروەرانەیە.

ئایینی نەفامی، ئایینی شەیتانی ئینس و جین، ئایینی دوژمنانی خودا و دوژمنانی پێغەمبەری خودایە، ئەوانە دوژمنی خودی خۆیانن، شەیتان دەیەوێت ئایینەکەی زاڵ بێت و دەسەلات پەیدا بکات ﴿لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ لَءَاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ ۖ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾﴾ الأعراف: ١٦ - ١٧، شەیتان رەواج بەو ئایینە دەدات و تەشەنەی پێدەکات، هەرکات تاریکی نەفامی باو چڕدەبێتەوە ئەم ئایینەش تونددەبێتەوە، هەرکات بۆگەنی پشت هەڵکردن لە خودا و کوێری لە بینینی

شـوێنەواری نـاو و سـیفەتەكانی خـودای موتـەعال لـە ئاسـۆی دەروون و گەردوونـدا بڵاودەبێتـەوە و سـوننەت و بەڵگـە و نیشـانەكانی خـودا لـەو ئاسـۆیەدا نـابینرێن و پشـتهەڵدەكرێت لـە كتێبـەكانی خـودا و تێگەیشـتن و قووڵبوونـەوە تیایانـدا و هیدایـەتی پێغەمبەران بەكەم تەماشا دەكرێت لە هەموو ئەم بارانەدا مرۆڤ ڕێگەی خێر و چاكەی لـێ بزردەبێت، كوێردەبن لە ئاستی ڕاستییە نەگۆڕەكان لە ئاسمان و زەوی و ناخی خۆیاندا، بەهۆی بـەش بـەش بوونیانـەوە لـە شـوێنكەوتنی شـەیتان لـە هـەر دۆڵێك لـە دۆڵـەكانی تیاچـووندا ڕووبـەڕووی بەدبـەختی دەبنـەوە، پشـتهەڵدەكەن و بێئاگـادەبن و نیشـانە و بەڵگەكانی خودا لە ئاسۆی دەروون و گەردووندا –كە ناو و سـیفاتی خـودای موتـەعالیان وەبیردێنێتەوە– لەبیری خۆیان دەبەنەوە ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا وَكَذَٰلِكَ الْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي مَنْ أَسْرَفَ وَلَمْ يُؤْمِن بِآيَاتِ رَبِّهِ وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبْقَىٰ ﴿١٢٧﴾ ﴾ طه: ١٢٤ – ١٢٧.

* * *

هەركەس سەرنجی وردی بەڵگە و نیشانە گەردوونییەكان و ئایەتـە قورئانییـەكان بـدات، ڕاستگۆیانە و دڵسۆزانە تێڕابمێنێ و بەقووڵی –بەوەی خودا پێی بەخشیوە لـە هۆكـاری زانست و هیدایەت لە بیستن و بینین و ژیری– لە ئایـەت و چـیرۆكەكانی قورئـان سـەرنج بدات، و بیرخستنەوەكانی قورئان لە بەڵێن و هەڕەشە و ئاگاداركردنەوە و پەنـدوەرگرتن بخوێنێتەوە، و گوێ هەڵبدات و بەدڵ ئامادەبێت ئەوا زۆر بە ڕوونی بـۆی دەردەكـەوێت: هەموو ئـەوەی مرۆڤایـەتی پێیـەوە گرفتـارە –لـە ئـەمڕۆ و هـەموو سـەردەمەكاندا– لـە بێبـاوەڕی و لادان و یـاخیبوون هـەموو ئەمانـە بـە تـەواوی هۆیـەكانیان لـە ڕێگـەی چاولێكەری كوێرانەوە لەدایك دەبن، كە دوژمنانی پێغەمبەران لە شەیتانی ئینس و جـین جوانیان كردووە و بە لەخۆدەرچوون وشەی زرقوبرقیان بۆ داتاشـیوە: ﴿ وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١١٢﴾ وَلِتَصْغَىٰ إِلَيْهِ أَفْئِدَةُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ وَلِيَرْضَوْهُ وَلِيَقْتَرِفُوا مَا هُم مُّقْتَرِفُونَ ﴿١١٣﴾ ﴾ الأنعـام: ١١٢ – ١١٣، لـەو بیدعانـەی بۆیـان تەشـریع دەكـەن و ئـەو ئەفسـانە و ئارەزووانـەی لایـان جـوان دەكـەن و ئـەو حەزانـەی ڕەواجـی پێدەدەن، تـا دڵ لەسـەریان ڕەق دەبێـت و دەروون تاریك دەبێـت و چـاوی دڵـی سـەر سـینە كوێردەبێتـەوە، چـەندە ئامۆژگارییەكـەی پێغەمبـەر(ﷺ) بـۆ خـەڵكی ڕاسـت و

دروستە! گەر ژیر بن و خەمی خۆیان بخۆن ((**تركتكم على المحجة البيضاء، ليلها نهارها، لا يزيغ عنها إلا هالك**)) لەسەر شارێگەی روون و ئاشكرا ئێوەم بەجێهێڵاوە، شەوەكەی وەك رۆژەكەی وایە، تەنها تیاچووان لێی لادەدەن، دیسان دەفەرموێت ((**تركت فيكم ما إن تمسكتم به لن تضلوا: كتاب الله و سنتي**)) ئێوەم لەسەر دوو شت بەجێهێڵاوە گەر دەستیان پێوە بگرن گومڕا نابن: كتێبی خودا و سوننەتەكانم.

لە ئەمڕۆدا چەندە مرۆڤایەتی —لە خۆرهەڵات و خۆرئاوا— پێویستی بە گەڕانەوەیە بۆ سەر شارێگەی سپی و روون و ئاشكرا! دەستبگرن بە پەتی توندوتۆڵی خوداوە لە هیدایەتی كەلامی خودا كە تا ئێستا تەڕ و پاراوە وەك چۆن حەزرەتی جبریل دابیەزاند بەسەر پێغەمبەردا —هەڵبژاردەی خودا و بەڕێزترین بەندەی ئەو—**سبحانە**— و خاتەمی پێغەمبەران لەلایەن خوداوە كە پەروەردگار و مەلیكی خەڵكی و پەستراوی هەموانە— قورئانێك كە هیدایەت و شیفایە بۆ دڵ و دەروون، هیدایەتدەر بۆ ئەو شتەی كە راسترینە لە هەموو كات و بارێكدا، ئەوان—سوێند بە خودا— گەر وابكەن و بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگاریان و تێگەیشتن لە قورئان بەشێوەیەكی راستگۆیانە و دڵسۆزانە و خەمخۆرانە بۆ خودی خۆیان هیدایەت دەدرێن بۆ پاكترین گوفتار و شارێگەی خودایەك كە عەزیزە و ستایشكراوە.

* * *

لەڕاستیدا كتێبی ((مدارج السالكين)) لە باشترین ئەو كتێبانەیە ئیبن قەیم نووسیبێتی— ناوی ئیبن قەیم بەسە بۆ تۆ— لە مەیدانی پاككردنەوەی دەروون و ئەخلاق و خۆڕازاندنەوە بە ئادابی خۆپارێزان و راستگۆیان، ئەوەش رۆشنترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە ئەم كەسە لە دەستەی هیدایەتدراوان و راستگۆیانە، ئەوانەی بە لەخواترسان دەروونیان ساز دەبێت، بینینیان بە هیدایەتی خودا نوورانی دەبێت، ئەوانە —إنشاءالله— لە بەهەشتی "رضوان"دان لەگەڵ خۆپارێزان و راستگۆیاندا.

* * *

لەبەرئەوەی پلە و پێگەی ((مدارج السالكين)) بەو جۆرەیە، چاپی یەكەمی —كە لە چاپخانەی مەنار ساڵی ١٣٣٤هـ لەچاپدراوە— كۆتایی پێهات، داوا و تامەزرۆیی خەڵی

بۆ کتێبەکە پەرەی سەند، پێویستییان بەم کتێبە زیادی کرد بەتایبەت لەم سەردەمەدا کە تۆفانی مادە مرۆڤی نوقم کردووە و خەڵکیش زۆرتر دەستیان بە مادەوە گرتووە و سەرکەوتنەکانیان لە هەموو کاروبارەکاندا بە کلکی مادەوە گرێداوە، ئاگری دوژمنایەتی و رق و کینە لەنێوانیاندا بڵێسەی سەندووە، وەحشیگەری بە کۆمەڵگەکانیاندا رۆچووە، بەو هۆیەوە شەکەتبوونیان زیادی کردووە، خەمەکانیان چەندبارە بووەتەوە، هۆکارەکانی بەدبەختی و دژواری ژیان بەسەریاندا کۆمابووە، بەڵا و فیتنە رەگی داکوتیوە و لە هەموو روویەکەوە پێداگرییان لەسەر دەکەن، بەڵا و فیتنەیەکی لەدایکبووی ژیان لەگەڵ مادەدا و چڕبوونەوەی سەرنج بە مادە و تەرخانکردنی کۆششەکان لە پێناویدا تا وای لێهاتووە مادە ببێت بە خودای زاڵ بەسەر دڵ و دەروونیاندا.

لەپێناوی ئەوەدا ویست و لێبڕان ئاراستە کرا بۆ چاپکردنی ئەم چاپە جوان و بەپێزە، تاکو ئەو پێویستییە زۆرە لە سەردەمی مادەدا پڕبکاتەوە، هیوام وایە خودا بەهۆیەوە سوود بە مەردوومان بگەیەنێت، دیسان داوامە لە خودا لەپاڵ ئەم چالاکییە مادییەی خەڵکیدا پاکێتی رۆح و خۆپارێزی دەروون و پاڵفتەبوونی ئەخلاقیان پێ ببەخشێت، تا بۆ عەرەب و موسڵمانان-لەوەی خودا پێیداون لە هۆکاری مادی و دەوڵەمەندی و پارەزۆری ئێستا و داهاتووی چاوەڕوانکراو، إنشاءالله- ژیانێکی خۆشگوزەران و بەخشندە و پاك و ئارامیان لە سێبەری ئیسلامدا پێ ببەخشێت، لەسەر ئەو رەوگەیەی پێشینی چاکان لەسەری بوون -خودا لە هەموویان رازی بێت- خودا-عزوجل- ترسی بۆ گۆڕین بە ئارامی و ئاسایش، چونکە ئەویان بە تاقوتەنها دەپەرست و هاوەڵیان بۆ دانەدەنا.

**هەژاری لێخۆشبوونی خودا**

**محمد حامد الفقي**

**نووسیویەتی**

**١٣٧٥هـ-١٩٥٥ز-قاهیر**

# پێشەكی ئیبن قەیم

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

(وبه نستعين، ولا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم)

الحمد لله رب العالمين، والعاقبة للمتقين، ولا عدوان إلا على الظالمين، وأشهد ان لا إلـه إلا الله وحده لا شريك لـه رب العالمين، وإلـه المرسلين، وقيوم السموات و الأرضين. و اشهد أن محمدا عبده و رسوله.

پێغەمبەری نێرراو بە قورئانێكی رۆشنەوە، جیاكەرەوەی هیدایەت و گومڕایی، سەرلێشێوان و ڕێنمایی، گومان و یەقین، خودا دایبەزاند تاكو لێی تێبگەین، بە وردی لێی ڕابمێنین، بە ئامۆژگارییەكانی بەختەوەر ببین، بە باشترین و راسترین شێوە ماناكانی لێكبدەینەوە، باوەڕی پێ بهێنین و "ئەمر و نەهی"یەكانی جێبەجێ بكەین، بەری زانستە بەسوودەكانی كە مرۆڤ بە خودا دەگەیەنن لە درەختەكەی بچنینەوە، گوڵ و ڕێحانەی حیكمەتەكان لە باخچەی گوڵانی بكەینەوە، قورئان كتێبێكی ئاماژەدەرە بە خودا بۆ كەسێك دەیەوێت خودا بناسێت، ڕێگەی پانوپۆڕی سالیكانە بۆ لای خودا، نووری ڕۆشنی خودایە كە تاریكی ڕەواندەوە، بەزەیی و هیدایەتدەرێكە چاكبوونی هەموو دروستكراوەكانی پێوە بەستراوە، هۆكاری گەیاندنی نێوان خودا و بەندەكانییەتی كاتێك هەموو هۆكارەكان لەدەست دەچن، دەرگای مەزنی ئەوە –سبحانە– كە لێیەوە دەچنە ژوورەوە، داناخرێت كاتێك هەموو دەرگاكان دادەخرێن، ڕێگەیەكی راست و دروستە كە بیروبۆچوون ناتوانێت خواری بكاتەوە، یادی "الحكیم"ە ئارەزووەكان كوێری ناكەنەوە، ئەو دابەزێنراوە بەخشندەیە كە زانایان لێی تێرنابن، شتە سەیروسەمەرەكانی كۆتایی پێ نایەت، هەورەكانی لەباران ناوەستن، ئایەتەكانی وشك ناكەن، ئاماژەكانی دژ بەیەكتر نابن، تا تێڕامان و بیركردنەوەی زۆرتر و زیاتری تیا بكرێت هیدایەت و بەرچاوڕوونی زیاتر دەبەخشێت، لە هەر شوێنێك كانیاوەكەی هەڵدەقوڵێت جۆگەلەی حیكمەت لێیەوە سەرچاوە دەگرێت، قورئان نووری بەرچاوڕوونییە بۆ كوێران، شفای دڵ و دەروونە بە دەواكانی، زیندەگی دڵانە، چێژی دەروونە، باخچەیە بۆ دڵ، گەشتی ڕۆحە بۆ مەملەكەتی

ئاسوودەیی، بەیانیان و ئێواران بانگمان لێ دەكات: ئەی ئەهلی رزگاری، وەرن بۆ رزگاری، بانگكەرێك لەسەر شارێگەی راست و درووست بانگدەكات ﴿ يَٰقَوۡمَنَآ أَجِيبُواْ دَاعِيَ ٱللَّهِ وَءَامِنُواْ بِهِۦ يَغۡفِرۡ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُجِرۡكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣١﴾ ﴾ الأحقاف: ٣١

كەماڵی مرۆڤ بە زانستی بەسوود و كرداری چاكەوەیە، ئەو دوانە هیدایەت و ئایینی راستەقینەن، هەروەها بە گەیاندنە كەماڵی كەسانی تر جگە لە خۆی ﴿ وَٱلۡعَصۡرِ ﴿١﴾ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ﴿٢﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ﴿٣﴾ ﴾ العصر: ١-٣، خودای موتەعال سوێند دەخوات كە یەك بە یەكی مرۆڤەكان زەرەرمەندن جگە لەوانەی هێزی زانستی بە ئیمان كامڵ بكەن و هێزی كرداری بە كرداری چاكە تەواو بكەن، كەسانی تریش بە وەسێت كردن بە حەق و ئارامی بگەیەننە كەماڵ، حەق بریتییە لە ئیمان و كرداری چاكە، ئەو دووانەش تەواو نابن بە ئارامی و بانگكردن نەبێت بۆ سەریان، دەبوا مرۆڤ كاتەكانی تەمەنی -بەڵكو هەناسەكانی- بۆ گەیشتن بە پلە باڵاكان بەخت بكردبایە، بۆئەوەی خۆی لە زیانۆمەندی ئاشكرا رزگاربكردبایە، ئەوەش تەنها بە رووكردنە قورئان و تێگەیشتن لێی و قووڵبوونەوە تیایدا و دەرهێنانی گەنجینە و شاراوەكانی دەبێت، پێویستە هەموو لاكردنەوەت بۆ لای ئەو بێت و بە ورە و لێبڕانی بەرزەوە رووی تێبكەیت، قورئان دەستەبەری بەرژەوەندی بەندەكانە لە دونیا و دواڕۆژدا، دەیانخاتە سەر رێگەی رەوا و گەیشتنە كەماڵ.

ئێمە بە پشتیوانی خودا لەسەر ئەم بابەتە هۆشداری دەدەین بە قسەكردن لەسەر سوورەتی "الفاتحة"-دایكی قورئان- هەروەها ئاماژە بەو پلە باڵانەی ئەم سوورەتە پیرۆزە لەئامێزی دەگرێت، هەر بەو جۆرە بەرپەرچدانەوەی هەموو دەستەكان لە ئەهلی بیدعە و گومڕایی كە ئەم سوورەتە لە ئامێزی دەگرێت، ئەو مەنزڵگانەی كاروانچییانی رێگەی خودا پێی تێدەنێن، ئەو مەقامانەی خوداناسان بەدەستی دەهێنن، جیاوازی لە نێوان هۆكارەكانی و ئامانجەكانی، باس كردنی ئەوەی هیچ سوورەتێك جێگەی ئەم سوورەتە ناگرێتەوە و كارەكانی ئەم سوورەتە تەواو ناكات، بۆیە لە تەورات و ئینجیل و قورئاندا نموونەی ئەم سوورەتە دانەبەزیوە.

خودا پشت و پەنایە، متمانە و كۆمەك هەر لەو داوا دەكرێت. ولا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم.

## سورەتی "الفاتحة"والأکەری داوا بەرز و بڵندەکان

بزانە کە ئەم سوورەتە (سورەتی الفاتحة) سەرجەم داوا بەرز و بڵندەکان بەتەواوترین و باشترین شێوە لەئامێز دەگرێت.

پێناسەی پەرستراو (معبود)-تبارك وتعالى- بە سێ ناو دەگرێتەخۆ، ئەو سێ ناوە دەبنە رووگە و خولگەی سەرجەم ناوە جوانەکانی خودا، ئەو سیانەش بریتین لە (الله، الرب، الرحمن)، سوورەتەکە لە خوایەتی و پەروەردگاری و بەزەیی بیناکراوە، "إياك نعبد" لەسەر خوایەتی (الإلهية) بونیادنراوە و "إياك نستعين" لەسەر پەروەردگاری (الربوبية) بیناکراوە، داواکردنی هیدایەتیش بۆ سەر شارێگەی راست و دروست (الصراط المستقيم) بە سیفەتی بەزەیی (الرحمة) دەبێت، ستایش (الحمد) هەر سێ راستییەکەی تێدایە، خودا لە خوایەتی و پەروەردگاری و بەزەییدا حەمدکراو (محمود)ە.

ئەم سوورەتە یەکلاکردنەوەی زیندووبوونەوەش دەگرێتەخۆ، پاداشتی دوارۆژ بە کردەوەکانیانە، چاکە و خراپە، تاکوتەنهایی خودا لەو رۆژەدا لە بڕیاردان و فەرمان دەرکردن لە نێوان دروستکراوەکانیدا، هەروەها دەرکردنی بڕیاری دادوەرانە، هەموو ئەمانە لەژێر "مالك يوم الدين"دا جێیان دەبێتەوە.

**لە چەند روویەکەوە باسی پێغەمبەرایەتی و جێگیرکردنی پێغەمبەرایەتی لەئامێز دەگرێت:**

**یەکەمیان:** لەبەر ئەوەی ئەو-سبحانه- پەروەردگاری جیهانەکانە، شایستە نییە بەو خودایە بەندەکانی وێڵ و پشتگوێ بخات و ئاشنایان نەکات بەوەی کەڵکی لێ دەبینن لە ژیانی دونیا و دوارۆژیاندا، هەروەها ئاگاداریان نەکاتەوە لەو شتانەی زیانیان پێ دەگەیەنێت لە هەردوو دونیادا، ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە سڕینەوەی پەروەردگارییە و دانەپاڵی شتێکە بۆ لای خودا کە شایستەی نییە.

**دووەم:** وەرگرتنە لە ناوی "الله" کە بریتییە لە "المألوه المعبود"واتە کەسێك کە بەندەکانی بۆ لای ئەو هەڵدێن و پەرستراوێکی راستەقینەیە، هیچ رێگەیەك نییە بۆ ناسینی بەندایەتی خودا لە رێگەی پێغەمبەرانەوە نەبێت.

**سێیەم:** لە ناوی "الرحمن"ەوەیە، بەزەیی خودا رێگرە لەبەردەم وێڵکردنی بەندەکانیدا، بەوەی ئاشناییان پێ پەیدا نەکات بەو رێگەیەی ئامانجی گەیشتنە کەماڵیان لەخۆ دەگرێت، هەر کەس مافی ناوی "الرحمن"بدات دەزانێت ئەم ناوە ناردنی

پێغەمبەران و دابەزاندنی کتێب زیاتر لە دابەزینی باران و رووانـدنی لـەوەڕگا و سەوزوکردنی تۆ و دانەوێڵە لەئامێز دەگرێت، سیفەتی بەزەیی ژیانی دڵ و رۆح زیاتر لە ژیانی جەستە لەخۆ دەگرێت، بەڵام بێبەشان لەم ناوە جوانە بەئەندازەی ئاژەڵ و چوارپێکان بەشیان دراوە، لە کاتێکدا خاوەن کرۆك و ژیرییەکان شتێکی تر لەپشتی ئەوەوە لەم ناوە جوانە وەردەگرن.

**چوارەم:** لە باسکردنی "يوم الدين" ئەو رۆژەیە خودا سزا و پاداشتی بەندەکان دەداتەوە بە کردەوەکانیان، لەسەر چاکە پاداشت و لەسەر یاخیبوون و خراپەش سزادانیان، خودا هیچ کەس ئازار نادات بەر لە خستنەڕووی بەڵگە و بڕینی بیانووی بەندەکانی، بەڵگەش بە پێغەمبەران و کتێبەکانی راست دەبێتەوە، بەو دووانەش پاداشت و سزا بە حەق دەگەڕێن، هەر بەو دووانە بازاڕی رۆژی دوایی دادەنرێت و چاکان بۆ بەهەشت رەوانە دەکرێن و خراپانیش بۆ دۆزەخ.

**پێنجەم:** لە "إياك نعبد" ئەوەی خودای پێ دەپەرسترێت دەبێت خودا پێی رازیبێت و خۆشیبوێت، بەندایەتی کردنی خودا-کە بریتییە لە شوکر و خۆشەویستی و ترسان-حاڵەتێکی فیترییە و لەلایەن ژیری تەندروستەوە ژنەوراوە، بەڵام ناتوانین بگەینە پەرستنی خودا و ئەوەی خودای پێ دەپەرسترێت لە رێگەی پێغەمبەران و بەیانی پێغەمبەرانەوە نەبێت، لەمەشەوە تێدەگەین ناردنی پێغەمبەران کارێکی جێگیر و سەلماوە لەڕووی ژیرییەوە، نابێت جیهان خاڵی بێت لێی، وەك چۆن نابێت جیهان دروستکەرێکی نەبێت، هەرکەس باوەڕی بە پێغەمبەران نییە ئەوە باوەڕی بە نێرەری پێغەمبەران(خودا) نییە، بۆیە خودا-**سبحانه**- بێباوەڕی بە پێغەمبەران لە خانەی بێباوەڕی بە خودا داناوە.

**شەشەم:** لە "إهدنا الصراط المستقيم"، هیدایەت: بریتییە لە بەیانکردن و رێنمایی، پاشان کۆمەکی و ئیلهام کە لەدوای بەیانکردن و رێنماییە، رێگەیەك بۆ بەیان و رێنمایی بوونی نییە لە رێگەی پێغەمبەرانەوە نەبێت، کە بەیان و رێنمایی و ناساندن بەدەستهاتن هیدایەتی کۆمەکی کردن بەدوایاندا دێت، خودا باوەڕی لەناو دڵدا داناوە، لای بەندەکانی خۆشەویستی کردووە و لەدڵیاندا جوانی کردووە و پێی رازیبووە و رەغبەتی پێداوە.

ئەو دووانە (بەیان و رێنمایی و ناساندن لەگەڵ کۆمەك و ئیلهام) دوو هیدایەتی سەربەخۆن، سەرکەوتن تەنها بەو دووانەوەیە، ئەو دووانە ناسینی ئەوەی نەمان ناسیوە

لە حەق و راستی بەدووروودرێژی لـەخۆ دەگرێـت و ئیلهاممان دەکـات بـۆ لای و وامـان لێدەکات بمانەوێت شوێنی بکەوین لە ناوەوە و لە دەرەوەماندا، پاشـان دروسـتکردنی توانا بۆ هەستان بە گوفتار و کار و لێبڕان بەپێی هیدایـەت، پاشـان بـەردەوام کردنـی ئەوە و راوەستانمان لەسەری تا مردن.

لێرەوە ئاتاجیی بەنـدەی خـودا بـۆ گـەڕان بـەدوای ئـەم بانگـەوازەدا لەسـەرو هـەموو پێویستییەکەوەیە، بێبنەمایی قسەی ئەوانەی دەڵێن: ئەگەر ئێمە هیدایەتدراوین چۆن داوای هیدایـەت بکـەین؟ نادیـار لـە حـەق و راسـتی لـە ئێمـەوە زۆر زیـاترە لـەوەی دەرکەوتووە، ئەوەی نامانەوێت ئەنجامی بدەین بەهۆی پشتگوێخستن و تەمبەڵییـەوە بـە ئەنـدازەی ئەوەیـە ئـەنجامی دەدەیـن، یـان زیـاتر یـان کـەمتر. ئـەوەی دەسـتمان بەسەریدا نـاڕوات و نـاتوانین ئـەنجامی بـدەین هـەر بـەو جۆرەیـە، ئـەوەی بـە گشـتی دەیـزانین و لـە وردەکارییـەکانی بێئاگـاین نایەتـە هـەژماردن، ئێمـە پێویسـتمان بـە هیدایەتی تێروتەواوە، هەر کـەس هـەموو ئەمانـەی بەدەسـتهێنا ئـەوا داوای هیدایـەت داوایە بۆ راوەستان و بەردەوام بوون لەسەر ئەوانە.

هیدایەت پلەیەکی تری هەیە -کە دواین پلەیە- ئەوەش بریتییە لە هیدایەت بـۆ سـەر رێگەی بەهەشت لەڕۆژی دواییدا، ئـەو رێگەیـەی دەمانگەیەنێتـە بەهەشـت، هەرکـەس لـەم ژیـانی دونیـادا هیدایـەت درابێـت بـۆ سـەر شـاڕێگەی راسـت و دروسـتی خـودای موتەعال -کە پێغەمبەرانی بۆ نێرراوە و کتێبەکانی لەسەر دابەزێنراوە- ئەوا لـەوێ و لەو رۆژەدا هیدایەت دەدرێت بۆ سەر ئەو شاڕێگەیە، رێگـەی گەیشـتن بـە بەهەشـت و خانـەی پاداشـتی خـودایی. بـە ئەنـدازەی جێگیربـوونی هـەنگاوەکانی لەسـەر ئـەم شاڕێگەیە - کە لەم ژیانی دونیادا خودا بۆ بەندەکانی راخسـتووە- هـەنگاوەکانی لـە رۆژی دواییدا لەسەر ئەو رێگەیە -کـە بەسـەر دۆزەخـدا راخـراوە- جێگیردەبێـت، بـە ئەندازەی رۆیشتنی لەسەر ئەم رێگەیە رۆیشتنی لەسەر ئەو رێگەیە بەردەوام دەبێـت، هەندێکیان وەك تیشك گوزەر دەکەن، هەندێکیان وەك دەنـگ و هەنـدێکیان وەك بـا و هەیانە بە سواری و هەیانە بە پەلە و هەیانە بە پیادەڕەوی، و هەشیانە بـە گـاوەڵکێ، کەسانێك بریندار و رادەستبوو، کەسانێکی تر بەربوەوە بۆ ناو ئاگر، با بەندەکان لێرە تەماشای رۆیشتنی خۆیان بکەن کە بە سەر دۆزەخدا راخراوە، بێ کەم و زیاد، تۆڵە و پاداشت بەپێی کردار ﴿هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٠﴾﴾ النمل: ٩٠

با سەرنجی تەمومژ (شبهات) و ئارەزوو (شهوات) بدات کە دەبنە لەمپەری رۆیشتنی بەرەو خوداچوونی لەسەر شارێگەی راست و دروست، ئەو دووانە ئەو قولاپانەن کە بە لاکانی پردی سیراتەوەن، دەیگرن و رایدەکێشن و لە جووڵە بەسەر ئەو رێگەیەدا پەکی دەخەن، گەر لێرە زۆربن و بەهێزبن لەوێش هەر بەو جۆرەیە ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ۝٤٦﴾ فصلت: ٤٦، داواکردنی هیدایەت هەموو خێر و پارێزراوییەك لەشەڕ لەئامێز دەگرێت.

**حەوتەم:** لە ناسینی خودی داواکراوەکە کە شارێگەی راست و دروست (الصراط المستقيم)ە، رێگە پێی ناوترێت شارێگە (الصراط) تا پێنج مەرجی تێدا نەبێت: رێکی، و گەیشتنە مەبەست، و نزیکی، و بەرینی و فراوانی بۆ ئەوانەی بەسەریدا تێدەپەڕن، و تەنها رێگەیی بۆ گەیشتنە مەبەست، شارێگەی راست و دروستی خوداش (الصراط المستقيم) ئەو پێنج مەرجەی تێدایە.

وەسفکردنی بە رێکی و راستی (المستقيم) نزیکی لەخۆ دەگرێت، چونکە هێڵی راست نزیکترین ماوەی نێوان دوو خاڵە، تا هێڵەکە لار و خوار ببێتەوە ماوەکەی دووردەکەوێتەوە، راست و دروستییەکەی گەیشتنە مەبەست لەئامێز دەگرێت، راخستنی ئەو رێگەیە بۆ هەمووان فراوانی و بەرینی لەخۆ دەگرێت، دانەپاڵی رێگەکە بۆ لای ئەوانەی نیعمەتی خودایان بەسەردا باریی(صراط الذين أنعمت عليهم) و وەسفکردنی بە جیاوازی لە رێگەی خەشملێگیراوان و سەرلێشێواوان(غير المغضوب عليهم ولا الضالين) تاککردنەوە و تەنهاکردنەوەی رێگەکەیە بۆ گەیشتن بە مەرام.

شارێگە(الصراط) هەندێ جار دەدرێتە پاڵ خودا کە ئەو-سبحانه- بەیانی کردووە و رایخستووە، وەك ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا ۝١٥٣﴾ الأنعام: ١٥٣ ﴿وَإِنَّكَ لَتَهْدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ۝٥٢ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ۝٥٣﴾ الشورى: ٥٢ – ٥٣، هەندێ جاریش دەدرێتە پاڵ بەندەکانی خودا، وەك لە سورەتی "الفاتحة"دا هاتووە (صراط الذين أنعمت عليهم) لەبەرئەوەی ئەهلی گرتنەبەری رێگەکەن، رێگەکە دەدرێتە پاڵیان و ئەوانیش کاروانچییانی سەر ئەو رێگەیەن.

**هەشتەم:** لە باسکردنی ئەوانەی نیعمەتی خودا بەسەریانەوەیە و جیاکردنەوەیان لە دوو تایەفەی خەشملێگیراوان و گومڕایان.

خەڵکی بەپێی ناسینی حەق و کارپێکردنی بۆ سێ دەستە دابەش بوون، چونکە بەندە یان زانایە بە حەق یان نەزانە، زانا بە حەق: یان بەپێی حەق کار دەکات یان ملپێچی و یاخیبوون لە حەق دەکات، ئەمە بەشەکانی ئەوانەن کە لەلای خوداوە تەکلیف لێکراون، لەم سیانە دەرناچن، ئەوەی زانایە بە حەق و کاری پێ دەکات یەکێکە لە ئەهلی نیعمەت، ئەو کەسەیە کە دەروونی خۆی بە زانستی بەسوود و کرداری چاکە پاك کردۆتەوە، ئەو یەکێکە لە رزگاربووان ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾﴾ الشمس: ٩، ئەو کەسەی زانستی بە حەق هەیە و شوێنی ئارەزووەکانی دەکەوێت بریتییە لە خەشملێگیراو (المغضوب علیه)، ئەوەش کە حەق ناناسێت گومڕایە لە دۆزینەوەی کرداری چاکە، گومڕاش خەشملێگیراوە بەهۆی سەرلێشێوانی لە نەبوونی زانستێك کرداری پێ ئەنجام بدات، هەر یەکێك لەو دوانە گومڕا و خەشملێگیراوە، بەڵام ئەوانەی حەق دەناسن و کاری پێ ناکەن نزیکترن لە وەسفی خەشم (الغضب) و شایستەترن پێی، لێرەدا یەهوود شایستەتر و لەپێشترە بەو وەسفە، ئەو وەسفە پڕ لە ڕەقی و توندییە کاڵای باڵایانە، وەك ئایەتی ﴿بِئْسَمَا ٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ أَن يَكْفُرُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بَغْيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٍ ۚ ﴿٩٠﴾﴾ البقرة: ٩٠ ﴿قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِ ۚ مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ ٱلْقِرَدَةَ وَٱلْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٦٠﴾﴾ المائدة: ٦٠، نەزان بە حەق شایستەترە بە وەسفی گومڕایی (الضلال)، لێرەدا وەسفی نەصارای پێکراوە لە ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓا۟ أَهْوَآءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا۟ مِن قَبْلُ وَأَضَلُّوا۟ كَثِيرًا وَضَلُّوا۟ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٧٧﴾﴾ المائدة: ٧٧، یەکەمیان لە ڕووتوێی گوتارەکەدا لەگەڵ یەهوودە، دووەمیان لەگەڵ نەصارایە، لە سوننەنی ئیمامی ترمذي و سەحیحی ئیبن حبان لە عەدی کوڕی حاتەمەوە، دەفەرموێت پێغەمبەری خودا فەرمووی ((الیهود مغضوب علیهم و النصاری ضالون)).

لە باسکردنی ئەوانەی نیعمەتی خودا بەسەریاندا داباریوە-کە ئەوانەن حەقیان ناسیوە و شوێنی کەوتوون- و خەشملێگیراوان -ئەوانەی حەقیان ناسی و شوێنی حەز و ئارەزوو کەوتن- و گومڕاکانیش ئەوانەن حەقیان نەناسیوە، لە باسکردنی ئەم سێ دەستەیەدا پەیام و پێغەمبەرایەتی ساغ دەبێتەوە و جێگیر دەبێت، چونکە

دابەشبوونی خەڵکی بۆ ئەو سیانە واقیعێکی بینراوە، ئەم دابەشبوونەش هاتنی پەیامی خودا ساغی دەکاتەوە.

**خودای موتەعال نیعمەتی داوەتە پاڵ خۆی، بەڵام بکەری خەشم (غضب)ەکەی لاداوە(غير المغضوب عليهم) بەچەند هۆیەکەوە:**

**رووی یەکەم:** نیعمەت خێر و چاکەیە، بەڵام خەشم (الغضب) تۆڵە لێ کردنەوەیەکی داپەروەرانەیە، بەزەیی بەسەر تووڕەیی خودادا زاڵە، بۆیە تەواوتر و لەپێشتر و بەهێزتری داوەتە پاڵ خۆی-سبحانە- ئەمە شێوازی قورئانە لە دانەپاڵی خێر و نیعمەت بۆ لای خودا و لادانی بکەر لە دژەکانیاندا (واتە شەڕ و نیقمەت)، هەر وەك قسەی باوەڕدارە جنییەکان ﴿ وَأَنَّا لَا نَدْرِيٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي ٱلْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا ﴿١٠﴾ ﴾ الجن: ١٠، هەروەها قسەکەی "خضر" دەربارەی دیوارەکە و دوو منداڵە هەتیوەکە ﴿ فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبْلُغَآ أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا ﴿٨٢﴾ ﴾ الکهف: ٨٢، دەربارەی کونکردنی کەشتییەکەش دەڵێت ﴿ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا ﴿٧٩﴾ ﴾ الکهف: ٧٩، پاشان دوای ئەوە دەڵێت ﴿ وَمَا فَعَلْتُهُۥ عَنْ أَمْرِي ﴿٨٢﴾ ﴾ الکهف: ٨٢.

**رووی دووەم:** خودا بۆخۆی بەتەنها خاوەنی نیعمەتەکانە ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ﴾ النحل: ٥٣، ئەو شتەی کە خودا-سبحانە- پێی تاك و تەنها بووەتەوە دایە پاڵ خۆی، گەر بدرێتە پاڵ کەسێکی تر جگە لە خودا ئەوا بەهۆی بوون بە رێگە و جاریبوونی نیعمەتەکەیە بە ئەودا، بەڵام خەشم لە دوژمنانی تەنها تایبەتی خودای موتەعال نییە، بەڵکو فریشتەکانی و پێغەمبەرانی و ئەولیاکانی بە تووڕەبوونی خودا تووڕە دەبن، لە دەستەواژەی "المغضوب عليهم" بە تەبایی ئەولیاکانی لەگەڵی بەڵگەیە لەسەر تاکبوونەوەی بە نیعمەت، نیعمەتی رەها تەنها لەوەوەیە، ئەو-سبحانە- پێی تاك و تەنها بووەتەوە، ئەم ئاماژەیە کە لەو دەستەواژەدا بوونی هەیە لە "المنعم عليهم"دا جێگەی نابێتەوە.

**رووی سێیەم:** لە لابردنی بکەری خەشمەکەدا سووکایەتی و کەم تەماشاکردن و بچووك کردنەوەی بۆ کەسی خەشملێگیراو (المغضوب عليه) تێدایە کە لە باسکردنی بکەری نیعمەتەکە بوونی نییە، ناوهێنانی بکەری نیعمەتەکە نیشانەی رێزگرتن و باسکردن و بەرزکردنەوەی پلەوپایەی کەسی نیعمەت بەسەردا داباریوە کە لە سڕینەوەی بکەری نیعمەتەکەدا ئەم مانایەی نەدەگەیاند، گەر کەسێکت بینی مەلیك

ڕێـز و شـکۆمەندی پێـدابوو و پلەوپایـەی بـەرزکردبوەوە، وتـت: ئـەوە ئـەو پیاوەیـە سوڵتان ڕێزی لێناوە و نیعمەتی خۆی بەسـەردا ڕژانـدووە و ئـەوەی ئـاواتی بـوو پێـی بەخشیوە ئەم دەربڕینە ڕەوانترە لە پیاهەڵدان و گەورەکردنـدا تـا بڵێیـت: ئەمـە ئـەو کەسەیە ڕێزی لێ گیراوە و نیعمەتی پێ بەخشراوە و پێیدراوە.

لە نهێنییەکی زۆر ورد ڕابمێنە ئەویش بریتییە لە باسکردنی هۆ و پاداشت و سزا بـۆ ئـەو سێ دەستەیە بە کـورتترین و کـەمترین وشـە. نیعمـەت لەسـەر دەسـتەیەکیان نیعمـەتی هیدایەت لەخۆ دەگرێت کە بریتییە لە زانستی بەسوود و کرداری چاکە ئـەوەش بریتییـە لە هیدایەت و ئایینی حەق (هدی و دین الحق)، کەماڵی نیعمەتیش پاداشتی چاکە بۆ ئـەو کەسـە لـەخۆ دەگرێـت، ئـەم پاداشـتەش بریتییـە لـە تـەواوی نیعمـەتی، دەسـتەواژەی "أنعمت علیهم" هەردوو کارەکە (هیدایەت و پاداشت)ی تێدایە.

باسی خەشمی خۆی لەسەر خەشملێگیراوان "المغضوب علیهم" ئەمیش دوو کـار لـەخۆ دەگرێت: سزادانیان بە خەشمی خودایی کە لوتکەی سزا و ڕسـوابوون بـەدوای خۆیـدا دەهێنێت، لەگەڵ ئەو هۆیەی شایستەی بوون بەهۆیەوە خەشمی خـودا بیانگرێتـەوە، چونکە خودا بەبـەزەییترە لـەوەی بـەبێ تـاوان و گـومڕایی لـە ئـەوان تـووڕە ببێـت و خەشمیان لێ بگرێت، وەك ئەوەی خەشم لەسەریان هاوملی گومڕاییان بێت، هـەر بـەو جۆرە ناوهێنانی "الضالین" هاوملی خـەشمی خـودایی و سـزادانی ئەوانـە، هـەر کـەس گومڕا ببێت شایستەی ئەو سزادان و خەشمەیە کە بەدوای گومڕابوونەکەیدا دێت.

وەسفی هەریەك لەم سێ دەستەیە بەباشترین شێوە هاومـل و تـەبا بـوو لەگـەڵ هـۆ و پاداشت و سـزایان، بـە تـەواوترین داواکـردن هـاتن بەدوایانـدا، ئـەوەش بـە کـورتترین دەربڕین و بەیانکردن و ڕەوانبێژی، لەگەڵ ناوهێنـانی بکـەر بـۆ ئـەهلی بەختـەوەری و سڕینەوە و لادانی بکەرەکە بۆ خەشملێگیراوان، هـەروەها دانـەپاڵی "کارەکـە" بـۆلای "هۆی کارەکە" لە باسکردنی گومڕایان (الضالین)دا.

سەرنجی بەرانبەرکێ لەنێوان کۆمەڵێك وشەدا بدە: هیدایەت و نیعمەت لەگەڵ خەشم و گومڕایی، باسی خەشملێگیراوان (المغضوب علیهم) و گومڕایان (الضالین)ی کرد بەرانبەر هیدایەتدراوان (المهتدین) و نیعمەتداران (المنعم علیهم)، ئـەم شـێوازە لـە قورئانـدا زۆرە، بەراورد دەکات لـەنێوان گـومڕایی و چارەڕەشـی لەگـەڵ هیدایـەت و ڕزگـاری، ئەمـەی

دووەميـــــان وەك ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٥ ﴾ البقـــــرة: ٥ ، هـــەروەها﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ ٨٢ ﴾ الأنعـــام: ٨٢، هـــەروەها يەكـــەميان (گومرايی و چارەڕەشی) وەك ﴿ إِنَّ ٱلۡمُجۡرِمِينَ فِي ضَلَٰلٖ وَسُعُرٖ ٤٧ ﴾ القمـر: ٤٧، ﴿ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡۖ وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ٧ ﴾ البقـــــرة: ٧، هەروەها ، خودای موتەعال لەم ئايەتانەدا چوار شتی كۆ كردۆتـەوە كـە دەفـەرموێت: ﴿ فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشۡقَىٰ ١٢٣ ﴾ طـه: ١٢٣، لـەم ئايەتەدا هيدايەت و بەختەوەری ئاماژە پێداوە، پاشـان دەفـەرموێت ﴿ وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ ١٢٤ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرۡتَنِيٓ أَعۡمَىٰ وَقَدۡ كُنتُ بَصِيرٗا ١٢٥ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتۡكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَاۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمَ تُنسَىٰ ١٢٦ ﴾ طـه: ١٢٤ — ١٢٦، لێرەشدا گومرايی و چارەڕەشی باس كردووە، كەوابوو هيدايەت و بەختەوەری هاوملی يەكترن و گومرايی و چارەڕەشيش هەر بەو جۆرەيە.

❁ ❁ ❁

## هیدایەت سەربەرزی بەدوای خۆیدا دەهێنێت

باسکردنی شارێگەی راست و دروست"الصـراط المستقیم" بـە "تـاك" و بـە "ناسـراو" ئەمەش بە دوو ناساندن: یەکەم ناساندن بە "أل"ی ناسـاندن، دووەم ناسـاندنیش بـە دانەپالّ (إضافة)، ئەمەش دیاریکردن و تایبەتمەندبوونی ئەو رێگەیـە دەگەیـەنێت، ئـەو رێگەیە تەنها یـەك رێگەیـە، بـەلاّم رێگـەی خـەشملێگیراوان و گومڕایـان بـە تـاك و کـۆ هـــــاتووە، وەك ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾﴾ الأنعـام: ١٥٣، وشـەی "صــراط" کـە رێگـەی خۆیـەتی بـە تـاك باسـی لێـوەکرد، پاشـان رێگـەی ئـەوانی تـری کـۆکردەوە "السبل"، ئیبن مەسعود دەفەرموێت: (پێغەمبەر(ﷺ) هێڵێکی بۆ کێشـاین و فـەرمووی ئەمە رێگەی خودایە، پاشان چەندین هێڵـی لـە راسـت و چـەپی ئـەو هێڵـەوە کێشـا و فەرمووی ئەمانە کوێرە رێگەکانن، لەسـەر هـەر یـەکێك لـەم کـوێرە رێیانـە شـەیتانێك دانیشتووە و بانگی بۆ دەکات، پاشـان ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾﴾ الأنعام: ١٥٣، ئەمەش چونکە رێگـەی گەیشـتن بـە خـودا یـەك رێگەیـە، ئـەوەش بریتییـە لـەو رێگەیـەی پێغەمبـەرانی بـۆ رەوانـە کـردووە و کتێبـەکانی بـۆ دابەزاندووە، کـەس بـە خـودا ناگـات لـەم رێگەیـەوە نـەبێت، گـەر خـەڵکی لـە هـەموو رێگەیەکەوە بێن و لـە هەرچـی دەرگایـە بـدەن، رێگـە بەڕوویانـدا کلۆمـە و دەرگـا بـە ڕوویانـدا داخـراوە، تـەنها لـەو یـەك رێگەیـەوە نـەبێت، ئـەو رێگەیـەش بـە خـوداوە پەیوەسـتە و دەگاتـە لای خـودا ﴿هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ مُسۡتَقِيمٌ ﴿٤١﴾﴾ الحجـر: ٤١، شـێخ حەسەن دەفەرموێت ماناکەی بریتییە لە: "صراط إلي مستقیم"واتە رێگەیەکە راست بـۆ لای مـن، ئەمـەش دوو ئەگـەری هەیـە: یەکـەمیان، مەبەسـتی شـێخ حەسـەن هـاتنی حەرفەکان بێت هەندێکیان لە جێگەی هەندێکی تریان، لێرەدا "علـی"ی ئایەتەکـە لـە جێگەی "إلی" هاتبێت، دووەمیان: مەبەستی راڤەکردن لەسەر مانابێت کـە لـە رێگـەی پێشینانەوە نزیکترە، واتە رێگەی گەیشتن بە من، موجاهید دەفەرموێ: حـەق بـۆ لای خودا دەگەڕێتەوە، رێگەش لەسەر خودایە، بەسەر هیچ شتێکدا لارنابێتـەوە، ئەمـەش هەروەك قسەکەی "شێخ حەسەن"ە و رۆشنترە لەو، ئەوەش راستترین رایەکە لەسەر

ئایەتەکە وترابێت، وتراوە وشەی "علی" واتە لەسەرم، مانای پێویستبوون دەگەیەنێت، واتە لەسەرمە ڕۆشنی بکەمەوە و بیناسێنم و ئاماژەی پێ بکەم، ئەو دوو قسەیە هاومانای ئەم ئایەتە پیرۆزەن ﴿وَعَلَى اللَّهِ قَصْدُ السَّبِيلِ ﴿٩﴾﴾ النحل: ٩، مانای دروست ئەو مانایەیە کە هاوشێوەی مانای ئایەتەکەی سورەتی "الحجر" دەکرێت: ڕێگەی "قاصد" –کە ڕێك و ڕاست و دروستە– بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە و مرۆڤ بە خودا دەگەیەنێت، "طفيل الغنوي" دەڵێت:

مضو سلفا، قصد السبيل عليهم وصرف المنايا بالرجال تتقلب

وشەی "عليهم" لێرەدا واتە: گوزەرکردن و تێپەڕبوونمان بەلایاندا بوو، گەیشتنمان بۆ لای ئەوان بوو، کەسێکی تر دەڵێت:

فهن المنايا: أي واد سلكته عليها طريقي أو علي طريقها

دەوترێت گەر ئەو مانایە مەبەست بوایە لە ئایەتەکەدا ئەوا بەکارهێنانی "إلى" شیاوتر بوو کە مانای گەیشتنە کۆتایی تێدایە نەك ئامرازی "علی" کە مانی پێویست بوون لەخۆ دەگرێت، نابینی کاتێك مەبەستی "گەیشتن"ە دەفەرموێت ﴿إِنَّ إِلَيْنَا إِيَابَهُمْ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُمْ ﴿٢٦﴾﴾ الغاشية: ٢٥ – ٢٦، هەروەها دەفەرموێت ﴿إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ﴾ یونس: ٧٠، هەروەها ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ﴾ الأنعام: ١٠٨، کاتێکیش مەبەستی پێویستبوون بێت دەفەرموێت ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ﴿٢٦﴾﴾ الغاشية: ٢٦، دیسان دەفەرموێت ﴿إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ ﴿١٧﴾﴾ القيامة: ١٧، هەروەها ﴿وَمَا مِن دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ إِلَّا عَلَى اللَّهِ رِزْقُهَا﴾ هود: ٦، هەر بەو جۆرە هاوشێوەکانی ئەمانە.

وتراوە لە بەکارهێنانی ئامرازی "علی"دا نهێنییەکی ورد هەیە ئەوەش تێگەیاندنی کەسی بەرانبەرە بەوەی سالیکی ئەو ڕێگەیە لەسەر هیدایەتە، هەر ئەوەش ڕاست و دروستە، وەك دەربارەی باوەڕداران دەفەرموێت ﴿أُولَٰئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ﴾ البقرة: ٥، هەروەها بە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ﴿فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّكَ عَلَى الْحَقِّ الْمُبِينِ ﴿٧٩﴾﴾ النمل: ٧٩، خودای موتەعال خۆی حەقە، ڕێگەکەی حەقە، ئایینەکەی حەقە، **هەرکەسێکیش لەسەر شاڕێگەی ئەو بێت لەسەر حەق و هیدایەتە، بۆیە لە بەکارهێنانی "علی" لەو جێگەیەدا مانایەك هەیە کە لە بەکارهێنانی "إلى"دا بزر دەبێت، تێڕابمێنە ئەمە نهێنییەکی زۆر وردە.**

گەر دەڵێی: سوودی ناوهێنانی "علی" لەوەدا چییە، چۆن دەبێت باوەڕدار باڵاتر بێت لە حەق و لە هیدایەت؟

دەڵێم: بەهۆی ئەو باڵابوون و بەرزبوونەوەی لە حەق و هیدایەتەوە دەستی دەکەون، لەگەڵ جێگیربوون و بەردەوامی و راوەستاوی لەسەریان، لە هێنانی ئامرازی "علی" ئاماژە بە باڵابوون و جێگیربوون و راوەستاوی هەیە، ئەمەش بە پێچەوانەی گومڕایی و دڵکرمێنی (ریب)ەوەیە، لەو میانەدا ئامرازی "في" بەکاردەهێنرێت کە بەڵگەیە لەسەر نوقمبوون و بزربوون و ژێرپێکەوتنی کەسەکە، وەك﴿ فَهُمْ فِي رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾ التوبـــة:٤٥، دیســـان دەفـــەرموێت ﴿ وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا صُمٌّ وَبُكْمٌ فِي الظُّلُمَاتِ ﴾ الأنعام:٣٩، هەروەها ﴿ وَإِنَّهُمْ لَفِي شَكٍّ مِنْهُ مُرِيبٍ ﴿٤٥﴾ ﴾ فصلت: ٤٥.

سەرنجی ئەم ئایەتە پیرۆزە بدە ﴿ وَإِنَّا أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ ﴿٢٤﴾ ﴾ سبأ: ٢٤، بە گرتنەبەری رێگەی حەق باڵا لێی دەوەستێ و خاوەنەکەی بەرزدەکاتەوە بۆ پلەیەکی زۆر بەرز، رێگەی گومڕایش نزم لێی دەوەستێ و خاوەنەکەی بۆ نزمترین ئاست دادەبەزێنێت.

### ۞ پەروەردگارم لەسەر شاڕێگەی راست و دروستە

رێگەی رێك و رەوان بریتییە لە رێگەی خودا، خودا—سبحانە— هەواڵمان پێدەدات کە ناردن و راخستنی ئەو رێگەیە لەسەر خودا خۆیەتی، وەك باسمان لەبارەوە کرد، ئەو—سبحانە— رایدەگەیەنێت کە لەسەر شاڕێگەی راست و دروستە (علی صراط مستقیم)، ئەمەش لە دوو جێگەی قورئاندا هاتووە: لە سورەتی "هود" و سورەتی "النحل"دا، لە سورەتی هودا دەفەرموێت: ﴿ إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُمْ مَا مِنْ دَابَّةٍ إِلَّا هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ ﴿٥٦﴾ ﴾ هود: ٥٦، لە سورەتی "النحل"یشدا دەفەرموێت: ﴿ وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا رَجُلَيْنِ أَحَدُهُمَا أَبْكَمُ لَا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَيْءٍ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوْلَاهُ أَيْنَمَا يُوَجِّهْهُ لَا يَأْتِ بِخَيْرٍ هَلْ يَسْتَوِي هُوَ وَمَنْ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ ﴿٧٦﴾ ﴾ النحـــل: ٧٦، ئەمە نموونەیەکە خودا دەیهێنێتەوە لەسەر ئەو بتانەی کە نەیاندەتوانی ببیستن و ئاخافتن بکەن و بژنەون، بەڵکو کۆڵ و باربوون بەسەر بەندەکانیانەوە، بتەکە ئاتاج بوو بەندەکەی هەڵیبگرێت و دایبنێ و لەسەر پێ رایبوەستێنێ و خزمەتی بکات، ئیتر چۆن بە خودا یەکسانی دەکەن کە فەرمان بە داد و راستڕەوی و یەکتاپەرستی دەکات؟ ئەو

خودایەکی بەتوانای قسەکەرە، لە قسە و کرداریدا لەسەر شارێگەی راست و دروستە، قسەکانی راست و تەواو و ئامۆژگاری و هیدایەتن، کردارەکانی دانایی و دادپەروەری و بەزەیی و بەرژەوەندییە بۆ مرۆڤ، ئەمە راسترین قسەیە لەسەر ئایەتەکە، ئەو قسەیەیە کە زۆرینەی راڤەکەرانی قورئان جگە لەم بۆچوونە ئامازەیان بە شتێکی تر نەداوە.

ئامازەی لەسەر رێگەبوون "علی الصراط" وادەگەیەنێت کە ئەو -سبحانە- لەسەر رێگەیەکی راست و دروست بێت، ئامازەی ئەو "لەسەر رێگەبوونە" بە گوفتار و بە کردارە، واتە ئەو لەسەر شارێگەی راست و دروستە بە گوفتار و بە کرداری، ئەمەش ئەو قسەیە هەڵناوەشێنێتەوە کە دەڵێت: ئەو -سبحانە- لەسەر شارێگەی راست و دروستە (على الصراط المستقيم)

وتراوە: ئەو کەسەی لەسەر شارێگەی راست و دروستە بریتییە لە پێغەمبەری خودا کە فرمان بە دادپەروەری و راستڕەوی دەکات و لەسەر شارێگەی راست و دروست ڕاوەستاوە.

دەڵێم: ئەم بۆچوونەش دروستە و قسەی یەکەم هەڵناوەشێنێتەوە، چونکە خودا لەسەر شارێگەی راست و دروستە و پێغەمبەرەکەشی لەسەریەتی، فرمان ناکات و کردارێك ئەنجام نادات بەپێی ئەو رێگە و پێویستیی ئەو رێگەیە نەبێت، بینا لەسەر ئەمە لە ئایەتەکەدا نموونەکە هێنراوەتەوە بۆ ئیمامی باوەڕداران(پێغەمبەر) لەگەڵ رێنماییکەری هاوەڵدانەران -کە بتێکی کەڕولاڵە- ئەو بتە توانای هیدایەت و خێر و چاکەی نییە، هەروەها نموونە بۆ ئیمامی چاکان هێنراوەتەوە، ئەو کەسەش بریتییە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە فرمان بە راستڕەوی و دادپەروەری دەکات و لەسەر شارێگەی ڕاست و دروستە.

لەسەر قسەی یەکەم: نموونەکە دەربارەی پەرستراوی بێباوەڕان و پەستراوی چاکانە، لەسەر قسەی دووەمیش مەبەستی ئیمامی بێباوەڕان و بتێکی کەڕ و کوێرە. هەردوو قسەکە تەبا و هاوشان و هاوملی یەکترن.

هەندێك لە خاوەن تەفسیرەکان ئەوەی یەکەمیان باس کردووە و هەندێکیان ئەوەی دووەم، ئایەتە پیرۆزەکە هەردوو قسەکەی مەبەستە، دەڵێت: وتراوە، هەردووکیان بۆ باوەڕدار و بێباوەڕە، وەك چۆن"عطیة" لە ئیبن عەباسەوە دەگێڕێتەوە، "عطاء"ش دەفەرموێت: "الأبكم" کەڕولاڵەکە "أبي بن خلف"ە، ئەو

کەسەش فرمان بە داد و راستڕەویی دەکات (یأمر بالعدل) بریتین لە حمزة و عثمان کوڕی عەفان و عثمان کوڕی مظعون.

دەڵێم: ئایەتەکە ئەم قسەیەش دەگرێتەخۆ و دوو قسەکەی پێشوو هەڵناوەشێنێتەوە، خودا لەسەر شارێگەی راست و درووستە، هەر بەو جۆرە پێغەمبەرەکەی و شوێنکەوتووانی پێغەمبەرەکەی، دژی ئەوەش: پەرستراوی بێباوەڕان و ڕێنماییکەریان، کەسی بێباوەڕی شوێنکەوتە(تابع) و شوێنکەوتوو (متبوع) و پەرستراو(معبود)، هەندێ لە پێشینان بەرزترین جۆریان باس کردووە(خودا)، هەندێکیان ڕێنیشاندەرەکەیان باس کردووە (پێغەمبەر)، هەندێکیشیان وەڵامدەرەوەی بانگەوازیان ئاماژە پێداوە (باوەڕداران)، ئایەتەکە دەست بۆ هەموو ئەوانە دەبات و ئاماژەیان پێدەدات، هاوشێوەی ئەمە لە قورئاندا زۆرە.

ئایەتەکەی سوورەتی "هود"یش: زۆر روون و ئاشکرایە و جگە لە یەك مانا هیچ مانایەکی تر لەخۆ ناگرێت، ئەویش ئەوەیە کە خودا—سبحانه— لەسەر شارێگەی راست و دروستە. خودا—سبحانه— لە هەر کەسێك لەپێشترە لەسەر ڕێگەی راست و دروست بێت، سەرجەم قسەکانی راست و تەواو و هیدایەت و دادپەروەری و راستڕەوی و دڵنایین ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ﴾ الأنعام: ١١٥، تەواوی کردارەکانی خودا بەرژەوەندی و حیکمەت و بەزەیی و دادپەروەری و خێر و چاکەیە، هەرگیز شەڕ تێکەڵ بە کردار و گوفتاری نابێت، چونکە شەڕ لە دەرەوەی شارێگەی راست و دروستە (الصراط المستقیم)، چۆن شەڕ تێکەڵ بە کردار یان گوفتاری کەسێك دەبێت لەسەر شارێگەی راست و دروست بێت؟ بەڵکو تێکەڵ بە کردار و گوفتاری کەسانێك دەبێت لەو ڕێگەیە لایاندابێت و دەرچووبن.

لە نزاکانیدا —علیه الصلاة والسلام— ((لبیك و سعدیك والخیر کله بیدیك والشر لیس إلیك))، خێر بەدەستی خودایە و شەڕ نادرێتە پاڵ خودا. لاناکرێتەوە بە لای راڤەکردنی کەسانێکدا کە لە راڤەکردنی فەرموودەکەدا دەڵێن: بەشەڕ کەس لە تۆ نزیك نابێتەوە، یان بۆ لای تۆ بەرز نابێتەوە. ماناکەی بالاتر و گەورەتر و ڕێزوپێزی مەزنترە لەو مانایە، کەسێك هەر هەموو ناوەکانی جوان و چاك و پاکبن و سەرجەم سیفەتەکانی لە کەماڵدا بن و کردارەکانی سەرتاپا حیکمەت بن، هەموو گوفتارەکانی راست و رەوان بن، هەرگیز نابێت شەڕ بچێتە ناو ناو و سیفەتەکانی، یان کردار و

گوفتارەكانیەوە، ئەم مانایە لەگەڵ ئەم ئایەتە پیرۆزە لەسەر یەك دابنێ ﴿إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ۝٥٦﴾ هـود: ٥٦، تێڕابمێنـە و ببینـە چۆن بەدوایـدا دەفـەرموێت ﴿ إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُم ﴾ هود: ٥٦، واتە ئەو پەروەردگارمـە، رادەستم ناكـات و بـزرم ناكات، ئەو پەروەردگاری ئێوەشە، ئێوە بەسەر مندا زاڵ ناكات و هێـز و دەسـەڵاتتان بەسەر مندا پێنادات، ناوچاوانی ئێوە بەدەسـتی ئـەوە -سبحانه- ئێـوە نـاتوانن هـیچ كارێك بەبێ ویستی ئەو بكەن، هەرچی پێی لەسـەر زەوی دانابێـت جڵـەوی لەدەسـتی ئەودایە، بە مۆڵەتی ئەو نەبێت ناتوانن بجووڵێن، ئەوە -سبحانه- كاریـان پـێ دەكـات، لەگەڵ ئەمەشدا لە كـاركردنی لەوانـەدا و جووڵـە و بزوانیـان و جێبـەجێكردنی بڕیـاری براوە و قەدەر و ئەندازەگیرییەكەیدا: لەسەر شاڕێگەی راست و دروسـتە، هـیچ كارێـك لەو كارانە ناكات لەڕووی حیكمـەت و دادپـەروەری و بەرژەوەندییـەوە نـەبێت، ئەگـەر ئێوە بەسەر مندا زاڵ بكات ئەوە بۆ حیكمەتێكـە و دەبێـت لەسـەری ستایشـی بكـەم، چونكە زاڵكردنەكە بەدەستی كەسێكە كە لەسەر شـاڕێگەی راسـت و دروسـتە، سـتەم ناكات و كاری هەوانتە ئەنجام نادات بەبێ حیكمەتێكی براوە.

### ۞ نامۆبوونی تەنهاكەوتنەوە چارەسەرەكەی ئاوڕنەدانەوەیە

لەبـەر ئـەوەی داخوازیكـەری شـاڕێگەی راسـت و دروسـت داخوازیكـەری ڕێگەیەكـە زۆرینەی خەڵكی تیایدا رووبەڕووی شكست بوونەتەوە، ئەو دەیەوێت ڕێگەیەك بگرێتـە بەر كە هاودەمی كەم و دەگمەنە، دەروونیش نامۆبوونی تـەنهایی و هـۆگری دۆسـت و هاوەڵ لە سروشت و هەویریدایە، خـودا ئاگاهیـداوە بـە هـاودەم لەسـەر ئـەم ڕێگەیـە، ئەوانەش بریتین لەوانەی كە ﴿أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّـٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُو۟لَـٰٓئِكَ رَفِيقًا ۝٦٩﴾ النساء: ٦٩، خودا -سبحانه- لێـرەدا شـاڕێگە (صـراط)ی داوەتـە پـاڵ هاودەمـانی خـۆی لـە سـالیكانی ڕێگەكـە، ئەوانـە ئـەو دەسـتەیەن نیعمەتـەكانی خودایـان بەسـەردا دابـاری، تـاكو بـۆ داواكـەرانی هیدایـەت و سـالیكانی ڕێگەكە نامۆبوونی تەنهایی لە ئەهلی سەردەم و هاوڕەگەزەكانی خۆیان بڕەوێنێتەوە، بۆئەوەی بزانێت هاودەمانی ئەو لەسەر ئەم ڕێگەیە بریتین لەوانەی نیعمەتی خودایـان بەسەردا داباریوە و گوێ نادەن بە پەرگرتنی شكستخواردووان لە ڕێگەكە، ئەوان كـەم نرخن با ژمارەیان زۆرتـر بێـت، وەك هەنـدێ لـە پێشـین دەڵـێن ((دەسـت بـە ڕێگـەی

حەقەوە بگرەوە و کەمی شوێنکەوتووانی تووشی نامۆبوونت نەکات، ئاگاداری رێگەی بەتڵ بە و فریونەخۆیت بە ژمارە زۆری تیاچووەکانی سەر ئەو رێگەیە))، هەرکات هەستت بە تەنهایی و نامۆبوون کرد تەماشای هاودەمی پێشتر بکە و هەوڵبدە پێیان بگەیت، چاوداخە لە خەڵکانی تر جگە لەوان، ئەوانە هیچ سوودێکت لای خودا پێناگەیەنن، گەر لەسەر رێگەی رۆیشتنت بەرەو خودا هاواریان لێکردی لا مەکەرەوە بە لایاندا، هەرکات لات کردەوە بە لایاندا پەلکێشت دەکەن و بەدبەختت دەکەن.

دوو نموونەت بۆ دەهێنمەوە با جێگەی بایەخی تۆ بن.

نموونەی یەکەم: پیاوێك لەماڵەوە دەرچوو بۆ نوێژکردن، تەنها بۆ ئەو کارە چووبوویەوە دەرەوە، لەسەر رێگەکەی شەیتانێك لە شەیتانەکانی مرۆڤ هاتە بەردەمی، چەند قسەیەکی ئازاربەخشی پێوت، ئەویش وەستا و وەڵامی دایەوە و هەڵشاخان بە یەکتردا، لەوانەیە شەیتانە مرۆییەکە بەهێزتر بووبێت لە ئەو، بۆیە زاڵ بوو بەسەریدا و بەزاندی، چۆن؟ رێگەی لێ گرت تا نەگاتە مزگەوت، لەوانەیە پیاوەکە ە شەیتانە مرۆییەکە بەهێزتر بووبێت، بەڵام بەهۆی خەریکبوونی بە شەیتانەکەوە ریزی یەکەمی نوێژکردن و گەیشتنی تەواو بە نوێژی جەماعەتی لەدەست چوو، گەر لا بەلای شەیتانەکەدا بکاتەوە ورە بە شەیتانەکە دەدات بۆ پەلامار و زاڵبوون بەسەریدا، ەوانەیە ویست و لێبڕانی پیاوەکە خاوبێتەوە بۆ نوێژەکەی گەر مەعریفە و زانستی بە شەیتانەکە هەبێت، لە هەوڵی گەیشتنە جەماعەت بەئەندازەی لاکردنەوەی بیر و زەینی بەلایدا سارد دەبێتەوە، گەر پشتی تێکرد و تەنها بەو کارەوە خەریك بوو دەیەوێت ئەنجامی بدات، و ترسا نوێژەکەی لەدەست بچێت، یان کاتەکەی بڕوات، ئەوا دوژمنەکەی ئەو شتەی دەیەوێت دەستی ناکەوێت.

نموونەی دووەم: ئاسك لە سەگ خێراتر دەڕوات، بەڵام کاتێك هەستی بە دوژمنەکەی کرد لا بەلایدا دەکاتەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی خاوبوونەوەی راکردنەکەی، بۆیە سەگەکە دەیگاتێ و دەیخوات.

مەبەست لە باسکردنی ئەو هاودەمە لابردنی نامۆبوونی تەنهاکەوتنە و هانی رۆیشتنی بەردەوام و سووربوون و خۆهەڵکردن بۆ ئەو رۆیشتنە تاکو پێیان بگاتەوە.

ئەمە یەکێکە لە سوودەکانی دوعای قنوت ((أللهم اهدني فیمن هدیت))، واتە بمخە ناو ئەو دەستەیەوە و بمکە بە هاودەمیان و لەگەڵیان بم.

**سوودی دووەم:** بریتییە لە تەوەسول کردن بۆ لای خودا بە نیعمەتەکانی ئەو-سبحانه- هەروەها بە چاکەکانی لەگەڵ ئەوانەی نیعمەتی هیدایەتی پێ بەخشیون، واتە نیعمەتی هیدایەتت داوە بەوانەی کە هیدایەت دان، ئەمەش نیعمەتێکە لە تۆوە، لەو نیعمەتە بەشم بدە، بمکە بە یەکێك لەوانەی نیعمەتت بەسەردا داباراندن، واتە تەوەسولکردن بە چاکەی خودا بۆ لای خودا.

**سوودی سێیەم:** وەك چۆن داواکارێك بە کەسێکی بەخشندە دەڵێت: خێرم پێ بکە لە ریزی ئەوانەی خێرت پێ کردوون، فێرم بکە لە ریزی ئەوانەی فێرت کردوون، چاکەم لەگەڵ بکە لەریزی ئەوانەی چاکەی خۆت دەیانگرێتەوە.

### ۞ بە ناوە جوانەکانی خودا و بەندایەتی کردنی تەوەسول دەکەین

لەبەر ئەوەی داوای هیدایەت لە خودا مەزنترین داوایە و گەیشتن پێی بەنرخترین بەخششە: بۆیە خودا بەندەکانی بە چۆنێتی داواکردنەکە فێر کردووە، فەرمانی پێداون لەبەردەمیدا ستایشی خودا بکەن و پیایدا هەڵبدەن و بەگەورە و شکۆمەند رایبگرن، پاشان ناوهێنانی بەندایەتی و یەکتاپەرستییان، ئەم دوانە دوو وەسیلەن بۆ گەیشتنە داواکانیان: بە ناو و سیفەتاکانی خودا تەوەسول بکە (الحمد لله رب العالمين، الرحمن الرحيم، مالك يوم الدين)، هەروەها بە بەندایەتیت بۆ خودا تەوەسول بکە (إياك نعبد وإياك نستعين)، ئەم دوو وەسیلەیە داوا لەگەڵیان ناگەڕێتەوە، ئەوەی پاڵپشتی ئەم دوو وەسیلە ئاماژەبۆکراوە دەکات ئەو دوو فەرموودەیە کە ئیبن حەبان لە سەحیحەکەیدا و هەروەها ئیمام ئەحمەد و ترمذي دەربارەی "الإسم الأعظم" ریوایەتیان کردووە.

**یەکێکیان:** ((حديث عبدالله بن بريدة عن أبيه قال: سمع النبي(ﷺ) رجلا يدعو، ويقول: اللهم إني أسألك بأني أشهد أنك الله الذي لا إله إلا أنت، الأحد الصمد، الذي لم يلد ولم يولد ولم يكن له كفوا أحد. فقال: والذي نفسي بيده، لقد سأل الله باسمه الأعظم، الذي إذا دعي به أجاب و إذا سأل به أعطى)) ئیمامی "ترمذي" دەفەرموێت: فەرموودەیەکی سەحیحە.

ئەم دوعایە تەوەسولە بە خودا بەیەکتاپەرستی خودا، شایەتیدانی داواکەرە بە تاك و تەنهایی خودا، جێگیرکردنی سیفەتەکانی خودایە بە ئامازەی ناوی "الصمد" ئەم ناوە

وەك ئیبن عەباس لەسەر ماناكەی دەفەرموێت: ((ئەو زانایەی كە زانستەكەی كامڵ بووە، ئەو بەدەسەڵاتەی كە دەسەڵاتەكەی كامڵ بووە))، لە ریوایەتێكی تردا لە ئیبن عەباسەوە ((ئەو سەردارەی كە هەرچی جۆری سەردارییە تیایدا گەیشتۆتە كەماڵ))، ئەبو وائیل دەڵێت ((ئەو سەردارەی كە سەرداریكردنەكەی ناكۆتایە))، سەعیدی كوڕی جوبەیر دەفەرموێت ((ئەو كەسەی لە هەرچی سیفات و كردار و گوفتاردا گەیشتۆتە كەماڵ))، هەروەها بە نەرێكردنی لێكچواندن (التشبیه) و نموونانـدن (التمثیـل)ی نـاو و سیفەتەكانی خودای موتەعال بـە وتـنی (ولم یكـن لـه كفـوا أحـد)-هاوشـان و هاوتـا و هاوشێوەی بۆ نییە، ئەمەش بریتییـە لـە وەرگێـڕان و نمـایش كردنـی بـاوەڕی ئـەهلی سوننەت، سەرئەنجام تەوەسولكردن بە ئیمان -بە هەموو ئەوانەی ئاماژەیان پێدرا و شایەتیدان پێیان- بریتییە لە ناوی مەزنی خودای موتەعال (الإسم الأعظم).

فەرموودەی دووەمیان: ((حدیث أنس: أن رسول الله (ﷺ) سمع رجـلا یـدعو: أللـهم إنـي نسألك بأن لك الحمد، لا إله إلا أنت، المنان، بدیع السموات و الأرض، ذا الجلال و الإكرام، یاحي یا قیوم، فقال: لقد سأل الله باسمه الأعظم)) ئەمەش تەوەسولە بە ناو و سیفەتەكانی خودای موتەعال.

سورەتی "الفاتحة" دوو جۆر تەوەسـولی لـەخۆ گرتـووە، ئـەو دوانـەش: تەوەسـول بـە حەمد و سەنای خودا و شكۆمەند كردنی، لەگەڵ تەوەسول بۆ لای خودا بە بەندایـەتی كردنـی و یەكتاپەرسـتی، دواتـر و دوای ئـەو دوو وەسـیلەیە داوای گـرنگترین داوا و باشترین ویستراو دەكرێت كە بریتییە لە هیدایەت.

هاوشێوەی ئەمە، داواكەی پێغەمبەرە(ﷺ) كاتێك لە شەودا بـۆ نوێـژ هەڵدەسـتا و لـە خودا داوای دەكرد، ئیمامی بوخاری لە سـەحیحەكەیدا لـە ئـیبن عەباسـەوە ریوایـەتی كردووە ((أللهم لك الحمد، أنت نور السموات والأرض و من فیهن، و لك الحمد أنت الحق، ووعدك الحق، ولقاؤك حق، والجنة حق، والنار حق، والنبیون حق، والساعة حق، ومحمد حق، أللهم لك أسلمت وبك آمنت، وعلیـك توكلـت، وإلیـك أنبـت، وبـك خاصـمت، وإلیـك حاكمت، فاغفر لي ما قدمت و ما أخرت وما أسررت و ما أعلنت، أنت إلهي لا إله إلا أنت)) لێرەدا باسی تەوەسـول دەكـات بـە حەمـد و سـەنا لەسـەری و بەندایـەتی و ملكەچـی بۆی، پاشان داوای لێخۆشبوون (المغفرة)ی لێكرد.

## سورەتی "الفاتحة" والآكەری دەرگای یەكتاپەرستی

سوورەتی "الفاتحة" هەر سێ جۆرە یەكتاپەرستییەكە لەخۆ دەگرێت، كە هەرچی پێغەمبەرانە –علیهم الصلاة والسلام– لەسەری كۆكن.

یەكتاپەرستی دوو جۆرە: **جۆرێكیان** لە "زانست و باوەڕ" (**العلم و الإعتقاد**)دایە، **جۆرێكی تریان** لە "ویست مەبەست" (**الإرادة والقصد**)دایە، بە یەكەمیان دەوترێت: یەكتاپەرستی زانستی، بە دووەمیشیان دەوترێت: یەكتاپەرستی ویست و مەرام و مەبەست، ئەمەش بەهۆی وابەستەبوونی یەكەمیان بە "هەواڵ و مەعریفە"وە و دووەمیان بە "مەبەست و ویست"ەوە. ئەمەی دووەمیان دیسان دوو جۆرە: **یەكتاپەرستی لە پەروەردگاری خودادا (توحید في الربوبیة) لەگەڵ یەكتاپەرستی لە خوایەتی خودادا (توحید في الإلهیة)، ئەمە سێ جۆر لە یەكتاپەرستی.**

**یەكتاپەرستی زانست**: خولگەكەی بەدەوری جێگیركردنی سیفاتی كەماڵدا دەسوڕێتەوە، هەروەها نەرێكردنی چوواندن و نموونانەدن (التشبیه والتمثیل) و پاكڕاگرتنی خودا لە نەنگی و ناتەواوی، دوو شت بە پوختی و بە دووروودرێژی ئاماژە بەم جۆرەیان دەكەن:

**پوختەكەیان**: بریتییە لە جێگیركردنی ستایش"حمد" بۆ خودا–**سبحانه**–، دوورودرێژەكەش: بریتییە لە باسكردنی سیفەتی خوایەتی و پەروەردگاریی و بەزەیی و موڵك، ئەم چوار سیفەتە دەبنە خولگەی هەموو ناو و سیفەتەكانی خودای موتەعال.

لەئامێزگرتنی ستایش (حمد) بۆ ئەم جۆرەیان (یەكتاپەرستی زانست): ستایش مەدح و پیاهەڵدانی كەسی ستایشكراو (محمود) بە سیفاتی كەماڵ و جوانی و شكۆمەندی لەخۆ دەگرێت، لەگەڵ خۆشویستن و ڕازیبوون لێی و ملكەچ بوون بۆی، كەسێك نابێت بە ستایشكەر (حامد) گەر نەرێی سیفەتێكی ستایشكراو (محمود)ەكە بكات، یاخود پشت لە خۆشویستنی بكات و بۆی ملكەچ نەبێت، تا سیفاتی كەماڵی ستایشكراوەكە زۆرتربێت ستایشكردنەكەی تەواوتر دەبێت، تا سیفاتی كەماڵی كەمتر بێت ستایشكردنەكەی كەمتر دەبێت، بۆیە هەرچی ستایشە بۆ خودایە (الحمد لله) ستایشێك كە جگە لە خودا كەس ناتوانێت ئاماری بكات بەهۆی كەماڵ و زۆری سیفەتەكانییەوە، لەم پێناوەدایە هیچ یەكێك لە دروستكراوەكانی ناتوانن ئاماری ستایشی خودا بكەن، ئەمەش بەهۆی بوونی سیفاتی

کەماڵ و جوانیی و شکۆمەندییەوە کە جگە لەخۆی –سبحانه– کەس ناتوانێت بیانژمێرێت، خۆیە خودای موتەعال زەمی خواوەندەکانی بێباوەڕان دەکات و نەنگیان –بە داڕنینی سیفاتی کەماڵ لێیان– دەداتە پاڵ، عەیبداریان دەکات بەوەی نابیستن و نابینن، ئاخافتن ناکەن و ناتوانن هیدایەت بدەن، سوود و زیان نابەخشن، ئەمە سیفەتی خوای "جەهمی"یەکانە کە بتەکانی پێ عەیبدار کرا، سیفەتی بتەکانیان دایە پاڵ خودا، پاکی و بەرزی و شکۆمەندی بۆ خودا لەوەی ستەمکاران و ملپێچیکەران لەسەر ئەو دەڵێن، خودا لە ئیبراهیمەوە –دۆستی خۆی(خليل الله)– لە بەڵگە هێنانەوە بۆ باوکی دەگێڕێتەوە ﴿يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِى عَنكَ شَيْـًٔا ﴿٤٢﴾﴾ مریم:٤٢، گەر خودای ئیبراهیم بەو سیفەت و شێوە بووایە، ئازەر پێی دەوت: تۆش خوداکەت وەك خوداکەی منە، چۆن ئەوەی من بە خراپ دەزانی و داوام لێدەکەی نەیپەرستم؟ بەڵام لەگەڵ هاوەڵدانانی بۆ خودا ئازەر لە جەهمییەکان زیاتر خودای دەناسی، هەر بەو جۆرە بێباوەڕانی قورەیش لەگەڵ هاوەڵدانانیان بۆ خودا دانیان دەنا بە سیفاتی دروستکەر و بالابوونی ئەو لە دروستکراوەکانی، خودا دەفەرموێ ﴿ وَٱتَّخَذَ قَوْمُ مُوسَىٰ مِنۢ بَعْدِهِۦ مِنْ حُلِيِّهِمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ خُوَارٌ ۚ أَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّهُۥ لَا يُكَلِّمُهُمْ وَلَا يَهْدِيهِمْ سَبِيلًا ۘ ٱتَّخَذُوهُ وَكَانُوا۟ ظَٰلِمِينَ ﴿١٤٨﴾﴾ الأعراف: ١٤٨، گەر خودای بوونەوەر –سبحانه– بەو جۆرە بوایە ئەوا رەخنەیان لێ نەدەگیرا، ئاماژەکردن بە پووچیی خوایەتی ئەو پەرستراوە نەدەکرا.

گەر بوترێت: خودای موتەعال ئاخافتن لەگەڵ بەندەکانیدا ناکات.

دەوترێت: با، خودا ئاخافتنی لەگەڵ کردوون، هەندێکیان لە پشتی پەردەوە لەوەوە بۆ خودا و بەبێ هۆکار وەك موسا(عليه السلام)، هەیانە لەسەر زمانی فریشتەیەکی نێرراو، وەك پێغەمبەران، مرۆڤەکانی تر لەسەر زمانی پێغەمبەرانەوە ئاخافتنیان لەگەڵ خودا کردووە، کەلامی خۆی بۆ دابەزاندوون کە پێغەمبەران رایانگەیاندووە.

پێیان وتن: ئەمە ئەو کەلامەی خودایە کە ئاخافتنی پێکردووە و فەرمانمان پێکراوە بە نیوەی بگەیەنین، لێرەدا پێشینان دەڵێن: هەرکەس باوەڕی بەوە نەبێت کە خوا قسەکەر (متکلم)ە ئەوا باوەڕی بە پەیامی سەرجەم پێغەمبەران نییە، چونکە حەقیقەتی ئەو پەیامانە گەیاندنی کەلامی خودا بووە کە ئاخافتنی پێکردووە لەگەڵ بەندەکانیدا، ئەگەر

نەرێی کەلامی بکرێت ئەوا نەرێی پەیامی دەکرێت، خودا لە سورەتی "طـه" لەسەر "السامري" دەفەرموێت ﴿ فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُ خُوَارٌ فَقَالُوا هَٰذَا إِلَٰهُكُمْ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِيَ ﴿٨٨﴾ أَفَلَا يَرَوْنَ أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا ﴿٨٩﴾ ﴾ طـه: ٨٨ – ٨٩، گێڕانەوەی وتە (رجع القول) بریتییە لە ئاخافتن کردن، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا رَّجُلَيْنِ أَحَدُهُمَا أَبْكَمُ لَا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَيْءٍ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوْلَاهُ أَيْنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأْتِ بِخَيْرٍ هَلْ يَسْتَوِي هُوَ وَمَن يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٧٦﴾ ﴾ النحل: ٧٦، نەرێکردنی سیفەتی کەلامی کرد بە پووچی خواوەندیی، ئەمەش کارێکی زانراوە بە فیترەت و ژیری تەندروست و کتێبە ئاسمانییەکان: کەسی بێبەش لە سیفاتی کەماڵ نابێت بکرێت بە خودا و هەڵسوڕێنەر و پەروەردگار، بەڵکو ئەو کەسە زەمکراو و نەنگ و ناتەواوە، نە لە سەرەتا و یەکەمجارەوە، نە لە کۆتایی و دواجارەوە ستایشی بۆ نییە، ستایشی یەکەمجار و دواجار تەنها بۆ کەسێکە سیفاتی کەماڵ و جوانی و شکۆمەندی هەبێت کە لەو پێناوەدا شایستەی ستایشکردنە، بەو مەبەستە بووە پێشینان کتێبەکانیان –کە لەسەر سوننە دایان ناوە، یان لەسەر جێگیرکردنی سیفاتی پەروەردگار و بەرز و بڵندی لە دروستکراوەکانی، یان ئاخافتن کردنی خودا– ناوی "یەکتاپەرستی"یان لێناوە، چونکە نەرێکردنی یەکتاپەرستی و بێباوەڕی پێی، بێباوەڕییە بە دروستکەر (الصانع)، یەکتاپەرستی خودا بریتییە لە: جێگیرکردنی سیفاتی کەماڵی و پاکراگرتنی لە چواندن و ناتەواوی، پەکخەران (المعطلة) نەریْ کردنی سیفات و پەکخستنی دروستکەر لەو سیفەتانە بە یەکتاپەرستی ناو دەبەن، بە چواندن و بەرجەستەکردن و نموونادن (التشبيه، التجسيم، التمثيل) ئەو سیفەتانە بۆ خودا جێگیر دەکەن، بە ناوی حەق ناویان لە باتڵ نا بۆ پێدانی ڕەواج و رووکەش کردنی، بە ناوی باتڵیش ناوی حەقیان ناوە تاکو خەڵکی لە حەق دووربخەنەوە، زۆربەی خەڵکی رەخنەی رەخنەگرانەیان نییە ﴿ مَن يَهْدِ اللَّهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُ وَلِيًّا مُّرْشِدًا ﴿١٧﴾ ﴾ الكهف: ١٧، ستایشکراو لەسەر نەبوونی سیفات و بێدەنگی و نەبوونی کەلام ستایش ناکرێت، مەگەر نەرێی نەنگی و ناتەواوی لێ بکرێت و سیفەتی پێچەوانەی ئەو سیفاتی نەنگی و ناتەواوییە لەخۆ بگرێت لە کەماڵە جێگیرکراوەکان، ئەگینا دارنینی سیفەتە ناباشەکان لە خودا هیچ ستایش و پیاهەڵدان و کەماڵێکی بۆ خودا تێدا نییە.

ستایشی خودا بۆ خۆی لەسەر نەبوونی کوڕ: سەرداری و دەوڵەمەندی و خاوەن موڵکی و ملکەچبوونی هەموو شتێك بۆ خودا لەئامێز دەگرێت، هەبوونی کوڕ نەرێی

هەموو ئەوانە دەكات ﴿ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ وَلِىٌّ مِّنَ ٱلذُّلِّ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًۢا ﴿١١١﴾ ﴾ الإسراء: ١١١.

ستایش كردنی خۆی –سبحانە– لەسەر نەبوونی هاوەڵ تاك و تەنهایی ئەو لە پەروەردگاری و خوایەتی لەخۆ دەگرێت، هەروەها یەكتایی لە سیفاتی كەماڵ لەئامێز دەگرێت كە وەسفی كەسی تری پێناكرێت، چونكە كەسەكە دەبێتە هاوەڵی خودا، گەر سیفاتی كەماڵی خودا نەرێ بكرێت ئەو كات بوونەكانی تر لە بوونی خودا كاملترن، چونكە ئەوەی لە بووندایە كاملترە لەوەی لە نەبووندایە، بۆیە خودا –سبحانە– بە نەبوون (عدم)ی سیفات ستایشی خۆی ناكات، مەگەر ئەو نەبوونە جێگیربوونی كەماڵ لەخۆبگرێت، وەك ئەو ستایش كردنەی خۆ كە ئەو –سبحانە– كەسێكە نامرێت ﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْحَىِّ ٱلَّذِى لَا يَمُوتُ ﴿٥٨﴾ ﴾ الفرقان: ٥٨، ئەم نەرێكردنە لەئامێزگرتنی ژیانە بۆ خودا، ستایشی خۆی كردووە بەوەی وەنەوز و خەو نایباتەوە ﴿ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ﴾ البقرة: ٢٥٥، ئەمەش كەماڵی راوەستاوی و راگیری (قیومیة)ی خودای تیدایە، ستایش كردنی خۆ بەوەی گەردیلەیەك لە زەوی یان لە ئاسمان، گەورەتر و بچووكتر لە گەردیلەی لێ بزر نابێت ﴿ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَلَآ أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرَ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٦١﴾ ﴾ یونس: ٦١، ئەمەش كەماڵی زانست و ئابلۆقەدان لەخۆ دەگرێت، ستایشی خۆ بەوەی ستەم لە كەس ناكات كەماڵی دادپەروەری و چاكە لەخۆ دەگرێت ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ ﴾ النساء: ٤٠، ستایشی خۆ بەوەی بینین پەیی پێ نابات ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴾ الأنعام: ١٠٣، ئەمەش بۆ كەماڵی مەزنی و شكۆمەندی خودا دەگەڕێتەوە كە نابینرێت و پەی پێ نابرێت، هەر بەو جۆرە دەزانێت و هیچ زانست و زانینێك ئابلۆقەی خودای پێ نادرێت، تەنها نەرێی بینین مانای كەماڵ ناگەیەنێت، چونكە نەبوون (عدم)یش نابینرێت، لە نەبینراوی شتێك بە تەنها هەرگیز كەماڵی تێدا نییە، بەڵكو كاتێك كەماڵی تێدایە نە ببینرێت و نە پەی پێ ببرێت، بەهۆی مەزنی لە خودی خۆیدا و بالابوونی لەوەی دروستكراو پەی پێ ببات، هەر بەو جۆرە ستایش كردنی خۆ بە نەبوونی بێئاگایی و لەبیرچوون، بۆ كەماڵی زانستی خودا دەگەڕێتەوە.

هەرچی نەرێیە لە قورئاندا كە خودا ستایشی خۆی پێ كردووە بۆ جێگیركردنی دژەكانی ئەو نەرێكراوانەیە و بۆ لە ئامێزگرتنی كەماڵی جێگیركردنی دژەكانە. ئەوەت

زانی کە حەقیقەتی ستایش بەدوای جێگیرکردنی سیفاتی کەماڵدا دێت، نەرێکردنی سیفەتەکانی کەماڵ نەرێکردنی ستایشی خودایە، نەرێکردنی "ستایش"یش بەدوایدا دژی ستایش جێگیر دەکات.

## ۞ مانای ناوە جوانەکان نەرێ ناکەین

ئەمە بەڵگەیە لەسەر یەکتایی ناو و سیفەتەکانی خودا.

ئاماژەی پێنج ناوەکە لەسەر یەکتایی ناو و سیفاتی خودا کە (الله، والرب، والرحمن، والرحیم، والملك) لەسەر دوو بنچینە بونیادنراون:

**یەکەمیان:** ناوی "الرب" تبارك و تعالی ئاماژەیە لەسەر سیفاتی کەماڵی خودا، ئەو ناوە لە سیفات داتاشراوە، بۆیە هەم ناوە و هەم وەسفە، بەوەش بووە بە ناوی باش و جوان (الحسنی)، گەر وشەگەلێك بوونایە مانایان تێدا نەبووایە باش و جوان (حسنی) نەدەبوون و ئاماژەشیان بە مەدح و کەماڵ نەدەکرد، ئەوکات دانانی ناوی تۆڵەسەندنەوە (الإنتقام) و تووڕەیی (الغضب) لە جێگەی شوێنی بەزەیی (الرحمة) و چاکە (الإحسان) وەك یەك وابوون و بەپێچەوانەشەوە، ئەو کاتە دەوترا (**أللهم إني ظلمت نفسي فاغفر لي إنك أنت المنتقم، واللهم أعطني فإنك أنت الضار المانع**)، هەر بەو جۆرە.

نەرێکردنی مانای ناوە جوانەکانی خودا گەورەترین لادانە تیایاندا، خوا دەفەرموێت ﴿وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ الأعراف: ١٨٠، هەروەها لەبەر ئەوەی گەر ئەو ناوانە ئاماژەیان بە مانا و وەسف نەکردبایە دروست نەبوو هەواڵی لەمەڕ چاوگەکانیان بدابایە و خۆی پێ وەسف بکردبایە، بەڵام خودا هەواڵی داوە دەربارەی خۆی بە چاوگەکانی ئەو ناوانە، خۆی و پێغەمبەرەکەی جێگیری کردوون، وەك ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ﴾ الذاريات: ٥٨، زانرا کە "القوي" لە ناوە جوانەکانی خودایە، ماناکەی وەسفکراو بە هێز (الموصوف بالقوة)، هەروەها ﴿فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا﴾ فاطر: ١٠، عەزیز کەسێکە عیززەتی هەبێت، گەر جێگیرکردنی هێز و عیززەت نەبوایە بۆ خودا ناوی بەهێز و عەزیزی لێ نەدەنرا، بە هەمان شێوە ئایەتەکانی ﴿أَنزَلَهُۥ بِعِلْمِهِۦ﴾ النساء: ١٦٦ ﴿أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلْمِ ٱللَّهِ﴾ هود: ١٤.

لە فەرموودەی سەحیحدا لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ((**إن الله لا ينام، ولا ينبغي له أن ينام، يخفض القسط و يرفعه، يرفع إليه عمل الليل قبل النهار، وعمل النهار قبل الليل، حجابه**

النور، لو كشفه لأحرقت سبحات وجهه ماانتهى إليه بصره من خلقه))، فەرموودەكە ئەو چاوگەی جێگیركرد (بصر) كە ناوی "البصير"ی لێداتاشراوە.

لە سەحیحی بوخاریدا لە عائشەوە-خوای لێ رازی بێت- ((الحمد لله الذي وسع سمعه الأصوات))

لە سەحیحدا فەرموودەی ئیستیخارە ((أللهم إني أستخيرك بعلمك، وأستقدرك بقدرتك)) ئەو "قادر"-بالآدەستە بەهۆی "قدرة"ەوە.

خوای موتەعال بە موسا پێغەمبەر دەفەرموێت ﴿إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي﴾ الأعراف: ١٤٤، ئەو-سبحانه- قسەكەر (متكلم)ە بە "كەلام".

خودا مەزن"العظيم"ە، چونكە مەزنیی"العظمة"ی هەیە، لە فەرموودەی سەحیحدا لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ((يقول الله تعالى: العظمة إزاري، والكبرياء ردائي))، ئەو حەكیمە چونكە خاوەنی حوكمە ﴿فَٱلۡحُكۡمُ لِلَّهِ ٱلۡعَلِيِّ ٱلۡكَبِيرِ﴾ غافر: ١٢، موسڵمانان كۆ دەنگن لەسەر ئەوەی ئەگەر كەسێك بە ژیانی خودا، یان بیستنی، یان بینینی، یان هێزی، یان عیززەتی، یان مەزنی سوێند بخوات سوێنەكەی دروستە و جێگیربووە و لەبارێكدا سوێندەكەی راست نەبێت دەبێت كەفارەتی بدات، چونكە ئەمانە سیفاتی كەماڵی خودان و ناوەكانیان لێوە داتاشراوە.

بیسان: گەر ناوەكانی خودا مانا و سیفاتیان لەئامێز نەگرتبایە گونجاو نەبوون هەواڵ لەمەڕ خودا بدەن بە فرمان(فعل)ەكانیان (واتە بە فرمانە داتاشراوەكان لەو ناوانە)، ئەو كاتە نەدەوترا: خودا دەبیستێ و دەبینێ و دەزانێ و تەقدیر دەكا و دەیەوێ، جێگیركردنی حوكمی سیفەتەكان وابەستەی لقێكە لە جێگیركردنی ناوەكانی، گەر بنچینە و سەرچاوەی سیفەتەكە (واتە ناوەكان) نەرێ كران ئەو كات ناتوانرێت حوكمی سیفەتەكان جێگیر بكرێن.

هەروەها گەر ناوەكانی خاوەن مانا و وەسف نەبوونایە ئەوا ناوی جامد دەبوون وەك ناوە تایبەتەكان (الأعلام) كە دانەنراون بۆ ناولێنراوەكان بەهۆی ماناكەیەوە كە پێی هەڵدەستن، بۆیە هەموویان یەكسان دەبوون، جیاوازی لە ئاماژەبۆكراوەكانیاندا نەدەبوو، ئەمەش لوتبەرزییەكی ئاشكرایە و بوختانێكی روونە. ئەو كەسەی مانای ناوی "القدير" دەكات بە مانای ناوی "السميع و البصير" و مانای ناوی "التواب"

دەكات بە مانای ناوی "المنتقم" و مانای ناوی "المعطي" دەكات بە مانای ناوی "المانع" ئەوە لەڕووی ئەقڵ و زمان و فیترەتەوە لوتبەرزی نوواندووە.
بۆیە نەریّ كردنی مانای ناوەكانی گەورەترین لادانە لە ناوەكان.

## ۞ پێویستی تێگەیشتن لە پێویستییەكانی سیفاتە

**بنچینەی دووەم:** هەر ناوێك لە ناوە جوانەكانی خودا –تبارك و تعالى– وەك چۆن ئاماژە بە زات و سیفەت دەكات كە لێی داتاشراوە بە پڕاوپڕی ماناكەی، هەر بەو جۆرە دوو ئاماژەی تر دەگەیەنێت ئەوانەش "لەئامێزگرتن و پێویستبوون"ن، بە لەئامێزگرتن: ئاماژە بە سیفەت دەكات و هەر بەو جۆرە ئاماژە دەدات بە زاتی خودای موتەعال بەبیّ سیفەت، هەروەها ئاماژە بە سیفەتێكی تر دەدات بە "پێویستوون". بۆ نموونە ناوی "السميع" ئاماژە بە زات و بیستنی پەروەردگار دەكات بەپڕاوپڕی مانا، هەروەها ئاماژە دەكات بە زات بە تەنها و بە بیستن بەتەنها، دواتر ئاماژە بە ناوی "الحي" و سیفەتی "الحياة" دەدات بە لەئامێزگرتن (چونكە گەر زیندوو نەبێت ناتوانێت ببیستێت)، هەر بەو جۆرە تەواوی ناو و سیفەتەكانی تری خودای موتەعال.
بەڵام خەڵكی لەمەڕ ناسینی "پێویستبوون" و "ناپێویستبوون" ئاستیان جۆراوجۆرە، لێرەوە جیاوازی دەكەوێتە نێوانیانەوە لە زۆرێك لە ناو و سیفات و ئەحكامدا، ئەو كەسەی كە دەزانێت ئەنجامدانی كرداری ئازادانە پێویستیی زیندەگییە، هەروەها بیستن و بینین پێویستیی زیندەگییەكی كامڵە و تەواوی كەماڵاتی تر لە پێویستییەكانی زیندەگییەكی كامڵەوە سەرچاوە دەگرن: ئەوا ئەو كەسە لە ناوی خودا و سیفات و كرداری شتێكی جێگیر كردووە كە هەر كەس ئەو پێویست بوونە نەزانێت و حەقیقەتی زیندەگی و پێویست بوون پەی پیّ نەبات نەریّی دەكات، هەر بەو جۆرە هەموو سیفەتەكانی تری.
ناوی "العظيم" كۆمەڵێك پێویستبوونی بۆ هەیە كە هەر كەس مەزنی خودا نەناسێت نەرێیان دەكات.
هەروەها ناوی "العلي" و ناوی "الحكيم" و هەموو ناوەكانی تر، لە پێویستییەكانی ناوی "العلي" بوونی بالابوونی رەهایە (العلو المطلق) بە هەموو شێوەیەك، ئەو–سبحانه– لە

هەموو رووبەكەوە بالآبوونی رەهای هەیە: بالآبوونی قەدەر، بالآبوونی زالْی، بـالآبوونی خود، هەر كەس بالآبوونی رەهای نەرێ كرد ئـەوا پێویسـتبوونەكانی نـاوی "العلـي"ی نەرێ كردووە.

بە هەمان شێوە ناوی "الظاهر" لە پێویسـتییەكانی: ئەوەیـە هـیچ شـتێك لەسـەریەوە نەبێت، وەك لە فەرموودەی سـەحیحدا لـە پێغەمبـەرەوە دەگێڕنـەوە ((وأنـت الظـاهر فلیس فوقك شيء))، بەڵكو ئەو-سبحانه- لەسەرو هەموو شتێكەوەیە، هەر كەس نەرێی "سەروو"بوونی خودا بكات ئەوا نەرێی پێویستی نـاوی "الظـاهر"ی كـردووە، دروسـت نییـە "الظـاهر" تـەنها بـریتی بێـت لـە سـەروبوونی قـەدر و گـەورەیی، وەك چـۆن دەوترێت: زێـڕ لەسـەروو زیوەوەیـە، گەوهـەر لـە سـەروو شووشـەوەیە.. چـونكە ئـەو سەروبوونەی خودای موتەعالە پەیوەستە بـە دەركـەوتن (الظهـور)ەوە، بـەڵكو بـۆی هەیە سەرخراوەكە(المتوفق) ئاشكراتر بێت لە سەرخەرەكە(الفـائق)، دروسـتیش نییـە تەنها دەركەوتنی زالْی و داگیركردن بێـت، بـا خـودا-سـبحانه- دەركـەوتبێت بـە زالْـی (قهر) و سەركەوتن، لەبەر بەرانبەربوونی ناوەكە بـە نـاوی "البـاطن" كـە بریتییـە لـەو كەسەی كەس لە خوار ئەوەوە نییە، وەك چۆن ناوی "الأول" كە كەس لە پێشـییەوە نییە بەرانبەرە بە ناوی "الآخر" كە كەس لە دوایەوە نییە.

هەر بەو جۆرە ناوی "الحكیم" لە پێویستییەكانی جێگیركردنی ئامانجی ستایشـكراو و مەبەستدارە بۆ خودا بە كردارەكانی و دانانی شتەكان لە جێگەی خۆیاندا و روودانیان بە جوانترین شێوە، نەرێكردنی ئەمانـە نـەرێكردنی ئـەم نـاوە و پێویسـتییەكانییەتی، هەر بەو جۆرە تەواوی ناوە جوانەكانی خودا.

### ✿ ئاماژەی ناوی (الله) بەسەر تەواوی ناوە جوانەكانی خوداوە

كە ئەم دوو بنچینەیە بڕیاریان لەسەر درا و جێگیركران، ئەوا ناوی "الله" ئاماژەیـە بـۆ تەواوی ناوە جوانەكانی خودا و سیفەتە بەرزەكانی بە سێ ئاماژە، ئەم ناوە ئاماژەیـە بۆ خوایەتی كە جێگیربوونی سیفاتی خوایـەتی لـەئامێز دەگرێـت، لەگـەڵ نـەرێكردنی دژەكانیان (دژی ئەو سیفاتانە) لە خودا.

**سیفاتی خوایەتی:** بریتین لە سیفاتی كەماڵ، پاك وبێگەردی لە چوواندن و نموونانـدن (التشبیه و المثال) و نەنگی و ناتەواوی، بۆیە خودای موتەعال تـەواوی نـاوە جوانـەكانی

تری دەداتە پاڵ ئەو ناوە، وەك ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ﴾ الأعراف: ١٨٠، بۆ"الله" ناوی جوان هەیە، دەوترێت ((الرحمن و الرحيم، والقدوس والسلام، والعزيز و الحكيم)) لە ناوە جوانەكانی ((الله))ن، ناوترێت ((الله)) لە ناوەكانی ((الرحمن))ە، یان لە ناوەكانی ((العزيز))ە، ئیتر بەو جۆرە.

زانرا كە ناوی ((الله)) بۆ مانای تەواوی ناوە جوانەكان پێویستە، ئاماژەیە بۆ سەریان بەگشتی، ناوە جوانەكانیش درێژەپێدان و روونكردنەوەیە بۆ سیفاتی خوایەتی (صفات الإلهية) كە ناوی ((الله)) لەو سیفاتانە داتاشراوە، ناوی ((الله)) ئاماژەیە بەوەی كە خودا پەرستراوە (معبود) و جێی ئومێد و دڵدە و هەڵهاتنی بەندەكانییەتی بۆ لای، واتە (مألوه)ە، دروستكراوەكان كردوویانە بە "إله" لە خۆشەویستی و بە مەزن زانین و ملكەچی و فەرمانبەرداریییەوە، هەروەها هەڵهاتن بۆ لای لە كاتی ترس و پێویستییەكاندا، ئەمەش پێویستیی كەماڵی پەروەردگاری و بەزەیی خودایە كە هەردوو سیفەتەی "موڵك و حەمد" لەئامێز دەگرن، خوایەتی خودا(الحمد لله) و پەروەردگاری خودا(رب العالمين) و بەزەیی خودا(الرحمن الرحيم) و موڵكی خودا(مالك يوم الدين) تەواوی سیفاتی كەماڵیان بەدوادا دێت، چونكە ئەو چوارە جێگیر ناكرێن بۆ كەسێك زیندوو (الحي)، و بیسەر (السميع) و بینەر (البصير) و بەتوانا (القادر) و قسەكەر (المتكلم) و بكەر (الفاعل)ی ئەو شتە نەبێت كە دەیەوێت و هەروەها لە كار و فرمانەكانیدا دانا نەبێت.

سیفاتی شكۆمەندی و جوانی (الجلال و الجمال): تایبەتمەندیترین سیفەتن بۆ ناوی ((الله)).

سیفاتی كار و توانین و تەنهابوون بە زیان و قازانج گەیاندن و بەخشین و لێگرتنەوە و جێبەجێ كردنی ویست و كەماڵی دەسەڵات و بەڕێوەبردنی كاروباری دروستكراوەكانی هەموو ئەمانە لە تایبەتمەندی ناوی ((الرب))ن.

سیفاتی چاكە و بەخشندەیی و بەزەیی و بەخشین و میهرەبانی تایبەتمەندی ناوی ((الرحمن))ن، چەند بارەی كردوونەتەوە بۆ جێگیركردنی وەسفەكە و بەدەستهێنانی كاریگەری و وابەستەبوونی بە وابەستەبوونەكانەوە.

الرحمن: كەسێكە كە بەزەیی (الرحمة) وەسفەكەیەتی. الرحيم: بەبەزەیی بۆ بەندەكانی. بۆیە دەفەرموێت ﴿وَكَانَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَحِيمٗا﴾ الأحزاب: ٤٣، ﴿إِنَّهُۥ بِهِمۡ

رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾ التوبة: ١١٧، دەربڕینی "الرحمن بعباده" لە قورئاندا نەهاتووە، هەر بەو جۆرە "الرحمن بالمؤمنين" نەهاتووە، لەگەڵ ئەوەی ناوی "الرحمن" کە لەسەر کێشی (فعلان)ە تەواوی وەسفی بەزەیی (الرحمة) لەخۆ دەگرێت و هەرچی مانای بەزەییە کە خودا پێ وەسف بکرێت لەئامێزیدایە.

ـبینی دەڵێن: "غضبان" پڕبوو بە تووڕەیی "غضب"، هەروەها "ندمان و حیران و سكران و لهفان" بۆ کەسێك بەکاردەهێنرێت بەو سیفەتانە پڕبووبێت، چونکە بونیادی کێشی (فعلان) بۆ بەرینی و گرتنەخۆ و گشتگیرییە، بۆیە دەستگرتنی بەسەر عەرشدا ـند جار بەم ناوە (الرحمن) دەردەبڕێت، وەك ﴿عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ﴾ طه: ٥، هەروەها ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱلرَّحْمَـٰنُ﴾ الفرقان: ٥٩، خودای موتەعال بە ناوی "الرحمن" ـەسەر عەرشەکەی ئیستیوای (الإستواء)ی کردووە، چونکە عەرشی خودا ئابلۆقەی ـەولوی دروستکراوەکانی داوە، لەئامێزی گرتوون، بەزەیش ئابلۆقەی دروستکراوەکانی ـوە و بەسەریاندا پەخش بووتەوە ﴿وَرَحْمَتِى وَسِعَتْ كُلَّ شَىْءٍ﴾ الأعراف: ١٥٦، ـەستی بەسەر فراوانترین دروستکراو (العرش)دا گرتووە بە فروانترین سیفەتی خۆی الرحمن)، بۆیە بەزەیی خودا هەموو شتێکی گرتووەتەوە، لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە لە ئەبی هورەیرەوە –رضي الله عنه– ((قال: قال رسول الله –صلى الله عليه و سلم–: لما قضي الله الخلق كتب في كتاب، فهو عنده موضوع على العرش، إن رحمتي تغلب غضبي)) لە دەربڕینێکی تردا ((فهو عنده على العرش)).

تێرابمێنە لە تایبەتمەندی ئەو نووسراوە (الكتاب) بە ناوهێنانی بەزەیی (الرحمة)، ئەو کاتە ئەوە لەگەڵ ئایەتی ﴿عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ﴾ طه: ٥، هەروەها ئایەتی ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱلرَّحْمَـٰنُ فَسْـَٔلْ بِهِۦ خَبِيرًا﴾ الفرقان: ٥٩، بەراورد پێ بکە دەرگایەکی مەزن ـە ناسینی خودا–تبارك و تعالى– بەڕووتدا دەکرێتەوە.

سیفاتی (العدل و القبض و البسط و الخفض و الرفع و العطاء و المنع و الإعزاز و الإذلال و القهر و الحكم و هەتا دوایی..) تایبەتن بە ناوی "الملك"، ئەو سیفەتانەی تایبەت کراوە بە ڕۆژی دوایی و دادگای خودایی، کە پاداشت و سزایە بە دادپەروەرانە، ـەبەر تەنهابوون و تایبەت بوونی بە دادگایی کردنی بەندەکانی لەو ڕۆژەدا و لەبەر ئەوەی ڕۆژێکی دروست و ڕەوایە و ئامانجی کۆتاییە و ڕۆژەکانی دونیا قۆناغی گەیشتنن بەو ئامانجە.

## ۞ مانای پەروەردگار (الرب) و رەحمان (الرحمن)

سەرنجی پەیوەندی بوون و بڕیار (الخلق والأمر) بدە بەو سێ ناوەوە کە بریتین لە (الله، الرب، الرحمن) چۆن دروستکراوەکان و ئەمر و پاداشت و سزایان لێوە پەیدابووە؟ چۆن دروستکراوەکانی کۆکردۆتەوە و بڵاوەی پێکردوون؟ کۆکردنەوە(الجمع) بۆ ئەوە و بڵاوەپێکردن (الفرق)یش هەر بۆ ئەوە.

ناوی پەروەردگار (الرب) کۆکەرەوەی کۆکەرەوەکانی سەرجەم دروستکراوەکانە، ئەو پەروەردگار و دروستکەری هەموو شتێکە، دەسەڵاتی بەسەریاندا هەیە و هیچ شتێك لە دەستی پەروەردگاریی (الربوبیة) ئەو دەرناچێت، هەرچی لە ئاسمان و زەویدایە بەندەی ئەون و لەناو لەپی دەستی ئەودان و لەژێر زاڵی(القهر) خودای موتەعالدان، بە سیفەتی پەروەردگاریی (الربوبیة) کۆبوونەتەوە و بە سیفەتی خواوەندی (الإلهیة) جیابوونەتەوە، تەنها خۆشبەختەکان کردوویانە بە "إله" و ملکەچانە دانیان بەوەدا ناوە کە ئەو "الله"یە و هیچ خودایەکی تر جگە لە ئەو بوونی نییە، بەندایەتی و پشتبەستن بە خودا و هیوا و ترس و خۆشەویستی و ملکەچی و گەڕانەوە و پڕبوون بە خۆشەویستی و ترس و چوونە ژێر باری فەرمانەکان تەنها بۆ خودایە.

لێرەوە خەڵکی جیاوازی کەوتۆتە نێوانیان و بوون بە دوو دەستە: دەستەیەکی هاوەڵدانەر لە دۆزەخدا، لەگەڵ دەستەیەکی یەکتاپەرست لە بەهەشتدا، خواوەندیی (الإلهیة) لەیەکتر جیای کردوونەتەوە، وەك چۆن پەروەردگاریی (الربوبیة) کۆی کردوونەتەوە.

ئایین و شەرع و ئەمر و نەهی -ڕوواڵەت و ڕاوەستانی- لە سیفەتی خواوەندیی (الإلهیة)ن، دروستکردن و هێنانەبوون و کارهەڵسوڕاندن و کارئەنجامدان لە سیفەتی پەروەردگاریی (الربوبیة)ن، پاداشتی چاکە و سزادان و بەهەشت و ئاگر لە سیفەتی "الملك"ن، ئەو مەلیکی ڕۆژی دواییە، بە خواوەندی فەرمانی پێکردوون، بە پەروەردگاری یارمەتیداون و کۆمەکی کردوون و هیدایەتی داون و گومڕای کردوون. بە موڵکداری و دادپەروەری پاداشت و سزای بۆ دەرکردوون، هەریەك لەمانە لەوانی تر دانابڕێت.

بەزەیی (الرحمة): بریتییە لە هۆ و دەستپێوەگیراوی نێوان خودا و بەندەکانی، بە "إله"کردنە لە بەندەکانەوە بۆ ئەو-سبحانە-، پەروەردگاریش لە خوداوەوە-سبحانە-

بۆ ئەوان، بەزەیش هۆی گەیاندنە لەنێوان خودا و بەندەكانیدا، بەو بەزەییە پێغەمبەرانی رەوانە كردووە و كتێبەكانی بۆ دابەزاندوون، بەو بەزەییە هیدایەتی داون و لە خانەی پاداشتدا (بەهەشت) نیشتەجێی كردوون، بە بەزەیی رۆزی داون و تەندروستی پێبەخشیون و بەهرەكانی خۆی بەسەردا باراندوون، لەنێوان بەندەكان و خودادا هۆی بەندایەتی هەیە، لەنێوان خودا و بەندەكانیدا هۆی بەزەیی هەیە.

نزیكبوونەوەی پەروەردگاریی لە بەزەیی وەك نزیكبوونەوەی دەست بەسەرداگرتنی عەرش وایە بە بەزەیی، بۆیە ﴿عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ﴾ پراوپرە لەگەڵ ﴿رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، گشتگیری و فروانی پەروەردگاریی (الربوبیة) –بەجۆرێك هیچ شتێكی لێ دەرنەچێت– داوای گشتگیری و فراوانی بەزەیی دەكات، بەبەزەیی و پەروەردگاریی هەرچی شتە داگیری كردووە، لەگەڵ ئەوەی كە "رب العالمین" ئاماژەی ئەوەی تێدایە كە خودا باڵایە لە دروستكراوەكانی و لە سەروو هەموو شتێكەوە كە روونكردنەوەكەی بە پشتیوانی خودا دواتر دێت.

### ۞ ستایشكراو (المحمود)

بە ناوهێنانی ئەم ناوانە(الله، رب، الرحمن، الرحیم، الملك) لەدوای "حمد" و بوونی ناوەرۆك و داواكارییەكانی ئەو ناوانە لە "حمد"دا ئاماژە دەكات بەوەی خودا لە "خواوەندی و پەروەردگاری و بەزەیی و موڵكدا "دا ستایشكراوە، خودا(إلـە)یێكی ستایشكراوە، پەروەردگارێكی ستایشكراوە، رەحمانێكی ستایشكراوە، مەلیكێكی ستایشكراوە، بەوەش هەرچی بەشەكانی كەماڵە بۆ خودایە، كەماڵ بە تەنها بۆ ئەوە لەو ناوەدا، كەماڵ لە ناوەكانی تردا، هەروەها كەماڵ لە نزیكبوونەوەی هەر یەكێكیان (ناوێكیان) لەوی تریان.

نموونەی ئەوە: خودا دەفەرموێت ﴿وَٱللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ التغابن: ٦، ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ النساء: ٢٦، ﴿وَٱللَّهُ قَدِيرٌۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ الممتحنة: ٧، دەوڵەمەند (غنی) سیفەتی كەماڵە، هەر بەو جۆرە ستایش (حمد) سیفەتی كەماڵە، نزیكبوونەوەی دەوڵەمەندی لە ستایش دیسان كەماڵە. زانستی خودا كەماڵە و حیكمەتی خوداش كەماڵە، نزیكبوونەوەی زانست لە حیكمەت دیسان سیفەتی كەماڵە. دەسەڵاتی خودا كەماڵە، لێخۆشبوونی كەماڵە، نزیكبوونەوەی دەسەلات لە لێخۆشبوون دیسان سیفەتی كەماڵە،

هەر بەو جۆرە لێبوردن لە دوای دەسەڵات ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا﴾ النساء: ١٤٩، هەر بەو جۆرە نزیكبوونەوەی زانست لە حیلم ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ﴾ النساء: ١٢.

هەموو ئەوانەی دەسەڵاتیان هەیە نابوورن، هەموو ئەوانەش دەبوورن لە دەسەڵاتەوە نابوورن، هەموو ئەوانەی دەزانن حەلیم نین، هەموو حەلیمیكێش زانا نییە، هیچ شتێك نزیك نەبووتەوە لە شتێكی تر جوانتر بێت لە نزیكبوونەوەی حیلم لە عیلم، هەروەها لە نزیكبوونەوەی لێبووردن لەكاتی دەسەڵاتدا، هەر بەو جۆرە لە نزیكبوونەوەی موڵك لە ستایش (حمد) و لە نزیكبوونەوەی عیززەت لە بەزەیی ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ الشعراء: ٩، لێرەدا مەسیح(عليه السلام) لەرۆژی دواییدا بە خودا دەفەرموێت ﴿إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١١٨﴾﴾ المائدة: ١١٨. ئەم دەربڕینەی مەسیح(عليه السلام) چاكترە لەوەی بڵێت: گەر لێیان دەبووری ئەوە خۆت لێخۆشبوو و خاوەن بەزەیت بە بەندەكانت (وإن تغفر لهم فإنك أنت الغفور رحيم)، لە ئایەتە پیرۆزەكەدا ئەوە دەگەیەنێت: گەر لێیان خۆش ببیت ئەوا لێخۆشبوونەكەت لە عیززەتەوەیە كە كەماڵی دەسەڵاتی خودایە، هەروەها لێخۆشبوونەكەت لە حیكمەتەوەیە كە بریتییە لە كەماڵی زانست (علم)، هەركەس لە دەستەوسانی و نەتوانین و نەزانینەوە لە تاوانی تاوانبار خۆش ببێت نابێتە "قادر و حكیم و علیم"، بەڵكو ئەو كارەی هیچیتر نییە جگە لە بێتوانایی و دەستەوسانی، تۆ نابووری تا توانای تەواو و زانستی تەواوت نەبێت، هەروەها خاوەنی حیكمەتێك نەبیت كە شتەكانی لە شوێنی خۆی پێ دابنێیت، ئەم دەربڕینەی مەسیح(فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ) لەم جێگەدا جوانتر و كامڵترە لە وتنی ((الغفور الرحيم))، لەم شوێنەدا بەنهێنی ئاماژە بەوە دراوە كە داوای لێخۆشبوونەكە لە كاتی خۆیدا نییە و گوزەری كردووە و تێپەڕیوە، گەر بویتبایە (وإن تغفر لهم فإنك أنت الغفورالرحيم) لەمەدا داوای سۆز و لێخۆشبوونێك بەنهێنی و شاراوەیی بۆ كەسانێك بوونی هەیە كە شایستەی نین، ئەمەش لە پلە و پایەی مەسیح(عليه السلام) بەدوورە، بەتایبەت هەڵوێستەكە هەڵوێستی مەزنی و شكۆ و گەورەیی خودایە، هەڵوێستی تۆڵەیە لەوانەی كوڕیان بۆ خودا بڕیاردا و مەسیحیان كرد بە خودایەك لەخوار خوداوە، بۆیە ناوهێنانی عیززەت و حیكمەت شیاوترە پێی تا ناوهێنانی بەزەیی و لێخۆشبوون، ئەمە بە پێچەوانەی داواكەی

ـیبراهیم (ﷺ) كە دەفەرمویت ﴿وَٱجۡنُبۡنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعۡبُدَ ٱلۡأَصۡنَامَ ٣٥ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضۡلَلۡنَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِۖ فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُۥ مِنِّيۖ وَمَنۡ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٣٦﴾ إبـراهیم: ٣٥-٣٦، ـیفەرموو: (فإنك عزيز حكيم)، چونكە هەڵوێستەكە هەڵوێستی داوای بەزەییە و بەنهێنی ـوای لێخۆش بوونە لـە ڕێگـەی نزاكەیـەوە، واتـە گـەر لێیـان خـۆش ببیـت و ڕەحمیـان پێبكەی بەوەی كۆمەكیان بكەی لە گەڕانەوەی هاوەڵدانان بـۆ یەكتاپەرستی، هـەروەها گێڕانەوەیان لە یاخیبوونەوە بۆ گوێڕایەڵی خۆت، وەك لـە فـەرموودەدا هـاتووە ((اللـهم غفر لقومي فإنهم لا يعلمون)).

ـەمەدا ڕۆشنترین بەڵگە بوونی هەیە لەسەر ئەوەی كە ناوەكـانی خـودای موتـەعال لـە وەسف و ماناگەلێك داتاشراون بە خوداوە ڕاوەستاون، و هـەر ناوێـك گونجـاوە لەگـەڵ ئەوەی بۆی باسكراوە و لێی نزیك بووەتەوە لە كـردار و بڕیارەكـانی، خـودا كۆمـەك و ـزمەتیدەرە بۆ ڕاستی و دروستی.

۞ ۞ ۞

## ئاستەكانی هیدایەت

ئاستەكانی هیدایەتی گشتی و هیدایەتی تایبەت دە ئاستن:

۞ **یەكەمین ئاست:** ئاخافتنی خودایە لەگەڵ بەندەكەیدا لە ئاگاهیدا بەبێ بوونی هۆكار لە نێواندا، بەڵكو راستەوخۆ لە خوداوە بۆ بەندەكەی، ئەمەیان بەرزترین ئاستی هیدایەتە، وەك چۆن خودا ئاخافتنی لەگەڵ موسای كوڕی عمران كرد-صلوات الله وسلامه عليه و على نبينا- خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيْمَٰنَ ۚ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿١٦٣﴾ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَٰهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ ۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾﴾ النساء: ١٦٣-١٦٤، لە سەرەتای ئایەتەكەوە باسی وەحی خۆی كرد بۆ نوح و ئەو پێغەمبەرانەی بەدوایدا هاتن، پاشان موسای جیاكردەوە بەوەی ئاخافتنی لەگەڵدا كردووە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە ئاخافتن (تكليم) كە لەگەڵ موسادا كراوە تایبەتترە لە وەحی بەگشتی كە لە سەرەتای ئایەتەكەوە ئاماژەی پێدراوە. پاشان ئاخافتنەكەی بە چاوگێكی راستەقینە دووپات كردەوە ئەویش چاوگی فرمانی "كلم"یە كە بریتییە لە "تكليم"، بۆ ئەوەی ئەو وەهمەی پەكخەران و جەهمییەكان و موعتەزیلە و كەسانی تریش بڕەوێنێتەوە كە دەڵێن ئاخافتنەكە بریتی بووە لە ئیلهام، یان ئاماژە (إشارة) یان پێناسە بۆ مانایەكی دەروونی بە شتێك جگە لە ئاخافتن، دووپاتی كردۆتەوە بە چاوگێك (المصدر) كە دەستەبەركردنی حەقیقەت و ڕەواندنەوەی مەجاز دەگەیەنێت، "الفراء"دەڵێت: "عەرەب هەموو ئەوەی بە مرۆڤ دەگات بە كەلام ناو دەبات بە هەر ڕێگەیەك گەیشتبێت، بەڵام بە چاوگ دووپاتی ناكاتەوە، كە بە چاوگ دووپاتی كردەوە هیچ مانایەكی تر ناگەیەنێت جگە لە حەقیقەتی ئاخافتن، وەك ویست"الإرادة" دەوترێت فلان "أراد إرادة" مەبەستیان حەقیقەتی ئیرادەیە، هەروەها دەوترێت "أراد الجدار" دیوارەكە دەیەوێت، بەدوایدا نالێن "إرادة"، چونكە ویستنەكە مەجازە و حەقیقی نییە" تا ئێرە قسەی "الفراء"بوو. خودای موتەعال دەفەرموێت: ﴿ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِىٓ أَنظُرْ إِلَيْكَ ﴾ الأعراف: ١٤٣، ئەم ئاخافتنە ئەو ئاخافتنەی یەكەم نییە كە

خودا رەوانەی كرد بۆ لای فیرعەون، لەم ئاخافتنی دووەمەدا داوای تەماشاكردنی كرد. نەك لە یەكەمیاندا، لەمەیاندا ئەلواحی تەوراتی پێدرا، ئەوەش لە دانانی مەوعیدێكەوە بوو لە خوداوە بۆ ئەو، ئاخافتنی یەكەم لەسەر مەوعیدی نێوانیان بوو، قورئان دەفەرموێ:﴿ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي ﴾ الأعراف: ١٤٤، (بكلامي) واتە بە ئاخافتنی من لەگەڵ تۆ، ئەم بۆچوونەش بە كۆدەنگی پێشین. خودای موتەعال هەواڵی داوە لە قورئاندا كە بانگی لێكردووە و ئاخافتنی لەگەڵ كردووە (ناداه و ناجاه) ﴿ وَنَٰدَيۡنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنِ وَقَرَّبۡنَٰهُ نَجِيّٗا ﴾ مريم: ٥٢ بانگلێكردن (ناداه) بۆ دووره ئاخافتن(ناجاه) بۆ نزیكە. لە فەرموودەی گەورەی "الإسراء"دا لە بینینی موسا لە ئاسمانی شەشەم یان حەوتەم، بەپێی جیاوازی ریوایەتەكە، فەرمووی: ((وذالك بتفضيله بكلام الله))-ئەوەش بە هۆی ئەوەی موسا بە كەلامی خودا فەزڵی پێدرابوو. گەر ئەو ئاخافتنەی لەگەڵ خودا وەك ئەوەی پێغەمبەرانی تر بووایە ئەوا لەم فەرموودەیەدا تایبەت نەدەكرایەوە لەڕووی ماناوە، ئەو كات موسا بە "كليم الرحمن" ناو نەئەبرا ﴿ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحۡيًا أَوۡ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ أَوۡ يُرۡسِلَ رَسُولٗا فَيُوحِيَ بِإِذۡنِهِۦ مَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ عَلِيٌّ حَكِيمٞ ﴾ الشوری: ٥١، جیاوازی هەیە لە نێوان ئاخافتنی وەحی لەگەڵ ئاخافتن بە ناردنی نێرراوێك، هەروەها ئاخافتن لە پشتی پەردەوە.

۞ **ئاستی دووەم:** ئاستی وەحی تایبەت بە پێغەمبەران بەگشتی ﴿ إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ ﴿١٦٣﴾ ﴾ النساء: ١٦٣، هەروەها ﴿ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحۡيًا أَوۡ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ أَوۡ يُرۡسِلَ رَسُولٗا فَيُوحِيَ بِإِذۡنِهِۦ مَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ عَلِيٌّ حَكِيمٞ ﴾ الشوری: ٥١. وەحی لەم ئایەتی دووەمەدا بوو بە بەشێك لە بەشەكانی ئاخافتن(تكليم)، لە ئایەتەكەی سورەتی "النساء"یشدا بوو بە بەشێكی سەرەكی لە دوو بەشی ئاخافتن "تكليم"، ئەمەش لە دوو ڕێگەوە: وەحی بەشی سەرەكی ئاخافتنی تایبەتە كە بەبێ ناوبەند(**الواسطة**)ە دەگاتە كەسەكە، هەروەها بەشێكیشە لە ئاخافتنی گشتی كە بریتییە لە گەیاندنی مانا لە چەندین ڕێگەوە. وشەی "**الوحي**" لە زمانەوانیدا بریتییە لە ئاگاداركردنەوە و هۆشداركردنەوەی خێرا و پەنهان، لەسەر فرمانەكەی دەوترێت: "**وحى و أوحى**"، "**وحى لها القرار فاستقرت**"، ئەمەش چەند بەشێكە وەك دواتر باسییان دەكەین.

۞ **ئاستی سێیەم:** ناردنی پەیامبەرێکی فریشتە بۆ لای پێغەمبەرێکی مرۆڤ، ئەو وەحیەی لە خوداوە فەرمانی پێکراوە پێی دەگەیەنێت. ئەم سێ ئاستە تایبەتن بە پێغەمبەران و بەشی کەسی تر جگە لە پێغەمبەرانی پێوە نییە. ئەو پەیامبەرە فریشتەیە هەندێ جار وەك پیاوێك خۆی بۆ پێغەمبەرەکە دەردەخات، بەچاو دەیبینێت و ئاخافتنی لەگەڵ دەکات، هەندێ جاریش لەو شێوەدا دەیبینێت کە فریشتەکەی لەسەر دروستکراوە، هەندێ جار فریشتەکە دەچێتە ناخییەوە، ئەوەندەی پێویست بێت لە وەحی پێی دەگەیەنێت، پاشان لێی جیادەبێتەوە، یان لێی دادەبڕێت، ئەم سێ جۆرە لە وەحی بۆ پێغەمبەری ئێمە کراوە (ﷺ).

۞ **ئاستی چوارەم:** ئاستی رازگر(**محدث**)، ئەم ئاستە لەخوار ئاستی وەحی تایبەتەوەیە و لەخوار پلەی "صدیقین"ەوەیە، وەك چۆن بۆ عومەری کوڕی خەتاب رووی داوە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((**إنه كان في الأمم قبلكم محدثون، فإن يكن في هذه الأمة فعمر بن الخطاب**))، گوێم لە "**شيخ الإسلام، تقي الدين بن تيمية**"-**رحمه الله**- بوو دەیفەرموو: فەرموودەکە دووپاتی دەکاتەوە و پێداگری دەکات لەسەر ئەوەی کە لە گەلانی پێش ئێمەدا بوونی هەبووە و لەم ئومەتەشدا بەستوویەتەوە بە ئامرازی مەرجی "**إن**"، لەگەڵ ئەوەی ئومەتەکەمان باشترین ئومەتە، بەهۆی ئاتاجی ئومەتانی پێش ئێمە بەو رازگرانە و بێنیازی ئەم ئومەتە لەو جۆرە، ئەمەش بە هۆی کەماڵی پێغەمبەرەکەی و پەیامەکەیەوە، خودا لە دوای پێغەمبەر ئەم ئومەتەی ئاتاج نەکردووە بە بوونی رازگر و ئیلهامبۆکراو و خاوەن کەشف و خەون بینین، ئەم راگرتنە بۆ کەماڵی ئوممەت و بێنیازی دەگەڕێتەوە نەك ناتەواوی. رازگر"**محدث**" کەسێکە لە پەنهان و لەناو دڵیدا شتێك باس دەکات و بەو جۆرە دەردەچێت کە ئەو لە پەنهاندا باسی کردووە. شێخمان(شێخی هەروی) دەفەرموێت: صدیق لە رازگر کاملترە، چونکە بە کەماڵی صدیقییەت و شوێنکەوتنی پێغەمبەر بێنیاز بووە لە رازگری (التحدیث) و ئیلهام و پەردە لەسەر لادان (کشف)، ئەو(صدیق) هەموو دڵ و نهێنی و دەرەوە و ناوەوەی رادەستی پێغەمبەر کردووە (ﷺ). دەڵێت: رازگر ئەوەی لەلایەتی دەیخاتەڕوو بەسەر ئەوەی پێغەمبەر هێناویەتی، گەر بەپێی ئەوەی پێغەمبەر بوو قبووڵی دەکات، ئەگەر نە بەرپەرچی دەداتەوە، لێرەوە تێدەگەین ئاستی صدیقییەت بالاترە لە ئاستی

رازگری. دەڵێت: ئەوەی زۆرێك لە خاوەنی ئەندێشە و نەفامی دەیڵێن ((حدثني قلبي عن ربي))-دڵم لە خوداوە پێی وتم، راستە دڵی پێی وتووە، بەڵام لە كێوە؟ لە شەیتانەكەیەوە، یان لە خوداوە؟ گەر بڵێت ((حدثني قلبي عن ربي)) دڵم لە خوداوە پێی وتم، ئەوا سەنەدی قسەكەی داوەتە پاڵ كەسێك كە نازانرێت پێی وتووە یان نە، ئەمەش دەبێتە درۆ. دەڵێت: رازگری ئوممەت (عومەری كوڕی خەتتاب) ئەو قسەیەی نەكردووە، هیچ رۆژێك لە رۆژان ئەو قسەیەی بە دەمدا نەهاتووە، خودا پاراستوویەتی لەوەی قسەی لەو جۆرە بكات، بەڵكو رۆژێك نووسەرەكەی نووسی (**هذا ما أرى الله أمير المؤمنين، عمر بن الخطاب**)-ئەم نووسینە ئەوەیە خودا نیشانی ئەمیری باوەڕداران، عومەری كوڕی خەتتابی داوە، عومەر فەرمووی: (**لا، امحه، واكتب: هذا ما رأى عمر بن الخطاب، فإن كان صوابا فمن الله، وإن كان خطأ فمن عمر، والله و رسوله منه بريء**) نەخێر، بیسڕەوە، بنووسە: ئەمە ئەوەیە عومەری كوڕی خەتتاب بەڕاستی زانی، گەر راست بێت لە خوداوەیە، گەر هەڵەش بێت لە عومەرەوەیە و خودا و پێغەمبەرەكەی لێی بەرین. لەسەر میراتی بەجێماو (**الكلالة**) دەڵێت: "رای خۆمی لەسەر دەردەبڕم، گەر راست بوو لە خوداوەیە، گەر هەڵەش بوو لە من و شەیتانەوەیە". سەرنجی قسەی ئەم دوو كەسە و ئەم دوو ئاستە و ئەم دوو قسە و ئەم دوو حاڵە بدە، ماف بۆ هەر خاوەن مافێك بگێڕەرەوە، پڕ لە خەوش و پاڵفتە مەكە بە یەك شت.

۞ **ئاستی پێنجەم**: ئاستی تێگەیاندن، خودا دەفەرموێت ﴿وَدَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ إِذۡ يَحۡكُمَانِ فِي ٱلۡحَرۡثِ إِذۡ نَفَشَتۡ فِيهِ غَنَمُ ٱلۡقَوۡمِ وَكُنَّا لِحُكۡمِهِمۡ شَٰهِدِينَ ۝٧٨ فَفَهَّمۡنَٰهَا سُلَيۡمَٰنَۚ وَكُلًّا ءَاتَيۡنَا حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ﴾ الأنبياء: ٧٨-٧٩، باسی ئەو دوو پێغەمبەرە بەڕێزەی كرد، وەسفی هەردووكیانی كرد بە زانست و حیكمەت، سولەیمانی لەم رووداوە دیاریكراوەدا بە تێگەیشتن (**فهم**) تایبەت كردەوە، عەلی كوڕی ئەبی تالب-خوای لێ رازی بێت- پرسیاری لێكرا (("ئایا پێغەمبەر ئێوەی بە شتێك جیا لە خەڵكی تایبەت كردووە؟)) فەرمووی ((نەخێر، سوێند بەو كەسەی تۆو دەڕوێنێ و رۆح بە بەردا دەكات، جگە لە تێگەیشتنێك لە قورئان خودا بە بەندەیەكی بدات و ئەوەی لەم لاپەڕەدایە" ئەوەی لە ناویدا بوو بریتی بوو لە مافی خوێنی كەسی كوژراو و كردنەوەی كۆت و بەندی دیل و نەكوشتنی موسڵمان بە بێباوەڕ))، لە نووسراوەكەی

عومەری کوڕی خەتابدا بۆ ئەبو موسای ئەشعەری -خوایان لیّ رازی بێت- ((**والفهم الفهم فيما أدلي إليك**)) تێگەیشتن، تێگەیشتن لەو شتانەی دەخرێتە بەردەمت و رووت تێدەکات. تێگەیشتن نیعمەتێکە خودا بە بەندەکەی دەدات، نورێکە هەڵیدەدات بۆ ناو دڵی، بەهۆیەوە دەزانێت و دەناسێت، پەی بە شتێك دەبات کە جگە لەو کەسی تر پەی پیّ نابات، لە دەقێك شتێك تێدەگات جگە لەو کەس ئەو شتە تێنەگەیشتووە، لەگەڵ ئەوەی لە لەبەرکردنی دەقەکە و تێگەیشتنی مانا بنچینەیی و سەرەکییەکەدا هەردوو یەکسانن. تێگەیشتن لە خودا و پێغەمبەر ناونیشانی صدیقییەتە، بڵاوکراوەی ویلایەتی پێغەمبەرایەتییە، ئەو جێگەیە ئاستی زانایان تیایدا جۆراوجۆرە، تا هەزاریان بە یەکێك دەژمێررێت، سەرنجی تێگەیشتنی ئیبن عەباس بدە، عمر بە ئامادەبوونی هەندێ لە ئەهلی بەدر و کەسانی تریش دەربارەی (**إذا جاء نصر الله والفتح**) پرسیاری لیّ کرد، ئەوەی ئیبن عەباس پێی تایبەت کراوە لە تێگەیشتنی ئایەتەکە، فەرمووی ((ئەوە هەواڵی مردنی پێغەمبەرە لەلای خوداوە-**سبحانه**-)) ئاگادارکردنی پێغەمبەر بە ئامادەبوونی ئەجەلەکەی، عومەر رەزامەندی لەسەر ئەو قسەی ئیبن عەباس دەبڕی، لە کاتێکدا ئەو تێگەیشتنە لە زۆربەی هاوەڵان شاراوە بوو، ئیبن عەباس لەو کاتەدا لە هەموویان گەنجتر بوو. کوێی ئەم سورەتە ئاماژەی تێدایە بە مردنی پێغەمبەر، گەر تێگەیشتنی تایبەت نەبێت؟ ئەم تێگەیشتنە ورد دەبێتەوە تا دەگاتە ئاستێك تێگەیشتنی زۆربەی خەڵکی لێی دەستەوسان دەبێت، لەگەڵ دەقدا ئاتاجی کەسانی تر دەبێت، ناتوانێت بە تەنها دەق لە کەسانی تر بێنیازی بێت، بۆ خاوەن تێگەیشتنە تایبەتەکەش جگە لە دەق ئاتاجی شتێکی تر نابێت.

۞ **ئاستی شەشەم:** ئاستی بەیانی گشتی، بریتییە لە رۆشنکردنەوە و جیاکردنەوەی حەق لە باتڵ بە بەڵگە و شایەتی و را و بۆچوونی گەورە پیاوانی، تا وای لیّ دێت بەدڵ ببینرێت، وەك بینینی چاو بۆ شتە بینراوەکان. ئەم ئاستە بریتییە لە بەڵگەی خودا بەسەر دروستکراوەکانییەوە، خودا هیچ کەس سزا نادات تا ئەو بەڵگانەیان پیّ نەگات، دەفەرمویّ ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِلَّ قَوۡمَۢا بَعۡدَ إِذۡ هَدَىٰهُمۡ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَۚ ﴾ التوبة: ١١٥، ئەم گومڕابوونە سزای خودایە بۆ ئەوان، کاتێك بۆی رۆشن کردنەوە، بەڵام ئەوەی ئەو-**سبحانه**- بۆی رۆشن کردنەوە وەریان نەگرت و کاریان پیّ

نەکرد، بۆیە سزایدان بەوەی گومڕایکردن لە وەرگرتنی هیدایەت، خودا هیچ کەسێك گومڕا ناکات دوای ئەم ڕۆشنکردنەوەیە نەبێت، گەر ئەمە بزانیت لە نهێنی قەدەر تێدەگەیت و زۆرێك لە گومان و تەمومژەکان دەڕەوێنەوە، لە حیکمەتی گومڕاکردنی هەندێك لە بەندە گومڕاکانی تێدەگەیت، قورئان بە روونی لە چەند شوێنێکدا ئاماژە بەم بابەتە دەکات، وەك ﴿ فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ ﴾ الصف: ٥، ﴿ وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ ﴾ النساء: ١٥٥، ئایەتی یەکەمیان بێباوەڕی سەرپێچی و ملنەدانە، دووەمیان بێباوەڕی مۆرکردنە، هەروەها ئایەتی ﴿ وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَـٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُواْ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴾ الأنعام: ١١٠، لەسەر وازهێنان لە باوەڕ بە خودا کاتێك یەقینیان پێی هەبوو، هەروەها چووبوونە بنج و بناوانییەوە خودا سزای ئەوانی دا بە وەرگێڕانی دڵ و هۆشیان. لەم بابەتە بە وردی ڕابمێنە، چونکە بابەتێکی زۆر مەزنە. خوای موتەعال دەفەرموێ ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَـٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّواْ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ ﴾ فصلت: ١٧، ئەمە هیدایەتێکە دوای ڕۆشنکردنەوە و ڕوونکردنەوە و ڕێنمایی کردن، ئەمە مەرجە نەك پێویستبوون، چونکە گەر جۆرێکی تر لە هیدایەت بەدوایدا نەیەت ئەوا کەماڵی هیدایەتی لێوە بەدەست نایەت، کە ئەوەش هیدایەتی کۆمەك کردن و ئیلهام کردنە. ئەم ڕۆشنکردنەوە و ڕوونکردنەوەیە(بیان) دوو جۆرە: ڕۆشنکردنەوە بە ئایاتی گوێلێگیراوی خوێنراوە(قورئان)، لەگەڵ ڕۆشنکردنەوە بە ئایاتی بینراوی بەرچاو(گەردوون)، هەردووکیان بەڵگە و نیشانەگەلێکن لەسەر یەکتایی خودا و ناو و سیفات و کەماڵی ئەو، هەروەها ڕاستیی ئەوەی پێغەمبەران دەربارەی خودا ڕایانگەیاندووە ڕادەگەیەنن، بۆیە خودا بەندەکانی بە ئایاتی خوێنراوە بانگ دەکات بۆ بیرکردنەوە لە بەڵگە و نیشانەی بینراو و بەرچاو و هانیان دەدات لە هەردوو جۆرە بەڵگە و نیشانەکان بیربکەنەوە، ئەمە ئەو ڕۆشنکردنەوەیە کە پێغەمبەرانی پێ ڕاوانەکراوە، دوای ئەوان بە زانایان دراوە، لەدوای ئەو ڕۆشنکردنەوەیە خودا هەر کەسی بوێت گومڕای دەکات، دەفەرموێت ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ ۖ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ إبراهیم: ٤، پێغەمبەران ڕۆشن دەکەنەوە، خودا خۆیەتی بە عیززەت و دانایی خۆی هەر کەسێکی بوێت گومڕای دەکات، یان هیدایەتی دەدات.

۞ **ئاستی حەوتەم:** ڕۆشنکردنەوە و ڕوونکردنەوەی تایبەت کە بریتییە لە بەیانی پێویست بۆ هیدایەتی تایبەت، ئەو بەیانەیە کە چاودێری کردن و کۆمەك کردن و هەڵبژاردن لەئامێز دەگرێت، هەروەها بنبڕکردنی هۆکارەکانی ڕسوایی و سەرشۆڕی و کەرەستەکانی لە دڵی مرۆڤدا، ئەو دڵە هەرگیز هیدایەتی لێ دواناکەوێت، خودا دەفەرموێ ﴿ إِن تَحْرِصْ عَلَىٰ هُدَاهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَن يُضِلُّ ۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّاصِرِينَ ﴾ النحل: ٣٧، هەروەها دەفەرموێ ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ۚ ﴾ القصص: ٥٦، بەیانی یەکەم مەرجە و ئەمەی دووەمیان پێویستە.

۞ **ئاستی هەشتەم:** ئاستی پێبیستن (الإسماع)، خودا دەفەرموێ ﴿ وَلَوْ عَلِمَ اللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ ۖ وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوا وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴾ الأنفال: ٢٣، هەروەها دەفەرموێ ﴿ وَمَا يَسْتَوِي الْأَعْمَىٰ وَالْبَصِيرُ ﴿١٩﴾ وَلَا الظُّلُمَاتُ وَلَا النُّورُ ﴿٢٠﴾ وَلَا الظِّلُّ وَلَا الْحَرُورُ ﴿٢١﴾ وَمَا يَسْتَوِي الْأَحْيَاءُ وَلَا الْأَمْوَاتُ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَاءُ ۖ وَمَا أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي الْقُبُورِ ﴿٢٢﴾ إِنْ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ ﴾ فاطر: ١٩-٢٣، ئەم پێبیستنە تایبەترە لە پێبیستنی بەڵگە و پێڕاگەیاندن، ئەو بەڵگەیە بۆیان بەدەست هاتووە و بەهۆیەوە بەڵگە و حوجەیان بەسەردا خوێنراوەتەوە، بەڵام ئەوە هیدایەتێکە بە گوێ دەبیسترێت و ئەمەش هیدایەتێکە بەدڵ دەبیسترێت، قسە وشە و مانای هەیە، بە گوێ و دڵ دەژنەورێت، بیستنی وشەکە بەشی گوێیە، بیستنی ڕاستێتی مانا و مەرامەکەی بەشی دڵە، خودا -سبحانە- نەرێی کردووە بێباوەڕان لە مانا و مەرامی کەلامی ئەو تێبگەن کە بریتییە لە بەشی دڵ و بیستنی وشەی بۆ جێگیرکردوون کە بەشی گوێیە، دەفەرموێت ﴿ مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ إِلَّا اسْتَمَعُوهُ وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴿٢﴾ لَاهِيَةً قُلُوبُهُمْ ۗ ﴾ الأنبياء: ٢-٣، ئەم پێبیستنە سوود بە گوێگر ناگەیەنێت جگە لە ڕاستکردنەوەی بەڵگە لەسەری (قیام الحجة)، یان بەباشی تێگەیشتن لێی، مەرامی پێبیستن و بەری ئەو پێبیستنە و مەبەست پێی: بەدەست نایەت لەگەڵ سەرگەرمی و بێئاگایی دڵ و پشتهەڵکردنی، بەڵکو گوێگر دێتە دەرەوە دەڵێت بەو کەسەی کە دڵی ئامادەبووە "ئەوە ئێستا چی وت؟" ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ حَتَّىٰ إِذَا خَرَجُوا مِنْ عِندِكَ قَالُوا لِلَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ مَاذَا قَالَ آنِفًا ۚ ﴾ محمد: ١٦. جیاوازی نێوان ئەم ئاستە و ئاستی تێگەیاندن: ئەم ئاستە بەهۆی گوێوە بەدەست دێت، ئاستی تێگەیاندن (إفهام) گشتگیرترە، لە ڕوویەکەوە ئاستی

پێبیستن تایبەتترە لە ئاستی تێگەیاندن، لەڕوویەکی ترەوە ئاستی تێگەیاندن تایبەتترە لە ئاستی پێبیستن، ئەمەش گرێ دەدرێت بە مانای ویستراو و پێویستییەکانی و وابەستەکان و ئاماژەکانی. ئاستی پێبیستن خولگەکەی لەسەر گەیاندنی مەبەست و مەرامە بە گوتار بۆ ناو دڵ، لەم بیستنەوە بیستنی قبوڵکردن پەیدا دەبێت. کەوابوو ئەمە سێ ئاستە: بیستنی گوێ، بیستنی دڵ، بیستنی قبووڵ کردن و وەڵامدانەوە.

۞ **ئاستی نۆیەم:** بریتییە لە پلەی ئیلهام، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ۝٧ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا﴾ الشمس: ٧ – ٨، پێغەمبەر(ﷺ) بە "**الحصين بن منذر الخزاعي**" فەرمووی ((قل: أللهم ألهمني رشدي، وقني شر نفسي))-بڵێ: خودا ئیلهامی روشد و کەماڵم بکە و لە شەڕی نەفسم بمپارێزە. ئیلهام گشتگیرترە لە راز (**التحديث**)، ئیلهام بۆ هەموو باوەڕدارانە بەپێی باوەڕەکەیان، هەموو باوەڕدارێك خودا ئیلهامی روشدی کردووە و بە باوەڕ بۆی بەدەستهاتووە، بەڵام "راز" پێغەمبەر(ﷺ) تیایدا فەرموویەتی ((**إن يكن في هذه الأمة أحد فعمر**))، واتە لەو رازگرانەیە، کەوابوو راز (**التحديث**) ئیلهامێکی تایبەتە، بریتییە لە وەحی بۆ کەسانێك کە پێغەمبەر نین، جا یان بۆ داوالێکراوەکان، وەك ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ﴾ القصص: ٧، هەروەها ﴿وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى ٱلْحَوَارِيِّـۧنَ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِى وَبِرَسُولِى﴾ المائدة: ١١١، یان وەحی بۆ گیاندارانێکی نا موکەلەف(داوالێنەکراو)، وەك ﴿وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ۝٦٨﴾ النحل: ٦٨، هەموو ئەمانە وەحی ئیلهامن. شێوە باوەکەی ئەوەیە گوتارێکە هەڵدەدرێت بۆ دڵی باوەڕدار کاتێك فریشتەیەك ئاخافتن لەگەڵ دڵی دەکات، وەك لە فەرموودە بەناوبانگەکەدا هاتووە ((**إن للملك لمة بقلب بن آدم، وللشيطان لمة، فلمة الملك: إيعاد بالخير و تصديق بالوعد، ولمة الشيطان إيعاد بالشر و تكذيب بالوعد**))، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ٱلشَّيْطَـٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ﴾ البقرة: ٢٦٨، ئەم ئایەتە بۆ داگیرکردنی مرۆڤ لەلایەن شەیتانەوە ﴿إِذْ يُوحِى رَبُّكَ إِلَى ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ أَنِّى مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ الأنفال: ١٢، ئەم ئایەتەش بۆ کۆمەك و پشتیوانی مرۆڤ لەلایەن فریشتەکانەوە، لە تەفسیرەکەیدا وتراوە: دڵیان بەهێز بکەن و مژدەیان بە سەرکەوتن پێبدەن. دیسان

وتراوە: لە جەنگدا لەگەڵیان ئامادە ببن، هەردوو قسەکە دروستە، ئەوان لە جەنگدا لەگەڵیان ئامادەبوون و دڵیان دامەزراندن. لەم گوتارەوە: خودا -عزوجل-ئامۆژگاری لە دڵی بەندە باوەڕدارەکانیدا داناوە، هەروەك لە جامعی ترمذي و مەسنەدی ئیمام ئەحمەددا لە فەرموودەی "النواس بن سمعان" لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی ((إن الله تعالى ضرب مثلا: صراطا مستقيما وعلى كتفي الصراط سوران، لهما أبواب مفتحة، وعلى الأبواب ستور مرخاة، وداع يدعو على رأس الصراط، وداع يدعو فوق الصراط، فالصراط المستقيم: الإسلام، والسوران حدود الله، والأبواب المفتحة محارم الله، فلا يقع أحد في حد من حدود الله حتى يكشف الستر، والداعي على رأس الصراط: كتاب الله، والداعي فوق الصراط واعظ في قلب كل مؤمن)) لە فەرموودەکە ئەم بەشەی جێگەی ئاماژەیە کە دەفەرموێت "والداعي فوق الصراط واعظ الله في قلب كل مؤمن" ئەو ئامۆژگاریکەرە لە دڵی باوەڕداراندا بریتییە لە ئیلهامی خودایی بەهۆی فریشتەوە، داگیرکردنی مرۆڤیش لەلایەن شەیتانەوە برتییە لە بەڵێن و خۆزگەکان کاتێك هێرش دەکەنە سەر مرۆڤ و فەرمانی پێدەکەن و ڕێگری لێ دەکەن، خودا دەفەرموێ ﴿يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا﴾ النساء: ١٢٠، عومەری کوڕی خەتتاب بە غەیلانی کوڕی سەلەمەی فەرموو-یەکێکە لە هاوەڵان، کاتێك ژنەکەی تەڵاق دا وماڵەکەی لە نێوان کوڕەکانیدا دابەش کرد-((من وا گومان دەبەم شەیتان-کە بەگوێ شت دەدزن- مردنی تۆی بیستووە و هەواڵەکەی هەڵداوەتە دەروونتەوە))، نیشانەی ئەم ئیلهامە شەیتانیانە ئەوەیە کە هەڵەکانی زۆرن، وەك پێغەمبەر(ﷺ) بە ئیبن صائدی فەرموو((ما ترى؟ قال: أرى صادقا و كاذبا. قال: لبس عليك)) کەشفی شەیتانی دەبێت درۆ بکات و درۆی تێدا بێت، هەرگیز ڕاستییەکانی بەردەوام نابن.

۞ **ئاستی دەیەم لە ئاستەکانی هیدایەت:** خەونی ڕاست کە بەشێکە لە چەند بەشی پێغەمبەرایەتی وەك چۆن لە پێغەمبەرەوە ساغ بۆتەوە کە فەرموویەتی ((**الرؤيا الصادقة جزء من ستة و أربعين جزءا من النبوة**))، خەون سەرەتا و دەستپێکردنی وەحیە، ڕاستی خەونەکە بەپێی ڕاستگۆیی و ڕاستڕەوی کەسەکەیە، ڕاستترین خەون خەونی کەسێکە کە زۆر ڕاستگۆیە، لەگەڵ نزیکبوونەوەی قیامەتدا زۆر کەم هەڵەی

تیادەکرێت، وەك پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی، ئەوەش بەهۆی دووری سەردەمەوە لە پێغەمبەرایەتی و ئاسەواری پێغەمبەرایەتی، باوەڕداران بە خەون باربوویان بۆ دەکرێتەوە، بەڵام لەسەردەمی هێزی نووری پێغەمبەرایەتیدا: لە ڕۆشنی و هێزی دەرکەوتنی نووری پێغەمبەرایەتی بێنیازبوون لە خەون. پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ ((**لم يبق من النبوة إلا المبشرات، قيل: وما المبشرات، يا رسول الله؟ قال: الرؤيا الصالحة، يراها المؤمن أو ترى له**))–خەوی خۆش کە کەسەکە خۆی دەیبینێت، یان پێیەوە دەبینن، گەر خەونی موسڵمانان لەگەڵ یەکتر ڕێکەوتن ئەوە ئەو خەونە درۆ نییە، پێغەمبەر(ﷺ) بە یارانی فەرموو کاتێك شەوی قەدریان لە دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا نیشان درابوو ((**أرى رؤياكم قد تواطأت في العشر الأواخر، فمن كان منكم متحريها فليتحرها في العشر الأواخر من رمضان**)). خەون وەك کەشف وایە، هەیانە ڕەحمانییە و لە خوداوەیە، هەیانە نەفسانییە و هەشیانە شەیتانییە. پێغەمبەر(ﷺ) دیسان دەفەرموێ ((**الرؤيا ثلاثة: رؤيا من الله، ورؤيا تحزين من الشيطان، ورؤيا مما يحدث به الرجل نفسه في اليقظة، فيراه في المنام**))، ئەوەی دەبێتە هۆی هیدایەت بریتییە لە خەونێك کە تایبەتە و لە خوداوەیە. خەونی پێغەمبەران وەحییە، چونکە خەونەکانیان لە شەیتان پارێزراوە بە کۆدەنگی ئوممەت، بۆیە ئیبراهیمی خەلیل بە خەونێك ویستی کوڕەکەی سەربڕێت–**عليهما السلام**– خەونبینی خەڵکانی تر جگە لە پێغەمبەران، ئەدرێت لە میزانی وەحی ڕوون و ئاشکرا، گەر قبووڵی کرد تەواوە و وەردەگیرێت، ئەگەر نە، کاری پێ ناکرێت، گەر بوترێت: ئەی چی دەڵێین گەر خەونەکە ڕاست بوو یان چەند کەسێك خەونەکەیان بینیبوو؟ دەڵێین: هەر خەونێك بەو جۆرە بێت هەرگیز پێچەوانە لەگەڵ وەحی ناوەستێتەوە، بەڵکو لەگەڵی بەتەواوی تەبا دەبێت و ئاگادارکەرەوەیە بۆ دەستگرتن بە وەحییەوە، یان ئاگادارکردنەوەیە لەسەر پرسێکی تایبەت بە حوکمەکانی، کەسی خەون بین هیچ شتێکی دەربارەی ئەو حوکمە نەزانیوە بە خەون لەسەر ئەوە ئاگاداری دەکەنەوە، هەر کەس دەیەوێت خەونەکانی ڕاست بن با بەدوای ڕاستگۆیی و خواردنی حەڵاڵدا بگەڕێت و پارێزگاری لە فەرمانەکانی خودا بکات و لە قەدەغەکراوەکان دووربکەوێتەوە. لەسەر دەستنوێژ و لەشپاکی تەواو ڕوو بە قیبلە بخەوێت، یادی

خـودا بکـات تـا چـاوەکانی خـامۆش دەبـن، ئـەوکات خەونـەکانی دەگمـەن ناڕاسـت دەربچن. راستگۆترین خەون خەوی بەرەبەیانە، ئەو کاتە کاتی دابـەزینی خودایيـە، نزیکبوونەوەی بـەزەیی و لێخۆشـبوونە، دامرکانـەوەی شـەیتانەکانە، پێچـەوانەکەی خـەونی کـاتی داهـاتنی تـاریکی بڵابوونـەوەی شـەیاتین و رۆحـە شـەیتانییەکان، عوبـادەی کـوڕی صـامت-خـوای لـێ رازی بێـت- دەفـەرموێ ((خـەونی بـاوەڕدار ئاخافتنێکە کە خودا لە خەودا لەگەڵی ئەنجام دەدات)).

۞ ۞ ۞

# سورەتی "الفاتحة" والاكەری دەرگای شفا

سورەتی **"الفاتحة"** دوو جۆر شفای تێدایە: شفای دڵ و شفای جەستە.

لەخۆگرتنی شفای دڵ بە باشترین شێوە لەئامێزی گرتووە، خولگەی دەرد و نەخۆشی دڵ لەسەر دوو پایەیە: تێكچوونی زانست و تێكچوونی ویست و مەرام. لەسەر ئەم دوانە دوو دەردی كوشندە سەر هەڵدەدەن كە بریتین لە گومڕایی و خەشملێگیراوی، گومڕایی بەهۆی تێكچوونی زانستەوەیە، خەشملێگیراویش بەهۆی تێكچوونی ویست و مەرامەوەیە، ئەم دوو دەردە سەرچاوەن بۆ هەرچی نەخۆشی دڵە، هیدایەتی شارێگەی ڕاست و دروست شفای نەخۆشی گومڕایی لەخۆ دەگرێت، بۆیە داوای ئەم هیدایەتە كراوە (**إهدنا الصراط المستقيم**) و لەسەر هەموو بەندەكان كردنی ئەو دوعایەی لە شەو و ڕۆژدا و لە هەموو نوێژێكدا پێویست بووە، ئەمەش بەهۆی پێویستی زۆری بەندەی خودا بە هیدایەتی داواكراو، هیچ داوایەك جێگەی ئەم داوایە ناگرێتەوە.

جێبەجێ كردنی ((**إياك نعبد و إياك نستعين**)) بە زانست و مەعریفە و كردار و حاڵ شفای نەخۆشی دڵ و تێكچوونی مەرام و ویست دەستەبەر دەكات. تێكچوونی ویست و مەرام پەیوەندی بە ئامانج و هۆكارەكانەوەیە، هەر كەس ئامانجێكی دوابڕاو و كەموكورت و تیاچووی داواكرد و چەندین جۆر هۆكاری گەیشتن بەو ئامانجەی گرتەبەر، ئەوە هەردوو جۆرە مەرامەكەی تێكچووە، ئەمەش حاڵی هەموو ئەوانەیە كە ئامانجی بریتی نەبێت لە خودا و بەندایەتی كردنی: لە هاوەڵدانەران و شوێنكەوتووانی حەز و ئارەزوو كە هیچ ئامانجێكیان لەو شوێنكەوتنەدا نییە، هەروەها خاوەن دەسەلاتەكان كە دەیانەوێت بە هەر نرخێك بووە –ڕەوا یان ناڕەوا– پێگەی دەسەلاتیان قایم بكەن. ئەگەر ڕەوا هات و بەرهەڵستكاری دەسەلاتەكەی ئەوانی كرد ئەوا دەیهاڕن و دەیخەنە ژێر پێیان، گەر لەوە دەستەوسان بوون ئەوا بە شمشێر –هەروەك بەرگری لە خاك و میللەت– بەرپەرچی دەدەنەوە، گەر ئەمەشیان نەتوانی ئەوا لە ڕێگەیەكەوە بەندی دەكەن و خۆیان بەرێگەیەكی تردا لادەدەن، ئەوان ئامادەن بەپێی توانای خۆیان ڕووبەڕووی ببنەوە و لە جووڵە و دەسەلات و جێبەجێ كردن كەناری بخەن، ئەگەر "ڕەوا" سەریان بخات و لە بەرژەوەندی ئەواندا بێت ئەوا بەهۆیەوە هێرش و پەلامار دەدەن و بە ملكەچی دێن بۆ لای "ڕەوا"، نەك

لەبەرئەوەی رەوایە، بەڵكو لەبەر ئەوەی لەگەڵ مەرام و حەز و سەركەوتنەكانی ئەواندا تەبایە ﴿ وَإِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلْحَقُّ يَأْتُوٓا۟ إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ ﴿٤٩﴾ أَفِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ٱرْتَابُوٓا۟ أَمْ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُۥ ۚ بَلْ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾ النور: ٤٨ — ٥٠.

مەبەست ئەوەیە كە مەرام و ویستی ئەوانە لە ئامانج و هۆكارەكاندا تێكچووە، ئەوانە گەر ئەو ئامانجانەی داوایان دەكرد بەدەستیان نەهێنا و پوكانەوە و تیاچوون گەورەترین زیانۆمەندی و پەشیمانی دەدوورنەوە، ئەوانە پەشیمانترین و خەمبارترین مرۆڤن، كاتێك رەوا سەركەوتنی بەدەست هێنا و نارەوا پووچ بوویەوە و لە هۆكارەكانی گەیشتن بە ئامانجی نێوانیان دابڕان و دڵنیابوون كە لە دەستەی سەرفرازان و بەختەوەران نین، ئەمەش زۆرجار لە دونیادا روودەدات. بەهێزتر لەمە لە كاتی كۆچكردن لە دونیا و رۆیشتن بەرەو خودا روودەدات، دەركەوتن و یەكلابوونەوەی لە جیهانی بەرزەخدا دەبینێت، هەموو پەردەكان لە رۆژی گەیشتن بە خودا و بەو جیهانە لادەدرێن، كە راستییەكان دەركەوتن، راستڕەوان سەركەوتنیان بەدەستهێنا و ئەهلی باتڵیش زیانۆمەندی، بۆیان دەركەوت كە ئەوان درۆزن بوون، فریودرابوون و لەخۆیان دەرچووبوون، هاوار بۆ زانستێك لەو جیهانەدا كە بە كەڵكی خاوەنەكەی ناخوات! هاوار بۆ یەقینێك كە خاوەن یەقینەكە قوتار ناكات!.

هەر بەو جۆرە ئەو كەسەی كە ئامانجی باڵا و داوای بەرزی هەیە، بەڵام وەسیلەیەكی نەگرتۆتە بەر بە ئامانجەكەی بگەیەنێت، بەڵكو دەستی بە وەسیلەیەكەوە گرتووە وا گومانی بردووە بە ئامانجەكەی بگەیەنێت، ئەمەش خراپترین پەككەوتن و دابڕانە لە هۆكار، حاڵی ئەم كەسە وەك حاڵی ئەوەی یەكەم وایە، هەردووكیان مەرامەكەیان تێكچووە، شیفای ئەم نەخۆشییە بوونی نییە بە دەوای ((إیاك نعبد و إیاك نستعین)) نەبێت. ئەم دەوایە لە شەش توخم پێكهاتووە:

١. بەندایەتی تەنها بۆ خودا، نەك بۆ غەیری خودا

٢. بە فەرمانی خودا و شەرعی خودا

٣. نەك بە ئارەزوو

٤. نەك بە را و بۆچوونی پیاوان و رەوش و بەندوباو و بیریان

٥. بەكۆمەك داواكردن لەسەر بەندايەتی بۆ خودا

٦. نەك بە حەزی بەندە و هێز وتوانا و هەوڵی خۆی و خەڵكانی تر.

ئەمانە بەشەكانی ((**إياك نعبد و إياك نستعين**))ن، گەر پزيشكێكی وردی لێزان، زانا بە نەخۆشی بياندات لە يەك و نەخۆشەكەش بەكاری هێنا، ئەوا شفای تەواو بەدەست دەهێنێت، ناتەواوی لە شفادا بەهۆی ناتەواويەوەيە لە بەشێك لە بەشەكانيدا، يان دوو بەش يان زياتر.

دڵ دوو نەخۆشی زۆر گەورە رووی تێدەكات، گەر كەسەكە چارەسەری نەكات دڵی لەكار دەخەن و تياچوون دەبێتە بەشی، ئەو دوانەش: بريتين لە ريا و لوتبەرزی، دەوای ريا لە ((**إياك نعبد**)) دايە و دەوای لوتبەرزيش لە ((**إياك نستعين**))دا، زۆرجار لە "**شيخ الإسلام ابن تيمية -قدس الله روحه-**م دەبيست، دەيفەرموو ((**إياك نعبد**)) ريا پاڵدەنێت و نايهێڵێت، ((**إياك نستعين**)) لوتبەرزی پاڵدەنێت و نايهێڵێت.

گەر لە نەخۆشی ريا بە ((**إياك نعبد**)) چاكبوويەوە و لە نەخۆشی لوتبەرزی بە ((**إياك نستعين**)) شفای بۆ هات و لە نەخۆشی گومرايی و نەزانی بە ((**إهدنا الصراط المستقيم**)) رزگاری بوو، ئەوا ئەو كەسە لەسەرجەم نەخۆشی و دەرد و پەتاكان رزگاری بووە و پۆشاكی تەندروستی لەبەركردووە و نيعمەتی خودای بەسەردا باريوە، ئەو كاتە لەو كەسانەيە نيعمەتی خودا دەيانگرێتەوە، ((**غير المغضوب عليهم**)) ئەوانەن كە مەرام و ويستيان تێكچووە، ((**والضالين**)) ئەمانەش ئەهلی تێكچوونی زانستن ئەوانەی حەقيان نەپێكا و نەياناسی.

حەقی خۆيەتی سورەتێك كە ئەم دوو شفايە لەخۆ دەگرێت بەكاربهێنرێت بۆ شفای هەرچی نەخۆشييە، نەخۆشييە بچووكەكان لەپێشتر و ئاسانترن، وەك چۆن دواتر رۆشنی دەكەينەوە. هيچ شتێك بە ئەندازەی مانای ئەم سورەتە شفای دڵ نادات، دڵێك كە لە كەلامی خودا تێدەگات و تێگەيشتنی تايبەتی لە خوداوە بۆ دروست دەبێت ئەم سورەتە تايبەت دەبێت بەو.

لە فەرموودەی سەحيحدا لە "**أبي المتوكل الناجي عن أبي سعيد الخدري**" ((**أن ناسا من أصحاب النبي (ﷺ) مروا بحي من العرب فلم يقروهم، ولم يضيفوهم فلدغ سيد الحي، فأتوهم، فقالوا: هل عندكم من رقية، أو هل فيكم من راق؟ فقالوا: نعم، ولكنكم لم تقرونا،**

فلا نفعل حتى تجعلوا لنا جعلا، فجعلوا لهم على ذالك قطيعا من الغنم، فجعل رجل منـا يقـرأ عليه بفاتحة الكتاب، فقام كأن لم يكن به قلبة، قال: فأوفوهم جعلهم الـذي صـالحوهم عليـه، فقال بعضهم: أقسموا، فقال الذي رقى لا تضلوا حتى نأتي النبـي (ﷺ) فأتينـاه، فـذكرنا لـه ذالك، فقال: ما يدريك أنها رقية؟ كلوا واضـربوا لـي معكـم بسـهم))، ئـەم فەرموودەیـە بەدەستهاتنی شفا بە سورەتی "الفاتحـة"بـۆ ئـەو كەسـە گـەزراوە ئامـاژە پـێ دەدات، بەجۆرێك پێویستی بە دەوای تر نەبوو، بەڵكو بەجۆرێك دەوریگێـڕا كـە هـیچ دەوایـەك بەو جۆرە نییە. ئەمـە لـە جێگەیەكدا كـە كەسـەكان شایسـتەی ئـەوە نـین -بـەهۆی ئەوەی موسڵمان نەبوون، یان بەخیل و چرووك بوون- ئەی ئەگەر كەسەكان شایسـتە بن دەبێت كاریگەری شفای سورەتەكە چۆن بێت؟

❁ ❁ ❁

## سورەتی "الفاتحة"والآکەری بەڵگەی دەمکوتکەر

سورەتی **"الفاتحة"** بەرپەرچی ئەهلی بەتاڵ لە مەزهەب و مەشرەبی ئایینەکانی تر دەداتەوە، هەر بەو جۆرە بەرپەرچدانەوەی ئەهلی بیدعەت و گومڕایی لەم ئومەتەدا.

ئەمەش بەدوو ڕێگە: بە کورتی و پوختی، هەروەها بە دووروودرێژی:

**بە کورتی و پوختی:** ئەوەیە کە شاڕێگەی ڕاست و دروست ناسینی حەق و هەڵبـژاردنی و پێشخستنی بەسەر هەر شتێکی تردا و خۆشەویستی لەخۆ دەگرێت، هەروەها ملکەچی و فەرمانبەرداری بۆی و بانگردن بۆ سەری و کۆشان دژی نەیارانی حەق بەپێی گونجان و بۆڕەخسان لەئامێز دەگرێت.

حەق: بریتییە لەوەی کە پێغەمبەر و یارانی لەسەری بوون، هەروەها ئەوەی پێغەمبەر بە زانست و کردار دەربارەی سیفاتی پەروەردگار **-سبحانە-** و ناو و یەکتاپەرستی و فەرمان و قەدەغەکردن و بەڵێن و هەڕەشە کە لە خوداوە بۆی هات و ئەویش بەیانی کرد، هەر بەو جۆرە ئەوەی لە ڕاستێتی باوەڕ خراوەتە ڕوو کە بریتییە لە مەنزڵگای ڕێبوارانی ڕێگەی خودا، هەموو ئەمانە ڕادەستی پێغەمبەر کرابێت بەبێ ڕا و بۆچوونی پیاوان و دۆخ و بیرکردنەوە و زاراوەکانیان.

هەرچی زانست و کردارێك لە چرای پێغەمبەرایەتی ئەوەوە سەرچاوەی گرتبێت و مۆری محەمەدی لێدرابێت بەجۆرێك شوێنی سکە لێدانەکە مەدینەیی بێت ئەوە لە شاڕێگەی ڕاست و دروستە، ئەوەی بەو جۆرە نەبێت لەسەر تووڵەڕێی خەشم و گومڕاییە، بۆیە دەرچوون نییە لە یەکێك لەم سێ ڕێگەیە: **ڕێگەی پێغەمبەر**(ﷺ) و ئەوەی لەگەڵ خۆی هێنای، **ڕێگەی ئەهلی خەشم**(خەشملێگیراوان) کە حەقیان ناسی و لەگەڵ ئەوەشدا چوون بە گژیدا، لەگەڵ **ڕێگەی ئەهلی گومڕایی** کە بریتییە لە ڕێگەی ئەو کەسانەی خودا گومڕای کردن لە دۆزینەوەی حەق، بۆ ئەم مەبەستە عەبدوڵای کوڕی عەباس و جابری کوڕی عەبدوڵا -خوایان لێ ڕازی بێت-دەفەرموون ((شاڕێگەی ڕاست و دروست (**الصراط المستقيم**) بریتییە لە ئیسلام))، **عەبدوڵای کوڕی مەسعود و عەلی کوڕی ئەبی تالب-خوایان لێ ڕازی بێت**-دەفەرموون (ئەو شاڕێگەیە بریتییە لە قورئان) لەم بارەیەوە فەرموودەیەکی "بەرزکراوە" لەلای **ترمذي** و کەسانی تریش ریوایەتکراوە.

سـەهلی کـوڕی عەبـدوڵا دەفـەرموێت ((ئـەو ڕێگەیـە بریتییـە لـە ڕێگـەی سـوننە و جەماعەت))، "بكـر بـن عبـدالله المزنـي"ش دەڵێـت ((ئـەو ڕێگەیـە بریتییـە لـە ڕێگـەی پێغەمبەر(ﷺ) )).

هیچ گومانی تێدا نییە ئەوەی پێغەمبەر و یارانی لەسـەری بـوون بـە زانسـت و کـردار بریتی بووە لە ناسینی حەق و پێشخسـتن و هەڵبـژاردنی بەسـەر هەرچـی شـتی تـردا، ئەمەش بریتییە لە شاڕێگەی ڕاست و دروست. هەموو ئەم قسانەی پێشەوە ئامـاژەن بۆ سەر ئەو شاڕێگەیە و کۆکەرەوەی مانای ڕێگەکەن.

بەم شێوە کورت و پوختە تێدەگەیت هەرچی پێچەوانەی ئەمە بێت پووچ و بێبنەمایـە و دەچێتەوە سەر ڕێگەی دوو ئومەتەکە: ئومەتی خەشم و ئومەتی گومڕایی.

## ۞ ساغکردنەوەی پەروەردگاریی ئاتاجی بەڵگە نییە

**ڕێگەی دووەم، بەدووورودرێژی:** بەناسینی مەزهەبی بەتاڵ و بێبنـەما و پووچـکردنەوەیان بـە وشـەکانی سـورەتی "**الفاتحـة**". بۆیـە دەڵـێین: خـەڵکی دوو بەشـن: دانپیانـەر بـە حەقـدا(بـە خـودادا) و ملپێچـیکەر لـە حـەق، سـورەتی"**الفاتحـة**" بـوونی دروسـتکەر یەکلادەکاتـەوە و بەرپەرچـی ئەوانـە دەداتـەوە کـە ملپێچـی دەکـەن، ئـەوەش بـە جێگیرکردن و ساغکردنەوەی پەروەردگاریی خودا بۆ هەموو جیهانەکان.

لە دۆخـی هـەموو جیهـان ڕابمێنـە، بـاڵا و نزمـی، بـە هـەموو بەشـەکانییەوە، دەبـینی گـەواهی بـوونی دروسـتکەر و بەدیهێنـەر و مـەلیکی دروسـتکراوەکان دەدەن، بـاوەڕ نەبوون بە دروستکەر و نەرێکردنی وەك باوەڕنەبوون وایە بە بوونی زانست لە ئـەقڵ و فیترەتـدا، جیـاوازی نییـە لەنێوانیانـدا، بـەڵکو بەڵگـەی بـوونی دروسـتکەر لەسـەر دروسـتکراوەکانی و بەڵگـەی کارکـەر لەسـەر کارەکـەی و بەدیهێنـەر لەسـەر بەدیهێنراوەکـەی لـەلای ژیـری پـاك و پرشـنگدار و بـاڵا و لـەلای فیترەتـی تەندروست ڕوونتر و ڕۆشنترە لە پێچەوانەکەی.

ئەگەر خەڵکی کردارەکانی خودا و بەدیهاتووەکانی بکەنە بەڵگە لەسـەر بـوونی خـودا، ئەوا خوداناسانی خـاوەن بینـینی ڕۆشـن خـودا دەکەنـە بەڵگـە لەسـەر کردارەکـانی و بـەدیهاتووەکانی، هـەردوو ڕێگەکـە ڕاسـت و دروسـتن، هـەردووکیان حـەقن و قورئـان هەردوو ڕێگەکەی لەخۆ گرتووە.

بەڵگە هێنانەوە بە بەدیهاتووەکان زۆرن، بەڵام بەڵگەهێنانەوە بە خودا لەسەر بەدیهاتووەکان شان و شکۆی تایبەت بەخۆی هەیە، ئەمە ئەو ئاماژەیە پێغەمبەران دەیانکردە بەڵگە و بە گەلانی خۆیان دەوت ﴿أَفِي اللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ إبراهيم: ١٠، واتە چ گومانێك لە بوونی خودادا هەیە تا بەڵگە لەسەر بوونی بهێننەوە؟ چ بەڵگەیەك رۆشنتر و دەرکەوتووترە لەو حەقەی بەڵگەی لەسەر دەهێنرێتەوە؟ چۆن دەبێت ناڕوون و نائاشکرا بکرێتە بەڵگە لەسەر روون و ئاشکرا؟ پاشان بەئاگایان دێننەوە بە وتنی ﴿فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾.

لە "**شيخ الإسلام تقي الدين بن تيمية -قدس الله روحه-**"م بیست، دەیفەرموو: چۆن بەڵگە لەسەر بوونی کەسێك داوادەکرێت کە بۆخۆی بەڵگەیە لەسەر هەموو شتێك؟ زۆرجار ئەم دێڕە هۆنراوەی دەکردە نموونە:

**وليس يصح في الأذهان شيء     إذا احتاج النهار إلى دليل**

(هیچ شتێك لە بیر و زەینی مرۆڤدا بەڕاست ناگەڕێت، گەر رۆژ پێویستی بە بەڵگە بێت)

ئاشکرایە بوونی خودای موتەعال لە ژیری و فیترەتدا ئاشکراترە لەبوونی خۆر، هەرکەس لە ژیری و فیترەتیدا ئەوە نەبینێت با گومانیان لێ بکات.

## ❁ جیاوازی خەڵکی لە خواوەندی خودادا

چەند دەستەیەك لەناو خەڵکیدا هەن فیترەتیان ئەم برە لە حەقیان نیشان دەدات، لە پەروەردگاری خودادا هیچ کەس بە هاوەڵ بۆ خودا دانانێن، خودایەکی تر لەگەڵ خودا بڕیار نادەن، بەڵام لە خواوەندی خودادا هاوەڵ بڕیار دەدەن، ئەوان دان بەوەدا دەنێن کە خودا بەتەنها پەروەردگار و مەلیك و دروستکەری هەموو شتێکە، ئەو پەروەردگاری خۆیان و باب و باپیرانیانە، پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکە و پەروەردگاری عەرشی مەزنە، لەگەڵ ئەو دان پیادانانەشدا جگە لە خودا کەسێکی تر یان شتێکی تر دەپەرستن، لەخوار خوداوە کەسانی تر لە خۆشەویستی و گوێڕایەڵی و بەمەزن زانین بە خودا یەکسان دەکەن. ئەو دەستەیە ئەوانەن کە لەخوار خوداوە کۆلکە خواوەندیان پەرست، ئەوانە وەفایان نەکرد بە مافی ((**إياك نعبد**))-تەنها تۆ دەپەرستین، هەرچەند بەشیان لە دەتپەرستین((**نعبدك**))دا هەبوو، بەڵام بەشیان لە

((إياك نعبد))دا نەبوو كە ماناكەی ئەم راستییە لەئامێز دەگرێت: بە خۆشەویستی و ترس و گوێڕایەڵی و بەمەزن زانین هیچ كەس ناپەرستین جگە لە تۆ، ((إياك نعبد)) تەحقیق كردنی ئەو یەكتاپەرستییە و پووچكردنەوەی هاوەڵدانانە لە خوایەتی خودادا، وەك چۆن ((إياك نستعين)) تەحقیق كردنی یەكتاپەرستی پەروەردگارییە، هەر بەو جۆرە ((إهدنا الصراط المستقيم، صراط الذين أنعمت عليهم)) ئەوانە ئەهلی یەكتاپەرستین و ئەهلی تەحقیقی ((إياك نعبد وإياك نستعين))ن، ئەهلی هاوەڵدانانیش بریتین لە ئەهلی خەشم و گومڕایی.

## ۞ پەكخستنی پەكخستووان

سورەتی "الفاتحة" بەرپەرچدانەوەی جەهەمییەكانی تێدایە كە پەكخەری سیفاتی خودای موتەعالن، ئەوان ئەهلی یەكتاپەرستی ناتەواون، ئەوانەی نەرێی ئەوە دەكەن كە زاتی خودای موتەعال خاوەنی سیفاتی "زانست و توانین و ڕۆزی، هتد.."بێت، ئەمەش لە چەند روویەكەوە:

یەكەم: لە وتنی (الحمدلله)، جێگیركردنی ستایشی تەواو بۆ خودا داوادەكات هەموو ئەوەی لەسەری ستایشكراوە بۆی جێگیر بكرێت، لە سیفاتی كەماڵ و شكۆمەندی و جوانی، چونكە كەسێك سیفاتی كەماڵی نەبێت بەرەهایی ستایشكراو نییە، بۆیە لەڕوویەكەوە ستایشكراوە، بەڵام لە روویەكی ترەوە ستایش ناكرێت، واتە لە هەموو روویەكەوە و لە هەموو رێگەیەكەوە بە هەموو جۆرەكانی "حمد" ستایش ناكرێت، تەنها كەسێك هەموو ستایشێكی بۆ هەیە كە خاوەنی سیفاتی كەماڵ بێت، گەر تەنها یەك سیفەتی ناتەواو بێت بەپێی ئەوە لە ستایشەكەی كەم دەبێتەوە.

هەر بەو جۆرە لە جێگیركردنی سیفەتی بەزەیی(الرحمة) بۆی: دەبێ هەموو ئەو سیفەتانەی بۆ بەزەیی پێویستن لەخۆ بگرێت لە (زیندوێتی، ویست و توانین و بیستن و بینین، هتد...)

هەروەها سیفەتی پەروەردگاریی: هەموو سیفەتەكانی كردار و سیفەتی خواوەندی و سەرجەم سیفەتەكانی كەماڵ داوا دەكات، لە خود و لە كرداردا وەك پێشتر ڕۆشنمان كردەوە.

بەوەی ستايشكراوە و خواوەندە و پەروەردگارە، و رەحمان و رەحيمە، و مەليك و پەرستراوە، و كۆمەككار و رێنماييكەر و نيعمەتبەخشە، و رازی دەبێت و تووڕە دەبێت -لەگەڵ نەرێكردنی راوەستاويی سيفات بەو خودايەوە- كۆكردنەوەی دوو دژە، بۆيە هەرگيز نابێت و بۆ خودا شياو نييە.

ئەم رێگەيە جێگيركردنی سيفاتی هەواڵيی لە دوو روەوە لەخۆ دەگرێت:

**يەكەميان رێگەی ژيری:** ئەو سيفەتانە لە پێويستييەكانی كەماڵی رەهان، دەست بەسەر عەرشدا گرتن **(الإستواء على العرش)** لە پێويستييەكانی بالأبوون (علو)ی خودای موتەعالن، دابەزينی بۆ ئاسمانی دونيا لە نيوەی دووەمی هەموو شەوێكدا لە پێويستييەكانی پەروەردگاری و بەزەييە، هەر بەو جۆرە تەواوی سيفاتی هەواڵيی.

**دووەميان رێگەی بە گوێ بيستن:** وەك مەدح و سەنای خودای موتەعال و خۆناساندنی بە بەندەكانی، نەرێكردنی ئەو سيفەتانە لەوەی ئاماژەی پێ دەدەن و پێيان مەبەستە پێچەوانەی ئەوەيە بۆی هاتوون، دەتوانيت بە رێگەی بيستن كە لە كەماڵدايە بەڵگە بهێنيتەوە، هەروەها بە رێگەی ژيريش وەك پێشترمان ئاماژەمان پێداوە.

### ۞ تێكشكانی جەبرييەكان

هەر بەو جۆرە ئەم سورەتە بەرپەرچدانەوەی جەبرييەكانيش لەخۆ دەگرێت، كە دەڵێن: مرۆڤ هيچ ويست و هەڵبژاردەيەكی بۆ نييە لە ئەنجامدانی كردارەكانيدا.

ئەم بەرپەرچدانەوەيەش لە چەند روويەكەوە:

**يەكەم:** لە جێگيركردنی ستايشی خودا-**سبحانه**- بەگشتی، ئەم ستايشكردنە داوا دەكات كە بەندەكانی سزا نەدات لەسەر شتێك كە توانايان نييە بەسەريدا و كرداری ئەوان نييە، بەڵكو ئەو كردارانە وەك رەنگ و درێژی و كورتی جەستەيان هيچ ويستێكی ئەوانی تێدا نييە، ئەو-**سبحانه**- لەسەر شتێك سزايان دەدات كە خۆی پێی ئەنجامداون، ئەو بكەری راستەقينەی خراپەكانيانە، لەگەڵ ئەوەشدا لەسەر ئەو كارانە سزايان دەدات، ستايشكردنی خودا هەموو ئەمانە رەد دەكاتەوە و بەتوندی نەرێيان دەكات، پاكێتی و مەزنی بۆ خودايەك كە هەرچی ستايشە شايستەی ئەوە لەم تۆمەتانەی دەدرێنە پاڵی، خودا سزايان دەدا لەسەر كردارگەلێكی خراپ كە بەڕاستی

ئەنجامیان دابێت، ئەو کردارە خراپانە کرداری خودا نین، بەڵکو کرداری ئەو-سبحانه- دادپەروەری و خێر و چاکەیە.

**رووی دووەم:** جێگیرکردنی بەزەیی و رەحمانبوونی خودا ئەوە نەرێ دەکات، چونکە هەرگیز گونجاو نییە ئەو دوو دۆخە کۆبکرێنەوە، خودا رەحمان و رەحیم بێت و لەگەڵ ئەوەشدا سزای بەندەکەی بدات لەسەر شتێك کە هیچ دەسەڵاتێکی ئەوی تێدا نییە و کرداری ئەو نییە، بەڵکو داوایەکی لێکردووە کە لە توانایدا نییە و دەستی بەسەریدا ناڕوات، پاشان لەسەری سزای بەندەکەی دەدات، ئایا ئەمە پێچەوانەی بەزەیی و دژی بەزەیی و هەڵوەشانەوەی بەزەیی خودا نییە؟ ئایا لە تێگەیشتنی کەسێکدا کۆبوونەوەی ئەمە و بەزەیی کامڵ و تەواو لە یەك زاتدا بەڕاست دەزانرێت؟

**رووی سێیەم:** جێگیرکردنی بەندایەتی و پەرستن و کۆمەکی کردنیان لەسەری و دانەپاڵی بەندایەتی و داواکردنی کۆمەکی بۆ لای بەندەکانی ((**نعبد، نستعین**)) کە دانەپاڵی راستەقینەیە نەك مەجازی، خودا وەسف ناکرێت بە بەندایەتی و پەنابردن و داواکردنی کۆمەك کە کار و کردەوەی بەندەکانییەتی، بەڵکو لەڕاستیدا مرۆڤ بەندە و پەنابەرە بۆ خودا، خودا پەرستراو و پەنابۆبراوە (**المعبود و المستعان**)

## ۞ ساغکردنەوەی پێغەمبەرایەتی

سورەتی "**الفاتحة**" بەرپەرچدانەوەی نەرێکەری پێغەمبەرایەتی تێدایە.

ئەمەش لە چەند روویەکەوە:

**یەکەم:** جێگیرکردنی ستایش(حمد)ی تەواو بۆ خودا، ئەم کەماڵی ستایشە داوای حیکمەتی خودا دەکات بەوەی دروستکراوەکانی بە هەوانتە بەدینەهێنابێت، هەرواش دەستبەرداریان نەبێت، فرمانیان پێ بکات و رێگرییان لێ بکات، بۆیە لە چەندین شوێنی قورئاندا خودا لەو کارە خۆی بەپاك راگرتووە، هەواڵی داوە کە هەر کەس پەیام و پێغەمبەرایەتی نەرێ بکات و پێیوابێت هیچ شتێك بۆ سەر مرۆڤ دانەبەزیوە، ئەو کەسە بە حەق خودای نەناسیوە و رێز و شکۆی تەواوی بە خودا نەداوە، بەڵکو خودای داوەتە پاڵ شتێك کە شایستەی نییە و ستایشکردن و مەزنڕاگرتنی خودا ئەو جۆرە لە دانە پاڵ رەد دەکاتەوە.

هەر کەسێك مافی ستایش بدات -لەڕووی زانست و ناسین و بینینی قووڵەوە- ئەوا ((أشهد أن محمدا رسول الله))ی لێ دەردەهێنێت، وەك چۆن ((أشهد أن لا إله إلا الله))ی لێ وەردەگرێت، ئەو کات بۆی دەردەکەوێت کە پەکخستنی پێغەمبەرایەتی -لە نەرێکردنی بۆ ستایش- وەك پەکخستنی سیفاتی کەماڵ وایە، بەڵکو وەك جێگیرکردنی هاوەڵ و کۆلکە خودا وایە لەپاڵ خودادا.

**دووەم:** خواوەندی خودا: لەبەرئەوەی خودا "إلـه"ە کەوابوو دەبێت پەرستراوێکی بەگوێکراو (معبودا مطاعا) بێت، هیچ رێگەیەك نییە بۆ زانینی ئەوەی خودای پێ دەپەرسترێ و ئەوەی گوێڕایەڵی خودای لەسەر دەکرێت لە رێگەی پێغەمبەرانەوە نەبێت.

**سێیەم:** بەوەی پەروەردگارە ئەوا سیفەتی پەروەردگاریی داوا دەکات فەرمان و رێگری هەبێت بۆ بەندەکانی، پاداشتی چاکەکاران بە چاکە بداتەوە و سزای خراپەکاران بە خراپەکانیان بدات، ئەمە حەقیقەتی پەروەردگارییە، ئەوەش جێبەجێ نابێت بە پەیام و پێغەمبەرایەتی نەبێت.

**چوارەم:** بەوەی رەحمان و رەحیمە، ئەوا کەماڵی بەزەیی داوادەکات خۆی و سیفەتاکانی بە بەندەکانی بناسێنێت، ئەوەیان نیشان بدات کە لە خوایان نزیك دەکاتەوە، هەروەها ئەوەیان بخاتە بەردەم لە ئەو-سبحانە- دووریان دەخاتەوە، پاداشتیان لەسەر گوێڕایەڵی بەچاکە دەداتەوە، ئەمەش بە پێغەمبەرایەتی و پەیام نەبێت نایەتە دی، کەوابوو بەزەیی خودا داوا دەکات پەیام و پێغەمبەرایەتی بوونی هەبێت.

**پێنجەم:** بەوەی مەلیکە و خاوەنی موڵکە. موڵك داوا دەکات بە قسە و گوفتار تاوتوێی دەسەڵاتەکەی بکات، هەروەك چۆم موڵك داوا دەکات بە کردار تاوتوێ بکات، مەلیك کەسێکە بە بڕیار و گوفتار تاوتوێی موڵکەکەی دەکات، چۆنی بوێت بەو جۆرە فەرمانەکان و مەراسیمەکانی جێبەجێ دەکات، مالیکیش تاوتوێکەرە لە موڵکەکەیدا بە کارەکانی، خودا خاوەنی موڵکە و بە گوفتار و کردار تاوتوێی دروستکراوەکانی دەکات.

تاوتوێکردن بە گوفتار دوو جۆرە: تاوتوێکردن بە کەلیماتە گەردوونییەکانی، هەروەها تاوتوێکردن بە کەلیماتە ئاینییەکانی، کەماڵی موڵکیش بەو دوانەوەیە.

**رەوانەکردنی پێغەمبەران:** پێویستیی کەماڵی موڵك و دەسەڵاتی خودایە، ئەمە شێوەی ئەو "مەلیك"ە ژنەوراوەیە لە فیترەت و ژیری مرۆڤدا بوونی هەیە، هەر مەلیکێك پەیامنێری نەبێت کە بلاوەیان پێبکات لە مەملەکەتەکەیدا ئەو کەسە مەلیك نییە.

بەم ڕێگەیە بوونی فریشتە دەزانرێت و دەژنەورێت، باوەڕ بە فریشتە لە پێویستییەكانی باوەڕە بە موڵكی خودا، ئەوان پەیامهێنی خودان لە بوون و بڕیار(الخلق والأمر)ی خودادا.

**شەشەم:** ساغبوونەوەی (یوم الدین) كە بریتییە لە ڕۆژی تۆڵە و پاداشت، ئەو ڕۆژەی خودا بە كرداری بەندەكان –چاك یان خراپ– پاداشت و سزا دیاری دەكات، ئەمەش كاتێك دێتە دی پەیام و پێغەمبەرایەتی ڕەوانە بكرێت، بەڵگە بخرێتە ڕوو كە بەهۆیەوە گوێڕایەڵ و یاخی بوو حەقی خۆیان وەربگرن.

**حەوتەم:** بەوەی پەرستراو (معبود)ە، ئەوا دەبێت بەوە بپەرسترێت كە خۆشی دەوێت و پێی ڕازییە، هیچ ڕێگەیەك لەبەردەم مرۆڤدا نییە بزانێت خودا چی پێخۆشە و لە چی ڕازییە لە ڕێگەی پێغەمبەرانەوە نەبێت، ئەوەی نەڕێی پێغەمبەران دەكات نەڕێی ئەوە دەكات خودا پەرستراو بێت.

**هەشتەم:** بەوەی خودا هیدایەتدەرە بۆ سەر شاڕێگەی ڕاست و ڕەوان، ئەوەش بریتییە لە ناسینی حەق و كاركردن بە حەق، ئەو ڕێگەیەش نزیكترین ڕێگەیە بۆ گەیشتن بە خودا، چونكە هێڵی ڕاست نزیكترین ماوەی نێوان دوو خاڵە، ئەو ڕێگەیەش نازانرێت لە ڕێگەی پێغەمبەرانەوە نەبێت، ناسینی حەق و كاركردن بە حەق تەنها لە ڕێی پێغەمبەرانەوەیە و لەسەر ئەوان وەستاوە، بەڵكو وەستانەكەی لەسەر ئەوان زۆر پێویستە، پێویستر لە وەستانی ڕێگەی هەست لەسەر تەندروستی هەستەكان.

**نۆیەم:** بەوەی نیعمەتبەخشە بە ئەهلی هیدایەت بۆ سەر شاڕێگەی ڕاست و دروست، نیعمەتی خودا لەسەر مرۆڤ بە ناردنی پێغەمبەرانە بۆیان، تاكو بیانكات بە وەرگری پەیامەكە و وەڵامدەرەوەی بانگەوازەكەی، لەم ڕێگەیەوە خودا منەتی خۆی و نیعمەتەكانی لە قورئاندا یادی بەندەكانی دەخاتەوە.

**دەیەم:** دابەشبوونی بەندەكانی بۆ نیعمەتداران و خەشملێگیراوان و گومڕایان، ئەم دابەشبوونە پێویستە بەپێی دابەشبوونیان لە ناسینی حەق و كار پێ كردنی، زانا بە حەق و كاركەر بە داواكانی حەق بریتین لە ئەهلی نیعمەت، زانا بە حەق و سەرپێچیكەر لە حەق بریتین لە خەشملێگیراوان، نەزان بە حەقیش بریتین لە گومڕایان، ئەم دابەشبوونە دوای ناردنی پێغەمبەران سەریان هەڵداوە، گەر

پێغەمبەران نەبوونایە تەنها یەك ئوممەت دەبوون، دابەشبوونیان بۆ ئەو بەشانە بەبێ ناردنی پەیام هەرگیز روونادات، ئەو بەشانە بەپێی واقیع پێویستن، چونکە ناردنی پەیام پێویستە.

لەم رێگەیەوە و لەوەی پێشتریش لات ئاشکرابوو: کە سورەتەکە بەیانی ساغبوونەوەی پاداشت و سزا و ئەمر و نەهی لەئامێز دەگرێت، ئەوەش ئەو حەقەیە ئاسمانەکان و زەوی لە پێناودا دروستکراوە و دونیا و دوارۆژی بۆ دانراوە، هەر ئەوەشە داواکاری بوون و بڕیار، نەرێکردنی ئەو حەقە نەرێ کردنی بوون و بڕیارە.

### ۞ خودا لەگەڵ موسا ئاخافتنی کرد

گەر پێغەمبەرایەتی و پەیام ساغبوویەوە ئەوا سیفەتی قسەکردن و ئاخافتن جێگیر دەبێت. راستێتی پەیام بریتییە لە گەیاندنی قسەی نێرەرەکە (خودا). گەر کەلام بوونی نەبێت پێغەمبەرەکە چی بگەیەنێت؟ بەڵکو چۆن دەژنەورێت ئەو کەسە پەیامهێن بێت؟ بۆیە چەندین کەس لە پێشین دەڵێن: هەر کەس نەرێی ئەوە بکات کە خودا خاوەنی کەلامە و ئاخافتنی کردووە، یان نەرێی ئەوە بکات قورئان کەلامی خودا بێت، ئەوە نەرێی پەیامی محمدی کردووە (ﷺ) بەڵکو نەرێی پەیامی تەواوی پێغەمبەران کە راستییەکەی بریتییە لە: گەیاندنی کەلامی خودا -تبارك وتعالى- بۆیە نەرێکارانی پەیامی محمد(ﷺ) دەربارەی قورئان دەیانوت ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ ﴿٢٤﴾ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ ﴿٢٥﴾﴾ المدثر: ٢٤-٢٥، مەبەستیان ئەو قورئانە بیستراوە بوو کە پێیانگەیشت و ئاگادارکرانەوە لەسەری.

هەر کەس بڵێ: خودا بەم قورئانە قسەی نەکردووە (واتە قورئان کەلامی خودا نییە)، قسەی ئەو کەسە وەك قسەی بێباوەڕانی "مەکە" وایە، بەرزی و شکۆمەندی بۆ خودا لەوەی ستەمکاران دەیڵێن.

۞ ۞ ۞

## پەرسش و داوای كۆمەك

نهێنی بوون و بڕیار، وكتێب و شەریعەت، وپاداشت وسزا: كۆتاییەكەیان دەگاتە ئەم دوو وشەیە (**إياك نعبد وإياك نستعين**) ئەو دوانەش لەنێوان پەروەردگار و بەندەكەیدا بۆ دوو بەش دابەشبووە، نیوەی بۆ خودایە كە بریتییە لە ((**إياك نعبد**)) و نیوەی بۆ بەندەكەیەتی كە بریتییە لە ((**إياك نستعين**)).

**پەرستن دوو بنچینە كۆدەكاتەوە:** لوتكەی خۆشەویستی لەگەڵ لوتكەی ملكەچی و چوونە ژێر فەرمانەوە، عەرەب دەڵێن: "**طريق معبد**" واتە ڕێگەیەكی تەخت، "**التعبد**" واتە "**التذلل**" گەردنكەچی و فەرمانبەرداری. گەر كەسێكت خۆشویست و بۆی ملكەچ نەبوویت و نەچوویە ژێر فەرمانییەوە ئەوە تۆ بەندەی ئەو نیت، گەر بۆی ملكەچ بوویت و چوویە ژێر فەرمانییەوە و خۆشتنەویست ئەوە تۆ بەندەی ئەو نیت، تا خۆشتدەوێت و بۆی ملكەچ دەبی و دەچییە ژێر فەرمانییەوە. لێرەدا نەرێكارانی خۆشەویستی بەندەكان بۆ پەروەردگاریان، نەرێی ڕاستێتی بەندایەتی دەكەن، هەروەها نەرێی ئەوە دەكەن كە پەروەردگار خۆشەویستی بەندەكانی بێت. خودا لوتكەی داوای بەندەكانییەتی و ڕووی جوانی ئەو دواین داوایانە. ئەوانە بەو نەرێكردنەیان نەرێی ئەوە دەكەن كە خودا "إله" بێت، هەرچەند دانیان بەوەدا ناوە كە خودا پەروەردگار و دروستكەری جیهانەكانە، ئەمە لوتكەی یەكتاپەرستی ئەو دەستەیەیە كە یەكتاییە لە پەروەردگارییدا و هاوەڵدانەرانی عەرەب دانیان پیادا نابوو، لەگەڵ ئەوەشدا بەو جۆرە یەكتاییە لە هاوەڵدانان نەهاتنە دەرەوە، خودا دەفەرموێت ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ﴿٨٧﴾ ﴾ الزخرف: ٨٧، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾ لقمان: ٢٥، ﴿ قُل لِّمَنِ الْأَرْضُ وَمَن فِيهَا إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٤﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٨٥﴾ قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ﴿٨٦﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٨٧﴾ قُلْ مَن بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٨﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾ المؤمنون: ٨٤–٨٩، بۆ ئەو مەبەستە خودا یەكتایی خۆی لە پەروەردگاریدا دەكاتە

بەڵگە بۆ سەر یەكتایی لە خواوەندیدا و دروست نییە جگە لە خودا كەسێكی تر بپەرسترێت، وەك چۆن هیچ دروستكەر و پەروەردگارێك جگە لە "الله" بوونی نییە.

داوای كۆمەك دوو بنچینە كۆدەكاتەوە: متمانە بە خودا و شانددان لەسەری، كەسێك متمانە بە كەسێك دەكات، بەڵام لە كارەكانیدا شانی لەسەر دانادات –لەگەڵ ئەوەی كە متمانەی پێیەتی– بەهۆی بێنیازی ئەو لە كەسەكە، لەوانەیە شانی لەسەر دابدات لەگەڵ بێمتمانەیی بەو كەسە، بەهۆی پێویستی ئەو بە كەسەكە، هەروەها بەهۆی نەبوونی كەسێكی تر بەو كارە هەڵبسێت، بۆیە ئاتاجی شانددان دەبێت لەسەری، لەگەڵ ئەوەی كە بێمتمانەیە پێی.

**پشتبەستن (التوكل)** مانایەكە ئەو دوو بنچینەیە دەگرێتە خۆ: لە متمانە و لە شانددان لەسەری، ئەوەش حەقیقەتی ((**إياك نعبد و إياك نستعين**))ە، پشتبەستن لە چەندین شوێنی قورئاندا باس كراوە و ئەو دوو بنچینەی كۆكردۆتەوە كە ئایەتەكەی سورەتی "**الفاتحة**"یەكێكە لەو ئامارانە.

دووەم ئامارەی قورئان بەو بنچینەیە: قسەكەی شوعەیبە (عليه السلام) ﴿وَمَا تَوْفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ﴾ هود: ٨٨

سێیەم ئەم ئایەتە پیرۆزەیە: ﴿وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ﴾ هود: ١٢٣

چوارەم: ﴿رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٤﴾﴾ الممتحنة: ٤

پێنجەم: ﴿وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلًا ﴿٨﴾ رَّبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذْهُ وَكِيلًا﴾ المزمل: ٨ – ٩

شەشەم: ﴿قُلْ هُوَ رَبِّي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ مَتَابِ﴾ الرعد: ٣٠.

ئەمە شەش ئامارە قورئانییە كە ئەو دوو بنچینەیە كۆدەكاتەوە بریتین لە ((**إياك نعبد وإياك نستعين**))

پێشخستنی پەرستن ((**العبادة**)) بەسەر داوای كۆمەك ((**الإستعانة**))دا لە سورەتی "**الفاتحة**"دا لەپێشخستنی ئامانجە بەسەر هۆكارەكاندا، پەرستن بریتییە لەو ئامانجەی بەندەكانی لەپێناودا دروستكراوە، داوای كۆمەكیش هۆكارە بۆ بەندایەتی، لەبەرئەوەی ((**إياك نعبد**)) وابەستەی خواوەندی خودا و ناوی ((**الله**))یە و ((**إياك**

**نستعين**))یش وابەستەی پەروەردگاریی و ناوی ((الرب))ە بۆیە ((**إياك نعبد**))ی پێشخست بەسەر ((**إياك نستعين**))دا، وەك چۆن لەسەرەتای سورەتەكەدا ناوی ((**الله**))ی پێشخست بەسەر ناوی ((الرب))دا، چونكە ((**إياك نعبد**)) بەشی خودایە، بۆیە لە بەشی یەكەمدایە كە بریتییە لە مەدح و سەنای خودا بەوەی لەپێشترە پێی، ((**إياك نستعين**)) بەشی بەندەیە، بۆیە لە بەشەكەی خۆیدایە كە بریتییە لە ((**إهدنا الصراط المستقيم**)) و تا كۆتایی سورەتەكە.

لەبەرئەوەی داوای كۆمەك ((**الإستعانة**)) بەشێكە لە پەرستن ((**العبادة**)) بەبێ پێچەوانە، هەروەها لەبەر ئەوەی ((**الإستعانة**)) داوایە لە خودا و ((**العبادة**))ش داوایە بۆ ئەو.

لەبەرئەوەی ((**العبادة**)) ئەنجام نادرێت لە كەسی دڵسۆزەوە نەبێت، بەڵام ((**الإستعانة**)) لە كەسی دڵسۆز و نادڵسۆزەوە ئەنجام دەدرێت.

لەبەرئەوەی ((**العبادة**)) مافی خودایە و لەسەر تۆی پێویست كردووە و ((**الإستعانة**))ش داوای كۆمەكییە بۆ پەرستنی خودا، داوای كۆمەكی بەیانی چاكەی خودایە كە بە تۆی بەخشیوە، بۆیە بەجێهێنانی مافی خودا گرنگترە لە وەرگرتنی چاكەی خودایی.

لەبەرئەوەی ((**العبادة**)) شوكركردنی نیعمەتەكانی خودایە لەسەر تۆ، خودا پێیخۆشە شوكر بكرێت، كۆمەكی خودا((**الإعانة**)) كاری خودایە لەسەر تۆ و یارمەتی ئەوە بۆ تۆ، گەر پابەندی بەندایەتی خودا بیت و چوویتە ژێر نیری بەندایەتییەوە ئەوا خودا كۆمەكیت دەكات لەسەری، پابەندبوون بە بەندایەتییەوە و چوونە ژێر نیری بەندایەتی هۆی گەیشتنە بە كۆمەك و یارمەتی خودایی، تا بەندەكە بەندایەتییەكەی كامڵتر بێت یارمەتی و كۆمەك لە خوداوە بۆ ئەو گەورەتر دەبێت.

بەندایەتی ((**العبودية**)) بە دوو كۆمەك دەورەدراوە: یارمەتییەك بەر لە پابەندبوون و ئەنجامدانی بەندایەتی، یارمەتییەكیش دوای ئەنجامدانی بەندایەتی بەوەی كۆمەكی بكات بە ئەنجامدانی بەندایەتییەكی تر، بەو جۆرە بەبەردەوامی تا بەندەكە كۆچی دوایی دەكات.

هەموو ئەم نهێنیانە حیكمەتی ئەوە دەردەخەن بۆچی ((**إياك نعبد**)) بەسەر ((**إياك نستعين**))دا پێشخراوە.

پێشخستنی ((**المعبود**)) و ((المستعان)) بەسەر دوو فرمانەكەیاندا (مەبەست لە هاتنی دوو "إياك"ی پێش "نعبد" و "نستعين"ە)، چەند حیكمەتێكی تێدایە: ئەدەبی

بەندەکان لەگەڵ خودا بە پێشخستنی ناوەکەی بەسەر کارەکەیاندا، هەروەها گرنگی و لاکردنەوەی زۆر بەلای خودادا، هەروەها تایبەتمەندکردنی خودا بەو دوو شتە کە لە زمانەوانیدا پێی دەوترێت کورتهەڵهێنان و سنووردارکردن"الحصر"، هێزی ئەو شێوازە وەك ئەوە وایە بڵێت: (**لا نعبد إلا إياك و لانستعين إلا بك**)، دادوەر لەمەدا زەوقی زمانی عەرەبی و تێگەیشتنی قووڵە لە زمان.

تێرابمێنە لەم دوو ئایەتە ﴿وَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ﴾ البقرة: ٤٠، ﴿وَإِيَّٰيَ فَٱتَّقُونِ﴾ البقرة: ٤١ و بزانە هێزەکەی لەگەڵ (**لا ترهبوا غيري**)، (**ولا تتقوا سواي**) چۆن دەبینیت؟ ئەوانە وەك ئەوە وایە بڵێیت (لا نعبد غيرك) و (ولا نستعين بسواك)، هەر خاوەن زەوقێکی تەندروست لە زمانی عەرەبی ئەم تایبەتمەندییە هەست پێدەکات.

دووبارەکردنەوەی ((**إياك**)) بەڵگەیە لەسەر وابەستەبوونی ئەو دوو دەربڕینە (بەندایەتی و داوای کۆمەك) هەریەك بە فەرمانەکەی خۆیەوە، لە دووبارەکردنەوەی جێناودا (إياك) هێزی داواکردن بوونی هەیە کە لە سڕینەوەی جێناوەکەدا ئەو هێزە بوونی نامێنێت، گەر بە مەلیکێکت وت، بۆ نموونە: هەر تۆم خۆشدەوێت و هەر لە تۆ دەترسم"**إياك أحب وإياك أخاف**" لەم دەربڕینەدا خۆشەویستی و ترس تایبەت دەکەیت تەنها بەو کەسە و گرنگیدان بە ناوهێنانی، ئەمەش لە دەربڕینی (**إياك أحب** و **أخاف**)دا بوونی نییە.

### ۞ داوای کۆمەك لە خودا دەکەین بۆ بەندایەتیکردنی

گەر ئەمەت زانی، ئەوا خەڵکی لەم دوو بنچینەدا-پەرستن و داوای کۆمەك- چوار بەشن:

**بەرزترین و چاکترینیان:** ئەهلی پەرستن و داوای کۆمەککەرن بۆ پەرستن، پەرستنی خودا و داوای کۆمەك بۆ پەرستن و سەرکەوتنیان لەو کارەدا لوتکەی دواکاری و ئامانجیانە، بۆیە باشترین شتێك لە خودا-**تبارك وتعالى**- داوابکرێت: بریتییە لە داوای کۆمەکی بۆ ئەو کارانەی رەزامەندی خودای تێدایە، ئەو دوعایەش ئەوە بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) فێری خۆشەویستەکەی خۆی کرد "**معاذ بن جبل**" ((**يا معاذ، والله إني أحبك، فلا تنس أن تقول دبر كل صلاة: اللهم أعني على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك**))-

ئەی مەعاز سوێند بە خودا خۆشم دەوێیت، لەبیرت نەچێت لەدوای هەموو نوێـژێك بڵێیت: "اللهم أعني على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك".

بۆیە بەسوودترین دوعا داواکردنی کۆمەکییە بۆ کارێك لە رەزامەندی خودادا بێت، باشترین بەخشش: بەهاناهاتنی خودایە بۆ پێدانی ئەو داوایە بە بەندەکەی، خولگەی هەرچی داوا و نزای بەدەستگەیشتووە لەسەر ئەم راستییەیە و پاڵپێوەنانی دژەکەی و کامڵکردن و ئاسان کردنی هۆکارەکانیەتی، بۆیە لێیڕابمێنە و سوودیان لێ ببینە.

"شيخ الإسلام ابن تيمية -قدس روحه-" دەفەرموێت: سەرنجمدا لە بەسوودترین دوعا بینیم بریتییە لە داوای بەندەی خودا بۆ کاروبارێك لە رەزامەندی خودادا بێت، پاشان لە سورەتی "الفاتحة"دا بینیمەوە ((إياك نعبد وإياك نستعين))

## ۞ پارمەتی بێباوەڕ بیانوو بڕین و بەڵگەی زیاترە لەسەری

**بەرانبەر ئەوەی یەکەم بەشی دووەمە:** ئەوانەی پشتیان کردۆتە پەرستن و داوای کۆمەك، نە پەرستنیان هەیە و نە داوای کۆمەك، بەڵکو گەر کەسێك لەوانە داوای لە خودا کرد و پەنای بۆ برد ئەوە بۆ بەش و حەزی خۆیەتی، نەك بۆ رەزامەندی خودا و مافی خودا لەسەری، ئەو-سبحانه- هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە داوای لێدەکەن، دۆستەکانی خودا و دوژمنەکانی داوای لێدەکەن، ئەویش-سبحانه- کۆمەکی هەردوو لایان دەکات.

خراپترین دروستکراوی، دوژمنی خودا ئیبلیسە -لەگەڵ ئەوەدا- داوای لە خودا کرد و خوداش پێیدا و بەوە خۆشحاڵی کرد (ئاماژە بە ئایەتی ﴿ قَالَ أَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤﴾ قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿١٥﴾ ﴾ الأعراف: ١٤ – ١٥ دەکات، بەڵام لەبەر ئەوەی کۆمەکی نییە بۆ رازی کردنی خودا بوو بە زیادە بەدبەختی ئیبلیس و دوورکەوتنەوەی لە خودا و دەرکردنی لە بەزەیی خۆی، هەر بەو جۆرە هەموو ئەوانەی داوای کۆمەك دەکەن بۆ کارێك کە کارەکە یارمەتیدەر نەبێت بۆ ملکەچی و گوێڕایەڵی خودا دەبێتە دوورخستنەوە لە رەزامەندی ئەو و رێگەی خودای لێ دەبڕێتەوە.

با کەسی ژیرمەند لە ناخی خۆیدا لەمە و غەیری ئەمە رابمێنێت، بزانێت وەڵام و بەدەمەوەچوون بۆ ئەو کەسەی هەموو کات داوا لە خودا دەکات و خوداش وەڵامی دەداتەوە بۆ رێز و حورمەتی کەسەکە ناگەڕێتەوە، بەڵکو بەندەکەی داوایەکی لێدەکات و بۆی جێبەجێ دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کارە داواکراوە تیاچوون و

بەدبەختی ئەوی تێدایە، جێبەجێ کردنی داواکەی لە سووکی و کەمیی بەندەکەیەتی لەلای و لەبەرچاوکەوتنیەتی، پێ نەبەخشین و رێگری کردن لە داواکەی بۆ رێزی ئەو کەسە لەلای خودا و خۆشەویستی ئەو-سبحانە- بۆ بەندەکەی دەگەڕێتەوە، بۆیە رێگری لێ دەکات تاکو پاسەوانی بکات و بیپارێزێ و بە لوتفی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا بکات، ئەو بە نەزانی خۆی وا گومان دەبات خودا خۆشیناوێت و رێزی ناگرێت، دەبینێت خودا داوای خەڵکانی تر جێبەجێ دەکات گومانی بە پەروەردگاری بۆ دروست دەبێت، ئەمەش لە ناواخنی دڵیدایە و زۆرجار هەستی پێ ناکات، پارێزراو کەسێکە خودا پارێزراوی بکات، مرۆڤ لەسەر خۆی باشبینە(بصیر)، نیشانەی ئەمە: ململانێی لەگەڵ قەدەردا و سەرزەنشتی ناوەکی بۆی، وەك دەوترێت:

وعاجز الرأي مضياع لفرصته          حتى إذا فات أمر عاتب القدرا

(ئەوەی دەستەوسانە لە بیروبۆچوونیدا هەلەکانی خۆی لەدەست دەدات، تا هەموو شتێکی لەدەست دەچێت ئەوکات دەست دەکات بە لۆمەی قەدەر)

سوێند بە خودا گەر پەردە لەسەر ناخ و نهێنی خۆی لابدات دەبینێت کە سەرزەنشتی قەدەر دەکات و تۆمەتی دەداتەپاڵ، پێویست بوو ئاوا و ئاوا بێت، بەڵام من چی بکەم، کارەکە لەدەست مندا نەبوو؟ ژیرمەند نەیاری نەفسی خۆیەتی و نەفامیش نەیاری قەدەری پەروەردگاری.

زۆر ئاگاداربە لەوەی کە داوایەکی تایبەتی لێ بکەی خێر و سەرئەنجامەکەیت لێوە دیارنەبێت، گەر ناچاربوویت داوای بکەیت ئەوا ببیبەستەوە بە مەرجی زانستی خودای موتەعالەوە کە خێری تێدابێت، بۆیە ئیستیخارە بکە لەپێش داواکەتەوە، ئیستیخارەکەت با تەنها بە زمان نەبێت بەبێ مەعریفە، بەڵکو ئیستیخارەی کەسێك کە زانستی بە بەرژەوەندی خۆی نییە و توانای بەسەریدا ناشکێت و نازانێت وردەکارییەکانی چییە و ناتوانێت زیان و قازانج بەخۆی بگەیەنێت، بەڵکو گەر ئەو مرۆڤە بدرێتە دەست نەفسی خۆی بەتەواوی تیادەچێت و کارەکەی لەدەست دەچێت.

گەر بەبێ داوا شتێکی پێدای: داوای لێبکە بۆت بکات بە یارمەتیدەر لەسەر گوێڕایەڵی خۆی و گەیشتنە رەزامەندی ئەو-سبحانە-، نەیکات بە رێگر لەسەر رێگەی بەرەو خودا چوونت و لادانت لە رەزامەندی خودا، واگومان مەبە هەموو پێدانێك بەهۆی رێزی بەندەوەیە لەلای خودا، یان هەموو پێنەدانێك بەهۆی سوکی و کەم نرخی

بەندەکەوەیە لەلای ئەو–سبحانە– ﴿ فَأَمَّا ٱلْإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكْرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَكْرَمَنِ ﴿١٥﴾ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَهَٰنَنِ ﴿١٦﴾ كَلَّا ﴿١٧﴾ ﴾ الفجر: ١٥ – ١٧، واتە هەموو ئەوانەی پێم بەخشیون و نیعمەتم پێداون و بێنیازم کردوون بەهۆی ئەوەوە نییە کە ئەوانە لەلام خاوەنی ڕێزن، بەڵکو تاقیکردنەوەیە لەلایەن منەوە بۆ ئەوان، ئایا شوکرم دەکات تا زیاتر لەوەی پێبدەم، یان کوفری نیعمەتم دەکات و لێی وەردەگرمەوە و دەیدەم بە کەسێکی تر؟ ئەوانەش وا بە بەرتەسکبوونەوەی ڕۆزیی تاقیدەکەمەوە و ئەوەندەی دەدەمێ لێی زیاد نەبێت بەهۆی سوکی و کەمی ئەو بەندەیەوە نییە لەلام بەڵکو تاقیکردنەوەیەکە، ئایا ئارام دەگرێت؟ زیاتر و زۆرتر لەوەی پێ بدەم کە لەدەستی چووە لە ڕزق و ڕۆزی، یان بێزار و ناڕازی دەبێت و سەرئەنجامەکەی تووڕەیی و ناڕازیبوونی خودا دەبێت لە ئەو؟.

خودا–**سبحانە**– دەمکوتی ئەوانەی کرد کە گومانیان دەبرد فراوانی ڕۆزی ڕێزگرتن بێت و هەژاریش سوکایەتی، بۆیە فەرمووی: بەندەم تاقینەکردۆتەوە بە دەوڵەمەندی بەهۆی ڕێزییەوە لەلام، هەروەها تاقیمنەکردۆتەوە بە هەژاری بەهۆی کەمی و سوکی ئەو لەلای من، بۆیە ڕایگەیاند ڕێزداری و بێڕێزی لەسەر ماڵ و دارایی و فراوانی ڕۆزی و بەرتەسکییان ناسوڕێتەوە، خودا بە بێباوەڕ دەبەخشێت، نەك بەهۆی ڕێزییەوە، لە باوەڕدار دەگرێتەوە، نەك بۆ سوکایەتی پێکردنی، بەڵکو بە خوداناسی و خۆشەویستی و گوێڕایەڵی ڕێز لە کەسێك دەنێت و بە پشتهەڵکردن و یاخیبوونیش کەسێك سوك و ڕسوا دەکات، ستایش بۆ خودایە لە هەردوو بارەکەدا، ئەو دەوڵەمەندی ستایشکراوە، لێرەوە بەختەوەری دونیا و دواڕۆژ گەڕایەوە سەر ((**إياك نعبد و إياك نستعين**))

❁ ❁ ❁

## پەرستن بەبێ داوای کۆمەك ناتەواوە

**بەشی سێیەم:** ئەوانەی پەرستنیان هەیە بەبێ داوای کۆمەك، ئەمانەش دوو جۆرن:

**جۆری یەکەم:** قەدەرییەکان، ئەوانەی دەڵێن خودا هەموو شتێکی بە لوتف و قەدەر بۆ بەندەکەی بڕیوەتەوە، ئەو بەندەیە لە قەدەریدا کۆمەکی بۆ کارەکانی نەماوەتەوە، خودا کۆمەکی کردووە بە دروستکردنی ئەندامەکانی و تەندروستیان و ناساندنی ڕێگەکە و ناردنی پێغەمبەران و توانینی کەسەکە لە ئەنجامدانی کارەکەی، لەدوای ئەمانە کۆمەکییەکی بڕاوە و دیاریکراو نەماوە تا داوای بکات، بەڵکو خودا دۆستەکانی و دوژمنەکای لە کۆمەکیدا یەکسان کردووە، یارمەتی ئەوانەی داوە وەك چۆن یارمەتی ئەمانەی داوە، بەڵام دۆستەکانی خودا باوەڕیان بۆ خۆیان هەڵبژارد و دوژمنەکانی بێباوەڕی، بەبێ ئەوەی خودا دەستەی یەکەمی بە کۆمەکی زیادە تایبەت کردبێتەوە تا شایستەی باوەڕبن، ئەوانەی دووەمی بە بڕیارێکی تر ڕسوا کردبێت و بێباوەڕی شایستە کردبن. ئەمانە (واتە قەدەرییەکان) بەشێکی ناتەواویان لە پەرستن بەرکەوتووە، داوای کۆمەکی لەگەڵ پەرستنەکەیاندا نییە. ئەوانە دراونەتە دەست خودی خۆیان، دەرگای داوای کۆمەك و یەکتاپەرستییان بەڕوودا داخراوە، ئیبن عەباس -خودا لە خۆی و باوکی ڕازی بێت- دەڵێت: باوەڕ بە قەدەر یاسای یەکتاپەرستییە، هەر کەس باوەڕ بە خودا بهێنێت و قەدەری بەدرۆ زانی ئەوا بەدرۆزانینەکە یەکتاپەرستییەکەی هەڵدەوەشێنێتەوە.

**جۆری دووەم:** ئەوانەی پەرستن و ئەورادیان هەیە، بەڵام بەشیان لە "پشتبەستن بە خودا و داوای کۆمەکی" ناتەواوە، دڵیان فراوان نەبووە تا تێبگەن و هۆکارەکان بە قەدەرەوە گرێبدەن و لەناو قەدەردا بزریان بکەن، هەستانی قەدەر بە هاتن و ڕوودانی هۆکارەکان نابینن، ئەو هۆکارانە بەبێ قەدەر وەك مردووەکان وان کە هیچ کاریگەرییەکیان نییە، بەڵکو وەك عەدەمێکن و بوونیان نییە، قەدەر وەك ڕۆحی بزوێنەر وایە بۆ هۆکارەکان، هەموو شان دادانێکیش بۆ جووڵەکان بۆ بزوێنەری یەکەم (خودا) دەگەڕێتەوە.

ئەوان (قەدەرییەکان) هێزی بینینی قووڵیان نەگەیشتە ئەم ڕاستییە "لە بزواوەوە بۆ بزوێنەر، لە هۆوە بۆ دابینکەری هۆ، لە ئامێرەوە بۆ بکەر"، بۆیە ویست و لێبڕانیان

لاواز بوو، بەشیان لە ((إیاك نستعین)) کەم بوویەوە و چێژی پەرستنیان بە پشتبەستن بە خودا و داوای کۆمەك لێی نەبینییەوە، هەرچەند چێژی پەرستنیان لە ئەوراد و جێبەجێ کردنی دروشمەکانی پەرستندا بینیوەتەوە.

ئەوانە بەشی خۆیان هەیە لە کۆمەك و سەرکەوتن و کاریگەری بەپێی داوای کۆمەك و پشتبەستنیان بە خودا، گەر بەندە بەتەواوی پشتی بە خودا بەستبێت لە سڕینەوەی چیایەك لە شوێنی خۆی -گەر فەرمانی پێکرابێت- سڵ ناکاتەوە و دەتوانێت بیسڕێتەوە.

**گەر دەپرسی مانای پشتبەستن بە خودا(التوكل) و داوای کۆمەك چییە؟**

دەڵێم: حاڵێکە لە دڵدا لە مەعریفەی خوداوە سەرهەڵدەدات، هەروەها باوەڕ بەتاك و تەنهایی ئەو وەك کارهەڵسوڕێنەر و گەیاندنی زیان و قازانج و بەخشین و لێگرتنەوە، هەرچی بیەوێت دەبێ و گەر نەیەوێت نابێت، ئەو شتەی ئەو نەیەوێت نایەتەدی با خەڵکیش بیەوێت، ئەمە پێویست دەکات بۆ هەڵسوڕاندنی کارەکان باوەڕی پێ بکەی و رادەستی ئەویان بکەی، لەو تەوەکولەی لە کاروبارەکانتدا بە خودا بەستووتە دڵنیایی و ئارامیت هەبێت و متمانە و یەقینت بە توانا و دەسەڵاتی ئەو ببێت، ئەوەی دەیەوێت دەبێت خەڵکی بیەوێ و نەیەوێ.

حاڵەتی ئەو کەسە لەگەڵ خودادا-**سبحانە**- وەك حاڵەتی منداڵێکی لێ دێت لەگەڵ دایك و باوکی لەو شتانەی حەزیان لێدەکات و لەو شتانەی لێیان دەترسێت، دایك و باوکی ئاگایان لێیەتی و چاودێری دەکەن و لەئامێزی دەگرن، سەرنجی یەکلابوونەوەی دڵی ئەو منداڵە بدەن بۆ لای دایك و باوکی و لانەکردنەوەی بەلای هیچ کەسێکی تردا، هەروەها بەندکردنی حەز و ویستی خۆی بۆ ئەو شتەی کە دایك و باوکی بۆ ئەویان دەوێت، ئەم نموونەیە حاڵی کەسی پشتبەستووە بە خودا(**المتوكل على الله**)، هەرکەس لەگەڵ خودادا بەم جۆرە بێت ئەوا خودا بۆ ئەو بەسە، خودای دەفەرموێت ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ﴾الطلاق: ٣، واتە خودا بۆ ئەو بەسە، وشەی ((**الحسب**)) مانای "**الكافي**"هەیە، گەر لەگەڵ ئەمەدا لە ئەهلی تەقوا بوو ئەوا سەرئەنجامێکی زۆر باشی دەبێت، گەر لە ئەهلی تەقوا نەبوو ئەوا ئەو کەسە لە بەشی چوارەمە:

**بەشی چوارەم:** کەسێك شایەتی تاکوتەنهایی خودا بدات لە زیان و قازانجدا، باوەڕی وابێت ئەو-**سبحانە**- هەرچی بوێت دەبێت و هەرچی نەوێت نابێت، هەروەها کەسەکە

لەگەڵ ئەو شتەی خۆی خۆشیدەوێت و پێیڕازییە ناسورێتەوە، بۆیە پشت بە خودا دەبەستێت و داوای کۆمەکی لێدەکات بۆ بەش و حەز و مەبەست و مەرامەکانی، لەو داوایان دەکات و ڕەوانەی لای ئەویان دەکات، بۆیە داواکانی جێبەجێ دەبێت و خودا دەچێت بە هانایەوە، جا ماڵ بێت یان کورسی و پلە و پایە لەلای خەڵکی، یان حاڵێك بێت لە پەردە لەسەر لادان و کاریگەری و هێز و پتەوبوونی پێگە، بەلام سەرئەنجامێکی دواڕۆژیی نییە، ئەوانە لە جۆری موڵکی ڕوواڵەتی و ماڵ و سامانن، پەیوەست بە ئیسلامەوە نین چجای ویلایەت و نزیکبوونەوە لە خودا، موڵك و پلە و پایە وماڵ و حاڵ بە چاك و خراپ و باوەڕدار و بێباوەڕ دەدرێت، هەر کەس شتێك لەوانە بکاتە بەڵگەی خۆشەویستی خودا و ڕازیبوونی لەو کەسەی پێی بەخشیوە و بە ئەولیای نزیك لە خودای بزانێت ئەو کەسە نەفامترین کەسی ناو نەفامەکانە، دوورترین کەسە لە ناسینی خودا و ناسینی ئایینەکەی و جیاکردنەوەی ئەوەی خودا خۆشی دەوێت و پێی ڕازییە لەگەڵ ئەوەی خۆشی ناوێت و ڕقی لێیەتی. حاڵ لە دونیادا وەك موڵك و ماڵ وایە، گەر یارمەتی خاوەنەکەی بدا لەسەر گوێڕایەڵی و ڕەزامەندی خودا و جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی ئەوا دەچێتە خانەی مەلیکە دادپەروەرە چاکەکانەوە، ئەگەر نە، ئەوە دەبێتە بارێکی قورس بەسەر شانی خاوەنەکەیەوە و لە خودا دووری دەخاتەوە و دەچێتە خانەی مەلیکە ستەمکارەکان و دەوڵەمەندە فاجیرەکانەوە.

### ۞ شوێنکەوتن و ئیخلاص

گەر ئەمەی زانی: بەندە ((إياك نعبد)) بە دوو بنچینەی مەزن جێبەجێ دەکات:

**یەکەمیان:** شوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ).

**دووەم:** ئیخلاص بۆ پەرستراو کە خودای موتەعالە، ئەم دوانە بریتین لە جێبەجێکردنی ((إياك نعبد))

**خەڵکی بەپێی ئەم دوو بنچینەیە بۆ چوار بەش دەبەش دەبن:**

**جۆری یەکەم:** ئەهلی ئیخلاص بۆ خودا و شوێنکەوتن، ئەمانە بریتین لە حەقیقەتی ئەهلی ((إياك نعبد))، هەموو کارەکانیان و قسەکانیان و بەخشین و لێگرتنەوە و خۆشەویستی و ڕقیان بۆ خودایە، مامەڵەکانیان لە ناوەوە و لە دەرەوە تەنها بۆ ڕووی پاکی خودایە، بەو کارەیان پاداشت و شکوریان لە خەڵکی ناوێت، بەڵکو خەڵکی

لەلایان وەك مردووی گۆڕستان وان، زیان و قازانج و مردن و ژیان و زیندووبوونەوەیان لەدەستدا نییە، کارکردن لە پێناوی خەڵکدا و داوای پلە و پایە لەوان و هیوای زیان و قازانج لێیان نیشانەی نەناسینی خەڵکییە، بەڵکو نەزانینی شانوشکۆیانە، هەر بەو جۆرە کەسەکە نەزانە بە خودا و نایناسێت، هەر کەس خەڵکی بناسێت لە مەنزڵگای خۆیاندا دایان دەنێت، هەر کەس خودا بناسێت کردارەکانی و قسەکانی و بەخشین و لێگرتنەوە و خۆشەویستی و رقی تەنها بۆ ئەو دەبن، هەر کەس مامەڵەی خودا بە کەسێك لە خوارخوداوە بگۆڕێتەوە نیشانەی نەناسین و نەزانینیەتی بە ئەو و دروستکراوەکانی، ئەگەر نە، گەر خودا و خەڵکی بناسیبایە مامەڵەی خودای بەسەر مامەڵەی خەڵکیدا هەڵدەبژارد.

هەر بەو جۆرە تەواوی کاروکردەوەکان و پەرستنیان بەپێی فەرمانی خودا دەبێت و بەو جۆرە دەبێت کە خودا خۆشیدەوێت و پێیرازییە، ئەمە ئەو کردەوانەیە کە خودا قبووڵی ناکات بە کەسێکی تر جگە لە ئەو بدرێت، لەپێناوی ئەو کردەوانەدایە خودا بەندەی بە مردن و ژیان تاقیکردۆتەوە ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾﴾ الملك: ٢، جوانی و رازانەوەی بە زەوی بەخشیوە تا تاقییان بکاتەوە کامیان باشترین کاروکردەوە بە ئەنجام دەگەیەنێت. فوزەیلی کوڕی **عیاض** دەفەرموێت: کاری چاکە ئەوەیە کە بۆ خودا بێت و بەپێی شوێنکەوتنی پێغەمبەری خودا بێت، واتە (**أخلصه و أصوبه**). وتیان: باوکی عەلی "**أخلصه و أصوبه**" چییە؟ فەرمووی: کاروکردەوە ئەگەر بۆ خودا بێت و دروست نەبێت قبوڵ ناکرێت، ئەگەر دروست بێت و بۆ خودا نەبێت قبوڵ ناکرێت، تا ئەو کاروکردەوەیە بۆ خودا بێت و دروست بێت. "**الخالص**" ئەوەیە بۆ خودابێت، "**الصواب**" ئەوەیە بەپێی سوننەتی پێغەمبەر بێت، ئەمەش لە قورئاندا باس کراوە ﴿فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا﴾ الکهف: ١١٠، هەروەها ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ﴾ النساء: ١٢٥، خودا کاروکردەوەیەکی قبووڵ نییە مەگەر تەنها ئەو کاروکردەوانە بۆ خودا ئەنجام درابن و لەسەر شوێنکەوتنی پێغەمبەر ئەنجام درابن، جگە لەو جۆرە کاروکردەوانە بەسەر خاوەنەکەیدا دەدرێتەوە و لێی وەرناگیرێتەوە، بەسەریدا دەدرێتەوە و دەکرێتە تۆزی بەر با لە رۆژێکدا کە زۆر پێویستی بەو کاروکردەوانە هەیە. لە فەرموودەی سەحیحدا لە عائشەوە کە لە

پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە ((کل عمل لیس علیه أمرنا فهو رد))، هەر کاروکردەوەیەك بەبێ شوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) بێت کەسەکە لە خودا دووردەخاتەوە، دەبێت خودا بە فەرمانەکانی خۆی بپەرسترێت نەك بە بیروبۆچوون و حەز و ئارەزووی مرۆڤ.

**جۆری دووەم:** ئەو کەسەی کە نە ئیخلاص و نە شوێنکەوتنی پێغەمبەری خودای هەیە، کارەکانی بەپێی شەرع نییە، خودی خۆی بۆ خودا ساغ نەبووەتەوە، وەك کاروکردەوەی ئەهلی خۆڕازاندنەوە بۆ خەڵکی و ریاکاران بۆیان کە خودا و پێغەمبەر لەسەری نین و پێی رازینین، ئەوانە لەلای خودا-عزوجل- خراپترین دەستە و خەشم لێگیراوترین خەڵکن، زۆرترین بەشیان لە ئایەتی ﴿ لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟ فَلَا تَحْسَبَنَّهُم بِمَفَازَةٍ مِّنَ ٱلْعَذَابِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ آل عمران: ١٨٨، دڵخۆشن بەوەی پێیان دراوە لە بیدعە و گومڕایی و هاوەڵدانان، دەیانەوێت بە شوێنکەوتنی سوننە و ئیخلاص مەدح بکرێن. ئەمانە جۆرێکن لە لادەرانی شارێگەی راست و دروست، خۆیان داوەتە پاڵ زانست و هەژاری و بەندایەتی کردنی خودا، ئەوانە بیدعە و گومڕایی و ریا و گەڕان بەدوای ناوبانگدا ئەنجام دەدەن و دەیانەوێت ستایش بکرێن لەسەر شتێك کە ئەنجامیان نەداوە لە شوێنکەوتنی پێغەمبەر و ئیخلاص و زانست، ئەوانە ئەهلی خەشم و گومڕایین.

**جۆری سێیەم:** ئەو کەسەی لە کاروکردەوەکانیدا موخلیصە بەڵام لەسەر شوێنکەوتنی پێغەمبەر نییە، وەك عابیدان و شوێنکەوتووانی رێگەی زوهد و هەژاری. هەر کەس خودای پەرست بە شتێك کە فەرمانی خودای لەسەر نەبوو، باوەڕی وابوو بەندایەتی کردنەکەی نزیکبوونەوەیە لە خودا ئەوە لە خودا ئەوە وەك حاڵی ئەو کەسە وایە کە پێیوایە گوێگرتن لە ئاواز و سەدا نزیکبوونەوەیە لە خودا، یان کەسی خەڵوەنشین کە جومعە و جەماعەتی تیادا وازلێدەهێنێت پێیوابێت نزیکبوونەوەیە لە خودا، یان دانە دەمی رۆژووی رۆژ لەگەڵ شەو بە نزیکبوونەوە بزانێت، یان رۆژووی رۆژی جەژنی رەمەزان بە نزیکبوونەوە بزانێت و نموونەی ئەمانە.

**جۆری چوارەم:** هەندێك لە کاروکردەوەکانی بەپێی شوێنکەوتنی پێغەمبەر بێت، بەڵام بۆ خودا نەبێت، وەك گوێڕایەڵی ریابازان، یان وەك پیاوێك کە بۆ ریا و دەمارگیری و

ناوی ئازایەتی دەجەنگێت، حەج دەكات و قورئان دەخوێنێت بۆ ئەوەی باس بكرێت، ئەوانە كارەكانیان لە رواڵەتدا كاری چاكەن و بەئەنجامدانیان فەرمان كراوە، بەلام لە ناوەرۆكدا كاروكردەوەی ناباشن و قبوولّ ناكرێن ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُواْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ ﴾ البينة: ٥، تەنها ئەوانەی بەو جۆرەی فەرمانیان پێكرابوو پەرستنی خودایان ئەنجامدا و ئیخلاصیان لە بەندایەتیدا هەبوو، ئەو كەسانە دەچنە ریزی ئەهلی ((أياك نعبد وإياك نستعين))ەوە.

### ۞ ترازووی دروست بۆ باشترین پەرستن

پاشان ئەهلی پلەی ((إياك نعبد)) چوار رێگەیان لەبەرە بۆ تایبەتكردنەوە و هەڵبژاردنی باشترین و بەسوودترین و لەپێشترین بەندایەتی، ئەوان لەو كارەدا دەبن بە چوار پۆلەوە:

**پۆلی یەكەم:** بەسوودترین و باشترین پەرستن لەلایان بریتییە لەو پەرستنەی كە زەحمەترین و گرانترین پەرستنە.

**وتوویانە:** لەبەر ئەوەی دوورترین شتە لە حەزی مرۆڤەوە، ئەوەش بریتییە لە حەقیقەتی بەندایەتی.

**وتوویانە:** پاداشت بەپێی گرانی و زەحمەتە، فەرموودەیەكیان ریوایەت كردووە كە بناغەی نییە ((أفضل الأعمال أحمزها)) باشترین كردەوە گرانترین و زەحمەترینە.

ئەمانە ئەهلی كۆشان و ستەمكردنن لە نەفسی خۆیان، دەڵێن: نەفسی مرۆڤ بەوە راست دەبێتەوە، چونكە سروشتی نەفس تەمبەڵی و بچووكی و پاڵدانەوە و لكان بە زەوییەوەیە، بۆیە نایەتە راستە بە ئەرك و ماندوویێتی و ئازاری زۆر نەبێت.

**پۆلی دووەم:** وتویانە: باشترین بەندایەتی خۆ یەكلاكردنەوەیە بۆ خودا و زوهد لە دونیا و كەمكردنەوەی دونیا چەندە بتوانیت، هەروەها گوێپێنەدان و لانەكردنەوە بەلای هەموو ئەوەی لە دونیایە و سەر بە دونیایە.

ئەمانەش دەبن بە دوو بەشەوە:

**خەڵكی رەشۆكی:** وا گومانیان برد ئەم خۆیەكلاكردنەوەیە ئامانجە، بۆیە خۆیان بۆ هەڵكرد و كاریان كرد لەسەری و خەڵكیان بۆ بانگ كرد و وتیان: ئەم خۆیەكلاكردنەوە

لە زانست و پەرسش باشترە، بۆیە وایبۆچوون کە زوهد لە دونیا لوتکە و ئامانجی هەموو پەرسش و بەندایەتییەك بێت.

**ئەهلی تایبەتیان:** وایبۆچوون کە زوهد بۆ جگە لەخودی زوهدەکە مەبەستە، مەبەست پێی ئەوەیە دڵ لەسەر خودا بمێنێتەوە و ویست و لێبڕان تەنها لەسەر ئەو بێت و دڵ خاڵی بکرێتەوە لە هەموو شتێك جگە لە خۆشەویستی خودا و گەڕانەوە بۆ لای ئەو و تەوەکول لەسەری و خەریکبوون بە ڕەزامەندییەکانییەوە و بەردەوامی یادی ئەو **–سبحانە–** بە دڵ و بە زمان، بەبێ پەرتکردن و دابەشبوونی دڵ و دابڕانی.

**پۆلی سێیەم:** وایان بینی بەسوودترین پەرسش و باشترین بەندایەتی بریتییە لەو کاروکردەوانەی چەندین سوود و قازانج لەخۆ دەگرن، وایان بینی ئەو کردەوانە باشترن لە کاروکردەوەیەك کە سوود و قازانجەکەی کەموکورت بێت، بۆیە وای بۆچوون خزمەتی هەژاران و سەرقاڵی بە بەرژەوەندییەکانی خەڵکیەوە و جێبەجێ کردنی پێویستییەکانیان و یارمەتیدانیان بە ماڵ و پلە و پایە بەسوودترین و قازانجترینە، بۆیە خۆیان بۆ تەرخان کرد و کاریان لەسەر کرد و فەرموودەکەی پێغەمبەریان (ﷺ) کرد بە بەڵگە ((**الخلق كلهم عيال الله وأحبهم إليه أنفعهم لعياله**)) رواه أبو يعلي. هەروەها بەڵگەی ئەوەیان هێنایەوە کە کاری عابید تەنها بۆ خودی خۆیەتی، بەڵام کاری بەسوود ئەوەیە سەربکێشێ بۆ کەسانی تر، ئەمەیان لەوەیان زۆر جیاوازە!

دەڵێن: بۆ ئەو مەبەستەیە کە پلە و گەورەیی زانا بەسەر عابیددا وەك گەشی و جوانی مانگ وایە بەسەر هەسارەکانی تردا.

دەڵێن: پێغەمبەر(ﷺ) بە عەلی کوڕی ئەبی تالبی فەرموو ((**لإن يهدي الله بك رجلا واحدا خير لك من حمر النعم**)) گەر بەهۆی تۆوە خودا تەنها یەك کەس هیدایەت بدات چاکترە بۆت لە ڕانە وشتری زۆر و زەبەلاح، دەڵێن: ئەم چاکتربوون و باشتربوونە بۆ فرە سوودی دەگەڕێتەوە.

بەڵگەیان بە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) هێنایەوە ((**من دعا إلى هدى كان له من الأجر مثل أجور من اتبعه من غير أن ينقص من أجورهم شيء**))–هەر کەس بانگ بۆ هیدایەتێك بکات هەروەك ئەو کەسەی شوێنی دەکەوێت پاداشتی بۆ هەیە بەبێ ئەوەی لە پاداشتی هیچ کەسێکیان کەم ببێتەوە.

بەڵگەیان هێنایەوە بەوەی خاوەن عیبادەت كاتێك مرد كارە چاكەكانی كۆتایی پێ دێت، كەسی خاوەن كاری بەسوود كۆتایی پێنایەت هەتا ئەو سوودەی كە دەدرێتە پاڵ ئەو بەردەوام بێت.

بەڵگەیان هێنایەوە كە پێغەمبەران بۆ چاكە لەگەڵ مەردوومان و هیدایەتیان رەوانە كراون، هەروەها سوود پێگەیاندنیان لە دونیا و دوارۆژدا، پێغەمبەران بە خەڵوەنشینی و دابڕان لە خەڵكی و رەهبانییەتەوە رەوانە نەكراون، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) هەڵوێستی ئەو چەند كەسەی بەباش نەزانی كە دەیانویست خۆیان بۆ عیبادەت یەكلابكەنەوە و واز لە تێكەڵبوونی خەڵكی بهێنن.

**پۆلی چوارەم دەڵێن**: باشترین عیبادەت كاركردنە لەسەر رەزامەندی خودا لە هەموو كاتێكدا بەو جۆرەی كاتەكە لە كار و ئەرك داوای دەكات، باشترین عیبادەت لە كاتی جیهاددا بریتییە لە جیهاد هەرچەند ببێتە هۆی وازهێنان لە ئەورادەكانی و شەونوێژ و رۆژوو، بەڵكو تەواوكردنی نوێژی فەرزیش وازلێبهێنێت وەك ئەو نوێژەی لە حاڵەتی ترسدا و لە جەنگدا ئەنجام دەدرێت.

باشترین كاروكردەوە لە كاتی هاویندا، بۆ نموونە: هەستان بە حەقی كشتوكاڵ و كردنەوەی بەرەكان، تەنانەت با ببێتە هۆی تیاچوونی ئەورادی پەسەندكراو، هەر بەو جۆرە لە جێبەجێ كردنی ماف ژن و منداڵدا.

باشترین كار لە كاتی بەرەبەیاندا خەریكبوونە بە نوێژ و قورئان و نزا و یاد و داوای لێخۆشبوونەوە.

باشترین كار لە كاتی پێویستی رێنمایی كردنی قوتابی و فێركردنی نەزاندا رووكردنە لە فێركردنی و سەرقاڵ بوون پێیەوە، باشترین كار لە كاتی بانگدا وازهێنانە لە ئەورادەكان و خەریكبوون بە وەڵامی بانگوێژەكەوە، باشترین كار لە كاتی پێنج نوێژەكەدا بریتییە لە كۆشان بۆ جێبەجێ كردنیان بە باشترین شێوە و رۆیشتن بە دەمیانەوە لە سەرەتای كاتەكانیانەوە و رووكردنە مزگەوت بۆ ئەنجامدانیان، هەتا دووربێت باشترە.

باشترین كار لە كاتی پێویستی كەسێكی ئاتاج بە پێویستییەك -بە پلە و پایە، بە جەستە یان بە ماڵ- خەریكبوونە بە یارمەتیدانی و پەنادانی ئاتاجییەكانی و هەڵبژاردنی ئەو ئەركە بەسەر ئەوراد و خەڵوەت كردندا.

باشترین کار لە کاتی خوێندنەوەی قورئاندا کۆکردنەوەی دڵ و ویستە لەسەر تێڕامان و وردبوونەوە و تێگەیشتن لێی تا وابزانیت کە خودا بەو قورئانە قسە لەگەڵ ئەودا دەکات، دڵت کۆبکەرەوە لەسەر تێگەیشتن و لێوردبوونەوە، لێبڕانت لەسەر جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی زۆرتر بێت لە لێبڕانی کەسێك کە لە دەسەلاتدارێکەوە نامەیەکی بۆ هاتووە.

باشترین کار لە کاتی وەستان لە عەرەفە تێکۆشانە بە ملکەچی و نزا و پاڕانەوە و یادی خودا بەبێ ڕۆژوویەکی لاوازکەر لە ئەنجامدانی ئەوانە.

باشترین کار لە ڕۆژەکانی "ذي الحجة"دا زۆر عیبادەت کردنە بەتایبەت کردنی "ألله أكبر" و "لا إله إلا الله" و "الحمد لله" ئەوانە باشترن لە جیهادێکی دیارینەکراو.

باشترین کارێك لە "دە"ی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا: پابەندبوون بە مزگەوتەوە و خەڵوەت و ئیعتیکاف و کەمکردنەوەی تێکەڵبوون بە خەڵکی و خەریکبوون پێیانەوە، تەنانەت باشترە لە فێرکردنی خەڵکی بە زانستێك و قورئان پێ خوێندنەوەیان لە لای زۆرێك لە زانایان.

باشترین کار لە کاتی نەخۆشی براکەتدا یان کاتی مردنی سەردانی کردن و ئامادەبوونە لەسەر جەنازەکەی و بەڕێکردنی.

باشترین کار لەکاتی داباریینی بەلا و ناخۆشی بەسەر خەڵکیدا ئارامگرتن و تێکەڵ بوون بە خەڵکی بەبێ هەڵهاتن لێیان، ئەو باوەڕدارەی تێکەڵ بە خەڵکی دەبێت و ئارام دەگرێت لەسەر ئازارەکانیان چاکترە لەوەی پێیان تێکەڵ نابێت و ئازاری نادەن. باشترە لە کاری خێردا تێکەڵیان ببیت، ئەو کارە باشترە لە کەنارگرتن لێیان، کەنارگرتن لە شەڕ باشترە لە تێکەڵبوونیان، گەر واتزانی تێکەڵیان ببێتە هۆی نەهێڵانی شەڕەکەیان، یان کەم کەمکردنەوەی شەڕەکانیان ئەو کارە باشترە لە کەنارگرتن لێیان.

**باشتر لە هەموو کات و بارێکدا:** بریتییە لە هەڵبژاردنی ڕەزامەندی خودایی لەو کات و بارەدا، سەرقاڵ بوون بە ئەرك و فەرمانی ئەو کاتە تایبەتە و داواکارییەکەی.

ئەم پۆلی چوارەمە ئەهلی بەندایەتی ڕەهان، پۆلەکانی پێشتر ئەهلی بەندایەتی سنووردارن، کاتێك کەسێك لەوانە دەست لە جۆرێك عیبادەت هەڵدەگرێت کە دەقی پێوەگرتووە -بۆ کارێکی تر- خۆی وادەبینێت وەك ئەوەی کەمی کردبێت و وازی

لەو عیبادەتە هێنابێت، ئەو بە یەك شێوە خودا دەپەرستێت، خاوەنی بەندایەتی رەها مەبەستێكی تایبەتی نییە لە بەندایەتییەكەیدا تا بەسەر بەندایەتییەكی تردا هەڵیبژێرێت، بەڵكو بەردەوام لە مەنزڵگای بەندایەتیدا تەكان بەخۆی دەدات و دەگوێزێتەوە، هەركات مەنزیلەیەكی بۆ دەردەكەوێت كاردەكات بۆ گەیشتن پێی، پێیەوە خەریك دەبێت تا مەنزیلەیەكی تری بۆ دەردەكەوێت، ئەمە ئاكاریەتی لە رۆیشتن بەرەو خودا تا كۆتایی كاروانەكەی، گەر زانایان ببینیت ئەویان لەگەڵ دەبینی، گەر عابیدان ببینیت ئەویان لەگەڵدایە، گەر موجاهیدان ببینیت ئەویان لەگەڵدایە، گەر یادكەران ببینیت ئەویان لەگەڵدایە، گەر خێرخوازان و چاكەخوازان ببینیت ئەویان لەگەڵدایە.

ئەمە برێتییە لە بەندەی رەها كە بەندوباو داگیری ناكات و كۆتوبەندەكان پێوەندی ناكەن كارەكانی بەپێی حەز و چێژ و ئاسانی و ئاسوودەیی دەروونی نییە، بەڵكو بەپێی ویستی پەروەردگاریەتی با ئاسوودەیی دەروونی لە شتێكی تردا بێت، ئەمە ئەو كەسەیە بە حەق دەستەبەری مانای ((إياك نعبد و إياك نستعين))ی كردووە، راستگۆیانە بەو دوو بنچینەیە هەستاوە، جلوپۆشاكی ئەوەیە كە بۆی ئامادە ببێت، خواردنی ئەوەیە بۆی دەست بدات، سەرقاڵبوونی بەوەی خودا فەرمانی پێكردووە لە هەر كاتێكدا بە كاتی خۆیەتی، شوێنی دانیشتن لە مەجلیسدا ئەو شوێنەیە كە چۆڵە، ئاماژە داگیری ناكات و كۆتوبەند پێوەندی ناكات، بەندوباو دەست بەسەریدا ناگرێت، كەسێكی ئازادی دارنراو لە هەموو شت، روو لە هەركوێ بكات لەگەڵ فەرمانەكانی پەروەردگاردایە، لەسەر ئایینی فەرماندەكەیەتی كاروانەكەی روو لە هەر كوێ بكات، لە كوێ ئەستوونەكانی هەڵدا لەگەڵی دەسورێتەوە، هەموو كەسێكی ئەهلی حەق هۆگرییان لەگەڵیدا هەیە، هەموو ئەوانەی ئەهلی باتڵن نامۆن لەگەڵی، وەك بارانی رەحمەت وایە لە كوێ باری سوود دەگەیەنێت، وەك دارخورما وایە گەڵاكانی ناوەرێن، هەمووی بەسوودە تەنانەت دڕكەكەی، جێگەی توندی و گرژییە لە سەرپێچیكەرانی فەرمانی خودا و تووڕەیی و رق لەوانەی سنووری خودا دەبەزێنن، ئەو بۆ خودا و بە خودا و لەگەڵ خودایە، هاوەڵی خودا دەكات بەبێ خەڵك، هاوەڵی خەڵكی دەكات بەبێ نەفس، بەڵكو كاتێك لەگەڵ خودایە دروستكراوەكان لەنێوان خۆی و خودا

لادەدات، كاتێكیش لەگەڵ دروستكراوەكانی خودادایە نەفسی لەو ناوەندە لادەدات و وازی لێدەهێنێت، ئای چەند مرۆڤێكی نامۆیە لەناو خەڵكیدا! چەندە غوربەتی لەدەستیان هەیە! چەندە هۆگری و دڵخۆشی و ئارامی و دڵنیایی لەگەڵ خودا هەیە!! خودا تەنها كۆمەككارە و پشتبەستن هەر بە ئەوە.

## ۞ بێبەشبوونی جەبرییەكان لە شیرینی عیبادەت

پاشان خەڵكی لە قازانجی پەرستش و حیكمەت و مەرامی پەرستشدا چوار ڕێگەیان هەیە، بۆیە دەبن بە چوار پۆلەوە:

**پۆلی یەكەم:** جەبرییەكان كاروبارەكان دەگێڕنەوە بۆ تەنها ویستنی خودا و وەلانانی ویستی مرۆڤ، لای ئەوانە هەستان بەكار تەنها فەرمانە، بەبێ ئەوەی ببێتە هۆی بەختەوەری دونیا و دواڕۆژ و ڕزگاری لە ئاگر، بەڵكو هەستان بە كار تەنها بەهۆی فەرمان و ویستی خوداوەیە.

ئەوانە شیرینی و چێژی پەرستش ناكەن و خۆشی لێ نابینن، نوێژ نابێتە ڕۆشنایی چاویان و فەرمانەكان سووری دڵ و دەروون و خۆراكی ڕۆح و ژیانیان نییە، بۆیە بەو پەرستشانە دەڵێن ئەركی داواكراو **"تكاليف"**، واتە داوایان لێكراوە بەو ئەركە هەستن، گەر كەسێكی بانگەشەكەری خۆشەویستی مەلیكێك لە مەلیكەكان ئەوەی مەلیك فەرمانی پێكردووە ناو بنێت ئەركی داواكراو **"تكليف"**، بڵێت من ئەو كارە بە تێچوونێك (**كلفة**) ئەنجام دەدەم ئەوا هیچ كەس ئەو پیاوە بە خۆشەویستی مەلیك نازانێت، بۆیە جەبرییەكان-یان زۆربەیان- نەرێی خۆشەویستی بەندە بۆ پەروەردگار دەكەن، دەڵێن: بەندە پاداشتەكە و ئەوەی خودا لە نیعمەت بۆی ئامادەكردوون خۆشدەوێت، نەك خودی خودایان خۆشبوێت، بۆیە خۆشەویستیان بۆ دروستكراوێك لەخوار خوداوە بڕیار داوە، لە كاتێكدا ڕاستی بەندایەتی بریتییە لە كەماڵی خۆشەویستی بۆ خودا، بۆیە حەقیقەتی بەندایەتی و كرۆكی بەندایەتییان نەرێ كردووە. حەقیقەتی خواوەندی: بریتییە لە داڵدە و پەنا (**مألوه**) و خۆشەویست بە لوتكەی خۆشەویستی و هاوتا لەگەڵ لوتكەی ملكەچی و فەرمانبەرداری و هەروەها پێدانی شكۆمەندی و مەزنی بۆ ئەو-**سبحانه**-، بۆیە نەرێی ئەوەیان

کـرد* خـودا خۆشەویسـت بێـت، ئەمــەش نــەرێکردنی خواوەنــدی خودایــە، شـێخی ئەوانــە بــریتی بــوو لــە "جەعــدی کــوڕی درهــەم" کــە خالیــدی کــوڕی عەبــدولاّی قەسـری لــە ڕۆژی جــەژنی قوربانــدا کــردی بــە قوربــانی و وتــی ((ئەمــە بانگەشــەی ئــەوە دەکـات خـودا ئاخـافتنی لەگـەڵ موسـا نـەکردووە و ئیبراهیمـی نـەکردووە بـە خــەلیلی خــۆی))، لەڕاســتیدا نــەرێکردنی "جەعــد" ئــەوە بــوو خــودا خۆشەویســت (محبــوب) بێــت یــان کەســێکی خۆشــبوێت، واتــە (محــب) بێــت، نــەرێی پێویســتی ئیبراهیمــی نــەکرد بــەو خۆشەویســتییە، کــە لای جەهمییــەکان پێــی دەوترێــت (الخلــة) لوتکــەی خۆشەویســتی کــە هــەموو دروســتکراوەکان تیایــدا یەکســانن، لای جەهەمییەکان هەموو خەلیلی خودان.

### ۞ هەندێك منەت بە ئیسلامبوونی خۆیەوە دەکات

**پۆلی دووەم:** بریتین لە قەدەرییە نەرێکەرەکان ئەوانـەی دەڵـێن کـە پەرسـش دانـراوە وەك نرخێك بـۆ ئـەو پاداشـت و نیعمەتـەی بەنـدە بەدەسـتی دەهێنێـت، وەك پێـدانی کرێی کرێکار وایە.

دەڵێن ئەو پاداشتە خـودا دەیکـات بـە باربووکردنـەوەی بەنـدەکانی، وەك لـە ئایـەتی ﴿وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ الأعــراف: ٤٣، هــەروەها ﴿ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ النحــل: ٣٢، هــەروەها ﴿هَلۡ تُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ النمل: ٩٠، فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) کە لە خوداوە -عزوجـل- دەگێڕێتـەوە ((يـا عبادي إنما هي أعمالكم أحصيها لكم، ثم أفيكم إياها))، هەروەها ئایەتی ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجۡرَهُم بِغَيۡرِ حِسَابٖ﴾ الزمر: ١٠.

دەڵێن خودا ئەو پاداشتەی بە "جزاء، أجر، ثواب" باسکردووە، چونکە لـە کردارەکـەوە دەگەڕێتەوە بۆ کرێکارەکە (ئەنجامدەری کارەکە)، ئەمـەش مانـای "یثـوب"ە کـە مانـای "رجع-واتە دەگەڕێتەوە" دەگەیەنێت، واتە لە کارەکەوە بۆ ئەو دەگەڕێتەوە.

پاداشت (الجزاء) بە "ثواب"باسکراوە-خودا باشتر دەزانێـت- چـونکە پاداشـتەکە بـۆ بەجێهێنەری کارەکە دەگەڕێتـەوە، بـەری کردارەکـەی لـە دونیـا بـۆ دەگەڕێتـەوە بـۆ ئەوەی رەخنەی لێ بگرێت و لەسەری دادگایی خۆی بکات و بزانێت چ جۆرە ناتەواوی

و لادانێك لە ڕاستە شەقام-كە زۆرجار ڕوودەدات- ڕووی لە كاروكردەوەكانی كردووە بە ئەندازەی ئەوەی بینیویەتەوە لە بەری كارەكەی كە جێگیرە و لە دونیادا بۆی گەڕاوەتەوە، وەك هەر جۆرە كاروبارێكی دونیایی، لە پیشەسازی و كشتوكاڵ و بازرگانی، هاوشێوەكانی ئەوانە، بەندە بەهانای ناتەواویەكەوە دەچێت و بەدوای شاڕێگەی ڕاست و ڕەواندا دەگەڕێت، گەر ڕەخنە لە كردارەكانی نەگرێت و خۆی لەسەر دادگایی نەكات بۆ ئەو بێئاگایی و نەفامی و شوێنكەوتنە كوێرانەی لێیوەشاوەتەوە ئەوە لە ڕۆژی دواییدا هیچ بیانوویەكی نییە.

دەڵێن: گەر پاداشت پەیوەستی كردارەكە نەبوایە ئەوا ناونانی بە "جزاء، أجر، ثواب"مانایەكی بۆ نامێنێتەوە.

دەڵێن: كێشانە و پێوانەی كردارەكان بەڵگەیە لەسەری، گەر پاداشت و سزا بە كردارەكانەوە وابەستە نەبووبن و بە دوایاندا نەیەن و نەبنە نرخێك بۆ ئەو كاروكردەوەنە، ئەوكاتە بۆ كێشان و پێوانی كردەوەكان مانایەك نامێنێتەوە، خودا دەفەرموێ ﴿وَٱلْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٨﴾ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُم بِمَا كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَظْلِمُونَ ﴿٩﴾﴾ الأعراف: ٨ - ٩.

ئەم دوو دەستەیە (جەبرییەكان و قەدەرییەكان) بەتوندترین شێوە بەرانبەر بە یەكتر وەستاون و لەنێوانیاندا گەورەترین بۆشایی (جیاوازی) هەیە.

جەبرییەكان هیچ جۆرە پەیوەندی و پەیوەست بوونێك لەنێوان كردەوە و پاداشتدا دانانێن، لایان گونجاوە خودا كەسێك سزا بدات كە هەموو تەمەنی لە گوێڕایەڵی و بەندایەتیدا بەسەر بردێت، هەر بەو جۆرە لایان گونجاوە خودا كەسێك بباتە بەهەشتەوە كە هەموو تەمەنی لە یاخیبوون و بێباوەڕیدا بەخت كردبێت، هەردووكیان لەلای خودا یەكسانن، گونجاوە كەسێكی خاوەن كرداری كەم بەرزبكرێتەوە بەسەر كەسێكی خاوەن كرداری زۆر و پلەی بەرز و باڵا، هەر هەموو ئەمانە دەگەڕێتەوە بۆ ویستی ڕەهای خودا، بەبێ هۆ هێنانەوە و حیكمەت و مەرام كە تایبەتمەندكردنی پاداشت بۆ ئەمەیان و سزا بۆ ئەوەیان دەخوازێت.

قەدەرییەكان پێویستیان كردووە لەسەر خودا چاودێری چاكتر (الأصلح) بكات، هەموو ئەوانە بەهۆی كردەوەكان و نرخەكەیانەوە، گەیشتنی پاداشت بە بەندە بەبێ

كرێی كردەوەكانی وەك خێری بەندە وایە بە بەندە، تەنانەت دەڵێن: پێدانی كرێ لەسەر كردار بۆ بەندە خۆشتر و باشترە لەوەی لە فەزڵی خوداوە و بەبێ كردار پاداشت بدرێتەوە.

جەبرییەكان بە توندترین شێوە رووبەڕوویان بوونەوە و تەنانەت بۆ كار و كردەوە كاریگەرییەكیان لە پاداشت نەهێڵایەوە.

هەردوو دەستەكە ستەمكارن، لە شارێگەی راست و دروست كە خودا بەندەكانی لەسەر بارهێناوە و پێغەمبەرانی بۆ هاتووە و كتێبەكانی بۆ دابەزاندووە لایانداوە، كردار هۆی گەیشتنە بە پاداشت و سزا، داخوازی دەكات و بەدوایدا دێت وەك داخوازیكردن و بەدواداهاتنی سەرجەم هۆیەكانی تر بۆ ئەو شتانەی دەبن بە هۆ بۆیان، كردەوەی چاكە لە كۆمەكی خوداوەیە، فەزڵ و منەت و خێریكە بەسەر بەندەكەیەوە، بەوەی یارمەتی داوە لەسەری و سەركەوتووی كردووە و ویست و توانینی بۆ ئەنجامدانی تیا دروست كرد و كردەوەكەی لا خۆشەویست بوو و لە دڵیدا جوانی كرد و دژی ئەو كردەوەیەی لەلا ناشیرین و بێزراو كرد، لەگەڵ بوونی ئەمانەدا ئەو كردەوانە نابنە نرخی پاداشت و بەئەندازەی ئەو پاداشتە مەزنە نییە خودا بە بەندەكەی دەبەخشێت، بەڵكو ئامانجەكەی –گەر بەندە هەوڵ و كۆششی خۆی بدا و بەجوانترین شێوە جێبەجێی بكات– شوكرێك بێت بۆ خودا بۆ بەشێك لەو نیعمەتانەی بە بەندەكەی بەخشیوە. گەر خودا بە تەواوی داوای مافی خۆی لە بەندەكەی بكات ئەوەندە شوكری لەسەر دەمێنێت كە ناتوانێت پێیان هەڵبستێت، بۆیە گەر ئەهلی ئاسمانەكان و زەوی سزا بدات بۆ خودا نابێت بە ستەم لە بەندەكانی، گەر بەزەییان پێبكات بەزەییەكەی باشترە بۆ ئەوان لە كاروكردەوەكانیان، ئەو مەبەستە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ساغبووەتەوە نەرێی ئەوە دەكات مرۆڤ بە كردەوەكانی خۆی بچێتە بەهەشتەوە، وەك دەفەرموێت ((لن يدخل أحدا منكم الجنة عمله–وفي لفظ: لن يدخل أحد منكم الجنة بعمله، و في لفظ: لن ينجي أحدا منكم عمله– قالوا: ولا أنت يا رسول الله؟ قال: ولا أنا إلا أن يتغمدني الله برحمة منه و فضل)) خودای موتەعال چوونە بەهەشتی بە كردەوەكان ساغكردۆتەوە، وەك ﴿ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ النحل: ٣٢، دژایەتی لە نێوان فەرموودەكە و ئایەتەكەدا نییە، لە كاتێكدا نەرێ و ئەرێی هاتوو لەو دوو

جێگەیەدا بە یەك مانا نییە، نەرێکردنەکەی پێغەمبەر مانای وایە مرۆڤ تەنها بە کردەوەکانی شایستەی بەهەشت نابێت و کردار نابێتە نرخ و بەهای پاداشتەکە، ئەمە وەك بەرچەرچدانەوەیەکی قەدەرییە مەجوسییەکان، کە دەیانوت گەر پاداشت بە زیادە بدرێت ئەوا منەتکردن بەسەر بەندەوە چەند بارە دەبێتەوە.

ئەم دەستەیە نەفامترین دروستکراوی خودان بە خودا و چڕترین پەردە کەوتۆتە نێوان ئەوان و خوداوە، ئەوانە شایستەن ببن بە مەجوسی ئەم ئوممەتە، بەسە نەزانینیان بە خودا: کە نەزانن ئەهلی ئاسمانەکان و زەوی لە ژێر منەتی خودادان، لە کەماڵی دڵخۆشی و سروور و چێژە ئەوان لەژێر منەتی سەرداری حەق و گەورەی خۆیاندا بن، ئەوان بەو منەتە خوداییە ژیانیان بەتامتر و خۆشتر دەبێت، مەزنترین پلەوپایە و نزیکترین کەسیان لە خوداوە و گەورەترین دانپیانەر و یادکەر و شوکرکەر و خۆشویست بۆ خودا لەو پێناوەدا زاناترینیانە بەم منەتە خوداییە، هەموو مرۆڤەکان لەناو نیعمەت و منەتی خودای موتەعالدا نغرۆبوون ﴿ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾ الحجرات: ١٧.

منەتی دروستکراو ناتەواوییە، چونکە کەسەکە هاوشانی خۆیەتی، گەر منەت بەسەریدا بکات ئەوا بەسەریدا سەردەکەوێت، ئەو کات منەت بەسەرداکراو خۆی لەخوار خاوەن منەتەکەوە دەبینێت، ئەمە لە کاتێکدا منەت لەناو هەموو دروستکراوەکاندا بوونی نییە، پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ئوممەتەکەی بۆی هەیە منەت بکات، یارانی پێغەمبەر دەیانفەرموو ((الله و رسوله أمن)) خودا و پێغەمبەرەکەی شایستەترن بە منەتکردن، ناتەواوی نییە باوك منەت بەسەر رۆڵەکەیدا بکات، شەرمەزاری نییە بۆ کوڕەکەی ئەو منەتە هەڵبگرێت، ئەی ئەبێت پەروەردگار چۆن بێت کە هەموو دروستکراوەکان لە دەریای منەتی ئەو و خێرپێکردنی ئەودا مەلە دەکەن، بەبێ بەرانبەر لەوانەوە؟ با کارەکانیشیان ببنە هۆ بۆ ئەوەی بەدەستیان هێناوە لە بەخشین و سەخاوەتیی خودا.

خودا خاوەن منەتی زۆرە لەسەریان، بەوەی یارمەتی داون بۆ ئەو هۆیانە و هیدایەتدانیان بۆ بەدەستهێنانیان، خودا کۆمەکی کردن و بۆی کامڵکردن، لە کۆتایشدا لێی قبووڵ کردن بە هەندێ ناتەواوییەوە؟ ئەمە ئەو مانایەیە کە چوونە ناو بەهەشتی پێ جێگیر بووە لە ئایەتی ﴿بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾.

ئەو پيتی "باء" پێی دەوترێت "باء السببية" واتە پيتی (ب) مانای هۆ دەگەيەنێت، ئەمەش بەرپەرچدانەوەی قەدەری و جەبرييە كە دەڵێن: هيچ پەيوەندييەك لە نێوان كردار و پاداشتدا بوونی نييە و كردار نابێتە هۆ بۆ پاداشت.

دەقەكان قسەی جەبرييەكان پووچ دەكەنەوە وەك چۆن قسەی قەدەرييەكانيش پووچ دەكەنەوە، بەڵگە لە ئەقڵ و فيترەت قسەی هەردوو دەستەكە پووچ دەكاتەوە، تا ئێرە بۆ ئەوانەی دڵ و ناوەرۆكيان هەيە بڕی قسەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت رۆشن بوويەوە، ئەوان دەستەی ناوەندن، ويستی خودا و دەسەڵاتی خودا بەگشتی جێگير دەكەن، هەروەها دروستكردنی بەندەكانی و كردارەكانيان، هەموو ئەمانەش بۆ حيكمەتێكی تەواو و ئامێزگرتنی پەيوەندی هۆ بۆ ئەنجامەكان دەگەڕێتەوە، هەر بەو جۆرە ئەنجام پەيدابوون لەو هۆيانە لەڕووی شەرع و قەدەرەوە و وەستان لەسەری لە ئێستا يان لە داهاتوودا.

هەر يەكێك لەم دوو دەستە لادەرە بەشێك لە حەقيان وازلێهێناوە، لەو پێناوەدا دەستيان بۆ جۆرێك لە باتڵ بردووە، بەڵكو چەندەها جۆر لە باتڵ، خودا بە ويست و بڕياری خۆی ئەهلی سوننەتی هيدايەت دا بۆ سەر ئەوەی ئەوان لە حەق جياوازيان لەنێواندا هەبوو ﴿وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ البقرة: ٢١٣، ﴿ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ﴾ الحديد: ٢١.

۞ ۞ ۞

## فەلسەفەلێدان

**پـۆلی سـێیەم:** ئەوانـەن کـە باوەڕیـان وابـوو سـوودی پەرسـش: وەرزشـی دەروونـە، ئامادەکردنیەتی بۆ وەرگرتنی نووری زانستی جۆراوجۆر، هاتنـەدەرەوەی هێزەکـانی لـە هێزی نەفسی ئاژەڵی، گـەر پەرسـش نـەکات دادەبـەزێت بـۆ ئاسـتی نەفسـی دڕنـدەیی و ئـاژەڵی. پەرسـش و بەندایـەتی کەسـەکە لـە ئولفـەت پێوەگیراوەکـان و خووخـدەکان دەهێنێتە دەرەوە و دەیگوێزێتـەوە بـۆ هاوشـێوەی ژیرییـە رووتـەکان (العقـول المجـردة)، ئەوکات زانا دەردەچێ و ئامادە دەبێت بۆ نەقشگرتنی وێنەی زانست و زانیاری لەسەری.

### ۞ خۆشەویستی بنچینەی بەندایەتییە

**پۆلی چوارەم:** بریتین لە دەستەی محەمەدی ئیبراهیمی، شـوێنکەوتەی دوو خەلیلەکـە، شارەزا بە خـودا لـە حیکمـەت و بڕیـار و شـەرع و دروسـتکراوەکانیدا، ئـەم دەسـتەیە ئـەهلی بینـینی ڕۆشـنن لـە پەرسشـیاندا و لـەو حیکمەتـە تێگەیشـتوون خـودا لـە بەندایەتیدا دایناوە.

سێ دەستەکەی پێشوو پەردەدراوە بەسەریاندا بەهۆی ئـەو تەمومـژە باتـڵ و یاسا و ڕێسا تێکچووانەوە کە لەلایانە، لە پشتی ئەوەوە شـتێکی تریـان لـەلا نییـە، دڵخۆشـن بەو بیروبۆچوونە بێبنەمایانەی لەلایانە، خۆیان ڕازیکردووە بـە کتـێبی دانـراوی پـڕ لـە خەیاڵ، گەر بیانزانیبایە لە پشتی ئەوەوە مەزنتر و گەورەتر بـوونی هەیـە بـە شـتێکی تری خوار ئەوە ڕازی نەدەبوون، بەڵام ژیرییان کەموکورتە و ئاگات بەو شـتە مەزنـە و نەیانتوانی بە نووری پێغەمبەرایەتی بیدۆزنەوە، هەستیان پێ نەکرد تا کۆشش بکـەن لە پێناویدا، ئەوان بینیان ئەوەی لایانە باشترە لە نەزانی، لـەپاڵ ئەوەشـدا دژیـەکی و تێکچوونی دەستەی بەرانبەریان بینی.

لە کـۆی ئـەو کاروبارانـە هەڵبـژاردنی ئـەوەی لەلایانـە بەسـەر شـتانی تـردا -جگـە لەوەی خۆیان- هاتە ئاراوە، ئەمە بەڵای دەستەگەرییە، سەلامەت کەسێکە خـودا سەلامەتی بکات.

بزانـە نهـێنی بەندایـەتی و ئامـانج و حیکمـەتی: تـەنها کەسـێك پێـی دەگـات سیفاتی پەروەردگاری -**عزوجل**- ناسی بێت و پەکینەخسبن، مانـای خواوەنـدی و حەقیقـەتی

خواوەندی زانیبێت، لەگەڵ ئەوەی خواوەندە، بەڵكو خواوەندێكی راستە، هەموو خواوەندێكی تر جگە لە ئەو پووچە، بەڵكو پووچی ناو پووچانە، راستێتی خواوەندی بۆ كەس شیاو نییە جگە لە ئەو، پەرسش و بەندایەتی داخوازی خواوەندی و كاریگەری و داواكانییەتی، پەیوەستبوونی بەندایەتی بە خواوەندییەوە وەك پەیوەستبوونی زانراو وایە بە زانین و توانراو بە توانین و دەنگ بە بیستن و چاكە بە بەزەیی و بەخشین بە سەخاوەتەوە.

هەركەس حەقیقەتی خواوەندی نەرێ بكات و نەیناسێت، دەبێ چۆن زانینی پەرسشەكان و ئامانجەكانیان و مەرامەكانیان و ئەوەی لە پێناویاندا بەیانكراون بۆ بێتە راستە؟ چۆن زانستی بۆ راستدەبێتەوە كە بریتییە لە ئامانجی مەبەستدار لە دروستكردن، ئەو ئامانجەی لە پێناویدا دروستكران و پێغەمبەرانی لە پێناودا رەوانەكراوە و كتێبەكانی لە پێناودا دابەزێنراوە و بەهەشت و دۆزەخ لەو مەرامەوە خولقێنراون؟ ئەگەری پەكخستنی بەندەكان لە پەرسش و بەندایەتی دانەپاڵی شتێكە بۆ لای خودا كە بە شكۆمەندی ئەو شیاو نییە، ئەو كەسەی ئاسمانەكانی بە حەق دروستكردبێت و پووچی لە دروستكردن و كاروكردەوەیدا نەبێت باڵاترە لەو دانەپاڵە بێجێیە، خودا مرۆڤی بە هەوانتە دروستنەكردووە و هەرواش وێڵی ناكات و دەستی لێ بەرنادات، دەفەرموێت ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴾ المؤمنون: ١١٥، واتە دروستكرابن بەبێ هیچ شتێك یان بەبێ حیكمەتێك یان بەبێ پەرسش و پاداشت و سزا، لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ ﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ الذاريات: ٥٦، پەرسش: ئەو ئامانجەیە كە مرۆڤ و جنی و تەواوی دروستكراوەكانی لە پێناودا دروستكراوە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ﴾ القيامة: ٣٦، مانای "سدى" واتە "مهملا" بەبێ مەرام و ئامانج و حیكمەت. ئیمامی شافعی لەسەرمانای "سدى" دەفەرموێت "لا يؤمر ولا ينهى –واتە فەرمانی بەسەردا نەكرێت و رێگری لێنەكرێت"، كەسانی تر دەڵێن: پاداشت نەدرێتەوە و سزا نەدرێت. دروسترینیان دوو شتە: پاداشت و سزا لەسەر بنچینەی فەرمان و قەدەغەكردن (الأمر والنهي)، فەرمان و رێگریش ویست و داوای پەرسش و بەندایەتییە، حەقیقەتی بەندایەتی جێبەجێ كردنی فەرمان و قەدەغەكردنە، خودا دەفەرموێت ﴿ الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ

وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾ آل عمــران: ١٩١، ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴾ الحجـر: ٨٥، ﴿ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ ﴾ الجاثية: ٢٢.

خـودای موتـەعال رایگەیانـد دروسـتکردنی ئاسمانـەکان و زەوی بـە حـەق فـەرمان و قەدەغەکردن و پاداشت و سزا لەخۆ دەگرێت.

بـا مرۆڤـی هۆشمەنـد لـە جیـاوازی نێـوان ئـەم بۆچـوونانە و وەحـی رابمێنێـت، دەبینێـت خـاوەنی ئـەو بیروبۆچـوونانە شـکۆ و گـەورەیی خودایـان رانـەگرتووە و بە دروستی نەیانناسیوە.

خودای موتەعال دروستکراوەکانی بۆ بەندایـەتی دروسـت کـردووە، بەندایەتییـەك کـە کۆکـەرەوەی کـەماڵی خۆشەویسـتییە بـۆ خـودا، لەگـەڵ ملکەچـی و چـوونە ژێـر فەرمانەکانییـەوە. بنچـینەی پەرسـش بریتییـە لـە خۆشەویسـتیی خـودا، بـەڵکو تەنهاکردنی خودا بە خۆشەویستی و سەرجەم خۆشەویستی بۆ ئەو بێت، لەگەڵ ئـەودا کەسێکی تری خۆش نەوێت، بەڵکو لە پێناوی ئەو و بـۆ ئـەو کەسـانی تـر و شـتەکانی تـری خۆشـبوێت، وەك خۆشەویسـتی پێغەمبـەران و فریشـتە و دۆسـتانی خـودا، خۆشەویستی ئێمە بۆ ئەوان لە تـەواوکردنی خۆشەویسـتیی خوداوەیـە، خۆشەویسـتی ئەوانە نابێتە خۆشەویستی لەپاڵ خودادا، وەك خۆشەویستی ئەوانەی لەخوار خـوداوە کۆلکە خودایان دەپەرست و بەئەندازەی خۆشویستنی خودا خۆشیان دەویستن.

گەر خۆشەویستی بۆ خـودا حەقیقـەت و نهێنی بەندایـەتی و پـەرسـش بێـت، ئـەوا بـە شوێنکەوتنی فەرمانەکانی و دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانی دەستەبەر دەکرێـت، لـە جێبـەجێ کردنـی فەرمانـەکان و دوورکەوتنـەوە لـە قەدەغـەکراوەکان حەقیقـەتی بەندایـەتی و خۆشەویسـتی رۆشـن دەبێتـەوە، بـۆ ئـەو مەبەسـتە خـودای موتـەعال شوێنکەوتنی پێغەمبـەری کـردووە بـە نیشـانە لەسـەر خۆشویسـتنی خـودا و شـایەتە لەسـەر کەسـێك بانگەشـەی خۆشەویسـتی و بەندایـەتی راسـتەقینە بکـات، خـودای موتـــەعال دەفـــەرموێت ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ ﴾ آل عمـران: ٣١، شـوێنکەوتنی پێغەمبـەری کـردووە بـە مـەرجی خۆشویسـتنی خـودا و مـەرجی خۆشەویستی خوداش بۆ ئەوان، بوونی بەمەرجگیراو رێگرە بەبێ بوونی مەرجەکـەی و جێبـەجێکردنی، ئـەوەش بـە دەسـتەبەرکردنی بەمەرجگیراوەکـە، بەدەسـتهێنانی خۆشەویسـتی بـە دەسـتەبەرکردنی شـوێنکەوتنی پێغەمبەرەوەیـە، گەیشـتن بـە

خۆشەویستی خودا پێویستە لە شوێنکەوتنی پێغەمبەرەوە بێت، شوێنکەوتنی پێغەمبەریش مەرجی خۆشەویستی خودایە، بۆیە هەرگیز خۆشەویستییان بۆ خودا ساغ نابێتەوە و خۆشەویستی خوداش بۆ ئەوان بەدەست نایەت بەبێ شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەی-علیه الصلاة والسلام-.

ئایەتەکە ئاماژە بەوە دەکات کە شوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) بریتییە لە خۆشەویستی خودا و پێغەمبەرەکەی و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی، ئەمە لە بەندایەتیدا بەس نییە تا خودا و پێغەمبەرەکەی لە هەرچی شتێك -لەخوار ئەوانەوە- خۆشترت نەوێن، شتێکی نەبێت لە خودا و پێغەمبەر زیاتر خۆشی بوێت، هەر کەس شتێکی هەیە لە خودا و پێغەمبەر زۆرتر خۆشی دەوێت ئەوە ئەو هاوەڵدانانەیە کە خودا لە خاوەنەکەی نابورێت و هیدایەتی نادات، دەفەرموێت ﴿ قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾ التوبة: ٢٤، هەر کەس گوێڕایەڵی کەسێکی پێشخست بەسەر گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەردا، یان قسەی کەسێکی دا بەسەر قسەی خودا و پێغەمبەردا، یان رازیکردنی کەسێکی بەسەر رازیکردنی خودا و پێغەمبەردا پێشخست، یان ترسان لە کەسێك، هیوا بە کەسێك، پشتبەستن بە کەسێك زۆرتر و زیاتر بوو لە ترسان و هیوا و پشتبەستن بە خودا، یان مامەڵەی کەسێکی سەرخست بەسەر مامەڵەی خودادا، ئەوە کەسێکە خودا و پێغەمبەری لە شتەکانی تر خۆشترنەویستووە، گەر بە زمان بیڵێت ئەوە درۆیەکەوە لە ئەوەوە و هەوڵێکە پێچەوانەی ئەوەی لەسەریەتی، هەر بەو جۆرە هەر کەس بڕیاری کەسێکی بەسەر بڕیاری خودا و پێغەمبەردا پێشخست.

### ۞ چوار پایەکەی پەرستشی تەواو

((**إياك نعبد**)) لەسەر چوار پایە بیناکراوە: خۆڕازاندنەوە بەوەی خودا و پێغەمبەر خۆشیان دەوێت و پێی رازین، لە قسەی زمان و دڵ و کرداری دڵ و ئەندامەکان.

بەندایەتی: ناوێکی کۆکەرەوەیە بۆ ئەو چوار ئاستە لە بەندایەتی، شوێنکەوتووانی ((**إياك نعبد**)) بە راستی و دروستی خاوەنی بەندایەتی راست و دروستن.

**قسەی دڵ:** بریتییە لەو باوەڕەی کە خودا دەربارەی خۆی و ناو و سیفات و کردار و فریشتە و گەیشتنەوە بە خودا لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی هەواڵی لەبارەوە داوە.

**قسەی زمان:** بریتییە لە گەیاندنی ئەو هەواڵانە لە خوداوە و لە ڕێگەی پێغەمبەرەکەیەوە بەدەستمان گەیشتووە، بانگکردن بۆی و بەرگری لێی و بەیانکردنی پووچی بیدعەی پێچەوانە بەوەی خودا و پێغەمبەر، هەروەها هەستان بە یادی خودا و گەیاندنی فەرمانەکانی.

**کردەوەی دڵ:** وەك خۆشویستنی خودا و پشت پێبەستن و گەڕانەوە بۆ لای و ترسان لێی و هیوا پێی و دڵسۆزی لە ئاییندا بۆ خودا و ئارامگرتن لەسەر فەرمانەکانی و قەدەغەکراوەکانی و قەدەرەکانی، ڕازیبوون بەو قەدەرانە و ڕازیبوون لە خودا، وەلا (الولاء) لەبەر خودا و لە پێناوی خودادا و دوژمنایەتی لە پێناویدا و ملکەچی و فەرمانبەرداری و یەکلابوونەوەی دڵ بەلای خوداوە و دڵنیایی بە خوداوە، جگە لەمانە زۆرێکی تریش لە کردەوەی دڵ، کردەوەی ئەندامەکان بەبێ ئەمانە یان بێسوودن، یان کەم سوود.

**کردەوەی ئەندامەکان:** وەك نوێژ و جیهاد، ڕۆیشتن بەپێ بۆ جومعە و جەماعەت، کۆمەکی و یارمەتی کەسی دەستەوسان و پەککەوتوو، چاکە لەگەڵ خەڵکیدا و هاوشێوەکانی ئەمانە.

بۆیە ((**إياك نعبد**)) پابەندوون و دانپیانانی ئەحکامەکانی ئەم چوار پایەیە، ((**إياك نستعين**))یش داواکردنی کۆمەك و یارمەتییە لەسەر ئەو چوارە و بۆ ئەو چوارە، ((**إهدنا الصراط المستقيم**)) پێناسەی ئەو دوانەی پێشوو بە وردی و ئیلهامی هەستان بەو دوانە و گرتنەبەری ڕێگەی ڕێبواران بۆ لای خودا بەهۆیانەوە لەخۆ دەگرێت.

❁ ❁ ❁

## بەندایەتی لوتکەی شەرەفمەندییە

هەموو پێغەمبەران بانگیان بۆ ((إياك نعبد و إياك نستعين)) کردووە، ئەوان هەموویان بانگیان بۆ یەکتاپەرستی و ئیخلاص لە پەرستندا کردووە، لە یەکەمیانەوە تا دوایین پێغەمبەر، حەزرەتی نوح دەفەرموێت ﴿ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ﴾ الأعراف: ٥٩، هەر بەو جۆرە هود و صالح و شوعەیب فەرموویان ﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۗ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴾ الأعراف: ٦٥، ﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا ۗ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۖ قَدْ جَاءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ هَٰذِهِ نَاقَةُ اللَّهِ لَكُمْ آيَةً ۖ فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِي أَرْضِ اللَّهِ ۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ الأعراف: ٧٣، ﴿ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۗ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۖ قَدْ جَاءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ فَأَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾ الأعراف: ٨٥.

هەر بەو جۆرەی ئەوان ئیبراهیم (عليه السلام) خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ﴾ النحل: ٣٦، هەروەها ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ ﴾ الأنبياء: ٢٥، هەروەها ئایەتی ﴿ يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا ۖ إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٥١﴾ وَإِنَّ هَٰذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاتَّقُونِ ﴾ المؤمنون: ٥١-٥٢، خودای موتەعال بەندایەتی کردووە بە وەسفی تەواوترین دروستکراو و نزیکترین کەس لە خۆی، دەفەرموێت ﴿ سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِ ﴾ الإسراء: ١، هەروەها دەربارەی مەسیح(عليه السلام) دەفەرموێت ﴿ لَّن يَسْتَنكِفَ الْمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبْدًا لِّلَّهِ وَلَا الْمَلَائِكَةُ الْمُقَرَّبُونَ ۚ وَمَن يَسْتَنكِفْ عَنْ عِبَادَتِهِ وَيَسْتَكْبِرْ فَسَيَحْشُرُهُمْ إِلَيْهِ جَمِيعًا ﴾ النساء: ١٧٢، هەروەها ﴿ إِنَّ الَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَيُسَبِّحُونَهُ وَلَهُ يَسْجُدُونَ ﴾ الأعراف: ٢٠٦، ئەمە رۆشنی دەکاتەوە کە وەستانی تەواو لە ئایەتەکەی سورەتی "الأنبياء" ﴿ وَلَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾ لەم شوێنەدایە، پاشان ئایەتەکە دەست پێدەکاتەوە ﴿ وَمَنْ عِندَهُ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ ﴿١٩﴾ يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ ﴾ الأنبياء: ١٩، ئەو دوو بەشەی ئایەتەکە دوو رستەی سەربەخۆی تەواون، واتە ئەو

کەسەی لە ئاسمان و زەویدا بەندە و موڵکی هەیە، پاشان رستەیەکی تر دەست پێدەکات ﴿وَمَنْ عِندَهُۥ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ﴾ الأنبياء: ١٩—٢٠، واتە فریشتەکان کە لەلای خودان لوتبەرزی لە پەرستنی خودا ناکەن و خۆیان بە گەورە نازانن. "لایستحسرون" ماندوونابن تاکو واز لە بەندایەتی بهێنن، دەوترێت "حسر واستحسر" واتە "تعب و أعيا"—ماندوو بوو، بەڵکو بەندایەتیان و تەسبیحاتیان وەك هەناسەدانی مرۆڤ وایە، بۆیە یەکەم: وەسفی بەندەی پەروەردگاریی خودایە، دووەم: وەسفە بۆ بەندەی خواوەندی خودا، خودای موتەعال دەفەرموێ ﴿وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا﴾ الفرقان: ٦٣، هەروەها ﴿عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا﴾ الإنسان: ٦، ﴿وَٱذْكُرْ عَبْدَنَا دَاوُۥدَ﴾ ص: ١٧، ﴿وَٱذْكُرْ عَبْدَنَآ أَيُّوبَ﴾ ص: ٤١، ﴿وَٱذْكُرْ عِبَٰدَنَآ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ﴾ ص: ٤٥، لەسەر سلێمان دەفەرموێت ﴿نِعْمَ ٱلْعَبْدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾ ص: ٣٠، دەربارەی مەسیح (عليه السلام) ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ﴾ الزخرف: ٥٩، ئامانجی مەسیحی دیاری کرد کە بریتییە لە بەندایەتی، نەك خواوەندی، وەك چۆن دوژمنەکانی مەسیح لە نەصارا دەیانوت، وەسفی بەرێزترین دروستکراوی خۆی و بەرزترین کەس لە پلەی بەندایەتی لە بەرزترین مەقامدا ﴿وَإِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا﴾ البقرة: ٢٣، ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ﴾ الفرقان: ١، ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَٰبَ﴾ الكهف: ١، بە بەندایەتی ناوی هێناوە لە مەقامی دابەزینی قورئان بەسەریدا لە جێگەیەك کە جێگەی پێکوڵییە بەوەی کتێبێکی تر وەك قورئان بهێنن ﴿وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبْدُ ٱللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا۟ يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا ﴿١٩﴾﴾ الجن: ١٩، لە مەقامی بانگەوازدا بە بەندایەتی وەسفی کرد، هەروەها دەفەرموێت ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا﴾ الإسراء: ١، لە مەقامی ئیسرادا بە بەندایەتی وەسفی کرد، لە فەرموودەیەکی سەحیحی پێغەمبەردا(ﷺ) ((لا تطروني كما أطرت النصارى المسيح بن مريم فإنما أنا عبد، فقولوا عبدالله ورسوله))، لە فەرموودەیەکی تردا ((أنا عبد، آكل كما يأكل العبد و أجلس كما يجلس العبد))، لە سەحیحی بوخاریدا لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە ((قرأت في التوراة صفة محمد(ﷺ): محمد رسول الله، عبدي ورسولي، سميته المتوكل، ليس بفظ ولا غليظ ولا صخاب بالأسواق، ولا يجزي بالسيئة السيئة ولكن يعفو ويغفر)).

خودا مژدەی رەهای بەبەندەکانی داوە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ﴾ الزمر: ١٧—١٨، ئاسایشی رەهای پێداون

﴿ يَٰعِبَادِ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَآ أَنتُمْ تَحْزَنُونَ ﴿٦٨﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُوا۟ مُسْلِمِينَ ﴾ الزخرف: ٦٨-٦٩، شەیتانی لە دەسەلات کەناردراوە بەسەر بەندەکانییەوە، دەسەلاتی شەیتانی لەسەر ئەوانە داناوە کە دەیکەنە سەرپەرشتکاری خۆیان و هاوەڵی بۆ خودا پێ دادەنێن ﴿ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾ الحجر: ٤٢، هەروەها ﴿ إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ إِنَّمَا سُلْطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشْرِكُونَ ﴾ النحل: ٩٩—١٠٠.

پێغەمبەر(ﷺ) چاکە لە بەندایەتیدا بە بەرزترین پلەی ئایین دادەنێت کە بریتییە لە پلەی ئیحسان، لە فەرموودەکەی جیبریلدا کە پرسیاری ئیحسانی لێ کرد، فەرمووی ((**أن تعبدالله كأنك تراه، فإن لم تكن تراه فإنه يراك**)).

### ۞ پێویستی ((**إياك نعبد**)) بۆ هەموو بەندەیەك هەتا مردن

خودای موتەعال بە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ﴿ وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ ﴾ الحجر: ٩٩، ئەهلی دۆزەخ دەڵێن ﴿ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلْيَقِينُ ﴾ المدثر: ٤٦-٤٧، یەقین لێرەدا بریتییە لە مردن بە کۆدەنگی ئەهلی تەفسیر، لە فەرموودەی سەحیحدا لە بەسەرهاتی "**عثمان بن مضعون**"دا خوای لێرازی بێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ((**أما عثمان فقد جاءه اليقين من ربه**))، واتە مردن و ئەوەی لەناو مردندایە، مرۆڤ تا لە خانەی دونیادا بێت داوای بەندایەتی لەسەر هەڵناگیرێت، بەڵکو لە جیهانی بەرزەخدا جۆرە بەندایەتییەکی تری لەسەرە، کاتێك دوو فریشتەکە پرسیاری لێ دەکەن ((**من كان يعبد؟ وما يقول في رسول الله** (ﷺ) )) داوای وەڵامی لێ دەکەن، لە رۆژی دواییدا بەندایەتییەکی تری لەسەرە، ئەو رۆژەی خودا هەموو بەندەکانی بۆ سوژدەبردن بانگ دەکات، باوەڕداران راستەوخۆ سوژدە دەبەن، بەڵام بێباوەڕان و دووڕووان ناتوانن سوژدە ببەن، کاتێك دەچنە خانەی پاداشت و سزاوە داواکردنی خودا لێیان کۆتایی پێ دێت، بەندایەتی ئەهلی پاداشت دەبێت بە تەسبیحات نزیك و تەبا لەگەڵ هەناسەیان، نە ماندوویی و نە شەکەتی لێوە نابینن.

هەر کەس پێیوابێت دەگاتە مەقامێك بەندایەتی لەسەر هەڵدەگیرێت، ئەو کەسە زەندیقە و بێباوەڕە بە خودا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، ئەو کەسە گەیشتۆتە مەقامی

بێباوەڕبوون بە خودا و دەرچوون لە ئایینەکەی، بەڵکو تا بەندە لە پلە و ئاستی بەندایەتییدا بەرزببێتەوە بەندایەتییەکەی بۆ خودا مەزنتر دەبێت، بۆ ئەو مەبەستە ئەرك لەسەر شانی پێغەمبەر و سەرجەم پێغەمبەرانی تر **-علیهم الصلاة والسلام وعلی نبینا-** مەزنتر و گەورەتر بووە لەوەی لەسەر شانی گەل ونەتەوەکانیان دانراوە، ئەرك لەسەر شانی خاوەنانی ویست و لێبڕان **"أولوا العزم"** زۆرتر و گەورەتر بووە لەوەی لەسەر شانی خەڵکانی خوار ئەوان دانراوە، ئەرك لەسەر شانی خاوەن زانستەکان **"أولوا العلم"** زۆرتر و زیاترە لەوەی لەسەر شانی کەسانی تر دانراوە، هەر کەسێك بەپێی پلە و ئاستی خۆی.

### ۞ دابەشبوونی بەندایەتی بۆ گشتی و تایبەت

**بەندایەتی دوو جۆرە: گشتی و تایبەت.**

**بەندایەتی گشتی:** بریتییە لە بەندایەتی ئەهلی ئاسمانەکان و زەوی، هەموویان بۆ خودان، چاکانیان و خراپانیان، باوەڕداران و بێباوەڕانیان، ئەمە بەندایەتی زاڵیی خودا و موڵکی خودایە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ﴿٨٨﴾ لَّقَدْ جِئْتُمْ شَيْـًٔا إِدًّا ﴿٨٩﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ ٱلْأَرْضُ وَتَخِرُّ ٱلْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوْا۟ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدًا ﴿٩١﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لِلرَّحْمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴿٩٢﴾ إِن كُلُّ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّآ ءَاتِى ٱلرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴾ مریم: ٨٨-٩٣، ئەم جۆرە بەندایەتییە باوەڕدار و بێباوەڕ دەگرێتەوە.

هەروەها ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَقُولُ ءَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِى هَٰٓؤُلَآءِ ﴾ الفرقان: ١٧، خودا بەبەندەی خۆی ناوی هێنان سەرەڕای گومراییان، بەلام ناونانێکی سنووردار بە ئاماژە. بەندایەتی رەهاش نەهاتووە بۆ ئەهلی جۆری دووەم نەبێت، دواتر بە پشتیوانی خودا باسی لەبارەوە دەکەین.

خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ عَٰلِمَ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ أَنتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِى مَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾ الزمر: ٤٦، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعِبَادِ ﴾ غافر: ٣١، هەروەها ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ حَكَمَ بَيْنَ ٱلْعِبَادِ ﴾ غافر: ٤٨، ئەمانە باس لە بەندایەتی تایبەت و گشتی دەکەن.

**جۆری دووەم:** بریتییە لە بەندایەتی گوێڕایەڵی و خۆشەویستی و شوێنکەوتنی فەرمانەکان ﴿ يَٰعِبَادِ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَآ أَنتُمْ تَحْزَنُونَ ﴾ الزخرف: ٦٨، ﴿ فَبَشِّرْ عِبَادِ ۝١٧ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ﴾ الزمر: ١٧–١٨، ﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴾ الفرقان: ٦٣، هەروەها خودای موتەعال دەربارەی ئیبلیس دەفەرموێت﴿ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ۝٣٩ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾ الحجر: ٣٩–٤٠، ﴿ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ ﴾الإسراء: ٦٥ ئەواوی دروستکراوەکان بەندەی پەروەردگاریی خودان، ئەهلی گوێڕایەڵی و دۆستایەتی خوداش بریتین لە بەندەی خاوەندی خودا.

لە قورئان وشەی "عباد" نەدراوەتە پاڵ خودا بۆ مانای ئەو دەستەیە نەبێت.

وەسفکردنی بەندەکانی پەروەردگاریی بە بەندایەتی، لەسەر یەکێك لەم پێنج رووە دێت:

یەکەم، بەشێوەی نەناسراو، وەك ﴿ إِن كُلُّ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّآ ءَاتِى ٱلرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴾ مریم: ٩٣

دووەم: ناسراو بە "لام" ﴿ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعِبَادِ ۝٣١ ﴾ غافر: ٣١ ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ حَكَمَ بَيْنَ ٱلْعِبَادِ ﴾ غافر: ٤٨

سێیەم: سنووردار بە ئامارە﴿ ءَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِى هَٰٓؤُلَآءِ ﴾ الفرقان: ١٧

چوارەم: لەگەڵ کۆی گشتی بەندەکاندا ناویان بهێنێت، لەگەڵ ئەهلی گوێڕایەڵیدا ناویان بهێنرێت ﴿ أَنتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِى مَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾ الزمر: ٤٦

پێنجەم: ناویان بهێنرێت بە وەسفکردنیان بەو کارانەی ئەنجامیان داوە﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ﴾الزمر: ٥٣

لەوانەیە بوترێت بۆیە بە "عبادە" ناوبراون چونکە بێهیوا نەبوون لە بەزەیی خودا، گەڕاونەتەوە بۆ لای، شوێنی باشترین لەوەی بۆیان دابەزیوە کەوتوون، بۆیە لە بەندەی خاوەندی و گوێڕایەڵین.

بەندایەتی بۆ تایبەت و گشتی دابەش کراوە، چونکە بنچینەی مانای وشەکە بریتییە لە ملکەچی و فەرمانبەرداری، دەوترێت ((طریق معبد)) ئەگەر تەخت بێت لەژێر پێدا، هەروەها ((فلان عبده الحب)) واتە نازداری کردووە، بەلام دۆستانی خودا بە ویست و

هەڵبژاردنی خۆیان بۆی ملکەچ بوون و شانیان داوەتە ژێر فەرمان و دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکان، دوژمنانی خودا بە زاڵیی و زۆری خودا ملکەچ بوون.

هاوشێوەی دابەشبوونی بەندایەتی بۆ تایبەت و گشتی بریتییە لە دابەشبوونی "القنوت–واتە گەردنکەچی" بۆ تایبەت و گشتی، هەروەها دابەشبوونی ((السجود)) سوژدە بەهەمان شێوە، خودای موتەعال لەسەر "قنوت"ی تایبەت دەفەرموێت ﴿ أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاءَ اللَّيْلِ سَاجِدًا وَقَائِمًا يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ ﴾الزمر: ٩، هەروەها لە حەقی مەریەمدا –عليها السلام– دەفەرموێت ﴿وَكَانَتْ مِنَ الْقَانِتِينَ ﴿١٢﴾﴾ التحريم: ١٢، لەم شێوانە زۆرن لە قورئاندا.

دەربارەی "قنوت"ی گشتیش دەفەرموێت﴿ وَلَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ كُلٌّ لَّهُ قَانِتُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾ الروم: ٢٦، "قانتون" واتە فەرمانبەردار و ملکەچن.

دەربارەی سوژدەی تایبەتیش دەفەرموێت ﴿ إِنَّ الَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَيُسَبِّحُونَهُ وَلَهُ يَسْجُدُونَ ۩ ﴿٢٠٦﴾ ﴾ الأعــــــراف: ٢٠٦﴿إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُ الرَّحْمَٰنِ خَرُّوا سُجَّدًا وَبُكِيًّا ﴿٥٨﴾﴾ مريم: ٥٨، لەم شێوەیە لە قورئاندا زۆرە.

لەسەر سوژدەی گشتیش دەفەرموێت﴿ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَظِلَالُهُم بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ ۩ ﴿١٥﴾ ﴾ الرعد: ١٥.

بۆیە ئەم سوژدەی ناچارییە جیایە لە سوژدەی ناوبراو لە ئایەتی ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَسْجُدُ لَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ وَالنُّجُومُ وَالْجِبَالُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ النَّاسِ ﴾الحج: ١٨، لێرەدا زۆربەی خەڵکی تایبەت کرد بە سوژدە، لە سورەتی "النحل"یشدا بەسەریاندا گشتگیری کرد ﴿ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مِن دَابَّةٍ وَالْمَلَائِكَةُ ﴾ النحل: ٤٩، ئەمە بریتییە لە سوژدەی ملکەچی و زاڵیی خودا–سبحانه–، هەموو کەسێك فەرمانبەرداری پەروەردگاریی خودایە، ملکەچی عیززەتی ئەون، لەژێر زاڵیی دەسەڵاتی ئەودان.

❁ ❁ ❁

## ئاستەكانی ((إياك نعبد)) بە زانست و كردار

بەندایەتی بەپێی زانست و كردار چەندین ئاستی هەیە، ئاستە زانستییەكەی دووجۆرە:

**یەكەم:** زانست بە خودا.

**دووەم:** زانست بە ئایینی خودا.

زانست بە خودا -سبحانه- بریتییە لە پێنج ئاست: زانست بە خودی خودا، بە سیفەتەكانی، بە ناوەكانی، بە كردارەكانی، پاكڕاگرتنی خودا لە شتێك كە شایستەی خودا نەبێت.

**زانست بە ئایینی خودا دوو ئاستە:**

**یەكەم:** زانست بە ئایینە شەرعییە ئەمرییەكەی خودا كە بریتییە لە شارێگەی ڕاست و دروست و گەیەنەر بە خودا(**الصراط المستقيم**).

**دووەم:** زانست بە ئایینی بەشەكی كە پاداشت و سزا لەخۆ دەگرێت، زانست بە فریشتە و كتێبەكان و پێغەمبەران دەچێتە ناو ئەم بەشەوە.

**ئاستە كردارییەكەشی دوو جۆرە:**

**یەكەم:** پلەیەك بۆ "**أصحاب اليمين**" ئەوانەی بە دەستی ڕاست بڕوانامەكەیان وەردەگرن.

**دووەم:** پلەیەك بۆ "**السابقين المقربين**" پێشكەوتووانی نزیكان لە خودا.

**ئاستی "أصحاب اليمين":** بریتییە لە جێبەجێ كردنی ئەركەكان و وازهێنان لە قەدەغەكراوەكان لەگەڵ چوونە ناو موباحات و هەندێ لە ناپەسەندەكان (مكروهات) و وازهێنان لە هەندێك لە پەسەندەكان (مستحبات).

**پلەی پێشكەوتووانی نزیكان (السابقين المقربين):** هەستان بە واجبەكان و پەسەندەكان (الواجبات والمستحبات) و دووركەوتنەوە لە قەدەغەكراوەكان و ناپەسەندەكان، دوورەپەرێزی لە هەر شتێك لە ڕۆژی دواییدا سوودیان پێ ناگەیەنێت، خۆپارێز لە هەر شتێك بترسن لە ڕۆژی دواییدا زیانیان پێ بگەیەنێت.

**كەسە تایبەتەكانی پێشكەوتوان و نزیكان لە خودا:** موباح بۆیان بووە بە گوێڕایەڵی و نزیكبوونەوە لە خودا، ئەوەش بە باشی نێتەكانیان، لە وەرگرتنی

نیعمەتەكان و بەهرەكانی پەروەردگاری زانا و دانا كە هیچ نیعمەتێكی بە بەندەكانی نەبەخشیوە بۆ پەروەردەكردنیان نەبێت بەو نیعمەتانە، تاكو نێت و مەلەكەی خێریان تیادا پەرەپێبدات، بەو بەهرە و نیعمەتانە رەگەزی مرۆیی بەخشندەیان بۆ زیاد بكات تاكو پێی بەرزببنەوە بۆ پلەكانی خێر و چاكە و كەماڵ و حیكمەت و بەو هۆیەشەوە بچنە ریزی چاكانەوە، ئەوان لە هەموو بار و حاڵێكیاندا عابید و زاكیری پەروەردگاریی خاوەن بەزەیین، بە هەموو جۆرەكانی ملكەچی و چوونەژێربار و خۆشەویستی و تەسلیمبوون، ئەوانە لە كێڵگەكانیاندا عابیدن، لە بازرگانییەكانیاندا عابیدن، لە سەرجێگە و لەگەڵ هاوسەرەكانیان عابیدن، بەو جۆرە بەهۆی ئەو شتانەی خودا پێیداون سەرمەست نابن و خوا و ناوەكانی خوایان لەیاد ناچێت، سەیری هەر شتێك دەكەن بە رەگەزێكی نوێی تەماشا دەكەن لە پەروەردە و ئیحساندا، بۆیە بۆ خاوەن نیعمەتەكە شوكر و خۆشەویستی و ملكەچی و تەسلیمبوون و گوێڕایەڵی زۆرتر دەردەبڕن.

لەلای ئەوان موباحی یەكسان لە هەردوو بەردا بوونی نییە (واتە نەخێری بۆ بنووسرێت، نە شەڕ)، هەموو كردەوەكانیان پارسەنگ بووە، خەڵكانی خوار ئەوان موباح واز لێ دەهێنن و بە پەرسشەوە خەریك دەبن، بەڵام ئەم دەستەیە موباح بە گوێڕایەڵی و نزیكبوونەوە لە خودا دەزانن، بۆ ئەهلی ئەم دوو ئاستە پلە و پایەگەلێك بوونی هەیە كە مەگەر تەنها خودا هەژماریان بكات.

### ۞ رێسكانی بەندایەتی

دەستهاڕی بەندایەتی لەسەر پازدە رێسا دەسوڕێتەوە، هەر كەس تەواویان بكات ئاستەكانی بەندایەتی كامڵ كردووە.

بەندایەتی دابەشبووە بۆ سەر دڵ و زمان و ئەندامەكانی لەش، لەسەر هەریەك لەمانە بەندایەتی تایبەت بەخۆی هەیە.

ئەحكامی بەندایەتی پێنجن: پێویست، باش، حەرام، ناباش، موباح، ئەمانە بۆ هەریەك لە دڵ و زمان و ئەندامەكانە.

ئەوەی "پێویستە" لەسەر دڵ هەندێكی كۆدەنگی لەسەر پێویستبوونیان هەیە و هەندێكی تریان جیاوازیان تێدایە.

ئەوەی كۆدەنگی لەسەر پێویستبوونی هەیە وەك: ئیخلاص و پشتبەستن بە خودا و خۆشەویستی و ئارامی و گەڕانەوە بۆ لای خودا(الإنابة) و ترس و هیوا و بەراستزانین (التصديق) و نییەت لە بەندایەتی و پەرستشدا، ئەم نییەتە بڕێكی زیاترە لە ئیخلاص، چونكە ئیخلاص بریتییە لە تەنهاكردنەوەی پەرستراو(معبود) لە كەسانی تر.

نێتی پەرستش دوو ئاستی هەیە:

یەكەم: جیاكردنەوەی پەرستش لە دەق پێوەگرتن.

دووەم: جیاكردنەوەی ئاستەكانی پەرستش هەندێكیان لە هەندێكی تریان.

هەرسێ بەشەكە پێویست (واجب)ن.

ئوممەت كۆدەنگی هەیە لەسەر پێویستی ئەو كارانە لەسەر دڵ بەشێوەیەكی گشتی.

هەر بەو جۆرە گەردنكەچی تەواو لە بەندایەتیدا كە خولگەی ئایینی لەسەرە، ئەوەش بریتییە لە كۆشان بۆ دەربڕینی بەندایەتی بەجۆرێك پەروەردگار پێیخۆش بێت و لێی ڕازی بێت، بنچینەی ئەم گەردنكەچبوونە پێویست (واجب)ە و كەماڵی "گەردنكەچبوون"یش پلەی نزیكان (المقربين)ە.

هەریەك لەو "پێویست"انە لەسەر دڵ دوو بەرەی هەیە: پێوستی شایستە (واجب مستحق) كە ئاستی"أصحاب اليمين"ە لەگەڵ كەماڵی پەسەند (كمال المستحب) كە بریتییە لە ئاستی نزیكان (المقربين)

هەر بەو جۆرە ئارامگرتن بە كۆدەنگی ئوممەت پێویست (واجب)ە، ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێت: خودا باسی ئارامگرتنی لە نەوەد شوێنی قورئاندا كردووە، یان زیاتر لە نەوەد، دوو بەرەی هەیە: پێویستی شایستە و كەماڵی پەسەند.

ئەوانەی كە ئوممەت جیاوازیان لەسەری هەیە، وەك ڕازیبوون، لە "پێویستبوون"یدا دوو قسە هەیە:

ئەوەی بە پێویستی داناوە دەڵێت: ناڕازیبوون لە خودا حەرامە، ڕزگاربوون لەو حەرامە تەنها بە ڕازیبوونە لە خودا بەدەست دێت، ئەو شتەی بەهۆیەوە لە حەرام ڕزگارت دەبێت پێویست (واجب)ە.

ئەو كەسەش كە دەڵێت ڕازیبوون لە خودا پەسەندە (مستحب)ە، دەڵێت: لە قورئان و فەرموودەدا فەرمانی پێنەكراوە، بەپێچەوانەی ئارامگرتن (صبر)ەوە خودا لە چەندین شوێنی كتێبەكەیدا فەرمانی پێكردووە.

هەر بەو جۆرە پشتبەستن بە خودا پێویستە ﴿إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ﴾ یونس: ٨٤

خودا فەرمانی بە گەڕانەوەی بەردەوام كردووە بۆ لای خۆی ﴿وَأَنِيبُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّكُمْ﴾ الزمر: ٥٤، فەرمانی بە ئیخلاص كردووە ﴿وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ البینة: ٥، هەروەها ترسان لە خودا ﴿فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٥﴾﴾ آل عمران: ١٧٥، ﴿فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِى﴾ البقرة: ١٥٠، ﴿وَإِيَّٰىَ فَٱرْهَبُونِ﴾ البقرة: ٤٠، هەر بەو جۆرە فەرمان بە صدق ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ التوبة: ١١٩، هەروەها خۆشەویستی كە یەكێكە لە مەزنترین واجبەكان، چونكە بریتییە لە كرۆكی بەندایەتی كە فەرمانی پێكراوە، بەڵكو مۆخ و رۆحی بەندایەتییە ﴿يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ﴾ المائدة: ٥٤. لێرەدا خۆشەویستی كراوە بە یەكێك لە سیفەتەكانی "حزب الله"

بەڵام رازیبوون: لە قورئاندا مەدح و سەنای ئەوانە كراوە كە رازین، فەرمانی پێنەكراوە ﴿رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ﴾ المائدة: ١١٩.

لای هەندێ كەس كۆبوونەوەی رازیبوون لەگەڵ ئازارچەشتن جێگەی پرسیارە، وادەزانن ئەو دوانە لەیەكتر جیان و پێكەوە كۆنابنەوە، بەڵام بەو جۆرە نییە كە ئەو گومانی پێ دەبات، نەخۆشێك كە دەوایەكی بێزراو و تاڵ دەخوات ئازاری پێ دەچێژێت، بەڵام پێی رازییە، رۆژووگر لە مانگی رەمەزاندا و لە گەرمای زۆردا ئازاری پێ دەچێژێت، بەڵام پێی رازییە، مرۆڤی بەخیل بە دەركردنی زەكات لە ماڵەكەی ئازار دەچێژێت، بەڵام پێی رازییە، وەك چۆن ئازارچەشتن نەرێی ئارامگرتن ناكات، هەر بەو جۆرە نەرێی رازیبوونیش ناكات.

جیاوازی نێوانیان لە رازیبوون بە بڕیارە بڕاوە گەردوونییەكانی خودادایە، بەڵام رازیبوون بەوەی ئەو-سبحانه- پەروەردگار و خودایە و رازیبوون بە فەرمانە ئاینییەكانی كۆدەنگی هەیە لەسەر پێویستبوونیان، بەڵكو بەندە نابێتە موسڵمان تا ئەو رازیبوونەی نەبێت، رازی بێت بە خودا وەك پەروەردگار، رازی بێت بە ئیسلام وەك ئاین، رازی بێت بە محمد(ﷺ) وەك پێغەمبەر.

لێرەدا جیاوازی هەیە لە نێوانیان لەمەڕ بوونی "الخشوع-ترس و ملكەچی" لە نوێژدا، فەقیهان دوو بۆچوونیان هەیە: ئیبن حامد كە لە هاوەڵانی ئیمام ئەحمەدە

و ئەبو حامد غەزالی لە "إحياء"دا بە پێویستی دادەنێن، بەڵام زۆربەی فەقیهان بە پێویستیان دانەناوە.

بەڵگەیان هێناوەتەوە بەوەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کردووە گەر کەسێك لە نوێژەکەیدا هەڵەی کرد سوژدەی سەهو ببات فەرمانی پێنەکردووە نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە، لەگەڵ فەرموودەی ((**إن الشيطان يأتي أحدكم في صلاته، فيقول: أذكر كذا، أذكر كذا-لما لم يكن يذكر- حتى يضل الرجل أن يدري كم صلى**)) بەڵام کێبەرکێ لەوەدا نییە کە ئەو نوێژە پاداشتەکەی بە ئەندازەی ئامادەبوونی دڵ و ملکەچییەتی بۆ خودا، وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((**إن العبد لينصرف من الصلاة ولم يكتب له إلا نصفها، ثلثها، ربعها، حتى بلغ عشرها**))، ئیبن عەباس -خوایان لێ رازی بێت- دەفەرموێت ((ئەوەندەت لە نوێژەکەت بۆ دەنوسرێ کە تێیگەیشتووی (دڵت ئامادەبووە)))، ئەو نوێژە -بەپێی کەماڵی مەبەست لە نوێژ- دروست نییە، هەرچەند دروستە بەپێی فەرمان نەکردن بە دووبارە کردنەوەی، نابێت وشەی "دروستە"ی بەسەردا بسەپێت و بوترێت "نوێژێکی دروستە" لەکاتێکدا ئەنجامدەرەکەی لەسەر نوێژەکە پاداشت وەرناگرێت، ئەو قسەیەی گوایە "ئەو نوێژەی خشوعی تێدا نەبێت دروستە، واتە ئەو ئایەتانەی کە دەیانخوێنی و ئەو یادانەی تیایدا ئەنجامی دەدات تێڕامانیان بۆ نەکات"، ئەم بەکارهێنانی وشەی "دروستە" بۆ ئەو مەرجە زاراوەییانە بەکاردەهێنرێت کە پەیوەندی بە کار و جوولەی رووالەتی و بەدەنییەوە هەیە، نەك کار و کردەوەی ناوەوەی مرۆڤ وەك ئیخلاص، هەروەك چۆن پزیشکان وشەی "تەندروست" بۆ جەستە بەکاردەهێنن بەبێ سەرنجدان لە تەندروستی دەروون و بیروباوەڕ و ئەخلاق، دروستیی نوێژ بەم مانایە ئەوە ناگەیەنێت فەرزەکەی لەکۆڵ بووبێتەوە و لە رۆژی دواییدا لەسەریان پرسیاری لێ نەکرێت، مەبەست ئەوەیە کە لە رووالەتیدا دروستە وەك بەکارهێنانی ناوی "موسڵمان" بۆ کەسی "دووڕوو" لە دەرەوەدا.

**کرۆکی مەبەست:** ئەم کار و کردەوانە -پێویست و بەباشزانراویان- بریتین لە بەندایەتی دڵ، هەر کەس پەکیان بخات ئەوا بەندایەتی مەلیك(دڵ)ی پەکخستووە با بە بەندایەتی رەعییەتەکان کە ئەندامەکانی جەستەیەتی هەستابێت.

ئەوەی پێویستە ئەوەیە کە مەلیکی هەموو ئەندامانی جەستە -کە بریتییە لە دڵ- بە بەندایەتی خۆی بۆ خودا -سبحانە- هەڵبستێت، ئەو و رەعییەتەکانیشی.

ئەو قەدەغەکراوانەی کە لەسەریەتی وەک "لوتبەرزی و ریا و لەخۆدەرچوون و حەسودی و بێئاگایی و دووڕوویی و لەخۆباییبوون" دوو جۆرن: بێباوەڕی و یاخیبوون.

**یاخیبوون دوو جۆرە: گەورە و بچووک.**

**گەورە:** وەک ریا و لەخۆدەرچوون و لوتبەرزی و شانازی و خۆمەزن کردن و بێهیوایی لە بەزەیی خودا و رەشبینی لە دەرگای خودا و گوێنەدان بە مەکری خودا و خۆشی و سروور بە ئازاری موسڵمانان و دەستهێنان بە ریشدا بۆ بەلا و ناخۆشییەکانیان و حەزکردن لەوەی خراپە لەناویان بڵاوببێتەوە، حەسوودی بەوەی خودا پێیداون، ئاوات خواستن بۆ ئەوەی نیعمەتەکانیان لێ وەربگیرێتەوە، سەرئەنجامەکانی ئەم ئاماژە بۆکراوانە کە لە زینا و خواردنەوەی ئارەق و گوناهە گەورە دیارەکان حەرامترن، چارەسەری دڵ و جەستە دوورکەوتنەوەیە لە هەموو ئەوانە و تەوبەکردن لێیان، ئەگەر نە، ئەوە دڵێکی نەخۆش و شێواوە، گەر دڵیش تێکبچێت هەموو جەستە تێکدەچێت.

ئەم ئافاتانە لە نەناسین و نەزانینی بەندایەتی دڵەوە سەرهەڵدەدەن، هەروەها هەڵنەستان پێیان.

بۆیە ئەرک و کاری ((**إياك نعبد**)) لەسەر دڵە بەر لە ئەندامەکان، گەر پشتگوێیان بخات و جێبەجێیان نەکات بە دژەکانی ئەوانە پڕدەبێت، بەپێی جێبەجێ کردنی ئەوانە لە دژەکانیان خاڵی دەبێتەوە.

ئەو کاروکردەوانە لەوانەیە گوناهی بچووک بن یان گەورە بن بەپێی هێز و توندیان یان سووکی و وردیان.

**لە گوناهە بچووکەکان:** حەزی حەرام و ئاوات بۆ خواستنی، جیاوازی پلەی حەز لە گوناهی گەورە و گوناهی بچووک بەپێی پلەی حەزلێکراوەکەیە، حەزی بێباوەڕی و هاوەڵدانان بێباوەڕییە، حەزی بیدعە لە ئایین دەرچوونە، حەزی گوناهە گەورەکان یاخیبوونە، گەر بۆ خودا ئەو گوناهە گەورەیە ئەنجام نەدا -لە کاتێکدا دەیتوانی ئەنجامی بدات- پاداشت لەسەری وەردەگرێت، گەر هەوڵیدا بۆ ئەنجامدانی گوناهەکە و پێینەگەیشت وەک بکەری گوناهەکە خراپەی بۆ دەنوسرێت، چونکە لە ئەحکامی

پاداشت و سزادا ئەو دوو کەسە یەکسانن، با لە ئەحکامی شەرعدا هەمان دوو کەس نەبن، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی ((گەر دوو موسڵمان بە شمشێرەکانیان رووبەڕووی یەکتر وەستانەوە، بکوژ و کوژراوەکە هەردوو لە ئاگردان، وتیان: ئەمەیان بکوژە ئەی پێغەمبەری خودا، ئەی کوژراوەکە بۆ؟ فەرمووی: ئەویش سووربوو لەسەر کوشتنی بەرانبەرەکەی))، کوژراوەکەشی وەك بکوژەکە دانا بە هۆی سووربوونی لەسەر کوشتنی کەسی بەرانبەر، هەردوو یەکسانن لە گوناهدا، نەك لە حوکمی شەرعدا، نموونەی ئەمانە لە پاداشت و سزا زۆرن.

بەم برەی خستمانەڕوو پەسەندەکانی دڵ و موباحەکانی زانرا و روون بوویەوە.

## ۞ بەندایەتی زمان

پێنج بەندایەتییەکەی زمان:

**یەکەم پێویستەکانیان:** گۆکردنی دوو شەهادەکە (**لا إله إلا الله، محمد رسول الله**) خوێندنەوەی قورئان چەندە پێویست بێت، ئەو برەش ئەوەیە کە نوێژی پێ دادەمەزرێت، گۆکردنی ئەو زیکرە پێویستانەی لە نوێژدا دەخوێنرێن کە خودا و پێغەمبەر فەرمانیان پێکردوون، وەك چۆن فەرمان بە "تسبیح"کراوە لە رکوع و سوژدەدا، هەروەها فەرمانی کردووە بە وتنی "ربنا ولك الحمد"دوای راستبوونەوە لە رکوع، هەروەها فەرمانی بە تەحیات و وتنی "الله اكبر" کردووە.

هەروەها لە پێویستییەکان لەسەر زمان وەڵامدانەوەی سڵاوکردنە، لە سەلامکردنی سەرەتادا دوو بۆچوون هەیە.

هەروەها لە پێویستییەکانی سەر زمان فەرمان بە چاکە و رێگری لە خراپەیە، فێرکردنی نەزان و رێنومایی سەرلێشێواو و شایەتی دانی تایبەت بە حەق و راستگۆیی لە گوفتاردا.

**بەڵام پەسەندەکانی زمان:** خوێندنەوەی قورئان و بەرداوامی لە یادی خودا و کۆڕی زانستی بەسوود و هاوشێوەکانی ئەمانە.

**حەرامەکانی زمان:** وتنی هەر شتێك خودا و پێغەمبەرەکەی پێیان ناخۆش بێت، وەك وتنی هەندێ بیدعە کە پێچەوانەی ئەوە بێت خودا پێغەمبەری بۆ رەوانە کرد و بانگردن بۆ ئەو شتانە و جوانکردنیان و بەهێزکردنیان، هەروەها دروستکردنی تۆمەت و جنێودان

بە موسڵمان و ئازاردانی بە هەر وتنێك، هەر بەو جۆرە درۆ و شایەتیدانی ناحەق و وتنی قسەیەك دەربارەی خودا زانستت پێی نەبێت كە لە هەموویان قەدەغەكراوترە.

**ناپەسەندەكان:** وتنی شتێك كە نەوتنی باشتربێت لەگەڵ نەبوونی سزا لەسەری.

**پێشین جیاوازی لەنێوانیاندا هەیە:** ئایا لە زماندا موباح بوونی هەیە كە هەردوو بەرەكەی یەكسان بێت، واتە وتن و نەوتنی وەك یەك وابێت؟ لەمەشدا دوو بۆچوون هەیە كە "إبن منذر" و كەسانی تریش باسیان كردووە، یەكێكیان: هەموو ئەوەی مرۆڤ دەیكات بە قسە: یان بەخێر بۆی دەنوسرێت یان بە شەڕ لەسەری دەنوسرێت، قسەیەك بوونی نییە نە بۆی بنووسرێت نە لەسەری بنووسرێت. بەڵگەیان بەوە هێناوەتەوە كە هەموو قسەیەكی مرۆڤ دەنوسرێت ﴿ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴿١٨﴾ ﴾ ق: ١٨، بۆیە جگە لە خێر و شەڕ شتێكی تر نانوسرێت.

دەستەیەكیش دەڵێن: موباح لە قسەدا بوونی هەیە و كەسەكە هیچی بۆ نانوسرێت نە پاداشت نە سزا، هەروەك جووڵەی ئەندامەكانی تر، دەڵێن: چونكە زۆرێك لە قسە بكە و مەكە(الأمر والنهي) نایانگرێتەوە، ئەمەش تایبەتمەندی موباحە.

راستییەكەی: جوڵاندنی زمان بە قسەكردن دوو بەرەی یەكسانی نییە، بەڵكو یان وەرگیراوە یان رەدكراوەتەوە، چونكە زمان تایبەتمەندییەكی هەیە كە ئەندامەكانی تر نیيانە، زۆربەی ئەوانەی لە ئاگری دۆزەخدا بەڕوودا وەریان دەگێڕن بەری زمانیانە، هەر وشەیەك لە زمان دێتە دەرەوە، یان خودا و پێغەمبەر رازی دەكات، یان نە، گەر رازی كرد وەرگیراوە، ئەگەر نە، رەد دەكرێتەوە، ئەمە پێچەوانەی جووڵەی ئەندامەكانی تری جەستەیە، خاوەنەكەی سوود لە جووڵاندنیان دەبینێت لە موباحێكی "دوو بەرە یەكسان"دا، بۆ ئەو ئاسوودەیی و قازانجەی تیایاندا هەیە، بەكارهێنانیان موباح كراوە لەو جێگەدا بە قازانجێك بۆی بگەڕێتەوە و لە رۆژی دواییدا زیانی پێ نەگەیەنێت، بەڵام جوڵاندنی زمان(قسەكردن) بە شتێك سوود و قازانجی نەبێت هەر بە زیان دەشكێتەوە بەسەر كەسەكەدا.

لەوانەیە جووڵە هەبێت بۆ ئەندامەكانی جەستە تیایدا زیان و قازانج و بەرپرسیارێتی یەكسان بن، دەرنەكەوتنی ئەوە لە زمان بۆ زۆری بەكارهێنانی زمان لەلایەن مرۆڤەوە دەگەڕێتەوە، ئەو لێی بەئاگایە، بەڵام لە ئەندامەكانی تر ئاگاهی نییە بەتایبەت بیستن و بینین.

وتـراوە جووڵـەی زمـان لـە كـاتی پێویسـتیدا وەرگـیراوە و لـەكاتی ناپێویسـتدا رەد دەكرێتەوە و سوودی بۆی نییە، ئەوكات لەسەری دەنوسریٚ و بۆی نانوسرێت.

ئەگەر بوترێت: گەر كارەكە دوو بەرە یەكسان (موباح) بـوو، ئـەوا جووڵـەی زمـان كـە وەسیلەیە بۆ ئەو موباحە دیسان موبـاح دەبێـت، چـونكە هۆكارەكـان شـوێن مـەرام و حوكمەكان دەكەون.

وتـراوە: مـەرج نییـە وابێـت، لەوانەیـە شـتێك موبـاح بێـت یـان پێویسـت بێـت، بـەڵام هۆكارەكەی ناپەسەند بێت، وەك وەفاكردن بە گوێڕایەڵییەكی نەزركراو، لەگـەڵ ئـەوەی كەجێبەجیٚ كردنی واجبە هۆكارەكەی كە بریتییە لە "نەزر" ناپەسەندە و نـەهیلێكراوە. هەر بەو جۆرە سوێندی ناچاریی رەد دەكرێتەوە لەگەڵ پێویستی وەفا بـە سـوێندەكە، یان دانی كەفارەت، سواڵكردن لە كاتی پێویستیدا بە ناپەسـەند دانـراوە كەچـی ئـەوەی بە سـواڵ پەیـدای كـردووە موباحـە سـوودی لـیٚ ببینێـت، لـەم شـێوانە زۆرن. لەوانەیـە هۆكارێكی فەسادئامێز بەهۆی ئەو فەسادەوە ناپەسەند بێت یان حەرا بكرێت، بەڵام ئەو شتەی هۆكارەكەی بۆ دەگیرێتەبەر نە حەرام بێت نە ناپەسەند.

### ۞ بەندایەتی ئەندامەكانی جەستە

پێنج بەندایەتییەكە لەسـەر ئەندامـەكانی جەسـتە: بیسـت و پێـنج پلـەن، هەسـتەكان پێنجن و ئەحكامەكانیش پێنج (پێنج بەندایەتییەكە)

### لەسەر گویٚ:

**پێویستی گوێگرتن:** وەك گوێگرتن بۆ ئەو شتانەی خودا و پێغەمبەرەكەی پێویسـتیان كردووە لە گوێگرتن لە ئیسـلام و بـاوەڕ و فـەرزەكانی، هـەر بـەو جـۆرە گـوێگرتن لـە خوێندنی ناو نوێژی بە كۆمەڵ كاتێك ئیمام دەیخوێنێت، هەروەها گوێگرتن لـە وتـاری هەینی لە دروستترین قسەی زانایاندا.

**حەرامكراو:** گوێگرتن لە بێباوەڕی و بیدعە، مەگەر لە گوێگرتنیدا بەرژەوەندییـەك بـوونی هەبێت، لە بەرپەرچدانەوەی یان شایەتیدان لەسەر ئەو كەسەی دەیڵێت، یـان زیـادكردنی هێزی باوەڕ و سوننەت بە زانینی دژەكانیان لە بێباوەڕی و بیدعە و هاوشێوەكانیان.

هەر بەو جۆرە گوێگرتن لە دەنگی ئافرەتی نامەحرەم گەر گوێگرتن لە دەنگیان فیتنەی لێ پەیدا ببێت، گەر پێویستییەك لە پشتییەوە بوونی نەبێت، لە شایەتیدان و مامەڵە و داوای فتوا و دادگایی و چارەسەر و هاوشێوەی ئەمانە.

هەر بەو جۆرە گوێگرتن لە مۆسیقا و ئامێرەكانی ئاواز و گۆرانی و سەرمەستی، وەك "عود و تەنمبورر و بەراع" و هاوشێوەكانیان، لەسەری پێویست نییە گوێی بئاخنێت ئەگەر دەنگەكەی دەگەیشتە لای، ئەو نایەوێت گوێیان بۆ بگرێت، مەگەر لەوە بترسێت گوێی بۆ بگرێت و هەستی بەلایدا ببزوێت، ئەو كات پێویستە لە گوێگرتن دوور بكەوێتەوە لە دەروازەی پێویستیی رێگری كردن لە هۆ"سد الذرائع".

هاوشێوەی ئەمە سەیركردنی لەناكاو و بێ مەبەست كە لەسەر تەماشاكەرەكە حەرام نەكراوە، بەڵام سەیركردنی دووەم لەسەری حەرامە گەر بە ویستی خۆی بێت.

**گوێگرتنی پەسەند:** گوێگرتنی پەسەند لە زانست و خوێندنەوەی قورئان و یادی خودا و گوێگرتن لە هەر شتێك خودا پێیخۆشە و نەبووەتە فەرز.

**گوێگرتنی ناپەسەند:** پێچەوانەی پەسەندە، گوێگرتن لە هەر شتێك بەناباش و ناپەسەند زانرێت و سزای لەسەر نەبێت.

**موباحی گوێگرتن** رۆشن و دیارە.

## لەسەر چاو:

**سەیركردنی پێویست:** تەماشاكردنی قورئان و كتێبە زانستییەكان لەكاتی پێویستبوونی ئەو زانستانەدا، تەماشاكردن بۆ جیاكردنەوەی حەڵاڵ لە حەرام بۆ ئەو شتانەی دەیخوات، یان دەیبەخشێت، یان خۆشی و چێژیان لێ دەبینێت، سەیركردنی ئەو ئەمانەتانەی دەیانگێڕێتەوە بۆ خاوەنەكانیان، هاوشێوەكانی ئەمانە.

**سەیركردنی حەرام:** سەیركردنی نامەحرەم بە حەز و ئارەزووەوە، یان بەبێ ئارەزوو مەگەر بۆ پێویستی، وەك سەیركردنی كەسی داخوازیكەر و مامەڵەكەر و شایەت و دادوەر و پزیشك و خاوەن مەحرەم.

**سەیركردنی پەسەند:** سەیركردنی كتێبی زانستی و ئاینیی كە كەسەكە باوەڕ و زانستی پێیان زیاد دەكات، سەیركردنی بەڵگە و نیشانە بینراوەكان بۆ ئەوەی بیانكات بە بەڵگەی یەكتای خودا و ناسین و حیكمەتەكانی، ئەمە پێویستترین

پێویستییە، لە زۆر شوێنی قورئاندا بە توندی فەرمانی پێکراوە، هەڕەشەی توندی کردووە لەوانەی خۆیان کوێر و بێئاگا کردووە لە بەڵگە و نیشانە گەردوونییەکان، کوێربوون لەوانە سەردەکێشێت بۆ بەدرۆزانینی بەڵگە و نیشانەکانی خودا لە ئاسۆی دەروون و گەردووندا. باوەڕ بە خودا و کتێبەکەی و پێغەمبەرەکەی بەری تێڕامان و بیرکردنەوەیە لە بەڵگە و نیشانەکانی خودا لە دەروون و گەردووندا.

**سەیرکردنی ناپەسەند:** زیادە سەیرکردن کە هیچ بەرژەوەندییەکی تێدا نییە، چاو زیادە سەیرکردنی هەیە وەك چۆن زمان هەیبوو، زۆرن ئەوانەی زیادە سەیرکردن بە ئەنجامێکی گەیاندوون زۆر بە زەحمەت لێی قوتاربوون و چارەسەرکردنەکەی زۆر گران بووە، هەندێ لە پێشین: سەیرکردنی زیادیان بە ناپەسەند دەبینی وەك چۆن قسەکردنی زیادیان بە ناپەسەند دەزانی.

**سەیرکردنی موباح:** ئەو سەیرکردنەی کە زیان و قازانجی تێدا نییە لە ئێستا و داهاتوودا.

**لە سەیرکردنی حەرام سەیری عەوراتە کە دوو بەشە:** عەورەتێك لە پشت پۆشاکەوە، لەگەڵ عەورەتێك لە پشت دەرگاوە، گەر تەماشای ئەو عەورەتە بکات کە لە پشتی دەرگاوەیە و خاوەن عەورەتەکە تیرێکی بۆ وەشاند و چاوی کوێر کرد ئەوا تیرئەندازەکە هیچی لەسەر نییە و خوێنی چاوەکەی بە بێ بەرانبەر دەڕوات، بە دەقی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) کە فەرموودەیەکی سەحیحە و ئیمامی بوخاری و مسلم ریوایەتیان کردووە، لە ئەبو هورەیرەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی **((من اطلع في بيت قوم بغير إذنهم، فقد حل لهم أن يفقأوا عينه))**، هەروەها ئەبو داوود ریوایەتی کردووە **((ففقأوا عينه فقد هدرت))**.

ئەمە لە کاتێکدا سەیرکەرەکە هۆیەکی نەبێت بۆ سەیرکردنی ئەو شوێنە، وەك بوونی عەورەتێکی خۆی لەو جێگە کە بیەوێت سەیری بکات، یان گومانێك -ئەو فەرمانی پێکرابێت، یان رێگەی پێدرابێت- چاودێری بکات.

## لەسەر تام و چێژ:

**چێژی پێویست:** خواردن و خواردنەوەی پێویست بە مرۆڤ گەر نەیخوات ترسی مردنی لێ بکرێت،گەر کەسەکە تا مردن خواردنی نەخوارد، ئەوا مردنەکەی یاخیبوونە

و كوشتنی خۆیەتی، **ئیمام ئەحمەد و طاووس دەڵێن:** هەر كەس ناچاربوو بە خواردنی مردارەوە بوو نەیخوارد و بەو هۆیەوە مرد دەچێتە ناو ئاگرەوە.

**چێژی حەرام:** وەك چێژی ئارەق و ژەهری كوشندە و چێژی قەدەغەكراو لێی لەكاتی رۆژووی پێویست (واجب)دا.

**چێژی ناپەسەند:** وەك چێژی گومان لێكراوەكان و خواردنی ناپێویست و چێژی خواردنێك خانەخوێ نەیویستبێت تۆ بانگهێش بكات بۆ سەری، هەروەها چێژ و چەشتنی خواردنی ریابازەكان لە وەلیمە و دەعوەتەكاندا، لە سونەتی پێغەمبەردا هاتووە: پێغەمبەر(ﷺ) **((نهى عن طعام المتبارين))**، هەروەها چێژی خواردنی كەسێك لەشەرمدا پێت ببەخشێت نەك بە دڵ و دەروون.

**چێژی پەسەند:** خواردنی ئەوەی یارمەتیت دەدات لەسەر گوێڕایەڵی خودا-عزوجل- لەو خواردنانەی خودا رێگەی پێداون، خواردن لەگەڵ میوان تاكو خواردنەكەی لەلا خۆش و باش بێت و مەبەستی خۆیی لێوە بەدەست بهێنێت، خواردنی كەسێك بانگهێشی كردبێت كە پێویست بێت یان بەباش بزانرێت بچیت بەدەم بانگهێش كردنەكەیەوە.

هەندێ لە فەقیهان خواردنی وەلیمەی پێویست بە رۆیشتن بۆی بە واجبیان داناوە، بەهۆی بوونی فەرمانەوە لەسەری لەلای شاریعەوە.

**چێژی موباح:** چێژێكە گوناهی تێدا نەبێت و نەكەوتبێت بەلای یەكێك لە دوو بەرەكەدا(پەسەند و ناپەسەند).

### ۞ پەیوەستبوونی پێنج بەندایەتییەكە (پێنج ئەحكامەكە) بە بۆنكردنەوە:

**بۆنی پێویست:** هەر بۆنێك رێگەی حەڵاڵ و حەرامی شتێك رۆشن بكاتەوە، وەك ئەو بۆنەی شتێكی تایبەتی پێ جیادەكەیەوە تاكو بزانیت پاكە یان پیسە؟ ژەهرێكی كوشندەیە یان زیانی تێدا نییە؟ دەتوانرێت سوودی لێ ببینرێت یان زەرەر؟ لەو بۆنكردنەوە راستییەك ساغ ببێتەوە بەهۆی كەسی خاوەن شارەزایی و هاوشێوەكانی ئەوانەوە.

**بۆنی حەرام:** بۆنكردنی بۆنی خۆش لە ئیحرامدا بە مەبەستەوە، بۆنكردنی بۆنی داگیركراو و دزراو، بۆنكردنی بۆنی ئافرەتێك بۆنی لەخۆی دابێت، نەوەك رووبەرووی فیتنەی دوای بۆنكردن ببێتەوە.

**بۆنی پەسەند:** بۆنی شتێك كۆمەكیت بكات لەسەر گوێڕایەڵی خودا، هەستەكانت بەهێز بكەن و دەروون بۆ زانست و كردار بكەنەوە، لەوانە هەدییەی بۆنی خۆش و ڕێحان گەر هەدیەت كرا.

لە سەحیحی "مسلم"دا لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) **((هەر كەس ڕێحانەی پێدرا ڕەدی نەكاتەوە، چونكە بۆنەكەی خۆشە و هەڵگرتنی ئاسانە))**

**بۆنی ناپەسەند:** وەك بۆنكردنی بۆنی ستەمكاران و كەسانی خاوەن شوبهە و هاوشێوەكانی ئەمانە.

**بۆنی موباح:** بۆنكردنێكە لەلای خوداوە قەدەغە نەكرابێت و هیچی لەسەر نەبێت و بەرژەوەندییەكی ئاینیی تێدا نەبێت و وابەستەی شەرع نەكرابێت.

**پەیوەستبوونی ئەو پێنج ئەحكامە بە هەستی دەستلێدانەوە ((اللمس)):**

**دەستلێدانی پێویست:** دەستلێدانی هاوسەر كاتێك هاوسەریكردن لەگەڵی پێویست بێت.

**دەستلێدانی حەرام:** دەستلێدانی نامەحرەم بەبێ هۆیەكی شەرعی.

**پەسەند:** ئەگەر چاوداخستنی تێدابێت و خۆی لە حەرام پێ بگرێتەوە و پاكداوێنی هاوسەرەكەی تێدابێت.

**ناپەسەند:** دەستدان لە هاوسەری خۆت بە مەبەستی چێژ لە كاتی ئیحرامدا، هەروەها لە ئیعتیكافدا و لە كاتی ڕۆژوودا ئەگەر لەخۆی دڵنیا نەبوو، هەروەها دەستدان لە ڕانی پیاو لەبارێكدا بە عەورە سەرژمێر كرابێت.

**موباحیش:** ئەوەیە نە بەرژەوەندییەكی ئاینیی نە مەفسەدەیەكی تێدایە.

هەر بەو جۆرە ئەم پێنج بەندایەتییە ڕوو لە دەست و پێ دەكات و نموونەكانیان شاراوە نین.

كاسپی دیاریكراو بۆ بژێوی خۆی و خانەوادە و ماڵ و منداڵ پێویستە، لە پێویستبوونی كەسابەت بۆ گێڕانەوەی قەرز جیاوازی هەیە، ڕای دروست ئەوەیە: بۆ گێڕانەوەی قەرزەكەی كەسابەت پێویستە، كاسپی بۆ دەركردنی زەكات پێویست نییە، لە پێویستبوونی بۆ جێبەجێ كردنی فەریزەی حەج جێی بیر لێكردنەوەیە،

بەهێزترین بەڵگە: پێویستبوونە، چونکە لە توانای مرۆڤدایە و بەو هۆیەوە دەتوانێت فەریزەی حەج ئەنجام بدات، ئەوەی لای زانایان مەشهورە پێویست نەبوونیەتی.

نموونەی دەستوەشاندنی پێویست: کۆمەکی کەسی پەککەوتە و ناچار و رەجمکردنی شەیتان (رمي الجمار).

حەرام: کوشتنی ئەو نەفسەی خوا کوشتنی حەرام کردووە، تاڵانکردنی ماڵ و سامانی کەسی بێگوناه، لێدانی کەسێك کە لێدانی دروست نییە، هەروەها یاریيە حەرامکراوەکان بە دەقی رۆشن وەك یانەسیب یان حەرامتر لەوە لەلای ئەهلی مەدینە وەك شەترەنج، یان هاوشێوەی ئەوە لای فەقیهەکانی فەرموودە وەك ئەحمەد و کەسانی تر، یان لەخوار ئەوەوە لای هەندێکی تریان. هەروەها نووسینی بیدعەی پێچەوانە بە سونەت، دانان یان لەبەرگرتنەوە، مەگەر پەیوەست بێت بۆ بەرپەرچدانەوە و هەڵوەشانەوەی. هەروەها نووسینی شتی درۆ و ستەم و حوکمی ناڕەوا و دەستدان لە ئافرەتی نامەحرەم و نووسینی شتێك زیان بە موسڵمانان بگەیەنێت لە دونیا و دواڕۆژدا، بەتایبەت گەر ماڵ و دارایی لەسەر وەرگرتبێت ﴿فَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتۡ أَيۡدِيهِمۡ وَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا يَكۡسِبُونَ﴾ البقرة: ٧٩، هەر بەو جۆرە نووسینی فتوایەك لەلایەن موفتیەوە کە پێچەوانەی حوکمی خودا و پێغەمبەرەکەی بێت، مەگەر کەسەکە موجتەهیدێك بێت تووشی هەڵە بووبێت، ئەو کاتە گوناه لەسەریان نییە.

پەسەند: نووسینی هەر شتێك سوود و قازانجی ئایینی تێدا بێت، یان بەرژەوەندی موسڵمانێك، یارمەتیدانی کەسێکی پیشەوەر بەدەستی، کار بۆ کەسێکی نەزان، یان ئاوی دۆلکەی خۆی بکات ناو دۆلکەی ئەوەوە، یان سواری وڵاخەکەی بکات، یان وڵاخەکەی بۆ بگرێت تا سوار دەبێت، یان بەدەستی یارمەتی بدات لە شتێك کە ئاتاجی بێت، و هاوشێوەکانی ئەمانە، هەروەها: دەستدان لە روکن لە تەوافدا، لە ماچکردنی روکن دوو بۆچوون هەیە.

موباحیش ئەوەیە کە نە زیانی تێدا بێت و نە پاداشت.

رۆیشتنی واجب: رۆیشتن بۆ جومعە و جەماعات، لە راستترین بۆچووندا بە بوونی زیاتر لە بیست بەڵگە، کە لە جێگەی تردا باسکراون، گەڕانی تەواف بەدەوری کەعبەدا، رۆیشتن لەنێوان سەفا و مەروە یان بەسواری، رۆیشتن بۆ جێبەجێ کردنی

حوكمی خودا و پێغەمبەر ئەگەر بانگی بۆ كرا، ڕۆيشتن بۆ بەجێهێنانی سيلەی ڕەحم و چاكەی دايك و باوك، ڕۆيشتن بۆ مەجليسی زانست كە فێربوونی واجبە، ڕۆيشتن بۆ حەج گەر ماوەكەی نزيك بوو و زيانی پێنەدەگەيان.

**حەراميش:** ڕۆيشتن بۆ كاری خراپە و تاوان، ئەوە پيادەڕەوی شەيتانە ﴿وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ﴾ الإسراء: ٦٤، موقاتل دەڵێت: كۆمەكيان بكە بە سەربازە سوار و پيادەڕەوەكانت، هەر سواربوويەك و ڕۆيشتوويەك بەپێ بۆ ياخيبوون لە خودا سەربازی شەيتانە.

**ئەم پێنج حوكمە سواربوونيش دەگرێتەوە:**

**پێويستەكەی:** سواربوون بۆ غەزا و جيهاد و حەجی واجب.

**پەسەندەكەی:** سواربوونی بەباشزانراو لەوەدا، بۆ داوای زانست و سيلەی ڕەحم و چاكەی دايك و باوك، لە وەستان لە عەرەفە جياوازی هەيە: ئايا سواربوون باشترە يان وەستان لەسەر زەوی؟ سواربوون باشترە گەر بەرژەوەندی تێدابوو: لە فێركردنی مەناسك و چاولێكردنی و يان باشتر بوو بۆ نزاكردن و زيانی بە وڵاخەكە نەدەگەياند.

**حەرامەكەی:** سواربوون بۆ ياخيبوون لە خودا.

نايەسەندەكەی: سواربوون بۆ كات كوشتن و ياری، هەروەها هەموو ئەو شتانەی وازلێهێنانيان باشترە لە كردنيان.

**موباحەكەی:** سواربوون بۆ شتێك پاداشتی تيا نەبێ و گوناهی لێوە بەدەست نەيەت.

ئەمە بريتييە لە پەنجا ئاست لە دە شت: دڵ و زمان و گوێ و چاو و لوت و دەم و دەست و لاق و فەرج و سواربوون لەسەر پشتی وڵاخ.

❁ ❁ ❁

## زاراوە و شێواز

خەڵکی قسەی زۆریان لە سیفەتی ((**إياك نعبد**)) کردووە کە دڵ قۆناغ بە قۆناغ دەگوێزێتەوە لە حاڵی رۆیشتنی بەرەو خودا، چەندین پلەی بەرزبوونەوەیان بۆ لای خودا باس لێوە کردووە، هەندێکیان بە هەزاری دادەنێن، هەندێکی تر بە سەد، هەندێکیان زیادیان یان کەمیان کردووە، هەریەك لەوانە وەسفی رێگەکەی کردووە بەپێی سلوك و رۆیشتنی تایبەت بەخۆی بەرەو خودا.

خاوەن سلوکەکان جیاوازی زۆر لەنێوانیاندا هەیە لەمەڕ ژمارەی مەقامەکان و رێکخستنەکانیان، هەر کەس بەو جۆرەی پێی تێناوە و حاڵی بۆ خولقاوە وەسفی دەکات، لە هەندێ مەنزیلەی بەرەو خوداچووندا جیاوازیان هەیە، ئایا لە بەشەکانی حاڵە یان لە مەقامە؟

**جیاوازی نێوانیان:** مەقامی بەدەستهێنراوەو پەیوەندی بە کۆششی مرۆڤەوەیە، بەڵام حاڵ بەخششە و لە خوداوەیە. هەیانە دەڵێت: حاڵ بەرهەمی مەقامە، مەقامەکانیش دەرئەنجامی کاروکردەوەکانن، هەر کەس کرداری باشتر بێت مەقامی بەرزتر دەبێت، هەر کەس مەقامی بەرزتر بێت حاڵی مەزنتر دەبێت.

رای دروست لەمەدا: هاتووەکان (شەپۆلە مەعنەوییە هاتووەکان لە خوداوە بۆ سەر باوەڕدار) بەپێی حاڵەکان ناوی جۆراوجۆریان بۆ دانراوە، لەسەرەتای دەرکەوتنیانەوە بریسکانەوە و بریقانەوە و دەرکەوتنیان بۆ هەیە، وەك چۆن لەدوورەوە تیشکێك دەردەکەوێت، کە پێی تێنا و دەستی پێکرد دەبێت بە حاڵ، کە تیایدا قووڵ بوویەوە و جێگیربوو بەبێ گواستنەوە پێی دەوترێت مەقام، لەسەرەتاوە بریسکانەوە و بەرچاوکەوتنە و لە ناوەڕاستەوە حاڵە و لە کۆتاییدا مەقامە. ئەوەی دەبریسکێتەوە لە خودی خۆیدا حاڵە، ئەوەش کە حاڵە لە خودی خۆیدا مەقامە، ئەم ناوانە بەپێی وابەستەبوونیان بە دڵەوە و دەرکەوتنیان و جێگیربوونیان بۆیان داتاشراون.

حاڵ بەری زانستە، و پاڵفتە نابێت بە پاڵفتەبوونی زانستی بەردار نەبێت. بینا لەسەر ئەمە حاڵ بریتییە لە جۆربوونی دڵ و رەنگ گرتنی بە بڕیاری هاتووەکان، حاڵ خاوەنەکەی بۆ ئەو ماقامە بانگ دەکات کە بووە بە سەرچاوەی هاتووەکە، وەك چۆن

باخ و سەهەندێك بە بۆنی خۆشی خۆی ڕێبواران بانگ دەکات بێنە ژوورەوە و ماوەیەك تیایدا بمێننەوە.

لەوانەیە کەسێك بە شتێك زانا بێت، بەڵام خۆی پێ نەڕازاندبێتەوە و بەکاری نەهێنابێت، زانست بە بابەتەکە شتێکە و بوون بە حاڵ شتێکی ترە، زانست بە عیشق و تەندروستی و شوکر و لەشساغی جیایە لە بەدەستهێنانی عیشق و تەندروستی و ئەوانی تریش، گەر حاڵی ئەو زانراوانە زاڵ بوو بەسەر کەسەکەدا زانست پێیان وەك بێئاگابوون وایە لێیان، کە لە ڕاستیدا لێیان بێئاگا نییە، بەڵکو زانستەکە گۆڕاوە بۆ حاڵ.

کەسێك لەڕووی زانستەوە دەزانێت "ترس" چییە، بەڵام کاتێك سیفەتی ترس دایدەگرێت و ترس ڕوو لە دڵی دەکات: حاڵی ترس و بێزاری بەسەریدا زاڵ دەبێت و زانستەکەی لە حاڵەکەدا نوقم دەبێت، ئەو کات بەهۆی زاڵبوونی حاڵەوە بیری زانستەکەی نییە (بیری ترسەکەی نییە).

هەرکەس ئەمە حاڵی بێت ئەوا پەیی بە ڕاوەستان (**الإستقامة**) بردووە، چونکە زانست کاتێك حاڵ بەرهەم دەهێنێت کەسەکە لەسەر کاروکردەوە باشەکان ڕاوەستاویی هەبێت و بە دروستی جێبەجێیان بکات. خاوەنی زانستەکە بەهۆی زانستەکەیەوە-لە ئاماژە بۆ ئەو حاڵانەی دەیبینێتەوە- دڵنیابووبێت، ئاماژەکەی "گریمانە" و "گومان" و "پێموایە" نەبێت، ئیتر ئەو کەسە شایستەی خۆدانە پاڵی بەندایەتی دروست بۆ "الرحمن"بووە ﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ ﴾الإسراء: ٦٥، ﴿ وَعِبَادُ الرَّحْمَٰنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا ﴿٦٣﴾ ﴾، ئایەتی ﴿ عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ اللَّهِ ﴾ الإنسان: ٦، هەروەها ئایەتی ﴿ يَا عِبَادِ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ وَلَا أَنتُمْ تَحْزَنُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾ الزخرف: ٦٨

کرۆکی مەبەست: ئەو کەسەی ئەمە سیفەتی بێت لە تەنها ئەحکامی کردارەوە گواستوویەتەوە بۆ ئەحکامی کردار بە حاڵێکی هاوڕێ لەگەڵ زانست، ئەو ئەنجامدەری کارە بە تام و چێژی حاڵێکەوە کە هاوڕێیە لەگەڵ زانستی هەڵقووڵاو لە چرای پێغەمبەرەوە، جیاکردنەوەی زانست لە حاڵ پەککستن و دەست بەتاڵییە، جیاکردنەوەی حاڵیش لە زانست بێباوەڕی و لادانە، کامڵ ئەوەیە: بەهۆی بینینی زانستەوە حاڵ بزر نەبێت، هەرچەند بەهۆی نوقمبوونی لە حاڵدا زانستی لێبزر دەبێت، بەڵام بە ئەحکامەکانی زانست هەڵدەستێت و بزربوون لەناو حاڵدا زیانی پێ ناگەیەنێت.

لەوانەیە سالیك لە مەقامەكەی بێتە دەرەوە و لێی دابڕنرێت وەك چۆن پۆشاك لەبەر دەكرێتەوە، لەو بارەدا دادەبەزێت بۆ مەقامێكی خوارتر لەوە، پاشان لەوانەیە جارێكی تر بۆ مەقامەكە بگەڕێتەوە، یان بۆ هەمیشەیی لەدەستی بدا و نەگەڕێتەوە ناوی.

هەندێك مەقام هەیە دوو مەقام لەخۆیدا كۆدەكاتەوە.

هەیانە زیاتر لە دوان كۆدەكاتەوە.

هەیانە هەرچی مەقامە كۆ دەكاتەوە، كەسەكە شایستەی ئەو مەقامە نابێت تا تەواوی مەقامەكانی تری تیا كۆنەكاتەوە.

تەوبە كۆكەرەوەی "مەقامی دادگایی خۆ" و مەقامی "ترس"ە، وێنای تەوبە ناكرێتە بەو دوو مەقامە نەبێت.

مەقامی هیوا (رجا) كۆكەرەوەی مەقامی "ترس" و مەقامی "ویست"ە.

مەقامی "ترس"یش دیسان كۆكەرەوەی مەقامی "رجا" و "ویست"ە.

مەقامی گەڕانەوەی بەردەوام بۆ لای خودا(الإنابة) كۆكەرەوەی "خۆشەویستی" و "زاڵبوونی ترس"ە، بەندە نابێتە "منیب" تا ئەو دوو مەقامە لە خۆیدا كۆنەكاتەوە.

مەقامی تەختبوون (الإخبات) كۆكەرەوەی مەقامی "خۆشەویستی" و "گەردنكەچی" و "فەرمانبەرداری"یە، بەپێی مەقامی تەختبوون هیچیان بەبێ ئەویتریان كامڵ نابێت.

مەقامی "زوهد" كۆكەرەوەی مەقامی رەغبە و رەهبە (ویستی بەرین و ترس و شڵەژان)ە، پێی ناوترێت زاهید تا رەغبەتی ئەو شتەی بۆ پەیدا نەبێت كە لێوەی هیوای بەدەست هێنانی سوود هەیە و ترسی زیانی هەیە.

مەقامی "خۆشەویستی" كۆكەرەوەی مەقامی "ناسین" و "ترس" و "رجا" و "ویست"ە، خۆشەویستی مانایەكە لەو چوارەوە گەڵاڵە دەبێت و بەو چوارە دەستەبەر دەبێت.

مەقامی "زاڵبوونی ترس" كۆكەرەوەی مەقامی ناسینی خودا و ناسینی مافی بەندایەتی كردنەیەتی، هەركات خودای ناسی و حەقی خودای لەسەر خۆی زانی ترسی زۆر دەبێت ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟﴾فاطر: ٢٨، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((أنا اعلمكم بالله وأشدكم له خشية)).

مـەقامی "هەیبـەت" کۆکـەرەوەی مـەقامی "خۆشەویسـتی" و "شـکۆ و مەزنییـە بـۆ خودا".

مـەقامی "شـوکر" کۆکـەرەوەی تـەواوی مەقامـەکانی بـاوەڕە، بۆیـە بـەرزترین و باڵاترینیانـە، تەنانـەت لەسـەروو مـەقامی "رازیبـوون"ەوە، شـوکر ئـارامگرتن (صـبر) لەخۆدەگرێت بەبێ پێچەوانەکەی، هـەروەها "پشتبەسـتن بـە خـودا" و "گەڕانـەوەی بـــەردەوام بـــۆ لای خـــودا" و "خۆشەویســـتی" و "تـــەختبوون" و "زاڵبـــوونی خۆشەویسـتی" و "رجـا" و تـەاوی مەقامـەکانی تـر لـەژێر ئـەم ناونیشـانەدا(شـوکر) کۆدەبنەوە. هیچ کەس شایستەی ئەو ناو و مەقامە نابێت تا تەواوی مەقامات لەخۆیدا کۆنەکاتەوە، بۆیە ئیمان دوو بەشە: بەشێکی ئارامگرتنـە و بەشـەکەی تـری شـوکرە، ئـارامگرتن لـەناو شـوکردایە، کـەوابوو هـەموو بـاوەڕ بریتییـە لـە شـوکر، بۆیـە سوپاسگوزاران کەمترین ژمارەی بەندەی خودان، وەك خـودای موتـەعال دەفـەرموێت ﴿ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ ﴾ سبأ: ١٣.

مەقامی "حەیا" کۆکەرەوەی مەقامی "خوداناسی" و "چاودێری"ە.

مەقامی "هۆگربوون" کۆکەرەوەی مەقامی خۆشەویستییە لەگەڵ مەقامی نزیکی، گەر خۆشەویست دووربێت لە مەحبووبەکەی هۆگری نابێت، گـەر نزیـك بێـت لـە کەسـێك و خۆشی نەوێت دیسان هۆگری نابێت، تـا خۆشەویسـتی لەگـەڵ نزیکـی بـۆ ئـەو کەسـە تیایدا کۆببێتەوە ئەوجا هۆگری دەبێت.

مەقامی صدق کۆکەرەوەی مەقامی "ئیخلاص" و "لێبڕان"ە، کۆبوونەوەی ئەو دووانە مەقامی صدق دەستەبەر دەکەن.

مەقامی چاودێری کۆکەرەوەی ناسین و زاڵبوونی ترسە، بە بوونی ئەو دووانە مـەقامی چاودێری راست و دروستە.

مــەقامی "دڵنیــایی" کۆکــەرەوەی "گەڕانــەوە" و "پشتبەســتن بــە خــودا" و "دانەدەست" و "رازیبوون" و "خۆڕادەست کـردن"ە، ئـەو مەقامـە مانایـەکی گەلاڵـە بووە لەم مەقامانە، کە کۆبوونەوە کەسەکە دەبێت بە خاوەنی دڵنیـایی، هـەتا لەوانـە کەم ببێتەوە دڵنیایی کەم دەبێتەوە.

هەر بەو جۆرە ویستی بەرین (الرغبـة) و تـرس و شـڵەژان (الرهبـة) هەریـەك لەوانـە لـە مەقامی "رجا" و "ترس" گەلاڵـە بـووە، رجـا لەسـەر ویسـتی بـەرین زۆرتـرە و تـرس لەسەر شڵەژانیش زیاترە.

**سالیكانی هەریەك لەم مەقامانە دوو جۆرن:** چاكان و نزیكان، چاكان بە دەورووبەریدان و نزیكان لە لوتكەیدان، هەر بەو جۆرە تەواوی مەقامەكانی باوەڕ، جیاوازی هەریەك لەم دووانە (چاكان و نزیكان) و بەرزونزمی پلە و پایەیان نایەتە هەژماردن مەگەر بەخودا.

**مورید لە زاراوەدا:** ئەو كەسەیە دەستی كردووە بە رۆیشتن بەرەو خودا، لەسەروو عابید و لەخوار گەیشتووانەوەیە(واصلين)، ئەمە زاراوەیەكە بەپێی حاڵی سالیكەكان، ئەگەر نە، عابید و سالیك و گەیشتوو هەر هەموو موریدن، ویست لە بەندە جیانابێتەوە هەتا لەژێر بڕیاری بەندایەتیدا بێت.

عاریف لەسەرو سالیكەوەیە و سلوكی لێ جیانابێتەوە، بەڵام لەگەڵ سلوكدا پەیی بە مەعریفە بردووە، بۆیە ناوێكی لێوە وەرگرتووە تایبەتترە لە ناوی سالیك، هەر بەو جۆرە لە تەواوی مەقام و حاڵدا، ئەو مەقامەی لێوەی بەرز دەبێتەوە لێی نابێتەوە، بەڵام كە پێ دەنێتە مەقامێكی تر ناوی ئەو مەقامە وەردەگرێت، ئەو ناوە بەو شایستەترە لەگەڵ جێگیركردنی مەقامی پێشووتردا بۆی.

قسەكەران لەم بارەیەوە مەعریفە بەسەر زانستدا سەردەخەن، زۆركەس بە زانست سەری بەرز نابێتەوە و پێیان وایە بەبێ مەعریفە زانست رێگر و پەردەیە، ئەهلی راوەستاو لەسەر شارێگە: زۆرترین وەسێت بە زانست بۆ موریدان دەكەن، لای ئەوان دۆستی خودا هەرگیز نابێتە خاوەنی ویلایەتی كامڵ ئەگەر نەبێت بە خاوەن زانست (أولي العلم)، خودا نە لە رابردوو و نە لە داهاتوودا دۆستی نەزان و نەفامی نەبووە و نابێت، نەزانی دایكی هەرچی بیدعە و گومڕایی و ناتەواوییە، زانست بنچینەی هەرچی خێر و هیدایەت و كەماڵە.

**جیاوازی نێوان ((زانست)) و ((مەعریفە)) لای ئەهلی راوەستاو لەسەر شارێگە و قسەكەران لەم بارەیەوە:**

**مەعریفە** لەلایان ئەو زانستەیە كە زانا بە داوا و داخوازییەكانی هەڵدەستێت، ناوی مەعریفە بەكارناهێنن بۆ ئاماژەی زانست بە تەنها، بەڵكو تەنها ئەوانە بە مەعریفە وەسف دەكەن كە خودا دەناسن و شارەزای رێگەی گەیشتنن بە خودا و ئاگادارن لە ئافاتەكانی رێگە و لەمپەر و رێگرەكانی، لەگەڵ خودادا حاڵێكی هەیە كە گەواهی مەعریفەی بۆ دەدات.

عاریف لای ئەوان کەسێکە خودای بە ناو و سیفات و کردارەکانی ناسیوە، پاشان لە مامەڵەکردنی لەگەڵ خودادا راستڕەوە، ئەوجا مەرام و مەبەست و نییەتی بۆ خودا پاڵفتە کردووە، لە ئەخلاقی ناباش خۆی داڕنیوە و لە پیسی و چڵك و پاشەڕۆ پاك بووەتەوە، ئەوجا ئارامی گرتووە لەسەر یاسا و بڕیارەکانی خودا لە نیعمەت و لە بەڵا، پاشان لەسەر ڕۆشنبینی بە ئایین و بەڵگە و نیشانەکانی خودا بانگ بۆ لای خودا دەکات، ئەوجا بانگکردن بۆ لای خودا بەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی لە هەرچی شتی ترە رووت دەکاتەوە، بانگەواز تێکەڵ ناکات بە بیروبۆچوون و چێژ و تام و کێشانە و پێوانە و ماقووڵ و ناماقووڵی پیاوان، ئەوانە ناکات بە ترازووی پێوانەکردنی ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی، ئەمە ئەو کەسەیە بە دروستی شایستەی ناوی عاریفە، گەر بە کەسێکی تر بوترێت عاریف ئەوە بانگەشە و خواستنە.

**جیاوازی نێوان زانست و مەعریفە لە چەند روویەکەوە:**

**یەکەم:** مەعریفە وابەستەی خودی شتەکەیە، زانست وابەستەی حاڵ و دۆخی شتەکەیە، دەڵێیت: ((**عرفت أباك**)) باوکی تۆم ناسی و ((**وعلمته صالحا عالما**)) زانیم کەسێکی صالح و زانایە، بۆیە لە قورئاندا فەرمان بە زانست کراوە نەك بە مەعریفە، وەك ئایەتی ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مُتَقَلَّبَكُمۡ وَمَثۡوَىٰكُمۡ ﴿١٩﴾ ﴾ محمد: ١٩، ﴿ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴾ المائدة: ٩٨، ﴿ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلۡمِ ٱللَّهِ ﴾ هود: ١٤

**بۆیە مەعریفە:** ئامادەبوونی وێنەی شتەکە و نموونەی زانستی شتەکەیە لە زەیندا، زانست ئامادەبوونی دۆخ و سیفاتی شتەکە و دانەپاڵی شتەکە بۆلای کەسەکەیە، کەوابوو مەعریفە وەك وێناکردن وایە، بەڵام زانست وەك بەڕاست زانین یان بەڕاست دانان وایە (تصدیق).

**دووەم:** بەزۆری مەعریفە بۆ شتێکە لە دڵ بزربووبێت دوای پەی پێ بردنەوەی، کە پەی پێ بردەوە دەوترێت ناسییەوە (**عرفە**)، یان بۆ شتێکە بە سیفتگەلێك وەسفکرابێت لە ناخی کەسەکەدا بوونی هەبێت، کە بینییەوە و زانی ئەوەیە لە ناخیدا وەسفکراوە دەوترێت ناسییەوە (**عرفه**)، قورئان دەفەرموێت ﴿ وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ كَأَن لَّمۡ يَلۡبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةً مِّنَ ٱلنَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيۡنَهُمۡ ﴾ یونس: ٤٥، ﴿ وَجَآءَ إِخۡوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُواْ

عَلَيۡهِ فَعَرَفَهُمۡ وَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾ یوســـف: ٥٨، ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمُ ﴾ الأنعام: ٢٠.

سیفاتی کەسەکە لایان زانراوە کە بینیانەوە بەو سیفاتانە ناسیانەوە، لە فەرموودەیەکی سەحیحدا ((أن الله تعالى يقول للآخر أهل الجنة دخولا: أتعرف الزمان الذي كنت فيه؟ فيقـول: نعـم، فيقـول: تمـن، فيتمنـى علـى ربـه))، خـودای موتـەعال دەفـەرمویت ﴿ وَكَانُواْ مِن قَبۡلُ يَسۡتَفۡتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِۦ ﴾ البقـرة: ٨٩، مەعریفـە وەك یادکردنـەوەی شـتیك وایـە، یـان هاتنـەوە بـەریادی شـتێکی لـەیادکراو، بۆیـە دژی مەعریفـە لـەم شـوێنەدا وێنانـەکردن (الإنكـار) بـەکاربراوە، دژی زانسـتیش نـەزانی (الجهـل)ە، دەفـەرموێت ﴿ يَعۡرِفُونَ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا ﴾ النحـل: ٨٣، دەوترێـت حەقی ناسی و دانی پیادانا، ناسی، یان حەقی وێنای نەکرد.

لـە قورئانـدا وشـەی "مەعریفـە" و وشـەی "زانسـت" هـاتوون، وەك ﴿ مِمَّا عَرَفُواْ مِنَ ٱلۡحَقِّ ﴾ المائـدة: ٨٣ ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمۡ ﴾ البقـرة: ١٤٦، وشـەی زانسـت "العلـم" لـەم ئایەتـە پیرۆزانـەدا ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مُتَقَلَّبَكُمۡ وَمَثۡوَىٰكُمۡ ﴾ محمد: ١٩ ﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلۡعِلۡمِ قَآئِمَۢا بِٱلۡقِسۡطِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾ آل عمـران: ١٨ ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡلَمُونَ أَنَّهُۥ مُنَزَّلٞ مِّن رَّبِّكَ بِٱلۡحَقِّ ﴾ الأنعـام: ١١٤ ﴿ وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا ﴾ طـه: ١١٤ ﴿ أَفَمَن يَعۡلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ كَمَنۡ هُوَ أَعۡمَىٰٓ ﴾ الرعـد: ١٩ ﴿ قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾ الزمـر: ٩ ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ وَٱلۡإِيمَٰنَ لَقَدۡ لَبِثۡتُمۡ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡبَعۡثِ ﴾ الـروم: ٥٦ ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ وَيۡلَكُمۡ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّمَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا ﴾ القصـــــص: ٨٠ ﴿ وَتِلۡكَ ٱلۡأَمۡثَٰلُ نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِۖ وَمَا يَعۡقِلُهَآ إِلَّا ٱلۡعَٰلِمُونَ ﴾ العنکبـوت: ٤٣، ﴿ قَالَ ٱلَّذِي عِندَهُۥ عِلۡمٞ مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾ النمـل: ٤٠ ﴿ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يُحۡيِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَا ﴾ الحدیـد: ١٧ ﴿ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ ﴾ الحدیـد: ٢٠ ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُ ﴾ البقـرة: ٢٢٣ ﴿ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلۡمِ ٱللَّهِ ﴾ هود: ١٤، نموونەی ئەمانە زۆرن لە قورئاندا.

خودای موتەعال ناوی "العلم" و ئەوەی لە وشەی "العلم" دادەتاشرێت بۆخۆی هەڵبژاردووە، وەسفی خۆی کردووە بە "علم" و "علیم" و "علام"، هەروەها فەرمانی "علم" و "یعلم"ی وەك کاری خۆی بەکارهێناوە، هەواڵی داوە کە "علم"ی هەیە.

بەڵام وشەی "مەعریفە"ی بۆ خۆی لە قورئاندا بەکارنەهێناوە، دیارە ئەو ناوەی خودا بۆ خۆی هەڵیبژاردووە تەواوترین مانای تێدایە بۆ ئەو شتەی بۆی بەکاربراوە، لێرەوە هەڵەی ئەوانە تێدەگەیت وشەی "مەعریفە"یان داوە بەسەر وشەی "علم"دا و وتی وتییان بە دەوردا کردووە، لە پێناوی گەیشتن بە راستی و دەرچوون لە جیاوازی قسە و باسەکانی ئەوانمان هێناوە، هەروەها بە هۆی پێداگری و خەمخۆریمانەوە بۆ مانای پڕ فەڕ و دروست کە عاریفانیان پێ وەسف کردووە.

وشەی "مەعریفە" تایبەتە بە باوەڕدارانی ئەهلی کیتاب، وەك ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٨٢﴾ وَإِذَا سَمِعُوا مَا أُنزِلَ إِلَى الرَّسُولِ تَرَىٰ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا مِنَ الْحَقِّ﴾ المائدة: ٨٢-٨٣ ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمُ﴾ الأنعام: ٢٠

**سالیکانیش لە ڕوویەکی ترەوە دوو جۆرن:** سالیکان لەسەر حاڵ کە لاکەرەوانن بۆ لای زانست، لەگەڵ سالیکان لەسەر زانست کە لاکەرەوانن بۆ لای حاڵ، تا لەگەڵ یەکتر وەك دوو دەستەی جیا و دوو ئاراستەی لێهاتووە، هیچ دەستەیەکیان هۆگریی لەگەڵ ئەویتردا نییە، پێی تێکەڵ نابێت و مامەڵەی لەگەڵ ناکات مەگەر بە چاولێخشان و هەندێ زۆر لەخۆکردنەوە.

ئەمەش لە کەمتەرخەمی هەردوو دەستەکەوەیە، یەکێکیان تووشی لاوازی بەرەو خوداچوون بووە بەهۆی کەمی زانستەوە، ئەویتریان لاوازە لەبەرەو خودا چوون بەهۆی کەمی حاڵەوە، لایەکیان زانست و فراوانی زانست و نووری زانستیان پێ باش بوو، لایەکی تریان حاڵ و دەسەڵاتی حاڵ و دامەزرانی حاڵیان پێ باش بوو، کەسانی راستگۆی لاواز لە هەردوو دەستەکە دروست بوون، بە یەکێك لە باڵەکان دەفڕێ و بەلاوازی لا بەلای ئەویترياندا دەکاتەوە.

ئەمەیان گوێڕایەڵی حاڵە و ئەوەیان گوێڕایەڵی زانست، بەڵام گوێڕایەڵی حاڵ هەرکات زانستی لێبڕا لە حاڵەکەی دادەبڕێت و پەردە دەکەوێتە نێوانەوە، با حاڵەکەی هەرچییەك بێت، گوێڕایەڵی زانست هەر کات بەهۆی زانستەکەوە پشتی کردە حاڵ ئەو کەسە وێڵبوو و ناتەواوە، خۆی بە هۆکارەوە سەرقاڵ کردووە، نەك بە ئامانجەوە.

**کەسی دامەزراو:** زانستەکەی لە حاڵدا بەخت دەکات، بڕیاری پێ دەردەکات بەسەر حاڵدا و ئەویش دێتە ژێر بڕیارەکانییەوە، هەر بەو جۆرە حاڵەکەی لە زانستەکەیدا

بەکاردەهێنێت، دەستبەرداری نابێت و تەنها لە پایدا بوەستێت، بەڵکو بانگی دەکات بۆ ئامانجی زانست، ئەویش وەڵامی دەداتەوە و دەچێت بەدەم بانگەکەیەوە، ئەمە حاڵی کەسانی کامڵی ئەم ئوممەتەیە، هەر کەس تاوتوێی حاڵی هاوەڵانی پێغەمبەر -خوایان لێ رازی بێت- بکات بەم جۆرە دەیانبینێت.

کە پاشین (المتاخرون) جیاوازیان خستە نێوان حاڵ و زانستەوە: ناتەواوی و هەڵە رووی تێکردن، خودا تەنها کۆمەکە ﴿يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَـٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَـٰثًا ۖ وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ﴾ الشوری: ٤٩-٥٠، هەر بەو جۆرە زانست بە کەسێك دەدات و حاڵیش بە کەسێك، یان هەردووکیان کۆدەکاتەوە و بە کەسێکی دەدا، یاخود لە هەردووکیان خاڵی و نەزۆك دەردەچێت.

بزانە ئەو رێخستنەی کە هەر رێکخەرێك بۆ مەنزیلەکان ئاماژەی پێ دەدەن خاڵی نییە لە سەپاندن و بانگەشە بەبێ مانای پڕاوپڕ، ئەگەر کەسێك پابەندبوو بە بەندەکانی ئیسلامەوە و بەتەواوی هاتە ناوی، ئەوا پابەندبووە بە پێویستییە ناوەکی و رووالەتییەکان و مەقام و حاڵەکانەوە، لە هەر بەندێك لە بەندەکانی ئیسلام و ئەرکێك لە ئەرکەکانیدا حاڵ و مەقامی تایبەت بەخۆی هەیە، وەفادار نییە بەو بەند و گرێبەست و ئەرکە گەر ئەو حاڵ و مەقامانە بەدەست نەهێنێت، هەرکات وەفا دەکات بە ئەرکێك ئەرکێکی تری دوای ئەوە بەڕوویدا دەکرێتەوە، هەرکە مەزنزیلەیەك دەبڕێت لەگەڵ مەنزیلەیەکی تر رووبەڕوو دەبێتەوە.

لەوانەیە بەرزترین مەقام و حاڵ لە سەرەتای بەرەو خوداچوون بۆ کەسێك واڵا بکرێت، بۆیە دەرگای حاڵی خۆشەویستی و رازیبوون و هۆگری و ئارامی بەڕوودا دەکرێتەوە کە تەنانەت بۆ کۆتا پلەی سالیکێك ناکرێتەوە، ئەم سالیکە لە کۆتاییدا پێویستی بە چەند مەنزیلەیەك دەبێت لە رۆشنبینی (بصيرة) و تەوبە و دادگاییکردنی خۆ زیاتر لە کەسێکی سەرەتای بەرەو خوداچوون، لە مەنزیلەکاندا

رێکخستنێکی پێویست و تایبەت و دیاریکراو بۆ سالیك بوونی نییە.

بەڵکو ئەو تۆبەی -کە لە یەکەمین مەقامدا بۆیان داناوە- ئامانجی عاریفەکان و کۆتایی دۆستانی نزیکی خودایە، گومانی تێدا نییە پێویستیی ئەوانە بە "دادگایی خۆ" لە کۆتاییەکانیاندا زیاترە تا سەرەتاکانیان.

بزانە ڕێبواری ڕێگەی خودا هەتا لە ژیاندا بێت ڕۆیشتنەكەی تەواو نابێت، بەندە تا لە ژیاندا بێت ڕۆیشتنەكەی نایگەیەنێت بە شوێنێك بێنیاز بێت لە ڕۆیشتنی زیاتر بۆ لای خودا، چونكە ئەمە ئەستەمە، بەڵكو هەركات سەرنجی وردی یەكتاپەرستی خودا و ناو و سیفاتی دەدات ڕۆیشتن و تەكانی زیاتر بەخۆی دەدات، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) لە هەموو كەس زیاتر كۆشاوە و بەكار هەستاوە و پارێزگاری لێ كردووە تا وەفاتی فەرمووە، ئەو زۆرترین هەوڵ و هەستانی هەبووە بۆ جێبەجێ كردنی ئەركی بەندایەتی، گەر كەسێك هەرچی كار و كردەوەی ئینس و جینە ئەنجامی بدات كۆتایی بە ڕۆیشتنی بەرەو خودا نایەت، دوای ئەوە هێشتا بەدوای ڕێگەی داوا و ویست و لێبڕانەوەیە.

بینا لەسەر ئەمە دابەش كردنی ڕێبوارانی ڕێگەی خودا بۆ داواكەر و ڕێبوار و گەیشتوو و مورید و موراد (موراد لە مورید بەرزترە، خودا بۆ خۆی دەیەوێت و بۆ لای خۆی كێشی بكات) دابەشكردنێكە بۆ ئاسانكاری، نەك دابەش كردنێكی ڕاستەقینە، چونكە گەر داوا و سلوك و ویست لە بەندەی خودا جیابوویەوە بەتەواوی لە خودا دادەبڕێت.

ئەم دابەشكردنە بەپێی گواستنەوەی كەسەكەیە لە ئەحواڵی بەرەو خوداچوونیدا، ئەگینا بەندەی ویستراو یان داواكراو (موراد) لەلایەن خوداوە ویست و داوا و بەرەو خوداچوونی زیاتر و زۆرترە لە ویست و لێبڕان و داوا و بەرەو خوداچوونی هەر كەسێكی تر.

ئەو كەسە یەكەمجار ویستراو (موراد)ە، واتە لە مەقامی داوادا دانراوە و داواكراوە، كێشكراوە بۆ گرتنەبەری ڕێگەی خودا، هەموو موریدێك مورادە، هەر كەسێكی گەیشتوو و سالیك و داواكەر داوا و ڕۆیشتنی لێ جیانابێتەوە، با ڕێگەی بەرەو خوداچوون جۆراوجۆر بێت بەپێی جیاوازی حاڵی كەسەكان.

هەندێ لە سالیكان ڕۆیشتنیان بەرەو خودا بە جەستە و بە ئەندامەكانی زاڵترە بەسەریدا لە ڕۆیشتن بەرەو خودا بە دڵ و ڕۆح.

هەیانە ڕۆیشتن بەدڵ و ڕۆح زاڵترە بەسەریدا، مەبەستم هێز و خێرایی ڕۆیشتنی بەرەو خودایە، هەیانە -كە ئەم جۆرەیان كامڵ و بەهێزەكانن- هەر پلە و ئاستێك حەقی خۆی پێ دەدات، بە جەستە و ئەندامەكان و دڵ و ڕۆحی بەرەو خودا دەچێت.

خودا دەربارەی هەڵبژاردەكانی لە دۆستانی خۆی هەواڵی داوە كە هەمیشە لە مەقامی ویستدان بۆ خودا ﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ

وَجْهَهُۥ ﴾ الأنعام: ٥٢، ﴿ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰٓ ﴿١٩﴾ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٠﴾ وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ ﴿٢١﴾ ﴾ الليل:١٩-٢١

تایبەتمەندترین وەسفی بەندە و بەرزترین مەقامی ئەوەیە کە موریدێکی راستگۆ بێت لە ویستدا، بەندە بێت بۆ خودا لە ویستیدا، ویستەکانی وەك ویستە ئاینییە شەرعییەکەی خودا وابێت، ویستی تری نەبێت لە شتێکی تردا جگە لە خودا.

لەپێشترە قسەکردن لەم مەقامانە لەسەر رەوگەی پێشڕەوان لە ئیمامانی رێگەکە قسەکردنێکی گشتی بێت، بۆ هەر مەقامێك مەقامێك هەیە، بە خستنەڕووی حەقیقەتی ئەو مەقامە و داواکارییەکانی، ئەو ئافاتانەی دەبنە رێگر لە بەدەستهێنانی، کۆسپ و لەمپەرەکانی و باسی تایبەتەکانی و گشتییەکانی.

هەر کەس تێڕامابێت دەبینێت قسەی ئیمامانی رێگەکە لەسەر ئەم پەیڕەوەیە، وەك – سهل بن عبدالله التستري و أبي طالب المكي و الجنيد بن محمد و أبي عثمان النيسابوري و يحيى بن معاذ الرازي– و بەرزتر لەم چینەش وەك – أبي سليمان الداراني و عون بن عبدالله (كە پێی دەوترا دانای ئوممەت و نموونەی زیندوو).

ئەمانە لەسەر کارەکانی دڵ و حاڵ بەشێوەیەکی ورد و دووروودرێژ و رۆشن و کۆکەرەوەی مانا و بەگشتی و بەبێ رێکخستن قسەیان کردووە، مەقامەکان بە ژمارەیەکی تایبەت سنووردار نەکراون، ناوبراوان مەزنتر بوون لەوەی سەرقاڵی هەژمارکردنی مەقام بن، ویست و لێبڕانیان مەزنتر و باڵاتر بووە، ئەوان بەدەوری وەرگرتنی حیکمەت و مەعریفە و پاککردنەوەی دڵ و خاوێنکردنەوەی دەروون و راستکردنەوەی مامەڵەدا دەگەڕان، بۆ ئەو مەبەستە قسە کەم و پوختەکانیان لێوان لێوە بە پیت و فەڕ، قسەی پاشینیش زۆر و درێژ، بەڵام فەڕ و پیتی کەمی تیا دەبینرێت.

**بزانە کۆتایی ویست و لێبڕانی راستگۆیان و خاوەن رۆشنبینی سێ شتە:**

**یەکەم:** پەردە لادان لەسەر مەنزیلەکانی بەرەو خوداچوون.

**دووەم:** پەردە لادان لەسەر نەنگی و ناتەواوییەکانی دەروون و ئافاتی کردەوەکان و تێکچوونیان.

**سێیەم:** پەردە لادان لەسەر مانای ناو و سیفەتەکان و حەقیقەتی یەکتاپەرستی و خوداناسی.

ئەم سێ دەرگایە: بریتییە لە كۆكەرەوەی زانستی ڕێگەكە، لەسەر ئەمە دەسوڕێنەوە و بەدەوریدا خول دەخۆن و خۆیان بۆ لای هەڵدەكەن، هەیانە زۆرینەی قسەی لەسەر ڕۆیشتن بەرەو خودا و سیفەتی مەنزیلەكانە، هەیانە زۆربەی قسەی: لە ئافات و ڕێگرەكانە، هەشیانە بەشێكی زۆری قسەكانی: لەمەڕ یەكتاپەرستی و خوداناسی و حەقیقەتی ناو و سیفاتی خودایە.

ڕاستگۆی زیرەك لە هەریەكێك لەم سیانە ئەوەی حەقە وەریدەگرێت، دەیكات بە كۆمەكی داواكەی خۆی، ئەوەی حەقە رەدی ناكاتەوە بەهۆی كەمتەرخەمی كەسەكە لە حەقێكی تر، ئەوەیان بەوە بەفیڕۆ نادات، چونكە كەماڵی رەها تەنها بۆ خودایە و هیچ بەندەیەك نییە پلەیەكی زانراو بە خۆی نەبێت.

پێویستە قسە لەگەڵ ئەهلی سەردەمی خۆماندا بە زاراوەی خۆمان بكەین، ئەوان هێزی ئەوەیان نییە خۆیان یەكلا بكەنەوە بۆ وەرگرتنی سلوك لە پێشینی یەكەم و قسە و هیدایەتیان، گەر هیدایەت و حاڵی پێشینیان بۆ دەربكەوێت نەرێی دەكەن و بە سلوكی خەڵكی رەشۆكی دەزانن، بۆ كەسانی تایبەت جۆرێك لە سلوكی تر هەیە، وەك هەندێ لە گومرایانی كەلامییەكان و نەزانەكانیان دەڵێن: ئەوانەی پێش ئێمە سەلامەتتر بوون هەرچەند ڕێگەكەی ئێمە زانایانەترە، یان یەكێك لەوانەی خۆی داواتە پاڵ فیقە و نەگەیشتۆتە بەرزی پلە و پایەی پێشین دەڵێت: ئەوان دەستیان بەتاڵ نەبوو بۆ هەڵهێنجانی فیقە لە دەقەكان و دامەزراندنی ڕێسا و ئەحكامەكانی، چونكە بە شتێكی ترەوە خەریك بوون، پاشینەكان دەستیان بۆ فیقە كراوە بوو، بۆیە لەم مەیدانەدا شارەزاتر و تێگەیشتووترن.

هەموو ئەمانە بێبەشن لە ناسینی پلە و پایەی پێشین و قووڵی زانستیان و كەمی زۆر لەخۆكردنیان و كەماڵی ڕۆشنبینییان، سوێند بەخوا پاشینەكان تەنها بە زۆر لەخۆ كردن و خەریكبوون بە توێكڵەوە خەریك بوون، بەڵام ویست و لێبڕانی پێشین چاودێری بنچینەكانیان و دانانی ڕێسا بۆیان و توندكردنەوەی شیرازەیان بووە، ویست و لێبڕانیان خۆ یەكلاكردنەوە بوو بۆ داوای بەرز و بڵند لە هەموو شتێكدا، پاشینەكان لە بارێكدان و پێشینەكان لە بارێكی تردا ﴿قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا﴾ الطلاق: ٣، باشترە بۆ ئێمە مەنزیلەكانی بەندایەتی باس لێوە بكەین، سنووری ئەوەی خودا بۆ

سەر پێغەمبەرەکەی دابەزاندووە روون بکەینەوە، ئەو کەسەی سنووری خودای موتەعالی نەناسیوە خودا بە بێباوەڕی و دووڕوویی وەسفی دەکات ﴿ ٱلۡأَعۡرَابُ أَشَدُّ كُفۡرٗا وَنِفَاقٗا وَأَجۡدَرُ أَلَّا يَعۡلَمُواْ حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ ﴾ التوبة: ٩٧، بە ناسینی سنوورەکەی پەیبردنی تێدایە و هەستان بە داواکانی چاودێری پێویستە، ئەو کاتە بەندە باوەڕی کامڵ دەبێت و دەبێتە ئەهلی ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴾ الفاتحة: ٥ رێکخستنێك بۆ مەنزیلەکان دەخەینە روو کە نالێین تەواو و شایستەیە، بەڵکو باش و گونجاوە بەپێی رێکخستنی دیاری رۆیشتن بەرەو خودا، تاکو ئەوە نزیکتر بێت لە دابەزاندنێکی ژنەوراو بۆ مەنزیلەی بینراو بە هەستەکان، ئەو کات بەڕاست زانین تەواوتر دەبێت و ناسینی کامڵتر دەبێ و دەست بەسەردا گرتنی ئاسانتر.

ئەمەیە سوودی نموونە هێنانەوەیە، بریتییە لە کرۆك و جەوهەری ئەقڵ، بۆیە خودا لە قورئاندا نموونەی زۆری هێناوەتەوە، نەرێی تێگەیشتنی ئەو نموونانەی لە مرۆڤە نازاناکان کردووە، دەفەرموێت ﴿ وَتِلۡكَ ٱلۡأَمۡثَٰلُ نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِۖ وَمَا يَعۡقِلُهَآ إِلَّا ٱلۡعَٰلِمُونَ ﴾ العنكبوت: ٤٣.

۞ ۞ ۞

## یەکەم چوار مەنزیلەی بنچینەیی

(١) (**منزلة اليقظة**) **مەنزیلەی بێداربوونەوە** (٢) (**منزلة الفكرة**) **مەنزیلەی بیر**

(٣) (**منزلة البصيرة**)**مەنزیلەی ڕۆشنبینی( بەصیرەت )**(٤) (**منزلة العزم**) **مەنزیلەی عەزم**

## (١) (منزلة اليقظة)

## مەنزیلەی بێداربوونەوە

### ۞ ڕاپەڕینی بەئاگاهاتن

یەکەمین مەنزیلەی بەندایەتی بریتییە لە بێداربوونەوە((**اليقظة**))، ئەوەش بێزاری دڵە بۆ ترسی سەرنجدان لە خەوی بێئاگایی، ئای خودایە چەندە ئەو ترسە بەسوودە! چەندە قەدەر و هەڕەشەیەکی مەزنە! چەندە کۆمەککارە بە گرتنە بەری ڕێگەی خودا! هەر کەس هەستی پێ بکات –سوێند بەخودا– هەستی بە ڕزگاری کردووە، ئەگەر نە، ئەو لە مەستی بێئاگاییدایە، هەرکات بەئاگا هات خۆی ئامادە دەکات بە ویست و لێبڕانی بۆ سەفەرکردن ڕووەو مەنزیلەی یەکەم و ئەو نیشتمانەی لێیەوە بەدیلگیرا و ڕەوانەی ئێرە کرا.

بزانە بەندە بەر لە گەیشتنی بانگکەر بۆ لای لە خەوی بێئاگاییدایە، دڵی خەوتووە و چاوەکانی بەئاگا، ئامۆژگاریکەرێك هاواری لێدەکات، بانگی سەرفرازی پێدەبیستێت، بانگکەرێکی "الرحمن" بانگی لێدەکات: وەرە بۆ ئازادی(حي على الفلاح).

یەکەم ئاستی ئەم کەسە خەوتووە: بێداری و بەئاگاهاتنە لە خەو، باسمان لەبارەوە کرد، بێداربوونەوە بێزاری دڵە بۆ ترسی سەرنجدان لە خەوی بێئاگایی.

وەك ئەوەی ئەو ڕاستبوونەوەیە هەستانێك بێت بۆ خودا کە لەم ئایەتەدا ئاماژەی پێدراوە ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ أَن تَقُومُوا۟ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ﴾ سبأ: ٤٦، ڕاستبوونەوە بۆ خودا بریتییە لە بێداری لە وەنەوزی بێئاگایی، هەستانەوە لە تێکەوتنی ساردی و

خاوبوونەوە، ئەوە یەکەمین شتە کە دڵی بەندە بە زیندەگی ڕۆشن دەکاتەوە بۆ بینینی نووری هۆشداری، یەکەمین نووری سەرنجی دڵە بە نیعمەت لەگەڵ دەستەوسانی لە ژماردنیان و دیاریکردنی کۆتاییەکەیان و خۆیەکلایی کردنەوە بۆ ناسینی منەتی نیعمەتەکان و زانست بە کەمتەرخەمی لەپای نیعمەتەکاندا.

ئەمە داوای بێداری و کاریگەرییەتی، گەر لە تێکەوتنی بێئاگایی ڕاستبوویەوە بۆ ڕۆشنکردنەوەی دڵی بە نووری هۆشداری ئەو کات تێبینی کردنی نیعمەتەکانی ناوەوە و دەرەوەی بۆ پێویست دەبێت، هەتا بە دڵ و چاو چاویان تێبڕێت زۆری و مەزنی نیعمەتەکانی بۆ دەردەکەوێت، بێهیوا دەبێت لە ژماردنیان و دیاریکردنی کۆتاییەکەیان، بۆیە دڵی یەکلادەبێتەوە بۆ بینینی منەتی خودا بە نیعمەتەکانی لەسەر ئەو، بەبێ ئەوەی شایانیان بێت و نرخێکی بەرانبەریان پێشکەش کردبێت، ئەو کاتە هەست بە کەمتەرخەمی لە ئەرکی سەرشانی دەکات کە هەستانە بە شوکری خودا.

بینینی ئەو منەتە خواییە و کەمتەرخەمی خۆی شایستەی دەکات بە دوو جۆر لە بەندایەتی: خۆشەویستی خاوەن نیعمەت و ناوهێنانی و یادکردنی و چوونە ژێر فەرمانەکانییەوە و بێزکردنەوە لە دەروونی خۆی بەوەی نەیتوانیوە شوکری نیعمەتەکانی بکات، ئەو کات تەحقیقی **((أبوء لك بنعمتك علي وأبوء بذنبي فاغفر لي فإنه لا يغفر الذنوب إلا انت))** دەکات، دەزانێت کە ئەم داوای لێخۆشبوونە شایستەی ئەوەیە پێی بوترێت سەروەری داوای لێخۆشبوون"سيد الإستغفار"، ئەو کات دەزانێت گەر خودا سزای ئەهلی ئاسمانەکان و زەوی بدات سزایان دەدات و ستەمیان لێ ناکات، گەر بەزەییان پێ بکات بەزەییەکەی باشترە بۆ ئەوان لە کردارەکانیان، ئەو کات دەزانێت بەندە بەردەوام بەرەو لای خودا دەڕوات لە نێوان خوێندنەوە و بینینی منەتی خودایی و سەرنجدانی کەمتەرخەمی خۆی.

ئەم بینین و سەرنجدانە سەردەکێشێت بۆ خوێندنەوەی خراپەکانی خۆی و وەستان لەسەر هەڕەشەکانی و خۆ ئامادە کردن بۆ چارەسەری و خۆرزگارکردن لە بەندایەتییەکەی و داوای ڕزگاری بە پاڵفتەکردنی.

سەرنجی ئەو خراپانە دەدات پێشتر ئەنجامی داون، دەزانێت–لەوەی لێی وەشاوەتەوە– لەبەردەم هەڕەشەیەکی مەزندایە، ئەو خەریکە تیادەچێت بە وەرگرتنەوەی مافی خاوەن ماف، خودای موتەعال زەمی ئەوانە دەکات کە کارە

خراپـەکانی پێشـووی خۆیـان لـەبیر دەچـێت ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ فَأَعْرَضَ عَنْهَا وَنَسِىَ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ ﴾الكهف: ٥٧، کاتێك گوناهـەکانی خـۆی دەخوێنێتـەوە خـۆی یـەکلا دەکاتەوە بۆ زانست و کار و لە کۆیلایەتی گوناهەکانی خـۆی رزگـار دەکـات بـە داوای لێخۆش بوون و پەشیمانی، هەروەها داوای پاڵفتەکردن کە بریتییـە لـە پاککردنـەوەی باوەڕ و مەعریفە لە پیسی گوناه، وەك پاڵفتەکردنی زێڕ و زیو کە پاککردنەوەیانـە لـە خەوشوخاڵ، ناتوانێت بچێتە بەهەشـتەوە بـەو پاڵفتەکردنـە نـەبێت، بەهەشـت پـاك و بێگەردە و تەنها پاکان و بێگەردانی تێدەچێت، بۆیە فریشتەکان پێیان دەڵێن ﴿ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴿٧٣﴾ ﴾ الزمـــــــر: ٧٣ ﴿ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ طَيِّبِينَ يَقُولُونَ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمُ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ ﴾ النحل: ٣٢، لە بەهەشـتدا گەردیلەیـەك لـە پیسـی بوونی نییە.

**ئەم پاڵفتەکردنە لە دونیادا بە گرتنەبەری چوار رێگەیە:**

**تەوبەکردن، داوای لێخۆشبوون، ئەنجامدانی کرداری چاکەی سڕەرەوەی گوناه، چوارەمیش بەڵا و ناخۆشییەکان کە دەبنە کەفارەتی گوناهان.**

گەر ئەم چوارە پاڵفتەی کرد و خاوێنی کردەوە دەچێتە ریزی ئەوانەوە فریشتەکان بە باشی گیانیان دەکێشن و مژدەی پێدەدەن بە بەهەشت و دەبێت بە یەکێك لەوانەی﴿ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ﴾ فصلت: ٣٠، لە کاتی مردندن ﴿ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ﴾ فصلت: ٣٠ – ٣٢

گەر ئەم چوارە پاڵفتەی نـەکرد و پـاکی نـەکردەوە، تەوبەکـەی تەوبـەی یـەکجاریی و تەواوەتی نەبێت و داوای لێخۆشبوونەکەی کامـڵ و تـەواو نـەبێت (داوای لێخۆشـبوونی تەواو پێویستە لە سەرجەم گوناهەکان بەدوور بێت و پەشیمانیان لەگەڵدا بێـت، نـەك پیاڵـەی ئارەقەکـەی لەدەسـتدا بێـت و بڵێـت "أستغفر الله" پاشـان پیاڵەکە ببـات بـۆ دەمی)، چاکەکانی لە چەندێتی و چۆنێتیدا نەگاتە ئاستی کەفارەتی گوناهەکانی، هەر بەو جۆرە بەڵا و ناخۆشییەکانی ژیانی گوناهەکانی بەتەواوی نەسڕێتەوە –ئەمـە یـان بەهۆی گەورەیی گوناهەکانییەوە، یان بەهۆی لاوازی پاڵفتەکەرەکانـەوە، یـان بـەهۆی هەردووکیانەوە– ئەوا لە بەرزەخدا بە سێ شت پاڵفتە دەبێت:

**یەكەم:** نوێژی جەنازە لەسەری، داوای لێخۆشبوون بۆی و شفاعەتی ئەوان بۆی.

**دووەم:** پاكبوونەوە بە فیتنەی گۆڕ و ترساندنی دوو فریشتەی پرسیاركە و تاقیكەرەوە، گۆڕەوشار و ترسان.

**سێیەم:** ئەوەی برا موسڵمانەكانی لە كاری چاكە هەدیەی دەكەن، لە خێر و حەج و ڕۆژوو و خوێندنی قورئان و نوێژ، خێری ئەوانەی بۆ رەوانە بكەن، گەیشتنی خێری صەدەقە و دوعا كۆدەنگی لەسەرە، ئیمام ئەحمەد دەفەرموێت: لەو دوانەدا ناكۆكی بوونی نییە لەوانی تردا ناكۆكی هەیە، زۆرینە لەسەر ئەوان كە حەج دەگات، ئەبو حەنیفە دەفەرموێت: تەنها بەخشینی ماڵ و دارایی پێ دەگات، ئیمامی ئەحمەد و ئەوانەی لەگەڵ ئەون مەزهەبەكەیان لەم بابەتەدا فراوانترین مەزهەبە، دەڵێن: هەر كارێك نزیكبوونەوە بێت لە خودا بە مردوو دەگات، بەدەنی و دارایی.

**گەر ئەم سیانەش پاڵفتەی نەكرد ئەوا لە وەستان لە بەردەم خودادا بە چوار شت پاڵفتە دەبێت:**

<u>ترسەكانی قیامەت</u> و <u>ترسی وەستان لەبەردەم خودا</u> و <u>شفاعەتی شفاعەتكاران</u> و <u>لێبوردنی خودا –عز وجل–</u>

**گەر ئەم سێ وێستگەیە** (لە دونیا و لە بەرزەخ و لە ڕۆژی حیساب) نەیتوانی پاڵفتەی بكات ئەوا دەبێت بخرێتە ناو كوورەی ئاگرەوە، ئەو كارەش بەزەییە لەپای ئەو كەسەدا تا لە ئاگردا پاڵفتە ببێت و پاك ببێتەوە، ئاگر پاككەرەوە و پاڵفتەكەر بێت بۆ لێكردنەوەی پیسییەكانی، مانەوەی لە ئاگردا بەپێی كەم و زۆری پیسییەكەیەتی، هەروەها بەپێی بەهێزی و لاوازی و كۆمابوونی گوناهەكانی، كە پیسییەكەی لێبوویەوە و ئاڵتوونەكەی پاڵفتە بوو و خاوێن و بێ خەوش مایەوە لە ئاگر دەردەهێنرێت و دەخرێتە بەهەشتەوە.

بەرزترین ئاستی بێداربوونەوە (**اليقظة**) لاكردنەوەیە بەلای زۆری و كەمی ڕۆژەكانی تەمەندا، خۆلادان لە بەفیڕۆدانیان، تۆمەتباركردنی بۆ بە هاناچوونی ئەوەی ماوە و باربووكردنەوەی لەدەست چووەكانی.

وردئەبێتەوە لەوەی لای ماوە لە زیاد و لە كەم، فریای لەدەستچووەكانی تەمەنی دەكەوێت، ئەو برە تەمەنەی كە ماوە بە هیچ نرخێك ناپێورێت، ساتەكانی تەمەنی –

بەڵکو هەناسەکانی– دەستپێوە دەگرێت لەوەی لە شتێکدا بەختی بکات رەزامەندی خوای لەسەر نەبێت، ئەمەیە حەقیقەتی ئەو زیانۆمەندییەی مەردوومان تیایدا هاوبەشن، لەگەڵ جیاوازیان لە برەکەیدا کەم یان زۆر، هەر هەناسەیەك دێتە دەرەوە و لە رەزامەندی خودادا بەخت ناکرێت لە رۆژی دواییدا پەشیمانی بەدواوەیە، وەستانێکە لەسەر رێگەی بەرەو خوداچوون، یان شکستێکە گەر بەردوام بێت لەسەر گوناهان، یان پەردەیەکە گەر بوو بە رێگر لەسەر رێگەی بەرەو خوداچوونی.

ئەوە نوورێکە بێداربوونەوەی بەدوای خۆیدا هێناوە، دڵ پێی نوورانی بووە بە بینینی هۆشداربوونەوە، بەپێی بەهێزی و لاوازی نوورەکە بینینی نیعمەتەکانی بۆ یەکلا دەبێتەوە، ئەو کەسەی کە تەنها نیعمەتی خودا لە خواردن و خواردنەوە و تەندروستی جەستە و رێز و ناوبانگی ناو خەڵکی دەبینێت بەشی لەو نوورە نەدراوە، نیعمەتی خودا بە ئیسلام و ئیمان و کێشکردنی بەندەکەی بۆ رووکردنە خودا و خۆشی لە یادی خودا و چێژوەرگرتن لە گوێڕایەڵییە، ئەمانە مەزنترین نیعمەتن، ئەمانەش بە نووری ئەقڵ و هیدایەتی کۆمەك کردنی خودایی پەی پێ دەبرێن.

هەر بەو جۆرە ئەخلاقی مامەڵەی لەگەڵ منەتەکانی خودا لەسەری، بە بینینیان و خودێندنەوەیان لە رێگەی هەوری خوخدە و تاریکی دەروونەوە، سەیرکردنی ئەهلی بەلا–کە بریتین لە ئەهلی بێئاگایی لە خودا و بیدعەکاری لە ئایینی خودادا– ئەو دوو پۆلە ئەهلی بەلای راستەقینەن، کە ئەوانی بینی و زانی لەسەر چین نیعمەتی خودا لە دڵیدا مەزن دەبێت و پاڵفتە دەبێ و نرخ و بەهای دەزانێت، جوانی دژ دژێکی تر دەریدەخات، شتەکان بە دژەکانیان جیا دەبنەوە.

تەنانەت لە کەماڵی نیعمەتی ئەهلی بەهەشت بریتییە لە بینینی ئەهلی دۆزەخ و ئەو سزایەی تێیکەوتوون.

بینین و خوێندنەوەی گوناه و خراپەکان بەسێ شت دەبێت: بە مەزنڕاگرتنی حەق و ناسینی دەروون و بەڕاست زانینی هەڕەشەکان.

هەر کەس مەزنیی خودای موتەعال لە دڵیدا کامڵ بێت سەرپێچی کردنی لا گەورە دەبێت، چونکە سەرپێچی کەسی گەورە وەك سەرپێچی نییە لە کەسانی خوار ئەو، هەر کەس نەفسی خۆی بناسێت و لە حەقیقەتی بگات، و تێبگات لە هەموو سات و

هەناسەیەكیدا چەندە هەژار و ئاتاجی دەرگای خودایە، ئەوكات تاوانی سەرپێچی لە فەرمانی كەسێك كە زۆر پێویستی پێیەتی لا گەورە دەبێت.

گەر نزمیی ئەو نەفسەی بۆ دەركەوت -لەگەڵ ناسینی گەورەیی ئەو كەسەی سەرپێچی لێدەكات- ئەوا تاوانەكانی لا گەورە دەبێت و خۆی یەكلادەكاتەوە بۆ رزگاربوون لێیان، خۆیەكلاكردنەوەی بۆ رزگاربوون لە تاوانەكان بەپێی بەڕاست زانینی هەڕەشەكانی خودا و یەقین بە بوونی ئەو هەڕەشانەیە.

خولگەی سەعادەت و مێخی دەستاری بەختەوەری لەسەر بەڕاستزانینی هەڕەشەكانە، ئەگەر لە دڵیدا بەڕاستزانینی هەڕەشەكان پەكی كەوت، ئەوا ئەو دڵە بە جۆرێك دادەڕوخێت و وێران دەبێت هیوای رزگاربوونی لێ ناكرێت، خودای موتەعال رایگەیاندووە كە بەڵگە و نیشانەكان و ئاگاداركردنەوەكان تەنها ئەوانە دەیانناسن و لێیان تێدەگەن كە هەڕەشەكانی خودا بەڕاست دەزانن، هەر ئەوانەش شایستەی ترساندن و ئاگاداركردنەوەن، ئەوانەن سوود لە بەڵگە و نیشانەكان دەبینن ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّمَنْ خَافَ عَذَابَ الْآخِرَةِ﴾ هود: ١٠٣ ﴿إِنَّمَا أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَاهَا﴾ النازعات: ٤٥ ﴿فَذَكِّرْ بِالْقُرْآنِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴿٤٥﴾﴾ ق: ٤٥

خودای موتەعال رایدەگەیەنێت كە ئەهلی سەرفرازی لە دونیا و دواڕۆژدا ئەوانەن هەڕەشەكان بەڕاست دەزانن و لێیان دەترسن، دەفەرموێت ﴿وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ الْأَرْضَ مِن بَعْدِهِمْ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ ﴿١٤﴾﴾ إبراهيم: ١٤

**زانینی كەم و زۆری رۆژەكانی تەمەن بەسێ شت دێتە راستە:** گوێگرتن لە زانست، وەڵامدانەوەی بانگخوازی خۆپارێزی لە حەرام و دۆستایەتی ساڵحان، بەدەستهێنانی ئەم سیانە لە دەستبەرداربوون و خۆرووتكردنەوەدایە لە خووخدەی خراپ و ناپەسەند.

**سالیكی رێگەی خودا:** بەپێی زانستی بە پلە و ئاستی كاروكردەوەكان و بەنرخیی بەدەستهێنانیان ناسینی بە كەم و زۆری حاڵ و ئیمان لا دروست دەبێت، هەر بەو جۆرە پشكنینی "وەڵامدانەوەی بانگخواز بۆ بەرزراگرتنی سنوورەكانی خودا" لە دڵیدا: ئایا خێرا وەڵامی دەداتەوە یان هێواش؟ بەپێی وەڵامدانەوەی بانگی بانگكەرەكە-بەخێرایی یان بەهێواشی- كەم و زۆری بەرهەم دێت.

هەر بەو جۆرە هاوەڵی كەسانی خاوەن ویست و لێبڕان، خۆ یەكلاكەرەوە بۆ پەیوەستبوون بە كۆڕی باڵای فریشتەكان (الملأ الأعلى)، لەو ڕێگەیەوە لە زیاد و كەمی خۆی دەگات.

ئەوەی كە هەموو ئەمانەی پێدەگرێتە دەست دەرچوونە لە خوخدە و دەقپێوەگیراوەكان و نیشتەجێكردنی دەروون بەدوور لەوانە، نامۆبوون لەناو ئەهلی بێئاگایی و پشتكەران لە خودا، خراپترین زیان بۆ كەسێك ئەوەیە خوخدەكان جڵەوی بگرنە دەست، بێباوەڕان بە خوخدەی جێگیر لەلایان و هاتوو لە باوباپیرانەوە بەرهەڵستكاری پێغەمبەرانیان دەكرد، هەر كەس دەروونی خۆی دوور لەوانە نیشتەجێ نەكات و لێیان نەیەتە دەرەوە و خۆی بۆ ئەوەی لێی داواكراوە ئامادە نەكات ئەوە دابڕاوە و لە ڕزگاری و بەدەستهێنانی سەركەوتن بەری لێگیراوە ﴿وَلَوْ أَرَادُوا۟ ٱلْخُرُوجَ لَأَعَدُّوا۟ لَهُۥ عُدَّةً وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ وَقِيلَ ٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْقَٰعِدِينَ ﴿٤٦﴾﴾ التوبة: ٤٦.

❁ ❁ ❁

## (٢) (منزلة الفكرة)

# مەنزیلەی بیر

كە بێداربوونەوە تێر و تەواو دەبێت بەدوای خۆیدا "بیر" دەهێنێت، ئەوەش -وەك پێشتر ئاماژەمان پێكرد- چاوتێبڕینی دڵە بۆ رووگەی داوا بە مەبەستی بەدەستهێنانی.

بیر دوو بیرە: بیرێك پەیوەستە بە زانست و ناسینەوە، بیرێك پەیوەستە بە داوا و ویستەوە.

ئەوەی پەیوەستە بە زانست و ناسینەوە: بریتییە لە جیاكردنەوەی حەق و باتڵ لەیەكتر، هەروەها جیاكردنەوەی ئەریّ و نەریّ(جێگیركردن و سڕینەوە)، ئەوەش كە پەیوەستە بە داوا و ویستەوە: ئەو بیرەیە بەسوودی لە بێسوود پێ جیادەكەیەوە.

دواتر لە گرتنەبەری رێگەی بەدەستهێنانی ئەوەی سوود دەگەیەنێت بیریكی تری لێوە پەیدا دەبێت، هەروەها لەسەر رێگەی ئەوەی زیان دەگەیەنێت و دەستبەرداری دەبێت دیسان بیریكی تر سەرهەڵدات.

ئەمە شەش بەش كە مەیدانی بیركردنەوەی زانایان و حەوتەمی نییە.

**بنچینەكەیان:**

**بیر لە یەكتاپەرستیدا:** بریتییە لە هەوڵی ئامادەكردنی بەڵگەكانی یەكتاپەرستی، هەروەها بەڵگە و نیشانەكان لەسەر پووچی هاوەڵدانان و بێبنەمابوونی، خواوەندی هەرگیز بۆ دوو كەس جێگیر ناكریّ و ساغ نابێتەوە، وەك چۆن پەروەردگاریی لە هیچ رێگەیەكەوە بۆ كەسێكی تر جگە لە خودا جێگیر ناكریّ و ساغ نابێتەوە، هەر بەو جۆرە تێگەیشتن لەوەی كە پووچترینی پووچان بریتییە لە پەرستنی دوو كەس و پشتبەستن بە دوو كەس، بەڵكو پەرسش و بەندایەتی تەنها و تەنها بۆ یەك خودایە، ئەو خودایەی پەروەردگاری راستەقینەیە و تاك و تەنها و زاڵ و بەدەسەڵاتە.

ئەم بیرە بریتییە لە حەقیقەتی خۆبەریكردن و پێدانی وەلا (البراء والولاء)، خۆبەریكردن لە پەرستنی كەسێك جگە لە خودا و پێدانی وەلا بە خودا، خودای موتەعال دەفەرموێت

﴿ قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِيٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُواْ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ ﴾ الممتحنة: ٤، هەروەها دەفەرمویت ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦٓ إِنَّنِى بَرَآءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ ۝٢٦ إِلَّا ٱلَّذِى فَطَرَنِى فَإِنَّهُۥ سَيَهْدِينِ ﴾ الزخرف: ٢٦– ٢٧، ﴿ يَٰقَوْمِ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ۝٧٨ إِنِّى وَجَّهْتُ وَجْهِىَ لِلَّذِى فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا ۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾ الأنعام: ٧٨– ٧٩، هەروەها ﴿ إِنِّى وَجَّهْتُ وَجْهِىَ لِلَّذِى فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا ﴾ الأنعام: ٧٩، خودای موتەعال بە پێغەمبەرەكەی دەفەرمویت ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ۝٢ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٣ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ۝٤ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٥ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ۝٦ ﴾ الكافرون: ١– ٦، ئەم خۆ بەریكردنە لێیان و لەوەی دەیانپەرست بە بەریبوون لە هاوەڵدانان بۆ خودا ناوزەدی كرد.

**بەریبوون** بریتییە لە حەقیقەی سڕینەوە و جێگیركردن، بە سڕینەوەی خۆشەویستی كەسێك، شتێك جگە لە خودا لە دڵیدا لەڕووی زانست و ویست و پەرستنەوە وەك چۆن لە بووندا سڕاوەتەوە و جێگیركردنی بە تەنها بۆ خواوەندی خودای موتەعال.

**هەروەها بریتییە لە حەقیقەتی كۆكردنەوە و جیابوونەوە:** جیاوازی دەكات لەنێوان خودای حەق و ئەوانەدا كە بانگەشەی پووچی خواوەندییان بۆ دەكرێت، بەخودا زانین و پەرستش و خۆشەویستی و ترس و رجا و پشتبەستن و داوای كۆمەكی تەنها لەسەر خودای حەق دەبێت كە هیچ خودایەك جگە لە ئەو بوونی نییە.

**هەروەها بریتییە** لە حەقیقەتی خۆداڕنین و تەنهاكردنەوە لە بەندایەتی بۆ هەر كەسێك جگە لە خودا و لە خوارخوداوە، لە بەندایەتی هەموو ئەوانە خۆی دادەڕنێت و خودا بە پەرستن تاك و تەنها دەكاتەوە، خۆداڕنین نەرێكردنە و تەنهاكردنەوەش جێگیركردنە، كۆكردنەوەی هەردووكیان بەیەكەوە بریتییە لە یەكتاپەرستی.

ئەمە بریتییە لە وەلا و بەڕا، وسڕینە و جێگیركردن، وكۆكردنەوە و جیاكردنەوە، وخۆداڕنین و تەنهاكردنەوە. تەنهاكردنەوەی پەیوەست بە یەكتایی خواوەندی بریتییە لە سوودی بە بەرهەم و رزگاركەر كە ئاسوودەیی و رزگاری لێوە بەدەست دێت.

## (٣) (منزلة البصيرة)

# مەنزیلەی ڕۆشنبینی

### ۞ ڕۆشنبینییەکان هیدایەتدەرن

کە بیری کەسەکە راست و دروست بوو دەرگای ((ڕۆشنبینی)) بۆ دەکرێتەوە کە بریتییە لە بوونی نوورێك لە دڵدا بەڵێن و هەڕەشەکان و بەهەشت و ئاگری پێ ببینێت، هەروەها ئەوەی خودا لەبەهەشتدا بۆ دۆستەکانی ئامادەی کردووە و ئەوەی لەدۆزەخدا بۆ دوژمنەکانی داناوە، خەڵکی دەبینێت لە گۆڕەکانیان هاتوونەتە دەرەوە و دەچن بەدەم بانگی حەقەوە، فریشتەکانی ئاسمان دابەزیوون و ئابلۆقەیان داون، دادگایی دانراوە و لاپەڕەی کردارەکان والآکراون، پێغەمبەران و شایەتەکان دەهێنرێن، ترازووی پێوانە دانراوە، لاپەڕەکان دەچن بە ئاسماندا و باڵدەگرنەوە، دوژمنان کۆدەکرێنەوە، هەر خاوەن حەقێك دەستی بەو کەسەوە گرتووە کە حەقی لایەتی، حەوزی کەوسەر و کوپەکانی لەدوورەوە دیارن، نوور دابەش دەکرێت بۆ ئەوەی بەهۆیەوە ئەهلی بەهەشت خۆیان بگەیەننە بەهەشت، ئاگر هەندێکی تری وردوخاش دەکات، ئەوانەی دەکەونە ناوی چەند بەرانبەری ڕزگاربووانن.

لە دڵیدا چاوێك دەکرێتەوە و هەموو ئەوانەی پێ دەبینێت، گەواهیدەرێك لە گەواهیدەرانی دوارۆژ لە دڵیدا راست دەبێتەوە و دوارۆژ و بەردەوامی دوارۆژی نیشان دەدات، هەروەها دونیا و خێرایی تیاچوونی دەخاتە پێش چاو.

((ڕۆشنبینی)) نوورێکە خودا هەڵیدەداتە ناو دڵەوە، بەهۆی ئەو نوورەوە ڕاستێتی ئەوەی پێغەمبەران هەواڵیان پێداوە دەبینێت، وەك ئەوەی بە چاوی سەر ببینێت، سوود و قازانجی ئەوەی پێغەمبەران بانگیان بۆ کردووە بەدەست دەهێنێت و خۆی لە زیانی سەرپێچی بانگی پێغەمبەران دووردەخاتەوە، ئەمە مانای قسەی هەندێ لە عاریفانە ((ڕۆشنبینی بریتییە لە پیاچوونەوە بۆ دڵنیابوون لە سوود لێبینین و زیان لێبینینی شتێك))، هەندێکی تریان فەرموویانە ((ڕۆشنبینی ئەو شتەیە تۆ لە سەرگەردانی ڕزگار دەکات، جا یان بە باوەڕ یان بە بینین))

"ڕۆشنبینی" سێ پلەیە: هەر كەس كامڵیان بكات ئەوا ڕۆشنبینی تەواوكردووە، ڕۆشنبینییەك لە ناو و سیفەتەكانی خودای موتەعالدا، و ڕۆشنبینییەك لە بكە و مەكە(ئەمر و نەهیدا)دا، و ڕۆشنبینییەك لە بەڵێن و هەڕەشەكاندا.

## ۞ یەكەمین ئاستی ڕۆشنبینی(بەصیرەت)

**ڕۆشنبینی لە ناو و سیفەتەكاندا:** باوەڕت ڕووبەڕووی گومانێك نەبێتەوە پێچەوانەی ئەوە بێت خودا وەسفی خۆی پێكردووە، یان پێغەمبەرەكەی وەسفی كردووە، بەڵكو گومان لە ناو و سیفەتەكاندا وەك گومان وابێت لە بوونی خودا، هەردووكیان لای ئەهلی ڕۆشنبینی لە بەڵادا یەكسانن.

**دامەزرانی ئەم حەقیقەتە بەم جۆرەیە:** دڵت پەروەردگار-تبارك وتعالى- لەسەر عەرشەكەی ببینێت، كە ئەمر و نەهی دەردەكات، ئاگادار و بینەرە بە جووڵەی گەورە و بچووكی جیهان و كەسەكان و بوونەكان، دەنگیان دەبیستێت، چاودێری ویژدان و نهێنی پەنهانیانە، كاروباری مەملەكەتەكەی لەژێر بەڕێوەبردنی ئەودایە، وەسفكراوە بە سیفاتی كەماڵ و شكۆمەندی، پاك و بێگەردە لە نەنگی و ناتەواوی و نموونە و هاوشێوە، ئەو بەو جۆرەیە خۆی لە كتێبەكەیدا باس خۆی كردووە، لەسەروو وەسفی دروستكراوەكانیەوەیە، زیندووە و نامرێت، ڕاگری بوونە و ناخەوێت، زانایە و گردیلەیەكی لە ئاسمان و زەوی لێ بزر نابێت، بەصیرە و لە شەوێكی تاریكدا و لەسەر تاشەبەردێت مێروولەیەك دەبینێت و دەنگی پێی دەبیستێت، بیسەرە و دەنگەكان بە جیاوازی زمانیان و جۆراوجۆری پێویستییانەوە دەبیستێت، وشەكانی ڕاست و دروستن، سیفاتەكانی بالاترن لەوەی بە سیفاتی دروستكراوەكانی بشوبهێنرێن و بەرجەستە بكرێن و نموونادنیان بۆ بكرێت، خودی خودا مەزنتر و بالاترە لەوەی بە خودێكی تر بچوێنرێت، كردارەكانی دادپەروەرانە و دانایانە و بەبەزەییانە و چاكەخوازانە و بەخشندانە هەموو مرۆڤ و سەرجەم دروستكراوەكانی تری گرتۆتەوە، بوون و بڕیار (خەلق و ئەمر) هەر بۆ ئەوە، نیعمەت و چاكە هەر لای ئەوە، موڵك و ستایش هی ئەوە، سەنا و شكۆمەندی بۆ ئەوە، یەكەمینە و بەر لەو هیچ نەبووە، دواهەمینە و لەدوای ئەو هیچ نییە، دیارە و هیچ بە سەریەوە نییە، شاراوەیە و هیچ لە خواریەوە نییە، ناوەكانی هەر هەموو ناوی مەدح و ستایش و سەنا و شكۆدانەپاڵن، بۆیە ئەو ناوانە ناوی جوانن (الحسنى)، سیفەتەكانی هەر هەموو سیفەتی كەماڵن،

ئەوسافەکانی هەر هەموو ئەوساف شکۆمەندین، کردارەکانی هەر هەموو دانایی و بەزەیی و بەرژەوەندی خەلقن و دادپەروەرانەن، هەر چی دروستکراوە ئاماژەی بۆ دەکەن، ڕێنماییکاری کەسێکن بە چاوی ڕۆشن بۆ لای خودا تەماشایان بکات، ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە هەروا و بەبێ هۆ دروستی نەکردوون، مرۆڤیشی بەبێ کار و حیکمەت وێڵ نەکردووە، بوونەوەری بەدیهێناوە بۆ هەستان بە یەکتاپەرستی و بەندایەتی، نیعمەتەکانی خۆی بەسەردا دابارانەوون تاکو بەهۆی شوکر کردنەوە بگەنە ڕێز و پلە و پایەی مەزن، خۆی بە چەندین ناساندن بە دروستکراوەکانی ناساندووە، نیشانەی بۆ خستوونەتە ڕوو و بەڵگەی جۆراوجۆری بۆ هێناونەتەوە، بانگی کردوون بۆ خۆشویستنی خودا لە هەموو دەرگایەکەوە، بەهێزترین هۆکاری لە نێوان خۆی و ئەواندا درێژەپێداوە، نیعمەتی بێشوماری بۆ تەواوکردوون و بەڵگەی گومانبڕی بۆ هێناونەتەوە، لێشاوی نیعمەتی بەسەریاندا ڕێژاوە، لەسەر خۆی بەزەیی نووسیوە، دەستەبەری ئەو نووسراوەی کردووە کە نووسیویەتی: بەزەیی زاڵە بەسەر تووڕەییدا.

جیاوازی ئاستی خەڵك لەم ڕۆشنبینییەدا بەپێی جیاوازی ئاستی ناسین و تێگەیشتنیانە لە دەقی فەرموودەی پێغەمبەر و زانست بە فەسادی ئەو گومانانەی پێچەوانەی حەقیقەتی فەرموودەکانن.

بۆیە لاوازترین ڕۆشنبینی بریتییە لە ڕۆشنبینی ئەهلی کەلامی پووچ و زەمکراو کە پێشین بە خراپ دایانناوە، بەهۆی نەزانینیان بە دەقەکان و ماناکانیان و زاڵبوونی گومانی پووچ بەسەر دڵیاندا، گەر سەرنجێکی حاڵی خەڵکی ڕەشۆکی بدەی –کە لای زۆرینەی ئەهلی کەلام بە باوەڕدار تەماشا ناکرێن– ڕۆشنبینی لە بۆچوونەکانیاندا زیاترە و باوەڕیان بەهێزترە، خەڵکی ڕەشۆکی خۆیان ڕادەستی وەحی دەکەن و مل بە حەق دەدەن.

### ✿ ئاستی دووەم لە ڕۆشنبینی

ڕۆشنبینی لە بکە و مەکە (ئەمر و نەهی)دا: کە بریتییە لە خۆدارنین لە هەر بەرهەڵستکارییەك بە تەئویلکردن و شوێنکەوتنی کوێرانە و ئارەزووبازی، لە دڵیدا گومانێك نامێنێتەوە بەرهەڵستی زانست بە "بکە و مەکە"ی خودایی بکات، ئارەزوویەکی تیا نامێنێتەوە ڕێگری بکات لە جێبەجێ کردنی "بکە و مەکە" و

دەستبۆبردنیان، شوێنکەوتنی کوێرانەی تیا نامێنێتەوە ئاسوودەی بکات لە کۆشش بۆ وەرگرتنی ئەحکام لە چرای دەقەکان، ئەهلی ڕۆشنبینی لە زانایان لەم حەقیقەتانە تێگەیشتوون.

## ۞ ئاستی سێیەم: ڕۆشنبینی لە بەڵێن و هەڕەشەدا

ئەوەیە گەواهی بدەی کە خودا لەسەر هەموو نەفسێك وەستاوە بەوەی بەدەستی دەهێنێت لە خێر و لە شەڕ، لە ئێستا و لە داهاتوودا و لە خانەی کردەوە و خانەی پاداشت و سزادا. ئەو ڕاستییە داواکاری خواوەندی خودا و پەروەردگاریی و دادپەروەری و دانایی ئەوە، گومان لەوەدا گومانە لە خواوەندی و پەروەردگاریی خودا، بەڵکو گومانە لە بوونی خودا، هەرگیز پێچەوانەی ئەوە بۆ خودا شیاو نییە، نابێت پەکخستنی کاری دروستکراوەکان و وێڵکردنیان و وازلێهێنانیان بدرێتە پاڵ خودا، ئەو—سبحانە—بەرز و بڵندترە لەوەی ئەم جۆرە بیرکردنەوانەی بدرێنە پاڵ.

گەواهیدانی ژیری بە بوونی پاداشت و سزا وەك گەواهیدان وایە بە یەکتاپەرستی، بۆیە دروست ئەوەیە کە زیندووبوونەوە بە ئەقڵ و بیر زانراوە، لە ڕێگەی "وەحی"شەوە وردەکارییەکان بەردەست دەکەون، بەو هۆیەوەیە خودا نەرێکردنی زیندووبوونەوەی بە بێباوەڕی بە خودی خۆی—سبحانە— داناوە ﴿وَإِن تَعۡجَبۡ فَعَجَبٞ قَوۡلُهُمۡ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡأَغۡلَٰلُ فِيٓ أَعۡنَاقِهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ الرعد: ٥.

لەسەر ئەم ئایەتە پیرۆزە دوو بۆچوون هەیە:

یەکەم: گەر سەرت سوڕبمێنێ لەم قسەیان ﴿أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍ﴾، قسەکەیان جێی سەرسوڕمانە! چۆن نەرێی زیندووبوونەوە دەکەن، لە کاتێکدا ئەوانە لە خاك دروستکران و شتێك نەبوون.

دووەم: گەر سەرت سوڕبمێنێ لەو هاوەڵدانانەی بۆ خودا بڕیاری دەدەن و ملکەچ نەبوونیان بۆ یەکتاپەرستی و بەندایەتی تەنها بۆ خودای تاق و تەنها و بێهاوەڵ، ئەوا نەرێکردنی زیندووبوونەوە و وتنی ﴿أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍ﴾ لەوە زیاتر جێگەی سەرسوڕمانە.

لەسەر ئەم دوو قسەیە: نەرێکردنی زیندووبوونەوە کارێکی سەرسوڕهێنە کە لە مرۆڤ دەوەشێتەوە، هەر ئەوەش مانای نەرێکردنی پەروەردگار و بێباوەڕییە پێی و سەرپێچییە لە خواوەندی خودا و توانین و دانایی و دادپەروەری و دەسەڵاتی.

لای "شيخ الإسلام الهروي" -خاوەنی کتێبی "منازل السائرين" کە ئێمە شرۆڤەی دەکەین- ڕێگەیەکی تر بۆ "ڕۆشنینی(بصيرة) باس لێوە دەکرێت، ئەو دەڵێت ((ڕۆشنبینی ئەوەیە رزگارت بکات لە سەرگەردانی))، لەلای ناوبراو **یەکەمین پلەی ڕۆشنبینی ئەوەیە** بزانیت فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) شایستەن بەوەی بە یەقینەوە جێبەجێ بکرێن، لە پێناویاندا خاوەن غیرەت بیت و بۆیان تووڕە ببیت))

**مانای قسەکەی:** ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) رایگەیاندووە لە حەقیقەتێکی راستەوە سەرچاوەیان گرتووە، ئەو کەسانەی شوێنی دەکەون ترسی شتێکی خراپیان نابێت لە سەرئەنجامدا، بەڵکو ئاسایش بەخشە بە سەرئەنجامی شوێنکەوتووانی، چونکە حەقە و شوێنکەوتەی حەقیش ترسی لەسەر نییە، مافی ئەوەی پێغەمبەر رایگەیاندووە بەسەر تۆوە بریتییە لە: ئەوەی فەرمانت پێکراوە لەو پەیامە بەبێ گومان و سکاڵا ئەنجامی بدەی، ئەوەی بە هۆیەوە رزگارت دەبێت بریتییە لە دەست بردن بۆ جێبەجێ کردنی پەیامەکەی لە بەڕاست زانینێکی تەواو و دوور لە گومانەوە، تووڕە ببیت لەسەر سەرپێچی لەو پەیامە نەبادا حەقێکی پێشێل بکرێت و لایەنێکی پشتگوێ بخرێت، ئەمەش باشترین شتێکە بۆ تۆ.

غیرەت بۆ ئیسلام لای "شيخ الإسلام" لە کەماڵی "بەصیرەت"ە، چونکە بە ئەندازەی ناسینی حەق و شایستەبوونی و خۆشەویستی بۆی و شکۆدانەپاڵی ئەوەندە غیرەت دەیگرێت تاکو حەق بزر نەبێت، بۆیە تووڕەیە لەوانەی حەق بزر دەکەن، ئەمە بەڵگەیە لەسەر خۆشویستنی خاوەن حەقەکە(خودا) و شکۆمەندی و مەزنی دانەپاڵی. ئەمەش چاوگەی "ڕۆشنبینی"یە، وەك چۆن شك و گومانی کەسەکە عەیبدارکەری کەماڵی ملکەچییە و چاوی ڕۆشنبینی کوێر دەکاتەوە، هەر بەو جۆرە نەبوونی تووڕەیی و غیرەت بۆ حەقی خودا لە بارێکدا پێشێل بکرێت، یان بۆ مەرز و سنووری خودا کاتێك بشکێنرێت دەبێتە هۆی کوێری لە "ڕۆشنبینی"دا.

**پاشان پلەی دووەم لای شێخی هەرەوی:** بریتییە لەوەی گەواهی بدەی لەسەر دادپەروەری خودا لە هیدایەتی خەڵکی و گومڕاکردنیاندا، پەتی گەیشتن بە خودا بۆ راکێشانت لەناو نەفسی فرمانکەر بە خراپەدا ببینیت.

مەبەستی شێخی هەورەزی -رەحمەتی خوای لەسەر بێت- لە گەواهیدان بە دادپەروەری خودا لە هیدایەتی ئەوەی هیدایەتی داوە و گومڕاکردنی ئەوەی گومڕایی کردووە دوو شتە:

یەکەم: تەنهاکردنەوەی خودا بە دروستکردن و هیدایەتدان و گومڕاکردن.

دووەم: ڕوودانی ئەوانە لە خوداوە بە حیکمەت و دادپەروەری، نەك بە ڕێکەوت، یان تەنها ویستێك لە دانانی شتەکان بەو جۆرە لە جێگاکەیاندا و دابەزاندنیان بۆ شوێنەکانیان، بەڵکو حیکمەتێك داوای کردووە هیدایەتی کەسێك بدات کە هەوڵی خۆ خاوێنکردنەوە دەدات لەسەر هیدایەت، قبووڵی هیدایەت دەکات و شوکر دەکات لەسەری، دەرئەنجام هیدایەت لەلای کەسەکە بەر دەگرێت، خودا خۆی دەزانێت -لە بنچینەدا و بە میرات- پەیامی بەکێ دەبەخشێت ﴿وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓا۟ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٥٣﴾﴾ الأنعام: ٥٣، ئەمانە ئەوانەن ڕێزی نیعمەتی خودا بە هیدایەت دەزانن، شوکری خودای لەسەر دەکەن، خودایان خۆشدەوێ و ستایشی دەکەن لەسەر ئەوەی کردوونی بە ئەهلی هیدایەت، خودا-سبحانە- لە حەقی دادپەروەری و چاکە لاینەداوە لە هیدایەتی ئەوانەی هیدایەت وەردەگرن و گومڕایی ئەوانەی گومڕا دەبن، کەسێك لە دەرگانەی خودا دەست بەڕوویدا نەنراوە و لە خودا دوور نەخراوەتەوە شایستەی نزیکبوونەوە و هیدایەت و ڕێزلێنان بێت، بەڵکو ئەوانە دەرکراون کە جگە لە دەرکردن و دوورخستنەوە شایستەی شتێکی تر نین، حیکمەتی خودا و ستایشی ئەو نایەوێت کەسەکە لە خۆی نزیك بکاتەوە و ڕێزی لێ بنێت، واتە نایەوێت کەسەکە بکات بە ئەهل و دۆستی خۆی و لە خاسانی بگێڕێت.

شتێکی تر نەماوە وتنی ئەم قسەیە نەبێت: باشە بۆ خودا ئەو کەسەی بەو جۆرە دروست کردووە شایستەی هیدایەت نەبێت؟

ئەمە پرسیاری مرۆڤێکی نەزانی ستەمکاری گومڕایە، لە نەفامی و ستەم و گومڕاییدا زیادەڕەوی کردووە، چونکە دروستکردنی دژەکان و بەرانبەرەکان لە کەماڵی پەروەردگاریی خودایە، وەك شەو و ڕۆژ، گەرم و سارد، چێژ و ئازار، خێر و شەڕ بەهەشت و دۆزەخ.

قسەکەی تری شێخی هەورەزی: خودا بەوە دەیەوێت کۆمەکی خۆییت بە گوێڕایەڵی کردن پێ نیشان بدات، لە نەفست دەرتبهێنێ و ڕاتبکێشێت بۆ لای خۆی، ئەو دەیەوێت تۆ

نزیکت بکاتەوە و تۆ بەخۆی بگەیەنێت، بۆ یارمەتی تایبەت وشەی راکێشان "الجذب"ی خواست و بۆ نزیکردنەوەش وشەی بە یەکترگەیشتن "الوصال"ی بەکارهێنا. مەبەستی بە پەت "الحبل" ئەوهۆکارەیە تۆ بە خودا دەگەیەنێت(دەقەکەی شێخی هەروی"أن تشهدفي هداية الله للناس وإضلاله لهم: إصابة العدل وتعاين في جذبه إياك من نفسك الأمارة بالسوء: حبل الوصل").

ئاماژەی بەوە داوە کە بەڵگە دەهێنیتەوە بە یارمەتی ئەو بۆ تۆ و راکێشانت بۆ لای خۆی و دەستگرتن بە پەتەکەیەوە —کە بریتییە لە پەیمان و وەسێتی خودا بۆ بەندەکانی— بۆ نزیك کردنەوەت لە خۆی، ئەم راسستییە ببینیت بۆ ئەوەی لە خۆشەویستی و شوکردا بەهێزتر بیت و باشتر لە بەندایەتیدا ملکەچ ببی و کۆشش بکەی. هەموو ئەمانە لە کەماڵی "بەصیرەت"ن کە سەردەکێشن بۆ جۆری سێیەم لە مەعریفە کە لای شێخی هەروی بریتییە لە هەڵقوڵینی مەعریفە و سەوزبوونی فیراسەت.

راستی کردووە—رەحمەتی خودای لێ بێت— بەو رۆشنبینییە لە دڵی خاوەنەکەیدا کانیاوی مەعاریف هەڵدەقوڵێت کە بە هەوڵ و کۆشش و باس و لێکۆڵینەوە بەدەست نایەت، ئەوە تێگەیشتنێکە خودا لە کتێبەکەی و ئایینەکەیەوە بە بەندەیەکی دەبەخشێت بەپێی رۆشنبینی دڵی کەسەکە.

### ۞ فیراسەت بەری رۆشنبینیینە

رۆشنبینی لە زەوی دڵدا فیراسەتی راستگۆ دەڕوێنێت، ئەوەش نوورێکە خودا هەڵیدەدات بۆ ناو دڵ، بەو نووره حەق لە باتڵ جیادەکاتەوە ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ ﴾ الحجر: ٧٥، موجاهید لەسەر مانای "المتوسمين" دەفەرموێت: "المتفرسين" واتە خاوەن فیراسەتەکان، ئیمامی "الترمذي"لە "أبي سعيد الخدري"ەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ریوایەتی کردووە فەرموویەتی ((إتقوا فراسة المؤمن، فإنه ينظر بنور الله))، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ ﴾ الحجر: ٧٥

((التوسم)) لەسەر کێشی "تفعل"ە لە "سیما"وە هاتووە کە مانای نیشانەی هەیە، کەسی خاوەن فیراسەت، واتە"متفرس"ی بە "متوسم" ناوبرد، چونکە ئەوەی ئامادە و بینراوە دەکاتە بەڵگە لەسەر ئەوەی بزر و نادیارە، واتە بینراوەکانی گەردوون دەکاتە

بەڵگە بۆ باوەڕ بە خودا، بۆیە خودای موتەعال سوود بینینی لە ئایات كردووە بە تایبەتمەندی ئەو كەسانە، چونكە ئەوەی دەیبینن دەكەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەران هەواڵیان لەبارەوە داوە، لە بكە و مەكە و پاداشت و تۆڵە. خودا ئەوەی ئیلهامی ئادەم كرد، كاتێك هەموو ناوەكانی فێركرد، بیستن و بینین و دڵی گرگرتوو(فؤاد) و شتی تریشی پێبەخشی تاكو حەقیقەت و سیفەتی شتەكانی پێ بناسێت و بە سوود لێ بینینیان شوكری خودا بكات لەسەریان، لە شوێنی باشی خۆیان بە بنچینە و بنەمای دروستكراو و فیترەت دایان بنێت، چونكە هەموو ئەوانە بۆ ئەو و رۆڵەكانی و شێوە و جێنشینەكانی دروستكراوە و دانراوە، هەموو دڵێك توانای ئەوەی هەیە، چونكە هێزێكی تێدا هەیە، بەوە بەڵگە دەهێنرێتەوە و پەند وەردەگیرێت و ئاماژە كردن راست دەردەچێت، خودا پێغەمبەرانی بە نووری وەحی و باوەڕەوە رەوانە كردووە بۆ یادخستنەوە و هۆشداركردنەوە و تەواوكردنی ئەو ئامادەییە، پەیامی پێغەمبەران دەخرێتە پاڵ نووری فیراسەت و ئامادەیی، دەبێت بە نوور لەسەر نوور، رۆشنبینی بەهێز دەبێت و نوور مەزن و بەردەوام دەبێت بە زیادبوونی مادە و تەواوبوونی نووری وەحی و باوەڕ. ئەو نوورە بەردەوام لە زیادبووندایە تا لە روخسار و ئەندامەكان و قسە و كرداردا دەبینرێت، هەر كەس هیدایەتی خودا قبوڵ نەكات و سەری بەو هیدایەتە بەرز نەبێتەوە دڵی دەچێتە ناو بەرگ و رووپۆشەوە، تاریك دەبێت و لە بینین كوێردەبێت، حەقیقەتی باوەڕی لێ دەشارێتەوە، ئەو كات حەق بە باتڵ دەبینێت و باتڵیش بە حەق، راستی بە سەرلێشێواو و سەرلێشێواو بە راستی ﴿ كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ ﴾ المطففين: ١٤. "الرين" و "الران" بریتییە لەو پەردە چڕوپڕە ڕێگرە لەسەر دڵ كە بینینی حەق و ملكەچی بۆ حەق دەشارێتەوە.

بەپێی هێز و لاوازی رۆشنبینی فیراسەت سەرهەڵدەدات، فیراسەتی راستگۆیان و عاریفان بە خودا و فەرمانەكانی پەیوەستە بە خوداوە، چونكە كاتێك ویست و لێبڕانیان پەیوەست بوو بە خۆشەویستی و ناسین و پەرستشی خوداوە و بانگەوازی خەڵكی بۆ سەری فیراسەتیان پەیوەست دەبێت بە نووری وەحی و نووری باوەڕەوە، ئەوەی خودا خۆشیدەوێ و ئەوەی خودا خۆشیناوێت لە شت و قسە و

كردار لە یەكتر جیادەكاتەوە، پیس لە پاك و حەق لە باتڵ و راستگۆ لە درۆزن جیادەكاتەوە، بڕی ئامادەیی سالیكانی ڕێگەی خودا دەزانێت، مامەڵە دەكات لەگەڵ هەر مرۆڤێك بەپێی تواناكەی لەڕووی زانست و ویست و كار و كردارەوە.

فیراسەتی ئەوانە هەمیشە دەسوڕێتەوە بە دەوری ڕێگەی پێغەمبەر و ناسینی ڕێگەی پێغەمبەر(ﷺ) و رزگاركردن و جیاكردنەوەی لە توولە ڕێگەكانی تر، هەروەها نەنگییەكانی دەروون و ئافاتی كاروكردەوەكان، و لەمپەر لەبەردەم گرتنەبەری ڕێگەی پێغەمبەراندا روون دەكاتەوە، ئەمە بەرزترین جۆری رۆشنبینی و فیراسەتە و بەسوودترینیانە بۆ ژیانی دونیا و دوارۆژی بەندەی خودا.

### ۞ مەبەستێك مرۆڤ بۆ هێرش بردن هانبدات

كە بەئاگاهات و بە رۆشنی بینی ئەو كات دەست دەبات بۆ "مەبەست" و "راستی لە ویست و لێبڕان"دا، مەرام و نییەتی كۆدەكاتەوە بۆ سەفەری كۆچكردن بۆ لای خودا، دەزانێت و یەقین پەیدا دەكات كە دەبێت ئەو كۆچە بكات، كۆڵی سەفەر دەپێچێتەوە و توێشوو و پێویستییەكانی سەفەر ئامادە دەكات، خۆی لە كۆسپ و لەمپەرەكانی سەفەر دادەڕنێت و لەو پەیوەندییانەی رێگەی دەرچوونی لێدەگرن دادەبڕێت.

شێخی "هەرەوی" وادەبینێت كە ئەوە (("مەبەستێكە" هاندەدات بۆ هەستان و لە دڵەڕاوكێ رزگاری دەكات و بانگ دەكات بۆ دووركەوتنەوە لە مەرامەكانی تر"قصدا یبعث على الإرتیاض و یخلص من التردد، ویدعو إلى مجانبة الاغراض"))

ئەو مەبەستە هانیدەدات بۆ گرتنەبەری ڕێگە بەبێ وەستان و دڵەڕاوكێ و پاساو، كەسەكە خۆی دادەڕنێت لە هەرچی شتە جگە لە بەندایەتی خودای موتەعال لە ریا و ناوبانگ و داوای ستایش و پلە و پایە و مەنزیلە لەلای خەڵك، هەموو ئەو هۆیانەی دەبنە ڕێگر بۆ گەیشتن بە مەبەست ریشەكەند دەكات و كۆسپ و تەگەرەكان بنبڕ دەكات، دژوارییەكان ئاسان دەكات و رەوشتی دەبێت بە خۆڕادەست كردن بۆ پاڵفتەكردنی زانست و وەڵامدانەوەی بڕیاری ئایین.

ئەو ملكەچ دەبێت بۆ زانست تاكو خۆی پێ چاك و خاوێن بكاتەوە، هەر كات بانگكەری بڕیاری ئاینیی بانگی لێكرد دەچێت بە دەمییەوە، بۆ هەر بڕیارێك لە

بابەتەكانی زانست بانگەرێك بوونی هەیە بانگ دەكات بۆ باوەڕ پێ هێنانی لەڕووی زانست و كردارەوە، ئەویش ڕوودەكاتە وەڵامدانەوەی بانگكەرەكەكانی.

وەڵامدانەوەی نهێنی و حیكمەتی بانگكەر بۆ بڕیاری شەرع بڕێكی زیادەیە لە جێبەجێ كردن، ئەو بانگ دەكات بۆ خۆشەویستی و شكۆ و ناسین و ستایشی خودا، فەرمانەكە (بڕیارەكە) بانگ دەكات بۆ جێبەجێ كردن و دەستەبەركردنی ئەو حیكمەتانەی تێیدایە، ئامانجەكانیش بانگ بۆ ناسین و خۆشەویستی دەكەن.

۞ ۞ ۞

# (٤) (منزلة العزم)

# مەنزیلەی عەزم

## ۞ دەسپێكردنی لێبڕان تا كۆتایی

كە مەبەستەكە داگیری كرد دەبێت بە لێبڕانی پێداگر (عزما جازما)، دەكەوێتە سەرەتای سەفەرەوە هاوڕێ لەگەڵ پشت بەستن بە خودا﴿ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ ﴾ آل عمران: ١٥٩

"لێبڕان" بریتییە لە مەبەستێكی پێداگری پەیوەست بە كارەوە، بۆیە وتراوە: بریتییە لە دەستكردن بە سەرەتای جووڵە بۆ داوای مەبەست، لە بەدواداچوونی ئەم بابەتەدا دەركەوتووە كە: دەستكردن بە جووڵە لە "لێبڕان"ەوە سەرهەڵدەدات، نەك خودی "لێبڕان" بێت، بەڵام كە "لێبڕان" پەیوەست بووە بە جووڵەوە وا گومان دەبرێت لەگەڵ جووڵە یەك شت بن.

راستییەكەی: بریتییە لە كۆكردنەوەی هێزی ویست بۆ كاركردن.

**"لێبڕان" دوو جۆرە:**

**یەكەم:** لێبڕانی مورید بۆ چوونە ناو رێگەكە، ئەوەش لە سەرەتاكانی رۆیشتنە بەرەو خودا.

**دووەم:** لێبڕانێك كە لەگەڵیدایە لە حاڵی گەشت بەرەو خودا تا كۆتایی، ئەمەیان تایبەترە لەوەی یەكەم، ئەم دووەمە لە مەقامەكانە كە لە شوێنی خۆیدا بە پشتیوانی خودا باسی لێوە دەكەین.

لەم مەنزیلەدا سالیك پێویستی بە جیاكردنەوەی "ئەوەی بۆ خۆیەتی" لە "ئەوەی لە سەریەتی"، تاكو هاوەڵی ئەوە بكات كە "بۆ ئەوە" و جێبەجێی ئەوە بكات كە "لەسەریەتی"، ئەم مەنزیلەش بریتییە لە "دادگایی خۆ" كە لە بەدوای یەكتر هاتندا لە پێش "تەوبە"وەیە، كاتێك سالیك ئەو دووانە لە یەكتر جیادەكاتەوە و دەیانناسێت: دەست دەكات بە راپەڕاندنی ئەوەی لەسەریەتی و چوونەدەرەوە لێی كە بریتییە لە تەوبە.

بزانە رێکخستنی ئەم مەقامانە بەو پێیە نییە کە سالیك مەقامەکە دەبڕێت و لێی جیادەبێتەوە و دەگوێزێتەوە بۆ مەقامێکی تر، وەك مەنزیلەی رۆیشتنێکی بەرهەست، ئەمە هەرگیز بەو جۆرە نییە، نابینی کە "بێداربوونەوە" لە تەواوی مەنزیلەکاندا لەگەڵیدایە و لێی جیانابێتەوە، هەر بەو جۆرە "رۆشنبینی" و "ویست" و "لێبڕان" و "تەوبە"، ئەمانە با لە مەقامەکانی سەرەتا بن لەگەڵ ئەوەشدا لە مەقاماتی کۆتایین، لەگەڵ یەك بە یەکی مەقامەکاندا هاوڕێیەتی دەکەن. خودای گەورە لەسەر غەزوەی تەبوك دەفەرموێت ﴿ لَقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾ التوبة: ١١٧، تەوبەی کرد بە یەکەمین و دواهەمین کاریان، لە سورەتی ئەجەلی پێغەمبەردا(ﷺ) کە دوایین سورەتە دابەزیبێت ﴿ إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ ۝١ وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا ۝٢ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَٱسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابًۢا ﴾ النصر: ١- ٣

لە سەحیحی ئیمامی "بوخاری و مسلم"دا لە عائشەوە -خوا لێی رازی بێت- ((پێغەمبەر(ﷺ) لە هەموو نوێژەکانیدا دوای دابەزینی ئەم سورەتە بۆ سەری لە روکوع و سوژدەکانیدا دەیفەرموو: "**سبحانك اللهم ربنا و بحمدك، اللهم اغفر لي**" تەئویلی قورئانی دەکرد))، تەوبە کۆتایی هەموو سالیك و دۆستێکی خودایە، ئەو ئامانجەیە کە عاریفان بە خودا و بە بەندایەتی خودا و ئەوەی شایستەی خودایە رووی تێدەکەن، خودا دەفەرموێ ﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ۝٧٢ لِّيُعَذِّبَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَٰتِ وَيَتُوبَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًۢا ۝٧٣ ﴾ الأحزاب: ٧٢ - ٧٣، خودا-**سبحانه**- لێرەدا تەوبەی کردووە بە ئامانجی هەموو باوەڕدارێکی ژن و پیاو.

هەر بەو جۆرە "ئارامگرتن" لە هیچ یەکێك لە مەقامەکاندا لێی جیانابێتەوە.

ئەم رێکخستنە رێکخستنێکی بەمەرجگیراوی وەستاوە لەسەر ئەو مەرجەی هاوڕێیەتی دەکات.

نموونەی ئەوە "رازیبوون" لەسەر "ئارامگرتن" وەستاوە، واتە رازیبوون لەسەر ئارامگرتن شان دادەدات، بەبێ "ئارامگرتن" مەقامی "رازیبوون" جێگیر نابێت.

گەر بوترێت: هـاتنی مـەقامی "رازیبـوون" بـە دوای مـەقامی "ئارامگرتن"دایـە مانـای ئەوە نییە كەسەكە لە "ئارامگرتن" جیـا دەبێتـەوە و بـۆ "رازیبـوون" دەگوێزێتـەوە، بەڵكو مانای ئەوەیە كە مەقامی "رازیبوون" بەدەست نایەت تا مـەقامی "ئـارامگرتن" پێشی نەكەوێت، لە مەقامەكانی بەندایەتیدا ئەم بەدوای یەكتر هاتنانە تێبگە.

كـەوابوو لـەوە گەیشـتیت كـە "مەبەسـت" و "لێـبڕان" پـێش هـەموو مەنزیلـەكان دەكەون، لەوەش گەیشتیت كە "دادگایی خـۆ" لـە پلـەدا پێشـی "تەوبـە" كـەوتووە، كاتێك بەندە دادگایی خۆی دەكات لەو دۆخە دێتە دەرەوە كـە لەسـەریەتی، ئـەوەش حەقیقـەتی تەوبەیـە، هـەروەها مەنزیلـەی "پشتبەسـتن بـە خـودا" پـێش مەنزیلـەی "گەڕانـەوەی بـەردەوام"ە، چـونكە بـۆ بەدەسـتهێنانی پشـت بـە خـودا دەبەسـتێت، تەوەكول هۆكارە و گەڕانەوەی بەردەوام ئامانجە.

❁ ❁ ❁

## (٥) (منزلة المحاسبة)

# مەنزیلەی خۆدادگایی کردن

باسی "بێداربوونەوە" و "بیر" و "ڕۆشنبینی" و "لێبڕانمان" کرد.

ئـەم چـوار مەنزیلەیــە بـۆ مەنزیلــەکانی تـر وەك بناغــە وان بـۆ بینــاکردن، تــەواوی مەنزیلەکانی سەفەر بۆ لای خودا لەسەر ئەم چوارەن، سـەفەر بـەبێ چـوونە نـاو ئـەم چـوار مەنزیلەیـە وێنـا ناکرێـت، ئـەو چـوارە لەسـەر ڕێکخسـتنی بەرهەسـت و بینـراو ڕێکخراون، ئەو کەسەی لە نیشتمانی خۆیدایە سەفەر دەست پێ ناکات تا لە بێئاگایی بێدار نەبێتەوە بـۆ سـەفەرەکەی، پاشـان وردەبێتـەوە لـە کاروبـاری سـەفەرەکەی و ترس و هەڕەشەکانی و ئەو سوود و قازانجانەی لە سـەفەرەکەوە دەسـتی دەکـەوێت، پاشــان بیردەکاتــەوە لــە پێچــانەوەی کـۆڵی ســەفەر و توێشــووی ســەفەر و پێویستییەکانی، پاشان بۆی لێدەبڕێت، کە بـۆی لێـبڕا و مەبەسـت و مـەرامی خـۆی کـۆکردەوە و دەگوێزێتــەوە بـۆ مەنزیلــەی "خـۆ دادگــایی کـردن" کـە بریتییــە لــە جیاکردنـەوەی ئـەوەی بۆ ئـەوە و ئـەوەی لەسـەر ئـەوە، ئـەوەی بـۆ ئـەوە دەیکاتـە هـاوەڵی سـەفەر و ئـەوەی لەسـەر ئـەوە جێبـەجێی دەکـات، چـونکە ئـەو موسـافیری سەفەرێکە کە جارێکی تر ناگەڕێتەوە.

لە مەنزیلەی "خۆدادگایی کردن"ەوە پێدەنێتە مەنزیلەی "تەوبە کردن"، چونکە گـەر خۆی دادگایی کرد ئەو مافە ڕەوایەی لەسەریەتی دەناسێتەوە، جێبەجێیان دەکـات و لێیـان دێتــە دەرەوە، واتــە دەیانگێڕێتــەوە بـۆ خاوەنــەکانیان، ئەمــەش حەقیقــەتی تەوبەکردنە، بۆیە پێشکەوتنی "خۆدادگایی کردن" لەسەر تەوبە لەپێشترە.

قسەیەك هەیە "خۆ دادگاییکردن" دەخاتە دوای "تەوبەکردن"، چونکە دەڵـێن: "خـۆ دادگایی کردن" پێکنایەت ئەگەر "تەوبە" پێشی نەکەوێت.

ڕاستییەکەی ئەوەیە: تەوبە لەنێوان دوو "خۆدادگایی کردن"دایە، خۆدادگایی کردنێك لە پێشەوە کە تەوبە پێویست دەکات و بەدوای خۆیدا دەیهێنێت، لەگـەڵ خۆدادگـایی کردنێك بەدوای تەوبەدا کـە پاراسـتنی تەوبـە پێویسـت دەکـات، تەوبـەکردن بـەو دوو

خۆدادگاییکردنە دەورە دراوە، ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژە بە خۆدادگاییکردن دەکات ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖ ﴾الحشر: ١٨، خودا –سبحانە– فەرمانی بە بەندەکانی کردووە تەماشای ئەو کار و کردەوانەی خۆیان بکەن کە بۆ سبەینێی پێش خۆیان خستووە، ئەمەش دادگاییکردنی نەفسی خۆ لە ئامێز دەگرێت، بەندە سەیری کاروکردەوەکانی خۆی دەکات تا بزانێت شایستەن پێیانەوە بە خودا بگات، یان نە؟

مەبەست لەم سەیرکردنە: ئەو سەرئەنجامانەیە لە کار و کردەوەکانەوە پەیدا دەبن، ئامادەیی تەواو دەکات بۆ ڕۆژی دادگایی و سەرنجی ئەوە دەدات پێشی خۆی خستووە بۆ ئەو ڕۆژە سەختە، هەروەها وردبوونەوە لەو کاروکردەوانەی لە سزای خودا دەیپارێزن و ڕووی سپی دەکەن، عومەری کوڕی خەتتاب –خوا لێی ڕازی بێت– دەفەرموێت ((حاسبوا أنفسكم قبل أن تحاسبوا، وزنوا أنفسكم قبل أن توزنوا، وتزينوا للعرض الأكبر)) ﴿ يَوۡمَئِذٖ تُعۡرَضُونَ لَا تَخۡفَىٰ مِنكُمۡ خَافِيَةٞ ﴿١٨﴾ ﴾ الحاقة: ١٨، واتە کاروکردەوەکان ((دەخرێنە ڕوو لەلای کەسێك کە کردارەکانی ئێوەی لا شاراوە نییە))

### ۞ چ شتێك مەغروری کردووی بە پەروەردگاری بەخشندەت

سەرەتای "خۆدادگایی کردن" ئەوەیە بەراورد بکەیت لەنێوان نیعمەتی خودا و خراپەکانی خۆت، ئەو کات جیاوازی نێوانیانت بۆ دەردەکەوێت، تێدەگەیت یان لێبوردن و بەزەیی خودایی یان تیاچوونی یەکجاریی چاوەڕوانت دەکات.

بەم بەراوردکارییە حاڵی دەبیت کە خودا خودایە و بەندەش بەندەیە، هەروەها حەقیقەتی نەفس و سیفاتی نەفست بەراورد بە مەزنی و شکۆمەندی و تاکوتەنهایی پەروەردگار بەتەواوی بۆ ڕۆشن دەبێتەوە، هەرچی نیعمەتی خودایە لە گەورەیی و چاکەی خۆیەوەیە، هەرچی بەلا و ناخۆشی و تاڵی ژیانە لە دادپەروەرییەوەیە، تۆ بەر لەم بەراوردکارییە نەزانی بە حەقیقەتی دەروونی خۆت و پەروەردگاریی دروستکەر و بەدیهێنەری نەفست، گەر بەراوردت کرد بۆت دەردەکەوێت کە نەفس سەرچاوەی هەموو شەڕێك و بنچینەی هەموو ناتەواوییەکە، سنوورەکەی: بریتییە لە نەفام و ستەمکار، گەر بە گەورەیی و بەزەیی خودا پاك نەبێتەوە هەگیز پاك نابێتەوە، گەر

هیدایەتی نەدا هیدایـەت نابینێتـەوە، گـەر خـودا ڕێنمـایی نـەکات و ڕاینـەگرێت هـەرگیز ناگاتە هیچ خێرێك، بەدەستهێنانی هەموو ئەوانە لە دروسـتکەر و بەدیهێنەرەکەیەوەیـە، وەستانی نەفس لەسەر خودا وەك وەستانی بـوونی نـەفس وایـە لەسـەر هاتنـەبوونی، وەك چۆن لە خودی خۆیدا بوونی نییە هەر بەو جۆرە لە نەفسیدا کەماڵ بوونی نییـە، لە ناخیدا جگە لـە عـەدەم شـتێکی تـر بـوونی نییـە، مـرۆڤ دوو جـۆر عـەدەم لـەئامێز دەگرێت: عەدەمی خود و عەدەمی کەماڵ، لێـرەدا دەبێـت دان بـەوەدا بنێـت و بڵێـت ((أبوء لك بنعمتك علي و أبوء بذنبي)).

پاشان بەراورد دەکات لەنێوان چاکەکانی و خراپەکانی، بەو بەراوردکارییەش دەزانێت کام تایـان زۆرتـر و سـەنگینترە، ئـەم بەراوردکارییـەی دووەم بەراوردکارییـە لـەنێوان کاروکردەوەکانت و ئەوەی تایبەتە بە خۆتەوە.

### ۞ ئامێری بەراوردکاری

ئەو بەراوردکارییە لەسەر شانی کەسێك گرانە کە نـووری حیکمـەتی نـەبێت، گومـانی خراپ بە نەفس و جیاکردنەوەی نیعمەت لە فیتنە لەسەر نووری حیکمـەت وەسـتاوە، ئەوە ئەو نوورەیە کە خودا دڵی شوێنکەوتەی پێغەمبەرانی پێ ڕۆشـن کردۆتـەوە، بـە ئەندازەی نووری حیکمەت جیاوازییەکە دەبینی و خۆدادگاییەکە باشتر دەبێت.

<u>نـووری حیکمـەت لێـرەدا</u>: ئـەو زانسـتەیە بەنـدە حـەقی لـە باتـڵ پـێ جیادەکاتـەوە، هەروەها هیدایەت لە گومڕایی و زیانبەخش لە سوودبەخش و تەواو لـە ناتـەواو و خێـر لـە شـەڕ، هـەر بـەو جـۆرە ئاسـتەکانی کـردار لـە قبـووڵکراو و ڕەدکـراوەی پـێ جیادەکاتەوە، تا بەشی کەسەکە لەو نوورە زۆرتربێت بەشی لە خۆدادگایی تـەواوتر و کامڵتر دەبێت.

<u>گومانی خراپیش بە نەفس</u>: بەندە ئاتاجییەتی، چونکە گومانی باش بـردن بـە نـەفس ڕێگرە لە کەماڵی خۆپشکنین و شتەکانی لا تێکەڵ دەکات، خراپە بـە چـاکە و نـەنگی بە کەماڵ دەبینێت، خۆشویستنی نەفس خراپە و نەنگییەکانی خۆشەویست نابینرێت.

فعين الرضا عن كل عيب كليلة     كما أن عين السخط تبدي المساويا

هەر كەس نەفسی خۆی ناسی گومانی خراپی پێ دەبات، ئەو كەسەی گومانی باش بە نەفسی خۆی دەبات نەزانترین كەسە بە نەفسی خۆی.

جیاكردنەوەی نیعمەت لە فیتنە: جیاوازی بكات لە نێوان نیعمەت كە چاكە و لوتفی خودایی پێ دەبینێت و بەختەوەریی هەتاهەتایی لێوە بەدەست دێت لەگەڵ نیعمەتێك كە فریوخواردنی لێوە بەدەست دێت، زۆرن ئەوانەی بە نیعمەت فریویان خواردووە و بەخۆیان نازانن، بە مەدح و سەنای نەفامان تووشی فیتنە بوون، فریویان خواردووە بەوەی خودا كارەكانی بۆ جێبەجێ كردوون و ستری خۆی داوە بەسەریاندا، لەلای زۆربەی خەڵكی: ئەو سیانە(مەدحی نەفامان، جێبەجێبوونی داوا و كارەكانیان، ستری خودا لەسەر خراپەكانیان) كراون بە نیشانەی خۆشبەختی و سەركەوتن، زانستی ئەوانە تا ئەو جێگە بڕ دەكات.

كە ئەو سیانەی تێدا كامڵ بوون(نووری حیكمەت، گومانی خراپ بە نەفس، جیاكردنەوەی نیعمەت لە فیتنە) لەوە تێدەگات كە هەر نیعمەتێك كۆی بكاتەوە و بەرەو خودا ئاراستەی بكات نیعمەتێكی راستەقینەیە، ئەو نیعمەتەش لە خودا جیایدەكاتەوە و دووری دەخاتەوە ئەوە بەڵایە لە شێوەی نیعمەتدا پێیدراوە، با ئاگای لەخۆی بێت، چونكە ئەو حاڵەتە بریتییە لە هەڵنان و فریوخواردن، هەروەها جیاوازی بكات لەنێوان منەتی خودایی(كە نیعمەتە) و بەڵگەی خودا لەسەر ئەو (كە بیانوو بڕینە)، زۆرجار كەسەكە ئەم دوانەی پێ لەیەكتر جیاناكرێتەوە.

بەندە لە نێوان منەتێكدایە لە خوداوە لەگەڵ بەڵگەیەك لە خوداوە بۆ سەر ئەو، لەو دوانە جیانابێتەوە، ئەوەش ئەم ئایەتە پیرۆزانە ئاماژەی پێدەدەن ﴿لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ﴾ آل عمـــران: ١٦٤ ﴿بَلِ ٱللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَىٰكُمْ لِلْإِيمَٰنِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٧﴾﴾ الحجرات: ١٧﴿فَلِلَّهِ ٱلْحُجَّةُ ٱلْبَٰلِغَةُ﴾الأنعام: ١٤٩.

هەر هێزێك (نیعمەتێك)ی دیار یان شاراوە جێبەجێ كردنی فەرمانەكان –بۆ رەزامەندی خودا– بەدوایدا هات ئەوە منەتە لە خوداوە بۆ ئەو كەسە، ئەگەر نە، ئەوە دەبێتە بەڵگە لەسەری، هەر بەهرەیەك بەختكردنی ماڵ و دارایی لەپێناوی خودا و گوێڕایەڵی خودای بەدوادا هات–نەك بۆ داوای پاداشت و سوپاس لە خەڵكی– ئەوە منەتێكە لە خوداوە، ئەگەر نە، بریتییە لە بەڵگە لەسەری.

هەر دەست بەتاڵییەك خەریکبوون بەوەی خودا لە بەندەکەی دەوێت بەدوایدا هات ئەوە بریتییە لە منەت، ئەگەر نە، بەڵگەیە.

هەر قبوڵ کردنێکی ئەو لەلای خەڵکی و خۆشەویستیان بۆی پەیوەست بوو بە ملکەچی بۆ خودا و چوونەژێر فەرمانی و زانینی نەنگی و ناتەواوییەکانی نەفس و کردار و ئامۆژگاری مەردوومانی بەدوا هات ئەوە منەتە، ئەگەر نە، بەڵگەیە.

هەر ڕۆشنبینی و ئامۆژگارییەك و یادخستنەوە و ناساندنێکی حەق -سبحانە- پەیوەست بوو بە پەند و وانە وەرگرتنەوە لە ئەقڵدا و ناسنی باوەڕ، ئەوە منەتە، ئەگەر نە، بەڵگەیە.

هەر حاڵ و مەقامێك لەگەڵ خودادا گەشتکردنی بەرەو خودا بەرهەم هێنا و ویست و داوای خودای بەسەر ویست و داوای خۆیدا هەڵبژارد ئەوە منەتە، ئەگەر کەسەکە لەو حاڵ و مەقامەدا وەستا و پێی ڕازی بوو و نەفس چێژی لێبینی و پاڵیلێدایە و مەیلی پێدا، ئەوە بەڵگەیە لەسەری.

با بەندە تێڕامان بکات لەم بابەتە ترسناکە مەزنەدا، جیاوازی بکات لەنێوان جێگەی نیعمەت و میحنەت، و بەڵگە و نیعمەت، زۆرن ئەوانەی ئەمەیان لا تێکەڵ دەبێت لە خەڵکانی تایبەت و خاوەن سلوکان ﴿وَٱللَّهُ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٍ ٢١٣﴾ البقرة: ٢١٣

### ۞ بۆ تۆ و لەسەر تۆ

گەر لەم بەراوردکارییانەدا ڕۆبچیت، "خۆدادگایی" دەرگایەك بە ڕووتدا واڵا دەکات لە جیاکردنەوەی نێوان ئەوەی لەسەرتە لە داواکاریی بەندایەتی و پابەندبوون و گوێڕایەڵی و دوورکەوتنەوە لە خراپە لەگەڵ ئەوەی بۆ تۆیە، ئەوەی بۆ تۆیە بریتییە لە موباحی شەرعی، بۆیە ئەرکت لەسەر شانە و مافیشت هەیە، ئەوەی لەسەر شانتە ئەنجامی بدە ئەوەی ماف تۆیە پێت دەدات.

پێویستە جیاکاری بکەیت لەنێوان ئەوەی بۆ تۆیە و ئەوەی لەسەرتە بە پێدانی ماف بە هەموو خاوەن مافێك.

خەڵکی بەشێکی زۆری ئەوەی لەسەر شانیەتی دەیکات بە بەشی ئەوەی مافی خۆیەتی، بۆیە سەرگەردان دەبێت لەنێوان ئەنجامدانی و وازلێهێنانی، گەر بینی کردارەکە چاکە ئەنجامی دەدات، بەڵام نەك وەك حەقێك کە لەسەریەتی.

هەروەك ئەو دەستەیە کۆمەڵێك هەن ئەو شتانەی کە مافی خۆیەتی ئەنجامیان بدات یان وازیان لێ بهێنێت-واتە کارەکە موباحە بۆی- لە ڕیزی ئەوانە سەرژمێر دەکات کە پێویستە ئەنجامی بدات، یان بەشی ئەوەی پێویستە ئەنجامی نەدات.

بە وازهێنان لەوەی بۆی هەیە ئەنجامی بدات بەندایەتی دەکات، وەك وازهێنان لە زۆرێك لە موباح، وادەزانێت ئەو وازهێنانە حەقێکە لەسەری، وەك کەسێك بیەوێت بە وازهێنان لە ژنهێنان بەندایەتی بکات، یان دوورکەوتنەوە لە خواردنی گۆشت، یان میوە، یان هەر حەڵاڵێك لە خواردن و پۆشاك، بەهۆی نەزانینەکەیەوە وادەبینێت ئەوە لەو بەشەیە کە لەسەریەتی، بۆیە وازهێنان لەو شتە لەسەر خۆی پێویست دەکات، یان دوورکەوتنەوە لێی بە باشترین نزیکبوونەوە لە خودا و مەزنترین گوێڕایەڵی دەبینێت، پێغەمبەر(ﷺ) کاری ئەوانەی بەباش نەزانی کە بەم جۆرە بیریان دەکردەوە، لە فەرموودەی سەحیحدا **((أن نفرا من أصحاب النبي (ﷺ) سألوا عن عبادته في السر، فكأنهم تقالوها، فقال أحدهم: أما أنا فلا آكل اللحم، وقال الآخر: أما أنا فلا أتزوج النساء، و قال الآخر: أما أنا فلا أنام على فراش، فبلغ النبي (ﷺ) مقالتهم، فخطب وقال: مابال أقوام يقول أحدهم: أما أنا فلا آكل اللحم، ويقول الآخر: أما أنا فلا أتزوج ويقول الآخر: أما أنا فلا أنام على فراش؟ لكني أتزوج النساء، وآكل اللحم، و أنام و أقوم و أصوم و أفطر، فمن رغب عن سنتي فليس مني))** خۆی بەریکردن لەوانەی پشت لە سونەتەکانی هەڵدەکەن، بە وازهێنان لەوەی خودا لە پاك و حەڵاڵ موباحی کردووە دەیەوێت خودا بپەرستێت، خۆی لێیان دووردەخاتەوە، وا گومان دەبات خۆ لێ دوورخستنەوەیان بەندایەتییە، ئەم کەسانە نەیتوانیوە جیاکاری بکەن لەنێوان ئەوەی لە سەریەتی و ئەوەی بۆی هەیە ئەنجامی بدات.

### ۞ زۆری....... کەم

لە تەواوکردنی ئەم جیاکارییە ئەوەیە بزانێت ڕازیبوونی بەندە لە کار و گوێڕایەڵییەکانی بەڵگەیە لەسەر گومانی باش بەخۆ بردن و نەزانی بە مافی بەندایەتی و کار نەکردنی بەو جۆرەی پەروەردگار**-جل جلاله-** شایستەیەتی مامەڵەی لەگەڵ بکرێت.

ئەنجامی ئەمە: نەناسینی نەفسی خۆ و سیفات و ئافات و ناتەواوی کاروکردەوەکانی و نەناسینی پەروەردگار و حەقی پەروەردگار و ئەوەی پێویستە مامەڵەی لەگەڵ خودا پێ بکرێت هەموو ئەمانە رازیبوون لە کارەکان و گومانی باش بەخۆ بەرهەم دەهێنێت، لەمەشەوە زۆرێك لە نەخۆشی پەیدا دەبێت لەوانە: خۆپەسەندی و لوتبەرزی و گەلێك لە ئافات کە لە گوناهە گەورەکان – زینا و خواردنەوەی ئارەق و هەڵهاتن لە جیهاد– گەورەترن.

رازیبوون لە کاروکردەوەکانی خۆ لە گێلێتی نەفس و بێئەقڵییەکانییەتی.

خاوەن لێبڕان و رۆشنبینییەکان زۆرترین داوای لێخۆشبوونیان لەدوای کاروکردەوەی چاکەیانەوەیە، بەهۆی بینینی ئەو کەموکورییانەی تێیدایە، نەیتوانیوە بۆ شکۆمەندی و گەورەیی خودا وەك پێویست کارەکانی ئەنجام بدات، گەر جێبەجێ کردنی فەرمانی پەروەردگاریان نەبووایە هیچ کام لەم کەسانە لەو جۆرە بەندایەتییە نەدەچوونە پێشەوە و بۆ سەردارەکەیان(خودا) پێی رازی نەدەبوون.

خودا فەرمان بە نوێنەرانی خۆی حاجیانی ماڵی خودا دەکات کە دوای هاتنەوەیان لە عەرەفات داوای لێخۆشبوون بکەن ﴿فَإِذَآ أَفَضۡتُم مِّنۡ عَرَفَٰتٖ فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ عِندَ ٱلۡمَشۡعَرِ ٱلۡحَرَامِۖ وَٱذۡكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمۡ وَإِن كُنتُم مِّن قَبۡلِهِۦ لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿١٩٨﴾ ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنۡ حَيۡثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٩٩﴾﴾ البقرة: ١٩٨ – ١٩٩ ﴿وَٱلۡمُسۡتَغۡفِرِينَ بِٱلۡأَسۡحَارِ ﴿١٧﴾﴾ آل عمران: ١٧، شێخ حەسەن دەفەرموێت: هاوەڵان نوێژیان درێژە پێ دەدا تا سەحەر، دواتر دادەنیشتن داوای لێخۆشبوونیان لە خودا–عزوجل– دەکرد، لە فەرموودەی سەحیحدا ((پێغەمبەر(ﷺ) کە لە نوێژ سڵاوی دەدایەوە، سێ جار داوای لێخۆشبوونی دەکرد، پاشان دەیفەرموو: "اللهم أنت السلام ومنك السلام، تبارکت یا ذا الجلال و الإكرام"))

خودا فەرمانی بە داوای لێخۆشبوون بە پێغەمبەرەکەی کردووە دوای گەیاندنی پەیامەکەی و هەستان بەو کۆڵە مەزنەی لەسەر شانی دانرابوو، هەروەها فەرمانی بە داوای لێخۆشبوون کردووە لە جێبەجێ کردنی فەرزی حەج و نزیکبوونەوەی ئەجەلیدا، لە دوایین سورەتدا دەفەرموێت ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ﴿١﴾ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ﴿٢﴾ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ﴿٣﴾﴾ النصر: ١ – ٣.

لێرەدا عومەر و ئیبن عەباس-خوایان لێ رازی بێت- لەوە گەیشتوون کە ئەو سورەتە (سورەتی نصر) ئەجەلی پێغەمبەرە(ﷺ) بەو سورەتە پێغەمبەری ئاگادارکردووە لە نزیکبوونەوەی ئەجەلی، بۆیە فەرمانی پێ کردووە داوای لێخۆش بوون بکات لەدوای جێبەجێ کردنی ئەوەی لەسەر شانی دانرابوو، وەك ئەوەی پێی بفەرموێت ئەوەی لەسەر شانت بوو جێبەجێت کرد، شتێکی تر لە سەر شانت نەماوە ئەنجامی بدەیت، بۆیە کۆتایی کارەکەت دەبێ داوای لێخۆش بوون بێت، وەك چۆن کۆتایی نوێژ و حەج و شەونوێژ دەبێت داوای لێخۆش بوون بێت، دوای لێبوونەوە لە دەستنوێژ دەبێت بلێت ((**سبحانك اللهم و بحمدك، أشهد أن لا إله إلا انت، أستغفرك و اتوب إليك، اللهم اجعلني من التوابين واجعلني من المتطهرين**))

ئەمە کاری ئەو کەسەیە کە دەزانێت چی لەسەر شانە بەرانبەر بە خودا و چی شایستەی شکۆ و گەورەیی خودای موتەعالە لە حەقی بەندایەتی و مەرجەکانی.

**هەندێ لە عاریفان دەڵێن:** هەر کات لە نەفس و کردارت رازیبووی بۆ خودا بزانە کە خودا لێیان رازی نییە، هەر کەس زانی نەفسی جێگەی هەموو نەنگی و خراپەیەکە و کردارەکانی لەبەردەم هەموو ئافات و ناتەواوییەکدایە، چۆن لە نەفس و کرداری خۆی بۆ شایستەبوون لەلای خودا رازی دەبێت؟!

**شێخ ئەبو مەدین دەفەرموێت:** هەر کەس لە بەندایەتی وردبێتەوە بە چاوی ریا تەماشای کردارەکانی دەکات، حاڵەکانی بە چاوی بانگەشەی بێجێ، قسەکانی بە چاوی هەڵبەستنی درۆ، تا داواکراو(خودا) لە دڵدا مەزن بێت نەفسی خۆتت لا بچووك دەبێتەوە و ئەو بەها و نرخەی بۆ بەدەستهێنانی داواکراو بەختی دەکەیت لات بچووك و کەم بایەخ دەبێتەوە، هەرکات حەقیقەتی پەروەردگاریی و حەقیقەتی بەندایەتی دەبینیت و خودا دەناسی و خۆشت دەناسی: بۆت رۆشن دەبێتەوە کە ئەو شمەکەی لەلای تۆیە بەکاری بردن نایە بۆ لای مەلیکی حەق، گەر کاروکردەوەی ئینس و جین ئەنجام بدەی دەبێت لە سەرئەنجامەکەی بترسیت، بەڵکو خودا بە بەخشندەیی و گەورەیی خۆی ئەو کار و کردەوانە وەردەگرێت، هەر بەو جۆرە بە بەخشندەیی و چاکەی خۆی لەسەریان پاداشتت دەداتەوە.

**۞ كەم تەماشاكردنی هێواش..... خۆ نمایشكردنێكە خراپەی تێدایە**

ئەوەی ئەم مانایە تەواو دەكات ئەوەیە نەفسی خۆت بەرز رابگریت لەوەی خەڵكی بە كەم و كەمتەرخەم تەماشا بكەیت، لەوانەیە عەیبدراركردنی براكەت بە گوناهێك گوناهێكی زۆر گەورەتر و یاخیبوونێكی زۆر توندتر بێت، بەوەی چاكی و پاكی خۆت نمایش دەكەی و تەزكیەی دەروونی خۆت دەكەی و وانیشان دەدەی لەناو شوكری خودادای و لە گوناهان بەریت، بەڵام براكەت گوناهكارە، لەوانەیە شكانی نەفسی ئەو بەو گوناهە و ئەوەی بۆی دروست بوو لە ملكەچی و شەرمەزاری و بێز لە خۆ كردنەوە و رزگاربوون لە نەخۆشی بانگەشە و لوتبەرزی و خۆپەسەندی و وەستانی لە بەردەم خودادا بە گەردنكەچی و سەر نزمی و چاوداخراوی و دڵشكاوی، لەوانەیە هەموو ئەوانە بەهۆی ئەو گوناهەوە باشتر بێت بۆی و خێرتر بێت لەو چاكە و گوێڕایەڵیەی تۆ لە ناویدای و بانگەشەی بۆ دەكەی و بەزۆری دەزانی و دەیژمێری و منەتی پێ دەكەیت بەسەر خودا و خەڵكیدا، چەندە ئەو یاخیبووە لە بەزەیی خوداوە نزیكە! و چەندە ئەم دەورگێڕە لە رقی خوداوە نزیكە! گوناهێك مرۆڤ لە بەردەمی خودادا زەلیل بكات چاكترە لە گوێڕایەڵییەك ئاماژەی پێ بكەیت، گەر شەو و رۆژ بخەوی باشترە لەوەی شەونوێژ بكەی و خۆتت لاپەسەند بێت، مرۆڤی خۆپەسەند كاروكردەوەكانی بۆ لای خودا بەرز نابنەوە، گەر پێبكەنی و دان بە گوناهەكانی خۆتدا بنێیت باشترە بۆت بگری و ئاماژە بە چاكەكانت بدەی، گریە و ناڵەی گوناهكاران لەلای خودا باشترە لە گرمە و ناڵەی تەسبیحاتكەرانێك ئاماژە بە كاروكردەوەی خۆیان دەدەن، لەوانەیە بەو گوناهە خودا دەوایەكی دەرخوارد دابێت كە نەخۆشییەكی گەورە و كوشندەی تێدا چارەسەر كردبێت كە لە تۆدا بوونی هەیە و پێی نازانیت.

خودا نهێنی زۆری لە ئەهلی گوێڕایەڵی و ئەهلی یاخیبووندا هەیە كە جگە لە خۆی كەس نایانزانێت، جگە لە ئەهلی رۆشنبینی كەس ناتوانێت هەستیان پێ بكات، ئەوانیش بە ئەندازەی زانیاری مرۆڤ ئەو نهێنیانە دەبینن، لە پشتی ئەوەوە تەنانەت فریشتەكانی چاودێری مرۆڤ و نووسەرانی چاكە و خراپەش نایزانن، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((گەر كەنیزەكێكی ئێوە زینای كرد داری حەدی لێ بدرێ و دوای ئەوە

عەیبداری نەكات)) واتە بە خراپە ناوی نەهێنێت، لە فەرموودەكەی یوسفەوە (ﷺ) ﴿لَا تَثۡرِيبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَ﴾یوسف: ٩٢

تـرازوو بـە دەسـتی خودایـە، بڕیـار لەدەسـتی ئەودایـە، ئـەو قەمچییەی لـەو كەسـە یاخیبووە دەدرێت بەهۆی زیناكەیەوە بە دەسـتی "مقلـب القلـوب" وەرگێـڕی دڵانـە، مەبەست جێبەجێ كردنی سنوور و بڕیاری خودایە، نەك عەیبـداركردن و سـووكایەتی، هێرش و پەلامارەكانی قەدەر و زۆر و زەبری كەس لێی دڵنیا نییە جگە لە نەفامان بە خودا، خودا بە زاناترین دروسـتكراوی خـۆی و نـزیكترین كـەس لـەوەوە وەك وەسـیلە دەفەرموێت ﴿وَلَوۡلَآ أَن ثَبَّتۡنَٰكَ لَقَدۡ كِدتَّ تَرۡكَنُ إِلَيۡهِمۡ شَيۡـٔٗا قَلِيلًا ٧٤﴾ الإسراء: ٧٤، یوسفی راستگۆ دەفەرموێت ﴿وَإِلَّا تَصۡرِفۡ عَنِّي كَيۡدَهُنَّ أَصۡبُ إِلَيۡهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ٣٣﴾ یوسـف: ٣٣، بەگشـتی سـوێندی پێغەمبـەر(ﷺ) ئـەمـە بـوو ((لا ومقلـب القلـوب))نـا، سوێند بە وەرگێڕی دڵان، هەروەها دەفەرموێت **((ما من قلب إلا وهو بين إصبعين مـن أصابع الرحمن عزوجل، إن شـاء أن يقيمـه أقامـه، وإن شـاء أن يزيغـه أزاغـه))** پاشـان فەرمووی **((أللهم مقلب القلوب ثبت قلوبنا على دينك، أللهم مصرف القلوب صرف قلوبنا على طاعتك))**.

۞ ۞ ۞

(٦) (منزلة التوبة)

# مەنزیلەی تەوبە

گەر ئەم مەقامە (مەقامی خۆدادگایی کردن) دروست بوو و بەندە پێی تێنا نزیك دەبێتەوە لە مەقامی ((تەوبە)) چونکە بە خۆدادگایی ئەوەی بۆ ئەوە و ئەوەی لەسەر ئەوە لای روون بوویەوە، با توانا و لێبڕانی کۆبکاتەوە بۆ دابەزینە ناوی و خۆ یەکلاکردنەوە بۆی هەتا مردن.

مەنزیلەی تەوبە یەکەمین مەنازیل و ناوەند مەنازیل و دواین مەنازیلە، بەندەی سالیك لێی جیا نابێتەوە، بەردەوام تیایدا دەمێنێتەوە هەتا مردن، کە دەچێت بۆ مەنزیلەیەکی تر بە تەوبەوە دەڕوات، هاوڕێیەتی دەکات و پێکەوە دەچنە ناو مەنزیلە نوێیەکە، تەوبە سەرەتا و کۆتایی بەندەیە، پێویستی بە تەوبە لە کۆتاییەکاندا پێویستترە، وەك چۆن لە سەرەتاوە پێویستی پێی بوو، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٣١﴾ النور: ٣١، ئەم ئایەتە لە سورەتێکی مەدەنیدایە، خودا لەگەڵ ئەهلی ئیمان و باشترین دروستکراویدا قسە دەکات و داوایان لێدەکات تەوبە بکەن دوای ئیمان و ئارامگرتنیان و کۆچ و جیهادیان، پاشان رزگاری وابەستەی تەوبە کرد وەك وابەستەبوونی هۆ بە ئەنجامەوە، ئامرازی "لعل"-بەڵکو-ی بەکارهێنا وەك دروستکردنی هەستی هیوا و رجا لەلای بەرانبەر، پێیان دەفەرموێت گەر تەوبە بکەن لەسەر هیوا و رجای رزگاریدان، تەنها تەوبەکاران هیوای رزگاربوون دەکەن، خودا بمانگێڕە لەوانە، خودا دەفەرموێت﴿وَمَن لَّمۡ يَتُبۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ١١﴾ الحجرات: ١١، عابیدانی دابەش کرد بۆ تەوبەکار و ستەمکار، بەشی سێیەم بوونی نییە، ناوی "ستەمکار"ی بەکارهێنا بۆ ئەوانەی تەوبە ناکەن، ستەمکارتر لەو کەسە بوونی نییە بەهۆی نەزانی بە پەروەردگار و ماف پەروەردگار، هەروەها بێئاگایی بە نەنگییەکانی دەروون و ئافاتی کردارەکانی، لە فەرموودەی سەحیحی پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی ((خەڵکینە، تەوبە بکەن بۆ لای خودا، سوێند بە خودا من لە رۆژێکدا حەفتا جار تەوبە دەکەم و داوای لێخۆشبوونی لێ دەکەم))، هاوەڵانی پێغەمبەر لە یەك دانیشتندا بەر لەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هەڵبسێت سەد جار ((رب اغفر لي وتب علي إنك أنت التواب

الرحیم))یان دەژمارد، دوای دابەزینی (إذا جاء نصر الله والفتح) هیچ نوێژێکی نەکردووە تیایدا نەفەرموێت ((سبحانك اللهم ربنا وبحمدك أللهم اغفر لي))، لە فەرموودەی سەحیحدا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی ((کردارەکان هیچ کام لە ئێوە رزگار ناکات، وتیان: تۆش ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟ فەرمووی منیش، مەگەر خودا نوقمی بەزەیی و فەزڵی خۆیم بکات))

صەلات و سەلام لەسەر زاناترین دروستکراوی خودا بە خودا و حەقی خودا و مەزنی و ئەوەی شایستەیەتی لە شکۆمەندی بەندایەتی بۆی، زاناترین کەس بە بەندایەتی و حەقی بەندایەتی، راوەستاوترین کەس بەو ملکەچی و بەندایەتییە.

## ۞ والآکەری تەوبە

لەبەر ئەوەی تەوبە گەڕانەوەی بەندەیە بۆ لای خودا و خۆبواردنە لە رێگەی خەشملێگیراوان و گومڕایان، ئەمەش بە هیدایەتی خودا بۆ سەر شاڕێگەی راست و دروست بەدەست دێت، هیدایەتیش بە کۆمەکی خودایی و یەکتاپەرستی دەستەبەر دەبێت، سورەتی "الفاتحة" بە جوانترین و وردترین شێوە رێکیخستوون و بەبالآترین شێواز لە ئامێزی گرتوون، هەر کەس حەقی "الفاتحة"بدات–لەڕووی زانست و گەواهی و حاڵ و مەعریفەوە– دەزانێت کە خوێندنەوەی ئەو سورەتە بۆ بەندایەتی دروست نابێت بە تەوبەیەکی یەکجاریی نەبێت، هیدایەتی تەواو بۆ سەر شاڕێگەی راست و رەوان دەستەبەر نابێت لەگەڵ نەزانین بە گوناهان و بەردەوامبوون لەسەریان، یەکەمیان نەزانینێکە نەرێی ناسینی هیدایەت دەکات، دووەم نەفامییەکە دژی مەبەست و ویستییەتی، بۆیە دوای زانین و ناسینی گوناهان و دانپیادانان و داوای رزگاربوون لە خراپی سەرئەنجامی لە دونیا و دواڕۆژدا تەوبە راست و دروست دەبێت.

## ۞ دەستگرتن بە حەبلی خوداوە..... یان گوناهان

یەکەم مانای تەوبە: سەیری دەستبەردان لە حەبلی خودا بکات لە کاتی ئەنجامدانی گوناهدا، خودا پاکێتی خۆی لە تۆ وەرگرتۆتەوە، سەیری ئەو دڵخۆشییەی خۆی بکات بەوەی گوناهەکەی بۆ رێککەوتووە، سەیری کەمتەرخەمی و پاڵدانەوەی خۆت بکات لە بەهاناچوون و فریاکەوتنی خۆت بۆ رزگاربوون لە گوناهانێك کە سوور و بەردەوامی

لەسەری، لەگەڵ باوەڕی تەواو بە تەماشاكردنی خودا بۆت، گەر بەندەی گوناهكار دەستی بە حەبلی خوداوە بگرتبایە لە هیدایەتی گوێڕایەڵی دەرنەدەچوو، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ (١٠١)﴾ آل عمران: ١٠١، گەر بە تەواوی دەستی بە خوداوە بگرتبایە ئەوا شەرمەزاری نەدەكرد، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَٱعْتَصِمُواْ بِٱللَّهِ هُوَ مَوْلَىٰكُمْ فَنِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ (٧٨)﴾ الحج: ٧٨، واتە هەركات دەستتان پێوەگرت سەرپەرشتیتان دەكات، و بەسەر نەفس و شەیتاندا سەرتان دەخات، ئەو دووانە دوو دوژمنن كە لە مرۆڤ جیانابنەوە، دوژمنایەتییەكەیان زیانبەخشترە لە دوژمنی دەرەكی، سەركەوتن بەسەر ئەو دوو دوژمنەدا گرنگترە و بەندە ئاتاجترە بەو سەركەوتنە لە هەر شتێكی تر. كەماڵی سەركەوتن بەسەر دوژمندا بەپێی كەماڵی دەستگرتن بە حەبلی خوداوەیە، كەمی ئەم دەستگرتنە سەردەكێشێت بۆ رووتبوونەوە لە پاراستنی خودایی بۆ ئەو كەسە، ئەوەش حەقیقەتی شەرمەزارییە، خودا دوای شەرمەزار كردنی بەندەكەی وێڵی دەكاتە ناو لەوەڕگای گوناهان و دەیداتە دەست نەفسی خۆی، گەر خودا تۆی بە پاكی رابگرتبایە گوناهان سەریان تێنەدەكردی.

عاریفان كۆدەنگییان هەیە لەسەر ئەوەی كە شەرمەزاربوون ئەوەیە خودا كەسەكە بسپێرێت بە نەفسی و بیداتە دەست نەفسی خۆی. كۆمەك و یارمەتی خوداییش ئەوەیە كە: كەسەكە نەداتە دەست نەفسی خۆی، خودای موتەعال لەم وازهێنانە لە بەندەكەی و وێڵكردنی و دانە دەست نەفسی خۆی تا دەكەوێتە ناو گوناهان حیكمەت و نهێنی زۆری هەیە، هەندێكی ئاماژە پێدەدەین:

بەم جۆرە تەوبە دەگەڕێتەوە بۆ دەستگرتنت بە خوداوە و پارێزگاری خودا بۆ تۆ.

بێئاگایی لە مرۆڤدا بەجۆرێك سەردەكات تا خۆشحاڵ دەبێت بەوەی ئارەزوویەكی حەرامكراوی جێبەجێ كردووە، ئەم خۆشحاڵییە بە گوناهان بەڵگەیە لەسەر زۆری ئارەزووی گوناهان و نەزانی بە شكۆ و مەزنی ئەو كەسەی لێی یاخیبووە، هەروەها نەزانینی خراپی سەرئەنجام و گەورەیی ترس و هەڕەشەكەی، خۆشحاڵبوونی بە گوناه هەموو ئەوانەی بەسەر دەهێنێت، خۆشحاڵبوونی بە گوناهان زیانەكەی گەورەتر و توندترە لە ئەنجامدانی گوناهەكە، باوەڕدار هەرگیز چێژ لە گوناه نابینێت و پێی دڵخۆش نابێت، هەر گوناهێك دەكات خەم و ئازار تێكەڵ بە دڵ و دەروونی دەبێت، بەڵام مەستی حەز و ئارەزوو رێگرە لەوەی هەستی پێ بكات، هەر كات دڵی لەو خەم

و نیگەرانییە خاڵی بوویەوە و بە گوناهان خۆشی رووی تێکرد با باوەڕی خۆی تۆمەتبار بکات، بۆ مردنی دڵی خۆی بگری، چونکە گەر زیندوو بوایە ئەنجامدانی گوناه خەمبار و نیگەرانی دەکرد، لای سەخت و دژوار دەبوو، کە بە گوناه ئازار ناخوات نیشانەی مردنە و مردووش بە بریندارکردن ئازار ناچێژێت، وەك دەوترێت (فما لجرح بميت إيلام).

ئەم شکستخواردنە لە گوناهدا کەمن ئەوانەی پەی پێ دەبەن و لایەکی بەلادا دەکەنەوە، بابەتێکی زۆر ترسناکە، سەردەکێشێت بۆ تیاچوون گەر بە سێ شت فریای نەکەویت: ترسان لە مردن بەر لە تەوبەکردن، پەشیمانی بەوەی لەدەستی چووە لەلای خودا بە سەرپێچی لە فرمانەکانی، و خۆ یەکلاکردنەوە بۆ کاری سەرومڕ تاکو پیایدا بگەیت.

کە بێئاگایی تا ئەو سنوورە توندبوویەوە: دەگوێزێتەوە بۆ پێداگری و بەردەوام بوون لەسەر گوناهان کە بریتییە لە جێگیربوون لەسەر سەرپێچی و لێبڕان بۆ دووبارەکردنەوەی هەمان گوناه کە دەبێتە گوناهێکی تر و لەوانەیە زۆر گەورەتر بێت لە گوناهەکەی یەکەم، ئەمە بریتییە لە سزای گوناه کە گوناهێکی گەورەتر بەدوای خۆیدا دەهێنێت. پاشان گوناهی دووەم و سێیەم و بەم جۆرە تا لێواری تیاچوون. بەردەوام بوون لەسەر گوناه گوناهێکی ترە، پاڵدانەوە لە دەستبردن بۆ کار و کردەوەیەك باربووی ئەو گوناهانە بکاتەوە کە ئەنجامت داون و رازی بوون بە گوناه و دڵنیایی بۆ لایان نیشانەی تیاچوونە، لە هەموو ئەمانە خراپتر ئاشکراکردنی گوناهە لەگەڵ بوونی یەقین بەوەی خودا -جل جلاله- لەسەر عەرشی خۆیەوە سەیری کەسی گوناهکەر دەکات، گەر باوەڕی بەو سەیرکردنەی خودا هەبێت و بەئاشکرا گوناهی ئەنجامدا ئەوە تاوانێکی زۆر مەزنە، گەر باوەڕی بە سەیرکردنی خودا نەبێت بۆی ئەوە بێباوەڕییە و بەتەواوی دەرچوونە لە ئیسلام، ئەو لەنێوان دوو حاڵدایە: لەنێوان کەمی حەیا بەوەی بەئاشکرا لەبەردەم خودادا ئەنجامی دەدات، لەگەڵ بێباوەڕبوون بە خودا و دەرچوونی تەواو لە ئیسلام بەوەی پێی وانییە خودا ئەو ببینێت، بۆیە مەرجی تەوبەی دروست ئەوەیە یەقینی هەبێت کە خودا تەماشای کردووە و -ئێستاش تەماشای دەکات- و ئاگادارە بە کاروکردەوەکانی، لە کاتی ئەنجامدانی گوناهە ئاشکراکانیدا خودا ئاگای لێی بووە.

چونکە تەوبە تەنها لە موسڵمان قبووڵ دەکرێت، مەگەر کەسەکە بێباوەڕ بوو بێت بە خودا و سەیرکردنی خودا بۆ ئەو، ئەو کاتە تەوبەکردنەکەی هاتنە ناو ئیسلام و موسڵمان بوونە و داننانە بە پەروەردگار و ناو و سیفات و بەڵگە و نیشانەی لە ئاسۆی دەروون و گەردووندا، زانینی ئەوەی کە ئەو هەڵهاتووە بۆ لای خودا و دیلی دەستی دوژمنەکەی بووە، ئەو بەهۆی نەناسینی خودا و بوێریی گوناه کردن لە بەردەمیدا کەوتۆتە بەر چڕنووکی دوژمنەکەی، دەبێ بزانێت چۆن نەفام و نەزان بووە؟ کەی نەفام و نەزان بووە؟ چۆن بوو بە بەندی دوژمنەکەی و کەی بوو بە دیل و یەخسیر؟ باوەڕی بەوە هەبێت کە تەوبە کارێکی گرانە و کۆششێکی مەزنی گەرەکە، بێداربوونەوەیەکی تەواوە بۆ رزگاربوون لەدەستی دوژمن و گەڕانەوە و هەڵهاتن بۆ لای پەروەردگاری رەحمان و رەحیم، گەڕانەوەی لە رێگەی تیاچوون کە دوژمنەکەی ئەوی ناوەتە سەری، بڕی ئەو هەنگاوانەی بەهۆیەوە لە خودا دوورکەوتۆتەوە، هەروەها بڕی هەوڵ و کۆشش و ئەو کۆسپ و لەمپەرانەی کە پێویستە بیانبڕێت و بەسەریاندا زاڵ ببێت تاکو بگەڕێتەوە سەر شارێگەی راست و دروست.

**مەرجەکانی تەوبە سیانن:** پەشیمانی، و دەستبەرداربوون لە گوناه، و داوای لێبووردن و لێخۆش بوون.

**راستێتی تەوبە:** بریتییە لە پەشیمانی لەوەی لە رابردوودا لێی روویداوە، یەکسەر دەستکێشانەوە لە گوناه و لێبڕان کە جارێکی تر لەداهاتوودا نەگەڕێتەوە سەری.

هەر سێ مەرجەکە کۆدەبنەوە لەو کاتەی تەوبەی تیادا روودەدات، چونکە لەو کاتەدا پەشیمانە و دەستی لە گوناه هەڵگرتووە و لێبڕاوە بۆ نەگەڕانەوە بۆ سەر گوناهان، لەو کاتەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بەندایەتییەی لەپێناویدا خولقاوە، ئەو گەڕانەوەیە بریتییە لە راستێتی تەوبە.

لەبەر ئەوەی تەوبە لەسەر ئەو سیانە وەستاوە بۆی کراون بە مەرج.

**پەشیمانی:** تەوبە بەجێنایەت بە پەشیمانی نەبێت، چونکە هەر کەس پەشیمان نەبێت لە خراپە ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێی رازییە و بەردەوامە لەسەری، لە "مەسنەد"ی ئیمام ئەحمەددا هاتووە ((الندم توبة))پەشیمانی تەوبەیە.

**دەستگرتنەوە:** تەوبە روونادات گەر کەسەکە دەستی لەناو گوناهاندا بێت.

داوای لێبوردن: لە کەماڵی تەوبەیە، مەبەستمان بە "داوای لێبوردن" قسـە و گفتوگۆ نییە لەسەر گوناهەکە، بەڵکو بەدڵ و بە زمان بڵێت: (أللهم لا براءة لي من ذنب فأعتذر، ولا قوة لي فانتصر، ولكني مذنب مستغفر، أللهم لا عذر لي، وإنما هو محض حقك، و محـض جنايتي، فإن عفوت وإلا فالحق لك)

ئەمە داوای لێبوردنێکە بە نیشاندانی لاوازی و ملکەچی و رووزەردی لە خزمەتی خودادا، ئەو بووەتە قوربانی دەستی زاڵبوونی شـەیتانی دوژمـن و هێـزی نەفسـی فەرمانکـەر بـە خراپە، بە زمان بڵێت:

(خودایە ئەوەی لە من روویدا سووکایەتی نەبوو بە حەقی تۆ، و نەزان نەبووم بە تـۆ، و نـەرێی بینـینی تـۆم نـەکردووە لـە کـاتی گوناهانـدا، هەڕەشـەکانتم بـە کـەم تەماشـا نـەکردووە، بـەڵکو هـەوا و ئـارەزوو بەسـەرمدا زاڵ بـوو، لـە بـەرگری نەخۆشـی حـەز و ئارەزوودا هێزم لاواز بوو، هیوام بە لێخۆشبوون و لێبوردنی تۆ هەیـە، گومـانی باشـم بـە تۆ هەیە، رجای بەخشینی تۆ دەکەم و هیـوام بـە حـیلم و بـەزەیی تـۆ زۆرە، شـەیتان و نەفسی فەرمانکەر بە خراپە تووشـی لەخۆدەرچـوونی کـردم، تـۆ ئـەو گوناهانـەی منـت داپۆشیی، نەزانینم کۆمەکی کردم، رێگەیەك نییە بـۆ پاراسـتنم لـە گونـاه تـەنها بـە تـۆ نەبێت، هیچ کۆمەکییەك نییە بۆ گوێڕایەڵی تۆ بە یارمەتی و کۆمەکی تۆ نەبێت).

هاوشێوەی ئەم نزا و پاڕانەوانە کە داوای بەزەیی خودا و ملکەچی و هەژاری و دانان بە گوناهان و دەستەوسانی و بڕیاردان بۆ بەندایەتی تێدایە.

ئەمـە لـە کـەماڵی تەوبەوەیـە، مرۆڤـی ژیـر و هۆشمەنـد کـە خـۆی لای خـودا دەباتەبەرەوە ئەم شێوازە دەگرێتە بەر، خودا پێی خۆشە کە بەندەکەی خۆی لـە خودا بباتە بەرەوە.

## ۞ راستێتی تەوبە

راستێتی تەوبە سێ شـتە: ١.گونـاه و تاوانەکـە بـە گـەورە بزانیـت، و ٢.تەوبەکـەی خۆی تۆمـەتبار بکـات، و ٣.غـیرەت بـۆ خـودا و تووڕەبـوون بـۆ ئـەو-سبحانه- گـەر سەرپێچی فرمانەکانی کرا و بیانوو و پاسا و قبوڵنەکردن لە سەرپێچیکار گوایە قەدەر بڕیاری داوە ئەو کارە خراپە ئەنجام بدات.

**بە گەورەزانینی گوناه و تاوان:** گەر گوناه بە سوك و كەم بزانێت، ئەوا لێیی پەشیمان نابێتەوە، بەپێی بەگەورەزانینی گوناهەكە پەشیمانییەكەی لە ئەنجامدانی گەورە دەبێت، هەر كەس دۆڕاندنی فلسێك -بۆ نموونە- بە كەم بزانێت لە دۆڕاندنی پەشیمان نییە، كە زانی دینارێكە پەشیمانییەكەی زیاد دەكات و تیاچوونەكەی لا گەورە دەبێت.

**بە گەورەزانینی گوناه و تاوان لە سێ شتەوە سەر هەڵدەدات:** بە مەزن زانینی فرمان و بڕیاریی خودایی(كە ئەو سەرپێچی لێكردووە)، و بە مەزن زانینی فرمانكەر(خودای موتەعال)، و بەڕاست زانینی تۆڵە و پاداشت (دواڕۆژ)

**تۆمەتباركردنی تەوبەی خۆ:** چونكە تۆبە مافێكی خودایە لەسەر ئەو، یەقینی نییە ئایا تەوبەكردنەكەی بە كامڵترین و باشترین شێوە ئەنجامداوە، یان نە، دەترسێت حەقی تەوبەی نەدابێت و لێی وەرنەگیرێت، دەترسێت كۆششی تەواوی نەكردبێت لە پێناوی تەوبەیەكی راست و دروستدا، تەوبەیەكی ناتەواو بێت و ئەو هەستی پێ نەكات، وەك تەوبەی خاوەن پێویستی و ئیفلاسكەران، یان وەك تەوبەی ئەوانەی دەیانەوێت لە ناو خەڵكیدا پارێزگاری لە پێویستی و پلە و پایەی خۆیان بكەن، یاخود تەوبەی كردووە بۆ ئەوەی پارێزگاری لە حاڵ و كاروباری خۆی بكات، بۆیە تەوبەكەی بۆ حاڵە، نەك بۆ خودای خاوەن شكۆ و مەزنی، یاخود تەوبەی كردووە بۆ ئەوەی رزگاری ببێت لەدەست شەكەتی و ماندووبوونی گەڕان بەدوای گوناهدا، یان لە ماڵ و شەرەف و پلە و پایەی خۆی دەترسێت، یان بەهۆی لاوازبوونی بانگكەری گوناه لە نەفسیدا و خامۆشبوونەوەی ئاگری حەز و ئارەزووەوە، یان بەهۆی نەبوونی گوناهەوە، واتە گوناهی دەست نەكەوێت، یان بەهۆی سەرقاڵی كەسەكەوە بە بەدەستهێنانی زانست و رۆزیەوە، هاوشێوەی ئەمانە كە تەوبە عەیبدار دەكەن لەوەی بۆ خودا بێت و بۆ مەزنی ئەو و پارێزگاری لە سنوورەكانی ئەو بێت، هەروەها تەوبەكەی بۆ شكۆمەندی خودا بێت و ترسانی بەربوونەوە بێت لەو مەنزیلەی لەلای خودا بۆی دانراوە و دوورخستنەوە و دەركردنی لە دەرگای ئەو-**سبحانە**- و دروستبوونی پەردە لە رۆژی دواییدا بۆ نەبینینی رووی جوانی خودا، ئەم تەوبەیە رەنگێكی ترە و تەوبەی خاوەن بەرژەوەندییەكان رەنگێكی تر.

**هەروەها لە تۆمەتباركردنی تەوبە:** لاوازی ویست و لێبڕان و ناو بەناو لاكردنەوەی دڵ بەلای حەزی گوناهەكەدا، و هێنانەوە بەریادی شیرینی گوناهەكە، لەوانەیە هەناسەیەكی

خەم و پەشیمانی هەڵبکێشێت بۆ ئەنجامدانی گوناهەکە، لەوانەشە بە یادکردنەوەی گوناهەکە نەفس بهروژێت و دیسان حەزی ئەنجامدانی تیا دروست ببێتەوە.

**هەروەها لە تۆمەتبارکردنی تەوبە:** دڵنیایی و متمانە بەوەی تۆبەی کردووە، وەك ئەوەی لاپەڕەیەکی داڵدەدان و سەلامەتی لە خوداوە پێگەیشتبێت، ئەمە لە نیشانەکانی تۆمەتبارکردنە.

**دیسان لە نیشانەکانی تۆمەتبارکردنی تەوبە:** وشکی چاو و بەردەوامبوونی بێئاگایی و دەرنەکەوتنی کۆمەڵێك دیاردەی چاکە لە دوای تەوبەکەی کە پێش تەوبەکە نەیبووبن.

**تەوبەی قبووڵکراو و دروست نیشانەی تایبەت بەخۆی هەیە:**

**لەوانە:** بەبەردەوامی ترس لێی جیانابێتەوە، لە مەکری خودا بۆ چاوتروکانێك بێباك نییە، ترسەکەی ئەو بەردەوامە تا گوێی لە قسەی نێرراوەکەی خودا دەبێت ﴿أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ۝٣٠﴾ فصلت: ٣٠، ئەو کاتە ترس نامێنێت.

**لەوانە:** خۆدادڕنینی دڵ و پارچە پارچە بوونی بەهۆی ترس و پەشیمانییەوە، ئەمەش بەپێی گەورە و بچووکی گوناه و تاوانەکەی، ئەم نیشانەیە تەئویلی "إبن عيينة"یە بۆ ئایەتی﴿ لَا يَزَالُ بُنْيَـٰنُهُمُ ٱلَّذِى بَنَوْا۟ رِيبَةً فِى قُلُوبِهِمْ إِلَّآ أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمْ ﴾ التوبة: ١١٠، دەڵێت: بە ترس پارچە پارچەی بکە، گومانی تێدا نییە ترسی زۆر لە سزای مەزنی خودا دڵ شەق پێ دەبات و رووتدەبێتەوە، ئەمەش مانای پارچە پارچە بوونیەتی، هەر ئەوەش بریتییە لە حەقیقەتی تەوبە، چونکە دڵ بەهۆی پەشیمانییەوە پارچە پارچە دەبێت و دەترسێت لە سەرئەنجامی خراپ، هەر کەس لە دونیادا دڵی بە ترس و پەشیمانی پارچە پارچە نەبێت ئەوا لە دوارۆژدا کە راستییەکان دەردەکەون دڵی پارچە پارچە دەبێت، کاتێك پاداشتی گوێڕایەڵان دەبینێ و سزای یاخیبووانی دەکەوێتە پێش چاو، بۆیە دەبێت دڵ یان لە دونیادا یان لە دوارۆژدا پارچە پارچە ببێت.

**لە پێویستییەکانی تەوبەی راست و دروست:** گەردنکەچی بۆ دڵ (دڵشکاوی) بەرهەم دێت کە بە هیچ شتێك ناچێت، و تەنها بۆ گوناهکارانە، بە برسێتی و خۆشەویستی

بەدەست نایەت، بەڵکو شتێکە لە پشت هەموو ئەمانەوە، دڵشکاویی لەبەردەم خودادا بە شکاندنێکی تەواو، لە هەرچی لاوە بە زەلیلی دەورە دراوە، بە گەردنکەچییەوە هەڵدراوەتە بەردەمی خودا.

هیچ شتێك بە ئەندازەی ئەم دڵشکان و زەلیل بوون و ملکەچی و تەختبوون و خۆخستنە بەر دەرگای خودا و خۆڕادەست کردنە لای خودا خۆشەویست نییە، لەو حاڵەدا ئەم وتەیە چەند شیرینە ((**أسألك بعزك وذلي إلا رحمتني، أسألك بقوتك وضعفي وبغناك عني وفقري إليك، هذه ناصيتي الكاذبة الخاطئة بين يديك، عبيدك سواي كثير، وليس لي سيد سواك، لا ملجأ ولا منجا منك إلا عليك، أسألك مسألة المسكين، وأبتهل إليك إبتهال الخاضع الذليل، وادعوك دعاء الخائف الضرير، سؤال من خضعت لك رقبته، ورغم لك أنفه، وفاضت لك عيناه، وذل لك قلبه**))

ئەمە و هاوشێوەکانی ئەمە لە نموونەی تەوبەی قبووڵکراون، هەر کەس ئەم حاڵەتەی لە دڵدا نەبینی با تەوبەکەی تۆمەتبار بکات و بگەڕێتەوە بۆ راستکردنەوەی، چەندە تەوبەی راست و دروست گرانە گەر حەقیقەت بێت! چەندە تەوبەی نادروست ئاسانە گەر زمان و بانگەشە بێت! گرانترین شتێك لای مرۆڤی صادق بیەوێت راستی بکاتەوە بریتییە لە راستکردنەوەی تەوبەکەی، بەوەی بیکات بە تەوبەیەکی پوخت و پاڵفتە و راست و دروست بۆ خودا. و"**لا حول ولا قوة إلا بالله**"

## ۞ قەدەر.......و هەڵبژاردن

غیرەت بۆ خودای موتەعال لەکاتی سەرپێچی خەڵکی لە فەرمانی خودا و پاساو هێنانەوە بە بیانووی قەدەر(گوایە قەدەر لەسەری نووسیوە گوناه ئەنجام بدات)، لەبەرئەوەی خودا-عزوجل- بەبەزەیتر و دەوڵەمەنتر و دادپەروەرترە لەوەی کەسی خاوەن بیانوو سزا بدات، هیچ کەس بە قەدەر خودا بیانوو و پاساوی پێخۆش نییە، بۆیە لەو پێناوەدا پێغەمبەرانی رەوانە کردووە و کتێبەکانی دابەزاندووە بۆ ئەوەی بیانووی خەڵکی ببڕێت و لەلای خودا بیانوو دروست نەکەن و پاساو نەهێننەوە.

وەك زانراوە بانگەشەکەری ئەو بیانووە(بیانووی قەدەر) لەسەر بەڵگەیەك وەستاوە کە خودا لە هەموو روویەکەوە پووچی کردۆتەوە، مەزنترین بەڵگەی یەکلاکەرەوە لەلای خودایە.

ئەوەی ساغبووەتەوە: ئەو کەسانەی یاخی دەبن لە خودا و سەرپێچی دەکەن هیچ بیانوویەکیان نییە، لەگەڵ بوونی زانست بە کارەکە و توانای هەڵبژاردن لەنێوان ئەنجامدان و دوورکەوتنەوە لێی، گەر بیانوویەکی هەبوایە شایستەی سزا و لۆمەکردن نەدەبوو نە لە دونیا و نە لە دواڕۆژدا، هەر کەس بانگەشەی ئەوە بکات گوناهەکەی بڕیارێکی بڕاوەی خودابیە و نەیتوانیوە ئەنجامی نەدات ئەوە ئەو کەسە ستەمکارە و نەفامە، گەر نەفامی و ستەمەکەی نەبوایە دەیزانی بەڵا و گیرۆدەبوونەکەی لە خودی خۆیدایە، نەفسی خۆی شایستەترە بە هەموو خراپەدانە پاڵ و زۆر و ستەمێك، نەفسی جێگەی هەموو خراپەیەکە ﴿ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٌ ﴿٦﴾ ﴾ العادیات: ٦، "ئیبن عەباس و موجاهید و قەتادە" لەسەر مانای "کنود" دەفەرموون: "کفور، جحود بنعم الله" واتە سپڵە و بێوەفا و گەردنکەچ نەبوو بۆ نیعمەتەکانی خودا. "حەسەن"یش دەفەرموێت: ئەو مرۆڤە ئەو کەسەیە بەڵا و ناخۆشییەکانی دەژمێرێت و نیعمەتەکانی لەبیردەچێتەوە. ئەبو عوبێدە دەفەرموێ: ئەوە کەسێکە کە خێری کەمە، چونکە "کنود" زەوییەکە هیچی لێ نەڕوێت، هەروەها وتراوە: "کنود" ئەو شتەیە هیچ جۆرە سوود و قازانجێکی لێ ناڕوێت. "فضل بن عباس" دەفەرموێت: "الكنود" ئەو کەسەیە تەنها یەك خراپە هەرچی چاکەیە لەبیری دەباتەوە.

گەر نەزانینەکەی نەبوایە دەیزانی کە نەفسی خۆی لەسەر رێگەی بەرژەوەندییەکانی دانیشتووە و رێگری دەکات لەوەی پێیان بگات، ئەوە بووە بەو تاشە بەردەی لەمپەری لەبەردەم ئاوی ژیانیدا دروست کردووە، نەفسی خۆیەتی بووە بە زەل و قامیش و مەجرای ئاوی بۆ ناو بێستانەکەی داخستووە، لەگەڵ ئەوەشدا پەنا دەبات و هاوار دەکات: تینوێتی، تینوێتی، لەسەر رێگەی ئاو وەستاوە و ناهێڵێت ئاوەکە بەخۆی بگات، ئەو بریتییە لە پەردەی سەر دڵی خۆی و ناهێڵێت نهێنی جیهانی پەنهان ببینێت، ئەو بریتییە لەو هەورە رەشەی کە رۆشنایی خۆری هیدایەتی بۆ سەر دڵی شاردۆتەوە، هیچ شتێك بە ئەنداوەی نەفسی زیانی پێناگەیەنێت، هیچ دوژمنێکی نییە درندەتر و دوژمنکارتر لە نەفسی خۆی.

ما تبلغ الأعداء من جاهل ما يبلغ الجاهل من نفسه

(ئەوەی نەزان بەخۆی دەکات هیچ دوژمنێك پێی ناکات)

دەستی بە برین بچێت ئەو ستەمكارەی لە قالبی ستەملێكراودا خۆی دەردەخات، سكالاكارێت كە تاوانەكە بۆ خۆی ئەنجامیداوە، بەئەوپەڕی توانایەوە خەریكی پشت هەڵكردنە لە خودا و هاوار دەكات: دەریانكردم، دووریانخستمەوە.

كەسێكی خاوەن بەزەیی پەلی دەگرێت تا نەكەوێتە ناو ئاگرەوە، كەچی ئەو جلوبەرگەكەی رادەكێشێت و بەسەر كەسەكەدا زاڵ دەبێت و لەگەڵ خۆی دەیخاتە ناو دۆزەخەوە، پاشان هانا دەبات و هاوار دەكات: گوناهی من چی بوو، هیچ دەسەلاتێكم نەبوو؟ بردمیان بۆ لێواری ئاگر و هەڵیاندامە ناویەوە، سوێند بە خودا زۆر ئامۆژگاریكەر هاواریان لێ كرد: ئاگاداربە، ئاگادار، وریابە، وریا، چەندین كەس دەستیان بە پۆشاكەكەی گرت، كێشمەكێشی لەگەڵ ئەوانەدا دەكرد رایانگرتبوو تا نەكەوێتە ناو ئاگرەوە، بەلام ئەو تەنها چوونە ناو ئاگری دەویست.

وەیل بۆ كەسێك بووە بە پشتیوانی شەیتان دژ بە پەروەردگاری، بووە بە ناحەزی خودا و لەسەر نەفسی خۆی دەكاتەوە، یاخیبووەكانی جەبرییانەیە و گوێڕایەڵییەكانی قەدەریانە(واتە گوناهەكانی دەداتە پاڵ خودا و چاكەكانی دەداتە پاڵ خۆی)، دەستەوسانە لە بڕیاردا و تیابەری هەلی خۆیەتی، پاڵیداوەتەوە لە بەرژەوەندییەكانی و لۆمەی قەدەرەكانی پەروەردگاری دەكات، بیانوویەك بۆ خودا دەهێنێتەوە كە لە كوڕەكەی و ژنەكەی قبووڵ ناكات كاتێك لە كەمتەرخەمی هەندێ لە كاروبارەكان بیانووی بۆی بهێننەوە، گەر فەرمان بە یەكێكیان بكات و ئەنجامی نەدا و شتێك لە یەكێكیان قەدەغە بكات و ئەنجامی بدات و دواتر بیانووی قەدەری بۆ بهێننەوە لێیان قبووڵ ناكات و دەست بە سزادانیان دەكات.

گەر قەدەر بەڵگەی دەستی تۆ بێت لە ئەنجام نەدانی حەقی خودا لەسەرت ئەی مرۆڤی ستەمكاری نەفام ئەدی بۆ نابێتە بەڵگە و بیانوو بۆ ژنەكەت لە ئەنجام نەدانی هەندێك لە مافەكانت؟ بەڵكو ئەگەر خراپەكارێك خراپەی لەگەڵ كردی و ستەمكارێك دەستدرێژی كردە سەرت و بیانووی قەدەری هێنایەوە ئەوا لێی توورە دەبیت و تاوانەكەی گەورەتر دەبێت لەلات و بیانووەكەی بەبێ بنەما تەماشا دەكەیت، پاشان دێیت و ئەو بیانووە بۆ خودا دەهێنیتەوە و بە پاساوی خۆتی دەزانی، كێ شایستەترە بە ستەم و نەزانی لە كەسێك ئەمە حاڵی بێت؟!.

ئەمە و بەردەوام بوونی چاکەی خودا لەسەرت لەگەڵ بە بەردەوام بوونی هەناسەکانت: نەخۆشییەکانی نەهێڵایت، توانای چوونە بەهەشتی پێ بەخشیت، بەڵگەی بۆ ناردی، کۆڵی سەفەری بۆ ئامادە کردوی و توێشووی بۆت رێکخستووە، ئەوەی لەگەڵ رێگراندا پێی دەجەنگیت پێی بەخشیوی، بیستن و بینین و بیرکردنەوەی پێداویت، خێر و شەڕ و قازانج و زیانی پێ ناساندووی، پێغەمبەری خۆی بۆ رەوانەکردووی، کتێبەکەی بۆ دابەزاندووی، ئاسانی کردووە بۆ یاد و تێگەیشتن و کارپێکردن، بە سەربازە بەڕێزەکانی کۆمەکی کردووی، دامەزراوت دەکەن و چاودێریت دەکەن، لەگەڵ دوژمنەکەت دەجەنگن و لێتی دووردەخەنەوە، دەیانەوێت تۆ مەیلی پێ نەدەی و لەگەڵی رێکنەکەویت، ئەوان بۆت چارەسەر دەکەن، بەڵام تۆ جگە لە پشتیوانی کردنی دوژمنەکەت دژ بەوان شتێکی ترت ناوێت، بەڵکو دژ بە سەرپەرشتیاری حەقی خۆت پشتیوانی دەکەیت، ئەو پشتیوانەی کە نزیکترین کەسە بە تۆ و شایستەی دۆستایەتییە ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا ﴿٥٠﴾ ﴾ الكهف: ٥٠، خودا فەرمانی پێکردووی بە شوکر کردنی، نەك ئەو پێویستی بە تۆ بێت، بەڵکو بۆ ئەوەی داوای چاکەی زۆرتری لێ بکەی، بێباوەڕی بە نیعمەتەکانی و بەکارهێنانیان لە نارەزامەندی خودادا لە گەورەترین هۆی لێ وەرگرتنەوەی نیعمەتەکانە، فەرمانی پێ کردووی بە یادی خودا تاکو چاکەکانی خۆیت بیربخاتەوە، لەبیرچوونەوەی خودا هۆیەکە بۆ ئەوەی خودا تۆ لەبیری خۆی بباتەوە ﴿ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْ ﴾ الحشر: ١٩ ﴿ فَنَسِيَهُمْ ۗ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾ التوبة: ٦٧.

فرمانی پێ کردووی داوای لێ بکەی تا پێت ببەخشێت، بەڵکو شیرینترین بەخششی بە بێ داواکردن بە تۆ بەخشیوە، کەچی قبووڵت نەبوو.

سکاڵا لەدەست کەسێك دەکەیت کە بەزەیی بە تۆدا دێتەوە لەلای کەسێك کە بەزەیی پێتدا نایەتەوە، داوا لە کەسێك دەکەیت کە دەستدرێژی دەکاتە سەرت و ستەمت لێ دەکات، گەر تەندروستی و لەشساغی و ماڵ و دارایی و پلە و پایەی پێ بەخشیت بەکاریان دەهێنیت لە یاخیبوونی خودادا!

بانگی کردی بۆ دەرگانەی خۆی نە لە بەردەمیدا وەستای، نە تەقـەت دا لـە دەرگـای، پاشان دەرگاکەی بۆ کردیەوە، بەڵام نەچوویە ژوورەوە.

پێغەمبەرەکەی خۆی رەوانـە کـرد بـۆ لات تـاکو بانگـت بکـات بـۆ خانـەی رێزلێنـان و بەخشندەیی، کەچی یاخیبووی لە پێغەمبەرەکەی و وتت: دەستبەرداری ئەو شتە نابم کە دەیبینم(دونیا) بۆ ئەو شتەی کە دەیبیستم(دوارۆژ).

لەگەڵ ئەمەشدا لـە بـەزەیی خـۆی بێهیـوای نـەکردووی، بـەڵکو فەرموویـەتی هـەرکات بێیت بۆ لام دەرگات بۆ دەکەمەوە، گەر شەو بگەڕێیەوە بۆ لام قبووڵت دەکـەم، گـەر رۆژ بگەڕێیەوە قبووڵـت دەکـەم، گـەر بسـتێك لـە مـن نزیـك ببیـەوە باڵێـك لێـت نزیـك دەبمەوە، گەر باڵێك لێم نزیك ببیەوە دوو باڵ لێـت نزیـك دەبمـەوە، گـەر بـە رۆیشـتن رووم تێبکـەی بـە راکـردن رووت تێدەکـەم، گـەر پـڕ بـە زەوی گونـاه بکـەی و رووم تێبکـەی –و هاوەڵـت بـۆ دانـەنابم– مـنـیش بـە پـڕ بـە زەوی لێخۆشـبوونەوە رووت تێدەکەم، گەر گوناهـەکانت بگاتـە ئاسمـان و دواتـر داوای لێبـوردنم لـێ بکـەیت لێـت دەبوورم، کێ لە من بەخشندەترە؟!

بەنـدەکانم بـە گونـاهی گـەورە رووبـەڕووم دەبنـەوە و مـنـیش لـەناو جێگـەکانیان ئاسوودەیان دەکەم، مـن و جـن و ئینـس لـە هـەواڵێکی مـەزن و سەرسـوڕهێنداین: دروستی دەکەم و کەسی تر دەپەرستێت، رۆزی دەدەم و شوکری کەسی تر دەکات، خێرم بۆ بەندەکانم دادەبارێنم و شەڕیان بۆم بەرز دەبێتەوە، خۆم بـە نیعمەتـەکانم لەلایان خۆشەویست دەکەم –لەگەڵ ئەوەی کـە لێیـان بێنیـازم– کەچـی بـە گونـاه خۆیان لام بێزراو دەکەن و لەگەڵ ئەوەشدا ئاتاجترین کەسن بۆ لای من.

هـەر کـەس رووم تێبکـات لـەدوورەوە قبـووڵی دەکـەم، هـەر کـەس پشـتم تێبکـات لـە نزیکەوە بانگی دەکەم، هەر کەس لەبەر من دەستبەرداری شتێك ببێت بە زیادەوە پێـی دەدەم، هەر کەس رەزامەندی منی بوێت ئـەوەم دەوێـت کـە دەیـەوێت، هـەر کـەس بـە توانا و هێزی منەوە هەڵسوکەوت بکات ئاسنی بۆ نەرم دەکەم.

ئەهلی یادی من ئەهلی دیوانی منـە، ئـەهلی شـوکرم لـەلام ئـەهلی زیـادکردنن، ئـەهلی گوێڕایەڵیم ئەهلی رێز و بەخشینی منن، ئەهلی یاخیبوونم لە بـەزەیی خـۆم بێبەشـیان ناکەم، گەر تەوبە بکـەن و بـۆ لام بگەڕێنـەوە مـن خۆشەویسـتیانم، مـن تەوبـەکاران و

پاكانم خۆشدەوێت، گەر تەوبە نەكەن من پزیشكیانم، بە بەڵا تاقییان دەكەمەوە تاكو لە نەنگی و ناتەواوی پاكیان بكەمەوە.

هەر كەس من هەڵبـژێرێت بەسـەر كەسانی تـردا منـیش ئـەو بەسـەر كەسانی تـردا هەڵدەبژێرم، چاكە لەلای من یەك بە دە تا یەك بە حەوتسەدە، تا چـەندەها بەرانبـەر، خراپە لەلام یەك بە یەكە، گەر پەشیمانیش بێتەوە لێی لێیخۆش دەبم.

كەمێك لە كار شوكر دەكەم (واتە بۆی زیاد دەكـەم)، لـە زۆرێـك لـە خراپـە دەبـوورم، بەزەییم لەپێش تووڕەبوونمەوەیە، حیلمم لەپێش تۆڵەسەندنەوەیە، لێبـوردنم لـەپێش سزاوەیە، من لە دایك بە منداڵەكەی بە بەزەییترم **((لله أشد فرحا بتوبة عبـده مـن رجـل أضل راحلته بأرض مهلكة دوية عليها طعامه و شرابه، فطلبها حتى إذا أيس من حصولها، نـام في أصل شجرة ينتظر الموت، فاستيقظ فإذا هي على رأسه، قد تعلق خطامها بالشـجرة، فـالله أفرح بتوبة عبده من هذا براحلته))**

ئەمـە خۆشـحاڵی چـاكە و لوتفـە، نـەك خۆشـحاڵی ئاتاجێـك بـە تەوبـەی بەندەكـەی و قازانجكـەر لێـی، هـەر بـەو جـۆرە سەرپەرشـتی كردنـی بەندەكـەی چـاكەیە لەگـەڵی و خۆشەویستییە بۆی، بەهۆی كەمییـەوە نییـە خـودا بیـەوێت بـە بەنـدەكانی خـۆی زیـاد بكات، بێ دەسەڵات نییە تا خۆی بە بەندەكانی بەهێز بكـات، شكسـتی نـەخواردووە تـا بە بەندەكانی خۆی راست بكاتەوە، بۆ كاتی تەنگانە نییە بەندەكەی خۆی ئامادە بكـات و داوای كۆمەكی و یارمەتی لێ داوا بكات ﴿ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ وَلِىٌّ مِّنَ ٱلذُّلِّ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًۢا ﴿١١١﴾ ﴾ الإسـراء: ١١١، لـە ئایەتەكـەدا نـەرێی ئـەوەی كـرد كـە لـە زەلـیلان و بێدەسـەڵاتان دۆسـتی هـەبێت، خـودا دۆسـتی ئەوانەیـە باوەڕیان هێناوە، ئەوانەن دۆستانی خودا.

ئەمە مەزنی و شكۆمەندی خودایە و ئەوەش ئاستی بەندەكەی، ئەوان هەڵگری پاسـاو و بیانووی خۆیانن و گوناهەكانیان بە ئەندازەی ئەوە هەڵدەگرن.

**إستأثر الله بالمحامد والمج      د و ولى الملامة الرجلا**

سـاغكردنەوە: غـیرەت بـۆ خـودا و تووڕەبـوون بـۆ ئـەو لـە حەقیقـەتی تەوبـەن، پووچكردنەوەی بیانووی خەڵك بۆ سەرپێچی لە ئەمر و نەهی و تووڕەبوون لـەو پێنـاوەدا لە نیشانەكانی گەورە راگرتنی سنوورەكانی خودان و راستێتی تەوبە رادەگەیەنن.

بە تايبەت گەر ئەو بيانووە ببێتە پاساوی ئەوانەی "بت"یان پەرست و پێغەمبەرانيان شەهيد كرد لە فيرعەون و هامان و نەمرودی كوڕی كەنعان و ئەبو جەهل و ياوەرانی و ئيبليس و سەربازەكانی و هەموو بێباوەڕان و ستەمكاران و دەستدرێژكارانی سەر سنووری خودا و مەرزبەزێنانی مەحاريمی خودا، پێيان وابێت هەموو ئەوانە لەژێر قەدەردان و ئەوانيش لە دروستكراوەكانن و قەدەری خودايان بەسەردا جاری دەبێت.

تەوبەكارانی راستەقينە ئەوانەن كە بە راستی و دروستی باوەڕيان بە قەدەر هێناوە، ئەوانەن چاوەڕوانی كەشتی ئەمری خودايی دەكەن، كە لێيان نزيك بوويەوە كەشتييەوان بانگيان دەكات ﴿ٱرْكَبُوا۟ فِيهَا بِسْمِ ٱللَّهِ مَجْر۪ىٰهَا وَمُرْسَىٰهَآ﴾ هود: ٤١، ئەوە بەراستی كەشتييەكەی نوحە و كەشتی تەواوی پێغەمبەرانی دوای ئەوە، هەر كەس سەركەوت رزگاری بوو، هەر كەس لێی دواكەوت نوقم بوو، سواری كەشتی ئەمری خودا بوون بە قەدەر، بەناو شەپۆلەكاندا و لەسەر بڕياری تەسليمبوون بە كەسێك كە كاروباری دەريای بەدەستە دەيانگوێزێتەوە، ماوەيەكی كەمە و بە زەوی و ئاسمان دەوترێت ﴿يَـٰٓأَرْضُ ٱبْلَعِى مَآءَكِ وَيَـٰسَمَآءُ أَقْلِعِى وَغِيضَ ٱلْمَآءُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَٱسْتَوَتْ عَلَى ٱلْجُودِىِّ﴾ هود: ٤٤، لەسەر چيای جودی لەنگەر دەگرێت كە بريتييە لە خانەی نيشتەجێ بوونی هەتاهەتايی.

ئەوانەی لە كەشتييەكە دواكەوتن –وەك هۆزەكەی نوح– هەموو نوقم بوون و پاشان سووتان، لەسەر سەری هەموو جيهانەكانەوە بانگيان لێدەكرێت و پێيان دەوترێت ﴿وَقِيلَ بُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ هود: ٤٤ ﴿وَمَا ظَلَمْنَـٰهُمْ وَلَـٰكِن كَانُوا۟ هُمُ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ الزخرف: ٧٦، پاشان بە زمانی شەرع و قەدەر بانگ دەكرێت، بۆ تەحقيقی يەكتاپەرستی و جێگيركردنی بەڵگەی خۆی –سبحانه– كە ئەو دادپەروەرترين دادپەروەرە ﴿قُلْ فَلِلَّهِ ٱلْحُجَّةُ ٱلْبَـٰلِغَةُ ۖ فَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ الأنعام: ١٤٩

## ۞ قەدەر بە قەدەر پاڵ پێوە دەنێين

سواربووی سەر ئەو دەريايە لە كەشتی بڕياردا ئەركەكەی بريتييە لە: رووبەڕووبوونەوەی شەپۆلەكانی قەدەر، بەرهەڵستكاری شەپۆلەكان هەندێكيان بە هەندێكی تريان، ئەگەر نە، لەسەر دەريا تيادەچێت، ئەو دەبێت قەدەر بە قەدەر بەرپەرچ بداتەوە، ئەمە بريتييە لە كەشتی كەسانێكی لێبڕاو لە عاريفان، ئەمە مانای قسەی شێخی عاريف و پێشەوا "عبدالقادر الگيلانی"ە كە دەفەرموێت ((كە دەگەنە

قەزا و قەدەر هەمووان بێدەنگ دەبن، جگە لە من، من دەرگایەکم لەناو قەدەردا بەڕوودا کراوەتەوە، بۆیە ململانێی قەدەری حەق بە حەق و لەپێناوی حەقدا دەکەم، پیاو ئەو کەسەیە ململانێی قەدەر دەکات، نەك خۆی رادەستی قەدەر بکات))، بەرژەوەندی خەڵکی لە دونیادا بەهۆی ململانێی قەدەرەوەیە هەندێکی بە هەندێکی تری، ئەی دەبێت بۆ دواڕۆژیان چۆن بن؟

خودای موتەعال فەرمانی کردووە خراپە–کە قەدەرێکە– بە چاکە –کە قەدەرێکی ترە– پاڵ پێوە بنێین، هەر بەو جۆرە برسێتی لە قەدەرەکانی خودایە و فەرمانی کردووە بە خواردن لایبدەن کە ئەوەش دیسان لە قەدەری خودایە، گەر کەسەکە خۆی رادەستی قەدەری برسێتی بکردبایە –لەگەڵ توانای لادانی ئەو برسێتییە بە خواردن– تا مردن ئەو کەسە بە یاخیبوو لە قەڵەم دەدرا، هەر بەو جۆرە ساردی و گەرمی و تینوێتی، هەر هەموو ئەمانە لە قەدەری خودان، فەرمانی کردووە بە لادانیان بە کۆمەڵێك قەدەری دژ بەوانە، پاڵنەر و پاڵنراو و پاڵنان هەر هەموو لە قەدەرەکانی خودان.

پێغەمبەر(ﷺ) ئەم مانایەی بەڕەوانی و تێر و تەواوی دەربڕیوە، وتیان ((ئەی پێغەمبەری خودا، ئەو دەرمانانە چۆن دەبینی بۆ چارەسەر بەکاریان دەهێنین، یان "رقية" کە چارەسەری پێ دەکەین، یان "توقية" کە خۆمانی پێ دەپارێزین، ئایا هیچ کام لەمانە لە قەدەری خودا دەگێڕێتەوە؟ فەرمووی: ئەوانە لە قەدەری خودان))، لە فەرموودەیەکی تردا ((دوعا و بەڵا لە نێوان ئاسمان و زەویدا تێك دەئاڵێن)). ئەگەر دوژمنێکی بێباوەڕ تەقەی دا لە دەرگای وڵاتێکی ئیسلام ئەوا تەقەی لێ بدەن بە قەدەری خودا، ئایا حەڵاڵە بۆ موسڵمانان خۆیان رادەستی قەدەر بکەن، دەرکردنی ئەو دوژمنە بە قەدەرێکی تر واز لێ بهێنن کە بریتییە لە جیهاد، ئەوەش وەك قەدەرێك قەدەری خودای پێ لابدەن؟

هەر بەو جۆرە گوناه و یاخیبوون گەر بە قەدەر بۆت بڕابووبێتەوە و بە قەدەر ئەنجامت دا ئەوا بە تەوبەیەکی یەکجاریی بیسڕەوە، چونکە تەوبەش لە قەدەرە.

**لادانی قەدەر بە قەدەر دوو جۆرە:**

**یەکەم:** پاڵنانی قەدەرێك کە هۆیەکانی ئامادەبووە تاکو رووبدات–بەڵام هێشتا روونەداوە– بە کۆمەڵێك هۆی تر کە بەرانبەرکێی لەگەڵ دەکات و ناهێڵێن رووبدات،

وەك لادانــی دوژمــن بــە جــەنگان لەگــەڵی، هــەروەها لادانــی ســەرما و گــەرما، و هاوشێوەکانیان بە کۆمەڵێك هۆی تر..

دووەم: لادانی قەدەرێك کە روویداوە و جێگیر بووە بە قـەدەرێکی تـر کـە ئـەو قـەدەرە لادەبات و دەیسڕێتەوە، وەك لادانی قەدەری نەخۆشی بە قەدەری چارەسەر، هـەروەها لادانی قەدەری گوناه بە قەدەری تەوبە و لادانی قەدەری خراپە بە قەدەری چاکە.

ئەمەیـە شـکۆی عاریفـان و شـکۆی قـەدەرەکان، نـەخێر، بـۆ خـۆ رادەسـت کردنـی و وازهێنان لە جووڵە، بەڵێ، بۆ گرتنەبەری هۆکارەکان، خۆڕادەست کـردن و وازهێنـان لـە جووڵە بریتییە لە دەستەوسانی و خودای موتەعال لۆمەی دەستەوسان دەکات.

### ❁ سێ مەرج

نـاواخنی حەقیقـەتی تەوبـە سـێ شـتە: ١.جیاکردنـەوەی توقییـە لـە عیـززەت، و ٢.لەبیرکردنی گوناه و تاوان و ٣.تەوبەکردن لە تەوبە، چونکە تۆبـەکار دەچێتە نـاو هــــەموو ئەمانـــــەوە، لـــــە ئایــــەتی ﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾ النور: ٣١، فەرمانی بە تۆبەکار کردووە تۆبە بکات لەوەی تێکەڵ بـە تەوبەکەی بووە لە خەوش و خاڵی ئاماژە کردن بە کارە چاکەکانی خۆی و خۆنمـایش کردن و ریایی و رووپامایی.

جیاکردنەوەی "توقییە" لە عیززەت: مەبەست لە تەوبەکردنەکەی خۆپارێزی بێت لـە گوناهـان، ئـەوەش بریتییـە لـە ترسـان لـە خـودا و هەسـتان بـە فەرمانـەکانی و خـۆ دوورخستنەوە لە قەدەغەکراوەکانی، بە گوێڕایەڵی خودا کـار دەکـات لەسـەر نوورێـك کە لە خوداوەیە و مەبەستی پاداشـتێکە لـەلای خودایـە، یـاخیبوون لـە خـودا واز لـێ دەهێنێت لەسـەر نوورێـك کـە لـە خوداوەیـە و لـە سـزای خـودا دەترسـێت، لـە کـارە چاکەکانیدا سەربەرزی دونیـایی مەبەسـت نییـە، گوێڕایـەڵی و تەوبـەکردن سـەربەرزی دەرەکی و ناوەکیان لەگەڵدایە، ئەو مەبەستی بەدەستهێنانی سەربەرزی دونیایی نییە با بشزانێت بەهۆی گوێڕایەڵی و تەوبەکردنەوە ئەو سـەربەرزییە بەدەسـت دێـت، هـەر کەس لە پێناوی سەربەرزی دونیاییدا تەوبەی کردبێت تەوبەکەی تێکەڵە.

زۆرێك لە صادیقان لەم بابەتـەدا حـاڵی دەروونـی خۆیـان لا تێکـەڵ دەبێـت، جگـە لـە ئـەهلی بەصـیرەت کـە دەتـوانن جیـای بکەنـەوە، ئەوانـەش لـەناو صـادیقاندا وەك صادیقان وان لەناو خەڵکیدا.

لەبیرچوونەوەی گوناه و تاوان: ئەمە بابەتێکە جێگەی درێژەپێدانە، پیاوانی رێگە جیاوازیان تیایدا هەیە.

**هەیانە:** وادەبینێت بە تەواوی گوناهەکە لەبیری خۆی بباتەوە و پشتی تێبکات، کاتی پاك و پڕ لە سەفا لەگەڵ خودادا لەپێشترە بۆ تەوبەکار و قازانجی زیاترە لە بیرکردنەوە لە گوناهانی پێشووی خۆی، بۆیە وتراوە: یادکردنەوەی جەفا لە کاتی سەفادا جەفایە.

**هەیانە:** وادەبینێت کە گوناهەکانی خۆی لەبیرنەچێت، بەڵکو بەبەردەوامی لەبەر چاوانی دایانبنێت و هەموو کاتێك سەرنجیان بدات، ئەوەش دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی گەردنکەچی و دڵشکاوی و زەلیلی و چوونە ژێر فەرمانەوە، هەر ئەمەش قازانجترە بۆ کەسی تەوبەکار لە سەفای کاتەکانی.

دەڵێن بۆ ئەم مەبەستە بووە کە پێغەمبەر داوود گوناهەکەی خۆی لەسەر دەستی هەڵکۆڵی بوو، سەیری دەکرد و دەگریا.

**وتوویانە:** هەر کات لە رێگەکە وێڵ بوویت بیر لە گوناهەکانت بکەرەوە دێیەوە سەر رێگە.

**مانای ئەمە:** کاتێك دەگەڕێیەوە بۆ سەرنجی گوناهەکانت گەردن کەچ دەبیت و لە بەردەم خودادا –**عزوجل**– بە ترس و زەلیلی و گەردن کەچییەوە سەرت دادەخەی، ئەمەش رێگەی بەندایەتییە.

**راستییەکەی:** درێژەدان بەم بابەتە، ئەوەیە بوترێت: گەر کەسەکە لە حاڵی سەفادا پەڵە هەوری بانگەشە و هەندێ خۆ لاپەسەندی و لەبیرچوونەوەی منەتی خوایی هەست پێ کرد و نەفسی لە حەقیقەتی هەژاریی دەرگانەی خودا و هەستکردن بە ناتەواویی دووری خستەوە، ئەوا بیرکردنەوە لە گوناهەکانی بۆ ئەو قازانجترە، بەڵام گەر لە حاڵەتی بینینی منەتی خوداییدا بوو، هەروەها لە کەماڵی هەژارییدا بوو بۆ دەرگانەی خودا و بێنیاز نەبوون لە خودا لە گەردیلەیەك لە گەردیلەکانی بوونی، حاڵەتی خۆشەویستی و ئاسوودەیی لەگەڵ خودا و هۆگری بە خودا و شەوق بۆ لیقای ئەو تێکەڵ بە دڵی بووبوو، هەستی بە بەرینی بەزەیی و حیلم و لێبوردەیی خودا دەکرد و نووری ناو و سیفەتەکانی خودا دڵی رۆشن کردبووەوە، ئەوا لەبیرکرنی گوناه و پشتکردن لە رابردووی گوناهاوی باشترە بۆی و سوودی زیاترە، چونکە هەرکات بیر

لەو گوناه و تاوانانە دەكاتەوە ئەو حاڵەتە باشانەی نامێنێت، لە بەرزییەكەوە دادەبەزێت بۆ خوارەوە، لە حاڵێكەوە بۆ حاڵێكی تر كە دووری نێوانیان وەك دووری ئاسمان وایە لە زەوی، ئەمە لە حەسوودی شەیتانە بەو، دەیەوێت لەو پلە و پایە بەرزە و ڕۆیشتنی دڵی لە مەیدانی مەعریفە و خۆشەویستییەوە دابەزێنێت.

**دوای ئەمە:** تەوبە دەكات لە بینینی تەوبەكەی خۆی، ئەو بە منەت و ویستی خودا تەوبەی بەدەست هێناوە، گەر بدرایەتە دەست نەفسی خۆی ئەوا تەوبەی نەدەبینییەوە، گەر وایزانی تەوبەكردنەكەی ئازایەتی خۆیەتی و لە خودی خۆیەوە سەرچاوەی گرتووە و بێئاگابوو لە منەتی خودا لەسەری ئەوا پێویستە تەوبە بكات لە بینینی تەوبە و شەپۆلی بێئاگایی.

لەوانەیە لە تەوبەدا عیللەت و ناتەواوی بوونی هەبێت و ئافەتێك سەریهەڵدابێت ڕێگر بێت لە گەیشتنە كەماڵی تەوبە، لەوانەیە خاوەن تەوبەكە هەست بەم حاڵەتە بكات، یان هەستی پێ نەكات، بۆیە لە ناتەواوی تەوبەكەی و نەدانی حەقی تەوبەكەی با تەوبە بكات، واتە تەوبە لەو بڕە دەكات كە بزر و نادیارە و تەوبەكەی ناتەواو كردووە.

### ۞ حەلیمی دادپەروەر.....سبحانە

وردی نهێنی تەوبە لە سێ شتدایە: ئەو گوناهە بناسێت كە بۆی ڕابووییەوە و لەوێوە مەبەستی خودا بزانێت لە ئەنجامدانی ئەو گوناهە، خودا جڵەوی نەفسی نەگرتی لە ئەنجامدانی گوناهەكە، ئەو-سبحانە- مرۆڤ دەداتە دەست گوناه بۆ دوو مانا:

**یەكەم:** تاكو عیززەتی خودا لە بڕیارەكانی و چاكەی ئەو لە داپۆشینی گوناهەكانی و حیلمی ئەو لە شلكردنی ڕەشوەی كەسەكە بۆ ئەنجامدانی گوناه و بەخشندەیی ئەو لە وەرگرتنی پاساو و بیانوو لە گوناهكاران و فەزڵی ئەو لە لێخۆشبوونی گوناهان بزانێت و بناسێت.

**دووەم:** تاكو بەڵگەی دادپەروەری خۆی لەسەر بەندەكەی بهێنێتەوە و بەو بەڵگانە لەسەر گوناهەكانی سزای بدات.

**درێژەی ئەم بابەتە:** خاوەن ڕۆشنبینی(بەصیرەت) كە هەڵەیەكی لێ دەوەشێتەوە تەماشای پێنج شت دەكات:

**یەکەم:** سەیری ئەمر و نەهی خودایی بکات، لەوێوە دانبنێت بەوەی روویداوە کە هەڵەیە و نەفسی تێبکەیەنێت گوناهی کردووە.

**دووەم:** سەیری بەڵێن و هەڕەشەی خودایی بکات، ئەمەش ترس و بیمی لا دروست دەکات و هانی دەدات شان بداتە ژێر تەوبەکردن.

**سێیەم:** سەیری ئەوە بکات چۆن خودا جڵەوی بۆ شل کرد تاکو ئەو گوناهە ئەنجام بدات، ئەوی دایە دەست گوناه و بڕیاری لەسەردا، گەر بیویستبایە ئەوی لە گوناه دەپاراست، لێرەوە چەندین جۆری مەعریفە بە خودا و ناو و سیفات و حیکمەت و بەزەیی و لێبوردەیی و لێخۆشبوون و حیلم و بەخشندەیی سەرهەڵدەدەن، ئەم مەعریفەیە بەندایەتی بەو ناوە جوانانە لا دروست دەکات کە بەبێ داواکارییەکانیان ئەو بەندایەتییە دەستەبەر نابێت، ئەو کاتە پەیوەندی بوون و بڕیار (الخلق و الأمر) و پاداشت و بەڵێن و هەڕەشە بە ناو و سیفەتەکانی پەی پێ دەبات، ئەمەش داوای ناو و سیفاتی خودای موتەعال و کاریگەرییانە لەسەر بوون، هەر ناو و سیفەتێك داوای شوێنەوار و کاریگەرییەکەی دەکات و پێیەوە گرێدراوە.

ئەم دیمەنە پەلکێشی دەکات بە ناو باخچەیەکی رازاوە لە مەعریفە و باوەڕ و نهێنی قەدەر و حیکمەت کە بەزمان دەربڕینی ئەستەمە.

**هەندێك لەوانە:** تاکو بەندەی خودا عیززەتی ئەو-**سبحانە**- لە کارە بڕاوەکانیدا بناسێت، ئەو-**سبحانە**- "عزیز"ێکە کە هەرچی بوێت بڕیاری لەسەر دەدات، لە کەماڵی عیززەتی ئەوە بڕیار لەسەر بەندەکەی دەردەکات و بەسەریدا جێبەجێی دەکات، بەوەی دڵی وەرگێڕا و ویستی ئاراستەکرد بۆ ئەو شوێنەی دەیەوێت، و جیاوازی خستە نێوان مرۆڤ و دڵی مرۆڤەوە، وای لێکرد ئەوەی بوێت کە خودای عەزیز و حەکیم داوای لێ دەکات، ئەوەش لە کەماڵی عیززەتی خودایە و تەنها ئەوە-**سبحانە**- دەستی بەسەر ئەو کارەدا باڵایە، ئامانجی دروستکراوانی خودا لە تۆدا: ئەوەیە کە دەتوانن جەستە و رووالەتت ئاراستە بکەن، بەڵام لە ناوەوە وات لێبکات ئەو شتەت بوێت کە ئەو-**سبحانە**- دەیەوێت هیچ کەس لە توانایدا نییە جگە لە خاوەن عیززەتێکی سەرسامکەر.

کە بەندە عیززەتی سەردارەکەی خۆی ناسی و بەدڵ سەرنجی دا و توانی بەباشی بیبینێت، ئەوا خەریکبوون بە گەردنکەچی گوناهەوە لەپێشتر و بەسوودترە بۆی، چونکە ئەو کات لەگەڵ خودا دەبێت نەك لەگەڵ دەروونی خۆی.

لە ناسینی عیززەتی خودا لە کارە بڕاوەکانیدا: ئەوەیە بزانێت کە ئەو(بەندە) هەڵسوڕێنراو و ژێردەستەیە و ناوچاوانی بەدەستی کەسێکی ترەوەیە، پاراستنی لە گوناە بە پارێزگاری ئەوەوەیە، سەرکەوتنی بۆ نییە بە کۆمەك و یارمەتی ئەو نەبێت، ئەو کەم و زەلیلە و لەناو دەستی کەسێکدایە کە "عزیز و حمید"ە.

هەروەها لە ناسینی عیززەتی خودا لە کارە بڕاوەکانیدا ئەوەیە: شایەتی بدات کە کەماڵ و ستایش و دەوڵەمەندی تەواو و عیززەت هەر هەموو بۆ خودایە، بەندە لەپێشترە بە کەمتەرخەمی و لۆمەکردن و نەنگی و ستەم و پێویستی، تا بینینی زەلیلی و ناتەواوی و هەژاری زۆرتر و زیاتر بێت بینینی بۆ عیززەت و کەماڵ و ستایش و دەوڵەمەندی خودا زۆرتر دەبێت، بە پێچەوانەوە هەر بەو جۆرە دەبێت، کەمی گوناە و کەمی زەلیلی دیمەنی عیززەتی خودی خۆی(بەندە) دێنێتە پێش چاو.

هەروەها لەوانە: چاکەی خودا ببینێت لە داپۆشینی ئەو لە کاتی ئەنجامدانی گوناهاندا، لەگەڵ کەماڵی بینینی خودا، ئەو–سبحانە– گەر بویستبایە لەناو خەڵکیدا ئاشکرای دەکرد و ئەوانیش لێی دوور دەکەوتنەوە، ئەمە لە کەماڵی چاکەی خودایە، یەکێك لە ناوە جوانەکانی "البر"چاکەکار و چاکەخوازە، ئەم چاکەیە لە خوداوە لەگەڵ کەماڵی بێنیازی لە بەندەکەی و کەماڵی هەژاری بەندەکەی بۆ ئەو–سبحانە– بەندە خەریکی بینینی ئەم منەتە خوادابیە و چاکە و بەخشندەیی خودا دەبێت، بۆیە لە یادی گوناهان بێئاگا دەبێت، تەنها لەگەڵ خودادا دەمێنێتەوە، ئەمە قازانجترە بۆ ئەو لە خەریکبوون و هێنانەوە بەر یادی گوناهەکانی و بینینی زەلیلی یاخیبوونەکانی، خەریك بوون بە خوداوە و بێئاگابوون لە هەموو شتێك جگە لە ئەو بریتییە لە داوای باڵا و مەرامی ئاسۆ دوور.

ئەمە مانای ئەوە نییە بە رەهایی گوناهەکانی خۆی لەبیر بچێتەوە، بەڵکو تەنها لەو حاڵەدا، گەر حاڵەکەی لەبیرچوویەوە با بگەڕێتەوە بۆ سەیرکردنی گوناهەکانی و یادی تاوان و خراپەکانی، بۆ هەر کات و مەقامێك جۆرێك لە بەندایەتی شیاو هەیە.

هەروەها لەوانە: بینینی حیلمی خودا لە مۆڵەتدان بە کەسی خاوەن هەڵە و گوناهان، گەر بویستبایە دەیتوانی سزاکەی بۆ پێش بخات، بەڵام ئەو حەلیمە و پەلە ناکات، ئەمەش ناسینی خودا–سبحانە– و ناسینی ناوی "الحلیم" و بینینی سیفەتی "حیلم"ی دێنێتە پێش چاو و بەو ناوە جوانە بەندایەتی خودا دەکات.

**هەروەها لەوانە:** بەندە بەخشندەیی پەروەردگاری بناسێت لە قبولْ كردنی پاساو و بیانوو لێی كاتێك داوای لێبوردنی لیّ دەكات، ئەو-**سبحانه**- بە بەخشندەیی خۆی بیانووەكەی لیّ قبوولْ دەكات، ئەمەش داوا دەكات بەندە سەرقالْ بێت بە یادی خودا و شوكر كردن و خۆشەویستییەكی تر كە پێشتر بەدەستی نەهێناوە، خۆشەویستیت بۆ كەسێك كە لەسەر چاكەكانت شوكری كردووی و پاداشتی داویتەوە و پاشان لە خراپەكانت بووراوە و بەو تاوانانە نەیگرتووی زۆرتر و زیاترە لە خۆشەویستیت بۆ شوكركردنی چاكەی خودا لەگەلْت بەتەنها، واقیع شاهیدی ئەمە دەدات، بەندایەتی خودا بە تەوبە لە دوای گوناه رەنگێكە و ئەمەش رەنگێكی ترە.

**هەروەها لەوانە:** فەزلّی خودا لە لێخۆشبوونیدا ببینێت، لێخۆش بوون فەزلێكە لە خوداوە، ئەگەر نە، گەر خودا بیەوێت تەنها بە مافەكانی لەسەر تۆ سزات بدات ئەو دادپەروەر و ستایشكراوە و ستەمی لە تۆ نەكردووە، لێبووردنی خودا بە فەزلّی خۆیەتی نەك بە شایستەبوونی تۆ، ئەمەش دیسان داوای شوكر و خۆشەویستی و گەرانەوەی بەردەوام و دلْخۆشی و گەشانەوەت لیّ دەكات، هەروەها داوای ناسینی ناوی "الغفار" و بینینی سیفەتی "الغفران"ت لیّ دەكات تاكو بە مانا و داواكاری ئەو ناوە جوانە بەندایەتی ئەنجام بدەیت، ئەوەش كاملْترین بەندایەتییە لەناو بەندایەتی و خۆشەویستی و مەعریفەدا.

**هەروەها لە حیكمەتەكانی رێگەدان بە گوناه:** تاكو پلەی زەلیلی و گەردنكەچی بۆ خودا و نیشاندانی هەژاری لەبەردەم دەرگانەی خودادا بۆ بەندەكەی كاملْ بكات، نەفس حەزی خۆ بە "پەروەردگارزانین"ی تێدایە، گەر بۆی برەخسێت قسەكەی فیرعەون دووبارە دەكاتەوە، بەلاّم فیرعەون بۆی رەخسا و رایگەیاند و خەلْكانی تر بۆیان نارەخسێت و دەیشارنەوە، لەم حەزی خۆ بە "پەروەردگارزانین"ە رزگاری نابێت بە بەندایەتی نەبێت كە ئەویش چوار ئاستی هەیە:

**ئاستی یەكەم:** هەموو خەلْكی تیایدا بەشدارن، كە بریتییە لە زەلیلی پێویستی و هەژاری بۆ لای خودا، ئەهلی ئاسمانەكان و زەوی هەرهەموو ئاتاجی دەرگانەی ئەون، هەژارن بۆ لای ئەو، ئەو-**سبحانه**- بە تەنها لە هەمووان بێنیازە، هەموو ئەهلی ئاسمانەكان و زەوی داوای لێدەكەن و ئەو داوا لە كەس ناكات.

ئاستی دووەم: گەردنکەچی لە گوێڕایەڵی و بەندایەتیدا کە بریتییە لە گەردنکەچییەك بە ویست و هەڵبژاردنی کەسی بەندە، ئەمەیان تایبەتە بە ئەهلی گوێڕایەڵی خودا کە بریتییە لە نهێنی بەندایەتی.

سێیەم: زەلیلی خۆشەویستی: ئەو کەسەی کەسێکی خۆشدەوێت لە خودی خۆیدا بۆی زەلیل و گەردنکەچە، واتە بە ئەندازەی خۆشەویستییەکەی بۆ ئەو کەسە زەلیل و گەردنکەچ دەبێت، خۆشەویستی لەسەر زەلیلی بۆ مەحبوب دامەزراوە، وەك وتراوە:

**إخضع وذل لمن تحب، فليس في حكم الهوى أنف يشال و يعقد**

ئاستی چوارەم: زەلیلی و گەردنکەچی بەهۆی یاخیبوون و گوناه و تاوانەوە.

گەر ئەم چوار ئاستە پێکەوە کۆبوونەوە ئەوا زەلیلی و گەردنکەچی بۆ خودا کامڵتر و تەواوتر دەبێت، بە هۆی ترس و خۆشەویستی و گەڕانەوە بۆ لای خودا و گوێڕایەڵی و هەژاری بۆی زەلیل و گەردنکەچ دەبێت.

**حەقیقەتی ئەمەش:** بریتییە لەو هەژارییەی کە پیاوانی ڕێگە ئاماژەی پێدەدەن، ئەم مانایە باڵاترە لەوەی پێی بوترێت هەژاری، بەڵکو کرۆك و نهێنی بەندایەتییە، بەدەستهێنانی بەسوودترین شتە بۆ بەندەی خودا و خۆشەویسترین شتە لەلای ئەو-سبحانه-.

**هەروەها لە حیکمەتەکانی ڕێگەدان بە گوناه ئەمەیە کە:** ئاسەوارەکانی ناوە جوانەکانی خودا داوای دەکەن وەك داواکردنی هۆ بۆ ئەنجامەکان، ناوی "الرزاق" داوای "مرزوق"ڕۆزیدراو دەکات، ناوی "الرحيم" داوای "مرحوم"بەزەییپێکراو دەکات، هەر بەو جۆرە ناوی "الغفور، العفو، التواب، الحليم" داوادەکەن کەسانێك بوونیان هەبێت " لێخۆشبوونیان بۆ هەبێت و تەوبەیان لێقبوڵ بکات و لێیان ببوورێ و لەگەڵیان حەلیم بێت"، نابێت ئەم ناو و سیفەتانە پەکیان بخرێت(لەکار بخرێن)، چونکە ناوی جوانن و سیفاتی کەماڵ و شکۆمەندی و کرداری حیکمەت و چاکە و بەخشندەین، دەبێت ئاسەواری ئەم ناوانە لەسەر جیهان دەربکەون، زاناترین کەس بە خودا ئاماژەی بەمە داوە-صلوات الله وسلامه عليه- ((لو لم تذنبوا لذهب الله بكم، ولجاء بقوم يذنبون ثم يستغفرون فيغفر لهم)).

تۆ گەر وادابنێیت گوناه و هەڵە و تاوان لە جیهاندا نەمێنێت، ئەی خودا لە كێ خۆشببێت؟ و لەكێ ببورێت؟ و تەوبە لە كێ قبوولْ بكات و حیلمی بۆ كێ و لەسەر چی هەبێت؟ گەر هەرچی داوا و پێویستییەكانە هەمووی جێبەجێ بكرێت، هەموو بەندەكان دەوڵەمەند و لەشساغ بن، ئیتر داوا و نزا و پاڕانەوە بۆچی بێت؟ ئەو كاتە وەڵامدانەوە و فەزلْ و منەت و تایبەت كردنەوە بە نیعمەت و بەخشش چ مانایەكی دەبێت؟

پاكێتی بۆ ئەو خودایەی خۆی ناساندووە بە بەندەكانی بە چەندین شێوەی خۆناساندن، رێگەی نیشانداون بە چەندین شێوەی رێگە نیشانداندان و هەرچی رێگەی خێرە لە بەردەمیاندا والای كردووە، پاشان راكشانی شاڕێگەی راست و رەوان(**الصراط المستقيم**) لە بەردەمیاندا و ناساندنی پێیان و رێنمایی كردنیان بۆ سەری ﴿لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٍ وَيَحْيَىٰ مَنْ حَىَّ عَنۢ بَيِّنَةٍ ۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٤٢﴾﴾ الأنفال: ٤٢

۞ **رەحیم..............سبحانه**

**هەروەها لە حیكمەتەكانی:** مەزنترین نهێنی كە دەربڕین ناچێتە ناویەوە و ئاماژە بوێری نییە بۆی و بانگكەری باوەڕ لەسەر سەری گەواهیدەرەكانەوە بانگی لێ ناكات، بەڵكو تەنها دڵی بەندە تایبەتەكانی خودا دەیبینن، پەیبردن بەو نهێنییە ناسینی خودا و خۆشەویستی بۆی زیاد دەكات، هەر بەو جۆرە دڵنیایی بە خوداوە و شەوق بۆ لای ئەو و پاراوبوونی زمان بە یادی و بینینی چاكە و لوتف و بەخشندەیی و ئیحسانی و سەرنجی نهێنی بەندایەتی و تەماشای خواوەندی خودا زیاد دەكات، ئەوەش ئەوەیە كە لە سەحیحی "البخاري ومسلم"دا هاتووە، لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە -رەزای خودای لێ بێت- فەرمووی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی ((**لله أفرح بتوبة عبده -حين يتوب إليه- من أحدكم، كان على راحلة بأرض فلاة، فانفلتت منه، وعليها طعامه وشرابه، فأيس منها، فأتى شجرة فاضطجع في ظلها قد أيس من راحلته، فبينما هو كذالك إذ هو بها قائمة عنده، فاخذ بخطامها، ثم قال: -من شدة الفرح- اللهم انت عبدي وأنا ربك، أخطا من شدة الفرح**)) ئەمە فەرموودەی بە "لفظ"ی مسلم هاتووە.

مەبەست: ئەم دڵخۆش بوونە تایبەتمەندییەکی هەیە کە نابێت بەندە پشتگوێی بخات و پشتی تێ بکات، هیچ کەس پەی پێ نابات ئەوانە نەبێت کە ناسینی تایبەتیان هەیە بە خودا و ناو و سیفات و ئەوەی شایستەی شکۆی ئەوە.

خودا -سبحانه- رەگەزی مرۆڤی لەنێوان دروستکراوەکانیدا تایبەت کردووە، بەوەی رێزی لێناوە و بەرزی کردۆتەوە و شەرەفی پێ بەخشیوە و بۆ خودی خۆی دروستی کردوون و هەرچی شتە بۆ خاتری ئەوان بەدیهێناوە و رامیکردوون و لە خزمەتی ئەواندایە، مرۆڤی تایبەت کردووە بە ناسین و خۆشەویستی و نزیکی لە خودا و رێزلێنانی کە بە هیچ کەسێکی تری نەداوە، لەپێناوی مرۆڤدا ئاسمان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە موسەخەری کردووە، تەنانەت فریشتەکانی -کە ئەهلی نزیکیی خودان- بەکاریهێناون بۆ مرۆڤ، کردوونی بە پارێزەر لە کاتی خەو و ئاگاهی و سەفەر و نیشتەجێبوونیان، کتێبەکانی بە ئەواندا بۆ سەر مرۆڤ دابەزاندووە، پێغەمبەرانی لە مرۆڤ بۆ مرۆڤ رەوانە کردووە، ئاخافتنی لەگەڵ کردووە راستەوخۆ لە خوداوە بۆ ئەو، "خەلیل و کەلیم"ی لێ هەڵبژاردوون، دۆستان و تایبەتان و هەڵبژێراوانی لێ دیاری کردوون، ئەوانی کردووە بە کانزای نهێنی خۆی و جێگەی خۆشەویستی تایبەتی، بەهەشت و دۆزەخی بۆ دروست کردوون، خولگەی بوون و بریار(خەلق و ئەمر)، و پاداشت و سزا لەسەر رەگەزی مرۆیی دامەزراوە، مرۆڤ پوختەی بوونەوەرە، ئەو کەسەیە تایبەت کراوە بە ئەمر و نەهی و لەسەر ئەو ئەمر و نەهییەش پاداشت و سزا دامەزراوە.

مرۆڤ شان و شکۆیەکی هەیە کە دروستکراوەکانی تر نییانە، باوکی مرۆڤی بەدەستی خۆی دروست کردووە، رۆحی خۆی بە بەردا کردووە، سوژدەی بە فریشتەکان بۆ مرۆڤ بردووە، ناوی هەموو شتەکانی فێرکردووە، لای فریشتەکان گەورەیی مرۆڤی دەرخستووە و هەر بەو جۆرە دەرخستنی گەورەیی مرۆڤ لەلای ئەوانەش لە خوار مرۆڤەوەن لە دروستکراوەکانی تر، ئیبلیسی لە نزیکی خۆی دەرکردووە و لە دەرگای خۆی وێڵی کردووە، چونکە لەگەڵ سوژدەبەران سوژدەی بۆ ئادەم نەبرد، خودای موتەعال بەهۆی ئەو سەرپێچییەوە شەیتانی کرد بە دوژمنی خۆی.

**باوەڕدار لە رەگەزی مرۆڤە:** بەڕەهایی باشترین دروستکراوی خودایە، خێرترین بەندەی خودایە لە جیهانەکاندا، ئەوی دروستکردووە تاکو نیعمەتی خۆیی لەسەر تەواو بکات و چاکەکانی بەبەردەوام بۆ رەوانە بکات، بۆ ئەوەی بە فەزڵ و رێز و

بەخشینێك تایبەتی بكات تەنانەت ئاواتەكانی مرۆڤ پێی نەگەیشتبن، بە خەیاڵیدا نەهاتبێت و هەستی پێ نەكردبێت، تاكو بەخششە شاراوە و دیارەكان و كاتی و هەمیشەییەكان لە خودا داوا بكات كە بە خۆشەویستی نەبێت بەدەست نایەن، خۆشەویستیش بەدەست نایەت بە گوێڕایەڵی و هەڵبژاردنی خودا نەبێت بەسەر شتاكانی تردا، مرۆڤی كردووە بە خۆشەویستی خۆی، باشترین شتێك كە خۆشەویست و بەخشندەی بەتوانا ئامادەی دەكات ئەو ‒سبحانه‒ بۆ مرۆڤی ئامادە كردووە كاتێك دەبێت بە میوانی خودا، پەیمانێكی لەگەڵ بەستووە كە ئەمر و نەهی خۆی تیا تۆمار كردووە و ئاگاداری كردووە لەو شتانەی لە خودا نزیكی دەكاتەوە و خۆشەویستی و ڕێزی بۆ زیاد دەكات، هەروەها ئەو شتانەی دووری دەخاتەوە و ڕووبەڕووی تووڕەبوونی خودای دەكاتەوە و لەبەرچاوی خودای دەخات.

بۆ خۆشەویست دوژمن هەیە، كە بێزراوترین دروستكراوی خودایە، دوژمنایەتی خۆی بۆ ئاشكرا كردووە و فەرمانی بە بەندەكانی خودا كردووە كە ئایین و گوێڕایەڵی و پەرسش و بەندایەتییان بۆ ئەو بێت ‒نەفرەتی خودای لێ بێت‒ داوای لێكردوون بەندایەتی خودای حەق و پەرستراوی حەق نەكەن، بەشێك لە بەندەكانی خوای بۆ خۆی بڕیوە، حیزبێكی لێ دروست كردوون، پشتیان لە پەروەردگاریان كردووە و لێی بەدوورن، لەپاڵ ئەم دوژمنەدا بوون بە دوژمنی خودا، بانگ بۆ خەشم و تووڕەیی خودا دەكەن، تانە لە پەروەردگاریی و خواوەندی و یەكتایی خودا دەدەن، جنێوی پێدەدەن و بەدرۆی دەزانن، دۆستانی خودا تووشی فیتنە دەكەن و بە چەندین شێوە ئازاریان دەدەن، دەكۆشن تاكو بوونیان نەهێڵن و دەوڵەتی شەیتان دابمەزرێنن، دەیانەوێت هەرچی خودا خۆشی دەوێت و پێی ڕازییە بیسڕنەوە و بیگۆڕن بە شتێك كە خودا پێی ناخۆشە و لای ناپەسەندە، خودا ئەم دوژمنە و ڕێگاكانی و كارو كردەوەكانی و ئەوەی بەدەستییەوەیە بە مرۆڤی ناساندووە، ئاگاداری كردووین لە خۆ ڕادەستكردن و چوونە ناو حیزبەكەی و ژیان و هاودەمی لەگەڵی.

لەو پەیمانەدا بە مرۆڤی ڕاگەیاندووە: كە ئەو ‒سبحانه‒ لە هەموو كەس بەخشندەترە، ڕێزدارترین ڕێزدارە، بەبەزەییترین خاوەن بەزەییە، بەزەییەكەی پێش تووڕەبوونی كەوتووە، حیلمی پێش سزای كەوتووە، لێبوردنی پێش تۆڵە لێكردنەوە كەوتووە، نیعمەتی بەسەر دروستكراوەكانیدا داباراندووە، بەزەیی لەسەر خۆی نووسیوە، خودا

خۆشی دێت لـە چاكە و بەخشـندەیی و بەخشـش، هـەموو فـەزڵێك بەدەسـت خۆیـەتی، هەموو خێرێك لە خوداوەیە، بەخشین هەموو بۆ ئـەوە، خۆشەویسـترین شـت لـەلای: بـە بەندەكانی ببەخشێت و چاكەیان بـۆ فـراوان بكـات و لـەناو ئیحسـان و بەخششـی خۆیـدا نوقمیان بكات، و نیعمەتی خـۆی لەسـەریان تـەواو بكـات، و منـەتی خـۆی بەسـەریانەوە چەند بارە بكات، و بە ناو و سیفەتەكانی خۆی بە بەندەكانی بناسێنێت، و بـە نیعمـەت و بەهرەكانی خۆی لایان شیرین و خۆشەویست بكات.

ئەو لە خودی خۆیدا بەخشندەیە، بوونی هەرچی بەخشندەییە خودا دروستی كردبێـت و خودا دروستی بكات كەمترە لە گەریدەلەیەك بە بەراورد لەگەڵ بەخشندەیی خـودای موتەعال، بەخشندەی رەها و تەواو هەر بـۆ خۆیـەتی، خۆشەویسـتی خـودا بـۆ چـاكە لەگەڵ كردن و نیعمەت پێدان لەسەرو بیری مرۆڤ و ئەندێشەی مرۆڤەوەیـە، خۆشـحاڵی خـودا بەبەخشـین و پێـدان زۆرتـر و زیـاترە لـە خۆشـحاڵی ئەوانـەی چـاكەیان لەگـەڵ دەكرێ و بەخششەكە وەردەگرن، كامەیان ئاتاجتر بن بە دەرگـای ئـەو لـە هـەموویان قەدر و حورمەتی زیاترە، گەر پێویستیی زۆر و مەزنیی قەدری پێدانەكـە و سـوود لـێ بینینی نیعمەتەكە هەر سێ كۆبوونەوە، دەبـێ خۆشـحاڵی ئـەو كەسـە چـۆن بێـت كـە نیعمەتەكەی بەخشیوە؟ خۆشحاڵبوونی خودا—**سبحانە**— بـە بەخشـین و پێـدان زۆرتـر و زیـاترە لـە خۆشـحاڵی ئـەو كەسـەی كـە وەریـدەگرێت، نموونـەی بـەرز و بڵنـد هـەر بۆ خودایە، خۆشحاڵبوون بە بەخشین سروشتی كەسی بەخشندەیە لەناو خەڵكیدا، ئەو كـە دەبەخشـێت خۆشـی و سـرووری بـۆ دروسـت دەبێـت و گەشـانەوە و چـێژی بـە بەخشینەكەی لەلا گەلاڵە دەبێت زیاتر لەو كەسەی كە پێـی دەبەخشـێت و بەخششـەكە وەردەگرێت، بەڵام كەسی وەرگر لە وەرگرتنەكەی خۆیدا نوقم بووە و ئاگـای لـە چـێژ و خۆشـی و سـروور و گەشـانەوەی كەسـی بەخشـندە نییـە، ئەمـە و مرۆڤـی بەخشـندە پێویستی و هەژاری بۆ ئەو شتە هەیە كە بەخشیویەتی و دڵنیا نییە لـەوەی بـە شـتێكی تر گەورەتر یـان بچـووكتر لـەوەی بەخشـیویەتی جێگـەی بگیرێتـەوە، هـەروەها ترسـی پێویستی بۆ ئەو شتەی بەخشراوە و ئەگەری ئەوەی ئەمیش رووبەڕووی زەلیلی هەژاری و نەبوونی ببێتەوە بۆ ئەو شتە یان بۆ شتێكی خوارتر لەوە، لەگەڵ ئەمانەشدا سروشتی دەروونی مرۆڤ بـە هەڵپـە و ژەنـگ و ژار نـەقش كـراوە، كەچـی لـەكاتی بەخشـیندا بـەو ئەندازەیە دڵخۆش دەبێت و سروور رووی تێدەكات.

ئەی دەبێ گومان چۆن بێت بە کەسێك کە پاکتر و پیرۆزترە لە هەموو ئەو شتانەی سیفەتی مرۆڤن؟ گەر ئەهلی ئاسمانەکان و زەوی و یەکەمین دروستکراو تا دواهەمین دروستکراو و ئینس و جین و تەڕ و وشك و هەر هەموو لە یەك شوێندا کۆببوونەوە و داوایان لێکرد ئەوا بەخشین و پێدانی هەر یەك لەوانە گەردیلەیەك لە خەزێنەی ئەو کەم ناکاتەوە.

ئەو لە خودی خۆیدا بەخشندەیە، وەکو چۆن لە خودی خۆیدا زیندووە و زانایە و بیسەر و بینەرە، بەخشندەیی لە سیفەتەکانی خودی خۆیەتی-سبحانە- لێبوردنی لە تۆڵە پێخۆشترە، بەزەیی لە سزادان لا خۆشەویسترە، مامەڵەکردن بە چاکەی لە مامەڵەکردن بە دادپەروەری پێ باشترە، بەخشینی لە لێگرتنەوە پێخۆشترە.

گەر بەندەکەی و خۆشەویستەکەی کە بۆ خۆی دروستی کردووە و چەندین جۆر ڕێز و بەخشینی پێداوە و ڕێزی داوە بەسەر هەموو دروستکراوەکانی تردا و کردوویەتی بە جێگەی ناسینی خۆی و کتێبی بۆ دابەزاندووە و پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە کردووە، سەرپەرشتی کاروبارەکانی دەکات و پشتگوێی ناخات و هەر وا دەستی لێ بەرنادا و وێڵی ناکات، گەر ئەم بەندەیە ڕووبەڕووی خەشمی خودا بوویەوە و هەڵە و تاوانی گەورەی لێوەشایەوە و ئەوەی خودا لای پەسەند نەبوو ئەنجامی دا و لە سەردارەکەی هەڵهات و چووە ڕیزی دوژمنی خوداوە و بوو بە پێڕی ئەو و دژ بە خودا پشتیوانی ئەو دوژمنەی کرد و دایە پاڵی و ڕێگەی نیعمەتەکان و چاکەی خودای نەگرتەبەر کە خۆشەویسترین شت بوو لەلای ئەو-سبحانە- و دەرگای سزا و خەشم و تۆڵەی بە ڕووی خۆیدا کردەوە، ئەوە داوای لە خودای بەخشندە کردووە شتێکی پێ ببەخشێت پێچەوانەی چاکە و بەخشین بێت و خۆی خستۆتە بەر تووڕەیی و خەشم و ڕق و تۆڵەی خوداییەوە، بە گوناهەکانی داوای شتێکی کرد لە خودا کە پێچەوانەی پێویستی زاتی خودای موتەعال بوو لە بەخشندەیی و چاکە.

ئەمە جێگەی ئەو باسە بەناوبانگەیە کە لە هەندێ عاریفانەوە دەیگێڕنەوە: لە کۆڵانێکدا دەرگایەکی بینی کرایەوە و منداڵێکی لێهاتە دەرەوە و هانای دەبرد و دەگریا، دایکی بەدوایدا رایدەکرد، منداڵەکە لەدەستی دەرچوو و دایکی گەڕایەوە ژوورەوە و دەرگاکەی بەدوای منداڵەکەدا داخست، منداڵەکە هەندێ دوورکەوتەوە و پاشان وەستا و کەمێك

بیری کردەوە، هیچ جێگەیەکی شك نەبرد بۆی بچێت جگە لەوماڵەی لێی هەڵهاتبوو، کەسی شك نەبرد بیگرێتە خۆی جگە لە دایکی، بۆیە بەدڵشکاوی و خەمبارییەوە گەڕایەوە بۆ بەر دەرگای ماڵەکە، بینی دەرگاکە داخراوە، لەبەردەم دەرگاکە راکشا و رووی نایە سەر چوارچێوەی دەرگاکە و خەوی لێکەوت، دایکی هاتە دەرەوە کە بینی لەو حاڵەدایە خۆی پێ نەگیرا و باوەشی پیا کرد، لەئامێزی گرت و ماچی دەکرد و دەگریا و دەیوت: رۆڵە گیان، بۆ کوێ هەڵدێیت لەدەستم؟ جگە لە من کێ داڵدەت دەدات؟ پێم نەوتی بەگوێم بکە و سەرپێچی مەکە، بە سەرپێچییەکانت وام لێ مەکە پێچەوانەی ئەوە لەگەڵت بجووڵێمەوە کە لەسەری بارهاتووم لە بەزەیی و سۆز و میهر بۆ تۆ و ویستی خێرم بۆت؟ پاشان پەلی گرت و بردییە ژوورەوە.

بیر لەم بەشەی قسەی دایکەکە بکەرەوە "وام لێ مەکە پێچەوانەی ئەوە لەگەڵت بجووڵێمەوە کە لەسەری بارهاتووم لە بەزەیی و سۆز و میهر"، لە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) تێڕابمێنە ((لله أرحم بعباده من الوالدة بولدها))، بەزەیی دایك لە کوێ و بەزەیی خودا لە کوێ کە هەموو شتێکی گرتۆتەوە؟

کاتێك بەندەکەی بە یاخیبوونەکانی خودای تووڕە کرد ئەوا ئەو بەزەییە لەسەر خۆی لادەدات، گەر تەوبەی کرد و گەڕایەوە بۆ لای خودا ئەوا داوای ئەوەی کردووە کە شایستەیەتی و لەپێشترە بۆی.

ئەمە پوختەیەکە نهێنی خۆشحاڵی خودا بە تەوبەی بەندەکەی دەخاتە پێش چاوت کە مەزنتر و گەورەترە لەو کەسەی وڵاخەکەی لە زەوی تیاچووندا گەڕایەوە بۆ لای دوای بێهیوابوون لە گەڕانەوەی، ئەمە و گەر سەرنجی وابەستەبوونی فەرەحی خودایی بدەی بە ئیحسان و بەخشین و چاکەی مەزنی.

بەڵام گەر سەرنجی وابەستەبوونی فەرەحی خودا بدەی لە رووگەی خواوەندی و بەوەی پەرستراوێکی حەقە: ئەوە دیمەنێکە مەزنتر و بالاترە لەوەی پێشوو، تەنها تایبەتمەندان لە خۆشەویستان هەستی پێ دەکەن و دەیبینن.

خودا-سبحانە- دروستکراوەکانی بۆ بەندایەتی دروست کردووە، عیبادەت کۆکەرەوەی خۆشەویستی و زەلیلی و گەردنکەچی و گوێڕایەڵییە بۆ خودا، ئەمە ئەو حەقەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لەسەر دروستکراوە و ئامانجی بوون و بڕیارە،

خـودا-سـبحانه- پێیخۆشـه بپەرسـترێ و گوێڕایـەڵی لـێ بکرێـت، بـاکێکی بـه دروستکراوەکانی نییە گەر خۆشەویستی ئەوان و گوێڕایەڵییان و داوا و نزایان نەبوایە.
خودا بانگەشەی ئەوانە ڕەد دەکاتەوە کە پێیان وایە بۆ شتێکی تر دروستکراون، گـەر ئـەوان بـۆ بەندایـەتی و یەکتاپەرسـتی و گوێڕایـەڵی خـۆی دروسـتنەکردبایە ئـەوا دروستکردنەکەیان پووچ و بێمانا دەردەچوو، ئەمەش لە سیفەتی "أحكم الحاكمين" و خـودای حـەق بـەدوورە، گـەر بەنـدە دەرچـوو لـەوەی لـە پێناویـدا دروسـتکراوە لـە گوێڕایەڵی و بەندایەتی ئـەوا ئـەو کەسـە لـە باشـترین شـت لـەلای خـودا و ئـەوەی لـە پێناویدا دروستکراوە دەرچـووە، وای لـێ دێـت وەك ئـەوەی هـەروا و بـەبێ مەبەسـت دروست کرابێت، چونکە زەوییەکەی ئەو تۆوەی سەوز نەکرد پیایـدا وەشـابوو، بـەڵکو تۆوەکـەی گـۆڕی بـۆ دڕك و داڵ، گـەر پێداچـوونەوە بکـات بـەوەی لـە پێناویـدا دروستکراوە ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو مەبەست و مەرامەی کە خۆشەویسترین شتە لای دروسـتکەر و بەدیهێنـەر، دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو حیکمەتـەی لـە پێناویـدا خولقـاوە و سـەرئەنجام لـە مانـای پووچـی و بـێ مەبەسـتی دێتـە دەرەوە، خۆشەویسـتی پەروەردگار بۆی زیاد دەبێت، چونکە خـودا تەوبـەکاران و پاکـانی خۆشـدەوێت، ئـەو خۆشەویسـتییە خۆشـحاڵییەك بەرهـەم دێنێـت کـە مـەزنترین فەرەحـە، گـەر خۆشحاڵییەکی تری بینراو لەم جیهانەدا هەبوایـە ئـەوا پێغەمبـەر(ﷺ) باسـی دەکـرد، بەڵام خۆشحاڵییەك مەزنتر لە خۆشحاڵی ئەو پیاوە کە وڵاخەکەی دەبینێتـەوە و ژیـان و هۆکاری سەفەرەکەی بۆ دەگەڕێتەوە بوونی نییە دوای بێهیوابـوون لـە هۆکارەکـانی ژیان. ئەمە نموونەی زۆری فەرەحی خودایی و خۆشەویستییە بۆ تەوبـەکارێك کـە بـۆ لای خودا دەگەڕێتەوە کاتێك بەندەکەی بزر دەبێت و پاشـان دەیدۆزێتـەوە و دێتـەوە بەردەستی، هیچ خۆشحاڵییەك لەلای خودا لەو خۆشحاڵییە مەزنتر نییە.
چۆن بیر دەکەیەوە لە مرۆڤێك کە زۆرت خۆشدەوێت، دوژمنەکەت ئەوی بەدیل گرتـووە و تۆی لەو دابڕیوە، تۆ دەزانێـت دوژمـن چ ئـازارێکی دەرخـوارد دەدات و بەچـەندین ڕێگـە دەیەوێت ڕووبەڕووی تیاچوونی بکاتەوە، تۆ نزیکترین کەسی لە ئەو، ئەو نەمامی نێژراو و بەرهـەمی پـەروەردەی تۆیـە، پاشـان لەدەسـتی دوژمنەکـەی هـەڵهاتووە و ڕووی لـە دەرگاکەت کردووە، لێت دەپاڕێتەوە و داوای ڕەزامەندی و کۆمەکیت لێدەکات، ڕوومـەتی ناوە بە چوارچێوەی دەرگاکەتەوە، دەبێ دڵخۆشبوونی تۆ بەو هەڵوێستەی ئـەو چـۆن و

چەند بێت؟ ئەوت تایبەت کردووە بە خۆت و کردووتە بە نزیکان لە خۆت و هەڵتبـژاردووە بەسەر کەسانی تردا؟

ئەمە هێشتا وەك ئەوە نییە کە بەدیتهێنابێت و دروستت کردبێـت و نیعمەتـەکانی خۆتـت بەسـەردا دابارنـدبێت، خـودا –عزوجـل– هـەر بـۆ خۆیـەتی بەندەکـەی بـەدیهێناوە و دروستیکردووە و نیعمەتەکانی خۆی بەسـەردا دابارانـدووە، ئـەو –سبحانه– پێـی خۆشـە نیعمەتەکانی لەسەر تەواو بکات، بەندەکەی ببێت بە دەرکەوتەی نیعمـەتی خـودا، باسـی نیعمەتەکە بکات و شـوکری بکـا و خـاوەن نیعمـەتی خۆشـبوێ و بۆی گوێڕایـەڵ بێـت و بەندایەتی ئەو بکات و دوژمنی دوژمنەکەی خودا بێت و رقی لێی بێت و لێی یاخی ببێـت، خودا پێیخۆشە دوژمنایەتی دوژمنەکەی بکرێت و سەرپێچی فەرمانـەکانی بکرێـت، وەك چـۆن پێـی خۆشـە گوێڕایـەڵی پـەروەردگاریان بکـەن و بەندایـەتی بـۆ ئـەنجام بـدەن، خۆشەویستی بۆ بەندەکەی بەهۆی خۆشەویستن و گوێڕایەڵی و گەڕانەوە بۆ لای دەخرێتە سەر خۆشەویستی بۆی بەهۆی دوژمنایەتی کردنی دوژمنەکەی خودا و سەرپێچی کردنـی و نەچوونە ژێر فەرمانەکانییەوە، بۆیە خۆشەویستی لەلای خـوداوە بـۆ ئـەو بەندەیـە زۆر دەبێت لەگەڵ بەدەستهێنانی مەحبووبەکەی، ئەمەش حەقیقەتی خۆشحاڵبوونە.

لە سیفەتی پێغەمبەر(ﷺ) لە هەندێ کتێبی پێشواندا ((ئەو بەندەیەی کە نەفسم پێـی خۆشـحاڵ دەبێـت))، ئەمـە لـە کـەماڵی خۆشەویسـتی خوداوەیـە بـۆ پێغەمبـەر، وای کردووە نەفسی خۆی –سبحانه– بەو پێغەمبەرە خۆشحاڵ بێت.

### ۞ لەگەڵ دڵخۆشیدا.... پێکەنینیش

لەمەوە "پێکەنینی" خودا –سبحانه– بەدەم بەندەکەیەوە کاتێك لـە مەیدانی بەندایەتیـدا مـەزنترین کـار ئـەنجام دەدات، خـودا بـە خۆشـحاڵبوون و رەزامەنـدی لـە بەندەکـەی بـە دەمیەوە پێدەکەنێت، خودا پێدەکەنێت بەدەم ئەو بەندەیەوە کە لەسەر جێگەی نووستن –لەلای هاوسەرەکەی– راست دەبێتەوە و قورئان دەخوێنێت و لەبەر خودا دەپاڕێتەوە.

هـــەروەها خـــودا پێدەکـــەنێت بـــەدەم پیاوێکـــەوە هاوەڵـــەکانی هـــەڵهاتوون لـــە رووبەڕووبوونەوەی دوژمن، ئەو روویان تێدەکات و خـۆی بـە خـودا دەفرۆشـێت و سـنگی دەکاتە چەکی دەستیان و لە پێناوی خۆشەویستی و رەزامەندی خودادا شەهید دەبێت.

پێدەكەنێت بەدەم كەسێكەوە كە خێری خۆی لە هاوەڵەكانی دەشارێتەوە، داواكەرێك داوای خێری لێكردن، هاوەڵەكانی پشتیان تێكرد و هیچیان پێنەدا، ئەو خۆی دواخست لە هاوەڵەكانی و بەنهێنی خێری پێكرد، جگە لە خودا كەس پێی نەزانی، ئەم پێكەنینە خۆشەویستی خودایە بۆ ئەو و خۆشحاڵییە بە كارەكەی، هەر بەو جۆرە لە رۆژی دواییدا كاتێك شەهید بە خزمەتی خودا دەگات، خودا بەڕوویەوە پێدەكەنێت و خۆشحاڵە بە هاتن بۆ لای.

ئەوە "خۆشحاڵییەكە" وەك هیچ شتێكی تر نییە، و پێكەنینێكە هیچ شتێك وەك ئەوە نییە، باوەڕمان بە هەردووكیان (خۆشحاڵی و پێكەنین) هەیە چونكە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتوون، وەك باوەڕمان بە هەموو سیفاتەكانی خودا كە دەقەكان جێگیریان كردووە.

## ۞ سزادان دوای بەڵگە هێنانەوە و بیانوو بڕینە

ئەوەی كە خودا-عزوجل- مرۆڤی داوەتە دەست گوناه تاكو بەڵگەی دادپەروەرانەی لەسەر ساغ بكاتەوە و پاشان لەسەر گوناهەكانی بەو بەڵگانە سزای بدات، ناوەڕۆكەكەی ئەوەیە كە داننانی بەندە بەوەی خودا بە ئەنجامدانی ئەو گوناهانە دەیەوێت بەڵگەی لەسەر ساغ بكاتەوە، ئەم داننانەش لە پێویستییەكانی باوەڕە، گوێڕایەڵ بێت یان یاخی، ساغبوونەوەی بەڵگەی خودا لەسەر بەندەكەی بە ناردنی پێغەمبەر و دابەزاندنی قورئان و گەیشتنی هەموو ئەوانە بە ئەو و بوونی زانست پێیان، بیزانێت یان نەیزانێت، هەر كەس توانی فرمانی خودا جێبەجێ بكات و لە قەدەغەكراوەكانی دوور بكەوێتەوە، بەڵام وای نەكرد و كەمتەرخەمی نواند و نەیویست بیانزانێت ئەو كەسە بەڵگەی خودایی بەسەردا جێبەجێكراوە و بیانووی براوە، خودا كەس سزا نادات لەدوای بڕینی بەڵگە و بیانوو نەبێت، گەر لەسەر گوناهەكەی سزای بدات بە بەڵگە هێنانەوە لەسەری سزای دەدات ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾ الإسراء: ١٥ ﴿كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ﴿٨﴾ قَالُوا بَلَىٰ قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ كَبِيرٍ ﴿٩﴾﴾ الملك: ٨ – ٩ ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ الْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ ﴿١١٧﴾﴾ هود: ١١٧، لەسەر ئەم ئایەتەی دوایی دوو قسە هەیە:

یەكەم، خودا ئـەوانی بـەرباد نـەكرد بـەهۆی سـتەمێكەوە ئـەنجامیان دابێـت، دووەم، خودا بە ستەم ئەوانی تیا نەبرد، واتە خودا ستەمی لێنەكردن، ماناكەی لەسەر **قسەی یەكەم:** خودا ئـەوانی بـەرباد نـەكرد بـەهۆی سـتەمێكەوە پێشـتر ئـەنجامیان دابێـت و ئێستا ئەهلی چاكە و چاكسازی بن، واتە ئەوان دوای ئەوەی چاكەیان كرد و تەوبـەیان كرد بەهۆی ستەمەكانی پێشوویانەوە خودا بەربادی نەكردن.

**لەسەر قسەی دووەم:** خودا لە تیابردن و بەرباد كردنی ئەوانەدا ستەمكار نەبوو، خودا ئەوانی تیانەبرد لە كاتێكدا ئەوان چاكەكار بـوون، بـەڵكو ئـەوانی تیـابرد لەبەرئـەوەی ستەمكاربوون، ئـەوان بـە سەرپێچیكردنەكەیان سـتەمكار بـوون، ئـەو لـە تیابردنیـان دادپــەروەر بـوو، هــەردوو قســەكە لــە ئایەتەكــەی ســورەتی "الأنعــام"دا ئامــاژەی پێــدراوە﴿ ذَٰلِكَ أَن لَّمْ يَكُن رَّبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا غَافِلُونَ ﴿١٣١﴾ ﴾ الأنعــام: ١٣١، هــەروەها ئایــەتی﴿ وَمَا عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ وَمَا يَنبَغِي لَهُ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْآنٌ مُّبِينٌ ﴿٦٩﴾ لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيًّا وَيَحِقَّ الْقَوْلُ عَلَى الْكَافِرِينَ ﴿٧٠﴾ ﴾ یس: ٦٩ – ٧٠

خودا–**سبحانە**– رایگەیاند كە خەڵكی دوو بەشن: زیندوو و شایستە بە سوودبینین، لـە هەڕەشـە و ترسـان تێـدەگات و قبـوڵی دەكـات، لەگـەڵ مردوویـەك كـە هەڕەشـە و ئاگاداركردنەوە وەرناگرێت و سوودی لـێ نابینێـت، چـونكە زەویەكـەی بەفـەڕ نییـە و ئامادەیی خێری تێدا نییە، بۆیە بڕیاری سزا دەسەپێت بەسەریدا، سزادانەكەشی دوای بیانووبڕین و خستنەڕووی بەڵگـە و نیشـانەیە، نـەك تـەنها بـەهۆی ئـەوەی شایسـتەی هیدایەت و باوەڕ نییە، بـەڵكو لەبـەر ئـەوەی شایسـتە نییـە و پێـی هەڵناسێت، دوای هاتنی بەڵگەی پێغەمبەر ناشایستەبوونەكەی دەردەكەوێت، چونكە گەر سزای بدابایـە تـەنها بـەوەی شایسـتە نییـە ئـەوا دەیـوت: گـەر پێغەمبـەرێك لـەلای تـۆوە بهاتبایـە فەرمانەكانی تۆم جێبـەجێ دەكـرد، بۆیـە پێغەمبـەری بـۆ رەوانـە كـردووە، فـەرمانی پێكردووە و رێگری لێكردووە،ئەو لە پێغەمبەرەكە یاخی بوو بـەهۆی ناشایسـتەبوونی بـۆ هیدایـەت، سـزا درا لەبـەر ئـەوەی كـاری هیدایـەت و بـاوەڕی جێبـەجێ نـەكرد، و سەرئەنجام بڕیاری خودای بەسەردا سەپا، ئـەو بـاوەڕ ناهێنێـت بـا پێغەمبەریشـی بـۆ رەوانە بكرێت، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ كَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى الَّذِينَ فَسَقُوا

أَنَّهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾﴾ یونس: ٣٣، سزا سەپا بەسەریدا﴿ وَكَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّهُمْ أَصْحَابُ النَّارِ ﴿٦﴾﴾ غافر: ٦

ئەو كەلیمەی بەسەریدا جێبەجێ بوو دوو كەلیمە بوو: كەلیمەی گومڕابوون و كەلیمەی سزادان، وەك دەفەرموێت ﴿ وَلَٰكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ الْعَذَابِ عَلَى الْكَافِرِينَ ﴿٧١﴾﴾ الزمر: ٧١، كەلیمەی خودا بە سزادان سەپا بەسەریاندا، ئەوەش بەهۆی بێباوەڕییانەوە، بۆیە كەلیمەی بەڵگە بەسەریاندا یەكلابوویەوە و دواتریش كەلیمەی دادپەروەری خودایی سزایدان.

**پوختەی هەموو ئەمەی وترا:** خودا-سبحانە- فەرمانی بە بەندەكانی كردووە لەگەڵ ویستی ئاینیی خودادابن، نەك لەگەڵ ویستی خودی خۆیاندا بن، لەگەڵ ئاگاهی بە مردنی دڵی هەندێكیان، ئەهلی گوێڕایەڵی خودا ویستی خودایان هەڵبژارد بەسەر ویستی خۆیاندا بۆیە شایستەی ڕێزلێنان بوون، ئەهلی یاخیبوونیش ویستی خۆیان سەرخست بەسەر ویستی خودادا بە یاخیبوونەكەیان بەڵگەی دادپەروەری خودا سەپێنرا و بە ستەمەكانیان سزای دان.

### ۞ دەروونێكی پڕ لە نەنگی......... پەروەردگارێكی چاكەكار

باسی ئەوەمان كرد بەندە لەناو گوناهدا چوار شتی بۆ هەیە:

**یەكەم:** سەیری ئەمر و نەهی، و **دووەم:** سەیری حوكم و قەزا، ئەوەی پەیوەندی بەم دوو سەرنجەوە هەیە باسمان لێوە كرد و خستمانە ڕوو.

**سێیەم:** سەیری جێگە و سەرچاوەی تاوان كە بریتییە لە نەفسی فرمانكەر بە خراپە، لەوێوە دەزانێت كە نەفسێكی نەزان و ستەمكارە، هەرچی قسە و كرداری خراپە لە نەزانی و ستەمەوە سەرچاوە دەگرن، ئەمەش پێویست دەكات لەسەری بكۆشێت بۆ بەدەستهێنانی زانستی بەسوود كە لە وەسفی نەزانی دەریدەهێنێت، هەروەها بكۆشێت بۆ كرداری چاكە كە دەریدەهێنێت لە وەسفی ستەم. لەگەڵ ئەمەشدا نەزانینەكەی زۆرترە لە زانستەكەی و ستەمەكەی گەورەترە لە دادپەروەرییەكەی.

كەسێك ئەمە شان و شكۆی بێت دەبێت ڕوو لە دروستكەر و بەدیهێنەر بكات تاكو لە شەڕەكەی پارێزراو بێت و خۆپارێزی پێ ببەخشێت و پاكی بكاتەوە، خودا

پەروەردگار و سەرپەرشتکارییەتی، داوای لێبکات تاکو چاوتروکانێك نەیداتە دەست نەفسی خۆی، چونکە گەر بیداتە دەستی تیایدەبات، ئەوانەی تیاچوون ئەوانە بوون دراونەتە دەست نەفسی خۆیان، پێغەمبەر(ﷺ) بە "الحصین بن المنذر" دەفەرموێت ((قل: اللهم ألهمني رشدي وقني شر نفسي))، لە وتاری پێویستیدا ((الحمدلله، نحمده ونستعينه، ونستهديه، ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا، و من سيآت أعمالنا))، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ الحشر: ٩، هەروەها دەفەرموێت ﴿إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ﴾ يوسف: ٥٣

هەر کەس حەقیقەتی دەروونی خۆی و ئەوەی لەسەری نەقشکراوە ناسی لەوە تێدەگات کە سەرچاوەی هەموو شەڕێك و ماوای هەموو خراپەیەکە، هەر خێرێکی تێدا بێت لە چاکە و گەورەیی خوداوەیە و منەتی کردووە کە پێی بەخشیوە و لە خودی نەفسەوە نییە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا﴾ النور: ٢١، ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ ٱلْإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِى قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ ٱلْكُفْرَ وَٱلْفُسُوقَ وَٱلْعِصْيَانَ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ﴾ الحجرات: ٧

ئەم خۆشەویستی و رقلێبوونە لە خودی نەفسەوە نییە و لەودا بوونیان نییە، بەڵکو ئەوە خودایە پێی بەخشیوە، وایکردووە بەندە بەهۆی ئەو دوانەوە بچێتە ریزی کاملان (الراشدين)﴿فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعْمَةً وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٨﴾﴾ الحجرات: ٨، "عليم"زانا بەو کەسەی کە شایستەی ئەو فەزڵەیە و لەسەر ئەو فەزڵە و بەو فەزڵە پاك دەبێتەوە و لەلای بەردەگرێت، "حكيم"دانا ئەو فەزڵە لای کەسێك دانانێت کە ئەهل نەبێت و تیای ببات بەوەی لە شوێنی خۆی دایانێت و بەکارینەهێنێت.

<u>**نهێنی دووەم لە نهێنییەکانی تەوبە:**</u> بزانێت کە سەرنجی بەصیرەت ئامێز و راستگۆیانە لە خراپەکانی خۆی چاکەیەکی بۆ ناهێڵێتەوە، چونکە ئەو لەنێوان بینینی منەتی خودایی و گەڕان بەدوای نەنگی دەروون و کرداردا دەجوڵێت، هەر کەس بەصیرەتی بە خودی خۆی و بە مافی پەروەردگاری هەبوو و راستگۆ بوو لە داوا و گەڕانیدا ئەوا سەرنجی بۆ خراپەکانی خۆی چاکەیەکی بۆ ناهێڵێتەوە، بە ئیفلاسێکی تەواو و هەژارییەکی بێوێنەوە بە خودای خۆی دەگات، ئەو کۆڵوبارەش کۆیکردۆتەوە رزگاربوونی لە سزای خودایی پێ ناکرێت، چجای سەرکەوتنی مەزن و بەدەستهێنانی

پاداشت، گەر کردار و حاڵی لەگەڵ خودا پاڵفتە بوون، کاتی بینینی منەتی خودایی لەسەری –بەهۆی پاڵفتەبوونی کردار و حاڵەوە لەگەڵ خودا– بۆی پاڵفتە بوو، تێگەیشت کە ئەوە تەنها فەزڵی خودایە و لە نەفسی خۆیەوە نییە و ئەو کەسێکە شایستەی ئەوە نییە ئەوا بە هەمیشەیی منەتی خودا لەسەر خۆی و ناتەواوی و نەنگی کردار و حاڵی خۆی دەبینێت، چونکە هەر کات بەدوایاندا بگەڕێت دەتوانێت بیانبینێت.

ئەمە لە باڵاترین و بەسوودترین جۆری مەعریفەیە، بۆیە دەبێت بە "سید الإستغفار" واتە سەرداری داوای لێخۆشبوون ((**أللهم أنت ربي لا إله إلا أنت خلقتني، وأنا عبدك، وأنا على عهدك ووعدك مااستطعت، أعوذ بك من شر ما صنعت، أبوء لك بنعمتك علي وابوء بذنبي، فاغفر لي إنه لا يغفر الذنوب إلا أنت**)).

ئەم داوای لێخۆشبوونە لە بەندەوە: دانانان بە پەروەردگاریی و خواوەندی و یەکتایی خودا دەستەبەر دەکات، هەروەها دانانان بەوەدا کە ئەو–**سبحانه**– دروستکەری ئەوە و زانایە پێی، ئەو بەجۆرێك دروستکراوە کە دەستەوسانی و کەمتەرخەمی لە سروشتیدایە بەرانبەر جێبەجێ کردنی مافی پەروەردگاری، دانانان بەوەدا کە بەندەی خودایە و چارەنووسی بەدەست ئەوە و لەناو لەپی دەستی ئەودایە، ناتوانێت لەدەستی خودا هەڵبێت، هیچ سەردارێکی نییە جگە لە ئەو، پاشان پابەندبوون بە هاتنە ناو پەیمانەکەیەوە–واتە ئەمر و نەهی خودایی– کە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی پەیمانی لەگەڵ بەستووە، ئەوەش بەپێی توانای "من" نەك بەپێی حەقی "تۆ" ئەی خودای موتەعال، چونکە ئەوە لە توانای مرۆڤدا نییە، بەڵکو کۆششێکی کەم و توانایەکی سنووردارە، لەگەڵ ئەوەشدا من بەڵێنەکانت بەڕاست دەزانم کە بەڵێنت دابوو بە ئەهلی گوێڕایەڵیت، ئەو بەڵێنەش بریتییە لە پاداشت، هەروەها هەڕەشەت لە یاخیبووان بەڕاست دەزانم کە بریتییە لە سزای دۆزەخ، من لەسەر عەهد و پەیمانەکەت راوەستاوم، و باوەڕم بە بەڵێنی تۆ هێناوە، پاشان هەڵدێم بۆ ژێر پەنا و پارێزگاری تۆ لەو خراپانەی لە ئەمر و نەهی تۆ تێیکەوتووم، گەر لەو کارە ناباشانە پەنام نەدەی بێشك تیاچوون دەورەی داوم، ئەنجامنەدانی حەقی تۆ هۆی تیاچوونی مرۆڤە، من دان بە نیعمەتەکانی تۆدا دەنێم و پێیانەوە پابەندم، هەر بەو جۆرە دان بە گوناهەکانی خۆمدا دەنێم، نیعمەت و چاکە لە تۆوەیە و گوناه و

خراپەش لە منەوە، داوات لێ دەكەم گوناهەكانم بسڕییەوە و لە شەڕیان پارێزگاریم لێ بكەی، جگە لە تۆ كەس لە گوناهان نابورێت.

بۆیە ئەم نزایە سەرداری داوای لێخۆشبوونە، هەرچی بەندایەتی خاوێنە تێیدایە، چ چاكەیەك بۆ كەسی خاوەن بەصیرەتی صادق دەمێنێتەوە لەگەڵ سەیركردنی نەنگییەكانی نەفس و كردارەكانی و زۆری منەتی خودا لەسەری؟ ئەمە ئەو بڕەیە كە سەرنجی نەفسی خۆی و كردارەكان بە مرۆڤی دەبەخشن

## ۞ شەیتان پێداگرە و درەنگ بێهیوا دەبێت

سەرنجی چوارەم: سەیری ئەو بڕیاردەرە بكات بڕیار دەردەكات بەسەریدا بۆ ئەنجامدانی گوناه و یاخیبوون، كارە خراپەكەی بۆ دەڕازێنێتەوە، و هانی دەدات بۆ ئەنجامدانی، ئەو كەسەش بریتییە لە شەیتانەكەی كە بەسەریەوە دانراوە.

سەیركردنی ئەمە سوودی پێدەگەیەنێت، سەرنجدانی: واتە شەیتان بكە بە دوژمنی خۆت و بەتەواوی خۆتی لێ بپارێزە، خۆپارێزی و ئاگاهیی و بێداری تەواو لەوەی دوژمنەكەی لەوی دەوێت و بەخۆی نازانێت، ئەو دەیەوێت لە حەوت لەمپەردا سەربكەوێت بەسەریدا، هەندێكیان لە هەندێكیان گرانترن، لە كۆسپ و لەمپەرێكی گران دانابەزێت بۆ یەكێكی ئاسان مەگەر شەیتانەكەی دەستەوسان بێت لە سەركەوتن بەسەریدا.

**كۆسپی یەكەم:** كۆسپی بێباوەڕبوون بە خودا و ئایینی خودا و گەیشتنەوە بە خودا لە ڕۆژی دواییدا، هەروەها بێباوەڕی بە سیفاتی كەماڵی خودا و بەوەی پێغەمبەران دەربارەی خودا هەواڵیان پێداوە، گەر لەم قۆناغەدا سەركەوت بەسەر مرۆڤدا ئاگری دوژمنایەتییەكەی سارد دەبێتەوە و پشوو دەدات، گەر ئەم لەمپەرەی بڕی و لێی ڕزگار بوو و سەلامەتی بەدەست هێنا بەهۆی بەصیرەتی هیدایەت و نووری ئیمانەوە، ئەوا شەیتان لە لەمپەری دووەمدا بەدوای مرۆڤەوەیە.

**لەمپەری دووەم:** بریتییە لە كۆسپ و لەمپەری بیدعە، یان لە باوەڕدا بەوەی پێچەوانە بیربكاتەوە لەگەڵ ئەو ڕاستیانەی پێغەمبەری بۆ ڕەوانە كردوون و قورئانی بۆ دابەزاندوون، یان لە پەرستنی خودادا بە شتێك كە خودا مۆڵەتی پێنەداوە، لە بەندوباو و ڕسوم و بارودۆخێكی داهێنراو لە ئاییندا كە خودا هیچ یەكێك لەوانەی قبووڵ نییە، ئەم دوو بیدعەیە (لە باوەڕدا، لە پەرستندا) زۆر جار تەواكەری یەكترن، كەم جار یەكێكیان لەوی تریان جیادەبێتەوە.

گەر ئەم کۆسپەشی بڕی و بەنووری سوننەت لە دەستی رزگاری بوو، خۆی لێپاراست بە حەقیقەتی شوێنکەوتنی پێغەمبەر و ئەوەی پێشینی چاکان لەسەری رۆیشتوون لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان، ئەوا لە کۆسپی سێیەمدا بەدوایەوەیە.

سێیەم: ئەمەش بریتییە لە کۆسپی گوناهە گەورەکان، گەر شەیتان توانی سەربکەوێت بەسەر مرۆڤدا ئەوا لای جوان دەکات و لەبەرچاوی شیرینی دەکات، بە "سوف" دەیخەڵەتێنێت، دەرگای دواخستنی تەوبەی بەڕوودا دەکاتەوە و پێی دەڵێت: باوەڕ تەنها بریتییە لە بەڕاست زانین(تصدیق)، خراپە و یاخیبوون کار لە باوەڕ ناکەن، ئەمە مانای "دواخستن"ە کە خراپترین بیدعەیەکە ئایینی خەڵکی تێکدابێت، لەوانەیە بەسەر زمانیدا و بە گوێیدا وشەیەك بوترێت و ببیسترێت کە خەڵکێکی زۆری تیابردووە، ئەو قسەش بریتییە لە"لەگەڵ یەکتاپەرستیدا گوناه و تاوان زیانیان نییە، وەك چۆن لەگەڵ هاوەڵدانانندا چاکە دەور نابینێت و سوودی نییە"، سەرکەوتن بەسەر مرۆڤدا لە کۆسپی بیدعەدا لە لای شەیتان خۆشەویسترین شتێکە بەهۆی پێچەوانە راوەستانی لەگەڵ ئاییندا و لادانی لەوەی خودا بە پێغەمبەردا رەوانەی کردووە، خاوەنەکەی تەوبەی لەسەر ناکات و ناگەڕێتەوە، بەڵکو خەڵکی بانگ دەکات بۆ سەری، بەهۆی ئەوەی قسە بەبێ زانست لەمەڕ خودا لەئامێز دەگرێت و بەئاشکرا دوژمنایەتی سوننە و ئەهلی شارێگەی سوننە دەکات و دەکۆشێت بۆ ئەوەی نووری سوننە بکوژێنێتەوە و ئەوەی خودا و پێغەمبەر کەناریان داوە بیهێنێتە پێشەوە و ئەوەی ئەوان نەرێیان کردووە جێگیریان بکات و ئەوەی ئەوان جێگیریان کردووە نەرێیان بکات و راست بە درۆ بزانێت و درۆ بە راست دابنێت و ململانێی حەق بکات بە باتڵ و ئاوەژوو کردنەوەی راستییەکان بەوەی حەق دەکات بە باتڵ و باتڵ دەکات بە حەق و لادان لە ئایینی خودا و شاردنەوەی حەق لە دڵان و بە ناڕاست زانینی شارێگەی خودا و کردنەوەی دەرگای گۆڕینی ئایین بە گشتی، بیدعە هەنگاو بە هەنگاو لە بچووکەوە بۆ گەورە بەرز دەبێتەوە تا خاوەنەکەی لە ئایین دەردەکات، وەك چۆن موویەك لە هەویر دەردەهێنێت، خراپەکانی بیدعە تەنها مەگەر ئەهلی بەصیرەت پەی پێ ببەن، بێ چاوان و گومڕایان لە تاریکستانی کوێریدان ﴿وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُورًا فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ ﴿٤٠﴾﴾ النور: ٤٠.

گەر ئەم کۆسپەشی بڕی بە پارێزگاری لێکردنی خودایی بۆ کەسەکە، یان بە تەوبەیەکی یەکجاریی رزگارکەر لەدەستی بیدعە، ئەوا شەیتان لە کۆسپی چوارەمدا بەدوای دەکەوێت.

**کۆسپی چوارەم:** بریتییە لە کۆسپی تاوانە بچووکەکان، پێی دەڵێت: لە ئەنجامدانی گوناهی بچووکدا هیچت لەسەر نانوسرێت ئەگەر خۆت لە گوناهە گەورەکان بپارێزیت، ئەو بێئاگایە و نازانێت بە دوورکەوتنەوە لە گوناهە گەورەکان و ئەنجامدانی چاکە خودا لە گوناهە بچووکەکان دەبوورێت، بەردەوام گوناهە بچووکەکانی لا سووک ئاسان دەکات لەسەریان بەردەوام ببێت، وای لێ دێت ئەو کەسەی گوناهی گەورەی ئەنجامداوە و ترسی لە خودا هەیە حاڵی باشترە لە ئەو، بەردەوام بوون لەسەر گوناهی بچووك خراپترە لەو گوناهە گەورەیە، گوناه گەورە نییە گەر تەوبە و داوای لێخۆشبوونی لە خودا بۆ بکرێت، بچووکیش بچووك نییە گەر بەردەوام بێت لەسەری، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت **((إياكم و محقرات الذنوب، لم ضرب لذالك مثلا بقوم نزلوا بفلاة من الأرض فأوعزهم الحطب فجعل هذا يجيء بعود وهذا بعود حتى جمعوا حطبا كثيرا فأوقدوا النار و أنضجوا خبزتهم، فكذالك فأن محقرات الذنوب تجتمع مع العبد وهو يستهين بشأنها حتى تهلكه))**.

گەر لەم کۆسپەش بە خۆلادان و خۆپارێزی و بەردەوامی تەوبە و داوای لێخۆشبوون رزگاری بوو، بەدوای خراپەدا چاکەی ئەنجام دا، ئەوا لە کۆسپی پێنجەمدا بە دوایەوەیە:

**کۆسپی پێنجەم:** بریتییە لە کۆسپی موباحات کە هیچ لەسەر ئەنجامدەرەکەی نانوسرێت، زۆر خەریك بوونی کەسەکە لەم مەیدانەدا بێئاگای دەکات لە ئەنجامدانی کاری چاکە و هەوڵدان بۆ کۆکردنەوەی تێشوو بۆ رۆژی دوایی، لێرەوە فریوی دەدات بۆ وازهێنان لە سوننەتەکان و پاشان لە دوورکەوتنەوە لە سوننەتەکانەوەبۆ وازهێنان لە واجبەکان، کەمەکەی ئەوەیە دووری بخاتەوە لە قازانج و کار و کەسابەتی مەزن و مەنزیلەی بەرز و باڵا لەسەر رێگەی باوەڕ، گەر نرخی ئەوانەی بزانیبایە ئەوا دەستبەرداری ئەو کارانە نەدەبوو کە لە خودا نزیکیان دەکاتەوە، بەڵام ئەو کەسێکی نەزانە بە نرخی کاڵاکان و مامەڵە پێکردنیان.

گەر لەم کۆسپەش رزگاری بوو بە بەصیرەتی تەواو و نووری هیدایەتدەر و ناسینی پلە و پایەی کاری چاکە و زۆرکردنی کاری چاکە، تێگەیشت لە کەمی مانەوە لە

بەندەری دونیا و ترسی بازرگانی و هەروەها تێگەیشت لە بەخشندەیی کڕیار(خودای موتەعال) و بڕی ئەوەی بازرگانەکانی پێ باربوو(تعويض) دەکرێتەوە، ئەوا دەست بە کاتەکانیەوە دەگرێت و نایەوێت هەناسەکانی بەفیڕۆ بڕوات، گەر لەم کۆسپەش رزگاری بوو، ئەوا دوژمن لە کۆسپی شەشەمدا بەدوایەوەیە.

**کۆسپی شەشەم:** کۆسپی کار و کردەوەی "باش و باشتر" لە پەرستن و گوێڕایەڵی خودادا، فەرمان بە کردنی باشەکان دەکات بە سەر باشترەکاندا، لەبەرچاوی جوان دەکات و لای چاك و باش دەکات و دەیڕازێنێتەوە، ئەوەی تێیدایە لە خێر و قازانج دەیخاتە پێش چاوی، بۆ ئەوەی خەریکی بکات و ئەو کردارەی کە باشتر و چاکتر و خێرترە ئەنجامی نەدات، چونکە کە نەیتوانی لە بنچینەی پاداشتدا زیانی پێبگەیەنێت هەوڵدەدات لە کەماڵی پاداشت و پلەی باڵادا زیانۆمەندی بکات، بۆیە بە چاك و باشەوە سەرقاڵی دەکات لە چاکتر و باشتر، هەروەها خەریککردنی بەوەی لای خودا خۆشەویستە لەوەی لە لای ئەو-سبحانە- خۆشەویستترە، هەروەها خەریکبوونی بەوەی لای خودا جێگەی رەزامەندییە لەوەی رازامەندی زۆرتر و زیاتری خودای لەسەرە.

بەڵام کێن هاوەڵانی بەردەمی ئەم کۆسپە، ئەوانە لە جیهاندا بە پەنجەی دەست دەژمێررێن، زۆربەی خەڵکی لە کۆسپی یەکەمدا گیرۆدە بوون چجای گەیشتن بە کۆسپی شەشەم!.

گەر لەمەش رزگاری بوو بەهۆی تێگەیشتنی وردەوە دەربارەی کار و کردەوەکان و ئاستەکانیان لەلای خودا و مەنزیلەیان لەخێر و چاکە و ناسینی بڕ و سنووریان و جیاکردنەوەی باڵاکانیان و نزمەکانیان و باشتر و باش و لوتکە و دامێن و سەردار و خوارپلە، چونکە لە کرداردا سەردار و خوارپلە و سەردەستە و ژێردەستە و لوتکە و دامێن بوونیان هەیە، وەك لە فەرموودەیەکی سەحیحدا هاتووە ((سيد الإستغفار: أن يقول العبد: أللهم أنت ربي، لا إله إلا أنت- الحديث))، لە فەرموودەیەکی تردا ((الجهاد ذروة سنام الأمر))، تەنها ئەهلی بەصیرەت و راستگۆیی و راستڕەوی و خاوەن زانستەکان-ئەوانەی لەسەر راستە شەقامی کۆمەك و یارمەتی خوداین- دەتوانن ئەم کۆسپە ببڕن، کار و کردەوەکان لە شوێنی خۆیان دادەنێن و ماف بە هەموو خاوەن مافێك دەدەن.

## ۞ بەندایەتی بە بوغزاندی شەیتان و هەڵهاتن لە دەستی و دۆزینەوەی داڵدە و پەنای تر

گەر لە هەموو ئەوانەی پێشوو رزگاری بوو کۆسپێك نامێنێت شەیتان لە دوایەوە بێت جگە لە یەك کۆسپ، گەر کەسێك لێی رزگار بوو بێت ئەوە پێغەمبەری خودا(بەرێزترین دروستکراوی خودا) و سەرجەم پێغەمبەرانی ترن، ئەوەش کۆسپی زاڵکردنی سەربازەکانی (واتە سەربازەکانی شەیتان) بەسەریدا بە چەندین جۆر لە ئازار، بە دەست و زمان و دڵ، بەپێی ئاست و پلە و پایەی کەسەکە لە خێردا، هەر کات پلەی بەرز دەبێتەوە شەیتانی دوژمن سەربازەکانی بە سواری و پیادەرەو دەنێرێت بۆ سەری، بەو سەربازانە بەربەرەکانی کەسەکە دەکرێت و چەك و جبەخانە و ئەهلی شەیتان زاڵ دەکات بە سەریدا، هیچ رێگەیەك بوونی نییە بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم کۆسپەدا و رزگاربوون لەدەستی، هەر کات لەسەر ئیستیقامە و بانگەواز بۆ لای خودا گەرم دەبێت و دەیەوێت بڕیارەکانی خودا جێبەجێ بکات دوژمن(واتە شەیتان) سەفیهەکان دژ بەو هاندەدات، ئەو لەم کۆسپەدا -کە جلوبەرگی جەنگی پۆشیوە- لەگەڵ دوژمندا بە خودا و بۆ خودا دەجەنگێت، بەندایەتی لەم کۆسپەدا بەندایەتی کەسە تایبەتەکانە لە عاریفان، ئەمەش پێی دەوترێت "بەندایەتی بە بوغزاندنی شەیتان" کە تەنها ئەهلی بەصیرەت بە تەواوی لای بەلادا دەکەنەوە، هیچ شتێك لەلای خودا بە ئەندازەی موراغەمەی دوژمن و بوغزاندنی خۆشەویست نییە، خودا ئاماژەی بەم جۆرە بەندایەتییە لە چەندین شوێنی قورئاندا کردووە.

یەکەم: ئایەتی ﴿وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يَجِدْ فِي الْأَرْضِ مُرَاغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً﴾ النساء: ١٠٠، کۆچکەر کە کۆچ دەکات بۆ پەرستنی خودا قورئان بە "مراغم" ناوی هێنا کە بریتییە لەو کەسەی دوژمنی خۆی و خودا دەبوغزێنێت، خودا پێی خۆشە دۆستەکەی دوژمنەکەی ببوغزێنێت، دەفەرموێت ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ وَلَا مَخْمَصَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَطَئُونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ الْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِ عَمَلٌ صَالِحٌ ۚ إِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ (١٢٠)﴾ التوبة: ١٢٠، خودای موتەعال لە نموونەی پێغەمبەر و شوێنکەوتووانیدا دەفەرموێت: ﴿وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ﴾ الفتح:

٢٩، بوغزاندنی بێباوەڕان ئامانجێکی خۆشەویست و داواکراوە لای پەروەردگار، سەرکەوتنی باوەڕدار لەم مەیدانەدا لە کەماڵی بەندایەتی کردنە بۆ خودا، پێغەمبەر(ﷺ) دوو سوژدەی بۆ نوێژی سەهو داناوە، فەرموویەتی ((گەر نوێژەکەی تەواو بوو ئەوا لوتی شەیتان دەدات لە خۆڵەوە)) لە ریوایەتێکی تردا ((ترغما للشیطان)) نوێژەکەی بە بوغزێنەری شەیتان ناوهێنا.

هەر کەس بە بوغزاندنی شەیتان خودای پەرست ئەوا لە مەقامی "الصدیقیة" بەشێکی باشی بەرکەوتووە، بەپێی خۆشەویستی بەندە بۆ پەروەردگاری و "وەلا" بۆ خودا و دوژمنایەتی لەگەڵ شەیتاندا لە بوغزاندنی شەیتان بەشی دەدرێت، لە پێناوی ئەم بوغزاندنەدایە ستایشی لەنجە و لار کراوە لە کاتی رووبەڕووبوونەوەی بەرەی باوەڕ لەگەڵ بەرەی بێباوەڕی لە کاتی جەنگدا، هەروەها لەنجە و لار لە کاتی سەدەقەی نهێنیدا کە تەنها خودا دەیبینێت، چونکە بوغزاندنی شەیتانی تێدایە، هەروەها بەخشینی ئەو شتەی تێدایە کە خۆشەویستە لەلای نەفس کە بریتییە لە ماڵ و دارایی.

ئەمە دەرگایەکە لە بەندایەتی کەمێکی کەم لە خەڵکی دەیزانن، هەر کەس تام و چێژی کردبێت دەگری بۆ رۆژە سەرەتاکانی باوەڕ. کۆمەك بە خودایە و پاڵپشت بەوە و "و لا حول ولا قوة إلا بالله"

خاوەنی ئەم مەقامە کە سەیری شەیتان دەکات و سەرنجی دەدات گەر لەناو گوناهدا بێت بە تەوبەیەکی نەصوح دەیبوغزێنێت، ئەم بوغزاندنەش بەندایەتییەکی تری لا گەڵاڵە دەکات (واتە تەوبەکەی جۆرێکە لە بەندایەتی و بوغزاندنی شەیتانیش بەندایەتییەکی تر).

ئەمە هەندێکە لە نهێنییەکانی تەوبەکردن بە کەمی مەزانە، لەوانەیە لە دانراوێکی تردا دەستت نەکەوێت، ستایش و منەت بۆ خودایە، کۆمەك و داواش هەر لەو دەکرێت.

### ۞ فیترەت کاری خراپەی پێ باش نییە

نهێنی سێیەم لە نهێنییەکانی تەوبە ئەوەیە کە تەوبەکار ناشیرینی و خراپی ئەو کار و کردەوانە ببینێت کە خودا نەهی لێکردوون، هەروەها باشی و جوانی ئەو کار و کردەوانە ببینێت کە خودا فەرمانی پێکردوون، بزانێت دەچێتە ریزی تێکدەرانەوە

گەر ئەو كارە بكات كە خودا نەهی لێكردووە، هەروەها بزانێت بەرژەوەندییەكی گەورەی لەدەست چووە كاتێك كەمتەرخەمی دەكات لەوەی خودا فەرمانی پێ كردووە، خودا نەهی لە كاری قێزەون -قێزەون لە خودی كارەكەدا- كردووە، هەروەها فەرمانی بە چاكە -چاك لە خودی كارەكەدا- كردووە، ئەو -سبحانە- بەندەكانی لەسەر بەباش زانینی راستی و دادپروەری و پاكی و چاكە و شوكركردنی نیعمەت بارهێناوە (بەدیهێناوە)، هەروەها لەسەر بەناشیرین و ناباش زانینی دژەكانی ئەوانە مرۆڤی بارهێناوە، نزیكی ئەمانە لە فیترەت و ژیرییەوە وەك نزیكی شیرین و ترش وایە بۆ هەستی چەشتن، هەروەها وەك بۆنی خۆش و بۆگەن وایە بۆ هەستی بۆنكردن، یاخود وەك بیستنی دەنگی خۆش و پێچەوانەكەی وایە بۆ هەستی بیستن، هەر بەو جۆرە تەواوی ئەو شتانەی بە هەستە دەرەكی و ناوەكییەكان هەستی پێ دەكەن، جیاوازی دەكەن لەنێوان باش و ناباش و بەسوود و زیانبەخش.

بەڵگە بۆ ئەمە ئایەتی ﴿ وَإِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً قَالُوا وَجَدْنَا عَلَيْهَا آبَاءَنَا وَاللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا ۗ قُلْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ ۖ أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ قُلْ أَمَرَ رَبِّي بِالْقِسْطِ ۖ وَأَقِيمُوا وُجُوهَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ ۚ كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ ﴿٢٩﴾ فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ الضَّلَالَةُ ۗ إِنَّهُمُ اتَّخَذُوا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ اللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٠﴾ ۞ يَا بَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلَا تُسْرِفُوا ۚ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ ﴿٣١﴾ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ ۚ قُلْ هِيَ لِلَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۗ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٣٢﴾ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالْإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَأَن تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ الأعراف: ٢٨ - ٣٣، خودای موتەعال هەواڵیداوە كە كارەكەیان "فاحشة"یە بەر لەوەی نەهی لێبكرێت، فەرمانی كردووە بە دووركەوتنەوە لەو فاحیشەیە بە "خۆجوانكردن"، وشەی "فاحشة" لێرەدا بریتییە لە تەوافكردنی بەیت (كەعبە) بەڕووتی -پیاو و ژن بە تێكەڵاوی- جگە لە قورەیش، پاشان دەفەرموێت (إِنَّ اللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ)، واتە خودا فەرمان نادات بە شتێك كە لە ئەقڵ و فیترەتدا بە فاحشە دادەنرێت، قورەیشەكان بوون بەڕووتی تەوافیان بە حەجاج و عەمرەكاران دەكرد، پێشەوایەتیان دەكردن بۆ مەناسیكی حەج و دروشمەكانی، شتێكیان لێ

وەردەگرتن بۆ ئەوەی پێی بژین، وەك وەڵامێك بۆ داواكەی باوكیان ئیبراهیم ﴿رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ ٣٧﴾ إبراهيم: ٣٧، خودا ڕۆزی ئەوانی دا بەوەی دڵی خەڵك ڕوو لە كەعبە دەكات، بەڵام زۆربەیان نوێژ و شوكریان بەو جۆرە نەكرد وەك خودا دەیویست، بەڵكو بێباوەڕبوون و خواوەند و بت و بتخانەیان لە مردووان دروست كرد و دەیانپەرستن، پەیوەندیان لەگەڵ ئەربابەكانیان زۆرتر و زیاتر بوو لە پەیوەندییان لەگەڵ پەروەردگاری ئاسمانەكان، شەیتان –لەخوار خوداوە– بوو بە سەرۆكاریان، نیعمەتەكانی خودا لەو ڕۆزییەی خودا بۆی ڕەوانە دەكردن شەیتان بە كەم خستیە پێش چاویان، ئیبلیس وەحی بۆ كردن كە بیدعەیەكی زۆر خراپ بۆ خەڵكی داتاشن: ئەوەش ئەوە بوو كە خەڵكی دەبێت بە پۆشاكی قورەیشەوە تەواف بكەن، پۆشاكەكانیان دابكەنن و بیخەنە ژێر پێی تەوافكارانی دەوری كەعبە، لەو كارە ناڕەوادا خەڵكی بۆیان ملكەچ بوون و شوێنیان كەوتن، ئەوەش بوو بە سەرچاوەیەكی بژێوی بۆ قورەیش، فەرمانڕەوایی خەڵكییان دەكرد بەو جۆرەی دەیانویست، دواتر شەیتان وەحی بۆ كردن لەگەڵ زیادبوونی خەڵكدا نرخەكان(نرخی جلوبەرگی قورەیش) لەسەر خەڵكی گران بكەن، تا زۆربەی خەڵكی دەستەوسان بوون لە حەج كردن، بۆیە داوایان كرد لە سەركردە ملهوڕەكان هەندێك لە نرخەكە دابەزێنن، ئەگەر نە، ناچاردەبن بەڕووتی تەوافی كەعبە بكەن، قورەیش نرخی پۆشاكەكانیان دانەبەزاند، بۆیە خەڵكی هەزار بەڕووتی تەوافیان دەست پێكرد.

پاشان دەفەرموێت (قُلۡ مَنۡ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزۡقِۚ)، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی شتەكە چاك و پاك بووە بەر لە حەرام كردنی، وەسفی چاك و پاك ڕێگری دەكات لە حەرام كردنی شتەكە و گەر حەرام بكرێت پێچەوانەی حیكمەتە.

پاشان فەرمووی (قُلۡ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَ)، ئەوانە بەر لە حەرام كردن و دوای حەرام كردن ناباش و خراپ بوون، خودای موتەعال پۆشاكی نەهی خۆی كرد بە بەریاندا و ناشیرینییەكی تری خستە پاڵ ناشیرینییەكانیان، ناشیرینییەكانیان لە خودی خۆیاندا بوو، ئەو ناشیرینییە بە نەهی كردنی پەروەردگار و زەم كردنیان

بوو بە دوو ناشیرینی، هەواڵی دا بە بێزراوی کارەکانیان و ئەنجامدەری کارەکان، وەك چۆن دادپەروەری و ڕاستگۆیی و یەکتاپەرستی و شوکری نیعمەت لە خودی خۆیاندا باش و چاکن، بۆیە بە فەرمانی پەروەردگار و مەدح کردنی ئەنجامدەرانی و هەوڵدان بە خۆشویستنی ئەوانە و ئەنجامدەرانیان باش و چاکێکی تر خرایە سەر ئەو باش و چاکەی لە خودی خۆیاندا بوو.

بەڵکو لە ڕاگەیاندنی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمانیان بە چاکە پێ دەکات و نەهیان لە خراپە لێ دەکات و چاك و پاکیان بۆ حەڵاڵ دەکات و پیس و ناباشیان لەسەر حەرام دەکات.

ئەوەی دەبێتە مەدح و سەنا و بەڵگە و نیشانە لەسەر پێغەمبەرایەتی محمد(ﷺ) ئەوەیە کە ژیری تەندروست گەواهی باشی و چاکی و پاکی دەدات لەسەر فەرمانپێکراوەکانی ئاینەکەی، بەوەی مەعروفن واتە ناسراون، ئەوەش کە نەهیان لێکراوە ژیری تەندروست گەواهی خراپی و ناباشیان دەدات بەوەی لە خودی خۆیاندا پیس و نەناسراون بە فیترەتی مرۆڤ، ئەمەش بانگەوازی تەواوی پێغەمبەرانە-صلوات الله وسلامه عليهم- پێچەوانەی بانگی خۆسەپێنان و ئەهلی باتڵ و درۆزنان و ساحیرەکان، ئەوان بانگ دەکەن بۆ شتانێك کە لەگەڵ حەز و بەرژەوەندییەکانیاندا پێك دێنەوە لە ناباش و نامۆ و خراپ و ناشیرین و ستەم و دەستدرێژکاری.

بۆیە وتراوە بە هەندێ ئەعراب -کە بانگەوازەکەی پێغەمبەری ناسی و موسڵمان بوو- بەچی موسڵمان بووی؟ چیت لێ بینی بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی پێغەمبەری خودایە؟ وتی ((فەرمانی بە شتێك نەکردووە ژیری بڵێت خۆزگە نەهی لێبکردبایە، هەروەها نەهی لە شتێك نەکردووە ژیری بڵێت: خۆزگە فەرمانی پێ بکردبایە، شتێکی حەڵاڵ نەکردووە ژیری بڵێت خۆزگە حەرامی بکردبایە، شتێکی حەرام نەکردووە ژیری بڵێت خۆزگە حەڵاڵی بکردبایە))، سەیری ئەو ئەعرابییە بکە و سەرنجی تەندروستی ژیری و فیترەت و هێزی باوەڕی بدە، هەروەها بەڵگە هێنانەوەی لەسەر ڕاستیی بانگەوازی پێغەمبەر ببینە بەوەی لە گەڵ هەموو ئەو شتانەی ئەقڵ بە باشی دەزانێت پێکدێتەوە، هەر بەو جۆرە تەبایی حەڵاڵ و حەرامەکانی لەگەڵ ژیریدا.

خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾﴾ المؤمنون: ١١٥، واتە پێتان وایە ئێوە بۆ هیچ شتێك دروست نەکراین،

نە فەرمانتان پێ بکرێت و نە نەهیتان لێ بکرێت، نە پاداشتتان بدرێتەوە و نە سزاتان بدرێت، ئەمەش لە خۆیدا گاڵتەجارییە، گاڵتەجاڕی و بێمانایی(عبث)ش لە خودی خۆیاندا ناشیرینن، ئایەتەکە ئاماژە دەدات بەوەی کە پەیبردن بەو ناشیرینییە لە فیترەت و ژیریدا جێگیرە، بۆیە کارەکەیان بە ناباش دادەنێت و ئاگاداریان دەکاتەوە بگەڕێنەوە بۆ سەر ژیری و فیترەتی خۆیان، ئەوانە گەر بیریان بکردبایەتەوە و ئەهلی بەصیرەت بوونایە دەیانزانی بۆ خودا گونجاو و شیاو نییە دروستکراوەکانی بەبێ ئامانج و مەرامێك خولقاندبێت، واتە نە بۆ فەرمان پێکردن و نە بۆ نەهی لێ کردن، نە بۆ پاداشت و نە بۆ سزا، ئەمەش بەڵگەیە کە چاکی و باشی کاروبارەکان و خراپی و ناشیرینییان لە ژیری و فیترەتدا جێگیربوون، هەر کەس بۆ خودا ئەو کارە نەشیاوە بڕیار بدات و شتێك بداتە پاڵ خودا کە ناوە جوانەکانی و سیفەتە باڵاکانی ڕێگەی پێ نادەن ئەوا ناشیرینی و ناباشی داوەتە پاڵ خودا ﴿ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الجاثية: ٢١، خودای موتەعال ئەم بۆچوونە ڕەد دەکاتەوە، ڕەدکردنەوە بە بەئاگاهێنانی ژیری لەمەڕ ناشیرینییەکەی، ئەو بڕیارە بڕیارێکی خراپە، ئەو کەسەش بڕیاری وا دەردەکات کەسێکی خراپەکار و ستەمکارە.

هـەروەها ئایـەتی ﴿ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾ ﴾ ص: ٢٨، ئەمە پرسیارێکە نینکاری تێدایە، ئاماژەی بـەوە کـرد کە ئەو کارە لە خودی خۆیدا ناشیرین و ناباشـە، نابـاش و نامۆیەکـە کـە لای ئـەقڵ و فیترەت بێزراوە، ئایا وا گومان دەبەن ئـاوا کارێـك شـایەنی ئێمەیـە و ئەنجامـدانی بـۆ ئێمە بـاش و گونجـاوە؟ خـودای موتـەعال ناپەسـەندیی ئـەوەی دەرخسـت و ژیـری و فیترەتی ئاگادار کردەوە لەسەر ناشیرینییەکەی، و ڕایگەیاند ئەو شـتە شایسـتە نییـە بدرێتە پاڵ خودا.

هەر بەو جۆرە خودای موتـەعال ناشـیرینی هاوەڵـدانان بـۆ خـۆی ڕەد دەکاتـەوە، بـە بـوونی بەڵگـە لەسـەر ئـەوەی کـە ئـەو شـتە لـە خـودی خۆیـدا لای ژیـری و فـیترەت ناشیرینە، ئەو کـارە ناشـیرینترین ناشـیرین و خـراپترین سـتەمە، چ شـتێك لـە ژیریـدا ڕاست دەردەچێت(یان چ بڕیارێکی ژیری ڕاست دەکەوێتەوە) گەر لـەناو ئـەو ژیرییـەدا

زانستی بە ناپەسەندیی و ناشیرینی هاوەڵدانان بۆ خودا تێدا نەبێت؟ زانست بە ناپەسەندی هاوەڵدانان لەناو ژیریدا و ناشیرینی ئەو بڕیارە بەڵگەنەویستە و زانستێکی حاشاهەڵنەگرە، پێغەمبەران گەلانیان هۆشدار کردۆتەوە بەو ناشیرینییەی هاوەڵدانان لەناو ژیری و فیترەتدا، رایانگەیاندووە کە هاوەڵدانەران نە ژیری و نە ناوەڕۆك و نە دڵیان هەیە، بەڵکو بیستن و بینینیان لێ نەرێ دەکەن، مەبەست بیستن و بینینی دڵە، بۆیە رایدەگەیەنێت ئەوانە کەڕ و لاڵ و کوێرن، ئەوەش وەسفی دڵیانە کە نەدەبیستێ و نە دەبینێ و نە دەتوانێت بژنەوێت و دەربڕێت، دەیانچوێنێت بە ئاژەڵان کە ژیرییان نییە بۆ جیاکردنەوەی باش و ناباش و حەق و باتڵ، بۆیە لە ئاگردا بێباوەڕان دان بەوەدا دەنێن کە ئەهلی بیستن و بینین و ژنەوتن نەبوون، ئەوانە گەر بگەڕابانایەوە بۆ لای بیستن و ژنەوتن ئەوا باشی و چاکەی ئەوەی پێغەمبەران هێنابوویان دەیانزانی و ناباشی سەرپێچی پێغەمبەرانیان بۆ دەردەکەوت.

خودای موتەعال دەربارەی ئەوانە بۆمان باس دەکات و دەفەرموێت ﴿وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ ۝١٠﴾ الملك: ١٠، زۆرجار لە قورئاندا پێیان دەفەرموێت (أفلا تعقلون؟)، (لعلكم تعقلون)، هۆشدارییان پێدەدات لەوەی لەناو فیترەت و ژیریاندایە لە پێوەری باش و ناباش، هەواڵ دەدات کە پێدانی ئەو دووانە (ژیری و فیترەت) بۆ سوود لێبینین و جیاکردنەوەی باش لە ناباش و حەق لە باتڵە.

زۆر نموونەی ئەقڵی و بەرهەستی لە قورئاندا خراونەتە روو کە ژیری ئاگادار دەکەنەوە لەسەر باشیی و جوانی ئەوەی فەرمانی پێکردووە و ناشیرینی ئەوەی نەهی لێکردووە.

قورئان پڕە لەم نموونە بەرز و بڵندانە بۆ کەسێك لێی تێبگات و تێڕامانی تێدا بکات، وەك ئایەتی ﴿ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ أَنفُسِكُمْ ۖ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن شُرَكَاءَ فِي مَا رَزَقْنَاكُمْ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَاءٌ تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ۝٢٨﴾ الروم: ٢٨، خودای موتەعال بەڵگەیان لەسەر دەهێنێتەوە بەو راستییەی لەناو ژیرییاندایە لە ناشیرینی ئەوەی کەسێك بەندەکەی شەریکی بێت، گەر یەکێك لای ناشیرینە بەندەکەی لە ماڵ و ملك و خانەوادەیدا ببێت بە شەریکی و پێی رازی نییە، کەوابێت چۆن شەریك بۆ من بڕیار دەدەن و وەك بەندایەتی بۆ من بەندایەتییان دەکەن؟ ئەمەش نیشانی دەدات ناشیرینی بەندایەتی بۆ کەسێك لە خوار

خوداوە لە فیترەت و ژیریدا جێگیرە، بیستن (بیستنی ئایات) هۆشداری دەدات بەو مەعریفەی خودا لە ناو ژیرییدا دایناوە لە ناشیرینی ئەو بەندایەتی کردنە بۆ کەسێك جگە لە خودا.

هەر بەو جۆرە ئایەتی ﴿ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ شُرَكَآءُ مُتَشَٰكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ هَلۡ يَسۡتَوِيَانِ مَثَلًاۚ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾ الزمـر: ٢٩، خـودای موتـەعال بەڵگـە دەهێنێتەوە لەسەر ناشیرینی هاوەڵدانان بـەوەی ژیـری دەیزانێـت لـە جیـاوازی حـاڵی بەندەیەکی خزمەتکار کە چەند کەسێکی شەڕەنگێزی خـراپ ڕەفتـار خاوەنـداری ئـەو دەکەن، لەگەڵ حاڵی بەندەیەکی تردا کە تەنها یەك سەرداری هەیـە و خـۆی رادەسـت کردووە، ئایا ئەو دوو بەندەیە حاڵیان وەك یەك وایە؟ هەر بەو جۆرە حاڵی هاوەڵدانەر و کەسی یەکتاپەرست کە تەواوی بەندایەتی خۆی بۆ خودای حەق ئـەنجام داوە؟ ئـەو دوانە یەکسان نین و یەکسان نابن.

هەر بەو جۆرە ئایەتی ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ كَٱلَّذِي يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفۡوَانٍ عَلَيۡهِ تُرَابٞ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٞ فَتَرَكَهُۥ صَلۡدٗاۖ لَّا يَقۡدِرُونَ عَلَىٰ شَيۡءٖ مِّمَّا كَسَبُواْۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٦٤﴾ ﴾ البقرة: ٢٦٤، نموونە بۆ ناشیرینی "ریاکردن" دەهێنێتەوە کە دەبێتە هۆی بەتاڵکردنەوەی کاری چاکەی مرۆڤ، هەروەها نموونەی ئەوانەی منەت و ئازار تێکەڵ بە خێر و سەدەقەکانیان دەکەن، نموونەی "صفوان" کە بەردێکی سافە دەهێنێتەوە، ئەو بەردە وەك دڵی کەسی ریاباز و منەتکار و ئازاردەرە، خاکیش "التراب" کە بە بەردەکەوە لکاوە نموونەی کارە چاکەکانییەتی، لێزمە بارانیش "الوابل" ئەو بارانەی ژیانی زەوی پێوە بەندە، گەر بە نەرمی و لەسەرخۆیی بەسەریدا داباری ئەوا گژوگیای لێ دەڕوێت، گەر بەسەر تاشە بەردەکاندا بەلێزمە داباری هیچی لەسەر ناڕوێت، بارانە لێزمەکە روویکردە ئەو بەردە سافە کە هەندێك تەپوتۆزی لەسەر نیشت بوو، بەسەریدا داباری و هیچی پێوە نەهێڵا، وایکرد بەردەکە هیچی لەسەر نەڕوێت، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە ناشیرینی (منەت و ئازار و ریا) لە قوڵایی ژیریدا جێگیر بووە، بۆیە خودا نموونەی لەسەر دەهێنێتەوە و شوبهاندنی بۆ دەکات.

پێچەوانەی ئەو مرۆڤە ریابـازە، ئایـەتی ﴿ وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمُ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِ وَتَثۡبِيتٗا مِّنۡ أَنفُسِهِمۡ كَمَثَلِ جَنَّةِۭ بِرَبۡوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٞ فَـَٔاتَتۡ أُكُلَهَا ضِعۡفَيۡنِ فَإِن لَّمۡ

يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٦٥﴾﴾ البقرة: ٢٦٥، گەر ئەو بەهەشتە(باخچە و بێستان و باخ و سەهەند)-كە بە شوێنێكی بەرزەوەیە و خۆر و با دەیگرێتەوە و بارانێكی بەخوڕ بەسەریدا دادەبارێت، بەروبوومەكەی دوو بەرانبەری ئەوەیە باخەكانی تر بەرهەمی دەهێنن- لە ئەقڵ و ژیریدا چاك و پاك بێت، هەر بەو جۆرە بەختكردنی ماڵ و دارایی لە پێناوی خودادا چاك و پاكە، نەك بۆ پاداشت و شوكری خەڵكی، بەڵكو بە ساغبوونەوەی ناخ و دەروون و هێزی دڵ بۆ خودا لە بەخشیندا، بەخشین جێگەی خۆی ناگرێت گەر لە كاتی جیاكردنە و پێدانـدا دڵ بهـەژێت و دەسـت بلـەرزێت، ورەی دابەبـەزێت و تـرس دایبگرێتەوە، پێچەوانەی بەخشینی كەسانی خاوەن دڵی بەهێز و دامەزراو.

لەبەر ئەوەی خەڵكی لە بەخشیندا ئەم دوو جۆرەن: نموونەی كەسی خاوەن ئیخلاص و دڵسۆزی و دڵ بە هێز و دامەزراو وەك بارانی لێزمە (وابل) وایە، نموونەی بەخشینی كەسی تر وەك نەرمە باران وایە، كە بارانێكی كز و لاوازە، ئەمە بەپێی زۆری و كەمی بەخشین و كەماڵی ئیخلاص و هێز و یەقین تیایدا لەگەڵ بوونی لاوازی و دڵەڕاوكێ لە بەخشیدا، نابینی خودای موتەعال ژیری دێنێتەوە بەر هۆش بەوەی تێیدایە لە "بەباشزانین" و لە "بە خراپزانین"؟

هەروەها ئایەتی ﴿ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ لَهُ فِيهَا مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ وَأَصَابَهُ الْكِبَرُ وَلَهُ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَاءُ فَأَصَابَهَا إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَاحْتَرَقَتْ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٦٦﴾﴾ البقرة: ٢٦٦، خودا-سبحانە- هۆشداری بە ژیری داوە لەوەی تێیدایە لە بە خراپزانینی كرداری ناباش كە پاداشتی چاكە دەپوكێنێتەوە، ئەو كارەشی شوبهاندووە بە حاڵی پیاوێكی بە تەمەن كە بەرپرسیارێتی خێزانێكی هەژار و لاوازی كەوتۆتە ئەستۆ، بەجۆرێك لە تیاچوونی خۆی و ئەوان دەترسێت، بێستانێكی هەیە كە سەرچاوەی بژێوی خۆی و خێزانەكەیەتی، بیستانەكەی دارخورما و ترێ و هەموو جۆرە میوەیەكی تێدایە، زۆر هەژار و ئاتاجی ئەو باخە بوو، دڵی پێی خۆش بوو، لەناكاو ئاگرێكی بەهێز بیستانەكەی سوتاند، خودای موتەعال ئاگادارمان دەكاتەوە لەوەی ناباشی گوناه كە چاكەكان دەسوتێنێت وەك ناباشی حاڵی ئەو پیاوە پیرە وایە، عومەر و ئیبن عەباس-خوایان لێ رازی بێت- بەم جۆرە تەفسیریان كردووە ((پیاوێكی دەوڵەمەند سەردەمێك خەریكی كاری چاكە و

گوێڕایەڵی خودابوو، خودا شەیتانی نارده لای، بە کاری گوناهەوە خەریك بوو تا هەموو کردارە چاکەکانی نوقم کرد)) ئیمامی بوخاری لە سەحیحەکەیدا باسی کردووە.

نابینی چۆن ئاگاداری بە ژیری دەدات لەسەر ناشیرینی گوناه دوای چاکە و گوێڕایەڵی، لەمەڕ ئەو کارەش ئەم نموونەی بۆ ناباشی کارەکەی هێنایەوە؟

هەندێك لە فەقیهان: قسە لە هۆ و مەرام و بۆنەگەلێك دەکەن کە داوای هاتنی بەیان کردنی حوکم دەکەن، جیاوازی دەکەن لەنێوان بەرژەوەندی پوخت و لەپێش لەگەڵ بەرژەوەندی پلە دوو، هەروەها جیاوازی نێوان زیانەکان بە هەمان شێوە، بەرژەوەندی زۆرتر و بەرینتر لە مەودایەکدا دەدەن بەسەر بەرژەوەندی کەمتر و بەرتەسك تر لە هەمان مەودادا، هەروەها بەهێزترین زیان پاڵپێوە دەنێن بە لاوازترینیان، ئەم کارە ئەنجام نادرێت بە دەرهێنانی حیکمەت و هۆ و مەرام نەبێت، ناسینی بەرژەوەندی و زیان لە کردارەکانەوە سەرهەڵدەدەن.

## ۞ خراپە لە بازنەی ویستی خودادایە، بەڵام پێی رازی نییە

ئەمەش لەتیفەی سێیەمە لە نهێنییەکانی تەوبە کە جوانی و ناشیرینی و باشی و خراپی تیا رۆشن دەبنەوە، لێرەوە جیاوازی نێوان خۆشویستنی خودا بۆ ئەو شتە و پێرازی بوون لەگەڵ ویستێکی گەردوونیی رۆشن دەبێتەوە، هەروەها یەکسان نەکردنی ئەم دوانە بە یەکتر و باوەڕ بە پێویستبوونیان بە یەکتری، وەك جەبرییەکان بۆی دەچوون کە دەیانوت: هەرچی کردارە لەلای خودا خۆشەویستە چونکە لە ویستی ئەوەوە سەرچاوەیان گرتووە، ئەو کردارانە خودی خۆشەویستی و رەزامەندی خودان، ئەمەش سەریکێشا بۆ ئەوەی خراپە لەلایان بە ناباش تەماشا نەکرێت و کاری ناشیرین و نامۆ بە قێزەون سەرنج نەدرێت.

لە بەرپەرچدانەوەی ئەوانەدا خودا دەفەرموێت ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ ۝٢٠٥﴾ البقرة: ٢٠٥ ﴿كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا ۝٣٨﴾ الإسراء: ٣٨، لێیان تێکچوو و پرسییان: چۆن دەبێت شتێك لای خودا بێزراو بێت لە کاتێکدا ئەو ویستوویەتی؟ چۆن خۆشی ناوێت کاتێك ئەو بوونی ئەو شتەی دەوێت؟ ئەم ئایەتانە و هاوشێوەکانی ئەمانەیان تەئویل کرد کە لەڕووی ئایینەوە خۆشیناون و لەڕووی

شەرعەوە پێیان رازی نییە و بێزراون لەلای بەو مانایەی شەرعییەتیان پێ نادات، لەگەڵ ئەوەی بوونیانی خۆشدەوێت و ویستراون لەلای ئەو –سبحانه–.

لەسەر ئەم بۆچوونە ئەوەیان بینا کرد کە ئەوان فەرمانیان پێکراوە بە شتە بڕاوەکان(بە بڕیارە قەدەرییەکان) رازی بن، گوناه و خراپە بڕاوەیەکن لە بڕاوەکانی خودا، بۆیە پێی رازی دەبین، لەم باوەڕەیانەوە گەیشتنە ئەو ئەنجامەی: بەوەی ئەو شتانە لای پەروەردگار خۆشەویستن و فەرمانیان پێکراوە پێیان رازی بن و کردارەکان یەکسان تەماشا بکەن و هیچ یەکێك لەو کردارانە بە خراپ و ناشیرین تەماشا نەکەن.

لەم میانەدا شتێکی تر خراپە سەر باوەڕیان ئەویش ناچارکردنی بەندەیە بە ئەنجامدانی ئەو کارانەی لێی دەوەشێتەوە، چونکە کاری ئەو نین و ناچارکراوە لە ئەنجامدانیان، ئەمەش بریتییە لە باوەڕی جەبرییەکان.

لێرەوە پێویست بوونێك سەری هەڵدا ئەویش لادان و سڕینەوەی ئەمر و نەهی و پێچانەوەی راخەری شەرع و خۆڕادەستکردنی قەدەر و ڕۆیشتن لەگەڵی رووی لە هەر شوێنێك کرد.

سەرچاوەی هەڵەکەیان لەو جێگەوەیە ویستی خودایان یەکسان کرد بە خۆشویستنی خودا و باوەڕبوونیان بە پێویستیی رازیبوون بە قەزا و بڕیارە بڕاوەکان، لەم دوو بەشەدا بە پشتیوانی خودا ئەمە ڕۆشن دەکەینەوە، هێز و توانین هەر لای خودایە.

ویست و خۆشەویستی: قورئان و سوننەت ئاماژە بە جیاوازی نێوانیان دەکەن، هەر بەو جۆرە ژیری و فیترەت و کۆدەنگی موسڵمانان هاوڕان لەسەر جیاوازی نێوان ئەو دوانە.

خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ يَسۡتَخۡفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسۡتَخۡفُونَ مِنَ ٱللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمۡ إِذۡ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرۡضَىٰ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ ﴾النساء: ١٠٨، هەواڵیدا کە رازی نییە بەو قسانەی لە پەنهاندا شەوان لەگەڵ یەکتر دەیکەن، بوختان لەخۆ دەگرێت و بێگوناه تۆمەتبار دەکەن و شایەتی درۆ دەدەن و تاوانبار بێگوناه دەردەکەن، ئەم ئایەتە لەسەر چیرۆکێك دابەزیوە بەم شێوەیە ئاماژەی بۆ کرا، لەگەڵ ئەوەی هەر هەموو کاروکردەوەکان بە ویستی خودان، موسڵمانان کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەو باوەڕەی: ئەوەی خودا بیەوێت دەبێت و ئەوەی نەیەوێت نابێت.

تەئویلێك لە تەئویلەکانی ئەو ئایەتە ئەوەیە: لەڕووی دینەوە پێی رازی نییە، لەگەڵ خۆشویستنی بۆ ئەوەی رووبدات، کە دەبێت ئەم لێکدانەوەیە کەلامی خودای لێ

بپارێزرێت، مانا لەلایان: کارەکە لای خودا خۆشەویستە، بەڵام لەڕووی شەرعەوە کەسەکە لەسەری پاداشت وەرناگرێت.

مەزهەبی پێشینی ئەم ئوممەتە و ئیمامەکانی: کرداری خراپە لای پەروەردگار بێزراوە و لەڕووی قەدەر و شەرعیشەوە ناپەسەندە، لەگەڵ ئەوەی بە ویست و بڕیاری ئەو -سبحانه- هاتوتە بوونەوە، خودا دەتوانێت ئەوەی خۆشیناوێت و لای ناپەسەندە دروستی بکات، هەروەك چۆن شتە بینراوەکان هەموو دروستکراوی خودان، تیایدایە لای خودا ناپەسەند و ناشیرین وەك ئیبلیس و سەربازەکانی و سەرجەم شتە پیسەکانی تر، هەر بەو جۆرە لەناو دروستکراوەکانیدا تیایدایە خۆشەویستە و جێگەی ڕەزامەندی ئەوە -سبحانه- وەك پێغەمبەران و فریشتە و دۆستانی خودا، بەم جۆرە تەواوی کردارەکان دروستکراوی خودان، هەیانە خۆشەویست لەلای و هەیانە بێزراو و ناپەسەند، دروستی کردووە بۆ حیکمەتێکی خۆی لە دروستکردنی شتێك کە بێزراو و ناپەسەندە لەلای وەك بینراو و بەرچاوەکان، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ﴾ البقرة: ٢٠٥، لەگەڵ ئەوەی بە ویست و بڕیار و قەدەری خۆیەتی ﴿إِن تَكْفُرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمْ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ وَإِن تَشْكُرُواْ يَرْضَهُ لَكُمْ﴾ الزمـر: ٧، بێباوەڕی و شوکردن بە ویست و قەدەری خودا ڕوودەدەن، یەکەمیان لای خودا خۆشەویستە و پێیڕازییە، ئەویتریان بێزراو و ناشیرین و ناپەسەندە.

هەر بەو جۆرە ئەو ئایەتەی دوای نەهیکردن لە هاوەڵدانان و ستەم و خراپە هاتووە ﴿كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا﴾ الإسراء: ٣٨، ئەو شتە لای خودا بێزراوە لەگەڵ ڕوودانی بە ویست و بڕیار و قەدەری خودا.

لە فەرموودەی سەحیحدا لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ((إن الله كره لكم ثلاثا: قيل وقال، وكثرة السؤال، وإضاعة المال)) ئەم کەراهەتە بۆ شتێکە کە ویست و بڕیار و قەدەری خودا بۆ هێنانە بوونی پێیەوە وابەستە بووە.

لە مەسنەددا هاتووە ((إن الله يحب أن يؤخذ برخصه، كما يكره أن تؤتى معصيته))، ئەم خۆشەویستی و کەراهەتە بۆ دوو شتن کە هاتوونەتە بوون: هەردووکیان لە ویستی خواییدا کۆبوونەتەوە و لە خۆشویستن و کەراهەتدا لەیەکتر جیابوونەتەوە، ئەم جۆرە نموونانە لە قورئان و فەرموودەدا زۆرترن لەوەی هەمووی باس بکرێن.

خودا مرۆڤی بەدیهێناوە لەسەر وتنی: ئەم کارە خودا خۆشی دەوێت، ئەو کارە بێزراو و ناپەسەندە لەلای خودا، فلان کارێك دەکات کە خودا خۆشی ناوێت، قورئان پڕە لە باسکردنی تووڕەیی و رقی خودا لە دوژمنەکانی، ئەوە سیفەتێکە پێیەوە راوەستاوە و سزا و نەفرەتی لەسەر دروست دەبێت، نەك تووڕەییەکە خودی سزا و نەفرەتەکە بێت، بەڵکو ئەو دوانە شوێنەواری تووڕەییەکەی خودان، بۆیە جیاکاری دەکرێت لەنێوانیان ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴿٩٣﴾ ﴾ النساء: ٩٣، جیاوازی خستە نێوان سزا و تووڕەیی و نەفرەتەوە، هەریەکەیانی بەسەربەخۆ باس کرد جیا لە دوانەکەی تر.

لە نزاکانی پێغەمبەر(ﷺ) ((**أللهم إني أعوذ برضاك من سخطك و أعوذ بمعافاتك من عقوبتك، و أعوذ بك منك**))

سەرنجی پەنابردنی پێغەمبەر(ﷺ) بدە بە سیفەتی رازیبوون (الرضا) لە سیفەتی رق و تووڕەیی (السخط)، هەروەها بە کاری سەلامەتی و رزگاربوون لە کاری سزادان (العقوبة)، یەکەمیان بۆ سیفەتە، دووەمیان بۆ ئەو دەرئەنجامەیە لێیەوە سەرهەڵدەدات، هەموو ئەوانەشی بەستۆتەوە بە خودی خودای موتەعالەوە، هەموو ئەوانە تەنها بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، نەك بۆ کەسێکی تر، ئەوەی پەنای پێ دەگرم: بە ویست و بڕیاری تۆ روودەدات، ئەوەی پەنای پێدەگرم لە رەزامەندی تۆ و سەلامەتی بە ویست و بڕیای تۆیە، گەر بتەوێت رازی دەبیت لە بەندەکەت و سەلامەتی دەکەیت، گەر بتەوێت خەشمی لێ دەگری و سزای دەدەیت، پەناگرتنی من لەوەیە کە حەزی پێ ناکەم و خۆمی لێ دەپارێزم، نەهێڵانی ئەوەی تووشم بێن دیسان بە ویستی تۆیە، خۆشەویست و بێزراو هەر هەموو بۆ بڕیار و ویستی تۆ دەگەڕێتەوە، بۆیە پەنادەگرم بە تۆ لە تۆ، پەنام بەهێز و توانا و دەسەڵات و بەزەیی و چاکەی تۆیە لەوەی بەهۆی هێز و توانا و دەسەڵات و دادپەروەری تۆوە روودەدەن، پەنانانگرم بە کەسێك جگە لە تۆ لە کەسێك جگە لە تۆ، پەنانانگرم بە تۆ نەبێت لە شتێك کە لە ویست و بڕیاری تۆوە سەرچاوە دەگرێت، بەڵکو ئەوە تۆی وام لێدەکەی پەنا بگرم لە ویستی تۆ لەو شتەی بە ویستی خۆت هاتۆتە بوونەوە، بۆیە پەنادەگرم بە تۆ لە تۆ.

تەنها ئەوانەی بە قووڵی لەگەڵ زانستی خودا و ناسینیدا رۆچوون دەزانن چی لەناو ئەو چەند وشەدایە لە یەکتاپەرستی و مەعریفە و بەندایەتی.

ئاماژەمان بە شتێکی کەم لە ماناکەی کرد، گەر بەدوای هەموو راڤەکردنیدا بچین کتێبێکی چەند بەرگی دەردەچێت، بەڵام دەرگاکەت بۆ کراوەتەوە، گەر بچیتە ژوورەوە ئەوەی چاو نەیبینیوە و گوێ نەیبیستووە و بەدڵی مرۆڤدا گوزەری نەکردووە دەیبینیت و هەستی پێدەکەیت.

مەبەست: دابەشبوونی بەدیهێنراوەکان -لە بینراو و سیفات و کردار- بۆ خۆشەویست لای پەروەردگار و رازی پێی لەگەڵ بێزراو ناپەسەند لە لای ئەو-سبحانه- بە چەندین جۆر بەڵگە خراوەتە روو، بۆیە کارێکی ئاشکرا و زانراوە لەناو ژیری و لەناو دەقدا، هەر بەو جۆرە لەناو فیترەتی مرۆڤدا، هەر کەس یەکسانی بخاتە نێوان هەموو ئەمانەوە ئەوە پێچەوانەی ئەو فیترەتە دەجوڵێتەوە کە خودا مرۆڤی لەسەر بارهێناوە، هەروەها پێچەوانەی ماقوڵ و مەنقوولە (المعقول و المنقول) و لەوەی پێغەمبەران هێناویانە چووتە دەرەوە.

بۆ چ شتێك خودا-سبحانه- سزای توندی لە دونیا و دوارۆژدا جۆراوجۆر کردووە و هەندێکی نیشانی بەندەکانی داوە؟ گەر توندیی تووڕەبوون و رقی نەبوایە لە ئەنجامدەرانی ئەو کارانە ئەوا بەو جۆرە بوغز وخەشمی لەمەڕ ئەو شتانە هەڵنەدەگیرسا، بوونی بێزاری و بوغز لەو شتانە: چەندین جۆر ناخۆشی بۆ خاوەنەکانیان بڕیوەتەوە، هەر بەو جۆرە خۆشەویستی بۆ ئەو شتانەی خۆشیدەوێن و پێیان رازییە لە کاروکردەوەی چاکە: چەندین جۆر سەرئەنجامی باشی بۆ خاوەنەکانیان بەدەست هێناوە، بینینی رێز و گەورەیی لە دونیادا بۆ دۆستانی خودا و تەواوکردنی نیعمەتەکانی لەسەریان و سەرخستنیان و پاڵپشتی کردنیان و سووکایەتی بە دوژمنەکانیان و سزادانیان و دابەزاندنی بەڵا بۆ سەریان باشترین بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستی و بوغزی خودا، بەڵکو خودی دۆستایەتی لەگەڵ ئەوانەی دۆستایەتی خودا دەکەن و دوژمنایەتی لەگەڵ ئەوانەی دوژمنایەتی خودا دەکەن: بریتییە لە چاوگەی خۆشەویستی و بوغزی خودا، دۆستایەتی بنچینەکەی خۆشەویستییە، دوژمنایەتیش بنچینەکەی رق و بوغزە، نەرێکردنی سیفەتی "خۆشەویستی و رق" نەرێکردنی حەقیقەتی دۆستایەتی و دوژمنایەتی.

**بەگشتی:** بینینی دڵان بۆ خۆشەویستی و رقی خودا وەك بینینی بەرچاو وایە لە رێزلێنانی خودا بۆ دۆستەکانی و سووککردنی دوژمنەکانی، لەسەر بابەتی "رازیبوون بە قەزا و بڕیاری بڕاوەش" دەوترێت:

**یەکەم:** بە کام قوران و بە کام سوننەت و بە کام ژیری زانیتان رازیبوون بە هەموو ئەوەی قەزا و قەدەری خودایی دەریدەکات پێویستە؟ بەڵکو دروستە، چجای پێویستبوونی؟ ئەوە کتێبەکەی خودا و سونەتی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) و بەڵگەی ژیری کە هیچ یەکێك لەو قسانەی تێدا نییە و بە ڕەوایان نەزانیوە.

بەڵکو هەندێك لە بڕیارە بڕاوەکان خودا پێی رازییە و رقی لە هەندێکی ترە و لای ناپەسەندن، بە هەموو قەزایەك رازینین وەك چۆن قازی–سبحانە– خۆی پێی رازی نییە، هەر وەك چۆن هەندێك لە بینراوە بڕاوەکان: مرۆڤ رووبەڕووی خەشم دەکەنەوە و رقی بەسەردا دادەبارێنن و دواجار نەفرەتی لێدەکرێ و بە خراپ باس دەکرێت.

**پاشان** دەوترێت قەزا دوو رووی هەیە:

**یەکەم:** وابەستەبوونی بە خودای موتەعالەوە–سبحانە– لەم رووەوە پێی رازییە.

**دووەم:** وابەستەبوونی بە بەندەوە و دانەپاڵ ئەو، لەم رووەوە: دابەش دەبێت بۆ ئەوەی پێی رازییە و ئەوەی پێی رازی نییە.

نموونەی ئەوە: خۆکوشتن–بۆ نموونە– دوو رووی هەیە: بەوەی خودا ئەندازەگیری بۆ کردووە و بڕیویەتەوە و نوسیویەتی و ویستوویەتی و کردوویەتی بە ئەجەلێك بۆ کوژراوەکە و کۆتایی تەمەنی: پێی رازییە، لەو رووەوە کە لە بکوژەکە کارەکە دەوەشێتەوە و ئەنجامیداوە و بەدەستی هێناوە و بە ویستی خۆی کارەکەی کردووە و بەو کردارەی لە خودا یاخیبووە: لەم رووەوە خودا رقی لێیەتی و پێی رازی نییە.

## ۞ چاودێری کردارەکانت بکە.......... و تاوتوێی دەروونی خۆت بکە

لە عابیداندا کەسانێك هەن لێبڕان و توانایان هەڵیان دەنێنن بۆ زۆر کردنی کار و کردەوەی چاکە، بەبێ سەرنجدانی نەنگی دەروون و کردار هەروەها پشکنینی فێڵ و پیلانەکانی نەفس، ئەوەی هەڵیان دەنێت بۆ زۆرکردنی کاروکردەوەی باش بینینی ئەو کارانە و سەرسامبوونە پێیان، گەر خۆیان یەکلابکردبایەتەوە بۆ پشکنینی نەفس و

کردار و دادگایی کردنی نەفس لەسەریان، جیاکردنەوەی بەشی دەروون لەو حەق و ڕەوایەتییەی تێیدایە، ئەوا ئەو کارە سەرقاڵی دەکردن بەخۆیەوە و ئەوەندە خەریکی زۆرکردنی کردار نەدەبوون، لەو پێناوەدا کاری کەمی عابید چاودێر بۆ کردارەکانی لەسەری ئاسانە و هەوڵی زۆرکردنی دەدات و وەك کاری دەقپێوەگیراوی لێدێت، کاتێك دەیەوێت کارەکانی لە خەوش و خاڵ پاك بکاتەوە و لە لێڵی پاڵفتەیان بکات لەوانە درك وداڵی ریا: دەبینێت ئەو کارە وەك قورسی چیاکان قورسە بۆیە لەبەرچاوی ئەو کارە بەکەم رادەگیرێت، بەڵام گەر شیرینی تێدا بینییەوە لەسەری ئاسان دەبێت و شان دەداتە ژێر قورسییەکەی و بەو ئەرکە هەڵدەستێ و تام و چێژی لێ دەبینێت لەگەڵ قورسییەکەیدا.

گەر ویستت لەم برە وەك پێویست تێبگەی سەرنجی کاتی خوێندنەوەی ئەم بابەتە بدە، گەر پشتت هەڵکرد لە ئەرکەکانی و تێڕامان لە مەوداکانی و تێگەیشتن و ژنەوتنی یەك بە یەکی ئایەتەکان و بەشت لە گوتاری ئەو ئایەتانە و دابەزاندنیان وەك دەوایەك بۆ چارەسەری دڵ و پابەندبوون پێیانەوە، چۆن کۆی بابەتەکە دەبینی-یان زۆربەی بابەتەکە، یاخود بەشێکی- بە ئاسانی و رەوانی، داوای خوێندنەوەی زۆرتر بکەیت، گەر خۆت پابەند کرد بە تێڕامان و ناسینی مەرام و مەبەستەوە، و سەرنجی ئەوەی تایبەتە بە تۆ تاکو بەندایەتی پێ ئەنجام بدەی، و دابەزاندنی دەواکانی بۆ چارەسەری دڵت و داوای شیفا پێیان لە خودا، ئەوا ناتوانی سورەتەکە یان ئایەتەکە بەجێبهێڵی بۆ سورەت و ئایەتێکی تر، هەر بەو جۆرە گەر هەموو دڵت لەسەر ئەنجامدانی دوو رکات نوێژ کۆبوویەوە، دڵت بە باشی تیایدا ئامادە بوو، هەر بەو جۆرە لێوان لێو بوو بە ترس و چاودێری خودایی، ئەوا ئەنجامدانی دوو رکاتی تر کۆشش و ماندووبوونی زۆری دەوێت، بەڵام گەر دڵ ئامادەیی و ترس و چاودێری لە نوێژەکەدا تێدا نەبێت ئەوا چەندین رکات بەئاسانی ئەنجام دەدەی، بۆیە زۆر کردنی کاروکردەوەی باش بەبێ رەچاوکردنی ئافەتەکانی و نەنگی و ناتەواوییەکانی بەڵگەیە لەسەر کەمی فیقه و تێگەیشتن.

ئەنجامدەری ئەو کارانە وا دەبینێت کە حەقی لەسەر خوا هەیە لە پاداشتی چاکەکانیدا بەهەشتی نەعیم و ریزوانی پێ بدرێت، بۆیە کارەکانی خۆی لەبەرچاو زۆر

دەبێت لەگەڵ بێئاگایی لە ناتەواوی کاروکردەوەکانی، ئەوە نازانێت هیچ کەس بە کردەوەکانی خۆی لە ئاگر رزگاری نابێت مەگەر بە لێبوردنی خودا و بەزەیی بەرینی ئەو-سبحانە-.

گومانی تێدا نییە تەنها ئەنجامدانی کاروکردەوەکان بە ئەندامەکان بەبێ ئامادەبوونی دڵ و چاودێری و رووکردنە خودا: قازانجیان کەمە لە دونیاو دوارۆژدا، زۆر لەسەر مرۆڤ دەکەوێت، ئەوە وەك کردارێك وایە ئەنجام درابێت بەبێ شوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) و بوونی ئیخلاص تیایدا بۆ خودا، ئەو کارانە-با زۆریش بن- ماندووکەر و بێکەڵکن، هەر بەو جۆرە کار و کردەوەی توێکڵ و رووالەتی وەك دارخورمای بێبەر وایە کە دیمەنێکی بەرچاوی هەیە و هیچ بەرێك ناگرێت، خودا تەنها ئەوە بۆ بەندەکەی لە نوێژ دەنوسێت کە تێیگەیشتووە.

بەڵام خۆشەویسترین کەس لەلای خودا: ئەوانەن کە کرداری چاکە زۆر دەکەن لەگەڵ چاودێری کردنی ئەو کارە چاکانە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ۝١٧ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ۝١٨﴾ الذاريات: ١٧ - ١٨، حەسەن دەفەرموێت: نوێژەکانیان تا بەرەبەیان درێژ دەکردەوە، پاشان دادەنیشتن بۆ داوای لێخۆشبوون لە خودا. پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((تابعوا بين الحج والعمرة، فأنهما ينفيان الفقر والذنوب كما ينفي الكير خبث الحديد))، هەروەها لە وەڵامی کەسێکدا کە داوای لێ کرد وەسێتی بۆ بکات بە شتێك بۆ رزگاربوون دەستی پێوە بگرێت فەرمووی ((لايزال لسانك رطبا من ذكر الله))

ئایین هەر هەمووی زۆرکردنی کاروکردەوەی چاکەیە، خۆشەویسترین دروستکراو لەلای خودا ئەوانەن کە مەزنترین کاری چاکەیان هەیە، لە فەرموودەیەکی سەحیحی قودسیدا هاتووە ((ما تقرب إلي عبدي بمثل أداءماافترضت عليه، ولايزال عبدي يتقرب إلي بالنوافل حتى أحبه، فإذا أحببته كنت سمعه الذي يسمع به، وبصره الذي يبصر به، ويده التي يبطش بها، ورجله التي يمشي بها، فبي يسمع و بي يبصر وبي يبطش وبي يمشي، ولئن سألني لأعطينه ولئن استعاذني لأعيذنه)) ئەمە پاداشت و رێزلێنانە بۆ کاروکردەوەی چاك و زۆریان.

### ۞ گوناهی بچووكی باوەڕدار........ گەورەیە

هەروەها: بەكەم تەماشاكردنی گوناه خراپە، هەر وەك چۆن بەزۆر تەماشاكردنی كرداری چاكە خراپەیە، خوداناس كەسێكە چاكەكانی خۆی لەبەرچاو بچووكە و خراپەكانی خۆی لا گەورەیە، هەتا چاكە لەبەر چاوت بچووك بێت لەلای خودا گەورە دەبێت، هەر بەو جۆرە هەتا چاكە لەلات گەورە بێت لەلای خودا بچووك دەبێتەوە، خراپەكانیش هەر بەو جۆرەن. هەر كەس خودا و ئەوەی شایستەی خودای موتەعالە لە بەندایەتی ناسی چاكەكانی خۆی لەبەرچاو بزر دەبێت و زۆر لەبەرچاوی بچووك دەبنەوە، لەوە تێدەگات ئەو كردارانە بۆ ئەوە ناشێن لە سزای خودایی رزگاری بكەن، ئەوەی شایستەی عیززەتی خودایە و بۆی ئەو شیاوە لە بەندایەتی شتێكی ترە. هەتا زۆرتر ئەنجام بدات بە كەمتر و بچووكتر تەماشایان دەكات، چونكە هەتا هەوڵی زۆرتر بدات بۆ كاری چاكە دەرگای مەعریفەی زۆرتر دەربارەی خودا و نزیكبوون لە خودا بەڕوویدا دەكاتەوە، كە دڵی مەزنی و شكۆمەندی خودا-سبحانە- دەبینێت هەرچی كاروكردەوەی چاكەیە لەبەرچاوی بچووك دەبنەوە با ئەوەندە قورس و زۆربێت هاوتای كاروكاردەوەی ئینس و جین بێت، گەر كارەكانی لەبەرچاو مەزن و گەورە بوون ئەوە بەڵگەی بێ بەشبوونیەتی لە گەیشتن بە خودا، نە دەیناسێ و نەدەزانێ چ شتێك شایستەی ئەوە-سبحانە-، بەپێی ئەو مەعریفەیە و مەعریفەی بە نەفسی خۆی گوناهەكانی خۆی لا گەورە و مەزن دەبێت، بەهۆی بینینی حەق-سبحانە- و ئەوەی شایستەیەتی و كەمتەرخەمی لە هەستان بەوەی داوای كردووە، هەروەها ئەنجامدانیان بەو جۆرەی خودا پێی خۆشە و لەسەری رازییە لە هەموو روویەكەوە.

### ۞ وەستان............ گەڕانەوەیە

تەوبەی كەسانی تایبەت لە بەفیڕۆدانی كاتدایە لە شتی پڕ و پووچدا، چونكە سەردەكێشێت بۆ دەرگای كاری خراپ و نزم، و نووری چاودێری خامۆش دەكات، ئەو كەسەی كە پارێزگاری لە كاتەكانی دەكات بەرەو پلەی كەماڵ سەردەكەوێت، گەر كاتەكانی بەفیڕۆ بدات لە پێگەی خۆیدا ناوەستێت، بەڵكو بەرەو پلەی نزم دەگەڕێتەوە، گەر بەرەو پێشەوە نەڕوات ئەوا بەدڵنیاییەوە بۆ دواوە دەگەڕێتەوە، بەندەی خودا لە جووڵە و ڕۆیشتندایە و ناوەستێت، یان بۆ سەرەوە یان بۆ خوارەوە،

یا بۆ پێشەوە یان بۆ دواوە، نە لە سروشتدا و نە لە شەریعەتدا وەستان بوونی نییە، تەنها قۆناغ برینە بە خێراترین شێوە یان بەرەو بەهەشت، یان بەرەو دۆزەخ، خێرا و هێواش، پێشکەوتوو و دواکەوتوو، لەسەر رێگە وەستان نییە، بەڵكو تەنها لە ئاراستەدا لەیەكتر جیاوازن، هەروەها جیاوازی لە خێرایی و هێواشی ﴿إِنَّهَا لَإِحْدَى الْكُبَرِ (٣٥) نَذِيرًا لِّلْبَشَرِ (٣٦) لِمَن شَاءَ مِنكُمْ أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ (٣٧)﴾ المدثر: ٣٥ – ٣٧، باسی وەستاوی نەكرد، چونكە شوێنێك نییە لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا، هیچ رێگەیەك جگە لە رێگە بۆ ئەو دوو ماڵە لەبەردەم سالیكدا نییە، هەر كەس بە كردەوەی چاكە پێشنەكەوێت بۆ ئەم ماڵەیان ئەوا بە كردەوەی خراپە دوادەكەوێت بەرەو ئەو ماڵەیان.

**گەر بڵێی:** هەر كەسێكی تێكۆشەر بۆ دەستەبەركردنی ئەوەی داوای دەكات رووبەرووی وەستان و ساردبوونەوە دەبێت، پاشان راست دەبێتەوە بۆ گەیشتن بە مەبەستەكەی.

**دەڵێم:** دەبێ ئەوە روودات، بەڵام كەسی وەستاو دوو حاڵی هەیە: یان دەوەستێت بۆ جەنگ و جۆركردنی خۆی و ئامادەكردنی نەفسی خۆ بۆ بەرەو خوداچوون، ئەم وەستانە بەشێكە لە رۆیشتن بەرەو خودا و وەستانەكە زیانی پێ ناگەیەنێت، چونكە ((بۆ هەر كارێك لوتكەیەك هەیە تیایدا دەگاتە ئەوپەڕی چالاكی، بۆ هەر گەیشتنە لوتكەیەكیش ساردبوونەوە و خاوبوونەوەی هەیە)).

یان دەوەستێت بەهۆی بانگی بانگكەرێك لەدواوە، هەروەها بەهۆی هێزێكەوە كە رایدەكێشێت، گەر وەڵامی دایەوە دوای دەخات، گەر خودا بە بەزەیی خۆی گەیشتە فریای و ئاگاداری كرد لە رۆیشتنی كاروانەكە و دواكەوتنی ئەو، ئەوا وەك راپەڕینی كەسێكی تووڕە لە دابڕان و دواكەوتن رادەپەڕێت، هەوڵدەدات و رۆیشتنی خێرا دەكات بۆ گەیشتنەوە بە كاروان، گەر بەردەوام بوو لەگەڵ بانگكەری دواكەوتن و گوێی بۆ گرت رازی نابێت بیگێڕێتەوە بۆ حاڵی یەكەمی لە بێئاگابوون و چوون بەدەم داوای حەزەكانەوە بەڵكو دەیگێڕێتەوە بۆ خراپترین شوێن و جێگە، ئەوەش وەك شكستێك وایە دوای چاكبوونەوە لە نەخۆشییەك كە ترسەكەی زۆرتر و سەختترە.

**بەگشتی:** گەر خودا(ﷻ) فریای ئەو بەندە كەوت و دەریهێنا لە دەستی دوژمنەكەی و رزگاری كرد، ئەگەر نە ئەو تاكو مردن بۆ دواوە دەگەڕێتەوە، بۆ دواوە دەگەڕێتەوە و پاشگەز دەبێتەوە و پشت هەڵدەكات، هیچ هێزێكیش جگە لە هێزی خودا بوونی نییە و پارێزراویش كەسێكە خودا پارێزگاری لێ بكات.

لەسەرو ئەمەوە مەقامێكی تر بۆ تەوبە هەیە، بەرزتر و تایبەتترە، تەنها كەسانی تایبەت و خواویست دەیزانن و دەیناسن، ئەوانەی كاروكردەوە و حاڵ و قسە و گوفتاری چاكەی خۆیان بۆ خۆشەویستەكەیان بەكەم دەزانن، هەمیشە بە چاوی كەم و كورت سەیری دەكەن، شانوشكۆ و گەورەیی خودا مەزنتر و باڵاتر تەماشا دەكەن لەوەی لە خۆیان و كارەكانیان رازی بن، ئەوان بە خراپترین و كەمترین شێوە سەرنجی كارەكانیان دەدەن، گەر نەیانتوانی مەبەست و مەرامی خۆشەویستەكەیان جێبەجێ بكەن و بێئاگابوون لێی ئەوا تەوبە دەكەن، وەك تەوبەكردنی كەسێك گوناه و تاوانی مەزنی ئەنجام دابێت، بۆیە تەوبەیان لێ جیانابێتەوە، تەوبەی ئەمان رەنگێكە تەوبەی خەڵكی تر رەنگێكی ترە ﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ ۝٧٦﴾ یوسف: ٧٦، تا خۆشەویستییان بۆ خودا زیاد بكات ناسینیان بە خودا زیاد دەكات و كەمتەرخەمی خۆیان دەبینن، بۆیە تەوبەكەیان مەزن دەبێت و ترسیان لە خودا زیاتر دەبێت، بێزكردنەوەیان لە نەفسی خۆیان زۆرتر دەبێت، ئەوەی ئەوان تەوبەی لێ دەكەن لەوانەیە چاكەی كەسانی تر بێت.

۞ ۞ ۞

## یاسا و ڕێساکانی تەوبە

کەمێك باسی یاسا و ڕێساکانی تەوبە دەکەین، پێویستییەکی زۆر هەیە بەم بابەتە و شیاو نییە بەندەی خودا نەیزانێت.

**لەوانە:** دەستبردن بۆ تەوبە لە گوناهان فەرزێکە دەبێت یەکسەر و بەبێ دواخستن ئەنجام بدرێت، هەرکات تەوبەی دواخستن بەو دواخستنە دیسان یاخیبووە، گەر لە گوناهان تەوبەی کرد تەوبەیەکی تری لەسەر دەمێنێت ئەوەش تەوبەکردنە لە دواخستنی تەوبە، کەم جار ئەمە بە بیری تۆبەکاردا گوزەر دەکات، بەڵکو لای ئەو: گەر لە گوناه تەوبەی کرد هیچی لەسەر نامێنێت، بەڵام تەوبەیەکی تری لەسەر ماوە ئەوەش تەوبەیە لە دواخستنی تەوبە، لەمەش ڕزگاری نابێت بە تەوبەیەکی گشتی نەبێت، تەوبە لە گوناهانەی دەیزانێت و لەو گوناهانەی نایزانێت، ئەوەی بەندە نایزانێت زۆر زیاترە لە گوناهانەی دەیزانێت، نەزانین نابێتە بیانوو بۆ تەوبەکردن لە گوناهە نەزانراوەکان ئەگەر کەسەکە ئەهلی زانست بێت، ئەو بە وازهێنان لە زانست و کردار بووە بە کەسێکی یاخی، یاخیبوونی ئەو کەسە خراپتر و توندترە، لە سەحیحی ئیبن حەبباندا هاتووە، کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی ((هاوەڵدانان بۆ خودا لەناو ئەم ئوممەتەدا لە تەپەی پێی مێروولە شاراوەترە، ئەبوبەکر فەرمووی: چۆن خۆمانی لێ ڕزگار بکەین ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: بڵێت: **"اللهم إني أعوذ بك أن أشرك بك وأنا أعلم و أستغفرك لما لا أعلم"**)).

ئەمە دوای لێخۆشبوونی گوناهێکە کە خودا دەزانێت گوناهە و بەندە نایزانێت.

لە فەرموودەی سەحیحدا لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ((لە نوێژەکانیدا دەپاڕایەوە: **"اللهم اغفر لي خطيئتي وجهلي وإسرافي في أمري وما أنت أعلم به مني، اللهم اغفر لي جدي وهزلي و خطئي وعمدي وكل ذالك عندي اللهم اغفر ما قدمت وما أخرت وما أسررت و ما أعلنت وما أنت أعلم به مني، أنت إلهي لا إله إلا أنت"**))

لە فەرموودەیەکی تردا ((**اللهم اغفر لي ذنبي دقه وجله، خطأه وعمده، سره وعلانيته، أوله وآخره**))

ئەم گشتاندن و گشتگیرییە بۆ ئەوەیە بەندە لەوەی دەیزانێت و لەوەی نایزانێت تەوبە بکات.

## ✿ تەوبە بە هەمیشەیی نویٚ دەبێتەوە

**لە یاساکانی تەوبە:** ئایا مەرجە بۆ ئەوەی تەوبەکەی دروست بێت هەرگیز نەگەڕێتەوە بۆ سەر گوناهەکانی پێشووی، یان ئەوە مەرج نییە؟

**هەندێك لە خەڵکی:** نەگەڕانەوەیان بۆ سەر گوناهان کردووە بە مەرج و دەڵێن: هەر کات گەڕایەوە بۆ سەر گوناه دەردەکەوێت کە تەوبەکەی باتڵ و نادروست بووە.

زۆربەیان لەسەر ئەوەن کە نەگەڕانەوە بۆ سەر گوناه مەرج نییە، بەڵکو دروستیی تەوبە لەسەر دەستکێشانەوە لە گوناه و پەشیمانی و لێبڕان بۆ ئەوەی نەگەڕێیەوە وەستاوە.

گەر تەوبەکردنەکە حەقی مرۆڤی تێدابوو، ئایا مەرجە حەقەکە بگێڕێتەوە؟ بەدرێژی قسەی لەبارەوە دەکەین-إنشاءالله- گەر گەڕایەوە سەر گوناه لەگەڵ ئەوەی لە کاتی تەوبەکردندا بڕیاری دابوو نەگەڕێتەوە سەری وەك ئەوە وایە کە دەست بە گوناهێکی تر بکات و تەوبەکەی یەکەم جاری بەتاڵ ناکاتەوە.

**بابەتەکە لەسەر بنچینەیەك بیناکراوە ئەوەش:** بەندە کە تەوبە لە گوناه دەکات و پاشان دەگەڕێتەوە سەری ئایا کۆڵی ئەو گوناهانەی بۆ دەگەڕێتەوە کە پێشتر تەوبەی لێ کردبوو و دواتر گەڕاوەتەوە سەریان، بەجۆرێك لەسەر ئەوانەی پێشوو و ئەمانەی دواتر سزا بدرێت گەر سووربوو لەسەر گوناهان تا مردن؟ یان ئەوانەی پێشوو بە تەواوی پووچ بوونەتەوە و گوناهەکان ناگەڕێنەوە بۆ سەری و تەنها لەسەر گوناهەکانی دواتر سزا دەدرێت گەر تەوبەیان لێ نەکات؟

**لەسەر ئەم بنچینەیە دوو قسە هەیە:**

**دەستەیەك دەڵێن:** گوناهەکانی یەکەمجاری بۆ دەگەڕێتەوە، بەهۆی تێکچوونی تەوبەکەیەوە و پووچکردنەوەی بەهۆی گەڕانەوە بۆ سەری.

**ئەمانە دەڵێن:** مەنزیلەی تەوبەکردن لە گوناه وەك مەنزیلەی ئیمان وایە لە بێباوەڕی، مرۆڤی بێباوەڕ کە موسڵمان دەبێت موسڵمانبوونەکەی هەموو گوناهی بێباوەڕی و ئەوەی بەدوایدا دێت دەشۆڕێتەوە، گەر پاشگەزبوویەوە لە ئیسلام گوناهەکانی سەرەتا و گوناهی پاشگەزبوونەکەی دێتەوە سەر، وەك لە فەرموودەیەکی سەحیحدا لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی ((هەر کەس لە ئیسلامدا باشی ئەنجامدا ئەوا گوناهی سەردەمی نەفامی ناکەوێتە گەردن، هەر کەسیش لە ئیسلامدا خراپەی

ئەنجامدا گوناهی پێشوو و دوایی دەکەوێتە گەردن))، ئەمە حاڵی کەسێکە موسڵمان بووە و لە موسڵمانبوونەکەیدا خراپەی ئەنجامداوە، وەك زانراوە پاشگەزبوونەوە گەورەترین گوناهە لە ئیسلامدا، گەر گوناهی سەرەدەمی بێباوەڕی بێتە گەردنی و موسڵمانبوونی نێوان دوو بێباوەڕی لە کۆڵی نەکاتەوە، هەر بەو جۆرە تەویەی نێوان دوو گوناه گوناهەکەی پێشوو ناسڕێتەوە، وەك چۆن ڕێگر نییە لە گوناهی پاشتر.

دەڵێن: لەبەر ئەوەی دروستیی تەوبە بەبەردەوامییەوە بەستراوە، هەروەها گرێدراوە بە وەفاداری بە تەوبەوە و وابەستەبوون بە مەرجێکەوە کە تەوبەکە تیادەچێت دەبێت بە ونبوونی ئەو مەرجە، وەك چۆن دروستیی ئیسلام مەرجدارکراوە بە بەردەوامبوون لەسەری و وەفاداری بە هاتنە سەر ئیسلامەکەی.

دەڵێن: تەوبە پێویستە بە پێویستبوونی گرتنەئامێزی هەموو تەمەن، کاتەکەی درێژایی تەمەنە، پێویستە لەسەری بە هەموو تەمەنی حوکمەکەی لەگەڵ بێت، تەوبە بۆ تەمەن وەك خۆگرتنەوە وایە لە هەموو ئەو شتانەی ڕۆژوو بەتاڵ دەکەنەوە، گەر زۆربەی ڕۆژەکەی بەڕۆژوو بوو پاشان بە شتێك ڕۆژووەکەی شکاند ئەوا ئەو بەشەی لە ڕۆژ کە تیایدا بەڕۆژوو بووە بەتاڵ دەبێتەوە و بە کەڵکی ناخوات و وەك ئەوە وایە ڕۆژەکەی بەڕۆژوو نەبوبێت.

دەڵێن ئەوەی دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەمە: ئەو فەرموودە سەحیحەیەی پێغەمبەری خودایە(ﷺ) کە دەفەرموێت ((بەندە کاردەکات بە کاری ئەهلی بەهەشت تا لەنێوان ئەو و بەهەشتدا دووری بالێك دەمێنێت، نووسراوی لێ هەڵدەگەڕێتەوە (لێ پێش دەکەوێت) بە کاری ئەهلی ئاگر کار دەکات و دەچێتە ناو ئاگرەوە))، ئەمە گشتگیرترە لەوەی کرداری دووەم بێباوەڕییەك بێت سەری دەربچێت لە مانەوەی هەتاهەتایی لە ئاگردا، یان گوناهێك بێت سەری لە چوونە ئاگرەوە دەربچێت، فەرموودەکە نافەرموێ (فیرتد فیفارق الإسلام) پاشگەز دەبێتەوە و لە ئیسلام جیادەبێتەوە، بەڵکو هەواڵمان پێ دەدات: ئەو بە کردارێك کار دەکات شایستەی ئاگری دەکات، لە هەندێ سونەندا ((بەندە شەست ساڵ بەندایەتی خودا دەکات، تا دەگاتە سەرەمەرگ لە وەسێتەکەیدا ستەم دەکات و دەچێتە ناو ئاگرەوە))، سەرئەنجامی خراپ گشتگیرترە لەوەی سەرئەنجامی خراپ بێت بە بێباوەڕی یان بە یاخیبوون، کردارەکان بە کۆتاییەکان دەپێورێن.

گەر بوترێت: ئەمە پووچبوونەوەی چاکە بە خراپە لەخۆ دەگرێت، کە ئەمە قسەی موعتەزیلەیە، قورئان و فەرموودە ئاماژە بەوە دەدەن کە چاکە خراپە دەسڕێتەوە نەك بە پێچەوانەوە، قورئان دەفەرموێت ﴿إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ هود: ١١٤، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((لە هەر شوێنێك هەیت لە خودا بترسە، بەدوای خراپەدا چاکە ئەنجام بدە دەیسڕێتەوە، لەگەڵ خەڵکی بە ڕەوشتی جوان تێکەڵ ببە)).

وتراوە: قورئان و سوننەت ئاماژە بە کێشانە و پێوانەی هەموو کردارەکان دەکەن، لێرەشەوە باس لە پووچبوونەوەی چاکە بە خراپە دەکرێت، قورئانیش بەشێکی دژایەتی نییە لەگەڵ بەشێکی تریدا، قورئان ڕەد ناکرێتەوە تەنها لەبەر ئەوەی موعتەزیلە -ئەهلی ئارەزوو و دەمارگیری- ئەو ڕایەیان هەیە، بەڵکو حەق هەر کەس بیڵێت ئێمە قبووڵی دەکەین، باتڵیش هەر کەس بیڵێت ڕەد دەکرێتەوە.

کێشانە و پێوانەی کردارەکان لەم سوورەت و ئایەتانەدا ئاماژەی پێکراوە ((الأعراف(٨-٩)، الأنبياء (٤٧)، المؤمنون (١٠١-١١١)، القارعة، الحاقة (١٩-٣٧))

بۆ پووچەڵکردنەوەی کردارەکان: خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَلَا تُبۡطِلُوٓاْ أَعۡمَٰلَكُمۡ ٣٣﴾ محمد: ٣٣، "بەتاڵبوونەوە" لێرەدا بە "پاشگەزبوونەوە" تەفسیر کراوە، چونکە گەورەترین بەتاڵکەرەوەیە، نەك بەتاڵکەرەوە لەناو پاشگەزبوونەوەدا بێت، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ كَٱلَّذِي يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ﴾ البقرة: ٢٦٤، ئەم دوو هۆیە -منەت و ئازار- دواتر ڕوویکردە بەخشین و بەتاڵیان کردەوە، خودای موتەعال لە پووچبوونەوەی پاداشتی هەر یەك لەو دوانە بەتاڵ کردنەوەکەی -بە منەت و ئازار- شوبهاندووە بە حاڵی بەخشندەیەکی ریاباز، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ٢﴾ الحجرات: ٢، لە فەرموودەی سەحیحدا لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی ((هەر کەس نوێژی عەسری واز لێ هێنا کرداری چاکەی بەتاڵ بووەتەوە))، عائشە -خودای لێ ڕازی بێت- بە دایکی کوڕێکی "زەیدی کوڕی ئیبن ئەرقەم" -کە فرۆشرابوو- فەرمووی ((هەواڵ بە زەید بدە کە جیهادەکەی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بەتاڵ بووەتەوە مەگەر تەوبە بکات))، ئیمامی ئەحمەد لەسەر ئەم ریوایەتە ئەفەرموێت: بەندە گەر لە خۆی

ترسا دەتوانێت ژن بهێنێت، قەرز بكات و ژن بهێنێت، با نەكەوێتە ناو حەرامەوە و كردارەكانی پووچ ببنەوە.

گەر رێسای شەریعەت جێگیر بوو-كە هەندێك خراپە هەن چاكە دەشۆرنەوە بە كۆدەنگی و هەندێكیش بە دەقی رۆشن- دروستە بڵێین كە خراپەی گەڕانەوە بۆ سەر گوناهان چاكەی تەوبە دەسڕێتەوە، تەوبە وای لێ دێت وەك ئەوەی هەر نەكرابێت، هەردوو كردارەكە یەك دەگرن و پەردە لە نێوانیاندا نامێنێتەوە، بۆیە كاریگەری بۆ هەردووكیان دەگەڕێتەوە.

**دەڵێن:** قورئان و سوننەت و كۆدەنگی سەلەف لەسەر كێشانە و پێوانەكردنی كردارن، سوودەكەی: بەهەندگرتنی تای قورس و بۆیە كاریگەری و كاری بۆ ئەو لە خوار تای سوكەوەیە، ئیبن مەسعود-خوای لێ رازی بێت- دەفەرموێت ((لە رۆژی دواییدا خەڵكی دادگایی دەكرێن، هەر كەس خراپەكانی بە یەك دانە لە چاكەكانی زۆرتر بوو دەچێتە ناو ئاگرەوە، هەر كەس چاكەكانی بە یەك دانە لە خراپەكانی زۆرتر بێت دەچێتە بەهەشتەوە))، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿وَٱلْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ ۚ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٨﴾ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُم﴾ الأعراف: ٨ - ٩، پاشان فەرمووی: ((ترازوو بە كێشی گەردیلەیەك دادەبەزێت یان بەرز دەبێتەوە))

دەستەیەكی تر بەڵگە دەهێننەوە-ئەو دەستەیەی كە دەڵێن گوناهی ئەو خراپانەی پێشتری بۆ ناگەڕێتەوە كە تەوبەكەی شكاند- چونكە ئەو گوناهانە بە تەوبەكە سڕاونەتەوە و وەك ئەوەیان لێهاتووە كە ئەنجامی نەدابێت، وەك ئەوەی هەر نەبن، بۆیە جارێكی تر بۆی ناگەڕێنەوە، بەڵكو گوناه گوناهی تێهەڵچوونەوەیە، نەك رابردوو.

**دەڵێن:** مەرجی تەوبە بێگوناهی نییە هەتا مردن، بەڵكو گەر پەشیمان بوویەوە و دەستی لە گوناه گرتەوە و لێبڕا بۆ ئەوەی نەگەڕێتەوە سەری: گوناهەكانی دەسڕێنەوە، گەر تێیهەڵكردەوە گوناهەكانی تێهەڵدەكەنەوە.

دەڵێن ئەمە وەك بێباوەڕبوون نییە كە كردارەكان پووچ دەكاتەوە، بێباوەڕیی شتێكی ترە بۆیە هەرچی چاكەیە دەیسڕێتەوە، گەڕانەوە بۆ سەر گوناه ئەوەی ئەنجامی داوە لە چاكە بەتاڵ ناكاتەوە.

**دەڵێن:** تەوبە گەورەترین چاكەیە گەر گەڕانەوەی بۆ گوناه بەتاڵی بكاتەوە ئەوا چاكەكانی تریش بەتاڵ دەكاتەوە، ئەمەش قسەیەكی باتڵە و هاوشێوەی مەزهەبی

خەواریجەکانە کە بە گوناه خەڵکیان بێباوەڕ دەکرد، هەروەها هاوشێوەی مەزهەبی موعتەزیلەیە کە پێیان وایە کە بە گوناهی گەورە موسڵمان لە ئاگردا بۆ هەتاهەتایە دەمێنێتەوە، با هەزاران چاکەی ئەنجام دابێت، هەردوو دەستەکە هاوڕان لەسەر ئەوەی کە خاوەن گوناهی گەورە بۆ هەتاهەتایە لە ئاگردا دەمێنێتەوە، بەڵام خەواریجەکان بە کافریان دانان، بەڵام موعتەزیلەکان بە فاسق، هەردوو مەزهەبەکە لە ئیسلامدا باتڵە، پێچەوانەی قورئان و فەرموودە و ئەقڵ و دادپەروەری خودایە ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةٗ يُضَٰعِفۡهَا وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿٤٠﴾ ﴾ النساء: ٤٠

دەڵێن: ئیمام ئەحمەد لە مەسنەدەکەیدا هێناویەتی بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) بەرزکراوەتەوە ((إن الله يحب العبد المفتن التواب))

دەڵێم: ئەوە ئەو کەسەیە هەرکات بە گوناه تووشی فیتنە دەبێت تەوبە دەکات، گەر گەڕانەوە بۆ سەر گوناه تەوبەکەی پووچ بکردبایەتەوە خۆشەویستی خودا نەدەبوو، بەڵکو سەری دەکێشا بۆ رقی خودایی.

دەڵێن: خودای موتەعال قبووڵی تەوبەی گرێداوە بە داوای لێخۆشبوون و بەردەوام نەبوون و نەگەڕانەوە بۆ سەر گوناه، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ ﴾ آل عمران: ١٣٥، سووربوون: دامەزراندنی دڵە لەسەر ئەنجامدانی گوناه کەی بۆی رێکبکەوێت، ئەمە ئەو کەسەیە لێخۆشبوونی لێ قەدەغە دەکرێت.

دەڵێن: بەردەوامبوونی تەوبە: مەرجی کەماڵ و سوودی تەوبەیە، نەک مەرجی دروستیی تەوبەکەی لەوەی لێی وەشاوەتەوە، پەرستشەکانیش بەو جۆرە نین، وەك رۆژوو و ژمارەی رکاتەکانی نوێژ، ئەوانە یەك پەرستشن وەرناگیرێن بە ئەنجامدانی هەموو پایە و بەشەکانی نەبێت، بەڵام تەوبە بریتییە لە ژمارەیەك بەندایەتی بە ژمارەی گوناهەکان، هەر گوناهێك تەوبەیەکی تایبەت بەخۆی هەیە، گەر بەندایەتییەکی ئەنجام دا و یەکێکی تری واز لێ هێنا، ئەوا ئەوەی وازی لێ هێناوە نابێتە هۆی بەتاڵبوونەوەی ئەوەی ئەنجامیداوە، وەك پێشتر ئاماژەی پێدرا.

بەڵكو هاوشێوەی ئەمە: لە رەمەزان هەندێك بگرێت و هەندێك بشكێنێت بەبێ بيانوويەكی شەرعی، ئايا ئەوەی شكاندوويەتی پاداشتی ئەو رۆژانە بەتاڵ دەكەنەوە كە بەرۆژوو بووە؟

يان هاوشێوەی ئەو كەسەی نوێژ دەكات و بەرۆژوو نابێت، يان زەكات دەدات و حەج ناكات.

خاڵی بابەتەكە: تەوبەی پێشتر چاكەيە و گەڕانەوە بۆ گوناه خراپەيە، بۆيە گەڕانەوەكە ئەو چاكەيە بەتاڵ ناكاتەوە، وەك چۆن ئەو بەراوردپێكراوانە يەكتر بەتاڵ ناكەنەوە.

دەڵێن: ئەمە لەسەر رەوگەی ئەهلی سوننەت دياتر و رۆشنترە، ئەوان كۆدەنگيان هەيە كە تەنها كەسێك لە يەك كاتدا –لە دوو رووی جياوازەوە– دۆستايەتی خودا و دوژمنايەتی خودای تێدايە، خۆشەويستە لەلای خودا لەڕوويەكەوە و ناباش و خراپە لەلای خودا لەڕوويەكی ترەوە، بەڵكو دەگونجێ باوەڕ و نيفاق و باوەڕ و بێباوەڕی تێدا بێت، لە يەكێكيانەوە نزيكتر بێت تا ئەويتريان، بۆيە ببێتە ئەهلی ئەوەيان، وەك خودای موتەعال دەفەرموێت﴿ هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَانِ ﴾ آل عمران: ١٦٧ ﴿ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِاللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾ ﴾ يوسف: ١٠٦، باوەڕ بە خودای بۆ جێگير كردن لەگەڵ نزيكبوونەوە لە كوفر، گەر ئەو هاوەڵدانانەدا بەدرۆ زانينی پێغەمبەرانی تێدابێت ئەو كاتە باوەڕ بە خودايەكەيان سوودێكيان پێناگەيەنێت، گەر بەڕاستزانينی پێغەمبەرانی تێدابێت و چەندين جۆر هاوەڵدانانيان بۆ خودا بڕيار دابێت لە باوەڕ بە پێغەمبەران و رۆژی دوايی دەريان ناهێنێت، ئەوانە شايستەی هەڕەشەی توندترين لەوانەی گوناه و تاوانی گەورە ئەنجام دەدەن.

هاوەڵدانانيان بۆ خودا دوو بەشە: هاوەڵدانانێكی شاراوە، لەگەڵ هاوەڵدانانێكی ئاشكرا، ئاشكراكەيان تەنها بە تەوبەكردن خودا لێی خۆشدەبێت، چونكە خودا خۆش نابێت هاوەڵی بۆ دابنرێت، بەم بنچينەيە ئەهلی سوننە باوەڕيان وايە ئەهلی گوناهی گەورە دەچنە ناو ئاگرەوە، پاشان دەردەهێنرێن و دەخرێنە بەهەشتەوە، لەبەر ئەو دوو هۆی گرتوويانەتە بەر.

گەر ئەمە ساغبوويەوە ئەوا ئەو كەسەی دەگەڕێتەوە بۆ گوناه لەلای خودا كەسێكی بێزراوە بەهۆی گەڕانەوەی بۆ سەر گوناهەكانی، خۆشەويستە بەهۆی تەوبەكردنەكە و

چاکەکانی پێشوویەوە، خودای موتەعال بە حیکمەت و دادپەروەری لەسەر هەر هۆیەك شوێنەوار و دەرئەنجامەکەی ڕێکدەخات و کێشی گەردیلەیەك ستەم ناکات ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ٤٦﴾ فصلت: ٤٦.

## ۞ باشی سەرئەنجام زەخیرەی تەمەن پارێزگاری لێ دەکات

گەر خراپە تازەکانی چاکە کۆنەکانی لە خۆیدا نوقم کرد و پووچی کردەوە، پاشان تەوبەیەکی یەکجاریی پاکی لە هەموو گوناهان کرد ئەوا چاکەکانی بۆ دەگەڕێتەوە، حوکمەکەی وەك حوکمی تێهەڵچوونەوە نییە، بەڵکو پێی دەوترێت: تەوبەت کرد لەسەر ئەو چاکانەی پێشتر ئەنجامت دابوون، چاکەی ئەنجامت داون لە ئیسلامدا مەزنترن لەو چاکانەی بێباوەڕ ئەنجامی دەدات لەناو بێباوەڕیدا: لە ڕزگارکردنی کۆیلە و خێر و سەدەقەکردن وبەجێهێنانی سیلەی ڕەحم، حەکیمی کوڕی حوزام دەڵێت ((ئایا ئەو کۆیلانەی لە پێش ئیسلامدا ڕزگارم کردوون و ئەو خێر و سەدەقانەی ئەنجامم داون و ئەو سیلەی ڕەحمەی کە گەیاندوومە چۆنن؟ ئایا هیچ پاداشتێکم بۆ هەیە؟ پێغەمبەر فەرمووی: موسڵمان بووی لەسەر ئەو پێشینە خێرەی کە هەتبووە))، ئەوەش لەبەر ئەوەی خراپەی نێوان دوو چاکە بە تەوبە لابراوە، وەك ئەوەی نەبووبن، هەردوو چاکەکە یەکیان گرت، خودا باشتر دەزانێت.

## ۞ تەوبەی دڵ تەواوە

لە یاسا و ڕێساکانی: کەسی یاخیبوو گەر گوناهەکەی بۆ ڕێکنەکەوت و دەستەوسان بوو لە ئەنجامدانی بەجۆرێك نەتوانێت ئەنجامی بدا، ئایا تەوبەکەی دروستە؟ ئەمەش وەك درۆزن و کەسی تۆمەتبەخش و شایەتی درۆ کە زمانی بڕابێت، زیناکەرێك ئەندامی نێرینەی یان مێیینەی بڕابێت، دزێك هەر چوار پەلی نەبێت، تەزویرچییەك دەستی بڕابێت، هەر کەس گەیشتبێتە سنوور و رادەیەك نەتوانێت ئەو گوناهەی هەیە ئەنجامی بدات.

ئەوەی دەردەکەوێت: تەوبەکەی دروست و گونجاوە، بەڵکو ڕاستییە، چونکە پایەکانی تەوبە تیایدا کۆدەبێتەوە، ئەوەی دەستی بەسەردا دەڕوات بریتییە لە پەشیمانی، لە فەرموودەیەکی بەرزکراوەدا لە مەسنەد ((پەشیمانی بریتییە لە

تەوبە))، ئەگەر پەشیمانی لەسەر گوناهەکە بۆ دروست بوو و لۆمەی نەفسی خۆی کرد لەسەری ئەوە تەوبەی کردووە.

چۆن دروستە تەوبەی لێ وەربگرینەوە لەگەڵ پەشیمانی زۆری کەسەکە لە گوناه و لۆمەکردنی نەفسی خۆی؟ بەتایبەت ئەوەی بەدوایدا دێت لە گریان و خەم و ترس و لێبڕانی تەواو و نیێتی ئەوەی گەر لەشساغ بووایە و بیتوانیبایە ئەو کارە خراپانە بکات ئەوا هەرگیز ئەنجامی نەدەدان؟

گەر خودای موتەعال کەسی دەستەوسان و پەککەوتە لە کاری چاکە لە جێگەی ئەوانە داناوە کە کارەکان ئەنجام دەدەن گەر نیێتی دروست بێت، وەك فەرموودەی پێغەمبەر لە فەرموودەیەکی سەحیحدا ((ئەگەر کەسێك نەخۆش کەوت یان سەفەری کرد ئەو کاروکردەوە چاکانەی بۆ دەنوسرێت کاتێك لەشساغبووە و نیشتەجێ بووە ئەنجامی داون))، لە فەرموودەیەکی سەحیحی تردا ((خەڵکانێك لە مەدینە هەن ڕێگەیەکتان نەبڕیوە و بە دۆڵێکدا تێنەپەڕیون ئەوانتان لەگەڵ نەبێت، وتیان ئەی پێغەمبەری خودا، بەڵام ئەوان لە مەدینەن؟ فەرمووی: ئەوان لە مەدینەن، بەڵام پاساویان هەبوو))، هاوشێوەی ئەمە لە فەرموودەدا زۆرە، تەماشاکردنی کەسی دەستەوسان لە گوناه و دوورەپەرێز بەهۆی ناچارکردنییەوە—لەگەڵ بوونی نیێت لە نەکردنی بە ویستی خۆی گەر بیتوانیبایە— وەك کەسێك کە دەتوانێت گوناه بکات و ئەنجامی نادات لەپێشترە.

### ❁ گەردنی خۆمان بەوانە ئازاد دەکەین ستەممان لێ کردوون

لە یاسا و ڕێساکانی: گەر گوناهەکە حەقی مرۆڤێکی تێدابوو: ئەوا تەوبەکار دەبێت لەو حەقە دەربچێت، یان بە گێڕانەوەی حەقەکە یان بە ئازادکردنی گەردنی خۆ پێی دوای ئەوە ئاگاداری دەکەیەوە لەسەر حەقەکەی، گەر حەقەکە حەقێکی دارایی یان دەستدرێژییەك بۆ سەر جەستەی یان جەستەی میراتگرێکی بوو، وەك لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ساغبووەتەوە فەرموویەتی ((هەر کەس لە براکەی ستەمێکی کردووە لە ماڵ یان لە نامووس، با گەردنی خۆی پێ ئازاد بکات، بەرلەوەی دینار و درهەم بوونی نەمێنێت و تەنها چاکە و خراپە بمێنێتەوە)).

گـەر سـتەمەكە بـە خـراپ ناوهێنـانی بـوو، غەیبـەتی كردبـوو یـان بوختـانی بـۆ هەڵبەستبوو، یان مەرجە بۆ تەوبەكەی كەسەكە ئاگادار بكات بەو شـتە تـاكو گـەردنی خۆی پێ ئازاد بكات؟ یان تەنها ئەوەندە بەسە كە ئاگاداری بكات كە دەمی خسـتۆتە حورمەتی، یان مەرج نییە بۆی دیاری بكەیت، یان هیچ كام لەو دوانە بەمەرج ناگیرێن، هەر ئەوەندە بەسە لە تەوبەكەیدا لە نێوان خودا و خۆیدا تەوبـە بكـات بـەبێ ئـەوەی ئاگاداری ئەو كەسە بكات كە غەیبەتی كردووە یان بوختانی بۆ دروست كردووە؟

**وەڵامەكەی سێ بۆچوونە:**

لە ئەحمەدەوە دوو ریـوات كـراوە دەربـارەی سـنووری تۆمـەت بەخشـینەوە، ئایـا لـە تەوبـەی كەسـی تۆمـەت بەخشـدا مەرجـە كەسـە تۆمـەت بـۆ هەڵبەسـتراوەكە ئاگـار بكرێتەوە و گەردنی خۆی پێ ئازاد بكات یان نە؟ لـە دوو ریوایەتەكـە تەوبـەی كەسـی غەیبەتكەر و جنێودەر دەرهێنراوە.

ئەوەی لە مەزهەبی "شافیعی و ئەبی حەنیفە و مالیـك"دا ئاشـكرایە ئەوەیـە: مـەرجی ئاگادار كردنەوەی كەسەكە و گەردنی خۆ پـێ ئـازاد كـردن، هـاوەڵانی ئـەو سیانە لـە كتێبەكانیاندا بەو جۆرە باسیان كردووە.

ئەوانەی ئەوەیان بـە مـەرجگرتووە بەڵگەیان هێناوەتـەوە بـەوەی گـەر گونـاه حـەقێكی مرۆڤی تێدابوو ئەوا تا گەردنی خۆی پێ ئازاد نەكات لە كۆڵی نابێتـەوە. پاشـان ئەوانـەی تەنها گەردن ئازادی لە حەقێكی نادیار بە راست نابینن بە مـەرجیان گرتـووە كـە دەبێـت كەسەكە بـە خـودی گوناهەكـە دەرحـەقی ئاگـادار بكرێـت، بەتایبـەت گـەر ئـەو كەسـەی حەقەكەی لەسەرە برەكەی دەزانی، بۆیە دەبێت ئاگادار بكرێتەوە لە حەقە خوراوەكەی، چونكە لەوانەیە كەسەكە گەردنی ئازاد نەكات گەر بڕی مافە خوراوەكەی بزانێت.

بەڵگەیان بەو فەرموودەی پێشوو هێناوەتەوە كـە دەفـەرموێت ((هـەر كـەس لـە براكـەی ستەمێكی كردووە لە ماڵ یان لە نامووس، با گەردنی خـۆی پـێ ئـازاد بكـات، بەرلـەوەی دینار و درهەم بوونی نەمێنێت و تەنها چاكە و خراپە بمێنێتەوە)).

دەڵێن: لەو خراپەدا دوو ماف هەیە: مافێكی خودا و مافێكی مرۆڤ، تەوبەكردن لێی بە گەردنی خۆ ئازاد كردن لە پێناوی مافەكەیدایە، پەشیمانیش لەو گوناهە لەنێوان خۆی و خودادا بۆ مافی خودایە لەسەری.

دەڵێن: بۆیە تەوبەی کەسی بکوژ دروست نییە تا خۆی نەداتە دەست خاوەن خوێنەکە، گەر بیەوێت تۆڵە دەکاتەوە یاخود لێی دەبورێت، هەر بەو جۆرە تەوبەی کەسی رێگر و چەتە.

بۆچوونی دووەم: مەرج نییە ئاگادار بکرێت بەوەی زمانی لە ناموسیدا بەکارهێناوە و غەیبەتی کردووە و تۆمەتی داوەتە پاڵی، بەڵکو تەنها تەوبەکردنی لەنێوان خۆی و خودادا بەسە، لەو شوێنەی غەیبەتی کردووە و ناوی بە خراپە هێناوە بەباشی ناوی کەسی غەیبەتکراو و تۆمەتبارکراو بهێنێت، غەیبەتەکەی بگۆڕێت بۆ مەدح و سەنا لەسەری و باسی چاکەکانی، پاکێتی و خۆپارێزییەکانی، داوای لێخۆشبوونی بۆ بکات بە ئەندازەی ئەو غەیبەت کردن و بە خراپە ناوهێنانە.

ئەمە هەڵبژاردەی شێخمان "أبي العباس إبن تيمية"یە-قدس الله روحه-.

خاوەنی ئەم بۆچوونە بەوە بەڵگە دەهێننەوە کە ئاگادارکردنەوەی خراپەی لێوە بەرهەم دێت و بەرژەوەندی تێدا نییە، ئازار و خەم و دڵتەنگی زۆرتر بۆ ئەو کەسە دروست دەکات، ئەو بەر لە بیستنی ئاسوودە بوو، گەر ببیستێت لەوانەیە ئارام نەگرێت لەسەری و زیان بە نەفس و جەستەی بگەیەنێت، وەك شاعیرێك دەڵێت:

فإن الذي يؤذيك منه سماعه      وأن الذي قالوا وراءك لم يقل

(ئەوەی ئازارت دەدات ئەوەیە کە دەیبیستی، ئەوەی لە پاشملە وتیان نەوتراوە)

هەر گوناهێك بەم جۆرە بوو خودا بە رەوای نابینێت کەسەکەی لێ ئاگادار بکرێتەوە، چجای بەپێویستی بزانێت و فەرمانی پێ بکات.

دەڵێن: لەوانەیە ئاگادار کردنەوەی بەو حەقەی هۆیەك بێت بۆ دوژمنایەتی و لەنێوان ئەو کەسەکەی تردا، هەرگیز دڵی بەرانبەری ساف نابێت، زانستی بەو کارە دوژمنایەتی و رقێکی وا دروست دەکات کە شەڕێکی لێوە بەرهەم بێت گەورەتر و خراپتر لە غەیبەت و تۆمەتەکە، ئەمەش پێچەوانەی مەبەست و مەرامی خاوەن شەرعە لە نزیکردنەوەی دڵان و سەرهەڵدانی بەزەیی و سۆز و خۆشەویستی.

دەڵێن: جیاوازی نێوان ئەوە و مافی دارایی و دەستدرێژی جەستەیی لە دوو رووەوەیە:

یەکەم: سوودی لێ دەبینێت گەر مافەکەی بۆ گەڕایەوە، بۆیە نابێت حەقەکەی لێ بشاریتەوە، ئەوە مافێکی خۆیەتی، بۆیە پێویستە بۆی بگەڕێتەوە، بە پێچەوانەی

غەیبـەت و تۆمەتـەوە کـە سـوودێکی پـێ ناگەیـەنێت جگـە لـە زیـان و هەڵچـوون، پێوانەکردنی ئەوە بۆ سەر ئەمە لە خراپترین کێشانە و پێوانەیە.

دووەم: ئەگەر پێی ئاگادار بکرێـت ئـازاری نـادات، نـە تـووڕەیی و نـە هەڵچوون رووی تێناکات، بەڵکو لەوانەیە دڵخۆش بێت پێی، بە پێچەوانەی ئاگادار کردنەوەی بە شتێك کە شەوانە و رۆژانە حورمەت و ناموسی لەکەدار کردووە، بە چەندین جـۆر تۆمـەت و غەیبەت و هێرش، دانانی ئەمە لە پاڵ ئەوەدا دانانێکی بێجێیە، ئەمەیان راسترینی دوو بۆچوونەکەیە وەك بینیت، خودا باشتر دەزانێت.

## ۞ گەر بە گوناه دابەزێت بە تەوبە بەرز دەبێتەوە

لە یاسا و رێساکانی: بەندە کە لە گوناه تەوبە دەکات ئایا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پلەیەی پێش کردنی گوناهەکە لێی بەربووبوویەوە، یـان ناگەڕێتـەوە بـۆی؟ دروسـت ئەوەیـە: هەندێك لە تەوبەکاران ناگەڕێنەوە بـۆ پلـەی یەکـەمجاریان، هەنـدێکیش دەگەڕێنـەوە، بەڵکو پلەی باڵاتر لەوەی یەکەم جار بەدەسـت دەهێـنن، بۆیـە باشـتر و چـاکتر و پلـە بەرزتر دەبێت لە پـێش ئەنجامـدانی گوناهەکـە، هەرچـەند کەسـانێکی وەك ئـەو هـەن دەچنەوە بۆ دۆخی یەکەمجاریان و هەیانە خوارتر لەو ئاستە و دابەزیو لە پلە.

ئەمە بە دوو نموونە رۆشن دەبێتەوە:

یەکەم: پیاوێکی موسافیر بە دڵنیایی و ئارامی و ئاسایشەوە بە رێگەیەکدا تێدەپـەڕێت، تاوێك بە پرتاو و تاوێك بە رۆیشتنی ئاسایی رێگە دەبڕێت، تاوێك پشـوو دەدات و تاوێـك دەخەوێت، ئەو لەو بارەدا بوو لەناکاو باخ و بیستان و سێبەر و ئاوێکی سارد هاتە سـەر رێگەی، نەفسی پاڵینا بۆ ئەوەی سەرێك بکێشێتە ئەو جێگەیە، بۆیـە رۆیشـتە ناویـەوە، دوژمنێك دای بەسەریدا، گرتی و کۆت و بەنـدی کـرد و لـە سـەفەرەکەی وەسـتاندی، تـا نزیك بوویەوە لە تیاچـوون، وا گومـانی بـرد کـە تیاچـووە و دەبێتـە ژەمـی گیانـداران و ئاژەڵانی دڕندە، وا گومانی برد لەو مەرامە دابڕا کە سـەفەرەکەی بـۆ گرتبـووە بـەر، لـە کاتێکدا ئـەو لـەو دۆخـەدا گومـان دایدەگرتـەوە لـەناکاو بـاوکی بەبـەزەیی و بـەتوانای گەیشتە سەری، کۆت و بەندەکەی کردەوە، پێی وت: بچۆرەوە سەر رێگەکەت و ئاگـات لەو دوژمنە بێت، ئەو لە قۆناغـەکانی رێگەتـدا بـۆت لـە شـکاردایە، بزانـە تـا خـۆتی لـێ

بپارێزێت و بێدار بێت توانای بە سەرتدا نییە، کە بێئاگابووی هێرش دێنێتە سەرت، من بۆ شوێنی مەبەست پێشت دەکەوم، لە پێشەوەم و شوێنپێکانم هەڵبگرە.

گەر موسافیرەکە کەسێکی ژیری زیرەکی هۆشیار بوو، زەین و ئەقڵی ئامادە بوو، بە جۆرێکی تر دەست بە سەفەرەکەی دەکاتەوە، بەهێزتر لە یەکەم و جار و تەواوتر، ئاگاهیی و خۆپارێزی زیاد دەکات، خۆی بۆ ئەو دوژمنە ئامادە دەکات، بەو جۆرە رۆیشتنی دووەمی بەهێزتر چاکتر دەبێت لە یەکەمی، گەیشتنی بە مەنزڵ خێراتر دەبێت، گەر لە دوژمنەکەی بێئاگابوو کەوتەوە سەر باری یەکەمجاری بەبێ زیاد و کەم و بەبێ هێزی خۆپارێزی و ئامادەباشی، دەگەڕێتەوە بۆ هەمان دۆخی یەکەمجاری، لەو بارەدا ئەگەری ئەوە هەیە جارێکی تر تێبکەوێتەوە.

گەر ئەو بەدیلگرتنە خاوبوونەوە و ساردبوونەوەی بۆ دروست کرد و بیری دەکردەوە لە خۆشی مانەوەی ناو باخ و بێستانەکە و ئاوی سازگار و سێبەری چڕوپڕ و سوکنایی دڵی بۆ ئەو شوێنە ئەوا ناگەڕێتەوە بۆ هەمان جێگە و لە کەمی دەدات.

**نموونەی دووەم:** بەندەیەك لە تەندروستی و لەشساغی و نیعمەتدا بوو، تووشی نەخۆشییەك بوو ناچاری کرد خۆپارێزی بکات و دەوا بخواتەوە و خۆی لە تێکەڵاوی بپارێزێت، بەو نەخۆشییە مادەیەکی ناباش لە جەستەیدا کەمی کرد کە بووبووە هۆی لاوازی هێز و تەندروستی ئەو، دوای نەخۆشییەکە بەهێزتر لە جاران دەرکەوتەوە، وەك وتراوە:

لعل عتبك محمود عواقبه ‌‌‌‌‌‌‌‌ وربما صحت الأجسام بالعلل

(لەوانەیە سەرزەنشت کردنەکەت سەرئەنجامی باشی هەبێت، لەوانەیە بە نەخۆشی جەستە تەندروست ببێت)

گەر ئەو نەخۆشییە لاوازی لە هێز و تواناداا بۆ بەرهەم هێنا بە ئەندازەی کەمی هێزی فریای خۆی کەوت دەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەو دۆخەی بەر لە نەخۆشییەکە لەسەری بوو.

گەر فریای ئەو کەمکردنەی هێز و توانای نەکەوت ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ ناو دۆخێك کەمتر لەوەی پێش نەخۆشییەکە لەسەری بوو.

ئەم دوو نموونەیە بەسە بۆ کەسێك لێیان تێبگات.

بۆ ئەم مەبەستە نموونەیەكی تر هێنراوەتەوە بە پیاوێك لە ماڵەوە دەردەچێت بۆ نوێژی جەماعەت، دەیەوێت لە ریزی یەكەمدا فریای نوێژ بكەوێت، لەسەر رێگەكەی لا بەلای هیچ شتێكدا ناكاتەوە، پیاوێك لە دواوە لە جلوبەرگەكەی دەنەوێت كەمێك رایدەگرێت، دەیەوێت بۆ گەیشتنە نوێژەكەی لەمپەری بۆ دروست بكات، لەو بارەدا یەكێك لەم دوو هەڵوێستەی هەیە:

**یەكەم:** بەو كەسەوە خەریك بێت تا نوێژەكەی دەچێت، ئەمەیان حاڵی كەسێكە تەوبەی نەكردووە.

**دووەم:** خۆی رادەكێشێت و لەدەستی خۆی قوتار دەكات بۆ ئەوەی نوێژەكەی نەچێت.

**لەدوای ئەو خۆ قوتاركردنە سێ حاڵی هەیە:**

**یەكەم:** رۆیشتنەكەی هەڵهاتن و راكردن بێت بۆ ئەوەی باربووی ئەو كاتە بكاتەوە كە دواكەوتووە، لەوانەیە باربووی بكاتەوە و زیاتریش لەوەی لەدەستی چووە.

**دووەم:** بگەڕێتەوە بۆ هەمان رۆیشتنی یەكەمجاری.

**سێیەم:** ئەو وەستانە ساردبوونەوە و خاوبوونەوەی بۆ دروست بكات، خێری ریزی یەكەمی لەدەست بچێت، یان خێری نوێژی بە كۆمەڵ و سەرەتای دەستپێكردنی، حاڵی تۆبەكاران و رێبوارانیش بەم جۆرەیە.

۞ ۞ ۞

## بەراوردكاری

ئەمە بە بابەتێكی شكۆمەند روون دەبێتەوە، ئەویش ئەوەیە: ئایا ئەو كەسەی گوێڕایەڵ و چاكەكارە و خراپەی لێ ناوەشێتەوە چاكترە لەو كەسەی یاخیبوونی لێدەوەشێتەوە و پاشان تەوبە دەكات و بە تەوبەیەكی یەكجاریی، یان ئەو تەوبەكەرە باشترە لەو؟

### ۞ جوانی بەرائەت

دەستەیەك ئەو كەسەی گوناه ناكات بەباشتر دەزانێت لەو كەسەی گوناه دەكات و دواتر تەوبەیەكی یەكجاریی دەكات، ئەمەش لە چەند روویەكەوە:

یەكەم: باشترین و كامڵترین دروستراوی خودا گوێڕایەڵترینیانە بۆ خودا، ئەوەی گوناه ناكات گوێڕایەڵترە بۆیە باشترینیانە.

دووەم: لە زەمەنی خەریكبوونی گوناهكەر بە ئەنجامدانی گوناهەوە كەسی گوێڕایەڵ چەندین قۆناغ پێشكەوتووە، بۆیە پلەی باڵاترە لە كەسی گوناهكەر، ئامانجەكەی: كاتێك تەوبەی كرد روو لە رۆیشتن بەرەو خودا دەكات بۆ ئەوەی پێی بگاتەوە، ئەوەش بە رۆیشتنێكی تر بەرەو خودا، ئیتر چۆن پێی دەگاتەوە؟ ئەو دوانە وەك دوو پیاو وان لە كەسابەتدا شەریكبن، هەر كات یەكێكیان برێك خێر دەكات، ئەویرتیان هەمان بڕ خێر دەكات، یەكێكیان ئەوەی پەیدای كردووە بەفیڕۆی دەدات و دەست دەكاتەوە بە پەیداكردنی برێكی تر، بەڵام ئەویتریان لە كەسابەتەكەیدا كەسێكی تێكۆشەرە، گەر گوڕوتینی ململانێی بگاتێ و دەست بە كەسابەت بكاتەوە دەبینێت هاورێكەی لەو ماوەیەدا خێرێكی زۆری كردووە، هەرچەندی خێر كردبێت برادەرەكەشی هەمان خێری كردووە، ئیتر چۆن پێی یەكسان دەبێت؟

سێیەم: ئامانجی تەوبە ئەوەیە خراپەكان لەسەر ئەو كەسە هەڵبگیرێن و وەك كەسێكی لێ بێت كە ئەنجامی نەداون، بۆیە كۆششی لە ماوەی یاخیبوونەكەیدا نە بۆ ئەوە نە لەسەر ئەوە، ئەم كۆششە لە كوێ و كۆششی كاسپیكەرێكی خاوەن قازانج لە كوێ؟

چوارەم: خودا رقی لەوانەیە لێی یاخی دەبن و سەرپێچی فەرمانەكانی دەكەن، لە ماوەی سەرگەرمی ئەو كەسە بە گوناه كردنەوە بەشەكەی بریتییە لە رقی خودا،

بەڵام بەشی گوێڕایەڵ بریتییە لە ڕەزامەندی خودا، خودا بە بەردەوامی لێی ڕازییە، گومانی تێدا نییە ئەم کەسە باشترە لەو کەسەی خودا لێی ڕازی بووە و دواتر بەهۆی گوناهەکانییە و ڕقی لێ هەڵگرتووە و پاشا بەهۆی تەوبەکەیەوە خودا لێی ڕازی بووە، ڕازامەندی خودایی بەردەوام باشترە لە ڕەزامەندییەك ڕقی خودای کەوتبێتە نێوانەوە.

پێنجەم: گوناه وەك خواردنەوەی ژەهر وایە، تەوبەکردن دەوا و چارەسەرەکەیەتی، گوێڕایەڵی تەندروستی و لەشساغییە، تەندروستی و لەشساغی بەردەوام باشترە لە تەندروستییەك خواردنەوەی ژەهر لە نێوانیدا بێت و دواتر چاکبووبێتەوە، لەوانەیە ئەو ژەهرە سەری لە نەخۆشی و هەمیشەیی و ناتەواویی هەمیشەییەوە دەربچێت.

شەشەم: کەسی یاخیبوو لەسەر ترس و هەڕەشەیەکی زۆر گەورەیە، هەمیشە بە دەوری سێ شتدا دەسوڕێتەوە:

یەکەم: تیاچوون و پەککەوتن بە خواردنەوەی ژەهرەکە، دووەم: لاوازبوون و بێهێزکردن گەر لە تیاچوون ڕزگاری بوو، سێیەم: گەڕانەوەی هێزی یەکەمجاری، یان باشتر لە هێزی یەکەمجاری.

بەزۆری دوو بەشی یەکەمە، لەوانەیە سێیەم زۆر دەگمەن بێت، ئەو دڵنیایە لە زیانەکانی خواردنەوەی ژەهر، هیوای وایە تەندروستی و لەشساغی بۆ بگەڕێتەوە، بەپێچەوانەی ئەو کەسەی کە ژەهری نەخواردۆتەوە.

حەوتەم: کەسی گوێڕایەڵ دیوارێکی بەرز و توندوتۆڵی بەدەوری باخی چاکەکانیدا هێناوە، دوژمن ناتوانێت بێتە ناویەوە، بەروبووم و گوڵ و سەوزی و جوانی و ڕازاوەیی باخەکەی بە هەمیشەیی لە گەشە و گوڕاندایە، یاخیبوو چەندین کەلەبەر بووەتە پەرژین و دیواری باخەکەی، کونی گەورەی تێبووە، دز و دوژمن دەتوانن بچنە ناویەوە، ڕۆیشتنە ناوی و بەچەپ و بەڕاستدا باخەکەیان وێران کرد، لق و پۆپی درەختەکانیان داهێنایە خوارەوە، دیوارەکەیان تێکوپێك شکاند، بەری درەختەکانیان کردەوە، هەندێ ئاگریان لەناویدا لێرە و لەوێ خستەوە، سەرچاوەی ئاوەکەیان لێبڕی و ئاودانیان کەم کردەوە، دەبێ ئەم باخە کەی بگەڕێتەوە بۆ دۆخی یەکەمجاری؟ گەر خاوەنەکەی فریای کەوت و وێرانکارییەکانی چاککردەوە و ئەوەی تێکدرابوو بینای کردەوە و سەرچاوە و ڕێگەی ئاوەکەی بە باخەکەی گەیاندەوە و ئەو وێران کرابوو ئاوەدانی کردەوە، ئەوا یان دەگەڕێتەوە بۆ دۆخی یەکەمجاری، یان کەمتر لە جاران

یـان باشـتر لـە جـاران، بـەڵام باخەکـەی لـە جـوانی و رازاوەییـدا ناگـات بـە بـاخی برادەرەکەی کە تـاکو ئێسـتا لـە گەشـە و بـەرەو پێشچـووندایە و بەروبومەکـەی دوو چەندانە بووە و درەختی نێژراوی زۆرتر لەئامێز دەگرێت.

هەشتەم: چـاوتێبڕینی دوژمـن لـەو یـاخیبووە بـەهۆی لاوازی زانسـت و لاوازی توانـا و لێبڕانییەوەیە، بۆیە بە نەزان یـان نـەفام ناودەبرێـت، قـەتادە دەفـەرموێت: هـاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ئەوە کۆدەنگن کـە هەرشـتێك بەهۆیـەوە لـە خـودا یـاخی بێـت بریتییە لە نەفامی، هەر بەو جۆرە خودا لە حەقی "ئادەم"داد دەفەرموێت ﴿وَلَمۡ نَجِدۡ لَهُۥ عَزۡمٗا ١١٥﴾ طه: ١١٥، لە حەقی کەسـانی تـردا دەفـەرموێت ﴿فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ﴾ الأحقاف: ٣٥، هەر کەس لێبڕانی بەهێز بێت و زانستی کامڵ بێـت و ئیمانی تەواو بێت دوژمنەکەی چاوی تێنابڕێت، بۆیە باشتر و پلە باڵاترە.

نۆیەم: گوناه شوێنەواری خراپ بەجێدەهێڵێت، یان بـە تیاچـوونێکی یـەکجاریی، یـان زیانۆمەندی و سزا بەدوایدا: یـان لێبـوردن و چـوونە نـاو بەهەشـت، یـان کـەمی پلـە و پایە، یاخود خامۆشبوونی چرای باوەڕ، کاری تەوبەکار بۆ لابردنی شـوێنەواری گونـاه و سڕینەوەیەتی، کاری کەسی گوێڕایەڵ لە زیادبوون و بەرزبوونەوەی پلە و پایەدایە.

بۆیە شەونوێژ بۆ پێغەمبەر(ﷺ) سوننەت بووە، ئەو بۆ بەرزبوونەوەی زیاتر لـە پلـە و پایە کاری کردووە، کەسانی تر کاریان بۆ لێخۆشـبوون و سـڕینەوەی گونـاه کـردووە، ئەمە لە کوێ و ئەوە لە کوێ؟

دەیەم: کەسی روو لە خودا و گوێڕایەڵ بۆی بە کۆی کردارەکانی بەرەو خودا دەچێت، تا گوێڕایەڵ و کاروکردەوەکانی زیاد بکات کەسابەتەکەی زیاتر و مەزنتر دەبێت، ئەوە وەك کەسێك وایە سەفەرێکی بازرگانی کردووە و دە بەرانبەری سەرمایەکەی قـازانجی بەدەست هێناوە، بۆ جاری سێیەم بە هەموو ئەو سـەرمایەوە سـەفەرێکی تـر دەکـات قەزانجەکەی هەر بەو جۆرە بوو (دە بەرانبەر بوو)، ئیتر بەو جۆرە، کە لە کۆتایـدا لـە سەفەکردن سارد دەبێتەوە، تەنها یەك جار سەفەر نەکردن بە قەدەر قازانجی هـەموو سەفەرەکانی، یاخود زیاتر خێری بازرگانی لەدەست دەچـێت، ئەمـە مانـای قسـەکەی "الجنید"ە-رەحمەتی خـودای لـێ بێـت- کـە دەفـەرموێت ((گـەر کەسـێکی راسـتگۆ هەزار ساڵ رووی لە خودا بـوو، پاشـان بـۆ سـاتێکی کـەم پشـتی لـە خـودا کـرد ئـەوا

ئەوەی لەدەستی چووە زۆرترە لەوەی بەدەستی هێناوە))، بەم مانایە ئەم قسەیە راستە، ئەو لە ماوەی پشتهەڵکردندا خێری هەموو ئەو کردارانەی لەدەست چووە، ئەوەش لە قازانجەکانی پێشوو زۆر زیاترە، گەر ئەمە حاڵی کەسێك بێت پشتی هەڵکردبێت، دەبێ ئەو کەسە چۆن بێت کە یاخی دەبێت و گوناه ئەنجام دەدات؟ ئەوەندەی باسمان کرد با بەس بێت.

## ۞ کەسی پێگەیشتوو جوانی خۆی هەیە.... هەروەها

دەستەیەك تەوبەکاری پێ باشترە هەرچەند نەرییێ ئەوە ناکەن کەسی بێگوناه چاکەی زۆرترە، ئەمانەش بە چەند شێوە و روویەك بەڵگە دەهێننەوە:

**رووی یەکەم:** بەندایەتی تەوبە خۆشەویسترین و بەرێزترین بەندایەتییە لەلای خودا، ئەو **-سبحانه-** تەوبەکارانی خۆشدەوێت، گەر تەوبە خۆشەویسترین شت نەبوایە لەلای ئەوا بەرێزترین دروستکراوی خۆی بە گوناه تووش تاقینەدەکردوە، لەبەر خۆشەویستی خودا بۆ تەوبەی بەندەکەی کە رووبەڕووی گوناهی کردۆتەوە ئەوەی خۆشیدەوێت لە تەوبەوە سەرهەڵدەدات و خۆشەویستی زیادە بە بەندەکەی دەبەخشێت، لای خودا تەوبەکاران خۆشەویستییەکی تایبەتیان هەیە، ئەوەی ئەم راستییە رۆشن دەکاتەوە:

**رووی دووەم:** تەوبە لای خودا **-سبحانه-** مەنزیلەیەکی تایبەتی هەیە کە چاکە و کاروکردەوەکانی تر بەو جۆرە نین، بۆیە خودا **-سبحانه-** بە تەوبەی بەندەکەی خۆشحاڵ دەبێت بە مەزنترین خۆشحاڵی کاتێك تەوبە دەکات و دەگەڕێتەوە بۆ لای، وەك پێغەمبەر(ﷺ) نموونەی هێناوەتەوە بە خۆشحاڵبوونی ئەو کەسەی خواردن و خواردنەوەکەی لەسەر وڵاخەکەیەتی لە زەوییەکی بیابانی تیابەردا، دوای ئەوەی لێی ون بوو، لە هۆکارەکانی ژیان بێهیوا بوو وڵاخەکە گەڕایەوە بۆ لای خاوەنەکەی، ئەم نموونەی خۆشحاڵ بوونە بۆ هیچ کارێکی چاکە نەهاتووە بۆ تۆبە نەبێت بەتەنها، ئەمەش لەنهێنییەکانی نووسینی گوناهە لەسەر بەندەکان، بەندە بە تەوبە پلەی خۆشەویستی بەدەست دەهێنێت و دەبێت بە خۆشەویستی خودا، خودا تەوبەکاران و بەندەیەکی تووشبوو بە گوناه و هەمیشە تەوبەکاری خۆشدەوێت، ئەم راستییە رۆشن دەکاتەوە:

**رووی سێیەم:** بەندایەتی تەوبە گەردنکەچی و دڵشکاوی تێدایە، پاشان سەرکزی و خۆبردنەبەرەوە بۆ لای خودا و زەلیلی و لارەملی، ئەمەش لە زۆر کاروکردەوەی رووالەتی لای خودا خۆشەویستترە با لە بڕ و چەندێتیدا لە بەندایەتی تەوبە زۆرتر بن، گەردنکەچی و سەرکزی و دڵشکاوی رۆح مۆخ و کرۆکی بەندایەتییە، رۆشنی دەکاتەوە:

**چوارەم:** بەدەستهێنانی پلەی گەردنکەچی و دڵشکاوی بۆ تەوبەکار کاملترە لە هی کەسانی تر، ئەو لە دەربڕینی هەژاری و بەندایەتی و خۆشەویستیدا بەشداری دەکات لەگەڵ ئەو کەسەی گوناه ناکات، لەگەڵ ئەوەشدا بە گەردنکەچی و دڵشکاوی بەهۆی گوناهەوە لەو کەسە جیادەبێتەوە، خودا ــسبحانهــ زۆر نزیکە لە بەندەکەی لە کاتی زەلیلی و دڵشکاویدا، لەو پێناوەدا ((لەکاتی سوژدە بردندا بەندە لە هەموو کات زیاتر لە خوداوە نزیکە))، چونکە سوژدە مەقامی زەلیلی و گەردنکەچییە لەبەردەم خودادا.

لە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) کە لە خوداوە ــعزوجلــ دەیگێڕێتەوە رابمێنە ((خودا لە رۆژی دوایدا دەفەرموێت: ئەی رۆڵەی ئادەم داوای خواردنم لێ کردنی خواردنت پێ نەبەخشیم، دەڵێت: ئەی پەروەردگار چۆن خواردنت پێ بدەم لە کاتێکدا تۆ پەروەردگاری هەموو جیهانەکانی؟ دەفەرموێت: بەندەکەم داوای خواردنی لێ کردی خواردنت پێ نەدا، گەر خواردنت پێ بدابا لەلای من دەتبینییەوە، ئەی رۆڵەی ئادەم، داوای ئاوم لێ کردی ئاوت پێ نەدام، دەڵێت: ئەی پەروەردگار چۆن ئاوت پێ بدەم لە کاتێکدا تۆ پەروەردگاری هەموو جیهانەکانی؟ دەفەرموێت: بەندەکەم داوای ئاوی لێ کردی ئاوت پێ نەدا، گەر ئاوت پێ بدابا لەلای من دەتبینییەوە، ئەی رۆڵەی ئادەم نەخۆش کەوتم سەرت لێ نەدام، دەڵێت: خودایە من چۆن سەردانی تۆ بکەم لە کاتێکدا تۆ پەروەردگاری هەموو جیهانەکانی؟ دەفەرموێت: فلان بەندەم نەخۆش کەوت سەردانت نەکرد، گەر سەردانت بکردبایە منت لەوێ دەبینییەوە))، بۆ سەردانی نەخۆشەکە فەرمووی ((منت لەوێ دەبینییەوە))، بۆ خواردن و خواردنەوە پێدان وتی ((پاداشتی ئەوەت لەلای من دەبینییەوە))، جیاوازی لە نێوانیاندا کرد، نەخۆش هەر کەسێك بێت دڵشکاوە، نەخۆشی تێکیدەشکێنێت، گەر باوەڕدار بێت دڵی بە نەخۆشییەکە دەشکێت ئەو کاتە خودا لەلای ئامادەیە.

ئەمە ــخودا باشتر دەزانێتــ نهێنی وەڵامدانەوەی دوعای سێ کەسەکەیە: ستەملێکراو، و موسافیر و رۆژووان، بەهۆی ئەو شکانەی لە دڵی هەر یەکێکیاندایە،

غەریبی موسافیر و دڵشكانی بەندە لە ناخیدا هەستی پـێ دەكـات، هـەر بـەو جـۆرە ڕۆژووان نەفسی دڕندەیی بەڕۆژووەكەی تێكدەشكێنێ و زەلیلی دەكات.

**ڕووی پێنجەم:** گوناه گەر تەوبەی لەگەڵ بێت لەوانەیە بۆ بەندە باشتر بێت لـە زۆرێـك لە چاكە، ئەمە مانای قسەی هەندێ لە پێشینە ((لەوانەیـە كەسـێك گوناهێـك ئـەنجام بدات و بەهۆیەوە بچێتە بەهەشت، لەوانەیە چاكەیەك ئەنجام بدات و بەهۆیەوە بچێتە ئـاگرەوە، وتیـان: ئـەوە چـۆن دەبێـت؟ وتـی: گوناهێـك دەكـات و بەبـەردەوامی گوناهەكەی لەپێش چاوانە، كە هەڵدەستێت و دادەنیشێت و هاتوچۆ دەكـات بـیر لـە گوناهەكەی دەكاتەوە، ئەوەش گەردنكەچی و سەركزی و تەوبـە و داوای لێخۆشـبوون و پەشـیمانی بـۆ دروسـت دەكـات، هـەر ئـەوەش دەبێتـە هـۆی ڕزگـاربوونی، كەسـێك چـاكەیەك ئـەنجام دەدات، بـەردەوام لـەپێش چـاوانی دایـدەنێت، كـە هەڵدەسـتێت و دادەنیشێت و هاتوچۆ دەكات بیر لە چاكەكەی دەكاتەوە، هەر كات بیری لێدەكاتـەوە لەخۆدەرچوون و لوتبەرزی و منـەتكردنی لا دروسـت دەكـات، ئـەوەش دەبێتـە هـۆی تیاچوونی)) گوناهەكە گوێڕایەڵی و چـاكە و گەشـی دڵ و دەروونـی لێدەكەوێتـەوە لـە تـرس و حـەیا لـە خـودا و سـەركز كـردن و گەردنكەچـی و شـەرمەزاری و گریـان و پەشیمانی و ڕووكردنە خودا، هەر یەكێك لەم شـوێنەوارانە قـازانجترە بـۆ كەسـەكە لـە كارێكی چاكە خۆدەرخسـتن و لـەخۆبایبوون و لوتبـەرزی و خـەڵك بەكـەم بینـینی لـێ بكەوێتەوە، گومانی تێدا نییە ئەو گوناهكارە لـەلای خـودا باشـترە و لـە ڕزگـاربوون و بەدەستهێنانی سەركەوتنەوە نـزیكترە لـەو كەسـەی بـە چـاكەكەی خـۆی بـاییبووە و خۆی پێدەنوێنێ و بە چاكە و حاڵی خـۆی منـەت دەكـات بەسـەر خـودا و بەنـدەكانی خـودادا، بـە زمـانی پێچـەوانەی ئـەوە بڵێـت، خـودا ئاگـادارە بـەوەی لـەناو دڵیدایـە، خەریكە دەستدرێژی دەكاتە سـەر خـەڵكی گـەر بـە مـەزن تەماشـای نەكـەن و پلـە و پایەی بەرزی پێنەبەخشن، بۆی ملكەچ بن، لە دڵیدا بوغز لەو كەسـانە هەڵـدەگرێت وا تەماشای ناكـەن و مامەڵـەی بـەو جـۆرە لەگـەڵ ناكـەن،، گـەر بـە وردی پشـكنینێكی دەروونی خۆی بكات دەبینێت تیایدا شاراوەتەوە، بۆیە لۆمەی ئەو كەسانە دەكات كە مەزن تەماشای ناكەن و حەقی شكۆمەندی پێ نـادەن، نەنگییەكـەی خـۆی لـە قـاڵبی خەمخۆری بۆ خودا و تووڕەبوون لە پێناویدا نیشـان دەدات، گـەر ئەوانـەی بـە مـەزن تەماشای دەكەن و ڕێزی لێدەگرن و بۆی ملكەچ دەبن چەندین گوناه و خراپە ئـەنجام

بدەن –زۆرتر لەوەی گوایە كەسانێك ڕێزیان لەو نەگرتووە– دەرگای بیانوو و پاساو و هیوایان بە ڕوودا دەكاتەوە و گوێ و چاوی لە گوناهەكانیان دەپۆشێ و دەڵێت: دەرگای بێگوناهی جگە لە پێغەمبەران لە هەموو كەسێك داخراوە، لەوانەیە وا گومان ببات گوناهی ئەوانەی ڕێزی بە مەزنی دەزانن بەهۆی ئەو پێدانی شان و شكۆ و ڕێزەوە بە ئەو سڕاوەتەوە و لەسەریان نەماوە.

گەر خودا خێری بۆ ئەو بەندە ویست هەڵیدەداتە ناو گوناهێكەوە بەهۆیەوە نەفسی بشكێت، سنووری خۆی بزانێت و خراپەكانی لە بەندەكانی دوور بخاتەوە، سەری كز بكات و نەخۆشی لوتبەرزی و لەخۆدەرچوون و منەتكاری بەسەر خودا و خەڵكیدا لێ ببێتەوە، ئەو گوناهە وەك خواردنەوەی دەوا وابێت بۆ چارەسەری نەخۆشییەكی كوشندە، وەك وتراوە بە زمانی حاڵ لە چیرۆكی ئادەم و دەرچوونی لە بەهەشت بە گوناهەكەی: ئەی ئادەم، نیگەرا مەبە لە خواردنەوەی پیاڵەی هەڵە و تێكەوتن كە دەبێتە هۆی زیرەكی و هۆشمەندی تۆ، بەو گوناهە لە نەخۆشییەك ڕزگارت بوو كە بەكاری ئەوە نەدەهات هاوسێیەتی ئێمەی پێ بكەیت، بەو گوناهە پۆشاكی ڕازاوەی بەندایەتی كرا بە بەرتدا، ئەی ئادەم، من بە گوناهێك تۆم تاقیكردەوە، چونكە پێمخۆشە فەزڵ و بەخشندەیی خۆم دەربخەم لەسەر ئەو كەسانەی یاخی دەبن لێم "گەر گوناه نەكەن خودا ئێوە لادەبات و كۆمەڵێكی تر دەهێنێت گوناه دەكەن و داوای لێخۆش بوون دەكەن و خوداش لێیان خۆش دەبێت"، ئەی ئادەم گەر تۆ و ڕۆڵەكانت لە گوناه بپارێزم ئەی حیلمی خۆم بەكێ ببەخشم؟ لێبوردن و لێخۆشبوون و قبوڵی تەوبەی خۆم بەكێ بدەم، من تەوبەكار و بەبەزەییم، ئەی ئادەم، نیگەران مەبە لەو قسەم كە دەڵێم"لە بەهەشت بچۆ دەرەوە" چونكە بۆ تۆم دروستكردووە، بەڵكو دابەزە بۆ خانەی تێكۆشان، تۆوی خۆپارێزی بچێنە، بارانی هەوری فرمێسكی بەسەردا داببارێنە، كە تۆوەكە ڕووا و قەد و گەڵای گرت وەرە و بیدوورەوە، ئەی ئادەم، بۆیە لە بەهەشت دەرمكردی تاكو تكا و ڕجام لێبكەی و هۆكار بگریتە بەر بۆ بەرزبوونەوە، تۆم دەرنەكردووە لە بەهەشت و نەفیت بكەم، تۆم بۆیە دەركرد بۆ ئەوەی بۆی بگەڕێیتەوە، ئەی ئادەم، گوناهێك بەهۆیەوە زەلیل و سەركز ببیت لەلای ئێمە خۆشەویستترە لە گوێڕپەڵییەك ئامـاژەی پێ بكەیت و لەخۆت بایی ببیت، ئەی ڕۆڵەی ئادەم، تا تۆ داوا و ڕجام لێ بكەیت من لەوەی لێت وەشاوەتەوە

خۆش دەبم و باكێكم نییە، ئەی رۆڵەی ئادەم، گەر گوناهەكانت بگاتە بەرزییەكانی ئاسمان پاشان داوای لێخۆشبوونم لێ بكەیت لێت خۆش دەبم، ئەی رۆڵەی ئادەم گەر بە زەوییەك گوناهەوە رووم تێبكەیت و هاوەڵم بۆ بڕیار نەدەیت منیش بە ئەندازەی ئەوە بە لێخۆشبوونەوە رووت تێدەكەم)).

لە هەندێ عابیدانەوە باس دەكەن: لە كاتی تەواف كەعبەدا داوای لە خودا كردووە كە لە گوناهان بیپارێزێت، پاشان چاوەكانی خەو دایگرتووە و خەوی لێكەوتووە، گوێی لە قسەكەرێك بووە دەیوت: تۆ داوای بێگوناهی لە من دەكەیت و هەموو بەندەكانم داوای بێگوناهیم لێ دەكەن، گەر هەمووتان بێگوناه بن، ئەی لێخۆشبوون و لێبووردن بە كێ ببەخشم؟ تەوبە لەكێ قبووڵ بكەم؟ ئەو كاتە بەخشندەیی و لێبووردەیی و لێخۆشبوون و فەزڵ و گەورەیی من لە كوێیە؟ هاوشێوەی ئەمە لە بەسەرهات.

ئەی رۆڵەی ئادەم، باوەڕم پێ بهێنی و هاوەڵم بۆ بڕیار نەدەی، هەڵگرانی عەرشم و ئەوانەی بەدەوری عەرشدان بە ستایش تەسبیحاتی من دەكەن و داوای لێخۆش بوون بۆ تۆ دەكەن و تۆش لەناو جێگەی خۆتدای، لە فەرموودەیەكی مەزنی خواییدا لە "أبي ذر"ەوە ((بەندەكانم ئێوە شەو و رۆژ هەڵە دەكەن منیش لە هەموو گوناهان دەبوورم، هەر كەس بزانێت من خاوەن توانام بۆ لێخۆش بوون لێی خۆش دەبم و باكێكم نییە ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ الزمر: ٥٣

ئەی بەندەكەم، دەستەوسان مەبە، دوعا لەسەر تۆیە و وەڵامدانەوە لە منەوە، داوای لێخۆشبوون لەسەر تۆ و لێخۆشبوون لەسەر من، تەوبە لەسەر تۆیە و گۆڕینی خراپەكانت بە چاكە لەسەر منە))، رۆشنی دەكاتەوە:

رووی شەشەم: كەلامی خودا ئایەتی ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ ﴾ الفرقان: ٧٠، ئەم ئایەتە گەورەترین مژدەیە بۆ تەوبەكاران گەر لەپاڵ تەوبەكەیاندا باوەڕ و كرداری چاكەی لەگەڵ بوو، ئەوەش بریتییە لە راستێتی تەوبە، ئیبن عەباس-خودا لە خۆی و باوكی رازی بێت- دەفەرموێت ((پێغەمبەر بە دابەزنی ئەم ئایەتە بە جۆرێك دڵخۆش بوو كە پێشتر بەو ئەندازەیە بۆ هیچ شتێكی تر ئەوەندە دڵخۆش نەبووە))، هەروەها

خۆشحاڵ بوونی بە ئایەتی ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ① لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾ الفتح: ١ – ٢.

جیاوازی هەیە لەسەر سیفەتی "گۆڕین" ئایا ئەو "گۆڕینی خراپە بە چاكە" لە دونیادایە، یان لەدوارۆژدا؟ ئەمەش دوو بۆچوون هەیە لەسەری:

ئیبن عەباس و هاوەڵانی دەڵێن: كردارە خراپەكانیان دەگۆڕین بۆ چاكە، هاوەڵدانان دەگۆڕین بۆ باوەڕ و زینا بۆ پاكداوێنی و خۆپارێزی، و درۆ بۆ راستگۆیی و خیانەت بۆ ئەمانەتپارێزی.

لەسەر ئەمە مانای ئایەتەكە: سیفاتە ناباشەكانیان و كردارە خراپەكانیان و بە سیفاتی جوان و كرداری چاكە ئاڵوگۆڕ دەكرێت، وەك چۆن نەخۆش نەخۆشییەكەی بە تەندروستی دەگۆڕدرێت و خاوەن بەلا بە سەلامەتی و لاچوونی بەلایەكەی، "سەعیدی كوڕی موسەیب" و كەسانی تریش لە شوێنكەوتووان دەڵێن: گۆڕینی ئەو خراپانەی ئەنجامیان داوە بە چاكە لە رۆژی دواییدا، لە جێگەی هەر خراپەیەك چاكەیەكیان پێ دەبەخشن، خاوەنی ئەم رایە بەڵگە بەو فەرموودە دەهێننەوە كە ئیمامی "الترمذي" لە جامعەكەیدا لە "الحسين بن حريث"ەوە ریوایەتی كردووە، دەڵێت: وەكیع بۆی گێڕاینەوە و وتی: ئەعمەش لە مەعروری كوڕی سویدەوە لە ئەبو زەڕەوە فەرمووی: پێغەمبەر فەرمووی ((من دواین پیاو كە لە ئاگر دەردەچێت دەناسم: پیاوێك لە رۆژی دواییدا دەهێنن، دەوترێت: گوناهە بچووكەكانی بخەنە پێش چاوی، گوناهە گەورەكانی لێدەشارنەوە، دەوترێت: فلان رۆژ فلان شت و فلان شتت ئەنجام دا، ئەو دانی پیادا دەنێت و نەرێیان ناكات، ئەو لە گوناهە گەورەكان دەترسێت، دەوترێت لە جێگەی هەر خراپەیەك چاكەیەكی پێبدەن، دەڵێت: من كۆمەڵێك گوناهم هەیە بۆ لەوێدا نایبینم، ئەبو زەڕ فەرمووی: پێغەمبەری خودام بینی پێكەنی تا ددانەكانی دەركەوتن)).

ئەم فەرموودەیە فەرموودەیەكی سەحیحە، بەڵام لە كردن بە بەڵگەی ئەو بۆچوونە جێگەی سەرنجە، ئەو كەسە بە گوناهەكانی سزا دراوە و چووەتە ناو ئاگرەوە، دوای ئەوە لە ئاگر دەرهێنراوە، لە جێگەی هەر خراپەیەك چاكەیەكی پێدراوە، چاكەیەكە خودا لەگەڵی كردووە بە ژمارەی گوناهەكانی، لەمەدا گۆڕینی خراپە بە چاكەی تێدا نییە، چونكە گەر وا بوایە لەسەری سزا نەدەدرا وەك چۆن تەوبەكار سزا نادرێت،

قسەکردن لە تەوبەکارێکە لە جێگەی هەر خراپەیەك چاکەیەکی بۆ جێگیر کراوە، بۆیە چاکەکانی زیادی کردووە، کوێی ئەم فەرموودەیە ئاماژە بەوە دەکەن؟

خەڵکی روویان لەم فەرموودە کردووە بۆ تەفسیر کردنی ئەو ئایەتە پیرۆزە بەم شێوەیە، لەوەی لە ئایەتەکەدایە تێگەیشتووم، بەڵام پێشین تێگەیشتنی ورد و قووڵیان هەیە و ئەوانەی دوای ئەوان پەی پێ نابەن.

بەڵگەهێناوە بە فەرموودەکە دروستە دوای زەمینەسازی بە رێسایەك، گەر ئەو رێسایەت زانی ورد و ناسکی بەڵگەهێناوەکەت دەردەکەوێت، ئەویش ئەوەیە گوناه شوێنەواری هەیە، شوێنەوارەکەشی یان بە تەوبە یان بە کرداری چاکە یان بە بەڵای سڕەرەوەی گوناه، یاخود بە چوونە ناو ئاگر دەسڕێتەوە بۆ ئەوەی رزگاری بێت لە شوێنەوارەکانی، هەر بەو جۆرە گەر شوێنەوارەکەی کاریگەر بوو و ئەو شتانە نەیانتوانی بیسڕنەوە، ئەوە پێویستە بچێتە ناو ئاگرەوە، چونکە بەهەشت گەردیلەیەك لە پیسی تێدا نییە، تەنها ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە کە پاك و چاکن لە هەموو روویەکەوە، ئەگەر شتێك لە پیسی گوناهی لەسەر مایەوە ئەخرێتە ناو کورەی تاقیکردنەوەوە تاکو ئاڵتوونی باوەڕەکەی لە خەوشی گوناه پاکبێتەوە، ئەو کاتە شایستەی دیوانی مەلیك ببێت.

گەر ئەمە زانرا ئەوا لابردنی گوناه و شوێنەواری گوناه جارێك بە تەوبەیەکی یەکجاری —کە بەهێزترین هۆکارە— و جارێك بە گێڕانەوەی حەق بۆ خاوەن حەقەکان و جارێك بە پاکبوونەوەی بە ئاگر، ئەگەر بە ئاگر پاکبوویەوە و شوێنەواری پیسی و خەوشوخاڵی لێبوویەوە، ئەوا لە جێگەی هەر گوناهێك چاکەیەکی پێ دەدرێت، گەر بە تەوبەی یەکجاریی پاکبوویەوە و شوێنەواری پیسی گوناهی لێبوویەوە، ئەوا لەپێشترە لە جێگەی هەر خراپەیەك چاکەیەکی پێ بدرێت، چونکە تەوبەی لابەری پیسی گەورەترە لە سڕینەوەی گوناه بە ئاگر و خۆشەویستریشە لە لای خودا، لابردن بە ئاگر بەدیلی تەوبەکردنە، تەوبە لەپێشتر و بنچینەیی ترە تا چوونە ئاگر و پاکبوونەوە بە ئاگر، رۆشنی دەکاتەوە:

**رووی حەوتەم:** تەوبەکار بە پەشیمانییەکەی هەموو خراپەکانی بە چاکە بۆ گۆڕیوە، پەشیمانییەکەی تەوبە بووە لەو خراپانە، پەشیمانیش بریتییە لە تەوبە، تەوبەش لە

هەموو گوناهێك چاكەیە، بەم پێیە جێگەی هەر گوناهێك بە چاكەیەك گیراوەتەوە، لێرابمێنە چونكە وردترین رووە لە رووەكان.

بینا لەسەر ئەمە بۆی هەیە ئەو چاكایە لە بڕدا یەكسان بێت بەو خراپەیە، لەوانەیە لەخوار ئەوەوە بێت، یان لەسەروو ئەو، ئەمەش بەپێی هێز و پێزی تەوبەكەی و راستڕەوی تەوبەكارەكە لە تەوبەكەیدا و ئەوەی لێیەوە سەرهەڵدەدات لە كاری دڵ كە سوود و قازانجی تەوبەكەی بەسەر مەفسەدەی ئەو گوناهەدا زیاد دەكات، ئەمەش لە نهێنی تەوبە و وردەكارییەكانییەتی، رۆشنی دەكاتەوە:

**رووی هەشتەم:** گوناهی زانا بە خودا و بە فەرمانەكانی بۆی هەیە چاكەی زۆرتر و گەورەتری لێوە پەیدا بێت، هەروەها مەزنتر لەڕووی قازانجەوە و خۆشەویستر لەلای خودا لە خۆپارێزی لەو گوناهە، لە زەلیلی و ملكەچی و دڵشكاوی و ترس و گەڕانەوەی بەردەوام و پەشیمانی و پیاگەیشتن بە بوغزاندنی شەیتان و ئەنجامدانی كرداری چاكە، یان كۆمەڵێك چاكەی گەورەتر لەوە، تا شەیتان دەڵێت: خۆزگە ئەو گوناهەم پێنەكردبایە، شەیتان پەشیمان دەبێتەوە لە گوناه پێكردنی، وەك پەشیمانی گوناهكەرەكە لە گوناهەكەی، بەڵام جیاوازی زۆرە لەنێوان ئەو دوو پەشیمانییەدا، خودا پێیخۆشە بەندەكەی شەیتان ببوغزێنێت و لوتی لەخۆڵەوە بدات، وەك پێشتر باسمان كرد ئەم جۆرە بەندایەتییە لە نهێنییەكانی تەوبە و پیاگەیشتنە و بەدەستهێنانی ئەوەیە خودا لە تەوبە گەرەكییەتی، و ئەوەی بەدوایدا دێت لە زیادكردنی كرداری چاكە لێرەدا كە داوا دەكات لە جێگەی خراپە چاكە دابنرێت، بەڵكو چەندین چاكە دابنرێت.

لەم ئایەتە رابمێنە (يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍۗ)، نافەرموێت لە جێگەی هەر دانەیە دانەیەك دادەنرێت، بۆیە دەگونجێ یەك خراپە بە چەندین چاكە ئاڵوگۆڕ بكرێت بەپێی حاڵی كەسەكە.

ئەوەی لە فەرموودەكەدایە: ئەوەی لەسەر گوناهەكانی سزا دەدرێت لە دونیادا خراپەكانی بە چاكە ئاڵوگۆڕ نەكردووە لە تەوبەی یەكجاریی و ئەوەی بەدواییدا دێت لە كاری دڵ و ئەنجامدانی كرداری چاكە، ئەوەی نەكردووە كە وابكات لە جێگەی هەر خراپەیەك چەندین چاكە دابنرێت، بەڵكو لە جێگەی هەر خراپەیەك تەنها یەك چاكەی

پێدراوە، پێغەمبەر(ﷺ) لە گوناهە گەورەکانی بێدەنگ بووە، کە بەندەکە باسی گوناهە گەورەکانی خۆی کرد پێغەمبەر پێکەنی و باسی ئەوەی نەکرد خودا چی لە گوناهە گەورەکانی دەکات، تەنها هەواڵی دا خودا هەر گوناهێکی بچووکی بە چاکەیەك ئاڵوگۆڕ دەکات، بەلام لە فەرموودەکەدا ئامارەیەکی وردی تێدایە کە ئەو ئاڵوگۆڕکردنە گوناهی بچووك و گەورەش دەگرێتەوە، لە دوو رووەوە:

یەکەم: ئەو بەشەی فەرموودەکەی پێغەمبەر(أخبئوا عنه كبارها) گوناهە گەورەکانیان لێشاردەوە، ئەمە رایدەگەیەنێت کە کەسەکە بینی گوناهە بچووکەکانی بە چاکە بۆ ئاڵوگۆڕ دەکەن باسی گەورەکانیش دەکات، و چاوەبڕێتە ئاڵوگۆڕیان بە چاکە، ئەو کاتە ئاڵوگۆڕی ئەو گوناهە گەورانە زۆر باشتر دەبێت بۆی لە گوناهە بچووکەکان، ئەویش بەو کارە خۆشحاڵی زیاتر دەبێت.

دووەم: پێغەمبەر(ﷺ) لە باسکردنی ئەوەدا پێکەنی، ئەم پێکەنینە ئامارەی سەرسوڕمانی تێدایە بەو هەموو چاکەی لەگەڵی ئەنجام دەدەن و ئەو دانپیادانان بەو گوناهانەی ئەنجامی داوە، بەبێ ئەوەی داوای لێ بکرێت دانیان پیادا بنێت یان پرسیاری لێ بکرێت، تەنها خراپەکانی خرایە پێش چاو.

(فتبارك الله رب العالمين، و أجود الأجودين، وأكرم الأكرمين، البر اللطيف، المتودد إلى عباده بأنواع الإحسان، وإيصاله إليهم من كل طريق بكل نوع، لا إله إلا هو الرحمن الرحيم)

❁ ❁ ❁

## پایەی كۆكەرەوە

زۆربەی خەڵكی تەوبە وا لێكدەدەنەوە كە لێبڕانێكە جارێكی تر نەگەڕێتەوە بۆ سەر گوناه، یەكسەر دەست هەڵگرتن لە گوناه و پەشیمانی لەوەی روویداوە لە رابردوودا، گەر گوناهەكە حەقی مرۆڤی تێدا بوو ئەوا كاری چوارەم بریتی دەبێت لە گەردنی خۆ پێ ئازاد كردن.

ئەمەی باسیان كردووە هەندێك لە ناوەكانی تەوبەن، بەڵكو مەرجەكانی تەوبەن، ئەگەر نە، تەوبە لە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەردا–وەك چۆن ئەوانە لەخۆ دەگرن– لێبڕان و یەكلایی بوونەوەیە بۆ ئەنجامدانی كرداری چاكە و پابەندبوون پێیەوە، بەڵكو رق لەو كەسانەی واز لە كرداری چاكە دەهێنن و لێی دوور دەكەونەوە، پابەندبوون بە فەرمان كردن بە فەرمانەكانی خودا و نەهیكردن لە نەهییەكانی، كرداری چاكە–بە مەرجگیراو بۆ تەوبە لە ئایەتەكەی سورەتی الفرقان– بریتییە لە ئەنجامدانی دژی ئەو كارە خراپانەی ئەنجامی دەدا، بە تەنها دەستهەڵگرتن لە گوناه و لێبڕان و پەشیمانی كەسەكە نابێتە تۆبەكار، تا لێبڕانی تەواوی لێ نەبینرێت بۆ ئەنجامدانی ئەوەی خودا فەرمانی پێكردووە و جێبەجێ كردنی، ئەمە حەقیقەتی تەوبەیە كە بریتییە لە ناوێك بۆ كۆكردنەوەی ئەو دوانە(وازهێنان لە گوناه و ئەنجامدانی كرداری چاكە)، بەڵام گەر جێبەجێ كردنی فەرمانەكانی بەدوادا هات ئەوە ئەو تەوبەیە كە ئەوان باسیان كردووە، گەر تاك كرایەوە هەردوو كارەكە لەخۆ دەگرێت.

تەوبە وەك وشەی "التقوى" وایە گەر بە تاك هات دەبێت ئەوەی خودا فەرمانی پێكردووە ئەنجام بدرێت و ئەوەی نەهی لێكردووە خۆی لێ بپارێزێت، كە دەبێت بە فەرمانێكی داخوازی مانای كۆتاهێنان بە نەهیلێكراوەكان دەگەیەنێت، هەرچەند ماناكەی گشتگیرترە، چونكە "التقوى" بریتییە لە بەكارهێنانی هەموو ئەوەی خودا بە بەندەكەی داوە –لە تەندروستی و ماڵ و منداڵ و شەو و رۆژ و نیعمەتەكانی تر– وەك قەڵغانێك خۆی پێ بپارێزێت لەوەی لێی دەترسێت. لە رۆیشتنی بەرەو خودا و خانەی دواڕۆژی رێگەكەی پڕە لە كۆسپ و دوژمن لە نەفسی فەرمانكەر بە خراپە و ئارەزوو و شەیتان كە پەلاماری دەدەن و رایدەكێشن تاكو رێگەی لێ بگرن و بیگێڕنەوە و رووبەڕووی تیاچوونی بكەنەوە، خودا بە هەموو ئەوانە گرفتاری كردووە، تەندروستی

و لەشساغی و سەرکەوتنی پیٚ بەخشیوە، ئەوەش بە باش دانانی هەر نیعمەتێك لە جێگەی خۆی، تیاچوون لەو جێگەدایە نیعمەتەکان لە جێگەی خۆیان بەکارنەهێنین، هەموو ئەمانەش بەهۆی نەفامی و شوێنکەوتنی ئارەزوو و زاڵبوونی حەزی ئاژەڵی و خۆدارنین لە بەڵگە و نیشانەکانی خودا و شەیتان کردن بە دۆست لە خوار خوداوە.

حەقیقەتی تەوبە بریتییە لە گەڕانەوە بۆ لای خودا بە پابەندبوون بەو کارانەی ئەو پێی خۆشە و دوورکەوتنەوە لەوانەی پێی ناخۆشە، تەوبە گەڕانەوەیە لە خراپەوە بۆ باش، گەڕانەوە بۆ باشەکان بەشێکی تەوبەیە و ناوی تەوبەی لێنراوە، گەڕانەوەش لە ناباشەکان بەشێکی تریەتی، بۆیە خودای موتەعال سەرکەوتنی تەواوی بەستۆتەوە بە ئەنجامدانی ئەو کارانەی فەرمانی پێکراوە و دوورکەوتنەوە لەو کارانەی نەهی لێکراوە ﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ٣١﴾ النور: ٣١، هەموو تۆبەکارێك سەرفرازە، سەرفرازیش نابێت تا ئەوەی فەرمانی پێکراوە ئەنجامی نەدات و ئەوەی نەهی لێکراوە خۆی لیٚ نەپارێزێت، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ١١﴾ الحجرات: ١١، هەر کەس واز لە فەرمان پێکراوەکان بهێنێت ستەمکارە وەك چۆن ئەنجامدەری کارە نەهی لێکراوەکان ستەمکارە، لاچوونی ناوی "ستەمکار" لەسەری بە تەوبەیەك دەبێت کە ئەو دووانەی تێدا کۆ ببێتەوە، خەڵکی دوو بەشن: تۆبەکار و ستەمکار، بەشی سێیەمی نییە، تۆبەکاران ئەمانەن ﴿ٱلتَّٰٓئِبُونَ ٱلْعَٰبِدُونَ ٱلْحَٰمِدُونَ ٱلسَّٰٓئِحُونَ ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ ٱلْءَامِرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱلْحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ١١٢﴾ التوبة: ١١٢، پارێزگاری لە سنوورەکانی خودا بەشێکە لە تەوبە، تەوبە کۆی هەموو ئەوانەیە، بۆیە نانونراوە "تائب" تۆبەکار چونکە لە نەهیکراوەکانەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەوەی خودا فەرمانی پێکردووە، هەروەها لە یاخیبوونەوە بۆ گوێڕایەڵی، بەڵکو گەڕانەوە بۆ لای دۆست و خۆشەویستی خۆی و رزگاربوونی لەدەست دوژمنەکەی. دوژمنەکەی دەیەوێت بەدبەختی بکات، بۆیە بە حەبلی ئاژەڵی و گێلی و نەفامی و شەهوانی رایدەکێشێت، بەڵام خودای دۆستی ئەو بۆ بەختەوەری و ئاسوودەیی ئەوی دەوێت، ئەو -سبحانە- خۆی لای بەندەکەی خۆشەویست دەکات بە هەموو ئەوەی پێیداوە لە خودی خۆی و ئەوەی بۆی رامهێناوە، بە هۆکاری نیعمەتەکانی کە نایەنە هەژماردن بەندەکەی بۆ لای خۆی

رادەکێشێت، لە بەهێزترینیان ئایەتەکان لە ئاسۆی دەروون و گەردوون و یاسا و ڕێساکانی کە گۆڕانیان بەسەردا نایەت و ئەو وەحیەی خودا بۆ پێغەمبەرانی رەوانە کردووە لە هیدایەت و رۆشنبینی ﴿قَدْ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِۦ وَمَنْ عَمِىَ فَعَلَيْهَا وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴿١٠٤﴾﴾ الأنعام: ١٠٤.

کەوابوو "تەوبە" بریتییە لە حەقیقەتی ئایینی ئیسلام و هەر هەموو ئایین دەچێتە ناو ناوی "تەوبە"ەوە، بەم شێوەیە تۆبەکار شایستە دەبێت بەوەی خۆشەویستی خودا بێت، خودا تۆبەکاران و پاکژکەرانی خۆشدەوێت، خودا ئەوانەی خۆشدەوێت بە فەرمانەکان هەڵدەستن و خۆیان لە نەهی لێکراوەکان بەدوور دەگرن.

کەوابوو تەوبە بریتییە لە گەڕانەوە(الرجوع) لەوەی لەناوەوە و لە دەرەوە خودا پێی ناخۆشە بۆ ئەوەی خودا پێیخۆشە لە ناوەوە و لە دەرەوە، ئیسلام و ئیمان و ئیحسان دەچنە ژێر ناوی تەوبەوە، هەرچی مەقاماتی باوەڕە لە تەوبەدا جێی دەبێتەوە، بۆیە تەوبە دەبێتە ئامانجی هەموو باوەڕدارێك و سەرەتا و کۆتایی گەشتی بەرەو خودا، وەك پێشتر ئاماژەی پێدرا، تەوبە ئەو ئامانجەیە دروستکراوەکانی لە پێناودا دروستکراوە، فەرمان پێکردن و یەکتاپەرستی بەشێکە لە تەوبە، بەڵکو مەزنترین بەشی تەوبەیە و بینای تەوبە لەسەر ئەو دوانە دەوەستێت.

زۆربەی خەڵکی گەورەیی تەوبە و حەقیقەتی نازانن، چجای پێی هەڵبستن لەرووی زانست و کردار و حاڵەوە، خودای موتەعال بۆیە خۆشەویستی خۆی بە تۆبەکاران داوە چونکە کەسانێکی تایبەتن لەلای ئەو.

گەر تەوبە ناوێکی کۆکەرەوە نەبوایە بۆ شەریعەتی ئیسلام و حەقیقەتی باوەڕ خودای موتەعال بەو ئەندازە مەزنە بە تەوبەی بەندەکەی دڵخۆش نەدەبوو، هەموو ئەوەی خەڵکی قسەی لێدەکەن لە مەقامات و حاڵ بریتییە لە درێژە و وردەکاری و شوێنەوارەکانی تەوبە.

## ۞ لە باتڵ جیادەبینەوە و پاشان دەگەڕێینەوە بۆ حەق

داوای لێخۆشبوون (الإستغفار) دوو جۆرە: تەنها و هاتوو لەگەڵ تەوبە، ئەوەی بە تەنها هاتووە: وەك فەرموودەکەی نوح (عليه السلام) لەگەڵ هۆزەکەی ﴿فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾﴾ نوح: ١٠ – ١١، هەروەها صالح پێغەمبەر

لەگەڵ هۆزەکەی ﴿لَوْلَا تَسْتَغْفِرُونَ اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٤٦﴾﴾ النمل: ٤٦، هەر بەو جۆرە ئایەتی ﴿وَاسْتَغْفِرُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴿١٩٩﴾﴾ البقرة: ١٩٩، هەروەها ئایەتی ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنْتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿٣٣﴾﴾ الأنفال: ٣٣.

هاتوو لەگەڵ تەوبەدا: ﴿وَأَنِ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُمْ مَتَاعًا حَسَنًا إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى وَيُؤْتِ كُلَّ ذِي فَضْلٍ فَضْلَهُ وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ كَبِيرٍ ﴿٣﴾﴾ هود: ٣، فەرموودەکەی هود لەگەڵ هۆزەکەی ﴿وَيَا قَوْمِ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُمْ مِدْرَارًا﴾ هود: ٥٢، هەروەها فەرموودەکەی صالح پێغەمبەر ﴿هُوَ أَنْشَأَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَاسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُجِيبٌ ﴿٦١﴾﴾ هود: ٦١، فەرموودەکەی شوعەیب پێغەمبەر ﴿وَاسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٌ وَدُودٌ ﴿٩٠﴾﴾ هود: ٩٠.

داوای لێخۆشبوون (الإستغفار) بەتەنها وەك "تەوبە" وایە، بەڵکو بریتییە لە خودی تەوبە لەگەڵ داوای لێخۆشبوون لەخۆگرتن، کە بریتییە لە سڕینەوەی گوناه و لابردنی شوێنەواری و خۆپارێزی لە شەڕی، نەك وەك هەندێك کەس گومانی بۆ دەبەن: بریتییە لە "داپۆشین" چونکە خودا ئەوانەی داوای لێخۆشبوون دەکەن و ئەوانەش کە نایکەن دادەپۆشێت، بەڵکو "داپۆشین" پێویستی ناوەڕۆکەکەیەتی یان بەشێکە لە داوای لێخۆشبوون، ئاماژە پێکردنی داوای لێخۆشبوون بە "داپۆشین" یان بە لەئامێزگرتنە یان بە پێویستبوون.

**حەقیقەتی داوای لێخۆشبوون:** بریتییە لە خۆپارێزی لە شەڕی گوناه، لەوەوە وشەی "المغفر واتە خوودەی سەر" هاتووە بەهۆی ئەوەی سەر لە ئازار دەپارێزێت، داپۆشین دەبێتە پێویستی ئەم مانایە، ئەگەر نە، بە عەمامە نالێن "المغفر" لە پارێزگارییەوە، ئەم داوای لێخۆشبوون (الإستغفار)ەیە ڕێگری لە سزا دەکات ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿٣٣﴾﴾ الأنفال: ٣٣، خودا سزای کەسێك نادات داوای لێخۆشبوون بکات، بەڵام ئەو کەسەی بەردەوام بێت لەسەر گوناه و داوای لێخۆشبوونیش بکات ئەوە لە هیچ ڕێگەیەکەوە داوای لێخۆشبوون نییە.

لەگەڵ ئەوەدا هیچ ڕێگرێك نییە مانای "الإستغفار" داوای "غفر" پۆشین بێت، کە بریتییە لە داپۆشینی نەنگی و ناتەواوییەکی تیابەری زیانبەخش، گەورەترین نەنگی

مرۆڤ و ناتەواوی بریتییە لە نەفامی و ستەمی، بە قـولایی نـەفامی و سـتەم دوژمنەکـەی رایدەکێشێت بۆ هەڵدێر و تیاچوون، رزگاربوونی لەدەست ئەو دوانە بە بێداری و وریـایی و هەوڵدان بۆ سوودبینین لەوەی خودا پێی بەخشیوە لە زانست و دادپەروەری و چـاکە، هەر کات بەندە لە رێزی مرۆیی خۆی بێئاگا دەبێت کە خودا لە رۆحی خۆی کـردووە بـە بەردا ئەوا دادەبەزێت و دەلکێت بە زەوی ئاژەڵیانەوە، ئەو کاتە نەفامی و سـتەمی زیـاد دەکات و خۆی رسوا دەکات.

هەتا گرنگی بە مرۆڤبوونی خۆی بدات و بە بیرکردنەوە لـە بەڵگـە و نیشـانە و یاسـا و رێساکان لە ئاسۆی دەروون و گەردووندا پشتیوانی کرد، هەروەها بە تێڕامان لە بەڵگە و نیشانە زانستییەکان کە پێغەمبەرانی پێ رەوانە کـراوە کۆڵییـەوە، ئـەوا خـودا لێـی خۆشدەبێت و نەنگی و ناتەواوییەکانی بۆ دادەپۆشێت، لەم رێگەیەوە لەوە تێدەگـەین خـــودای موتـــەعال بـــە پێغەمبەرەکـــەی(ﷺ) دەفـــەرموێت ﴿ لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ ﴾ الفتح: ٢، پێغەمبەر(ﷺ) هـەرگیز کـارێکی نەشـیاوی نەکردووە و هەرگیز لە خودا یاخی نەبووە و لە فەرمانەکانی لای نەداوە، بـەڵکو ئـەوە بریتییە لە داپۆشینی نەنگی مرۆڤایەتی و لەسەر بارهاتووەکانی بـەوەی پێیـدراوە لـە زانسـت و هیدایـەت کـە خـودا تیایانـدا بـاڵای کردبـوو لـە دەستبەسـەردا گـرتنی ئـەم سروشـتە مرۆییانـە، چـاکە لەگـەڵ ئـەو سروشـتە مرۆییانـە و کـارکردن لەناویانـدا، تـا پێغەمبەر بوو بە حەکیمێکی کامڵی رێنوماییکار–علیه الصلاة والسلام–

بـەڵام لـە نزیکبوونـەوە و هـاتنی یـەکێك لـە وشـەکان لـەپاڵ ئـەوی تـردا، ئـەوا داوای لێخۆشبوون (الإستغفار) بریتییە لە داواکردن بۆ پارێزگاری لە شەڕی ئەو خراپانـەی لـە رابردوودا لێی وەشاوەتە، تەوبەش بریتی دەبێت لـە گەڕانـەوە و داوای پارێزگـاری لـە شەڕێك کە لە داهاتوودا لێی دەترسێت لە کار و کردەوەی خراپی خۆی.

**لێرەدا دوو گونـاه هەیـە:** گوناهێـك کـە گـوزەری کـردووە، داوای لێخۆشـبوون بریتییـە لـە پارێزگاری لە شەڕی، لەگەڵ گوناهێك کـە ترسـی روودانـی هەیـە، تەوبـە بـریتی دەبێـت لـە لێبڕانێـك کـە ئـەنجامی نـەدا، گەڕانـەوە بـۆ لای خـودا هـەردوو جۆرەکـە لـەخۆ دەگرێـت، گەڕانەوەیـەك بـۆ لای خـودا بـۆ ئـەوەی لەشـەڕی ئـەوەی روویـداوە بیپارێزێـت، لەگـەڵ گەڕانەوەیەك پارێزگاری لێ بکات لە شەڕێکی داهاتووی نەفسی خۆی و کردارە خراپەکانی.

هەروەها گوناهكار وەك كەسێك وایە كەوتبێتە سەر ڕێگەیەك كە سەری لە تیاچوونییەوە دەردەچێت و نایگەنێت بە مەرام، ئەو فەرمانی پێكراوە پشت لەو ڕێگەیە بكات و بگەڕێتەوە بۆ سەر ئەو ڕێگەیەی ڕزگاری لێوە بەدەست دەهێنێت و بە مەبەستی دەگەیەنێت و سەرفرازی ئەوی تێدایە.

لێرەدا دوو شت هەیە پێویستە ببن: جیابوونەوە لە شتێك و گەڕانەوە بۆ سەر شتێكی تر، "تەوبە" تایبەتكراوە بەو گەڕانەوەیە و "إسغفار"یش تایبەت كراوە بە جیابوونەوە، كاتێك هەر یەك لەم دوانە تەنها دەكەون هەردوو ماناكە لەخۆ دەگرن، بۆیە -خودا باشتر دەزانێت- بەدوای یەكتردا فەرمان بە هەردووكیان كراوە لە ئایەتی ﴿ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ﴾ هود: ٥٢، ئەمە بریتییە لە گەڕانەوە بۆ سەر ڕێگەی حەق لەدوای جیابوونەوە لە ڕێگەی باتڵ.

هەروەها "إسغفار" لە دەروازەی لادانی زیانە و "تەوبە"ش داوای ڕاكێشانی سوود و قازانجە، خودا لەشەڕی گوناه بیپارێزێت، تەوبە ئەوەیە دوای ئەو پارێزگارییە ئەوەی خودا پێی خۆشە بێتە سەر ڕێگەی، لە تەنهابوونەوەدا هەر یەكەیان مانای ئەویتریان لەخۆ دەگرێت، خودا باشتر دەزانێت.

### ۞ تەوبەی یەكجاریی

ئەمەش بە باسی تەوبەی یەكجاریی (توبة نصوحا) و حەقیقەتی تەوبەی یەكجاریی ڕۆشن دەبێتەوە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةٗ نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيُدۡخِلَكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ التحريم: ٨، خۆپارێزی لە شەڕی خراپە- كە بریتییە لە سڕینەوەی- كرد بە لابردنی ئەوەی بەندە حەزی پێناكات، چوونە بەهەشت-كە بریتییە لە بەدەستهێنانی ئەوەی بەندە دەیەوێت- بەستراوەتەوە بە كردنی تەوبەی یەكجارییەوە، وشەی "النصوح" لەسەر كێشی "فعول"ە، لە ناوی بكەر(ناصح)ەوە وەرگیراوە بە مەبەستی "مبالغة" زۆركردنی ئەو كارە، وەك "شكور و صبور"، بنچینەی مادەی "ن ص ح" مانای ڕزگاركردنی شتێكە لە خەوش و غەشی نامۆ پێی، ئەوەش لە داتاشینی گەورەتری "نصح" بەمانای "خلص" خاوێنكردنە و پاڵفتەكردن، یەكانگیر دەبێت، بۆیە "النصح" لە تەوبە و پەرستش و ڕاوێژدا بریتییە لە پاككردنەوە و پاڵفتەكردنیان لە هەرچی غەل و غەش و خەوش و ناتەواوی و تێكدانە، جێبەجێ كردنیان بە باشترین شێوە، "النصح" دژی "الغش"ە.

**عومەری كوڕی خەتاب و ئوبەی كوڕی كەعب** -خودایان لێ ڕازی بێت- دەڵێن ((تەوبەی یەكجاریی: ئەوەیە كە تەوبە لە گوناهێك بكات و پاشان نەگەڕێتەوە سەری، وەك چۆن شیر ناگەڕێتەوە بۆ گوان)).

**شێخ حەسەنی بەصری دەڵێت:** ((ئەوەیە بەندە لەوەی لە ڕابردوو لێیوەشاوەتەوە پەشیمان بێت و یەكلابوو بێتەوە لەسەر ئەوەی نەگەڕێتەوە سەری)).

"الكلبي" دەڵێت: ((ئەوەیە كە بە زمان داوای لێخۆشبوون بكات و بەدڵ پەشیمان و جەستەی بگرێتەوە لەو گوناهە)).

سەعیدی كوڕی موسییب دەڵێت ((تەوبەی یەكجاریی ئامۆژگاری خۆتانی پێبكەن)).

وەك مانای "ناصحة للتائب" ئامۆژگاریكەر بۆ تەوبەكار لێكیدایەوە، وەك وشەی "ضروب"ی داتاشراو لە "ضارب" لێدەر.

خاوەنانی قسەی یەكەم مانای "مفعول"یان پێدا واتە كەسی تەوبەكار كاری پاككردنەوەی تێدا كرد و تێكەڵی نەكرد بە خەوش و غەل و غەش. كەوابوو یان بە مانای "منصوح" وەك "ركوبة، حلوبة" بە مەمانای "مركوبة، محلوبة"، یان بە مانای "فاعل" واتە"ناصحة" وەك "خالصة، صادقة".

"محمد بن كعب القرظي" دەڵێت: چوار شت تەوبە لە ئامێز دەگرن: داوای لێخۆشبوون بە زمان، خۆگرتنەوە بە جەستە، شاردنەوەی بڕیاری گەڕانەوە بۆ سەر گوناە بە دڵ و ناخ، دووركەوتنەوە لە هاوڕێ و هاوخوانانی خراپ.

**دەڵێم: "نصح" لە تەوبەدا سێ شت لەخۆ دەگرێت:**

**یەكەم:** تەوبەكە هەرچی گوناهە بەگشتی لەخۆ بگرێت و گوناهێك نەمێنێتەوە ئەو تەوبەیە لەئامێزی نەگرێت.

**دووەم:** لێبڕان و ڕاستگۆیی بەتەواوی لە تەوبەكەیدا بەجۆرێك دڵەڕاوكێ و سەرزەنش و چاوەڕوانی نەمێنێت، بەڵكو بە هەرچی ویست و لێبڕانەوەیە دەست دەداتە تەوبەكەی.

**سێیەم:** ڕزگاركردنی تەوبەكەی لە هەرچی خەوش و غەل و غەش و نەخۆشی و نەنگییەك كە پاڵفتەبوونی بشێوێنێت، بەجۆرێك تەوبەكە تەنها ترسی خودا و ویستی گەیشتن بەوەی لەلای خودایە و خۆپاراستن لە سزای خودای لە پشتەوە بێت، نەك

وەك كەسێك تەوبە بكات كە دەیەوێت پلە و پایە و رێز و كورسی و سەرۆكایەتی خۆی پارێزگاری لێ بكات، یان بیەوێت بەهۆیەوە پارێزگاری بكات لە حاڵ و هێز و ماڵی، ستایشی خەڵك بەدەست بهێنێت و لە زەمیان دووربكەوێتەوە، یاخود نەفامان و ساویلكەكان بەسەریدا زاڵ نەبن، یان لە دونیا تێربووبێت، تووشی ئیفلاس و دەستەوسانی بووبێت، هاوشێوەی ئەم هۆیانە كە دروستیی تەوبەكەی و پاڵفتەبوونی بۆ خودا لەكەدار دەكەن.

یەكەمیان گرێدراوە بەوەی تەوبەی لێدەكات، سێیەم گرێدراوە بەو كەسەوەی تەوبەكەی بۆ دەكات (خودای موتەعال)، ناوەڕاستەكەیان (دووەم) گرێدراوە بە خودی تەوبەكارەكەوە، "نصح" لە تەوبەدا بریتییە لە راستكردن لە تەوبەدا و پاڵفتەبوون و گشتگیركردنی هەموو گوناهەكان، گومانی تێدا نییە ئەم تەوبەیە داوای لێخۆشبوون لە ئامێز دەگرێت و پێویستی دەكات و سەرجەم گوناهەكان دەسڕێتەوە، ئەمەش كاملترین تەوبەیە، والله المستعان و علیه التكلان ولا حول ولا قوة إلا بالله.

## ۞ خەڵاتكردنێك سەرەتاكەی بریتییە لە ئیلهام

تەوبەی بەندە بۆ لای خودا دەورەدراوە بە تەوبەیەك لەلای خوداوە بۆ ئەو لە پێش تەوبە كردنەكەی، تەوبەكردن لە بەندەكەوە دوای ئەو تەوبەیە دێت، تەوبەیەكی پێشین و تەوبەیەكی دوایین، یەكەم جار خودا تەوبەی لێوەرگرتووە بە مۆڵەتدان و كۆمەك و ئیلهام ئەوجا بەندەكە تەوبەی دەستپێكردووە، بۆیە بۆ جاری دووەم خودا تەوبەی لێقبووڵ فەرمووە، وەك وەرگرتن و پاداشت و خەڵات، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِى سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُوا۟ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوٓا۟ أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾ ﴾ التوبة: ١١٧ – ١١٨، خودای موتەعال رایدەگەیەنێت كە تەوبەكەی لەسەریان پێش تەوبەكەی ئەوانە، ئەوە خودایە ئەوانی كردووە بە تەوبەكار، ئەو هۆی داواكەری تەوبەكەیانە، ئاماژەی تێدایە كە ئەوان تەوبەیان نەكرد تا خودا تەوبەی بۆ بڕیار نەدان، حوكمەكە نەرێ دەكرێت بە نەرێكردنی هۆیەكەی.

هاوشێوەی ئەمە: هیدایەتدانی بەندەكەی پێش هیدایەت وەرگرتنی، خودا هیدایەتی فیترەتی بە مرۆڤ بەخشیوە ﴿إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿٢﴾ إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾﴾ الإنسان: ٢-٣، باشترین هیدایەت بە هیدایەتی فیترەت بریتییە لە بوونی بیستن و بینین و ژنەوتن، شوكركردنی خودا لەسەر ئەمانە بەكارهێنانیانە بۆ گەیاندنی زانیاری بە دڵ بەو جۆرە دروستەی خودا باری هێناون لەسەری و دروستیكردوون، لێیان تێبگات و ڕێكیان بخات و كەڵكیان لێ ببینێت، خوداش بەوە هیدایەتی بۆ زیاد دەكات و نیعمەتی بیركردنەوە و تێڕامانی پاڵفتەتر و نوورانی تر دەبن، ئەوەش سەردەكێشێت بۆ تێگەیشتن لە كەلامی خودا و كەلامی پێغەمبەرەكەی(ﷺ) هەركەس خودا نووری پێ نەدات نووری نییە.

كە بەندە هیدایەتی وەرگرت ئەو هیدایەتە هیدایەتێكی تری بۆ پێویست دەكات، خودا بەو هیدایەتە پاداشتی هیدایەتەكەی دەداتەوە، لە پاداشتی هیدایەت هیدایەتێكی ترە كە بە دوایدا دێت، وەك چۆن لە سزای گومڕایی گومڕاییەكی ترە كە بەدوایدا دێت، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى﴾ محمد: ١٧، یەكەمجار هیدایەتیدان و ئەوانیش هیدایەتیان وەرگت، بۆیە هدایەتی دووەمی بۆ زیادكردن، پێچەوانەكەشی لە لادراونی راستە شەقامی هیدایەت لە ئایەتی ﴿فَلَمَّا زَاغُوٓا۟ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ﴾الصف: ٥، ئەم لادانەی دووەم سزایە لەسەر لادانیان

ئەم برە لە نهێنی دوو ناوی "الأول" و "الآخر" ئەو ئامادە دەكات و كۆمەك دەكات، هۆ و دەرئەنجام هەر لە خوداوەیە، ئەو كەسەیە كە بەندەكانی لەخۆی بە خۆی پەنادەگرن، وەك زاناترین كەس بە خودا دەفەرموێت ((أعوذ بك منك)) پەنا دەگرم لە خۆت بە خۆت، بەندە تۆبەكارە و خوداش قبووڵكەری تەوبە، تەوبەی بەندە گەڕانەوەیە بۆ لای سەردارەكەی دوای هەڵهاتنی، تەوبەی خودای موتەعالیش دوو جۆرە: مۆڵەت بە كەسەكە بۆ تۆبەكردن، لەگەڵ قبووڵكردنی تەوبەكەی و كۆمەك كردنی.

تەوبە سەرەتا و كۆتایی هەیە، سەرەتاكەی: بریتییە لە گەڕانەوە بۆ لای خودا بە گرتنەبەری شارێگەی راست و دروست كە بۆ بەندەكانی راخستووە تاكو بە رەزامەندی خودا بگەن، فەرمانی كردووە بە گرتنەبەری ئەو شارێگەیە بە ئایەتی ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِى مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ﴾ الأنعام: ١٥٣، ﴿وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴿٥٣﴾﴾ الشوری: ٥٢ – ٥٣ ﴿وَهُدُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلْقَوْلِ وَهُدُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ﴾ الحج: ٢٤ .

**کۆتاییەکەی:** گەڕانەوەی بۆ لای خودا لە ڕۆژی دواییدا، گرتنەبەری ئەو شارێگەی ڕاخراوە بۆ گەیشتنە بەهەشت، هەر کەس لەم خانەی دونیادا بە تەوبە گەڕایەوە بۆ لای خودا، ئەوا لە خانەی دواڕۆژدا بە پاداشتەوە دەگەڕێتەوە، ئەمە یەکێکە لە تەئویلەکانی ئایەتی ﴿ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابًا ﴾ الفرقان: ٧١، ئیمامی بەغەوی و کەسانی تریش دەڵێن: (("يتوب إلى الله متابا" واتە دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا لەپاش مردن، گەڕانەوەیەکی باش کە لە هەرچی گەڕانەوەی ترە باشترە))، تەوبەی یەکەمیان کە بریتییە لە "ومن تاب" گەڕانەوەیە لە هاوەڵدانان بۆ خودا، **دووەمیان:** بریتییە لە گەڕانەوە بۆ لای خودا بۆ پاداشت و خەڵات.

**تەئویلی دووەم:** پاداشت فەرمان دەگرێتە ئامێز، ماناکەی: هەرکەس بۆ تەوبە لێبڕا و ویستی تەوبە بکات با تەوبەکەی تەنها بۆ خودا و لەبەر خودا و بۆ لای خودا بێت، تەنها لەبەر ڕووی جوانی خودا بێت نەك شتێکی تر.

**تەئویلی سێیەم:** مەرام و مەبەست پێویستی ئەم مانایە، کە بریتییە لە ئاگادارکردنەوەی تەوبەکار بەوەی تەوبەی بۆ دەکات و بۆ لای دەگەڕێتەوە، **ماناکەی:** با بزانێت تەوبەکەی بۆ لای کێیە؟ گەڕانەوەکەی بۆ لای کێیە؟ تەوبە دەبێت بۆ لای خودا بێت نەك بۆ لای کەسێکی تر و شتێکی تر.

هاوشێوەی ئەمە لەسەر یەکێك لە تەئویلەکان، ئایەتی﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ ﴾المائدة: ٦٧، واتە ئەو شتە بزانە کە لەسەر پاخیبوون لە فەرمانەکانی و نەگەیاندنی پەیامەکەی سەرهەڵدەدات

**تەئویلی چوارەم:** تەوبە یەکەمجار بە مەبەست و لێبڕان دەبێت لەسەر ئەنجامدانی، پاشان کە لێبڕان بەهێز بوو سەریکێشا بۆ پێداگری و سووربوون کرداری تەوبەی لێوە پەیدا دەبێت، تەوبەی یەکەم بە لێبڕان و مەبەست لە ئەنجامدانی و تەوبەی دووەم بە ڕوودانی تەوبەکە و سەرهەڵدان و ئەنجامدانی، **ماناکەی:** هەر کەس بە مەبەست و نێت و لێبڕان تەوبەی کرد بۆ لای خودا ئەوا تەوبەکەی بۆ لای خودایە بە کار و کردار، ئەمەش هاوشێوەی فەرموودەی پێغەمبەرە(ﷺ) ((هەر کەس کۆچەکەی بۆ لای خودا و پێغەمبەرە، ئەوە کۆچەکەی بۆ لای خودا و پێغەمبەر(ﷺ) دەبێت، هەر کەس کۆچەکەی بۆ لای شتێکی کەموکورت بێت دەستی دەکەوێت، بۆ لای ئافرەتێك بێت مارەی دەکات، کۆچەکەی بۆ لای ئەو شتەیە کۆچی بۆ کردووە))

## ۞ گوناهی بچووك لەخوار گوناهی گەورەوە

گوناه دابەش دەبێت بۆ گەورە و بچووك بە دەقی قورئان و فەرموودە و كۆدەنگی پێشین، و بە وردبوونەوە ﴿ إِن تَجْتَنِبُوا كَبَائِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ ﴾ النساء: ٣١، هەروەها دەفەرموێت ﴿ الَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ إِلَّا اللَّمَمَ ﴾ النجم: ٣٢، لە فەرموودەیەكی سەحیحدا لە پێغەمبەری خوداوە((پێنج نوێژەكە و ئەم هەینی بۆ ئەو هەینی و ئەم رەمەزان بۆ ئەو رەمەزان دەبنە لابەری گوناه لە نێوانیاندا، گەر لە گوناهە گەورەكان كەناگیری بكرێت)).

ئەوەی بە دەربڕینی خاوەن شەرع هاتووە ناونانی ئەوە بە "اللمم" و "محقرات" وەك لە فەرموودەی ((إياكم و محقرات الذنوب))، وتراوە"اللمم" كە لە ئایەتەكەدا ئاماژەی پێدراوە لە گوناهە گەورەكانە، ئیمامی بەغەوی و كەسانی تریش باسیان كردووە.

دەڵێن: مانای "الإستثناء"كە ئەوەیە كە جارێك گوناهی گەورەی كرد پاشان تەوبەی لێ بكات، بكەوێتە ناو گوناه و لێی بێتە دەرەوە، نەك بیكات بە كار و پیشەی بەردەوامی، بینا لەسەر ئەمە هەڵاواردنی "اللمم" لە دوورەپەرێزی و خۆدوورگرتنەوەیە، چونكە ماناكەی ئەوەیە كە لێیان نەوەشێتەوە، گوناهە گەورەكانیان لێ نەوەشێتەوە مەگەر جار بە جار كە زوو تەوبەی لێبكەن و نەیكەنە پیشەی شەو و رۆژیان.

جمهور لەسەر ئەوەن وشەی "اللمم" لە وشەی "الكبائر" هەڵاوراوە، هەڵاوەردنەكە لە جۆری دابڕاوە (المنقطع)، واتە بەڵام "اللمم"یان لێ دەوەشێتەوە.

رووداني دابڕانی لە دوای ئەرێ بەباش دادەنێت-كە زۆرینە پێچەوانەی ئەون- چونكە لە هەڵاوەردەی خاڵیكردنەوە (التفريغ)دا ئەوە روودەدات، چونكە لەم ئەرێی ئێرەدا مانای نەرێی تێدایە كە بریتییە لە: گوناهی گەورە ئەنجام نادەن، بۆیە هەڵواردنی"اللمم"ی بەباش دانا.

لەوانەیە ئەمە "أبا إسحاق"ی هاندابێت بۆ ئەوەی بڵێت ((هەرچی گوناهە گەورەیە))، چونكە بنچینە لە "إستثناء"دا بریتییە لە گەیاندن و پەیوەست بوون (الإستثناء المتصل)، بە تایبەت كە لە رستەی ئەرێدا دێت، بەڵام دەقەكانی قورئان و فەرموودە و كۆدەنگی پێشین لەسەر ئەوەن كە گوناه گەورە و بچووكی هەیە.

دواتر لە دوو بەشدا جیاوازی كەوتۆتە نێوانیانەوە، یەكەمیان: لە "اللمم"دا كە كامانەن، دووەمیان: لە گوناهە گەورەكان (الكبائر) ئایا ژمارەیەكی دیاریكراوی هەیە، یان سنوورێك هەیە سنوورداری بكات، لێرەدا شتێك دەربارەی ئەم دوو بەشە باس دەكەین.

## ۞ راڤەی "اللمم"

لەسەر "اللمم" لە كۆمەڵێك لە پێشینەوە گێڕراوەتەوە كە بریتییە لە جارێك كەوتنە نـاو گوناه و پاشان نەگەڕانەوە بـۆ سـەری، بـا گوناهەكـەش گـەورە بێـت، ئیـمامی بەغـەوی دەڵێـت: ئەمـە قسـەی "أبـي هريـرة و مجاهـد و الحسـن" و ریوایـەتی "عطـاء"ە لـە ئـیبن عەباسـەوە، دەڵێـت-عبـدالله بـن عمـرو بـن العـاص-یـش وتوویـەتی (("اللمـم" لـەخوار هاوەڵدانانەوەیە بۆ خودا))، "السدي"یش دەڵێت ((ئەبو صالح وتی: پرسـیارم لێكـرا لـە فەرموودەی خودا "إلا اللمم" منیش وتم: ئەوە كەسێكە گوناهێك لەخۆدەگرێت و پاشان ناگەڕێتەوە سەری، پاشان ئەمەم بۆ ئیبن عـەباس بـاس كـرد، فـەرمووی: فریشـتەیەكی بەخشندە كۆمەكی تۆی كردووە لەسەری))

جمهور: لەسەر ئەوەن كە"اللمم" لەخوار گوناهە گەورەكانەوەیـە، ئەمـەش راسـترینی یـەكێك لـەو دوو ریوایەتەیـە لـە ئـیبن عەباسـەوە، وەك لـە سـەحیحی بوخاریـدا لـە "طاووس"ەوە لە ئیبن عەباسەوە ریوایەت كراوە كە دەڵێـت ((هـیچ شـتێكم نـەبینیوە زیاتر بە"اللمم" بچێت لەوەی ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەری خوداوە ریوایەتی دەكـات: خودا بەشی زینای لەسەر مرۆڤ نوسیوە، بەبێ چەنوچـوون پێـی دەگـات: زینـای چـاو نەزەری حەرامە، زینای زمـان قسـەیە، نـەفس ئـاوات دەخـوازێ و حـەزی لێـدەكات و داوێنیش یان ئەوانە بەڕاست دەردەكات یان بەدرۆیان دەخاتەوە))، ئیمامی مسـلم لـە "سهيل بن أبی صالح" لە باوكیەوە، لە ئەبی هـورەیرەوە ریوایـەت دەكـات كـە تێیـدا هاتووە ((هەردوو چاو زیناكەیان نـەزەرە، هـەردوو گـوێ زیناكـەیان گوێگرتنـە، زمـان زیناكەی قسەیە، دەست زیناكەی دەست بۆ بردنە، لاقیش زیناكەی هەنگاونانە بۆی))

"الكلبـي"دەفـەرموێت: (("اللمـم" دوو رووی هەیە: هـەر گوناهێـك خـودا لـە دونیـادا "حد"ی بۆ دانەناوە و لە دواڕۆژیشدا باسی سزای بۆ نـەكراوە، ئـەوە بریتییـە لـەوەی پێنج نوێژەكە دەیسـڕێتەوە، گـەر نەگاتـە گونـاهی گـەورە و فاخیشـە، رووی دووەم: بریتییە لە گوناهی گەورە، موسڵمان ناو بەناو تێدەكەوێ و تەوبەی لێ دەكات))

**سەعیدی كوڕی موسەییب** دەڵێت: ئەوەیـە بـە دڵدا تێدەپـەڕێت، واتـە پیایـدا گـوزەر دەكات.

**حوسەینی كـوڕی فـەزڵ** دەڵێـت: "اللمـم" سـەیركردن بـەبێ مەبەسـت، ئـەوە خـودا لێیخۆشبووە، گەر جارێكی تر سـەیری كـردەوە ئـەوا "اللمـم" نییـە، بـەڵكو گوناهـە.

"عطاء" لە ئیبن عەباسەوە ریوایەتی کردووە، دەڵێت پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی ((إن تغفر اللهم تغفر جما، وأی عبد لك إلا ألما))

**دەستەی سێیەم وای بۆ دەچن:** کە "اللمم" ئەوەیە کە لەسەردەمی نەفامیدا و پێش ئیسلام ئەنجامیان داوە، خودا بەو گوناهانە نایانگرێت، ئەوەش چونکە هاوەڵدانەران بە موسڵمانانیان دەوت: ((ئێوە دوێنێ لەگەڵ ئێمە ئەوەتان دەکرد، خودا ئەم ئایەتەی دابەزاند))، ئەمە قسەی "زید بن ثابت" و "زید بن أسلم"ە.

دروست قسەی جمهورە: "اللمم" بریتییە لە گوناهی بچووك لە نەزەر و چاوداگرتن و ماچ و هاوشێوەکانیان. ئەمە قسەی جمهوری هاوەڵان و ئەوانەی دوای ئەوانە، هەر بەو جۆرە قسەی "أبي هريرة و عبدالله بن مسعود و إبن عباس و مسروق و الشعبي"، ئەمە نەرێی قسەکەی "أبي هريرة و إبن عباس" ناکات لە ریوایەتێکی تردا کە دەڵێن "تووشی گوناهی گەورە دەبێت و پاشان ناگەڕێتەوە سەری"، کەوابوو "اللمم" یان هەردوو ماناکەیە و وشەکە دوو رووی هەیە، وەك "الكلبي" دەڵێت، یان ئەبو هورەیرە و ئیبن عەباس ئەوەی گوناهی گەورە-یەك جار ئەنجام دەدات و سوورنابێت لەسەری، بەڵکو هەڵەی تەمەنییەتی- گرێدەدەنەوە بە "اللمم"ەوە، وایدەبینن کە گوناه گەورە دەبێت و قورس و گران دەبێت کاتێك چەندین جار لە کەسەکە بوەشێتەوە، ئەمەش لە فیقهی هاوەڵانەوەیە-خودایان لێ رازی بێت- و قووڵی زانستیان نیشان دەدات، گومانی تێدا نییە خودا جارێك و دوو جار و سێ جار لە بەندەکەی دەبوورێت، ترس لەسەر ئەو کەسەیە کە دەقی بە گوناهەوە گرتووە و بەردەوامە لەسەری و چەند بارە دەبێتەوە، لەوەدا شوێنەواری کوشندە بوونی هەیە، سەرنجدان لە واقیع ئەو راستییەمان بۆ روون دەکاتەوە، دەگێڕنەوە لە "علی"ەوە -خودای لێ رازی بێت- کە دزێکیان هێنا بۆ لای، فەرمانی بە بڕینی دەست کرد، تۆمەتبارەکە وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، سوێند بەخودا تەنها ئەم جارە دزیم کردووە، فەرمووی: درۆ دەکەی، کە دەستی بڕا، فەرمووی: راستم لەگەڵ بکە چەند جار بەم جارەوە دزیت کردووە؟ وتی: چەندین جار، فەرمووی: راست دەکەی، خودا بە یەکەم گوناه کەس ناگرێت، یان هاوشێوەی ئەوەی کە فەرمووی. یەکەمین گوناه گەر "اللمم" نەبێت ئەوا لە رەگەز و هاوشێوەی ئەوە، دوو قسەکە لە "ئەبی هورەیرە و ئیبن عەباس"ەوە لەگەڵ یەکتر تەبان و جیاواز نین، خودا باشتر دەزانێت.

ئـەم وشـەیە "اللمـم" مانـای نـاو بـە نـاو نزیكبوونـە و چـوونە بـەردەمی تێدایـە بـە فەرمانەكەن، دەوترێت "ألم بكذا" گەر لێی نزیك ببێتەوە و نەیگاتێ، لەم رووەوە ماچ و چاوداگرتن بە "اللمم" نابراوە چـونكە لـەوەی دواتـر نزیـك دەبێتـەوە، یـان دەوترێـت "فلان لا یزورنا إلا لماما" فلان ناو بە ناو سەردانمان دەكات، مانای وشەكە جێگیرە لەو دوو رووەوە كە هاوەڵان ئایەتەكەیان پێ راڤە كردووە، مانای ئایەتەكـە ﴿ ٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَۚ ﴾ ئەوە نییە كە ئـەوان لێـی دوور ناكەونـەوە، ئـەو كاتـە ئایەتەكە بە دووركەوتنەوە لە "اللمم" مەدحیان دەكات كـە ئەمـەش بـەهیچ رێگەیـەك دروست نییە، بەڵكو ئەمـە هەڵاواردنێكـە لـە نـاوەڕۆكی قسـەكە، ماناكـەی: دووتـوێیی قسەكردن باسی دابەش بـوونی خەڵكـە بـۆ چـاكەكار و خراپـەكار، خـودا ئەمـەیان بـە چاكەكەی پاداشـت دەداتـەوە و ئەوەشـیان بـە خراپەكـەی سـزا دەدا، پاشـان باسـی چـاكەكارانی كـرد و وەسـفی كـردن بـەوەی لـە گوناهـە گـەورەكان دوور دەكەونـەوە، ناوەڕۆكی ئەمـەش: ئـەو نابێتـە چـاكەكار و پاداشـتی چـاكەی نادرێتـەوە و لـە سـزای خودایی رزگاری نابێت مەگەر كەسەكە لە گونـاهی گـەورە خـۆی بـەدوور بگرێـت، لـەو بارەدا هەڵاواردنی "اللمم" باش و شیاوە، گەر نەچێتە ناو گوناهـە گەورەكانـەوە ئـەوا دەچێتە ناو "الإثم والفواحش".

پێوەری هەڵاواردنە دابڕاوەكە (المستثنى المنقطع): ئەوەیە كە هەڵاواردەكە "مستثنى" لە رەگەزی لێهەڵاوراو"المستثنى منه"ەكەیە، با نەشچێتە ناو خودی شتەكەوە، وشـەكەی نەیگرێتـە خـۆی، وەك ئایـەتی ﴿ لَّا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوًا إِلَّا سَلَٰمٗاۖ ﴾مـریم: ٦٢، وشـەی "سلام" دەچێتە ناو كەلامەوە كە لە رەگەزی "اللغـو و السـلام"ە، هـەر بـەو جۆرە ئایـەتی ﴿ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرۡدٗا وَلَا شَرَابًا ٢٤ إِلَّا حَمِيمٗا وَغَسَّاقٗا ٢٥ ﴾ النبـأ: ٢٤ – ٢٥، وشەی "حمیم و غساق" دەچنە ناو چێژی دابەشبوو، وەك لە یەكەمیاندا وترابێـت: "لا یسـمعون فیهـا شـیئا إلا سـلاما" هـیچ نابیسـتن تیایـدا جگـە لـە سـەلام، لـەوەی دووەمیان: "لا یذوقون فیها شیئا إلا حمیما و غساقا"، هەر بەو جۆرە ئایـەتی ﴿ مَا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّۚ ﴾النساء: ١٥٧، گومان "الظن" دەچێتە ناو هەستەوە كە لە رەگەزی زانست و گومان (العلم و الظن)ە.

## ✿ هەژمارکردنی گوناهە گەورەکان

**گوناهی گەورە:** پێشین جیاوازیان هەیە تیایدا بە جیاوازییەك ناگەڕێتەوە بۆ جیاوازی لە یەكتر و دژ بەیەكتر وەستان، قسەكانیان لەیەكترەوە نزیكە.

لە هەردوو سەحیحەكەیدا، لەو فەرموودەوە كە "الشعبي" لە عبدالله بن عەمرەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە، فەرموویەتی ((گوناهە گەورەكان بریتین لە: هاوەڵدانان بۆ خودا، و خراپبوون لەگەڵ دایك و باوك، و كوشتن، سوێندی درۆ)).

لە دوو سەحیحەكەدا لە "عبدالرحمن بن أبي بكرة" لە باوكییەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ((دەتانەوێت هەواڵتان پێ بدەم بە گەورەترینی گوناهە گەورەكان؟ وتیان: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: هاوەڵدانان بۆ خودا، و خراپبوون لەگەڵ دایك و باوك، شانی دادابوو بەرزبوویەوە و دانیشت و فەرمووی: شایەتی درۆ، ئەوەندە دووبارەی كردەوە، تا وتمان خۆزگە بێدەنگ دەبوو))

لە فەرموودەی سەحیحدا لە ئەبی وائلەوە لە عمروی كوڕی شورەحبیلەوە لە عبدوڵای كوڕی مەسعودەوە، فەرمووی: وتم ((ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، چ گوناهێك مەزنترینە؟ فەرمووی: هاوەڵ بۆ خودا دابنێیت كە دروستی كردووی، دەڵێ: وتم: پاشان چیتر؟ فەرمووی: زینا لەگەڵ ژنی جیرانەكەتدا بكەیت، خودای موتەعال بۆ بەڕاستزانینی فەرموودەكەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ﴾الفرقان: ٦٨))

لە دوو سەحیحەكەدا لە "أبي هريرة"وە لە پێغەمبەری خوداوە، فەرموویەتی ((لە حەوت گوناهە گەورە تیابەرەكە خۆتان بپارێزن، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەوانە كامانەن؟ فەرمووی: هاوەڵدانان بۆ خودا، سیحر، كوشتنی مرۆڤ كە خودا حەرامی كردووە مەگەر بە مافێك، خواردنیماڵی هەتیو، هەڵهاتن لە رۆژی ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمندا، تۆمەتدانە پاڵ ئافرەتی پاكداوێن و بێئاگا و باوەڕدار)).

"شعبة" لە سەعدی كوڕی ئیبراهیمەوە دەگێڕێتەوە: گوێم لە حەمیدی كوڕی عبدالرحمن بوو كە لە دەمی عەبدوڵای كوڕی عومەرەوە-خوایان لێ رازی بێت- دەیگێڕیەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی ((لە گەورەترینی گوناهە گەورەكان: كەسێك جنێو بە دایك و باوكی بدات، وتیان: چۆن پیاو جنێو بە دایك و باوكی دەدات؟

فەرمووی: جنێو بە باوكی پیاوێك دەدات، ئەویش جنێو بە باوكی ئەو ئەداتەوە، جنێو بە دایكی كەسێك دەدا، ئەویش جنێو بە دایكی دەداتەوە)).

لە فەرموودەیەكدا كە "أبي هريرة" لە پێغەمبەری خوداوە دەیگێڕێتەوە، فەرموویەتی ((لە گەورەترینی گوناهە گەورەكان: دەمدرێژی و زمان خستنە ناو حورمەت و نامووسی برا موسڵمانەكەیەوە بە ناحەق))

عبدالله بن مسعود –خوای لێ رازی بێت– دەفەرموێت ((گەورەترینی گوناهە گەورەكان: هاوەڵدانان بۆ خودا، ئاسایش و سەلامەتی لە مەكری خودا، و رەشبینی بە بەزەیی خودا، و بێهیوابوون لە دەروو و رەحمی خودا ))

سەعیدی كوڕی جوبەیر دەفەرموێت ((پیاوێك پرسیاری لە ئیبن عباس كرد دەربارەی گوناهە گەورەكان: ئایا ئەوانە حەوتن؟ فەرمووی: ئەوانە نزیكەی حەوتسەدن، بەڵام لەگەڵ داوای لێخۆشبووندا گوناهی گەورە بوونی نییە، لەگەڵ بەردەوامبوون و سووربوونیشدا گوناهی بچووك بچووك نییە)) هەروەها فەرمووی ((هەر شتێك لە خودا پێی یاخی بێت ئەوە گەورەیە، هەر كەس شتێك لەوانەی كردووە با داوای لێخۆشبوون لە خودا بكات، خودا كەس لەم ئوممەتە لە ئاگردا بە هەتاهەتایی ناهێڵێتەوە مەگەر كەسێك لە ئیسلام پاشگەز بووبێتەوە، یان ئینكاری یەكێك لە فەرزەكان بكات، یاخود قەدەر بەدرۆ بخاتەوە))

عەبدوڵای كوڕی مەسعود –خوای لێ رازی بێت– ((ئەوەی خودا لە سورەتی "النساء"دا نەهی لێكردووەلە سەرەتایەوە تا ﴿ إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ ﴾ النساء: ٣١، بریتین لە گوناهی گەورە))، "علي بن أبي طلحة" دەڵێت: گوناهی گەورە هەر گوناهێكە خودا بە هەڕەشەی ئاگر كۆتایی پێ هێنابێت، یان بە خەشم و تووڕەیی، یان بە نەفرەت، یان سزا.

"ضحاك" دەڵێت: ئەو گوناهانەن كە خودا هەڕەش حەددی لەسەر داناون، یان سزا لە دوارۆژدا، حوسەینی كوڕی فەزڵ دەڵێت: ئەوەی خودای موتەعال لە قورئاندا بە گەورە(كبير) ناوی بردووە، یان بە مەزن (عظيم)، هاوشێوەی ئەمانە ناوی هێناون گوناهی گەورەن، وەك ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ حُوبًا كَبِيرًا ۝٢ ﴾ النساء: ٢ ﴿ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا ۝٣١ ﴾ الإسراء: ٣١ ﴿ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ۝١٣ ﴾ لقمان: ١٣ ﴿ إِنَّ كَيْدَكُنَّ

عَظِيمٌ ﴿٢٨﴾ ﴾ يوسف: ٢٨ ﴿سُبْحَٰنَكَ هَٰذَا بُهْتَٰنٌ عَظِيمٌ ﴿١٦﴾ ﴾ النور: ١٦ ﴿إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا ﴿٥٣﴾ ﴾ الأحزاب: ٥٣

مالیکی کوڕی میغوەل دەڵێت: گوناهە گەورەکان(الکبائر) بریتیە لە گوناهەکانی ئەهلی بیدعە، خراپەش (السیئات) برتییە لە گوناهی ئەهلی سوننە.

دەڵێم: دەیەوێت بڵێت بیدعە لە گوناهە گەورەکانە، بەڵکو زۆر گەورەترە لە گوناهە گەورەکانی ئەهلی سوننە، گوناهە گەورەکانی ئەهلی سوننە وەك گوناهی بچووك وان بەراورد بە گوناهی ئەهلی بیدعە، ئەمە مانای قسەی هەندێ لە پێشینە: بیدعە خۆشەویسترە لای ئیبلیس لە یاخیبوون، چونکە بیدعە تەوبەی لێ ناکرێت، بەڵام یاخیبوون تەوبەی لێ دەکرێت.

دەستەیەك دەڵێن: گوناهی بچووك ئەوەیە کە دەکەوێتە خوار دوو سنوور(حد)ەکەوە، گوناهی گەورەش ئەوەیە یەکێك لە دوو سنوور(حد)ەکە بیگرێتەوە.

مەبەستیان بە دوو سنوورەکە سزای دونیا یان دواڕۆژە، هەر گوناهێك سزایەکی شەرعی سنووراری لە دونیادا بۆ دانرابێت، وەك زینا و ئارەق خواردنەوە و دزی و تۆمەت، یان هەڕەشەی دواڕۆژی لەسەر بێت، وەك خواردنی ماڵی هەتیو و خواردنەوە لە قاپ و قاچاغی زیو و ئاڵتوون و خۆکوژی و ناپاکی لە ئەمانەت، و هاوشێوەی ئەمانە، هەموو ئەوانە لە گوناهە گەورەکانن، ئیبن عەباس-خوایان لێ ڕازی بێت- ڕاستی فەرمووە لە وتنی ((ئەوانە لە حەوتسەد نزیکترن تا لە حەوتەوە))

## ❁ چاکەی گوناهکار شفاعەتی بۆ دەکات

لێرەدا خاڵێك هەیە دەبێت زۆر لێی بەئاگابین، ئەوەش ئەوەیە کە گوناهی گەورە هەندێ جار حەیا و ترس و بە گەورەزانینی گوناهەکەی بەدوادا دێت وای لێدەکات پاشکۆی گوناهە بچووکەکان بکرێت، لەوانەیە گوناهی بچووك کەمی حەیا و بێباکی و نەبوونی ترس و سوك تەماشا کردنی لەگەڵدا بێت وای لێ بکات ببێتە پاشکۆی گوناهە گەورەکان، بەڵکو لە لوتکەی گوناهە گەورەکاندا دەیدەنێت.

ئەمە کارێکە بۆ دڵ دەگەڕێتەوە، بڕێکی زیاترە لە کردارەکە، مرۆڤ ئەوە لە دەروونی خۆی و خەڵکانی تردا دەخوێنێتەوە.

هەر بەو جۆرە خودا لە کەسی خۆشەویست و چاکەکار دەبوریٚ کە لەوانەیە لە کەسانی تر هەمان گوناه نەبووریٚت، لێبووردەیی بۆ هەندیٚ کەس هەیە و بۆ هەندێکی تر بەو جۆرە نییە.

گوێم لە "شیخ الإسلام إبن تیمیة-قدس الله روحه" بوو، دەیفەرموو: سەیری موسا بکە-صلوات الله وسلامه علیه- لەوحەکانی هەڵدا کە کەلامی خودای تێدا بوو، خودا بەدەستی خۆی نووسیبووی و شکاندنی، ریشی پێغەمبەرێکی وەك خۆی راکێشا، ئەو کەسەش هاروون بوو، زلەیەکی دا لە چاوی "ملك الموت" و چاوێکی دەرکرد، لۆمەی پەروەردگاری کرد لە شەوی ئیسرادا بەهۆی "محمد"ەوە (ﷺ) و بەرزکردنەوەی بەسەر ئەودا، پەروەردگاری هەموو ئەوانەی لیٚ قوبولٚ دەکات، خۆشی دەوێت و ریٚزی لیٚ دەنێت، چونکە بۆ خودا لەو مەقامە مەزنانەدا هەستاوە و رووبەرووی خراپترین دوژمنی خودا بوەتەوە و فەرمانی خودای پێگەیاندووە، چارەسەری هەردوو ئومەتی قیبتی و بەنی ئیسرائیلی بە باشترین شێوە چارەسەر کردووە، ئەو کارانە وەك موویەك وایە لە دەریایەکدا.

سەیری "یونس بن متی" بکە ئەو مەقامانەی نەبوو کە موسا هەیبوو، تەنها یەك جار پەروەردگاری خۆی توورە کرد، گرتی و لە سکی حوتێکدا بەندی کرد، ئەوەی لیٚ قبوولٚ نەکرد کە لە موسای قبوولٚ کرد، جیاوازی هەیە گەر تەنها یەك گوناه ئەنجام بدات و چاکەی نەبێت شفاعەتی بۆ بکات لەگەلٚ کەسێك گوناهێك دەکات و چاکەی هەیە بۆ ئەوەی شفاعەتی بۆ بکات، وەك وتراوە:

وإذا الحبیب أتی بذنب واحدا    جاءت محاسنه بألف شفیع

(گەر خۆشەویست گوناهێك بکات چاکەکانی بە هەزار تکاکارەوە دێن)

کرداری چاکە لەلای خودا شفاعەت بۆ خاوەنەکەی دەکەن، گەر کەوتە ناو تەنگانەوە یادی دەکەن، خودای موتەعال دەربارەی "ذي نون" دەفەرموێت ﴿ فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ ﴿١٤٣﴾ لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾ الصافات: ١٤٣ – ١٤٤، فیرعەون کە پێشینەیەکی خێر و چاکەی نەبوو تاکو شفاعەتی بۆ بکات وتی ﴿ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِىٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾ یونس: ٩٠، بەلام جبریل (عليه السلام) پێی فەرموو ﴿ ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾ یونس: ٩١.

بۆیە هەر کەس تای ترازووی چاکەکانی قورستر بوو لە خراپەکانی رزگاری بووە و سزا نادرێت، خراپەکانی پێ دەدرێتەوە لە پێناوی چاکەکانیدا، بۆیە لە گوناهانێکی کەسی یەکتاپەرست خۆشدەبێت کە هەمان گوناه لە هاوەڵدانەران خۆش نابێت، چونکە بە کارێك هەستاوە کە خودا پێی خۆشە و ئەوەش داوا دەکات کە لێی ببورێت و چاوپۆشی لێبکات، هەتا یەکتاپەرستی کەسەکە مەزنتر بێت لێخۆشبوونی خودایی بۆ ئەو تەواوترە، هەر کەس بە خزمەتی خودا گەیشت و هیچ جۆرە هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەدابێت، خودا لە هەموو گوناهەکانی دەبورێت، هەرچەندە زۆربن و لەسەریان سزا نادرێت.

ئێمە ناڵێین هیچ کەس لە ئەهلی یەکتاپەرستی ناچێتە ناو ئاگرەوە، بەڵکو زۆر لەوانە بە گوناهەکانیان دەچنە ناو ئاگرەوە و بە ئەندازەی گوناهەکەی سزا دەدرێت، پاشان لە ئاگر دێتە دەرەوە، دژایەتی لەنێوان ئەو دوانەدا نییە هەر کەس زانیاری تەواوی هەبێت بەوەی پێشتر باسمان لەبارەوە کرد.

لێرەدا دەمانەوێت رۆشنکردنەوەیە بدەین بەهۆی مەزنی مەقامەکە لە پێویستی زۆر بەم بابەتە. بزانە تیشکی "لا إله إلا الله" تەم و مژ و هەوری گوناه بە ئەندازەی هێز و ڕووناکی و لاوازی ئەو تیشکە دەڕەوێنێتەوە، نووری خۆی هەیە و جیاوازی خەڵکی لەو نوورە—لەڕووی بەهێزی و لاوازییەوە— مەگەر تەنها خودا بۆ خۆی هەژماری بکات.

**هەیانە:** نووری "لا إله إلا الله" وەك خۆر وایە لەناو دڵیدا.

**هەیانە:** وەك ئەستێرەیەکی درەوشاوە و پرشنگدار.

**هەیانە:** نوورەکەی وەك مەشخەڵێکی مەزن وایە.

**هەیانە:** وەك چرایەکی رۆشن، هەشیانە وەك چرای کز و لاواز.

بۆیە لە رۆژی دوایدا لەلای راست و لە بەردەمیانەوە نوور پەیدا دەبێت، بەو ئەندازەیە و بەپێی بوونی نووری وشەی "لا إله إلا الله" لە دڵیاندا لەڕووی زانست و کردار و مەعریفە و حاڵەوە.

تا نووری ئەم وشەیە گەورە بێت و رۆشنتر بێت گومانەکان و حەزەکان زیتر دەنوسێنێت بەپێی بەهێزی و توندی نورەکە. تەنانەت لەوانەیە بگاتە حاڵێك نە گومان و نە حەز و نە گوناه بوونیان نەمێنێت بیانسووتێنێت، ئەمە حاڵی کەسی راستگۆیە لە یەکتاپەرستییەکەیدا کە هاوەڵ بۆ خودا بڕیار نادات، هەر گوانە و حەز

و گومانێك لێی نزیك ببێتەوە دەیسوتێنێت، ئاسمانی باوەڕی بە ئەستێرە پارێزراوە دژ بە هەر دزێك بیەوێت لە چاکەکانی بەرێت، دزەکە ناتوانێت دەستی خۆی بوەشێنێك لەپڕ و لەباری بێئاگایی ئەودا نەبێت کە بەسەر هەموو مرۆڤێکدا گوزەر دەکات، کە بەئاگاهاتەوە و ئەوەی زانی کە لێی دزراوە لەدەستی دزەکە وەریدەگرێتەوە، یان بە کۆششی زۆرتر چەند بەرانبەر بەوەی لێی دزراوە چاکە زیاد دەکات، ئەو بە هەمیشەیی لەگەڵ دزی جین و ئینسدا بەو جۆرە مامەڵە دەکات، وەك ئەو کەسە نییە خەزێنەکەی خۆی بۆیان دەکاتەوە و پشت هەڵدەکات لێی.

یەکتاپەرستی تەنها ئەوە نییە بەندە دان بەوەدا بنێت کە هیچ دروستکەرێك بوونی نییە جگە لە "الله"، خودا پەروەردگار و مەلیکی هەموو شتێکە، وەك چۆن بتپەرستان دانیان بەوەدا دەنا و لەگەڵ ئەوەشدا هاوەڵدانەر بوون، بەڵکو یەکتاپەرستی "خۆشەویستی خودا و فەرمانبەرداری و ملکەچی و کەماڵی چوونە ژێر باری گوێڕایەڵی و ئیخلاص لە بەندایەتی و پەرسش و خوداویستی لە قسە و کردار و لێگرتنەوە و پێ بەخشین و خۆشەویستی و رق" دەگرێتە خۆ، هەموو ئەمانە خاوەنەکەیان و هۆکاری بانگەکەر بۆ یاخیبوون و سووربوون لەسەر گوناه لە یەکتر دوور دەخەنەوە، هەر کەس ئەمە بزانێت لە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) تێدەگات کە دەفەرموێت ((خودا کەسێکی لە ئاگر حەرام کردووە بڵێت: "لا إله إلا الله" بە وتنی ئەوە تەنها رووی خودای مەبەست بێت))، لەم شێوەیە فەرموودەی زۆر هاتووە کە لای هەندێ کەس تێکەڵیی دروست کردووە و تەنانەت هەندێ کەس پێیان وایە کە نەسخکرابنەوە، هەندێکیش وا گومان دەبات بەر لە هاتنی "بکە و مەکە" و جێگیربوونی شەرع وترابێت.

راڤەکەری شەرع-صلوات الله و سلامه علیه- بەدەستهێنانی ئەوەی تەنها بە وتنی زمانەوە نەبەستۆتەوە، چونکە ئەوە پێچەوانەی زانراوە بە ناچاری لە ئایینی ئیسلامدا، دووڕووەکان بە زمان دەیانوت، بەڵام لە ژێرەوە و لە ناخەوە رەدیان دەکردەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان لە قوڵترینی قوڵاییەکانی دۆزەخدان، پێویستە وتنی دڵ و وتنی زمان هەردوو هەبن، وتنی دڵ داوا دەکات وشەکە بزانرێت و بناسرێ و بەڕاست دابنرێت، زانینی حەقیقەتی ئەوەی وشەکە لە ئامێزی دەگرێت لە

نەریٚ و ئەریٚ، ناسینی حەقیقەتی خواوەندی و نەریٚکراو لە هەرچی کەس و شتە جگە لە خودا، تایبەتکراو بە خوداوە کە نەشیاوە و نابێت بۆ کەسان و شتانێك جگە لە خودا جێگیر بکرێت، راوەستانی ئەم مانایە لە دڵدا بە زانست و مەعریفە و یەقین و حاڵەوە وا لە کەسەکە (وێژەرەکە) دەکات لە ئاگر حەرام ببێت، هەر قسەیەکی راڤەکەری شەرع پاداشتی لەسەر جێگیر کرابێت ئەوە قسەیەکی تێر و تەواوە، وەك فەرموودەی ((هەر کەس لە رۆژێکدا سەد جار بڵێت: "سبحان الله وبحمده" گوناهەکانی لیٚ هەڵدەوەرێن، یاخود لە گوناهەکانی خۆشەبن، با وەك کەف دەریا زۆر و زەبەند بن))، ئەمە بەتەنها وتنی زمان دانامەزرێت.

بەڵیٚ کەسێك بە زمان بیڵێت و لە ماناکەی بێئاگا بێت و پشتی لە تێرامانی کردبێت و دڵ و زمانی یەکانگیر نەبن و پایە و حەقیقەتی ئەو وتنە نەزانێت، لەگەڵ ئەوەشدا هیوای بە پاداشت هەبێت، بە ئەندازەی ئەوەی لە دڵیدایە لە گوناهەکانی هەڵدەوەرێت، باشی و چاکی کار وکردەوەکان بە وێنە و ژمارە نییە، بەڵکو بەوەی لەناو دڵدایە، ئەو کاتە وێنەی دوو کارەکە (کاری دڵ و کاری زمان) یەك وێنە دەبێت، بەڵام جیاوازی نێوانیان وەك جیاوازی نێوان ئاسمان و زەوی وایە، دوو پیاو لە نوێژدا مەقامی وەستانیان لە یەك ریزدایە، بەڵام جیاوازی نوێژەکانیان ئاسمان و رێسمانە.

تێرابمێنە لەو حەقیقەتی باوەڕەی لە دڵی بکوژی سەد کەسەکەدا سەریهەڵدا و سەرقاڵی نەکرد لە رۆیشتن بەرەو گوندە باشەکە، ئەو باوەڕە وای لێکرد -کە ئەو لە سەرەمەرگدا بوو- سنگی بەرەو گوندە باشەکە وەربگێرێت و چارەسەری سەرەمەرگی خۆی بکات، ئەمە شتێکی تر و باوەڕێکی ترە، بۆیە کرایە پاشکۆی گوندە باشەکە و لە خەڵکەکەی سەرژمێر کرا.

نزیك لەمە ئەوەی لە دڵی ئافرەتە پیسداوێنەکەدا سەریهەڵدا، کە سەگێکی بینی لە تینوێتیدا خۆڵی دەخوارد، لەو کاتەدا بەدڵ -لەگەڵ نەبوونی ئامێرێك بۆ هەڵگۆزینی ئاو و سەرچاوەیە لە ئاو و نەبوونی کەسانێك لە دەوروبەر کارەکەی ببێتە مایەی ریا- وای لێکرد خۆی بخاتە بەر مەترسی و دابەزێت بۆ ناو بیرەکە و خوفەکانی پڕ بکات لە ئاو و گویٚ نەداتە خراپبوونی خوفەکانی، هەردوو خوفەکەی بەدەم هەڵگرت کە پڕبوون لە ئاو تا بەبیرەکەدا بتوانێت سەر بکەوێت، پاشان خۆ بەکەم زانینی لەبەردەم ئەو

مەخلوقـەدا کـە خـەڵکی راهـاتوون لێـی بـدەن، خوفـەکانی بەدەسـتی خـۆی گـرت تـا سەگەکە ئاوی خواردەوە، بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی پاداشت و شوکرێك بکـات، نـووری ئەم برە لە یەکتاپەرستی هەموو کارە خراپەکانی سوتاند و خودا لێی خۆشبوو.

کار و کارکەر بەم جۆرەیە لەلای خودا، کەسی بێئاگا بێئاگایە لەم مادده کیمیاوییە پڕ نهێنییـە، گـەر گەردیلەیـەکی بخرێتـە سـەر چـیایەك لـە نوحاسـی کاروکردەوەکـان دەیانگۆڕێت بۆ زێڕ، خودا کۆمەکی هەمووان بێت.

## بەرزی مەنزیلە وریای زۆرتری دەوێت

**گەر بوترێت:** باسی ئەوەتان کرد خۆشەویست لێبوردنی بۆ خۆشەویستەکەی خۆی وەك لێبوردنی نییە بۆ کەسانی تر، شتێك لە دۆستەکانی دەبورێت کە لـە کەسـانی تر نایبوورێت.

ئـەوەی باسـتان کـرد دروسـتە، هـەر ئـەوەش بـەپێی حیکمـەت و بەخشـین و چـاکەی خودایە، بەڵام چی لـەو سـزا چـەند بەرانبـەرە دەکـەن، کـە هەڕەشـەی پێکـراوە لەمـەڕ ئەوانەی شتێکیان لێبوەشـێتەوە خـودا پێـی نـاخۆش بێـت، وەك ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ يُضَٰعَفۡ لَهَا ٱلۡعَذَابُ ضِعۡفَيۡنِ﴾ الأحـزاب: ٣٠ ﴿وَلَوۡلَآ أَن ثَبَّتۡنَٰكَ لَقَدۡ كِدتَّ تَرۡكَنُ إِلَيۡهِمۡ شَيۡـٔٗا قَلِيلًا ٧٤ إِذٗا لَّأَذَقۡنَٰكَ ضِعۡفَ ٱلۡحَيَوٰةِ وَضِعۡفَ ٱلۡمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيۡنَا نَصِيرٗا﴾ الإسراء: ٧٤ — ٧٥، واتە گەر جێگیرکردنی ئێمـە نەبوایـە بـۆ تـۆ خەریك بوو شتێکی کەم بەلایاندا لابدەی و مەیلیان پێ بـدەی، گـەر ئەوەشـت بکردبایـە ئەوا چەند بەرانبەر سزای دونیا و دوارۆژمان دەدایت، واتە سزای دونیـا و دواڕۆژمـان بـۆ زیاد دەکردی، هـەروەها دەفـەرموێت ﴿وَلَوۡ تَقَوَّلَ عَلَيۡنَا بَعۡضَ ٱلۡأَقَاوِيلِ ٤٤ لَأَخَذۡنَا مِنۡهُ بِٱلۡيَمِينِ ٤٥ ثُمَّ لَقَطَعۡنَا مِنۡهُ ٱلۡوَتِينَ ٤٦﴾ الحاقة: ٤٤ — ٤٦، واتە گەر شتێك لە خۆیەوە بهێنێت، ئـەوا لای راستی دەگرین و شارەگی دڵـی ئـەبڕین و تیایدەبـەین، خـودا پارێزگـاری لێکـرد لـەوەی گەردیلەیەك مەیل لە دڵیدا بەرانبـەر بەوانـە بـوونی هـەبێت، یـان قسـە بـەدەم خـوداوە هەڵبەسـێت، زۆرن ئەوانـەی مـەیل بـە دوژمنـانی خـودا دەدەن و درۆ بـەدەم خـوداوە هەڵدەبەستن و خـودا پـەتی بـۆ شـلکردوون و مۆڵـەتی داون و گوێیـان پـێ نـادات، وەك خاوەن بیدعەکان و درۆ هەڵبەستان بەدەم ناو و سیفات و ئایینی خوداوە.

ئەوەی لە چیرۆکی حەزرەتی یونس باستان کرد لەم دەروازەیە، تورەبوونێکی لێ قبوولنەکرا، لەو پێناوەدا لە سکی حوتێکدا بەندکرا، بەسە بۆ ئێمە حاڵی باوکی مرۆڤایەتی کە تەنها یەك پارووی لێ قبوول نەکرا و هۆی وەردەرنانی بوو لە بەهەشت.

وەڵام: ئەمەش هەر بەو جۆرە راست و دروستە، دژیەتی لەنێوان ئەو دوانەدا نییە، ئەو کەسەی نیعمەتی خودای لەسەر تەواو بووە بە شتێك تایبەتی کردۆتەوە کە بە کەسێکی تری نەبەخشیوە لە پێدانی شتێك کە خەڵکانی تر لێی مەحروومن، بە نیعمەت بە هۆی خۆشویستنەوە بەسەریدا رژاوە و تایبەتکراوە بە رێز و گەورەیی، نزیکی لە خودا پێ بەخشراوە و خراوەتە مەنزیلەی دۆستێکی خۆشەویست حاڵی ئەو کەسە لە پارێزگاری پلەی دۆستایەتی و نزیکیی و تایبەتکردنەوە داوا دەکات پلە و پایەی خۆی پارێزگاری لێ بکات لە کەمترین تێکدەر و رێگر، لەبەر گرنگیدانی زۆر بەو کەسە و نزیکی زۆری لە خوداوە و بوون بە بەشی خودا و هەڵبژاردنی لەلای ئەوەوە بەسەر خەڵکانی تردا ماف دۆست و سەردارەکەی بەسەرییەوە زۆر زیاتر و نیعمەتەکانی گەورەترە، بۆیە داوا لەو کەسە لەسەروو داوا لە کەسانی ترەوەیە، گەر بێئاگابێت و بەپێی پلەی خۆی هەڵسوکەوت نەکات بەجۆرێك ئاگادار دەکرێتەوە کە کەسێکی دووری لابەلا بەو جۆرە ئاگار ناکرێتەوە، وەك چۆن لێبووردنێك بۆ ئەو هەیە بۆ کەسانی تر دەستەبەر نابێت، بۆ لە حەقی ئەودا هەردوو مامەڵەکە کۆدەبێتەوە.

لاکردنەوەی بەلای ئەم مانایەدا لە شەرعدا دەرکەوتووە، کاتێك حەددی ئەو کەسەی نیعمەتی هاوسەرداریی هەیە کاتێك دەستی بۆ زینا برد بریتییە لە رەجمکردن، بەڵام حەددی ئەو کەسەی ئەم نیعمەتەی نییە بریتییە لە جەڵدکردن.

پاکێتی بۆ خودایەك حیکمەتی لە بوون و بڕیار و پاداشت و سزادا ژیری خاوەن ژیرییەکانی سەرسام کردووە و شایەتی دەدەن کە خودا دادپەروەرترین دادوەرە.

لله سر تحت كل لطيفة فأخو البصائر غائص يتملق

(لەژێر هەر وردەکارییەکدا نهێنییەکی خودایی خۆی حەشارداوە، خاوەن رۆشنبینییەکان لە ئاستیدا قورگیان دەگیرێ و خۆیان دەبەنەوە بەرەوە)

## جۆرەكانی حەرام

بەندە شایستەی ناوی "تۆبەكار" نابێت تا بە تەواوی لە هەموو جۆرەكانی حەرام پاڵفتە دەبێت.

ئەوانەش دوازدە جۆرن و لە قورئاندا باسیان كراوە: بێباوەڕی، هاوەڵدانان، دووڕوویی، لادان(فسوق)، یاخیبوون، تاوان، دوژمنایەتی، خراپەی گەورە، مونكەر، دەستدرێژی، قسەكردن لەسەر خودا بەبێ زاست، گرتنەبەری ڕێگەیەك كە ڕێگەی باوەڕداران نەبێت.

ئەم دوازدە جۆرە خولگەی هەموو ئەوانەیە كە خودا حەرامی كردوون، هەموو دونیا بە گشتی روو لەمانە دەكەن، جگە لە شوێنكەوتەی راستەقینەی پێغەمبەران–صلوات الله وسلامه علیهم– لەوانەیە لە كەسێكدا زۆرینەی یان كەمینەی بوونی هەبێت، یان دانەیەك، لەوانەیە ئاگاهی هەبێت بە بوونی ئەوانە لە خۆیدا، یان بێئاگابێت.

**تەوبەی یەكجاریی:** بریتییە لە رزگاربوون لەوانە، خۆپارێزی و خۆلادان لە كەوتنەوە ناویان، تەنها ئەوانەی ئەم حەرامكراوانە دەناسن توانای خۆپارێزییان هەیە.

ئێمە باسیان لەبارەوە دەكەین و ئەوەی كۆدەنگی لەسەرە و ئەوەی جیاوازی دەیخەینە روو، تاكو سنوور و حەقیقەتیان رۆشن ببێتەوە، خودا كۆمەك و یارمەتیدەرە بۆ ئەوانەی دوای ئەمانە دێن، وەك چۆن كۆمەكی كردووە، **ولا حول ولا قوة إلا بالله.**

ئەم بەشە لە بەسوودترین بەشەكانی ئەم كتێبەیە، بەندە لە هەموو شتێك زیاتر پێویستی پێیەتی.

### ۞ بێباوەڕییەك كە نزمترە لە بێباوەڕییەكی تر

**بێباوەڕی دوو جۆرە:** بێباوەڕی گەورە و بێباوەڕی بچووك.

**بێباوەڕی گەورە:** سەردەكێشێت بۆ مانەوەی هەتاهەتایی لە ئاگردا.

**بێباوەڕی بچووكیش:** شایستەبوونی هەڕەشەی چوونە ناو ئاگرە بەبێ مانەوەی هەتاهەتایی، وەك لە فەرموودەیەكی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتووە ((دوو شت لە ئوممەتی مندا بێباوەڕییان پێوەیە، تانە لە رەچەڵەك لەگەڵ شینوشەپۆڕ بۆ مردوو))، هەروەها

فەرموودەی ((هەر كەس هاتە لای كاهینێك یان فاڵچییەك باوەڕی كرد بەوەی دەیڵێت، ئەوە بێباوەڕ بووە بەوەی بۆ سەر محمد دابەزیوە))، هەروەها فەرموودەی ((لەدوای من مەگەڕێنەوە بۆ بێباوەڕبوون، هەندێكتان بدەن لە گەردنی هەندێكی ترتان))، ئەمە تەئویلی ئیبن عەباس و هاوەڵانە بە گشتی لەسەر ئایەتی ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ المائدة: ٤٤، ئیبن عەباس دەفەرموێت: ئەو كوفرە نییە لە ئایینی ئیسلام دەریبكات، بەڵكو ئەگەر ئەنجامیدا ئەوا كوفری پێوەیە، وەك ئەوە نییە كەسێك كوفری بە خودا بە رۆژی دوایی كردبێت. "طاووس"یش هەر بەو جۆرە دەڵێت، "عطاء"یش دەڵێت ((ئەوە كوفرێكە لە خوار كوفرێكی ترەوە، ستەمێكە لەخوار ستەمێكی ترەوە، لادانێكە لەخوار لادانێكی ترەوە))

**لەوانە:** ئایەتەكەی بەوە تەئویل كردووە كە حوكم پێ نەكردنەكەی، بەهۆی بێباوەڕییەوە بێت، ئەوەش قسەی"عكرمة"یە، كە تەئویلێكی رەدكراوەیە، چونكە هەر خودی بێباوەڕییەكەی بێباوەڕییە، جا حوكمی پێ بكات، یان حوكمی پێ نەكات.

**لەوانە:** ئایەتەكەی تەئویل كردووە بە وازهێنان لە هەموو حوكمی خودا، دەڵێت: حوكم بە یەكتاپەرستی و بە ئیسلامیش دەچێتە ناو ئەو وازهێنانەوە، ئەمە تەئویلی "عبدالعزیز الكناني"ە، ئەمەش دیسان دوورە، چونكە هەڕەشەكە لەسەر نەرێكردنی حوكمە بە "دابەزێنراوەكە"، كە بریتییە لە پەكخستنی حوكمەكەی هەمووی یان بەشێكی.

**لەوانە:** ئایەتەكەی تەئویل كردووە بە پێچەوانەی دەقی ترەوە، بە ئەنقەست و بەبێ ئەوەی پێی نەزان بێت، هەڵە لە تەئویلدا نییە، ئیمامی "بەغەوی" لە زانایانەوە بەگشتی ئەمەی باس كردووە.

**لەوانە:** ئایەتەكەی بەسەر ئەهلی كیتابدا تەئویل كردووە، ئەوەش رای "قتادة و ضحاك" و كەسانی ترە، ئەمەش دیسان دوورە، پێچەوانەی ئاشكرای مانای ئایەتەكەیە، بۆیە ئەو بۆچوونە هەڵناگرێت.

**لەوانە:** ئایەتەكەی بە بێباوەڕییەك راڤە كردووە كە خاوەنەكەی لە ئیسلام دەردەكات.

**رای دروست:** حوكم كردن بەشتێك جگە لەوەی خودا دایبەزاندووە دوو جۆر بێباوەڕی لەخۆ دەگرێت: كوفری بچووك و كوفری گەورە بەپێی حاڵی فەرمانڕەواكە. گەر ئەو

باوەڕی وابوو حوكم كردن بەوەی خودا دایبەزاندووە لەو ڕووداوە تایبەتەدا پێویستە، بەڵام بەهۆی یاخیبوونەوە لێی لادا لەگەڵ دان نان بەوەدا كە شایستەی سزادانە، ئەمە كوفری بچووكە، گەر باوەڕی وابوو كە كاركردن بە حوكمی خودا پێویست نییە، ئەو ئازادە تیایدا لەگەڵ بوونی یەقین كە ئەوە حوكمی خودایە، ئەمە بریتییە لە كوفری گەورە، گەر نەیزانی و هەڵەی تێدا كرد: ئەو هەڵەكارە و حوكمی هەڵەكار دەدرێت بەسەریدا.

مەبەستەكە: هەموو یاخیبووەكان لە جۆری كوفری بچووكن، ئەو كارانە پێچەوانەی شوكرن كە بریتییە لە كاركردن بە گوێڕایەڵی.

**كوفری گەورە:** پێنج جۆرە: كوفری بەدرۆزانین، و كوفری لوتبەرزی و خۆ لێبایبوون لەگەڵ بەڕاستزانین، كوفری پشتهەڵكردن، كوفری گومان، كوفری دووڕوویی.

**كوفری بەدرۆزانین:** بریتییە لە باوەڕی بەدرۆزانینی پێغەمبەران، ئەم بەشە لە بێباوەڕان كەمن، خودای موتەعال پێغەمبەرەكانی خۆی پاڵپشت كردووە و بەڵگە و بورهانی لەسەر ڕاستێتی ئەوان پێ بەخشیون و كردوونی بە بڕینی بیانوو و پاساوی مرۆڤ، خودای موتەعال لەمەڕ فیرعەون و هۆزەكەی دەفەرموێت ﴿وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا﴾ النمل: ١٤ ﴿فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٣٣﴾﴾ الأنعام: ٣٣، گەر ئەمە بە بێباوەڕی بەدرۆزانین ناوبنێین دیسان دروستە، چونكە بەدرۆزانینە بە زمان.

**كوفری لوتبەرزی و خۆلێبایبوون:** وەك كوفری ئیبلیس، ئەو فەرمانی خودای ڕەد نەدەكردەوە و ئینكاری نەدەكرد، بەڵكو بە لوتبەرزی و لەخۆبایبوونەوە، لەم جۆرە بێباوەڕییە بێباوەڕی ئەوانەی پێغەمبەر بەڕاست دەزانن و ئەوەی لەلای خوداوە هێناویەتی بەڕەوای دەزانن، بەڵام بەهۆی لوتبەرزی و لەخۆ بایبوونەوە بۆی ملكەچ نابن، كە بێباوەڕی دوژمنانی پێغەمبەران بەزۆری لەم جۆرە بێباوەڕییەیە ﴿فَقَالُوٓاْ أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ ﴿٤٧﴾﴾ المؤمنون: ٤٧، قسەی گەلان بە پێغەمبەرانیان ﴿إِنْ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا﴾ إبراهیم: ١٠ هەروەها ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَىٰهَآ ﴿١١﴾﴾ الشمس: ١١، ئەوە بێباوەڕی یەهودییەكان بوو، وەك ﴿فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِۦ﴾ البقرة: ٨٩، هەروەها ﴿يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ﴾ البقرة: ١٤٦،

کوفری "ئەبی تالب"یش لە هەمان بێباوەڕییە، ئەو پێغەمبەری بەراست دەزانی و گومانی لە راستگۆییەکەی نەبوو، بەڵام دەمارگیری و بە مەزن راگرتنی باب و باپیر لەوەی پشت لە ئایینەکەیان بکات و شایەتی کافربوونیان بدات.

**کوفری پشتهەڵکردن:** ئەوەیە بە گوێ و دڵ پشت لە پێغەمبەر بکات، بەڕاستی نەزانێت و بە درۆی نەزانێت، دۆستایەتی نەکات و دەستدرێژیش نەکاتە سەری، گوێ نەگرێت بۆ ئەوەی هێناویەتی، وەك "عبد یالیل" وتی پێغەمبەر(ﷺ) ((سوێند بەخودا قسەیەکت پێ دەڵێم، گەر راستگۆ بیت تۆ مەزنتری لەبەرچاوم لەوەی رەدت بکەمەوە، گەر درۆزن بیت تۆ بچووکتری لەوەی قسەت لەگەڵ بکەم)).

ئەو کوفرە هەمان کوفری مولحیدینی ئەمڕۆیە لەوانەی ناوی ئیسلامان لەخۆ ناوە، چاولێکەرانی ئەفرنج(فەرەنسا و ئەوروپای ئەمڕۆ) لە یەهود و نەصارا و هەڵوەشاوان لە گشت ئەخلاق و فەزیلەتێك، بانگەشەکران بە نەزانی و گێلی کە ئەوە رێگەی پێشکەوتن و شارستانێتە.

**کوفری گومان:** نە بەڕاستزانینی یەکلاکردۆتەوە، نە بەدرۆزانین، بەڵکو گومانی هەیە تیایدا، ئەم کەسە گومانەکەی بەردەوام نابێت مەگەر خۆی ناچار بکات بە پشت هەڵکردن لە تێڕوانینی ئەو بەڵگە و نیشانانەی بەگشتی راستێتی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر دەسەلمێنن، گوێیان بۆ نەگرێت و لایان بەلادا نەکاتەوە، بەڵام لەگەڵ لابەلادا کردنەوە و سەرنجدانی بەڵگە و نیشانەکان هیچ جۆرە گومانێکی نامێنێت، چونکە نیشانەکان مرۆڤ ناچار دەکەن پێغەمبەر بەڕاست بزانێت، بە تایبەت سەرنجدان لە کۆی نیشانەکان، چونکە ئاماژەی ئەو نیشانانە لەسەر راستێتی پێغەمبەر وەك ئاماژەی رۆژ وایە لەسەر خۆر.

**کوفری دووڕوویی:** ئەوەیە کە بە زمانی باوەڕ نیشان بدات و بەدڵ بەدرۆی بزانێت، ئەمە بریتییە لە دووڕوویی گەورە، بە پشتیوانی خودا لە داهاتوودا بەشەکانی دەخەینە روو.

کوفری ئینکار و ملنەدان، دوو جۆرە: <u>کوفرێکی رەهای گشتی</u>، لەگەڵ <u>کوفرێکی سنووورداری تایبەت</u>.

**کوفری رەها:** ئەوەیە ئینکاری تەواوی ئەوەی خودا دایبەزاندووە و ناردنی پێغەمبەر لەلای خوداوە بکات.

**كوفری تایبەت:** ئینكاری فەرزێك لە فەرزەكانی ئیسلام بكات، یان ئینكاری حەرامێك لە حەرامەكانی بكات، یان ئینكاری سیفەتێك كە خودا خۆی پێ وەسف كردبێت، یان ئینكاری هەواڵێك خودا رایگەیاندبێت، یان پێش خستنی قسەی كەسێك بەسەر ئەوەی خودا رایگەیاندووە بۆ مەبەستێك لە مەبەستەكان.

بەڵام ئینكاری كردن بە نەفامی، یان بە تەئویل خاوەنەكەی بیانووی بۆ دەهێنرێتەوە و بەو ئینكار كردنەی بە بێباوەڕ لە قەڵەم نادرێت، وەك ئەو فەرموودەی ئاماژە بە كەسێك دەكات كە ئینكاری دەسەڵاتی خودا دەكات بۆ زیندووكردنەوەی، فەرمانی بە خانەوادەكەی كرد دوای مردن بیسووتێنن و خۆڵەمێشەكەی بدەن بەدەم باوە، لەگەڵ ئەوەشدا خودا لێی خۆش بوو، بەهۆی نەزانینەكەیەوە بەزەیی پێكرد، چونكە ئەوەی كردی ئەوپەڕی زانستی بوو، تا ئەو شوێنە زانستی بڕی كردبوو، ئینكار كردنەكەی بۆ دەسەڵاتی خودا لەسەر زیندووبوونەوە بەهۆی ملنەدان و بەدرۆزانینەوە نەبوو، چیرۆكەكە لە سەحیحی بوخاری و شوێنی تریش ریوایەت كراوە.

### ۞ هاوەڵدانانیش دوو هاوەڵدانانە

**هاوەڵدانان دوو جۆرە:** <u>گەورە</u> و <u>بچووك</u>، گەورە: خودا لێی نابورێت مەگەر بە تەوبەكردن لێی، <u>هاوەڵدانان</u> ئەوەیە هاوتا لەخوار خوداوە بۆ خودا دابنرێت، خۆشی بوێت وەك چۆن خوای خۆشدەوێت، ئەوە ئەو هاوەڵدانانەیە كە یەكسانبوونی خوداكانی هاوەڵدانەرانی بە خودای پەروەردگاری تێدایە، بۆ ئەو مەبەستەیە لە ئاگردا بە خوداكانیان دەڵێن ﴿ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذۡ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾ ﴾ الشعراء: ٩٧ – ٩٨، لەگەڵ دان نان بەوەی كە تەنها خودا دروستكەر و پەروەردگار و مەلیكی هەموو شتێكە و خواكانیان نە دەتوانن دروست بكەن و نە رۆزی بدەن، نە زیندوویكەنەوە و نە بمرێنن، بەڵكو ئەو یەكسان كردنە تەنها لە خۆشەویستی و بە مەزن زانینی و پەرستشدا بووە، هەر وەك حاڵی زۆربەی هاوەڵدانەرانی جیهان، بەڵكو هەموویان، پەرستراوەكانی خۆیان لەخوار خوداوە خۆشدەوێت و بە مەزنیان دەزانن و دۆستایەتییان لەگەڵیان هەیە، زۆربەیان –بەڵكو هەرە زۆریان– خوداكانی خۆیانی لە خودا زیاتر خۆشدەوێت، زۆرتر و زیاتر خۆشحاڵ دەبن و مژدە بە یەكتر دەدەن كاتێك

ناویـان دەهێـنن وەك لـەوەی نـاوی خـودا بـە تـەنها بهێنرێـت، توورەبوونەكـەیان بـۆ ناوهێنانی پەرستراوەكانیان —لە شێخ و مەشایخ— بـە خراپـە گـەورەترە وەك لـەوەی كەسێك بە كەم باسی پـەروەردگاری جیهانـەكان بكـات، گـەر حورمـەتی خوداكـان و پەرستراوەكانیان سوكایەتی پێبكرێت وەك شێر توورە دەبن و دێنە دەنگ، بەڵام گەر سوكایەتی بە سنوورەكانی خودا بكرێت هیچ توورە نابن، بـەڵكو گـەر كـابرای سـنوور بەزێن شتێك خواردنی پێدان لێی رازی دەبن و دڵیان هیچ گرانییەك بەرانبەر ئەو كەسە هەڵناگرێت، ئێمە و خەڵكانی تریش بەئاشكرا ئەمانەمان لێ بینیـون، لەوانـە دەبینیـت كاتێك هەڵدەستێ و كاتێك دادەنیشێت ناوی خوداكان و پەرستراوەكانی خۆی لـەخوار خوداوە بەسەر زمانەوەیە، لە كـاتی تێكـەڵ بـوون بـە خـەڵكی و نەخۆشـی و تـەنهایی ناویان دەهێنێت، یادی حخوداكانی و پەرستراوەكانی لە خوار خوداوە زاڵە بەسـەر دڵ و زمانیـدا و خۆشـی ئـەم راسـتییە رەد ناكاتـەوە، وا گومـان دەبـات ئەوانـە دەرگـای پێویسـتی و داوای ئـەون بـۆ لای خـودا، شـفاعەتنی بـۆ دەكـەن و دەبنـە وەسـیلەی گەیشتن بە خودا.

هـەر بـەو جـۆرە عابیـدانی بـت یەكسـانن، ئـەم برەیـە لـە دڵیانـدا سـەری هەڵـداوە، هاوەڵدانـەران بـە مـیرات بۆیـان بـەجێماوە بـە جیـاوازی خواوەنـدەكانیان، ئەوانـە خواوەندەكانیان لە بەرد و بەڵام خەڵكانی تر خواوەندەكانیان لە مـرۆڤ دروسـت كـرد، خـــودای موتـــەعال دەفـــەرموێت ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ الزمـــر: ٣، پاشـــان شایەتی لەسەردان بە كوفر و درۆیان و رایدەگەیەنێت كە خودا هیدایەتیان نـادات﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَٰذِبٌ كَفَّارٌ ۝٣﴾ الزمـر: ٣، ئەمـە حـاڵی كەسـێكە لـەخوار خوداوە دۆستی تری گرتووە، بانگەشە دەكات گوایە لە خـودا نزیكـی دەكەنـەوە، زۆر دەگمەن خەڵك لەمە رزگاری دەبێت،، بەڵكو زۆر دەگمەنن ئەوانەی دەستدرێژی ناكەنە سەر كەسێك نەرێی خواوەندەكانیان بكات.

ئـەوەی لـە دڵـی هاوەڵدانـەر و پێشـینەكانیاندایە ئەوەیـە كـە خوداكانیـان لای خـودا شفاعەتیان بۆ دەكەن، ئەمە بۆخۆی خودی هاوەڵدانانـە، خـودا لـە كتێبەكەیـدا رەدی ئەمـەی داوەتـەوە و پووچـی كردۆتـەوە، رایگەیانـدووە كـە هـەر هـەموو شـفاعەت بـۆ

خودایە و لای خودایە، هیچ کەس ناتوانێت شفاعەت بکات مەگەر خودا مۆڵەتی شفاعەت کردنی پێبدات و خودا لە قسە و کردارەکانی رازی بێت، ئەوانەش تەنها ئەهلی یەکتاپەرستین کە شفاعەتکەریان لەخوار خوداوە دانەناوە، خودا بە ویستی خۆی مۆڵەتی ئەوانە دەدات شفاعەت بکەن، چونکە ئەوانە ئەم کەسەیان نەکردووە بە شفاعەتکار، بۆیە بەختەوەرترین کەس بە شفاعەت ئەو کەسەیە کە خودا مۆڵەتی دەدات، ئەوەش یەکتاپەرستان سەرکەوتنی پێ بەدەست دەهێنن.

تێڕابمێنە لە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لە ئەبو هورەیرەوە کە پرسیاری لێ کرد، فەرموویەتی ((بەختەوەرترین کەس بە شفاعەتی من: کەسێکە بڵێت "لا إله إلا الله" بە پوختی و دڵسۆزی لە دڵەوە)) دەبینیت چۆن مەزنترین هۆکارێك شفاعەتی پێغەمبەری پێ بەدەست بهێنیت بریتییە لە پاکبوونەوەی یەکتاپەرستی، پێچەوانەی ئەوەی لای هاوەڵدانەرانە: شفاعەت بەدەست دێت-بەبیری خۆیان- بەوەی دۆستەکانیان بکەن بە شفاعەتکار بۆ لای خودا و لەوێشەوە بیانپەرستن و دۆستایەتیان بکەن لەخوار خوداوە، پێغەمبەر(ﷺ) ئەو بانگەشە درۆی هەڵگەڕاندەوە، پێی راگەیاندن هۆی شفاعەت بریتییە لە پاککردنەوەی یەکتاپەرستی و رووتکردنەوەی لە هاوەڵدانان، ئەو کاتە خودا مۆڵەت دەداتە شفاعەتکەرەکە تا شفاعەت بۆ کەسەکە بکات.

لە نەزانی کەسی هاوەڵدانەر ئەوەیە کە باوەڕی وایە ئەو کەسەی کردوویەتی بە دۆست و شفاعەتکاری خۆی دەتوانێت شفاعەتی بۆ بکات و قازانجێکی لەلای خودا پێ بگەیەنێت، هەروەك چۆن پیاوانی نزیك لە مەلیکەکان و والییەکان دەتوانن شفاعەت بۆ دۆستەکانی خۆیان بکەن، ئەوە نازانن کە هیچ کەس ناتوانێت لەلای خودا شفاعەت بکات تا خودا بۆخۆی مۆڵەتی نەدات، مۆڵەتی کەسێکیش نادات لە قسە و کرداری رازی نەبێت، وەك چۆن لە بەشی یەکەمدا خودای موتەعال فەرمووی﴿مَن ذَا ٱلَّذِى يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦ﴾ البقرة: ٢٥٥، بەشی دووەم ﴿وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ﴾ الأنبياء: ٢٨، لە بەشی سێیەمدا خودا لە قسە و گوفتاری کەسێك رازی نابێت مەگەر کەسەکە ئەهلی یەکتاپەرستی بێت و شوێنکەوتەی راستەقینەی پێغەمبەر بێت، لەسەر ئەم دوو وشەیە لە ئەوانەی پێشوو و ئەوانەی دوایین پرسیار دەکرێت، وەك "أبو العالية" دەڵێت: ((دوو کەلیمە هەیە پێشوەکان و دواینەکان پرسیاریان لێ دەکرێت لەسەریان: چیتان دەپەرست؟ چیتان وەڵامی پێغەمبەران دایەوە؟))

ئەم سێ ئەسڵە دررەختی هاوەڵدانان لە دڵی کەسێکدا تێیبگات و بژنەوێت ریشەکەند دەکات: شفاعەتکردن بە مۆڵەتی خودایە، رێگە بە کەسێك نادات شفاعەت بکات مەگەر لە گوفتار و کرداری رازی بێت، لە گوفتار و کرداری رازی نابێت گەر ئەهلی یەکتاپەرستی نەبێت و شوێنکەوتەی راستەقینەی پێغەمبەر نەبێت، خودا لە هاوەڵدانانی کەسێك خۆشنابێت بتەکانیان لەگەڵ خودادا هاوتا کردبێت ﴿ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴾ الأنعام: ١، راستترین دوو بۆچوون: هاوەڵدانەران کەسی تریان دەکردە هاوتای خودا لە پەرسش و دۆستایەتی و خۆشەویستیدا، وەك ﴿ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾ ﴾ الشعراء: ٩٧ – ٩٨، هەروەها لە ئایەتەکەی سورەتی "البقـرة"دا ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ﴾ البقرة: ١٦٥.

هاوەڵدانەران حاڵ و کرداریان قسەکانیان بەدرۆ دەخەنەوە، ئەو دەڵێت: وەك خۆشەویستی خودا خۆشمان ناون، یەکسان و هاوتایان ناکەین بە خودا، دواتر بۆ ئەوانە و حورمەتی ئەوانە زیاتر تووڕە دەبێت وەك لە تووڕەبوونی بۆ خودا و سنووری خودا، بە ناوهێنانیان سروور و خۆشحاڵی رووی تێدەکات، بە تایبەت ئەگەر باسی شتێك بکرێت لەواندا بوونی نەبێت وەك بە هاناوەچوونی لێقەوماوان و هانابەران، رەواندنەوەی مەینەتی و بەڵا و ناخۆشی، جێبەجێ کردنی پێویستی و داواکان، ئەوانە دەرگایەکن لە نێوان خودا و بەندەکانیدا، کە باسی ئەمانە دەکرێت کەسی هاوەڵدانەر دەبینی دەگەشێتەوە و خۆشحاڵ دەبێت و دڵی پڕ دەبێت، لە ناخیدا هەستی بە مەزن زانین و ملکەچی بۆیان و دۆستایەتییان سەرهەڵدەدات، بەڵام گەر خودا بە تاکو تەنها باس بکرێت و یەکتاپەرستییەکەی لە هەموو ئەوانە دابڕنرێت دەبینی نامۆیی و تەنهایی دایدەگرێتەوە، سنگی توند دەبێت و نارەحەت دەبێت و کەمی و ناتەواوی دەداتە پاڵت و لەوانەیە بکەوێتە دوژمنایەتییەوە لەگەڵت.

سوێند بە خودا ئەمانەمان بە ئاشکرا لێ بینیون، تۆمەتباریان کردووین بە دوژمنایەتییان، دەستدرێژیان کردتە سەرمان، خودا رسوای کردوون لە دونیا و دوارۆژدا، هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نەبووە جگە لە وتنی-وەك چۆن هاوشێوەکانیان دەیانوت: خواکانمان عەیبدار دەکەن – : ئەمانەش دەڵێن: شێخو

مەشایخی ئێمە و دەرگای پێویستییەکانمان بۆ لای خودا بە کەم دەزانن، نەصاراکان هەمان شتیان بە پێغەمبەر(ﷺ) دەوت، کاتێك پێغەمبەر پێی فەرموون: ((مەسیح بەندەی خودا بوو))، وتیان: مەسیحت بە کەم دانا و عەیبدارت کرد، هەر بەو جۆرە هاوشێوەی هاوەڵدانەران هەمان شتیان بەوانە وت کە پێیان دەڵێن قەبر مەکەن بە بت و لەخوار خوداوە بیپەرستن، مزگەوت تایبەت مەکەنەوە بە زیارەت، ئەوەش فەرمان بە زیارەتی کراوە بەو جۆرە زیارەتی بکەن و خودا و پێغەمبەرەکەی مۆڵەتیان پێداوە، دەڵێن: ئێوە خاوەنی ئەو گۆڕشانە بەکەم تەماشا دەکەن، ئەوەش نامۆ نییە لەوان، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحۡدَهُ ٱشۡمَأَزَّتۡ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِۖ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ إِذَا هُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ۝٤٥﴾ الزمر: ٤٥، هاوەڵدانانی تازە هەمان هاوەڵدانانە کۆنەکەیە، سەرهەڵدانی هەموو ئەمانە لە بەدرۆزانینی ڕۆژی دواییەوە سەرچاوە دەگرن، باوەڕەکەیان لەسەر دوارۆژ بەو جۆرە نییە کە خودای زانا و دانا بەیانی کردووە، لە سزا و پاداشتی دادپەروەرانە، کێشانە و پێوانەی کردارەکان بە میزانی ورد و دروست، ئەوان دوارۆژ بە شفاعەت و کۆمەڵێك مەبەست تەماشا دەکەن کە خودا ناتوانێت –بە بۆچوونی ئەوان– بڕیاری لێ نەدات، ئەوە ئەو دوارۆژە نییە خودا وەسفی کردووە و هۆشداری بە بەندەکانی داوە لەمەڕ ڕووداوەکانی، هاوەڵدانەرانی کۆن و نوێ باوەڕیان وایە دۆست و شفاعەتکارەکانیان شتێك لە سیفەتی پەروەردگارییان تێدایە، بۆیە بانگیان لێ دەکەن و لە کاتێکدا ئەوانە مردوون و شاراونەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕییان وایە ئەوانە زیندوون، نەك زیندووێتی قەبر و پرسیاری قەبر، بەڵکو لە جۆری زیندەگی پەروەردگار–سبحانە– جۆرە توانایەکیان دەدەنە پاڵ تەنانەت مرۆڤی زیندوو ئەو توانایەی نییە، چجای کەسی مردوو، کە پێغەمبەران هاتنە لایان، پێیان وتن: ئەوانە مرۆڤن و مردوون، پێیان دەڵێن: ئێوە جنێو بە خواوەندەکانی ئێمە دەدەن و بەکەم تەماشایان دەکەن و عەیبداریان دەکەن.

تەماشای لێکچوونی نێوان دڵانیان بکەن، وەك ئەوەی وەسێتیان بۆ یەکتر کردبێت ﴿مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِۖ وَمَن يُضۡلِلۡ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيّٗا مُّرۡشِدٗا ۝١٧﴾ الکهف: ١٧.

هەرچی هۆکارە کە هاوەڵدانەران دەستی پێوە دەگرن لەلای خوداوە براوەتەوە، بڕینەوەیەك کە هەر کەس تێڕابمێنێ و بیناسێتەوە لەوە تێدەگات هەر کەس لەخوار

خوداوە دۆست و شفاعەتكار بگرێت نموونەكەی وەك ﴿كَمَثَلِ الْعَنكَبُوتِ اتَّخَذَتْ بَيْتًا وَإِنَّ أَوْهَنَ الْبُيُوتِ لَبَيْتُ الْعَنكَبُوتِ﴾العنكبوت: ٤١، هەروەها ئایەتی ﴿ قُلِ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ وَمَا لَهُ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ ﴿٢٢﴾ وَلَا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ عِندَهُ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُ ﴾ سبأ: ٢٢ – ٢٣.

هاوەڵدانەر بۆیە پەرستراوێك لەخوار خوداوە بڕیار دەدات تاكو سوود و قازانجی پێ بگەیەنێت، سوود و قازانجیش بەدەست نایەت مەگەر كەسی قازانجبەخش یەكێك لەم چوار سیفەتەی تێدا بێت: خاوەنی ئەو شتە بێت بەندە لێی داوا دەكات، گەر خاوەنی نەبێت ئەوا شەریكی خاوەنەكەی دەبێت، گەر شەریكی نەبێت ئەوا یارمەتیدەر و پشتیوانی بێت، گەر یارمەتیدەر و پشتیوانی نەبوو ئەوا شفاعەتكار بێت لەلای.

خودا هەر چوار ئاستەكەی نەرێ كردووە، لە سەرەوە بۆ خوارەوە، نەرێی "موڵك و شەراكەت و پشتیوانی و شفاعەت"ی كردووە كە هاوەڵدانەران باوەڕیان پێیەتی، شفاعەتێكی جێگیر كردووە كە بەشی هاوەڵدانەرانی تێدا نییە، ئەویش شفاعەتە بە مۆڵەتی خودا.

نوور و بەڵگە و رزگاری و یەكتاپەرستی پاك و بێگەردی ئەم ئایەتە بەسە، ئەم ئایەتە هاوەڵدانان لە رەگ و ریشك دەردەهێنێت، قورئان پڕە لە نموونە و هاوشێوەی ئەم ئایەتە، بەڵام زۆر كەس هەست ناكەن بەو مانا قووڵەی لە ژێریدایە و ئەوەی لە ئامێزی دەگرێت، وا گومان دەبەن باسی جۆر و هۆزێكی تر دەكات كە پێشتر تێپەڕیوە و هیچ میراتگرێكیان لەدوا بەجێنەماوە، ئەمە ئەوەیە كە دڵ لە تێگەیشتنی قورئان لا دەدات.

سوێند بە خودا گەر ئەوانە گوزەریان كردبێت ئەوا كۆمەڵێك میراتگری وەك خۆیان بەجێهێڵاوە، یان خراپتر لەوان، یاخود لەخوار ئەوانەوە، دەستبردنی قورئان بۆ ئەوانە وەك دەستبردنیەتی بۆ هاوەڵدانەرانی پێشوو، بەڵام كارەكە-وەك عومەری كوڕی خەتتاب خوای لێ رازی بێت دەفەرموێت- ((گرێكانی (پایەكانی) ئیسلام هەڵدەوەشێتەوە ئەگەر لە ئیسلامدا نەوەیەك دروست بوون نەفامیان نەناسی))

ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە گەر نەفامی و هاوەڵدانان بۆ خودا نەناسی و ئەوەی قورئان زەمی كردووە جیای نەكاتەوە ئەوا دەكەوێتە ناویەوە و بڕیاری لێدەدات و

بانگ دەکات بۆ لای و بەڕاست و دروستی دەزانێت، ئەو نازانێت ئەوە ئەوەیە کە ئەهلی نەفامی لەسەری بوون، یان هاوشێوەی ئەوەیە، یان خراپتر لەوە، یان لەخوار ئەوەوە، بەو هۆیەوە گرێی ئیسلام لەدڵیدا هەڵدەوەشێت، مەعروف و چاکەی لێدەگۆڕێت بە خراپە و خراپەشی لێدەگۆڕێت بە چاکە، بیدعەی لێدەبێت بە سوننەت، و سوننەتیش بە بیدعە، کەسێك کافر دەکەن لەگەڵ بوونی باوەڕ و پاکی و بێگەردی یەکتاپەرستی لەلای، ئەو کەسەی شوێنی پێغەمبەر دەکەوێت و جیادەبێتەوە لە ئارەزووبازی و بیدعە بە بیدعەی تۆمەتبار دەکرێت، هەر کەس خاوەنی ڕۆشنبینی و دڵێکی زیندوو بێت بە بەرچاوەوە شتەکان دەبینێت، خودا کۆمەککار و یارمەتیدەرە.

### ۞ هەژمارکردنی دووڕوویی بچووك

<u>هاوەڵدانانی بچووك</u> وەك کەمێك لە ڕیا، خۆنمایشکردن و خۆبردنەوە بەرەوە لای خەڵك، سوێندخواردن بە کەسێك یان شتێك جگە لە خودا، وەك لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ساغ بووەتەوە کە فەرموویەتی ((هەر کەس بە شتێك یان کەسێك سوێند بخوات ئەوە هاوەڵیداناوە))، سوێنخواردن بە غەیری خودا هاوەڵدانانە، لەبەرئەوەی ڕاستێتی سوێندخواردن و داواکەی: سوێنخۆر ڕاستێتی هەواڵەکەی پشتڕاست دەکاتەوە بەوەی گەر درۆ بکات ئەوا سوێن پێخوراوەکە سزای بدات بە سزایەك کە ئەو دەستی بەسەردا ناڕوات، هیچ مرۆڤێکیش ناتوانێت لەسەری لایبدات، چونکە سوێنپێخوراوەکە توانای ئەوەی هەیە تۆڵە و دەستوەشاندنی خۆی بگەیەنێت بەرێگەیەك لەسەرو دەسەڵات و توانای مرۆڤەوە، ئەمەش نابێت بۆ خودای خاوەن هێز و دەسەڵات نەبێت، خاوەن دەستوەشاندنی توندوتیژ و کارا لە ئەنجامدانی ئەوەی دەیەوێت.

هاوشێوەی ئەوە وتنی کەسێك بە کەسێکی تر "گەر خودا و تۆ بتانەوێت" یان "ئەمە لە خودا و لە تۆوەیە"، "من گیانم بە خودا و بە تۆیە"، "کەسم نییە جگە لە تۆ و خودا"،"تەوەکولم بە خودا و بە تۆ بەستووە"، "گەر تۆ نەبوایە ئەوە و ئەوە ڕووینەدەدا"، ئەم جۆرە قسانە هەندێ جار هاوەڵدانانی گەورەن، بەپێی قسەکەرەکە و مەبەستەکەی، لە فەرموودەی سەحیحدا پێغەمبەر بە پیاوێکی فەرموو کە پیاوەکە وتبووی: ((خودا و تۆ بتانەوێت))، پێی فەرموو ((دەمکەیت بە هاوەڵ بۆ خودا؟ بەڵێ: تەنها خودا بیەوێت)) ئەم قسەیە هێواشترە لەو قسانەی ئاماژەمان پێکردن.

**لە جۆرەکانی هاوەڵدانان:** تەوبە بۆ شێخ، ئەمە هاوەڵدانانێکی زۆر گەورەیە، چونکە تەوبە تەنها بۆ خودای موتەعالە، وەك نوێژ و ڕۆژوو و حەج و مەناسیکەکان کە تەنها دەبێت بۆ خودابن.

لە مەسنەددا: پێغەمبەر(ﷺ) ((ئەسیرێکیان هێنا، وتی: خودایە من تەوبە دەکەم بۆ لای تۆ، تۆبە ناکەم بۆ لای محمد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: حەقی ناسی بۆ خاوەنەکەی))

تۆبەکردن بەندایەتییە وەك سوژدە و ڕۆژوو و دەبێت تەنها بۆ خودای موتەعال بێت، **هەروەها لە جۆرەکانی:** نەزرکردن بۆ غەیری خودا، ئەوەش هاوەڵدانانە، لە سوێندخواردن بە غەیری خودا گەورەترە، گەر ((هەر کەس بە شتێك یان کەسێك سوێند بخوات ئەوە هاوەڵیداناوە)) دەبێت حاڵی کەسێك چۆن بێت نەزر بۆ غەیری خودا بڕیار دەدات؟ لەگەڵ ئەوەی لە "السنن"دا لە فەرموودەکەی "عقبە بن عامر" لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی ((نەزرکردن سوێنخواردنە))

**لە جۆرەکانی:** ترسان لە غەیری خودا و پشتبەستن بە غەیری خودا و کارکردن بۆ غەیری خودا و گەڕانەوە و ملکەچی و گەردنکەچی بۆ غەیری خودا، داواکردنی ڕۆزی لە غەیری خودا و ستایش کردنی غەیری خودا کە ڕۆزی پێدا، بەجۆرێك لە ستایشکردنی خودا **—سبحانە—** بێنیاز ببێت، بێزار و وەڕسی و بێتاقەتی لەسەر شتێك خودا بۆ تۆی نەبڕیوەتەوە و قەڵەمی قەدەر بۆتی نەنوسیوە، هەروەها دانەپاڵی نیعمەتەکانی خودا بۆ لای غەیری خودا، باوەڕبوون بەوەی لە گەردووندا شتێك بوونی هەیە کە ویستی خودای لەسەر نەبێت.

**لە جۆرەکانی:** داوای پێویستی لە مردوو، هانا بۆ بردنیان، ڕووکردنە تێیان.

ئەمەیان بنچینەی هاوەڵدانانی هەموو دونیایە، مردوو لەگەڵ کارەکانی لەیەکتر دابڕاون، ئەو زیان و قازانج بە خودی خۆیشی ناگەیەنێت، چجای بۆ ئەو کەسانەی پەنای پێدەگرن و هانای بۆ دەبەن و داوای جێەجێ کردنی پێویستییەکانیان لێ دەکرێت، یان داوای لێدەکات لەلای خودا ببێت بە تکاکاری، ئەمە نەناسینی شفاعەتکار و شفاعەتبۆکراو و شفاعەت لاکراوە، وەك پێشتر ئاماژەی پێکراوە، ئەو ناتوانێت شفاعەتی بۆ بکات لەلای خودا بە مۆڵەتی خودا نەبێت، خودا پەنابردنەکەی و

داواكردنەكەی نەكردووە بە هۆیەك بۆ مۆڵەتدانەكەی، بەڵكو هۆی مۆڵەتدانەكە بریتییە لە كەماڵی یەكتاپەرستی، كەسی هاوەڵدانەر دەستی بۆ هۆیەك بردووە كە مۆڵەت قەدەغە دەكات، ئەو وەك ئەو كەسە وایە بۆ پێویستییەك هانای بە شتێك بردووە كە رێگرە لە بەدەستهێنانی، ئەمە دۆخی هەموو مرۆڤێكی هاوەڵدانەرە، مردوو پێویستی بەوەیە دوعای بۆ بكرێت و بەزەیی پیابێتەوە، و داوای لێخۆشبوونی بۆ بكرێت، وەك پێغەمبەر(ﷺ) وەسێتی بۆ كردووین كاتێك زیارەتی گۆڕستانی موسڵمانانمان كرد رەحمەتیان بۆ بنێرین و داوای سەلامەتی و لێخۆشبوونیان بۆ بكەین.

كەس لە داوی ئەم هاوەڵدانانە گەورە رزگاری نەبووە جگە لە ئەوانەی یەكتاپەرستی خۆیان پاك و بێگەرد كردووە و دوژمنایەتی هاوەڵدانەرانیان لەبەر خودا راگەیاندووە، بە رق لەوانە لە خودا نزیك بووەتەوە، خودای بە تاق و تەنها كردووە بە دۆست و خودا و پەرستراو، خۆشەویستی و ترس و رجا و گەردنكەچی و پشتبەستن و هانابردن و پەناگرتن و هەڵهاتنی تەنها بۆ خودا و بۆ لای خودایە، مەرام و مەبەستی بۆ خودا پاك كردۆتەوە، شوێنی فەرمانەكانی كەوتووە، بەدوای رەزامەندی ئەودا دەگەرێت، گەر داوایەكی هەبوو داوا لە خودا دەكات، گەر پەنای گرت پەنا بە خودا دەگرێت، گەر كارێكی كرد بۆ خودا ئەنجامی داوە، ئەو بۆ خودایە و بە خوداوەیە و لەگەڵ خودایە.

هاوەڵدانان جۆری زۆرە مەگەر تەنها خودا هەژماریان بكات.

گەر بەردەوام بین لە ناوهێنانیان باسەكەمان زۆر درێژ دەبێتەوە.

## ۞ نەخۆشی دووڕوویی

دووڕوویی دەردێكی كوشندەی ناوەوەیە، كە كەسەكە پڕ دەبێت بەو دەردە و پێی نازانێت، كارێكی شاراوەیە لە خەڵكی، زۆرجار ئەو كەسەی نەخۆشییەكە بووە بە پۆشاكی بەری ئاگاهی پێی نییە، وا بانگەشە دەكات كە ئەو كەسێكی چاكساز (مصلح) بێت، بەڵام راستییەكەی ئەوەیە كە ئەو تێكدەر(مفسد)ە.

**ئەمەش دوو جۆرە: گەورە و بچووك.**

**گەورەكەی:** ئاگری دۆزەخی بۆ دەبڕێتەوە لە قوڵترین شوێنیدا. ئەوەیە كە بۆ موسڵمانان باوەڕی خۆی بە خودا و فریشتەكان و كتێبەكان و پێغەمبەران و رۆژی

دوایی رابگەیەنێت، بەڵام لە ناوەوە لە هەموو ئەوانە داڕنرابێت و بەدرۆیان بزانێت، باوەڕی بەوە نییە خودا بە کەلامێك قسەی کردووە و دایبەزاندووە بۆ سەر مرۆڤ و کردوویەتی بە پێغەمبەر بۆ خەڵکی، خەڵکی بە مۆڵەتی خودا هیدایەت دەدات و لە هەڕەشەکانی خودا ئاگاداریان دەکاتەوە، و لە سزاکەی دەیانترسێنێت.

خودا لە قورئاندا پەردەی لەسەر دووڕووان لاداوە و نهێنییەکانی دەرخستوون و کاروبارەکانی بۆ بەندەکان رۆشن کردۆتەوە، بۆ ئەوەی لەوانە و ئەهلی ئەوانە خۆیان بەدووربگرن و هۆشیار بن.

سێ دەستەکەی هەموو دونیا لە سەرەتای سورەتی "البقرة"دا باس کردووە: باوەڕداران و بێباوەڕان و دووڕووان، چوار ئایەتی لەسەر باوەڕداران باس کردووە، دوو ئایەتی لەسەر بێباوەڕان باس کردووە، پاشان سیازدە ئایەتی لەسەر دووڕووان باس کردووە، بەهۆی زۆرییانەوە و گشتگیریی بەڵای ئەوانە و توندی و دژواری فیتنەیان لەسەر ئیسلام و ئەهلی ئیسلام، تووشبوونی ئیسلام بەوانە و بەڵای ئەوانە لەسەر ئیسلام سەخت و دژوارە، چونکە خۆیان دەدەنە پاڵ ئیسلام و سەرخستنی ئیسلام و دۆستایەتی ئیسلام، بەڵام لە ناوەرۆکدا دوژمنی ئیسلامن، دوژمنایەتی کردنی ئیسلام دەخەنە ناو قڵبێکەوە کە مرۆڤی نەزان وادەزانێت زانست و چاکسازییە، لەراستیدا لوتکەی نەزانی و تێکدانە.

بەس خودا دەزانێت ئەوانە چەند سەنگەری ئیسلامیان وێران کردووە، چەند قەڵای ئیسلامیان لە بناغەوە دەرهێناوە و روخاندووە، چەند شوێنەوار و مەشخەڵی ئیسلامیان سڕیوەتەوە، چەند ئاڵای بەرزی ئیسلامیان دانەواندووە، چەند بنچینەی دامەزراوی ئیسلامیان بە گومان و تەمومژ هەڵتەکاندووە، چەند سەرچاوەی ئیسلامیان وشك کردووە بە بۆچوونەکانیان تاکو ئیسلام بشارنەوە و بنبڕی بکەن!

ئیسلام و ئەهلی ئیسلام بەردەوام لەدەستیان لەناو بەلا و ئازاردا بووە، بەردەوام و سوپا لە دوای سوپا گومان و شوبهەکانیان رەوانەی سەر ئیسلام دەکەن و بەو کارەشیان وا بانگەشە دەکەن کە چاکسازن ﴿أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْمُفْسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ ﴿١٢﴾﴾ البقـرة: ١٢ ﴿يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾﴾ الصف: ٨

## ۞ ناشیرینییەکانی کەسایەتی دووڕوو

کۆدەنگن لەسەر دوورکەوتنەوە لە وەحی، ئەوان لەسەر هیدایەت وەرنەگرتن لە وەحی کۆبوونەتەوە ﴿ فَتَقَطَّعُوٓاْ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ زُبُرًا ۖ كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾ المؤمنون: ٥٣ ﴿ يُوحِى بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ﴾ الأنعـــــام: ١١٢ ﴿ ٱتَّخَذُواْ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ مَهْجُورًا ﴿٣٠﴾ ﴾ الفرقان: ٣٠

مەشخەڵی باوەڕ لە دڵیاندا کپبوەتەوە و نایناسنەوە، شوێنی پەیمانی رزاوە و ئاوەدانی ناکەنەوە، هەسارە رووناکەکانی باوەڕ لە دڵیاندا ئاوابووە و زیندووی ناکەنەوە، خۆری باوەڕ لە دڵیاندا بەهۆی تاریکی بیر و بۆچوونەکانیانەوە گیراوە و نابینن، ئەو هیدایەتەی خودا بە پێغەمبەردا رەوانەی کردووەقوبووڵی ناکەن و سەری خۆیانی پێ بەرزناکەنەوە و پشتهەڵکردن لەو هیدایەتە بە رووکردنە بیر و بۆچوونەکانیان بەخراپ نابینن، دەقەکانی وەحییان لە دەسەڵاتی حەقیقەت رووت کردۆتەوە، لە ویلایەتی یەقین کەناریان داون، هێرشی تەئویلی پووچ و بێبنەما دەکەنە سەری، دەڵێن: ئێمە چیمان لە دەرەوە و رووالەتی وشە کە یەقینمان پێ نابەخشێت؟ ئەوەی پاشین(خلف) بۆیان بەجێهێڵاوین بەسمانە، ئەوان شارەزاتر و زاناتر بوون لە پێشینی رابردوو، راسترەوترن لەسەر رێگەی هێناوەی بەڵگە و بورهان، ئەوانە سادەیی و سینەساف زاڵ بووە بە سەریاندا، خۆیان یەکلا نەکردۆتەوە بۆ رێخۆشکردنی کۆمەڵێك یاسا و رێسای تێڕامان و سەرنجدان لە دەقەکان، توانا و لێبڕانیان لە ئەنجامدانی کاری فەرمانپێکراو و دوورکەوتنەوە لە نەهیلێکراودا بەخت دەکەن، رێگەی پاشین زاناتر و توندوتۆڵترە، و رێگەی پێشینی رابردوو نەزانترە، بەڵام سەلامەتترە.

نەخۆشی گومان و حەز ناخی پڕکردوون و تیابردوون، مەبەست و مەرامی خراپ زاڵبووە بەسەر ویست و نێتیاندا و تێکیداوە بەسەر یەکدا، تێکچوونی ئەوانە سەری لە تیاچوونەوە دەرچووە و پزیشکە عاریفەکان لێی دەستەوسانن ﴿ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُواْ يَكْذِبُونَ ﴾ البقرة: ١٠

گوێی دڵیان قورسیی کەڕی کردووە و بانگی بانگەکەری باوەڕ نابیستێت، چاوی رۆشنبینییان پەردەی کوێری بەسەردا هاتووە، حەقیقەتی قورئان نابینێت، زمانیان

لاڵی تێکەوتووە لە وتنی حەق و ئەوان ناتوانن قسەی پێبکەن﴿ صُمٌّ بُكۡمٌ عُمۡيٞ فَهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ١٨ ﴾ البقرة: ١٨

نیشانەیان لە قورئان و فەرموودەدا بۆ دانراوە و پێی دەناسرێنەوە، بۆ ئەوانەی ئەهلی رۆشنبینی باوەڕن دەردەکەوێت، ریا بەوانەوەیە، کە سوێند بە خودا خراپترین شتێکە بە مرۆڤەوە بێت، تەمبەڵی لە ئەنجامدانی ئەو فەرمانانەی پێیان کراوە پەکی خستوون ﴿ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلٗا ١٤٢ ﴾ النساء: ١٤٢

هەریەك لەوانە وەك مەڕی وێڵبووی نێوان دوو ڕانەمەڕی لێهاتووە، جارێك خۆی دەكات بەمیاندا و جارێك بەویاندا، لە رانەمەڕێکیاندا خۆی راناگرێت، ئەوان لەنێوان دوو دەستەدا وەستاون، سەیردەکەن بزانن کامیان بەهێزتر و ژمارە زۆرترە﴿ مُّذَبۡذَبِينَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلٗا ١٤٣ ﴾ النساء: ١٤٣

چاوەڕوانی تیاچوونی ئەهلی سوننە و قورئانن، گەر لەلای خوداوە سەرکەوتنێکیان پێبدرێت، دەڵێن: ئەی ئێمە لەگەڵ ئێوە نەبووین؟ لەسەر ئەوە بە ئەوپەڕی توانایانەوە سوێن دەخۆن، گەر بۆ دوژمنانی کیتاب و سوننە سەرکەوتنێك تۆمار کرا، پێیان دەڵێن: بۆ نازانن پەیمانی برایەتی لەنێوانماندا توندوتۆڵە و رەچەڵەکمان لە یەکترەوە نزیکە؟ ئەی ئەو کەسەی دەتەوێ بیانناسی، سیفەتەکانیان لە کەلامی پەروەردگاری جیهانەکانەوە وەربگرە، لەدوای ئەوە پێویستت بە بەڵگە و نیشانە نییە ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمۡ فَإِن كَانَ لَكُمۡ فَتۡحٞ مِّنَ ٱللَّهِ قَالُوٓاْ أَلَمۡ نَكُن مَّعَكُمۡ وَإِن كَانَ لِلۡكَٰفِرِينَ نَصِيبٞ قَالُوٓاْ أَلَمۡ نَسۡتَحۡوِذۡ عَلَيۡكُمۡ وَنَمۡنَعۡكُم مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۚ فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ وَلَن يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لِلۡكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ سَبِيلًا ١٤١ ﴾ النساء: ١٤١

گوێگر سەرسام دەبێت بە قسەیان لە نەرمی و شیرینی، خودا بە شایەت دەگرێت لەسەر ئەو درۆ و ناڕاستیانەی لەناو دڵیدایە، دەبینیت لە حەق و بۆ حەق نوستووە و بۆ باتڵیش لە پێشەوەیە، وەسفی ئەوانە لە قسەی "القدوس السلام" وەربگرە﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعۡجِبُكَ قَوۡلُهُۥ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيُشۡهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلۡبِهِۦ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلۡخِصَامِ ٢٠٤ ﴾ البقرة: ٢٠٤.

ئەو فەرمانانەی بەسەر شوێنکەوتووانیاندا دەریدەکەن فەسادی خاك و خەڵکی تێدایە، نەهێکردنیان لە چاکەیەکە کە ژین و دین و دواڕۆژی خەڵکی پێوە بەستراوە، لەوانە

دەبینیت خۆیان خزاندۆتە ناو ئەهلی باوەڕ و نوێژ و یاد و زوهد و ئیجتیهاد ﴿ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ ٱلْحَرْثَ وَٱلنَّسْلَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ ﴿٢٠٥﴾ ﴾ البقرة: ٢٠٥

گەر بیانگێڕیتەوە بۆ سەر وەحی ڕۆشن دەبینی لێی هەڵدێن، گەر بانگیان بکەی بۆ حوکمی قورئان و سونەتی پێغەمبەر(ﷺ) دەیانبینی پشتی لێ هەڵدەکەن، گەر حەقیقەتیان سەرنج بدەی دەبینی لەنێوان هیدایەتدا دوورییەکی بەرین بوونی هەیە، بۆت دەردەکەوێت حەقیقەتیان پشت لە وەحییە بە پشت تێ کردنێکی توند و بەرین ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيْتَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا ﴾ النساء: ٦١

سوێندیان پێش قسەیان دەکەوێت بەبێ ئەوەی کەس بەرهەڵستی کردبێت بەهۆی ئەوەی کە دەزانێت دڵی ئەهلی ئیمان دڵنیا نییە لێی، بە سوێندەکەی پاکانە بۆ خۆی دەکات لە بردنی گومانی خرا پێی و پەردەلادان لەسەر ئەوەی لەلایەتی، هەر بەو جۆرە ئەهلی گومان درۆ دەکەن و سوێند دەخۆن تاکو گوێگر وادابنێت ئەوانە راستگۆن ﴿ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَيْمَٰنَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ المنافقون: ٢

دەستیان بە بڕین بچێت! لەگەڵ قافڵەی باوەڕدا هاتنە دەرەوە و کاتێك درێژی ڕێگەکە و ئازار و مەینەتی دووریيان بینی پاشگەز بوونەوە و لەسەر پاژنە وەرچەرخان و گەڕانەوە، وا گومانیان برد چێژ لە خۆشی ژیان و ئاسوودەیی خەو لەناو ماڵەکانیاندا وەردەگرن، نە خۆشییان چەشت و نە سودیان لە خەوەکانیان بینی، دەبێ حاڵیان چۆن بێت کاتێك دەگەنەوە بە خودا؟ حەقیان ناسی و ڕەدیان کردەوە، کوێربوون دوای ئەوەی حەقیان بینی﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٣﴾ ﴾ المنافقون: ٣

جوانترین جەستەیان هەیە و شیرینترین زمان و ڕەوانترین بەیان، بەڵام پیسترین دڵ و لاوازترین ناخ، ئەوان وەك تەختەی ڕەق وان کە هیچ بەروبوومێکی نییە، لە ڕەگ و ریشە هەڵکەنراوە و پاڵی بە دیوارێکەوە داوە تاکو پیادەڕەوان پێی پیانەنێن ﴿ وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ ۖ وَإِن يَقُولُوا۟ تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ ۖ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ ۖ يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ ۚ هُمُ ٱلْعَدُوُّ فَٱحْذَرْهُمْ ۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ ۖ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴾ المنافقون: ٤

نوێژ دوا دەخەن و لە کاتی خۆیدا ئەنجامیان نادەن، بەیانی لە کاتی هەڵهاتنی خۆر و نوێژی عەسر و خۆرئاوابوون، دەنووك بە زەویدا دەدەن وەك قەلەڕەش، نوێژەکانیان

نوێژی جەستەیە، نەك نوێژی دڵ، لە نوێژەكانیاندا وەكو ڕێوی لادەكەنەوە، چونكە دڵنیایە ئەو دەركراو و داواكراوە، نوێژی بە كۆمەڵ ناكەن، بەڵكو گەر یەكێكیان نوێژی كرد یان لە ماڵەوە یان لە دوكان ئەنجامی دەدات.

گەر ئەهلی كیتاب و سونەت سەلامەتی و سەركەوتن و پشتیوانیان بۆ بەدەستهات نیگەران دەبن و پێی دڵتەنگن، گەر ناخۆشی و تاقیكردنەوەیەك لە خوداوە ڕوویان تێبكات تاكو گوناهەكانیان بشۆرێتە و خراپەكانیان بسڕێتەوە خۆشحاڵ دەبن و دەگەشێنەوە ﴿إِن تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِن تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُوا بِهَا﴾آل عمران: ١٢٠

خودا گوێڕایەڵی ئەوانەی پێ ناخۆشە بەهۆی پیسی دڵ و تێكچوونی نێتەكانیانەوە، خودا لەو كارە باشانە بەندی كردوون و لە جووڵەی خستوون، خودا نزیكی و جیرانی ئەوانەی پێ ناخۆشە بە هۆی مەیلیانەوە بۆ دوژمنانی خودا، لەلای خۆی دەریكردوون و دووری خستوونەتەوە، ئەوان پشتیان لە وەحی خودا كرد و خوداش پشتی لەوان كرد، ڕووبەڕووی شەقاوەتی كردنەوە و بەختەوەرییان پێ نابەخشێت، بە بڕیاری دادپەروەرانە حوكمی بەسەر ئەوانەدا دەركرد، بۆیە هیچ جۆرە هیوایەكی ڕزگارییان لەدوای ئەوە نییە، مەگەر بچنە ریزی تۆبەكارانەوە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَلَوْ أَرَادُوا الْخُرُوجَ لَأَعَدُّوا لَهُ عُدَّةً وَلَٰكِن كَرِهَ اللَّهُ انبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ وَقِيلَ اقْعُدُوا مَعَ الْقَاعِدِينَ﴾ التوبة: ٤٦

پاشان باسی حیكمەتی بەندكردن و دانانیان دەكات لە كرداری چاكە، هەروەها باسی دەركردنیان لە دەرگای خودا و دوورخستنەوەیان، ئەمە بەهۆی لوتفی خوداوەیە بە دۆستەكانی و بەختەوەركردنیان، دەفەرموێت-كە ئەو داناترین و دادوەرترین بڕیاردەرە- ﴿لَوْ خَرَجُوا فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا وَلَأَوْضَعُوا خِلَالَكُمْ يَبْغُونَكُمُ الْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ سَمَّاعُونَ لَهُمْ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ﴾ التوبة: ٤٧

دەقەكان لەسەریان گران بوون بۆیە لێیان بێزارن، هەڵگرتنیان شەكەتی كردوون بۆیە لەسەر شانیان هەڵیاندا و لەكۆڵیان كردنەوە، ناتوانن سونەتەكان لەبەر بكەن و لەدەستیان دەرچوون، بۆیە پشتگوێیان دەخەن، دەقەكانی كیتاب و سوننەت هێرش دەكەنە سەریان بۆیە كۆمەڵێك یاسایان بۆ داناون تاكو بەرپەرچییان بدەنەوە و بیانبەنە دواوە، خودا پەردەی لەسەر هەڵگرتوون و نهێنییەكانی دەرخستوون،

كردوونی بـە نموونـە بـۆ بەنـدەكانی، بزانـە هـەر كـات دەسـتـەیەك لەوانـە قـڕ دەكـات دەستەیەكی تر لە هاوشێوەیان بەدوایاندا دێت، خـودا وەسـفی ئـەوانی بـۆ دۆسـتـانی كردووە و ڕۆشـنی كردوونەتـەوە تـاكو لێیـان ئاگـادار بـن ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ ﴿٩﴾ ﴾ محمد: ٩

نهێنی پڕ لە نیفاقیان شاردۆتەوە، خودا لەسەر ڕووپەڕی ڕوخساریان و زەلەی زمانیان دەریخستووە، مۆرێكی داوە لـە ڕوخسـاریان كـە لـەلای كـەمتری ئـەهلی ڕۆشـنبینی و بـاوەڕ ناشـارڕێتەوە، وا گومانیـان بـرد گـەر بێباوەڕییەكـەیان بشـارنەوە و لـەدەرەوە باوەڕ نیشان بدەن ڕزگاریان دەبێت لـە دەسـتی تاوتوێكـەران و ڕەخنـەگران، چـۆن؟ ڕەخنەگری خاوەن بینینی ڕەها پـەردەی لەسـەر ئـەوان لاداوە ﴿ أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخْرِجَ اللَّهُ أَضْغَانَهُمْ ﴿٢٩﴾ وَلَوْ نَشَاءُ لَأَرَيْنَاكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَاهُمْ ۚ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِي لَحْنِ الْقَوْلِ ۚ وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَعْمَالَكُمْ ﴾ محمد: ٢٩-٣٠

ئەبێ حاڵی ئەوانە چۆن بێت لە ڕۆژی یەكتر بینینەوە و ڕووبەڕووبوونەوەدا، خودا-جل جلاله- جیلـوە بكـات بـۆ بەنـدەكانی، لەسـەر لاق پـەردە لابـدرێت؟ بـانگ بكـرێن بـۆ سوژدە، بەڵام نەتوانن سوژدە ببـەن ﴿ خَاشِعَةً أَبْصَارُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ۖ وَقَدْ كَانُوا يُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ وَهُمْ سَالِمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ القلم: ٤٣

دەبێ حاڵیان چۆن بێت گەر كۆبكرێنەوە بۆ سەر پردی دۆزەخ؟ كە لـە تاڵـەموو بـاریكتر و لە دەمی شمشێر تیژترە، جێی هەڵكەوتن و خلیسكانە، تاریكە و هیچ كـەس ناتوانێـت بیبڕێت تەنها بـە نورێـك نـەبێت بـەرپێی خۆیـانی پـێ ببیـنن، لـەو ڕۆژەدا نـوور لـەنێوان خەڵكیدا دابەش دەكرێت، ڕۆیشـتن و تێپـەڕبوونیان بـەپێی كـەمی و زۆری نوورەكەیـە، لەگەڵ ئەهلی ئیسلامدا نورێكی دەرەكیان پێ دەدرێت، وەك چـۆن لەگـەڵیان بـوون لـەم ژیانی دونیادا و نوێژ و ڕۆژ و حەج و زەكاتیان ئەنجام دەدا، كاتێك گەیشتنە ناوەڕاسـتی پردەكە بارەشی نیفاقیان هەڵدەكات و ئەو چـرانەی بـە دەسـتیانەوەیە دەكوژێنێتـەوە، سەرسامانە دەوەستن و ناتوانن گوزەر بكەن، لەنێوان ئـەوان و ئـەهلی بـاوەڕدا دیوارێـك دروست دەبێت كە دەرگایەكی هەیە، لەنێوان دووڕووان و كلیلـی دەرگاكـەدا دوورییـەكی زۆر هەیە، ڕووی ناوەوەی-كە ڕووی باوەڕدارانە- ڕەحمەتی خودایە و ڕووەكەی تـر كـە ڕووی دووڕووانە سزا و تۆڵەیە، بانگ لەوانە دەكەن كە پێشییان كـەوتوون لـە نوێنـەرانی

باوەڕ، مەشخەڵی كاروانەكەیان لە دوورەوە وەك ئەستێرە دەدرەوشێتەوە و ئەو كەسەی تەماشا بكات دەیبینێت ﴿ٱنظُرُونَا نَقۡتَبِسۡ مِن نُّورِكُمۡ﴾ الحديد: ١٣، تاكو لەم گەرووە تەنگەلانەوە بتوانین بپەڕینەوە، نوورەكانمان كوژاونەتەوە، كەس ناتوانێت گوزەر بكات بە چرای نوورەوە نەبێت ﴿قِيلَ ٱرۡجِعُواْ وَرَآءَكُمۡ فَٱلۡتَمِسُواْ نُورًا﴾ الحديد: ١٣، نوور دابەشكراوە و زۆر دوورە وەستان لەو شوێنەدا، چۆن نوور بەدەستبهێنین لەم گەرووە تەنگەلانەدا؟ ئایا لە ئەمڕۆدا و لەسەر ئەو ڕێگەیە كەی ئاوڕ بەلای كەسی تردا دەداتەوە؟ ئایا دۆست و هاوەڵ لا بەلای یەكتردا دەكەنەوە؟ ئەوانیش دەڵێن: ئێمە لە دونیادا لەگەڵ ئێوە كۆدەبووینەوە و هاوەڵی ئێوە بووین، وەك چۆن كەسێكی غەریب لە سەفەرێكدا هاوەڵی و ئاشنایی خۆی بیری كەسێك دەخاتەوە (ئایا ئێمە لەگەڵ نەبووین؟) وەكو ئێوە ڕۆژوومان دەگرت و نوێژمان وەك ئێوە دەكرد، وەكو ئێوە قورئانمان دەخوێند و خێر و چاكەمان وەك ئێوە ئەنجام دەدا، حەجمان وەكو ئێوە دەكرد؟ ئەی چی لە ئەمڕۆدا ئێمەی لە ئێوە جیاكردەوە؟ تا ئێوە بەبێ ئێمە گوزەر بكەن؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ، بەڵام ئێوە بە ڕوواڵەت لەگەڵ ئێمەدا بوون و ناوەوەتان لەگەڵ مولحیدان و لادراوان ستەمكاران و بێباوەڕاندا بوو ﴿وَلَٰكِنَّكُمۡ فَتَنتُمۡ أَنفُسَكُمۡ وَتَرَبَّصۡتُمۡ وَٱرۡتَبۡتُمۡ وَغَرَّتۡكُمُ ٱلۡأَمَانِيُّ حَتَّىٰ جَآءَ أَمۡرُ ٱللَّهِ وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ١٤ فَٱلۡيَوۡمَ لَا يُؤۡخَذُ مِنكُمۡ فِدۡيَةٞ وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ مَأۡوَىٰكُمُ ٱلنَّارُۖ هِيَ مَوۡلَىٰكُمۡۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ١٥﴾ الحديد: ١٤ — ١٥

درێژە بە وەسفی ئەو دەستەیە مەدە، سوێند بەخوا ئەوەی لەسەریان باس نەكراوە چەند بەرانبەری ئەوەیە كە باس كراوە، خەریكە هەموو قورئان لەسەر ئەمانە بێت، بەهۆی زۆرییان لەسەر زەوی و لەناو سكی گۆڕدا، زەوی خاڵی نییە لەمانە تاكو باوەڕداران لەسەر ڕێگە و بانەكان نامۆ نەبن و هۆكارەكانی ژیان پەكیان نەخات و گیاندارانی دڕندە پەلاماریان نەدەن، "حذيفة" گوێی لە پیاوێك بوو دەیوت: خودایە دووڕووان بەرباد بكە، ئەویش پێی فەرموو: برازای خۆم، گەر دووڕووان تیابچن لەسەر ڕێگە و بانەكان نامۆیی و غەریبی داتان دەگرێتەوە بەهۆی نەبوونی كەسێك بەسەریدا گوزەر بكات))

سوێند بەخودا ترس لە نیفاق دڵی پێشینە پێشەنگەكانی ئەم ئومەتەی لەت لەت كردبوو، بەهۆی زانستیان بە ورد و درشت و پوختە و درێژەی كاری دووڕوویی،

گومانی خراپیان بە نەفسی خۆیان دەبرد تا ترسان یەكێكبن لە دووڕووان، عومەری كوڕی خەتتاب فەرمووی بە "حذيفة" خودا لە هەردووكیان ڕازی بێت ((ئەی حوزەیفە داوات لێ دەكەم بە خودا، ئایا پێغەمبەر(ﷺ) ناوی منی لە دووڕووان هێناوە)) فەرمووی: نەخێر، بەڵام دوای تۆ پاكانە بە هیچ كەسێكی تر نادەم)) ئیبن ئەبی مولیكە دەڵێت: بە سی هاوەڵ لە هاوەڵانی محمد(ﷺ) گەیشتم، هەر هەموویان لە دووڕوویی خۆیان دەترسان، هیچ كەس لەوانە نەبوو بڵێت: باوەڕەكەی وەك باوەڕی جبریل و میكائیل وایە))

ئیمامی بوخاری باسی كردووە، لە حەسەنی بەسرییەوەدەگێڕنەوە: هیچ كەس لە نیفاق دڵنیا نییە جگە لە دووڕوو، تەنها باوەڕداریش لە دووڕوویی دەترسێت)).

لە هەندێ لە هاوەڵانەوە دەگێڕنەوە: كە لە دوعاكانیدا دەیفەرموو: "أللهم إني أعوذ بك من خشوع النفاق" وتیان "خشوع النفاق"چییە؟ فەرمووی: بەدەن وانیشان بدرێت كە بۆ خودا خاشیعە و دڵ بۆ خودا خاشیع نەبێت))

سوێن بە خودا دڵی ئەوان پڕ لە باوەڕ و یەقین بوو، ترسیان لە نیفاق زۆر زۆر بوو، خەمیان بۆ ئەوە خەمێكی قورس و گەورە بوو، جگە لەوان كەسانی تر كە باوەڕەكەیان لە قوڕگیان نەچۆتە خوارەوە بانگەشەی ئەوە دەكەن باوەڕەكەیان وەك باوەڕی "جبریل و میكائیل"ە.

**ڕووەكی نیفاق لەسەر دوو ئاودەر دەڕوێت:** ئاودەری درۆ و ئاودەری ڕیا.

**ئەو دووانەش لە دوو سەرچاوە دێنە دەرەوە:** چاوگەی لاوازی ڕۆشنبینی، و چاوگەی لاوازی لێبڕان، كە ئەم چوار پایەیە بەرزبوویەوە ڕووەكی نیفاق و بینای نیفاق دەچێت بە ئاسماندا، بەڵام لە لێواری مەجرای لافاودا، لەسەر لێوار و قەراغێكی بەئاو داڕنراو كە خەریكە دەڕمێت، گەر ئەو ڕۆژەی ناخی مرۆڤ دەهێنرێتە دەرەوە لافاوی ڕاستییەكان ببینن و نهێنییەكان پەردەی لەسەر بدرێت و ئەوەی لەناو گۆڕدا دەربهێنرێت و ئەو لە سینەدا كۆبكرێتەوە، لەو ڕۆژەدا ئەوانەی شمەكیان بریتییە لە نیفاق بۆیان دەردەكەوێت كە بەری ڕەنجیان وەك سەراب وایە ﴿يَحْسَبُهُ ٱلظَّمْـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمْ يَجِدْهُ شَيْـًٔا وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٣٩﴾﴾

النور: ٣٩

دڵیان لە خێر و چاکە بێئاگایە، جەستەیان بۆ خێر و چاکە هەوڵدەدات و خراپە لە شیودۆڵییاندا بڵاوبۆتەوە، کە حەق دەبیستن دڵیان لەبیستنی رەق دەبێت، کە لەسەر باتڵ و زور و خراپە ئامادە دەبن چاوی دڵیان دەکرێتەوە و گوێیەکانیان دەبیستن.

ئەمانە سوێند بە خودا نیشانەکانی نیفاقن، ئاگات لێی بێت ئەی پیاوی مەرد بەرلەوەی بریاری کۆتایی بەسەرتدا دابەزێت، کە پەیمان دەبەستن وەفادار نین، کە بەڵێن دەدەن دەیشکێنن، کە قسە دەکەن بە ویژدانانە قسە ناکەن، کە بانگ دەکرێن بۆ گوێڕایەڵی دەوەستن، گەر پێیان بوترێت: وەرن بۆ لای ئەوەی خودا دایبەزاندووە و بۆ لای پێغەمبەر پشت هەڵدەکەن، گەر هەوا و ئارەزوو بانگیان بکات بۆ مەرام و حەزەکانیان بە پەلە رووی تێدەکەن و بۆی دەچن، لێیانگەڕێ با لەگەڵ ئەو رسوایی و سەرشۆڕی و زیانۆمەندییەدا بن بۆ خۆیان هەڵبژارد، متمانەت بە بەڵێنەکانیان نەبێت و لە پەیمانەکانیان دڵنیا مەبە، ئەوانە لەوانەدا درۆ دەکەن ﴿وَمِنْهُم مَّنْ عَـٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنْ ءَاتَىٰنَا مِن فَضْلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضْلِهِۦ بَخِلُوا۟ بِهِۦ وَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٧٦﴾ فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِى قُلُوبِهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ يَلْقَوْنَهُۥ بِمَآ أَخْلَفُوا۟ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿٧٧﴾﴾ التوبة: ٧٥ – ٧٧

❁ ❁ ❁

## جۆرەكانی لادان (فسوق)

**لە قورئاندا دوو جۆرە:** تەنها و رەها بەستراوە بە گوناه و یاخیبوون.

**تەنهاش دوو جۆرە:** لادانی بێباوەڕی، كە كەسەكە لە ئیسلام دەكاتە دەرەوە، لەگەڵ لادانێك كە لە ئیسلام نایكاتە دەرەوە، تەنهای بەستراوە بە یاخیبوون، وەك ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ ٱلْإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِى قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ ٱلْكُفْرَ وَٱلْفُسُوقَ وَٱلْعِصْيَانَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ﴿٧﴾﴾ الحجرات: ٧

تەنها–كە بریتییە لە لادانی بێباوەڕی– وەك ﴿يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِى بِهِۦ كَثِيرًا ۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ﴾ البقـــــرة: ٢٦– ٢٧ ﴿وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ۖ وَمَا يَكْفُرُ بِهَآ إِلَّا ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٩٩﴾﴾ البقـــرة: ٩٩ ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُوا۟ فَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ۖ كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَآ أُعِيدُوا۟ فِيهَا وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ﴾ السجدة: ٢٠، هەموو ئەمانە لادانی بێباوەڕییە.

نموونەی ئەو لادانەی كە كەسەكە لە ئیسلام دەرناكات، وەك ﴿وَإِن تَفْعَلُوا۟ فَإِنَّهُۥ فُسُوقٌۢ بِكُمْ﴾ البقـرة: ٢٨٢ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓا۟ أَن تُصِيبُوا۟ قَوْمًۢا بِجَهَٰلَةٍ فَتُصْبِحُوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَٰدِمِينَ ﴿٦﴾﴾ الحجرات: ٦، ئەم ئایەتە لەسەر "ولید بن عقبة بن أبي معیط" دابەزیوە كاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بۆ لای "بني المصطلق" لەدوای ڕووداوەكە تا بزانێت ڕاستە، لە سەردەمی نەفامیدا دوژمنایەتی لەگەڵیان هەبوو، كە هۆزەكە بیستبوویان بەڕێوەیە هاتبوونە پێشوازی، وەك بە مەزن ڕاگرتێكی فەرمانەكەی پێغەمبەر، شەیتان وەسوەسەی بۆ دروست كردبوو كە ئەوانە بۆ كوشتنی هاتوونەتە دەرەوە، لێیان ترسا بوو و بەڕێگەی خۆیدا گەڕابوویەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتبووی: "بني المصطلق" زەكات و سەدەقەیان لێ گرتۆتەوە و ویستوویانە بیكوژن، بۆیە پێغەمبەر تووڕەبوو ویستی هێرش بكاتە سەریان، هۆزەكە بیستبوویان گەڕاوەتەوە خۆیان هاتنە خزمەتی پێغەمبەر، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ئێمە بیستمان نێراوت ناردووە هاتینە دەرەوە تا پێشوازی لێبكەین و ڕێزی لێبگرین و ئەو حەقەی خودا لەسەرمانە پێی بدەین، بەڵام ئەو گەڕابوویەوە، ترساین لە ڕێگە نووسراوێكی لە تۆ

پێگەیشتبێت بەهۆی توورەبوونێکەوە لە ئێمە، ئێمە پەنا دەگرین بە خودا لە توورەبوونی خۆی و پێغەمبەرەکەی، پێغەمبەر تۆمەتباری کردن، خالیدی کوڕی وەلیدی لەگەڵ کۆمەڵێك سەرباز ڕەوانە کرد، فەرمانی پێکرد ڕۆیشتنەکەی بۆ سەریان بشارێتەوە، پێی فەرموو: سەرنج بدە گەر شتێکت لێ بینین نیشانەی باوەڕیان بێت ئەوا زەکاتی ماڵ و دارایییان وەربگرە، گەر ئەوەت لێ نەبینن ئەوەی بەرانبەر بە بێباوەڕان دەکرێت لەگەڵیان ئەنجام بدە، خاید بەو جۆرەی کرد، بەنهێنی هاتە لایان و گوێی لە بانگی نوێژی مەغریب و عیشا بوو، زەکاتەکانیانی وەرگرت، جگە لە گوێڕایەڵی و خێر شتێکی تری لێ نەبینن، گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر و هەواڵەکەی پێدا، ئەم ئایەتە دابەزی ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓا۟ أَن تُصِيبُوا۟ قَوْمًۢا بِجَهَـٰلَةٍ فَتُصْبِحُوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَـٰدِمِينَ ﴾ الحجرات: ٦

"النبأ" بریتییە لە هەواڵێکی نادیار لە سەرچاوەی هەواڵەوە بە مەرجێك هەواڵەکە شکۆ و گەورەییەکی تێدا بێت.

لێرەدا سوودێکی ورد هەیە: خودای –سبحانە– فەرمانی نەکردووە بە ڕەدکردنەوەی هەواڵی کەسی فاسق و بەدرۆزانینی و ڕەدکردنەوەی شایەتی ئەو کەسە بە یەکجاریی، بەڵکو فەرمانی بە ڕۆشنکردنەوە کردووە، گەر بەڵگە و نیشانە لە دەرەوە بوونی هەبوو کە ڕاستگۆیی کەسەکەی دەسەلماند بە بەڵگەی ڕاستی کاردەکرێت، هەواڵەکە هەر کەسێك ڕایگەیاندبێت، بەم جۆرە دەبێت شان لەسەر ریوایەت و شایەتی کەسی فاسق دابدرێت، زۆرێك لە فاسقەکان لە هەواڵ و گێڕانەوە و شایەتیداندا ڕاست دەکەن، بەڵکو زۆربەیان ئەوپەڕی هەولی ڕاستگۆیی دەدات، فیسقەکەی لەلایەکی ترەوەیە، نموونەی ئەو کەسانە هەواڵ و شەهادەتی ڕەد ناکرێنەوە، گەر شایەتی و هەواڵی ئەم جۆرانە ڕەد بکرێنەوە بەشێکی زۆر لە مافەکان تیادەچن و پەکیان دەکەوێت، ئەو کاتە زۆرێك لە هەواڵی ڕاست بە پووچ دەردەکرێن، بە تایبەت ئەو کەسەی لادانەکەی لەڕووی باوەڕ و بۆچوونەوەیە، ئەو بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێت و دەپشکنێت، ئەم کەسانە نە هەواڵەکانیان و نە شایەتیدانەکەیانیان ڕەد ناکرێنەوە.

بەلام ئەو کەسەی فیسقەکەی لە ڕووی درۆوەیە: گەر زۆری لێبینرا و چەندبارە بوویەوە بەجۆرێك درۆی زاڵ بێت بەسەر ڕاستیدا ئەو کەسە نە هەواڵ و نە شایاتی لێ

وەرناگیرێت، گەر بەدەگمەن لێیبینرا جارێك دووجار ئەوا لە رەدی شایەتی و هەواڵیدا لای زانایان دوو بۆچوون هەیە: ئەو دوانەش دوو ریوایەتن لای ئیمام ئەحمەد-خودا رەحمی پێ بکات-

مەبەست: باسی ئەو لادانەی کە ناگاتە بێباوەڕی.

ئەو لادانەی تەوبەکردن پێویست دەکات گشتگیرترە لە لادانی کەسێك هەواڵ و شایەتی وەرناگیرێت.

قسەی ئێمە ئێستا لەسەر ئەوەیە کە تەوبەکردن لێی پێویستە، ئەمەش دوو بەشە: فیسقێك لە رووی کردارەوە، لەگەڵ فیسقێك لەڕووی باوەڕەوە.

فیسقی کرداریش دوو جۆرە: گرێدراوە بە یاخیبوونەوە، لەگەڵ هاتنی بە تەنها.

ئەوەی گرێدراوە بە یاخیبوونەوە: بریتییە لە ئەنجامدانی ئەوەی خودا نەهی لێکردووە، یاخیبوونەکە یاخیبوونە لە فەرمانی خودا، وەك ئایەتی ﴿لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ﴾ التحریم: ٦، موسا بە هاروونی برای فەرمووو ﴿مَا مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَهُمْ ضَلُّوٓاْ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِ ۖ أَفَعَصَيْتَ أَمْرِى ﴿٩٣﴾﴾ طه: ٩٢ - ٩٣، شاعیرێك دەڵێت:

أمرتك أمرا جازما فعصيتني فأصبحت مسلوب الإمارة نادما

(فەرمانم پێکردی بە فەرمانێکی پێداگر کەچی تۆ لێم یاخی بوو، بۆیە دەسەڵاتی ئەمیریت لێوەرگیرایە و پەشیمان بوویەوە)

فیسق تایبەترە بە ئەنجامدانی ئەو شتانەی نەهییان لێکراوە، بۆیە زۆر بۆیان بەکاردەهێنرێت، وەك ئایەتی ﴿وَإِن تَفْعَلُواْ فَإِنَّهُۥ فُسُوقٌۢ بِكُمْ﴾ البقرة: ٢٨٢، یاخیبوونیش تایبەتە بە ئەنجامنەدانی ئەو شتانەی فەرمانی پێکراوە، هەر یەکێك لەم دووانە بەکاردەهێنرێن بۆ خاوەنی ئەو دوو کارە (ئەنجامدەری نەهیلێکراو، ئەنجام نەدەری فەرمانپێکراو) ﴿إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ﴾ الکهف: ٥٠، لەم شوێنەدا جێبەجێ نەکردنی فەرمانی خودا بە "فسق" نابرا، ئایەتی ﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ﴾ طه: ١٢١، لێرەدا ئەنجامدانی کاری نەهیلێکراو بە "معصية" یاخیبوون ناوبرد، ئەمە ئەگەر وشەی "فسق" تەنها بێت و بە گوناه و یاخیبونەوە گرێنەدرابێت، بەڵام گەر گرێدرابوون پێیەوە ئەوە یەکێکیان بۆ سەرپێچی فەرمان و ئەویتریان بۆ سەرپێچی نەهی بەکاردەهێنرێن.

((التقوى))-خۆپارێزی بریتییە لە خۆپاراستن لە هەردوو کارەکە، بە دەستەبەربوونی خۆپارێزی تۆبەکردن لە لادان و یاخیبوون دروست دەبێت، بەوەی کەسەکە کار بە گوێڕایەڵی خودا -لەسەر نورێك لە خوداوە- بکات و هیوای بە پاداشتی خودا بێت، دەستبەرداری یاخیبوون ببێت لەسەر نورێك لە خوداوە و لە ترسی سزای خودایی.

هەر کەس تێڕامان لە وشەی ((التقوى)) بکات لە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەردا(ﷺ) و لە زمانی عەرەبدا-بە مەرجێك سەلامەت بێت لە لاساییکردنەوە و دووبارە کردنەوەی بێ تێگەیشتن- تێدەگات کە ((التقوى)) ئەوەیە بەندە هەموو ئەوەی پێیدراوە بکات بە خۆپارێزی بۆ خۆی بەرانبەر ئەوەی لێی دەترسێت لە بێهیوایی و زیانۆمەندی دونیا و دوارۆژ، بە ئەوپەڕی بێداری و هیدایەت و ڕۆشنبینییەوە هەوڵبدات هەموو ئەوانە بکاتە هۆی سەرکەوتن و رزگاربوونی لە دونیا و دوارۆژدا، باوەڕی هەبێت هەموو ئەوەی خودا پێیداوە لە خودی خۆی و ماڵ و منداڵ و هەموو ئەوشتانەی بۆی رامهێنراوە گونجاون بۆ ئەوەی ببنە هۆی رزگاربوونی و هەر بەو جۆرە هۆی زیانۆمەندی دونیا و دوارۆژ، بەڵکو ئەنانە قورئان خۆشی ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّـٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾ ﴾ الإسراء: ٨٢، گەر قورئان بۆ ستەمکاران مایەی زیانۆمەندی بێت، ئەی دەبێ غەیری قورئان بۆ ئەوانە چۆن بێت؟ بۆیە پەروەردگارمان وەسێتمان بۆ دەکات کاتێك وشەیەکی قورئان بەسەر زمانماندا دێت هانا و پەنا بۆ خودا ببەین لە شەیتانی رەمکراو، تا لە تێگەیشتنی قورئان گومڕامان نەکات و لەو مانایە لامان نەدات کە خودا وشەکەی بۆ داناوە، لەوێشەوە بچینە ریزی زیانۆمەندان.

لادان لە باوەڕدا وەك لادانی ئەهلی بیدعەت کە باوەڕیان بە خودا و پێغەمبەر و رۆژی دوایی هەیە و ئەوەی خودا بە حەرامی داناوە بە حەرامی دەزانن و ئەوەی خودا پێویستی کردووە بە پێویستی دەزانن، بەڵام زۆرێك لەوەی خودا و پێغەمبەر جێگیریان کردووە ئەوان نەرێی دەکەن، ئەمەش بەهۆی نەزانی و تەئویل و شوێنکەوتنی شێخەکانیان، هەر بەو جۆرە شتێك جێگیر دەکەن کە خودا و پێغەمبەر جێگیرییان نەکردووە.

تەوبە کردن لەم جۆرە لادانە بەوە دەبێت ئەوەی خودا بۆ خۆی جێگیری کردووە، هەروەها ئەوەی پێغەمبەر بۆ خودا جێگیری کردووە ئەرێ بکەن بەبێ چواندن و

نموونانــدن (التشــبیه والتمثیــل)، هــەروەها پــاكڕاگرتنی خــودا لــەو شــتانەی خــۆی لێپــاكڕاگرتووە و پێغەمبەرەكــەی خــودای لــێ پــاكڕاگرتووە بــەبێ گریمانــەكاری و پەكخستن، هەروەها وەرگرتنی نەرێ و ئەرێ لە چرای وەحییـەوە، نـەك لـە بۆچـوونی پیاوان و بەرهەمی بیریانەوە كە سەرچاوەی بیدعە و گومڕاییە.

تەوبەی ئەو لادەرانە لە رووی باوەڕی تێكدەرانەوە تـەنها بـە شـوێنكەوتنی سـوننەتی پێغەمبەر دەبێت، ئەمەیان لێ وەرناگیرێت تاكو فەسادی ئەو بیدعەیەی لەسەری بوون بۆ مەردوومان روون نەكەنەوە، چونكە تەوبە لە گونـاه بـە ئەنجامـدانی پێچـەوانەكەی دەبێـت، بۆیــە خــودا لەمــەڕ تەوبــەی ئەوانــەی بەڵگــە و نیشــانە و هیدایــەتی خــودا دەشــارنەوە مەرجەكــەی ئەوەیــە بــۆ خــەڵكی بیخەنــە روو، چــونكە گوناهەكــەیان شاردنەوەی حەق بوو، كەوابوو تەوبەكەیان بریتییـە لـە بـەیان كردنـی حـەق، خـودای موتــەعال دەفــەرموێت ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيۡهِمۡ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٠﴾ ﴾ البقرة: ١٥٩ – ١٦٠

گوناهی بیدعەكەر لەسەرو گوناهی ئەوانەوەیـە كـە حـەق دەشـارێتەوە، چـونكە ئـەوە حەقێكی شاردۆتەوە، بەڵام بیدعەكەر حەق دەشارێتەوە و بانگ بـۆ پێچـەوانەی حـەق دەكات، هەموو بیدعەكەرێك دەبێتە شارەوەی حەق، نەك بەپێچەوانەوە.

مەرجی تەوبەی كەسی دووڕوو بریتییە لە ئیخلاص، چونكە گوناهەكەی بەهۆی ریاوەیە، خــودای موتــەعال دەفــەرموێت ﴿ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمۡ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَٱعۡتَصَمُواْ بِٱللَّهِ وَأَخۡلَصُواْ دِينَهُمۡ لِلَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَسَوۡفَ يُؤۡتِ ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿١٤٦﴾ ﴾ النساء: ١٤٥–١٤٦

## ۞ چەندین رەنگ لە خراپە، ئەوانیتر

خراپە و دەستدرێژی (الإثم والعدوان) هاوتای یـەكترن، خـودای موتـەعال دەفـەرموێت ﴿ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ ﴾المائـدة: ٢، هــەر یــەك لــەم دووانە كە تـەنها دەبنەوە مانای ئەویتر لە ئامێز دەگرێت، هـەموو"إثم"ێـك بریتییـە لـە "عدوان" ئەوەش بریتییە لە ئەنجامدانی ئەوەی خودا نەهی لێكردووە، یـان نـەكردنی

ئەوەی خودا فەرمانی بە کردنی کردووە، ئەو کارە بریتییە لە دەستدرێژی بۆ سەر "بکە و مەکە"ی خودایی، هەموو دەستدرێژییەك خراپەیە و خاوەنەکەی پێی دەبێت بە خراپەکار، بەڵام کاتێك لەگەڵ یەکتر دێن، ئەوا دەبنە دوو شت بەپێی وەسفەکانیان و وابەستەگییەکانیان.

خراپە **"الإثم"** وەك رەگەزێکی حەرامکراو وایە لە درۆ و زینا و خواردنەوەی ئارەق و هاوشێوەکانیان، دەستدرێژی (العدوان) ئەوەیە موباح تێپەڕینی و بگەیە بڕی حەرام و زیادە لەو کارەدا.

**دەستدرێژی (العدوان)** بریتییە لە تێپەڕاندنی ئەوەی لەو کارە موباح کراوە تا دەگاتە بڕی حەرامکراو و زیادە لەو بڕەش، وەك دەستدرێژی بۆ وەرگرتنەوەی حەقێك کە لەسەر کەسێکە، بە دەستدرێژی بۆ سەر ماڵی یان گیانی یان شەرەف و نامووسی، گەر چڵە دارێکی براوی تووڕەی بکات تەنها بە خانووی کەسەکە رازی دەبێت، گەر شتێکی تێکبدەی چەند بەرانبەر تێکدەدات، گەر وشەیەکی پێ بوترێت چەندین وشەی پێدەڵێت، هەموو ئەمانە بریتین لە دەستدرێژی و تێپەڕاندنی دادپەروەری.

ئەم دەستدرێژییە دوو جۆرە: دەستدرێژییەك بۆ سەر حەقی خودا، لەگەڵ دەستدرێژییەك بۆ سەر حەقی مرۆڤ، وەك ئەوەی لەوەی بۆی حەڵاڵ کراوە لە چوونە لای هاوسەرەکەی و کەنیزەکەکانی سنووربەزێنی بکات بۆ شتی تر کە خودا حەرامی کردووە، وەك ئایەتی ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ ۝٥ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ ۝٦ فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ ۝٧ ﴾ المؤمنون: ٥ – ٧، هەروەها دەستدرێژی لەوەی لە ژنەکەی و کەنیزەکەیدا بۆی حەڵاڵکراوە تا دەگاتە ئەوەی لێی حەرامکراوە، چوونە لایان لە حەیز و زەیسانیدا، یان لە کاتی ئیحرامدا، یان کاتی رۆژووی واجبیان، هاوشێوەکانی ئەمانە.

هەر بەو جۆرە هەر کەس بڕێکی دیاریکراوی بۆ موباح کرابێت تێیپەڕێنێت بۆ زیاتر لەوە، ئەوە دەچێتە ریزی دەستدرێژییەوە، نموونەی ئەو کەسەی بە مەبەستی داخوازی یان شایەتی یان مامەڵە و کڕین و فرۆشتن یان چارەسەرکردن تەماشای ئافرەتێك دەکات، چاوی بە هەموو شوێنەکانیدا دەخشێنێت، لەوێوە موباح بەجێدەهێڵێت و دەکەوێتەوە ناو قەدەغەکراوەوە، بە دەوری ناوچەی قەدەغەکراو و پەرژینکراودا دەسوڕێتەوە.

خراپە(الإثم): "الإثم والبغي" لە سورەتی "الأعـراف-لآیـة ٣٣"دا باسـكراون ﴿ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالْإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَنْ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَأَنْ تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ الأعـــراف: ٣٣، بـــەزۆری بـــەكارهێنانی "البغي"تێپەڕندن و سنووربەزێنی لە مافی خەڵكیدای و هەڵكوتانە سەریدایە.

لەسەر ئەم شێوەیە گەر "البغي" لەگەڵ "العدوان"دا هات، ئەوا "البغي"ستەم لێكردنیانـە بە حرامی رەگەزەكە، وەك دزی و درۆ و بوختان و ئازاردان، "العدوان"یش بریتی دەبێـت لە تێپەڕاندنی حەق و دەستبردن بۆ زیاتر و زۆرتر لەوە، ئەو كاتە "البغي" و "العدوان" لە حەقی خەڵكیدا وەك "الإثم" و "العدوان"ی لێدێت لە سنووری خودادا.

لێرەدا چوار شت هەیە: حەقێك هی خودایە و حەددی بۆ داناوە، حـەقێك بـۆ مرۆڤـە و حەددی بۆ داناوە، "البغي"تێپەڕاندن و "العدوان"دەستدرێژی و "ظلـم"سـتەم بـریتین لە تێپەڕاندنی هەردوو سنوورەكە و گەیشتنە ئـەو دیـوی دوانەكـە، یـان كەمتەرخـەمی لەو دوانەدا و نەگەیشتنە مەرزی ئەو دووانە.

"الفحشاء"كرداری زۆر ناشیرین و "المنكر"كار و كردەوەی نـامۆ و بێـزراو، "الفحشـاء" لە بنچینەدا سیفەتە بـۆ وەسـفكراوێكی لابـراو بـۆ ئـەوەی مـەرامی سیفەتەكە رووت ببێتــەوە، ئـەوەش بریتییـە لـە "الفعلــة الفحشــاء"كــاری زۆر ناشــیرین، روخســاری "الفحشاء" ئەوەیە كە ناشیرینییەكەی بۆ هەموو كـەس دەربكـەوێت و هـەموو خـاوەن ژیرییەكی تەندروست بە ناشیرینی بزانێت، بۆیە وشەی"الفحشاء" بە "زینـا و لیواتـە" تەفسیر كراوە، خودا بە "الفاحشة" ناویان دەبات بەهۆی ناشیرینی بێسـنووریان، هـەر بـەو جـۆرە ناشــیرین لــە قســە بــە "فحــش" ناودەبرێــت، ئـەوەش ئەوەیـە كـە ناشیرینییەكەی لای هەمووان ئاشكرا بێت لە جنێودان و تۆمەت، و هاوشێوەكانیان.

"المنكر" دیسان سیفەتێكە بۆ وەسفكراوێكی لادراو، واتە "الفعل المنكر"كاری نامۆ و بێزراو، ئەو كارەیە بە فیترەت و ژیری نامۆیە و بێزی لێ دەنەوە، دانـەپاڵی "المنكـر" بۆ لای فیترەت و ژیری وەك دانەپاڵی بۆنی ناخۆش وایە بۆ هەسـتی بـۆن كـردن، یـان دیمەنی ناشیرین بۆ هەستی بیـنین، یـان تـامی نـاخۆش بـۆ هەسـتی چەشـتن، یـاخود دەنگی بێزاركەر بـۆ هەسـتی بیسـتن، ئـەوەی زۆر نـامۆ و بێـزراو بێـت لـەلای ژیـری و فیترەت بریتییە لە "فاحشة"، وەك چۆن هەستەكان بۆ ئەو پەیپێبراوانە بێزار دەبن.

مونكەر بۆ هەستەكان بریتییە لەو "مەودا"نەی كە نەدەیانناسن و نە هۆگرییان لەگەڵیاندا هەیە، ناشیرین و بێزراویش بە رادەیەكی زۆر بریتییە لە "الفاحشـة"، بۆیـە ئـیبن عـەباس دەفەرموێت: (("فاحیشة" بریتییە لە زینـا، "مونەكـەر"یش ئەوەیـە كـە لـە شـەریعەت و سوننەت نەناسراوبێت))، تێرابمێنە لـە پێناسـەكەی نێـوان ئـەوەی باشـی و چـاكییەكەی نەناسراو و ناباوە، لەگەڵ ئەوەی ناشیرینییەكەی لەناو فیترەت و ژیریدا جێگیر بووە.

## ۞ قسەكردن لەسەر خودا بەبێ زانست سەرچاوەی تێكدان و تێكچوونە

"قسەكردن لەسەر خودا بەبێ زاست" لە هەرچی ئەو حەرامكراوانەیە خراپتر و تـاوانی زۆرتـرە، بۆیـە لـە ئاسـتی چـوارەمی حەرامكراوەكانـدا باسـی كـراوە كـە شـەریعەت و ئایینەكان كۆدەنگن لەسەری و هەرگیز و لە هیچ بارێكدا موباح ناكرێن، بەڵكو هەمیشە حەرامن، وەكو مردارەوە بوو خواردنی خوێن و گۆشتی بەراز نین كە لە حاڵێكـەوە بـۆ حاڵێكی تر موباح دەكرێن.

**حەرامكراوەكان دوو جۆرن:** حەرامكراو لە خـودی خۆیـدا كـە لـە هـیچ كاتێكـدا موبـاح نابن، لەگەڵ حەرامكراوێك لە كاتێكەوە بۆ كاتێكی تـر، خـودای موتـەعال لەسـەر ئـەو حرامكراوانەی لە خودی خۆیاندا حەرامن دەفـەرموێت ﴿ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ﴾ الأعراف: ٣٣، پاشان گواستییەوە بۆ گەورەتر لـەوە ﴿وَأَن تُشْرِكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا ﴾، پاشان گواستنەوە بۆ گـەورەتر لـەوە ﴿وَٱلْإِثْمَ وَٱلْبَغْىَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ﴾، پاشـان گـەورەتر لـەوە ﴿وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾، ئەمـەی دواییـان گـەورەترین حەرامكراو و خراپترین خراپەیە، چـونكە درۆ كردنـی تێدایـە بـەدەم خـوداوە و شـتێك دەدرێتە پاڵی كە شایسـتە نییـە، لـەوێوە گـۆڕینی ئایینەكـەی و نـەرێكردنی ئەوانـەی خودا جـێگیری كـردوون و جێگیركردنـی ئەوانـەی كـە خـودا نـەرێی كـردوون، بـە رەوا بینینی شـتێك خـودا بـە نـاڕەوای دەزانێـت و بـە نـاڕەوابینینی شـتێك خـودا بـە ڕەوا دایناوە، دوژمنایەتی كەسێك دۆستی خودایە و دۆستایەتی كەسـێك دوژمـنی خودایـە، خۆشەویستی كەسێك خودا رقی لێیەتی و رقبوونەوە لە كەسـێك خـودا خۆشـیدەوێت، وەسفكردنی خودا لە زات و سیفات و قسە و كرداریدا بە شتێك كە شایستەی نییە.

هیچ كام لە جۆرەكانی حەرام بە ئەندازەی "قسەكردن لەسەر خودا بەبێ زانست" لای خودا گەورە نییە و خراپەی زۆر نییە، ئەو كارە سەرچاوەی هاوەڵدانان و بێباوەڕییە، لەسەر ئەو جۆرە قسەكردنەوە لەمەڕ خودا كۆشكی بیدعە و گومڕایی بیناكراوە.

هەر بیدعەیەكی گومڕاكەر لە ئاییندا بنچینەكەی بریتییە لە "قسەكردن لەسەر خودا بەبێ زانست"

بۆ ئەو مەبەستە پێشین و ئیمامان زۆر بە توندی بە گژیداچوون، ئەهلی ئەو حەرامەیان لەسەر زەوی ناساندووە و قاوكردووە، هۆشدارییان داوە لەسەر فیتنەی ئەوانە بە توندترین هۆشداری، زیادەڕەوییان لە رووبەڕووبوونەوەیاندا كردووە كە بۆ "فحشاء و ظلم و عدوان" بەو ئەندازەیە زیادەڕەوییان نەكردووە، چونكە زیانی بیدعە لە روخانی ئایین و نەرێكردنی ئایین زۆر گەورەتر و ترسناكترە، ئەوانەی حەڵاڵكردنی شتێك و حەرامكردنی شتێك دەدەنە پاڵ ئایین خودا كارەكەیان بە خراپە و ئیفتیرا لە قەڵەم دەدات﴿ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿١١٦﴾ ﴾ النحل: ١١٦

ئەی ئەوانەی سیفەتێك دەدەنە پاڵ خودا –سبحانە– كە خودا نەیدابێتە پاڵ خۆی، یان نەرێی سیفەتێك دەكەن كە ئەو –سبحانە– بۆ خۆی جێگیر كردبێت، دەبێ حاڵیان چۆن بێت؟

هەندێك لە پێشین دەڵێن: ئاگاداربن لە وتنی: خودا ئەوەی حەڵاڵ كردووە، و ئەوەی حەرام كردووە، خودا پێی دەفەرموێت: درۆت كرد، ئەوەم حەڵاڵ نەكردووە و ئەوەم حەرام نەكردووە.

ئەوان مەبەستیان حەڵاڵكردن و حەرامكردنێكە تەنها بە بۆچوونی خۆی بێت و بەڵگە و بورهانی لەلای خودا و پێغەمبەرەوە لەسەر نەبێت.

بنچینەی هاوەڵدانان و بێباوەڕی بریتییە لە قسەكردن لەسەر خودا بەبێ زانست، هاوەڵدانەر وا گومان دەبات ئەو كەسەی ئەو كردوویەتی بە پەرستراو لەخوار خوداوە لە خودا نزیكی دەكاتەوە، و لەلای ئەو شفاعەتی بۆ دەكات، و پێویستییەكانی بەهۆی ئەوەوە دەستەبەر دەبێت، هەروەك ئەو كەسانەی دەبنە واسیتەی نێوان مەلیك و رەعییەتەكەی، هەموو هاوەڵدانەرێك شتێك لەسەر خودا دەڵێت كە زانستی پێی نییە،

بەبێ پێچەوانەکەی، قسەکردنی لەسەر خودا بەبێ زانست هەندێ جار پەکخستن و داهێنانی بیدعە لە ئایینی خودادا لەئامێز دەگرێت، لە هاوەڵدانان گشتگیرترە، هاوەڵدانان تاکێکە لە تاکەکانی.

بۆیە درۆکردن بە دەم پێغەمبەرەوە(ﷺ) سەردەکێشێت بۆ چوونە ناو دۆزەخ، و دیاریکردنی شوێنێك لە ئاگردا بۆ خۆی، ئەوەش شوێنێکە خاوەنەکەی لێی جیانابێتەوە، چونکە کارەکەی "قسەکردن لەسەر خودا بەبێ زانست" لەئامێز دەگرێت، وەك درۆی ئاشکرا بەدەم پێغەمبەرەوە، چونکە ئەوەی دەدرێتە پاڵ پێغەمبەر دەدرێتە پاڵ خودا، قسەکردنیش لەسەر خودا بەبێ زانست درۆهەڵبەستنێکی ئاشکرایە بە دەم خوداوە﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا ﴾ الأنعام: ٢١، گوناهی ئەهلی بیدعە هەر هەموو دەکەونە ژێر ئەم جۆرەوە و تەوبەی لێوە بەدەست نایەت مەگەر لە هەرچی بیدعەیە تۆبە بکات.

چۆن دەتوانێت تەوبەی لێ بکات گەر نەزانێت کارەکەی بیدعەیە، یاخود وا گومان دەبات کارەکەی سوننەیە، ئەو بانگی بۆ دەکات و خەڵکی هاندەدات بۆ سەری؟ گوناهی ئەمانەی بۆ دەرناکەوێت کە تەوبەکردن لێیان پێویستە تەنها بە شارەزابوون لە سوننەت نەبێت، زۆری ئاگاهی لێی و بەردەوامی لێکۆڵینەوە و پشکنین تیایدا، خاوەنی بیدعەش هەرگیز ئەوە بە خۆیەوە نابینێت.

سوننە لە خودی خۆیدا بیدعە دەسڕێتەوە، بە سوننەت بیدعە لەسەر پێی خۆی ناوەستێت، کە خۆری سوننەت لە دڵی کەسێك هەڵهات تەمومژی بیدعە دەڕەوێتەوە، و تاریکی هەموو گومڕاییەکان کۆتایی پێ دێت، چونکە بەرانبەر دەسەڵاتی خۆر تاریکی هیچ دەسەڵاتێکی نییە، جیاوازی نێوان سوننە و بیدعە نیشانی بەندە نادرێت و یارمەتی نادرێت بۆ دەرچوون لە تاریکی بیدعەوە بۆ رۆشنایی سوننەت مەگەر ئەو کەسە شوێنی پێغەمبەر بکەوێت و بەدڵ لە هەموو کاتێکدا کۆچ بۆ لای خودا بکات، بەداوای کۆمەکی و ئیخلاص و پەناگرتنی راستەقینە بە خودا، هەروەها کۆچ کردن بۆ لای پێغەمبەر، بە سووربوون بۆ گەیشتنە فەرموودەکانی کردارەکانی و هیدایەت و سوننەتەکانی ((هەر کەس کۆچەکەی بۆ لای خودا و پێغەمبەرە، ئەوە کۆچەکەی بۆ لای خودا و پێغەمبەر دەبێت)) هەر کەس کۆچەکەی بۆ لای شتێکی تر بێت ئەوە دەبێتە بەشی لە دونیا و دوارۆژدا، خودا کۆمەککار و یارمەتیدەرە.

## دیمەنەكانی یاخیبوون

**بریتییە لە:** دیمەنی ئاژەڵسروشتی و تێركردنی حەزەكان و دیمەنی جەبر و دیمەنی قەدر، و دیمەنی حیكمەت، و دیمەنی كۆمەك و شەرمەزاری، و دیمەنی یەكتاپەرستی و ناو سیفەتەكانی، و دیمەنی باوەڕ و فرە دیمەنی، و دیمەنی بەزەیی و دیمەنی دەستەوسانی و لاوازی، و دیمەنی گەردنكەچی و هەژاری، و دیمەنی خۆشەویستی و بەندایەتی.

سیانی یەكەمیان بۆ لادەرانن و ئەوانی تر بۆ ئەهلی راوەستاون لەسەر راستە شەقام.

ئەم بەشە لە بەرزترین بەشەكانی كتێبەكەیە، بەسوودترینیانە بۆ هەموان، شایستەی ئەوەیە خۆتی بۆ ماندوو بكەی، لەوانەیە لە كتێبی تردا ئەمەت بەرچنگ نەكەوێت، مەگەر لە كتێبێكی ترماندا بە ناوی **"سفر الهجرتين في طريق السعادتين"**.

### ۞ سروشتی ئاژەڵی لە هەندێ مرۆڤدا

دیمەنی ئاژەڵی و تێركردنی حەز دیمەنی خەڵكانی نەفامە، ئەو خەڵكانەی جیاوازییەك نابینرێت لە نێوان ئەوان و ئاژەڵانی تردا، جگە لە باڵا رێكی و قسەی زمان، هیچ خەمێكیان نییە جگە لە تێركردنی حەزەكانیان بە هەر رێگەیەك بێت، ئەوانە نەفسیان نەفسێكی ئاژەڵییە، بەرز نەبووەتەوە بۆ پلەی مرۆیی، چجای بەرزبوونەوە بۆ پلەی فریشتە، ئەوانە حاڵیان پەستترە لەوەی باس بكرێت، ئەوان لە حاڵیاندا جیاوازیان هەیە بەپێی جیاوازی ئاژەڵان كە ئەوان لەسەر ئەخلاق و سروشتیانن.

**هەیانە نەفسیان نەفسێكی سەگانەیە**، گەر گەیشت بە لاكێك كە هەزار سەگ تێر دەكات، دەست دەگرێت بەسەریدا و لە سەگەكانی تر پارێزگاری لێ دەكات، هەر سەگێك لێی نزیك دەبێتەوە دەست بە وەڕین دەكات لێی، سەگەكان بە گەلەكۆمە و بەزاندنی ئەو نەبێت ناوێرن لێی نزیك ببنەوە، شتێك لەو لاكە تۆپیوە نادات بە سەگێك، خەمی گەورەی ئەو تێركردنی ورگێتی بە هەر رێگەیەك بێت، مردارەوە بوو یان سەربڕاو، پیس یان پاك، شەرم لە قێزەون ناكاتەوە، داری بۆ هەڵبگریت دەمە لاسكێیەتی، دەستبەرداری ببیت دەمە لاسكێیەتی، گەر نانی پێ بدەیت بە دەورتدا كلكەلەقێیەتی، گەر پێی نەدەیت دەست بە وەڕین دەكات لێت.

**هەیانە نەفسی وەك نەفسی گوێدرێژە**، دروستنەکراوە بۆ زەحمەت و ئالف نەبێت، تا ئالفی بۆ زیاد بکرێت زەحمەتی زیاد دەکات، گیاندارێکی بێزمان، کەمترین هەستی هەیە، بۆیە خودا ئەو کەسەی کتێبەکەی هەڵدەگرێت و هیچی لێ تێناگات و مەعریفەی پێی نییە و کاری پێ ناکات بە گوێدرێژ شوبهاندووە، سەگی کردووە بە نموونەی ئەو زانا خراپانەی کە خودا بەڵگە و نیشانی پێ بەخشیون کەچی خۆیان لێداڕنیوە وەك دارینی کەوڵ لە جەستەی ئاژەڵ، بە زەویەوە لکا و شوێنی حەزەکانی خۆی کەوت، لەم دوو نموونەدا نهێنی زۆر مەزنیان تێدایە کە ئێرە جێگەی باسکردنی نییە.

**هەیانە نەفسی نەفسێکی دڕندەییە و تووڕەییە**، هەوڵی بریتییە لە دەستدرێژی بۆ سەر خەڵکی و ژێردەستە کردنیان بەو هێز و دەسەڵاتەی بەدەستی هێناوە، سروشتی ئەو کارە داوا دەکات وەك سروشتی گیاندارێکی دڕندە کە ئەو کارانەی لێوە پەیدا دەبێت.

لەسەر ئەو لێکچوونە ئەوانەی تەئویلی خەون دەکەن بینینی گیانداری دڕندە لەلای مرۆڤ و لە ماڵەکەیدا، یان بیەوێت هێرش بکاتە سەری بەو سیفەتە لێکدەدەنەوە و شانی لەسە دادەدەن، بۆ ئێمە و بۆ خەڵکانی زۆر لەو جۆرە خەونە لە خەودا روویداوە، تەئویلی خەونەکە پڕاوپڕ بووە بۆ خەڵکانێك کە لەسەر سروشتی ئەو دڕندانە بوون، پێغەمبەر(ﷺ) لە چیرۆکی غەزوەی ئوحد لە خەوندا بینی ((گایەك سەردەبڕا))، ئەوە بوو هەندێ لە یاوەڕداران بەدەستی بێباوەڕان شەهید بوون، گا بەسوودترین گیاندارە بۆ زەوی، باشی زەوی و کاری جوتیاری بە گاوەیە، لەگەڵ بوونی ئارامی سوودی زۆری تر، ملکەچ و رامهاتووە بۆ مرۆڤ، مل بە مرۆڤ دەدات و یاخی نابێت، عومەری کوڕی خەتتاب لە خەوندا بینی وەك ئەوەی کەڵەشێرێك بیەوێت سێ دەنووکی لێبدات، ئەوە بوو "ئەبو لوئلوئە" چەند خەنجەرێکی لێدا، کەڵەشێر پیاوێکی ئەعجەمی زۆر خراپە.

هەندێ مرۆڤ هەیە سروشتی وەك سروشتی بەراز وایە، بەلای شتی باشدا گوزەر دەکات و لای بەلادا ناکاتەوە، کە مرۆڤێك بیەوێت رێی پێبگرێت لێیدەدا، زۆربەی خەڵکی بەم جۆرەن، چەند بەرانبەری خراپە چاکەت لێ دەبیستێ و لێ دەبینێت نە لەبەری دەکات و نە دەیگوێزێتەوە و نە بەکاری ئەو دێت کە تێکەوتنێکی تۆی بینی یان وشەیەکی خراپی تۆی بیست ئەوەی بەدوایدا دەگەڕێت دەیبینێتەوە و دەیکات بە میوە و شەوچەرەی خۆی.

هەیانە سروشتی وەك سروشتی تاووس وایە، هیچ كارێكی نییە خۆجوانكردن و خۆڕازانەوە نەبێت بە پەڕەكانی، لەپشتی ئەوەوە هیچ شتێكی تر نییە.

باشترین سروشت سروشتی ئەسپە كە گیاندارێكە خاوەن نەفسێكی بەرز و سروشتێكی بەخشندەیە، هەر بەو جۆرە مەڕ، هەر كەس سروشتی یەكێك لەم ئاژەڵانەی تێدا بێت ئەوا لە ناخ و ئەخلاقیدا شتی باشی دەستكەوتووە، گەر گۆشتیان بخوات لێكچوونەكەی زۆر دەبێت، چونكە خۆراكخۆر سیفەتی خۆراكەكە وەردەگرێت.

بۆیە خودا خواردنی گۆشتی ئاژەڵی دڕندە و باڵندەی ڕاوكەری حەرام كردووە، چونكە خواردنەكەی سیفەتی ئاژەڵەكە لە دەروونێدا دروست دەكات، خودا باشتر دەزانێت.

**مەبەست:** ئەوەیە كە كەسانێك خاوەنی ئەم دیمەنەن بینینیان بۆ نییە جگە لە مەیلی دەروون و تێركردنی حەزەكان، شتێكی تر لە پشتی ئەوەوە نابیننەوە.

## ۞ دیمەنی هاوەڵانی جەبر

پاشان دیمەنی هاوەڵانی جەبر، ئەمەش ئەوانەن كە شایەتی دەدەن ئەوان لەسەر ئەنجامدانی كردارەكانیان ناچاردەكرێن و ویستی ئەوانی تێدا نییە و ئەو ڕووداوانە بەبێ دەسەڵاتی ئەوان ڕوویداوە، بەڵكو شایەتی نادەن ئەو كارانە كاری ئەوان بێت.

**دەڵێن:** هیچ كەس لە ڕاستیدا بكەری كاری خۆی نییە و خاوەن هێز و توانین نییە، بكەر و بزوێنەر لە كارەكەدا كەسێكی ترە، ئەو تەنها ئامێرێكە، جووڵەی ئەو وەك هەڵكردنی با و جووڵەی درەختەكان وایە.

ئەوانە گەر كارەكانیان بە خراپ دابنێیت پەنا بۆ قەدەر دەبەن، گوناه و تاوانەكانی خۆیان دەدەن بە كۆڵدا، هەندێ جار زیادەڕەوی دەكەن، تا وایان لێ دێت هەموو كارەكانیان بە كار و كردەوەی چاك و گوێڕایەڵی خودا بزانن، بەخێر و شەڕەوە گوایە لەگەڵ ویست و قەدەری خودادا پێكهاتوونەتەوە.

**هەروەها دەڵێن:** وەك چۆن ئەنجامدانی فەرمانی خودا چاكەیە، هەر بەو جۆرە ئەنجامدانی ویستی خودا چاكەیە، وەك چۆن خودا حكایەتی هاوەڵدانەرانمان -براكانی ئەوان- بۆ دەگێڕێتەوە، ئەوان ویستی خودا بۆ كارەكانیان كردە بەڵگە و نیشانە بۆ فەرمانی خودا و ڕەزامەندی ئەو بۆ ئەو كارانە و لەسەر ئەو كارانە، ئەوانە خراپترن لە

قەدەرییە نەرێکەرەکان، دوژمنایەتییان بۆ خودا کتێبەکانی و پێغەمبەران و ئایینەکەی توندتر و سەختترە، هەتا هەندێ لەوانە بیانوو بۆ ئیبلیس دەهێنێتەوە، ئازاری بۆ خودا، بیانووەکەی بە کۆششی خۆی رادەوەستێنێت و بە زمانی حاڵ و گوفتار ستەم دەداتە پاڵ خودا –سبحانه– دەڵێن: ئیبلیس گوناهی چی بوو ناوچاوانی خۆی پاراست لە سوژدەبردن بۆ غەیری دروستکەرەکەی خۆی؟ ئەو تەبایی کردووە لەگەڵ حوکم و ویستی خودا لەسەر خۆی؟ ئەو چۆن دەتوانێت سوژدە ببات لە کاتێکدا دروستکەرەکەی رێگەی سوژدەبردنی لێگرتووە؟ ئایا واز هێنان لە سوژدە بۆ غەیری خودا کارێکی باش نییە؟

ئەوانە دوژمنی راستەقینەی خودان، دۆستی ئیبلیسن و برای ئەون، گەر یەکێکیان ئیبلیس بلاوێنێتەوە دەبینی هەمووان دەدەن لە پرمەی گریان و سۆز و هەڵچوونێکی سەیر داگیریان دەکات، دەبینیت ستەمی قەدەر لەوان و تۆمەتبارکردنی خودا بەسەر زمانیاندا جاری دەبێت و لە روخسارییاندا دەردەکەوێ، لەوانە دەبیستی سکالا لە مەزڵومی و ئازارچەشتنی دەستی قەدەر دەکات وەك بیستنی سکالای کەسێکی دەستەوسانی ستەملێکراو لە دوژمنەکەی.

## ۞دیمەنی قەدەری نەرێکەر

پاشان دیمەنی قەدەری نەرێکەر، شایەتی دەدەن هەموو ئەو تاوان و خراپانە خۆیان خولقاندوویانە و بە ویستی ئەوان هاتوونەتە دی، بەبێ ویستی خودای موتەعال، خودا ئەوانەی بۆ ئەوان نەبرپوەتەوە و نەینووسیوە و نەیویستووە و کاروکردەوەکانی ئەوانی نەخولقاندووە، نە دەتوانێت هیدایەتی کەسێك بدات، نە دەتوانێت گومڕای بکات، ئەو تەنها بەیان و رۆشنکردنەوەی لەسەرە، نەك ئیلهامی هیدایەت و گومڕابوون و خراپە و خۆپارێزی بە کەسەکە ببەخشێت و ئەوانە بخاتە ناو دڵیەوە.

شایەتی ئەوە دەدەن کە شتێك لە موڵکی خودادا روودەدات کە خودا نەیویستووە، هەروەها شتێکی لە موڵکی خۆیدا دەوێت، بەڵام نابێت و روونادات، مرۆڤ خولقێنەری کاروکردەوەکانی خۆیانن بەبێ ویستی خودا.

یاخیبوون و گوناه دروستکراوی ئەوانە و لە ویستی ئەوانەوە هاتوون، نەك دروستکراوی خودا بن، ئەوانە بە هیچ جۆرێك پەیوەست نین بە ویستی خوداوە، ئەوان

لەوانەدا بەشێكی خراپیان هەیە لە داواكردنی كۆمەك و یارمەتی لە خودا، و پشت پێبەستنی و دەستگرتن بە حەبلییەوە و داوای هیدایەت و جێگیركردن و راوەستانی دڵییان و داوا لە خودا دڵییان تووشی لادان لە باوەڕ نەكاتەوە، هەموو ئەوانە ناچنە ژێر ویستی خوداوە.

شەیتان بەم برە لێیان رازی بووە، بۆیە هانیان نادات بۆ ئەنجامدانی ئەو گوناهانە، بێزاریان ناكات بۆ رووكردنە تاوان و گوناه، لەو كارەدا دوو مەرامی گڵاوی هەیە:

**مەرامی یەكەم:** تاكو لە دڵیاندا دروستیی ئەم دیمەن و بیروباوەڕە جێگیر بكات و پێیان بڵێت: ئەو گوناهانە گەورانەی ئەهلی سوننەت دەیكات ئێوە تێیناكەون، ئەمەش بەڵگەیە كە ئەو كارە بەدەست ئێوەیە و بەهۆی ئێوەوە روودەدات، ئێوە خۆتانن دەبنە پارێزەری خۆتان لە گوناه و تەنها خۆتانن رێگری دەكەن تووشی گوناه دەبن.

**مەرامی دووەم:** بەو كارە خەڵكی نەزان بەدەستی ئەوانە (قەدەرییەكان) راو دەكات، كە دەیانبینن ئەهلی عیبادەت و زوهد و وەرعن لە خراپە و یاخیبوون و بە گەورەزانینی ئەو گوناهانە، دەڵێن: ئەوانە ئەهلی حەقن-شەیتانیش بیدعە باشترە لە لای و خۆشەویسترە لە گوناه- گەر شەیتان زەفەری پێبردن و لەسەر دەستی ئەوانە نەزانانی راوكرد، ئیتر چۆن فەرمانیان پێ دەكات بە یاخیبوون؟ بەڵكو نەهییان لێ دەكات و لەبەر چاو و دڵانیان ناشیرینی دەكات، ئەم حەقیقەتانەش تەنها ئەهلی رۆشنبینی دەیانزانن.

## ۞ یەكەمین راوەستان لەسەر شارێگە بریتییە لە زانینی حیكمەتی دروستكراو

بەڵام ئەهلی راوەستان لەسەر شارێگە حیكمەتی خودا دەبینن لەوەی شتێكی لەسەر بەندەكەی بڕیارداوە كە بێزراو و بوغزێنراوە لەلای-سبحانه-، ئەو شتەی بەندەكەی لەسەر لۆمە دەكات و سزای دەدات، ئەو-سبحانه- گەر بویستبایە لەو گوناهانە دەیپاراست و لە ئەنجامدانی لایدەدا، خودا-سبحانه- بەزۆر هیچ كەس وا لێناكات لە خودا یاخی ببێت، هیچ شتێكیش لەم جیهانەدا روونادات بە ویستی ئەو نەبێت ﴿أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴿٥٤﴾﴾ الأعراف: ٥٤

ئەوانە شایەتی دەدەن کە خودا هیچ شتێکی بەبێ حیکمەت دروست نەکردووە، بەڵکو مەزنترین حیکمەت هەیە لە هەموو ئەوەی بڕیاری داوە و بڕاوەتەوە لە خێر و لە شەڕ و گوێڕایەڵی و یاخیبوون، حیکمەتێکی سەرسامکەری ئەوتۆ کە ئەقڵ دەستەوسانە لە پەیبردن بە حەقیقەتی و زمانەکان دەستەوسانن لە تەعبیرکردنی.

سەرچاوەی قەزا و قەدەری خودا لەوەی بوغزێنراوە و جێگەی تووڕەیی و ناڕەزایی خودایە بۆ ناوی "الحكيم" دەگەڕێتەوە، کە حیکمەتەکەی هەموو خاوەن ژیرییەکی سەرسام کردووە، خودای موتەعال بە فریشتەکانی فەرموو، کاتێك ئەوان وتیان ﴿أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾ البقـــــــرة: ٣٠، وەلامیدانەوە ﴿إِنِّيٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾﴾ البقرة: ٣٠، خودا-سبحانه-حیکمەتی مەزنی هەیە لە دەرکەوتنی گوناه و تاواندا و کاریگەری شوێنەواری گوناه و تاوان لەسەر بەڵگە و نیشانە و حیکمەتەکان و جۆرەکانی خۆناساندن بە دروستکراوەکانی و هەروەها کاریگەری لەسەر هەمەچەشنی ئایەتەکان و بەڵگەکانی پەروەردگاری و یەکتاپەرستی و خواوەندی و دانایی و عیززەت و تێر و تەواوی موڵکی خودا و کەماڵی قودرەت و ئابلۆقەی زانستی خودا کە خاوەن رۆشنبینییەکان بە رۆشنبینی دڵیان ئاشکرا دەیبینن و دەڵێن ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ﴾ آل عمران: ١٩١، ئەوە تەنها حیکمەتی سەرسامکەر و بەڵگە و نیشانەی ئاشکرای تۆیە.

**ولله في كل تحريكة وتسكينة أبدا شاهد**

**وفي كل شيء له آية تدل على أنه واحد**

(لە هەموو جووڵاندن و وەستانێکدا بۆ خودا بە هەمیشەیی گەواهیدەرێك بوونی هەیە، لە هەر شتێکدا ئایەتێکی خودا هەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو تاك و تەنهایە)

زۆرن ئەو ئایەتە رۆشنانەی لە زەویدا بوونیان هەیە و بەڵگەن لەسەر خودا و راستێتی پێغەمبەرەکانی، هەروەها بەڵگەن لەسەر ئەوەی گەیشتنەوە بە لیقای خودا راستە، چەندین ئایەتی گەورە نیشانی مرۆڤ دراوە کە هۆیەکەیان یاخیبوونی مرۆڤ و گوناهەکانیان بووە، وەك ئایەتی نوقمبوونی قەومی نوح و بەرزبوونەوەی ئاو بۆ سەر لوتکەی چیاکان و نوقمکردنی هەموو ئەهلی سەر زەوی و رزگارکردنی دۆستەکانی لە ئەهلی ناسینی خودا و یەکتاپەرستی، زۆرن ئەو ئایەتانەی بەڵگە و نیشانە و پەند و

وانەيان تێدايە و ئاماژەيەکی هەميشەيين لەگەڵ تێپەڕبوونی سەردەمەکان، هەر بەو جۆرە بەرباد کردنی قەومی عاد و سەموود.

هەروەها گۆڕينی ئاگر بۆ ساردێکی سەلامەت لەسەر ئيبراهيم بەهۆی گوناهی قەومەکەی و ياخيبوونيانەوە، هەڵدانی ئيبراهيم بۆ ناو ئاگر لەلايەن ئەوانەوە، تا بوو بە ئايەتێك و ئيبراهيم کەماڵی خۆشەويستی و نزيکی لە خوداوە بەو هۆيەوە بەدەستهێنا.

هەر بەو جۆرە ئەوەی لە پێغەمبەران ڕوويانداوە لە کەرامەت و پلە و نزيکبوونەوە لە خوداوە و پايەداری لەلای ئەو، بەهۆی ئارامييانەوە لەسەر ئازاری قەومەکانيان و بەگژداچوونيان لەلايەن ئەوانەوە و دوژمنايەتی و دەستدرێژييان بۆ سەر پێغەمبەران.

هەر بەو جۆرە هەڵبژاردنی گەواهيدەران (الشهداء) و دۆستان (الأولياء) و هەڵبژێراوان و پاڵفتەکراوان (الأصفياء) لە مرۆڤ لەلايەن خوداوە، بەهۆی ئارامگرتنيان لەسەر ئازاری مرۆڤەکان لە ئەهلی ياخيبوون و ستەم، کۆشان لەگەڵيان لە پێناوی خودادا، دان بەخودا گرتن لەبەر خودا بەرانبەر دوژمنانی خودا، ئەوەش شايستەی بەرزترين پلە و پايەی کردن.

ئەوانە و زۆرێکی تريش لە بەرژەوەندی و حيکمەت کە هاتوونەتە دی بەهۆی ياخيبوون و تاوانی مرۆڤەوە، کە لە هۆيەکانيان بڕانەوە و بڕياری خودايە بۆ ئەو کار و کردەوانەی لەلای خودا بێزراو و بوغزێنراون و جێگەی ڕق و خەشمی خودان. ئەو کارە حيکمەتێکی باڵايە، نەبوونی ئەو کارانە (نەبوونی گوناه و ياخيبوون) دەبووە هۆی تياچوونی زۆرێك لە کار و کردەوەی چاك و باش کە لەلای خودا خۆشەويست و ويستراون.

بەدەستهێنانی ئەو خۆشويستراوە مەزنانە لەلای خودا خۆشەويسترە لە نەبوونی ئەو کارە ناپەسەند و بوغزێنراوانە، بەدەستهێنانی ئەو خۆشويستراوە کە پەيدا نەدەبوو بەبێ بوونی ئەو ناپەسەند و بێزراوانە لای خودا خۆشەويسترە و تياچوونی ئەو خۆشويستراوە لەلای خودا لە تياچوونی کارە خراپەکان ناپەسەندترە، کەماڵی حيکمەتی خودا داوا دەکات خۆشەويسترينی دوو کارێك بێتە بوونەوە بە تياچوونی نزمترينی دوو خۆشويستراوەکە و ئەو خۆشويستراوە پەکی نەکەوێت بە پەکخستنی ئەو بێزراوە، گريمانەی بير و زەين بۆ بوونی ئەمە بەبێ ئەوە وەك گريمانەی بوونی دەرئەنجامەکان وايە بەبێ هۆ، يان گريمانە پێويستکراوەکان بەبێ پێويستی کە

حیکەتی خودا و کەماڵی توانا و دەسەڵاتی و پەروەردگاریی ئەو رێگری دەکات لەو جۆرە کارانە.

زۆرێك لە حیکمەتی مەزن و نیعمەتی گەورە بوونی هەیە لەسەر خستنی دۆستەکانی بەسەر دوژمنەکانیدا و سەرخستنی دوژمنەکانی بەسەر دۆستەکانیدا و کۆکردنەوەیان لە یەك شار و ناوچەدا.

زۆرێك لە بەدەستهاتووی خۆشەویست بۆ پەروەردگار بوونی هەیە، لە ستایشی ئەهلی ئاسمانەکان و زەوی بۆ خودا و گەرندنکەچی و زەلیلی و ترس و هەژاری و لارەملی لە بەردەمی خودادا بەوەی نەیکردوون بە دوژمنی خۆی، ئەهلی باوەڕ دوژمنانی خودا دەبینن و رووزەردی و رسوابوونیان بەهۆی خوداوە تەماشا دەکەن، دەبینن چۆن خودا پشتیان تێدەکات و خەشمیان بەسەردا دادەبارێنێ و سزای گەورەیان بۆ ئامادە دەکات، هەموو ئەوانە بە ویستی خودا و تاوتوێکردن و بڕیاردان لە مەملەکەتەکەیدا، دۆستانی خودا لە ترسی رووزەردبوون گەردنکەچن و دەلەرزن، بە ئەوپەڕی ترس و ملکەچییەوە.

کە فریشتەکان ئیبلیس و ئەوەی بەسەریدا هات دەبینن، هەروەها بینینی هاروت و ماروت، سەریان دەخەنە بەردەم پەروەردگاریان وەك گەردنکەچی بۆ مەزنی خودا و سەرکزی بۆ عیززەتی ئەو و ترسان لە دوورخستنەوەیان و دەرکردنیان، هەروەها زەلیلی لەبەردەم شانوشکۆی مەزنی خودادا و دەربڕینی هەژاری بۆ بەزەیی و پارێزگاری لێکردنیان، بەوەش منەت و چاکەی خودا و تایبەتمەندکردنیان بە گەورەیی و رێز لەسەر خۆیان دەبینن.

هەر بەو جۆرە دۆستە خۆپارێز و لە خودا ترساوەکانی، کە حاڵی دوژمنانی خودا و خەشم و رق و رسواکردنیان لێیان دەبینن گەردنکەچی و فەرمانبەرداری زۆرتریان بۆ دروست دەبێت، هەژاری و دڵشکاوی زۆرتر دەردەبڕن، کۆمەك هەر بە خودایە و گەڕانەوەش هەر بۆ لای ئەوە، پشتبەستن بەوە و ترس و هیواش بۆ لای ئەوە، دەزانن کە هیچ پەنا و هانایەك نییە جگە لە پەنای ئەو، لە خەشم و تووڕەیی ئەو رزگاریان نابێت بە رەزامەندی خودا نەبێت، فەزڵ و گەورەیی هەر بۆ ئەوە لە یەکەمجار و دواجاردا.

ئەمە دڵۆپێکە لە دەریای حیکمەتی ئابلۆقەدەری دروستکراوەکانی، مرۆڤی رۆشنبین بە رۆشنبینییەکەی تەماشای پشتەوەی ئەمانە دەکات، لەوێوە حیکمەتی

سەرسامکەری بەرچاو دەکەوێت کە زمان ناتوانێت دەریان ببڕێت و وەسفکردن لە ئاستیان دەستەوسانە.

بەشی بەندە لە خودی خۆی و ئەوەی لە بینینی ئەم حیکمەتە بەو تایبەتکراوە بەپێی ئامادەیی و هێز و ڕۆشنبینییەتی، هەر باوەڕدارێك لەوانە سەرچاوە خواردنەوەی خۆی هەیە و مەقامێکی بۆ دیاریکراوە کە ناتوانێت بازی بەسەردا بدات و سنوورەکانی ببەزێنێت، خودا کۆمەککار و یارمەتیدەرە.

## ۞ دیمەنی یەکتاپەرستی

ئەوەیە کە تاك و تەنهایی پەروەردگار لە خەلق و بڕیاردا ببینێت، بزانێت ئەوەی خودا دەیەوێت دەبێت و ئەوەی نەیەوێت نابێت، گەردیلەیەك ناجولێت بە مۆڵەتی ئەو نەبێت، هەموو بوون ژێردەستەی هێز و دەسەڵاتی ئەون، هیچ دڵێك نییە لەنێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی ڕەحماندا نەبێت، گەر ویستی ڕاوەستاوی بکات ئەوا ڕاوەستاوی دەکات و ئەگەریش ویستی لایبدا و وەریبگێڕێت ئەوا لایدەدات و وەریدەگێڕێت، دڵەکان بەدەستی خوداوەن، ئەو وەریاندەگێڕێت و تاوتوێیان دەکات چۆنی بوێت، هەرئەوە کە خۆپارێزی بە نەفسی باوەڕداران داوە، ئەوە هیدایەتی داون و پاکی کردوونەتەوە، هەر ئەویشە خراپەی ئیلهامی نەفسی خراپەکاران کردووە ﴿ مَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَا هَادِيَ لَهُۥ ﴾ الأعراف: ١٨٦، بە فەزڵ و بەزەیی خۆی هیدایەتی هەر کەسێك دەدات کە بیەوێت، فەزڵ و چاکەی کەسی بەخشندە منەتی لەگەڵ نییە، ئەوە دادپەروەری و بڕیاری خودایە ﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأنبياء: ٢٣ .

ئیبن عەباس –خوا لە خۆی و باوکی ڕازی بێت– دەفەرموێت: ((باوەڕ بە قەدەر نیزامی یەکتاپەرستییە، هەر کەس قەدەر بەدرۆ بزانێت ئەوا بەدرۆزانینەکەی لە یەکتاپەرستییەکەی کەم دەکاتەوە، هەر کەسیش باوەڕی بە یەکتاپەرستی هەبێت ئەوا باوەڕەکەی یەکتاپەرستییەکەی بەڕاست دەردەکات))

لەم دیمەنەدا مەقامی ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾ ﴾ بە زانست و بە حاڵ بەدەستدێت، پێیەکانی بەندە لە یەکتاپەرستی پەروەردگاریدا جێگیر دەبێت، پاشان لێیەوە بەرز دەبێتەوە بۆ یەکتاپەرستی خواوەندی، ئەو کە دڵنیابوو زیان و قازانج بەخشین و

لێگرتنەوە و هیدایەت و گومڕایی و بەختەوەری و بەدبەختی، هەموو ئەمانە بەدەستی خودان و بەدەستی کەسێکی تر نین، هەر ئەوە دڵان وەردەگێڕێ و چۆنی بوێت بەو جۆرە ئاراستەیان دەکات، هیچ کەس سەرکەوتوو نابێت مەگەر خودا کۆمەکی و یارمەتی بۆ بنێرێت، هیچ کەس شەرمەزار و ڕسوا نابێت مەگەر خودا شەرمەزار و ڕسوایی بکات و دەستی لێ بەربدا، ڕاسترین و سەلامەترین و ڕاوەستاوترین و ناسکترین و پاکترین و خۆگرترین و نەرمترین دڵ ئەو دڵەیە کە خودای کردووە بە پەرستراو و خواوەندی خۆی، خودای لە هەموو کەس زیاتر خۆش دەوێت، لە هەموو کەس زیاتر لێی دەترسێت، لە هەموو کەس زیاتر ڕجای بە ئەوە، خۆشەویستی ئەو دەخاتە پێش هەموو خۆشەویستییەکانەوە، خۆشەویستییەکانی تر بەدوای خۆشەویستی خودادا دێن وەك چۆن سوپا شوێنی سوڵتان دەکەوێت، ترس لە خودا لەناو دڵیدا لە پێش هەرچی ترسەوەیە لە دروستکراوەکانی، ترسەکانی تر بەدوای ترسی ئەودا دێن، ڕجای لە دڵدا پێش هەموو ڕجایەك دەکەوێت، ڕجاکانی تر بەدوای ڕجای ئەودا دێن.

ئەمە نیشانەی یەکتاپەرستی خودایە لە دڵدا، ئەو دەرگایەی لێیەوە هاتۆتە ناوی بریتییە لە یەکتاپەرستی پەروەردگاریی، واتە دەرگای یەکتاپەرستی خواوەندی بریتییە لە یەکتاپەرستی پەروەردگاریی.

یەکەمین جار دڵ وابەستەی یەکتاپەرستی پەروەردگاری دەبێت، پاشان بەرزدەبێتەوە بۆ یەکتاپەرستی خواوەندی، وەك چۆن خودا-**سبحانه**- بەندەکانی بەم یەکتاپەرستییە بانگ دەکات بۆ یەکتاپەرستی خواوەندی، بە یەکتاپەرستی پەروەردگاریی بەڵگەیان بۆ دەهێنێتەوە و ناچاری دانپیادانانیان دەکات و پاشان هەواڵمان پێدەدات کە ئەو دانپیادانانە بە هاوەڵدانان بۆی هەڵدەوەشێننەوە و لە خواوەندیدا هاوەڵی بۆ پەیدا دەکەن.

لەم دیمەنەدا مەقامی ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ بەدەست دەهێنرێت، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٨٧﴾ ﴾ الزخرف: ٨٧، واتە شایەتی "لا إله إلا الله" و پەرستنی خودا بە تەنها بۆ کوێ دەبەن، کاتێك ئەوان شایەتی دەدەن کە هیچ پەروەردگارێك و هیچ دروستکەر و بەدیهێنەرێك جگە لە ئەو بوونی نییە، هەر بەو جۆرە ئایەتی﴿ قُل لِّمَنِ الْأَرْضُ وَمَن فِيهَا إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٤﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ

﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٨٥﴾﴾ المؤمنون: ٨٤ – ٨٥، ئەوان دەزانن گەر تەنها خودا خاوەنی موڵكی زەویە و ئەوەی كە تێیدایە و هەر ئەو دروستكەر و پەروەردگار و مەلیكیانە كەوابوو هەر ئەو بە تەنها پەرستراو و خواوەندیانە، جگە لە ئەو بۆ ئەوان پەروەردگارێكی تر بوونی نییە هەر بەو جۆرە پەرستراو و خواوەندێك جگە لە ئەو بۆ ئەوان بوونی نییە ﴿قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ﴿٨٦﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٨٧﴾ قُلْ مَن بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٨﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ فَأَنَّى تُسْحَرُونَ ﴿٨٩﴾﴾ المؤمنون: ٨٦ – ٨٩، هەر بەو جۆرە فەرموودەی خودا لە سورەتی "النمل"دا ﴿قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَامٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ الَّذِينَ اصْطَفَىٰ آللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٥٩﴾ أَمَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَنبَتْنَا بِهِ حَدَائِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنبِتُوا شَجَرَهَا أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ ﴿٦٠﴾ أَمَّن جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَالَهَا أَنْهَارًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَاسِيَ وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ أَمَّن يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الْأَرْضِ أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ تَعَالَى اللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٣﴾ أَمَّن يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٦٤﴾﴾ النمل: ٥٩ – ٦٤.

بەڵگەیان لەسەر دەهێنێتەوە ئەو كەسەی هەموو ئەمانەی بۆ ئەوان ئەنجامداوە ئەو كەسە پەرستراو و خواوەندیانە بە تەنها، گەر پەروەردگارێكی تری لەگەڵ بوایە و ئەو كارانەی لەگەڵ بكردبایە ئەوا پێویست بوو ئەویش بپەرسترێت، گەر هیچ كەسێك لەگەڵ خودا بۆ ئەنجامدانی ئەو كارانە بوونی نەبووە، ئیتر چۆن دەبێت پەرستراو و خواوەندێكی تر لەگەڵ خودادا بپەرستن؟!

بۆیە راسترین بۆچوون لە تەقدیری ئایەتەكەدا ئەوەیە بوترێت ((أإله مع الله فعل هـذا)) ئایا خواوەندێكی تر لەگەڵ خودادا بوونی هەیە ئەو كارانەی ئەنجام دابێت؟ تا بەڵگەی بۆ بهێنرێتەوە، وەڵامەكە بەدڵنیاییەوە نەخێرە، گەر خواوەندێك لەگەڵی نییە تا ئەوەی خودا ئەیكات ئەویش بیكات، ئیتر چۆن خواوەندە پووچەكانی تر لەخوار خوداوە دەپەرستن؟ لێرەوە زانرا خواوەندی لە خوار خوداوە پووچ و بێبنەمایە، وەك چۆن پەروەردگاری لەخوار خوداوە پووچ و بێبنەمایە بە شایەتی و دانپیانانی خۆتان.

ئەو کەسەی دەڵێت ماناکەی بریتییە لە ((هل مع الله إله آخر)) ئایا لەگەڵ خودادا خواوەندێکی تر هەیە؟ بەبێ وتنی مانای ((فعل هذا)) ئەوەی ئەنجامداوە، بۆچوونەکەی لە دوو رووەوە لاوازە:

یەکەم: ئەوان دەیانوت: لەگەڵ خودادا کۆمەڵێك خواوەندی تر هەن، هاوەڵدانەران نەرێی ئەوەیان نەدەکرد لەگەڵ خودادا خواوەندی تر هەبێت، تا خودا بۆیان بکات بە پرسیار.

دووەم: بەڵگەکە تەواو نابێت و بەرانبەرەکە دەمکوت ناکرێت و بەڵگەیان بەسەردا ناسەپێنرێت بەو تەقدیرە نەبێت (ئایا خواوەندێکی تر لەگەڵ خودادا بوونی هەیە ئەو کارانەی ئەنجام دابێت؟)، واتە ماناکەی بەم جۆرەیە: گەر ئێوە دەڵێن خوایەکی تری لەگەڵ نییە ئەوەی ئەو دەیکات ئەویش بیکات، ئەی چۆن پەرستراوێکی تر لەپاڵ خودادا دادەنێن کە بێتوانا و دەستەوسانە؟ ئەمەش لە ئایەتی ﴿أَمۡ هَلۡ تَسۡتَوِي ٱلظُّلُمَٰتُ وَٱلنُّورُۗ أَمۡ جَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ خَلَقُواْ كَخَلۡقِهِۦ فَتَشَٰبَهَ ٱلۡخَلۡقُ عَلَيۡهِمۡۚ قُلِ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ وَهُوَ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّٰرُ ١٦﴾ الرعد: ١٦﴿ هَٰذَا خَلۡقُ ٱللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦۚ ﴾ لقمان: ١١ ﴿ أَفَمَن يَخۡلُقُ كَمَن لَّا يَخۡلُقُۚ ﴾ النحل: ١٧ ﴿ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَخۡلُقُونَ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ٢٠ ﴾ النحل: ٢٠ ﴿وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗ لَّا يَخۡلُقُونَ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ﴾ الفرقان: ٣، لەم نموونانە زۆرن لە قورئاندا، بەهۆیانەوە بەڵگە لەسەریان تەواو دەبێت وەك رۆشنبوویەوە.

مەبەست: ئەوەیە کە بەندە ئەمەی بەرچنگ دەکەوێت لە تێڕامان لە دیمەنی تاوان و گوناه و جاریبوونیان بەسەر ژیان و بەسەر مرۆڤدا بە ئەندازەگیری خودای عەزیز و حەکیم، هیچ پارێزەرێك لە تووڕەیی خودا و خەشم و رقی ئەو بوونی نییە جگە لە خۆی، مرۆڤ ناگاتە گوێڕایەڵی خودا بە کۆمەکی ئەو نەبێت، ناگاتە رەزامەندی ئەو بە یارمەتی ئەو نەبێت، ویستنی هەموو کاروبارەکان بەوە و لە لای ئەوە، سەرچاوەکانیان بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە، هەموو کۆمەکی و یارمەتییەك لەدەستی ئەودایە و یارمەتیدەرێك بۆ بەندەکانی نییە جگە لە ئەو، پشتبەستن هەر بەوە، وەك شوعەیب (عليه السلام) وتارخوێنی پێغەمبەران دەفەرموێت ﴿وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ٨٨﴾ هود: ٨٨.

## ۞ دیمەنی كۆمەكی و شەرمەزاربوون

ئەوەش لە تەواوكردنی ئەم دیمەنە و لقەكانییەتی، بەڵام بەتەنها باسكراوە بەهۆی پێویستی بەندە بە بینینی و وەرگرتنی سوود لێیەوە، خوداناسان كۆدەنگییان لەسەر ئەوە هەیە كە "خۆشبەختی" ئەوەیە خودا نەتداتە دەست نەفسی خۆت، "شەرمەزاربوون"یش ئەوەیە خودا لەگەڵ نەفست وێڵت بكات، بەندەكانی لەنێوان "خۆشبەختی" و "شەرمەزاربوون"ی ئەودا تەپاوتل دەكەن، بەڵكو بەندە لە یەك ساتدا بەشی لە هەردووكیاندا هەیە، گوێڕایەڵی خودا دەكات و لەخۆی ڕازی دەكات و یاد و شوكری دەكات بەو خۆشبەختییەی كە لە خوداوەیە، پاشان لە خودا یاخی دەبێت و سەرپێچی لە فەرمانەكانی دەكات و خودا لەخۆی تووڕە دەكات و لێی بێئاگا دەبێت بەو شەرمەزاركردنەی لە خوداوە ڕووبەڕووی دەبێتەوە، ئەو لەنێوان خۆشەبەختبوون و شەرمەزاربووندا دەسوڕێتەوە، گەر بە كاری چاكە خۆشبەختی كرد ئەوە بە فەزڵ و بەزەیی خۆیەتی، گەر شەرمەزاری كرد ئەوە بە دادپەروەری و حیكمەتی خۆیەتی، ئەو-سبحانە- لەسەر هەردووكیان ستایشكراوە، تەواوترین و كامڵترین ستایش هەر بۆ ئەوە، شتێكی لە بەندەكەی قەدەغە نەكردووە هی ئەو بێت، ئەو تەنها فەزڵ و بەخششی لێ گرتۆتەوە، ئەو زاناترە بەوەی چۆن و لە كوێ فەزڵ و بەخششی خۆی دادەنێت؟

هەركات بەندە ئەم دیمەنەی بینی و مافی خۆی پێدا ئەو كات دەزانێت چەندە پێویستی بە خۆشبەختبوونە لەلای خوداوە لە هەموو هەناسە و چركەسات و چاوتروكانێكیدا، ئیمان و یەكتاپەرستی بەندە بەدەستی خودایە، گەر تەنها چاوتروكانێك خودا دەستی لێ بەربدا عەرشی یەكتاپەرستییەكەی دەپسێت و دادەڕمێت، و ئاسمانی باوەڕی بە زەویدا دەكێشێت، مەگەر بە بڕیاری خودا ڕاوەستاوی بكات، بۆیە كاری زمانی بە هەمیشەیی ((**يا مقلب القلوب ثبت قلوبنا على دينك، يا مصرف القلوب صرف قلوبنا إلى طاعتك**)) دوعای بە هەمیشەیی ((**يا حي يا قيوم يا بديع السموات والأرض، يا ذا الجلال و الإكرام، لا إله إلا أنت، برحمتك أستغيث، أصلح شأني كله، ولا تكلني إلى نفسي طرفة عين، ولا إلى أحد من خلقك**)).

ئەم دیمەندا "خۆشبەختكردن" و "شەرمەزاركردن"ی خودا بۆ بەندەكەی بەرچاو دەكەوێت، هەروەك چۆن پەروەردگاریی و خەلقی خودا دەبینێت، داوای خۆشبەختكردن لە خودا دەكات بە داوای كەسێكی ئاتاج و ناچار، پەنا بە خودا دەگرێت لە شەرمەزاربوون بە پەناگرتنێكی هانابەرانە، نەفسی خۆی دەخاتە بەردەستی و لە دەرگای خودادا خۆی رادەست دەكات و دەمێنێتەوە، سەری خۆی لەبەردەم خودادا كز دەكات، گەردنكەچ و زەلیل و شەرمەندە، نە قازانج و نە زیان و نە مردن و نە ژیان و نە زیندووبوونەوەی لەدەستی خۆیدا نییە.

"خۆشبەختبوون" ویستی خودایە لەلای خۆیەوە بەوەی كارێك بە بەندەكەی و بۆ بەندەی بكات بەهۆیەوە چاك ببێت، وای لێ بكات بتوانێت كارێك ئەنجام بدات رەزامەندی ئەوی تێدا بێت، ئەوی بوێت، ئەوی خۆشبوێت و خودا بەسەر هەموو شتەكانی تردا هەڵببژێرێت، هەر بەو جۆرە خودا شتێك لای بەندەكەی بێزراو و ناشیرین بكات كە دەبێتە هۆی خەشم و تووڕەیی خودا لە ئەو، هەموو ئەوانە كاری خودان و بەندە تەنها دەفری ئەو كارانەن، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ ٱللَّهِ ۚ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِى كَثِيرٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ ٱلْإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِى قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ ٱلْكُفْرَ وَٱلْفُسُوقَ وَٱلْعِصْيَانَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ﴿٧﴾ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعْمَةً ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٨﴾﴾ الحجرات: ٧ – ٨، ئەو-سبحانه- زانایە بەو كەسەی شایستەی فەزڵە و ئەو كەسەش كە شایستەی نییە، ئەو حەكیمە و فەزڵ لە شوێنی خۆی دادەنێت و و لای كەسێك دایدەنێت كە ئەهلی ئەو فەزڵەیە، ئەمەش لە دوای ئەم بەشەی ئایەتە دەفەرموێت ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ ٱللَّهِ ۚ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِى كَثِيرٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ﴾، پاشان پیتی پیاگەیشتن (لكن)ی هێنا و فەرمووی ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ ٱلْإِيمَٰنَ﴾ خودا-سبحانه- دەفەرموێت: خۆشەویستیتان بۆ باوەڕ و ویستی ئێوە بۆی و جوانكردنی لە دڵتاندا بوونی نەبوو، بەڵام خودا بۆ خۆی لەناو دڵتان دایناوە و ئێوەش هەڵتان بژارد و پێی رازی بوون، بۆیە پێشمەكەون لە پێغەمبەرەكەم، شتێك مەڵێن هەتا ئەو نەیڵێت، كارێك مەكەن ئەو فەرمانی پێ نەكردبێت، ئەو كەسەی باوەڕی لا خۆشەویست كردوون زاناترە بە بەرژەوەندی بەندەكانی لە بەندەكانی، ئێوەش گەر

خۆشبەختکردنی خودا بۆ ئێوە نەبوایە دەروونتان خۆی رادەستی باوەڕ نەدەکرد، باوەڕ بە راوێژی ئێوە و کۆمەکی ئێوە نەبووە، ئێوە بۆ بەدەستهێنانی باوەڕ لە خودا پێش نەکەوتوون، دەروونتان کەمتەرخەم و دەستەوسانە لەو کارە و ناتوانن بۆ خۆتان دەستەبەری بکەن، گەر پێغەمبەرەکەم لە زۆربەی ئەوەی ئێوە دەتانەوێت بە گوێتان بکات زۆر بە گران بەسەر ئێوەدا دەشکێتەوە، ئەو کاتە تیادەچن و بەرژەوەندییەکانتان تێکدەچێت و بەخۆتان نازانن، وا گومان مەبەن دەروونی خۆتان رێگەی راست و دروست و چاکەتان بۆ دیاری بکات وەك چۆن باوەڕتان هەڵبژارد، گەر من لاتان خۆشەویستم نەکردبایە و لە دڵتاندا جوانم نەکردبایە و بێباوەڕی و لادانم لاتان ناشیرین نەکردبایە ئەوا دەروونتان باوەڕی نەدەدۆزییەوە و خراپەی هەڵدەبژارد.

قەدەرییە جەبرییەکان "خۆشبەخت" بوونیان بە خەلقی گوێڕایەڵی لێکداوەتەوە و "شەرمەزاربوون"یشیان بە خەلقی یاخیبوون راڤە کردووە.

بەڵام ئەوەیان لەسەر بنەمای تێکچووی خۆیان بیناکردووە لە رەدکردنەوەی هۆ و حیکمەت، کارەکەیان تەنها بۆ ویستی خودا گێڕاوەتەوە بەبێ هۆ و حیکمەت.

قەدەری نەرێکەر رووبەڕوویان بوونەوە و "خۆشبەخت" کردنیان بە رۆشنکردنەوەی گشتی و هیدایەتی گشتی و توانای گوێڕایەڵی و رووکردنە چاکە و ئامادەکردنی هۆکارەکانی لێکداوەتەوە، ئەمانەش بۆ هەموو بێباوەڕ و هاوەڵدانەرێك بەدەستهاتووە و بەڵگەیان لەسەر هێنراوەتەوە و ئامادەیی باوەڕیان پێ بەخشراوە.

"خۆشبەختبوون" لای ئەوان کارێکی هاوبەشی نێوان بێباوەڕ و باوەڕدارە، چونکە قەدەر و ئامادەیی پێدان و بەڵگە و رۆشنکردنەوە هەردوو دەستەکەی گرتۆتەوە، لای ئەوان باوەڕداران تەنهانەکراونەتەوە بە باوەڕ بەهۆی "خۆشبەختبوون"ەوە و بێباوەڕانیش بەهۆی "شەرمەزاربوون"ەوە رووبەڕووی بێباوەڕی بوونەوە، گەر خودا ئەوە بکات لەلای ئەوان خۆشەویستییە بۆ دەستەیەك و ستەمە لە دەستەیەکی تر.

خودا بە مۆڵەتی خۆی هیدایەتی ئەوانەی دا (مەبەستی ئەهلی شارێگەی راست و دروستە) و لەو جیاوازییە رزگاری کردن و حەقی پێنیشان دان، خودا خۆیەتی هەر کەسێکی بوێت بۆ سەر شارێگەی راست و رەوان رێنومایی دەکات، ئەوان قەزا و

قەدەر و ویستی گشتگیری خودایان بۆ بوونەوەر جێگیر کرد، هۆ و حیکمەت و ئامانج و بەرژەوەندییان جێگیر و دامەزراو کرد، خودایان لەوە بەپاکڕاگرت شتێك لە موڵکیدا هەبێت ئەو نەیویستبێت، یان دروستکراوەکانی توانای کارێکیان هەبێت نەکەوێتە ژێر دەسەڵات و ویستی ئەوەوە، یان شتێك لە کارەکانیان بەبێ ویست و هەڵبژاردنی ئەو رووبدات، هەر کەس ئەمە بڵێ پەروەردگاری نەناسیوە و کەماڵی پەروەردگاریی بۆ خودا جێگیر نەکردووە.

لەگەڵ ئەوەشدا خودایان لە کاری هەوانتە و بێمانا بە پاك ڕاگرتووە، بەوەی شتێکی بەبێ مەرام دروست کردبێت، یاخود کردارەکانی خاڵی بێت لە حیکمەتی مەزن، حیکمەتێك کە لە پێناویدا شتەکان بەدیهاتبن و هۆیەك بوویێتە سەرهەڵدانی بوون، ئامانجگەلێك ببێتە رێگە و هۆکار بۆ لایان، ئەوەی دروستی کردووە و بڕیاری لێداوە حیکمەتی زۆر مەزن لە پشتییەوەیە، ئەو حیکمەتە سیفەتێکی راوەستاوە بە خوداوە، لە راستیدا دروستکراو نییە وەك قەدەرییەکان –نەرێکارانی قەدەر و حیکمەت– دەیانوت.

ئەهلی شارێگەی راست و دروست لەو دوو دەستەیە بەرین، جگە لە حەقێك کە لەناو هەندێ لە قسەکانیاندا بوونی هەیە، لەسەر ئەو حەقە لەگەڵیان تەبان، حەقی هەردوو دەستەکە کۆدەکەنەوە ولەپاڵ حەقێکی تردا دایدەنێن، بەهۆی ئەو پووچەی کە دەیڵێن ئەو حەقەی لەلایانە بە پووچی نازانن، ئەوان شایەتی خودان لەسەر دەستەکانی تر، ئەمینداڕانی خودان و دادوەرانی خودان لەنێوانیاندا، بڕیار لەسەریان دەدەن، بەبێ ئەوەی هیچ کام لەوانە بڕیار بەسەر ئەماندا بدات، پەردە لەسەر حاڵی ئەو دەستانە لادەدەن، کەس ناتوانێت پەردە لەسەر ئەوان لابدات مەگەر کەسێك لە زانستێکەوە کە پێغەمبەر هێنابێتی و بەهۆیەوە جیاوازی نێوان ئەوە و شتانی تر بدۆزێتەوە و لێی تێکەڵ نەبێت، ئەوانە چەند کەسێکی کەم و دەستەبژێر و پاڵفتەی جیهانن، لەوانە نین ئاینەکەی خۆیان پارچە پارچە کرد و دەستە دەستە لێی وەستان، هەروەها لەوانەش نین کە کاروباری خۆیان لەناو خۆیاندا پارچە پارچە کرد، بەڵکو لەوانەن لەسەر بەڵگە و بورهان و رۆشنایی باوەڕن لە پەروەردگاریانەوە، زانا و شارەزان بەوەی لای خەڵکییە، خودا یارمەتیدەر و کۆمەککارە.

## ۞ دیمەنی ناو و سیفەتەكان

لە بەرزترین دیمەنەكانە، لەوەی پێش خۆی باڵاتر و بەرینترە.

سەركێشانە ناو ئەم دیمەنە دەبێتە هۆی زانینی وابەستەبوون و گرێدانی بوون و بڕیار(خەلق و ئەمر) بە ناوە جوانەكانی خودا و سیفەتە بەرزەكانییەوە، هەرچەند جیهان و ئەوەی تێیدایە بەشێكە لە شوێنەوار و بەدواداهاتووەكانی ئەو ناو و سیفەتانە.

ئەمەش لە بەرزترین و مەزنترین زانستەكانە، هەر ناوێك لە ناوەكانی خودای موتەعال–سبحانە– سیفەتێكی تایبەتی هەیە، ناوەكانی كۆمەڵێك وەسفی مەدح و كەماڵن، هەر سیفەتێكیش داواكراو و بەدوادا هاتووی بۆ هەیە كە تێنەپەڕە یان تێپەڕە، لەو بارەدا كە تێپەڕە كردارەكەی وابەستەی "بەركار"ێك دەبێت كە لە پێویستییەكانییەتی، ئەمەش لە بوون و بڕیار و پاداشت و سزادایە، هەموو ئەوانەش شوێنەواری ناوە جوانەكانی خودا و پێویستییەكانییەتی.

پەكخستنی ناوەكانی لە وەسف و ماناكانیان محاڵە و هەر بەو جۆرە پەكخستنی وەسفەكانی لەوەی داوای دەكەن و بەدوایاندا دێن لە كردارەكان و پەكخستنی كردارەكان لە بەركارەكان محاڵە، وەك چۆن محاڵە بەركارەكان لە كارەكانیان پەكبخرێن و كردارەكان لە وەسفەكانیان و وەسفەكان لە ناوەكانیان هەر بەو جۆرە محاڵە ناو و سیفەتاكان لە زاتی خودای موتەعال پەكبخرێن.

كاتێك ئەوسافەكانی خودا سیفاتی كەماڵبن و كردارەكانی حیكمەت و بەرژەوەندی بن و ناوەكانی جوانبن ئەوا گریمانەی پەكخستنیان لە داواكراو و بەدوادا هاتووەكانیان دیسان محاڵە لە حەقی خودادا، بۆیە خودا–سبحانە– دەچێت بە گژ ئەوانەدا كە خودا لە بڕیار و نەهیلێكردن و پاداشت و سزا پەكدەخەن، بەو كارەشیان شتێك دەدەنە پاڵ خودا كە شایستەی خودا نییە و دەبێت خودای لێ بەپاك رابگیرێت، ئەو حوكمدانە بەسەر خودادا حوكمێكی خراپە، دانەپاڵی ئەوە بۆ لای خودا پێنەدانی حەقی خودایە و مەزنی و شكۆمەندی ئەویان نەداوە بە خودا ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِذْ قَالُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَيْءٍ﴾ الأنعام: ٩١، هەروەها خودای موتەعال دەرحەق ئەوانەی نەرێی زیندووبوونەوە و پاداشت و سزا دەكەن دەفەرموێت ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ﴾ الزمر: ٦٧،

هەروەها دەرحەقی ئەوانەی یەکسان بوونی دوو دژ لەلای خودا بە رەوا دەبینن وەك یەکسان کردنی چاکان و خراپان و باوەڕداران و بێباوەڕان دەفەرموێت ﴿أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٢١﴾﴾ الجاثية: ٢١، رایگەیاند کە ئەوە حوکمێکی خراپە و شایستەی خودا نیە، ناوەکان و سیفەتەکانی ئەوە قبوولْ ناکەن، بۆیە دەفەرموێت ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ ۖ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾﴾ المؤمنون: ١١٥ – ١١٦، لەو گومان و بۆچوونە کە ناو و سیفەتەکانی وەریناگرن و قبوولّی ناکەن.

هاوشێوەکانی ئەمانە لە قورئاندا زۆرن، پێچەوانەی ناو و سیفەتەکانی لە خۆی نەرێ دەکات، چونکە ئەو کارە پەکخستنی ئەو ناو و سیفەتانەیە لە کەماڵ و داواکارییەکانیان.

ناوی ستایشکراو (الحمید) رێگری دەکات لەوەی مرۆڤ وێڵ بکرێت و هیچ مەرام و حیکمەتێك لە دروستبوونیدا نەبێت و بکە و مەکە(ئەمر و نەهی) بەسەردا دەرنەکرێت و پاداشت و سزا وەرنەگرێت، هەر بەو جۆرە ناوی دانا (الحکیم) هەموو ئەوانەی پێشەوە رەد دەکاتەوە، ناوی "الملك" و ناوی "الحي" رێگری دەکەن لەوەی خودا لە ئەنجامدانی کردار دەستەوسان بێت، بەڵکو حەقیقەتی زیندەگی بریتییە لە کردار، هەموو زیندوویەك کارایە، "خالق و قیوم" لە داواکارییەکانی کەسی زیندووە، هەروەها ناوی "السمیع و البصیر" داوای بیسترا و بینراو دەکەن، ناوی "الخالق" داوای دروستکراو دەکات، هەر بەو جۆرە ناوی "الرزاق" و "الملك" داوای مەملەکەت و هەڵسوڕان و بەڕێوەبردن و پێدان و لێگرتنەوە و چاکە و دادپەروەری و پاداشت و سزا دەکەن، هەروەها ناوی "البر" واتە چاکەکار و پێدەر و خاوەن منەت بە نیعمەتەکانی داوای شوێنەوار و بەدوادا هاتووەکانی دەکات.

کە ئەمە زانرا لە ناوە جوانەکانی –سبحانە– ((الغفار، التواب، العفو)) دەبێت بۆ ئەم ناوانە وابەستەبوون بوونی هەبێت، دەبێت تاوانێك بوونی هەبێت تا لێی خۆشببێت، دەبێ تەوبە لە گوناه بوونی هەبێت تا خودا قبوولّی بکات، دەبێ خراپە هەبێت تا لێی ببورێت، بۆیە دەبێت بۆ ناوی "الحکیم" وابەستەیەك بوونی هەبێت تا حیکمەتەکانی

خودای تیا دەربکەوێت، چونکە داواکاری ئەم ناوانە بۆ شوێنەوارەکانیان وەك داواکاری ناوی ((الخالق، الرزاق، المعطي، المانع))وایە بۆ دروستکراو و ڕۆزیدراو و پێدراو و ڕێلێگیراو(پێنەدراو)، هەموو ئەم ناوانەش ناوی جوان و بەرز و بڵندن.

پەروەردگار زات و ئەوساف و ناوەکانی خۆی خۆشدەوێت، ئەو لێبوردە(العفو)ە و لێبوردنی خۆش دەوێت، هەر بەو جۆرە لێخۆشبوون و تەوبەی خۆش دەوێت، بە تەوبەکردنی بەندەکەی خۆشحاڵ دەبێت کاتێك دەگەڕێتەوە بۆ لای بە خۆشحاڵ بوونێك بە خەیاڵی مرۆڤدا تێناپەڕێت.

لێخۆشبوون لە گوناهان و لێبووردن لە ئەنجامدەرانی و حیلم بەرانبەری و تەوبە لێ قبووڵ کردن و لێبووردەیی بەرانبەر لە پێویستییەکانی ناو و سیفاتەکانییەتی و بەدەستهاتنی ئەوەی کە خودا خۆشیدەوێت و پێی رازییە، ئەوەی خودا ستایشی خۆی لەسەر دەکات و ئەوەی ئەهلی ئاسمانەکان و زەوی لەسەری ستایشی دەکەن لە پێویستییەکانی کەماڵی خودای موتەعال و داواکارییەکانی ستایشی خودایە.

ئەو-سبحانە- ستایشکراو و شکۆمەندە (الحمید، المجید)، "حمد و مجد" داوای شوێنەوارەکانیان دەکەن.

لەوانە: لێخۆشبوون لە هەڵە و تێکەوتن و خلیسکان، لێبووردن لە خراپە و تاوان، لەگەڵ کەماڵی هێز و دەسەڵات بۆ وەرگرتنەوەی حەق، هەروەها زانست بە تاوان و بڕی سزاکەی، حیلمی خودا دوای زانستی خودایە و لێبووردنی خودا دوای دەسەڵاتی خودایە، لێخۆشبوونی لە کەماڵی عیززەت و حیکمەتەوەیە، وەك مەسیح (عليه السلام) دەفەرموێت ﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١١٨﴾ ﴾ المائدة: ١١٨، واتە لێبوردنت لە کەماڵی دەسەڵات و حیکمەتەوەیە، وەك ئەو کەسانە نیت کە لە بێدەسەڵاتی و دەستەوسانییەوە دەبوورن، یان بەهۆی نەزانینیان بە گەورەیی حەق دەبوورن، تۆ زانای بە حەقی خۆت، بەتوانا و بەدەسەڵاتی لە وەرگرتنەوەی و دانای لە دەستبۆبردنیدا.

هەر کەس لە جاریبوونی شوێنەواری ناو و سیفەتەکانی خودای موتەعال لە جیهاندا رابمێنێت، هەروەها تێڕامان لە بڕیارەکانی بکات تێدەگات کە سەرچاوەی ئەنجامدانی ئەو تاوانانە لە بەندەکانەوەیە، واتە ئەوە لە کەماڵی ناو و سیفەت و کردارەکانەوەیە،

ئامانجەكەشی دیسان: داواكردنی ستایش و شكۆمەندیی خودایە، هەروەك چۆن دواكردنی پەروەردگاریی و خواوەندیی خودایە.

لە هەموو ئەوانەی بڕیاری لێداوە و ئەندازەی گرتووە مەزنترین حیكمەتیان تێدایە، هەر بەو جۆرە بەڵگە و نیشانە سەرسامكەرەكان و خۆناساندنی بە بەندەكانی بە ناو و سیفەتەكانی، ڕاكێشانی خۆشەویستیان بۆ خودا، یادكردنیان بۆ خودا و شوكرییان بۆی و پەرستنیان بۆ خودا بە ناوە جوانەكانی، چونكە هەر ناوێك جۆرێك لە پەرستنی تایبەتی بۆ هەیە، لە زانست و ناسین و حاڵدا بەرجەستە دەبێت، كامڵترین بەندایەتی بەندایەتی كەسێكە كە بە هەموو ئەو ناو و سیفەتانەی مرۆڤ پێیان گەیشتووە بەندایەتی دەكات، بەندایەتی ناوێك لە ناوەكانی بێبەشی ناكات لە بەندایەتی لە ناوێكی تردا، وەك ئەوەی كەسێك بەندایەتی بە ناوی "القدير" بێبەشی بكات لە بەندایەتی بە ناوی "الحليم الرحيم"، یان بەندایەتی ناوی "المعطي" بێبەشی بكات لە بەندایەتی ناوی "المانع"، یان بەندایەتی ناوی "الرحيم و العفو والغفور" بێبەشی بكات لە بەندایەتی ناوی "المنتقم" یاخود بەندایەتی ناوی ((الودود، والبر، و اللطف و الإحسان)) بێبەشی بكات لە بەندایەتی ناوی ((العدل و الجبروت و العظمة و الكبرياء)) و هاوشێوەكانی ئەمانە.

ئەمە ڕێگەی كەسانی كامڵە لە ڕێبوارانی ڕێگەی بەرەو خوداچوون، ڕێگەیەكە لە كرۆكی قورئان داتاشراوە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا﴾ الأعراف: ١٨٠، داواكردن بە ناوە جوانەكانی داوای داواكاری و داوای مەدح سەنا و داوای بەندایەتی لە ئامێز دەگرێت، ئەو –سبحانە– بەندەكانی بانگ دەكات كە بە ناو و سیفاتەكانی بیناسن، بەو ناوانە مەدح و سەنای بكەن و بەشی خۆیان لە بەندایەتی لەو ناوانەوە وەربگرن.

ئەو –سبحانە– داواكاری و پێویستییەكانی ناو و سیفەتەكانی خۆی خۆشدەوێت.

ئەو زانا(علیم)ە و هەموو زانایەكی خۆشدەوێت، "جواد"ە و هەموو بەخشندەیەكی خۆشدەوێت، تاك(وتر)ە و تاكی لە كاروكردەوەكاندا خۆشدەوێت، جوان(جمیل)ە و جوانی خۆشدەوێت، چاكەكار(البر)ە و چاكەكارانی خۆشدەوێت، سوپاسگوزار(الشكور)ە و سوپاسگوزارانی خۆشدەوێت، ئارامگر(صبور)ە و ئارامگرانی خۆشدەوێت، حەلیمە و ئەهلی حیلمی خۆشدەوێت، بەهۆی خۆشەویستی ئەوەوە –سبحانە– بۆ تەوبە و

لێخۆشبوون و لێبووردن و چاولێپۆشین، دروستكراوێكی دروستكردووە تا لێی خۆشببێت و تەوبەی لێ قبوول بكات ولێی ببورێت، هەروەها كۆمەڵە شتێكی بۆ داناوە تاكو ئەوەی بێزراو و بوغزێنراوە لێی بوەشێتەوە، تاكو ئەوەی كە خۆشەویستە لەلای خودا و پێی رازییە لە لێبوردن و لێخۆشبوون و تەوبە لەدوای ئەوانەوە پەیدا ببن و سەرهەڵبدەن.

## ۞ دیمەنی زیادەی باوەڕ و فرەیی دیمەنەكانی

ئەمە لە وردترین دیمەنەكان و تایبەتترینە بە ئەهلی مەعریفە، لەوانەیە گوێگر نەرێی ئەم دیمەنە بكات و بڵێت: چۆن لە گوناه و یاخیبوونەوە زیادە لە باوەڕدا سەرهەڵدەدات؟ بە تایبەت گوناه و یاخیبوونەكانی خودی بەندەكە، بۆ مەگەر ئەوانە نابنە هۆی كەمكركردنەوەی باوەڕ، بە كۆدەنگی پێشین باوەڕ بە گوێڕایەڵی زیاد دەكات و بە گوناه و یاخیبوونیش كەم دەكات؟!

بزانە، ئەمە بۆ كەسی خوداناس بەدەست دێت كە لادەكاتەوە بەلای گوناهەكانی خۆی و خەڵكی و سەرنجی ئەو شوێنەوارە دەدات لەو گوناهانەوە سەرهەڵدەدەن، سەرهەڵدانی شوێنەوار لەسەر گوناه مەشخەڵێكە لە مەشخەڵی پێغەمبەرایەتی و بەڵگەیە لەو بەڵگانەی پێغەمبەران بەڕاست دەردەكات و دروستیی ئەوەی هێناویانە دەردەخات، پێغەمبەران-صلوات الله وسلامه علیهم- فەرمانیان بە بەندەكان كردووە بەوەی چاكیی و باشی دەرەوە و ناوەوە و ژیان و دواڕۆژی ئەوانی تێدایە، هەر بەو جۆرە نەهیان لێكردوون لە شتانێك كە تێكدانی ناوەوە و دەرەوە و ژیان و دواڕۆژی ئەوانی تێدایە، هەواڵیان پێداون كە خودا ئەوە و ئەوەی خۆش دەوێت و بەوە و بەوە پاداشت لەسەریان وەردەگرێت، هەر بەو شێوەیە هەواڵیان داوە پێیان كە خودا ئەوە و ئەوەی رق لێیە و بە ئەوە و ئەوە سزایان دەدات، هەواڵیان داوە گەر گوێڕایەڵی خودا بكرێت بەو شتانەی فەرمانی پێكردووە ئەوا شوكری بەندەكەی دەكات بە پێدانی زۆرتر و زیاتر و نیعمەتی فراوانتر لە دڵ و جەستە و ماڵ و دارابیدا، بەندە ئەو زیادە و هێزەی لە هەموو حاڵ و بارێكی خۆیدا دەبینێتەوە، گەر سەرپێچی لە فەرمان و نەهییەكانی بكرێت ئەوا لە ناتەواوی دەدات و تێكچوون و لاوازی و زەلیلی و سوكی و كەمی و

تەنگەلانیی بـژێوی و تـاڵی ژیـان رووی تێدەکـەن، وەك خـودای موتـەعال دەفـەرموێت ﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾ ﴾ النحـــــل: ٩٧ ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ ﴾ الزمر: ١٠ ﴿ وَأَنِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَيُؤْتِ كُلَّ ذِى فَضْلٍ فَضْلَهُۥ ﴾ هود: ٣ ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴾ طه: ١٢٤.

ئەوانەیـە مەبەسـت لـە وشـەی "الـذکری" هـەموو ئـەو شـتانە بێـت خـودا بـیری مـرۆڤ دەخەنــەوە، ئــەوەش یەکــەمجار ئامــاژەی پێــدراوە لــە ئایــەتی ﴿ وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الـذاريات: ٢١، هــەروەها لــە ئایــەتی ﴿ قُلْ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الملـك: ٢٣، ئەمــەش لــە قورئانــدا زۆر زۆرە، بێئاگایی لە بەڵگە و نیشـانەکانی خـودا و شـوێنەواری نـاو و سیفەتەکانی لـە ئاسـۆی دەروون و گەردوونـدا و خـۆدارنین لـە تـەواوی ئـەو ئایاتانـە: ئەوەیـە دەبێتـە هـۆی نوقمبوونی مرۆڤ لە تاریکی نەفامیدا، وای لێدەکات ببێت بە دۆستی شەیتان و شـوێنی وەحی نەفامی و بتپەرستی شەیتان بکەوێت و کۆچ لە قورئان بکـات، هـەوڵی تێرامـان لـە ئایەتـەکانی نـادات، مـاقی خوێندنـەوەی نـادات، چـونکە شـەیتان پێـی وتـووە لـە بیروباوەڕ و کار و کردەوە و ئەخلاق و حاڵ و باریدا پێویستی بە قورئان نییە، هـەموو ئەوانـەی بـۆ کۆدەکاتـەوە بـە قسـەی زرق و بـرق و گومڕاکـەر، سەرلێشـێوان و فێـڵ لێکردنی دەگاتە ئاستێك پێی بڵێت خوێندنەوەی قورئان تەنها بۆ مردوو و تەبەڕووکە، قورئان کردن بە نوشتە کە لەوانەوە وەریگرتووە پشتیان لە یادی خودا کردووە.

تەفسیری "معیشة ضنکا" بە سزای ناو گـۆڕ کـراوە، بـەڵام راسـتییەکەی ئەوەیـە کـە لـە دونیادا و لە جیهانی بەرزەخدایە، هەر کەس پشتهەڵبکات لـەو یـادەی کـە دایبەزانـدووە ئەوا سنگتەنگی و بـژێوی تـاڵ و ترسـی گـەورە و هەڵپـەی زۆر و مانـدوون لـە دونیـادا و خـەمخواردن بـۆ لەدەستچـوونی پـێش بەدەسـتهێنان و دوای بەدەسـتهێنان بـەرۆکی دەگرێت و هـەروەها ئـەو ئازارانـەی لەمانـەوە سـەرهەڵدەدەن و دڵ هەسـتیان پێناکـات بەهۆی مەستبوون و رۆچوونی لە سەرخۆشیدا، ئەو گەر تـەنها سـاتێك ئاگـای لـە خـۆی بێت هەست بەو ئازارانە دەکات، بۆیە بە سەرخۆشییەکی تر هەوڵی لادانـی ئـەو ئازارانـە

دەدات، ئەو بە هەموو تەمەنی بەم جۆرە دەژی، چ ژیانێك لەو ژیانە تەنگەلانترە گەر دڵ كەمترین هەستی تێدا مابێت؟

دڵی ئەهلی بیدعە و پشتهەڵكەران لە قورئان و ئەهلی بێئاگایی لە خودا و ئەهلی یاخیبوون لە دۆزەخدان بەر لە گەیشتن بە دۆزەخە گەورەكە، دڵی چاكانیش لە بەهەشتدایە بەر لە گەیشتن بە بەهەشتی گەورە ﴿إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ﴿١٣﴾ وَإِنَّ ٱلْفُجَّارَ لَفِى جَحِيمٍ ﴿١٤﴾﴾ الانفطار: ١٣–١٤، ئەمە لە هەر سێ خانەكەدا(دونیا، بەرزەخ، بەهەشت یان دۆزەخ) تەنها تایبەت نییە بە خانەی رۆژی دوایی، لە جیهانی بەرزەخیشدا لەخوار ئەوەوە، وەك خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ عَذَابًا دُونَ ذَٰلِكَ﴾ الطور: ٤٧، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٧١﴾ قُلْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ رَدِفَ لَكُم بَعْضُ ٱلَّذِى تَسْتَعْجِلُونَ ﴿٧٢﴾﴾ النمل: ٧١– ٧٢.

لەم دونیایەشدا لەخوار ئەوەی لە بەرزەخدایە رووبەڕوویان دەبێتەوە، بەڵام رۆچوون لە مەستبوونی حەزەكاندا رێگرە لە هەستپێكردنی و نەخستنەڕووی بۆ سەر دڵ و بیر لێ نەكردنەوەی.

هەندێجار مرۆڤ ئازارێكی بەرهەستی تووش دەبێت لە دڵ دەریدەكات و لای بەلادا ناكاتەوە، روو لە شتێكی تر دەكات، تاكو بە تەواوی لە ئازارەكەیدا نغرۆ نەبێت، گەر ئەو لاكردنەوەی بەلای شتی تردا نەمێنێت لە تاو ئازار هاوار دەكات، ئەی دەبێت سزا و ئازاری دڵ چۆن بێت؟

خودای موتەعال شوێنەواری خۆشەویست و بەتام و پاكی لە كرداری چاكە و گوێڕایەڵیدا داناوە، چێژەكەی لەسەروو چێژی گوناهەوەیە بە چەندەها جار، بەڵكو لەگەڵ یەكتر بەراورد ناكرێن، هەر بەو جۆرە لە خراپە و یاخیبووندا ئازار و شوێنەواری بێزاركەری داناوە، ئازارێك كە چەند بەرانبەری چێژ و خۆشی گوناهەكەیە، ئیبن عەباس–خودا لە خۆی و باوكی رازی بێت– دەفەرموێت: ((بۆ چاكە نوورێك لە دڵدا بوونی هەیە، رۆشناییەك لە روخسار و هێزێك لە جەستە و زۆربوونێك لە رۆزی و خۆشەویستی لە دڵی خەڵكیدا بەرانبەری، بۆ خراپەش رەشییەك لە روخسار و تاریكییەك لە دڵ و لاوازییەك لە جەستە و كەمی لە رۆزی و رق و بوغز لە دڵی خەڵكی بەرانبەری بوونی هەیە))، ئەمەش تەنها خاوەن رۆشنبینی دەیزانێت و لە خۆی و خەڵكیدا دەیبینێت و هەستی پێ دەكات.

هیچ دۆخ و بارێكی خراپ و دژوار بەسەر بەندەدا نەهاتووە بەهۆی گوناهەوە نەبێت، ئەوەی خودا لێی خۆش دەبێت زۆر زیاترە لەو گوناهانە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ﴿٣٠﴾ ﴾ الشوری: ٣٠، بە هەڵبژاردەی دروستكراوەكانی و هاوەڵانی پێغەمبەرەكەی دەفەرموێت ﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡ ﴾آل عمران: ١٦٥، هەروەها ﴿ مَّآ أَصَابَكَ مِنۡ حَسَنَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٖ فَمِن نَّفۡسِكَ ﴾النساء: ٧٩.

مەبەست بە چاكە و خراپە لێرەدا ئەو نیعمەت و ناخۆشییانەیە كە مرۆڤ لە خوداوە رووبەروویان دەبێتەوە، بۆیە فەرمووی "ما أصابك" ئەوەی تووشت هات، نەیفەرموو "ما أصبت" ئەوەی تووشی خۆت كرد.

هەرچی ناتەواوی و بەلاّ و شەڕە لە دونیا و دوارۆژدا هۆیەكەی گوناه و خراپە و سەرپێچییە لە فەرمانی پەروەردگار، شەڕێك لە جیهاندا بوونی جگە لە گوناه و ئاسەوارەكانی.

ئاسەواری چاكە و خراپە لەسەر دڵ و جەستە و ماڵ كارێكی بەرچاوە لە جیهاندا، خاوەن ژیری سەلامەت رەدی ناكاتەوە، بەڵكو باوەڕدار و بێباوەڕ و چاكەكار و خراپەكار دەیزانێت.

بینینی ئەمە لە نەفسی خۆ و خەڵكیدا و تێڕامان و خوێندنەوە و سەرنجدانی باوەڕ بەوەی پێغەمبەران هێناویانە پتەو دەكات، هەروەها باوەڕ بە پاداشت و سزا، چونكە ئەوە دادپەروەریەكی بینراو و هەستپێكراوە لەم جیهانەدا و پاداشت و سزایەكی كەم و كورتی ئەم جیهانەیە، بەڵگەیە لەسەر بوونی گەورەتر لەوانە بۆ كەسی خاوەن رۆشنبینی، وەك هەندێ لە پێشین دەڵێن: گەر گوناهێكم لێ بوەشێتەوە بە هانایەوە نەچم و بە تەوبەیەك فریای نەكەوم چاوەڕوانی شوێنەواری خراپی دەكەم، گەر لە سەروو یان لە خوارو ئەوەوە تووشم بوو وەك چۆن دامنابوو ئەوا وتنی"أشهد أن لا إله إلا الله و أشهد أن محمد رسول الله" زۆر دەكەم، چونكە ئەوە لە شایەت و بەڵگەكانی باوەڕە، گەر راستگۆیەك هەواڵی پێدای ئەگەر تۆ ئەوە و ئەوە بكەیت ئەوا ئەوە و ئەوەی لە خراپە لێوە پەیدا دەبێت، هەر كات شتێك لەو كارە دەكەیت و تووشی ئەو

خراپەیە دەبیت ئەوا زانستت بە راستگۆیی و رۆشنبینی ئەو کەسە بۆ دروست دەبێت، ئەمەش بۆ هەموو کەس نییە، بەڵکو زۆربەی خەڵکی لیتەی گوناه لەسەر دڵی نیشتووە، نە شتێك لەوانە دەبینێت و نە هەستی پێ دەکات.

ئەمە بۆ دڵێکە نووری باوەڕی تێدابێت و بارەشی گوناه و یاخیبوون تیایدا هەڵبکات، ئەو هەردووکیان دەبینێت، حاڵەتی چرای باوەڕی خۆی و هێزی ئەو گەردەلوول و رەشەبای تیایدا هەڵدەکات دەبینێت، خۆی وادەبینێت لە هەڵچوونی دەریادا سواری کەشتییەك بووە، وەرگەڕان و لاربوونەوەی کەشتییەکە، بە تایبەت گەر کونی تێبێت و بشکێت، ئەویش لەسەر لەوحێکی دارینە بمێنێتەوە و با و شەپۆلەکان یاری پێبکەن، بەم جۆرە باوەڕدار خۆی تەماشا دەکات لە کاتی ئەنجامدانی گوناهدا، گەر خودا خێری بۆ ئەو کەسە بوێت، خۆ گەر شتێکی تری بۆی بوێت ئەوا دڵی لە دۆڵێکی ترە.

هەر کات ئەم دەرگایە بەرووی بەندەدا کرایەوە سوود لە خوێندنەوەی مێژووی جیهان و دۆخی گەلان و گوزەرکردنی دروستکراوەکان دەبینێت، بەڵکو لە دۆخی ئەهلی سەردەمی خۆی سوود وەردەگرێت بەوەی لە ژیان و کاروباری خەڵکی دەیبینێت، ئەو کاتە لە مانای ئەم ئایەتە تێدەگات ﴿ أَفَمَنْ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ ﴾الرعد: ٣٣، هەروەها ئایەتی ﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْعِلْمِ قَآئِمًۢا بِٱلْقِسْطِ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٨﴾ ﴾ آل عمران: ١٨، هەموو ئەوەی لە بووندا دەیبینیت لە شەڕ و ئازار و سزا و سیاساڵی و گرانی، زیان و لە کەمیدان لە خودی خۆت و خەڵکیدا ئەوە لە هەستانی پەروەردگارە بە کاری دادپەروەرانە، با بەدەستی ستەمکارێکیش کارەکان ئەنجام بدات، ئەو کەسەی ئەو ستەمکارەی زاڵ کردووە دادپەروەرترین دادپەروەرە، وەك خودای موتەعال بەوانەی لەسەر زەوی شەڕ و خراپە دەنێنەوە دەفەرموێت ﴿ بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَآ أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُوا۟ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِ ۚ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولًا ﴿٥﴾ ﴾ الإسراء: ٥.

گوناه وەك ژەهر زیان بە مرۆڤ دەگەیەنێت، گەر فریای کەوت بە خواردنەوەی دەرمانی دژ بەو ژەهرە چارەسەر دەکرێت، ئەگەر نە، هێزی باوەڕی شکست پێدەهێنێت، تیاچوونەکەشی وەك هەندێ لە پێشین دەڵێن: ((یاخیبوون پۆستەبەری بێباوەڕییە، وەك چۆن لەرز و تا پۆستەری مردنە)).

بینینی ناتەواوی حاڵ لەلایەن بەندەوە كاتێك لە پەروەردگاری یاخی دەبێت، گۆڕانی دڵ لەسەری و بچووكبوونەوە بەو گوناهە و داخرانی دەرگاكان بە ڕوویدا و سەختی و دژواری گرتنەبەری ڕێگەكان و سووكبوونی لای خانەوادە و منداڵ و ژن و دۆست و برادەرانی، هەروەها گەڕان بەدوایدا تا بزانێت هەموو ئەمانە لە كوێوە هاتوون، و كەوتن بەسەر ئەو هۆیەدا كە ئەو دەرئەنجامانەی دروست كردووە دەبێتە بەهێزبوونی باوەڕ، گەر كەوت بەسەر ئەو هۆیانەدا كە دژی ئەو حاڵەی بۆ دروست دەكات، ئەوا عیززەت لەدوای زەلیلی بەدەست دەهێنێت و دەوڵەمەندی دوای هەژاری، و خۆشی دوای ناخۆشی، و ئاسایش لە دوای ترس، و هێزی دڵ لەدوای لاوازی و پسانی، باوەڕی لەدوای باوەڕ بۆ زیاد دەبێت، بەڵگە و نیشانە و بورهانی باوەڕ لە دۆخی گوناه و گوێڕایەڵییدا لە دڵیدا بەهێز دەبێت، دەچێتە ڕیزی ئەوانەوە خودای موتەعال لەسەریان دەفەرموێت ﴿لِيُكَفِّرَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ وَيَجْزِيَهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٣٥﴾﴾ الزمر: ٣٥.

خاوەنی ئەم دیمەنە هەركات ڕۆشنبینانە تێڕامانی تێدا كرد و مافی خۆی پێدا دەبێتە پزیشكی دڵانی هەموو دونیا و شارەزا بە دەرد و دەرمان، خودا وای لێ دەكات سوود بە خۆی و هەر كەسێكی تر خودا بیەوێت بگەیەنێت، خودا زاناترە.

### ✿ دیمەنی بەزەیی

بەندە كاتێك دەكەوێتە ناو گوناهێكەوە زبری و ڕەقی لە دڵی دەردەچێت، هەروەها چۆنێتی تووڕەیی كە لە سروشتیدایە بەرانبەر ئەو كەسەی كە گوناهی لێوەشاوەتەوە دەرەوێتەوە، تەنانەت گەر دەستی بەسەر كەسی گوناهكەردا بڕوات هەوڵی تیابردنی دەدات، لەوانەیە داوا لە خودا بكات تاكو بەو گوناهە بیگرێت و بەربادی بكات، تووڕەبوونێك لە بەندەوە بۆ خودا، سوور و پێداگرە لەسەر ئەوەی كەسێك گوناه نەكات، لە دڵیدا بەزەیی بە هەڵەكاران و گوناهكاران نابینێتەوە، تەنها بە چاوی بێز و ناشیرین تەماشایان دەكات، بە زمانی تانە و تاشەر ئامۆژگارییان دەكات، عەیبەیان لێ دەردەهێنێت و زەمیان دەكات، گەر قەڵەمی قەدەر بەسەریدا گوزەری كرد و درایە دەست نەفسی خۆی و هانای بۆ خودا و برد و پەنای پێگرت خۆی خستە بەردەرگای

و لەبەردەستیدا دەستی پاڕانەوەی بەرزکردەوە، وەك کەسێکی بەگیرهاتوو لەبەری پاڕایە و نزای کرد ئەوا ئەو رەقییە بەهۆی گوناهەکەیەوە دەگۆڕێت بۆ نەرمی، ئەو دڵڕەقییە بەرانبەر هەڵەکاران دەبێت بە بەزەیی لەگەڵ پارێزگاری لە سنووری خودا، دوعا لێکردنیانیان دەگۆڕێت بۆ دوعا بۆکردن، بەشێك لە تەمەنی بۆ ئەوانە تەرخان دەکات و داوا لە خودا دەکات لێیان خۆشببێت.

چەندە دیمەنێکی بەسوودە! چەندە دەرئەنجامێکی باشە بۆی، خودا باشتر دەزانێت.

### ۞ داماو...... ئەو کەسە دەستەوسانە

پاشان دیمەنی لاوازی دەبینێت، ئەو دەستەوسانترین و لاوازترین شتێکە بتوانێت پارێزگاری لە خودی خۆی بکات، ئەو هێز و توانا و هەوڵی بە پەروەردگارەوەیە، دڵی خۆی وەك پەڕێك دەبینێت لە سارایەکدا بارەش بۆ لای راست و چەپی ببات، خۆی وەك ئەو کەسە دێتە پێش چاو سواری کەشتییەك بووە و با ئەم دیو ئەودیوی دەکات و شەپۆلەکان یاری پێدەکەن، تاوێك بەرزی دەکانەوە و تاوێك نزم، بڕیارەکانی قەدەری بەسەردا جاری دەبێت، ئەو وەك ئامێرێك وایە لەبەردەستی دروستکەرەکەیدا، لە دەرگایدا کەوتووە، روومەتی ناوە لە خۆڵی بەردەرگا، زیان و قازانج و مردن و ژیان و زیندووبوونەوەی بەدەستی خۆی نییە، لە دەروونی خۆیدا تەنها نەزانی و ستەم و ئاسەوارەکانیان دەبینێتەوە، تیاچوون لە نەعلەکانی لێیەوە نزیکترە، ئەو وەك مەڕێك وایە کەوتبێتە ناو گەلەگورگی دڕندەوە، تەنها شوانەکە دەتوانێت لەدەستیان رزگاری بکات، گەر چاوتروکانێك وازی لێبهێنێت لەناو خۆیاندا پارچە پارچەی دەکەن.

هەر بەو جۆرە حاڵی بەندەی خودا لە نێوان خودا و دوژمنەکانیدا لە شەیتانەکانی ئینس و جین، گەر بیپارێزێت لە ئەوانە و دووریان بخاتەوە ئەوا دەستیان پێی ناگات، گەر وازی لێهێنا و چاوتروکانێك دایە دەستی نەفسی، نەك دابەشی بکەن لە نێوانیاندا بەڵکو دەبێت بە بەشی یەکێك لەو دوژمنانەی دەستی بەسەردا دەگرن.

لەم دیمەنەدا بە دروستی نەفسی خۆی دەناسێت، هەر بەو جۆرە خوداش دەناسێت، ئەمە یەکێکە لەو تەئویلانەی بۆ ئەو قسە بەناوبانگە کراوە کە دەڵێت ((هەر کەس

خۆی بناسێت خودا دەناسێت))، ئەمە فەرموودەی پێغەمبەر نییە، بەڵام دەتوانرێت بە سێ تەئویل تەویل بکرێت:

یەکەم: هەر کەس نەفسی خۆی بە لاوازی ناسی، ئەوا پەروەردگاری بە بەهێزی دەناسێت، هەر کەس نەفسی خۆی بە دەستەوسانی ناسی، ئەوا پەروەردگاری بە دەسەلات دەناسێت، هەر کەس نەفسی خۆی بە زەلیلی ناسی، ئەوا پەروەردگاری بە عیززەت دەناسێت، هەر کەس نەفسی خۆی بە نەزانی ناسی، ئەوا پەروەردگاری بە زانایی دەناسێت، خودای موتەعال خاوەنی کەماڵی رەها و ستایشی رەها و شکۆ و دەوڵەمەندی رەهایە، بەندە هەژار و ناتەواو و ئاتاجە، تا بەندە زانستی بە ناتەواوی و تەنگی و هەژاری و زەلیلی و لاوازی خۆی زیاد بکات ناسینی بە پەروەردگار و ئەوسافی کەماڵی زیاد دەکات.

تەئویلی دووەم: هەر کەس سەرنجی ناخی خۆی و ئەو سیفاتە باشانەی کە تێیدایە بدات لە هێز و ویست و قسە و زیندەگی لەوە تێدەگات ئەو کەسەی ئەم سیفەتانەی بەو بەخشیوە لەپێشترە بە سیفەتەکان، ئەو کەسەی کەماڵ دەبەخشێت لەپێشترە بە کەماڵ، چۆن مرۆڤ دەبێت بە کەسێکی زیندوو و قسەکەر و بیسەر و بینەر و خاوەن ویست و زانا، بە ویستی خۆی کارەکانی ئەنجام دەدات ئەو کەسەی بەدیهێناوە و دروستی کردووە لە پێشتر نەبێت بەو سیفەتانە؟ ئەمە مەزنترین محاڵە، بەڵکو ئەو کەسەی مرۆڤ دەکات بە قسەکەر لەپێشترە خۆی قسەکەر بێت، هەر بەو جۆرە ئەوەی مرۆڤی کردووە بە زیندوو و زانا و بیسەر و بینەر و کارا و بەتوانا لەپێشترە خۆی هەموو ئەو سیفاتە کەماڵانەی هەبێت.

تەئویلی یەکەم لە دەروازەی دژەوە، بەڵام ئەم دووەمە لە دەروازەی "لەپێشتر"ەوە.

تەئویلی سێیەم: ئەمە لە دەروازەی نەرێیە، واتە: وەك چۆن نەفسی خۆت کە نزیکترین شتە لێتەوە ناناسیت و نازانیت حەقیقەتی چییە و ئەوچییەی و چۆنێتی چ شێوەیەکە، ئەی دەبێت چۆن پەروەردگار و چۆنێتی سیفەتەکانی بزانیت؟

مەبەست: ئەم دیمە مرۆڤ تێدەگەیەنێت کە دەستەوسان و لاوازە، تەنها بانگەشەی بێبنەما و شت دانە پاڵ خۆ دەستەوسانی و لاوازی لێدەکاتەوە کە بۆخۆی دەزانێت بەو جۆرە نییە و هیچی لەدەستدا نییە، ئەو تەنها ژێردەستە و دەستەوسان و لاوازە و هیچی تر.

## ۞ هەستی هەژاری بۆ خودا

پاشـان دیمـەنی زەلیلـی و گەردنکەچـی و سـەرکزی و ملکەچـی و هـەژاری بـۆ پەروەردگار–جل جلاله– لە هەموو گەردیلەیەك لە گەردیلەکانی ناوەوە و دەرەوەیدا پێویستی و هەژارییەکی تەواو بۆ پەروەردگار و سەرپەرشتکارەکەی بوونی هەیە، ئەو کەسەی چاکردن و سەرفرازی و هیدایەت و بەختەوەری ئەوی لەدەستدایە، ئەم حاڵە کە بۆ دڵی دروست دەبێت زمان توانای دەربڕینی نییە، تەنها بە بەدەستهێنان مرۆڤ تێیدەگات، شکانێك روو لە دڵی دەکات کە هیچ شتێك پێی ناچێت، خۆی وەك دەفرێکی شکاو دێتە پێش چاو لەژێر پێیاندا، کە هیچ شتێکی تێدا نییە و بەوەوە و لەوەوە هیچ سودێك نابینرێت، کەس حەزی ئەو جۆرە دەفرەی نییە، ئەو بەکاری سوود لێ بینین نەماوە، مەگەر دروستکەرەکەی جارێکی تر دروستی بکاتەوە، ئەو کاتە لەم دیمەنەوە زۆرێك لەوەی لە خوداوە بۆ سەر ئەو دادەبارێت دێتە پێش چاوی، وادەبینێت ئەو شایستەی کەم و زۆری ئەوانە نییە، هەر خێرێك لە خوداوە دەستی بکەوێت زۆر بە گەورە تەماشای دەکات، دەزانێت نرخ و بەهای ئەو لەخوار ئەوەوەیە، تەنها بەزەیی خودا شایستەی یاد کردنە بەو گشتە چاکەیەی لەگەڵی کردووە و بۆی رەوانە کردووە، ئەو کاتە گوێڕایەڵی بۆ پەروەردگار لە نەفسیدا جێگیر دەبێت، کارە چاکەکانی خۆی گەر بە ئەندازەی کاری ئینس و جین بێت هێشتا بە کەمی تەماشا دەکات بۆ پەروەردگاری، ئەو کات کەمی گوناه و یاخیبوونەکانی زۆر لای گەورە دەبێت، ئەو شکانە لە دڵدا هەموو ئەمانەی بۆ بەرهەم دەهێنێت.

چەندە دروستکردنەوە لەو دڵە شکاوەوە نزیکە! چەندە سەرکەوتن و بەزەیی و رۆزی لێیەوە نزیکن، ئەم دیمەنە چەندە بە سوودە بۆی! گەردیلەیەك لەمە و هەناسەیەکی لەلای خودا لە ئەنجامدانی چاکەگەلێك کە وەك چیا وان باشترە، ئەو چاکانەی کەسانی خۆپەسەند و سەرسام بە کار و زانست و حاڵی خۆیەوە ئەنجامیان دەدات و ئاماژە بۆ کارەکانی دەکات، خۆشەویسترین دڵ لەلای خودا ئەو دڵەیە ئەم شکانە رووی تێکردووە و ئـەو زەلیلییە دەستی بەسەردا گرتووە، ئـەو لـە بەردەستی خودا سەرکز و گەردنکەچە، سەری بۆ خودا بەرز ناکاتەوە بەهۆی شەرم و حەیاوە لە پەروەردگاری.

بە هەندێ لە عاریفان وترا ئایا دڵ سوژدە دەبات؟ وتی: بەڵێ، سوژدەیەك دەبات تا رۆژی لیقای خودا سەر بەرز ناکاتەوە، ئەمە بریتییە لە سوژدەی دڵ.

دڵێك ئەم شكانە رووی تێنەكات ئەو سوژدە پێویست و داواكراوە نابات، گەر دڵ ئەم سوژدە مەزنە بۆ خودا ببات هەموو ئەندامەكانی سوژدەی لەگەڵ دەبەن، ئەو كاتە رووی خۆی دەكاتە خودای زیندوو و راگری هەموو بوونەوەر، دەنگ و ئەندامەكان پڕ دەبن لە خشوع، بەندە زەلیل و گەردنكەچ و سەركز دەبێت، روومەتی دەخاتە سەر دەرگای بەندایەتی، بەدڵ چاوەڕوانی پەروەردگار و سەرپەرشتكاری خۆی دەبێت بە چاوەڕووانی كەسێكی زەلیل بۆ خودای عەزیز و رەحیم، لەبەر پەروەردگاری دەپاڕێتەوە بۆی گەردنكەچ و فەرمانبەردار دەبێت و ملكەچ و داواكەری سۆز و بەزەیی دەبێت، ئەو بەدوای رەزامەندی خودادا دەگەڕێت وەك كەسێكی خۆشەویست بەدوای رەزامەندی خۆشەویستەكە و خاوەنەكەیدا، ئەو پەروەردگارەی ناتوانێت لێی بێنیاز ببێت، بەڵكو بوونی ئەو بە بوونی ئەوەوە بەستراوە، هیچ خەمێكی نییە جگە لە خەمی رازیكردنی و گەیشتن بە سۆز و بەزەیی ئەو، چونكە ژیان و سەرفرازی بۆ ئەو بەدەست نایەت مەگەر بە نزیكی و رازیبوون و خۆشەویستی ئەو -سبحانە- دەڵێت: چۆن لە خۆم تووڕەبم بۆ رازیكردنی ئەو؟ چۆن لە كەسێك دووربكەومەوە بەختەوەری و سەرفرازی و سەركەوتنم لە نزیكی و خۆشەویستی و یادی ئەودایە؟

خاوەنی ئەم دیمەنە خۆی وەك پیاوێك دێتە پێش چاو كە لەژێر چاودێری و باڵی بەزەیی باوكیدا بووە، باشترین خواردن و خواردنەوە و پۆشاكی پێبەخشیوە، بە جوانترین شێوە پەروەردەی كردووە، بە پلەكانی كەماڵدا بە تەواترین شێوە سەریخستووە، ئەو باوكە سەرپەرشتی هەموو كار و بەرژەوەندییەكانی كوڕەكەی دەكرد، باوكی بۆ كارێكی پێویستی خۆی كوڕەكەی رەوانە كرد، لە رێگە دوژمنێكی لێ پەیدا بوو، بەدیلی گرت و كۆت و زنجیری كرد، پاشان لەگەڵ خۆی بردی بۆ وڵاتی دوژمنان، بە خراپترین ئازار ئازاری دا، بەپێچەوانەی مامەڵەی باوكی مامەڵەی لەگەڵ دەكرد، ئەو ناو بەناو بیری لە پەروەردە و چاكەی باوكی دەكردەوە، هەر كات بیری لە حاڵی خۆی دەكردەوە ئازار و خەم و مەینەتی لە ناخیدا سەری هەڵدەدا، بیری ئەو رۆژانەی دەكردەوە كە پێشتر تیایدا ژیابوو، هەموو ئەو چاكە و نیعمەتانەی تیایدا تەمەنی بەڕێكرد بوو، لە كاتێكدا ئەو دیل و بەندەی دوژمنەكەی بوو و بەخراپترین شێوە ئازاری دەدا و دەیچەوساندەوە و لە كۆتاییدا دەیویست بیكوژێت لایەكی بەلای وڵاتی باوكیدا كردەوە، باوكی خۆی لە

نزیکەوە بینی، رۆیشت بۆ لای و خۆی خست بەسەر دەست و پێیدا، لەبەر دەستی راکشا و هانا و پەنای بۆ برد: باوکە گیان، باوکە گیان، باوکە گیان، سەیری کوڕەکەت و ئەوەی تێیدا دەژی بکە، فرمێسکەکانی بەسەر گۆنایدا پێشبڕکێیان دەکرد، ئەویش لە ئامێزی گرت و بە خۆیدا نووساند، دوژمنەکەشی لەدووی دەگەڕا، تا هاتە سەری، بینی باوکی لە ئامێزی گرتووە و توند بە خۆیەوە نووساندووە، ئایا دەڵێیت: باوکی لەو حاڵەدا رادەستی دوژمنەکەی بکاتەوە، واز لە کوڕەکەی بهێنێت بۆ دومنەکەی؟ دەبێت گومانت چۆن بێت بە کەسێك لە باوك و دایك بە کوڕەکەیان بە بەزەییترە؟ گەر بەندەیەك بۆ لای ئەو هەڵبێت و لە دەستی دوژمنەکەی رابکات و خۆی بخاتە بەر دەرگای پەروەرگاری و گۆنای بخاتە سەر خاکی بەردەم دەرگاکە و بگری و بڵێت: ئەی پەروەردگار، ئەی پەروەردگار، بەزەیت بە کەسێکدا بێتەوە کە هیچ کەس نییە بەزەیی پیایدا بێتەوە، هیچ کەسێك نییە سەرپبخات جگە لە تۆ، مەئوایەکی پێ ببەخشێت جگە لە تۆ، داڵدەی بدات جگە لە تۆ، هیچ داڵدەیەك بوونی نییە جگە لە داڵدەی تۆ، هەر تۆ پەنای و بۆ لای تۆ هانا دەبرێت.

يا من ألوذ به فيما أؤمله ومن أعوذ به مما أحاذره

لا يجبر الناس عظما أنت كاسره ولا يهيضون عظما أنت جابره

(ئەی ئەو کەسەی لەو شتانەی ئاواتمە پەنای بۆ دەبەم، ئەی ئەو کەسەی لەو شتانەی لێیان دەترسم هانای بۆ دەبەم، ئێسکێك تۆ بیشکێنی خەڵکی ناتوانێت بیگرێتەوە، ئێسکێك تۆ بیگریتەوە کەس ناتوانێت بیشکێنێت)

گەر وردبوویەوە لەم دیمەنە، دڵی داگیر کرد و هەستی پێکرد و تام و شیرینییەکەی چەشت لێیەوە بەرزدەبێتەوە بۆ دیمەنی بەندایەتی و خۆشەویستی، هەروەها تامەزرۆبوون بۆ لیقای خودا و گەشانەوە پێی و خۆشی و سروور و رۆشنبوونەوەی چاو بە خوداوە، دڵ لەگەڵی ئارام دەگرێ و ئەندامەکان خامۆش دەبن و یادی خودا بەسەر زمان و دڵیدا زاڵ دەبێت و ئەوکات بیری خۆشەویستی جێگەی بیری یاخیبوون دەگرێتەوە، ویستی نزیکبوونەوە لە خودا و لە رەزامەندی خودا جێگەی ویستی یاخیبوون و تووڕەکردنی خودا دەگرێتەوە، جووڵەی زمان و ئەندامەکان بە گوێڕایەڵی جێگەی جووڵەیان بە گوناه و یاخبوون دەگرێتەوە، دڵی بە خۆشەویستی خودا پڕبووە،

زمانی بە یادی ئەو پاراو بووە، ئەندامەکان ملکەچی گوێڕایەڵی بوون، ئەو شکانە تایبەتەی دڵ کاریگەری سەرسوڕهێنی لەسەر خۆشەویستی هەیە و زمان ناتوانێت تەعبیری بکات.

لە هەندێ لە عاریفانەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: لە هەرچی دەرگای خێر و چاکەوەیە ویستم بچمە ژوورەوە بۆ خزمەتی خودا، لە دەرگایەکەوە نەچوومە ژوورەوە خەڵکێکی زۆری لە بەردەمدا نەبێت، بۆیە نەمتوانی بچمە ژوورەوە، تا هاتم بۆ دەرگای گەرنکەچی و نیشاندانی هەژاری، بینیم نزیکترین دەرگا و بەرینترین دەرگایە بۆ خزمەتی خودا، قەرەباڵغی و کۆسپ و تەگەرەی لەسەر نەبوو، هەر ئەوەندە پێم نایە بەر دەرگاکەی خودا دەستی گرتم و بردمی بۆ لای خۆی.

**"شيخ الإسلام ابن تيمية"** خوای لێ ڕازی بێت دەیفەرموو: هەر کەس بەختەوەری هەتاهەتایی گەرەکە با دەرگای بەندایەتی بەرنەدات.

هەندێ لە عاریفان دەڵێن: هیچ ڕێگەیەك نزیکتر نییە لە خوداوە بەقەدەر ڕێگەی بەندایەتی.

مەبەست: ئەو گەردنکەچی و شکانە تایبەتەی دڵ پەلی دەگرێت بۆ خزمەتی خودا، دەیخاتە سەر ڕێگەی خۆشەویستی، دەرگایەکی بە ڕوودا دەکرێتەوە کە لە هیچ ڕێگەیەکی ترەوە بۆی ناکرێتەوە، هەرچەند ڕێگاکانی تری چاکە و گوێڕایەڵی دەرگای خۆشەویستی بۆ بەندە دەکاتەوە، بەڵام ئەو دەرگای خۆشەویستییەی گەرنکەچی و نواندنی هەژاری دەیکاتەوە لە پاڵ خۆشەویستیدا، هەروەها بێز کردنەوە لە نەفس و بە کەم تەماشاکردنی کارەکانی خۆ و سەیرکردنی نەفس بە چاوی لاوازی و دەستەوسانی و نەنگی و ناتەواوی، بە جۆرێك کارە چاکەکانی وا دەبینێت وێڵبوون و دەستەوسانی بن، لێرەوە جۆرێکی تر لە سەرکەوتن بەڕوویدا دەکرێتەوە، ڕێبواری سەر ئەم ڕێگەیە نامۆیە لەناو خەڵکی، ئەوان لە شیوێکی تر و ئەمیش لە دۆڵێکی تر، خودا کۆمەککارە و باشترین کەسێکە لە گوناهان ببورێت.

ئەمە ئەو کەسەیە ئاسەواری خۆشەویستی خودای لەسەر دەرکەوتووە، بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە، خۆشحاڵبوونی خودا بە تەوبەی بەندەکەی زمان کۆڵە لە دەربڕینی، خودا تۆبەکارانی خۆشدەوێ و بە تەوبەیان خۆشحاڵ دەبێت.

تا بەندە سەرنجی منەتەكانی خودا بدات لەسەر خۆی پێش گوناهكردن و لە كاتی گوناه كردن و دوای گوناهەكەی، پاشان سەرنجی چاكەی خودا و حیلمی خودا بدات، خۆشەویستی لە دڵیدا سەرهەڵدەدات و تامەزرۆی دیداری دەبێت، دڵ ئەوانەی خۆشدەوێت چاكەی لەگەڵ دەكەن، چ چاكەیەك لەو چاكەیە مەزنترە بە یاخیبوون و گوناه رووبەڕووی ببیتەوە، بەڵام ئەو-سبحانە- بە پێدانی نیعمەت و چاكە لەگەڵ كردن و داپۆشینی گوناهەكانی رووبەڕووی دەبێتەوە؟

باسی تەوبە و ئەحكام و بەروبوومەكانی كورت دەكەینەوە و لەم برە زیاتر درێژەی پێنادەین، درێژەپێدانی بەم ئەندازەیە بە هۆی پێویستبوونی باسی تەوبە و ناسینی ئەحكام و بابەت و دەروازەكانییەوەیە، خودا یارمەتیدەرە بۆ كاری تەوبە و هەستان بە تەوبە بە كردار و حاڵ، وەك چۆن لەڕووی زانست و مەعریفەوە كۆمەككار و یارمەتیدەر بوو، هەر كەس پشتی پێ ببەستێت و هانا و پەنای بۆ ببات زیانۆمەند نابێت، ولا حول ولا قوە إلا باللە.

❁ ❁ ❁

## (٧) (منزلة الإنابة)

# مەنزیلەی گەڕانەوەی بەردەوام بۆ لای خودا

ئەوەت زانی ئەو کەسەی پێ لە مەنزیلەی تەوبە دەنێت و تیایدا دەمێنێتەوە ئەوا پێی لە هەموو مەنزیلەکانی ئیسلام ناوە، تەوبەی کامڵ هەموو ئەوانە لە ئامێز دەگرێت، تەوبەش بۆ خۆی یەکێکە لەو مەقامانە، بەڵام پێویست بوو بە باسکردنی دوور و درێژ تەنها بکرێتەوە تاکو حەقیقەت و تایبەتمەندییەکان و مەرجەکانی ڕۆشن ببنەوە.

کە پێیەکانی لە مەنزیلەی تەوبەدا جێگیر بوون بەدوایدا پێ لە "مەنزیلەی گەڕانەوەی بەرەوام بۆ لای خودا" دەنێت، خودا لە کتێبەکەیدا فەرمانی پێکردووە، وەسفی خۆشەویستەکەی خۆی پێکردووە، دەفەرموێت﴿ وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمْ ﴾ الزمر: ٥٤﴿إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٌ مُّنِيبٌ ﴿٧٥﴾ ﴾ هود: ٧٥، خودای موتەعال هەواڵی داوە کە تەنها ئەوانەی ئەهلی گەڕانەوەن بەڵگە و نیشانەکانی خودا دەبینن﴿ أَفَلَمْ يَنظُرُوٓاْ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا ﴾ ق: ٦ ، تا دەفەرموێت﴿ تَبْصِرَةً وَذِكْرَىٰ لِكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ ﴿٨﴾ ﴾ ق: ٨ ﴿وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ ﴾ غافر: ١٣ ، هەروەها خودای موتەعال دەفەرموێت﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُنَزِّلُ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ رِزْقًا وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ ﴾ غافر: ١٣، هەروەها﴿مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَٱتَّقُوهُ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ الروم: ٣١.

وشەی (منيبين) لە حاڵەتی "نصب" دایە چونکە "حال"ە بۆ ئەو جێناوە شاراوەی کە لە وشەی (فأقم وجهك)، واتە بکەری فرمانی "أقم"، چونکە ئەم گوتارە ڕوو بە پێغەمبەر و ئومەتەکەیەتی، واتە ماناکەی بەم جۆرە لێکدەدرێتەوە "**أقم وجهك أنت و أمتك منيبين إليه**"، هاوشێوەی ئەمە ئایەتی ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ ﴾ الطلاق: ١، دەگونجێ "حال" بێت بۆ بەرکاری "الناس" لە "**فطر الناس عليها**"دا، واتە ماناکەی "**فطرهم منيبين إليه**"، گەر خۆیان بدەنە دەست فیترەتیان ئەوا لە گەڕانەوە بۆ لای خودا لانادەن، بەڵام گۆڕانیان بەسەر ئەوەدا هێناوە کە خودا فیترەتیانی لەسەر بارهێنابوو، وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((**ما من مولود إلا يولد على الفطرة–وفي**

الروايـة علـى الملـة- حتـى يعـرب عنـه لسـانه))، لەسـەر داوود پێغەمبـەر دەفـەرموێت ﴿ فَٱسۡتَغۡفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّۤ رَاكِعࣰا وَأَنَابَ ۝٢٤ ﴾ ص: ٢٤، رایگەیاندووە کە پاداشت و بەهەشتی بۆ ئەهلی ترس و گەڕانـەوەی بەردەوامـە بـۆ لای خـودا ﴿ وَأُزۡلِفَتِ ٱلۡجَنَّةُ لِلۡمُتَّقِينَ غَيۡرَ بَعِيدٍ ۝٣١ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ ۝٣٢ مَّنۡ خَشِيَ ٱلرَّحۡمَٰنَ بِٱلۡغَيۡبِ وَجَآءَ بِقَلۡبٍ مُّنِيبٍ ۝٣٣ ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ﴾ق: ٣١ – ٣٤ ، مژدە لە خوداوە بۆ ئەهلی گەڕانەوەیە ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱجۡتَنَبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ أَن يَعۡبُدُوهَا وَأَنَابُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ ﴾ الزمر: ١٧

گەڕانـەوەی بـەردەوام دوو گەڕانەوەیـە: گەڕانـەوە بـۆ لای پـەروەردگاریی خـودا کـە بریتییە لە گەڕانەوەی تەواوی دروستکراوەکان، تیایدا بێبـاوەڕ و بـاوەڕدار بەشـدارن، ﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلنَّاسَ ضُرࣱّ دَعَوۡاْ رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيۡهِ ﴾ الـروم: ٣٣ ، ئەمـە گشـتییە بـۆ هـەموو بانگکـەرێك کـە رووبـەڕووی زیـان دەبێتـەوە، وەك چـۆن لـە واقیعـدا دەبینرێـت، ئـەم گەڕانەوەیە مەرج نییە موسـڵمانبوونی لەگـەڵ بێـت، بـەڵکو جـاری وایـە هاوەڵـدانان و بێباوەڕی لە خۆیـدا کۆدەکاتـەوە، وەك خـودای موتـەعال لەمـەڕ ئەوانـە دەفـەرموێت ﴿ ثُمَّ إِذَآ أَذَاقَهُم مِّنۡهُ رَحۡمَةً إِذَا فَرِيقࣱ مِّنۡهُم بِرَبِّهِمۡ يُشۡرِكُونَ ۝٣٣ لِيَكۡفُرُواْ بِمَآ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ ﴾ الـــروم: ٣٣ – ٣٤، ئەمەیە حاڵی ئەو کەسانە دوای گەڕانەوەکەیان.

گەڕانەوەی دووەم: بریتییە لە گەڕانەوەی دۆستانی خودا بۆ لای خـودا و ملکەچبوون و رووتێکردن و پشکردن لە هەرچی شت و کەسە جگە لە خودا، هیچ کەس شایسـتەی ناوی "منیب" نابێت تا ئەم چوار سیفەتەی تێدا کۆنەبێتـەوە، تەفسـیری پێشـین بـۆ ئەم وشەیە بە دەوری ئەم چوارەدا دەسوڕێتەوە.

لە وشەکەدا مانای پەلەکردن و پێشکەوتنی تێدایـە، "المنيـب إلى الله" واتـە کەسـێکی پەلەکەر لە گەڕانەوە بۆ لای رەزامەندی خودا، لە هەموو کاتێکدا بۆ لای دەگەڕێتـەوە، لەو شتانەی خودا پێی خۆشە پێشکەوتووە، لە زمانەوانیدا وشەکە مانای "الرجوع"ی هەیە، لێرەدا بریتییە لە گەڕانەوە بۆ حەق.

شێخی هەروی دەڵێت: ((بریتییە لە سێ شت: گەڕانەوە بۆ لای حەق بۆ خۆچـاککردن، وەك چۆن بۆ لای دەگەڕێتەوە و پاساو و بیانووی بۆ دەهێنێتەوە، هەروەها گەڕانـەوە بۆ لای بە حاڵ، وەك چۆن بـە وەڵامدانـەوە بـۆ لای گەڕاوەتـەوە))، واتـە کـە تۆبـەکار گەڕاوەتەوە بۆ لای خودا بە پاساو هێنانەوە و دەستگرتنەوەی لە گوناه و خراپەکانی

ئـەوا تەواوکـەری ئـەوە بریتییـە لـە گەڕانـەوە بـۆ لای خـودا بـە کـار و تێکۆشـان و گەردنکەچـی تـەواو لـە گوێڕایەڵیـدا، وەك ئایـەتی ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا ﴾ الفرقان: ٧٠ ، هەروەها﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصْلَحُواْ ﴾ البقرة: ١٦٠، تەوبە کـردن و دەست بەتاڵی سوودی نییە، دەبێ تەوبە و کرداری چاکە بـوونی هـەبێت، وازهێنـان لە کارە خراپەکان و رووکردنە کارە چاکەکان و خۆشەویستەکان، خـۆی لـە گونـاه و یاخیبوون خاڵی دەکاتەوە و بە گوێڕایەڵی خۆی دەڕازێنێتەوە.

هەر بەو جۆرە گەڕانەوە بـۆ لای خـودا بـە وەفـاکردن بـە بەڵێنەکانییـەوە، وەك چـۆن گەڕایتەوە بۆ لای لە کاتی وەرگرتنی بەڵێنـدا، گەڕایتـەوە بـۆ لای بـە چـوونە ژوورەوە لەژێر پەیمانەکەیدا یەکەمجار، بۆیە لەسـەرتە بـۆ جـاری دووەم بگەڕێیتـەوە بـۆ لای و وەفا بکەیت بەوەی پەیمانت دابوو لەسەری، ئایین هەر هـەموو پـەیمان و وەفادارییـە، خودا پەیمانی گوێڕایەڵی لێ کردن بۆ خـۆی وەرگرتـووە لـە "داوالێکـراوان"، پـەیمانی خـۆی لـە پێغەمبـەران وەرگرتـووە لەسـەر زمـانی فریشـتەکانی، یـان راسـتەوخۆ لـە خۆیەوە بـۆ پێغەمبەرەکـە وەك چـۆن قسـەی لەگـەڵ موسـا کـرد، پـەیمانی خـۆی لـە ئوممەتان وەرگرتووە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکانی، پەیمانی خۆی لە خەڵکانی نـەزان وەرگرتـووە بـەهۆی زاناکانـە، لـە نـەزانان پـەیمانی فێربـوون و لـە زانایـان پـەیمانی نیعمەت، مەدحی وەفاداران بە پەیمانەکانی دەکات، هەواڵیداوە بـەوەی لەلایـەتی لـە پاداشت بۆ وەفاداران ﴿ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيْهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٠﴾ ﴾ الفـتح: ١٠ ﴿ وَأَوْفُواْ بِٱلْعَهْدِ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا ﴿٣٤﴾ ﴾ الإسـراء: ٣٤﴿ وَأَوْفُواْ بِعَهْدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمْ ﴾ النحل: ٩١﴿ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُواْ ﴾البقرة: ١٧٧

ئەمەش وەفاداربوون بەو پەیمانەی لەگەڵ خودا بەستوویانە دەگرێتەوە، بـە ئـیخلاص و باوەڕ و گوێڕایەڵی کردن لێی، هەر بەو جۆرە پارێزگاری لە پەیمان لەگەڵ خەڵکیدا.

پێغەمبەر رایگەیاندووە کە لە نیشانەکانی دووڕوویی بریتییە لە غەدر لە دوای بەستنی پەیمان (الغدر بعد العهد)

کەسێك بۆ لای خودا نەگەڕاوەتەوە غەدر و ناپاکی لە پەیمانەکـەی کردبێـت، هـەروەك چۆن نەگەڕاوەتەوە بۆ لای خودا گەر نەچێتە ژێر پەیمانەکەیەوە، گەڕانەوە دەستەبەر دەبێت بە پابەندبوونی پەیمانەکەی و وەفاداری پێی.

ئەوەش كە دەڵێت ((گەڕانـەوە بـۆ لای بـە "حـاڵ" وەك چـۆن گەڕایتـەوە بـۆ لای بـە وەڵامدانەوە))، واتە ئەو–سبحانە– بانگی لێكردی و تۆش بە وتـنی "لبیـك و سـعدیك" وەڵامت دایەوە، بۆیە دەبێـت بـە "حـاڵ"یش وەڵامـی بدەیـەوە، حاڵەكـەت قسـەكەت بەڕاسـت بگـەڕێنێت، چـونكە حـاڵ یـان قسـە بەڕاسـت دەگـەڕێنێت، یـان بـە درۆی دەردەكات، هەموو قسەیەك بـۆ راسـتی و درۆیـی شـایەتێكی لـە حـاڵی قسـەكەردا بـۆ هەیە، وەك چۆن بـە قسـە وەڵامـی خـودات دایـەوە، ئـاواش بـە حـاڵ وەڵامـی خـودا بدەرەوە، حەسەن دەڵێت: ئەی رۆڵەی ئادەم، قسە و كردارت بـۆ هەیـە، كردارەكانـت بۆ تۆ لە پێشترن لە قسەكانت، شاراوە و ئاشكرات هەیـە، شـاراوەكانت زیـاتر مـوڵكی تۆن لە ئاشكراكانت.

### ۞ گەڕانەوەی چاكسازی

دەڵێت ((گەڕانەوە راوەستان پەیدا دەكات بە چاكسازی لە سێ شتدا: بـە دەرچـوون لە دەرئەنجامە ناباشەكانی گوناه، و ئازار بۆ هەڵە و تێكەوتنەكان و، و پیاراگەیشـتنی لەدەستچووەكان))

دەرچوون لە دەرئەنجامـە خراپـەكانی گونـاه بـە تەوبـەكردن دەبێـت لـە گونـاه، ئـەو گوناهانەی لەنێوان مـرۆڤ و خـوداداان و گەڕانـەوەی مـاف بـۆ خـاوەن مافـەكان ئەگـەر گوناههەكە مافی مرۆڤی تری لەسەر بوو.

پاشان ئازار دەچێژێت بـۆ ئـەو هەڵـە و خراپانـەی كـە لێـی دەوەشـێتەوە، دڵـی ئـازار دەخـوات و ژان دەكـات، ئـەوەش بەڵگـەی گەڕانەوەیـە بـۆ لای خـودا، بەپێچـەوانەی ئەوانەی دڵیان بە گوناه هیچ ئازار و ژانێك ناخوات، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر تێكچوونی دڵ و مردنی.

هەر بەو جۆرە ئازار دەخوات بە هەڵـە و گونـاه و تێكەوتنـەكانی براكـەی، تەنانـەت وا هەست دەكات ئەو هەڵەكانی پێ ئەنجامداوە و پێی خۆشحاڵ نابێت، ئەوەش بەڵگەی نەرمی دڵ و گەڕانەوەیەتی بۆ لای خودا.

ئەو دوانە بە "پیاراگەیشتن بە لەدەستچووەكان" تـەواو دەبـن، ئـەوەش پیاگەیشـتنە بەوەی لە دەستی چووە لە كاری خێر و چاكە و گوێڕایەڵی و نزیكبوونـەوە لـە خـودا،

یان باشتر لەوانە بە تایبەت لەو بەشەی تەمەن کە ماوە، لە نزیکبوونەوەی کۆچکردنی بۆ لای خودا، ئەوەی ماوەتەوە لە تەمەنی لە باوەڕدار بەها و نرخی نییە گەر بەوەی نەدەست چووە پیاڕانەگات و ئەوەی مراندوویەتی زیندووی نەکاتەوە.

## ❁ گەڕانەوە وەفادارییە بە پەیمان

دەڵێت ((گەڕانەوە راوەستان پەیدا دەکات بە پەیمانداری و وەفاداری بە سێ شت: بە رزگاربوون لە چێژی گوناه، و بە وازهێنان لە سووکایەتی بە ئەهلی بێئاگایی بەهۆی ترسان لەسەر ئەنجامیان و رجای زۆر بۆ خۆ، هەروەها بە پشکنینی هۆی ئەنجامدانی خزمەت و چاکەکانت))

مرۆڤ کە گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگاری بۆ پاڵفتە دەبێت، لە بیری چێژوەرگرتن لە گوناه رزگاری دەبێت، هەر کات یادی دەکاتەوە و دەیهێنێتەوە بیری خۆی جێگەی گوناه بە ئازار و ژان دەگیرێتەوە، تا چێژی بیری گوناه لە دڵدا بوونی هەبێت گەڕانەوەکەی بۆ لای خودا پاڵفتە نەبووە.

گەر بوترێت: کام حاڵیان باڵاترە؟ حاڵی کەسێك چێژی گوناه لە دڵیدا دەبینێت و لەبەر خودا تێکۆشانی لەگەڵ دەکات و لەبەر ترس و خۆشەویستی و شکۆی خودا دەستبەرداری دەبێت، یان حاڵی ئەو کەسەی چێژی گوناه لە دڵیدا مردووە و جێگەی بە ئازار و ژان و دڵنیایی بۆ لای پەروەردگار و ئارامی و چێژوەرگرتن لە خۆشەویستی و بەهرەمەندبوون لە یادی خودا گیراوەتەوە؟

وتراوە: حاڵی ئەم کەسی دووەمەیان کامڵتر و بەرزترە، ئامانجی ئەو کەسەی لەگەڵ دڵی تێدەکۆشێت ئەوەیە بگاتە مەقام و مەنزیلەی ئەم کەسەی دووەم، بەڵام لە پلە و پایە و نزیکیدا لەدوای کەسی دووەمەوەیە.

گەر بوترێت: ئەی پاداشتی تێکۆشانی کەسی خاوەن چێژ و دەستبەردار لێی لەبەر خۆشەویستی خودا و هەڵبژاردنی رەزامەندی ئەو بەسەر حەز و ئارەزووکاندا لە کوێیە؟ بەم تێڕوانینە لەلای ئەهلی سوننەت مرۆڤ باشتر و چاکترە لە فریشتەکان، ئەوان باشترین دروستکراوێکن، بەڵام کەسی دڵنیا لە ئازاری تێکۆشان رزگاری بووە و

تەندروستی رووی لە دڵی کردووە، جیاوازی نێوان ئەو دوو کەسە وەك جیاوازی مرۆڤێکی تووشبوو بە بەڵا و مرۆڤێکی ئاسوودە و بێبەڵا وایە.

وتراوە نەفس سێ حاڵی هەیە: فەرمان کردن بە گوناه، و پاشان لۆمەکردن لەسەری و پەشیمانی لێی، و لە کۆتایشدا ئارامی و دڵنیایی بۆ لای پەروەردگار و روو تێ کردنی، ئەم حاڵی سێیەمە باڵاترین و بەرزترین حاڵیانە، ئەو حاڵەیە تێکۆشەران خۆیانی بۆ ئامادە دەکەن و هەوڵی بۆ دەدەن، ئەوەی بەدەستی دەهێنێت لە پاداشتی تێکۆشان و ئارامگرتنەکەی بۆ ئەوەیە بگات بە پلەی دڵنیایی و پاڵدانەوەی دڵ بەلای خوداوە، ئەو وەك کەسێك وایە رێگەی چۆڵی پڕ ترسی سارای گرتبێتە بەر تاکو بگاتە ماڵی خودا(کەعبە) دڵی ئارام بگرێت و تەواف بە دەورەدا بکات، ئەویتریان وەك کەسێك وایە لە کەعبەدا سەرقاڵە و نوێژ و تەواف دەکات و سوژدە و رکوع دەبات، لا بەلای هیچ شتێکی تردا ناکاتەوە، ئەمەیان بە ئامانجەوە سەرقاڵە و ئەویتریان بە هۆکارەوە، هەردووکیان پاداشتی خۆیان هەیە، بەڵام لە نێوان پاداشتی ئامانجەکان و پاداشتی هۆکارەکاندا جیاوازییەکی گەورە هەیە.

ئەوەی بۆ کەسی دڵنیا بەدیدێت لە ئەحواڵ و بەندایەتی و باوەڕ لەسەروو ئەو پلانەوەیە کە بۆ کەسی تێکەشەر لەگەڵ نەفسی –لە پێناوی خودادا– بەدیدێت، با کرداری زۆرتری هەبێت، رێز و گەورەیی کرداری کەسی دڵنیا و ئارام و گەڕاوە بۆ لای خودا بە شێوەیەکی گشتی و لەڕووی چۆنێتییەوە مەزنترە، هەرچەند کەسە تێکۆشەرەکە کردارەکانی زۆرترن، ئەوە فەزڵێکە لە خوداوە بە هەر کەسێکی دەدات کە بیەوێت، ئەبوبەکری صدیق بە زۆری کردار پێش هاوەڵان نەکەوتبوو، چونکە لەناو یاراندا کەسانێك هەبوون لە ئەو زیاتر رۆژ و حەج و خوێندنەوەی قورئان و نوێژیان هەبوو، بەڵکو بە کارێکی تر کە دڵی پێی هەڵدەستا، تەنانەت باشترین هاوەڵی پێغەمبەر پێشبڕکێی لەگەڵ دەکرد، بەڵام هەمیشە صدیقی لەپێشەوە دەبینی.

بەڵام بەندایەتی کەسی تێکۆشەر لەگەڵ نەفسی خۆی لەسەر چێژی گوناه و حەز و ئارەزوو لەوانەیە گرانتر بێت، گرانتر نابێتە هۆی باشتر بوون و باڵاتربوون لە پلەدا، باشترین کردار باوەڕ بە خودایە، تێکۆشان گرانترە لە باوەڕ بە خودا کەچی بەدوایدا دێت لە پلە و پایەدا، پلەی صدیقان باڵاترە لە پلەی تێکۆشەران و گەواهیدەران.

### ترس.... بەبێ رەشبینی

لە نیشانەکانی گەڕانەوە بۆ لای خودا: وازهێنانە لە سوکایەتی کردن بە ئەهلی بێئاگایی، ترسان لە سەرئەنجامیان و کردنەوەی دەرگای رجا بەڕووی نەفسی خۆتدا، هیوای بەزەیی بۆ نەفسی خۆت دەخوازیت، بەڵام ناخۆشی و سزا بۆ ئەهلی بێئاگایی وێنا دەکەیت، راستییەکەی ئەوەیە دەبێت بەزەیی بۆ ئەوان رجا بکەی و لە نەفسی خۆشت بترسیت رووبەڕووی سزا ببێتەوە، گەر پێویست بێت سوک سەیریان بکەی و رقت لێیان ببێتەوە بەهۆی دەرکەوتنی حاڵیانەوە بۆت و بینینی ئەوەی ئەوان تێیکەوتوون، ئەوا رقت لە نەفسی خۆت با زۆرتر و زیاتر بێت تا لەوان، رجات بە بەزەیی خودا بۆ ئەوان لە رجات بۆ خۆت پێ نزیکتر بێت.

هەندێ لە پێشین دەڵێن: ئاگایی و تێگەیشتنی تەواوت نابێت تا لەبەر خودا رقت لە کردەوەی خراپی خەڵکی نەبێتەوە، پاشان بگەڕێیتەوە بۆ لای نەفسی خۆت و زۆر زیاتر لەوەی خەڵکی رقت لێی ببێتەوە.

ئەم قسەیە تەنها شارەزایان و ئاگادارانی ئایین لە ماناکەی تێدەگەن، هەر کەس حەقیقەتی دروستکراو و دەستەوسانی و لاوازی و کەموکوڕیی ببینێت، بەڵکو کەم رەوی و تیابردنی حەقی خودا و رووکردنە کەسانێك لە خوارخوداوە، و فرۆشتنی بەشی خۆیان لەلای خودا بە شتێکی کەمی دونیایی ببینێت دەبێت رقی لێیان بێت، چونکە جگە لەوە چارەیەکی تری نییە، بەڵام کە دەگەڕێتەوە بۆ لای نەفسی خۆ و حاڵ و کەموکورتییەکەی و سەرنجدانی بە بینینی رۆشن، ئەوا رقی زۆرتر و سووك تەماشاکردنی زیاتر بۆ نەفسی خۆیەتی، ئەم کەسەیە دەبێتە فەقیه.

پشکنین بۆ بینینی هۆی ئەنجامدانی کاری خێر و چاکە و ئەوەی تێکەڵی دەبێت لە حەزی دەروون و جیاکردنەوەی مافی خودا لە بەشی دەروون. لەوانەیە زۆرینەی–یان لەوانەیە هەموو– کاری خێر و چاکە بەشی دەروون بێت و تۆ پێی نەزانیت.

پەنا بە خودا دەبێ چەند دەرد و نەخۆشی و مەرام و بەشی دەروون لە ناخدا بوونی هەبێت و رێگرین لەوەی کار و کردەوەکان تەنها بۆ خودا بن و بگەنە خودا! بەندە جاری وایە کردارێك ئەنجام دەدات و هیچ مرۆڤێك پێی نازانێت و بە پاکیش بۆ خودا ئەنجام نەدراوە، یان کردارێك ئەنجام دەدات و چەندین چاوی لەسەرە و بۆ خودای

موتەعال ئەنجامی داوە، تەنها ئەهلی بینینی رۆشن و پزیشكی دڵان و زانایان بە دەرد و دەرمان دەتوانن ئەم دووانە لەیەكتر جیا بكەنەوە.

لە نێوان كردار و دڵدا دوورییەك بوونی هەیە، لەسەر ئەو دوورییە كۆمەڵێك رێگر هەن ناهێڵن كار بگاتە دڵ، بۆیە كەسەكە كرداری زۆری هەیە و خۆشەویستی و ترس و رجا ناگاتە دڵی، هەر بەو جۆرە نە زوهد لە دونیا و نە حەز بۆ دواڕۆژ و نە نوور بۆ جیاكردنەوەی دۆستانی خودا و دوژمنانی خودا و جیاكردنەوەی حەق لە باتڵ و هەروەها نەبوونی هێز و پێز لە كاروبارەكانیدا بوونی نییە، گەر كاریگەری كار و كردەوەكان بگەنە دڵی ئەوا نووورانی دەبێت و روناك دەبێتەوە و حەق و باتڵ دەبینێت و ئەولیای خودا و دوژمنی خودا لەیەكتر جیادەكاتەوە، و حاڵی زۆرتر و زیاتر بەو هۆیەوە بۆی دەستەبەر دەبێت.

پاشان لە نێوان دڵ و پەروەردگاردا دوورییەك بوونی هەیە، كۆمەڵێك رێگر هەن رێگرن لە گەیشتنی كردارەكان بە خودا، لە لوتبەرزی و خۆپەسەندی و ئاماژەكردن بە كاروكردەوەكانی و لەبیرچوونەوەی منەتی خودا و كۆمەڵێك هۆی شاراوە گەر پشكنینی بۆ بكات و بەدوایدا بڕوات شتی سەیر و سەمەرە دەبینێت، لە بەزەیی خودا ئەوەیە كە زۆربەی كاركەرانی داپۆشیوە، چونكە گەر ببینن و تەماشای بكەن دەكەونە ناو خراپتر لەوانە، لە بێهیوایی و رەشبینی و دەستەئەژنۆیی و وازهێنان لە كار و خامۆشبوونی لێبڕان و خاوبوونەوەی هیممەت، بۆیە كاتێك كتێبی "الرعاية"ی حاریسی موحاسیبی دەركەوت و عابیدان پێیەوە سەرقاڵ بوون، مزگەوتەكانیان چۆڵ كرد كە كاتی خۆی بە بەندایەتی ئاوادانیان كردبوونەوە، پزیشكی لێزان دەزانێت چۆن چارەسەری دەروونەكان دەكات، قەسرێك ئاوەدان ناكاتەوە و میسرێك بڕوخێنێت.

## ۞ دەبێت حاڵێك بوونی هەبێت گوفتار بەڕاست دەربكات

گەڕانەوە لە رووی حاڵەوە بە سێ شت دێتە راستە: بێهیوابوون لە كارەكەت، و بینینی ناچاری خۆت، و بینینی لوتفی خودا بە خۆت.

بێهیوا ببە لە رزگاربوون بە هۆی كردارەكانتەوە، تەنها رزگاربوون بەهۆی بەزەیی و فەزڵ و گەورەیی خوداوەیە، وەك لە فەرموودەی سەحیحدا لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)

فەرموویەتی ((كردارەكان هیچ كام لە ئێوە رزگار ناكات، وتیان: تۆش ئـەی پێغەمبـەری خودا؟ فەرمووی منیش، مەگەر خودا نوقمی بەزەیی و فەزڵی خۆیم بكات)).

"بینینی ناچاری" ئەوەیە كاتێك لە كارەكانی بێهیوا دەبێت دەبینێت خودای موتەعال لە زاتی خۆیدا دەوڵەمندە، دەوڵەمەندی وەسفێكی زاتییە بـۆ پـەروەردگار، هـەژاری و پێویستی و ناچاریی سیفەتێكی زاتییە بۆ بەندە.

شیخ الإسلام إبن تيية –قدس الله روحه– دەفەرموێت:

هەژاری بۆ من وەسفی خودێكە كە بە هەمیشەیی لەگەڵیدایە، وەك چۆن دەوڵەمەنـدی بە هەمیشەیی وەسفی زاتی خودای موتەعالە.

پێویستە بەندە لە دوای ئەوە "سەرنجی لوتفی خودا بدات"، بزانێت هەموو ئـەوەی ئـەو تێیدایە و ئەوەی هیوای بۆ دەخوازێ و ئەوەی پێی دراوە لوتفە لـە خـوداوە و منەتێكـە خودا بە بەندەكانی بەخشیوە، چاكەیە بـەبێ بەرانبـەر خـودا بـەوی بەخشیوە، خـودا چاكەكارە بە بەخشینی هۆ و دەرئەنجامەكان، هەموو كارەكـان لـە رابـردوو و داهـاتوو و ئێستادا بۆ خودایە، ئەو–سبحانە– "الأول و الآخر، لا إله غيره، ولا رب سواه".

❁ ❁ ❁

## (٨) (منزلة التذكر)

# مەنزیلەی بەیادهاتنەوە

پاشان دڵ پێ دەنێتە مەنزیلەی "بەیادهاتنەوە" کە هاودەمی گەڕانەوەی بەردەوام (الإنابة)یە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾﴾ غافر: ١٣ ﴿تَبْصِرَةً وَذِكْرَىٰ لِكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ ﴿٨﴾﴾ ق: ٨، ئەوەش (ذکری) لە تایبەتمەندییەکانی خاوەن ژیری و ناوەڕۆکە ﴿إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُوا الْأَلْبَابِ ﴿٩﴾﴾ الزمر: ٩ ﴿وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾﴾ غافر: ١٣

بەیادهاتنەوە(التذكر) و بیرکردنەوە(التفكر) دوو مەنزیلەن جۆرەکانی مەعریفە و حەقیقەتەکانی باوەڕ و ئیحسان لە باوەڕدا بەرهەم دەهێنن، خوداناس کەسێکە بەردەوام بە "بیرکردنەوە"کەی دەگەڕێتەوە بۆ سەر "یادهێنانەوە"کەی، هەروەها بە "یادهێنانەوە"کەی دەگەڕێتەوە بۆ سەر "بیرکردنەوەکەی"، تا قوفڵی دڵ بە مۆڵەتی ئەو کەسەی والآکاری زانا "الفتاح العليم"ە دەکرێتەوە، شێخ "الحسن البصري"دەفەرموێت: بەردەوام ئەهلی زانست بە یادکردنەوە دەگەڕێنەوە بۆ سەر بیرکردنەوە، و بەبیرکردنەوە بۆ سەر یادکردنەوە، زۆر لە دڵ دەکەن قسە بکات تا دەیهێننە قسە.

یادهاتنەوە یاخود یادکردنەوە"التذكر" لەسەر کێشی "التفعل"ە لە "الذكر"ەوە–یاد– وەرگیراوە کە پێچەوانەکەی "النسيان"ە–لەبیرچوون، کەوابوو یادکردنەوە"التذكر" بریتییە لە ئامادەکردنی وێنەی یادکراوی زانستی لە دڵدا، بینای "التفعل"ی بۆ هەڵبژێرراوە لەبەر بەدەستهێنانی لەدوای ماوەیەك لە زەمەن و پلەبەندی (مهلة وتدرج)، هەروەك "التبصر، والتفهم، والتعلم"کە لەسەر هەمان کێش و مانان.

مەنزیلەی یادکردنەوە(التذكر) لە بیرکردنەوە(التفكر) بریتییە لە مەنزیلەی بەدەستهێنانی ئەوەی بەدوایدا دەگەڕێیت لە دوای پشکنین، بۆیە ئایاتی خوێنراو و بینراو بریتییە لە یادخستنەوە(ذکری)، وەك لە ئایاتی خوێندراودا هاتووە ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْهُدَىٰ وَأَوْرَثْنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ الْكِتَابَ ﴿٥٣﴾ هُدًى وَذِكْرَىٰ لِأُولِي

ﭐﻷَﻟۡﺒَٰﺐِ ﴿٥٤﴾ ﴾ غافر: ٥٣ – ٥٤، دەربارەی قورئان دەفەرموێت ﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَذۡكِرَةٞ لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ ﴾ الحاقة: ٤٨، دەربارەی ئایاتی بنراو دەفەرموێت ﴿ أَفَلَمۡ يَنظُرُوٓاْ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوۡقَهُمۡ كَيۡفَ بَنَيۡنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٖ ﴿٦﴾ وَٱلۡأَرۡضَ مَدَدۡنَٰهَا وَأَلۡقَيۡنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ ﴿٧﴾ تَبۡصِرَةٗ وَذِكۡرَىٰ لِكُلِّ عَبۡدٖ مُّنِيبٖ ﴿٨﴾ ﴾ ق: ٦ – ٨

بۆیە "التبصرة" بریتییە لە ئامراز یان ئامێری بینین، "التذكرة"ش بریتییە لە ئامراز یان ئامێری یاد، هەردووکیانی کۆکردۆتەوە و کردوونی بە سیفەتی ئەهلی گەڕانەوە بۆ لای خودا(الإنابـة)، چـونکە ئـەو کەسـەی دەگەڕێتــەوە بـۆ لای خـودا شـوێنی بەڵگـە و نیشـانەکان دەبینێـت، دەیانکاتـە بەڵگـە لەسـەر ئەوانـەی دەبنـە ئایـات بـۆ خـودای موتەعال، بۆیە پشتهەڵکردن –بە گەڕانەوە بۆ لای– کۆتایی پێ دێت، هەر بەو جۆرە کـوێری بـە بیـنین و بێئاگـایی بـە یادکردنـەوە نامێنێـت، چـونکە بیـنین وێنـەی ئاماژەبۆکراو لە دڵدا بەرهەم دەهێنێت دوای بێئاگایی لێی، بۆیە ڕێکخسـتنی ئـەو سـێ مەنزیلەیە باشترین ڕێکخستنە، پاشان هەریەك لەوانە دوانەکەی تر پاڵپشتی دەکـەن و بەهێز و بە بەرهەمیان دەکەن.

خودای موتـەعال دەفـەرموێت ﴿ وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّن قَرۡنٍ هُمۡ أَشَدُّ مِنۡهُم بَطۡشٗا فَنَقَّبُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ هَلۡ مِن مَّحِيصٍ ﴿٣٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكۡرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلۡبٌ أَوۡ أَلۡقَى ٱلسَّمۡعَ وَهُوَ شَهِيدٞ ﴿٣٧﴾ ﴾ ق: ٣٦ – ٣٧

**خەڵكی سێ جۆرن:** كەسێكی دڵ مردوو، كەسێكە كە دڵی نییە، ئەو كەسە ئەم ئایەتە نابێتە یاد بۆی.

**دووەم:** كەسێك دڵێكی زیندووی ئامـادەی هـەڵگرتووە، بـەڵام گـوێ بـۆ ئایـاتی خـوێنراو ناگرێت كە خودای موتەعال لە ڕێگەیانەوە هەواڵ لەمەڕ ئایاتی بینراو رادەگەیەنێت، یان بەهۆی باس نەكردنیانەوە، یاخود بەهۆی ئەوەی بەدەستی نەگەیشتووە، دڵی بـە شـتی ترەوە خەریك بووە و لە ئایاتەكان بێئاگابووە، ئەو كەسە دڵی بزرە و ئامادە نییە، ئـەم جۆری دووەمەش یاد بەدەست ناهێنێت، لەگەڵ بوونی ئامادەیی و بوونی دڵ.

**سێیەم:** پیـاوێكی دڵ زینـدووی ئامـادە، ئایـاتی بەسـەردا خوێنراوەتـەوە، گـوێی بـۆ گرتووە، گوێی بۆ هەڵداون و دڵی ئامادە بووە، ئەوەی گوێی لێبووە بە تێگەیشـتنەوە گوێی بۆ گرتووە، ئەو دڵئامادەیە، گوێهەڵخەرە، ئەم بەشی سێیەمەیە سوود لە ئایاتی خوێنراو وبینراو دەبینێت.

یەکەمیان وەك پیاوێکی کوێر وایە کە نابینێت.

دووەمیان وەك پیاوێك وایە کە دەبینێت بەڵام رووی لە شوێنێك کردووە کە شوێنی بینینەوەی راستییەکان نییە، بۆیە هەردووکیان (یەکەم و دووەم) کوێرن.

سێیەم وەك کەسێکی چاوساغ وایە کە رووی کردۆتە شوێنی مەبەست، چاویشی دوای ئاراستەکەی(رووگەکەی) کەوتووە، رووبەرووی وەستاوە لەسەر میانەگیری لە دووری و لە نزیکی، چونکە نزیکی زۆریش دیسان نەبینینە، ئەمە ئەو کەسەیە دەبینێت.

پاکێتی بۆ ئەو خودایەی کەلامی خۆی کردووە بە شیفای ئەوەی لە سنگدا شاراوەتەوە.

گەر بوترێت مانای وشەی ((أو)) لە ئایەتەکەدا(أَوۡ أَلۡقَى ٱلسَّمۡعَ وَهُوَ شَهِيدٞ ) چییە لەم رێکخستنەی تۆ بڕیارت لەسەر داوە؟

وتراوە: نهێنییەکی زۆر وردی تێدایە، ئێمە نالێین "أو" بە مانای "واو" هاتووە، وەك "نەحوزان"ە رووالەتییەکان دەیلێن.

بزانە هەندێ جار کەسێك دەبێتە خاوەنی دڵێکی گەش و گەرم، پڕ دەبێت لە دەرهێنانی پەند و حیکمەت، ئەم کەسە دڵی دەیخاتە ناو یادکردنەوە و پەند وەرگرتن، کە ئایاتی بیست دەبێت بە نوور لەسەر نوور، ئەوانە کامڵترین دروستکراوی خودان، مەزنترین باوەڕ و بینینی رۆشنیان هەیە، تەنانەت ئەوەی پێغەمبەر هەواڵیان پێ دەدات وەك ئەوەیە بینیبێتیان.

خاوەنی ئەم دڵە (لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلۡبٌ ) کە ئایات دەبیستێت -و لە دڵیدا نووری بەصیرەت بوونی هەیە- نووری زیاتر دەخاتە سەر نوورەکەی، گەر کەسەکە خاوەنی ئەم دڵە نەبوو ئەوا گوێ هەڵدەدات و دڵی ئامادە دەبێت و بزر نابێت (أَوۡ أَلۡقَى ٱلسَّمۡعَ وَهُوَ شَهِيدٞ ) ئەمیش دیسان یادکردنەوە بەدەست دەهێنێت وەك ئەوەی یەکەمیان.

خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿فَإِن لَّمۡ يُصِبۡهَا وَابِلٞ فَطَلّٞ ﴾البقرة: ٢٦٥

لێزمەباران (وابل) و نەرمەباران (طل) لە هەرچی کار و کردەوە و ئاسەوار و داوا و بەدوادا هاتنەکاندا بوونیان هەیە. ئەهلی بەهەشت "سابقون مقربون" و "أصحاب اليمين" لە نێوان ئەو دوو کۆمەڵەدا جیاوازی زۆر لە پلە و پایەدا بوونی هەیە، تەنانەت شەرابی جۆری یەکەمیان پاڵفتە و بێگەردە و شەرابی دووەمیان تێکەڵ دەکرێت،

قورئـــان دەفـــەرموێت ﴿ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ وَيَهْدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٦﴾ ﴾ سـبأ: ٦، هـەموو باوەڕدارێـك ئەمـە دەبینێـت، بەڵام بینینی ئەهلی زانست رەنگێکە و بینینی کەسانی تریش رەنگێکی تر.

### ۞ بیرکردنەوە سەردەکێشێت بۆ کرداری چاکە

**بینای وشەی "التذکر" سێ شت لە ئامێز دەگرێت:** کـەڵکبینین لـە ئامۆژگـاری، داوای رۆشنبینی(بەصیرەت) بە پەندوەرگرتن، گەیشتنە سەرئەنجامی بەری بیرکردنەوە.

**کەڵکبینین لە ئامۆژگاری:** ترس و رجا لە دڵدا لە یەکتر بدەن، دڵ بکەوێتە گەڕ بـۆ کـار، بەدوای رزگاربوون لە ترس بگەڕێت و حەزی بەدەستهێنانی رجاکانی لا دروست ببێت.

**پەندوەرگرتن (العظة)** بریتییە لە "ئەمر و نەهی" کە بە تـەرغیب و تـەرهیب ناسـراون، ئەمەش دوو جۆرە: پەند و ئامۆژگاری بە بیستراو، لەگەڵ پەندو ئامۆژگاری بە بینراو.

**پەندوەرگرتن بە بیستراو:** سودبینین لەوەی دەیبیستێت لە هیدایەت و رێنومایی، ئـەو ئامۆژگارییانـەی لەسـەر زمـانی پێغەمبـەران و ئـەو وەحییـەی هێناویانـە، هـەروەها سوودبینین لە هەر ئامۆژگارییەك لە ئامۆژگارییکەران و مورشیدانەوە دەیبیسـتێت بـۆ بەرژەوەندی دونیا و دوارۆژی.

**پەند وەرگرتن بە بینراو:** بریتییە لە سوودبینین لەوەی لە جیهاندا دەیبینێت لـە پەنـد و ئامۆژگـاری و بڕیارەکـانی قـەدەر و تێپـەڕبوونی، هـەروەها بینـینی ئـەو ئایەتانـەی بەڵگەن لەسەر راستێتی پێغەمبەران لە خوداوە.

**رۆشنبینی(بەصیرەت) بە پەند:** بریتییە لە رۆشـنبینی زیـاد لـەوەی لەسـەری بـوو لـە مەنزیلـەی بیرکردنـەوە بـە هێـزی ئامـادەکردن، چـونکە یادکردنـەوە ئـەو مانایانـە وەردەگرێت کە بـە بیرکردنـەوە بەدەسـتهاتووە لـە شـوێن و جێگـەی پەنـد، واتـە بـە بیرکردنەوە پەندەکان بەدەست دەهێنێت و پاشان بە یادکردنـەوە سـپی دەکاتـەوە و رووی رۆشنیان دەردەکەوێت، لەوێوە لێبڕان بەهێز دەبێت بۆ گەشتکردن بەرەو خـودا بەپێی داوای رۆشنبینی، چونکە دیاریکردنی سـەرنج پێویسـت دەکـات لـەو شـوێنەی داواکراو دەبزوێنێت، چونکە داوا لقێکە لە هەستکردن و بەدوایـدا دێـت، هـەتا هەسـتی کەسـەکە بـە خۆشەویسـتەکەی بـەهێزتر بێـت سـەفای دڵ بـۆ لای تونـدتر و خێراتـر

دەبێت، هەتا بیر پێیەوە خەریك بێت هەستی كردن و بینینی رۆشن و یادكردنەوە بۆی زۆرتر دەبێت.

"گەیشتنە دەرئەنجامی بەری بیركردنەوە" ئەمە بابەتێكی ورد و هەستیارە.

دوو بەری شیرین بۆ بیركردنەوە بوونیان هەیە: بەدەستهێنانی داواكراو بە تەواوی و بەپێی پێویست، لەگەڵ كاركردن بەپێی ئەو بەدەستهاتووە وەك رەچاوكردنی مافی ئەو بەدەستهاتووە. دڵ لە حاڵەتی بیركردنەوەدا لە بەدەستهێنانی داواكراودا شەكەت بووە، كە ماناكانی بۆ بەدەست دێن و لە دڵدا رەنگ دەگرن ژێری پشوویەك دەدات و دەگەڕێتەوە بۆ "یادكردنەوە"ی ئەوەی بەدەستی هێناوە و سەریكێشاوەتە ناو، لەو بارەدا پێی دەگەشێتەوە، لەم مەنزیلەیەدا ئەوەی لە مەنزیلەی بیركردنەوەدا لەدەستی چووە بەدەستی دەهێنێتەوە، چونكە لە مەقامی "یادكردنەوە"دا پێی گەیشتووە كە بەرزترە لەو (بەرزترە لە بیركردنەوە)، لەو دەمەدا بەری مەبەست دەچنێتەوە، ئەوەش بریتییە لە كاركردن بەپێی بەدەستهاتووەكە وەك ریعایەت كردن لە ماف، كرداری چاكە بەری زانستی بەسوودە، كە ئەمیش لە رێگەی خۆیەوە بەری بیركردنەوەیە.

گەر دەتەوێت لەمە تێبگەیت بە نموونەیەكی بەرهەست: كەسی داواكەری ماڵ و سامان هەتا لە داواكردنەكەیدا سوور و لێبڕاو بێت لە شەكەتی و ماندووبووندایە، كە گەیشت پێی ماندوویێتی هەوڵ و كۆششەكەی دەردەچێت، لە كاروانی بازرگانی دەگەڕێتەوە، ئەوەی بەدەستی هێناوە و بینیویەتی پیاداچوونەوەی بۆ دەكات، لەم حاڵەدا ئەو شتانەی لەوانەیە هەڵەی تێدا كردووە بەهۆی خەریكبوونی بە داواكەیەوە راستیان دەكاتەوە، گەر شتەكانی راستكردەوە و قازانجەكەی بەدەستهێنا ئەوا سەرمایەكەی لەو جێگانە بەرهەم دەهێنێت كە قازانجی لێوە دەست دەكەوێت، خودا باشتر دەزانێت.

## ۞ مەرجی سوودبینین لە پەند و ئامۆژگاری

سوود لە پەند و ئامۆژگاری دەبینێت دوای بەدەستهێنانی سێ شت: "زۆری پێویستی و هەژاری بە پەند و ئامۆژگاری"، "كوێربوون لە نەنگی ئامۆژگاریكەر"، "یادكردنەوەی بەڵێن و هەڕەشە".

هەژاری و پێویستی بەندە بۆ ئامۆژگاری زیاد دەكات-كە بریتییە لە تەرغیب و تەرهیب- ئەگەر گەڕانەوە و یادكردنەوە(الإنابة والتذكر)ی لاواز بوون، ئەگەر نە، هەر كات گەڕانەوە و یادكردنــەوەی بــەهێز بــوون پێویســتی بــە یادخســتنەوەی تــەرغیب و تــەرهیب كــەم دەبێتەوە، بەڵام لەو بارەدا پێویستی لە ناسینی ئەمر و نەهی زیاد دەكات.

كەسـی گـەڕاوە بـۆ لای خـودا و یادكـەرەوە زۆر پێویسـتی بـە ئـەمر و نەهییـە، بـەڵام پشتهەڵكەری بێئاگـا پێویسـتی زۆری بـە تـەرغیب و تەرهیبـە، پشـتهەڵكەری لوتبـەرز پێویستی بە موجادەلەیە.

ئەم سیانە لـە حـەقی ئـەو سـیانەدا هـاتووە، لـە ئایـەتی﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ ﴾النحل: ١٢٥، ئایەتە "حیكمەت"ی رەهـا كرد و بە وشەی چاك و باش "الحسنة" وەسفی نەكرد، چونكە هـەمووی "الحسـنة"یـە، وەسفی چاك و باش"الحسن" لـە خـودی حیكمەتدایـە. بـەڵام ئامۆژگـاری(الموعظـة) بـە وشەی چاك و باش (الحسنة) سنووورداری كرد، چونكە هەموو ئامۆژگارییەك چاك و باش نییە. هەر بەو جۆرە گفتوگۆ (الجدال) لەوانەیە بـە باشـە بێـت، لەوانەشـە بـەو جـۆرە نەبێت، ئەم سێ حاڵەتە لەوانەیە بۆ حـاڵی كەسـی گفتوگۆكـەر لـە تونـدی و نـەرمی و تیژی و ناسكی بگەڕێتەوە، ئەو كەسە فەرمانی پێكراوە بەپێی حـاڵی كەسـەكە و بـەو جۆرەی باش و شیاوە گفتوگۆكە بكات.

لەوانەشە سیفەت بێـت بـۆ ئـەو شـتەی گفتوگۆكـەی پـێ دەكـات لـە بەڵگـە و بورهـان و وشەگەلێك كە باشترین و رونترین بن، دروسترین ئاماژە بن بۆ مەبەستەكە، بـە كـورترین شێوە بگەنە ئەو شتەی داواكراوە، لە راستیدا ئایەتەكە هەردوو جۆرەكە لەخۆ دەگرێت.

كوێربوون لە نەنگی ئامۆژگاریكەر: چـونكە گـەر بـە نەنگییەكانییـەوە خـەریك بـوو لـە پەنـد و ئامۆژگارییـەكانی مـەحروم دەبێـت و سـوودیان لـێ نابینێـت، نەفسـی مـرۆڤ راهاتووە لەسەر ئەوەی سوود نەبینێت لە قسەی كەسێك بە زانستەكەی كار نـەكات و بۆ خۆی سوودی لێ نەبینێت.

لـەپێناو ئـەم سـەرنجەدا شـوعەیب (عليه السلام) بـە هۆزەكـەی دەفـەرموێت ﴿وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ ﴾ هود: ٨٨، هەندێ لە پێشین دەڵێن: گـەر دەتـەوێت فەرمانی ئەمر و نەهیت لێ قبووڵ بكرێت، گەر فـەرمانت بـە شـتێك كـرد خـۆت یەكـەم

کەس بیت جێبەجێی دەکەیت و بە فەرمانەکە هەڵدەستیت، گەر نەهیت کرد لە شتێك خۆت یەکەم کەس بیت لەو شتە دەست هەڵدەگریت و دوور دەکەوییەوە، وتراوە:

| | |
|---|---|
| يا أيها الرجل معلم غيره | هلا لنفسك كان ذا التعليم؟ |
| تصف الدواء لذي السقام من الضنى | ومن الضنى تمسي و أنت سقيم |
| لا تنه عن خلق وتأتي مثله | عار عليك إذا فعلت ذميم |
| إبدأ بنفسك فانهها عن غيها | إذا انتهت عنه فأنت حكيم |
| فهناك يقبل ما تقول و يقتدى | بالقول منك وينفع التعليم |

**کوێری و خۆبێئاگاکردن لە نەنگییەکانی ئامۆژگاریکەر:** لە مەرجەکانی سوودبینینی تەواوە لە ئامۆژگاری، سالیکی ڕێگەی خودا یادکردنەوەی بەڵێن و هەڕەشەکان و ترس و سڵەمینەوە لێیان بە پێویست دەزانێت، ئامۆژگاری تەنها بۆ کەسێك سوودی هەیە باوەڕی بە خودا هێنابێت و لێی بترسێت و هیوای پێی هەبێت، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّمَنْ خَافَ عَذَابَ الْآخِرَةِ﴾ هود: ١٠٣، هەروەها دەفەرموێت ﴿سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَىٰ ﴿١٠﴾﴾ الأعلى: ١٠، هەروەها ﴿إِنَّمَا أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَاهَا ﴿٤٥﴾﴾ النازعات: ٤٥، ڕۆشنتر دەفەرموێت ﴿فَذَكِّرْ بِالْقُرْآنِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴿٤٥﴾﴾ ق: ٤٥، باوەڕ بە بەڵێن و هەڕەشە و یادکردنەوەیان مەرجی سوود بینینە لە پەند و ئامۆژگاری و تێگەیشتن لە بەڵگە و نیشانەکان، بەبێ ئەو باوەڕە هیچ کام لەوانە بەدەست نایەن.

### ✿ مەرجەکانی پەندوەرگرتن

بە سێ شت پەند وەردەگیرێت: زیندەگی ژیری، و ناسینی ڕۆژگار، و سەلامەتی لە مەرامەکاندا.

"پەند (العبرة)" بریتییە لە وەرگرتنی پەند (الإعتبار)، ڕاستییەکەی بریتییە لە پەڕینەوە لە حوکمی شتێکەوە بۆ حوکمی هاوشێوەی خۆی، گەر کەسێکی بینی بەڵا و ناخۆشی ڕووی تێکردبوو بە هۆیەکەوە کە پێی هەستابوو، دەزانێت حوکمی هەر کەسێك ئەو هۆیە ئەنجام بدات وەك ئەو کەسە وایە بەڵا و ناخۆشییەکانی بەسەردا هاتووە.

"زیندەگی ژیری" بریتییە لە تەندروستی و پەیپێبردن، هەروەها هێز و پێزی تێگەیشتن و بەدواداچوون بۆ سوود بینین لە شتێك و زیان لێ بینینی، ئەوە نوورێکە

خودا هەندێ لە بەندەكانی خۆی پێ تایبەت دەكاتەوە، بەپێی جیاوازی خەڵك لە بەهێزی و لاوازی ئەو نوورەدا، هەروەها بەپێی بوون و نەبوونی ئەو نوورە جیاوازی زەین و تێگەیشتن و پەیبردن سەرهەڵدەدات، پەیوەندی ئەو نوورە لەگەڵ دڵدا وەك پەیوەندی ڕۆشنایی وایە لەگەڵ چاودا.

لە ئەزموونەكانی سالیكان كە ئەزموونیان كردووە و هۆگری بوون بە دروستی ئەوەیە: هەر كەس بە وتنی ((يا حي يا قيوم لا إله إلا أنت)) ئالوودە ببێت زیندەگی ئەقڵ و دڵی بۆ دەستەبەر دەبێت.

"شيخ الإسلام ابن تيمية-قدس الله روحه-" زۆر ئەو یادەی دەخوێند، ڕۆژێك پێی وتم: ئەم دوو ناوە كە بریتین لە "الحي القيوم" كاریگەری مەزنیان لەسەر زیندەگی دڵ هەیە.

**"ناسینی ڕۆژگار"**: ئەوەیە كە بزانێت چەندە كەموكورتە، چەند هەناسەیەكی گوزەركردوون، هەر هەناسەیەكی هەزاران هەزار ساڵ لە خانەی مانەوە بەرانبەریەتی، ئەم چەند ڕۆژەی دونیا هەرگیز بە زەمەنی دواڕۆژ بەراورد ناكرێت، وەك ماوەی خەوتن وایە بەراورد بە ئاگاهی ژیرییەكی بەئاگا و زیندوو و دڵێكی هۆشمەند، چەند باشە بۆی گەر بتوانێت هەناسەیەك لە هەناسەكانی بەفیڕۆ نەدات، بەڵكو تەنها لە باشترین و خۆشەویسترین كار لەلای خودا بەختیان بكات، گەر لە كارێكدا بەختی بكات كە لای خودا خۆشەویستە و بەو كارەشی خۆشەویستری واز لێهێنا ئەوە تووشی زیان بووە بە لە دەستچوونی باشترین، ئەی دەبێ حاڵی ئەو كەسە چۆن بێت تەمەنی لە شتێكدا بەخت دەكات سوودی پێ ناگەیەنێت؟ ئەی ئەو كەسە چۆنە كە تەمەنی لە تووڕەیی و رقی خودادا بەخت دەكات؟ خودا كۆمەككارە و هێز و توانین هەر لەلای ئەوە.

هەر بەو جۆرە ئەو ڕۆژگارانە یاد دەكاتەوە كە خودا فەرمانی بە پێغەمبەران كردووە گەلانی خۆیان لە هەڕەشەی خودایی بترسێنن و خودایان یادبخەنەوە، وەك خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَذَكِّرْهُم بِأَيَّامِ اللَّهِ ﴾ إبراهيم: ٥، تەفسیری "أيام الله" بە نیعمەتی خودا كراوە، هەروەها بە بەڵا و ناخۆشییەكانی ئەهلی بێباوەڕی و یاخیبوون تەفسیر كراوە، یەكەمیان تەفسیری ئیبن عەباس و ئوبەی بن كەعب و موجاهیدە، دووەمیان تەفسیری "مقاتل"ە.

دروستەکەی: ڕۆژگاری خودا هەردووکیان لەئامێز دەگرێت، ئەو ڕووداوانەی بەسەر دوژمنەکانیدا هێنای و ئەو نیعمەتانەی بەسەر دۆستەکانیدا دایڕشت، ئەو نیعمەت و نیقمەتە گەورانە کە قسە لە بارەیانەوە دەکرێت بە "أیام" ناوبراوە، چونکە "أیام"واتە ڕۆژگار دەبێتە ئەو دەفرەی ڕووداوەکانی تێدا ڕوودەدەن، عەرەب دەڵێت: فلانە کەس زانایە بە ڕۆژگاری عەرەب و ڕۆژگاری خەڵکی، واتە بە ڕووداوانەی لەو ڕۆژگارانەدا ڕوویانداوە، ناسینی ئەو ڕۆژگارانە بینینی ڕۆشن بۆ پەندوەرگرتن دروست دەکات، بەپێی ناسینی ئەو ڕۆژگارانە پەند و ئامۆژگاری وەردەگرێت، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ ﴾ یوسف: ١١١.

هەموو ئەوانە بە سەلامەتی لە مەرامدا بەدەست دێن، سەلامەتی لە شوێنکەوتنی حەز و ئارەزوو و ملکەچبوون بۆ بانگی نەفسی فەرمانکەر بە خراپە، شوێنکەوتنی حەز و ئارەزوو نووری ئەقڵ کپ دەکاتەوە و بینینی ڕۆشنی دڵ کوێر دەکات، ڕێگری دەکات لە گرتنەبەری ڕێگەی حەق، وێڵبوون و گومڕایی لە شاڕێگەی ڕاست و دروست بەرهەم دەهێنێت، بۆیە بینینی ڕۆشنی پەند و ئامۆژگاری لەو ڕێگەیەوە بەدەست نایەت، بەندە کە شوێنی حەز و ئارەزوو دەکەوێت ڕا و سەرنجی تێکدەچن، نەفسی خراپەکاری باش و جوانی لەناو وێنەی ناشیریندا بۆ دادەنێت، هەر بەو جۆرە ناشیرینی بۆ دەخاتە ناو وێنەی باش و جوانەوە، بۆیە حەق و باتڵی لا تێکەڵ دەبێت، ئیتر چۆن سوود لە یادهێنانەوە و بیرکردنەوە و ئامۆژگاری وەردەگرێت؟

### ۞ بەری بیرکردنەوە بە کەمی و کورتی ئاواتەکان دەچنرێتەوە

بە سێ شت بەری بیرکردنەوە لێدەکرێتەوە: کەموکورتی ئاوات و خۆزگە، تێڕامان و تێگەیشتن لە قورئان، و خۆ بەدوورگرتن لە پێنج تێکدەرەکەی دڵ.

کەموکورتی ئاوات و خۆزگە: بریتییە لە زانینی نزیکبوونەوەی سەفەری یەکجاریی (مردن و کۆچی دوایی) و خێرایی گوزەرکردنی ساتەکانی ژیان، ئاواتکورتی بەسوودترین کارێکە بۆ دڵ و هەلی دەنێت بۆ فریاکەوتنی ڕۆژەکانی تەمەن، بەدەستهێنانی ئەو فورسەتانەی کە بەخێرایی وەکو هەور تێدەپەڕن، هەوڵدان بۆ پێچانەوەی لاپەڕەی کاروکردەوەکان، لێبڕانی خامۆش و وەستاوی بەرەو خانەی

دواڕۆژ دەخاتە گەڕ، هانی دەدات بۆ كۆكردنەوەی توێشووی سەفەر و پیاگەیشتنی ئەوەی لەدەستی چووە، زوهدی لە دونیا بۆ دروست دەكات و حەز و ویستی دواڕۆژی بۆ زیاد دەكات، لە دڵیدا شایەتێك لە شایەتەكانی یەقین سەرهەڵدەدات –گەر بەردەوام بێت لە بەدواداچوونی كورتیی ئاوات و خۆزگەكانی– ئەوەش فەنای دونیا و خێرایی تەواوبوون و كەمی ئەوەی كە ماوە پیێ نیشان دەدات، دونیا كۆچی كردووە و پشتی هەڵكردووە و هیچی نەماوەتەوە جگە لە چەند قومێك كە ئەهلی دونیا بینی لێدەگرن، بە ئەندازەی ئەو ڕۆژەی ماوە كە خۆر لە كەنارەكانەوە بە خۆی و زەردەپەڕەوە خەریكە ئاوا دەبێت، هەر بەو جۆرە مانەوەی دواڕۆژ و بەردەوامبوونی نیشان دەدات، خەریكە ڕووی تێدەكات و پێی تێدەنێت، مەرجەكان و نیشانەكانی هاتووە، لە هاتنیدا وەك ئەو موسافیرە وایە دۆستەكەی هاتووەتە پێشوازی، هەردووكیان لە یەكتر نزیك دەبنەوە، زۆر كەمی ماوە تا بەم نزیكانە بەیەكتر بگەن.

بەسە بۆ كەسی ژیر لەمەڕ كورتیی لە ئاوات و خۆزگەدا هاتنی ئەم ئایاتانە ﴿ أَفَرَءَيْتَ إِن مَّتَّعْنَٰهُمْ سِنِينَ ﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يُمَتَّعُونَ ﴿٢٠٧﴾ ﴾ الشعراء: ٢٠٥ – ٢٠٧ ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَن لَّمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا سَاعَةً مِّنَ ٱلنَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ ﴾ یونس: ٤٥ ﴿ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا ﴿٤٦﴾ ﴾ النازعات: ٤٦ ﴿ قَالُوا۟ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ فَسْـَٔلِ ٱلْعَآدِّينَ ﴿١١٣﴾ قَٰلَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا ۖ لَّوْ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ المؤمنون: ١١٣ – ١١٤ ﴿ فَٱصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ ۚ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍ ۚ بَلَٰغٌ ۚ فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ الأحقاف: ٣٥ ﴿ يَتَخَٰفَتُونَ بَيْنَهُمْ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا عَشْرًا ﴿١٠٣﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذْ يَقُولُ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا يَوْمًا ﴿١٠٤﴾ ﴾ طه: ١٠٣–١٠٤، پێغەمبەر(ﷺ)، ڕۆژێك خۆر لەسەر چیاكانەوە ئاوا دەبوو، بە هاوەڵانی فەرموو ((لە دونیا هەر ئەوەندە ماوە وەك لەم ئەمڕۆ و ئەوەی لێی تێپەڕیوە))، بینای كورتی ئاوات لەسەر دوو شتە: یەقین بە تیاچوونی دونیا و جیابوونەوە لێی، لەگەڵ یەقین بە دواڕۆژ و بەردەوامبوون و مانەوەی هەمیشەیی تیایدا. پاشان بەراورد دەكات لە نێوان هەردووكیاندا و كامەیان لەپێشتر بوو بە هەڵبژاردن هەڵی دەبژێرێت.

## ✿ تێڕامان لە قورئان و تێگەیشتن لێی بیر بەرهەم دەهێنێت

تێرامــان و تێگەیشــتن لــە قورئــان: بریتییــە لــە وردبوونــەوە بــەدڵ لــە ماناکــانی، کۆکردنەوەی بیر لەسەر تێرامان و تێگەیشتن لێی، ئەوەش مەبەستی دابەزینی قورئان بووە، نەك تەنها خوێندنەوەی بە بێ تێگەیشتن و تێرامــان لــە ئایەتــەکانی، خــودای موتەعال دەفەرموێت ﴿كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٢٩﴾﴾ ص: ٢٩ ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ أَمۡ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقۡفَالُهَآ ﴿٢٤﴾﴾ محمـــــد: ٢٤ ﴿أَفَلَمۡ يَدَّبَّرُواْ ٱلۡقَوۡلَ﴾ المؤمنــــون: ٦٨ ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيّٗا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٢﴾﴾ یوســـف: ٢، حەسـەن دەفـەرموێت: قورئـان دابـەزیوە بـۆ ئـەوەی تێیڕابمێـنن و تێبگـەن و کـاری پێبکەن، بۆیە خوێندنەوەی قورئان بکەن بە کردار.

هیچ شتێك لە دونیا و دواڕۆژدا بۆ بەندە بە ئەندازەی تێگەیشـتن لـە قورئـان و تێرامـانی ..وورودرێژ و کۆکردنـەوەی بـیر لەسـەر مانـای ئایەتـەکان بەسـوودتر و نـزیکتر نییـە بـۆ ..زگاری مرۆڤ، تێگەیشتن لە قورئـان مەشـخەڵی خێـر و شـەڕ بـە تـەواوی نیشـانی مـرۆڤ ..ەدات، هـــەروەها ڕێگـــەی خێـــر و شـــەڕ و هۆکارەکانیـــان و ئامانجـــەکانیان و بەروبوومەکانیان و سەرئەنجامی ئەهلی دوو ڕێگەکـە دەخاتـە ڕوو، ڕێساکانی بـاوەڕ لـە ..ڵیدا جێگیر دەبێت و بیناکەی بەرز دەبێتەوە و پایەکانی دادەمەزرێت، وێنـەی دونیـا و ..وارۆژی نیشان دەدات، بەهەشت و دۆزەخ لە دڵیدا، دەیباتەوە بۆ ناو گـەلانی پێشـوو و ..ۆژەکانی خودا لـە سـەرئەنجامی ئـەو گەلانـەدا نیشـانی مـرۆڤ دەدات، جێگـەی پەنـد و ئامۆژگاری بە ڕۆشنی نیشان دەدات، دادپەروەری خودا و فەزڵی خودای نیشان دەدات، ..ات و نـاو و سـیفات و کردارەکـانی خـودای پـێ دەناسـێنێت، ئـەو شـتانەی خـودا خۆشیدەوێت و ئەوانەی ڕقی لێی دەبێتەوە دەخاتە ڕوو، ئـەو ڕێگەیـەی مـرۆڤ بـە خـودا ..ەگەیـەنێت، ئـەوەی بـۆ سـالیکان ئامـادەکراوە دوای گەیشـتن و هاتنـەوە لـە ڕێگـەی سەفەر، لەمپەرەکانی ڕێگا و ئافاتەکانی، هەر بەو جـۆرە نـەفس و سیفاتەکانی نەفسـی پـێ دەناسـێنێت، تێکـدەرانی کاروکردەوەکـان و راسـتکەرەوانی کاروکردەوەکـانی پـێ ئاشـنا دەکـات، ڕێگـەی ئـەهلی بەهەشـت و ئـەهلی دۆزەخ و کاروکردەوەکانیـانی پـێ دەناسێنێت، حاڵ و بار و سیمایان، پلـەکانی ئـەهلی بەختـەوەری وئـەهلی بەدبـەختی، بەشەکانی مرۆڤ و کۆبوونەوەیان لەو شتانەی لەسەری کۆدەبنـەوە، جیاوازییـان لـەوەی لەسەری لەیەکتر جیادەبنەوە.

بە کورتی ئەو پەروەردگارەی بانگی بۆ لادەکرێت دەناسێنێت، هەروەها رێگەی گەیشتن بە پەروەردگار و ئەوەی بۆی ئامادەکراوە لە رێز و نیعمەت گەر روو لە خودا بکات، بەرانبەر ئەمە سێ شتی تری پێ دەناسێنێت: ئەوەی شەیتان بانگی بۆ دەکات، ئەو رێگەیەی مرۆڤ بە شەیتان دەگەیەنێت، ئەوەی وەڵامدەرەوەی شەیتان رووبەرووی دەبێتەوە لە رسوایی و سزا، دوای وەڵامدانەوەی بانگی شەیتان و گەیشتن پێی.

ئەم شەش کارە پێویستە بەندە بیانزانێت و بیانبینێت و بەدواداچوونیان بۆ بکات، قورئان دوارۆژی نیشان دەدات وەك ئەوەی لە ناویدا بێت، لە دونیا دایدەبڕێت وەك ئەوەی تیایدا نەبێت، حەق و باتڵی لەیەکتر بۆ جیادەکاتەوە لە هەموو ئەوەی جیهان جیاوازیان تیایدا هەیە، حەقی بە حەق پێنیشان دەدات، و باتڵیش بە باتڵ، جیاکەرەوە و نووری پێدەبەخشێت، تاکو هیدایەت و گومڕایی و سەرلێشێوان و راستڕەوی پێ لەیەکتر جیابکاتەوە، هێزێك بە دڵی دەبەخشێت، ژیانێکی بەرین و سنگواڵا و گەشانەوە و خۆشی و سروور، ئەو دەچێتە ناو دۆخێکەوە و خەڵکیش لە دۆخێکی تردا.

مانای قورئان بە دەوری یەکتاپەرستی و بەڵگەکانی یەکتاپەرستیدا دەسوڕێتەوە، هەروەها زانست بە خودا و ئەو ئەوسافە کەماڵانەی کە هەیەتی و ئەوەی خودای لێ بەپاك رادەگیرێت لە شەقڵی ناتەواوی، هەروەها باوەڕ بە پێغەمبەران و باسکردنی بەڵگە و نیشانەکانی راستێتی ئەوەی لای خوداوە هاتوون و بەڵگەی راستێتی پێغەمبەرایەتییان، ناساندنی مافی پێغەمبەران، و مافی ئەو کەسەی ئەوانی رەوانە کردووە بۆ لای مرۆڤەکان، هەروەها باوەڕ بە فریشتەکان، ئەوان نێراوی خودان لە بوون و بڕیاردا و لە راپەڕاندنی کاروبارەکان بە مۆڵەت و ویستی خودا، دانانیان لەسەر جیهانی خوارو و جیهانی باڵا، هەروەها ئەوانەی تایبەتکراون بە جۆری مرۆڤ لە فریشتەکان، لەو کاتەوەی لە رەحمی دایکدا جێگیر دەبێت تا ئەو رۆژەی دەگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگار و دێتەوە خزمەتی، هەروەها باوەڕ بە رۆژی دوایی و ئەوەی خودا بۆ دۆستەکانی لە خانەی نیعمەتی رەهادا ئامادەی کردووە، کە تیادا هەست بە ئازار و خەم و مەینەتی ناکەن، ئەوەی بۆ دوژمنەکان ئامادەی کردووە لە خانەی لێزمەی سزادا کە نە خۆشی و نە خۆشگوزەرانی و نە ئاسوودەیی و نە شادییەکی تێدایە، درێژەدان بەمە بە تەواوترین و رۆشنترین شێوە، هەروەها درێژەی ئەمر و نەهی

خودایی، و شەرع و قەدەر، و حەڵاڵ و حەرام، پەند و ئامۆژگاری و چیرۆك و نموونە، هۆ و بڕیار، بنەما و ئەنجامەکان لە ئەمر و نەهی خودادا.

بەردەوام ماناکانی قورئان بە بەڵێنی جوان مرۆڤ رادەپەڕێنێت، ئاگاداری دەکاتەوە و هەڕەشەی لێدەکات بە لێزمە سزا و هانی دەدات بۆ خۆ سووك کردن و بار سووکی بۆ رۆژێکی قورس و گران، لە تاریکستای بیر و بۆچوونی مەزهەبەکان دەریدەهێنێت بۆ سەر راستترین رێگە، رێگەی لێ دەگرێت لە چوونە ناو رێگەی بیدعە و گومڕایی و بەئاگای دەهێنێت لە زیادکردنی نیعمەت بە شوکری پەروەردگاری جەلیلی، چاوی رۆشن دەکاتەوە لە سنوورەکانی حەڵاڵ و حەرام، لەسەر ئەو سنوورانە رایدەگرێت بۆ ئەوەی دەستدرێژی نەکات و بەهۆیەوە رووبەڕووی ئازار و مەینەتی دووروودرێژ ببێتەوە، دڵی جێگیر دەکات لە لادان لە حەق و لاربوونەوە لەسەر رێگەی حەق، کاروباری گران و لەمپەری گەورەی بۆ ئاسان و لا ئاسان دەکات، هەر کات لێبڕانی خاوبوویەوە و رۆیشتنی ساردبوویەوە بانگی لێ دەکات، پێی دەڵێت: کاروانەکە پێشکەوتووە و تۆش رێنیشاندەرت لەدەستچووە، خێراکە و پیابگە، بەگەڕ بکەوە و بگە بە کاروان، وەك رێگەنیشاندەرێك پێشی دەکەوێت و رێگەی نیشان دەدات، هەرکات کەمینێك لە کەمینەکانی دوژمنی هاتە سەر رێگە یان رێگرێك لە رێگرەکانی کاروان، بانگی لێ دەکات: وریابە، وریابە، دەست بە خوداوە بگرە، داوای کۆمەکی لێ بکە، بڵێ: "حسبي الله ونعم الوكيل".

لە تێڕامانی قورئان و تێگەیشتن لێی چەند بەرانبەری ئەمەی باسمان کرد بوونی هەیە.

## ۞ لێڵکەرانی دڵ

لێڵکەران و تێکدەرانی دڵ بریتین لە: <u>زۆر تێکەڵی بە خەڵکی</u>، و <u>زۆری ئاوات</u>، و <u>وابەستەبوون بە غەیری خودا</u>، و <u>تێری لەڕادەبەدەر</u>، و <u>خەوی زۆر</u>.

ئەم پێنجە لە گەورەترین تێکدەرەکانی دڵن، لەبەرئەوەی دڵ دەچێت بۆ لای خودا-عزوجل- و خانەی دوارۆژ، و رێگەی حەق و بەرنامەی حەق دەدۆزێتەوە، هەر بەو جۆرە ئافاتی نەفس و کردار و رێگران لە نوور و زیندەگی و هێز و تەندروستی و لێبڕان و سەلامەتی بیستن و بینین دەبینێتەوە، ئەم پێنج تێکدەرە نوورەکەی

خامۆش دەکەن و چاوی ڕۆشنبینی کوێر دەکەن و گوێیەکانی قورس دەکەن-گەر کەڕولاڵی نەکەن- و هەموو هێزی لاواز دەکەن، تەندروستی دادەڕوخێنن و لێبڕانی خاودەکەنەوە، ویستی بالآی رادەوەستێنن و بەرەو دواوە دەیگێڕنەوە، هەر کەس هەستی بەمانە نەبێت ئەو کەسە دڵی مردووە، بۆیە برین ئازار بە مردوو ناگەیەنێت، ئەوانە کۆسپ و لەمپەرن لەبەردەم گەیشتنە کەماڵی کەسەکەدا، ڕێگەگرن لەبەردەم گەیشتن بەو شتانەی بۆی ئامادەکراوە، نیعمەت و بەختەوەری و خۆشی و چێژەکانی ئەو لە گەیشتندایە بەوەی بۆی ئامادەکراوە.

نیعمەت و چێژ و خۆشی و کەماڵ بەدەست نایەن مەگەر بە ناسین و خۆشەویستی خودا و ئارامی بە یادی خودا و دڵخۆشی و گەشانەوە بە نزیکی لە ئەو و تامەزرۆبوون بۆ لیقای، ئەمە بریتییە لە بەهەشتەکەی یەکەم، هەر بەو جۆرە لە دواڕۆژدا نیعمەت بەدەست ناهێنێت و نابێتە دراوسێی خودا و سەرکەوتنی بۆ نییە بە چوونە ناو بەهەشت نەبێت، بۆیە دوو بەهەشتی بۆ هەیە: ناچێتە بەهەشتی دووەمەوە گەر نەچێتە بەهەشتی یەکەمەوە.

گوێم لە "شیخ الإسلام ابن تیمیة-قدس الله روحه-" بوو دەیفەرموو: لە دونیادا بەهەشتێك هەیە گەر تێی نەچیت ئەوا ناچیتە بەهەشتەکەی دواڕۆژەوە.

**هەندێ لە عاریفان دەڵێن:** هەندێ کات بەسەر دڵدا تێدەپەڕێت، دەڵێم گەر ئەهلی بەهەشت لەم جۆرە خۆشییەدا بن ئەوا لە ژیانێکی زۆر پاك و خۆشدان.

هەندێ لە خودا خۆشویستان دەڵێن: ئەهلی دونیا هەژارن، لە دونیا دەرچوون و خۆشترین و بەتامترینیان تێدا نەچەشت، پرسییان: خۆشترین و بەتامترین شت چییە لە دونیادا؟ وتی: خۆشەویستی خودا و هۆگربوون و شەوق بۆ لیقا و ڕووکردن لە خودا و پشتهەڵکردن لە غەیری خودا، یان هاوشێوەی ئەم قسەیە.

هەرکەس دڵی هەبێت ئەمە دەبینێت و هەستی پێکات و تامی دەکات.

ئەم پێنج شتە ئەو ژیانە پڕ تام و چێژە ناهێڵن، دەبنە پەردە لە نێوان دڵ و ئەو خۆشییانەدا، ڕێگرن لە بەردەم بەرەو خودا چوونیدا، نەخۆشی و دەردگەلێکی وای بۆ دروست دەکەن گەر پیایدا نەگات ئەوا لە مەترسیدایە.

## ۞ تەنها لە خێردا تێكەڵ بە خەڵك دەبین

ئـەو كاریگەریانـەی زۆری تێكـەڵبوون لەسـەر مـرۆڤ بەجێیـدەهێڵن: پڕبـوونی دڵ بـە دووكـەڵی هەناسـەی مـرۆڤ تـا رەش دەبێتـەوە، پـەرتبوون و دابـەش بـوون رووی تێدەكات، هەروەها خەم و خەفەت و لاوازی، و هەڵگرتنی كۆڵێك كە دەستەوسـانە لـە هەڵگرتنی بەهۆی هاودەمی خراپەوە، تیاچوونی بەرژەوەندییەكانی بـەهۆی سـەرقاڵ بوون بە خەڵكی و كاروباری خەڵكییەوە، بیری پەرت و دابەش دەبێت لە دۆڵی ویست و داواكارییەكانیاندا، چی لەو ماوەتەوە بۆ خودا و رۆژی دوایی؟

ئەمە و هاتنی زۆرێك لە بەڵا و لە دەستچوونی زۆرێك لە نیعمـەت بـەهۆی تێكـەڵبوون بـە خەڵكی، رووكردنە میحنەت و لەدەستچوونی نیعمەت، لە چاكە دەرچوون و لەناو خراپـە نیشتەجێبوون، ئافەتی خەڵكی بریتییە لە خەڵكی، خراپترین شتێك بـۆ ئـەبی تالـب -لـە كاتی مردندا- هاودەمی خراپ بوو، بە بەردەوام تـەفرەیان دا تـا نـەیانهێڵا ئـەو وشـەیە بڵێت كە بەختەوەری هەتاهەتایی بۆ دەهێنا.

ئەم جـۆرە تێكەڵبوونـە كـە لەسـەر جۆرێـك لـە خۆشەویسـتییە لـە دونیـا و تێربـوونی هەندێكیان لە هەندێكی تریان، كاتێك حەق هاتە پێشـەوە دەگۆڕێـت بـۆ دوژمنایـەتی، كەسی تێكەڵ بوو هەردوو دەستی بەهۆی پەشیمانییەوە دەگەزێت ﴿ وَيَوْمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِي ٱتَّخَذْتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ يَٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴿٢٨﴾ لَّقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَآءَنِي ﴾ الفرقان: ٢٧ - ٢٩، ﴿ ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٦٧﴾ ﴾ الزخرف: ٦٧

ئیبراهیمی خەلیل بە هۆزەكەی دەفـەرموێت ﴿ وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٥﴾ ﴾ العنكبوت: ٢٥، ئەمە حـاڵی هـەر دوو هاوەڵێكە لە مەرامێكـدا هاوبـەش بـن، خۆشەویسـتی یـەكترن تـا ئـەو كاتـەی كـە كۆمكاری یەكترن بۆ بەدەسـتهێنانی، كـە ئـەو مەرامـەیان نـەما پەشـیمانی و حـوزن و ئـازار بەدوایـدا دێـت، خۆشەویسـتییەكەیان وەردەگـەڕێت بـۆ بـوغز و نـەفرەت و زەمكردنی یەكتری، كە ئەو مەرامە وەرگەڕا بۆ حوزن و سزا وەك چـۆن لـەم دونیایـەدا حـاڵی هاوبەشـان و هـاوەڵان لـە رسـواییدا دەبیـنین گـەر گیران و سـزادران، هـەردوو

یارمەتیدەرێکی یەکتر لەسەر باتڵ خۆشەویستی یەکترن، ڕۆژێك دێتە بەرەوە خۆشەویستییەکەیان بۆ بوغز و دوژمنایەتی بگۆڕرێت.

پێوەری باش و بەسوود لە تێکەڵبووندا ئەوەیە لە خێردا تێکەڵ بە خەڵکی ببێت وەك جومعە و جەماعەت و جەژنەکان و حەج و فێربوونی زاست و جیهاد و ئامۆژگاری، هەروەها خۆی لێیان کەنارگیر بکات، ئاگاداربوون لە شەڕیان گەر بۆی نەکرا خۆی لێیان بەدووربگرێت، با ئاگادار و وریابێت لەو کارە خراپانەدا لەگەڵیان تەبا نەبێت، با ئارامبگرێت لەسەر ئازاریان، ئەوانە بەدڵنیاییەوە ئازاری دەدەن گەر هێز و سەرخەری نەبێت، بەڵام ئازارێك عیززەت و خۆشەویستی و مەزنی بۆ ئەو تێدایە، هەروەها مەدح و سەناکردنی لەوانەوە و لە باوەڕدارانەوە و لە پەروەردگاری هەموو جیهانەکانەوە، تەبابوون لەگەڵیان و لەسەر خراپەکانیان زەلیلی و بوغز و خەشم و زەمی ئەوان و باوەڕداران و خودای بەدوا دێت.

ئارامگرتن لەسەر ئازاریان باشتر و چاکترە بۆ سەرئەنجامی، دەرئەنجامێکی ستایشکراوی بۆ ئەو لێوە بەرهەم دێت، گەر پێویست بوو تێکەڵیان ببێت لە هەندی لە موباحاتدا با هەوڵبدا مەجلیسەکەی ببێت بە گوێڕایەڵی بۆ خودا، ئەگەر توانی، خۆی هانبدات و دڵی بەهێز بکات و لانەکاتەوە بەلای وەسوەسەی شەیتانی لادەر لەو کارە و پێی بڵێت ئەو کارەت ریایە و دەتەوێت زانست و حاڵی خۆتیان نیشان بدەیت، هەروەها هاوشێوەکانی ئەم وەسوەسەیە، با دژی بجەنگێ و داوای کۆمەکی لە خودا بکات و کاری خێر لەو خەڵکە بکات لە ئەوپەڕی هەوڵیدا.

گەر ئەو کارەی بۆ نەکرا، با دڵی خۆی لە ناویان دەربکێشێت وەك دەرکێشانی موو لە هەوێر، با لە ناویاندا حازری نادیار بێت، نزیکی دوور بێت، خەوتووی بە ئاگا بێت، سەیریان بکات و نەیانبینێت، قسەکانیان ببیستێ و تێیان نەگات، چونکە لە نێوان ئەواندا نەماوە و دڵی بەرزکردۆتەوە بۆ خانەی باڵای فریشتەکان، لەگەڵ ڕۆحە باڵا و پاکەکاندا بە دەوری عەرشدا تەسبیحات دەکات، ئەم کارە زۆر لە سەر نەفس سەخت و دژوارە، تەنها بۆ ئەوانە ئاسانە کە خودا بۆی ئاسان کردبن، لەنێوان بەندە و خودادا ئەوەیە خودا بەڕاست بزانیت و بە بەردەوامی پەنای بۆ ببەی و خۆت بخەیە بەر دەرگانەی بە زەلیلی و گەردنکەچی، تەنها خۆشەویستی ڕاست بەم کارە

کۆمەککارە، هەروەها یادی بەردەوام بە دڵ و بە زمان، خۆی لە چوار تێکدەرەکەی تر بپارێزێت کە دواتر باسیان لەبارەوە دەکەین، ئەمەش بەدەست دێت بە خۆئامادەکردنێکی باش و سەرچاوەیەکی هێز لە خوداوە، هەروەها لێبڕانی راستگۆیانە و خۆیەکلاکردنەوە بۆ خودای موتەعال. خودا باشتر دەزانێت.

## ۞ لە ئاواتخواستندا فەسادی زۆرتر هەیە

دڵ بەسواربوونی دەریای ئاواتەکان کە کەناری نییە رووبەڕووی تێکچوون دەبێتەوە، موفلیسەکانی جیهان سواری ئەو دەریایە دەبن، وەك وتراوە: ئاواتخواستن سەرمایەی موفلیسەکانە، شمەك و کەلوپەلی "سەرنشینان"ی بریتییە لە بەڵێنەکانی شەیتان و خەیاڵی مەحاڵ و خەیاڵی زەبەلاح، بەردەوام شەپۆلی درۆینەی ئاواتەکان و خەیاڵی پووچ یاری بەسەرنشینانی دەکات، هەر کەس بەپێی حاڵی خۆی، هەیانە ئاواتخوازی هێز و دەسەڵاتە، هەیانە گەشت و گەڕان و سوڕانەوەیە بەسەر زەویدا، هەیانە بۆ ماڵ و دارایی و سامانە، کەسی ئاواتخواز وێنەیەکی داواکراو لە نەفسیدا گەڵاڵە دەکات و وا وێنای دەکات کە بەدەستی هێناوە، چێژ لە بەدەستهێنانی دبینێت، ئەو لە قووڵایی ئەم خەیاڵانەدایە و لەپڕ بەئاگادێت و دەبینێت لەسەر پارچە حەسیرێکە.

خاوەنی هیممەتی بەرز ئاواتەکانی بە دەوری زانست و باوەڕ و کرداردا دەسوڕێتەوە، ئەو شتانەی لە خودا نزیکی دەکەنەوە، دەیبەن بۆ خانەی هاوسێیەتی ئەو.

ئاواتی ئەم کەسە باوەڕ و نوور و حیکمەتە، بەڵام باوەڕی ئەوانە فریودان و مەغروور بوونە.

پێغەمبەر ئاواتخوازی خێری مەدح کردووە، لەوانەیە پاداشتەکەی لەگەڵ پاداشتی ئەنجامدەرەکەی یەکسان کردبێت، وەك ئەو کەسەی کە دەڵێت: گەر ماڵ و دارایم ببوایە ئەوا وەك فڵانەکەس دەمبەخشی کە لە خودا دەترسێت لە ماڵ و سامانەکەیدا، سیلەی رەحمی پێ بەجێدەهێنێت، مافی خودای لێدەدات، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((ئەو دوانە لە پاداشتدا یەکسانن))

## ۞ شەرمەزاری تەواو لە وابەستەبووندا بە کەسان و شتانێکەوە جگە لە خودا

سێیەمین تێکدەر لە تێکدەرەکانی دڵ بریتییە لە خۆگرێدان بە کەسان و شتانێکەوە جگە لە خودا(تبارك وتعالى) ئەمەش خراپترین تێکدەر و وێرانکەری دڵی مرۆڤە.

هیچ شتێك بە ئەندازەی ئەمە زیانی پێناگەیەنێت، لە هەموو شتێك زیاتر بەرژەوەندی و بەختەوەرییەکەی رووبەڕووی مەترسی دەکاتەوە، ئەو کە خۆی بە غەیری خوداوە دەبەستێتەوە خودا دەیداتە دەست ئەو شتەی ئەو خۆی پێ بەستۆتەوە، ئەوا ئەو مەبەستەی کە بڕیار بوو لە خوداوە بەدەستی بهێنێت لەدەستی دەچێت، ئەوەش بەهۆی وابەستەبوون بە غەیری خوداوە و لاکردنەوە بۆ لای غەیری خودا، نە گەیشت بەو بەشەی لە خوداوە بۆی دانرابوو نە بەو شتە گەیشت لە دەستی کەسانی ترەوە ئاواتی بۆ دەخواست، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَاتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لِّيَكُونُوا لَهُمْ عِزًّا ﴿٨١﴾ كَلَّا ۚ سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا ﴿٨٢﴾﴾ مریم: ٨١- ٨٢ ﴿وَاتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لَّعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَهُمْ وَهُمْ لَهُمْ جُندٌ مُّحْضَرُونَ ﴿٧٥﴾﴾ یس: ٧٤-٧٥

شەرمەزارترین مرۆڤ ئەو کەسەیە دەستی بە غەیری خوداوە گرتووە، ئەوەی لە دەستی دەرچووە لە بەرژەوەندی و بەختەوەری و سەرفرازی گەورەترە لەوەی بەدەستی هێناوە لەو کەس و شتانەی پێیانەوە وابەستەبووە، ئەو شتانە رووبەڕووی تیاچوون دەبنەوە، نموونەی ئەو کەسەی خۆی بە غەیری خوداوە گرێ دەدات وەك ئەو کەسە وایە لە گەرما و سەرمادا پەنا بۆ ماڵی جاڵجاڵۆکە دەبات، ئەوەش خراپترین و لاوازترین خانەیە.

بە کورتی: بنچینەی هاوەڵدانان و ئەو پایانەی لەسەری دامەزراوە بریتییە لە خۆگرێدان بە غەیری خوداوە، خاوەنەکەی شەرمەزار و زەمکراوە، وەك خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿لَّا تَجْعَلْ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ فَتَقْعُدَ مَذْمُومًا مَّخْذُولًا ﴿٢٢﴾﴾ الإسراء: ٢٢، زەمکراوە و ستایشکەری نییە، شەرمەزارە و سەرخەری نییە، هەندێ کەس لەوانەیە مەزڵوم بێت بەڵام ستایشکراو بێت، وەك کەسێك بە ناحەق دەستی بەسەردا گیرابێت، لەوانەیە کەسانێك هەبن زەمکراو بن بەڵام سەرکەوتوو بن، وەك ئەو کەسەی بەرانبەرەکەی بە ناحەق ژێردەستە کردووە، لەوانەیە ستایشکراو و سەرکەوتوو بێت،

وەك ئەو کەسەی بە حەق هێز و دەسەڵات دەگرێتە دەست، بەڵام هاوەڵدانەری وابەستە بە غەیری خوداوە بەشەکەی خراپترین بەشی ئەو چوار بەشەیە، ئەوەش ئەوەیە کەسەکە نە ستایشکراوبێت نە سەرکەوتوو بێت.

## ۞ هەڵلوشینێکی تیابەر

یەکێکی تر لە تێکدەرانی دڵ بریتییە لە خواردن، دوو جۆر تێکدەر لە خواردن بۆ دڵ بوونی هەیە:

یەکەم، ئەوەی خودی خواردنەکە تێکدەری دڵە وەك خواردنی حەرامکراوەکان، کە ئەمانەش دوو جۆرن: حەرامکراو بەهۆی حەقی خوداوە، وەك مرداراوەبوو و خوێن، و گۆشتی بەراز و درندەی کەڵبەدار و چرنووکدار لە باڵندەکان، هەروەها حەرامکراو بەهۆی مافی بەندەکانەوە وەك دزراو و داگیرکراو و تالانکراو، یان ئەوەی بەبێ رەزامەندی خاوەنەکەی دەخورێت، جا یان کەسەکە ژێردەستە بێت، یان شەرم بکات، یاخود نەیەوێت زەمی بکەن.

دووەم: ئەوەی دڵ تێکدەدات بە بەزاندنی بڕ و سنووری، وەك ئیسراف کردن لە حەڵاڵدا، تێربوونی لەڕادەبەدەر کە جەستەی لە بەندایەتی قورس و گران دەکات، خەریکی دەکات بە بەڵای ورگنی و داواکانی ورگەوە، هەروەها تووشی زیانبوون بەهۆی جەستە قورسییەوە، و زۆربوونی حەز و ئارەزووی جەستەیی، فراوانکردنی مەجرای شەیتان و بەرینبوونی لە ناوەوەی مرۆڤدا، چونکە شەیتان بە مەجرای خوێنی مرۆڤدا گوزەر دەکات، رۆژووگرتن مەجراکەی بەرتەسك دەکاتەوە و رێگەکەی دادەخات، تێری بەرین و فراوانی دەکات، هەر کەس زۆری خوارد زۆر دەخواتەوە و لەوێشەوە زۆر دەخەوێت و زۆر زیانی بەردەکەوێت، لە فەرموودەیەکی مەشهووردا فەرموویەتی ((ئادەمی دەفرێکی خراپتر لە سکی پڕ نەکردووە، چەند پاروویەك بەسە بۆ مرۆڤ خۆی پێڕابگرێت، ئەگەر هەر نەبێت با سێیەکی بۆ خواردن و سێیەکی بۆ خواردنەوە و سێیەکی بۆ هەناسەی بێت))

## ۞ خەوی بێئاگایان

تێکدەری پێنجەم بریتییە لە خەوی زۆر، چونکە خەوی زۆر دڵ دەمرێنێت، جەستە قورس دەکات و کات بەفیڕۆ دەدات و بێئاگایی و تەمبەڵی بەرهەم دەهێنێت، هەندێ خەو هەیە زۆر مەکروهە و هەندێکی زیان بە جەستە دەگەیەنێت، باشترین خەو ئەو خەوەیە مرۆڤ زۆری پێویست بێت، خەوی سەرەتای شەو باشترە لە کۆتایی شەو، خەوی نێوەڕۆ لە خەوی سەرەتا و کۆتایی ڕۆژ باشترە، هەتا خەو لە دوو جەمسەرەکەی ڕۆژ نزیك بێتەوە سوودی کەمتر دەبێت و زیانی زۆرتر دەبێت بە تایبەت خەوی عەسر، هەروەها خەوی سەرەتای ڕۆژ مەگەر کەسەکە شەونخوونی کردبێت.

هەروەها خەوی مەکروهـ وەك خەوی دوای نوێژی بەیانی هەتا خۆرهەڵدێت، چونکە ئەو ماوەیە بە کاتی ڕۆزی و بەرەکەت ناسراوە، بەکارهێنانی ئەو کاتە بۆ ڕۆیشتن لە لای سالیکان گرنگییەکی زۆری هەیە، تەنانەت گەر هەموو شەوەکە بەپێ ڕۆیشتبن ڕێگە نادەن بە دانیشتن لە ڕۆیشتنی ئەو کاتە تا خۆر هەڵدێت، چونکە ئەو کاتە سەرەتای ئەو ڕۆژە و کلیلەکەیەتی، کاتی دابەزینی ڕۆزییە، کاتی وەرگرتنی بەشی ئەو ڕۆژە و داباریینی بەرەکەتە، لەو کاتەوە هەموو ڕۆژەکە سەرهەڵدەدات، حوکمی هەموو ڕۆژەکە بەپێی حوکمی ئەو کاتەیە، دەبێ خەو لەو کاتەدا خەوی ناچاری بێت.

بە کورتی خەوی میانە و بەسوود: بریتییە لە خەوی نیوەی یەکەمی شەو، ئەم خەوە باشترین خەوە لای پزیشکان، زیادبوون و کەمبوون لەو ڕادەیە کاریگەری لەسەر سروشتی مرۆڤ و لادانی بەجێدەهێڵێت.

لەو خەوانەی کە دیسان سوودی نییە: خەوی سەرەتای شەو، دوای ئاوابوونی خۆر تا پشکۆی عیشا خامۆش دەبێت، پێغەمبەر(ﷺ) خەوی ئەو کاتەی پێ باش نەبووە، بۆیە لە ڕووی شەرع و سروشتەوە بەباش تەماشا ناکرێت.

وەك چۆن زۆری خەو هەموو ئەو ئافاتانە دروست دەکات هەر بەو جۆرە نەخەوتن و کۆچکردن لێی ئافاتی گەورەی تر پەیدا دەکات، لە خراپی میزاج و وشکبوونەوەی، لادانی نەفس و وشکبوونەوەی تەڕییە دیارییکراوەکانی تێگەیشتن و کار، هەروەها سەرهەڵدانی نەخۆشی تیابەر کە کەسەکە سوود لە دڵ و بەدەنی نابینێت بەهۆی ئەو ئافاتانەوە، بوون لەسەر میانەگیری دامەزراوە، هەر کەس دەست بەو میانەگیرییەوە بگرێت ئەوا بەشی لە هەموو خێرێك بەدەست هێناوە، کۆمەکی لەلای خودایە.

## (٩) (منزلة الإعتصام)

# مەنزیلەی دەستگرتن بە خودا و حەبلی خوداوە

پاشان دڵ پێ دەنێتە مەنزیلەی دەستگرتن بە خودا و حەبلی خوداوە:

**ئەمەش دوو جۆرە:** دەستگرتن بە خوداوە و دەستگرتن بە حەبلی خوداوە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْ ﴾ آل عمران: ١٠٣ ﴿وَٱعۡتَصِمُواْ بِٱللَّهِ هُوَ مَوۡلَىٰكُمۡۖ فَنِعۡمَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَنِعۡمَ ٱلنَّصِيرُ ۝٧٨﴾ الحج: ٧٨.

(الإعتصام) دەستگرتن لەسەر كێشی "إفتعال"ە و لە "العصمة"ەوە هاتووە كە بریتییە لە دەستگرتن بەوەی بتپارێزێت و ڕێگری بكات لەوەی لێی دەترسی و خۆتی لێ بەدوور دەگریت، كەوابوو"العصمة" واتە "الحمية"خۆپارێزی، "الإعتصام"یش واتە "الإحتماء"پەناگیری بۆ خۆپارێزی، لێرەوە قەڵاكان بە "العواصم" ناونراون بەهۆی ئەو ڕێگری و پارێزگارییەی كە تێیاندایە.

**خولگەی بەختەوەری دونیا و دواڕۆژ:** لەسەر دەستگرتن بە خودا و بە حەبلی خوداوە وەستاوە، هیچ ڕزگاربوونێكیش نییە بەو دووانەوە نەبێت.

دەستگرتن بە حەبلی خوداوە: كەسەكە لە گومڕایی خۆی دەپارێزێت، "الإعتصام بە" ئەو كەسەی یان ئەو شتەی دەستی پێوە دەگرێت لە تیاچوون دەیپارێزێت، ئەو كەسەی بۆ لای خودا دەڕوات وەك ئەو كەسە وایە بۆ مەبەستێك ڕێیەكی گرتۆتە بەر، ئەو ئاتاجی نیشاندانی ڕێگە و ئاتاجی سەلامەتی سەر ڕێگەیە، ناگاتە مەبەستی خۆی بە بەدەستهێنانی ئەو دووانە نەبێت(نیشاندانی ڕێگە و سەلامەتی ڕێگە)، ڕێنیشاندەر دەیپارێزێت لە سەرلێشێوان و لە ڕێگە لادان و دەیخاتە سەر ڕێگەی دروست، بە هۆی هێز و زەخیرە و چەكەوە(واتە توێشوو) سەلامەتی ڕێگە بەدەست دەهێنێت و لە ڕێگرانی سەر ڕێگە و ئافەتەكانی خۆی دەپارێزێت.

بۆیە دەستگرتن بە حەبلی خوداوە: ڕێنومایی بۆ دەستەبەر دەكات و شوێنی ڕێنیشاندەر دەكەوێت، دەستگرتنیش بە خوداوە هێز و زەخیرە و چەكی بۆ دەستەبەر دەكات، هەروەها ئەو توێشووەی بۆ ڕێگەكەی پێویستییەتی، بۆ ئەو

مەبەستە دەربڕینی پێشین بۆ دەستگرتن بە حەبلی خوداوە "الإعتصام بحبل الله" جیاوازی تێدایە، دوای ئەوەی هەموویان ئاماژە بەم مانایە دەکەن.

ئیبن عباس دەفەرموێت: بریتییە لە دەستگرتن بە ئایینی خوداوە.

ئیبن مەسعود دەفەرموێت: بریتییە لە کۆمەڵ(الجماعة)، بۆیە دەڵێت ((لەگەڵ کۆمەڵ بژین، چونکە بریتییە لەو حەبلەی خودا فەرمانی پێکردووە، با شتگەلێکیش ببینن لەناو کۆمەڵدا کە پێتان باش نییە، گوێڕایەڵی باشترە لەوەی خۆتان حەزتان لێیەتی لە جیاوازیدا))

مجاهد و عطاء دەڵێن حەبلی خودا بریتییە لە پەیمانی خودا"عهد الله"، قتادة و سدي و زۆرێك لە ئەهلی تەفسیریش دەڵێن: بریتییە لە قورئان.

"مقاتل" دەڵێت: بە فەرمانی خودا و گوێڕایەڵی خودا، دەستە دەستە مەبن وەك یەهود و نەصارا دەستە دەستە لێی وەستان.

لە "الموطأ"دا لە مالیکەوە لە سوهەیلی کوڕی صالحەوە لە باوکییەوە لە ئەبی هورەیرەوە -خوای لێ رازی بێت- پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ((خودا رازی دەبێت لە سێ شت بۆ ئێوە و ناڕازی دەبێت لە سێ شت، بۆ ئێوە رازییە: کە بیپەرستن و هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن، و هەمووتان دەست بە حەبلی خوداوە بگرن، و گوێڕایەڵی ئەوانە بکەن خودا کاروباری ئێوەیانی رادەست کردوون. ناڕازی دەبێت لە: وتی وتی، و بەفیڕۆدانی ماڵ ودارایی، و پرسیاری زۆر)) ئیمامی مسلم لە سەحیحەکەیدا ریوایەتی کردووە.

**دەستگرتن بە حەبلی خوداوە:** بریتییە لە پارێزگاری لە گوێڕایەڵی خودا و چاودێری فەرمانەکانی.

مەبەستمان بە چاودێری فەرمانەکانی: ئەنجامدانی گوێڕایەڵی خودایە لەو پێناوەدا کە خودا فەرمانی پێکردووە و پێی خۆشە، نەك تەنها وەك عادەتێك ئەنجام بدرێن، یان بەهۆی مەبەستێکەوە جگە لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خودا، وەك طلق کوڕی حبیب لەسەر "التقوی" دەڵێت: ((بریتییە لە کارکردن بە گوێڕایەڵی خودا لەسەر نوورێك لە خوداوە، مەبەستت پاداشتی خودا بێت، وازهێنان لە یاخیبوون لە خودا لەسەر نوورێك لە خوداوە، لە سزای خودا بترسیت))

ئەمە بریتییە لە باوەڕ و نیازی پاداشت(الإيمان والإحتساب)، ئەوەی لە فەرموودەی پێغەمبەردا ئاماژەی پێدراوە ((من صام رمضان إيمانا واحتسابا. هەروەها "من قام ليلة

القـدر إیمانـا واحتسـابا-غفـر لـه)) ڕۆژووی ڕۆژ و مانـەوە و نوێـژی شـەو بریتییـە لـە گوێڕایەڵی، باوەڕیش (الإیمان) بریتییە لە چاودێری ئەو کارانە، پاڵفتەکردنی نێتیش بـۆ خودا: ئەوەیە کە باوەڕ فەرمانکەر بێت بـە کارەکـە، نـەك شـتێکی تـر، "الإحتسـاب" بریتییە لە هیوا بە پاداشتی خودا.

دەستگرتن بە حـەبلی خـوداوە لـە بیدعـە و ئافـاتی کـردار دەیپارێزێـت، خـودا باشـتر دەزانێت.

**دەستگرتن بە خوداوە (الإعتصام به):** بریتییە لە پشتبەستن بە خودا و خۆدانە پەنای، و خۆپارێزی بە داڵدەی ئەو، داواکردنی بەردەوام تاکو پارێزگاری و ڕێگری لە کاری خـراپ لە بەندەکەی بکـات و بیپـارێزی و بـەرگری لـێ بکـات، بـەری دەسـتگرتن بـە خـوداوە: بریتییە لە بەرگری لەو بەندەیە، خودا بەرگری لەوانە دەکات باوەڕیان هێنـاوە: بـەرگری لە بەندە باوەڕدارەکەی دەکات کە دەست بە خوداوە بگرێت لە هەر هۆیـەك کـە سـەری لـە تیاچـوونەوە دەربچـێت، بیپارێزێـت لێـی، لێڵـی و تەمومـژ و حـەز و ئارەزووەکـان (الشبهات و الشهوات)ی لـێ بـەدوور بگرێـت، هـەروەها فێڵـی دوژمـنی دیـار و نادیـار لـە دەرەوە و لـە نـاوەوە، هـەروەها بیپارێزێـت لـە شـەڕی نەفسـی خـۆی، بیپارێزێـت لـەو شەڕانەی کـە هـەموو هۆیـەکانی سـەرهەڵدانیان فەراهـەم بـووە، ئەمـەش بـەپێی هێـزی دەستگرتن بە خوداوە و قووڵبوونەوە تیایدا، بۆیە هۆی تیاچوونی ئەو کەسە بزر دەبێت و بـەرگری لـێ دەکرێـت، بـە قـەدەری خـۆی-سـبحانه- قـەدەری خراپـی بەندەکـەی دەگۆڕێـت، و بـە ویسـتی خـۆی ویسـتی ناباشـی لادەبـات، و وای لـێ دەکـات لـە شـتە خراپەکاندا پەنا بەو بگرێت.

### ۞ پلەکانی دەستگرتن

ئـەوەش لەسـەر سـێ پلەیـە: دەسـتگرتنی گشـتی بـە خێـرەوە بـە تەسـلیمبوون و گەردنکەچـی، بەڕاسـت زانـینی بـەڵێن و هەڕەشـەکانی خـودا و مـەزن ڕاگـرتنی فـەرمان پێکراوەکان و نەهیلێکراوەکان، لە کۆتاییشدا دامەزراندنی مامەڵە لەسەر یەقین و ویژدان.

خـەڵکی بەگشـتی دەسـتیان بـەو هەواڵـەوە گرتـووە لـە خـوداوە هـاتووە، بـە تەسلیمبوونێکی بێ چەندوچوون، بەڵکو بە بوونی باوەڕ پێی، ملکەچ بـوون بـە مـەزن ڕاگرتنی فەرمان پێکراوەکـان و نـەهی لێکراوەکـان، هـەر بـەو جـۆرە بەڕاسـت زانـینی

بەڵێن و هەڕەشەکان، مامەڵەی خۆیان لەسەر یەقین دامەزراند، نەك لەسەر شك و دڵەڕاوکێ و گرتنەبەری ڕێگەی ئەگەر و نەگەر، وەك شاعیرێك دەڵێت:

زعم المنجم والطبيب كلاهما لا تبعث الأجساد، قلت إليكما

إن صح قولكما فلست بخاسر أو صح قولي فالخسار عليكما

(ئەستێرەناس و پزیشك هەردوو بانگەشەی ئەوەیان کرد کە جەستە زیندوو ناکرێتەوە، وتم بەسە: گەر قسەکەتان ڕاست بێت من زیانۆمەند نیم، بەڵام گەر قسەکەی من ڕاست بێت ئەوا زیانۆمەندی بەسەر ئێوەدا دەشکێتەوە)

ئەمە ڕێگەی ئەهلی گومانە، بە کاری ئەمر و نەهی هەڵدەستن وەك ئەگەر و نەگەرێك مامەڵەی دەکەن، ئەم ڕێگەیە مرۆڤ لە سزای خودا قوتار ناکات و بەختەوەری بۆ خاوەنەکەی بەدەست ناهێنێت و نایگەنێتە شوێنی سەلامەتی.

ئەو ویژدانەی مامەڵەی خۆیان لەسەر دامەزراند: بریتییە لە ویژدان لە مامەڵەی خودا و خەڵکیدا.

**ویژدان لە مامەڵەکردن لەگەڵ خودادا:** ئەوەیە ماف بەندایەتی بدات، ململانێ لەگەڵ خودادا نەکات بە سیفاتە خواوەندییەکانی کە شایستەی بەندە نییە و نابێت داوای بکات، وەك مەزنی و شکۆمەندی و جەبەرووت (**العظمة والكبرياء والجبروت**).

لە ویژدانی مامەڵەکردن لەگەڵ خودادا ئەوەیە لەسەر ئەو نیعمەتانەی خودا پێی بەخشیوە شوکری خودای لەسەر بکات، نەك شوکری کەسانی تر، نیعمەتەکانی لەبیرنەچێت و نەیانکات بە کۆمەکی بۆ ئەنجامدانی گوناه و خراپە.

## ۞ ناپەیوەستبوون (لا علائق)

**دەستگرتنی تایبەتەکان:** بریتییە لە پۆشینی ئەخلاق لەوەوە بە باڵای خەڵکیدا بە پانوپۆڕی، و نەرێکردنی پەیوەستبوونەکان بە لێبڕان.

ئەخلاقی باش و جوان و پاکژیی کردنی دەروون و ڕازاندنەوەی بە ئەخلاقی بەرز و بڵند بەڵگەی فراوانیی دڵی خاوەنەکەی و بەخشندەیی دەروون و ناخی پاکییەتی، لەم وەسفەدا: ئازارنەدانی مەردوومان و شاندانە ژێر کۆڵی ئازارەکانیان بوونی هەیە.

**نەرێكردنی پەیوەستبوونەكان لەڕووی لێبڕانەوە:** بریتییە لە ویست و لێبڕانی تەواو بۆ نەرێكردنی پەیوەستبوونەكان و وازلێهێنانیان لە ناوەوە و لە دەرەوە.

بنچینەكەی بریتییە لە بڕینی وابەستبوونەكانی ناوەوە، هەر كات لە ناوەوە بڕینی ئەوا پەیوەستبوونەكانی دەرەوە زیانی پێناگەیەنن، هەر كات ماڵ و دارایت لە دەستدا بوو، نەك لە دڵدا ئەوا هیچ زیانێكت پێناگەیەنێت با زۆریش بێت، هەر كات ماڵ و دارایی لە دڵدا بێت زیانت پێ دەگەیەنێت با هیچیشت بەدەستەوە نەبێت.

وترا بە ئیمام ئەحمەد: دەگونجێ پیاوێك زاهید بێت و هەزار دیناری پێ بێت؟

فەرمووی بەڵێ، بە مەرجێ خۆشحاڵ نەبێت كە زیاد دەكات و خەفەتبار نەبێت كە كەم دەكات.

لەوانەیە-رەحمەتی خودای لێ بێت- مەبەستی خۆشحاڵی فەخر و شانازی و خۆ لێ بایيبوون بێت، بەڵام خۆشحاڵی بە نیعمەت و رێزی لێبگرێت و شوكری بكات و لە شوێنی خۆی بەكاری بهێنێت لەو شتانەیە خودا پێی خۆشە و پێی رازییە، ناگونجێت ئیمام ئەحمەد ئەوەی پێ باش نەبووبێت.

بۆیە هاوەڵان زاهیدترین كەسی ئەم ئوممەتە بوون لەگەڵ ئەو ماڵ و سامانەی لەبەر دەستیان بوو.

**وترا بە سوفیانی سەوری:** ئایا خاوەن ماڵ و دارایی زاهید دەردەچێت؟ فەرمووی: بەڵێ، بە مەرجێ كاتێك ماڵەكەی زیاد دەكات شوكری خودا بكات و كاتێك ماڵەكەی كەم دەكات شوكر بكات و ئارام بگرێت.

بڕینی پەیوەستبوونەكانی دەرەوە لە دوو شوێندا ستایشكراوە: لە شوێنێكدا ترسی ئەوەی هەبێت زیان بە ئایینەكەی بگەیەنێت، یان لە شوێنێك بەرژەوەندییەكی پارسەنگی تێدا نەبێت، كەماڵ لەمەدا: بڕینی هەموو ئەو پەیوەستبوونانەی كە دەبنە قوڵاپ لەسەر پردی صراط و رێگەی لێ دەگرن لە پەڕینەوە كە بریتین لە قوڵاپەكانی "شەهوات و شبهات"، لەدوای ئەوانە پەیوەستبوونی تر زیانی پێ ناگەیەنێت.

لوتكەی دەستگرتن بە نزیكی دەبێت لە خوداوە، گومانی تێدا نییە بەندە لە خودا نزیك دەبێتەوە، خوداش لە بەندە نزیك دەبێتەوە، نزیكبوونەوەی بەندە: وەك ئایەتی

﴿وَٱسْجُدْ وَٱقْتَرِب ۩ ﴿١٩﴾﴾ العلق: ١٩، هەروەها ئەو فەرموودە قودسییەی كە دەفـەرموێت ((من تقرب مني شبرا تقربت منه ذراعا))، هەروەها فەرموودەی ((وما تقـرب إلـي عبـدي بمثل أداء ما افترضت عليه، ولايزال عبدي يتقرب إلي بالنوافل حتى أحبه، فإذا أحببته كنـت سمعه الذي يسمع به، وبصره الذي يبصر به، ويده التي يبطش بها، ورجله التي يمشي بها، فبي يسمع، وبي يبصر، وبي يبطش، وبي يمشي)) لە فەرموودەیەكی سەحیحدا ((أقرب ما يكون الرب من عبده في جوف الليل الأخير))، لە فەرموودەیەكی تردا ((أقرب ما يكون العبد من ربه وهو ساجد))، لـە فەرموودەیـەكی سـەحیحی تـردا –كاتێـك دەنگیـان بـە ألله أكـبر لەگەڵ پێغەمبەر بەرزبوویـەوە لـە سـەفەردا– فـەرمووی ((يـا أيهـا النـاس أربعـوا علـى أنفسكم، إنكم لا تدعون أصما ولا غائبا، إن الذي تدعونه سميع قريب، أقرب إلى أحدكم من عنق راحلته))

❁ ❁ ❁

## (١٠) (منزلة الفرار)

# مەنزیلەی هەڵهاتن

لە مەنزیلەكانی ((**إياك نعبد وإياك نستعين**)) بریتییە لە مەنزیلەی هەڵهاتن بۆ لای خودا.

خـــودای موتـــەعال دەفـــەرمویت ﴿ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ ﴾ الـــذاريات: ٥٠، حەقیقـــەتی هەڵهاتن(الفرار) بریتییە لە راكردن لەدەست شتێك بۆ لای شتێكی تر، ئەوەش دوو جۆرە: هەڵهاتنی بەختەوەران، و هەڵهاتنی بەدبەختان.

**هەڵهاتنی بەختەوەران:** بریتییە لە هەڵهاتن بۆ لای خودا، هەڵهاتنی بەدبەختانیش بریتییە لە هەڵهاتن لە خودا، بەڵام بۆ لای خودا نە.

**هەڵهاتن لە خودا بۆ لای خودا** بریتییە لە هەڵهاتنی دۆستەكانی خودا، ئیبن عباس لەسەر ﴿ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ ﴾ دەفەرمویت: لە خوداوە هەڵبێن بۆ لای خودا، كار بە گوێڕایەڵی خودا بكەن، سەهلی كوڕی عەبدوڵا دەڵێت: لە غەیری خودا هەڵبێن بۆ لای خودا، هەندێكی تر دەڵێن: لە سزای خودا هەڵبێن بۆ لای پاداشتی خودا بە باوەڕ و گوێڕایەڵی.

**نزمترینی: هەڵهاتن** لە نەزانی بۆ لای زانست بە لێبڕان و هەوڵ و كۆشش، لە تەمبەڵی بۆ لای خۆ یەكلایی كردنەوە بە سووربوون و لێبڕان، هەڵهاتن لە تەنگەلانی بۆ لای بەرینی و فراوانی بە متمانە و رجا.

**نەزانی دوو جۆرە:** نەبوونی زانست بە راستەقینەیەكی قازانجبەخش، هەروەها كارنەكردن بەپێی داواكارییەكانی، هەردووكیان نەزانییە لەڕووی زمانەوانی و عورف و شەرع و راستییەوە، موسا (عليه السلام) دەفەرمویت ﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ۝٦٧﴾ البقرة: ٦٧ كاتێك هۆزەكەی پێیان وت ﴿أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا ﴾، واتە تۆ لە گاڵتەكەرانی، یوسوف صدیق دەفەرمویت﴿وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّى كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ۝٣٣﴾ یوسف: ٣٣، واتە دەگەڕێم لە ریزی ئەوانەی بەو كارانە هەڵدەستن كە لەسەریان حەرامكراوە، هەروەها خودای موتەعال دەفەرمویت ﴿ إِنَّمَا ٱلتَّوْبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ﴾ النساء: ١٧.

**قەتادە دەفەرموێت:** هاوەڵانی پێغەمبەر کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی هەر شتێك بە هۆیەوە مرۆڤ لە خودا یاخی ببێت بریتییە لە نەفامی، کەسانی تریش دەڵێن: هاوەڵان کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی هەر کەسێك لە خودا یاخی ببێت نەفامە.

**هەڵهاتنی ناویراو هەڵهاتنە لە دوو نەفامییەکە (نەزانینەکە):** لە نەزانی بە بەدەستهێنانی زانست لەڕووی باوەڕ و مەعریفە و بینینی ڕۆشنەوە، لەگەڵ نەزانی بە کردار بە هەوڵ و کۆششی بەسوود و کاری چاکەی مەبەستدار و هەوڵی پڕ لە کۆشش.

پاشان هەڵدێت لە وەلامدانەوەی بانگکەری تەمبەڵی بۆ لای بانگەری کار و یەکلابوونەوە و سووربوون و کۆششی سەرومڕ.

**سووربوون و پێداگری و لێبڕان ((الجد))** لێرەدا بریتییە لە ڕاستێتی کار و کردەوە و پاککردنەوەیان لە خەوش و خەڵتەی خاوبوونەوە و ساردبوونەوە، هەروەها دوورخستنەوەیان لە بەڵێنی دواخستن و خەمساردی، هەموو ئەمانە لەژێر وشەی دواتر، پاشان، لەوانەیە، بۆی هەیە (سین، سوف، عسی، لعل)دایە، کە زیانبەخشترین شتن بۆ بەندە، ئەوانە درەختێکن بەرەکەیان بریتییە لە زیانۆمەندی و پەشیمانی.

**جیاوازی نێوان سووربوون و لێبڕان (الجد والعزم):** لێبڕان بریتییە لە ڕاستێتی ویست و کۆکردنەوەی، سووربوونیش بریتییە لە ڕاستێتی کردار و بەختکردنی تێکۆشان تیایدا، خودای موتەعال فەرمانی کردووە فەرمانەکانی بە لێبڕان و سووربوونەوە وەربگیرێت ﴿خُذُواْ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ﴾ البقـــــرة: ٦٣ ﴿وَكَتَبْنَا لَهُۥ فِى ٱلْأَلْوَاحِ مِن كُلِّ شَىْءٍ مَّوْعِظَةً وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَىْءٍ فَخُذْهَا بِقُوَّةٍ﴾ الأعراف: ١٤٥ ﴿يَٰيَحْيَىٰ خُذِ ٱلْكِتَٰبَ بِقُوَّةٍ﴾ مریم: ١٢، واتە بە سووربوون و کۆشش و لێبڕانەوە، نەك وەك کەسێك ئەوەی فەرمانی پێکراوە بە دڵڕاوکێ و خاوی و ساردییەوە دەستی بۆ دەبات.

پاشان بەندە لە تەسکی دەروونی هەڵدێت لە خەم و پەژارە و دڵتەنگی و ترسەوە کە لەم ژیانی دونیایەدا ڕووبەڕووی دەبێتەوە لە خودی خۆیەوە، یان لە دەرەوەی خۆیەوە کە پەیوەندی بە بەرژەوەندی خۆیەوە هەیە یان بەرژەوەندی ئەو کەسانەی پەیوەنییان بەوەوە هەیە، هەروەها ئەوەی پەیوەندی بە ماڵ و دارایی و جەستە و خانەوادە و دوژمنەکەیەوە هەیە، بە تەسکی دەروونی بە هەموو ئەوانەوە هەڵدێت بۆ لای فراوانی و بەرینی فەزای متمانە بە خودا –تبارك وتعالى– و ڕاستێتی پشتبەستن بەو و ڕجای باش

لەلای بەهۆی ئەو چاکانەی لەگەڵی کردووە و پێشبینی رجاکراو لە لوتف و چاکەی خودا، باشترین قسەی خواناسان ئەوەیە کە دەڵێت: هیچ خەمێك لەگەڵ خودادا بوونی نییە ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ۝٢ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ﴾ الطلاق: ٢ – ٣

رەبیعی کوڕی خیثم دەڵێت: دەرووی لێدەکاتەوە لە هەموو ئەو شتانەی لە خەڵکی بەرتەسك بوونەتەوە، ئەبو العالیة دەڵێت: دەروو لە هەموو تەنگەلانییەك، ئەمەش هەموو تەنگەلانییەکی دونیا و دوارۆژ دەگرێتەوە، هەروەها هەموو بەرتەسکییەکی دونیا و دوارۆژ، خودا ئەوەی لە خەڵکی بەرتەسك بووەتەوە و بووە بە تەنگەلانییان بۆ کەسانی خۆپارێز (المتقي) دەیگۆڕێت بە دەروو، حەسەن دەفەرموێت: دەرچەیەك بۆ دەرچوون لەوەی خودا نەهی لێکردووە ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ﴾الطلاق: ٣، واتە بەسە بۆ کەسانێك متمانەیان بە خودایە لە کاتی بەلا و ناخۆشی و تەنگەلانییەکانی ژیاندا، خودای بەسە بۆ هەموو ئەو خەمانەی داگیری دەکات، وشەی "الحسب" واتە بەسییەتی، ﴿حَسْبُنَا ٱللَّهُ﴾.التوبة: ٥٩، واتە خودامان بەسە.

هەتا بەندە گومانی باشی بە خودا بێت و رجای باشی بەو بێت و لە پشتبەستنی بە خودا راست بکات، ئەوا هەرگیز خودا بێهیوای ناکات، چونکە ئەو–سبحانه– خاوەن هیواکان لەخۆی رەشبین ناکات، کاری خاوەن کردارەکان بەفیڕۆ نادات، بە "فراوانی" مانای "متمانە"ی دەربڕی، هەروەها گومانی چاکە بە بەرینی و فراوانی، هیچ شتێك لەدوای باوەڕ بە ئەندازەی متمانە بە خودا و رجا بەو و گومانی باش بردن بە ئەو سنگ والا و بەرین ناکات.

## ۞ رووتبوونەوە

دوورترین هەڵهاتن بریتییە لە رەسم و رواڵەت بۆ لای بنچینە و بنەما، هەروەها هەڵهاتن لە بەشی خۆ بۆ لای رووتبوونەوە، خاوەنانی لێبڕان لە رۆیشتنیان بەرەو خودا بە رەسم و رواڵەتی کار و کردەوەکان رازی نابن، بەڵکو خۆیان دەگەیەننە رۆح و حەقیقەتی ئەو کاروکردەوانە، ئەم بڕ و رادەیە زەندیقان و رێگرانی فەوتاندووە، ئەوان کە زانییان رۆح و حەقیقەتی ئەو کار و کردەوانە پێویست و داواکراون، نەك

وێنە و سێبەر و ڕووالەتیان، وتیان: ئێمە خەمی خۆمان لەسەر مەرام و حەقیقەتی ئەو كاروكردەوانە كۆدەكەینەوە و پێویستمان بە وێنە و ڕووالەتیان نییە، بەڵكو خەریكبوون بە ڕووالەتەوە خەریكبوونە بە هۆكارەوە لە جێگەی ئامانج، هەروەها خەریكبوونە بە داواكراو بۆ دەرەوەی خۆی لە داواكراو لە خودی خۆیدا، ئەوەی ئەوانی ڕووبەڕووی سەرلێشێوان كردەوە بینینی خەڵكانی وەستاو لەسەر وێنە و ڕووالەتی كار و كردەوەكان بوو، بەبێ ڕەچاوكردنی حەقیقەت و مەبەست و ڕۆحی كاروكردەوەكان، نەفسی خۆیان وا هاتە پێش چاو كە لە نەفسی ئەوانە بالاتر بێت، هەروەها لێبڕانیان لە لێبڕانی ئەوان زۆرتر و زیاتر بێت، پێیان وابوو ئەوان بە كرۆكەوە خەریكن و ئەوانی تریش بە توێكڵەوە، لە كەمتەرخەمی ئەوان و دەستدرێژی ئەمان پەكخستن و وازلێهێنان سەری هەڵدا.

**پوختەكەی:** ئەوانە نهێنی و مەبەست و حەقیقەتی كار و كردەوەكانیان پەكخستووە، ئەوانە وێنە و ڕووالەتیان پەكخستووە و واگومان دەبەن دەگەنە حەقیقەتی ئەو كار و كردەوانە، بەبێ وێنە و ڕووالەت، نەیانتوانی بگەنە هیچ شتێك جگە لە بێباوەڕی و زەندەقە، ئەوەی پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە كرابوو نەرێیان كرد و ملپێچییان نیشان دا، ئەوانە بێباوەڕ و دووڕوو و زەندیقن و كەمتەرخەم و ناتەواون، بەڵام ئەوانەی بە ڕووالەت و بە ناوەرۆك هەڵدەستن وادەبینن فەرمان ڕووی لە دڵ كردبێت بەر لە ئەندامەكانیان، لەسەر دڵ جۆرە بەندایەتییەك پێویستە وەك چۆن لەسەر ئەندامەكان پێویستە، هەروەها پەكخستنی بەندایەتی دڵ وەك پەكخستنی بەندایەتی ئەندامەكان وایە، ئەوانە تایبەتەكانن لە ئەهلی باوەڕ و ئەهلی زانست و عیرفان، ئەوانەی هەڵهاتنەكەیان بۆ لای خودا تەواو دەكەن بە ڕاكردن لە بەشی دەروون بە جیاوازی پلەكانییەوە، هەڵدێن بۆ لای ڕووتبوونەوە، ئەو بەشانەی نەفس تەنها ئەوانە دەیزانن گرنگی بە ناسینی خودا و مورادی دەدەن، هەروەها گرنگی بە مافی خودا لەسەر بەندەكەی و ناسینی دەروون و كردار و ئافاتەكانیان، لەوانەیە داوای گەورە و مەزنی عابیدان لەلای دەستەیەكی تر لە خوداناسان بە بەشی نەفس تەماشا بكرێت، داوای لێبوردن لە خودا بكەن و لێی هەڵبێن بۆ لای خودا، وای دەبینن بووە بە پەردە لەنێوان ئەوان و داواكەیاندا (كە خودایە).

بەشی نەفس: بریتییە لە شتگەلێك جگە لە مەبەستی ئایینی خودا لە تۆ، هەرچییەك بێت، ئەمەش بەشی حەرام و مەکروه و موباح و موستەحەب دەگرێتەوە، جگە لەوانە لەلای خودا خۆشەویستترە، ئەمە جیاناکرێتەوە مەگەر کەسەکە لە مەقامی زانستی قووڵ و ریشەداردا بێت بە خودا و فەرمانی خودا، هەروەها زاست بە نەفس و دۆخ و سیفاتی.

لێرەدا بەشی نەفس لە ماف جیادەبێتەوە، لە بەشی نەفس هەڵدێت بۆ رووتبوونەوە، زۆربەی خەڵکی ئەمەیان بۆ شیاو نییە، چونکە خودا بە بەشی دەروونی خۆیانەوە دەپەرستن و بەپێی ویست و مەرامی خۆیان بەندایەتی دەکەن.

بە کورتی: خاوەنی ئەم رووتبوونەوەیە: بە شتێك لە خوداوە قەناعەت ناکات و سوکنایی بۆ نایەت جگە لە بەشی خودا خۆی، دڵخۆش نابێت بە هیچ شتێك لەخوار خوداوە، بۆ هیچ شتێك خەم ناخوات لەدەستی چووبێت جگە لە خودا، بە پلەیەکی باڵا بێنیاز نابێت با لای خۆی و خەڵکی مەزن بێت، ئەو تەنها بە خوداوە لە شتەکانی تر بێنیاز دەبێت، هەژارییەکەی تەنها بۆ لای خودایە، تەنها بە تەبایی لەگەڵ رەزامەندی خودا خۆشحاڵ دەبێت، تەنها بە لەدەستچوونی ئەوەی لەلای خودا لەدەستی چووە دڵتەنگ دەبێت، تەنها لە لەبەرچاوکەوتنی خودا و سەرهەڵدانی پەردە لە نێوان ئەو خودادا دەترسێت، هەموو بوونی بە خوداوەیە، هەموو بوونی بۆ خودا و لەگەڵ خودایە، رۆیشتنی بە هەمیشەیی بۆ لای خودایە، زانستی بۆ باڵاکراوە و خۆی بۆ یەکلاکردۆتەوە، داواکراوەکەی لە بەشی نەفس رووتکردۆتەوە و کاری بۆ دەکات، بەشی نەفس بانگی دەکات: وەرە بۆ لام، ئەویش دەڵێت: من ئەو کەسەم دەوێت کە بەدەستم هێنا هەموو شتێك بەدەست دەهێنم، گەر لەدەستم دەربچێت هەموو شتێکم لەدەست دەرچووە، ئەو لەگەڵ خودادایە و لە دروستکراوەکانی رووتبووەتەوە، لەگەڵ خەڵکیدایە و لە بەشی نەفسی پاکبووەتەوە، لەگەڵ فەرماندایە و دابڕاوە لە بەشی نەفسێك ململانێ لەگەڵ فەرماندا دەکات، بەڵام ئەو بەشەی یارمەتی راپەڕاندنی فەرمان دەدات: ئەوە دەست بۆ بردنی لە پلە و پایە دانابەزێنێت و لەبەر چاوی پەروەردگاری بەرنابێتەوە.

ئەم بابەتە بابەتێكە كە هەندێ لە شێخان تیایدا بە هەڵەداچوون، وا گومان دەبەن ویستی بەشی نەفس ناتەواوییە لە ویستدا.

بەدواداچوون و راستێتی ئەمە: ئەوەیە كە دوو جۆر بەشی نەفس هەیە: بەشێك ململانێ دەكات لەگەڵ فەرمانی خودادا، لەگەڵ بەشێك پشتیوانی لە فەرمانی خودا دەكات و دەبێتە هۆی جێبەجێ كردنی، یەكەمیان زەمكراوە و دووەمیان مەدحكراوە، دەستبردن بۆ دووەم لە كەماڵی بەندایەتییە، ئەم دووەمەیان رەنگێكی ترە و ئەوەی یەكەمیان رەنگێكی تر.

۞ ۞ ۞

# ((١١) (منزلة السماع))

## مەنزیلەی بیستن

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی "بیستن"ە.

وشەی بیستن (السماع) ناوی چاوگە وەك وشەی "النبات"، خودای موتەعال لە كتێبەكەیدا فەرمانی پێكردووە و مەدح و سەنای ئەهلی بیستنی كردووە ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاسْمَعُوا﴾ المائدة: ١٠٨ ﴿وَاسْمَعُوا وَأَطِيعُوا﴾ التغابن: ١٦ ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ قَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَاسْمَعْ وَانظُرْنَا لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَقْوَمَ﴾ النســـــاء: ٤٦ ﴿فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ هَدَاهُمُ اللَّهُ وَأُولَٰئِكَ هُمْ أُولُو الْأَلْبَابِ ﴿١٨﴾﴾ الزمر: ١٧ – ١٨ ﴿وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنصِتُوا ﴿٢٠٤﴾﴾ الأعراف: ٢٠٤ ﴿وَإِذَا سَمِعُوا مَا أُنزِلَ إِلَى الرَّسُولِ تَرَىٰ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا مِنَ الْحَقِّ﴾ المائدة: ٨٣

پێ بیستن لە خوداوە و بیستن لەوانەوە بەڵگەیە لەسەر زانینی خێر تیایاندا، نەبوونی بیستنی كرد بە بەڵگە لەسەر نەبوونی خێر لەواندا ﴿وَلَوْ عَلِمَ اللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوا وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾﴾ الأنفال: ٢٣

هەواڵی دەربارەی دوژمنەكانی راگەیاند: ئەوانە كۆچیان لە بیستن كردووە و نەهی لێدەكەن ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَسْمَعُوا لِهَٰذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ﴾ فصلت: ٢٦.

بیستن پەیامنێری باوەڕە بۆ ناو دڵ، بانگكەری دڵ و مامۆستایەتی، لە زۆر شوێنی قورئاندا دەفەرموێت ﴿أَفَلَا يَسْمَعُونَ ﴿٢٦﴾﴾ السـجدة: ٢٦ ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَٰكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ ﴿٤٦﴾﴾ الحج: ٤٦

بیستن بنچینەی ژیرییە و ئەو باوەڕەیە لەسەری دامەزراوە، بیستن دەبێتە پێشەنگ و هاودەم و وەزیری باوەڕ، بەڵام هەموو شكۆ و گەورەیی بۆ بیستنە، بەیەكداكێشانی خەڵكی و جیاوازییان بەهۆی بیستن و بۆ بیستن دەگەڕێتەوە، كۆمەڵێك بە هۆیەوە ڕووبەڕووی هەڵە بوونەتەوە.

**حەقیقەتی بیستن:** ئاگادارکردنەوەی دڵە بە مانا بیستراوەکان، و بزواندنی بەو مانانە لە ڕووی داوا و هەڵهاتن و خۆشویستن و ڕقلێبوونەوە، ئەو کەسەیە هەموو کەسێك دەداتە بەر بۆ نیشتمان و ئەو شوێنەی هۆگری بووە.

**خاوەنی بیستن هەیانە:** بە سروشت و دەروون و حەزی خۆی گوێدەگرێت، ئەمە بەشی ئەو کەسەیە لە بیستن، ئەوەی لەگەڵ حەز و سروشتیدا تەبایە.

**هەیانە:** بە حاڵ و باوەڕ و مەعریفە و ژیری خۆی گوێدەگرێت، ئەم کەسە لە بیستراو سوودمەند دەبێت بەپێی ئامادەیی و هێز و جۆری بیستراوەکە.

**هەیانە:** بە خوداوە گوێدەگرێت، بە غەیری خوداوە گوێناگرێت، وەك لە فەرموودە قودسییە سەحیحەکەدا هاتووە ((**فبي يسمع وبي يبصر**)) –بە من گوێدەگرێت و بە من دەبینێت، ئەمەیان باڵاترین بیستنە و لە هەموویان دروستترە.

قسەکردن لەسەر بیستن بە مەدح و بە زەم پێویستی بە ناسینی وێنەی بیستراوەکە هەیە، هەروەها ناسینی حەقیقەت و هۆیەکەی و پاڵنەرەکە و بەربووم و ئامانجەکەی، بەم سێ بەشە کاری "بیستن" سەرنووس دەبێت و بەسوودی لە بێسوود و حەقی لە باتڵ و مەدحکراوی لە زەمکراو جیادەبێتەوە.

**بیستراو سێ جۆرە:**

**یەکەم:** بیستراوێك خودا و پێغەمبەری خودا(ﷺ) خۆشیان دەوێت و پێی ڕازین، فەرمانی پێکردووە بە بەندەکانی، مەدح و سەنای ئەهلەکەی کردووە و لێیان ڕازی بووە بەو بیستنە.

**دووەم:** بیستراوێك خودا پێی ناخۆشە و بە ناپەسەندی دەزانێت و نەهی لێکردووە، هەر بەو جۆرە مەدحی ئەوانەی کردووە کە گوێی بۆ ناگرن و پشتی تێدەکەن.

**سێیەم:** بیستراوێکی موباحی مۆڵەت پێدراو، نە خۆشی دەوێت و نە ڕقی لێیەتی، نە خاوەنەکەی مەدحکراوە و نە زەمکراوە، ئەمەیان حوکمەکەی وەك حوکمی هەموو موباحەکانی تر وایە: لە سەیرکراوەکان و بۆنکراوەکان و چێژکراوەکان و لەبەرکراوە موباحەکان. هەر کەس ئەم جۆری سێیەمەی حەرام کردووە ئەوە شتێکی لەسەر خودا وتووە کە نایزانێت و نەیزانیوە، شتێکی حەرام کردووە کە خودا بە حەڵاڵ دایناوە، هەر کەسیش کردوویەتی بە بەشێك لە ئایین و وەك کارێکی چاکە بۆ نزیکبوونەوە لە خودا

تەماشای دەکات ئەوە درۆی بە دەم خوداوە کردووە و ئایینێکی تەشریع کردووە خودا مۆڵەتی پێنەداوە، لەو کارەیدا هاوشێوەی هاوەڵدانەرانە.

## ✿ بیستنی ئیمانیانە

جۆری یەکەم: ئەو جۆرە بیستنەیە کە خودا لە کتێبەکەیدا مەدحی کردووە و فەرمانی پێکردووە و سەنای خاوەنی ئەو جۆرە بیستنەی کردووە و زەمی پشتهەڵکرانی کردووە و نەفرەتی لێکردوون و لەخوار ئاژەڵەوە دایناون، ئەوانەش ئەوانەن لە ئاگردا دەڵێن ﴿لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ ﴿١٠﴾﴾ الملك: ١٠، ئەو بیستنە بریتییە لە بیستنی ئایەتە خوێنراوەکانی خودا کە دایبەزاندووە بۆ سەر پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، ئەم بیستنە بناغەی باوەڕە و بینای باوەڕی لەسەر دادەمەزرێت، ئەمەش سێ جۆرە: یەکەم، بیستنی پەیبردن: بە هەستی گوێ (بیستن)، لەوێوە بیستنی تێگەیشتن و ژنەوتن، بیستنی تێگەیشتن و وەڵامدانەوە و قبووڵ کردن، سێیەم بریتییە لە بیستنی قورئان.

بیستنی پەیبردن: بریتییە لە ئەو ئایەتەی کە چیرۆکی دەستەیە لە جینی باوەڕدارمان بۆ باس دەکات ﴿إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا ﴿١﴾ يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ﴾ الجن: ١ – ٢، هەروەها ئایەتی ﴿يَا قَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنَا كِتَابًا أُنزِلَ مِن بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾﴾ الأحقاف: ٣٠، ئەمە بیستنی پەیبردنە کە باوەڕ و وەڵامدانەوەی لەگەڵە.

بیستنی تێگەیشتن: نەرێکراوە لەوانەی پشتهەڵدەکەن و بێناگان، وەك ﴿فَإِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ الصُّمَّ الدُّعَاءَ﴾ الـروم: ٥٢ ﴿إِنَّ اللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَاءُ ۖ وَمَا أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي الْقُبُورِ﴾ فاطر: ٢٢

تایبەتکردنەوەکە لێرەدا بۆ بیستنی تێگەیشتن و ژنەوتنە، ئەگینا بیستنی گشتی کە بەڵگەی پێ دەهێنرێتەوە: تایبەت کردنی تێدا نییە، وەك ئایەتی ﴿وَلَوْ عَلِمَ اللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ ۖ وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوا وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾﴾ الأنفال: ٢٣، واتە: گەر لەو کەسە بێباوەڕانەدا قبووڵ کردن و ملکەچی بوونی هەبوایە ئەوا خودا تێیدەگەیاندن، ئەگینا ئەوان تەنها وەك بیستنێکی پەیبردن بیستوویانە، گەر خودا تێیان بگەیەنێت پشتهەڵدەکەن و خۆیانی لێ لادەدەن، گەر تێشیان بگەیەنێت نە ملکەچ دەبن و نە

سوود لەو تێگەیشتنە دەبینن، چونکە لە دڵیاندا بانگکەری پشتهەڵکردن و خۆلادان بوونی هەیە، کە ڕێگەیان لێ دەگرێت سوود ببینن لەوەی دەیبیستن.

<u>بیستنی قبوول و وەڵامدانەوە</u>: لەو ئایەتە پیرۆزەدا کە بەسەرهاتی بەندە باوەڕدارەکان باس دەکات، ئەوان وتیان ﴿سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا﴾ النور: ٥١، ئەمەیان بیستنی قبوول و وەڵامدانەوەیە و بەرهەمهێنی گوێڕایەڵییە.

راستییەکەی: ئەو ئایەتە هەر سێ جۆرەکەی تێدایە، ئەوان رایانگەیاند کە پەییان بە بیستراوەکە بردووە و تێگەیون و وەڵامیان داوەتەوە.

لە بیستنی قبوول کردن ئایەتی ﴿وَفِيكُمْ سَمَّاعُونَ لَهُمْ﴾ التوبة: ٤٧، واتە قسەیان لێ وەردەگرێت و قبووڵی دەکات و وەڵامیان دەداتەوە.

مەبەست ئەوەیە کە بیستنی نزیکان لە خودا بریتییە لە بیستنی قورئان بە سێ ئاست: پەیبردن و تێگەیشتن، و تێڕامانی قووڵ، و وەڵامدانەوە، هەر بیستنێك لە قورئاندا خودا مەدح و سەنای خاوەنەکەی کردبێت و فەرمانی بە دۆستانی کردبێت لەسەری ئەو بیستنە ئەم جۆرەیە، کە بریتییە لە بیستنی ئایات، نەك بیستنی بەیت و بالۆرە، بیستنی قورئان، نەك بیستنی جووزەلەی شەیتان، بیستنی پەروەردگاری زەوی و ئاسمان، نەك بیستنی چامەی شاعیران، بیستنی رێنومایییەکان، نەك بیستنی قەسیدە دووروودرێژەکان، بیستنی کەلامی پێغەمبەران، نەك بیستنی گۆرانیبێژە هەرزەکارەکان.

ئەم بیستنە هێزێکی راکێشەرە کە دڵان رادەکێشێت بۆ لای خودای زانا بە جیهانی پەنهان، هێزێکە رۆحەکان بۆ وڵاتی ئاسوودەیی دەداتە بەر، بزوێنەرێکە ویست و لێبڕان بۆ باڵاترین مەقام و بەرزترین پلە بەگەڕ دەخات، بانگکەرێکە بانگ بۆ باوەڕ دەکات، رێگەنیشاندەرێکە قافڵەکە بەرەو رێگەی بەهەشت رێنومایی دەکات، بانگوێژێکە بەیانیان و ئێواران بانگ لە دڵان دەکات لە خوداوە "حي على الفلاح، حي على الفلاح"

هەر کەس ئەم بیستنەی هەبێت ئەوا هیچ کام لەم کارە مەزنانەی لەدەست دەرناچێت: رێنومایی بە بەڵگە بۆ بڕینی پاساو و بیانوو، و بینینی رۆشنی پەند و ئامۆژگاری، و یادکردنەوە بۆ مەعریفە، و بیرکردنەوە لە بەڵگە و نیشانە، و بەڵگە لەسەر پێگەیشتن و کەماڵ، و بەرپەرچدانەوەی گومڕایی، رێنومایی ئەوانەی سەریان

لـیّ دەشـێوێت، و چـاو ڕۆشـنكردنەوەی ئەوانـەی كوێربـوون، و فـەرمانكردن بـە بەرژەوەندی، و نەهیكردن لە زیانبەخش و شتی تێكدەر، و هیدایـەت بـۆ لای نـوور، و هاتنـە دەرەوە لـە تـاریكی، و دەمكـوتكردنی ئـارەزوو، و هانـدان بـۆ خۆپـارێزی، و ڕۆشـنبوونەوەی بیـنین، و زینـدەگی دڵ، و خـۆراك و دەوا و شـفای دەروون، و دەستگرتن بە پەتی ڕزگارییەوە، و پەردەلادان لەسـەر بابەتـە لێـڵ و تەمومـژەكان، و ڕۆشنكردنەوەی بورهان، و جێگیربوونی حەق، و پووچبوونەوەی باتڵ.

هەر كەس قورئانی بەسەردا خوێنرایەوە با خـۆی وا دابنێـت وەك ئـەوەی لـە خـوداوە بیبیستێت و گفتوگۆی پیّ بكات، لەو كاتەدا مانای بیسـتراو و لـەتائیف و نهێنییـەكان لەسـەر دڵـی كەڵەكـە دەبـن، ئـەوەی دەتـەوێت لـە زانسـت و حیكمـەت و ڕۆشـنبینی و هیدایـەت، زیـاتر خـۆی هاندەدات و سـەفەر بـۆ لای ئامـانجی بـە مەبەسـتگیراو دەسـت پێدەكات بەهۆی ئەو بیستنەی كراوە بە وەسیلە بۆ لای ئامانجەكە، ئەوەش بریتییـە لـە خودای موتەعال، ئەو ـسبحانه ـ ئامـانجی هـەموو داوایەكـە ﴿ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿٤٢﴾ ﴾ النجم: ٤٢، لەو دیوی خوداوە ئامانجێكی تر بوونی نییە، لەخوار خوداوەش جێگەیـەك بۆ ئارامی و جێگیربوون بوونی نییـە، چـاو بـە غـەیری ئـەو ڕۆشـن نابێتـەوە، هەرچـی داواكراوە لە خوار ئەوەوە سێبەرێكی سڕاوە و تیاچووە، و خـەیاڵێكی گـوزەركردووە، با خاوەنەكەشی چێژی لیّ ببینێت، بەڵام چێژێكی فریودەرە.

## ❁ بیستنی زەمكراو و ناپەسەند

بیستنێكی تر كە خودا ڕقی لێیەتی و ناپەسەندە و مەدحی ئەو كەسانە دەكات كە پشتی لـیّ هەڵدەكـەن بریتییـە لـە بیسـتنی هـەموو ئەوانـەی زیـان بـە دڵ و ئـایینی كەسـەكە دەگەیـەنن، وەك بیسـتنی باتـڵ بـە هـەموو جۆرەكانییـەوە، مەگـەر بەرپەرچـدانەوە و پووچەڵكردنەوە و پەند و وانە لەئامێز بگرێت، یان مەبەستی ئەوە بێت بەهۆیەوە دژەكەی بە باش بزانێت، چونكە دژ باشی و جوانی دژ دەردەخات، وەك وتراوە:

وإذا سمعت إلى حديثك زادني     حبا له سمعي حديث سواكا

(كە گوێم لە قسـەی تـۆ دەبێـت بیسـتنم خۆشەویسـتیم بـۆ قسـەی كەسـانی تـر زیـاد دەكات)

هەروەها بیستنی گاڵتە و گەپ کە مەدحی ئەوانە کراوە پشتی لێ دەکەن ﴿ وَإِذَا سَمِعُواْ ٱللَّغْوَ أَعْرَضُواْ عَنْهُ ﴾ القصص: ٥٥، هەروەها ئایەتی ﴿وَإِذَا مَرُّواْ بِٱللَّغْوِ مَرُّواْ كِرَامًا ﴿٧٢﴾ ﴾ الفرقان: ٧٢، محمد بن حەنەفییە دەڵێت: "لغو"بریتییە لە گۆرانی، حەسەن و کەسانی تریش دەڵێن: رێز لە خۆتان بگرن بە گوێ لێ نەگرتنی.

ئیبن مەسعود دەفەرموێت: ((گۆرانی دووڕوویی لە دڵدا دروست دەکات وەك چۆن ئاو پاقلە دەروێنێت))، ئەمە قسەی کەسێکە بەئاگایە لە کاریگەری گۆرانی و بەروبوومەکەی، ئەوانەی دەقیان پێوە گرتووە دڵیان نیفاقی تیا دەروێت بەبێ ئەوەی بەخۆی بزانێت، گەر حەقیقەتی دووڕوویی و دەرئەنجامەکەی بزانیبایە لە دڵی خۆیدا دەیبینی، چونکە هەرگیز لە دڵی کەسێکدا خۆشەویستی گۆرانی و خۆشەویستی قورئان جێی نابێتەوە، یەکێکیان ئەویتریان لە دڵدا دەردەکات، ئێمە و کەسانی تریش قورسی و گرانی قورئانمان لەسەر ئەهلی گۆرانی بینیوە، هەروەها بێزاری ئەوان لە قورئان و هاواریان لەو کەسانەی قورئان درێژ دەکەنەوە، هەروەها سوود نەبینینیان لە خوێندنەوەی قورئان، قورئان نایبزوێنێ و چێژی لێ نابینێ و پێی ناگەشێتەوە و بەهۆیەوە هاننادرێت بۆ کاری چاکە.

ثقل الكتاب عليهم لما رأوا　　تقييده بأوامر ونواهي
وعليهم خف الغنا لما رأوا　　إطلاقه في اللهو دون مناهي
يا فرقة ما ضر دين محمد　　وجنى عليه وملـه إلا هي
سمعوا له رعدا وبرقا إذ حوى　　زجرا وتخويفا بفعل مناهي
ورأوه أعظم قاطع للنفس عن　　شهواتها يا ويحها المتناهي
وأتى السماع موافقا أغراضها　　فلأجل ذاك غدا عظيم الجاه

لە سەرسوڕهێنەرترین سەرسوڕهێنەکان: بەڵگە هێنانەوە لەسەر ئەوەی گوێگرتن لە گۆرانی موباحە، چونکە لای سروشتی مرۆڤ بەتامە و نەفس چێژی لێ دەبینی و بە بیستنی ئاسوودە دەبێت، منداڵ بە دەنگی خۆش ئارام دەبێتەوە، وشتر لە ئازاری رۆیشتن و لەژێر کۆڵی قورسدا بە گۆرانی دەی دەی (الحداء) ئازار و ماندووبونی دەرەوێتەوە، هەروەها دەنگی خۆش نیعمەتێکە لە خوداوە و زیادەیەکە خودا بە هەندێ مرۆڤی دەبەخشێت، هەروەها خودا زەمی دەنگی

ناسازای کردووە ﴿إِنَّ أَنكَرَ ٱلۡأَصۡوَٰتِ لَصَوۡتُ ٱلۡحَمِيرِ ﴿١٩﴾﴾ لقمان: ١٩، هەروەها خودا وەسفی نیعمەتەکانی ئەهلی بەهەشت دەکات و دەفەرموێت ﴿فَهُمۡ فِي رَوۡضَةٖ يُحۡبَرُونَ ﴿١٥﴾﴾ الروم: ١٥، ئەوەش بریتییە لە بیستنی دەنگی خۆش، چۆن دەبێت دەنگی خۆش حەرام بێت و لە بەهەشتدا بوونی هەبێت، خودا گوێ بۆ شتێك ناگرێت وەك گوێگرتنی بۆ پێغەمبەرێکی دەنگ خۆش، بە دەنگی خۆش قورئان دەخوێنێت، هەروەها پێغەمبەر گوێی بۆ خوێندنی قورئانی ئەبو موسای ئەشعەری گرتووە، مەدح و سەنای دەنگ خۆشییەکەی کردووە و فەرموویەتی ((لقد أوتي هذا مزمارا من مزامير آل داود))، ئەبو موسا پێی فەرموو ((گەر دەمزانی گوێت بۆ گرتووم خوێندنی قورئانەکەم بە دەنگی خۆش جوان دەکرد)) "حبرته" واتە جوانم دەکرد و دەمڕازاندەوە، هەروەها پێغەمبەر دەفەرموێت ((قورئان بە دەنگی خۆشتان بڕازێننەوە))

هەروەها فەرموودەی ((ليس منا من لم يتغن بالقرآن))–لە ئێمە نییە هەر کەس بە دەنگی خۆش قورئان نەخوێنێت– دروست ئەوەیە کە: لە "التغني"ەوە هاتووە بە مانای دەنگ خۆش کردن، بەم مانایە ئیمام ئەحمەد–خودا رەحمی پێبکات– لێکیداوەتەوە، دەفەرموێت: "يحسنه بصوته ما استطاع"–بە دەنگی چەند بتوانێت خوێندنی قورئانەکە خۆش دەکات–.

هەروەها بەڵگە بەوە دەهێننەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) رازیبووە بەوەی عائشە گوێ لە گۆرانی دوو ئافرەتە گۆرانیبێژەکە بگرێت و بە ئەبوبەکری فەرموو ((وازیان لێ بهێنە هەر گەل و نەتەوەیەك جەژنی خۆی هەیە، ئەمەش جەژنی ئێمەیە ئەهلی ئیسلام))

هەروەها پێغەمبەر لە شایی و زەماوەندا مۆڵەتی داوە گۆرانی بوترێت و ناوی ناوە "لەهو"، پێغەمبەر(ﷺ) گوێی لە گۆرانی "دەی دەی" بۆ وشتر بووە و رێگەی پێداوە، گوێی لە ئەنەس و هەندێ لە هاوەڵان بوو هۆنراوەیان بە دەنگەوە دەخوێندەوە لە هەڵکەندنی خەندەقدا:

نحن الذين بايعوا محمدا    على الجهاد ما بقينا أبدا

پێغەمبەر(ﷺ) رۆیشتە ناو مەککە هۆنراوەبێژێك هۆنراوەیەکی عەبدوڵای کوڕی رەواحەی بە دەنگەوە بۆ دەوت، هەروەها لە کاتی دەرچوون لە خەیبەر کەسێك بە دەنگەوە دەیخوێند و دەیوت:

واللە لولا اللە ما اهتدينا ولا تصدقنا ولا صلينا

فأنزلن سكينة علينا وثبت الأقدام إن لاقينا

إن الذين قد بغوا علينا إذا أرادوا فتنة أبينا

ونحن إن صيح بنا أتينا وبالصياح عولوا علينا

ونحن عن فضلك ما استغنينا

پێغەمبەر دوعای بۆ ئەو کەسە کرد هۆنراوەکەی خوێندەوە.

گوێی لە قەسیدەیەکی "كعب بن زهير" بوو مۆڵەتی دا بە دەنگەوە بخوێنرێتەوە.

هەروەها "الأسود بن سريع" چەندین قەسیدەی کردووە بە نەشید و ستایشی پەروەردگاری پێ کردووە.

لە هۆنراوەکانی "أمية بن أبي الصلت" نزیکەی سەد دێڕە هۆنراوەی بە نەشید وتۆتەوە.

هەر بەو جۆرە "الأعشی" شتێك لە هۆنراوەی خۆی بەسەر دا خوێندۆتەوە و گوێی بۆ گرتووە.

هەر بەو جۆرە تەصدیقی هۆنراوەکەی "لبيد"ی کردووە کە دەڵێت:

((ألا كل شيء ما خلا اللە باطل))

دوعای بۆ "حسان" کرد کە ((خودا بە رۆحی قدس پشتیوانی بکات، لەبەر ئەوەی بەرگری لە پێغەمبەر دەکرد))

پێغەمبەر(ﷺ) هۆنراوەکانی "حسان"ی پێ خۆش بوو، پێی فەرموو ((هێرش بکە سەریان، رۆحی قودوست لەگەڵە))

هەروەها ئیبن عمر رێگەی پێداوە، هەر بەو جۆرە عەبدوڵای کوڕی جەعفەر و ئەهلی مەدینە.

هەروەها کۆدەنگی هەیە لەسەر ئەوەی گوێگرتن لە دەنگی خۆشی باڵندە موباحە، دەنگی خۆشی ئادەمی لەپێشترە بە موباح بوون، یان پێی یەکسانە.

هەروەها گوێگرتن رۆح و دڵی گوێگرەکە دەداتە بەر بۆ لای خۆشەویستەکەی، گەر خۆشەویستەکە حەرام بوو ئەوا گوێگرتن دەبێتە یارمەتیدەر بۆ حەرام، گەر موباح بوو

ئەوا گوێگرتن دەبێتە موباح، گەر خۆشەویستییەکەی رەحمانی بێت ئەوا گوێگرتن دەبێتە کاری چاکە و نزیکبوونەوە لە خودا، چونکە خۆشەویستی رەحمانی دەبزوێنێ و بەهێزی دەکات و دەیهەروژێنێت.

هەروەها چێژبردن بە گوێ بە بیستنی دەنگی خۆش هەروەك چێژبردن وایە بە چاو لە بینینی دیمەنی جوان، و بۆنکردنی بۆنی دڵڕفێن و تامی خۆش، گەر ئەوە حەرام بێت هەموو ئەو پەیپێبراوانە حەرام دەبن.

**وەڵامی هەموو ئەم قسانە:**

ئەم قسانە خۆ دزینەوە و خۆ لادانە لە مەبەستەکە، پێچلێدانە لە شوێنی ململانێ، دەستگرتنە بە شتێکەوە کە بە هیچ شتێکەوە نەبەستراوەتە، ئەوەی کە شتێك هەستەکان چێژی لێ ببینن و تەبابێت لەگەڵیان نابێتە بەڵگەی موباح بوون و حەرام کردن و کەراهەت و پێویست بوون، ئەو چێژە پێنج ئەحکامەکە دەیگرێتەوە، لەوانەیە حەرام بێت، یان واجب، یان مەکروە، یان موستەحەب، یان موباح بێت، چۆن کەسێك چێژی گوێگرتن دەکاتە بەڵگەی موباحبوون گەر مەرجی بەڵگە و شوێنی بەڵگە هێنانەوە بزانێت و بناسێت؟

ئەم کەسە وەك ئەو کەسە وایە زینا حەڵاڵ بکات بە بەڵگەی ئەوەی کەسی زیناکەر چێژی لێ دەبینێت، هەروەها بڵێت چێژەکەی سروشتی تەندروستی مرۆڤ رەدی ناکاتەوە، ئایا بوونی چێژ و تەبایی و گونجان دەکرێتە بەڵگە لەسەر حەڵاڵ بوونی چێژ لێوەرگیراوەکە؟ ئایا زۆربەی حەرامکراوەکان خاڵین لە چێژ؟ ئایا دەنگی ئامێرە مۆسیقییەکان ناخۆشن کە لە فەرموودەی سەحیحەوە لە پێغەمبەرەوە حەرامبوونیان راگەیەنراوە، و لە ئومەتەکەیدا کەسانێك پەیدا دەبن حەڵاڵیان دەکەن، هەروەها ئەهلی زانست کۆدەنگیان هەیە لەسەر حەرامبوونی هەندێ لەو ئامێرە مۆسیقییانە، جمهوری زانایانیش دەڵێن: سەراپایان حەرامن مەگەر یەکێکیان کە گوێ چێژی لێ دەبینێت، ئایا چێژ بینینی وشتر و منداڵ لە دەنگی خۆش دەکرێتە بەڵگەی حوکمەکەی لە موباح و حەرام؟

**لەمەش عەجاییتر:** بەڵگە هێناوە لەسەر موباح بوون بەوەی خودا دەنگی خۆشی خولقاندووە و نیعمەتێکی زیادەیە و بە کەسەکەی داوە.

دەوترێت: دیمەنی ئەفسوناوی جوانە، ئایا نیعمەتێكی زیادە نییە و خودا دروستكەری نییە و جوانی پێ نەبەخشیوە؟ ئایا ئەوە ئەكرێتە بەڵگەی ئەوەی خۆشی لێ ببینیت و بە رەهایی چێژی لێ ببینیت؟

ئایا ئەمە چیترە جگە لە مەزهەبی موباحكردن؟

لەمەش عەجایبتر: بەڵگەهێنانەوە بۆ موباحبوونی گۆرانی بە گوێگرتنی ئەهلی بەهەشت، ئەوەش وەك ئەوە وایە ئارەق حەڵاڵ بكرێت چونكە ئەهلی بەهەشت دەیخۆنەوە، هەروەها پۆشاكی ئاورشم حەڵاڵ بكرێت چونكە ئەهلی بەهەشت دەیپۆشن، هەروەها حەڵاڵ كردنی قاپ و قاپاغی زێر و خۆڕازاندنەوە بە ئاڵتوون بۆ پیاوان، چونكە ئەوانە لە بەهەشتدا جێگیرن و یەكێكن لە نیعمەتەكان.

ئەو قەسیدانەی كە مەدحی خوا و پێغەمبەر و ئایینەكەی و كتێبەكەی پێكراون، هەروەها هێرشیان پێكراوەتە سەر دوژمن ئەوانە تاكو ئێستا موسڵمانان دەیانگێڕنەوە و گوێیان لێ دەگرن و باسی لەسەر دەكەن، ئەوانە ئەو قەسیدانەن كە پێغەمبەر و هاوەڵان گوێیان لێ بووە و كەسەكە لەسەری پاداشتی وەرگرتووە، هەروەها هانی "حسان"ی داوە لەسەریان، ئەوانە بوون گوێگرانی شەیتانی فریویان پێخوارد و وتیان: ئەوانە كۆمەڵێك قەسیدە بوون ئێمە گوێ بۆ كۆمەڵێك قەسیدەی تر دەگرین، بۆیە بۆ ئەمانەش دیسان بەڵێ و دروستە گوێ بۆ گرتنیان، ئەمە وەك ئەوە وایە هەرچی قسە بێت حەڵاڵ بكرێت، بەڵام: سوننە قسەیە، و بیدعە قسەیە، و تەسبیح قسەیە، و غەیبەت قسەیە، و دوعا قسەیە، و تۆمەتیش قسەیە.

هاوشێوەی ئەمە: ئەوەی كە پێغەمبەر(ﷺ) بە باشی بینیوە لە دەنگی خۆش بۆ خوێندنی قورئان و گوێ بۆ گرتنی و مۆڵەت پێدانی، هەروەها خۆشویستنی خودا بۆ ئەو دەنگە خۆشە.

ئەم بەباش زانینەیان گواستۆتەوە بۆ بەباش زانینی دەنگی ئافرەتان بە گۆرانی تێكەڵ بە مۆسیقا و سەیركردنی ئافرەت، هەروەها باسی قەد و باڵا و كەمەر و مەمك لە گۆرانییەكانیاندا، هەروەها وەسفی چاو و كارەكانی و لۆمەكردن و داوای بەزەیی و تامەزرۆبوون و نیگەرانی و دووری لەیەكتر و ئەوەی بەم جۆگەلەیەدا گوزەر دەكات، كە لە خواردنەوەی ئارەق بۆ دڵ خراپترن، بەڵكو بەیەكتر بەراورد ناكرێن.

**عەجایبتر لەمە:** بەڵگە هێنانەوە بۆ موباح بوونی گوێگرتن -بەوەی باسمان کرد لە باری کۆمەڵایەتی- بە گۆرانی دوو کچۆڵە بۆ ئافرەتێکی منداڵ لە ڕۆژێکی جەژن و خۆشیدا کە چەند دێڕێك لە هۆنراوەی عەرەب و وەسفی ئازایەتی و جەنگ و ئەخلاقی بەرز و بەخشندەی تێدابووە، ئەوە لە کوێ و ئەمە لە کوێ؟

جێی سەرسوڕمانە ئەو فەرموودەیە گەورەترین بەڵگەیە لەسەریان، ئەبوبەکری صدیقی گەورە-خودای لێ ڕازی بێت- ئەو گۆرانییەی ناو نا ((مزمورا من مزامیر الشیطان))، پێغەمبەریش دانی نا بەو ناونانەدا و مۆڵەتی بەو دوو کچۆڵەیە دا کە نەگەیشتبوونە سنووری تەکلیف و خراپییەك نییە لە سروودەکەیان و گوێگرتن لێیان، ئایا ئەمە دەکرێتە بەڵگە لەسەر موباحبوونی ئەوەی دەیکەن و دەیزانن لە گوێگرتنی ئەوەی کە شاراوە نییە، سبحان الله، چۆن ژیری و تێگەیشتن سەریلێشێواوە؟

لە هەموو ئەمانە عەجایبتر: بەڵگە هێنانەوە لەسەر موباحبوونی بەوەی پێغەمبەر بیستوویەتی لە نەشید کە حەق و یەکتاپەرستی تێدا بووە، ئایا هیچ کەس هۆنراوەی بە ڕەهایی حەرام کردووە، وتنی هۆنراوە و گوێگرتن لێی حەرامکراوە؟

عەجایبتر لەو بەڵگەهێنانەوە لەسەر موباحبوونی بەڵگەی موباحبوونی دەنگی خۆشی باڵندە، ئایا ئەمە هەمان ڕەگەزی کێشانە و پێوانە نییە کە دەیانوت ﴿إِنَّمَا ٱلۡبَيۡعُ مِثۡلُ ٱلرِّبَوٰاْۗ﴾ البقرة: ٢٧٥، باشە دەنگی باڵندە لە کوێ و دەنگ و سەدای ناسکان و جوانان و بەزمی عود و مۆسیقا لە کوێ؟

ئەوەی کێبەرکێکە لە حوکمی ئەو بابەتەدا ساغ دەکاتەوە ئەوەیە بزانیت کێبەرکێ لەسەر حوکمی کارێك لە کردەوەکان و حاڵێك لە حاڵان و چێژێك لە چێژان، ئایا دروستە یان نادروستە؟ حەقە یان باتڵە؟ پێویستە بگەڕێینەوە بۆ بەڵگەی قبووڵکراو لەلای خودا و بەندە باوەڕدارەکانی، ئەوەش بریتییە لەو وەحییەی کە کار و بارەکانی بەسەردا واڵا دەکرێت و دەپێورێن و هەڵدەسەنگێنرێن، ئەوەی وەحی بەپاکی دابنێت و قبووڵی کرد و پارسەنگی پێدا و بە دروستی زانی ئەوە قبووڵکراوە، ئەوەش کە بە باتڵ تەماشای دەکات و ڕەدی دەداتەوە پووچ و ڕەدکراوەیە، ئەوەی لەسەر ئەم بنچینەیە زانست و سلوك و کرداری دانەمەزرێنێت لەسەر شتێك لە ئایین نییە، با.. و با... بەڵکو لەسەر فێڵ و فریو وەستاوە ﴿كَسَرَابِۭ بِقِيعَةٖ يَحۡسَبُهُ ٱلظَّمۡـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمۡ يَجِدۡهُ شَيۡـٔٗا وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥۗ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ٣٩﴾ النور: ٣٩

ئەگەر سالیك یان كەسی لێكۆڵەر حوكمی شتێكی لێ ئاڵۆز بوو، موباحە یان حەرام؟ با تەماشای مەفسەدە و بەرووبوومی مەفسەدە و دەرئەنجامەكەی بكات، گەر مەفسەدەیەكی تا پارسەنگی روونی تێدا بوو، ئەوە هەرگیز شاریع فەرمانی پێ نەكردووە یان بە موباحی دانەناوە، بەڵكو زانستی بە حەرامبوونی لە شەرعەكەیدا براوەتەوە، بەتایبەت ئەگەر ڕێگەیەك بوو سەری لە تووڕەبوونی خودا و پێغەمبەرەوە دەردەچوو، یان لە نزیكەوە بەو حەرامەی دەگەیاند و هەڵیدەنا و پەلكێشی دەكرد بۆی، ئەمە خاوەن بینینی ڕۆشن گومانیان لە حەرامبوونی نییە، ئەی دەبێ كەسێكی دانای شارەزا كە بە ئەندازەی سەرە دەرزییەك ئارەق لەلای حەرامە، چونكە سەردەكێشێت بۆ ئەو مەستییەی حەرامەكانی تری پێ ئەنجام بدات، چۆن ئەوەی لە ئارەق خراپترە بۆ رووكردنە حەرامی تر بە موباحی دابنێت؟ گۆرانی وەك ئیبن مەسعود -خوای لێ رازی بێت- دەفەرموێت ((هەڵنانە بۆ زینا))، خەڵكی دەبینن: هەر منداڵێك بە گۆرانییەوە خەریك بێت پەروەردەی تێكدەچێت، هەر ئافرەتێك پێیەوە سەرقاڵ بێت تووشی زینا دەبێت، گەنجێك پێیەوە خەریك بێت تووشی ئەوە و ئەوە دەبێت، پیرێك رووبەڕووی ئەوە و ئەوە دەبێتەوە، بینینی بەرچاو و ئاشكرا پێویستی بە بەڵگە و بورهان نییە.

ئەگەر هیچ شتێكی تر بوونی نەبێت بۆ بڕیاردان جگە لە چێژ وەرە با داوای بڕیاری چێژ بكەین لە كۆمەڵێك شتدا كە من و تۆ نەرێی ناكەین، جگە لەو چێژانەی ئاماژەمان پێكردن.

دڵ رووبەڕووی دوو حاڵەت دەبێتەوە: حاڵی دڵتەنگی و نیگەرانی بۆ لەدەستچوونی شتێك، لەگەڵ حاڵی خۆشی و سروور بۆ بەدەستهێنانی شتێك، بەپێی ئەم دوو حاڵەتە دوو جۆر بەندایەتی لەسەرە.

**بەپێی حاڵەتی یەكەم:** بەندایەتی رازیبوون بۆ پێشڕەوان (السابقين) و بەندایەتی ئارامگرتن بۆ راستڕەوان (أصحاب اليمين).

**بەپێی حاڵەتی دووەم:** بەندایەتی شوكری لەسەرە، شوكركارانیش دوو جۆرن: پێشڕەوان و راستڕەوان، نەفس و شەیتان بە گوێگرتنی دوو دەنگی نەفامی و فاجیری لەو دوو جۆرە بەندایەتییە دڵ بێئاگا دەكەن، ئەو دەنگانە دەنگن بۆ شەیتان نەك بۆ

رەحمان: دەنگی لاوانەوە و پیاهەڵدانی مردوو لە كاتی دڵتەنگی و مەرگی ئازیزاندا، لەگەڵ دەنگی گۆرانی و بەزم و سەدا لە بەدەستهێنانی شتی باش و كاتی خۆشیدا، شەیتان ئەم دوو دەنگەی لە جێگەی ئەو دوو جۆرە بەندایەتییەی داناوە.

پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی بە خودی ئەم مانایە كردووە لەو فەرموودەی ئەنەس-خوای لێ رازی بێت- ریوایەتی كردووە فەرموویەتی ((نەهیملێكراوە لە دوو دەنگی نەفامانەی فاجیرانە: دەنگی واوەیلا لەكاتی ناخۆشیدا لەگەڵ دەنگی جووزەلە و گۆرانی لە كاتی نیعمەت و خۆشیدا))

دەوای كەسی خاوەن ئەم حاڵەتە: پلە بە پلە بگوێزێتەوە بۆ بیستنی قورئان بە دەنگی خۆش لەگەڵ وردبوونەوە لە تێگەیشتنی ماناكەی، و كەم كەم تێڕامان لە گوتارەكەی، تا لە دڵیدا دەنگی بیستنی بەیت و بالۆرە نامێنێت و پۆشاكی خۆشەویستی بیستنی ئایات دەكرێت بەبەر دڵدا، ئەو كاتە چێژ و خواردنەوە و حاڵ و وەجدی لەناو قورئاندا دەبێت، ئەو كات لە ناخی خۆیدا دەزانێت: پێشتر لەسەر هیچ نەبووە و نموونە بە شیعری ئەو شاعیرە دەهێنێتەوە كە دەڵێت:

وكنت أرى أن قد تناهى بي الهوى  إلى غاية ما فوقها لي مطلب
فلما تلاقينا وعاينت حسنها  تيقنت أني أنما كنت ألعب

نەرێكەری لاواندنەوە ئارامگرتنە و نەرێكەری گۆرانی شوكرە، كارێكی ئاشكرایە لە ئاییندا، هیچ كەس گومانی لەوە نییە مەگەر كەسێكی زۆر دوور لە زانست و باوەڕ، شوكر بریتییە لە سەرقاڵبوون بە گوێڕایەڵی خوداوە، نەك بە دەنگێكی نەفامانەی فاجیرانەوەكە بریتییە لە شەیتان، هەر بەو جۆرە لاواندنەوە دژی ئارامگرتنە، وەك عومەری كوڕی خەتتاب -خوا لێی رازی بێت- لەسەر ئەو كەسەی مردووی دەلاواندەوە-دەستی بە لێدانی كرد تا پرچی دەركەوت- و فەرمووی: ((ئەو كەسە حورمەتی نییە، فەرمان بە لاواندنەوە دەكات كە خودا نەهی لێ كردووە، نەهی لە ئارامگرتن دەكات كە خودا فەرمانی پێكردووە، زیندوو تووشی فیتنە دەكات و مردوو ئازار دەدات، فرمێسكەكانی دەفرۆشێت، ئازاری شتی تر دەیهێنێتە گریان))

لای هەمووان ئاشكرایە: فیتنەی گوێگرتن لە گۆرانی و مۆسیقا گەورەترە لە فیتنەی گوێگرتن لە لاواندنەوە، ئەوەی ئێمە و كەسانی تریش بینیومانە و بە ئەزموون

زانیومانە: هەر گەل و هۆز و نەتەوەیەك گۆرانی و ئامێرەکانی ژەنین و لەهوی تیا بڵاوبێتەوە و پێیەوە سەرقاڵ بن خودا دوژمنیان بەسەردا زاڵ دەکات و تووشی بەڵای گرانی و سیاسالی و دەسەڵاتداری خراپ دەبن.

ئەوان بە بەزم و گۆرانی ژیانی کار و پڕ چالاکی و سووربوون و لێبڕانی خۆیان وەردەگێڕن بۆ یاری و گاڵتە و گەپ و بەزمی شەوانە، هەروەها ژیانی روشد و کەماڵیان وەردەگێڕن بۆ نەفامی و سەرلێشێوان، لە هێزەوە بۆ لاوازی و سستی، ژیانی گۆرانی و بەزم و یاری رەگەزەکانی هێزو چالاکی زانستی و کرداری لەبەر یەکتر هەڵدەوەشێنێت کە سەرکەوتن و هێز و پێزی ئوممەتیان پێوە بەستراوە، ئەو کاتە لەڕووی پیشەسازی و ئابووری و کشتوکاڵ و سەربازییەوە لاواز دەبن، سەرباری داڕووخانی لەڕووی ئەخلاقەوە، و شایستەبوون بە نەفرەتی خودایی، ئەو کات کاروبارەکانی لەبەر یەکتر هەڵدەوەشێن، چونکە دڵی بێئاگابووە لە حەق لەناو یاسا و رێسکانی خودا و ئایەت و حیکمەتەکانی، شوێنی ئارەزووی خۆی کەوتووە، ئەوەش رووبەڕووی هەڵدێری سستی و لاوازی کردۆتەوە.

❁ ❁ ❁

# (١٢) (منزلة الخوف)

# مەنزیلەی ترس

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی ترسە.

لە بەرزترین مەنزیلەكانی ڕێگەیە، بەسوودترینیانە بۆ دڵ و لەسەر هەموو كەسێك فەرزە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٥﴾﴾ آل عمران: ١٧٥، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ ﴿٤٠﴾﴾ البقرة: ٤٠، هەروەها ﴿فَلَا تَخْشَوُا النَّاسَ وَاخْشَوْنِ﴾ المائدة: ٤٤، مەدح و سەنای ئەهلی ترسی كردووە لە كتێبەكەیدا و دەفەرموێت ﴿إِنَّ الَّذِينَ هُم مِّنْ خَشْيَةِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ ﴿٥٧﴾ وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٨﴾ وَالَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمْ لَا يُشْرِكُونَ ﴿٥٩﴾ وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوا وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ رَاجِعُونَ ﴿٦٠﴾ أُولَٰئِكَ يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَهُمْ لَهَا سَابِقُونَ ﴿٦١﴾﴾ المؤمنون: ٥٧ — ٦١، لە مەسنەدی "الترمذي" لە عائشەوە–خودا لێی ڕازی بێت– دەڵێت: وتم ((ئەی پێغەمبەری خودا، فەرموودەی خودا ﴿وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوا وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ﴾، ئەوە ئەو كەسەیە كە زینا دەكات و ئارەق دەخواتەوە و دزی دەكات؟ فەرمووی: نەخێر كچەكەی صدیق، بەڵكو پیاوێك نوێژ دەكات و ڕۆژوو دەگرێ و خێر و سەدەقە دەكات و دەترسێت لێی قبووڵ نەكرێت))، حەسەن دەفەرموێت: بە گوێرایەڵی –سوێند بە خودا– كاریان كرد و كۆششییان لەو مەیدانەدا كرد، لەگەڵ ئەوەشدا ترسان بە ڕوویاندا بدرێتەوە، باوەڕدار ئیحسان و ترس كۆدەكاتەوە، بەڵام دووڕوو خراپە و ئاسایش كۆدەكاتەوە.

ترسی هەستكردن (الوجل) و ترسی پێشبینی (الخوف) و ترسی زانین (الخشية) و ترسی شڵەژان و لەرزین(الرهبة) و ترسی بە مەزنزانین (الهيبة) كۆمەڵێك زاراوەی لە یەكتر نزیكن، بەڵام هاوواتا (مترادف) نین لەگەڵ یەكتر، "أبو القاسم الجنيد" دەفەرموێت: ترس بریتییە لە پێشبینی سزا بە تێپەڕبوونی هەناسەكان.

وتراوە: ترس شڵەژان و جووڵەی دڵە لە یادكردنەوەی ئەوەی لێی دەترسێت.

وتراوە: ترس هێزی زانستە بە تێپەڕبوونی بڕیارەكان، ئەمە هۆی ترسە، نەك خودی ترسەكە.

وتراوە: ترس هەڵهاتنی دڵە لە هاتنی ئەوەی لێی بێزارە لە كاتی هەست پێ كردنیدا.

ترسی زانین (الخشية) تایبەتترە لە ترسی پێشبینیكراو (الخوف) ترسی زانین بۆ زانایان و خوداناسانە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟﴾فاطر: ٢٨، ئەو ترسە ترسێكە هاوملە لەگەڵ مەعریفە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((إني أتقاكم وأشدكم منه خشية))

ترسی پێشبینی بریتییە لە جووڵە، ترسی زانین بریتییە لە خۆگرمۆڵە كردن و گرژبوون و لە جووڵەكەوتن، ئەو كەسەی دوژمن دەبینێت، یان لافاوێك، یاخود هاوشێوەی ئەمانە دوو حاڵەتی بۆ هەیە:

یەكەم: جووڵە بۆ هەڵهاتن لێی كە بریتییە لە ترسی پێشبینی.

دووەم: لە جووڵەكەوتن و قەرارگرتن لە شوێنێكدا تاكو دوژمنەكە یان لافاوەكە نەیگاتێ، ئەمەش بریتییە لە ترسی زانین، لەم وشەیەوە (واتە خشية) دەوترێت "إنخش الشيء" شتەكە چووە ناوی، لە زمانی عەرەبیدا "المضاعف"—پیتی زیادە لەسەر فرمان و "المعتل"—بوونی حرف العلة لەناو فرمانەكەدا، برای یەكترن، هەروەك "تقضى البازي– بازەكە بەسەریدا داباری (كۆتاییەكەی "حرف العلة"یە) یان تقضض البازي (كۆتاییەكەی پیتی زیادەیە)".

ترسی شڵەژان (الرهبة) بریتییە لە ئەوپەڕی هەڵهاتن لە ئەو شتەی لێی دەترسێت، پێچەوانەی وشەی "الرغبة"یە كە بریتییە لە سەفەری دڵ بۆ بەدەستهێنانی ئەو شتەی حەزی لێدەكات.

لە نێوان وشەی "الرهب" و "الهرب"دا موناسەبە هەیە لە نێوان وشەكە و ماناكەدا، داتاشینی ناوەند كۆیان دەكاتەوە كە بریتییە لە وەرگەڕانی وشەكە لەسەر مانایەكی كۆكەرەوە.

ترسی هەستكردن و لەرزین(الوجل): بریتییە لە لەرزینی دڵ و درز تێبوونی بەهۆی یادكردنەوەی ئەو كەسەی كە لە دەسەڵات و سزای دەترسێت، یان بەهۆی بینینییەوە.

ترسی بە مەزنزانین (الهيبة): بریتییە لە ترسێكی هاومل لەگەڵ بە مەزنزانین و شكۆدانەپاڵ، بە زۆری ئەم جۆرە ترسە لەگەڵ خۆشەویستی و ناسیندایە.

شكۆمەندی دانەپاڵ: بریتییە لە بە مەزنزانین لەگەڵ خۆشەویستی.

ترسی پێشبینی بۆ هەموو باوەڕدارانە بە گشتی، بەپێی زانست و مەعریفە ترسی پێشبینی و ترسی زانین زیاد دەکات، وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((من زاناترین کەسی ئێوەم بە خودا، لە هەمووتان زیاتر لێی دەترسم))، لە ریوایەتێکدا "خوفا" لە جێگەی "خشیة" هاتووە، هەروەها دەفەرموێت ((**لو تعلمون ما أعلم، لضحكتم قليلا، ولبكيتك كثيرا، ولما تلذذتم بالنساء على الفرش، ولخرجتم إلى الصعدات تجأرون إلى الله تعالى**))

**کەسی خاوەن ترسی پێشبینی:** پەنا دەبات بۆ هەڵهاتن و خۆگرتنەوە، کەسی خاوەن ترسی زانین: پەنا دەبات بۆ دەستگرتن بە زانستەوە، نموونەی ئەو دوانە وەك نموونەی کەسێکە کە زانستی بە کاری پزیشکی نەبێت لەگەڵ پزیشکێکی شارەزا، یەکەمیان پەنا دەبات بۆ خۆپارێزی و هەڵهاتن لە نەخۆشی، پزیشکەکەش پەنا دەبات بۆ زانست بە دەرمان و چارەسەر.

**ئەبو حفص دەڵێت:** ترس قامچی خودایە، وێڵبووانی دەرگانەی خۆی پێ ڕاست دەکاتەوە.

دەڵێت: ترس چرایەکە لە دڵدا، بەهۆیەوە خێر و شەڕی لە ناودا پێ دەبینرێت، لە هەر کەسێك بترسیت لێی هەڵدێیت، جگە لە خودا، ئەو کە لێی دەترسیت بۆ لای هەڵدێیت.

کەسی ترساو لە پەروەردگاری هەڵدێت بۆ لای پەروەردگاری.

**ئەبو سولێمان دەڵێت:** ترس لە هەر دڵێك جیابوویەوە وێران دەبێت، ئیبراهیمی کوڕی سوفیان دەڵێت: کە ترس لە دڵدا نیشتەجێ بوو شوێنی شەهوات لە دڵدا دەسوتێنێت و دونیای لە دڵ دەردەکات، "**ذو النون**"دەڵێت: خەڵکی لەسەر ڕێگەی بەرەو خودا چوونن تا ترسیان هەبێت، کە ترسیان نەما ڕێگەیان لێ بزر دەبێت.

ترس لە خۆیدا مەبەست نییە، بەڵکو بۆ شتی تر پێویستە، هەر وەك ویستنی هۆکار بۆ گەیشتنە ئامانج، بۆیە بە تیاچوونی ئەو شتەی لێی دەترسن ترس دەڕەوێتەوە، ئەهلی بەهەشت ترس و دڵتەنگییان نییە لەبەر ئەوەی لە دۆزەخ ڕزگارییان بووە.

ترس وابەستەی کردارەکانی خودایە، و خۆشەویستی وابەستەی زات و سیفاتە، بۆیە خۆشەویستی باوەڕداران بۆ خودا زۆر زیاد دەکات کاتێك دەچنە ناو بەهەشتەوە، ترس دوایان ناکەوێت، بۆیە مەنزیلەی خۆشەویستی و مەقامی بالاتر و بەرزترە لە مەنزیلەی ترس و مەقامی.

ترسی ستایشکراوی راستگۆ: ئەوەیە کە خاوەنەکەی لە حەرام بەدوور بگرێت، گەر ئەو سنوورە ببەزێنێت ترسی ئەوە هەیە بێهیوایی و رەشبینی و دەستەئەژنۆیی ببێتە بەشی.

ئەبو عثمان دەڵێت: راستگۆیی لە ترسدا بریتییە لە خۆگرتنەوە لە هەرچی گوناه و تاوانی دەرەوە و ناوەوەیە.

گوێم لە "شیخ الإسلام إبن تیمیة" بوو-قدس الله روحه- دەیفەرموو ((ترسی ستایشکراو ئەوەیە لە حەرامەکانی خودا راتبگرێت))

خاوەنی کتێبی "المنازل" شێخی الهروي -رەحمەتی خودای لێ بێت- دەفەرموێت: ((ترس بریتییە لە خۆدارنین لە ئاسایش و ئارامی بە بیستنی هەواڵ))

واتە: هاتنە دەرەوە لە ئارامی و ئاسایش بە ئامادەبوونی ئەوەی خودا هەواڵی داوە لە بەڵێن و هەڕەشە.

دەفەرموێت ((سەرەتای ترس: بریتییە لە ترس لە سزادان، ئەمەش ئەو ترسەیە باوەڕی پێ دادامەزرێت، ئەو ترسەیە لە بەڕاست زانینی هەڕەشەکان و یادکردنەوەی خراپە و تاوان و بیرکردنەوە لە سەرئەنجام لەدایك دەبێت))

هەست و زانست پێشی ترس کەوتوون، هەرگیز ترس دروست نابێت لە شتێك هەست و زانستی پێی نەبێت.

دوو وابەستەبوونی هەیە: یەکەمیان: خودی ئەو شتەی لێی دەسڵەمێتەوە و خۆی لێ دەپارێزێت و ترسی ڕوودانی هەیە.

دووەم: ئەو هۆ و ڕێگەیەی مرۆڤ دەگەیەنێتە ئەو شتە کە لێی دەترسێت، بە ئەندازەی هەست و زانستی بەو هۆیەی دەیگەیەنێت بەو سەرئەنجامە و بە ئەندازەی هەست و زانینی بە خودی ئەو شتەی لێی دەترسێت کەسەکە ترسی زیاد دەکات، گەر هەستی بە یەکێك لەو دووانە کەمی کرد ئەوا بە ئەندازەی ئەو کەم کردنە ترسی کەم دەکات.

هەر کەس باوەڕی وا نەبێت کە فلان هۆ سەردەکێشێت بۆ فلان هەڕەشە لە هۆیەکەی ناترسێت، گەر کەسێك باوەڕی وابێت ئەو هۆیە سەردەکێشێت بۆ فلان هەڕەشە، بەڵام بڕی هەڕەشەکەی نەزانی وەکو پێویست لێی ناترسێت، گەر بڕی لێترساوەکەی زانی و دڵنیابوو لەوەی ئەو هۆیە دەیگەیەنێت بەو لێترساوە (ئەوەی لێی دەترسێت) ئەوا ترسی بۆ بەرهەم دێت.

ئەمەیە مانای "لە بەڕاست زانینی هەڕەشە و یادی گوناه و تاوانەکان لەدایك دەبێت".

لە چاودێری سەرئەنجام: زیادە ئامادەکردنی ئەو شتەی لێی دەترسێت لە دڵدا و دانانی لە پێش چاوی، بەجۆرێك لەبیری نەکات، ئەو شتەی لێی دەترسێت–با زاناش بێت پێی– بەڵام لە بیرکردنی و چاودێری نەکردنی لە نێوان دڵ و ترسدا ترسەکە هەڵدەگرێت، بۆیە ترس نیشانەی راستێتی باوەڕە، کۆچکردنی لە دڵ نیشانەی کۆچکردنی باوەڕە، خودا باشتر دەزانێت.

لە ترسی ستایشکراو: ترسی مەکری خودا لە جاریبوونی هەناسەدا کە هەموو ئاگاهی داگیر دەکات، ترسێکی تێکەڵ بە شیرینی.

دەیەوێ بڵێت: ئەو کەسەی بێداری بۆ بەدەستهاتووە دوور لە بێئاگایی و هەموو هەناسەکانی داگیر کردووە، ئەوەی لا شیرینە، هیچ شتێك بە قەدەر ئامادەبوون لە بێداریدا شیرینتر نییە، ئەو پێویستە لە مەکری خودا بترسێت نەبادا ئەو ئامادەبوون و بێداری و شیرینییەی لێ وەربگیرێتەوە، زۆرن ئەوانەی لە خۆشترین حاڵدا بوون و لێیان وەرگیراوەتەوە، لە باشترین کردارەوە گەڕاوەتەوە بۆ ناشیرینترین کردار، وای لێ هاتووە هەردوو دەستی بە یەکتردا بکێشێت و بە راستی چەپی دابگرێتەوە، لە کاتێکدا مانگی چواردەی دەدرەوشایەوە لەناکاو رووبەڕووی گیران بوویەوە و رۆیشتە ناو تاریکی و هۆگری ئەو بوو بە وەحشەت و ئامادەبوونی بوو بە بزربوون و رووکردنە خودای بوو بە پشتهەڵکردن و نزیکبوونەوەی گۆڕا بە دووری و تەبایی لەگەڵ خودا بوو بە جیابوونەوە.

## ✿ تەواوکاری ترس و رجا

دڵ لە رۆیشتنی بەرەو خودا وەك باڵندەیەك وایە، خۆشەویستی بریتییە لە سەری باڵندەکە، ترس و رجا بریتین لە دوو باڵەکەی، هەر کات سەر و دوو باڵەکە سەلامەت بن ئەوا باڵندەیەکە بە باشی دەتوانێت بفڕێت، هەر کات سەری لێکرایەوە دەمرێت، هەر بەو جۆرە گەر باڵەکانی لەدەستدا رووبەڕووی راوچی درندە دەبێتەوە، بەڵام پێشین پێیان باش بووە باڵی ترس بەهێزتر بێت لە باڵی رجا، لە کاتی دەرچوون لە دونیا باڵی رجا بەهێزتر بێت لە باڵی ترس، ئەمە رێگەی ئەبو سولەیمان و کەسانی ترە.

دەڵێت: پێویستە ترس بە سەر دڵدا زاڵ بێت، چونکە گەر رجا زاڵ بوو بە سەریدا تێکدەچێت.

کەسانی تریش دەڵێن: کامڵترین حاڵ: بریتییە لە هاوسەنگ بوونی ترس و رجا و زاڵبوونی خۆشەویستی، خۆشەویستی هۆکاری سوارییە، رجا پێشڕەوی دەکات و ترسیش ئەو کەسەیە دەیداتە بەر، خوداش بە منەت و بەخشندەیی کەسەکە دەگەیەنێتە جێگەی خۆی.

❁ ❁ ❁

## (١٣) (منزلة الإشفاق)

# مەنزیلەی خەمخۆری و بەزەیی

لە مەنزیلەکانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی خەمخۆری و بەزەییە.

خـــــودای موتـــــەعال دەفـــــەرموێت ﴿ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ وَهُم مِّنَ ٱلسَّاعَةِ مُشْفِقُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾ الأنبيـــاء: ٤٩ ﴿ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٢٥﴾ قَالُوٓاْ إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِىٓ أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ ﴿٢٦﴾ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ ﴾ الطور: ٢٥ — ٢٧

"خەمخۆری و بەزەیی" بریتییە لە نەرمە ترسێك، یان ترسێکی تێکەڵ بە بەزەیی لە کەسی ترساوەوە بۆ ئەو کەسەی کە لە سەرئەنجامی بڕیارەکانی دەترسێت، نزیکی "خەمخۆری و بەزەیی" لە "ترس"ەوە وەك نزیکی "الرأفة" وایە لە "الرحمة"، یەکەمیان (الرأفة) بریتییە لە بەهێزترین و ناسکترین بەزەیی.

سەرەتای خەمخۆری و بەزەیی: بریتییە لە خەمخۆری و بەزەیی بۆ دەروونی خۆ، نەبادا سەربکاتە ملپێچی و گوێنەدان، یان پەلە بکات و رووبکاتە رێگەی ئارەزوو و یاخیبوون و ملنەدان بە بەندایەتی، پاشان خەمخۆری و بەزەیی بۆ کاروکردەوە چاکەکانی نەبادا بەرەو تیاچوون و پووچەڵبوونەوە بچن.

دەترسێت کردەوەکانی ئەو کردەوانە بن خودای موتەعال لە بارەیانەوە دەفەرموێت ﴿ وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾ ﴾ الفرقان: ٢٣، ئەوانە بریتین لەو کردارانەی بۆ خودا نەکراون و لەسەر فەرمانی ئەو و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ئەنجام نەدراون، هەروەها دەترسێت کارەکەی لە داهاتوودا پووچ ببێتەوە، یان بە وازهێنان لەو کارە یان بەهۆی گوناهەوە کە کارەکەی پەرش و بڵاو دەکات و بەتاڵی دەکاتەوە، بۆیە تیادەچێت و بێ دەستمایە دەبێت، ئەو کاتە وەك ئەو کەسەی لێ دێت کە قورئان دەربارەی دەفەرموێت ﴿ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ لَهُۥ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَأَصَابَهُ ٱلْكِبَرُ وَلَهُۥ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَآءُ فَأَصَابَهَآ إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَٱحْتَرَقَتْ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٦٦﴾ ﴾ البقرة: ٢٦٦

عومەری کوڕی خەتتاب —خوای لێ ڕازی بێت— بە هاوەڵانی فەرموو—خوایان لێ ڕازی بێت— ((پێتان وایە ئەم ئایەتە لەسەر کێ دابەزیوە؟ وتیان: خودا باشتر دەزانێت،

عومەر تووڕە بوو و فەرمووی: بڵێن: دەیزانین، یان نایزانین، ئیبن عباس فەرمووی: لە دەروونمدا لەسەر ئایەتەكە شتێك هەیە ئەی ئەمیری باوەڕداران، فەرمووی: بڵێ برازای خۆم، خۆت بە كەم تەماشا مەكە، ئیبن عەباس فەرمووی: نموونەیە بۆ كردارێك هێنراوەتەوە، عومەر فەرمووی: چ كردارێك؟ ئیبن عباس فەرمووی: بۆ كردارێك، عومەر فەرمووی: بۆ پیاوێكی دەوڵەمەند كە بە گوێڕایەڵی خودا كردار دەكات، خودا شەیتانی ناردە لای، دەستی بە گوناه و تاوان كرد تا هەموو كردارەكانی نغرۆ كرد))

**ناوەندی ئەم مەنزیلەیە ئەوەیە:** خەمخۆری و بەزەیی بۆ كات(كاتی سەفا و تەبابوون لەگەڵ خودا) هەبێت نەبادا جیابوونەوەی(جیابوونەوە لە خودا) تیا روویدات.

واتە: ئاگای لە كاتەكانی دەبێت نەوەك شتێكیان تێكەڵ ببێت لە ئامادەبوون لەگەڵ خودا دایببڕێت، هەروەها ترسی لە دڵ هەیە شتێك رووی تێبكات و تەنگی پێ هەڵبچنێت.

ئەو شتەی كە روو لە دڵ دەكات و تەنگی پێ هەڵدەچنێت: یان خاوبوونەوە و ساردبوونەوەیە، یان گومان و لێڵییەكە، یان حەز و ئارەزووە، هەر یەك لەم هۆیانە دەبنە لەمپەری بەردەم سالیكی رێگەی خودا.

**كۆتایی ئەم مەنزیلەیە:** خەمخۆری و بەزەییەكە هەوڵ و كۆششی كەسەكە لە خۆپەسەندی و لەخۆباییبوون بپارێزێت، دەستبكێشێتەوە لە دوژمنایەتی و ناحەزی كردنی خەڵك، كەسی خاوەن ویست بەرەو سووربوون و لێبڕان هەڵبنێت.

خۆپەسەندی كاری تێكدەدات وەك چۆن ریا تێكیدەدات، بۆیە خەمخۆری بۆ هەوڵ و كۆششی خۆی هەیە لەو تێكدەرە (خۆپەسەندی)، بە خەمخۆرییەك كە پارێزگاری لە كاروكردەوەكان بكات لە ئافاتی خۆپەسەندی.

**دوژمنایەتی و ناحەزی كردنی خەڵكی:** ئەخلاق تێكدەدات، بۆیە خەمخۆری ئەخلاقی خۆی دەبێت و ناهێڵێت دوژمنایەتی و ناحەزیی خەڵك دایبڕوخێنێت.

ویست: نەبوونی سووربوون و لێبڕان تێكیدەدات، ئەوەش بە گاڵتە و گەپ و یاری و بەزم، بۆیە خەمخۆری ویستی خۆی دەبێت تاكو ئەوانە وێرانی نەكەن، كە كردار و ئەخلاق و ویستی هاتنە راستە و دروست لێی وەستان: ئەو كاتە سلوك و دڵ و حاڵی ئەو كەسە لەسەر راستە شەقام راوەستاو دەبێت، خودا كۆمەككارە.

## (١٤) (منزلة الخشوع)

# مەنزیلەی گەردنکەچی و زەلیلییە لەبەردەم خودادا

لە مەنزیلەکانی ((إیاك نعبد وإیاك نستعین)) مەنزیلەی گەردنکەچی و زەلیلییە.

خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ﴾ الحدید: ١٦، ئیبن مەسعود–خوای لێ رازی بێت–دەفەرموێت((لە نێوان موسڵمان بوونمان و لۆمەکردنمان بەم ئایەتە چوار ساڵی نێوانە))، ئیبن عەباس دەفەرموێت ((خودا لەگەڵ دڵی باوەڕدارانـدا لەسەرخۆ بوو، لە سەرەتای ساڵی سیازدەهەمی دابەزینی قورئانـدا لۆمەی کـردن))، هەروەها دەفەرموێت ﴿قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ۝١ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ۝٢﴾ المؤمنون: ١ – ٢

لە زمانەوانیدا مانای "الخشـوع" بریتییە لە دانەوین و زەلیلی و خامۆشی، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ﴾ طه: ١٠٨، "خشعت" واتە خامۆش بوو، و زەلیل بوو، و گەردنکەچ بوو، لەوێوە وەسفی زەوی بە گەردنکەچ کراوە کە بریتییە لە وشکبوونەوە و دانەوین و بەرزنەبوونەوە بە ئاودانی و گژوگیا، خودای موتـەعال دەفـەرموێت ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَٰشِعَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ﴾ فصلت: ٣٩

"الخشـوع" بریتییە لە وەستانی دڵ لەبەردەم خودادا بە ملکەچی و زەلیلی و کۆبوونەوە لەسەری.

**وتراوە:** "الخشوع" بریتییە لە ملدان بە حەق، ئەمە لە داواکارییەکانی ملکەچییە.

**نیشانەکانی:** گەر کەسێك دەمکوت کرا و بە حەق بەرپەرچدرایەوە قبووڵی بکات و بۆی ملکەچ ببێت.

وتراوە "الخشوع" بریتییە لە کپبوونەوەی ئاگری شەهوەت و خامۆشبوونی دووکەڵی سینە و درەوشانەوەی نووری بە مەزن ڕاگرتنی خودا لە دڵدا.

جونەيد دەفەرموێت: "الخشوع" بريتييە لە گەردنكەچی دڵان بۆ زانای پەنهان (**تذلل القلوب لعلام الغيوب**).

عاريفان كۆدەنگن لەسەر ئەوەی كە "الخشوع" شوێنەكەی لە دڵدايە و بەرووبوومەكەی لەسەر ئەندامەكانە، ئەندامەكانن دەريدەخەن، ((پێغەمبەر پياوێكی بينی لە نوێژدا ياری بە ريشی دەكرد، فەرمووی: گەر دڵی ئەو كەسە گەردنكەچ بوايە ئەندامەكانيشی گەردنكەچ دەبوون))، هەروەها پێغەمبەر دەفەرموێت ((تەقوا لێرەدايە -ئاماژەی بە سنگی كرد- سێ جار))، هەندێ لە عاريفان دەڵێن: باشی ئەدەب لە روواڵەتدا نيشانەی باشی ئەدەبی ناوەوەيە، يەكێك لە عاريفان پياوێكی بينی كە شان و جەستەی خامۆش و زەليل بوو، پێی وت ((ئەی فلان، خامۆشی و گەردنكەچی لێرەدايە، ئاماژەی بە سنگی كرد، نەك لەو جێگەدا، ئاماژەی بە ناوشانی كرد))

هەندێ لە هاوەڵان -خوايان لێ رازی بێت- كە حوزەيفەيە دەڵێت: وريای گەردنكەچی دووڕوويی بن، پێيان وت: گەردنكەچی دووڕوويی چييە؟ فەرمووی: جەستە گەردنكەچ بێت و دڵ گەردنكەچ نەبێت. عومەری كوڕی خەتتاب-خوای لێ رازی بێت- پياوێكی بينی سەری لە نوێژدا شۆڕكردبوو، پێيفەرموو ((ئەی خاوەن گەردنی كەچ، گەردنت بەرز بكەرەوە، گەردنكەچی لە گەردندا نييە، گەردنكەچی لە دڵدايە))، عائشە-خوای لێ رازی بێت- چەند گەنجێكی بينی زۆر لاواز و سست بە رێگەدا دەڕۆيشتن، بە هاوەڵەكانی خۆی فەرموو: ئەوانە كێن؟ وتيان كۆمەڵێك ناسيكن (خۆيەكلاكەرەوە و دابڕاو بۆ عيبادەت)، فەرمووی: عومەری كوڕی خەتتاب كە دەڕۆيشت خێرابوو، كە قسەی دەكرد گوێی بۆ دەگيرا، كە لێيدەدا ئازاری پێدەگەياند، كە خواردنی دەخوارد تێری دەخوارد، ئەو ناسيكی راستەقينە بوو))، "الفضيل بن عياض" دەفەرموێت: لايان ناپەسەند بوو پياوێك گەردنكەچی بە جەستەی زياتر لە دڵی نيشان بدات. حوزەيفە-خوا لێی رازی بێت- دەفەرموێت: يەكەم شتێك لە ئايينەكەتان لەدەستی دەدەن بريتييە لە گەردنكەچی، دواين شت لە ئايينەكەتان لەدەستی دەدەن بريتييە لە نوێژ، نوێژكەر هەيە هيچ خێرێكی تێدا نييە، خەريكە وای لێ دێت بچيتە ناو نوێژی بە كۆمەڵ لە مزگەوتدا و گەردنكەچێك نەبينی. سەهل دەفەرموێت: هەر كەس دڵ گەردنكەچ ببێت شەيتان نزيكی ناكەوێت.

## ۞ گەردنکەچی زەلیلی و خۆڕادەستکردنە

**هەموو گەردنکەچی بریتییە لە:** ملکەچی بۆ فەرمان و خۆڕادەستکردنی بڕیار و شکانەوە و شۆڕبوونەوەی دڵ و ئەندامەکان بۆ سەیرکردنی خودا.

**ملکەچی بۆ فەرمان:** وەرگرتنی فەرمان بە ملکەچی، قبووڵ و چوونەژێر فەرمان و جێبەجێ کردنی، تەبابوونی ناوەوە و دەرەوە لەگەڵ نیشاندانی لاوازی و بێدەسەڵاتی(لەبەردەم خودادا)، هەژاری و ئاتاجبوون بۆ هیدایەتی گەیشتن بە فەرمان پێش بە کردارکردنی، هەروەها کۆمەکی لە کاتی ئەنجامدانیدا و پاشان قبووڵ کردنی ئەو کارە لەلای خوداوە.

**خۆڕادەستکردنی بڕیاری شەرعی:** بەرهەڵستی نەکردنی بڕیاری شەرع بە ڕا و بۆچوون و حەز و ئارەزوو.

**شۆڕبوونەوەی دڵ و ئەندامەکان بۆ سەیرکردنی خودا:** بریتییە لە داڕمان و شکانەوەی دڵ و ئەندامەکان بۆ سەیرکردنی پەروەردگار و بینینی درێژەی ئەوەی لەناو دڵ و سەر ئەندامەکاندا دیارە، ئەمە یەکێکە لەو دوو تەئویلەی ئایەتی ﴿وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾﴾ الرحمن: ٤٦، هەروەها ئایەتی ﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾﴾ النازعات: ٤٠، کە ئەوەش بریتییە لە مەقامی پەروەردگار لەسەر بەندەکەی بە تەماشاکردنی توانا و دەسەڵات و پەروەردگار بوونی.

ترسی بەندە لەو مەقامە: بەبێ هیچ گومانێك گەردنکەچبوونی دڵی لێوە پەیدا دەبێت، هەتا ئامادەبوونی دڵی زۆرتر و زیاتر بێت گەردنکەچبوونی زۆرتر و زیاترە، گەردنکەچی لەدڵدا بار دەکات کاتێك بێئاگابوو لە سەیرکردنی خودا بۆ ناو دڵی و تەماشاکردنی.

**تەئویلی دووەم:** بریتییە لە مەقامی بەندە لەبەردەم خودادا ئەو ڕۆژەی کە پێی دەگاتەوە.

لەسەر تەئویلی یەکەم: لە بابی دانە پاڵی چاوگە بۆ لای بکەرەکەی.

لە تەئویلی دووەمدا -کە شیاوترە بە ئایەتەکە- لە دانەپاڵی چاوگە بۆ لای ئەو شتەی لێی دەترسیت.

**بزانە:** گەشەی گەردنکەچی لە دڵدا بەپێی چاودێریکردنی ئافاتی دەروون و کردارە، هەروەها بینینی فەزڵی هەموو خاوەن فەزڵێك لەسەرت، پێشبینی دەرکەوتنی ناتەواوییەکانی نەفس و کردار و نەنگییەکانیان -بێ هیچ گومانێك- دڵ گەردنکەچ

دەكـات، ئەمــەش بــەهۆی بینــینی نــەنگی دەروون و كـردار و ناتەواوییــەكانیان لــە لوتبەرزی و خۆپەسەندی و ریا و لاوازی لە راستگۆیی و راسـتڕەویدا و كـەمی یـەقین و پەرتبوونی نییەت و خۆدانەڕنین لە ئارەزووی نەفسانی و ئـەنجام نـەدانی كردارەكـان بەو جۆرەی پەروەردگار لێی رازی بێت، ئەمانە و زۆرێكی تر لـە نەنگییـەكانی دەروون و تێكدەرانی كار و كردەوەكان.

**بینینی فەزڵی خاوەن فەزڵەكان لەسەر خۆت:** بریتییە لە رەچاوكردنی مـافی خـەڵكی و بەئەنجامگەیانـدنیان، مـافی خـۆت لەسـەر ئـەوان نـەبینیت و بەرهەڵسـتیان نەكـەیت لەسەری، چونكە ئەو كارە لە گەوجی و بێئەقڵی نەفسەوەیە، داوای مـافی خۆتیـان لـێ مەكە، دان بنێ بە فەزڵی خاوەن فەزڵەكاندا و فەزڵی نەفسی خۆت لەبیر ببەرەوە.

گوێم لە "شیخ الإسـلام ابـن تیمیـة –قـدس الله روحـه–" بـوو دەیفـەرموو: عـاریف هـیچ مافێكی خۆی لەسەر خەڵكی نابینێت، و هیچ فەزڵێكی خۆی لەسـەریان ناخوێنێتـەوە، بۆیە لۆمە ناكات و داوا ناكات و بەیەكتردا ناكێشن.

## ۞ نیشاندانی هەژاری و داوای داپۆشین

گەردنكەچـی دەگاتـە كـەماڵ بـە پاڵفتـەكردنی كاتـەكان لـە ریاكـاری بـۆ خـەڵك، رووتكردنـەوەی بینـینی فـەزڵ، حـاڵ و كۆششـی لـە خـەڵكی دەشـارێتەوە، وەك گەردنكەچبوون و زەلیلی و شكانەوەی، بۆ ئەوەی خەڵكی نەیبینن و سەیركردنەكەیان بە پەسەند بزانێت و كات و دڵ و حاڵی لەگەڵ خودا تێكبچێت، زۆرێك لە سالیكان بـەو هۆیەوە رووبەڕووی ئەم جۆرە دابڕانە بوونەتەوە، پارێزراو كەسێكە خـودا پارێزگـاری لێ بكات، هیچ شتێك بە ئەندازەی نیشاندانی زەلیلی و هەژاری و بێنەوایی لـە بـەردەم خودادا سوود بە كەسی راستگۆ ناگەیەنێت، خۆی وا ببینێت كە ئەو هیچ نییـە، خـۆی وا بێتە پـێش چاو كـە ئـەو كەسێكە هێشتا ئیسلامەتییەكەی نەهاتۆتـە راستە، تـا بانگەشەی شكۆ و گەورەیی بۆ خۆی بكات.

كارێكم لە "شیخ الإسلام ابن تیمیة–قدس الله روحه–" بینی كە لە هیچ كەسم نـەبینیوە، زۆرجار دەیوت: من شتێكم نییە، و لە منەوە شتێك نییە، و شتێكم تێدا نییە، زۆرجـار ئەم دێڕە هۆنراوەی دەخوێندەوە:

أنا المكدى وابن المكدى        وهكذا كان أبي وجدي

ئەگەر كەسێك لە روودا مەدحی بكردبایە دەیفەرموو: سوێند بە خودا تا ئێستا بەردەوام موسڵمانبوونی خۆم نوێ دەكەمەوە، تاكو ئێستا بە موسڵمان بوونێكی باش موسڵمان نەبووم.

لە كۆتای تەمەنیدا پوختەیەكی لە تەفسیر بە خەتی خۆی بۆ ناردم لەسەر پشتەكەی ئەم دێرە هۆنراوانەی خۆی لەسەر بوو:

أنا الفقير إلى رب البريات        أنا المسكين في مجموع حالاتي
أنا الظلوم لنفسي وهي ظالمتي        والخير إن يأتنا من عنده يأتي
لا أستطيع لنفسي جلب منفعة        ولا عن النفس لي دفع المضرات
والفقر لي وصف ذات لازم أبدا        كما الغنى أبدا وصف له ذاتي
وهذه الحال حال الخلق أجمعهم        وكلهم عنده عبد له آتي

رووتكردنەوەی بینینی فەزڵ: ئەوەیە كە فەزڵ و چاكە تەنها لە خوداوە ببینێت، خودا خاوەن منەتە بەبێ هۆیەك لە بەندەكەیەوە، هیچ وەسیلەیەكی پێشینە نییە بۆ لای چاكەكانی خودا گرتبێتییە بەر، بەڵكو هەموو ئەوەی بەدەستی هێناوە لە خێر و چاكە تەنها لە منەتی خودا و فەزڵی خوداوەیە لەسەری، بەبێ ئەوەی ئەو شایستەی بێت، بەندە شتێكی نەبەخشیوە تاكو ئەوەی بەدەست هێنابێت، وەك خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿١٧﴾ ﴾ الحجرات: ١٧.

هەر بەو جۆرە ئەوەی لێی وەردەگیرێتەوە لە دونیا، یان ئەوەی رووبەرووی دەبێتەوە لە ئازار و زیان هەمووی لە خوداوەیە و دەبێت بزانێت لە چەندین رووەوە منەتێكی تری خودایە بەسەر ئەوەوە، ئەمەش بیری دروست پەیی پێ دەبات و دەریدەهێنێت، وەك هەندێك لە پێشین دەڵێن: ((ئەی رۆڵەی ئادەم، تۆ نازانیت كام لەم دوو نیعمەتە بۆ تۆ باشترە، نیعمەتێك لەوەی پێیداوی، یان نیعمەتێك لەوەی لێی سەندوویەوە))، عومەری كوڕی خەتتاب-خوای لێ رازی بێت- دەفەرموێت: ((گوێم لێ نییە لە سەر

کام دۆخ ڕۆژ دەکەمەوە، یان ئێوارەم بەسەر دێت، گەر دەوڵەمەندی بوو شوکری تێدایە، گەر هەژاری بوو ئارامگرتنی تێدایە))، هەندێ لە پێشین دەڵێن: ((نیعمەتی خودا لەسەرم لەوەی لێی گرتوومەتەوە مەزنترە لەوەی پێی بەخشیوم، من دەبینم بە کۆمەڵێکی بەخشی و پێی گومڕابوون))

۞ ۞ ۞

## (١٥) (منزلة الإخبات)

# مەنزیلەی تەختبوون

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی "تەختبوون"ە.

خودای موتەعال ﴿وَبَشِّرِ ٱلۡمُخۡبِتِينَ ٣٤﴾ الحج: ٣٤، دواتر پەردە لەسەر ماناكانی لادەدات و دەفەرموێت ﴿ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَٱلصَّٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمۡ وَٱلۡمُقِيمِي ٱلصَّلَوٰةِ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٣٥﴾ الحج: ٣٥، هەروەها دەفەرموێت ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَأَخۡبَتُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٢٣﴾ هود: ٢٣.

"الخبت" لە بنچینەی زمانەوانیدا بریتییە لە زەوی نەرم، بەو مانایە ئیبن عەباس- خوایان لێ رازی بێت- و قەتادە مانای "المخبتين"یان لێكداوەتەوە، دەڵێن: ئەوانە بریتین لەو كەسانەی تەوازوعیان هەیە. مجاهد دەڵێت: "المخبت" مانای "المطمئن إلى الله"- دڵنیا بۆ لای خودای هەیە، دەڵێت "الخبت" بریتییە لە شوێنێكی دڵنیا و ئارام لە زەوی. "ئەخفەش" دەڵێت: مانای "الخاشعون"-گەردنكەچانی هەیە، ئیبراهیمی نەخعی دەڵێت: نوێژكەرانی دڵسۆز، كەلبی دەڵێت: ئەوانەن كە دڵیان ناسكە، "عەمری كوڕی ئەوس"یش دەڵێت: ئەوانەن ستەم ناكەن، گەر ستەمیان لێ بكرێت نایانەوێت خۆیان سەربخەن.

هەموو ئەم قسانە لەسەر دوو مانا دەسوڕێنەوە: تەوازوع (التواضع) و ئارامی بۆ لای خودا-عزوجل- بۆیە بە حەرف "إلى" فرمانەكە كرا بە تێپەڕ (وأخبتوا إلى ربهم) تاكو مانای دڵنیایی و سوكنایی و گەڕانەوە بۆ لای خودا دەستەبەر بكات.

"تەختبوون" لە سەرەتاكانی مەقامی دڵنیایی (الطمأنينة)یە، هەروەك "السكينة"- سوكنایی و "اليقين"-یەقین و "الثقة بالله"-متمانە بە خودای موتەعال و هاوشێوەكانیان. تەختبوون پێشەكی و سەرەتای دڵنیاییە، بە "تەختبوون" ئاسایش لە گەڕانەوە و دڵەڕاوكێ دەستەبەر دەبێت، چونكە كاتێك "تەختبوون" سەرەتای مەقامەكە بێت سالیك لە دڵەڕاوكێ رزگاری دەبێت -كە جۆرێكە لە بێئاگایی و

پشتهەڵكردن–، سالیك موسافیرە بۆ لای پەروەردگاری، بەدرێژایی هەناسەكانی ئەو لە رۆیشتندایە، كۆتایی بە رۆیشتنەكەی نایەت هەتا هەناسە یاوەری بێت، بەدەستهێنانی "تەختبوون" وەك ئاوێكی زوڵاڵ وایە كە موسافیر لە قۆناغەكانی سەرەتای سەفەرەكەیەوە دەچێتە سەری لە كاتی تینوێتی و پێویستیدا، لێی پاراو دەبێت و ئەندێشەی دڵەڕاوكێ بۆ تەواوكردنی سەفەرەكەی یان گەڕانەوە بۆ نیشتمانەكەی بە هۆی گرانی سەفەرەوە لەسەر دەردەكات، هەركە گەیشتە سەر ئەو ئاوە دڵەڕاوكێ و بیری گەڕانەوەی كۆتایی پێ دێت، سالیكیش هەر بەو جۆرەیە كاتێك دەگاتە سەرچاوەی "تەختبوون"، لە دڵەڕاوكێ و بیری گەڕانەوە بۆ دواوە رزگاری دەبێت، پێ دەنێتە یەكەمین مەنزیلەی دڵنیایی لە سەفەرەكەیدا و لەسەر سەفەرەكەی سوور دەبێت.

**ئەم مەقامە سێ پلەی هەیە:**

**پلەی یەكەم:** ئەوەیە كە خۆپارێزییەكەی ئابلۆقەی شەهوەت بدات (أن تستغرق العصمة الشهوة) و ویست بگاتە فریای بێئاگایی (وتستدرك الإرادة الغفلة) و داوا دڵنەوایی بەربداتەوە(واتە لە خۆی بكاتەوە و هەڵیبدات) (ويستهوي الطلب السلوة)–

**موریدی سالیك:** بێئاگایی روو لە مەبەست و داواكەی دەكات و ویستی لاواز دەكات، شەهوەت بەرهەڵستی ویستی دەكات و رێگەی گەیشتن بە موورادی لێدەگرێت، هەروەها گەڕانەوە لە مووراد و مەبەست، دڵنەوایش لەو جۆرانەیە.

ئەم پلەیە لە تەختبوون لەو سێ شتە دەیپارێزێت، بۆیە خۆپارێزییەكەی هەموو شەهوەتەكانی دەگرێتەوە.

"العصمة"– بریتییە لە پارێزگاری لێكردن، "الشهوة" بریتییە لە مەیل بۆ داواكانی نەفس، و "الإستغراق" بۆ شتێك بریتییە لە لە ئامێزگرتن و ئابلۆقەدانی.

مەبەستی بە "دڵنەوایی" ئەو تام و چێژەیە سالیك لە خۆشەویستی وەریدەگرێت، لای عاریفان خۆشەویستی كامڵ ئەوەیە كە تام و چێژ لەگۆڕ بنرێت و خودا خۆی بكرێتە ئامانج و هیچ شتێك نەبێتە پەردەی نێوان بەندە و خودا.

ئەم پلەیە لە تەختبوون لەو سێ ئافەتە دەیپارێزن، بۆیە خۆپارێزییەكەی زاڵ دەبێت بەسەر شەهوەتدا و ژێردەستەی دەكات، ئەمەش هەموو بەشەكانی شەهوەت

دەگرێتەوە، كە خۆپارێزی هەموو بەشەكانی شەهوەتی گرتەوە ئەوە بەڵگەی تەختبوون و ڕۆیشتن بۆ ناو مەقامی دڵنیایی و پێخستنە ناو قۆناغەكانی سەرەتایە، ڕزگاربوونی لەم مەنزیلەدا لە دڵەڕاوكێ لە نێوان ڕووكردنە مەبەست و پشت تێكردنی، و گەڕانەوە و لێبڕان، لێبڕان بۆ ڕاوەستان و سووربوون و ڕۆیشتنی بەردەوام، ئەمەش نیشانەی بوونی سوكناییە.

ویست بگاتە فریای بێئاگایی (وتستدرك الإرادة الغفلة)، "الإرادة" لەلای ئەهلی ڕێگەی بەرەو خوداچوون، بریتییە لە ناوی یەكەمین مەنزیلەی ئەوانەی بۆ لای خودا دەچن، "المريد" ئەو كەسەیە لە نیشتمانی سروشت و نەفسی خۆی هاتۆتە دەرەوە و دەیەوێت سەفەر بۆ لای خودا و خانەی دواڕۆژ بكات، كە پێی نایە مەنزیلەی "تەختبوون" ویستی ئابلۆقەی بێئاگایی دەدات، فریای دەكەوێ و بەهانایەوە دەچێت، بەو هۆیەشەوە ئەوەی لەدەستی چووە بەدەستی دەهێنێتەوە.

بەردانەوەی داوا بۆ دڵنەوایی (إستهواء طلبه لسلوته) بریتییە لەژێردەستە كردنی خۆشەویستییەكەی بۆ دڵنەوایی و زاڵبوونی بەسەریدا(واتە لە خۆشەویستییەكەی لەگەڵ خودا دڵنەوایی داوا نەكات، بەڵكو تەنها خودا بە ئامانج بگرێت)، بەجۆرێك كە دڵنەوایی بەربدرێتەوە و بكەوێتە خوارەوە وەك ئەو كەسەی بە بیرێكدا بەردەبێتەوە، ئەمەش نیشانەی خۆشەویستی ڕاستەقینەیە: هاتووی دڵنەوایی ژێردەست بكرێت و لە چاڵێكدا بیشارێتەوە و دوای ئەوە هەرگیز نەڕوێتەوە و جارێكی تر نەژێتەوە.

دەرئەنجام: خۆپارێزییەكەی ئارەزووەكانی ژێردەستە دەكات و ویستی بێئاگاییەكەی ڕادەماڵێ و خۆشەویستییەكەشی دڵنەوایی لەخۆی دەكاتەوە.

پلەی دووەم: بەرهەڵستكارێك دڵی ڕووبەڕووی وەحشەت نەكاتەوە (أن لا يوحش قلبه عارض)، و فیتنە ڕێگەكەی لێ نەبڕێتەوە (ولا يقطع عليه الفتنة).

"العارض" بریتییە لەو شتەی كە پێچەوانەی تۆیە، وەك ئەو شتەی لەسەر ڕێگە بەرهەڵستیت دەكات، بەدرێژایی ڕێگە دێت و ڕووبەڕووت دەبێتەوە، بەهێزترین ئەو بەرهەڵستكارانە: بەرهەڵستكاری وەحشەتی تەنهایی، ساليك لا بەلایدا ناكاتەوە، وەك هەندێك لە ڕاستگۆیان دەڵێن: تەنهابوونت لەسەر ڕێگەی داواكەت نیشانەی ڕاستی داواكەتە، هەندێكی تر دەڵێن: وەحشەت نەتگرێت لەسەر ڕێگە بەهۆی كەمی سالیكانەوە، فریو نەدرێیت بەهۆی زۆری تیاچووانەوە(ئەوانەی لەسەر ڕێگەی باتڵن).

"الفتنة" کە ڕێگە لە سالیك دەبڕێتەوە: بریتییە لەو هاتووانەی ڕوو لە دڵ دەکەن و ڕێگەی لێ دەگرن لە بەدواداچوونی حەق و بە مەبەستگرتنی، کاتێك لە مەنزیلەی "تەختبوون" ویستی ڕاستەقینەی داواکەی ڕیشەی داکوتی ئەوا بەرهەڵستکاری فیتنە چاوی تێنابڕێت و ڕێگەی لێ نابڕێتەوە.

ئەم لێبڕانانە تەنها بۆ ئەوانە دروستن کە نووری ئاسەواری ناو و سیفەتەکان و جیلوەی ماناکانیان دڵی ڕۆشن کردبنەوە.

**پلەی سێیەم:** مەدح و زەمی لا یەکسان ببێت و لۆمەی بۆ نەفسی خۆی بەردەوام بێت.

بزانە: هەرکات پێی بەندە(سالیك) لە مەنزیلەی "تەختبوون"دا جێگیر بوو و تیایدا قووڵبوویەوە هیممەتی بەرز دەبێتەوە و نەفسی لە ڕاچڵەکینی مەدح و زەم باڵا دەبێت و بە مەدحی خەڵکی دڵخۆش نابێت و بە زەمیشیان دڵتەنگ نابێت، ئەمە وەسفی کەسێکە لە بەشی نەفسی خۆی هاتبێتە دەرەوە و دڵی خۆی دابێتە بەر تیشکی ناو و سیفەتەکانی خودای موتەعال و شیرینی باوەڕ و یەقین بە دڵی گەیشتبێت.

وەستان لەسەر مەدح و زەمی خەڵك: نیشانەی دابڕانی دڵ و خاڵیبوونیەتی لە خودا، بەڵگەی ئەوەیە ڕۆحی خۆشەویستی و ناسینی خودا نەگەیشتوونەتە دڵی و چێژی وابەستەبوون و دڵنیایی نەکردووە.

بەندە(سالیك) چێژی شیرینی باوەڕ و صدق و یەقین ناکات تا هەموو نەفامی لەدڵی دەرنەچێت، سوێند بە خودا، گەر خەڵکی لەم سەردەمەدا لە دڵی پیاوێکدا ئەو چێژی باوەڕە ببینن هەموویان بەردبارانی دەکەن و پێی دەڵێن: ئەوە بیدعەچییە و لە بانگەکەرانی بیدعەیە، سکاڵا تەنها بۆ لای خودایە، ئارامی و خۆڕاگری تەنها بەوەوەیە، هەر دەگەینەوە بە لیقای ﴿وَقَدۡ خَابَ مَنِ ٱفۡتَرَىٰ ۝٦١﴾ طە: ٦١ ﴿وَسَيَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَيَّ مُنقَلَبٖ يَنقَلِبُونَ ۝٢٢٧﴾ الشعراء: ٢٢٧.

مەبەست بە "النفس" لای عاریفان: ئەوەی نەخۆش و دەردەدارە لە سیفاتی بەندە، هەروەها ئەوەی زەمکراوە لە ئەخلاق و کرداری، جا ئەو سیفات و ئەخلاقانە بەدەستهێنراو بن و لە دەرەوە ڕوویان لە بەندە کردبێت، یاخود لە سروشت و هەویری ناخیدا بوونی هەبێت، ئەو (سالیك) زۆر لۆمەی ئەو دۆخە دەکات، ئەمە یەکێکە لەو

تەئویلانەی بۆ ئایەتی ﴿ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ۝٢ ﴾ القيامة: ٢ کراوە سەعیدی کوڕی جوبەیر و عکرمة دەڵێن: لەسەر خێر و شەڕ لۆمە دەکرێت، لەسەر خۆشی و ناخۆشی ئارام ناگرێ.

قەتادە دەڵێت: مانای "اللوامة" بریتییە لە "الفاجرة"-بەدکار.

مجاهد دەڵێت: لەوەی لەدەستی چووە پەشیمان دەبێتەوە و دەڵێت: گەر بمکردبایە؟ گەر ئەوەم نەکردبایە؟

فراء دەڵێت: هیچ نەفسێکی چاکەکار و بەدکار نییە لۆمەی خۆی نەکات، گەر کاری چاکەی کردبێت دەڵێت: بۆ زیاترم نەکرد؟ گەر کاری خراپەی کرد دەڵێت: خۆزگە نەمکردبایە.

حەسەن دەڵێت: بریتییە لە نەفسێکی باوەڕدار، باوەڕدار-سوێند بە خودا- هەمیشە لۆمەی نەفسی خۆی دەکات، مەبەستم چی بوو بە وتنی ئەو کەلیمەیە؟ مەبەستم بە خواردنی ئەو لوقمەیە چی بوو؟ مەبەستم بە فلان کار چی بوو؟ مەبەستم چی بوو بە...؟ بەدکار -لە کاری خراپەدا- بۆ پێشەوە دەڕوات و نە دادگایی و نە لۆمەی خۆی دەکات.

مقاتل: دەڵێت: بریتییە لە نەفسێکی بێباوەڕ، لە دوارۆژدا لۆمەی نەفسی خۆی دەکات لەسەر ئەو کارە خراپانەی لە دونیادا ئەنجامی داون.

مەبەست: هەر کەس راستگۆیانە نەفسی بە خودا بەخشیبێت پەسەند نییە لای لەگەڵی بمێنێتەوە، چونکە دەیەوێت لەلایەن ئەو کەسەوە کە پێیبەخشراوە نەفسەکە قبووڵ بکرێت، ئەو نەفسی خۆی بۆ کردووە بە قوربانی، ئەو کەسەی قوربانی دەکات و لێی قبووڵ دەکرێت وەك ئەو کەسە نییە کە لێی قبووڵ ناکرێت و بەسەریدا دەدرێتەوە، مانەوەی نەفسی لەگەڵیدا بەڵگەی وەرنەگرتنی قوربانییەکەیەتی.

نەفس چیایەکی گەورە و گرانە لەبەردەم رێبوارانی رێگەی بەرەو خوداچووندا، دەبێت بگات بەو چیایە و بەسەریدا سەربکەوێت، بەڵام لای هەندێ کەس سەخت و گرانە و لای هەندێکیش ئاسانە، هەر کەسێکیش خودا لای ئاسان بکات بۆی ئاسان دەبێت.

لەو چیایەدا شیو و دۆڵ هەیە، کۆسپ و لەمپەر و درك و داڵ، هەروەها دز و چەتە کە رێگەی کاروانی بەرەو خوداچوون دەگرن، بە تایبەت ئەوانەی بەشەو سەفەر دەکەن، گەر زەخیرەی باوەڕیان لەگەڵ نەبێت و چرای یەقین کە بە زەیتی "تەختبوون" کار

دەكات بە دەستەوە نەگرن ئەوا لەو شیو و دۆڵانەدا دادەخرێن و چەتە و ڕێگرەكان لە یەكیان دادەبڕن و ناتوانن ڕۆیشتنەكەیان بەردەوام بێت.

زۆربەی ئەوانەی بەرەو خودا دەچن لەگەڵ گەیشتن بەو چیا و هەورازە گەڕاونەتەوە، چونكە دەستەوسان بوون لە سەركەوتن بەسەریدا و بڕینی كۆسپ و لەمپەرەكانی، شەیتان لەسەر قوللەی ئەو چیایەیە، هۆشداری بە خەڵكی دەدات لە سەركەوتن بەسەر ئەو چیایەدا و دەیانترسێنێت، بۆیە ئەرك وماندبوون و سەختیی سەركەوتن و دانیشتنی ئەو ترسێنەرە لەسەر لوتكەی چیاكە و لاوازی لێبڕان و نێتی ڕێبواری ڕێگەی خودا یەكدەگرن و ئەمەی لێوە پەیدا دەبێت: دابڕان و گەڕانەوە، پارێزراو كەسێكە خودا بیپارێزێت.

هەتا ڕێبواری ڕێگەی خودا زیاتر بەو چیایەدا بەرز ببێتەوە هاوار و هۆشداری و ترساندنی ڕێگر زۆرتر و زیاتر دەبێت، كە چیاكەی بڕی و گەیشتە لوتكەكەی: هەموو ئەو ترسانە دەبن بە ئاسایش و ئارامی، ئەو كاتە ڕۆیشتن ئاسان دەبێت و بەرهەڵستییەكان و گرانی و سەختی سەر ڕێگە كەم دەبنەوە، ڕێگەكەی لێ دەبێت بە ڕێگەیەكی بەرینی پڕ لە ئاسایش، ڕێگەكە سەری لە مەنزڵەكانی بەندایەتی و سەرچاوەكانییەوە دەردەكات، مەشخەڵ و ئاماژەی لەسەر دیاری كراوە، شوێنی مانەوە لەسەر ڕێگە هەیە و هەموو ئەوانە بۆ كاروانی ڕەحمان ئامادەكراون.

لەنێوان بەندە و بەختەوەری و سەرفرازیدا: هێزێكی مەزن بوونی هەیە، هەروەها ساتێك ئارامی و ئازایەتی دەروون و ڕاوەستانێكی دڵ، فەزڵ بەدەستی خودایە و بە هەر كەسێكی دەبەخشێت كە بیەوێت، خودا خاوەنی مەزنترین فەزڵ و چاكەیە.

❁ ❁ ❁

# (16) (منزلة الزهد)

## مەنزیلەی زوهد

لە مەنزیلەکانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی زوهدە.

خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ ﴾ النحل: 96 ﴿ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌۢ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَـٰدِ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَـٰمًا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٌ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَـٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿٢٠﴾ ﴾ الحديد: 20 ﴿ إِنَّمَا مَثَلُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَـٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلْأَنْعَـٰمُ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلْأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَآ أَنَّهُمْ قَـٰدِرُونَ عَلَيْهَآ أَتَىٰهَآ أَمْرُنَا لَيْلًا أَوْ نَهَارًا فَجَعَلْنَـٰهَا حَصِيدًا كَأَن لَّمْ تَغْنَ بِٱلْأَمْسِ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ يونس: 24 ﴿ وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَـٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ ٱلرِّيَـٰحُ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقْتَدِرًا ﴿٤٥﴾ ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱلْبَـٰقِيَـٰتُ ٱلصَّـٰلِحَـٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا ﴿٤٦﴾ ﴾ الكهف: 45 — 46 ﴿ قُلْ مَتَـٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ وَٱلْـَٔاخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ ﴾ النساء: 77 ﴿ بَلْ تُؤْثِرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿١٦﴾ وَٱلْـَٔاخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٧﴾ ﴾ الأعلى: 16 — 17 ﴿ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٣١﴾ ﴾ طه: 131 ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ وَإِنَّا لَجَـٰعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيدًا جُرُزًا ﴿٨﴾ ﴾ الكهف: 7 — 8 ﴿ وَلَوْلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً لَّجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ بِٱلرَّحْمَـٰنِ لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فِضَّةٍ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ ﴿٣٣﴾ وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَٰبًا وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِـُٔونَ ﴿٣٤﴾ وَزُخْرُفًا وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَـٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٣٥﴾ ﴾ الزخرف: 33 — 35.

قورئان پڕە لە ئاماژەی دونیانەویستی و هەواڵدان بە کەمی و کەم نرخی و خێرا تیاچوونی، هاندان بۆ هەڵبژاردنی دواڕۆژ و هەواڵدان لەسەر گەورەیی و بەردەوامییەکەی، گەر خودا بۆ بەندەیەك خێری بریار دابێت لە دڵیدا گەواهیدەرێك دروست دەکات و بەهۆیەوە حەقیقەتی دونیا و دواڕۆژی پێ دەبینێت، کامەیان لە پێشترە بۆ هەڵبژاردن ئەوەیان هەڵدەبژێرێت.

خەڵكی قسەی زۆریان لەسەر زوهد كردووە، هەر كەس لەوانە ئاماژەی بە چێژی خۆی كردووە و حاڵ و بینینی خۆی دەربڕیوە، زۆربەی قسەی ئەهلی ئەم ڕێگەیە لەسەر چێژ و حاڵی خۆیانە، بەڵام قسەكردن بە زمانی زانست بەرینترە لە قسەكردن بە زمانی چێژ و نزیكترە لە بەڵگە و بورهانەوە.

گوێم لە "شیخ الإسلام ابن تیمیة–قدس الله روحه–" بوو دەیفەرموو: زوهد بریتییە لە وازهێنان لە شتێك كە لە دواڕۆژدا قازانج ناگەیەنێت، وەرعیش(خۆگرتنەوە) بریتییە لە وازهێنان لە شتێك كە دەترسیت لە دواڕۆژدا زیانت پێ بگەیەنێت.

ئەم دەربڕینە لە باشترین ئەو دەربڕینانەیە لەسەر "زوهد و وەرع" وترابێت.

**سوفیانی سەوری دەڵێت:** زوهد لە دونیا بریتییە لە كورتی ئاوات، نەك خواردنی وشك و پۆشینی عەبای زبر.

لە زمانی عەرەبدا –كە زمانی ئیسلامە– "زوهد لە شتێك" بریتییە لە پشتهەڵكردن لەو شتە بەهۆی كەم بایەخییەوە لەلای، كەم تەماشاكردنی و بێنیازبوون لێی بە شتێكی باشتر لەوە، لە قورئاندا تەنها دەربارەی ئەوانە هاتووە كە "یوسف"یان فرۆشت ﴿ وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍ بَخْسٍ دَرَاهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُوا فِيهِ مِنَ الزَّاهِدِينَ ﴿٢٠﴾ ﴾ یوسف: ٢٠، زوهد لەو شتانەی خودا وەك نیعمەت لەم ژیانی دونیادا بە مرۆڤی بەخشیوە –بەوەی كردوونی بە بەڵا و یارمەتیدەر بۆسەر باوەڕ و هیدایەت و كردەوەی چاكی خۆپارێزان، بۆیە دەبنە كرداری چاكە بۆ ئاخیرەت، هەر بەو جۆرە یارمەتیدەر لەسەر بێباوەڕی و لادان و یاخیبوون بۆ بێئاگایان و بێباوەڕان– زوهد لەو نیعمەتانە پشت هەڵكردنە لە نیعمەتی خودا و كەم تەماشا كردنیەتی، ئەمەش لە هیدایەتی پێغەمبەر و هاوەڵانییەوە بەدوورە، بەڵكو هیدایەتی ئەوان بەڕێزەوە تەماشای نیعمەتەكانیان كردووە و خۆشیان ویستوون بە فەزڵی خودا دڵخۆش بوون و شوكریان كردووە بە بەكارهێنانی ئەو نیعمەتانە بۆ سەركەوتن و سەرفرازی لە تاقیكردنەوەكانی خودادا.

جونەید دەفەرموێت: زوهد لە ئایەتی ﴿ لِكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ ۗ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿٢٣﴾ ﴾ الحدید: ٢٣، زاهید كەسێكە لە دونیادا دڵی بە هیچ خۆش نییە و دڵتەنگ نییە بە شتێك لەدەستی چووە.

**یەحیای كوڕی مەعاز دەفەرموێت:** زوهد بەخشین لە موڵكدا بەدەست دەهێنێت، خۆشەویستیش بەخشین بە ڕۆح بەدەست دەهێنێت.

"إبن جلاء" دەڵێت: زوهد بریتییە لە سەرنجدانی دونیا بە چاوی تیاچوونەوە، لەبەر چاوت بچووك دەبێتەوە، بۆیە پشت هەڵکردن لێی لەسەرت ئاسان دەبێت.

وتراوە زوهد: بریتییە لە کەناگیری دڵ لە دونیا بەبێ زۆر لەخۆ کردن.

جونەید دەفەرموێت: زوهد بریتییە لە خاڵیبوونەوەی دڵ لەوەی دەست لێی خاڵیبووە.

ئیمام ئەحمەد دەفەرموێت: زوهد لە دونیا بریتییە لە کورتی ئاوات.

هەر لە ئیمام ئەحمەدەوە ریوایەتێکی تر کراوە کە دەفەرموێت: زوهد بریتییە لە دڵخۆش نەبوون بە هاتنی دونیا و دڵتەنگ نەبوون بە پشتهەڵکردنی، پرسیاری پیاوێکی لێکرا کە هەزار دیناری هەیە، ئایا دەگونجێ ئەو کەسە زاهید بێت؟ فەرمووی: بەڵێ، بە مەرجێك دڵخۆش نەبێت بە زیادبوونی و دڵتەنگ نەبێت بە کەم کردنی.

ئەبو سولەیمانی دارانی دەفەرموێت: زوهد وازهێنانە لە هەر شتێك سەرقاڵت بکات و خودات لەبیر بباتەوە.

رووەیم لە جونەیدی پرسی دەربارەی زوهد؟ فەرمووی: کەم تەماشاکردنی دونیا و سڕینەوەی ئاسەواری لە دڵدا، جارێکیان وتی: زوهد بریتییە لە خاڵیبوونەوەی دەست لە موڵك و ماڵ و خاڵیبوونەوەی دڵ لە چاوتێبڕین و بەدواداچوونی.

یەحیای کوڕی مەعاز دەفەرموێت: هیچ کەس ناگاتە راستێتی زوهد تا سێ سیفەتی تێدا نەبێت: کار بەبێ پەیوەندی، قسە بەبێ چاوتێبڕین، عیززەت بەبێ سەرۆکایەتی.

وتراوە: زوهد بریتییە لە پێشخستنی کەسانی تر(الإيثار) لە کاتی بێنیازبووندا، جوامێرییش بریتییە لە پێشخستنی کەسانی تر (الإيثار) لە کاتی پێویستی خۆتدا ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾الحشر: ٩.

ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەفەرموێت: زوهد سێ جۆرە:

یەکەم: وازهێنان لە حەرام کە بریتییە لە زوهدی خەڵکی بەگشتی.

دووەم: وازهێنان لە زیادە حەڵاڵ کە بریتییە لە زوهدی تایبەتەکان.

سێیەم: وازهێنان لە هەر شتێك مرۆڤ سەرقاڵ بکات و خودای لەبیر بباتەوە، ئەمەش بریتییە لە زوهدی عاریفان.

ئەم قسەیەی ئیمام ئەحمەد لەسەر هەموو ئەو قسانەوەیە مەشایخەکان کردوویانن، لەگەڵ بەیان کردن و رونکردنەوەی پلەکانی، پوختترین کەلامە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئیمام ئەحمەد -خوای لێ رازی بێت- لەم زانستەدا لە شوێنێکی بالآدا بووە، شافعی شایەتی ئیمامەتی لە هەشت شتدا بۆ داوە، یەکێك لەوانە "زوهد" بووە.

ئەوەی عاریفان کۆدەنگیان لەسەری هەیە: زوهد بریتییە لە سەفەری دڵ لە نیشتمانی دونیا و رووکردنە مەنزڵگاکانی دوارۆژ، لەسەر ئەم بنچینەیە ئەوانەی پێشوو کتێبەکانی زوهدیان پۆلێن کردووە، وەك "زوهدی عەبدوڵای کوڕی موبارەك، هەروەها زوهدی ئیمام ئەحمەد، زوهدی وەکیع و زوهدی هناد بن السري" کەسانی تریش.

وابەستەکانی زوهد شەش شتن، بەندە شایستەی ناوی زوهد و زاهید نابێت تا لەو شەش شتەدا زوهد پەیدا نەکات، کە بریتین لە: ماڵ و دارایی، و شان و شکۆ و کورسی و سەرۆکایەتی و خەڵك و نەفس و هەر شتێکی تر لەخوار خوداوە.

مەبەست ئەوە نییە لە موڵکداری ئەو شەش شتە دەربکەین، سولەیمان و داوود- علیهما السلام- زاهیدترین ئەهلی سەردەمی خۆیان بوون، موڵك و ماڵ و ئافرەتی زۆریشیان هەبوو، پێغەمبەری خۆمان بە رەهایی لە هەرچی مرۆڤە زاهیدتر بووە، نۆ هاوسەری هەبووە، عەلی کوڕی ئەبی تالب و عبدالرحمن کوڕی عەوف و عوسمانی کوڕی عەففان-خوایان لێ رازی بێت- لە زاهیدان بوون لەگەڵ ئەو ماڵ و داراییەی کە لەژێر دەستیاندا بوو، حەسەنی کوڕی عەلی-خوا لێیان رازی بێت- لە زاهیدان بوو لەگەڵ ئەوەی لە هەموو کەس زیاتر خۆشەویستی و هاوسەری بۆ ئافرەت هەبوو، لە زۆر کەس دەوڵەمەندتر بوو. عەبدوڵای کوڕی موبارەك لە ئیمامانی زاهیدان بوو لەگەڵ ماڵ و داراییەکی زۆردا، هەر بەو جۆرە لەیسی کوڕی سەعد لە ئیمامانی زاهیدان بوو لەگەڵ ئەوەشدا خاوەنی سەرمایەیەکی گەورە بوو، دەیوت: گەر ئەوە (ماڵ و دارایی) نەبوایە نەفامان دەیانکردین بە خاولی بەشان و پاککەرەوەی ماڵەکانیان.

لە باشترین ئەو وتانەی لەسەر زوهد وتراون بریتییە لە قسەی شێخ حەسەنی بەصری و کەسانی تریش: زوهد لە دونیادا بە حەرام کردنی حەڵاڵ نابێت، هەروەها بە بەفیڕۆدانی ماڵ و سامان نابێت، بەڵکو بەوە دەبێت متمانەت بەوەی لەدەستی خودادایە زۆرتر بێت لەوەی لەدەستی خۆتدایە، حەزی زۆرترت هەبێت بۆ پاداشتی

بەڵا و ناخۆشی –ئەگەر تووشت هات– تا حەزت بۆ ئەوەی تووشت نەبێت. ئەمە پوختەترین و باشترین قسەیەکە لەسەر زوهد کرابێت. بە ریوایەتی بەرزکراوە بەدەستمان گەیشتووە.

## ۞ سوننەتی دونیانەویستی بەردەوامە

خەڵکی لەم سەردەمەدا جیاوازی کەوتۆتە نێوانیانەوە لەمەڕ ئەوەی ئایا زوهد لەم سەردەمەدا گونجاوە یان نەگونجاوە؟

**ئەبو حفص دەڵێت:** زوهد تەنها لە حەڵاڵدایە، حەڵاڵیش لە دونیادا نییە بۆیە زوهد بوونی نییە.

**خەڵکی لەم بۆچوونەدا پێچەوانەی ئەون و دەڵێن:** حەڵاڵ لە دونیادا بوونی هەیە، حەرامی زۆریشی تێدایە، بەو گریمانەی کە حەڵاڵی تێدا نەبێت زوهدکردن لێی پێویستترە و تەنها وەك کەسێکی ناچار(المضطر) دەست بۆ دونیا ببات، وەك چۆن لە ناچاریدا دەست بۆ مردارەوە بوو و خوێن و گۆشتی بەراز دەبات.

**یوسفی کوڕی أسباط دەفەرموێت:** گەر هەواڵم پێ بدرێت پیاوێك لە زوهددا گەیشتۆتە پلەی "أبي ذر" و أبي الدرداء و سلمان و المقداد" و هاوشێوەکانیان لە هاوەڵانی پێغەمبەر–خودایان لێ رازی بێت– پێی نالێم زاهید، چونکە لە حەڵاڵی رەهادایە، حەڵاڵی رەهاش لەم سەردەمەی ئێمەدا بوونی نییە، حەرامیش گەر ئەنجامی بدەیت خودا–**عزوجل**– سزات دەدات.

پاشان لەسەر وابەستەکانی زوهد جیاوازی کەوتۆتە نێوانیانەوە.

**دەستەیەك دەڵێن:** زوهد لە حەڵاڵدایە، چونکە وازهێنان لە حەرام فەرزێکە لە فەرزەکان.

**دەستەیەکی تر دەڵێن:** زوهد تەنها لە حەرامدایە، حەڵاڵ نیعمەتێکی خودایە بەسەر بەندەکەیەوە، خودا پێی خۆشە ئاسەواری نیعمەتەکانی بەسەر بەندەکەیەوە ببینێت، شوکری خودا لەسەر نیعمەتەکانە و کۆمەکییان پێ دەکرێت بۆ ئەنجامدانی گوێڕایەڵی و کاری چاکە، نیعمەتەکان دەکرێنە رێگەیەك بۆ گەیشتنە بەهەشت، دەست بۆ بردنیان چاکترە لەوەی زوهدی تێدا بکەیت و وازیان لێ بهێنی و خۆت لە هۆکارەکانی بەدوور بگریت.

راستییەكەی: گەر نیعمەتەكان لە خودا بێئاگای كرد ئەوا زوهد تیایاندا لەپێشتر و باشترە، گەر سەرقاڵی نەكرد و لەخودا بێئاگای نەكرد، بەڵكو شوكری خودای لەسەر دەكرد ئەوا ئەو حاڵەی باشترە، ئەو كاتە زوهد لەو نیعمەتانە دەبێتە خاڵیكردنەوەی دڵ لە وابەستەبوونی نیعمەتەكان و پاڵدان بەلایانەوە، خودا باشتر دەزانێت.

## ۞ خۆپاك راگرتن و گیانی بالأبوون

**ئەوەش سێ پلەی هەیە:**

**پلەی یەكەم:** زوهد لە شتە گوماناوییەكان لەدوای وازهێنان لە حەرام، بە خۆ بەدوور گرتن و كەنارگیری لە لۆمە(بالحذر من المعتبة) و ملنەدان بە ناتەواوی(والأنفة من المنقصة) و لا ناپەسەندی بەشداربوون لەگەڵ لادەران(وكراهة مشاركة الفساق).

**زوهد لە شتە گوماناوییەكان:** بریتییە لە وازهێنان لەو شتەی لە بیری بەندەدا تێكەڵ دەبێت و پێی جیاناكرێتەوە، ئایا حەلاڵە یان حەرامە؟ وەك لە فەرموودەكەی نوعمانی كوڕی بەشیر–خوا لە خۆی و باوكی رازی بێت– لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) **((الحلال بين، والحرام بين، وبين ذالك أمور مشتبهات، لا يعلمهن كثير من الناس، فمن اتقى الشبهات اتقى الحرام، ومن وقع في الشبهات وقع في الحرام، كالراعي يرعى حول الحمى، يوشك أن يرتع فيه، ألا وان لكل ملك حمى، ألا وأن حمى الله محارمه، ألا وأن في الجسد مضغة إذا صلحت صلح لها سائر الجسد، وإذا فسدت فسد لها سائر الجسد، ألا وهي القلب))**

پاشان خۆی بە گەورە رادەگرێت لەوەی بە ناتەواوی بچێتەوە خزمەت پەروەردگاری و لەبەر چاوی خودا بكەوێت(والأنفة من المنقصة)، نەك خۆ بە گەورە ڕاگرتنەكەی بۆ ئەوە بێت لەلای خەڵكی ناتەواو تەماشا نەكرێت، هەرچەند ئەوەش ناپەسەند نییە، بەڵكو ستایشكراوە، ناپەسەند ئەوەیە: هەموو خۆ بە گەورە راگرتنەكەی بۆ خەڵكی بێت و بەشی خودای تێدا نەبێت.

ناپەسەندی بەشداربوون لەگەڵ لادەران(وكراهة مشاركة الفساق): ئەمەش لەبەر ئەوەی لادەران لە مەیدانەكانی حەزی دونیادا ململانێ و شانشانێن دەكەن، لەو شوێنانەدا قەڕەی سكی ئەهلی دونیا دێت و كەسی دونیانەویست خۆ بەرزتر رادەگرێت لەوەی روو لەو شوێنانە بكات، ڕۆحی عەزیزتر و بالاترە لە تێكەڵی ئەو

کۆمەڵە دونیاپەرستە، وەك وتراوە بە هەندێکیان: چی وای لێکردی زوهد لە دونیا بکەی؟ وتی: کەمی وەفای دونیا و زۆری جەفای و نزمی هاوەڵانی.

| | |
|---|---|
| إذا لم أترك السماء اتقاء | تركت لكثرة الشركاء فيه |
| إذا وقع الذباب على الطعام | رفعت يدي ونفسي تشتهيه |
| وتجتنب الأسود ورود ماء | إذا كان الكلاب يلغن فيه |

## ✿ تەلارێك..... لە سوکنایی

**پلەی دووەم:** بەکارهێنانی بۆشاییەکانی کات بۆ ئاوادانکردنەوەی تەمەن و دڵدامەزراوی.

لەبەر ئەوەی زوهد بۆ ئەهلی پلەی یەکەم: بریتییە لە ترس لە لۆمەکردن و دوورەپەرێزی لە ناتەواوی، ئەوا زوهدی ئەهلی ئەم پلەیە بالاتر و بەرزترە، ئەوەش بریتییە لە بەکارهێنانی بۆشاییەکانی کات بۆ ئاوەدان کردنەوەی ژیان لەگەڵ خودادا، چونکە گەر بە زیادەی دونیاوە خەریك بوو بەشی خۆی لە فورسەتی کات لەدەست دەدات، کات شمشێرە گەر نەیبڕێت ئەو تۆ دەبڕێت.

ئاوەدانکردنەوەی کات: بریتییە لە سەرقاڵی لە هەموو چرکە ساتەکاندا بە شتێك لە خودای نزیك بکاتەوە، یان یارمەتی نزیکبوونەوە لە خودا بدات لە خواردن و خواردنەوە و هاوسەری کردن و خەوتن و پشوو، هەر کات ئەمانەی بە نییەتی بەهێزبوون لەسەر ئەو شتەی خودا خۆشی دەوێت و دوورکەوتنەوە لەوەی تووڕەی دەکات ئەنجام دران ئەوە بریتییە لە ئاوەدان کردنەوەی کات، با تەواوترین چێژیشی لەو کاتە وەرگرتبێت، ئاوەدان کردنەوەی کات بە کۆچکردن لە چێژ و خۆشییەکان نابێت.

وا دامەنێ ئاوادان کردنەوەی کات تەنها بە نوێژە، بەڵکو بە کرداری چاکە وەك شوکرێك بۆ خودا، بە کشتوکاڵ و پیشەسازییەوە، کارکردن بۆ ئاوەدان کردنەوەی سەر زەوی و دەرهێنانی گەنجینەکەی و چاکسازی تیایدا، پەرەسەندنی سەرمایە و ئامادەکردنی هێز و ژمارە و چەك، تاکو ئوممەت بتوانێت ئایینەکەی خۆی جێگیر بکات و شەریعەتی ئیسلام راوەستاو بکات لەوێشەوە سێبەری دادپەروەری و رەحمەتی ئیسلام بۆ سەر هەموو خەڵکی درێژبکاتەوە، لە تاریکیەوە بۆ نوور دەریان

بهێنێت، هەر بەو جۆرە مامەڵەی باش لەگەڵ خانەوادە و منداڵ و ئاوسێدا بە هەموو جۆرەكانی مامەڵەی باش لە خواردن و خواردنەوە و پۆشاك، شتانی تریش جگە لەوانە كە ژیانێكی خۆشگوزەران ئامادە دەكەن، هەر بەو جۆرە ژیانێكی بەختەوەرانە بۆ خێزان، تاكو لە ژینگە و فەزایەكی چاك و پاك و رێزداردا پەروەردە ببن، بۆ پەروەردەبوونی نەوەیەكی نوێ لە رۆڵەی سالحانی قازانبەخش، كاركەر بۆ هێز و عیززەتی ئوممەت، هەر بەو جۆرە شارەزایی لە پیشەسازیدا كە ئوممەتی بەسەر گەلانی تردا لە مەیدانی ئاوەدان كردنەوەدا پێ پێشدەكەوێت، هەموو ئەو كارانە و هاوشێوەكانیان لە شوكری ئەو نیعمەتانەن خودا بەخشیونی و پێویستە سوودیان لێ ببینرێ و كاتەكانی پێ ئاوەدان بكرێتەوە.

خۆشەویست و خواویستی راستگۆ لەوانەیە رۆیشتنی دڵ و ناخی بۆ لای خودا لە كاتی خواردن و خواردنەوە و پشوودا بەهێزتر بێت لە رۆیشتنی جەستەیی لە هەندێ كاتدا.

گومانی تێدا نییە گەر نەفس بەشێكی باشی لە دونیا بەدەست هێنا پێی بەهێز و دڵخۆش دەبێت، ئەو كاتە هێزەكانی خۆی كۆدەكاتەوە و لە پەرتبوون رزگاری دەبێت.

**یەكلابوونەوەی دڵ (حسم الجأش):** بریتییە لە برینی شێواوی دڵ بەهۆی وابەستەبوونی بە هۆكارەكانی دونیاوە، حەز و ترس و خۆشەویستی و بوغز و كۆشش، زوهدی بەندە نایەتە راستە تا ئەو ئاشووب و شێواوییە لە دڵیدا دانەمركێنێتەوە، بەوەی لانەكاتەوە بە لایاندا، وابەستەیان نەبێت لە حاڵەتی دەست بۆبردنیان یان وازلێهێنانیان، زوهد بریتییە لە زوهدی دڵ، نەك تەنها زوهدی دەست و بەشەكانی تری جەستە، زوهد خاڵیبوونەوەی دڵە لە هەموو ئەوانە، نەك خاڵیبوونی دەست.

## ۞ زوهد بەچی..... شتێك لەوێ بوونی نییە

پلەی سێیەم: زوهد لە زوهد، ئەوەش بە سێ شت ئەنجام دەدرێت: بەكەم تەماشا كردنی ئەوەی زوهدت لێ كردووە، و یەكسان بوونی حاڵەتەكان لەلات، و وازهێنان و رۆیشتن لە بینینی ئەوەی بەدەستت هێناوە.

**زوهد لە زوهد بە سێ شت راڤە دەكرێت:**

**یەكەم:** بە كەم تەماشا كردنی ئەوەی زوهدت لێ كردووە، هەر كەس دڵی بە خۆشەویستی خودا و مەزن راگرتنی پڕ ببێت وانابینێت ئەوەی دەستبەرداری بووە لە دونیا شایستەی

نزیکبوونەوە بێت لە خودا، چونکە سەراپای دونیا لای خودا نرخی باڵە مێشوولەیەکی نییە، کەسی عاریف وانابینێت زوهدەکەی لە دونیا شانوشکۆیەکی ئەوتۆی ببێت شانی لەسەر دابدات و ئاهەنگی بۆ بگێڕێت، ئەو کەسەی زوهدەکەی دروست بێت شەرم دەکات ئەوەی بۆ خودا دەستبەرداری بووە گەورە تەماشای بکات و چاوی لەسەری بێت، بەڵکو فەنا لە زوهدەکەی دەکات، وەك چۆن بە زوهدەکەی فەنای لە شتەکان کردووە، شەرم دەکات بە زمان باسی لەبارەوە بکات و بەدڵ چاوی بخاتە سەر.

**یەکسان بوونی حاڵەتەکان لەلای:** ئەو شتەی وازی لێهێناوە و زوهدی لێ کردووە لەگەڵ وەرگرتن و دەست بۆ بردنی لای یەکسان بێت، چونکە شتەکە لە لای ئەو هیچ بەها و نرخێکی نییە، ئەمەش لە وردەکارییەکانی فیقهی زوهدە، لە حاڵەتی وەرگرتندا کەسەکە زاهیدە، وەك چۆن لە حاڵەتی دەستبەرداربوونیدا زاهیدە، چونکە هیممەت و لێبڕانی باڵاترە لە سەرنجدانی شتەکە بە وەرگرتنی یان وازلێهێنانی، بەهۆی بچووکی لەبەر چاویدا.

**تەنهای خودا لە بەخشین و لێگرتنەوەدا ببینێت:** واهەست نەکات شتێکی وازلێهێناوە یان شتێکی وەرگرتووە، بەڵکو خودایە بە تاك و تەنهایی دەبەخشێت و دەگرێتەوە، ئەوەی وەریگرتووە وەك جاریبوونی بەخشینی خودایی وایە، وەك جاریبوونی ئاو بە رووباردا، ئەوەی وازی لێ هێناوە بۆ خودا(ﷻ) هەر خۆیەتی لێی گرتۆتەوە، بۆیە بە بینینی خودای "فعال"ەوە خەریك دەبێت و بینینی بەدەست هێنان و وازلێ هێنانی خۆی لەبیر دەچێتەوە.

❁ ❁ ❁

# (١٧) (منزلة الورع)

## مەنزیلەی وەرع

لە مەنزیلەکانی ((إیاك نعبد وإیاك نستعین)) مەنزیلەی خۆگرتنەوە(وەرع)ە.

خــودای موتــەعال دەفــەرموێت ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُوا۟ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعْمَلُوا۟ صَٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٥١﴾ ﴾ المؤمنون: ٥١، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴿٤﴾ ﴾ المدثر: ٤، قەتادە و موجاهد دەڵێن: نەفست لە گوناه پاکبکەرەوە، نەفسی بە پۆشاك(ثـوب) ناوبردووە، ئەمەش رای "إبراهیم النخعي و الضحاك و الشعي و الزهري" و هەندێك لە زانایانی ئەهلی تەفسیرە.

**ئیبن عەباس دەفەرموێت:** پۆشاکی گوناه و غەدر مەکە بە بەردا، پاشان وتی: گوێت لە هۆنراوەکەی "غیلان بن سلمة الثقفي" نەبووە کە دەڵێت:

**(وإني –بحمد الله– لاثوب غادر لبست ولا من غدرة أتقنع)**

عەرەب گەر بیەوێت وەسفی پیاوێك بە راستگۆیی و وەفا بکات دەڵێت: "پۆشاکەکانی پاکە" بە کەسی غەدرکەر و داوێنپیس و بەدکاریش دەڵێت "پۆشاك پیس"، ئوبەی کوڕی کەعب دەفەرموێت: پۆشاکی غەدر و ستەم و خراپەی لەبەر مەکە، بەڵکو پۆشاکی چاك و پاکی لەبەر بکە.

**"الضحاك"دەڵێت:** کردارەکەت چاك بکە، "السدي" دەڵێت: گەر پیاوێك چاك و پاك بێت پێی دەوترێت "پۆشاك پاك"، گەر بەدکاریش بێت پێی دەوترێت "پۆشاك پیس". سەعیدی کوڕی جوبەیر دەفەرموێت: دڵ و ماڵی پاك بکەرەوە، حەسەن و "القرظي" دەڵێن: رەوشتت باش و جوان بکە.

**ئیبن سیرین و ئیبن زید دەڵێن:** فەرمانی بە پاککردنەوەی جلوبەرگ داوە کە نوێژ پێیەوە دروست نییە، چونکە هاوەڵدانەران خۆیان و پۆشاکی بەری خۆیان پاك نەدەکردەوە.

"الطاووس" دەڵێت: پۆشاکەکەت کورت بکەرەوە، چونکە کورتکردنەوەی جلوبەرگ پاکوخاوێنی بوو بۆی.

قسەی یەکەم دروسترین بۆچوونە لەسەر ئایەتەکە.

ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە پاککردنەوەی پۆشاك لە پیسی و کورتکردنەوەی لە کۆی ئەو پاککردنەوەیە فەرمانی پێدراوە، چونکە کردەوە و ئەخلاق بەوە تەواو دەبن. چونکە پیسی دەرەوە پیسی ناوەوە دروست دەکات، بۆیە فەرمان بەو کەسە کراوە کە لەبەر دەستی خودادا رادەوەستێت ئەو پیسیە بسڕێتەوە و لێی دووربکەوێتەوە.

مەبەست: وەرع پیسی دڵ پاك دەکاتەوە وەك چۆن ئاو پیسی پۆشاك و جلوبەرگ پاك دەکاتەوە، لەنێوان پۆشاك و دڵدا لێکچوونی دەرەکی و ناوەکی هەیە، بۆیە لە خەوندا جلوبەرگی مرۆڤ هێمایە بۆ دڵ و حاڵی، هەر یەکێکیان کار لەوی تریان دەکات. بۆیە نەهیکراوە لە پۆشینی جلوبەرگی ئاورشم و ئاڵتون و پێستی درندە، کاریگەری دڵ و دەروون لەسەر پۆشاك کارێکی شاراوەیە، ئەهلی بینینی رۆشن لە پاکوخاوێنی و پیسی و بۆن و گەشی و لێڵی جلوبەرگدا ئەم حاڵەتە دەناسنەوە، تەنانەت پۆشاکی چاکان لە پۆشاکی بەدکاران جیادەکرێتەوە بەبێ ئەوەی لەبەریان کردبێت.

پێغەمبەر(ﷺ) وەرعی لە یەك کەلیمەدا کۆکردۆتەوە، فەرمووی ((لە جوانی و باشی موسڵمانبوونی کەسێك ئەوەیە واز لە هەموو ئەو شتانە بهێنێت کە پەیوەندی بە ئەوەوە نییە))، ئەم وازهێنانە قسە و سەیرکردن و گوێگرتن و دەستوەشاندن و رۆیشتن و بیرکردنەوە و تەواوی جووڵەی دەرەوە و ناوەوە دەگرێتەوە، تەنها ئەو کەلیمەیە بەسە و شیفایە بۆ خۆگرتنەوە(وەرع).

**ئیسحاقی کوڕی خەلەف دەڵێت:** وەرع لە قسە و گفتوگۆدا زۆر پێویستترە لە وەرع لە ئاڵتوون و زیودا، زوهد لە کورسی و دەسەڵات پێویستترە لە زوهدی زێڕ و زیو. چونکە زێڕ و زیو بۆ بەدەستهێنانی پلە و پایە بەخت دەکرێن.

**ئەبو سولەیمانی دارانی دەڵێت:** وەرع سەرەتای زوهدە، وەك چۆن قەناعەت سەرەتای رازیبوونە.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** وەرع بریتییە لە راوەستان لە سنووری زانستدا بەبێ تەئویل کردن، دیسان دەڵێت: وەرع دوو رووی هەیە: وەرعێك لە دەرەوە و رووالەتدا. لەگەڵ وەرعێك لە ناوەوە، وەرعی دەرەوە: تەنها بە خودا و بۆ خودا جووڵە بکات. وەرعی ناوەوە: ئەوەیە هیچ نەچێتە دڵتەوە جگە لە خودا، هەروەها دەڵێت: هەر کەس سەرنجی وردە وەرع نەدات ناگاتە بەخشینی مەزن.

وتراوە: وەرع بریتییە لە دەرچوون لە شەهەوات و دەستبەرداربوونی خراپەكان.

"یونس بن عبيد" دەڵێت: وەرع بریتییە لە دەرچوون لە هەموو گوماناوییەك و دادگایی نەفس لە هەموو چاوتروكانێكدا.

سوفیانی سەوری دەفەرمویت: هیچ شتێكم نەبینیوە بە ئەندازەی وەرع ئاسان بێت، هەرشتێك ختوكەی دڵتی دا وازی لێ بهێنە.

سەهل دەڵێت: حەڵاڵ ئەوەیە كە بەهۆیەوە لە خودا یاخی نابیت، حەڵاڵی پاڵفتە ئەوەیە كە بە هۆیەوە خودات لەبیر ناچێت، حەسەن پرسیاری لە مێردمنداڵێك كرد و پێی وت: دەستگرتن بە ئایینەوە چییە؟ وتی: وەرعە، پێی وت: ئافەتەكەی چییە؟ وتی: چاوتێبڕینە، حەسەن پێی سەرسام بوو.

ئەبو هورەیرە دەڵێت: سبەینێ ئەهلی دیوانی خودا بریتین لە ئەهلی وەرع و زوهد.

هەندێ لە پێشین دەڵێن: بەندە ناگات بە حەقیقەتی خۆپارێزی تا ئەو شتانە واز لێ نەهێنێت كە مەترسییان نییە لە ترسی ئەوەی نەبادا تووشی مەترسی ببێت.

### ۞ بێداربوونەوەی دڵ، ئەندامەكان دەپارێزێت

"شیخ الإسلام الهروي"خاوەنی كتێبی "منازل السائرين" دەڵێت:

وەرع بریتییە لە ئەوپەڕی خۆپارێزی لە قەدەغەكراوەكان یان تەنگەتاوبوون لە مەزنی خودای موتەعال (توقي مستقصى على حذر أو تحرج على تعظيم)

واتە: تا ئەوپەڕی خۆپارێزی خۆی بپارێزێت لە حەرام و شتە گوماناوییەكان و هەموو ئەوانەی دەترسێت زیانی پێ بگەیەنن، چونكە وشەی "التوقي" و "الحذر" مانایان لە یەكترەوە نزیكە، "التوقي" كاری ئەندامەكانە و "الحذر"یش كاری دڵە، لەوانەیە كەسێك خۆپارێزی لە شتێك بكات و ترسی لێی نەبێت، بەڵام خۆپارێزییەكەی بۆ مەبەستی ترە: لە نیشاندانی پاكێتی و عیززەت و تەصەوف یان بەرهەڵستی كەسانی تر، وەك خۆپارێزی ئەو كەسانەی باوەڕیان بە زیندووبوونەوە و بەهەشت و ئاگر نییە و خۆیان لە كاری خراپ و نزم بەدوور دەگرن، وەك دوورەپەرێزییەك لەو كارانە و بەرزكردنەوەی دەروونیان لە تێكەوتن و حەز و داوای ستایشكردنی خەڵك بۆیان و هاوشێوەكانی ئەمانە.

یان تەنگەتاوبوون لە مەزنی خودای موتەعال (أو تحرج على تعظيم): واتـە پاڵنـەری وەرع لە حەرام و شتە گوماناوییەکان یان ترس بێت لە هەڕەشەکانی خودا، یـان بـە مەزن راگرتنی خودای موتەعال بێت، ئەوەندە شکۆی بداتە پاڵ نەیـەوێت رووبکاتـە کارە نەهیلێکراوەکان.

**وەرع لە گوناه:** یان بە هۆی ترسەوە یـان بـە مـەزن راگـرتنی خـودا، تـەنها ئامـاژەی بـە "مەزن راگرتن" کرد و باسی خۆشەویستی نەکرد کـە دەبێتـە پاڵنـەر بـۆ ئـەنجام نـەدانی کارێك خۆشەویستەکەی بڕەنجێنێت، چونکە ئەو خۆشەویستییە لەگەڵ بە مەزن راگرتنـدا سەر هەڵدەدات، گەر دڵ خاڵی بێت لە بـە مـەزن زانـینی خـودا ئـەوا تـەنها خۆشەویسـتی ناتوانێـت لـە سەرپێچـی بیگێڕێتـەوە، وەك خۆشەویسـتی مـرۆڤ بـۆ منداڵەکـەی، گـەر خۆشەویستی مەزن زانینی لەگەڵ بوو لە سەرپێچی کردن دوور دەکەوێتەوە.

وەرع بە شێوەیەکی گشتی پاڵنەرە بۆ وازهێنـان لـە کـاری خراپـە، بـۆ پارێزگـاری لـە نەفس و پاشەکەوت کردنی چاکە و پاراستنی باوەڕ، ئەمە سێ سوود لـە سـوودەکانی دوورکەوتنەوە لە خراپەیە.

**یەکەمیان:** <u>پارێزگاری لە نەفس</u>: واتە پارێزگاری لێ کردنی لە شتگەلێك کە ناشـیرین و عەیبـداری دەکـات و لەبەرچـاوی خـودا و فریشـتەکان و بەنـدە باوەڕدارەکـان و دروستکراوەکانی تری دەخات، هەر کـەس نەفسـی خـۆی بـەڕێز تەماشـا بکـات و لای گەورە بێت دەیپارێزێت و پاکی دەکاتەوە و لە جێگەیەکی بەرز دایدەنێت، بەو نەفسە بەڕێزەوە پێشبڕکێ لەگەڵ ئەهلی لێبڕان و کەماڵدا دەکات، هەر کەسیش نەفسی خۆی لا بچووك و رسوا بێت رووبەڕووی شتە خراپ و نزمەکانی دەکاتەوە، رەشوەی بۆ شـل دەکـات و دەیلـەوەڕێنێت، پشـتگوێی دەخـات و لـە خراپـە نایگێڕێتـەوە، کـەمترین سوودەکانی دوورکەوتنەوە لە خراپە بریتییە لە پارێزگاری لە نەفس.

پاشەکەوت کردنی چاکە دوو رووی هەیە:

**یەکەم:** پاشەکەوت کردنی کاتەکەی بە بەدەستهێنانی چاکە تیایدا، گەر خۆی بە خراپەوە خەریك کرد چاکەکانی کەم دەبنەوە کە ئامادەبوون بۆ ئەوەی بەدەستیان بهێنێت.

**دووەم:** پاشەکەوت کردنی چاکە ئەنجام دراوەکان لە بەتاڵ بوونەوە بە پێوانە کردنـی خراپەکان و پووچکردنەوەی چـاکەکان لـە رۆژی دواییـدا، وەك لـە مەنزیلـەی تەوبـەدا

باسمان لەبارەوە کرد: خراپە چاکە پووچ دەکاتەوە، لەوانەیە خراپەکان هەموو چاکەکان لە خۆیاندا نغرۆ بکەن یان کەمی بکەنەوە، بۆیە دەبێت زۆر کەم بکرێنەوە تا رادەی بنبڕ بوون، دوورکەوتنەوە لە خراپە دیوانی چاکەکانمان بۆ پاشەکەوت دەکات، وەك ئەوە وایە کەسێك سەرمایەیەکی زۆری هەبێت کە خاوەن قەرزەکان دێن بۆ قەرزەکانیان یان هەموو سەرمایەکەی لە قەرزدا دەداتەوە یان زۆربەی دەدات یاخود بەشێکی لێ کەم دەبێتەوە، چاکە و خراپەش هەر بەو جۆرەیە.

**پاراستنی باوەڕ:** چونکە باوەڕ لای هەموو ئەهلی سوننەت بە کاری چاکە زیاد دەکات و بە گوناه و یاخیبوونیش کەم دەکات، ئیمامی شافعی و کەسانی تریش لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان و ئەوانەی دوای ئەوان گواستوویانەتەوە، لاوازبوونی باوەڕ بە گوناه و یاخیبوون بە چێژ و ئەزموون ساغ بووەتەوە، بەندە-وەك لە فەرموودەدا هاتووە- ((کاتێك گوناهێك دەکات خاڵێکی رەش لەناو دڵی دادەنرێت، گەر تەوبەی کرد و داوای لێخۆشبوونی کرد دڵی پاك دەبێتەوە، گەر گەڕایەوە بۆ گوناه و گوناهێکی تری کرد خاڵێکی رەشی تر دادەنرێت تا بەسەر دڵیدا سەردەکەوێت و دڵی داگیر دەکات، ئەوەش بریتییە لە ژەنگ "الران" لە ئایەتی ﴿ كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ١٤ ﴾ المطففين: ١٤))

گوناه و خراپە دڵ رەش دەکەن و نووری دڵ دەکوژێننەوە، باوەڕ بریتییە لە نووری دڵ، خراپە ئەو نوورە ناهێڵێت، یاخود کەمی دەکاتەوە، چاکە نووری دڵ زیاد دەکات و خراپە نووری دڵ خامۆش دەکات، خودای موتەعال رایدەگەیەنێت کە خراپەی دڵ هۆیەکە بۆ ژەنگ هەڵهێنان، هەروەها رایگەیاندووە کە دڵی دووڕووانی وەرگەڕاندووە بەوەی ئەنجامی دەدەن ﴿ وَٱللَّهُ أَرۡكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓاْ ﴾ النساء: ٨٨، رایگەیاندووە کە هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی توندوتۆڵ کە خودا لە بەندەکانی وەرگرتووە هۆیە بۆ رەقبوونی دڵ، دەفەرموێت ﴿ فَبِمَا نَقۡضِهِم مِّيثَٰقَهُمۡ لَعَنَّٰهُمۡ وَجَعَلۡنَا قُلُوبَهُمۡ قَٰسِيَةٗۖ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ ﴾ المائدة: ١٣، گوناهی هەڵوەشاندنەوەی پەیمان سەرپێکێشا بۆ ئەو ئاسەوارانە: لە رەقبوونی دڵ و نەفرەت و گۆڕینی کەلیمە و لەبیرچوونەوەی زانست.

باوەڕی کەسی گوناهکار وەك هێزی نەخۆش وایە بەپێی هێز و لاوازی نەخۆشییەکەی.

ئەم سێ شتە: پارێزگاری لە نەفس و پاشەکەوت کردنی چاکە و پاراستنی باوەڕ لە هەموو پاڵنەرە گشتییەکانی تر باڵاترن، چونکە خاوەنەکەی لێبڕانی زۆرترە و دەیەوێت نەفسی خۆی پاك بکاتەوە و بیپارێزێت و لە گوناه بەدووری بگرێت و چاکەکانی پاشەکەوت بکات و لە تیاچوون و کەم بوون بیانپارێزێت، چونکە بەو چاکانەوە دەچێت بۆ لای خودا و داوای ڕەزامەندی خودای پێ دەکات، هەروەها باوەڕەکەی بە پەروەردگاری بپارێزێت لە خۆشەویستی بۆ خودا و یەکتاپەرستی و ناسینی.

## ۞ پیاوانی پلەی باڵا

وەرع خاوەنەکەی بەرز دەکاتەوە تا دەیگەیەنێتە پارێزگاری لە سنوور کاتێك کەسەکە گرفتار نەبێت، هەروەها دەیهێڵێتەوە لەسەر پاراستنی خۆپارێزی و ڕزگاربوون لە سنووربەزێنی.

هەر کەس بەرزبوویەوە بۆ ئەم پلەیە لە وەرع: زۆرێك لە موباح کە زەرەری نەبێت واز لێ دەهێنێت، مانەوە لەسەر پارێزگاری لێکردنی و ترسان لەوەی پاکێتییەکەی لێڵ ببێت و لەدەستی بدات و نوورەکەی خامۆش ببێت، زۆرێك لە موباح پاکێتی خۆپارێزی لێڵ دەکات، گەشانەوەی ناهێڵێت و نوورەکەی دەکوژێنێتەوە و شەوق و جوانییەکەی دەڕژێنێت.

ڕۆژێك "شیخ الإسلام ابن تیمیة -قدس الله روحه-" لەسەر شتێك لە موباح پێی فەرموم: ئەوە پێچەوانەی بەدەستهێنانی پلەی باڵایە، هەرچەند وازلێهێنانی نەکراوەتە مەرجی ڕزگاربوون، یان هاو شێوەی ئەم قسەیە.

عاریف زۆرێك لە موباح واز لێ دەهێنێت تاکو پارێزگاری لە باوەڕ بکات، بە تایبەت گەر ئەو موباحە لەناوەندی حەڵاڵ و حەرامدا بوو.

**جیاوازی نێوان خاوەن وەرعێکی گشتی و خاوەنی ئەم وەرعەی باسمان لەبارەوە کرد:** ئەوەیە هەوڵبدات بۆ بەدەستهێنانی پارێزگاری لێکردن لە باوەڕ، ئەم کەسە هەوڵدەدات پارێزگاری لە پاکێتی بکات و لێڵی ڕووی تێنەکات، نەهێڵێت نوورەکەی خامۆش ببێت و کۆتایی پێ بێت.

**ڕزگاربوون لە سنووربەزێنی:** "سنوور": بریتییە لە کۆتاییەکان، ئەوەش مەرزەکانی حەڵاڵ و حەرامن، لە هەر شوێنێك کۆتایی پێ بێت ئەوە بریتییە لە سنوور، هەر کەس

بیبەزێنێت کەوتۆتە ناو یاخیبوونەوە، خودای موتەعال نەهی کردووە لە بەزاندنی سنوورەکانی و نزیکبوونەوە لێیان ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا﴾ البقرة: ١٨٧، هەروەها دەفەرموێت ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا﴾ البقرة: ٢٢٩، سنوور لێرەدا بریتییە لە کۆتایی حەڵاڵ، کاتێك نەهی لە نزیکبوونەوە دەکات ئەوا سنوور لەو شوێنەدا بریتییە لە سەرەتای حەرام.

خودای موتەعال دەفەرموێت: ئەوەی بۆم موباح کردوون سنوور بەزێنی مەکەن بەسەریدا، ئەوەش حەرامم کردووە نزیکی مەکەون.

وەرع بەندە لە نزیکبوونەوەی ئەمە و سنوور بەزێنی ئەوە رزگارت دەکات، کە بریتییە لە سنوور شکێنی.

## ✿ بەری پاك

**بزانە:** ترس وەرع و داوای کۆمەکی لە خودا و ئاواتی کورت بەدوای خۆیدا دەهێنێت، هێزی باوەڕ بە لیقای خودا زوهد بەرهەم دەهێنێت، مەعریفەش خۆشەویستی و ترس و رجا بەرهەم دەهێنێت، قەناعەت رازیبوون بەرهەم دەهێنێت، یادی خودا زیندەگی دڵی لێوە بەرهەم دێت، باوەڕ بە قەدەر تەوەکول بەرهەم دەهێنێت، بەردەوامی تێڕامان لە ناو و سیفاتەکان مەعریفە بەرهەم دەهێنێت، وەرع زوهد بەرهەم دەهێنێت، تەوبە دیسان خۆشەویستی بەرهەم دەهێنێت، هەروەها بەردەوامی یادی خودا خۆشەویستی بەرهەم دەهێنێت، رازیبوون شوکر بەرهەم دەهێنێت، لێبڕان و ئارامی هەموو حاڵ و مەقامەکان بەرهەم دەهێنێت، ئیخلاص و صدق هەریەکەیان ئەویتر بەرهەم دەهێنێت، پاکداوێنی ئەخلاق بەرهەم دەهێنێت، بیرکردنەوە لێبڕان بەرهەم دەهێنێت، چاودێری ئاوەدانکردنەوەی کات و رۆژەکان و حەیا و ترسی زانست و گەڕانەوە بۆ لای خودا و مراندنی نەفس بەرهەم دەهێنێت، رق لە نەفس و بێز لێ کردنەوەی شەرم لە خودا بەرهەم دەهێنێت، هەروەها بەزۆرزانینی ئەوەی لەوەوەیە و بەکەم زانینی ئەوەی لە خۆیەوەیە لە کەمی گوێڕایەڵی و کرداری چاکە، هەروەها بانگەشە لە دڵ و زمان دەسڕێتەوە، دروستیی بەصیرەت یەقین بەرهەم دەهێنێت، باشی تێڕامان لەوەی دەبینی و دەیبیستی لە ئایاتی بینراو و بیستراو دروستی بەصیرەت بەرهەم دەهێنێت.

**پوختەی هەموو ئەمانە دوو شتن:**

**یەكەم:** دڵت لە نیشتمانی دونیاوە بگوێزیتەوە بۆ نیشتمانی دوارۆژ، **پاشان** بە هەموو دڵتەوە روو لە مانای قورئان و تێرامان و رۆشنبوونەوەی بكەیت، تێگەیشتن لە مەبەستەكەی و لە پێناوی چیدا دابەزیوە، وەرگرتنی بەشی خۆت لە یەك بە یەكی ئایەتەكانی و دابەزاندنی بەسەر دەرد و نەخۆشییەكانی دڵ و ناخدا.

ئەمە رێگەیەكی پوخت و كورت و ئاسانە، دەتگەیەنێت بە خودای موتەعال، گەیشتنێكی سەلامەت و كە ترس و تیاچوون و برسێتی و تینێوێتی رووناكاتە رێبوارانی، هیچ جۆرە ئافەتێكی رێگەكانی تری لەسەر نییە، لەسەر ئەو رێگەیە پاسەوان و پارێزەر لە خوداوە دانراوە كە سالیكان دەپارێزن و چاودێرییان دەكەن و بەرگرییان لێ دەكەن، هیچ كەس رێزی ئەو رێگەیە نازانێت مەگەر كەسانێك كە رێگەی خەڵكی و ئافات و رێگرەكانیان ناسیبێت، خودا كۆمەككارە.

❁ ❁ ❁

## (١٨) (منزلة التبتل)

# مەنزیلەی دابڕان

لە مەنزیلەکانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی "دابڕان"ە.

خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَٱذۡكُرِ ٱسۡمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلۡ إِلَيۡهِ تَبۡتِيلٗا ۝٨ ﴾ المزمل: ٨

مانای "التبتل" بریتییە لە "الإنقطاع" دابڕان، لەسەر کێشی "تفعل" لە "بتل"ەوە هاتووە کە مانای "قطع"ی هەیە، مەریەم بە "البتول" ناونراوە بەهۆی دابڕانییەوە لە هاوسەرگیری، هەروەها بەوەی هاوشانی هەبێت لە ئافرەتانی سەردەمی خۆی، لەڕووی شەرەف و فەزڵەوە لەسەروو ئافرەتانی سەردەمی خۆیەوە بوو، بۆیە لێیان دابڕا، چاوگی فرمانی "بتل" بریتییە لە "تبتلا" هەروەك "تعلم و تفهم"، بەلام (تبتیل)لە شێوەی "تفعیل"دا هاتووە بەهۆی نهێنییەکی وردەوە: ئەو فرمانانەی لەسەر کێشی "تفعل"بن مانای پلە بە پلە و زۆر لە خۆکردن و هەوڵی ئەنجامدان و هەوڵی زۆرکردن و زیادەڕەوی تێدایە، بۆیە فرمانێکی هێنا (تبتل) ئاماژە بێت بە یەکێك لەو مانایانە، هەروەها هێنانی چاوگەکەی (تبتیلا) تاکو بەڵگە بێت لەسەر مانایەکی تر لەو مانایانە، وەك ئەوەی وترابێت: "بتل نفسك إلى الله تبتيلا" لە هەمان کاتدا وترابێت "وتبتل إليه تبتيلا"، تێگەیشتن لەو دوو مانایە لە فرمانەکە و چاوگەکەیەوەیە، ئەمە لە قورئاندا زۆرە، لە باشترین کورتکردنەوەکان و ئاماژەی پوختی قورئانییە.

بۆیە "التبتل" بریتییە لە دابڕانی تەواو بۆ خودای موتەعال، ئایەتی ﴿ لَهُۥ دَعۡوَةُ ٱلۡحَقِّۚ ﴾ الرعد: ١٤، واتە رووتبوونەوەی تەواو لە هەموو شتێك بۆ خودا، واتە دابڕان لە سەرنجدان بە پاداشت، بەجۆرێك کەسی دابڕاو بۆ خودا وەك کرێکارێکی لێ بێت کە تەنها بە مەبەستی کرێ کار بکات، کە پارەکەی وەرگرت لە دەرگای خاوەن کاردا ناوەستێت.

بەڵگە هێنانەوە بە ئایەتی﴿ لَهُۥ دَعۡوَةُ ٱلۡحَقِّۚ ﴾ لەم بابەتەدا مەبەستدارییەکی بەم مانایە تێدایە، خودای موتەعال خاوەنی بانگی حەقە بە زات و سیفاتی با پاداشتیش بۆ بانگکەرەکە (ئەو کەسەی نزا و پاڕانەوە لە خودا دەکات) بوونی نەبێت، خودا بە زاتی شکۆمەندی شایستەی ئەوەیە، ئەو شایستەیە بەوەی بە تەنها بپەرسترێت، بە تەنها

بانگی لێ بکرێت، ڕووی تێبکرێت و شوکر و ستایشی بکرێت، خۆشیان بوێت و ڕجایان بۆ لای ئەو بێت و لێی بترسن و پشتی پێببەستن و داوای کۆمەکی لێ بکەن و هانای بۆ ببەن و داڵدەی لێ داوا بکەن و پشتی پێوە بدەن، بۆیە بانگکردنی خودایی حەق تەنها بۆ ئەوە.

هەر کەس بە دڵ لەڕووی ناسین و حاڵ و چێژەوە بەم جۆرە بوو ئەوا پێی لە مەقامی "دابڕان" ناوە و بۆ خودا یەکلابووەتەوە، پێشین "دعوة الحق"یان بە یەکتاپەرستی و ئیخلاص لە یەکتاپەرستیدا و ڕاستگۆیی تیایدا لێکداوەتەوە کە مەبەستی ئەو مانایەیە ئاماژەمان پێکرد.

علی-خوا لێ ڕازی بێت- دەفەرموێت "دعوة الحق" بریتییە لە یەکتاپەرستی، ئیبن عەباس -خوا لە خۆی و باوکی ڕازی بێت- دەفەرموێت: بریتییە لە "شهادة أن لا إله إلا الله"، وتراوە: بریتییە لە دوعاکردن بە ئیخلاصەوە، بانگی حەق بانگێکی خودایی و پێدانی مافی ئەو بانگە و ڕووتکردنەوەیەتی لە هەموو شتێك و ئیخلاص بۆ خودا تیایدا.

## ۞ پەیوەستبوون............و لەیەکتر دابڕان

"التبتل-واتە دابڕان" دوو شت کۆدەکاتەوە: پەیوەستبوون و لە یەکتر دابڕان کە بەو دووانەوە مانای "دابڕان" دێتە دی.

لەیەکتر دابڕان: بریتییە لە دابڕانی دڵ لە بەشی نەفس کە شان شانێن دەکات لەگەڵ ئەوەی خودا لە بەندەکەی دەوێت، هەروەها دابڕان لە لاکردنەوەی دڵ بەلای غەیری خودادا، حەزی لێ بکات یان سەرنجی ڕابکێشێت یاخود بیری لێ بکاتەوە.

**پەیوەستبوون:** تەنها لەدوای ئەو لەیەکتر دابڕانە دروست دەبێت، کە بریتییە لە پەیوەستبوونی دڵ بە خوداوە و ڕووکردنە خودا و ڕاگرتنی ڕوو لە ڕووگەی ئەودا، ئەمەش بە خۆشەویستی و ترس و ڕجا و گەڕانەوەی بەردەوام و پشت بەستن بە خودا.

ئەوەی مادەی "ڕجا بە خەڵك" لە دڵت دەردەکات بریتییە لە ڕازیبوون بە حوکمی خودا و ئەو بەشەی پێیداوی، هەر کەس بە حوکمی خودا و بەشی خودا ڕازی بوو شوێنێك بۆ ڕجا بە خەڵك لەناو دڵیدا نامێنێتەوە.

**ئەوەی مادەی ترس لە دڵدا دەسڕێتەوە:** بریتییە لە خۆ تەسلیم کردن بە خودا، هەر کەس خۆی بە تەواوی ڕادەستی خودا بکات و بزانێت ئەوەی بڕیارە تووشی ببێت

تووشی دەبێت و ئەوەی لەسەر ئەو نەنوسراوە رووبەڕووی نابێتەوە، واتە بزانێت تەنها ئەوانە تووشی دەبن کە لەسەری نووسراون شوێنێك بۆ ترس لە خەڵکی لەناو دڵی جێگەی نابێتەوە، ئەو نەفسەی ئەم لە تیاچوونی دەترسێت رادەستی گەورە و سەردارەکەی خۆی کردووە، گەیشتۆتە ئەو راستییەی کە تەنها ئەوەی نووسراوە تووشی دەبێت، ئەوەش نووسراوە هەر دەبێت تووشی ببێت، بۆیە مانایەك بۆ ترس لە غەیری خودا نامێنێتەوە.

لە تەسلیم بووندا سوودێکی ورد و ناسك بوونی هەیە: ئەو کە خۆی رادەستی خودا دەکات لەلای خودا بووە بە ئەمانەت و خستوویەتە ژێر پارێزگاری و چاودێریی خوداییەوە، بۆیە دەستی هیچ دوژمن و دەستدرێژکارێکی ناگاتێ.

ئەمە بریتییە لە "دابڕان" لە خەڵك، بەڵام دابڕان کامڵ نابێت تا کەسی دابڕاو لە نەفسی خۆی دانەبڕێت، بە دوورکەوتنەوە لە حەز و ئارەزوو هۆگربوون وەك نەسیمێك لەلای خوداوە هەڵدەکات، لە دوورکەوتنەوە لە حەز و ئارەزووەکان و سەرپێچی لێیان و رێگریکردنی نەفس لەو حەز و ئارەزووانە هۆگربوون وەك نەسیمی ئاسوودەیی لە خوداوە پەیدا دەبێت، ئەو نەسیمە بۆ رۆح وەکو رۆح وایە بۆ جەستە، ئەو نەسیمە رۆح و بۆنی خۆشی رۆحە، ئەوەش بە پشتکردن لە حەز و ئارەزوو هاتۆتە دی، هۆگربوونی رۆح بەو نەسیمەوە و بۆنکردنی ئەو بۆنە خۆشە نەفس بە خۆیەوە وابەستە دەکات، چونکە نەفس هەر دەبێت بە شتێکەوە وابەستە ببێت، گەر لە پەیوەستن بە ئارەزوو دابڕا رۆحی هۆگری بە خوداوە دەبینێتەوە و ئاسوودەی دەکات و زیندووی دەکاتەوە، خاوەنەکەی خەریك دەکات بە ویستی خودایی ئاینیی فەرمانپێکراوی نەبەویەوە، جێبەجێ کردنی ئەو بڕیارانە لە ناوەندی ئەهلی سەرپێچی و دەستدرێژکار و بەرهەڵستکاردا، لەو فەرمانانەدا نوقم دەبێت، تۆمەتی گەورەی بۆ دروست دەکەن و دەیترسێنن و داوای رشتنی خوێنی دەکەن، بەڵام ئەو لە تێکۆشان دژ بەوانە لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسێت، فەرمانی خودا لەلای هەمووان رادەگەیەنێت، ترسی لێیان بێت، یاخود رجای پێیان بێت، ئەو لە مەدحکردن و زەمکردنیان ناترسێت، بە ئاشکرا هاواریان لێ دەکات و ئامۆژگارییان دەکات، بە ئاشکرا و بە نهێنی بانگیان دەکات.

# (١٩) (منزلة الرجاء)

## مەنزیلەی ڕجا

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإيك نستعين)) بریتییە لە مەنزیلەی ڕجا.

خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ وَيَرۡجُونَ رَحۡمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ ﴾ الإسـراء: ٥٧، گرتنەبـەری وەسـیلە بـۆ لای خودابریتییـە لـە داوای نزیكبوونـەوە لێـی بـە بەندایـەتی و خۆشەویسـتی، باسـی سـێ مەقامەكەی ئەهلی باوەڕی كرد كە بینای وەسیلەی لەسەرە، ئـەو سیانەش بـریتین لـە: خۆشەویستی و ترس و ڕجا، خـودای موتـەعال دەفـەرموێت ﴿ مَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَأٓتٖۚ ﴾العنكبـــــوت: ٥، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يَرۡجُونَ رَحۡمَتَ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٢١٨ ﴾ البقرة: ٢١٨.

لە سەحیحی "مسلم"دا لە جابرەوە -خوا لێی ڕازی بێت- گوێم لە پێغەمبـەری خـودا بوو دەیفەموو -پێش مردنی بە سێ ڕۆژ- ((هەر كەس لە ئێوە مرد بـە گومـانی بـاش بە خـودای خـۆی بمـرێت)) لـە فەرموودەكـەی سـەحیحدا لـە پێغەمبـەری خـوداوە(ﷺ) ((خودای موتەعال دەفەرموێت: من لەگەڵ گومانی بەندەكەمدام بە من، چۆنی دەوێت با وا گومانم پێ ببات))

ڕجا دڵ دەداتە بەر بۆ وڵاتی خۆشەویستی، ئەوەش بریتییە لـە خـودا و خانـەی ڕۆژی دوایی و ڕۆیشتنەكەی بۆ خۆش و ئاسان دەكات.

وتـراوە: بریتییـە لـە مـژدەی بەخشـش و فـەزڵی پـەروەردگار -تبـارك وتعـالی- و ئاسوودەبوون لە سەرنجدانی بەخشینی خودا-سبحانه-.

وتراوە: ڕجا بریتییە لە متمانە بە بەخششی خودا.

جیاوازی نێوان "ڕجا" لەگـەڵ "التمني" -خۆزگـە- "الـتمني" لەگـەڵ تەمبـەڵیدایـە و ڕێگەی سووربوون و كۆشان بە خاوەنەكەی ناگرێتەبەر، بەڵام "ڕجا" لەگەڵ كۆشـان و پشتبەستن بە خودادایە.

**یەکەمیان:** وەك حاڵی ئەو کەسە وایە خۆزگە بخوازێت پارچە زەوییەکی هەبێت بیکێڵێت و بیکات بە کشتوکاڵ.

**دووەمیان:** وەك ئەو کەسە وایە زەویەکە دەکێڵێت و تۆوی تێ دەچێنێ و رجای وایە تۆوەکەی سەوز ببێت و سەردەربهێنێت.

بۆیە عاریفان لەسەر ئەوە کۆدەنگن کە "رجا" تەنها لەگەڵ بوونی کرداردا دروستە.

**"شاە الکرماني" دەڵێت:** نیشانەی دروستی رجا بریتییە لە گوێڕایەڵی باش.

**رجا سێ جۆرە:** دووانیان ستایشکراون و سێیەمیان فریوخواردنە و مەزموومە.

**یەکەم و دووەم:** بریتیین لە رجای کەسێك کار بە گوێڕایەڵی خودا دەکات لەسەر نوورێك کە لە خوداوەیە، رجای بە پاداشتی خودا هەیە، لەگەڵ رجای پیاوێك گوناهێکی کردووە و تەوبەی لێکردووە، ئەو کەسە رجای لێبووردن و لێخۆشبوون و چاکە و فەزڵ و حیلمی بەخشینی خودای هەیە.

**سێیەمیان:** پیاوێك لە گوناە و تاواندا پێی راکێشاوە، رجای بەزەیی خودای هەیە بەبێ کردار، ئەوەش بریتییە لە فریوخواردن و خۆزگە و رجای درۆزن.

**سالیك دوو سەرنجی هەیە:** سەرنجێك بە نەفس و نەنگی و ئافاتی کردارەکانی، دەرگای ترسی بەڕوودا دەکرێتەوە بۆ لای بەرینی فەزڵی پەروەردگار و چاکە و بەخشندەیی، لەگەڵ سەرنجێك کە دەرگای رجای لێدەکاتەوە.

بۆیە لەسەر رجا وتراوە: بریتییە لە سەرنجدان بە بەزەیی خودا.

**پرسیار لە ئەحمەدی کوڕی عاصم کرا:** نیشانەی رجا چییە لە کەسێکدا؟ وتی: نیشانەکەی ئەوەیە گەر بە چاکە دەورە درا ئیلهامی شوکر بکرێت، لەگەڵ رجای تەواوی نیعمەتی خودا لەسەری لە دونیا و دوارۆژدا، لەگەڵ تەواوکردنی نیعمەتەکان لەسەری لە دوارۆژدا بە لێخۆشبوون لێی.

**جیاوازی کەوتۆتە نێوان ئەهلی رێگەوە کام لەم دوو رجایە کاملترە:** رجای کەسێکی چاکەکار بە پاداشتی چاکەکەی، لەگەڵ رجای خراپەکاری تەوبەکار بە لێخۆشبوون و لێبووردنی خودا؟

دەستەیەك تای تەرازووی "چاکەکار"ەکە بە قورس دەبینن بەهۆی هێزی هۆکاری رجاوە (کە کردەوە چاکەکانییەتی)، دەستەیەکیش رجای کەسی گوناهکار بە

قورس دەبینن، چونکە رجاکەی خاڵییە لە بینین و سەرنجدانی کردار و هاوتایە لەگەڵ زەلیلی دڵدا.

**یەحیای کوڕی موعاز (لە موناجاتێکدا لەگەڵ خودا) دەفەرموێت:** خەریکە رجام لەگەڵ گوناهدا بە تۆ زاڵ دەبێت بەسەر رجام لەگەڵ کرداردا، چونکە دەبینم لە کاروکردەوەکاندا شان لەسەر ئیخلاص دادەدەم، چۆن پاڵفتەیان بکەم و بەدەستیان بهێنم؟ من بە ئافات بەناوبانگم، لە گوناه و خراپەدا شان لەسەر لێبووردنی تۆ دادەدەم، چۆن لێم نابووریت تۆ بە بەخشندەیی بەناوبانگی؟!

**هەروەها دەفەرموێت:** خودایە، شیرینترین بەخشش لە دڵدا رجایە، شیرینترین کەلام لەسەر زمان مەدح و سەنای تۆیە، خۆشترین سات لەلام ئەو ساتەیە بە لیقای تۆ دەگەم.

## ۞ بینای خۆشەویستی لەسەر رجایە

رجا لە مەزنترین و بالآترین و بەنرخترین مەنزیلەکانە، خولگەی رۆیشتن بۆ لای خودا لەسەر رجا و خۆشەویستی و ترس دامەزراوە. خودا مەدح و سەنای ئەهلی رجای کردووە و دەفەرموێت ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب: ٢١

لە فەرموودەیەکی سەحیحی قودسیدا لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە لە خوداوە -عزوجل- دەیگێڕێتەوە دەفەرموێت((ئەی رۆڵەی ئادەم، تا تۆ داوام لێ بکەیت و رجام پێ بکەیت لەوەی ئەنجامت داوە لە کاری خراپە دەبوورم و باکێکم نییە))

ئەعمەش لە ئەبی صالحەوە لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ((خودای موتەعال دەفەرموێت: من لەگەڵ گومانی بەندەکەمدام بە من، من لەگەڵ ئەوم، گەر یادم بکات لە ناخی خۆیدا ئەوا لە نەفسی خۆمدا یادی دەکەم، گەر لەناو کۆمەڵێکدا یادم بکات لەناو کۆمەڵێکی باشتر لەو کۆمەڵە یادی دەکەم، گەر بستێك لێم نزیك ببێتەوە باڵێك لێی نزیك دەبمەوە، گەر باڵێك لێم نزیك ببێتەوە دوو باڵ لێی نزیك دەبمەوە، گەر بە رۆیشتن بێت بۆ لام بە راکردن دەچم بۆ لای)) رواه مسلم

خودای موتەعال هەواڵ لەمەڕ بەندە تایبەتەکانی دەدات کە هاوەڵدانەران بانگەشەی ئەوەیان دەکرد بەهۆیانەوە لە خودا نزیك دەبنەوە، ئەو بەندانە ئەوان

دەیانکەن بە هاوەڵ بۆ خودا رجایان بە خودا هەبووە و لە خودا ترساون ﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِۦ فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا ﴿٥٦﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ ۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا ﴿٥٧﴾ ﴾ الإسراء: ٥٦ — ٥٧.

خودای موتەعال دەفەرموێت: ئەوانەی لەخوار منەوە بانگیان لێ دەکەن بەندەگەلی منن، بە گوێڕایەڵی من لێم نزیك دەبنەوە و رجایان بە بەزەیی من هەیە و لە سزای من دەترسن، ئیتر بۆچی لەخوار منەوە داوایان لێ دەکەن و بانگیان لێ دەکەن؟ وەسف و سەنای کردن بە باشترین حاڵ و مەقام: لە خۆشەویستی و ترس و رجا.

ئەوەش بریتییە لە بەندایەتی و پەیوەستبوون بە خوداوە لەڕووی ناوی "المحسن و البر"—چاکەکار، پەیوەستبوون و بەندایەتی بەو ناوەوە و ناسینی خودا وایکردووە کەسەکە رجای بە خودا هەبێت، لەو رێگەیەوە کە دەزانێت یاخود نازانێت، هێزی رجا بەپێی هێزی ناسینی خودا و ناو و سیفەتەکانییەتی، هەروەها زاڵبوونی بەزەیی خودا بەسەر خەشم و تووڕەییدا، گەر رۆحی رجا نەبوایە بەندایەتی دڵ و ئەندامەکان پەکیان دەکەوت، خەڵوەتگا و پەرستگا و مزگەوتەکان کە پێویستە یادی زۆری خودایان تێدا بکرێت دەڕووخان، بەڵکو گەر رۆحی رجا نەبوایە ئەندامەکان بە کاری چاکە هەڵنەدەستان، بەڵکو گەر نەرمە بارانی رجا نەبوایە کەشتی ویستی مرۆڤ لەناو دەریای کاروکردەوەی باشدا نەدەکەوتە گەڕ، هەندێك دێڕە هۆنراوەم هەیە:

لولا التعلق بالرجاء تقطعت — نفس المحب تحسرا وتمزقا
وكذالك لولا برده بحرارة إلا — كباد دابت بالحجاب تحرقا
أيكون قط حليف حي لا يرى — برجائه بحبيبه متعلقا
أم كلما قويت محبته له — قوي الرجاء فزاد فيه تشوقا
ولولا الرجاء يحدو المطي لما سرت — بحمولها لديارهم ترجو اللقا

رجا بەپێی خۆشەویستی و هێزی خۆشەویستی بەرهەم دێت، هەموو خۆشەویستێك خاوەنی رجا و ترسە، تا رجای زۆرتر بێت بە خۆشەویستەکەی زۆرتر خۆشی دەوێت، هەموو خۆشەویستێك خاوەن رجایە، هەر بەو جۆرە ترسەکەی، ئەو دەترسێت لەبەر چاوی بکەوێت و لەبەر دەرگای خۆشەویستی ئەو دەربکرێت و پەردەیەك بخاتە نێوان

خۆی و ئەوەوە، ترسەكەی بەهێزترین ترسە، رجاكەشی لەگەڵ خۆشەویستییەكەیدایە، ئەو رجای پێیەتی بەر لە پێگەیشتنی، كە گەیشت بە خۆشەویستەكەی رجای زۆرتر و زیاتر دەبێت بەهۆی ئەو زیندەگییەی رۆحەوە كە لێیەوە بەدەستی هێناوە، هەروەها خۆشییەكانی دڵی لە لوتفی خۆشەویستەوەیە، هەر بەو جۆرە چاكە لەگەڵ كردن و رووتێكردن و سەرنجدانی بە چاوی رازیبوون و ئامادەكردنی بۆ خۆشەویستی خۆی و ئەمانە و زۆرێكی تر لە زیندەگی و ئاسوودەیی و سەركەوتن كە تەنها بە گەیشتنی خۆشەویست بەدەست دەهێنرێن، بۆیە رجاكەی مەزنترین و تەواوترین رجایە.

تێرامان لەم بابەتە بە دروستی و تەواوی نهێنی گەورەی بەندایەتی و خۆشەویستی دەخاتە بەردەمت، هەموو خۆشەویستییەك ترس و رجای لەگەڵدایە، بەپێی داگیركردنی دڵ بە رجا ترس و خۆشەویستی زیاد دەكات، بەڵام ترسی خۆشەویست وەحشەتی لەگەڵدا نییە، بە پێچەوانەی ترسی كەسی خراپەكارەوە، رجای كەسی خۆشەویست هۆی لەگەڵدا نییە، بە پێچەوانەی رجای ئەو كەسەی وەك كرێكارێك كار بۆ خودا دەكات، رجای كەسی خۆشەویست لە كوێ و رجای كرێكارێك لە كوێ؟ نێوان ئەو دوانە وەك نێوانی حاڵیان وایە.

بە كورتی و پوختی: رجا پێویستە بۆ موریدی سالیك و عاریفی رێگە، گەر ساتێك لێی جیا ببێتەوە تیادەچێت، ئەو لە نێوان گوناهێكدا دەسورێتەوە كە رجای لێخۆشبوونی دەكات، یان نەنگی و ناتەواوییەك كە رجای چاككردنی دەكات، یان كردارێكی چاكە رجای قبووڵبوونی لای خودا دەكات، یان راوەستانێك رجای بەدەستهێنان و بەردەوامی دەكات، یاخود نزیكییەك لە خوداوە و مەنزیلەیەك لەلای خودا رجای گەیاندنی بە خودا لێوە دەكات، هیچ كەسێك لە سالیكان لەمانە یان لە یەكێك لەمانە جیانابێتەوە.

كەسی رجاكار هەمیشە لە رەغبەت و رەهبەتدایە، هیوای بە فەزڵی پەروەردگاری هەیە، گومانی باشی پێ دەبات، هیوای وابەستەی چاكە و بەخشینی خودا بووە، بە ناوەكانی دەیپەرستێت ((المحسن، البر، المعطي، الغفور، الجواد، الوهاب، الرزاق))، خودای موتەعال دەیەوێت بەندەكەی رجای پێی هەبێت، بۆیە لەگەڵ رجا و گومانی بەندەكەیدایە.

## ۞ پەروەردگارێکی لێخۆشبوو پێیخۆشە بەندەکانی رجایان پێی هەبێت

لە "رجا" و "دوعا"دا بەرهەڵستکاری بوونی نییە بۆ خودا لە بەڕێوەبردنی موڵکی خۆیدا، وەك چۆن هەندێ کەسی نەزان وا گومان دەبەن.

بەندە رجای بڕیاری خودا دەکات لە موڵکیدا بە باشترین یەکێك لەو دوو بڕیارەی کە خۆی پێیخۆشە، خودای موتەعال فەزڵی پێخۆشترە لە عەدل، عەفوی پێخۆشترە لە تۆڵە، لێبووردنی پێخۆشترە لە دوورخستنەوە، دەستبەرداربوونی پێخۆشترە لە وەرگرتنەوە، ئەو-سبحانە- رەحمەتی زاڵە بەسەر تووڕەیی و خەشمیدا.

کەسی رجاکار رجای خۆی بە بڕیاری خوداوە بەستۆتەوە، بڕیارێك کە پێخۆشترە و پێی رازیترە. رجا دەرچوون نییە لە بڕیاردان لەناو مامەڵەکەتیدا، بەڵکو رجا نیشاندانی بەندایەتی و جێبەجێبوونی خۆشەویسترین بڕیاریەتی لەلای، خودای موتەعال بە وەرگرتنەوەی حەقی خۆی و سزادانی بەندەکەی قازانجێك ناکات تاکو رجاکەی بەتاڵکەرەوەی ئەو قازانجە بێت، بەندە بەهۆی هاوەڵدانان بۆ خودا و بێباوەڕی پێی شایستەی سزا دەبێت و تۆڵەی لێ دەکرێتەوە، ئەو بەهۆی کۆشش بۆ راکێشانی خەشمی خودا رووبەڕووی سزا بۆتەوە، چونکە خەشم و تووڕەیی خودا داواکاری و ئاسەواری هەیە، بەندەش کاریگەری ئەوانەیە و هەوڵی بەدەستهێنانیان دەدات، کار لەسەر ئەو ئاسەوارانە دەکات و هەوڵی هۆکانیان دەدات، ئەو تیابەری نەفسی خۆیەتی، پەروەردگاری ئاگاداری دەکاتەوە و چاوی رۆشن دەکاتەوە و بانگی لێ دەکات: وەرە بۆ لام ئەتپارێزم و داڵدەت دەدەم و لەو شتانەی لێیان دەترسیت رزگارت دەکەم، بەڵام ئەو تەنها دوورکەوتنەوە و پشتهەڵکردن دەزانێت، ئەو لەگەڵ دوژمنەکەی خۆیدا ئاشتەوایی دەکات و دژ بە خودا پشتیوانی لێ دەکات، داوای رەزامەندی خەڵکی دەکات بە تووڕەکردنی خودا، رەزامەندی خەڵکی لە رەزامەندی خودا پێ باشترە، حەقی خەڵکی لە حەقی خودا پێ لەپێشترە، ترس و رجا و خۆشەویستی خەڵك لە دڵیدا زۆرتر و زیاترە لە ترس و رجا و خۆشەویستی خودا، رێگەیەکی بۆ بەخشندەیی و فەزڵ و پاداشتی پەروەردگاری نەهێڵایەوە، بەڵکو هەموو رێگەکانی بەخشندەیی لەخۆی داخستووە و کلیلەکەی داوەتە دەستی دوژمنەکەی، ئاشت و تەبایە لەگەڵی و گوێی بۆ دەگرێت و گوێڕایەڵی دەکات، رووی لە رەزامەندی ئەو کردووە، بۆیە خراپترین و توندترین ستەم ئەنجام دەدات.

ئەو ویستی خودای گۆڕیوەتەوە بە ویست و ئارەزوو و حەزەکانی خۆی، بەرهەڵستی هەموو ئەو شتانە دەکات لەلای خودا خۆشەویستن و جێگەی ڕەزامەندی ئەون، ڕێگە بە ڕەزامەندی خودا نادات ڕووی تێ بکات، بۆیە بەشی خۆی لەدەستدا و ستەمی لە خۆی کرد دەستدرێژی کردە سەر خۆشەویست و دۆستەکەی خۆی و دوژمنەکەی کرد بە دۆست، ئەو کەسەی دەبوا لەخۆی ڕازی بکات (خودا) و ژیانی لە پێناوی ڕەزامەندی ئەودا بێت لەخۆی تووڕە کرد و ئەو کەسەی دەبوا لە خۆی بڕەنجێنێت (شەیتان) لەخۆی ڕازی کرد، خۆی بۆ دوژمنەکەی کرد بە قوربانی و بەرانبەر خۆشەویست و دۆستەکەی بەخیل بوو.

پەروەردگار خوێنی لەسەر بەندەکەی نییە تاکو بە سزادانی تۆڵەی لێ بکاتەوە و بە ئازاردانی خۆشحاڵ بێت، ئەو سزادانە گەردیلەیەك لە موڵکی زیاد بکات، لە لێخۆشبوونی گەردیلەیەك کەم ناکات گەر لە هەموو ئەهلی سەر زەوی خۆشببێت، بۆچی؟ چونکە بەزەیی لە سزا فراوانترە و لە تووڕەیی و خەشمی خودا لەپێشتر و زاڵترە. ئەو بەزەیی لەسەر خۆی نوسیوە، ڕجای بەندە لە خودا لە حیکمەتی خودا کەم ناکاتەوە و گەردیلەیەك لە موڵکی کەم ناکاتەوە و لە کەماڵی بڕیاری خودا دەرناچێت و پێچەوانەی کەماڵی خودا نییە و نابێتە هۆی پەکخستنی ناو و سیفاتی خودای موتەعال، گەر بەندە ڕێگەی خێری لەخۆی نەبەستبایە و دەرگای بەزەیی دانەخستبایە بە گوناه و خراپەکانی پەروەردگاری لەسەر و ڕجا و هیوای ئەوەوە دەبوو.

خۆڕادەستکردنی بەندە بە پەروەردگاری و خۆخستنە بەر دەرگانەی و ڕازیبوون بە بڕیارە پڕ لە حیکمەتەکانی: هەموو ئەو کارانە ڕجای بەندەیە تاکو خودا بەزەیی پێ بکات و لە گوناه و هەڵە و تاوانەکانی خۆش ببێت، چاکەکانی لێ قبووڵ بکات لەگەڵ ناتەواوی و نەنگی لە کاروکردەوەکانیدا، هێزی ڕجا ئەو گەردنکەچی و خۆڕادەست کردن و چوونە بەر دەرگانەی خودای بۆ بەدەست هێنا، هیچ کام لەوانە بەبێ ڕجا وێنا ناکرێت، ڕجا زیندەگی داوایە و ویستیش ڕۆحی داوایە.

### ۞ شك و گومانی ڕەشبینان

دەستەیەك وا گومان دەبەن لەگەڵ ڕجا لاکردنەوە بەلای بەشی نەفسدا بوونی هەیە، سالیکانیش لە نەفسی خۆیان هاتوونەتە دەرەوە، چجای بەشی نەفسیان؟

خودایـە، چـەندە جێـی سەرسـوڕمانە! چ هەڵەیـەك لـە رجـای بەندەدایـە بـۆ لای پـەوەردگاری و چـاوتێبڕین لـە چـاکە و فـەزڵی و داوای ئـەوە بـە دڵ و زمـانی؟ رجـا بریتییە لـە چـاوتێبڕینی دڵ بـۆ گەیشـتن بـەو شـتەی رجـای پێیـەتی، گـەر بەنـدە بـە بەردەامی چاوی تێبـڕێت و بـە زمـان داوای بکـات و بـە تـەمای فـەزڵی پـەروەردگاری بێـت، دەبـێ چ هەڵەیـەك لەمـەدا بـوونی هـەبێت؟ ئایـا دوعاکـەی پێغەمبـەرتان پێنەگەیشتووە؟ **((أللهم أعوذ برضاك من سخطك وبمعافاتك من عقوبتك، وبـك منـك، لا أحصي ثناءا عليك، أنت كما أثنيت على نفسك))**

هەروەها فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بە مامی خۆی عەباس-خوای لـێ رازی بێـت- **((يا عم عباس، يا عم رسول الله، سل الله عافية))**

هەروەها فەرموودەکەی کە بە ئەبوبەکری صدیقی فـەرموو کاتێـك داوای لـێ کـرد دوعایەکی فێر بکات لە نوێژەکانیدا بیخوێنێت، فەرمووی **((قـل: أللـهم إنـي ظلمـت نفسي ظلما كثيرا، ولا يغفر الذنوب إلا أنت، فاغفر لـي مغفـرة مـن عنـدك، إنـك أنـت الغفور الرحيم))**

هەروەها فەرموودەکەی -کە بە راستگۆی ئافرەتانی فـەرموو -کاتێـك داوای لـێ کـرد دوعایەکی فێر بکات بیخوێنێت گەر رێی لە شەوی قەدر کەوت فەرمووی **((قـولي: إنـك عفو تحب العفو فاعف عني))**

هەروەها فەرموودەکەی لەو دوعایەدا کـە هـەرگیز لـەبیری نـەدەکرد، یـا دوعـای تـری لەگەڵ بکردبایە ((ربنا آتنا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة وقنا عذاب النار))

خودای موتەعال مـەدح و سـەنای ئـەهلی تایبـەتی خـۆی کـردووە کـە بـریتین لـە "أولـوا الألباب" -خاوەن ژیرییەکان، پێی فەرموون داوای لێ بکەن لە سزای ئاگر رزگاریان بکات و بیانپارێزێت ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ ﴿١٩١﴾﴾ آل عمران: ١٩١

پێغەمبەر(ﷺ) بە "أم حبيبة"ی فەرمووی **((لو سألت الله أن يجيرك من عذاب النار لكان خيرا لك))** و((پێغەمبەر زۆر پەنای بە خودا دەگرت لە سزای ئاگر و سزای قەبر))، فەرمانی بە موسڵمانان کرد: کە لە "تەحیات"دا پەنا بە خـودا بگـرن لـە سـزای قـەبر و سـزای ئاگر و فیتنەی ژیان و مردن و فیتنەی مەسیحی دەجال))، هەتا وتـراوە: ئـەم دوعایـە لە نوێژدا واجبە و نوێژ بـەوەوە دروسـتە، ئـیبن حـەزم و کەسـانی تـر وتوویانـە "ئـەم دوعایە مەزنترە لەوەی پشتگوێ بخرێت"

لە مەسنەددا لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی ((هیچ شتێکی داوا نەکردووە خۆشەویستر بێت لەلای لە داوای لێبوردن و عافییەت "العفو و العافية"))

بە هەندێ لە هاوەڵانی فەرموو: ((چی دەڵێیت کاتێك نوێژ دەکەیت؟ وتی: داوای بەهەشت لە خودا دەکەم و پەنای پێ دەگرم لە ئاگر، من دەندەنەی تۆ و مەعاز باش نازانم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئێمەش بە دەوری ئەوەدا دەسوڕێینەوە))

## ۞ رجایەکی زیانبەخش

وەك چۆن رجا گەرمی ترس سارد دەکاتەوە، سوودی زۆری تری بەرچاوی هەیە:

**لەوانە:** دەرخستنی بەندایەتی و پێویستی زۆر بەوەی داوای دەکات لە پەروەردگاری و لە چاکەی ئەو چاوەڕوانی دەکات، بەندە بۆ چاوترووکانێك لە فەزڵ و چاکەی خودا بێنیاز نییە.

لەوانە: خودا **—سبحانه—** پێیخۆشە بەندەکانی هیوایان پێی هەبێت و رجای لێ بکەن و داوای فەزڵی ئەو بکەن، چونکە ئەو مەلیکی راستەقینە و بەخشندەیە، زۆرتر و بەرینتر لەوەی داوای لێ دەکرێت، کەسی بەخشندە کاتێك خۆشحاڵە داوای لێ بکرێت و رجایان پێی هەبێت و جێگەی ئومێدی دەوروبەری بێت، فەرموودەکە ((هەر کەس داوا لە خودا نەکات خودا لێی تووڕە دەبێت))، نزاکەر رجاکەر و داواکەرە، هەر کەس رجای بە خودا نەبێت خەشمی لێ دەگرێت.

ئەمە سوودێکی ترە لە سوودی رجا کە رزگاربوونە لە تووڕەیی خودا بەهۆی رجاوە.

**لەوانە:** رجا باوەڕدار دەداتە بەر بەرەو خودا، رێگەی بەرەو خوداچوونی بۆ خۆش دەکات و هانی دەدات لەسەر دەستگرتن بەو رێگەیەوە، گەر رجا نەبوایە کەس رێگەی بەرەو خوداچوونی نەدەگرتەبەر، بەتەنها ترس بەندە نابزوێنێت، بەڵکو خۆشەویستی جووڵەی پێ دەکات و ترسیش نائارامی دەکات و رجاش دەیداتە بەر.

**لەوانە:** رجا کەسەکە لەبەر دەرگانەی خۆشەویستیدا رادەکێشێت، هەڵیدەداتە ناو توناوتوونەکانی خۆشەویستییەوە، تا کەسەکە رجای زۆرتر بێت و ئەوەی رجای دەکات بۆی بەدەست بێت خۆشەویستی و شوکر و رەزامەندی بۆ خودای موتەعال زیاتر دەبێت.

**لەوانە:** کەسەکە هان دەدات بۆ بەرزترین مەقام کە بریتییە لە مەقامی شوکر، ئەوەش بریتییە لە پوختەی بەندایەتی، ئەو کە رجاکراوەکەی بەدەست دەهێنێت بانگی دەکات بۆ شوکر کردن.

**لەوانە:** مەعریفەی زیاتری بە خودا و ناوەکانی و مانای ناوەکانی بۆ پەیدا دەکات و پێیانەوە وابەستە دەبێت، کەسی رجاکار وابەستەیە بە ناوە جوانەکانی خودای موتەعالەوە، بەو ناوانە بەندایەتی خودا دەکات و بانگ لە خودا دەکات، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَا﴾ الأعراف: ١٨٠، نابێت داواکانی بە ناوە جوانەکانی خودا پەکبخات کە مەزنترین شتێکە داواکەر داوای پێ بکات، بە کەم تەماشا کردنی رجا پەکخستنی بەندایەتییە بەو ناوانە، هەروەها پەکخستنی نزا و پاڕانەوەیە بەو ناوە جوانانە.

**لەوانە:** خۆشەویستی لە رجا جیانابێتەوە وەك پێشتر باسمان کرد، هەر یەکێك لەو دوانە ئەویتریان پاڵپشت دەکات و هێزی پێ دەبەخشێت.

**لەوانە:** ترس بەدوای خۆیدا رجا دەهێنێت و رجاش بەدوای خۆیدا ترس دەهێنێت، هەموو رجاکارێك ترساوە و هەموو ترساوێکیش رجاکارە، بۆ ئەو مەبەستە لە هەر شوێنێکدا رجا رووبدات روودانی ترسیش بە باش دەبینرێت ﴿مَّا لَكُمۡ لَا تَرۡجُونَ لِلَّهِ وَقَارٗا ١٣﴾ نوح: ١٣، زۆرێك لە ئەهلی تەفسیر دەڵێن: ماناکەی: بۆ لە مەزنی خودا ناترسن؟ دەڵێن: رجا لەم شوێنەدا بە مانای "ترس" هاتووە.

**راستییەکەی:** ترس هاوملی رجایە، هەموو رجاکارێك ئەترسێت ئەوەی رجای بۆ دەکات لەدەستی دەربچێت، ترسیش بەبێ رجا بێهیوایی و دەستەئەژنۆییە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَغۡفِرُواْ لِلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ﴾ الجاثیة: ١٤، لەسەر تەفسیرەکەی دەڵێن: لە دەستوەشاندنی خودا ناترسن، وەك ئەو دەستوەشاندنانەی بەسەر گەلانی پێشوودا هێنای.

**لەوانە:** بەندە کە دڵی وابەستەی رجای پەروەردگاری بوو، و ئەوەی رجای دەکرد پێی بەخشی: ئەوە دەبێتە شیرینترین هەڵوێست لەلای بەندە و مژدەی بەدەستهێنانی ئەو شتانە دەدات کە هێشتا پێی نەبەخشراوە، ئەمە یەکێکە لەو هۆ و حیکمەتانەی لەم دونیایەدا باوەڕدارانی لە نێوان ترس و رجادا راگرتووە، بەپێی ترس و رجایان لەرۆژی

دواييدا خۆشی و ئاسوودەيی روويان تێ دەكات، ئەمەش بە بەدەستهێنانی داواكانيان و لادانی ترسەكانيان.

لەوانە: خودای موتەعال تەواوكردنی پلەكانی بەندايەتی لە بەندەكەی مەبەستە: لە زەليلی و لارەملی و پشتبەستن بە خودا و رازيبوون لێی و گەڕانەوەی بەردەوام بۆ لای، و پلەكانی تريش، بۆ ئەو مەبەستە گوناهی لەسەر نووسيوە و بەهۆيەوە تاقيدەكاتەوە، بۆ ئەوەی پلەكانی بەندايەتی ئەو كەسە بە تەوبەكردن كامڵ ببێت كە لە خۆشەويسترين بەندايەتييەكانی بەندەی خۆيەتی، هەر بەو جۆرە كامڵ كردنی پلەكانی باوەڕ بە ترس و رجا.

لەوانە: رجا چاوەڕوانی و پێشبينی كردنی فەزڵ و چاكەی خودايە و دڵ وابەستە دەكات بە يادی خوداوە و لاكردنەوەی بەردەوام بۆ لای ناو و سيفاتی خودای موتەعال و گەشتی دڵ بەناو باخچە رازاوەكانيدا و وەرگرتنی بەشی خۆی لە هەر ناو و سيفەتێك وەك پێشتر ئاماژەی پێدراوە، گەر لەوانە دابڕێت و بزرببێت ئەوا بێبەش دەبێت لەو بەشەی كە لە ناو و سيفەتەكانی خودا بۆی دانراوە.

لەوانە: كەسی خۆشەويست و راستگۆ لە رجادا هەندێ جار بە خۆشەويستەكەی خۆشحاڵ دەبێت و خۆشحاڵييەكەی زياد دەكات و ئاسەواری لوتفی خودا دەبينێت و چاكە و بەرگری خودا لەوەوە هەست پێ دەكات و دەبينێت بە لوتفی خۆی لە هەموو رێگەيەكەوە سوود و خێر و خۆشی بۆ بەندەكەی رەوانە دەكات و زيان و ناخۆشييەكانی لە هەموو رێگەيەكەوە لێ لادەدات، ئەو هەر كاتێك ئەمانە دەپشكنێت شتی سەير و سەمەرەی بەرچاو دەكەوێت، بير و خەياڵی لە مەبەست و مەرامێكدا راناوەستێ و ئەوەی بۆی شاراوەتەوە زۆرترە لەوەی بۆی دەركەوتووە، بە بينينی ئەم حاڵەتە جۆرێك لە كرانەوەی سروور ئامێز رووی تێدەكات.

خۆشحاڵی و ئاسوودەيی دڵ بە پەروەردگار و گەشانەوە و رۆشنبوونەوەی چاوی و بەختەوەری بە خۆشەويستی خودا و شەوق بۆ گەيشتن بە ليقای خودا لەلای ئەهلی دڵ شاراوە نيين و نەرێ ناكرێن، مەگەر لای كەسانێك پەردە بەسەر دڵيدا درابێت و سروشتێكی ناسازی هەبێت.

لەوانە: خێرايی رۆيشتن بۆ لای خودا، ئەمەش وەك ئەو كەسەی دەيەوێت بچێت بۆ شارێك، كە لێی نزيكبوويەوە و شارەكەی بينی ئەو كات رێگەكەی زۆر لا رۆشن

دەبێتەوە و ڕۆشنایییەکانی و پەیوەستبوونی بە شارەکەوە لای ئەو ڕوونتر دەبێتـەوە، پێش بینینی شارەکە زانست -یان گومان- ی هەبوو کە دەرگـای شـارەکەی لـێ بـزر بوویێت، بەڵام ئێستا دڵنیابووە لـەوەی دەرگـای شـارەکەی لـێ بـزر نـەبووە، کەسـی ڕجاکاریش هەر بەو جۆرەیە کە ڕێگرەکانی لێ بوویەوە و ڕێگەکەی بۆ ڕۆشن بوویـەوە و چاوبڕییە گەیشتنی کۆتایی وەك ئەو کەسەی لێ دێت کە دەرگای شارەکە دەبینێـت و چاوی پێی دەکەوێت، یان وەك ئـەو کەسـەی لـێ دێـت سـپێدە و سـوورایی بـەر لـە هەڵهاتنی خۆر دەبینێت، چونکە دڵنیا دەبێت دوای ئەو نیشانەیە خۆر هەڵدێت.

هێزی دەرەوە و ناوەوەی بۆ کۆ دەبێتەوە بە مەبەستی گەیشتن و لێبڕان بۆ ئامانج، بـۆ بینینی ئەوەی بەرەو ڕووی دەڕوات، کاری موسافیریش هەر بەو جۆرەیە: ئـەو کـە نزیـك دەبێتەوە لە ئاوەدانی و دەیبینێت ڕۆیشتنەکەی خێرا دەکات و کۆششی زیـاتر دەکـات، هەر بەو جۆرە ئەو کەسەی پێشبڕکێ دەکات کاتێك ئامانجەکەی دەبینێت هەموو هێـزی ڕاکردنی خۆی دەخاتە گەڕ، هەر بەو جۆرە کەسی ڕاستگۆ لە کۆتایی تەمەنیدا لێـبڕان و مەبەستگیری بەهێزترە لە هەر کاتێکی سەرەتا بەهۆی نزیکبوونەوە لەو ئامانجـەی بـۆی دەڕوات، کەسـی ڕجاکـاریش هـەر بـەو جۆرەیـە لـە شـەرمەزاری بێهیـوایی خـۆی قوتـار دەکات، نیعمەتەکانی دواڕۆژ دێتە پێش چاوی و پەلە دەکات بۆ لایان.

لەگەڵ زۆرێك لە سوودی تر کە ئەو کەسەی تێڕامان دەکات و بیردەکاتـەوە دەتوانێـت دەریان بهێنێت، کۆمەك بە خودایە.

## ۞ بەر لە هێرش بردن...... شەوقێك

**بزانە سەرەتای ڕجا:** ڕجایەکە کەسی کارکەر بەرەو تێکۆشان هەڵدەنێت و چـێژی لـە خزمەت و بەندایەتیدا پـێ دەبەخشێت، سروشـت بـە ئاگادەهێنێـت بـۆ لێبـوردەیی بـە وازهێنان لە نەهیلێکراوەکان، چالاکی دەکات بۆ بەختکردنی وزە و توانا بۆ ئەو شتەی ڕجای پاداشـتەکەی دەکـات لـە پەروەردگارییـەوە، هەرکـەس مـەزنی داواکـەی خـۆی بزانێت ئەوەی بەختی دەکات لە هەوڵ و تێکۆشان بە کەمی دەبینێت.

لـەدایکبوونی چـێژبینین لـە خزمـەت: هـەرکات دڵـی سـەرنجی بـەری ئـەو کارانـە و سەرئەنجامی باشی ئەو کارانـە دەدات چـێژیان لـێ دەبینێـت، ئەمـەش وەك حـاڵی ئـەو کەسەی هیوای خێر و قازانجی زۆر لە سـەفەرەکەی دەکـات، سـەختی و دژواری سـەفەر

لە پێناويدا قبووڵ دەكات، هەر كات وێنەی ئەو قازانجە دەخاتە بەر دڵی سەفەرەكەی لەسەر ئاسان دەبێت و چێژی لێ دەبينێت، كەسی خۆشەويستی راستگۆی كۆششكار بۆ رەزامەندی خۆشەويستەكەی هەموو گرانێك لەسەری هەر بەو جۆرەيە، هەر كات بيردەكاتەوە لە بەری رازيبوونی ئەو (خودا) لە خۆی و بير لە قبووڵی هەوڵەكەی و نزيكی لە ئەو دەكاتەوە لەو هەوڵ و كۆششانە چێژ وەردەگرێت، هەتا زانستی بەندە سەرنج بدات لە مەزنيی خودا و ئەو هۆكارانەی مرۆڤ بەو دەگەيەنێت چێژی زياتر لە ئەنجامدانيان وەردەگرێت.

بێداركردنەوەی سروشت بۆ لێبووردەيی و وازهێنان لە نەهيلێكراوەكان: سروشتی مرۆڤ هەندێ زانراو و خوخدەی هەيە كە لە مرۆڤ داوايان دەكات، رێگە بە واز لێ هێنانيان نادات مەگەر بە بەدەستهاتوويەكی خۆشەويستتر لەلای و مەزنتر و قازانجتر بۆی، كە وابەستەبوونی رجا بەو بەدەستهاتووە باشتر و مەزنترە بەهێز بوو سروشت رێگە دەدات ئەو زانراو و خوخدە ناباشانە واز لێ بهێنێت، چونكە نەفس دەستبەرداری خۆشەويستێك نابێت مەگەر بە خۆشەويستێكی مەزنتر لە ئەو، يان بە ترسێنەرێك كە تێكدان و زيانەكانی زۆرتر بێت لە خۆشييەكانی ئەو خوخدە خۆشەويستانە لەلای، يان خۆدوورخستنەوە بێت لە ترسێك كە تێكدان و هەڕەشەكەی مەزنتر بێت لە بەدەستهێنانی بەرژەوەندييەك بەوەی خۆی خۆشيدەوێت و دەقی پێوەگرتووە، نەفس واز لە خۆشەويستێك ناهێنێت مەگەر بۆ خۆشەويستێكی گەورەتر، ئەو كەسەی خواردنێكی بەتامی پێشكەش دەكرێت و دەبێتە هۆی زيان و نەخۆشی بۆی وازی لێ دەهێنێت لە پێناو لەشساغيدا كە خۆشەويستترە لەلای لە خۆشی خواردنەكەی.

بەرزتر لەو رجايە: رجای خاوەن دڵانە، كە بريتييە لە رجای گەيشتن بە پەروەردگار و هەڵدانی بۆ تامەزرۆيی ئەو بە يەكترگەيشتنە و دووركەوتنەوە لە ژيانی كەموكورت و زوهد لە خەڵكی.

ئەم رجايە باشترين و بالاترين جۆری رجايە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿فَمَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ١١٠﴾ الكهف: ١١٠ ﴿مَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَأٰتٍ﴾ العنكبوت: ٥

ئەم جۆرە رجایە بریتییە لە باوەڕی تەواو و پوختەکەی، چاوی کەسە موشتاقەکان لەسەر ئەم جۆرە باوەڕەیە، بۆیە خودا بە هاتنی کاتی لیقای خۆی دڵخۆشیان دەکات و کاتێکی بۆ دیاری کردوون کە دەروونیان ئارام بکاتەوە و دڵنیایان بکات.

**"ئیشتیاق"–تامەزرۆبوون:** بریتییە لە سەفەری دڵ بۆ داوای خۆشەویستەکەی.

گومانی تێدا نییە ژیانی کەسی تامەزرۆ ناخۆشە تا دەگات بە خۆشەویستەکەی، لەو شوێنەدا چاوی رۆشن دەبێتەوە و ناخۆشییەکانی ژیانی دەڕەوێتەوە، هەر بەو جۆرە تا ئەوپەڕی زوهد لە خەڵکی زوهد دەکات، چونکە کەسەکە بەدوای هۆگری و نزیکبوونەوە لە خودا دەگەڕێت، ئەوەش بەهێزترین زوهدە لە خەڵکی، مەگەر شتانێك کۆمەك بن لەسەر داواکەی و بیگەیەنن بە داواکەی، گەر کەسێك بوو ئەوا ئەو کەسە دەبێتە خۆشەویسترین دروستکراوی خودا لەلای و هۆگری کەسانی تر نابێت و ئارامی لای کەسانی تر بۆ نایەت، پێویستە بکۆشی بۆ بەدەستهێنانی ئەو دۆستە، گەر نەتبینییەوە ئەوا با تەنها خودا دۆست و هاوەڵت بێت، هەموو خەڵکی بخەرە لاوە.

لا تخف وحشة الطريق إذا جئـ ـت وكن في خفارة الحب سائر
واصبر النفس ساعة عن سواهم فإذا لم تجب لصبر فصابر
وافطم النفس عن سواه فكل الـ ـعيش بعد الفطام صائر
يا أخا اللب إنما السير عزم ثم صبر مؤيد بالبصائر
يا لها من ثلاثة من ينلها يرق يوم المزيد المنابر

۞ ۞ ۞

## (٢٠) (منزلة الرغبة)

# مەنزیلەی رەغبەت

لە مەنزیلەکانی ((إیاك نعبد وإیاك نستعین)) مەنزیلەی رەغبەتە.

خودای موتـەعال دەفـەرموێت ﴿وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗا﴾الأنبیـاء: ٩٠، جیـاوازی نێـوان "الرغبة"—ویستی بەرین لەگەڵ "الرجاء"—رجا: رجا چاوتێبڕینە، بەڵام رەغبـەت داوایـە، واتە رەغبەت بەری رجایە، چونکە گـەر رجـای شـتێکی کـرد داوای دەکـات، "رەغبـە" لەگەڵ "رجا" وەك "هەڵهاتن" وایە لە "تـرس"، هـەر کـەس رجـای شـتێکی کـرد داوای دەکات و رەغبەتی هەیە بۆی، هەر کەسیش لە شتێك بترسێت لێی هەڵدێت.

**مەبەستەکە:** کەسی رجاکار داواکارە، کەسی ترساویش هەڵهاتووە، رەغبەت: بریتییـە لە رجا بەڕاستی و دروستی، چونکە رجا چـاوتێبڕینێکە پێویسـتی بـە تـەحقیق هەیـە، واتە چاوتێبڕینێکە لە نەبوونی رجاکاردا بەدەستهێنانی جێگەی گومانە، بـا لـە خـودی خۆیـدا تـەحقیقکراو بێـت، وەك رجـای بەنـدە بـۆ چـوونە بەهەشـت، بەدەسـتهێنانی بەهەشت گومانی تێدا نییە، بەڵکو گومان لە چـوونە بەهەشـتی ئـەوە، بـە پێچـەوانەی رەغبەتەوە کە بریتییە لە داوا، هەرکات چاوتێبڕینەکە بەهێز بوو دەبێت بە داوا.

**سەرەتای رەغبەت:** بریتییە لـەو رەغبەتـەی لـە زانسـتەوە لـەدایك دەبێـت، کەسـەکە بەرەو کۆشان بۆ مەقامی شهوود هەڵدەنێت (فتبعـث علـى الإجتهـاد المنـوط بالشـهود) و کەسی سالیك لە سستی خاوبوونەوە و تەمبەڵی پارێزگاری لێ دەکات (وتصون السالك عن وهن الفترة والکسل).

ئـەم بـاوەڕە پەیوەسـتی مەنزیلـەی "ئیحسـان"ە، لـەوەوە تەماشـای دەکـات و پێـی دەگات، بۆیە تەبا و نزیکە بە شهوود، ئەو شهوودەش بریتییە لە مـەقامی "ئیحسـان" کە بریتییە لە: (أن تعبد الله کأنك تـراه)— خـودا بپەرسـتی وەك ئـەوەی ببیـنی، هـیچ مەشهەدێك لە دونیا بۆ بەندە لەم مەشهەدە باڵاتر نییە.

گەر لەسەرو مەقامی "ئیحسان"ەوە مەقامێکی تر هەبوایـە پێغەمبـەر(ﷺ) بـۆ جبریـل باسی لەبارەوە دەکرد و جبریل پرسـیاری لـە پێغەمبـەر دەکـرد لەسـەری، پێغەمبـەر تەواوی مەقامەکانی ئیسلام و ئیمان و ئیحسانی تیادا کۆکردۆتەوە.

بەدەستهێنانی مەقامی ئیحسان: دەبێت کەسەکە بە خۆشەویستی و ترس و رجا و پشتبەستن بە خودا و پەرستنی خودا و دابڕان لە هەموو شتێك بۆ خودا فەنا ببێت، لە سەرو ئەو مەقامەوە مەقامێکی تر بوونی نییە تاکو داوابکرێت مەگەر هاتنی شتە لابەلاکان بن.

رەغبەت بەرزدەبێتەوە تا توانایەك بۆ کۆشش نامێنێتەوە تا بەخت بکرێت، سووربوون و لێبڕان سستی رووی تێ ناکات، جگە لە مەبەست و مەرامی لەبەرچاوگیراو ئاوات بۆ هیچ شتێکی تر ناخوازرێت.

رەغبەتەکەی هەموو کۆشش و تواناکانی پێ بەخت دەکات، سووربوون و لێبڕانی خاوبوونەوە و خامۆشی رووی تێناکات، لێبڕانی لە زیادبووندایە، لە دڵدا بەشی شتێکی تر جگە لە مەبەست و مەرامەکەی خۆی بوونی نییە.

کە رەغبەتەکەی کامڵ بوو: ئەخلاقی چاودێری ئیمانی کامڵ دەبێت کە بریتییە لە: چاودێری کردنی زانست و پارێزگاری لێ کردنی بە کردار، و چاودێری کردنی کردار بە ئیحسان و ئیخلاص، هەروەها پارێزگاری لێ کردن و پاراستنی لە تێکدەرکان (مفسدات).

ئاستەکانی زانست و کردار سیانن: "رواية" -گێڕانەوە کە تەنها بریتییە لە گواستنەوە و هەڵگرتنی ریوایەتکراوەکە، "دراية" -پەیپێبردن کە بریتییە لە تێگەیشتن و ژنەوتنی مانای ریوایەتەکان، "رعاية" -چاودێری کە بریتییە لە کارکردن بەپێی ئەوەی زانیویەتی.

گوازەرەوەکان کاریان بریتییە لە گێڕانەوە، زانایان کاریان بریتییە لە پەیبردن، عاریفانیش کاریان بریتییە لە چاودێری، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَجَعَلْنَا فِي قُلُوبِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ابْتِغَاءَ رِضْوَانِ اللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا﴾الحديد: ٢٧، واتە بۆ داوای رەزامەندی خودا ئەنجامیان دا، بەڵگە لەسەر ئەمە وشەی "ابتدعوها" -دایانهێنا، پاشان پاڵنەری ئەو داهێنانە کە رەهبانییەتە باس دەکات کە بریتی بووە لە بەدەستهێنانی رەزامەندی خودا، پاشان بە وازهێنان لە ریعایەتی ئەو کارە زەمیان دەکات، چونکە هەر کەس بۆ خودا پابەندی شتێك ببێت -کە خودا بۆ خۆی کەسەکەی پابەند نەکردبێت- لە کاری نزیکبوونەوە لە خودا ئەوا ریعایەت کردن و تەواوکردنی ئەو کارە لەسەری پێویستە،

تا هەندێك لە فوقەها ئەوانەی خۆیان پابەند دەكەن بە كارێكی چاكەوە لەسەریان پێویست كردوون تەواوی بكەن، پابەندبوونی شەرعییان وەك پابەندبوون بە "نەزر"ەوە تەماشا كردووە، ئەبو حەنیفە و مالك و ئەحمەد لە یەكێك لە دوو ریوایەتەكەدا لەسەر ئەم بۆچوونەن.

نەصارا رەهبانییەتیان داهێنا، بانگەشەی ئەوەیان كرد كە لە سوننەتەكان و هیدایەتەكانی عیسای كوڕی مەریەمە (عليه السلام)، خودا بەدرۆی خستنەوە و رایگەیاند ئەوان لە خۆیانەوە دایانهێنا و عیسا (عليه السلام) لێی بەرییە، رەهبانییەت پێچەوانەی فیترەتێكە كە خودا مرۆڤی لەسەر بارهێناوە، خودای موتەعال شتێك بە رەوا نابینێت پێچەوانەی فیترەت بێت و خۆشی لێنایەت، بۆیە نەیانتوانی و ناتوانن حەقی ئەو رەهبانییەتە بدەن، چونكە هیچ كەس ناتوانێت یاسا و رێساكانی خودا بگۆڕێت.

مەبەستەكە: لەلای خوداوە زەمی ئەو كەسانە دەكرێت كە كارێك بۆ خودا دادەهێنن بڕیاری لێ دەدەن و دواتریش ریعایەتی ناكەن و لەسەری بەردەوام نابن، ئەی دەبێ حاڵی ئەو كەسە چۆن بێت كە ریعایەتی كاروكردەوەگەلێك ناكات كە خودا بۆ بەندەكانی بەرەوایان دەزانێت و مۆڵەتی پێداون و هانیان دەدات لەسەری؟

لە پایەكانی ریعایەت: ریعایەتی كاروكردەوەكان بەپێی شێوازی میانەگیری، لەگەڵ بەكەم تەماشاكردنیان و لانەكردنەوە بە لایاندا.

سەرەتای ریعایەتی كاروكردەوەكان: لادانیانە لە دوو جەمسەرەكەی كەمڕەوی بە ناتەواوی و زیادەڕەوی بە خستنەسەر، بەجۆرێكی شەرعی و شیاو لە سنوور و سیفات و مەرج و كاتی خۆیاندا، پاشان بچووك و كەم تەماشاكردنی ئەو كاروكردەوانە لە لاكردنەوە بەلایاندا، ئەوەی شایستەی مەزنی و شكۆمەندی پەروەردگارە لە حەق و بەندایەتی شتێكی ترە، وا ببینێت كە حەقی خودای نەداوە و لەو كردەوانە بۆ پەروەردگاری و لە هیچ شتێكی تریش بۆ ئەو ئەنجام بدرێت رازی نییە.

وتراوە: نیشانەی رازیبوونی خودا لە تۆ بریتییە لە پشتهەڵكردنت لە خۆت، نیشانەی قبووڵبوونی كاروكردەوەكانت: بریتییە لە بچووك و كەم تەماشاكردنیان، بچووكبوونەوەیان لە دڵتدا، هەتا عاریفان لەدوای كاروكردەوە چاكەكانیان داوای لێخۆشبوون لە خودا دەكەن، پێغەمبەر كە لە نوێژ سلاوی دەدایەوە سێ جار "أستغفر

الله"ی دەكرد، خودای موتەعال فەرمانی بە بەندەكانی كردووە لە دوای حەج "أستغفر الله" بكەن، هەروەها مەدحی ئەوانەی كردووە لەدوای شەونوێژ "أستغفر الله" دەكەن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی بە تەوبە و ئیستغفار كردووە لەدوای پاكبوونەوە.

هەر كەس مافەكانی پەروەردگار و بڕی كاروكردەوەكانی خۆی ببینێت و ناتەواوی خۆی بێتە پێش چاوی هیچ ڕێگەیەكی لەبەردەم نییە جگە لە داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگاری و بچووك و كەم تەماشاكردنی كاروكردەوەكانی خۆی.

پاشان هەستان بەو كاروكردەوانە بە جوانترین ئەنجامدان، كاروكردەوەكانی ڕاوەستاو بكات، وەك ڕاوەستاوی شایەتیدان و ڕاوەستاوی نوێژ، و ڕاوەستاوی درەخت لەسەر قەدەكەی كە بەر نابێتەوە، بەبێ ئەوەی لا بەلای ئەو كاروكردەوانەدا بكاتەوە و بیانژمێرێ و باسیان بكات، لە ترسی خۆپەسەندی و منەتكردن، دەرئەنجام لەبەر چاوی خودا بكەوێ و كردارەكانی پووچ ببنەوە، بەڵكو شیاوترە یەقینی خۆی تۆمەتبار بكات، چونكە یەقینەكەی بەپێی پێویست نەبووە، بەڵكو ئەوەی ئەنجامی داوە وەك شتێكی خوازراو وابووە نەك موڵكێكی جێگیر، تۆمەتی نەفسی خۆی زیاتر دەبێت و زیاتر پاكی دەكاتەوە لە حەزی بانگەشە و ڕزگار كردنی دڵ لە بەشی شەیتان، لەگەڵ هەر هەنگاوێك بوەستێت بە ئەندازەی ڕاستكردنەوەی لەڕووی نێت و مەبەست و ئیخلاص و بەدواداچوونەوە، بێسەروبەر هەنگاو هەڵناگرێت، بەڵكو بەر لە هەڵگرتنی هەنگاوێكی نوێ هەنگاوەكەی پێشووی ڕاستدەكاتەوە، لە شێوازێكی ئامادەباشی بۆ هەنگاوی داهاتوو و پەیبردنێكی ورد بۆ هەنگاوی پێشوو، پاشان هەنگاوی لێبڕانی هەڵدەگرێت، كە هەنگاوەكەی دروست بوو و گواستییەوە بۆ شوێنی مەبەست لە خۆی جیادەبێتەوە، لەبەر ئەوەی نەفس شوێنی لێڵی و تێكدانە، جیابوونەوەكەی لەو نەفسە پاكێتی و دەرئەنجامی ڕیعایەتی لێ دەكەوێتەوە.

❁ ❁ ❁

## (٢١) (منزلة المراقبة)

# مەنزیلەی چاودێری

لە مەنزیلەکانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی چاودێرییە.

خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ فَٱحْذَرُوهُ﴾ البقرة: ٢٣٥، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ رَّقِيبًا ﴿٥٢﴾﴾ الأحزاب: ٥٢، هەروەها ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ﴾ الحديد: ٤ ﴿أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ﴿١٤﴾﴾ العلق: ١٤، هەروەها ئایەتی ﴿فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا﴾ الطور: ٤٨، هەروەها ﴿يَعْلَمُ خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِى ٱلصُّدُورُ ﴿١٩﴾﴾ غافر: ١٩، ئەمانە و زۆرێك لە ئایاتی تر.

لە فەرموودەکەی جیبریل (عليه السلام): ((دەربارەی ئیحسان لە پێغەمبەری پرسی؟ پێی فەرموو: أن تعبد الله كأنك تراه فإن لم تكن تراه فإنه يراك-خودا بپەرستی وەك ئەوەی دەیبینیت، گەر نەتوانی بیبینیت ئەوا ئەو تۆ دەبینێت))، لەم فەرموودەیەوە روون دەبێتەوە کە "چاودێری" بریتییە لە بەردەوامی زانست و یەقینی بەندە بە سەیرکردن و ئاگاداربوونی خودا بە ناوەوە و دەرەوەی ئەو، بەردەوام بوون لەسەر ئەم زانست و یەقینە بریتییە لە "چاودێری"، ئەوەش بەری ئەو زانینەیە کە خودا-سبحانه- چاودێرە لەسەری و تەماشای دەکات و گوێی لە قسەکانییەتی و لە هەموو کات و ساتێك و هەموو هەناسە و چاوتروکانێکدا ئاگادارە بە کاروکردەوەکانی.

وتراوە: هەر کەس ئەوەی بە بیر و خەیاڵیدا گوزەر دەکات بخاتە ژێر چاودێری خوداییەوە ئەوا جووڵەی ئەندامەکانی لەلایەن خوداوە پارێزراو دەبێت.

جونەید دەفەرموێت: هەر کەس چاودێری بەدەست بهێنێت دەترسێت لەوەی چرکەساتێکی لەدەست بچێت چاودێری خودای تیا نەکردبێت.

"ذو النون" دەفەرموێت: نیشانەی چاودێری بریتییە لە هەڵبژاردنی ئەوەی خودا دایبەزاندووە، و بە مەزن راگرتنی ئەوەی خودا بە گەورەی زانیوە و کەم تەماشا کردنی ئەوەی خودا بە کەمی زانیوە.

ئیبراهیم الخواص دەفەرموێت: چاودێری بریتییە لە پاكبوونەوە و پاڵفتەبوونی نهێنی و ئاشكرا بۆ خودا -عزوجل-

وتراوە: باشترین شتێك مرۆڤ لەسەر ئەم رێگەیە خۆی پێوە پابەند بكات بریتییە لە دادگاییكردنی خۆ و چاودێری و بەڕێوەبردنی كارەكانی بە زانست.

ئەبو حفص بە "أبي عثمان النيسابوري" فەرموو: گەر بۆ خەڵكی دانیشتی ئامۆژگاریكەری دڵی خۆت و نەفسی خۆت بە، بە كۆبوونەوەی خەڵك لەسەرت فریو نەخۆی، ئەوان تەنها دەرەوەت دەبینن و خودا چاودێری ناوەوەت دەكات.

ئەهلی ئەم رێگەیە كۆدەنگییان هەیە لەسەر ئەوەی كە چاودێری خودایی لەسەر ئەو شتانەی بە دڵ و خەیاڵدا گوزەر دەكەن هۆیەكە بۆ پارێزگاریكردنی خودایی بۆ جووڵەی دەرەوە و ئەندامەكان، هەر كەس چاودێری خودایی بكات لە نهێنی و پەنهانیدا خودا لە جووڵەكانیدا لە نهێنی و ئاشكرا پارێزگاری لیّ دەكات.

چاودێری بریتییە لە پەرستنی خودا بە ناوە جوانەكانی (الرقيب، الحفيظ، العليم، السميع، البصير)، گەر لەم ناوانە تێبگات و بە داواكارییەكانیان بەندایەتی بكات ئەوا چاودێری بەدەست دەهێنێت.

جوانترین و وردترین شتێك كە وەسفی چاودێری پێكراوە ئەوەیە:

چاودێری خودای موتەعال لە رۆیشتن بەرەو خودا بە بەردەوامی، لەنێوان بە مەزنزانینێكی سەرسامكەر (التعظيم المذهل) و نزیكبوونەوەیەكی دەستباردەر (ومداناة الحاملة) و سرووریكی هاندەرانە (وسرور باعث).

بە مەزنزانینێكی سەرسامكەر بریتییە لە: پڕبوونی دڵ بە شكۆ و مەزنیی خودای موتەعال بەجۆرێك كە لە بە گەورەزانینی غەیری ئەو بێئاگای بكات، هەروەها لانەكاتەوە بە لایاندا، كاتێك دڵی لەگەڵ خودا ئامادە دەبێت ئەو بە مەزن زانینەی لە یاد نەچێت، بەڵكو هەمیشە لەگەڵیدا بێت، چونكە ئامادەبوون لەگەڵ خودا هۆگری و خۆشەویستی دروست دەكات، گەر ئەو دووانە بە مەزنزانینی خودای موتەعالیان لەگەڵ نەبێت كەسەكە لە سنوور و ئادابی بەندایەتی دەردەچێت، هەر خۆشەویستییەك بە مەزنزانینی خۆشەویستەكەی لەگەڵ نەبێت دەبێتە هۆی دووركەوتنەوە لێی و لەبەر چاو كەوتنی.

بەو شێوەیە وەسفەكە پێنج شت دەستەبەر دەكات: ڕۆیشتن بەرەو خودا، و بەردەوام بوون لەسەر ئەو ڕۆیشتنە، و ئامادەبوونی دڵ لەگەڵیدا، و بە مەزنراگرتنی خودا، و بێئاگابوون بەهۆی بە مەزنڕاگرتنی خوداوە لە غەیری خودا.

**نزیكبوونەوەیەكی دەستباردەر (ومداناة الحاملة) بریتییە لە**: نزیكبوونەوەیەك كە یارمەتی و دەستباری بدات لەسەر ئەو پێنج كارەی سەرەوە، ئەو نزیكییە پاڵی دەنێت بۆ بەمەزنڕاگرتن كە لە خۆی و غەیری خۆی بێئاگادەبێت، هەتا لە خودا زۆرتر نزیك ببێتەوە زیاتر بە مەزن رایدەگرێت و زۆرتر لە خەڵك دووردەكەوێتەوە و بێئاگا دەبێت.

**سرووڕێكی هاندەرانە (وسرور باعث) بریتییە لە**: خۆشی و بە مەزنراگرتن و ئەو چێژەی لە نزیكی خودا دەیبینێت، سرووری دڵ بە خودا و دڵخۆشبوون پێی و ڕوونبوونەوەی چاو جۆرە چێژێكە كە لە هیچ نیعمەت و تام و چێژێكی ئەم دونیایە ناچێت، هاوشێوەیەكی نییە پێی پێوانە بكرێت، حاڵێكە لە حاڵە ناكۆتاكانی ئەهلی بەهەشت، تا هەندێك لە عاریفان دەڵێن: هەندێك كاتم بەسەردا گوزەر دەبێت تیایدا دەڵێم: گەر ئەهلی بەهەشت لەناو ژیانێكی لەم جۆرەدا بن بەراستی لە ژیانێكی خۆشدان.

گومانی تێدا نییە ئەو سرووورە هانی دەدات بۆ بەردەوامی گەشت بەرەو خودا، و كۆششكردن بۆ گەیشتن پێی و بەدەستهێنانی ڕەزامەندییەكانی، هەر كەس ئەم سرووورە نەبینێتەوە و شتێكی لەو سرووورە لەلا نەبێت با باوەڕ و كردارەكانی خۆی تۆمەتبار بكات، چونكە باوەڕ شیرینی هەیە، هەر كەس چێژی ئەو شیرینییە نەكات با بگەڕێتەوە، و نوورێك بەدەست بهێنێت بەهۆیەوە شیرینی باوەڕ بچێژێت.

پێغەمبەر(ﷺ) باسی تامی باوەڕ و چێژی شیرینییەكەی كردووە، تام و چێژی باس كردووە و بەستوونییەتەوە بە باوەڕەوە و دەفەرموێت ((چێژی باوەڕی كردووە هەر كەس ڕازیبێت بەوەی الله پەروەردگاری بێت و ئیسلام ئایینی بێت و محمد(ﷺ) پێغەمبەری بێت))

هەروەها دەفەرموێت ((هەر كەس سێ شتی تێدا بێت شیرینی باوەڕ دەبینێتەوە: كەسێك خودا و پێغەمبەری لە هەموو كەس و شتێك زیاتر خۆش بوێت، و كەسێك كەسێكی تەنها لەبەر خودا خۆشبوێت، و كەسێك پێیناخۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ بێباوەڕی –دوای ئەوەی خودا ڕزگاری كرد لێی– وەك چۆن پێیناخۆشە هەڵبدرێتە ناو ئاگرەوە))

گوێم لە شێخولئیسلام ئیبن تەیمیە بوو -قدس الله روحه-" دەیفەرموو: گەر شیرینی و والآبوونی سنگت لە كارێكدا نەبینییەوە ئەوا ئەو كردارە تۆمەتبار بكە، پەروەردگار "شكور"ە. واتە خودای موتەعال پاداشتی كاركەرەكە لە دونیادا دەداتەوە بە شیرینییەك لە دڵیدا و هێزی والآبوونی سنگ و روونبوونەوەی چاو، گەر ئەوانەی نەبینییەوە ئەوا كارەكەی شتی تێكەڵ بووە.

پاداشت دەگەڕێتەوە بۆ كەسی كاركەر لەسەر كارەكەی، كاروكردەوەی چاكە تەندروستییەكیان تێدایە بەسەر خاوەنەكەیدا دەشكێتەوە و پەیوەست دەبێت بە ژیان و هەموو كاروبارەكانییەوە، نوێژ نەهی لێدەكات لە "الفحشاء والمنكر" و رەوشت جوان دەكات و بە بالآترین پەروەردە كە خودا خۆشیبوێت پەروەردەی دەكات، هەر بەو جۆرە رۆژوو لێبڕان بەهێز دەكات، نەفسی لۆمەكار و بەصیرەتی رۆشن دەكاتەوە و وایان لێدەكات كەسەكە بەهۆیەوە شارێگەی راست و دروست ببینێت و بچێتە ریزی خۆپارێزانەوە، هەر بەو جۆرە تەواوی كردەوە باشەكان پاداشتگەلێكیان هەیە لەم دونیایەدا هەموو كاروبارەكان چاك و باش دەكەن، ژیانی خێزان و كۆمەڵی پێ بەختەوەر و ئاسوودە دەبێت، وەك كردەوەی خراپە بە هەمان شێوەیە، ئەوانەی چاكەیان كرد باشە چاوەڕوانیانە (للذين أحسنوا الحسنى)، ئەوانەش كە خراپەیان كرد خراپە چاوەڕوانیانە (الذين أساؤوا السوأى).

**مەبەستەكە:** سروور بە خودا و لەگەڵ خودا و نزیكبوون لێی و رۆشنبوونەوەی چاو پاڵی كەسەكە دەنێت بۆ كاری چاكەی زۆرتر و هاندانی لەسەر سووربوون بۆ رۆیشتن بەرەو خودا، و گواستنەوە بۆ "چاودێری"یەكی تر كە هەڵتدەنێت بۆ پشتكردن لە بەرهەڵستی كردن بە پارێزگاری دەرەوە و ناوەوە، پارێزگاری دەرەوە: بە پارێزگاری لە جووڵە دەرەكی و بەرچاوەكان، پارێزگاری ناوەوەش: بە پارێزگاری هەموو ئەو شتانەی بە دڵ و بیر و خەیاڵی كەسەكەدا گوزەر دەكات و سەرجەم جووڵە ناوەكییەكانی تر كە رەفزی بەرهەڵستكاری بڕیار و هەواڵی لێوە پەیدا دەبێت.

ناوەوە لە هەموو شەهوەت و ویستێك پاك دەبێتەوە كە بەرهەڵستی بڕیاری خودا دەكات، هەروەها هەر ویستێك پێچەوانەی ویستی ئەو بێت، و هەر شوبهەیەك دژ بە هەواڵ و گەیەنراوی ئەو بێت و هەر خۆشەویستییەك تەك بە خۆشەویستی ئەو

هەڵبچنێت، ئەمەش بریتییە لە حەقیقەتی دڵی سەلامەت کە کەس ڕزگاری نابێت مەگەر بەو دڵەوە بۆ لای خودا گەڕابێتەوە، هەر ئەمەش حەقیقەتی خۆداڕنین و دابڕانی چاکان و عاریفانی نزیك بە خودا، هەر خۆداڕنینێکی تر جگە لەمە ناتەواوە، ئەمەش خۆداڕنینی کەسانی خاوەن لێبڕانن.

**سێ جۆر بەرهەڵستی کردن لەناو خەڵکیدا باوە، پارێزراویش کەسێکە خودا پاراستبێتی:**

**جۆری یەکەم:** بەرهەڵستی ناو و سیفەتەکانی بە شوبهەی پووچ و بێبنەما کە لەو پێناوەدا نەرێی ئەو ناو و سیفەتانە دەکەن کە خودا بۆ خۆی جێگیری کردوون، هەروەها پێغەمبەرەکەی بۆی جێگیر کردووە، هەروەها شتێك بۆ خودا جێگیر دەکەن کە خودا بۆ خۆی لە خۆی نەرێی دەکات، بەو کارەشیان دۆستایەتی دوژمنەکانی خودا دەکەن و دژایەتی دۆستانی خودا دەکەن، کەلیمەیان لە جێگەی خۆی گۆڕی و زۆرێك لەوەی یادیان خرابوویەوە لەبیری خۆیان بردەوە و کاروبارەکان لە نێوانیان پچڕ پچڕ و دەستە دەستە لێی وەستان و هەر حیزبێك بەوەی لایانە دڵخۆشن.

**پارێزەر لەم بەرهەڵستی کردنە:** خۆڕادەستکردنی تەواوە بە وەحی، کە دڵ بە وەحی تەسلیم بوو ڕاستێتی ئەوەی وەحی هێناویەتی بۆ دەردەکەوێت، و دەزانێت بەپێی ژیری و فیترەتی ڕۆشن ئەوانە ڕاست و دروستن، بۆیە بیستن و ژیری و فیترەتی بۆ کۆدەبێتەوە، ئەمەش کامڵترین باوەڕە، وەك کەسێك نییە جەنگ لەنێوان بیستن و ژیری و فیترەتیدا بەردەوامە.

**جۆری دووەم:** بەرهەڵستکاری شەرع و بڕیاری خودا، ئەهلی ئەم بەرهەڵستکارییە چەند جۆرێکن:

**لەوانە:** بەرهەڵستکاران بە ڕا و پێوانەکانی خۆیان کە حەڵاڵکردنی حەرامی خودا لەئامێز بگرێت، هەروەها موباح حەرام بکات و ناواجب بکات بە واجب و واجبیش بکات بە ناواجب، ئەوەی دروستە بەتاڵی بکاتەوە و ئەوەی بەتاڵە بە نادروست لە قەڵەمی بدات، ئەوەی خودا سڕیویەتەوە جێگیری بکات و ئەوەی جێگیری کردووە بیسڕێتەوە، ئەوەی ڕەهایە سنوورداری بکات و ئەوەی سنووردارە ڕەهای بکات.

ئەمە بریتییە لە راوبۆچوون و كێشانە و پێوانە كە تەواوی پێشین كۆدەنگییان هەیە لەسەر زەمكردنی و هۆشداری لەسەری و هاوار و بانگ لەوانەی لەسەر زەوی بەو كارە هەڵدەستن و ئاگاداركردنەوەی خەڵكی و داوای دووركەوتنەوە لێیان.

لەوانە: بەرهەڵستی حەقیقەتی باوەڕ و شەرع دەكات بە زەوق و خەیاڵات، هەروەها بە كەشفی باتڵی شەیتانی كە دینێك تەشریع دەكات خودا مۆڵەتی پێنەداوە و بڕیاری لەسەر نەداوە و بەتاڵكردنەوەی ئەو ئایینەی لەسەر زمانی پێغەمبەرەكەی تەشریعكراوە و لادانی حەقیقەتی ئیمان بە فێڵ و فریودانی شەیتان.

ئەوانە لەناو حەز و ئارەزوودان و كردوویانە بە ئایین و بەسەر شەرع و ئایینی خودادا پێشیان خستووە، دڵانیان پێ وێران كردووە و ڕێگەی بەرەو خودا چوونیان لێ گرتوون، لە ماقووڵی ئەوانە و بیر و ڕا و كێشانە و پێوانەی پووچ و بێبنەمایان و زەوقی ئەمانەی تر وێرانكردنی دونیا و تێكدانی بوون و رووخانی پایەكانی ئایین لەدایك بووە، كار گەیشتە تەنگەژە و قەیران و خەریك بوو ئایینەكە تیاببەن گەر خودای موتەعال كەسانێكی دەستەبەر نەكردبایە ئایینەكە بپارێزن و مەشخەڵەكانی رۆشن بكەنەوە و لە فێڵ و پیلانی خاوەن پیلانەكان بیپارێزن.

لەوانە: ئەهلی بەرهەڵستی كردن بە سیاسەتگەلێكی ستەمكارانە: ئەوەش خاوەن ویلایەتەكان پێی هەستاون و بڕیارەكانی خۆیان خستۆتە پێش حوكمی خودا و پێغەمبەرەوە، بەو بڕیارانەی خۆیان حوكمی بەندەكانی خودا دەكەن، بەو كارەشیان شەرع و دادپەروەری و سنووری خودایان پەكخستووە.

ئەوانەی یەكەم دەڵێن: ئەگەر ئەقڵ و نقڵ پێچەوانەی یەكتر بوون كار بە ئەقڵ دەكەین.

ئەوانەی تر دەڵێن: ئەگەر ریوایەت و قیاس پێچەوانە بوون كار بە قیاس دەكەین.

خاوەنانی زەوق و كەشفیش دەڵێن: گەر زەوق و كەشف و رووالەتی شەرع پێچەوانەی یەكتر بوون كار بە زەوق و كەشف دەكەین.

خاوەن دەسەڵات و سیاسەتیش دەڵێن: گەر سیاسە و شەرع پێچەوانە بوون سیاسە پێش دەخەین.

هەر دەستەیەك لەوانە بەرانبەر شەرع و ئایینی خودا وەستاون، ئەوانە تاغوتن و حوکمداری دەکەن.

**ئەوانە دەڵێن:** نقل(ریوایات) بۆ ئێوە و ئەقڵیش بۆ ئێمە، هەندێکی تریان دەڵێن: ئێوە خاوەن ئاسەوار و ئیخبارن و ئێمەش خاوەنی کێشانە و پێوانە و بیر و بۆچوونین، دەستەیەکی تر دەڵێن: ئێوە خاوەنی رووالەتن و ئێمەش ئەهلی حەقیقەت، ئەوانی تریش دەڵێن: شەرع بۆ ئێوە و سیاسەت بۆ ئێمە، چ بەلایەك هەموو لایەکی گرتۆتەوە و کوێری کردوون! شتێکی بێبەها هەڵدرا و کەڕی کردن، فیتنەیەك دلانی بانگ کرد و هەرچی دڵی نەخۆش و تووشبووە بە فیتنە وەلامیان دایەوە، گەردەلوولێك هەڵیکرد و بەهۆیەوە گوێکان کەڕبوون، و چاوەکان کوێربوون، و مەشخەڵی ئەحکامی شەرعی پێ کپ کرایەوە، هەر بەو جۆرە نەرێی سیفاتی خودای موتەعال کرا و هەر دەستەیەك خۆیان دایە پاڵ ستەم و تاریکی بیروبۆچوونەکانیان، لەنێوان خودا و بەندەکانیدا حوکم دەردەکەن بە قسە و گوفتاری تێکدەرانەیان و حەز و ئارەزووی سەرلێشێواویان، بەو هۆیەوە وەحی رووبەرووی تەحریف و تەئویلی ناپەسەند بووەتەوە، ئایین کراوە بە ئامرازی تێکدان و گۆڕین.

**جۆری سێیەم:** بەرهەڵستکاری کارەکانی خودا و قەزا و قەدەری خودا، ئەمەش بریتییە لە بەرهەڵستکاری نەزانان، ئەو بەرهەڵستکردنەش لەنێوان ئاشکرا و شاراوەدایە، ئەمەش جۆرەکانی نایەنە هەژماردن.

بەناو دەروونیدا جاری دەبن وەك جاریبوونی تا بە جەستەی تاداردا، گەر بەندە لە قسە و ئاوات و ویست و حاڵی خۆی وردببێتەوە لە دڵیدا ئەو بەرهەڵستکارییە بە روونی دەبینێتەوە، هەرچی نەفسە بەرهەڵستکارە بۆ قەدەر و بەش و کاری خودا جگە لە نەفسێك کە لەلای خودا ئارام بووەتەوە و بە حەق ناسیویەتی، ناسینێك کە پێویستە مرۆڤ بیگاتێ، ئەوەش بەشی ئەوە لە خۆڕادەست کردن و ملکەچی و بە تەواوی رازیبوون بە بەشی خودا.

❁ ❁ ❁

# (٢٢) (منزلة تعظيم الحرمات)

## مەنزيلەی بە مەزنڕاگرتنی سنوور و دروشمەكانی خودا

لە مەنزيلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزيلەی بە مەزنڕاگرتنی سنوور و دروشمەكانی خودايە.

خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَمَن يُعَظِّمْ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ﴾ الحج: ٣٠، دەستەيەك لە تەفسيركەرانی قورئان دەفەرموون: "حرمات الله" لێرەدا مانای ئەو شتانەی هەيە كە ئەنجامدانيان خودا تووڕە دەكات، واتە ئەو شتانەی نەهی لێكردوون، "تعظيمها"–بە مەزن زانينيان بريتييە لە وازهێنان لە تێكەڵبوون بەو حەرامكراوانە.

**"الليث" دەفەرموێت:** "حرمات الله" ئەوەيە كە ڕەوا نييە سنووربەزێنی و پێشێلكاری بۆ بكەيت.

**هەندێك دەڵێن:** "الحرمات" بريتييە لە بكە و مەكە (الأمر والنهي)

**زجاج دەڵێت:** "الحرمة" ئەوەيە ئەنجامدانی واجب بێت و وازلێهێنانی حەرام بێت.

**هەندێك دەڵێن:** "الحرمات" لەم ئايەتەدا مانای ڕێورەسم (المناسك)ی هەيە، هەروەها دروشمەكانی حەج لەڕووی كات و شوێنەوە.

**ڕاستەكەی:** "الحرمات" هەموو ئەوانە دەگرێتە خۆ، وشەكە كۆی وشەی "حرمة"يە ئەو شتانە دەگرێتەوە كە پێويستە ڕێزييان لێ بگيرێت و پارێزگارييان لێ بكرێت: لە ماف و كەس و كات و شوێن، بۆيە "تعظيمها"–بەرز و مەزن ڕاگرتنيان بريتييە لە: پێدانی مافيان و پارێزگاری كردن لێيان و دەرچوون لە ناڕەحەتی سەرپێچی و بوێری هەنگاونان بۆ سەريان و بە مەزن تەماشا كردنی ئەمر و نەهی لە ترسی سزا و داوای پاداشت.

لەمەدا بەڵگە دەهێنينەوە بە حاڵی پێغەمبەران و صديقين و دوعا و داوايان، هەروەها ترسيان لە ئاگر و ڕجايان بۆ بەدەستهێنانی بەهەشت، وەك چۆن خودای موتەعال دەربارەی بەندە تايبەتەكانی خۆی كە هاوەڵدانەران دەيانپەرستن دەفەرموێت ﴿وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ﴾ الإسراء: ٥٧، دەربارەی پێغەمبەران ديسان

دەفـــــــەرموێت ﴿ وَزَكَرِيَّآ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرْنِى فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٨٩﴾ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ وَوَهَبْنَا لَهُۥ يَحْيَىٰ وَأَصْلَحْنَا لَهُۥ زَوْجَهُۥٓ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا ۖ وَكَانُوا۟ لَنَا خَٰشِعِينَ ﴿٩٠﴾ ﴾ الأنبياء: ٨٩ – ٩٠، واتـە: ڕەغبەتيان بۆ ئەو شتە هەيە لەلای ئێمە و ترسيان لـە سـزا هەيـە، لـەلای شـرۆڤەكارانی قورئان بەگشتی جێناوەكە لـە وشـەی "إنهـم"دا بـۆ ئـەو پێغەمبەرانـە دەگەڕێتـەوە كـە ناويان هێنراوە لەم سوورەتەدا.

هـەر بـەو جـۆرە ئـەوەی لـە سـەرەتای چـيرۆكی ئيبراهيمدايـە ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ ﴿٥١﴾ ﴾ الأنبياء: ٥١، لە باسكردنی بەڵای پێغەمبـەران و ئـەوەی ئابلۆقـەی داون لە ناخۆشی و ڕزگاركردنيان لەلايەن خوداوە بە دوعا و پاڕانەوە و پـەناگرتن بـە خـودا بە حەز و ترسەوە.

"الرغب و الرهب" لەلای سەرجەم پێغەمبەران بريتييـە لـە ڕجـای بـەزەيی و تـرس لـە ئاگر.

خودا –سبحانە– باسی دەستەيەك لە بەندەكانی دەكات كە بەندەی تايبەتی خودان و بە باشترين كردەوەيان مەدح و سەنايان دەكات، لەوانە: پەناگرتنيان لە ئاگر، دەفـەرموێت ﴿ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ ۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٦٦﴾ ﴾ الفرقـان: ٦٥ – ٦٦، دەربارەيـان هەواڵيـداوە: ئەوانـە بـاوەڕی خۆيان كرد بە وەسيلە بۆ لای خودا تاكو لە ئـاگر بـەدووريان بگرێـت، خـودای موتـەعال دەفـــــەرموێت﴿ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٦﴾ ﴾آل عمران: ١٦، مەزنترين وەسيلەيان بۆ لای خودا بـريتی بـوو لـە وەسـيلەی بـاوەڕ تـاكو ڕزگاريان ببێت لە دۆزەخ.

هەروەها خودای موتەعال هەواڵيداوە دەربارەی سەردارانی عاريفان و خاوەن هـۆش و ژيرييەكان: ئەوانە داوای بەهەشتيان لـە خـودا دەكـرد و پـەنايان لـە دۆزەخ بـە خـودا دەگرت، خودای موتـەعال دەفـەرموێت﴿ إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا

يُنَادِى لِلْإِيمَـٰنِ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ۚ رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ
ٱلْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۗ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾
فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّى لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَـٰمِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ ۖ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ ۖ فَٱلَّذِينَ
هَاجَرُوا۟ وَأُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِمْ وَأُوذُوا۟ فِى سَبِيلِى وَقَـٰتَلُوا۟ وَقُتِلُوا۟ لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ
وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ ثَوَابًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلثَّوَابِ ﴿١٩٥﴾ ﴾
آل عمران: ١٩٠ — ١٩٥، جیاوازی لەوەدا نییە بەڵێندراوەکە لەسەر زمانی پێغەمبەران بریتییە لەو بەهەشتەی کە داوایان دەکرد.

دەربارەی ئیبراهیم خەلیلی خودا دەفەرموێت ﴿ وَٱلَّذِىٓ أَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لِى خَطِيٓـَٔتِى يَوْمَ
ٱلدِّينِ ﴿٨٢﴾ رَبِّ هَبْ لِى حُكْمًا وَأَلْحِقْنِى بِٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٨٣﴾ وَٱجْعَل لِّى لِسَانَ صِدْقٍ فِى
ٱلْـَٔاخِرِينَ ﴿٨٤﴾ وَٱجْعَلْنِى مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨٥﴾ وَٱغْفِرْ لِأَبِىٓ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٨٦﴾ وَلَا تُخْزِنِى يَوْمَ
يُبْعَثُونَ ﴿٨٧﴾ يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾ ﴾ الشعراء: ٨٢ — ٨٩، داوای بەهەشتی لە خودا کرد و پەنای بە خودا گرت لە ئاگر کە بریتییە لە سەرشۆڕی ڕۆژی زیندووبوونەوە.

خودا —سبحانه— هەواڵمان دەربارەی بەهەشت پێدەدا: کە بەڵێنێکی داواکراوە ﴿ وَعْدًا مَّسْـُٔولًا ﴿١٦﴾ ﴾ الفرقان: ١٦، واتە بەندەکان و دۆستەکانی خودا داوای دەکەن.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی بە ئومەتەکەی کردووە: کە لە کاتی گیرابوونی دوعا و دوای هەر بانگێکدا داوای بەرزترین مەنزیلەی لە بەهەشت لەلای خودا بۆ بکەن، و رایدەگەیەنێت: هەر کەس داوای ئەوەی بۆ بکات ((حلت عليه شفاعته)) شفاعەتی پێغەمبەر لەلای خودا دەیگرێتەوە.

"سليم الأنصاري" فەرمووی بە پێغەمبەر(ﷺ) ((من داوای بەهەشت لە خودا دەکەم و پەنای پێدەگرم لە ئاگر، ئیتر من ورتە ورتی تۆ و مەعاز نازانم، پێغەمبەر فەرمووی: من و مەعاز بەدەوری ئەوەدا ورتە ورت دەکەین))

لە فەرموودەی سەحیحدا لە فەرموودەی فریشتە گەڕۆکە بەڕێزەکاندا کەکردەوەی مرۆڤەکان دەنووسنەوە ((خودای موتەعال پرسیاری بەندەکانیان لێ دەکات —ئەو خۆی زاناترە— —تبارك وتعالى— ئەوانیش دەڵێن: لەلای هەندێ لە بەندەکانتەوە هاتووین کە "يهللونك (لا إله إلا الله)، ويكبرونك (الله أكبر) ويحمدونك (الحمد لله)،

ويسبحونك ويمجدونك (سبحان الله)، خـوداى موتـەعال دەفـەموێت: ئايـا ئـەوان منيـان بينيـوە؟ دەڵـێن: نـەخێر، ئـەى پـەروەردگار، نـەيانبينيويت، خـودا –عزوجـل– دەفەرموێت: چۆن دەبوون گەر منيان ببينيبايە؟ دەڵێن: گەر تۆيان ببينيبايە زياتر و زۆرتر شكۆ و مەزنييان دەدايە پاڵت، وتيان: ئەى پەروەردگار، داواى بەهەشتى تۆيان دەكرد، دەفەرموێت: ئايا بينيويانە؟ دەڵێن: نەخێر، بە عيززەتـى تـۆ نـەيان بينيـوە، دەفەرموێت: چۆن دەبوون گەر بەهەشتيان ببينيبايە؟ دەڵێن: گەر بيانبينيبا زۆرتـر و زيـاتر داوايـان دەكـرد، وتيـان: پـەنايان پێـدەگرتى لـە ئـاگر، خـودا –عزوجـل– دەفـەرموێت: ئايـا بينيويانـە؟ دەڵـێن: نـەخێر، بـە عيززەتـى تـۆ نـەيانبينيوە، دەفەرموێت: چۆن دەبوون گـەر ئاگريـان ببينيبايـە؟ دەڵێن: گـەر ئاگريـان ببينيبايـە زۆرتر و زياتر لێى هەڵدەهاتن، خودا دەفەرموێت: من ئێوە بە شـايەت دەگـرم كـە لـە ئەوان خۆشبووم، ئەوەى داواى دەكەن پێيان دەبەخشم و ئەوەى پەناى لێدەگرن بـە من پەنايان دەدەم لێى"))

قورئـان و سـوننەت پـڕن لـە مـەدح و سـەناى بەنـدە و دۆسـتەكانى خـودا بـە داواى بەهەشت و رجاى بەدەستهێنانى و پەناگرتن لە ئاگر و ترسى تێكەوتنى.

پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵانى فـەرموو ((پـەنا بـە خـودا بگـرن لـە ئـاگر))، بـەو كەسـەى فـەرموو كـە داواى هـاوەڵى پێغەمبـەرى كـرد لـە بەهەشـتدا ((يارمـەتيم بـدە لەسـەر دەروونت بە بردنى سوژدەى زۆر)).

كـاركردن بـۆ داواى بەهەشـت و رزگـاربوون لـە ئـاگر مەبەسـتى پێغەمبـەر بـووە لـە ئومەتەكەى، بۆئەوەى هەميشە لە يادیان بێت و لەبيرى نەكەن، چونكە باوەڕبوون بەو دووانە مەرجى رزگارييە، كاركردن بۆ بەدەستهێنانى بەهەشت و رزگاربوون لـە دۆزەخ تەنها بە باوەڕ ئەنجام دەدرێت.

پێغەمبەر هـاوەڵان و ئومەتەكـەى هانـداوە بـۆ بەهەشـت و بۆيـانى وەسـف كـردووە و رۆشنى كردۆتەوە تاكو بيخوازن، فەرموويەتى ((كەسـێك هەيـە خـۆى يەكلاكردبێتـەوە بـۆ بەدەسـتهێنانى بەهەشـت؟ سـوێند بـە خـوداى كەعبـە بەهەشـت نوورێكـە دەدرەوشێتەوە، رێحانەيەكە دەشەكێتەوە، هاوسەرى جوان و خۆشڕەفتار، و ميـوەى گەيوو، و كۆشكى بەرز و بينـاكراو، و رووبـارى راكشـاو –تـا كۆتـايى فەرموودەكـە–،

هاوەڵێك فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئێمە خۆمان بۆ ئامادە كردووە و بۆی یەكلابووینەتەوە، فەرمووی: بڵێن: إن شاء الله))

گەر ئەوەی لە سوننەدا هاتووە باس بكەین لە فەرموودە ((هەر كەس ئەوە و ئەوە بكات خودا دەیباتە بەهەشتەوە)) باسەكەمان درێژە دەكێشێت، ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر فەرموویەتی هانی ئومەت دەدەن كار بكەن بۆ بەهەشت و مەبەست لە كارەكانیان بەدەستهێنانی بەهەشت بێت.

پێغەمبەر هانمان دەدات و دەفەرموێت ((هەر كەس ئەوە بكات هەشت دەرگای بەهەشتی بۆ دەكرێتەوە))، ((هەر كەس بڵێ "سبحان الله" دارخورمایەكی لە بەهەشتدا بۆ دەنێژرێت))، ((هەر كەس موسڵمانێكی بێ جلوبەرگ پۆشتە بكاتەوە خودا لە پۆشاك و خشڵەكانی بەهەشت پۆشتەی دەكاتەوە))، ((ئەو كەسەی سەردانی نەخۆش دەكات لەناو میوەی بەهەشتدایە)) فەرموودەی زۆر لەم شێوانە هەیە.

هەروەها خودا-سبحانە- پێیخۆشە بەندەكانی داوای بەهەشتی لێ بكەن و پەنای پێ بگرن لە ئاگر، ئەو پێیخۆشە داوای لێبكرێت، هەر كەس داوای لێ نەكات خودا لێی توورە دەبێت، مەزنترین شتێك لە خودا داوا بكرێت بریتییە لە بەهەشت، مەزنترین شتێك مرۆڤ لە خودا پەنای پێ بگرێت بریتییە لە ئاگر.

كاركردن بۆ داوای بەهەشت لای خودا خۆشەویستە و پێی رازییە، بەڵكو داوای بەهەشت بەندایەتی كردنی خودایە، هەستان بە هەموو بەندایەتی لەپێشترە لە پەكخستنی هەندێكی.

گەر دڵ خاڵی بوو لە لاكردنەوە بەلای بەهەشت و ئاگردا، رجای بەهەشت و هەڵهاتن لە ئاگر، لێبڕانەكانی خاودەبنەوە، سووربوونی لاوازی رووی تێدەكات و هەوڵدان بۆی سست دەبێت، هەتا زۆرتر داوای بەهەشت بكات و زیاتر كاری بۆ بكات هاندان بۆی بەهێزتر دەبێت و سووربوون تونتر دەبێت و هەوڵدان تەواوتر، ئەمە كارێكی ئاشكرایە بە ئەزموون و چێژ با شەرعیش داوای نەكردبێت.

كە وەسفی بەهەشتی كرد بۆ بەندەكانی و بۆیانی خستەڕوو و ئەوەندەی ژیرییان دەیگاتێ هەواڵی وردەكارییەكانی بەهەشتی بەیان كرد، شتەكانی تریش بە گشتی هەواڵیان پێدراوە، هەموو ئەمانە تاكو بۆ بەهەشت تامەزرۆیان بكات و هانیان بدات بۆ كۆشش و كاركردن.

خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَٱللَّهُ يَدۡعُوٓاْ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ﴾ یونس: ٢٥، ئەمە هاندانە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو بانگە و ڕۆیشتن بە دەمیەوە و پەلەکردن بۆ وەڵامدانەوە.

پاشان شاراوە نییە کە بەهەشت ناوێك نییە تەنها بۆ درەخت و میوە و خواردن و خواردنەوە و حۆرلعەین و ڕووبار و کۆشك، زۆرینەی خەڵکی لە ناوەڕۆکی بەهەشتدا هەڵە دەکەن، بەهەشت ناوێکە بۆ خانەی نیعمەتی ڕەهای کامڵ، لە مەزنترین نیعمەتەکانی بەهەشت: خۆشی وەرگرتن بە سەیر کردنی ڕووی جوانی خودای موتەعال و گوێگرتن لە کەلامی و ڕۆشنبوونەوەی چاو بە نزیکی لە خودا و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو، هیچ بەراوردێك لە نێوان چێژی خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و دیمەندا نییە لەگەڵ چێژی بینینی ڕووی جوانی خودای موتەعال، کەمێکی کەم لە ڕەزامەندی خودا مەزنترە لە باخچە و خۆشییەکانی بەهەشت، وەك خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَرِضۡوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِ أَكۡبَرُ﴾ التوبة: ٧٢، لە شێوازی ئەرێدا ئەرێ دەکات و دەفەرموێت "چ شتێك لە ڕەزامەندی خودا بۆ بەندەکەی مەزنترە، ئەو ڕەزامەندییە لە بەهەشت گەورەترە"

قليل منك يقنعني ولكن قليلك لا يقال له قليل

(کەمێکی تۆ ڕازیم دەکات، بەڵام بە کەمی تۆ ناوترێت کەم)

لە فەرموودەیەکی سەحیحدا –فەرموودەی بینینی خودا– ((سوێند بە خودا شتێکی پێنەداون لایان خۆشەویستتر و شیرینتر بێت لە سەیرکردنی ڕووی خۆی))

گومانی تێدا نییە ئەو کارە دەبێت وابێت، مەزنترە لەوەی مرۆڤ بیری لێ بکاتەوە و بە خەیاڵیدا گوزەر بکات، بە تایبەت خەڵاتی خۆشەویستان لەوێ بە ژیان لەگەڵ خۆشەویستیدا، مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسەیە خۆشی دەوێت، تایبەت کردنەوە لەم حوکمەدا نییە، بەڵکو جێگیرکراوە لەڕووی دیار و نادیارەوە.

چ نیعمەت و چ چێژێك و چ چاو ڕۆشنبوونەوەیەك و چ سەرکەوتنێك بە قەدەر ئەو نیعمەتە و چێژی ئەو نیعمەتە و ڕۆشنبوونەوەی چاو بەو نیعمەتە مەزنترە(واتە بینینی خودا)؟

ئایا لەسەرو نیعمەتی رۆشنبوونەوەی چاو بە ژیان لەگەڵ خۆشەویست –کە هیچ شتێك لەوە مەزنتر و کامڵتر و جوانتر نییە– رۆشنبوونەوەیەکی تر بۆ چاو بوون هەیە؟

ئەمە –سوێن بە خودا– ئەو مەشخەڵەیە کە خۆشەویستان روویان تێکردووە و خۆیان بۆ یەکلا کردۆتەوە، ئەو قافڵەیە کە عاریفان سەرقافڵەیی دەکەن، ئەوە بریتییە لە رۆحێك کە ناوی لێنراوە بەهەشت و ژیانی بەهەشت، بەوەوە بەهەشت خۆش و راوەستاوە.

هەر بەو جۆرە ئاگر –خودا پەنامان بدات لێی– بۆ ئەهلی دۆزەخ نەبینینی خودا و پەردە کەوتنە نێوان ئەوان و خوداوە و خەشم و تووڕەیی خودا لەسەر ئەوان و دوورکەوتنەوەیان لە ئەو زۆر کاریگەرترە لە سزای ئاگر بۆ جەستە و رۆحیان، بەڵکو گڕتێبەربوونی دڵیانە بەو بڵێسەیە گڕی لە جەستەیان بەرداوە، لە دڵەوە کڵپەکە سەری کردووە بۆ جەستەیان.

داوای پێغەمبەران و صدیقین و شوهەدا و صالحین بریتییە لە بەهەشت و هەڵهاتنیان لەو ئاگرە.

باشترین بەندەی خودا ئەوانەن خودا و پاداشتی خودایان دەوێت، ئەوانە خەڵکە تایبەتەکەی خودان، دەفەرموێت ﴿ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَـٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾ ﴾ الأحزاب: ٢٩، ئەمە گوتاری خودایە بۆ باشترین ئافرەتانی جیهان، هاوسەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَمَنْ أَرَادَ ٱلْـَٔاخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴿١٩﴾ ﴾ الإسراء: ١٩، هەواڵیداوە کە هەوڵی مەشکوور هەوڵی کەسێکە کە دوارۆژی دەوێت، هەروەها راشکاوانەتر لەوە گوتاری خودا روو بە دۆستانی تایبەتی خۆی (هاوەڵانی پێغەمبەرەکەی) –خوایان لێ رازی بێت– لە رۆژی ئوحددا ﴿ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ﴾ آل عمران: ١٥٢، دابەشی کردن بۆ دوو بەش کە سێیەمی نییە.

هەڵەی کردووە ئەو کەسەی وتی: ئەی ئەوانە لە کوێن کە خودایان دەویست؟ ویستنی دوارۆژ بریتییە لە ویستنی خودا و پاداشتی خودا، داوای پاداشت نەرێی ویستنی خودا ناکات.

### ۞ لەسەر مەشخەڵی سوننە..........بەبێ تەئویل

لوتكەی بە مەزن زانینی سنوور و دروشمەكانی خودا بریتییە لە: تێپەڕاندنی ئەو هەواڵانەی خودا رایگەیاندوون وەكو خۆی و لەسەر رووالەتی خۆی كە بریتییە لە مانەوەی نیشانەكەی یەكتاپەرستی هەواڵپێدراو لەسەر شێوە و رووالەتی تایبەت بە خۆیان، زۆر لەخۆكردنی تیانەبێت لە رووی تەئویلەوە و رووالەت تێنەپەڕێنێت لە رووی نواندنەوە.

پارێزگاری سنووری دەقەكانی ناو و سیفەتەكان: بە تێپەڕاندنی هەواڵەكانیان لەسەر شێوازی رووالەتی خۆیان، وەك "مالك" -رەحمەتی خودای لێ بێت- دەفەرموێت، كاتێك پرسیاری ئایەتی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ﴾ی لێكرا، چۆن خودا ئیستیوای كردووە؟ مالك ماوەیەك بێدەنگ بوو، ئارەقێكی زۆری كردەوە، پاشان فەرمووی (الإستواء معلوم، والكيف غير معقول، والإيمان به واجب، والسؤال عنه بدعة)

جیاوازی كرد لە نێوان مانای ئاشكرای ئەو وشەیە و چۆنێتی ماناكەی كە مرۆڤ ناتوانێت بیزنەوێت، ئەم وەڵامە لە "مالك"ەوە -خوا لێی رازی بێت- شفایە و گشتییە بۆ هەرچی بابەتی سیفاتە.

هەر كەس پرسیار بكات لە ئایەتی ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَآ أَسۡمَعُ وَأَرَىٰ ۝٤٦﴾ طه: ٤٦، چۆن دەبیستێ و دەبینێ؟ بە هەمان وەڵامی "مالك" وەڵامی بدەرەوە، پێیوترا: بیستن و بینین ئاشكرایە، چۆنێتییەكەی ژێری مرۆڤ نایگاتێ.

هەر بەو جۆرە ئەوانەی پرسیار دەكەن لە زانستی خودا و زیندەگی و قودرەت و ویست و دابەزین و تووڕەبوون و رازیبوون و بەزەیی و پێكەنین و سیفاتی تری لەم شێوەیە، مانا ئاشكراكانیان دیارە، بەڵام چۆنێتی ئەو مانایانە نازنەورێن، چونكە تێگەیشتن لە چۆنێتی پەیوەندی بە زانین و ناسینی زات و حەقیقەتی خودای موتەعالەوە هەیە، گەر زانینی ئەو زاتە بۆ مرۆڤ مەحاڵ بێت ئیتر چۆن دەتوانرێت لە چۆنێتی سیفەتەكانی تێبگەین؟

خۆپارێزی بەسوود لەم دەروازەیە: ئەوەیە كە وەسفی خودا بكرێت بەوەی خۆی و پێغەمبەرەكەی(ﷺ) وەسفیان پێكردووە، بەبێ لادان و پەكخستن و چۆنێتی و نموونانـدن(تمثيل)، بەڵكو ناو و سیفەتی بۆ جێگیر بكرێت و نەرێی شێوەی

دروستكراوەكانی لێ بكرێت، ئەو كاتە جێگیركردنەكەت لە چوواندن(تشبيه) پاكدەبێتەوە، و نەرێكردنەكەش لە پەككخستن(تعطيل)ی ناو و سیفەتەكان خاوێن دەبێتەوە، هەر كەس نەرێی حەقیقەتی "الإستواء" بكات ئەوا ئەو كەسە پەككخەر (المعطل)ە، هەر كەسیش چواندوویەتی بە دەستبەسەرداگرتنی دروستكراوێك بەسەر دروستكراوێكی تردا ئەوە نموونەی خودای بە مەخلوق هێناوەتەوە، هەر كەسیش بڵێت (إستواء ليس كمثله شيء– دەست بەسەردا گرتنێك كە هیچ شتێك لەو ناچێت) ئەوە كەسێكی یەكتاپەرستی خودا بەپاكڕاگرە.

هەر بەو جۆرە قسە لە بیستن و بینین و زیندەگی و ویست و توانین و دەست و روو و رازیبوون و تورەبوون و دابەزین و پێكەنین و تەواوی ئەوەی خودا وەسفی خۆی پێكردووە.

مەبەست بە تەئویلی نەهیلێكراو لێرەدا: بریتییە لە تەئویلی زاراوەیی كە بریتییە لە لادانی وشەكە لە مانا دیار و بەرچاوەكەی، هەروەها لادان لە مانای تا قورس(الراجح) بۆ مانای تا سووك(المرجوح).

زیاتر لە كەسێك لە زانایان باسی ئەوەیان كردووە: كە پێشین كۆدەنگیان هەیە لەسەر وازهێنان لەو جۆرە تەئویلە، لەوانەی باسیان كردووە "البغوي" و "أبو المعالي الجويني" لە ریسلەكەیدا بەناوی "النظامية" بە پێچەوانەی ئەو رێچكەیەی گرتوویەتە بەر لە "شامله" و "إرشاده"، هەروەها لەوانەی باسیان كردووە "سعد بن علي الزنجاني".

پێش ئەوانەش زۆرێك لە زانایان كە تەنها خودا ژمارەیان دەزانێت.

لە باسكردنی تێنەپەڕاندنی مانای رووالەتی وشەكە بە نموونادن ئاماژەیەكی ورد هەیە: ئەوەش ئەوەیە كە رووالەت و دەركەوتەی وشەكە داوای نواندن ناكات وەك پەككخەران و نەرێكەرانی سیفات گومان دەبەن، نموونادن تێپەڕاندنی رووالەتە لە رێگەی نموونادنەوە، هەروەها تەئویل قبوول ناكات، بەڵكو وەرگرتنی رووالەت و مانای دەرەكی وشەكە بەبێ تەئویل و نموونادن، ئەمە رێگەی دروستی سالیكانە كە راستترین و دروستترین رێگەیە.

❁ ❁ ❁

## (٢٣) (منزلة الإخلاص)

# مەنزیلەی ئیخلاص

لە مەنزیلەکانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی ئیخلاصە.

خـودای موتـەعال دەفـەرموێت ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾ البينـة: ٥، هەروەها دەفـەرموێت ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ۝٢ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُ ﴾ الزمر: ٢ – ٣، هەروەها بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێت ﴿ قُلِ ٱللَّهَ أَعۡبُدُ مُخۡلِصٗا لَّهُۥ دِينِي ۝١٤ فَٱعۡبُدُواْ مَا شِئۡتُم مِّن دُونِهِۦۗ قُلۡ إِنَّ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَأَهۡلِيهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ۝١٥ ﴾ الزمر: ١٤ – ١٥، هەروەها پێـی دەفـەرموێت ﴿ قُلۡ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحۡيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝١٦٢ لَا شَرِيكَ لَهُۥۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرۡتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ۝١٦٣ ﴾ الأنعـام: ١٦٢ – ١٦٣، هـەروەها دەفـەرموێت ﴿ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗا ﴾ الملـك: ٢، فـەزڵی کـوڕی عیـاض دەفـەرموێت "أحسـن عمـلا" بریتییە لە "أخلصه وأصوبه"، وتیان باوکی عـەلی "أخلصه وأصوبه" چییە؟ فـەرمووی: کار گەر خالص بێت و "صواب" نـەبێت وەرناگیرێـت، گـەر "صـواب" بێـت و خـالص نەبێت وەرناگیرێت، هەتا کارەکە خالص و صواب بێت ئـەوجا وەردەگیرێـت، خـالص: ئەوەیە بۆ خودا ئەنجام بدرێت، صـواب: ئەوەیـە لەسـەر سـوننەی پێغەمبـەر ئـەنجام بدرێت، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ فَمَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلۡيَعۡمَلۡ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَلَا يُشۡرِكۡ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا ۝١١٠ ﴾ الکهـف: ١١٠، هـەروەها خـودای موتـەعال دەفـەرموێت ﴿ وَمَنۡ أَحۡسَنُ دِينٗا مِّمَّنۡ أَسۡلَمَ وَجۡهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ ﴾ النســاء: ١٢٥، "إســلام الوجـــه"– تەسلیمبوونی ڕوو: بریتییـە لـە ئیخلاصـی مەبەسـت و کـردار بـۆ خـودای موتـەعال. "الإحسـان فيـه"–ئیحسـان لـە کـاروکردەوەدا: بریتییـە لـە شـوێنکەوتنی پێغەمبـەر و سـوننەتەکانی، هـەروەها دەفـەرموێت ﴿ وَقَدِمۡنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنۡ عَمَلٖ فَجَعَلۡنَٰهُ هَبَآءٗ مَّنثُورًا ۝٢٣ ﴾ الفرقان: ٢٣، ئـەو کاروکردەوانەیـە لەسـەر سـوننەتی پێغەمبـەر ئـەنجام نەدراون، یاخود لە ئەنجامدانیاندا مەبەستیان خودای موتەعال نەبووە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بە سەعدی کوڕی ئەبی وقاص –خوای لێ ڕازی بێت– ((**إنك لن تخلف فتعمل**

**عملا تبتغي به وجه الله إلا ازددت به خيرا، ودرجة ورفعة** – تۆ شتێك بەجێبهێڵیت بۆ ئەوانەی دوای خۆت مەبەستت پێی ڕووی خودای موتەعال بێت بەو كارە خێرت زیاد دەبێت و پلە و بەرزیت زیاد دەكات))

لە فەرموودەی سەحیحدا لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە –خوای لێ ڕازی بێت– فەرمووی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ((**ثلاث لا يغل عليهن قلب مسلم: إخلاص العمل لله، ومناصحة ولاة الأمر، ولزوم جماعة المسلمين، فإن دعوتهم تحيط من ورائهم**))، واتە ناپاكی لەگەڵ نامێنێت، و لەگەڵ ئەو سیانە ناپاكی هەڵناگرێت، بەڵكو نەڕێی ناپاكی لێ دەكات و پاكیدەكاتەوە لە ناپاكی و لێی جیادەبێتەوە، دڵ تووشی ناپاكی دەبێت لەسەر هاوەڵدانان بە خراپترین ناپاكی، هەر بەو جۆرەی كە لەسەر غەش دروست دەبێت، هەروەها لەسەر دەرچوونی لە كۆمەڵی موسلمانان بە بیدعە و گومڕایی، ئەم سیانە پڕی دەكەن لە ناپاكی و تێكەڵی، دەوای ئەم ناپاكییە و دەركردنی خەوش بە پاككردنەوەی ئیخلاص و ئامۆژگاری و گوێڕایەڵی كۆمەڵی موسڵمان و شوێنكەوتنی پێغەمبەر دەبێت.

((پرسیاركرا لە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی پیاوێك كە بۆ ڕیا دەجەنگێت، دەجەنگێ بۆ ئەوەی پێی بوترێت ئازا، دەجەنگێت لەسەر جۆش و دەمارگیری نەفامی، كامیان لە پێناوی خودادایە؟ فەرمووی: هەر كەس بجەنگێت بۆ ئەوەی كەلیمەی خودا بەرز و بڵند بێت ئەوە بۆ خودا و لە ڕێگەی خودایە))

پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی دەربارەی ئەو یەكەمین سێ كەسە داوە كە ئاگر جۆشیان دەدات و دەیانسوتێنێت: خوێنەری قورئان، و موجاهید، و كەسێكی صەدەقەكار بە ماڵ و دارایییەكەی، ئەوانەی ئەو كارانەیان ئەنجام دا بۆ ئەوەی پێیان بوترێت: فڵان خوێنەری قورئانە، فڵان كەسێكی ئازایە، فڵان خێرخوازە، كارەكانیان لە پێناوی خودادا نەبووە.

لە فەرموودەیەكی سەحیحی قودسیدا خودای موتەعال دەفەرموێت: ((من بێنیازترین كەسم لە هاوەڵ، هەر كەسێك كارێكی ئەنجام بدا و بەشی كەسێكی تری تێدابوو، ئەوە بۆ ئەو كەسەی ئەنجام داوە و من لێی بەریم))

هەروەها لە فەرموودەیەكی تری سەحیحدا لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ((خودا تەماشای جەستە و وێنە و ڕوواڵەتتان ناكات، بەڵكو تەماشای دڵتان دەكات))، خودای موتەعال دەفەرموێت﴿ لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ ﴾الحج: ٣٧.

دەربڕینی ئەهلی ئەم ڕێگەیە دەربارەی "ئیخلاص" و"صدق" جۆراوجۆرە و مەبەستیان یەك مەبەستە.

**وتراوە:** ئیخلاص بریتییە لە تەنها کردنەوەی خودا-**سبحانه**- بە مەبەست و گوێڕایەڵی.

**هەروەها وتراوە:** پاڵفتەکردنی کار لە سەرنجدانی دروستکراوەکان.

**هەروەها وتراوە:** خۆپارێزی لە سەرنجدانی خەڵکی و تەنانەت لە نەفسی خۆت بۆ کار و کردەوەکان، "صدق"یش بریتییە لە خۆخاوێنکردنەوە لە خوێندنەوەی نەفس، کەسی "موخلیص" ریای نییە و کەسی "صادق"یش خۆپەسەندی نییە، ئیخلاص تەنها بە صدق دەستەبەر دەبێت، بوونی"صدق"یش تەنها بە "ئیخلاص" سەرهەڵدات، هەردوو"ئیخلاص و صدق" بە ئارامگرتن(صبر) کامڵ و تەواو دەبن.

**وتراوە:** ئیخلاص بریتییە لە هاوتابوونی کاروکردەوەکان لە دەرەوە و لە ناوەوە، "ریا" ئەوەیە کە دەرەوەی باشتر بێت لە ناوەوە، "صدق" لە ئیخلاصدا ئەوەیە ناوەوەی ئاوادانتر بێت لە دەرەوەی.

**وتراوە:** ئیخلاص بریتییە لە: لەبیربردنەوەی بینینی خەڵك بە بەردەوامی سەرنجدانی خودا، هەر کەس خۆی لای خەڵك بە شتێك جوان بکات کە تێیدا نەبێت لەبەرچاوی خەڵك دەکەوێت.

**لە قسەکانی "الفضیل بن عیاض":** وازهێنان لە کار لە پێناوی خەڵکیدا ریایە، کارکردنیش لە پێناوی خەڵکیدا هاوەڵدانانە، ئیخلاص ئەوەیە خودا لەو دووانە بتپارێزێت.

**جونەید دەفەرموێت:** ئیخلاص نهێنییەکە لە نێوان خودا و بەندەدا، فریشتە پێی نازانێت بینووسێت، و شەیتان پێی نازانێت لێی تێکبدات، و ئارەزوو پێی نازانێت خواری بکات.

**بە سەهل وترا:** چ شتێك زۆر لەسەر نەفس گرانە؟ فەرمووی: ئیخلاص، چونکە بەشی نەفسی تێدا نییە.

**هەندێکیان دەڵێن:** ئیخلاص ئەوەیە کە لەسەر کاروکردەوەکانت هیچ شایەتێك داوا نەکەیت جگە لە خودا و داوای پاداشت نەکەیت لە هیچ کەسێك جگە لە خودا.

**مەكحول دەڵێت:** هەر بەندەیەك چل رۆژ بۆ خودا موخلیص بێت كانیاوی حیكمەت لە دڵ و لەسەر زمانی هەڵدەقوڵێت.

**ئەبو سولەیمانی دارانی دەڵێت:** كاتێك بەندەیەك دەگاتە ئیخلاص وەسوەسە و ریا لێی جیادەبێتەوە.

## ۞ كرۆكی ئیخلاص بریتییە لە پاڵفتەكردنی كاروكردەوەكان لە خەوشوخاڵ

ئیمامی "الهروي" ئیخلاص بە پاڵفتەكردنی كردارەكان لە هەموو خەوش و خەڵەتەیەك دەزانێت.

واتە كردارەكانی بە خەڵەتە و خەوشی ویستی دەروون تێكەڵ نەبێت، جا داوای خۆجوانكردن بێت لە دڵی خەڵكیدا، یان داوای مەدحیان بێت و راكردن لە زەمیان بێت، یان داوای بە مەزنزانینیان و داوای ماڵ و داراییان، یان خزمەتیان و خۆشەویستیان و دەستەبەركردنی پێویستییەكانی خۆی لەوانەوە، یاخود هۆكاری تر لە خەوش و خەڵەتە كە بریتین لە ویستی كەسانی تر جگە لە خودا بە كارەكانی، ئەو كەس و ئەو كارانە هەرچییەك بن.

**یەكەمین پلەی ئیخلاص** لای ئیمامی "الهروي" بریتییە لە دەركردنی بینینی كردار لە كردار و رزگاربوون لە داوای پاداشت لەسەر كار و دابەزین لە رازیبوون بە كردار، كەسی كاركەر سێ ئافات روو لە كارەكەی دەكات: بینین و سەرنجدانی، و داوای كرێ لەسەری، و رازیبوون پێی و پاڵدان بەلایەوە.

لەم پلەیەدا لەم سێ بەلایە رزگاری دەبێت، ئەوەی رزگاری دەكات لە بینینی كردارەكانی بینینی منەتی خودایە لەسەری، هەروەها فەزڵ و كۆمەكی خودا بۆ ئەو، ئەو كردارانە بە خودایە نەك بە نەفسی خۆی، ئەوە ویستی خودایە ئەو كارە خێرەی بە ئەو ئەنجامداوە نەوەك ویستی ئەو، وەك خودای موتەعال دەفەرموێت﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢٩ ﴾ التكوير: ٢٩

لێرەدا و لە بینینی جەبری خودایی سوود وەردەگرێت، ئەو تەنها ئامێرێكە، و كاروكردەوەكانی وەك جووڵەی درەختەكان و هەڵكردنی با وان، جووڵێنەری درەختەكان شتێكی ترە و بكەرەكەی شتێكی ترە جگە لە خۆی، هەر بەو جۆرە ئەو

مردووە و مردوو ناتوانێت شتێك ئەنجام بدات، گەر خودا ئەوی بدابایەتە دەستی خۆی هیچ کارێکی چاکەی پێ ئەنجام نەدەدرا، نەفسی مرۆڤ نەزان و ستەمکارە، سروشتی بریتییە لە تەمبەڵی و هەڵبژاردنی حەز و ئارەزووەکانی و دەستبەتاڵی، ئەو نەفسە سەرچاوەی هەموو شەڕێکە و لانکەی هەموو خراپەیەکە، کەسێك ئا بەم جۆرە بێت خێرێکی لێ ناوەشێتەوە، و خێر لە سروشتی ئەو نییە.

ئەو خێرەی لە مرۆڤ دەوەشێتەوە لە خوداوەیە و بەو ئەنجام دەدرێت، نەك لە بەندەکەوە و ئەنجامدانی ئەو، وەك خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ﴾النور: ٢١، ئەهلی بەهەشت دەڵێن ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا﴾ الأعراف: ٤٣، هەروەها -تبارك وتعالى- دەفەرموێت ﴿وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَٰكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ﴿٧٤﴾﴾ الإسراء: ٧٤، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ ٱلْإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمْ﴾ الحجرات: ٧.

هەموو کردارێکی چاکە لە بەندەوە تەنها فەزڵ و منەت و چاکە و نیعمەتی خودایە، ستایش تەنها بۆ ئەوە لەسەر ئەو کردارانە.

ئەوەی رزگاری دەکات لە رازیبوون لە کردەرەکانی و پاڵدانەوە بەلایاندا، دوو شتە:

یەکەم: سەرنجدان بە نەنگی و ئافات و کەموکورتی لەو کردارانەدا، هەروەها ئەوەی کە تێیدایە لە بەشی نەفس و شەیتان، زۆر کەم کردار هەیە بەشی شەیتان و نەفسی تێنەکەوێت، جا ئەو بەشە کەم بێت یان زۆر، پرسیار لە پێغەمبەر(ﷺ) کرا دەربارەی پیاوێك لە نوێژدا ئاوڕ دەداتەوە؟ فەرمووی ((ئەوە دزییەکە شەیتان لە نوێژی کەسەکە دەیدزێت))

ئەگەر ئەمە لاکردنەوەی چاو و جەستەی بێت بەلای شتێکدا ئەی لاکردنەوەی دڵی بۆ لای کەس و شتێك لەخوار خوداوە دەبێت چۆن بێت؟ ئەمەیان مەزنترین بەشی شەیتانە لە بەندایەتی مرۆڤ بۆ خودا.

ئیبن مەسعود دەفەرموێت: ((با هیچ کەس لە ئێوە لە نوێژەکەیدا بەشی شەیتانی تیانەبێت، وابببینێت کە لەسەری پێویستە لابەلای هیچ شتێکدا نەکاتەوە جگە بەلای راستیدا))، ئەو شتە کەمە لە لاکردنەوە لەلای ئیبن مەسعود بە بەشی شەیتان لە نوێژی بەندە تەماشا دەکرێت، دەبێ لەسەرو ئەوەوە چۆن بێت؟

بەشی نەفس لە كاردا تەنها ئەهلی بینینی ڕۆشن و ڕاستگۆیان دەیزانن.

**دووەم:** زانستی بەندە بەوەی پەروەردگار - **جل جلالە**- شایستەیەتی لە ماف بەندایەتی و ئادابی دەرەكی و ناوەكی و مەرجەكانی، بەندە لاوازتر و دەستەوسانتر و كەمترە لەوەی بتوانێت ماف بەندایەتی بدات و بۆ پەروەردگار بەڕاستی بزانێت، كەسی خوداناس لە هیچ كردەوەیەكی خۆی بۆ پەروەردگاری ڕازی نییە، تەنها چاوتروكانێكیش لە نەفسی ڕازی نییە، شەرم دەكات لەوەی بە كار و كردەوەكانیەوە ڕوو لە خودا بكات.

گومانی خراپی بە بە نەفس و كردەوەكانی و بوغزی لێیان و ناحەزی پێیان و بەرزكردنەوەیان بۆ لای خودا وای لێ دەكات ڕازی نەبێت لە كار و كردەوەكانی و ڕازیبوون لە نەفسی خۆی.

**هەندێكیان دەڵێن:** ئافەتی كەسەكە بریتییە لە ڕازیبوون لە نەفسی خۆ، هەر كەس بە بەردەوامی نەفسی خۆی تۆمەتبار نەكات ئەو كەسە لەخۆی دەرچووە و فریوی خواردووە.

## ۞ كارێك كە نەرێی شەرمەزاری ناكات

وتراوە: پێویستە بەندە شەرم بكات لە كاروكردەوەكانی لەگەڵ بەختكردنی هەوڵ و كۆششدا.

لە دڵسۆزییەكانی بەندە بۆ خودا شەرمكردنییەتی لە كردارەكانی، ئەوەش حەیای زۆری ئەوە لە خودا، چونكە ئەو كارانە بۆ خودا بە شیاو نازانێت، لەگەڵ ئەوەی كە بۆیان كۆشاوە و هەوڵ و ماندووبوونی لە پێناویان چەشتووە، خودای متەعال دەفەرموێت ﴿وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَآ ءَاتَوا وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ رَٰجِعُونَ﴾ المؤمنون: ٦٠، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((ئەو كەسە بریتییە لە پیاوێك كە بەڕۆژوو دەبێت، و نوێژ دەكات، و خێر و صەدەقە ئەنجام دەدات، و ئەترسێت خودا لێی وەرنەگرێت))

كەسی باوەڕدار مەقامی "ئیحسان" و "ترس"ی لە خۆیدا كۆكردۆتەوە و گومانی خراپ بە نەفسی خۆی دەبات، بەڵام كەسی فریوخواردوو: گومانی باش بە نەفسی خۆی دەبات لەگەڵ بوونی خراپەكانی.

لە درێژایی هەموو ئەمانەدا کردارەکانت دەکەیت بە شوێنکەوتەی زانست و تەبا لەگەڵی و شوێنکەوتە بۆ زانست (مەبەستی هیدایەتی پێغەمبەرە)، بە ڕۆیشتنی دەڕوات و بە وەستانی دەوەستێت و بە جوولەی دەجوولێت و لەگەڵی هەنگاو بۆ مەنزڵگاکانی دەنێت، لە سەرچاوەکانی سەرچاوە دەگرێت و تەماشای حوکمی ئاینیی ئەمری دەکات و پێیەوە پابەند دەبێت، لە ئەنجامدان و وازهێنان و داوا و هەڵهاتندا، هەروەها تەماشای پاداشت و سزا دەکەی لەسەری بەهۆ و بە دەستەبەر کردن، لەگەڵ ئەوەشدا تۆ گەشت بە دڵت دەکەی بە سەرنجدان و بینینی حوکمی گەردوونی بڕواوە کە هۆ و دەرئەنجامەکان و جووڵە و وەستان لەخۆ دەگرێت، هیچ شتێك لەو جێگە نامێنێتەوە لە ویستی خودا و تەنهاکردنەوەی خودا بە کارەکان و سەرچاوەی کارەکان لە ویستی خودای موتەعالەوە، ئەو کاتە هەڵدەستێت بە ئەمر و نەهی بە ئەنجامدان و دوورکەوتنەوە لێیان، بە بڕیارەکانی ئەو و قەزا و قەدەری ئەو لە رووی باوەڕ و بینین و حەقیقەتەوە دەجوولێت و دەکەوێتە گەشت و گەڕان، ئەو تەماشای حەقیقەت دەکات و لەسەر شەریعەت ڕاوەستاوە.

ئەم دوو کارە بریتییە لە بەندایەتی ئەم دوو ئایەتە ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ ۝٢٨ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢٩﴾ التكوير: ٢٨ — ٢٩، هەروەها خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذۡكِرَةٞۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلٗا ۝٢٩ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا ۝٣٠﴾ الإنسان: ٢٩ — ٣٠.

وازهێنان لە کردار لەگەڵ ڕۆیشتنی زانسدا دەڕوات: دیمەنی ((لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ))، ڕۆیشتنی خاوەنەکەی لەگەڵ بینینی حوکم: دیمەنی ((وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ))

ئەمە بریتییە لە پاککردنەوەی کردار بەوەی کارکەر تیایدا روو لە زانست بکات، ئەوەش: بە لاکردنەوە بەلایدا و گوێگرتن بەوەی فەرمانی پێ دەکرێت و گەڕانەوە بۆ حوکمی زانست، هەر کات بەم رووتێکردنە روو لە زانست نەکات ئەوا ڕۆیشتنەکەی زەمکراوە و ناتەواوە و لە خودا دووری دەخاتەوە، هەر ڕۆیشتنێك بۆ لای خودا زانستی لەگەڵ نەبێت ترسی ئەوە هەیە ئەو کەسە شەیتان فریوی دابێت، ئەم چارەنووسەیە ئەهلی سەنگەرەکانی خودای وێران کردووە و لە خودا دووری خستوونەتەوە و

سەرئەنجام لە سەنگەری خودا وەدەرنراون، چونکە نەگەڕانەوە بۆ لای زانست و پشتیان تێ کرد، تا لە حەقیقەتی باوەڕ و شەریعەتی ئیسلام هاتنە دەرەوە.

ئەوانە ئەو کەسانەن کە سەرداری ئەهلی ئەم ڕێگەیە جونەیدی کوڕی محمد دەربارەیان دەفەرموێت: کاتێك پێی وترا: ئەهلی مەعریفە دەگەنە وازهێنان لە جووڵە و کار لە دەروازەی چاکە و نزیکبوونەوە لە خودا، جونەید فەرمووی: ئەوە قسەی کەسانێکە کە قسە لە وازهێنان لە کاروکردەوەی ئەندامەکان دەکەن، ئەو قسانە لای من زۆر ترسناکن، ئەو کەسەی زینا دەکات و دزی دەکات حاڵی باشترە لەو کەسانەی ئەو قسانە دەکەن، عاریفان کارەکانیان لە خوداوە وەرگرتووە و بەو کارانەوە بۆ لای خودا دەگەڕێنەوە، گەر هەزار ساڵ تەمەنم بێت بە ئەندازەی گەردیلەیەك لە کارەکانم کەم ناکەمەوە مەگەر ڕێگرێك هەبێت نەهێڵێت ئەنجامیان بدەم.

**هەروەها دەفەرموێت:** هەرچی ڕێگەیە لە خەڵك داخراوە جگە لەوانەی شوێنپێی هەنگاوەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هەڵدەگرن.

**هەروەها دەفەرموێت:** هەر کەس قورئان لەبەر نەکات و فەرموودە نەنووسێت لەسەر ئەم ڕێگەیە ناکرێت بە پێشەوا و شایستەی شوێنکەوتن نییە، چونکە ڕێگەکەمان و زانستەکەمان بە کیتاب و سوننەت بەستراوەتەوە.

هەروەها دەفەرموێت: ئەم زانستەمان بە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) بەڵگەی بۆ دەهێنرێتەوە.

بزانە مەعریفەی دروست بریتییە لە ڕۆحی زانست، و زانستی دروست و کاری ڕاوەستاویش بریتین لە میزانی مەعریفەی دروست.

ئەم پایانە بریتین لە پایەی ڕۆیشتن بەرەو خودا و ئەو بنچینانەی کە هەر کەس سەیر و سلوکی لەسەر بینا نەکات لە ڕێگە لادەدات و ناگاتە ئەنجام، با گومانیش ببات ئەو بەرەو خودا دەچێت، ڕۆیشتنەکەی یان پێچەوانەی ئەو شوێنەیە ئەم مەبەستییەتی، یان ڕۆیشتنی کەسێکی دانیشتووی زنجیرکراوە، ئەمە ڕۆیشتنی ئەو کەسەیە کە دەخرێتە سەر پشتی وڵاخێکی سەرشێت، هەرکات هەنگاوێك بۆ پێشەوە بنێت دە هەنگاو دێتە دواوە.

نەبوونی ئیخلاص و شوێنکەوتنی پێغەمبەر رۆیشتنەکەی بۆ دواوە دەگەڕێنێتەوە، گەر هەوڵێك نەدات و داواکەی یەکنەخات وەك کەسێکی زنجیرکراو دەچێت بەڕێوە.

گەر ئەوانەی بۆ پێکهات و تیایدا کۆبوونەوە (ئیخلاص و شوێنکەوتنی پێغەمبەر) ئەوە داوای پاداشت ناکات لەسەر رۆیشتنەکەی، هەموو ئەمانەش فەزڵێکە لە خوداوە بە هەر کەسی بوێت دەیبەخشێت، خودا خاوەنی فەزڵی مەزنە.

۞ ۞ ۞

## (٢٤) (منزلة التهذيب)

# مەنزیلەی پاڵفتەكردن و پاككردنەوە

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی پاڵفتەبوون و پاكبوونەوەیە.

ئەمەش بریتیە لە داڕشتەی بەندایەتی لە كورەی تاقیكردنەوەدا، بە مەبەستی دەركردن و جیاكردنەوەی پیسی و خەوش و خەڵتە لێی.

**سەرەتاكەی: بریتییە لە پاككردنەوەی خزمەت:** واتە نەزانی و نەفامی نەچێتە ناوی، و خووخودەی تێكەڵ نەكرێت، و سووربوون و لێبڕان لە سنوورەكانیدا رانەوەستێت.

واتە: پاڵفتەكردن و پاككردنەوەی بەندایەتی لەو سێ ئافەتە ئاماژەبۆكراوە كە بریتین لە: نەفامی چوونە ناو، و خووخدە تێكەڵبوونی، و وەستانی سووربوون و لێبڕان لە سنووریدا.

**جۆری یەكەم:** نەفامی چوونە ناو، هەركات نەفامی تێكەڵ بە بەندایەتی بوو بەندە بە ئاقارێكی تردا دەبات و لە شوێن و جێگەیەكی تر بەندایەتی دادەنێت و دەیدات بە كەسانێك كە شایستەی بەندایەتی نین، كۆمەڵە كارێك ئەنجام دەدات كە باوەڕی وایە چاكەیە، بەڵام تێكدانی خزمەتی بەندایەتییە، بەوەی لە جێگەی وەستان بجوولێت و لە جێگەی جووڵان بوەستێت، بچێتە پێشەوە لە شوێنی خۆگرتنەوە و خۆی بگرێتەوە لە شوێنی چوونە پێشەوەدا، لە جێگەی وەستاندا بڕوات و لە ڕۆیشتندا بوەستێت، و هاوشێوەكانی ئەمانە لە جووڵە و وەستان كە لە حەقی خزمەتی بەندایەتیدا وەك جووڵەی قورس و بێزراو وایە بۆ خزمەتی خەڵكی.

گەر خزمەتی بەندایەتی زانستێكی تر بە ئاداب و حەقی خزمەت هاوەڵی نەكات -جگە لە زانست بە خودی خزمەتەكە- گومانی ئەوەی لێ دەكرێت خاوەنەكەی لە خودا دووربخاتەوە، با مەبەستی لە ئەنجامدانی كارەكەش نزیكبوونەوە بێت لە خودا، بەڵام مانای ئەوە نییە پاداشت پووچ دەكاتەوە، گەر لە پاداشت بێبەشی نەكات، ئەوا لە مەنزیلەی باڵا و نزیكبوونەوە لە خودا دووری دەخاتەوە، بابەتەكانی ئەم پوختەیە تەنها بە مەعریفەیەكی تایبەت بە خودا و بڕیاری خودا و خۆشەویستییەكی تەواو و مەعریفە بە نەفس و ئەوەی لە نەفسەوەیە واڵا دەبن.

**جۆری دووەم:** تێکەڵبوونی خووخدە: بریتییە لە تێکەڵبوونی حوکم و بڕیارێك لە بڕیارەکانی نەفس بە بەندایەتی کە جێبەجێکاری فەرمانەکانی بێت و یارمەتیدەری بێت، لە کاتێکدا خاوەنەکەی وابزانێت نزیکبوونە و گوێڕایەڵییە لە خودا، وەك کەسێك – بۆ نموونە– دەق بە ڕۆژوو گرتنەوە بگرێت و لەسەری ڕابێت تا نەفی هۆگری دەبێت و لای ئاسایی دەبێتەوە، ئەو کاتە بۆی ببێتە عادەت و حەزی پێ بکات و خاوەنەکەی وابزانێت ئەو حەز پێکردنە بەندایەتی رووتە بۆ خودا، بەڵام بێئاگایە لەوەی کە حەز و داواکاری نەفسە و لەسەری ڕاهاتووە.

**نیشانەی ئەمە:** ئەگەر گوێڕایەڵییەك لەخوار ئەوەوە و ئاسانتر لەوە و گەورەتر لەڕووی بەرژەوەندییەوە بدەیت بەسەریدا ئەوا ئەنجامی نادات و پێی هەڵناستێت وەك ڕۆژووەکە کە هۆگری بووە و دەقی پێوەگرتووە.

خودا بپەرستە بەپێی داواکاری بڕیارەکانی، نەك بەپێی ئەو بیر و ڕایەی خۆت دەیزانیت، پاڵنەری ئەنجامدان با دەق پێوەگرتن نەبێت، هەروەك پاڵنەری ئەوانەی کە ڕۆشنبینییان نییە و دەقی بە کارێکەوە گرتووە و لەسەری بەردەوامە، خۆ گەر پێچەوانەی ئەوەش دەق پێوە بگرێت ئەو لەسەری دەڕوات.

دەرئەنجامەکەی: نابێت پاڵنەری لەسەر بەندایەتی تەنها بیر و ڕا و تەبایی بێت لەگەڵ حەز و ئارەزوو و پێخۆشبوون و دەق پێوەگرتن، بەڵکو پاڵنەر تەنها جێبەجێ کردنی بڕیاری خودا بێت، ڕا و پێخۆشبوون و ئارەزوو و دەق پێوەگرتن جێبەجێکار و شوێنکەوتە بن، نەك گوێ بۆگیراو و پاڵنەر بن، ئەمە خاڵێکە تەنها ئەهلی بینینی ڕۆشن پێی ئاگادارن و لای بەلادا دەکەنەوە.

**جۆری سێیەم:** وەستانی سووربوون و لێبڕان لە سنوورەکانیدا: ئەمەش نیشانەی لاوازی و کەموکورتی کردارە باشەکەیە، بەندە سووربوون و لێبڕانی لە سنووری کردارە چاکەکاندا ڕاناوەستێت، بەڵکو لێبڕانی لەوە بالاترە، ئەو خزمەتەکانی بۆ ڕەزامەندی خزمەتکراوەکە (خودا)یە، ئەو هەمیشە خزمەتەکانی بۆ ئەو لەبەر چاو خۆی بچووك دەکاتەوە، لە سنوورییاندا ناوەستێت، قەناعەت لە هەموو شوێنێکدا بۆ خاوەنەکەی باشە جگە لەم جێگەیە، قەناعەت لەم شوێنەدا بێبەشبوونە، خۆشەویست بە شتێکی کەمتر و خوارتر لە خۆشەویستەکەی ڕازی نابێت، وەستانی لێبڕان و سووربوونی بەندە لە سنووری پاداشتی خزمەتدا بەربوونەوە و بێبەشبوونە.

## پاڵفتەکردنی مەبەست و مەرام

پاڵفتەبوونی خزمەت بە پاڵفتەبوونی مەبەست و مەرام کامڵ دەبێت، ئەوەش بریتییە لە پاڵفتەکردنی مەبەست لە زەلیلی زۆر لە خۆکردن، و پارێزگاری لێ کردنی لە نەخۆشی خاوبوونەوە و ساردبوونەوە، و سەرخستنی بەسەر زانستێکی ناپێویستدا.

یەکەمیان: پاڵفتەبوونی لە زەلیلی زۆر لە خۆکردن: واتە بە زۆر نەفسی بەرەو خودا نەداتە بەر، وەك کرێکارێکی داوالێکراوی رامهێنراو، بەڵکو پاڵنەرەکانی دڵی و راکێشانەکانی بە گەردنکەچی و خۆشەویستی و خوداویستییەوە روو لە خودا دەکەن، وەك جاریبوونی ئاو بەسەر شوێنێکی لێژدا، ئەمەش حاڵی خۆشەویستان و راستگۆیانن کە بەندایەتییەکەیان تەسلیمبوون و خۆشەویستی و رازیبوونە، رووناکی چاویان و سرووری دڵیان و چێژی رۆحیان لە بەندایەتیدایە، وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((رۆشنایی چاوم لە نوێژدایە))، هەروەها دەیفەرموو ((ئەی بلال، بە وتنی بانگ ئاسوودەمان بکە))

رۆشنایی چاوی خۆشەویست و چێژ و نیعمەتی رۆحی لە گوێڕایەڵی خۆشەویستەکەیدایە، بە پێچەوانەی ئەوانەی بەزۆر گوێڕایەڵی دەکەن، و بە جەستەی قورسەوە شان دەدەنە ژێر خزمەت، ئەو کەسەی وادەبینێت گەر زۆر و زاڵیی خودا نەبوایە ئەوا گوێڕایەڵی خودای نەدەکرد، ئەو شان دەداتە ژێر گوێڕایەڵی وەك ئەو کەسەی زۆردارێك زەلیلی کردووە و کاری پێ دەکات، بە پێچەوانەی ئەو کەسەی خودای خۆشدەوێت و گوێڕایەڵی بۆی بە رۆزی و نیعمەت و چێژ و سروور دەزانێت، ئەم کەسە پاڵنەرەکەی زەلیلی زۆر لێ کردن نییە.

دووەم: خۆپارێزی لە نەخۆشی خاوبوونەوە و ساردبوونەوە، واتە پارێزگاری لە مەبەست لە خابوونەوە و خامۆشبوونی ئاگری داوا، لێبڕان بریتییە لە رۆحی مەبەست و مەرام، چالاکی ئەو رۆحە وەك تەندروستیی وایە بۆی، و خابوونەوەشی نەخۆشییەکە لە نەخۆشییەکانی، پاڵفتەکردن و پاککردنەوەی مەبەستەکەی بە خۆپارێزی لە هۆیەکانی ئەو نەخۆشییە کە بریتییە لە خاوبوونەوە و ساردبوونەوە، ئەو خۆپارێزییەش بە خۆلادان دەبێت لە زیادەی هەموو شتێك و وازهێنان لە شتێك پەیوەندی بەوەوە نەبێت، قسە لە شتانێك بکات کە رجای زیادبوونی باوەڕ و حاڵی

دەكات لەگەڵ خودا، هاوڕێیەتی تەنها ئەوانە بكات یارمەتیدەدەن لەسەر ئەو ڕێگەیە، گەر بە كەسانێك تووشبوو كە لەسەر ئەو ڕێگەیە كۆمەكیان نەدەكرد با چەندە دەتوانێت خۆی لێیان بەدوور بگرێت و بەڕێیان بكات و پاڵیان پێوە بنێت و لەو پێناوەدا بكۆشێت.

سێیەم: سەرخستنی مەبەست بەسەر كێبەركێی زانستدا: مانای ئەمەش بریتییە لە سەرخستنی بیر و خەیاڵی بەندایەتی و ڕووكردنە خودا بە هەموو دڵێكەوە، هەروەها بەدوورگرتنی دڵ لە ڕۆیشتن بەرەو بابەتی زانستی جیاوازی و گریمانەیی و زیادەكانی زانست كە بیری تێكدەدەن و سەرنجی بۆ لای یاسا و ڕێساكانی زانستی شەرعی گشتگیر لاواز دەكەن، ئەو زانستەی كە زیندەگی دڵی تێدایە و گەشتكردن بەرەو خودا لەسەر ڕاستە شەقامی هیدایەت ڕاوەستاو دەكات.

۞ ۞ ۞

## (٢٥) (منزلة الإستقامة)

# مەنزیلەی ئیستیقامە

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی ئیستیقامەیە.

خـــودای موتـــەعال دەفـــەرموێت ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ فصلت: ٣٠ ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾ ﴾ الأحقاف: ١٣ – ١٤، بە پێغەمبەرەكەی خۆی فـەرموو ﴿ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْاْ ۚ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٢﴾ ﴾ هـــــــود: ١١٢، ئایەتەكە بەیانی ئەوەی كرد كە راوەستانی راست و دروسـت (الإستقامة) دژی لـە سـنوور دەرچووون(الطغيان)ە.

هــەروەها دەفــەرموێت ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَٱسْتَقِيمُوٓاْ إِلَيْهِ وَٱسْتَغْفِرُوهُ ﴾فصـــلت: ٦ ﴿وَأَلَّوِ ٱسْتَقَٰمُواْ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَٰهُم مَّآءً غَدَقًا ﴿١٦﴾ لِّنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ﴾ الجن: ١٦ – ١٧

دەربـارەی راوەسـتانی راسـت و دروسـت(الإسـتقامة) پرسـیار لـە صـدیقی ئوممـەت و راوەستاوترین كەسی ئوممەت–ئەبوبەكری صدیق خوا لێی رازی بێت– كرا؟ فەرمووی ((هاوەڵ بۆ خودا دانەنێیت))، مەبەستی راوەستان بووە لەسەر یەكتاپەرسـتی تـەواو، هەر كەس راوەسـتاو بێـت لەسـەر یەكتاپەرسـتی راسـتگۆیانە كـە ئەبوبـەكری صـدیق دینداری پێ دەكرد و ئایینی خۆی لەسەر دامەزراند بـوو، یەكتاپەرسـتییەكەی لەسـەر زانستێكی راست بوو بە نـاو و سیفات و ئاسەوارەكانی خـودای موتـەعال لـە ئاسـۆی گەردوون و دەروونـدا، ئەوا لە هەموو كاروبارەكانیدا لەسەر شارێگەی راست و دروسـت راوەستاو دەبێت، ئەو كاتە هەموو كار و حاڵێكی بۆ دێتە راستە.

عومەری كوڕی خەتتاب–خوا لێی رازی بێت– دەفەرموێت ((ئیستیقامە بریتییـە لـە راوەسـتان لەسـەر بكـە و مەكـە (ئـەمر و نـەهی)، كەسـەكە پـێچ لـێ نـەدات وەك پێچلێدانی رێوی))

عثمان کوڕی عەفان دەفەرموێت ((استقاموا: واتــە كاروكردەوەكانیـان تـەنها بـۆ خـودا بوو و"ئیخلاصیان هەبوو لە كاروكردەوەكانیاندا"))

علی کوڕی ئەبی تالب و ئیبن عەباس–خوایان لێ ڕازی بێت– دەفـەرمون ((اسـتقاموا: واتە فەرزەكانیان جێبەجێ كرد))

حەسەن دەفەرموێت ((لەسەر فەرمانی خودا ڕاوەستان و بە گوێڕایەڵی كاریان ئـەنجام دا و لە یاخیبوون و سەرپێچی دووركەوتنەوە))

موجاهید دەفەرموێت ((لەسەر شەهادەی "أن لا إله إلا الله" ڕاوەستان هەتا بە خودای خۆیان گەیشتن))

گوێم لە "شیخ الإسلام إبن تیمیة–قدس الله روحه–" بوو دەیفەرموو ((لەسەر بەندایەتی و خۆشەویستی خودا ڕاوەستان و بەلای ڕاست و چەپدا لایان نەكردەوە))

لـە سـەحیحی "مسـلم"دا لـە سـوفیانی كـوڕی عەبـدوڵاوە–خـوا لێـی ڕازی بێـت– دەفەرموێت: وتم ((ئەی پێغەمبەری خودا، شتێكم لـە ئیسـلامدا پـێ بڵـێ كـە لـە هـیچ كەسێكی تر جگە لە تۆ پرسیار نەكەم لەسەری، فەرمووی: بڵێ باوەڕم بە خـودا هێنـا و پاشان ڕاوەستاوبە))

هـەر لـە سـەحیحی "مسـلم"دا لـە "ثوبـان"ەوە –خـوا لێـی ڕازی بێـت – لـە پێغەمبـەری خـوداوە(ﷺ) فـەرمووی ((ڕاوەسـتاوبن، نـاتوانن هـەژماری بكـەن، بـزانن باشـترینی كردەوەكانتان بریتییە لە نوێژ، تەنها باوەڕدار دەتوانێت پارێزگاری لە دەستنوێژ بكات))

ئەوەی لە بەندە داواكراوە بریتییـە لـە ڕاوەسـتان، ئـەوەش بریتییـە لـە هاتنـە ڕاسـتە و دروسـت پێكـانی كاروكردەوەكـان، گـەر نـەیتوانی بـە تـەواوی بێتـە ڕاسـتە بـا لێـی نزیكببێتەوە، گەر لە نزیكبوونەوە دابەزی ئەوە كەمڕەوی و تیاچوونە، وەك لە سـەحیحی "مسلم" دا هاتووە لە ئەبی هورەیرەوە–خوا لێی ڕازی بێت– لە پێغەمبـەری خـوداوە(ﷺ) فـەرمووی ((ڕاوەسـتاوبن و نزیكببنـەوە لـە ڕاوەسـتان، بـزانن هـیچ كـەس لـە ئێـوە بـە كاروكردەوەكانی خۆی ڕزگاری نابێت، فەرموویان: تەنانەت تۆش ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی منیش، مەگەر خودا لە بەزەیی و فەزڵی خۆیدا نوقمم بكات))

لـە فەرموودەكـەی پێشـتردا هـەموو مەقامـەكانی ئـایینی كـۆكردەوە، فـەرمانی بـە ڕاوەستان كرد كە بریتییە لە هاتنە ڕاستە و پێكان لە نێت و قسە و كرداردا.

لە ئەو فەرموودەی "ثوبان" ریوایەتی کرد رایگەیاند: کە ئەوان ناتوانن بە تەواوی شان بدەنە ژێر ئیستیقامە، بۆیە گواستنیەوە بۆ نزیکبوونەوە لە راوەستان، ئەوەش ئەوەیە کە بەپێی توانای خۆیان لە راوەستان نزیك ببنەوە، وەك کەسێك تیر بە ئامانجێکەوە دەنێت گەر نەیپێکێت لێی نزیك ببێتەوە، لەگەڵ ئەمەشدا هەواڵی پێدان: کە راوەستان و نزیکبوونەوە لە راوەستان لە رۆژی دواییدا رزگاریان ناکات، با هیچ کەسێك پاڵ نەداتەوە بەلای کارەکانیدا و جێگەی پەسەند کردن نەبن لەلای، وا نەزانێت رزگاربوونی بەو کاروکردەوانەیە، بەڵکو رزگاربوونی بە بەزەیی و لێبووردن و فەزڵی خوداوەیە.

راوەستان (الإستقامة) وشەیەکی کۆکەرەوەیە و هەموو ئایینی لە خۆدا کۆکردۆتەوە، ئەوەش بریتییە لە راوەستان لەبەردەم خودای موتەعالدا بە صدق و وەفاوە.

راوەستان وابەستەی قسە و کردار و حاڵ و نییەتە، راوەستان لەوانەدا ئەوەیە کە بۆ خودا و بە خوداوە بن و لەسەر ئەمری خودا بن.

گوێم لە "شیخ الإسلام إبن تیمیة -قدس الله تعالی روحه-" بوو دەیفەرموو ((مەزنترین کەرامەت بریتییە لە پابەندبوون بە ئیستیقامەوە))

## ۞ کۆشش لەسەر رەوگەی سوننەت....... لەناو میانەگیریدا

راوەستان لەلای "شیخ الإسلام الهروي" بریتییە لە: (الإستقامة علی الإجتهاد في الإقتصاد، لا عادیا رسم العلم، ولا متجاوزا حد الإخلاص، ولا مخالفا نهج السنة)-راوەستان لەسەر کۆشش لەناو میانەگیریدا، دەستدرێژی نەکرێتە سەر رەسمی زانست و سنوور، و مەرزی ئیخلاص تێنەپەڕێنێ و پێچەوانەی نەهجی سوننەت نەبێت.

ئەم پلەیە شەش کار لەخۆ دەگرێت: کار و کۆشش تیایدا، کە بریتییە لە بەخشینی هەوڵ و کۆشش، میانەگیری: کە بریتییە لە گرتنەبەری رێگەیەك دووربێت لە زیادەڕەوی (ستەم لە خۆ) و کەمڕەوی کە تیابردنی کاروکردەوەکانە، وەستان لەسەر ئەوەی زانست دیاری دەکات، و تەنها کردنەوەی پەرستراو بە ویست و لێبڕان کە بریتییە لە ئیخلاص، کارەکان بەپێی ئەمرەکان بێت کە بریتییە لە شوێنکەوتنی سوننەتەکان

بەم شەش پایەیە (کار) راوەستان بۆ ئەهلی راوەستان دەستەبەر دەبێت، بە دەرچوون لە یەکێك لەمانە لە راوەستان دەردەچن: جا یان دەرچوونی تەواو، یان بەشێك لە دەرچوون.

پێشین ئەم دوو بنچینەیە زۆر باس دەکەن، ئەو دوانەش بریتین لە میانەگیری لە کاروکردەوەکاندا و دەستگرتن بە سوننەتەوە، شەیتان بۆنی دڵی بەندە دەکات و تاقیدەکاتەوە، گەر مەیلی بیدعەی تیابوو، هەروەها پشتهەڵکردنی تیابوو لە سوننەت و ملکەچبوونی تەواو بۆی، ئەوا لە دەستگرتن بە خوداوە دەریدەهێنێت، بەڵام گەر سووربوونی لەسەر سوننەت لێ بینی و کەسەکە بە توندی بەدوای سوننەت کەوتبوو، ئەوا شەیتان لەو ڕێگەوە زەفەری پێ نابات و دەکەوێتە گرتنەبەری ڕێگەیەکی تر، هەوڵدەدات-نەفرەتی خوای لێ بێت- لەو ڕێگەیەوە فریوی بدات، وەك هەوڵ و کۆششی زۆر تا ڕادەی لە ستەم لە نەفسی خۆ و دوورکەوتنەوە لە میانەگیری، پێی دەڵێت: ئەو کارەی تۆ خێر و گوێڕایەڵییە بۆ خودا، هەتا زۆرتر و زیاتر بکەیت کامڵترە، لەگەڵ ئەهلی خاوبوونەوە و ساردبوونەوەدا خاوەبەرەوە و ساردمەبەرەوە، لەگەڵ ئەهلی خەودا مەخەوە، بەردەوام شەیتان هانی دەدات و پاڵی دەنێت تا لە سنووری میانەگیری دەریدەکات، ئەو کاتە لە سنووری ڕاوەستان دەردەچێت، وەك چۆن ئەوەی یەکەم(بە ئەنجامدانی بیدعە و وازهێنان لە سوننەت) لە سنووری ڕاوەستان دەرچوو، هەر بەو جۆرە ئەمیش لە سنووری ڕاوەستان دەرچووە، هەردوو کارەکە دەرچوونن لە سوننەت و کەوتنە ناو بیدعەن، بەڵام ئەوەیان کەوتۆتە ناو بیدعەی کەمڕەوی و تیابردنی کاروکردەوەکان، ئەمەشیان کەوتۆتە ناو بیدعەی زیادەڕەوی و ئیسراف کردنەوە.

هەندێ لە پێشین دەڵێن: خودا فەرمانی بە هەر کارێك کردبێت شەیتان دوو دەستێوەردانی بۆ هەیە، جا یان بۆ کەمڕەوییە لەو کارەدا یان بۆ زیادەڕەوییە، باکی نییە ڕوو لە کامیان دەکات: زیادکردن یان کەمکردن.

پێغەمبەر(ﷺ) بە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصی فەرمووـخوایان لێ ڕازی بێت- ((ئەی عەبدوڵای کوڕی عەمر، هەموو کار و کردەوەیەك لوتکەی سووربوون و کەماڵی بۆ هەیە، هەموو کەماڵێکیش خاوبوونەوە و ساردبوونەوەی بۆ هەیە، هەر کەس ساردبوونەوە و خاوبوونەوەکەی بۆ لای سوننەت بوو ڕزگاری بووە، هەر کەسیش ساردبوونەوەکەی بۆ لای بیدعە بێت زیانۆمەند بووە)) کاتێك ئەم فەرموودەی پێ فەرموو کە فەرمانی پێکرد بوو بە میانەگیری لە کاروکردەوەکاندا.

هەرچی خێرە لە کۆششێکدایە میانەگیری تێدا بێت، هەروەها لە ئیخلاصێکدا شوێنکەوتنی پێغەمبەری لەگەڵ بێت، وەك هەندێ لە هاوەڵان دەیانفەرموو: میانەگیری لەسەر رەوگە و سوننەت باشترە لە کۆشش و هەوڵ و ماندووبوونێك پێچەوانەی رەوگە و سوننەت بێت، هەوڵبدەن کاروکردەوەکانتان لەسەر رەوگە و سوننەتی پێغەمبەران –علیهم السلام– بێت.

بە هەمان شێوە ریا لە کاروکردەوەکاندا لە راوەستان دەریدەکات، هەر بەو جۆرە ساردبوونەوە و خاوبوونەوە لە راوەستان دووری دەخاتەوە.

ئەوەی یارمەتی عابید دەدات لەسەر ئەم جیاکردنەوەیە، ئەوەیە کە لە مەقامی جیاکردنەوەدا بێت، جیاوازی ببینێت لە نێوان ئەمر و نەهی و وەلا پێدان و دوژمنایەتی کردن و جیاوازی نێوان ئەوەی خودا پێی خۆشە و پێی رازییە لەگەڵ ئەوەی خودا پێی تووڕە دەبێت و لێی ناڕازییە، کەسێك ئەم جیاکردنەوەی هەبێت لە مەقامی جیاکردنەوەدایە، گەر ئەم مەقامەی نەبێت مەقامی ئیسلامی بۆ بەدەست نایەت، چجای مەقامی ئیحسان.

ئەمەش تەنها بە مانەوە لەناو نووری ئاگاهی و بێدابوونەوە بەدەست دێت کە بریتییە لە ئاگاداری و بێداربوونی بەردەوام، تاریکی بێئاگایی نوورەکەی ناکوژێنێتەوە، بەڵکو هەردەم بێدار دەبێت، ئەو لەو دۆخەدا کەمەندکێش کراوە و بێدارییەکەی لەخۆیەوە نییە، بەڵکو پارێزگارییەکە لە خوداوە بۆ ئەو، نەك بە هەوڵ و کۆششی خۆی بێت، ئەو دەبێت خودا ببینێت لە راوەستان و بێداری خۆیدا، چونکە راوەستانەکەی بە خوداوەیە نەك بە نەفس و هەوڵی خۆیەوە.

ئەم برە لە مانا ناوی "القیوم"داوای دەکات و لە پێویستییەکانی موشاهەدەی ئەو ناوەیە، خودا کەسێکە بە خۆیەوە راوەستاوە و ئاتاجی هیچ کەسێك نییە لەو راوەستانەدا و هەرچی شتی ترە بەوەوە وەستاوە و بە هەمیشەیی ئاتاجی دەرگای ئەون.

۞ ۞ ۞

## (٢٦) (منزلة التوكل)

# مەنزیلەی پشتبەستن بە خودا

لە مەنزیلەکانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی پشتبەستن بە خودایە.

خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾ المائدة: ٢٣، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴾ إبراهيم: ١٢، هەروەها ﴿ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ﴾ الطلاق: ٣، دەربارەی دۆستەکانی خۆی دەفەرموێت ﴿ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴾ الممتحنة: ٤، بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێت ﴿ قُلْ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ءَامَنَّا بِهِۦ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا ﴾ الملك: ٢٩، هەروەها پێی دەفەرموێت ﴿ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ إِنَّكَ عَلَى ٱلْحَقِّ ٱلْمُبِينِ ﴾ النمل: ٧٩ ﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴾ النساء: ٨١ ﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْحَيِّ ٱلَّذِى لَا يَمُوتُ وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِۦ ﴾ الفرقان: ٥٨ ﴿ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴾ آل عمران: ١٥٩، لەسەر زمانی پێغەمبەرانی دەفەرموێت ﴿ وَمَا لَنَآ أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنَا سُبُلَنَا ﴾ إبراهيم: ١٢، دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەر دەفەرموێت ﴿ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُواْ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴾ آل عمران: ١٧٣، هەروەها دەفەرموێت ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾ الأنفال: ٢

**قورئان پڕە لەم نموونانە.**

لە ناوەکانی پێغەمبەری خودا "المتوكل"ە، واتە پشتبەستوو بە خودا، پشتبەستنی پێغەمبەر بە خودا مەزنترین پشتبەستن بووە، خودا پێی فەرموو ﴿ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ إِنَّكَ عَلَى ٱلْحَقِّ ٱلْمُبِينِ ﴿٧٩﴾ ﴾ النمل: ٧٩، لە ئاماژە بە پشتبەستنی و لەسەر حەقبوونی پێغەمبەر بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئاین هەر هەمووی لەسەر ئەو دوانەیە: بەوەی بەندە لە گوفتار و کردار و باوەڕ و نییەتیدا لەسەر حەق بێت و پشتی بە خودا بەستبێت و متمانەی پێدابێت، هەموو ئاین لەم دوو مەقامەدایە، پێغەمبەرانی خودا فەرموویانە ﴿ وَمَا لَنَآ أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنَا سُبُلَنَا ﴾ إبراهيم: ١٢، ئافەتی مرۆڤ یان لە نەبوونی هیدایەتە، یان لە نەبوونی پشتبەستن بە خودا، گەر پشتبەستن لەگەڵ هیدایەت کۆبکاتەوە ئەوا هەموو باوەڕی کۆکردۆتەوە.

لە دوو سەحیحەكەدا(بوخاری و مسلم) لە فەرموودەی حەفتا هەزار كەسەكە كە بێ دادگایی دەچنە بەهەشتەوە دەفەرموێت ((**هم الذين لا يسترقون ولا يتطيرون ولا يكتوون وعلى ربهم يتوكلون**))

لە سەحیحی بوخاریدا لە ئیبن عەباسەوە –خوا لێیان رازی بێت– پێغەمبە(ﷺ) فەرموویەتی ((**حسبنا الله ونعم الوكيل**، ئیبراهیم –**صلى الله عليه وسلم**– فەرموویەتی كاتێك فرێدرایە ناو ئاگرەكەوە، **محمد** فەرموویەتی كاتێك پێیان وت:((**إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدۡ جَمَعُواْ لَكُمۡ فَٱخۡشَوۡهُمۡ فَزَادَهُمۡ إِيمَٰنٗا وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ**))

لە دوو سەحیحەكەدا، پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: ((**أللهم لك أسلمت وبك آمنت، وعليك توكلت، وإليك أنبت، وبك خاصمت، أللهم إني أعوذ بعزتك، لا إله إلا أنت: أن تضلني، أنت الحي الذي لا يموت، والجن والإنس يموتون**))

لە سونەنی "الترمذي"دا لە عومەری كوڕی خەتابەوە –خوا لێی رازی بێت– پێغەمبەر فەرموویەتی ((گەر بە تەواوی پشت بە خودا ببەستن، وەك باڵندەكان رۆزیتان دەدات، بەیانیان بە سكی خاڵی دەردەچن و ئێواران بە سكی تێرەوە دەگەڕێنەوە))

لە "سونەن"دا لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە –خوا لێی رازی بێت– فەرمووی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ((هەر كەس لە ماڵەوە دەرچوو وتی: "**بسم الله، توكلت على الله ولا حول ولا قوة إلا بالله**" پێی دەوترێت: هیدایەتدرایت، و پارێزرایت و ئەوەشت بەسە، شەیتانێك بە شەیتانێكی تر دەڵێت: تۆ چۆن دەتوانی زاڵبیت بەسەر كەسێكدا هیدایەت درابێت و پارێزرابێت و بەشی درابێت؟))

پشتبەستن بە خودا نیوەی ئایینە، نیوەكەی تری بریتییە لە گەڕانەوەی بەردەوام بۆ لای خودا، چونكە ئایین بریتییە لە داوای كۆمەكی و بەندایەتی، پشتبەستن بە خودا بریتییە لە داوای كۆمەك (الإستعانة)، گەڕانەوەی بەردەوامیش بریتییە لە بەندایەتی (العبادة)، بەڵكو بریتییە لە رۆحی بەندایەتی و پاڵفتەی یەكتاپەرستی، گەر خاوەنەكەی بەڕاستی پێی هەستابێت.

دوڕ و گەوهەری خوایی سەرداری ئەم دەستەیە "سەهلی كوڕی عەبدوڵای التستري" كە دەفەرموێت: هەر هەموو زانست دەرگایەكە لە بەندایەتی، هەر هەموو بەندایەتی دەرگایەكە لە وەرع، هەر هەموو وەرع دەرگایەكە لە زوهد، هەر هەموو زوهد دەرگایەكە لە پشتبەستن بە خودا(تەوەكول).

مەنزیلەی پشتبەستن بە خودا لە هەموو مەنزیلەكانی تر فراوانتر و كۆكەرەوەترە، بەردەوام بە میوانان ئاوەدانە، بەهۆی وابەستەی تەوەكول و زۆری ئاتاجی خەڵكی، ئەهلی ئاسمانەكان و زەوی–ئەوانەی تەكلیفلێكراون و ئەوانەش كە تەكلیفیان لێنەكراوە– هەر هەموو لە مەقامی تەوەكولدان، با وابەستەی تەوەكولەكەیان جیاوازی هەبێت، دۆستەكانی خودا و تایبەتەكان لە باوەڕ و سەرخستنی ئایین و بەرزكردنەوەی كەلیمەی خودا و تێكۆشان دژ بە دوژمنەكانی و خۆشەویستی و جێبەجێ كردنی فەرمانەكانی پشتی پێ دەبەستن.

لەخوار ئەوانەوە كەسانێك لەسەر راوەستان لە ناخی خۆیاندا پشتی پێدەبەستن، هەروەها لەسەر پارێزگاری حاڵ لەگەڵ خودا و خۆ خاڵیكردنەوە لە خەڵك.

لە خوار ئەمانەشەوە كەسانێك بۆ زانراوێك كە لە خوداوە بەدەست دێت پشتی پێدەبەستن، لە رۆزی و لەشساغی و سەركەوتن بەسەر دوژمندا، یان بۆ كاروباری هاوسەر و منداڵ و خانەوادە و هاوشێوەكانی ئەمانە پشت بە خودا دەبەستێت.

باشترین پشتبەستن بە خودا بریتییە لە پشتبەستن لە واجبدا، مەبەستم واجبی خودا و واجبی خەڵك و واجبی خۆیە، بەرینترین و بەسوودترینیان بریتییە لە: پشتبەستن بە خودا لە كاركردنە سەر دەرەوە بۆ بەرژەوەندییەكی ئایینی، یان بۆ لادانی مەفسەدەیەكی ئایینی، ئەوەش بریتییە لە تەوەكولی پێغەمبەران بۆ پیادەكردنی ئایینی خودا، و لادانی فەسادی خاوەن فەسادەكان لەسەر زەوی، هەر ئەمەش تەوەكولی میراتگرانی پێغەمبەرانە، پاشان خەڵكی بەپێی سووربوون و لێبڕان و مەرام و مەبەستیان، هەیە پشتی بە خودا بەستووە بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات و موڵك، هەشە پشتی پێ بەستووە لە بەدەستهێنانی پارچە نانێكدا.

هەر كەس لە تەوەكولەكەیدا لەسەر خودا راست بكات ئەوەی دەیەوێت بەدەستی دەهێنێت، گەر ئەو شتە لەلای خودا خۆشەویست بێت و پێی رازی بێت ئەوا سەرئەنجامێكی باشی بۆ كەسەكە دەبێت، گەر لای خودا خراپ و ناباش بێت و جێگەی خەشم و تووڕەیی ئەو بێت–سبحانە– ئەوا ئەوەی بەدەستی هێناوە بەهۆی تەوەكولەكەیەوە زیانبەخشە و سەرئەنجامی خراپی لێ دەكەوێتەوە، گەر شتەكە موباح بێت ئەوا بەرژەوەندی تەوەكولەكەی دەستكەوتووە، نەك بەرژەوەندی ئەو

شتەی بەڕێگەی تەوەكول بەدەستی هێنا، مەگەر شتەكە وەك كۆمەكییەك لە پێناوی گوێڕایەڵی خودا بەكاربهێنێت، خودا باشتر دەزانێت.

## ۞ مانای پشتبەستن بە خودا و پلەكانی

با لێرەدا مانای تەوەكول و پلەكانی تەوەكول و ئەوەی لەسەری وتراوە باس لێوە بكەین.

**ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێت:** "پشتبەستن بە خودا كاری دڵە" مانای ئەم قسەیە ئەوەیە: تەوەكول كارێكە لە دڵدایە، قسەی زمان و كاری ئەندامەكان نییە، هەروەها لە دەروازەی زانست و پەی پێبراوەكان نییە.

**هەندێ كەس:** لە دەروازەی زانست و زانیاری سەرژمێری دەكەن و دەڵێن: تەوەكول بریتییە لە زانستی بەندە بەوەی پەروەردگاری بەسە بۆ بەندەكەی.

**هەیانە:** بە سوكنایی و خامۆشبوونی جووڵەی دڵ لێكیدەداتەوە، دەڵێت: تەوەكول بریتییە لە راكشانی بەندە لەبەردەم دەرگانەی خودادا، ئەوەش بریتییە لە دەستبەرداربوونی هەڵبژاردن، و لەوێوە ڕۆیشتن و جاریبوون و خۆدانە دەمی مەجرای قەدەرەكان.

**سەهل دەڵێت:** تەوەكول بریتییە لە ڕۆیشتن لەگەڵ خودا لەو قەدەرانەی كە دەیەوێت.

**هەیانە:** بە رازیبوون لێكیدەداتەوە، دەڵێت: بریتییە لە رازیبوون لە قەدەرەكان.

**وتراوە:** تەوەكول بریتییە لە كۆچكردن لە پەیوەستبوونەكان و گەیاندنی راستییەكان (هجر العلائق و مواصلة الحقائق)

حەقیقەتی ئەم كارە: تەوەكول حاڵێكە لە كۆمەڵێك شت دروست دەبێت، كە حەقیقەتی تەوەكول تەنها بەوانە دەستەبەر دەبێت، هەر یەك لە عاریفان ئاماژەیان بە یەكێك یان دوان یان زیاتر لەو راستیانە كردووە.

**یەكەمیان:** ناسینی خودا و سیفاتی خودایە، بەسبوونی خودا بۆ بەندەكەی و راوەستاوی ئەو لەسەر دروستكراوەكانی، هەروەها كۆتاهاتنی هەموو شتێك بۆ لای زانستی ئەو و ڕوودانی ڕووداوەكان بە ویست و بڕیاری ئەو، ئەم ناسینە یەكەمین پلەیە كە بەندە بەهۆیەوە پێدەنێتە مەقامی تەوەكولەوە.

شێخمان–خوا لێی رازی بێت– دەفەرموێت: بۆیە تەوەکول لە فەیلەسوف وێنا ناکرێت و بەراست نازانرێت، هەر بەو جۆرە لە قەدەریی نەرێکار(نەرێکاری سیفات) وێناناکرێت کە دەڵێن: لە موڵکی خودادا شتانێك روودەدات کە خودا نەیویستووە، هەروەها لە جەهەمی نەرێکارانی سیفاتی پەروەردگار–جل جلاله– وێنا ناکرێت، تەنها لە ئەهلی جێگیرکردنی ناو و سیفات و کردار و ئاسەوار وێنای تەوەکول دەکرێت.

چ جۆرە تەوەکولێك لای کەسێك دروست دەبێت باوەڕی وابێت کە خودا زانستی تەنها بە کولیات(گشت)ە و ئاگای لە جوزئیات(بەش) و جیهانی نزم نییە و بە ویستی خۆی کارەکان ئەنجام نادات و ویست و بڕیاری نییە، و سیفەتەکان بەوەوە رانەوەستاون؟ هەتا کەسەکە بە خودا و سیفاتی زاناتر بێت تەوەکولەکەی راستتر و بەهێزتر دەبێت، خودای موتەعال زاناترە.

## ۞ نەرێی هۆکارەکان ناکەین

**پلەی دووەم:** جێگیرکردن لە هۆ و دەرئەنجامەکاندا.

هەر کەس نەرێی هۆ و دەرئەنجامەکان بکات تەوەکولەکەی شتی تێکەڵ بووە، ئەمەش پێچەوانەی بۆچوونی سادەی هەندێ کەسە کە پێیان وایە: جێگیرکردنی هۆ تەوەکول ناتەواو و عەیبدار دەکات، و نەرێ کردنی هۆ لە تەوەکولی تەواو و کامڵەوەیە.

بزانە نەرێکارانی هۆ هەرگیز تەوەکولیان بۆ نایەتە راستە، چونکە تەوەکول بەهێزترین هۆیە بۆ بەدەستهاتنی ئەو شتەی تەوەکولەکەت بە خودا بۆ بەستووە، تەوەکول وەك دوعا وایە بۆ بەدەستهێنانی دوعابۆکراوەکە، گەر کەسەکە باوەڕی وابێت خودا تەوەکولی نەکردووە بە هۆ، هەروەها دوعای نەکردووە بە هۆی بەدەستهێنانی شتێك، ئەوە ئەو کەسە کەوتۆتە ناو وەهمێکی پووچەوە، چونکە خودای موتەعال بڕیاریداوە تێربوون بە خواردنەوە ببەستێتەوە، و پاراوبوونیش بە خواردنەوەوە، گەر ئەو کارە نەکات و ئەو هۆیە نەگرێتە بەر نە تێر دەبێت و نە پاراو.

حەجی کردووە و گەیشتۆتە کەعبەی پیرۆز ئەگەر کەسەکە سەفەر بکات و رێگەی حەجکردن بگرێتە بەر، گەر لە ماڵەوە دابنیشێت ناگاتە مەککە.

بڕیاری چوونە بەهەشتی بۆ کەسێك داوە گەر موسڵمان ببێت و کرداری چاکە ئەنجام بدات، گەر ئیسلام واز لێ بهێنێت و دەستبەرداری کرداری چاکە ببێت هەرگیز ناچێتەبەهەشتەوە.

بڕیاری سەوزبوونی دانەوێڵەی داوە گەر زەوی بکێڵرێت و تووەکەی تێبکرێت، گەر کەسێك زەوی نەکێڵێ و تووی تێنەکات تەنها بێهیوایی بۆ دەمێنێتەوە.

هەڵسەنگاندن بۆ قسەی ئەوانە بکە نەرێی هۆ دەکەن و پێیان وایە دەبێت بۆ گەیشتنە ئەنجامەکان هۆ نەگیرێتە بەر، دەڵێت: گەر بڕیارم بۆ درابێت و لە ئەزەلەوە تێرێتی و پاراوبوون و حەجم بۆ نوسرابێت و بۆم ڕەوانە کرابێت ئەوا هەر دەگاتە دەستم و پێی دەگەم، بۆی بجووڵێم یان بۆی نەجووڵێم، سەفەری بۆ بکەم یان بۆی دابنیشم، گەر بۆشم نەبڕابێتەوە ئەوا هەگیز ئەوانە بۆم بەدەست نایەن، کاری بۆ بکەم یان کاری بۆ نەکەم.

ئایا کەسێك هەیە خاوەنی ئەم ڕایە لەڕیزی عاقڵان سەرژمێر بکات؟ ئایا ئاژەڵ لەم کەسە ژیرتر نییە؟ ئاژەڵان بە هیدایەتی گشتی بەدوای هۆکارەکاندا دەگەڕێن.

تەوەکول لە مەزنترین ئەو هۆیانەیە داواکراوەکانی پێ بەدەستدێت، و نەخوازراوەکانی پێ لادەدرێت، هەر کەس نەرێی هۆ بکات ناتوانێت لەسەر تەوەکول ڕاوەستاو بێت، بەڵکو مەیل نەدان بە هۆ و هۆکارەکان و بڕینی پەیوەندی دڵ پێیانەوە لە کەماڵی تەوەکولە، حاڵی دڵ وەستانە لەگەڵ خودا نەك لەگەڵ هۆ و هۆکارەکان، بەڵام حاڵی جەستەی گرتنەبەر و هەستانە بە هۆ و هۆکارەکان.

هۆ و هۆکارەکان جێگەی حیکمەت و بڕیار و ئایینی خودان، تەوەکول وابەستەیە بە پەروەردگاریی خودا و بڕیار و قەدەرییەوە، بەندایەتی لە گرتنەبەری هۆ و هۆکاردا بەجێنایەت لەسەر پایەی تەوەکول نەبێت، پایەی تەوەکولیش لەسەر پێی بەندایەتی وەستاوە.

بەڵکو خۆ دارنینی تەواو لە هۆ و هۆکارەکان لەڕووی شەرع و عەقڵ و هەستەوە گونجاو و شیاو نییە، هۆکارێك نییە پێغەمبەر(ﷺ) کەمتەرخەمی تیاداکردبێت، لە ڕۆژی ئوحددا خۆی لەنێوان دوو دورعدا قایم کردبوو، هەرگیز لە ڕیزدا بەرووتی و بەبێ دورع ئامادە نەبووە، وەك چۆن هەندێك کەس کە زانست و خوداناسییان نییە ئەنجامی دەدەن، دەلیلێکی هاوەڵدانەری بە کرێ گرت تاکو ڕێگەی کۆچکردنی پێ نیشان بدات.

خودا بە پێغەمبەرەکەی هیدایەتی مرۆڤایەتی دا و لە هەموو خەڵکی پاراستی، قوتی ساڵێکی بۆ خانەوادەکانی لاخست بوو لە کاتێکدا سەرداری ئەوانە بوو پشتیان بە خودا بەستبوو، کاتێك برۆیشتبا بۆ جیهاد و حەج و عەمرە توێشوو و خۆراکی لەگەڵ خۆی هەڵدەگرت، هەر بەو جۆرە هەموو یار و هاوەڵانی، لە کاتێکدا بە حەق خاوەنی تەوەکول بوو، کامڵترین کەس لە تەوەکولدا لەدوای ئەوان کەسێکە کە لە دوورەوە بۆنی تەوەکولی ئەوان دەکات و شوێنپێی ئەوانی هەڵگرتووە.

## ۞ خۆدارنین بنچینەی پشتبەستن بە خودایە

**پلەی سێیەم:** قووڵبوونەوە و جێگیربوونی دڵ لە مەقامی یەکتایی تەوەکولدا.

تەوەکولی هیچ کەس نایەتە راستە و دروست نابێت تا یەکتاپەرستییەکەی دروست و تەواو نەبێت، بەڵکو حەقیقەتی تەوەکول بریتییە لە یەکتایی دڵ، تا وابەستەبوونی هاوەڵدانان لە دڵدا بوونی هەبێت تەوەکولەکەی ناتەواو و نەخۆشە و شتی تێکەڵ بووە، بەپێی رووتبوونەوەی یەکتاپەرستی لەو شتانە تەوەکولەکەی دروست دەبێت، هەرکاتێك بەندە لای بەلای غەیری خودادا کردەوە ئەو لاکردنەوەیە بەشێك لە دڵی داگیر دەکات، ئەو کات بەپێی گەورە و بچووکی ئەو بەشە داگیرکراوە لە دڵیدا تەوەکولەکەی کەم دەبێتەوە، لێرەدایە هەندێك وا گومان دەبەن کە تەوەکول کاتێك تێر و تەواوە دەستبەرداری هۆ و هۆکارەکان ببێت و وەلایان بنێت، ئەمە راست و دروستە، بەلام وەلانانی هۆکارەکان لە دڵدایە نەك بە ئەندامەکان و لە دەرەوە، چونکە تەوەکول کاتێك تێر و تەواوە هۆ و هۆکار لە دڵدا بسڕێتەوە و تەنها ئەندامەکان لە دەرەوە پێیەوە وابەستە بن، ئەو کاتە کەسەکە لە هۆ و هۆکارەکان دابڕاوە و پەیوەستیش بووە، خودای موتەعال زاناتر و بەئاگاترە.

## ۞ پەنابردن بۆ خودا ئارامی و سوکنایی‌مان پێ دەبەخشێت

**پلەی چوارەم:** شانداdan و متمانەی دڵ بە خودا و خۆدانە پاڵ خودا و ئارامی لەلای خودا، بەجۆرێك لەرزە و شڵەژان رووی تێنەکات بەهۆی تەشویشی هۆ و هۆکارەوە، دڵ بەلای هۆ و هۆکاردا پاڵ نەداتەوە، بەڵکو پاڵدانەوە بۆ لایان لەدڵ دەردەهێنێت، پۆشاکی سوکنایی سەرچاوەی هۆ و هۆکارەکان کە خودایە دەکات بە بەر دڵیدا.

نیشانەی ئەمە ئەوەیە گوێنەدات بە رووتێکردن و پشت تێکردنی هۆ و هۆکارەکان، دڵی نەیەتە لەرزە و چەپۆکان کاتێك ئەوەی حەزی لێ دەکات پشتی تێبکات، یاخود ئەوەی حەزی لێ ناکات رووی تێبکات، چونکە متمانەی بە خودا و سوکنایی لەلای ئەو و خۆدانەپاڵی لە ترس و رجای هۆ و هۆکارەکان پاراستوویانە، حاڵی ئەو کەسە وەك ئەو کەسە وایە دوژمنێك گەورە و سەرسەخت رووی تێکردووە و ئەمیش توانای رووبەڕووبوونەوەی نییە، لەو کاتەدا قەڵایەکی کراوە دەبینێت، خاوەنەکەی دەیگەیەنێتە ناو قەڵاکە و بەدوایدا دەرگاکە دادەخات، ئەو دوژمنەکەی لە دەرەوەی قەڵاکە دەبینێت، بۆیە لەرزین و چەپۆکانی دڵی لەو کاتەدا مانایەکی نییە.

هەروەها وەك ئەو منداڵە شیرەخۆرەی کە متمانە و سوکنایی و ئارامی بە مەمکی دایکییەوەیە کە جگە لەو کەسێکی تر ناناسێت، لە دڵیدا لاکردنەوە بەلای کەسێکی تردا بوونی نییە، وەك هەندێ لە عاریفان دەڵێن: کەسی پشتبەستوو بە خودا وەك منداڵ وایە، شتێکی تر شك نابات پەنای بۆ ببات جگە لە مەمکی دایکی، هەر بەو جۆرە کەسی پشتبەستوو تەنها پشت بە خودا -سبحانە- دەبەستێت.

## ۞ پاکێتی بۆ خودایەك کە خاوەن فەزڵ و منەتە

**پلەی پێنجەم:** بریتییە لە گومانی باش بە خودای موتەعال.

بە ئەندازەی گومانی باش و رجات بە خودا تەوەکولت پێی دەبێت، بۆیە هەندێ لە عاریفان مانای تەوەکولیان بە گومانی باش بە خودا لێکداوەتەوە.

راستییەکەی: گومانی باش بە خودا کەسەکە بانگ دەکات بۆ پشتبەستن بە خودا، چونکە تەوەکول بۆ کەسێك وێنا ناکرێت گومانی خراپی بە خودا هەبێت، هەر بەو جۆرە تەوەکول بۆ کەسێك نییە رجای بە خودا نەبێت، خودا باشتر دەزانێت.

## ۞ خۆ رادەستکردن

**پلەی شەشەم:** بریتییە لە خۆرادەست کردنی دڵ بە خودا، و پێدانی هەموو حەز و خۆزگەکانی بە خودا و بڕینی هەموو شتانەی ململانێ لەگەڵ دڵدا دەکەن.

ئەم مانایە وتەی هەندێکیانە کە دەڵێن: تەوەکول بریتییە لە لادانی تەگبیر، واتە خۆ رادەستکردن بە تەگبیری خودا بۆ کەسەکە، ئەمەش دەروازەی ئەمر و نەهی

ناگرێتەوە، بەڵكو ئەوەی خودا بۆ تۆی هەڵدەبـژێرێت و رووت تێـدەكات، نـەك ئـەوەی خودا فەرمانی بە كردنی كردووە.

تەوەكولی بەندە بریتییە لەم تەوەكولە، ئەمەش زانستێكی پێ دەبەخشێت كە دەزانێـت پێش كردارەكەی هیچ توانا و ئامادەییەكی نییە، و لە مەكری خودا دڵنیا نییە.

تواناكـانی بەدەسـتی خودایـە، نـەك بەدەسـتی خـۆی، ئـەو تـەنها خـاوەنی توانـای بەندەكەیـەتی، گـەر خـودا توانـای پـێ نەبەخشـێت ئـەو دەستەوسـانە، جووڵـەی بـە خوداوەیە، نەك بە خودی خۆیەوە، ئیتر چۆن لە مەكری خـودا دڵنیـا دەبێـت كـە ئـەو بزوێنراوە نەك بزوێنەر؟ كەسێك دەیبزوێنێت كە جووڵەكـەی بەدەسـت خۆیـەتی(واتـە خودا)، گەر بیەوێت بێتوانای دەكات و لە جووڵە و هەوڵ و كۆشش پەكی دەخات، ئەو كات لەگەڵ كەسە بێتواناكاندا دەبێت پاڵبداتەوە، وەك چۆن بەوانـەی كۆمـەكی خـۆی لـێ گرتنـەوە دەفـەرموێت ﴿وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمۡ فَثَبَّطَهُمۡ وَقِيلَ ٱقۡعُدُواْ مَعَ ٱلۡقَٰعِدِينَ ٤٦﴾ التوبة: ٤٦

ئەمـە بریتییـە لـە مـەكری خـودا بـە بەندەكـەی: كاتێـك كۆمـەكی و یارمـەتی لـێ دەگرێتەوە، و دەیداتە دەست نەفسی خۆی، بانگكەری خێـری تیـا زینـدوو ناكاتـەوە، ئەو كات لە مەیدانی رەزامەندی خـۆی و ئـەوەی لای خۆشەویسـتە بـەكاری ناهێنێـت، ئەمە لەسەر خودا پێویست نـەكراوە، تـاكو بـە نەبەخشـینی بـە بەندەكـەی سـتەمكار بێت، گەورەیی بۆ خودا لەو جـۆرە كارانـە، بـەڵكو ئـەوە تـەنها فەزڵێكـە كـە سـتایش دەكرێت لەسەری بە بەخشینی بە هەر كەسێك بیەوێت، هـەروەها لـە نەبەخشـینی بـە هەر كەسێك نەیەوێت، بۆ خودا لە هەردوو بارەكەدا ستایش بوونی هەیە.

هەر كەس لەمە تێبگات دەرگایەكی مەزن لە نهێنی قـەدەر بـە روویدا دەكرێتـەوە، و زۆرێـك لـە تەمومـژی لا دەڕەوێتـەوە، هـەر شـتێك خـودای موتـەعال بـە بەندەكـەی ببەخشێت و لە رەزامەندی ئەودا بـەكاری بهێنێـت خـودا لێـی ناگرێتـەوە و بـە فـەزڵی خۆی پێی دەبەخشێت، هـەر شـتێك بەنـدە داوای بكـات و خـودا بزانێـت لـە خراپـە و نارازیبوونی ئەودا بـەكاری دەهێنێـت خـودا لێـی دەگرێتـەوە، گـەر بەندەیـەكیش لای خودا بێزراو بێت لەسەر ئەنجامدانی خراپـە ناچـاری دەكـات، بـەڵكو دەیداتـە دەسـت نەفس و هێز و توانای خۆی، ئەمەش بریتییە لە مەكری خودا.

## ۞ كارەكانمان رادەستی خودا دەكەین

**پلەی حەوتەم:** بریتییە لە كار رادەستكردن، كە بریتییە لە رۆح و كرۆك و حەقیقەتی تەوەكول، گێڕانەوەی هەموو كاروبارەكانە بۆ لای خودا، چوونە ناو كاروبارەكانە بە داوا و هەڵبژاردنی خودا بۆ ئەو، نەك بە بێزاری و ناچارییەوە، رادەستكردن وەك رادەستكردنی منداڵێكی دەستەوسان و لاواز و ژێركەوتە كە چۆن هەموو كاروبارەكانی بۆ لای باوكی دەگێڕێتەوە، زانا بە بەزەیی و سۆزی باوكی لەسەری، هەروەها ئاگا بەوەی باوكی بەسە بۆ ئەو و سەرپەرشتی دەكات و كاروبارەكانی بۆ رادەپەڕێنێت، وادەبینێت كە تەگبیری باوكی بۆ ئەو باشتر و چاكترە لە تەگبیری خۆی بۆ خۆی، هەستانی باوكی بە بەرژەوەندییەكانی ئەو و گرتنەدەستی جڵەوی كارەكانی چاكتر و باشترە لەوەی ئەو پێی هەڵدەستێت، كەسێكی شیاوتر و باشتر و دڵنەرمتر لە باوكی شك نابات كاروبارەكانی رادەست بكات و تێچوون و بارگرانی لە كۆڵ بكاتەوە كە بەرانبەریان دەستەوسانە و نەزانە بە رووی بەرژەوەندی جۆراوجۆر، زانستی هەبێت بە كەماڵی زانست و توانا و بەزەیی ئەو كەسەی كاروبارەكانی رادەست دەكات، رادەستكردنی كاروبارەكان بە خودا لە قورئاندا لەسەر زمانی باوەڕدارەكەی ئالی فیرعەون هاتووە و دەفەرموێت ﴿وَأُفَوِّضُ أَمْرِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ غافر: ٤٤

كەسی رادەستكەر(مفوض) بۆیە كاروبارەكانی رادەستی خودا دەكات، چونكە دەزانێت ئەوەی خودا بۆ ئەوی دەوێت لە دونیا و دوارۆژدا باشترین شتێكە، با ئەوەی خودا بۆی دەبڕێتەوە لە رواڵەتدا پێچەوانە بێت لەگەڵ حەز و ویستەكانی ئەودا، ئەو پێی رازییە، چونكە دەزانێت ئەوە بۆ ئەو باشترە، با رووی بەرژەوەندیش لەو كارەدا نەبینێت و لە ئەو شاراوە بێت، هەر بەو جۆرە حاڵی كەسی پشتبەستوو بە خودا، بەڵكو حاڵی لەو حاڵە باڵاترە، چونكە لەگەڵیدا كاری دڵ هەیە كە لەلای كەسی رادەستكەر نابینرێت، واتە كەسی پشتبەستوو بە خودا یەكسانە بە كەسی رادەستكەر و زیادەیەكیش، مەقامی تەوەكول تەنها بە رادەستكردنی كاروبارەكان بە خودا دێتە راستە، ئەو كاتێك كاروبارەكانی رادەستی خودا دەكات بەدوایدا بە هەموو دڵیەوە شانی لەسەر دادەدات و متمانەی پێدەكات.

هاوشێوەی ئەمە: كەسێك كە كاروبارەكانی بە پیاوێك رادەست دەكات و دەیانداتە دەستی ئەو، ئەو كەسە لە ناخیدا –لەدوای رادەست كردن– متمانەیەكی تایبەت و

سوكنایی و دڵنیایی لەلای كەسی رادەستكراو دەبینێتەوە، زیاتر لەو كاتەی رادەستی نەكردبوو، ئەمەش بریتییە لە حەقیقەتی تەوەكول.

## ۞ رازیبوون بەری تەوەكولە

كە پێی نایە ئەم پلەیە بۆ پلەی رازیبوون دەگوێزێتەوە، كە بریتییە لە بەری تەوەكول، ئەوانەی تەوەكولیان بە رازیبوون لێكداوەتەوە بە مەزنترین بەروبوومی تەوەكول و گەورەترین سوودەكانی ئاماژەیان بۆ كردووە، ئەو كە بە راستی پشت بە خودا دەبەستێت رازی دەبێت بەوەی وەكیلەكەی بۆی بریار دەدات و بۆی ئەنجام دەدات.

شێخی ئیمە -خوا لێی رازی بێت- دەیفەرموو: ئەو قەدەرانەی مرۆڤ رووبەڕوویان دەبێتەوە دوو ئەمر لەئامێز دەگرن: تەوەكول لە پێشییەوە و رازیبوون لە دوایەوە، هەر كەس پێش كارەكە پشتی بە خودا بەست و دوای كارەكە رازیبوو بە سەرئەنجام و بریارە براوەكان ئەوا ئەو كەسە بە كاری بەندایەتی هەستاوە، یان هاوشێوەی ئەم مانایەی فەرموو.

دەڵێم: ئەمەش مانای فەرموودەكەی پێغەمبەرە(ﷺ) لە دوعای "الإستخارة"دا ((**أللهم إني أستخيرك بعلمك، وأستقدرك بقدرتك، وأسألك من فضلك العظيم**)) ئەمە بریتییە لە پشتبەستن بە خودا و رادەستكردنی كاروبارەكان بە ئەو، پاشان دەفەرموێت ((**فإنك تعلم ولا أعلم، وتقدر ولا أقدر، وأنت علام الغيوب**)) ئەمەش خۆ بەریكردنە بۆ لای خودا لە زانین و هەوڵ و هێز، هەروەها تەوەسول كردن بۆ لای خودا بە سیفاتی خودا كە باشترین شتێكە تەوەسولكەران بۆ لای ئەو-**سبحانه**- بیگرنەبەر، پاشان داوای لە پەروەردگاری كرد ئەو كارەی بۆ ئەنجام بدات ئەگەر بەرژەوەندی تێدایە بۆ ئەو لە ئێستا و لە داهاتوودا، هەر بەو جۆرە داوای لێ كرد ئەو كارەی لێ دووربخاتەوە گەر زیانی پێ دەگەیەنێت لە ئێستا و لە داهاتوودا، ئەمە ئەو پێویستییەیە كە داوای لە خودا كرد، هیچی تر لەسەری نەماوە جگە لە رازیبوون بەوەی خودا بۆی دیاری دەكات و بۆی دەبرێتەوە، بۆیە فەرمووی ((**واقدر لي الخير حيث كان، ثم رضني به**))

ئەم دوعایە هەموو ئەم مەعاریفە خواییانە و حەقیقەتە ئیمانیانە لەئامێز دەگرێت، كە پوختەكەی بریتییە لە: پشت بەستن بە خودا و رادەست كردنی كاروبارەكان بە

ئەو لەپێش ڕوودانی قەدەرە بڕاوەکانەوە، لەدوای ڕوودانی قەدەرەکانیش ڕازیبوون پێیان کە بریتییە لە بەری داری تەوەکول، ڕادەست کردنیش نیشانەی ڕاستی و دروستیی تەوەکولە، گەر ڕازی نەبێت بەوەی بۆی بڕاوەتەوە ئەوا ڕادەست کردنەکەی ناتەواو و تێکچووە.

بە تەواوکردنی ئەم هەشت پلەیە مەقامی تەوەکول بۆ کەسەکە کامڵ دەبێت و پێیەکانی تیایدا جێگیر و دامەزراو دەبن، ئەمەش مانای وتەکەی "بیشری حافی"ە کە دەیفەرموو: کەسێك دەڵێت پشتم بە خودا بەستووە و درۆ بە دەم خوداوە دەکات، چونکە گەر تەوەکولی بە خودا هەبوایە ڕازی دەبوو بەوەی خودا بۆ ئەوی بڕیوەتەوە.

### ۞ وەهمی هەندێك لە پشتبەستووان بە خودا

زۆرجار لەم دەروازەیەوە پەسەندی کامڵ تێکەڵ بە ناپەسەندی ناتەواو دەکرێت، لێرەوە ڕادەست کردن لەگەڵ تیاچوون و بەفیڕۆدان تێکەڵ دەبێت، بەندە بەشی خۆی بزر دەکات و وا گومان دەبات ئەو کارەی تەوەکول و ڕادەست کردنی کاروبارە بە خودا، لەڕاستیدا ئەو کارە بەفیڕۆدانە نەك ڕادەست کردن، ئەو کارە ئەنجام نەدانی حەقی خودایە و ڕادەست کردنی کارێکە بە ئەو-سبحانە- کە پێویستە تۆ ئەنجامی بدەیت.

هەروەها تێکەڵ کردنی تەوەکول بە پشوودان و بێباکی، فڕێدانی کۆڵی بەرپرسیارێتی و خاوەنەکەی وا گومان دەبات پشتی بە خودا بەستووە.

هەروەها تێکەڵ کردنی خۆ داڕنین لە هۆ و هۆکارەکان بە وازهێنان و پشتگوێ خستنی هۆ و هۆکارەکان، خۆداڕنین بریتییە لە یەکتاپەرستی، بەڵام پشتگوێخستن لادان و زەندەقەیە، خۆداڕنین بریتییە لە شان دانەدانی دڵ لەسەر هۆ و هۆکارەکان و هەروەها دڵ قایم نەکردن لەسەریان و مەیل پێنەدانیان، لەگەڵ ئەوەی بە ئەندامەکانی خۆی ئەو هۆ و هۆکارانە دەگرێتە بەر و بەجوانترین شێوە ئەنجامیان دەدات، پەکخستنی هۆ و هۆکارەکانیش بریتییە لە سڕینەوەیان لەسەر ئەندامەکان.

هەروەها تێکەڵ کردنی متمانە بە خودا بە لەخۆدەرچوون و دەستەوسانی، جیاوازی نێوانیان: کەسی خاوەن متمانە بە خودا ئەوەی خودا فەرمانی پێ کردووە ئەنجامی

داوە و لە دەرکەوتنی بەروبوومەکەی و گەشە و گەورەبوونیدا متمانەی بە خودا هەیە، وەك ئەو کەسەی کە درەخت دەچێنێت و زەوی دەکێڵێت و تۆوی تیا دەڕوێنێت، کەسی لەخۆدەرچوو و دەستەوسانیش: ئەوەی خودا فەرمانی پێ کردووە ئەنجامی نەداوە، وا بانگەشە دەکات گوایە متمانەی بە خودا هەیە، متمانە کاتێك دروستە هەوڵ و کۆشش و کاری خۆت ئەنجام بدەی.

هەروەها تێکەڵ کردنی دڵنیایی لەلای خودا و ئارامی بۆ لای ئەو بە دڵنیایی بۆ لای زانراو(معلوم) وئارامی دڵ لەلای، تەنها خاوەن بینینی ڕۆشن دەتوانن ئەو دووانە لەیەکتر جیابکەنەوە، وەك چۆن لە "أبي سليمان الداراني"وە دەگێڕنەوە: پیاوێکی لە مەککە بینیوە کە هیچ شتێکی نەدەخوارد جگە لە چەند قومە ئاوێکی زەمزەم، چەند ڕۆژ بەسەریدا گوزەری کرد، ڕۆژێك ئەبو سولێمان پێی فەرموو: باشە گەر ئاوی زەمزەم چوو بە ناخی زەویدا تۆ چی دەخۆیەوە؟ ئەویش سەری ئەبی سولەیمانی ماچ کرد و وتی: خوا پاداشتت بداتەوە بەوەی ڕێنومایت کردم، من چەندین ڕۆژە زەمزەم دەپەرستم، پاشان وازی لێهێنا و ڕۆیشت.

زۆرن ئەوانەی تەوەکولیان بۆ لای زانراوە و ئارامی و دڵنیاییان بۆ لای ئەو شتە زانراوەیە، وا گومان دەبەن تەوەکولیان بۆ لای خودایە، نیشانەی ئەوە: هەر کاتێك زانراوەکەیان لێبڕا خەم و پەژارە و ترس دایاندەگرێتەوە، ئەو کاتە بۆی دەردەکەوێت دڵنیایی و ئارامییەکەی بۆ لای خودا نەبووە.

هەروەها تێکەڵ کردنی زانستی تەوەکول بە حاڵی تەوەکول، زۆرێك لە خەڵکی زانستیان بە تەوەکول و ڕاستێتی تەوەکول و وردەکارییەکانی هەیە و وا گومان دەبەن پشتیان بە خودا بەستووە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو یەکێك نییە لە ئەهلی تەوەکول، چونکە حاڵی تەوەکول: شتێکی ترە و لە پشتی زانستی تەوەکولەوەیە، ئەمەش وەك ناسینی خۆشەویستی و زانست بە خۆشەویستی و هۆکار و پاڵنەرەکانی وایە، بەڵام حاڵی کەسێك کە لەناو خۆشەویستیدایە و عاشق بووە لەپشتی ئەو زانست و زانیاریانەوەیە، هەروەها وەك بوونی زانست بە ترسان لە خودا و حاڵی کەسی ترساو لە خودا دۆخێکی ترە، ئەوە هەر وەك ناسین و زانینی نەخۆشی و حەقیقەتی تەندروستی وایە و جیاوازە لە دۆخی ئەو کەسەی لەناو نەخۆشییەکەدایە.

لەم دەروازەیەوە تێكەڵبوونی زۆرێك لە بانگەشە بە حەقیقەت هەست پێ دەكرێت، شتی لابەلا بە داوای راستەقینە، ئافاتی رێگر بە هۆ و هۆكاری گەیەنەر، خودا هەر كەسێكی بوێت بۆ سەر راستە شەقام رێنومایی دەكات.

## ۞ كەسی پشتبەستوو بە خودا بە ناوە جوانەكان بەندایەتی دەكات

تەوەكول گشتگیرترین مەقامێكە لە وابەستەبوونی بە ناوە جوانەكانی خودای موتەعالەوە.

مەقامی تەوەكول وابەستەبوونێكی تایبەتی هەیە بە كۆی ناوی كردار و ناوی سیفاتی خودای موتەعالەوە.

لەلایەكەوە وابەستەی ناوی ((الغفار، التواب، العفو، الرؤوف، الرحيم))ە و هەروەها وابەستەبوون بە ناوی ((الفتاح، الرزاق، المعطي، المحسن))، هەر بەو جۆرە وابەستەبوون بە ناوی ((المعز، المذل، الحافظ، الرافع، المانع))، لە رووی پشتبەستن بە خودا لە زەلیلكردنی دوژمنانی ئایین و دابەزاندنیان و رێگری لە هۆكاری سەركەوتنیان، هەروەها وابەستەبوونی بەو ناوانەی توانا و ویستی خودا نیشان دەدەن ((القدرة والإرادة))، وابەستەبوونێكی گشتی هەیە بە سەرجەم ناوە جوانەكانی خودای موتەعالەوە، بۆیە هەندێك لە ئیمامان تەوەكول بە زانست بە خودا و ناسینی خودا ناو دەبەن.

مەبەستیان ئەوە بووە بەپێی ناسینی خودا پشت بەستنی بەندە پێی زیاد دەكات، هەتا زاناتر بێت بە خودا پشتبەستنەكەی بە خودا بەهێزتر دەبێت.

## ۞ هیممەتی نزم كەسی پشتبەستوو بە خودا دەخاتە ناو فریوخواردنەوە

زۆرێك لە پشتبەستووان بە خودا لە پشتبەستنەكەیاندا زیانۆمەند دەبن، كەسێك بە تەواوی پشت بە خودا دەبەستێ و لەگەڵ ئەوەشدا زیانۆمەندە، وەك كەسێك تەوەكولەكەی لە شتێكی بچووكدا بەكاربهێنێت تا هێزی تەوەكولەكەی خاڵی دەبێتەوە، ئەو دەیتوانی بە ئاسانترین شت بەدەستی بهێنێت و دڵی خاڵی نەكردبایە لە تەوەكول بۆ زیادكردنی باوەڕ و زانست و سەرخستنی ئایین و كاركردنی خێر لە

خەڵكی، ئەمە بریتییە لە تەوەكولی كەسە دەستەوسانەكان و هیممەت نزمـەكان، وەك ئەو كەسەی هیممەت و تەوەكول و دوعـای لـە ئـازارێكی بچـووكی جەسـتەیدا سـەرف دەكات كە دەیتوانی بە ئاسانترین رێگە و بچووكترین شت چارەسـەری بكردبایـە، یـان سەرف كردنی لە برسێتییەكدا كە بە لەتە نانێك یـان بـە نیـو درهـەم برسـێتییەكەی لا دەچـوو، بـا هیممـەت و تـەوەكول و دوعاكـانی لـە سەرخسـتنی ئـایین و قەلاچـۆی بیدعەچییەكان و زیادبوونی ئیمان و بەرژەوەندی گشتی موسڵماناندا خەرج بكردبایە.

## ۞ كەسێك تەوەكولی نەبێت باوەڕی نییە

خـودای موتـەعال رایگەیانـدووە كـە خـاوەن تەوەكولـەكانی خۆشـدەوێت وەك چـۆن كەسـانی سوپاسـگوزاری خۆشـدەوێت، هـەر بـەو جـۆرە چـاكەكاران و ئـارامگران و تۆبەكارانی خۆشدەوێت.

هەروەها رایگەیاندووە كە بە هاناهاتن و بەدەمەوەچوونی ئەو–سبحانە– بۆ بەندەكانی بەپێی پشتبەستنیانە بە خودا، خودا بەسە بۆ كەسێك پشتی پێببەستێت، بۆ كارێكی چاكە و مەقامێك لە مەقامەكان پاداشتێكی دیاریكراوی داناوە.

ئەو–سبحانە– خۆی كردووە بە پاداشتی ئـەو كەسـەی پشـتی پـێ دەبەسـتێت و هـەر ئەویش بەسە بۆ ئەو بەندەیە، دەفەرموێت ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ۝٢﴾ الطلاق: ٢ ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرۡ عَنۡهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ﴾ الطـلاق: ٥ ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مِنۡ أَمۡرِهِۦ يُسۡرٗا ۝٤﴾ الطـلاق: ٤ ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ﴾ النساء: ٦٩، پاشان لەسەر تەوەكول فەرمووی ﴿وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓ﴾ الطلاق: ٣.

سەرنجی ئەو پاداشـتە بـدە كەسـی پشتبەسـتوو بـە خـودا بەدەسـتی دەهێنێـت، كـە كەسی تر جگە لە ئەو بەدەستی ناهێنێت، ئەمە دەریدەخات كە تـەوەكول بـەهێزترین رێگەیە بۆ لای خودا و خۆشەویسترینیانە، كە خودای موتەعال هەموو كارەكان دەداتە پاڵ خۆی نەرێی تەوەكولی بەندە لەسەر ئەو(خودا) ناكات، بەڵكو ئەمـە ئـەو راسـتییە دەردەخات كە هەرچی شتە لەدەسـتی خودادایـە، چـونكە گـەر مـرۆڤ ئـەوەی زانـی و لەرێگەی مەعریفەوە بەدەستی هێنـا بەناچـاری حـاڵی دەگۆڕێـت بـۆ پشتبەسـتن بـەو

کەسەی ئەوە شان و شکۆیەتی، چونکە دەزانێت هەرچی کاروبارە لەدەستی ئەودایە و بەندە شتێکی لەدەستدا نییە، بۆیە هیچ رێگەیەکی تری لەبەردەمدا نییە جگە لە پشتبەستن بە خودا و رادەستکردنی کاروبارەکان و متمانە پێی، ئەمەش لە دوو رووەوە: لە رووی هەژاری و ئاتاجی بەندەوە و نەبوون بە خاوەنی هیچ شتێك، دووەم لەرووی ئەوەی کە هەرچی کاروبارە لەدەستی خودادایە و بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە، تەوەکول لەم دوو جۆرە زانینەوە سەرهەڵدەدات.

لەبەرئەوەی هەموو کاروبارەکان بۆ خودایە و لەلای خودایە و بەشی بەندەی تێدا نییە ئەوا تەوەکولەکەی لەسەر خودا دەبێت، ئەوەش بە رادەستکردنەوەی کاروبارەکان بە ئەهلی خۆی کە خودایە و خۆ کەنارکردن لە ململانێی خاوەنی راستەقینەی کاروبارەکان و شانداداان لەسەری و دەرچوون لە دەستێوەردانی خۆی و هەوڵ و هێزی خۆی بۆ بڕیاری پەروەردگاری کە هەر ئەو دەتوانێت بڕیار لە کاروبارەکان بدات، ئەمە بریتییە لە مەرام و مەبەستی تەوەکول، گەر بەندە خۆی لە مەقامی تەوەکول جیاکردەوە ئەوە لە حەقیقەتی بەندایەتی کەنارگیری کردووە، خودای موتەعال بە تەوەکول لە کتێبەکەیدا لەگەڵ بەندە تایبەتەکانی خۆی و کەسانی نزیك لێی و خاوەن رێزەکان گفتوگۆ دەکات و پێیان دەفەرموێت مەرجی باوەڕتان ئەوەیە کە پشت بە خودا ببەستن، هەر شتێك بە مەرجەوە گرێدرا بە نەبوونی ئەو مەرجە ئەویش کۆتایی پێ دێت.

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هاتنە دی باوەڕ بە هاتنە دی تەوەکولەوەیە، هەر کەس تەوەکولی نەبێت باوەڕی نابێت، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٣﴾﴾ المائدة: ٢٣، لەم ئایەتە پیرۆزەدا تەوەکول کراوە بە مەرجی ئیمان، هەروەها دەفەرموێت ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾﴾ الأنفال: ٢، لێرەشدا باوەڕدار کەسێکە کە پشتی بە خودا بەستووە

خودای موتەعال لەمەڕ پێغەمبەرانی رایدەگەیەنێت کە تەوەکول پەنا و هانایان بووە، و لە چوار شوێنی قورئاندا فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی کردووە﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰقَوْمِ إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ ﴿٨٤﴾ فَقَالُواْ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْنَا ﴿٨٥﴾﴾ یونس: ٨٤ – ٨٥

# (٢٧) (منزلة الثقة)

# مەنزیلەی متمانە

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی متمانەیە بە خودای موتەعال.

ئەوەش ئەوەیە كە خودای موتەعال ئیلهامی دڵی دایكی موسای كرد، دەفەرموێت ﴿ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي ﴾القصص: ٧، ئەو كارەی دایكی موسا مەزنترین متمانە بوو بە خودا، گەر متمانەی تەواوی بە پەروەردگاری نەبوایە جگەر گۆشەكەی خۆی هەڵنەدەدایە ناو تەوژمی ئاوەكەوە تاكو شەپۆلەكان یاری پێ بكەن و راماڵی بكەن بۆ ئەو شوێنەی دەیانەوێت.

خولگەی رادەستكردن(تفويض) لەسەر متمانەیە، بوونی متمانە لەناو رادەستكردندا وەك چەقی بازنەیەك وایە كە هێڵەكەی بەدەوردا كێشراوە، چەق ئەو خاڵەیە چێوەكەی بە دەوردا دەكێشرێت، دووری نیوەتیرەكان لە چەقەكەوە بۆ چێوەكەی یەكسانن، هەر بەشێك لە بەشەكانی چێوەكە بەدووری یەكسان بەرانبەر چەقەكە وەستاوە، هەر بەو جۆرە متمانە ئەو چەقەیە كە رادەستكردنی بە دەوردا دەسوڕێتەوە.

وەك چۆن كرۆكی دڵ بریتییە لە تەسلیمبوون بە خودا، بەرێزترین و مەزنترین بەشی دڵ بریتییە لە كرۆكەكەی، ئەو بەشەیە كە زیندەگی ژیانی پێوەیە، كرۆك لە ناوەڕاستی دڵدایە، گەر رادەستكردنی كاروبارەكان دڵ بێت ئەوا متمانە بریتییە لە كرۆكی دڵ، گەر رادەستكردن چاو بێت ئەوا متمانە بیلبیلەكەیەتی، گەر بازنە بێت چەقەكەیەتی، پێشتر ئاماژەمان بەوە كرد كە هەندێك لە عاریفان تەوەكول بە متمانە لێكدەدەنەوە، و بە حەقیقەتی تەوەكولی دەزانن، هەیانە تەوەكول بە رادەستكردنی كاروبارەكان راڤە دەكەن، هەشیانە بە خۆ تەسلیم كردن بە خودا تەفسیری دەكەن.

لەوە گەیشتیت كە مەقامی تەوەكول هەموو ئەوانە لەخۆ دەگرێت، وەك ئەوەی متمانە(ثقة) رۆح بێت و تەوەكولیش كە متمانەی هەڵگرتووە جەستە بێت، نزیكی و پەیوەندی متمانە بە تەوەكولەوە وەك نزیكی و پەیوەندی ئیحسان وایە بە ئیمانەوە.

ناونیشانەكەی: بریتییە لە سەلامەتی و ئاسایشی بەندە لە تیاچوون(لەدەستچوون)ی بڕیار لەسەردراوەكان و كۆتا نووسراوەكان، لەوێوە بگاتە ڕۆحی ڕازیبوون، ئەگەر نە، بە چاوی یەقین، ئەگەر نە، بە لوتفی ئارامگرتن.

هەر كەس ناسینی خودای بەدەستهێنا و زانی هەرچی خودا بڕیاری لەسەر دابێت گەڕانەوەی نییە سەلامەت دەبێت لە تیاچوونی ئەو بەشەی خودا بۆ ئەوی دیاریكردووە، هەروەها سەلامەت دەبێت لە كەمكردن و كەمبوونەوەی ئەو بەشەی بۆی ڕەوانە دەكرێت، ئەو بەشەی لە كتێبی نووسینە خواییەكاندا تۆماركراوە، لێرەوە ڕۆحی ڕازیبوون بە بەشی خودا بەدەست دەهێنێت، واتە بەدەستهێنانی ئاسوودەیی و چێژ و نیعمەت، چونكە كەسی ڕازی لەناو ئاسوودەیی و چێژ و سروورداییە، وەك لەو فەرموودەی عەبدوڵای كوڕی مەسعود لە پێغەمبەری خوداوە ریوایەتی دەكات، فەرموویەتی ((خودا -بە دادپەروەری خۆی- ڕۆح و بەختەوەری لە یەقین و ڕازیبووندا داناوە، خەم و دڵتەنگیشی لە گومان و نارازیبووندا داناوە)).

گەر بەندەی خودا نەیتوانی ڕۆحی ڕازیبوون بەدەستبهێنێت با "چاوی یەقین" بەدەستی بهێنێت كە بریتییە لە هێزی ئیمان و تێكەڵبوون بە دڵ و لەوێشەوە خۆ تەسلیم كردن بە خودا.

ئەمەش دوو جۆرە: تەسلیمبوون بە حوكمی ئایینی و بڕیارەكانی خودا، لەگەڵ تەسلیمبوون بە حوكمی گەردوونی و قەدەری.

یەكەمیان: بریتییە لە تەسلیمبوونی باوەڕداران و خوداناسان، دەفەرموێت ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ ﴾ النساء: ٦٥

ئەم ئایەتە سێ ئاست ئاماژە پێ دەدات: گەڕانەوە بۆ حوكمی خودا و خوداكردن بە حاكم، فروانی سنگ بە لادانی گرژی و حەرەج و نارازیبوون، لەگەڵ خۆتەسلیم كردن بە خودا.

دووەم: تەسلیمبوون بە حوكمی گەردوونی قەدەری: ئەم جۆرە قەدەرە جێگەی خلیسكانی پێیەكانە، و تێگەیشتنی گومڕایانەی لێوە بەرهەم هاتووە، مرۆڤایەتی سەرسام كردووە، و ململانێ و دوژمنایەتی خولقاندووە، ئەوەش بابەتی "ڕازیبوونە بە

قەزای خودایی"، پێشتر قسە لەبارەیەوە كراوە و ئەوەندە بەسە، ئەوەمان روون كردەوە كە تەسلیم بوون بە قەزا كارێكی ستایشكراوە گەر فەرمان بە لادان و ململانێ كردنی نەكرابێت، وەك ئەو ناخۆشییانەی كە هیچ دەسەڵاتێك نییە بۆ لادانیان.

ئەو ئەحكامانەش فەرمان بە لادانیان كراوە دروست نییە مرۆڤ خۆی رادەستیان بكات، بەڵكو بەندایەتی بریتییە لە لادانی ئەو ئەحكامانە بە ئەحكامی تر كە لای خودا باشتر و خۆشەویستترن.

## ۞ فیترەتێك ئیلهاممان بكات لە داوای بەڵگە بێنیازمان بكات

یەكەمین تەسلیمبوون و سەرەتای تەسلیمبوون ئەوەیە لەسەر یەكتاپەرستی بەڵگەت پێویست نەبێت، چۆن وەلی و خۆشەویستی خۆت ئاتاج دەكەیت بە هێنانەوەی بەڵگە لەسەر یەكتایی و ناسینی، بە جۆرێك نەتەوێت گەشت بكەی بۆ لای تا بەڵگە لەسەر بوون و یەكتایی و دەسەڵات و ویستی خۆی نەهێنێتەوە؟!

گەر پیاوێك بانگهێشت بكات بۆ ماڵەكەی و تۆش بڵێی بە پەیامهێنەكەی نایەم لەگەڵت تا بەڵگەم بۆ نەهێنیتەوە لەسەر بوونی ئەو كەسەی تۆی بۆ لای من رەوانەكردووە، دەبێت بیسەلمێنی ئەو كەسێكە پێویستە گوێی لێ بگیرێت و شایستەی ئەوەیە روو لە دەرگای بكەیت، ئەو كاتە تۆ لە بانگەشەی جوامێری و پیاوەتیدا راستت نەكردووە، ئەی دەبێ حاڵی كەسێك چۆن بێت داوای بەڵگە بكات لەسەر كەسێك كە بوون و یەكتایی و دەسەڵات و پەروەردگاریی و خوایەتییەكەی لە هەرچی شتە رۆشنتر و دیارترە؟ هەر بەڵگەیەك بهێنیتەوە لە رۆشنی و بەهێزیدا ناگاتە رۆشنی و بەهێزی یەكتایی و كەماڵی خودای موتەعال، دانپیانانی فیترەت بە دروستكەری هەموو جیهانەكان هیچ شتێك ناتوانێت رایبگرێت، و ئاتاجی هیچ بەڵگە و بورهانێك نییە، بۆیە هەرگیز پێغەمبەران گەلانی خۆیان بانگ نەكردووە بۆ ئەوەی دان بە بوونی دروستكەری جیهانەكاندا بنێن، بەڵكو بانگیان كردوون بۆ یەكتاپەرستی و بەندایەتی خودا، بەجۆرێك لەگەڵیان دواون وەك ئەوەی هیچ گومانێك بوونی نەبێت لەلای ئەوان لەسەر بوونی خودایەك كە دروستكەری جیهانانە و ئاتاجی هیچ بەڵگە هێنانەوەیەك ناكات لەسەری ﴿قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي اللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ إبراهيم: ١٠، كەی دروستە بەڵگە

لەسەر شتێك بهێنیتەوە کە لە بەڵگەکە ڕۆشنتر و دیارترە؟ تا هەندێ لە عاریفان دەڵێن: چۆن داوای بەڵگە لەسەر کەسێك بکەم کە خۆی دەبێتە بەڵگە لەسەر هەموو شتێك؟ خۆبەستنەوەی سالیکی ڕێگەی خودا بە بەڵگەوە و وەستان لەسەری بەڵگەی نەبوونی یەقینە، بەڵکو کۆتوبەند دەبێت بە بەڵگەیەك کە دەیگەنێتە خودا دوای ناسینی خودا، کەسەکە دوای ناسینی خودا پێویستی بە بەڵگەیە تاکو بە خودا بگات و ڕێگەی گەیشتنی پێ نیشان بدات، ئەو بەڵگەیە بریتییە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ)، لەسەر پێغەمبەرایەتی دەوەستێت و پێیەوە پابەند دەبێت، هەموو هەنگاوەکانی لەدوای پێغەمبەرەوەیە، ئەو کاتە زانست و یەقین و نووری ڕۆشنبینی(بەصیرەت) کەسەکە بێنیازی دەکات لە زۆرێك لە بەڵگەی خاوەن بەڵگەکان و ئەربابی کەلام کە لێوانلێون بە زۆرلەخۆکردن، ئەو بە گرنگتر لەوانەوە سەرقاڵە و هەر ئەوەش ئامانجی داواکراوە.

نموونەی ئەو کەسە: ئەهلی کەلام تەمەنیان لە گەیشتنە ئەو ئەنجامەدا بەخت دەکەن کە جیهان ڕووداوە(حدث) یان هەربووە(أزلي)، ئەم گەردوونە دروستکەری هەیە، یان نە؟ وەڵامی ئەو پرسیارانە لای سالیکی ڕاستگۆی خاوەن یەقین دراوەتەوە و کۆتایی پێهاتووە، ئەوەی خاوەن بەڵگەکان بەدوایدا دەگەڕێن و جێگەی گومانە لەلایان و پرسیار و وەڵامی ناکۆتا لەئامێز دەگرێت لای سالیکی ڕێگەی خودا پەردەی لەسەر هەڵگیراوە و یەقینە، خۆ کۆتوبەند کردن لە سلوکەکەیدا بە بەڵگە و نموونەی ئەهلی کەلام کە خۆیان لە ڕێگەکە دابراون دەرچوونە لە جوامێری و پیاوەتی.

ئەمە حەقێکە هیچ عاریفێك کێبەرکێی لەسەر ناکات، ئەهلی کەلام سەرقاڵی زەمان و مەکان و حەقیقەت و خەیاڵ و گەردوونە جۆراوجۆرەکانن و لەو بازنەدا دەسوڕێنەوە و ناگەن بە مەعبوودی حەق و دروستکەری زەمان و مەکان و گەردوونەکان، سالیکی ڕێگەی خودا ئەو دۆخەی بەجێهێڵاوە و دڵی لەسەر مەعبوودی حەق کۆکردۆتەوە ئەمەش لەڕووی ناو و سیفەتە بەرز و بڵندەکانییەوە، لا بەلای شتێکی تردا جگە لە خودا ناکاتەوە، دڵی جگە لە خودا سەرگەرمی هیچ شتێکی تر نابێت.

ئەهلی کەلام پەرتەوازەیە و سەرقاڵی زانینی زەمان و مەکانن، عاریفیش نایەوێت کەمترین کاتی بەفیڕۆ بڕوات جگە لە ڕۆیشتن بەرەو خودای خاوەن زەمان و مەکان.

## ۞ شوبوهات(گومان و تەمومژ) و شەهەوات(حەز و هەوەس) هۆی دابڕانن

کەماڵی تەسلیمبوون بە خودا ڕزگاربوونە لە گومان و تەمومژ و بەرھەڵستکاری هەواڵی ڕاگەیەنراو(مەبەست پێی ئەو هەواڵانەیە قورئان و فەرمووده ڕایانگەیاندووه)، یان ڕزگاربوون لە شەهوەتێك بەرهەڵستکاری بڕیار بکات(بڕیار واتە ئەمر و نەهی)، یان ویستێك بەرهەڵستکاری ئیخلاص بکات، یان بەرهەڵستکارییەك دژ بە قەدەر و شەرع بێت، خاوەنی ئەم ڕزگاربوونە: خاوەنی دڵێکی سەلامەتە کە لە ڕۆژی دوایدا هیچ کەس ڕزگاری نابێت مەگەر کەسێك خاوەنی ئەو دڵە بێت، خۆ تەسلیم کردن بە خودا دژی ململانێ و سەرپێچییە.

**ململانێی:** بە هۆی گومانێکی تێکدەرەوەیە کە بەرهەڵستکاری باوەڕهێنان بە هەواڵە ڕاگەیەنراوەکان دەکات، ئەو هەواڵانەی خودا وەسفی خۆی پێ کردووە لە سیفات و کرداری، هەروەها ئەو هەواڵانەی دەربارەی ڕۆژی دوایی بەیانی کردوون، غەیری ئەوانەش لە هەواڵی تر، خۆرادەستکردن بۆ هەموو ئەوانە: بریتییە لە وازهێنان لە گومانی پووچی ئەهلی کەلام.

**شەهوەیەك:** کە بەرهەڵستکاری بڕیاری خودای موتەعال بکات، تەسلیمبوون تیایدا بریتییە لە ڕزگاربوون لەو حەز و هەوەس و ئارەزووە.

**یان ویستێك:** بەرهەڵستکاری ویستی خودا بکات بۆ بەندەکەی(واتە بەرهەڵستکاری ئەو بڕیارەی خودا بەسەر بەندەکەیدا دەریدەکات)، بەرهەڵستکارییەکە ئەوەیە ویستی بەندەکە پێچەوانەی ویستی پەروەردگار بۆ بەندەکەی ببێتەوە، تەسلیمبوونیش تیایدا بریتییە لە وەلانانی ئەو ویستەی خۆی و تەسلیمبوون بە ویستی خودا بۆ ئەو.

**یان بەرهەڵستکارییەك:** بەرهەڵستی حیکمەتی خودا بکات لە بوون و بڕیار(خەلق و ئەمر)دا، بەوەی پێی وابێت حیکمەت پێچەوانەیە لەگەڵ ئەوەی شەرع و قەزا و قەدەر بڕیاری لێ دەدات، تەسلیمبوون تیایدا ڕزگاربوونە لە کۆی ئەو کێبەرکێ و ملنەدان و بەرهەڵستکارییە.

بەم برە ڕۆشن دەبێتەوە کە تەسلیمبوون لە بەرزترین مەقامەکانی باوەڕە و بالاترین ڕێکەی خاسانی خودایە، بەڵکو تەسلیمبوون بریتییە لە حەقیقەتی صدیقییەت کە دەکەوێتە دوای پلەی پێغەمبەرایەتییەوە، کامڵترین کەس لە تەسلیمبووندا کامڵترین کەسە لە صدیقییەتدا.

## (٢٨) (منزلة الصبر)

# مەنزیلەی ئارامگرتن

لە مەنزیلەکانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی ئارامگرتنە.

ئیمامی ئەحمەد-رەحمەتی خوای لێ بێت- دەفەرموێت: ئارامگرتن لە قورئاندا لە نزیکەی نەوەد شوێندا هاتووە.

بە کۆدەنگی ئوممەت ئارامگرتن واجبە و نیوەی ئیمانە، ئیمان دوو بەشە بەشێکی ئارامگرتنە و بەشەکەی تری شوکرە.

لە قورئاندا بە شازدە جۆر باس لەبارەی ئارامگرتنەوە کراوە:

یەکەم: فەرمان کردن بە ئارامگرتن وەك ئایەتی ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ﴾البقرة: ١٥٣ ﴿وَٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ﴾ البقرة: ٤٥ ﴿ٱصْبِرُوا۟ وَصَابِرُوا۟ ﴾ آل عمران: ٢٠٠ ﴿ وَٱصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ﴾النحل: ١٢٧

دووەم: نەهیکردن لە دژی ئارامگرتن ﴿ فَٱصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ ﴾ الأحقاف: ٣٥ ﴿فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلْأَدْبَارَ ﴿١٥﴾ ﴾ الأنفال: ١٥، پشتهەڵکردن و راکردن لە جەنگدا وازهێنانە لە ئارامگرتن و خۆڕاگری﴿وَلَا تُبْطِلُوٓا۟ أَعْمَـٰلَكُمْ ﴿٣٣﴾ ﴾ محمد: ٣٣، بەتاڵکردنەوەی کردارەکان بریتییە لە وازهێنان لە ئارامگرتن بە تەواوی﴿وَلَا تَهِنُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ ﴾ آل عمران: ١٣٩، داڕوخان و ورەنزمی بەهۆی نەبوونی ئارامگرتنەوەیە.

سێیەم: مەدح و سەنای ئەهلی ئارامگرتن، وەك ﴿ ٱلصَّـٰبِرِينَ وَٱلصَّـٰدِقِينَ ﴾ آل عمران: ١٧ ﴿وَٱلصَّـٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ ﴾ البقرة: ١٧٧، لەم جۆرە لە قورئاندا زۆرە.

چوارەم: خودا خۆشەویستی ئەهلی ئارامگرتنی بە واجب داناوە﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ ﴾ آل عمران: ١٤٦

پێنجەم: واجبوونی هاوەڵی و دۆستایەتی خودا بۆ ئەهلی ئارامگرتن، کە لەگەڵبوونێکی تایبەتە، پاراستنیان و سەرخستنیان و پشتیوانی کردنیان لەئامێز دەگرێت، ئەم لەگەڵبوونە جیایە لە لەگەڵبوونی گشتی کە بریتییە لە لەگەڵبوونی زانست و

ئابلۆقەدان ﴿وَاصْبِرُوا إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ ﴿٤٦﴾﴾ الأنفال: ٤٦ ﴿وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ ﴿٢٤٩﴾﴾ البقرة: ٢٤٩

شەشەم: خودای موتەعال رایگەیاندووە كە ئارامگرتن باشترین كارێكە بۆ خاوەنەكەی ﴿وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّابِرِينَ ﴿١٢٦﴾﴾ النحل: ١٢٦ ﴿وَأَن تَصْبِرُوا خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ النساء: ٢٥

حەوتەم: واجبوونی پاداشت بۆ ئەهلی ئارامگرتن بە باشترین كاروكردەوەیان ﴿وَلَنَجْزِيَنَّ الَّذِينَ صَبَرُوا أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾﴾ النحل: ٩٦

هەشتەم: واجبوونی پاداشت بۆ ئەهلی ئارامگرتن لە هەژمارگرتن نایەت ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿١٠﴾﴾ الزمر: ١٠

نۆیەم: راگەیاندنی مژدە بۆ ئەهلی ئارامگرتن﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوْفِ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الْأَمْوَالِ وَالْأَنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ ۗ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ ﴿١٥٥﴾﴾ البقرة: ١٥٥

دەیەم: دەستەبەركردنی سەركەوتن و كۆمەكی بۆ ئەهلی ئارامگرتن﴿ بَلَىٰ ۚ إِن تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَٰذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ آلَافٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴿١٢٥﴾﴾ آل عمران: ١٢٥، هەر بەو جۆرە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) ((واعلم أن النصر مع الصبر))

یازدەهەم: هەواڵدان بەوەی ئەهلی ئارامگرتن ئەهلی لێبڕان و كارە مەزنەكانن﴿ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ ﴿٤٣﴾﴾ الشورى: ٤٣

دوازدەهەم: هەواڵدان بەوەی ئەهلی ئارامگرتن دەگەنە كاروكردەوەی چاكە و پاداشت و بەشی مەزن ﴿وَيْلَكُمْ ثَوَابُ اللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا وَلَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الصَّابِرُونَ ﴿٨٠﴾﴾ القصص: ٨٠﴿ وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾﴾ فصلت: ٣٥

سیازدەهەم: راگەیاندنی ئەوەی كە ئەهلی ئارامگرتن پەند و ئامۆژگاری لە ئایەتەكان دەبینن، وەك فەرمانی خودای موتەعال بە موسا (عليه السلام) ﴿أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَذَكِّرْهُم بِأَيَّامِ اللَّهِ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٥﴾﴾ إبراهيم: ٥، هەروەها دەربارەی ئەهلی سبأ ﴿فَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَاهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿١٩﴾﴾ سبأ: ١٩، هەروەها لە سورەتی "الشورى"دا﴿وَمِنْ آيَاتِهِ الْجَوَارِ فِي الْبَحْرِ كَالْأَعْلَامِ ﴿٣٢﴾ إِن يَشَأْ يُسْكِنِ الرِّيحَ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣٣﴾﴾ الشورى: ٣٢ — ٣٣

چواردەهەم: هەوڵدان بەوەی سەركەوتنی داواكراو و ويستراو و رزگاربوون لە ناخۆشی و ئـازار و چـوونە بەهەشـت بـە ئـارامگرتن دەبێـت، وەك ﴿وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ ۚ فَنِعْمَ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٤﴾﴾ الرعد: ٢٣ — ٢٤

پازدەهەم: كەسی ئارامگر پلەی ئیمامەتی پێ دەدرێت، گـوێم لـە "شـيخ الإسـلام إبـن تيمية–قدس الله روحه–" بـوو دەيفـەرموو: بـە ئـارامگرتن و يـەقين ئيمامـەت لـە ئايينـدا بەدەســـت ديـــت، وەك ﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا ۖ وَكَانُوا بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾﴾ السجدة: ٢٤

شازدەهەم: هاوتابوون و نزيكبوونەوەی ئارامگرتن لەگەڵ مەقامـەكانی تـری ئيسـلام و ئيمانـدا، وەك چۆن خـودا–سـبحانه– هاوتـای كـردووە بـە يـەقين و ئيمـان و تـەقوا و تەوەكول و شوكر و كرداری چاكە و بەزەيی.

لەبـەر ئەوەيـە ئـارامگرتن لەگـەڵ بـاوەڕدا وەك سـەر وايـە بـۆ جەسـتە، هـەر كـەس ئارامگرتنی نەبێت باوەڕی نييە، وەك چۆن جەستە بەبێ سـەر بـوونی نييـە، عومـەری كوڕی خەتتاب–خوا لێـی رازی بێـت– دەفـەرموێت ((هـەر كـەس ئـارام بگرێـت و دان بەخۆيدا بگرێت خودا خۆڕاگری پێ دەدات))

لە فەرموودەيەكی سەحيحدا ((**عجبا لأمر المؤمن إن أمره كله له خير، وليس ذالـك لأحـد إلا للمؤمن، إن اصابته السراء شكر فكان خيرا له، وإن أصابته الضراء صبر فكان خيرا له**))

پێغەمبەر(ﷺ) فـەرمانی بـە ئەنصـار كـرد ئـارام بگـرن بـەهۆی ئـەو منپەرسـتی و خۆپەرستييەی لەدوای ئەو رووبـەڕوويان دەبێتـەوە تـا لەسـەر حـەوزی كەوسـەر پێـی دەگەنەوە.

هەروەها لە كاتی گەيشتن بە دوژمـن و رووبەڕووبوونـەوە فـەرمانی بـە ئـارامگرتن پـێ كـردوون، هـەروەها فـەرمانی بـە ئـارامگرتن كـردووە لـەكاتی بـەڵا و ناخۆشـيدا، دەفەرموێت ((**أنه إنما يكون عند الصدمة الأولى**))–واتـە ئـارامگرتن لەگـەڵ ئـازار و تـاڵی سەرەتای بەڵا و ناخۆشييەكاندايە.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی كردوە بەوانەی تووشی بەڵا و ناخۆشی دەبن بـە بەسـوودترين شت بۆيان كە بريتييە لە ئارامگرتن و داوای پاداشت لـە خـودا، ئـەوە ناخۆشـييەكانی كـەم دەكاتـەوە و پاداشـتی گـەورەی بـۆ بەدەسـتدەهێنێت، شينوشـەپۆڕ و هـاوار و

نیگەرانی و بێزاری و نارازیبوون بەلا و ناخۆشییەکان لەسەر مرۆڤ زیاتر دەکەن و پاداشتی گەورەی لەدەست ئەچێت.

پێغەمبەر(ﷺ) رایگەیاندووە کە ئارامگرتن هەر هەمووی خێرە ((هیچ کەس خێرێکی پێنەدراوە گەورەتر و بەرینتر بێت لە ئارامگرتن))

## ۞ بالاترین ئارامگرتن ئەو ئارامگرتنەیە ویست و هەڵبژاردنی تێدابێت

ئارامگرتن ((الصبر)) لە زمانەوانیدا بریتییە لە ((الحبس والكف))-بەندکردن و خۆگرتنەوە و دەستگرتنەوە، بۆیە وتراوە "قتل فلان صبرا"کەر بگیرێت و بەند بکرێت. وەك ئایەتی﴿وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ ﴿٢٨﴾﴾ الكهف: ٢٨، واتە لەگەڵیان بمێنەرەوە وەك ئەوەی خۆت بەند بکەی لەلایان.

ئارامگرتن بریتییە لە بەندکردنی نەفس و راگرتنی لە نائارامی و نیگەرانی و نارازیبوون، هەروەها بەندکردن و گرتنەوەی زمان لە سکالا، هەر بەو جۆرە بەندکردنی ئەندامەکان لە شڵەژان و پەشۆکان و پەلاماری چەپ و راست.

ئارامگرتن سێ جۆرە: ئارامگرتن لەسەر گوێڕایەڵی خودا، ئارامگرتن لەسەر ئەنجام نەدانی گوناه و یاخیبوون و سەرپێچی، لەگەڵ ئارامگرتن لەسەر تاقیکردنەوەکانی خودا بۆ بەندەکانی.

یەکەم و دووەم: ئارامگرتن لەسەر ئەوەی مرۆڤ ئەنجامی دەدات و ئەنجامی نادات، واتە کەسپی مرۆڤە و لەدەستی ئەودایە، سێیەمیان ئارامگرتنێکە لەسەر شتێك کە دەستی ئەوی تێدا نییە.

گوێم لە "شیخ الإسلام إبن تيمية-قدس الله روحه" بوو دەیفەرموو: ئارامگرتنی یوسف لەسەر ئەوەی ئافرەتەکەی عەزیزی مصر داوای لێ دەکرد مەزنتر بوو لە ئارام گرتنی لە چاڵەکەدا کاتێك براکانی فڕێیاندایە ناوی، هەروەها مەزنتر بوو لە فرۆشتنی و دوورخستنەوەی لە باوکی، چونکە ئەو کارانە بەسەریدا هات و هیچ ویست بڕیارێکی ئەوی تێدا نەبوو، بەندە هیچ چارێکی نییە جگە لە ئارامگرتن، بەلام ئارامگرتنی لە گوناه نەکردن ئارامگرتنی ویست و هەڵبژاردن و رازیبوون و جەنگانە لەگەڵ نەفس، بەتایبەت لەگەڵ ئەو گوناهانەی کە لە ناخی مرۆڤدا پاڵنەر و حەز هەیە بۆ

ئەنجامدانیان، یوسف لاوێك بوو، پاڵنەری لاوێتی تیایدا بەهێز بوو، كەسێكی بێ هاوسەر بوو، رێگەیەك لەبەردەمیدا نەبوو تینی حەزەكان دابمركێنێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا غەریب و دوور لە وڵات بوو، كەسی غەریب لە وڵاتی غوربەتدا زۆر شەرم ناكات وەك ئەوەی لە وڵاتی خۆیدا شەرمی لێ دەكات لە هاوەڵ و دۆست و ناسراو و خانەوادە، ئەو بەندەیەك بوو، بەندەش حاڵی وەك حاڵی كەسی ئازاد نییە، ئافرەتەكە جوان بوو، خاوەنی پلە و پایە بوو، خۆی بە سەرداری یوسف دەزانی، چاودێر بەسەریانەوە نەبوو، ئافرەتەكە داوای كرد بوو ئەو كارە ئەنجام بدات، زۆر پێداگری لە ئەنجامدانی ئەو كارە دەكرد، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هەڕەشەی لێ كرد بوو گەر ئەو كارە ئەنجام نەدات بەندی دەكات و شانوشكۆی بچووك دەكاتەوە، لەگەڵ هەموو ئەم پاڵنەرانەدا: یوسف بە هەڵبژاردنی خۆی ئارامی گرت و ئەوەی لەلای خودایە بەسەر ئەو گوناهەدا هەڵیبژارد، ئارامگرتنی ئەمە لە كوێ و ئارامگرتنی ناو چاڵەكە لە كوێ كە هیچ ویستێكی ئەوی تێدا نەبوو؟

هەروەها دەیفەرموو: ئارامگرتن لەسەر جێبەجێ كردنی فەرمان و گوێڕایەڵییەكان كامڵترە و باشترە لە دووركەوتنەوە لە حەرامەكان، چونكە لەلای خودا بەرژەوەندی ئەنجامدانی كاری چاكە خۆشەویستترە لە بەرژەوەندی وازهێنان و دەستگرتنەوە لە گوناه و یاخیبوون، هەر بەو جۆرە مەفسەدەی گوێڕایەڵی نەكردن و ئەنجام نەدانی كاری چاكە لەلای خودا خراپترە لە مەفسەدەی بوونی گوناه و یاخیبوون.

شێخی ئیبن تەیمیە-رەحمەتی خوای لێ بێت- كتێبێكی هەیە كە لە بیست رووەوە بەراوردی پێ كردووە و ئێرە جێگەی باسكردنی نییە.

مەبەست لێرەدا قسەكردنە لەسەر "ئارامگرتن" و حەقیقەت و پلە و ئاستی ئارامگرتن، خوا كۆمەك و یاریدەدەرە.

### ❁ ئاستەكانی ئارامگرتن

**ئارامگرتن سێ جۆرە:** ئارامگرتنێك بە خوداوە، ئارامگرتنێك بۆ خودا، ئارامگرتنێك لەگەڵ خودا.

**یەكەمیان (ئارامگرتن بە خوداوە)** بریتییە لە داوای كۆمەكی و یارمەتی، بزانێت كە خودا خۆی ئارامی دەبەخشێت، ئارامگرتنی بەندەی خودا بە خوداوەیە نەك بە خودی

خۆیـەوە، خـودای موتـەعال دەفـەرموێت ﴿ وَٱصۡبِرۡ وَمَا صَبۡرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ﴾النحـل: ١٢٧، واتە گەر خودا ئارامگرتنت پێ نەبەخشێت ناتوانیت ئارام بگریت.

**دووەم، ئارامگرتن بۆ خودا:** پاڵنەری ئارامگرتنەکەی بـۆ خۆشەویسـتی خـودا بێـت و مەبەستی رووی پاکی ئەو بێت و بیەوێت بەو کـارە لـە خـودا نزیـك ببێتـەوە، نـەك بـۆ دەرخستنی هێزی دەروون و داوای ستایش لە خەڵکی و مەبەست و مەرامی تر.

**سێیەم، ئارامگرتن لەگەڵ خودا:** ئەمەش بریتییە لە سوڕانەوەی بەندەی خودا لەگـەڵ ویسـتی ئـایینی خـودا، هـەروەها شـاندانە ژێـر ئەحکامـەکانی ئـایین، نەفسـی خـۆی لەپایان(لە پای بڕیارەکان) رابگرێت، بۆ کوێ رۆیشتن لەگەڵیان بـڕوات، پێیـان نایـە چ مەنزڵێك پێی تێ بنێت و بە وەسـتانیان بوەسـتێت، روویـان لـە هـەر کـوێ کـرد رووی تێبکات و لە کوێ رەشماڵیان هەڵدا رەشماڵ هەڵبدات.

ئەمەیە مانای ئارامگرتن لەگەڵ خودا، واتە نەفسی خۆی لەسەر فەرمانەکان و ئـەوەی خودا پێیخۆشە رابگرێـت، ئـەم ئارامگرتنـە تونـدترین جـۆری ئارامگرتنـە، ئـەم جـۆرە ئارامگرتنی صدیقیینە.

جونەید دەفەرموێت: رۆیشتن لە دونیاوە بۆ دوارۆژ سووك و ئاسـانە لەسـەر بـاوەڕدار، بەڵام کۆچکردن لە خەڵکی لەبەر خودا گرانە، بردنـی نـەفس لەگـەڵ خـودادا گـرانترە، ئارامگرتن لەگەڵ خودادا زۆر گرانترە.

دەربـارەی ئـارامگرتن پرسـیاری لێکـرا؟ فـەرمووی: خواردنـەوەی تـاڵاوە بـەبێ رووگرژکردن.

وتـراوە: ئـارامگرتن بریتییـە لـە راهێنـانی دەروون لەسـەر هێرشـکردنە سـەر ناخۆشییەکان.

هەروەها وتراوە: ئارامگرتن بریتییە لە مانەوە لەگەڵ بەڵادا بە باشترین هاوەڵی کردن، هەر وەك مانەوە لەگەڵ خۆشی و لەشساغیدا.

عەمری کوڕی عثمان دەفەرموێت: ئارامگرتن بریتییـە لـە خـۆڕاگری لەگـەڵ خـودادا، و وەرگرتنی بەڵا و ناخۆشییەکانی بە سنگ فراوانییەوە.

"الخواص" دەڵێت: ئارامگرتن بریتییە لە خۆڕاگری لەسەر ئەحکامی کیتاب و سوننە.

وتراوە: ئاستەکانی ئارامگران پێـنجن: (صابر، مصطبر، متصبر، صبور، صبار)، "صـابر": لە هەموویان گشتگیرترە، "المصطبر" ئەو کەسەیە ئارامگرتن بەدەست دەهێنێت و پێی

پڕ دەبێت، "المتصبر": ئەو كەسەیە زۆر لە نەفسی خۆی دەكات بۆ ئارامگرتن، "الصبور" كەسێك كە ئارامگرتنەكەی زۆر مەزنە و ئارامگرتنی ئەو گەورەترە لە ئارامگرتنی كەسانی تر، "الصبار" كەسی زۆر ئارامگر، واتە ئارامگرتنەكەی زۆر زۆرە چ لە رادە و ئاستدا بێت، چ لە بڕ و زۆریدا، بەڵام "صبور" لە وەسف و چۆنێتیدایە.

لەسەر ئەم ئایەتە ﴿ٱصۡبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ﴾ آل عمران: ٢٠٠ وتراوە: ئارامگرتنەكە گواستنەوەیە لە نزمەوە بۆ بەرز، بۆیە "صبر" لەخوار "مصابرة"وەیە، "مصابرة"ش لەخوار "مرابطة"وەیە، وشەی "مرابطة" لەسەر كێشی "مفاعلة"یە كە لە "الربط" بە مانای "الشد–توندكردن و بەستنەوە"وەرگیراوە، كەسی "المرابط" بەو ناوە ناونراوە چونكە ئەسپەكانیان دەبەستنەوە و چاوەڕوانی هاتنی دوژمن دەكەن، پاشان بە هەموو كەسێكی چاوەڕوانكەر"المنتظر" كە نەفسی خۆی لە گوێڕایەڵی و چاكەدا راگرتووە وتراوە "مرابط"، وەك فەرموودەكەی پێغەمبەر(ﷺ) ((ألا أخبركم بما يمحو الله به الخطايا، ويرفع به الدرجات؟ إسباغ الوضوء على المكاره، وكثرة الخطا إلى المساجد، وانتظار الصلاة بعد الصلاة، فذالكم الرباط، فذالكم الرباط)).

دیسان لەسەر ئایەتەكە ﴿ٱصۡبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ﴾ وتراوە: نەفستان لەسەر كاری چاكە و گوێڕایەڵی خودا رابگرن و بەدڵتان لەسەر بەڵا دانبەخۆتاندا بگرن و لەسەر شەوق و تامەزرۆیی بۆ لای خودا خۆتان بهێڵنەوە.

هەروەها لەسەر ئایەتەكە وتراوە: "إصبروا في الله، وصابروا بالله، ورابطوا مع الله"– ئارامبگرن لەگەڵ خودا و دان بە خۆتاندا بگرن بە خوداوە و خۆتان رابگرن و خۆتان بەند بكەن لەگەڵ خودا.

هەروەها وتراوە: ئارامبگرن لەسەر نیعمەتەكان و خۆشییەكان، دان بە خۆتاندا بگرن لەسەر بەڵا و ناخۆشییەكان، و لە مەملەكەتی دوژمندا خۆڕاگرین و چاوەڕوان بن، لەخودای زەوی و ئاسمانەكان بترسن تاكو لە خانەی هەتاهەتاییدا سەرفرازی بەدەست بهێنن.

"الصبر" لەگەڵ نەفسی خۆتدایە، "المصابرة" لەنێوان تۆ و دوژمندایە، "المرابطة" بریتییە لە خۆڕاگری و ئامادەكردنی هێز و پێویستی، وەك چۆن خۆڕاگری لە سەنگەرەكاندا پێویستە تاكو دوژمن لێیەوە هێرش نەهێنێت، هەر بەو جۆرە مانەوە

لە سەنگەری دڵدا پێویستە تاكو دوژمن(شەیتان) لێیەوە هێرش نەكاتە سەرت، لەوێوە داگیری بكات و كاول و وێرانی بكات و خراپەی تیا بچێنێت.

وتراوە: تاڵاوی ئارامگرتن بنۆشە، گەر كوشتیتی بە شەهیدی سەردەنێیتەوە، گەر زیندوو رایگرتی بە عیززەت و سەربەرزییەوە دەژیت.

وتراوە: ئارامگرتن بۆ خودا دەوڵەمەندی و بێنیازییە و ئارامگرتن بە خوداوە مانەوەی هەتاهەتاییە، ئارامگرتن لەبەر خودا بەڵا و تاقیكردنەوەیە، ئارامگرتن لەگەڵ خودا وەفادارییە، ئارامگرتن بەبێ خودا بێمەیلی و جەفایە، ئارامگرتن لەسەر داوا ناونیشانی سەركەوتن و زەفەر پێبردنە، ئارامگرتن لەسەر ناخۆشییەكان ناونیشانی دەرووی خودایە.

وتراوە: حاڵی بەندە لەگەڵ خودا خۆراگری و مانەوەیە، لەگەڵ ئەو شتانەی لەخوار خوداوەن نەیاریكردنە.

لە كتێبی "الأدب البخاري"دا هاتووە ((پرسیار لە پێغەمبەری خودا كرا لەمەڕ ئیمان؟ فەرمووی: ئارامگرتن و لێبووردەیی و سنگفراوانی))، ئەم فەرموودەیەی لە "موسى بن إسماعيل"ەوە لە "سويد" لە "عبدالله بن عبيد بن عمير" لە باوكییەوە، ئەویش لە باپیرییەوە ریوات كردووە.

ئەم فەرموودەیە جوانترین و پوختترین كەلامێكە لەسەر ئارامگرتن وترابێت كە تیایدا هەموو مەقامەكانی باوەڕ لە سەرەتاوە بۆ كۆتایی لەئامێز دەگرێت.

دوو شت لە نەفس داوا دەكرێت: بەخشینی ئەوەی فەرمانی پێكراوە، ئەوەش كە وا دەكات بتوانێت ببەخشێت بریتییە لە لەخۆبوردەیی و سنگفراوانی(السماحة)، هەروەها وازهێنان لەوەی نەهیلێكراوە و دووركەوتنەوە لێی، پاڵنەری ئەمەش بریتییە لە ئارامگرتن.

خودای موتەعال لە قورئاندا فەرمانی بە ئارامگرتنی جوان (الصبر الجميل) كردووە، هەروەها فەرمانی كردووە بە لێبوردەیی و سنگفراوانی جوان و باش(الصفح الجميل)، هەر بەو جۆرە فەرمانی كردووە بە كۆچكردنی باش و جوان (الهجر الجميل)، لە "شيخ الإسلام إبن تيمية-قدس الله روحه-"م بیست دەیفەرموو: "ئارامگرتنی جوان" ئەو ئارامگرتنەیە كە سكاڵای لەناو و لەگەڵ نەبێت، "لێبووردنی جوان" ئەوەیە كە لۆمەی لەگەڵ نەبێت، "كۆچكردنی جوان"یش ئەوەیە كە ئازاری بۆ بەرانبەر لەگەڵ نەبێت.

ئیبن عیینة لەسەر ئایـەتی ﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا ﴾السجدة: ٢٤، دەفەرموێت: ئەوانە سەری ئەمرەكانیان گرتە دەست (واتـە ئـارامگرتن)، بۆیـە خـودا ئەوانی كرد بە سەركردە و ئیمام.

سكاڵا بۆ لای خودا نەرێی ئارامگرتن ناكات، یەعقوب (عليه السلام) بەڵێنی ئـارامگرتنی جـوانی دا، گەر پێغەمبەرێك بـەڵێن بـدات دەیباتـە سـەر لەگـەڵ ئەوەشدا دواتـر دەفـەرموێت ﴿ قَالَ إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللَّهِ ﴾ یوسف: ٨٦، هـەر وەك یـەعقوب ئـەیوب (عليه السلام) خودا هەواڵ دەربارەی رادەگەیەنێت كە ﴿إِنَّا وَجَدْنَاهُ صَابِرًا ﴾ص: ٤٤ –ئـارام و خـۆڕاگر بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئـەیوب دەفـەرموێت ﴿أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾ الأنبياء: ٨٣، ئەوەی نەرێی ئارامگرتن دەكات سكاڵایە لەدەست خـودا نـەك سـكاڵا بـۆ لای خودا، وەك ئەو كەسـەی پیـاوێكی بـینی سـكاڵای هـەژاری و پێویسـتی خـۆی لای كەسێك دەكرد، ئـەویش پێـی وت: ئـەی فـلان سـكاڵا لەدەسـتی كەسـێك دەكـەی كـە بەزەیی بە تۆ هەیە لـەلای كەسـێك كـە بـەزەیی بـە تـۆ نییـە، پاشـان ئـەم دوو دێـڕە هۆنراوەی هۆنییەوە:

(وإذا عرتك بلية فاصبر لها صبر الكريم فإنه بك أعلم
وإذا شكوت إلى ابن آدم إنما تشكو الرحيم إلى الذي لا يرحم)

## ۞ گران............. بەتام

بەڵام هەرچەند دەربڕینەكان جۆراوجۆر بن جیاوازی نییە لـەنێوان ئـەهلی زانسـتدا كـە روونترین و دیارترین مانای "ئـارامگرتن" بریتییـە لـە راگرتن و بەنـدكردنی نـەفس لـە نەویستراو نەخوازراو(واتە شتە خراپەكان)، ئـارامگرتن گـرانترینی هـەموو مەنزیلەكانـە لەسەر خەڵكی بەگشتی، نامۆترینی رێگەی خۆشەویستییە.

بەگشتی ئارامگرتن لەسەر خـەڵكی گرانـە: چـونكە خـەڵكی رەشـۆكی لەسـەر رێگەكـە سەرەتایانە و ئەزموونیان لە سـەیر و سـلوكدا نییـە، و بـە بـڕینی مەنزیلـەكانی بـاوەڕ خۆیـان پاڵفتـە نـەكردووە، بۆیـە كاتێـك ناخۆشـییەك روویـان تێـدەكات نیگـەرانی و هەڵچوون روویان لێدەكات و ناتوانن شان بدەنە ژێر بەڵا و ئازارەكە، ئارامگرتن بۆ ئەو كەسـانە زۆر گـران دەبێـت، چـونكە ئـەهلی وەرزشـی دەروونـی نـیین تـاكو بـبن بـە

نیشتەجێی مەملەکەتی ئارامگرتن، و لە ئەهلی میحنەتیش نیین تاکو چێژ لە بەلا وەربگرن لە رازیبوونی خۆشەویستەکەیاندا.

ئەوەی کە ئارامگرتن نامۆیی و وەحشەتی ڕێگەی خۆشەویستییە: چونکە خۆشەویست چێژ وەردەگرێت لە تاقیکردنەوەی خۆشەویستەکەی بۆ ئەو، ئارامگرتن نەیاری و ناحەزی ئەو چێژوەرگرتنە بەدوای خۆیدا دەهێنێت، بەلام کەسی ئارامگر نەفسی لەسەر ئارامگرتن ناچار دەکات بۆ خودا(واتە تالاوی ئارامگرتن دەنۆشێت لە جێگەی شیرینی)، بۆیە ئارامگرتن لەسەر ڕێگەی خۆشەویستی وەحشەت و نامۆبوونە.

لەسەر وەحشەت خاڵێکی ورد و جوان هەیە: چێژوەرگرتن لە میحنەت لەناو خۆشەویستیدا لە داواکارییەکانی هۆگربوونی دڵە بە خۆشەویستەوە، ئەگەر هەستی بە ئازار کرد-بەجۆرێك ئاتاجی ئارامگرتن بوو- دڵ لە هۆگربوونەوە دەگوێزێتەوە بۆ وەحشەت، گەر وەحشەت نەبوایە ئەو دڵە هەستی بە ئازار و تالاوی ئارامگرتنەکە نەدەکرد.

ئارامگرتن گرنگترین مەنزیلەیە لەسەر ڕێگەی خۆشەویستی و پێویسترینە بۆ خۆشەویستان، ئەوان لە هەرچی مەنزیلەیە زیاتر پێویستیان بە مەنزیلەی ئارامگرتنە، ناسراوترین و ڕۆشنترین مەنزیلە لەسەر ڕێگەی یەکتاپەرستی بریتییە لە مەنزیلەی ئارامگرتن.

پێویستی موحیب(المحب) بەم مەنزیلەیە لە ڕادەبەدەرە.

گەر بوترێت: چۆن پێویستی موحیب بەم مەنزیلەیە لە ڕادەبەدەرە لەگەڵ نەرێکردنی کەماڵی خۆشەویستیدا، چونکە ئارامگرتن لەگەڵ ململانێی نەفسدایە بۆ ویست و مەرامی خۆشەویست؟

وتراوە: ئەمە ئەو خاڵەیە کە لە پێناویدا مەنزیلەی ئارامگرتن بووە بە پێویسترین و وابەستەترین مەنزیلە لەسەر ڕێگەی خۆشەویستی، بە ئارامگرتن خۆشەویستی ڕاست لە خۆشەویستی ناڕاست جیادەکرێتەوە، بە ئەندازەی هێزی ئارامگرتن لەسەر بەلا و ناخۆشییەکان -کە ویست و موورادی خۆشەویستە- ڕاستی و دروستی خۆشەویستی دەردەکەوێت.

لێرەوەیە کە خۆشەویستی زۆربەی خەڵکی درۆینەیە، هەر هەموو بانگەشەی خۆشەویستی خودا دەکەن، بەلام کاتێك بە ناخۆشییەکان تاقییان دەکاتەوە لە

پۆشاکی خۆشەویستی دێنە دەرەوە، لەو بارەدا تەنها ئارامگران لەسەری دەمێننەوە، گەر هەڵگرتنی کۆڵی قورس و شاندانە ژێر دژوارییەکان بە ئارامگرتن نەبوایە راستی و ناڕاستی خۆشەویستییەکەیان دەرنەدەکەوت، بەم رێگەیە دەردەکەوێت کە هەر کەس خۆشەویستییەکەی بۆ خودا مەزن بێت ئارامگرتنەکەشی مەزن دەبێت، بۆیە خودای موتەعال دۆستە تایبەتەکان و خۆشەویستانی بە ئارامگرتن وەسف دەکات، دەربارەی خۆشەویستی خۆی ئەیوب دەفەرموێت ﴿وَجَدْنَٰهُ صَابِرًا﴾ص: ٤٤، پاشان مەدح و سەنای دەکات و دەفەرموێت ﴿نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٤٤﴾﴾ ص: ٤٤.

خودای موتەعال فەرمانی بە خۆشەویستترین خەلقی خۆی(پێغەمبەر) کردووە بە ئارامگرتن لەژێر بڕیار و حوکمیدا، بەجوانترین شێوە وەسفی ئارامگرانی کردووە، باشترین پاداشتی بۆ داناون، پاداشتی کەسانی تر سنووردار و حساب کراوە، بەڵام پاداشتی ئەوان بێسنوور و بێحیسابە، ئارامگرتنی لەگەڵ مەقەمەکانی ئیسلام و ئیمان و ئیحساندا هاوەل کردووە–وەك پێشتر باسمان کرد–، کراوە بە هاوتای یەقین و تەوەکول و ئیمان و کرداری چاکە و تەقوا.

رایگەیاندووە کە سوودبینین لە بەڵگە و نیشانە خواییەکان لە ئاسۆی گەردوون و دەروونـدا بەشی ئارامگرانە، رایگەیاندووە کە ئارامگرتن بۆ ئەهلی ئارامی خێر و چاکەیەکی مەزنە، فریشتەکان لە بەهەشتدا سەلامیان لێ دەکەن بەهۆی ئارام گرتنیانەوە، وەك پێشتر ئاماژەی پێدرا.

نەویستن و نەخواستنی ئازار کە ئارامی لەسەر بگرێت و هەست کردن بە ئازار و ناخۆشییەکانی خۆشەویستی و یەکتاپەرستی ناتەواو و عەیبدار ناکات، هەستکردن بە ئازار و بێزاری لێی: حاڵەتێکی سروشتییە بۆ دەروونی مرۆڤ هەر وەك چۆن خواردن و خواردنەوە داوا دەکات و بە نەبوونیان ئازار دەچێژێت، رێگەیەك نییە بۆ بزرکردن و پەکخستنی سروشتی نەفس بە تەواوی، گەر وا نەبوایە نەدەبوویە نەفسێکی مرۆیی، ئەو کات میحنە و تاقیکردنەوە کۆتایی پێ دەهات و مرۆڤ دەبوو بە دروستکراوی جیهانێکی تر.

"ئارامگرتن" و "خۆشەویستی" دژ بەیەکتر نین، بەڵکو برا و دۆستی یەکترن.. بەڵێ، عیللەتی ئارامگرتن لە راستیدا دژ بە خۆشەویستی و پێچەوانەی یەکتاپەرستییە، بەوەی پاڵنەر لەسەری ویستی رازیبوونی خۆشەویست(خودا) نەبێت، بەڵکو پاڵنەر

ویستی غەیری خۆشەویست بێت، یان بە ویستی غەیری خودا تەكیپێهەڵچنی، ئەمە بریتییە لە وەحشەتی ئارامگرتن و نامۆبون تیایدا.
بەڵام ئەو كەسەی كە ئارامگرتنەكەی بە خودا و بۆ خودا و لەگەڵ خودا بێت، ببینێت كە ئارامگرتنەكەی بەهۆی خوداوەیە نەك بەهۆی بەهێزی خۆیەوە، ئەم كەسە خۆشەویستییەكەی تووشی وەحشەت نابێت و یەكتاپەرستییەكەشی نامۆبوون رووی تێناكات.

## ❁ وەرعكردن بەهۆی حەیاوە جوامێرانەترە لە وەرعكردن بەهۆی ترسەوە

ترسان لە هەڕەشەكان زۆر بەسوودە بۆ ئارامگرتنی مرۆڤ لەسەر گوناه نەكردن و دووركەوتنەوە لێیان، بە رۆڵ و كاریگەری خۆی دووركەوتنەوە لە گوناهان زۆر بەسوودە لە پاراستنی باوەڕ و مانەوە لەسەری، گوناه و یاخیبوون باوەڕ كەم دەكات یاخود نایهێڵێت، یان جوانی و گەشی باوەڕ دەبات و نایهێڵێت، یان نوورەكەی خامۆش دەكات یان بیهێزی دەكات یان بەری درەختی باوەڕ كەم دەكاتەوە، ئەمە كارێكی سەپاوە لەنێوان گوناه و یاخیبوون و باوەڕدا، ئەم راستییە بە هەواڵ و ئەقڵ و واقیع دەركەوتووە و رۆشن بووەتەوە، وەك لە فەرموودەیەكی سەحیحدا هاتووە **((لا يزني الزاني حين يزني وهو مؤمن، ولا يشرب الخمر حين يشربها وهو مؤمن، ولا يسرق حين يسرق وهو مؤمن، ولا ينتهب نهبة ذات شرف –يرفع إليها الناس فيها أبصارهم– حين ينتهبها وهو مؤمن، فإياكم إياكم، والتوبة معروضة بعد))**
بەڵام لەبەر ئەوەی حەیا سیفەتی خاوەن ئابڕووەكانە، هەروەها سیفەتی ئەهلی بەخشندەیی و نەفسە خاوێنەكانە: خاوەنەكەی حاڵی باشترە لە ئەهلی ترس و سەیركردن و هەستكردن بە هەڕەشەكان، چونكە لە شەرمكردندا بەڵگەی چاودێری و ئامادەبوونی دڵ هەیە لەگەڵ خودا، هەروەها لەبەر ئەوەی لە شەرم كردن لە خودادا بە مەزنراگرتنی خودا و شكۆمەند كردنی تێدایە كە لە پاڵنەری ترسدا نییە.
هەركەس پاڵنەرەكەی ترس بێت لە خودا: دڵی لەگەڵ سزادا ئامادە دەبێت، هەركەس پاڵنەرەكەی شەرمكردن بێت لە خودا دڵی لەگەڵ خودادا ئامادەیە، كەسی ترساو رەچاوی خۆی و پاراستنی خۆی دەكات، بەڵام كەسی خاوەن شەرم رەچاوی پەروەردگاری و بینینی مەزنی ئەو دەكات، هەردوو مەقامەكە مەقامی ئەهلی ئیمانن.

بەڵام شەرمکردن لە مەقامی ئیحسانەوە نزیکترە و پێیەوە لکاوترە، چونکە کەسەکە خۆی خستۆتە مەنزیلەیەك وەك ئەوەی خودا دەیبینێت، بۆیە کانیاوی حەیا لە چاوگەی دڵی هەڵقوڵاوە و چەندین جۆگەلەی دروست کردووە.

هەروەها: ئەنجامدانی کاری چاکە مەزنترە لە وازهێنان لە گوناه و یاخیبوون، بۆیە ئارامگرتن لەسەری لەسەرو ئارامگرتنە لەسەر وازهێنان لە گوناه و خراپە، چونکە وازهێنان لە گوناه و خراپە بۆ تەواوکردنی چاکە و گوێڕایەڵییە، نەهیلێکردن لە گوناه و خراپە بۆ ئەوەیە کە فەرمان پێکراوەکان لاواز و کەم دەکات، بۆ پاراستن و پارێزگاری لەوانە نەهی لە گوناه و خراپە کراوە، کردارە چاکەکان وەك تەندروستی و ژیان وان و نەهیلێکراوەکانیش بریتین لەخۆپاراستن کە بۆ پارێزگاری لە ژیان و تەندروستی پێویستە.

ئارامگرتن لەم پلەدا بە سێ شتە: بەردەوام بوون لەسەر چاکە و گوێڕایەڵی، و ئیخلاص لە چاکە و گوێڕایەڵیدا، و ئەنجامدانیان بەپێی زانست(قورئان و فەرموودە) کە بریتییە لە باشکردن و چاککردنی ئەو کارانە لەڕووی زانستەوە.

وازهێنان لە ئیخلاص لە کارە چاکەکاندا وەك ئەوەی پاڵنەر لە ئەنجامدانیان بۆ غەیری خودا بێت و بەو کارە خودا و نزیکبوونەوە لە خودای مەبەست نەبێت، خۆ رزگارکردن لەم ئافەتە تەنها بە چاودێری و رەچاوکردنی ئیخلاصە.

ئەوەی کە کارە چاکەکان بەپێی زانست نەبێت ئەوەیە بەپێی شوێنکەوتنی سوننەت نەبێت، پارێزگاری لە کارەکان لەم ئافەتە بەوە دەبێت کە بە تەواوی شوێنی پێغەمبەر بکەویت، هەروەك چۆن پارێزگاری لە ئافەتەکەی پێشوو بە دارنینی مەبەست و مەرام بوو لە هەر شتێك جگە لە خودا.

## ۞ شیرینی پاداشتی میحنەت ناخۆشییەکانمان لەبیر دەباتەوە

ئارامگرتن لەسەر میحنەتی ئازاری ستەمکاران و دابارینی بەڵا و ناخۆشییەکان بەندەکانی خودا هەوڵی لادان و رەواندنەوەی بە سێ شت دەدەن و کۆمەکی لەو سێ سەرچاوەوە وەردەگرن:

یەکەمیان: ((تێبینی کردنی پاداشتی چاکە)) هەتا بەجوانی سەرنجی پاداشت بدەیت و متمانەت پێی هەبێت و ببینیت کوڵی بەڵا و ناخۆشییەکانت لا سووك دەبێت،

بەهۆی بینینی ئەو باربووكردنەی خودا لە جێگەی بەلاّ و ناخۆشییەكان بە بەندەكەی دەبەخشێت، ئەمەش هەروەك ئەو چێژەی كە بەدەست دێت لە هەڵگرتنی كۆڵی قورس و بیركردنەوە لە سەركەوتن و سەرئەنجامەكەی، گەر ئەو بیركردنەوەیە لە پاداشت و سەرئەنجام نەبوایە بەرژەوەندی دونیا و دوارِۆژ پەكی دەكەوت، هیچ كەس شانی نەدەدایە ژێر ناخۆشییەكی كەم و هەنووكەیی(دونیا) بۆ بەر و پاداشتی دواكەتوو(دوارِۆژ)، نەفس حەزی لە خۆشەویستی شتی هەنووكەییە، ژیری تایبەت سەرنجی سەرئەنجام دەدات و بیر لە دەرئەنجامەكان دەكاتەوە.

ژیرمەندانی هەموو ئوممەتان كۆكن لەسەر ئەوەی كە نیعمەت بە نیعمەت پەی پێنابرێت، هەر كەس بە بەردەوامی لە ئاسوودەیدا بێت نائاسوودەیی رووبەڕوو دەبێتەوە لە كاتی ئاسوودەییەكەیدا و لە خانەی ئاسوودەییدا، بە ئەندازەی ماندوو بوون ئاسوودەیی بەدەست دێت.

(على قدر أهل العزم تأتي العزائم　　وتأتي على قدر الكريم الكرائم

ويكبر في عين الصغير صغيرها　　وتصغر في عين العظيم العظائم)

مەبەستی: سەرنجدانی دەرئەنجامی باش و چاك یارمەتی ئارامگرتن دەدات لەوەی بە ویستی خۆت یان بە ناچاری شان دەدەیە ژێری.

دووەم ((چاوەڕوانی دەروو)) واتە ئاسوودەیی و نەسیم و چێژی، چونكە چاوەڕوانی و سەیركردن و چاوەچاو بۆی كۆڵی گرانی ناخۆشییەكان سووك دەكات، بە تایبەت لە كاتی بەهێزیی رجا و هیوادا و دڵنیابوون لە كردنەوەی دەرگای دەرووی خودایی، لە ناواخنی بەلاّدا كەسەكە رۆحی دەروو و نەسیم و ئاسوودەیی دەبینێتەوە، ئەو لوتفە شاراوانە و ئەو دەرووە خێرای كە چاوەڕوانی دەكات، بەوە و بە شتانی تر مانای ناوی جوانی ((اللطیف))ی بۆ دەردەكەوێت.

سێیەم ((ئاسانبوونی بەلاّ)) بە دوو شت:

یەكەم: نیعمەتەكانی خودا و دەستی خودا لە ئێستادا لەسەر خۆی بژمێرێت، گەر نەیتوانی بیانژمێرێت و بێهیوا بوو لە ئاماركردنیان ئەوا ئەو شتانەی بەلاّ و ناخۆشی لە پشتیانەوەیە–بەرانبەر نیعمەت و دەستی خودا لەسەر ئەو– لەسەری ئاسان دەبن و وەك دڵۆپێكی لێ دێت لە دەریایەكی بێ پەی.

دووەم: یادكردنەوەی ئەو نیعمەتانەی لە رابردوودا خودا بەوی دابوو، ئەمەیان پەیوەندی بە رابردووەوەیە، هەژماركردنی دەستی نیعمەت -لەوەی پێشوودا- وابەستە بە ئێستاوە، چاوەڕوانی پاداشتی چاك و ڕۆحی دەروو و كرانەوەی دەرگای رزگاری پەیوەستە بە داهاتووەوە، یەكێكیان لە دونیادایە و ئەویتریان لە دوارۆژدا.

دەگێڕنەوە ئافرەتێكی عابیدی خواناس كەوت بە زەویدا و پەنجەیەكی لەدەستدا، ئەویش پێكەنی، هەندێك لەوانەی لەگەڵی بوون پێیان وت: پێدەكەنیت لە كاتێكدا پەنجەیەكت بڕاوەتەوە؟ وتی بەپێی ژیری خۆت قسەت لەگەڵ دەكەم، شیرینی پاداشتەكەی تاڵاوی ئازارەكەی لەبیر بردمەوە، ئاماژەی بەوە كرد كە ژیری كەسەكە لەسەرو ئەو مەقامەوە ناتوانێت تێبگات، ئەوەش سەرنجدانی ئەو كەسەیە بەڵاكەی بۆ ناردووە و بینینی ئەو هەڵبژاردنەیە كە ئەوی بۆ دیاریكراوە، هەروەها چێژی شوكر لەسەر ئەو هەڵبژاردنە بۆ پاداشتێكی مەزن، هەر بەو جۆرە رازیبوون لە خودا لەو بەڵایەدا و شوكر و ستایشی خودا بەرانبەر ئەوەی رووی تێكردووە.

### ❁ ئارامگرتن بۆ خودا........... و بە خوداوە

ئارامگرتن سێ جۆرە:

**ئارامگرتن بۆ خودا:** واتە رجای پاداشت و ترس لە سزای، هەروەها ئارامگرتنی موریدان كە بە خوداوەیە، ئەوان ئارامگرتنێكیان بۆ خۆیان ناوێت و هێزی ئارامگرتنیش لە نەفسی خۆیان ناناسن، بەڵكو حاڵیان بریتییە لە جێبەجێ كردنی مانای ((لا حول ولا قوة إلا بالله))، لە رووی زانست و مەعریفە و حاڵەوە.

ئارامگرتن بۆ خودا لەسەرو ئارامگرتن بە خوداوەیە، و پلەكەی باڵاتر و مەزنترە،، ئارامگرتن بۆ خودا وابەستەی خوایەتی خودایە، بەڵام ئارامگرتن بە خوداوە وابەستەی پەروەردگاریی خودایە، ئەوەی وابەستەی خوایەتی خودا دەبێت كامڵتر و باڵاترە لەوەی وابەستەی پەروەردگاریی خودا دەبێت.

هەروەها لەبەر ئەوەی ئارامگرتن بۆ خودا بەندایەتییە و ئارامگرتن بە خوداوە داوای كۆمەكی و یارمەتییە، بەندایەتی ئامانجە و داوای كۆمەكی هۆكارە، ئامانج لەخۆیدا مەبەستە و هۆكار بۆ غەیری خۆی مەبەستە.

هەروەها لەبەر ئەوەی ئارامگرتن بە خوداوە هاوبەشە لەنێوان بێباوەڕ و باوەڕدار و خراپان و چاكاندا، هەر كەس حەقیقەتێكی گەردوونی ببینێت پێیەوە ئارام دەگرێت.

بەڵام ئارامگرتن بۆ خودا مەنزیلەی پێغەمبەران و صدیقین و ئەوانەیە كە تەحقیقی ((إياك نعبد وإياك نستعين))یان كردووە.

هەروەها لەبەر ئەوەی ئارامگرتن بۆ خودا ئارامگرتنێكە كە حەقی خودایە، لەلای خۆشەویستە و پێی رازییە، بەڵام ئارامگرتن بە خوداوە: هەندێ جار لە رازیبوونی خودادایە و هەندێ جار لە نارازیبوونیدا، هەندێ جار لە ناپەسەند و موباحدایە، ئەوە لە كوێ و ئەمە لە كوێ؟

سێیەم ((ئارامگرتن لەسەر ئەحكامەكانی))

ئەمەش بریتییە لە ئارامگرتن لەسەر قەدەرەكانی خودا، بەوەی پێشكەش كرا زانیت: ئارامگرتن لەسەر گوێڕایەڵی خودا و ئارامگرتن لەسەر گوناه و خراپە نەكردن كامڵترە لە ئارامگرتن لەسەر قەدەرەكانی خودا، وەك لە ئارامگرتنەكەی یوسف (عليه السلام) ئاماژەمان پێ كرد، ئارامگرتن تیایدا ئارامگرتنی ویست و هەڵبژاردن و خۆشەویستییە، ئارامگرتن لەسەر ئەحكامە گەردوونییەكانی: ئارامگرتنی ناچارییە، لەنێوان ئەم دوانەدا دوورییەكی زۆر هەیە.

هەر بەو جۆرە ئارامگرتنی نوح و ئیبراهیم و موسا و عیسا –علیهم الصلاة والسلام– لەسەر ئەوەی رووبەڕووی بوونەوە لەبەر خودا بە ویست و كار و هەڵبژاردنی خۆیان، هەر بەو جۆرە بەرهەڵستكاری گەل و هۆز و نەتەوەكانیان: ئەو جۆرە ئارامگرتنە كامڵترە لە ئارامگرتنی ئەیوب (عليه السلام) بەوەی تووشی بوو لە تاقیكردنەوە كە دەستی خۆی تێدا نەبوو.

هەر بەو جۆرە ئارامگرتنی ئیسماعیلی سەربڕاو و ئارامگرتنی باوكی(ئیبراهیم)–علیهما السلام– لەسەر جێبەجێ كردنی فەرمانی خودا كامڵترە لە ئارامگرتنی یەعقوب لەسەر دووركەوتنەوە لە یوسف.

بەم شێوەیە زانیت كە ئارامگرتن بۆ خودا كامڵترە لە ئارامگرتن بە خوداوە، هەروەها ئارامگرتن لەسەر گوێڕایەڵی و گوناه نەكردن كامڵترە لە ئارامگرتن لەسەر قەزا و قەدەری خودایی، خودا كۆمەك و یارمەتیدەرە، ولا حول ولا قوة إلا بالله.

# (٢٩) (منزلة الرضا)

## مەنزیلەی رازیبوون

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی رازیبوونە.

زانایـان كۆدەنگییـان هەیـە لەسـەر ئـەوەی رازیبـوون پەسەند"مسـتحب"ە، بـەڵكو "مستحب"ێكی پێ لەسەرداگیراوە، لەسەر "واجب" بوونی جیاوازی لەنێوانیاندا هەیە، لەسەر دوو بۆچوون:

شێخولئیسلام ئیبن تەیمیە-قدس الله روحه- وای بۆ دەچێت "مستحب" بێت.

دەفەرموێت: رازیبـوون لـە قورئـان و فـەرموودەدا فـەرمانی پـێ نـەكراوە، وەك چۆن فەرمان بە "ئارامگرتن" كراوە، بەڵكو تەنها مـەدح و سـەنای ئـەو كەسـانە كـراوە كـە ئەهلی رازیبوونن، هەروەها دەفەرموێت: ئەوەی لە ئەسەردا هاتووە (من لم يصبر على بلائي ولم يرض بقضائي، فليتخذ ربا سوائي) ئەمە ئەسەرێكی ئیسرائیلییە و لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ریوایەت نەكراوە.

دەڵێم: بە تایبەت لەلای ئەوانەی كە پێیان وایە رازیبوون لەو حاڵانەیە كـە بەدەسـتهێنانی لەژێر ویست و دەسەڵاتی مرۆڤدا نییە، تەنها بەخشراوێكە لە خوداوە بۆ مرۆڤ، ئیتر چۆن دەبێت فەرمانی پێكرابێت، لە كاتێكدا لەژێر ویست و دەسەڵاتی مرۆڤدا نییە؟

خوراسانییەكان دەڵێن: رازیبوون یەكێكە لە مەقامەكان و كۆتایی تەوەكولە، بینا لەسەر ئەمە: بەندە دەتوانێت بە هەوڵی خۆی پێی بگات، چونكە خودا مـەدح و سـەنای ئـەهلی رازیبوونی كردووە، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لە توانا و دەسەڵاتی مرۆڤدایە.

عێراقییـەكان دەڵـێن: رازیبـوون یەكێكـە لـە حاڵـەكان و كەسـبی بەنـدە نییـە، بـەڵكو میوانێكە روو لە دڵ دەكات هەروەك حاڵەكانی تر.

جیاوازی نێوان مەقامـەكان و حاڵـەكان: مـەقامات لـەلای ئـەوان كەسپكراوە و بـەپێی هەوڵ و توانای بەندەكەیە، بەڵام حاڵەكان تەنها بەخششێكی خـوایین بـۆ بەندەكـەی، دەسـتەی سـێیەم لـەنێوان ئـەم دوو دەسـتەیەدا بڕیـارێكی تریـان هەیـە، لەوانـە "القشيري"-خـاوەنی الرسـالة-(مەبەسـتی "الرسـالة القشـيرية"یـە) و كەسـانی تـریش

دەڵێن: دەتوانرێت ئەو دوو رایە کۆبکرێتەوە، بەوەی بوترێت: سەرەتای رازیبوون کەسپی بەندەیە و هەوڵ و کۆششی ئەوە و لێرەوە رازیبوون دەبێت بە یەکێك لە مەقامەکان، بەڵام کۆتایی رازیبوون: یەکێکە لە حاڵەکان، خودا باشتر دەزانێت.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((تام و چێژی باوەڕی کردووە هەر کەس رازیبێت بەوەی "الله" پەروەردگاری بێت، و ئیسلام ئاینیی بێت و محمد پێغەمبەری بێت))

هەروەها دەفەرموێت ((هەر کەس کاتێك گوێی لە بانگ دەبێت بڵێت:"رضيت بالله ربا وبالإسلام دينا وبمحمد رسولا"خودا لە گوناهەکانی خۆشدەبێت))

ئەم دوو فەرموودەیە خولگەی مەقامەکانی ئاینیان لەسەرە، و بۆ لای ئەو دوو فەرموودەیە دەگەڕێنەوە، ئەم دوو فەرموودەیە رازیبوونی تێدایە بە پەروەردگاریی و خواوەندی خودا-سبحانه-، هەروەها رازیبوون بە پێغەمبەرەکەی و گوێڕایەڵی و شوێنکەوتنی، هەر بەو جۆرە رازیبوون بە ئاینەکەی کە ئیسلامە و خۆڕادەستکردنی تەواو پێی، هەر کەس ئەم چوارە بەدەست بهێنێت: ئەو کەسە بەڕاستی "صدیق"ە، بە زمان و بانگەشە ئاسانە، بەڵام گرانترین کارێکە لە کاتی راستێتی تاقیکردنەوەدا، بەتایبەت ئەو کاتانەی شتێك پێچەوانەی حەزی نەفس و ویستی نەفس رووبەڕووت دەبێتەوە، لەوەوە رۆشن بوویەوە کە رازیبوون بە زماندا هات و رایگەیاند، واتە لەسەر زمانی بوو، نەك لەسەر حاڵی.

<u>رازیبوون بە خواوەندی خودا</u> رازیبوون بە خۆشویستنی ئەو و ترس و رجا و گەڕانەوەی بەردەوام و خۆیەکلاکردنەوە بۆ لای خودا لەخۆ دەگرێت، هەر بەو جۆرە هەموو هێزی ویست و خۆشەویستی روو لەو بکات، بە تەواوی لە خۆشەویستەکەی رازی بێت، ئەمەش بەندایەتی و ئیخلاص بۆ خودا لەئامێز دەگرێت.

<u>رازیبوون لە پەروەردگاریی خودای موتەعال</u>: رازیبوون لە تەگبیری خودا بۆ بەندەکەی و پشتبەستن پێی و داوای کۆمەکی و یارمەتی لێی و متمانە پێی و شان دادان لەسەری لەخۆ دەگرێت، هەر بەو جۆرە دەبێت بە هەموو ئەو شتانەی خودا بەوی دەکات و بەسەر ئەوی دەهێنێت بە خۆش و ناخۆشییەوە رازی بێت.

<u>رازیبوون بە محمد</u> وەك پێغەمبەرێك کەماڵی گوێڕایەڵی و شوێنکەوتن و تەسلیمبوونی تەواو بۆی لەئامێز دەگرێت، بەجۆرێك پێغەمبەر لای ئەو لەخۆی لەپێشتر بێت، هیدایەت

تەنها لە فەرموودەكانی ئەو وەربگرێت، بۆ لای ئەو بگەڕێتەوە، كەسی تر نەكات بە حەكەم لەسەر پێغەمبەر، بەڵكو هەرگیز بە حوكمی كەسی تر رازی نەبێت، نە لە شتێك لە ناو و سیفەت و كرداری پەروەردگار، نە لە مەیدانی چێژی ئیمان و حەقیقەتی باوەڕ و مەقامەكانیدا، هەر بەو جۆرە لە ئەحكامەكانی دەرەوە و ناوەوە بە حوكمی هیچ كەس رازی نەبێت، تەنها بە حوكمی پێغەمبەر(ﷺ) رازی بێت.

رازیبوون بە ئایینەكەی: كاتێك خودا فەرمووی و حوكمی كرد و بڕیاری دا و نەهی لە شتێك كرد شتێك لە حەرەج لە دڵی بەندەدا بەرانبەر ئەو حوكمانە بوونی نەبێت، بە ئەوپەڕی تەسلیمبوون و ملكەچییەوە تەسلیم ببێت، با پێچەوانەی ویست و حەزی نەفسیش بێت، یان پێچەوانەی بۆچوونی تەقلیدكراو و شێخ و پیر و دەستە بێت.

لێرەدا هەموو خەڵكی لە تۆ نامۆ دەبن جگە لە غەریبانی جیهان، هەرگیز نامۆبوون داتنەگرێتەوە بەهۆی تەنهایی و بێكەسییەوە، ئەوە -سوێند بە خودا- سەرچاوەی عیززەتە و بەڵگەی پەیوەندی دروستە لەگەڵ خودا و پێغەمبەرەكەی، و گیانی هۆگربوون پێیانەوە، بەڵگەی ئەوەی رازیبوویت بەوەی خودا پەروەردگارت بێت و محمد پێغەمبەر و ئیسلام ئایینت بێت.

بەڵكو صادق ئەو كەسەیە هەر كات نامۆبوون رووی تێكرد و شیرینی نامۆبوونی چەشت و رۆحی نەسیم لێی هەڵكرد بڵێت: خودا نامۆبوون و وەحشەتی زیاترم لەم جیهانەدا بۆ رەوانە بكەی، هۆگربوونم بە خۆتەوە بۆ زیاد بكەی، هەر كات شیرینی ئەم نامۆبوون و تەنهاكەوتنەوە دەچێژێت: وەحشەت لە خەڵكی دەبێت بە هۆگربوون و زەلیلی دەگۆڕێت بۆ عیززەت و نەزانی دەبێت بە دووركەوتنەوە لە را و بۆچوونەكانیان و زبڵخانەی بیر و زەینیان، دابڕان دەبێت بە خۆ كۆت و بەند كردن لە بەند و باڵۆرەی ئەوان، خودا بە هیچ كەس و هیچ شتێك ناگۆڕێتەوە، بەشی خۆی لەلای خودا بە رازیبوونی ئەوان ناگۆڕێتەوە كە تەنها بێبەشبوون و زیانۆمەندی لێ دەكەوێتەوە، ئامانجەكەی: خۆشەویستی نێوانیان لە ژیانی دونیادا، كاتێك هەرچی هۆكارە كۆتایی پێهات و راستییەكان دەركەوتن و ئەوەی لەناو گۆڕدا بوو هاتە دەرەوە و ئەوەی لەناو سینەدا كۆكرایەوە و نهێنییەكان شەن و كەو كران و جگە لە مەولای حەق هێز و سەرخەرێكی تر بوونی نەما، ئا لەو رۆژەدا قازانج و زەرەر

دەردەكەوێت، دەردەكەوێت میزانی چاكەی كێ سەنگینە و خراپەی كێ قورسە، خودا كۆمەك و یارمەتیدەرە و پشت و پەناش هەر ئەوە.

بەدواداچوون و ساغكردنەوەی ئەم بابەتە: "رازیبوون" بە سەرنجدان لە هۆیەكەی كەسپی مرۆڤە، بەلام بە سەرنجدان لە حەقیقەتی رازیبوون بەخششی خوداییە، بۆیە دەتوانرێت بوترێت بە هۆكارەكان كەسپی مرۆڤە، كە هۆكارەكانی قووڵبوونەوە و درەختەكەی بنجی داكوتی: بەری رازیبوونی لێ دەچنێتەوە، رازیبوون كۆتایی پشتبەستنە بە خودا، هەر كەس لە تەوەكول و خۆرادەستكردن بە خودا و گێڕانەوەی كارەكان بۆ لای خودا قووڵ بوویەوە بە بێ گومان رازیبوون بەدەست دەهێنێت، بەلام بەهۆی دەگمەن بوون و وەلام نەدانەوەی زۆربەی خەڵكی بۆی و گرانی لەسەر دەروون خودای موتەعال واجبی نەكردووە لەسەر بەندەكانی، ئەمەش وەك بەزەییەك و ئاسانكارییەك بۆ ئەوان، بەلام هانیداون و بە پەسەند و باش باسی كردووە، و مەدح و سەنای ئەوانەی كردووە كە رازی دەبن، رایگەیاندووە پاداشتی خودا رازیبوونی خودایە لەوان، ئەوەش مەزنتر و گەورەترە لە باخچەكانی بەهەشت و ئەوەی تێیاندایە، هەر كەس لە پەروەردگاری رازی بێدا خوداش لەو رازی دەبێت، بەڵكو رازیبوونی بەندە لە خودا ئەنجامی رازیبوونی خودایە لە ئەو، ئەو بە دوو جۆر رازیبوون لەلای خوداوە دەورەدراوە: رازیبوونێك لە پێشەوە كە وا لە بەندەكەی دەكات لە خودا رازی بێت، لەگەڵ رازیبوونێك دوای رازیبوونی بەندەكە كە بریتییە لە بەری درەختی رازیبوون، بۆ ئەو مەبەستەیە رازیبوون دەرگایەكی مەزنی خودایە و بەهەشتە لە دونیادا و ئەو جێگەیە عاریفان پشووی تێدا دەدەن، خۆشەویستان ژیان و زیندەگی لێوە بەدەست دەهێنن و عابیدان لێیەوە بەهرەدار دەبن و تامەزرۆیانی دیداری خودا بە هۆیەوە چاویان رۆشن دەبێتەوە.

مەزنترین هۆ بۆ بەدەستهێنانی رازیبوون ئەوەیە كە بەندە پابەندی هەموو ئەو كار و ئەمرانە ببێت كە خودا پێی رازییە، چونكە رازیبوون بەوانە دەیگەیەنێتە مەقامی رازیبوون بەبێ هیچ گومانێك.

بە یەحیای كوڕی مەعاز وترا: كەی بەندە دەگاتە مەقامی رازیبوون؟ فەرمووی كاتێك بەندەكە نەفسی خۆی لەسەر چوار پایە راگرت كە مامەڵەی پەروەردگاری پێ دەكات:

بە پەروەردگاری بڵێت: گەر پێم ببەخشیت قبووڵی دەکەم، گەر پێم نەبەخشیت رازیم، گەر دەستبەردارم ببیت بەندایەتی دەکەم، گەر بانگم لێ بکەی وەڵام دەدەمەوە.

جونەید دەفەرموێت: رازیبوون بریتییە لە دروستیی زانستی گەیشتوو بە دڵ، گەر حەقیقەتی زانست بگاتە دڵ سەردەکێشێت بۆ رازیبوون.

((رازیبوون و خۆشەویستی)) وەك ((رجا و ترس)) نین، رازیبوون و خۆشەویستی دوو حاڵی باڵای ئەهلی بەهەشتن، ئەو کەسەی لە دونیادا بەدەستیان دەهێنێت و دەیانکات بە پۆشاکی خۆ لە دونیای بەرزەخ و دواڕۆژیشدا لێی جیانابنەوە، بە پێچەوانەی ترس و رجاوە، ئەو دوانە(ترس و رجا) لە ئەهلی بەهەشت جیادەبنەوە هەرکە ئەوەی رجایان دەکرد پێیان بەخشرا و ئاسایش و ئاسوودەیی و بەختەوەری بوو بە کاڵای باڵایان، هەرچەند رجایان بەوەی بەدەستی دەهێنن هەمیشەییە بەڵام رجایەك نییە تێکەڵ بە شك و گومان، بەڵکو رجایەکی متمانەدار بە بەڵێنێکی راستگۆ لە خۆشەویستێکی خاوەن دەسەڵاتەوە، ئەو جۆرە رجایە رەنگێکە و رجای ژیانی دونیاش رەنگێکی تر.

## ۞ هیممەت و لێبڕانی بەرز و باڵا نیشانەکەی رازیبوونە

مەرجی رازیبوون ئەوە نییە هەست بە ئازار و ناخۆشی نەکەیت، بەڵکو مەرجەکەی ئەوەیە بەرهەڵستکاری حوکمەکەی نەکەیت و رق و کینەت لە بڕیارەکەی نەبێت، بۆیە لای هەندێك کەس رازیبوون بە ئازار و ناخۆشییەکان لێڵ و تەمومژاویی بووە و تانەیان لێداوە، و دەڵێن: ئەوە بۆ سروشتی مرۆڤ شیاو و گونجاو نییە، بەڵکو ئارامگرتن گونجاوە، ئەگینا چۆن رازیبوون و ئازار و بێزاری لەگەڵ یەکتر کۆدەکرێنەوە؟ ئەو دوانە دژی یەکترن.

راستییەکەی: ئەو دوانە دژایەتییان لە نێواندا نییە، بوونی ئازار و بێزاری دەروون نەرێی رازیبوون ناکات، وەك رازیبوونی نەخۆش بە خواردنەوەی دەوا لەگەڵ تاڵی و ناخۆشیدا، رازیبوونی رۆژووگر لە رۆژێکی زۆر گەرمدا بەوەی رووبەڕووی دەبێتەوە لە برسێتی و تینوێتی، هەروەها رازیبوونی کەسی تێکۆشەر بەوەی لە پێناوی خودادا تووشی دەبێت لە ئازاری برین و ماندووبوون.

ڕێگەی ڕازیبوون ڕێگەیەکی زۆر کورت و نزیکە، مرۆڤ بە مەزنترین ئامانج دەگەیـەنێت، بەڵام ئازار و مەینەتی تێدایە، لەگەڵ ئەوەشدا ئازار و گرانییەکەی بە ئەندازەی ئازار و گرانی موجاهەدەی نەفس سـەخت نییـە، بـە ئەنـدازەی ڕێگـەی موجاهـەدە کۆسـپ و لەمپەری تێدا نییە، تەنها لەمپـەرێك بـوونی هیمـەتێکی مـەزن و نەفسـێکی خـاوێن و نیشتەجێ کردنی نەفس لەسەر هەموو ئەو شتانەی لە خوداوە ڕوو لەو دەکات.

ئەوەی ڕازیبوون لەسەر بەندە ئاسان دەکات: زانستییەتی بـە لاوازی و دەستەوسـانی خۆی و بەزەیی و میهر و چاکەی خودا بـۆ ئـەو، گـەر ئـەم دوو بەرەیـەی بـینی(لاوازی خۆی، بەزەیی خودا) و خۆی نەخستە بەر دەرگانەی خـودا و لـە خـودا ڕازی نـەبوو و پاڵنەرەکانی خۆشەویستی و ڕازیبوونی بۆ لای خودا نەبوو ئەوا نەفسی ئەو کەسـە لـە دەرگـای خـودا دەرکـراوە و دوورخراوەتـەوە، ئـەو شایسـتە نییـە بـە نزیکبوونـەوە و دۆسـتایەتی خـودا، یـاخود ئـەو نەفسـە نەفسـێکە لـە میحنـەت و تاقیکردنەوەدایـە و چەندین جۆر لە بەڵا ڕووی تێکردووە.

ڕێگەی ڕازیبوون و خۆشەویستی بەندەی خودا بەرەو کەماڵ دەبات با لەسەر جێگـەی نوستنیش ڕاکشا بێت، بەڵکو بە چەندین قۆناغ پێش قافڵەکە دەکەوێت.

بەری درەخـتی ڕازیبـوونیش: بریتییـە لـە دڵخۆشـی و سـروور بـە پـەروەردگار-تبارك وتعالى-

لە خەوندا شێخوئیسلام ئیبن تەیمییەم بینی -قدس الله روحه- شتێك لە کـاروکردەوەی دڵم بۆ باس کرد، باسی گەورەیی و سوودی ئەو کارەم کرد-کە لێرەدا و لـە ئێسـتادا باسی ناکەم- فەرمووی: من ڕێگەکەم بریتییـە لـە دڵخـۆش بـوون بـە خـودا و سـروور پێی، یان هاوشێوەی ئەم قسەیەی فەرموو.

ئەو حاڵی لە ژیانیشدا هەر بەو جۆرە بوو، لە ڕوواڵەتیدا دەردەکەوت، حاڵەکەی بانگی بۆ ئەو ڕاستییە دەکرد.

بە حوسەینی کوڕی عـەلی-خوایـان لـێ ڕازی بێـت- وتـرا: ئـەبو زەڕ-خـوا لێـی ڕازی بێت- دەڵێت: هەژاریم لە دەوڵەمەندی لا خۆشەویستترە، و نەخۆشیم لە لەشساغی لا خۆشەویسترە، فەرمووی: ڕەحمەتی خودا لە ئەبو زەڕ بێت، مـن دەڵـێم: هـەر کـەس تەسلیم بووبێت بەوەی خودا بۆی هەڵدەبژێرێت هەرگیز ئاوات بۆ شـتێك جگـە لـەوەی خودا ناخوازێت.

فەزلی کوڕی عەییاز بە بیشری حاف وت: ڕازیبوون گەورەترە لە زوهد لە دونیا، چونکە کەسی ڕازی ئاوات بۆ مەنزیلەیەکی بالاتر ناخوازێت.
پرسیار لە عوسمان کرا دەربارەی فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) ((أسألك الرضا بعد القضاء))، فەرمووی: چونکە ڕازیبوون بەر لە بڕیار لێبڕانە لەسەر ڕازیبوون، ڕازیبوونیش لەدوای بڕیار بریتییە لە خودی ڕازیبوونەکە.
وتراوە: ڕازیبوون بریتییە لە نەهێشتنی نیگەرانی و تێکچوون لە هەر حوکم و بڕیارێکدا.
نیسان وتراوە: ڕازیبوون بریتییە لە نەمانی هەڵبژاردن، هەروەها وتراوە: بریتییە لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەحکام بە دڵخۆشییەوە.
نیسان وتراوە: ڕازیبوون بریتییە لە خامۆشبوونی دڵ لەژێر جاریبوونی بڕیارەکاندا.
عومەری کوڕی خەتتاب نامەیەکی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری نارد و فەرمووی ((هەرچی خێرە لە ڕازیبووندایە، گەر توانیت ڕازی ببە، ئەگەر نە، ئارام بگرە))
ڕازیبوون سێ بەشە: ڕازی بوونی خەڵکی ڕەشۆکی بەوەی خودا دابەشی کردووە و بەخشیویەتی، ڕازیبوونی تایبەتەکان لە قەدەر و قەزای خودا، لەگەڵ ڕازیبوونی تایبەتی تایبەتەکان بە خودا لە جێگەی هەرچی شتە جگە لە خودا.

## ۞ ڕازیبوون ڕۆڵە(بەر)ی دڵنیاییە

دەروون بە دڵنیایی و ئارامی ڕازیبوون بەدەست دەهێنێت، هەر کەس ڕاهێنان بە نەفسی خۆی بکات لەسەر دڵنیایی و ئارامی ڕازیبوون لە خودا بەدەست دەهێنێت و خوداش لێی ڕازی دەبێت، ئەمەش ئەو ئایەتە پیرۆزەیە کە دەفەرموێت ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ﴿٢٨﴾ فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ﴿٢٩﴾ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ﴿٣٠﴾ ﴾ الفجر: ٢٧ – ٣٠، ئەمەش هاوشێوەی ئایەتی ﴿ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ طَيِّبِينَ يَقُولُونَ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمُ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾ النحل: ٣٢، ئەم سەلام و مژدەی مەلائیکە بۆ ئەوان بە مەرجێکەوە بەستراوەتەوە، ئەوەش ئەوەیە کە مردنەکەیان "طيبين"–مردنێکی چاك و پاك بێت، ئایەتەکە هیچ ڕێگەیەکی بۆ گەیشتن بەو مژدەیە نەهێڵاوەتەوە جگە لە مردن بەو شێوە چاك و پاکە.

دەربارەی كاتی وتنی ئەو قسەیە (سلام علیكم أدخلوا الجنـة) پێشـین سـێ بۆچـوونیان هەیە:

یەكەمیان: ئەو قسەیە كـاتی مردنـە، كـە ئـەم بۆچـوونەیان زۆر مەشـهوورە، حەسـەن (لەسەر ئایەتەكە) دەفەرموێت: هەر كـات ویسـتی گیـانی بكێشـێت نەفسـەكە دڵنیـا و ئارام دەبێت بۆ گەڕانەوە بۆ لای خودا و ڕازی دەبێت بەوەی لەلای خودایە و خـوداش لەو ڕازی دەبێت.

هەندێكی تر دەڵێن: ئەو قسەیە كاتی زیندووبوونەوە پێی دەوترێت، ئەمە ڕای "عكرمة و عطاء والضحاك"و دەستەیەكی ترە.

كەسانی تر دەڵێن: كەلیمەی یەكەم لـە ئایەتەكـە كـە بریتییـە لـە ((ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً)) لە كاتی مردندا پێی دەوترێت، بەڵام كەلیمەی دووەم ((فَٱدْخُلِى فِى عِبَٰدِى ﴿٢٩﴾ وَٱدْخُلِى جَنَّتِى)) ڕۆژی قیامەت پێی دەوترێت.

ڕاستییەكە ئەوەیە: كە ئەو قسەیە كاتی دەرچـوون لـە دونیـا و لـە ڕۆژی قیامەتیشـدا پێی دەوترێت، یەكەم زیندووبوونەوەی بریتییە لە بـەجێهێڵانی دونیـا، ئـەو كاتـە ئـەو لای دۆستی باڵا و شكۆمەند "الرفيق الأعلى"ە، گەر دڵنیا و ئارام بووبێت لەگەڵ خودا، بۆیە سەرەتای ئـەوە لـە كـاتی مردندایـە و كۆتـایی و كەماڵیشـی لـە ڕۆژی دواییدایـە، جیاوازی لە نێوان ئەو دوانەدا نییە.

### ۞ ڕازیبوون بە "الله" وەك پەروەردگار بنچینەی باوەڕە

باڵاترین ڕازیبوون بریتییە لە ڕازیبوون بە "الله" وەك پەروەردگار و ڕقبوون لـە بەندایـەتی هەموو ئەوانەی دەكەونە خوار خوداوە، ئەمە جەمسەری دەستهاڕ(دەساڕ)ی ئیسلامە.

ڕازیبوون بە "الله" وەك پەروەردگار: پـەروەردگارێكی تـر جگـە لـە خـودا بڕیـار نـەدات، خۆی بداتە دەسـت تـەگبیرەكانی و پێویسـتییەكانی خـۆی بـۆ لا بەرزبكاتـەوە، خـودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِى رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَىْءٍ ﴾الأنعام: ١٦٤، ئیبن عەباس- خوا لە خۆی و باوكی ڕازی بێـت- لەسـەر وشـەی "رب"دەفـەرموێت: ((سـيدا وإلهـا))- سەردار و پەرستراو، واتە چۆن پەروەردگارێكی تر جگە لە ئەو بڕیار بـدەم لـە كاتێكـدا ئەو پەروەردگاری هەموو شتێكە، لە سـەرەتای سورەتەكەشـەوە فـەرمووی﴿ قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ

أَتَّخِذُ وَلِيًّا فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ الأنعام: ١٤، لێرەدا "ولي" بە مانای " معبود و ناصر و معين و ملجأ" هاتووە، لە "الموالاة-دۆستايەتی"ەوە هاتووە كە خۆشەويستی و گوێڕايەڵی لەخۆ دەگرێت، لە ناوەندی ئايەتەكەشدا دەفەرموێت ﴿ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ إِلَيْكُمُ ٱلْكِتَٰبَ مُفَصَّلًا ﴾الأنعام: ١١٤، واتە ئايا جگە لە خودا كەسێكی تر بڕيار بدەم لەنێوان من و ئێوەدا حوكم دەربكات، بگەڕێينەوە بۆ لای لەو شتانەی جياوازی لەنێوانماندا هەيە لەسەری، ئەوە كتێبەكەيەتی سەرداری حاكمانە، ئيتر چۆن دەبێت بچين بۆ لای غەيری كتێبەكەی كە بەدوورودرێژی دابەزيوە و بەسە بۆ باوەڕداران و شيفايە بۆ كردنەوەی هەموو گرێكوێرەكان؟

گەر سەرنجی ئەم سێ ئايەتە بدەيت و تێڕامانيان تيادا بكەی دەبينيت بريتين لە "رازيبوون بە خودا وەك پەروەردگار و رازيبوون بە ئيسلام وەك ئايينی راستەقينەی خودا و رازيبوون بە محمد(ﷺ) وەك پێغەمبەری خودا"، ئەو كات دەبينی فەرموودەكە تەرجەمەی ئەم سێ ئايەتەيە و لێرەوە وەرگيراوە، زۆرێك لە خەڵكی رازين بەوەی "الله" پەروەردگاريان بێت و هيچ پەروەردگارێكيش جگە لە ئەو بڕيار نادەن، بەڵام رازی نييە ئەو بە تەنها "ولي" و "ناصر" بێت، بەڵكو كەسانێكی تر لە خوار خوداوە دەكات بە وەلی و ناصری خۆی، وا گومان دەبات ئەوانە لە خودای نزيك دەكەنەوە و دۆستايەتييان وەك دۆستايەتی وايە لەگەڵ دەست و پێوەندەكانی مەليك دا، ئەمە لەخۆيدا خودی هاوەڵدانانە، بەڵكو يەكتاپەرستی ئەوەيە كە لەخوار خوداوە كەسێكی تر نەكەيت بە "ولي"، قورئان پڕە لە وەسفی هاوەڵدانەران كە لەخوار خوداوە "اولياء"ی تريان بڕيارداوە.

ئەمە جيايە لە دۆستايەتی(موالاة) پێغەمبەران و بەندە باوەڕدارەكانی خودا، ئەمەيان لە كەماڵی باوەڕ و كەماڵی دۆستايەتييەوەيە، دۆستايەتی دۆستەكانی خودا جۆرێكە و بڕياردانی "ولي" لەخوار خوداوە جۆرێكی ترە، هەر كەس جياوازی نێوان ئەو دوانە تێنەگات با لە بنچينەوە بگەڕێتەوە بۆ زانستی يەكتاپەرستی، چونكە ئەم بابەتە بنچينەی يەكتاپەرستييە.

زۆرێك لە خەڵكی حەكەمێكی تر جگە لە خودا بڕيار دەدەن، دەگەڕێنەوە بۆ لای و ناكۆكييەكانيان دەدەنە دەست بڕياری ئەو و بە حوكمەكەی رازی دەبن.

ئـەم سـێ مەقامـە پایـەكانی یەكتاپەرسـتین: كـەس جگـە لـە خـودا بـە پـەروەردگار نەزانێت، جگـە لـە ئـەو كەسـی تـر بـە پەرسـتراو(معبـود) نـەزانێت و مەنهـەجی هـیچ كەسیش نـەكات بـە حەكـەم و ڕووی تێبكـات و بـە بڕیارەكـانی ڕازی بێـت، جگـە لـە مەنهەجی خودا.

تەفسیری ڕازیبوون بە "الله" وەك پەروەردگار ئەوەیە كە ڕقـی لـە بەندایـەتی غـەیری خودا بێت، ئەمـە بریتییـە لـە ڕازیبـوون بـە "اللـە" وەك پەرسـتراوی حـەق، ئەمـەش تـەواوكاری ڕازیبوونـە بـە "الله" وەك پـەروەردگار، هـەر كـەس بەڕاسـتی خـودا بـە پەروەردگار بزانێت و ماف بدات بەبێ هیچ گومانێـك ڕقـی لـە بەندایـەتی غـەیری خـودا دەبێتەوە، چونكە ڕازیبـوون بـە تەجریـد(داڕنـین)ی پـەروەردگاریی خـودای موتـەعال بەدوای خۆیدا تەجریدكردنی بەندایەتی دەهێنێت، وەك چۆن زانست بە یەكتاپەرسـتی پەروەردگاریی یەكتاپەرستی خواوەندی بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

بۆیە خولگەی سوڕانەوەی ئیسـلام لەسـەر ڕازیبـوونی بەنـدە وەسـتاوە لـە بەندایـەتی كردن تەنها بۆ پەروەردگار و ڕقبـوون لـە بەندایـەتی كـردن بـۆ غـەیری خـودا، پێشـتر باسی ئەوەمان كردووە كە بەندایەتی بریتییە لە خۆشەویستی و گەردنكەچی، بۆ هـەر كەسێك لەخوار خوداوە گەردنكەچ و ملكەچ بوویت و گوێڕایـەڵیت كـرد و خۆشتویسـت ئەوە تۆ بەندەی ئەو كەسەی و ئەوت پەرستووە.

### ۞ ڕازیبوون بە بڕیاری خودا لە تەواوكاریەكانی باوەڕە

پاشان بەدوایدا: ڕازیبوون لە هەموو ئەوەی لەلای خوداوە دێت، چەندین ئایـاتی قورئـانی پیرۆز ئاماژەیان پێكردووە، ئەوەش ڕازیبوونە لە خودا لە هەموو قەزا و قەدەرێكیدا.

ئـەم ڕازیبوونـە بـەدوای ئـەوەی پێشـتردا دێـت، چـونكە ڕازیبـوون بـە خـودا وەك پەروەردگار قەدر و شان وشـۆی بـاڵاتر و بـەرزترە، پلـەی ئـەو ڕازیبوونـە تایبەتـە بـە باوەڕدارانەوە، بەڵام ڕازیبوون بەو شتانەی لە خوداوەیە هاوبەشە لـەنێوان بـاوەڕداران و بێباوەڕانـدا، ئامـانجی ڕازیبـوونی دووەم خۆڕادەسـت كردنـە بـە قـەزا و قـەدەری خودایی، ئەمە لە كوێ و ڕازیبوون بە "الله" وەك پەروەردگار و پەرستراو لە كوێ؟

هەروەها رازیبوون بە خودا وەك پەروەردگار فەرزە، بەڵكو بە كۆدەنگی ئوممەت لە هەموو فەرزەكان مەزنترە، هەر كەس رازی نەبێت بە "الله" وەك پەروەردگار نە ئیسلام و نەكردار و نەحاڵی دروست دەبێت و دێتە راستە.

رازیبوون بە قەزای خودایی: زۆربەی خەڵكی پێیان وایە "مستحب"ە و واجب نییە، وتراویشە: واجبە، هەردوو قسەكە لە مەزهەبی ئیمام ئەحمەددا هاتوون.

جیاوازی نێوان ئەو دوو پلەیە وەك جیاوازی نێوان فەرز و سوننەت(ندب) وایە، لە فەرموودەیەكی قودسیدا ((**یقول الله عز وجل: ما تقرب إلي عبدي بمثل أداء ما افترضت عليه**))، ئاماژەی بەوە كرد كە نزیكبوونەوە لە خودا-**سبحانه**- بە جێبەجێ كردنی فەرزەكان باشتر و چاكترە لە نزیكبوونەوە لە خودا بە نەوافل(سونەتەكان).

هەروەها: رازیبوون بە خودا وەك پەروەردگارێك رازیبوون لە بڕیارەكانی لەئامێز دەگرێت و بۆی پێویست دەبێت، رازیبوون بە پەروەردگاریی خودا: بریتییە لە رازیبوونی بەندە بەوەی خودا ئەمری پێ دەكات و نەهی لێ دەكات، ئەوەی بەشی دەكات و ئەندازەگیری دەكات لەسەری، پێی دەبەخشێت و لێی دەگرێتەوە، هەركات بە هەموو ئەوە رازی نەبوو ئەوا لە هەرچی رووەوە رازی نەبووە خودا پەروەردگاری بێت، هەرچەند لە هەندێكیدا رازی بێت بە پەروەردگاریی خودا، رازی بوون لێی لە هەموو روویەكەوە: رازی بوون لە ئەمرەكانی-بەبێ هیچ شك و گومانێك- لەئامێز دەگرێت.

هەروەها: رازیبوون بە خودا وەك پەروەردگار وابەستەی زات و سیفات و كردار و پەروەردگاریی گشتی و تایبەتی خودای موتەعالە، ئەوەش رازیبوونە پێی وەك(**خالق، مدبر، آمر، ناهي، ملك، معطي، مانع، حكم، وكيل، ولي، ناصر، معين، كافي، حسيب، رقيب، مبتلي، معافي، قابض، باسط**) دروستكەر و كارهەڵسوڕێنەر و فەرمانكەر و نەهیكەر و خاوەن موڵك و پێدەر و لێگرەوە و حاكم و وەكیل و وەلی و سەرخەر و كۆمەككەر و كاف و چاودێر و تاقیكەرە و شیفادەر و داخەر و والاكەر و زۆرێكی تر لە سیفاتی پەروەردگاریی.

رازیبوون لە فەرمان و بڕیارەكانی: بریتییە لە رازیبوونی بەندە لەوەی خودا بەوی دەكات و بەسەریدا دەهێنێ، بۆیە تەنها لە پاداشتدا هاتووە، وەك﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ ﴾ الفجر: ٢٧ - ٢٨، ئەمە بە رازیبوون لە بڕیارەكانی بەوەی

بۆی بەدەستهاتووە لە ڕێز و پاداشت، وەك ئایـەتی﴿ جَزَآؤُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ رَبَّهُۥ ﴿٨﴾ ﴾ البينة: ٨.

ڕازیبوون بە خودا: بنچینەی ڕازیبوونە لە بڕیار و فەرمانی خودا، واتە ڕازیبوون لە بڕیارەکانی بەری درەختی ڕازیبوونە بە خودا. نهێنی ئەم بابەتە لەو شوێنەدایە کە "ڕازیبوون بە خودا" وابەستەی ناو و سیفاتی خودای موتەعالە، ڕازیبوون لە بڕیارەکانی وابەستەی پاداشت و سزایە.

هەروەها: پێغەمبەر(ﷺ) چێژ و تامی ئیمانی وابەستەی ئەو کەسە کردووە کە ڕازیبووە بەوەی "الله" پەروەردگاری بێت، وابەستەی نەکردووە بە ڕازیبوون بە ئەمر و بڕیارەکانەوە، وەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی ((چێژی باوەڕی کردووە هەرکەس ڕازی بێت بە "الله" وەك پەروەردگاری و ئیسلام وەك ئایینی و محمد(ﷺ) وەك پێغەمبەری)) ڕازیبوون بە خودا بوو بە هاوتای ڕازیبوون بە ئایین و ڕازیبوون بە پێغەمبەرەکەی، ئەم سیانە پایەکانی ئیسلامن، کە کۆشکی ئیسلام لەسەریان بینادەکرێت و دەوەستێت.

هەروەها: ڕازیبوون بە خودا وەك پەروەردگار یەکتاپەرستی و بەندایەتی و گەڕانەوە بۆ لای و تەوەکول پێ و ترس و ڕجا و خۆشەویستی و ئارامگرتن بۆ ئەو شوکری نیعمەتەکان لەخۆ دەگرێت، هەرچی نیعمەت و چاکەیە لە خوداوە لەئامێز دەگرێت با بەندەکەشی خراپەکار بێت و دانی پێدا نەنێت و شوکری نەکات، ڕازیبوون بە پەروەردگاریی خودا شەهادەتی ((لا إلـه إلا الله)) و ڕازیبوون بە پێغەمبەرایەتی محمد(ﷺ) لەخۆ دەگرێت، واتە ڕازیبوون بە ((شهادة أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله))، ڕازیبوون بە ئیسلام وەك ئایینی ڕاستەقینەی خودا: پابەندبوون بە بەندایەتی و گوێڕایەڵی خودا و گوێڕایەڵی پێغەمبەر لەخۆ دەگرێت، ئەم سیانەش هەموو ئایین لەخۆ دەگرن.

هەروەها: ڕازیبوون بە خودا وەك پەروەردگار: پەرستنی و بە تاقوتەنها ڕاگرتنی لەخۆ دەگرێت، هەر بەو جۆرە خودا کردن بە دۆست و سەرپەرشتیار(الولي) و پووچکردنەوەی بەندایەتی بۆ غەیری خودا، خودای موتەعال بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێت ﴿ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا ﴾ الأنعام: ١١٤، هەروەها دەفەرموێت ﴿ قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِي رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيْءٍ ﴾ الأنعام: ١٦٤، ئەمە خودی ڕازیبوونە بە "الله" وەك پەروەردگار.

هەروەها: خودای موتەعال راستێتی رازیبوون بە خودا وەك پەروەردگار كردووە بە دووركەوتنەوە و رقلێبوونەوە لە بەندایەتی غەیری خودا، هەركات مرۆڤ رقی لە بەندایەتی غەیری خودا لە خواوەندە پووچ و بەتاڵەكان هەڵگرت و هەرچی خۆشەویستی و ترس و رجا و بە مەزن زانین و بە شكۆمەند زانینە لەو خواوەندە پووچانەی وەرگرتەوە ئەوا "رازیبوون بە خودا وەك پەروەردگار"ی جێبەجێ كردووە كە جەمسەری سوڕانەوەی ئیسلامە.

خۆدارنین لە خواوەندە پووچەكان بووە بە جەمسەی سوڕانەوەی ئایین: چونكە هەرچی بیروباوەڕ و كاروكردار و حاڵە لەسەر یەكتاپەرستی خودای موتەعال لە بەندایەتی و رق لە بەندایەتی غەیری خودا بیناكراوە، هەر كەس ئەم جەمسەرەی نەبێت ئەوا خولگەیەكی نییە بە دەوریدا بسوڕێتەوە. هەر كەس ئەو جەمسەرەی بەدەست هێنا ئەوا خولگەی سوڕانەوەی بۆ بەدەست دێت، و ئەو كات جەمسەرەكە بەدەوریدا دەسوڕێتەوە، بەو جۆرەش لە بازنەی هاوەڵدانانەوە دەگوێزێتەوە بۆ بازنەی ئیسلام و یەكتاپەرستی، ئەو كات بەرداشی ئیسلام و ئیمانی بەدەوری ئەو جەمسەرە جێگیرە پێویستەدا دەسوڕێتەوە.

هەروەها: بەدەستهێنانی ئەم پلەیە لە رازیبوون بەستراوەتەوە بەوەی خودای موتەعال لە هەموو شتێك زیاتر لەلای بەندەكەی خۆشەویست بێت و لە هەرچی شتە زیاتر مەزنی و شكۆمەندی بۆ بڕیار بدات، و بەو كەسەی بزانێت شایستەیە بە گوێڕایەڵی و بەندایەتی بۆ كردن، ئەم خاڵانەش رێساكانی بەندایەتی لە خۆیاندا كۆدەكەنەوە، و لق و بەشەكانی رێكدەخەن.

لەبەر ئەوەی خۆشەویستی تەواو بریتییە لە مەیلی دڵ بۆ لای مەحبوب: ئەوا ئەو مەیلە گوێڕایەڵی و بە مەزن زانین لەخۆ دەگرێت، تا مەیلەكە بەهێزتر بێت گوێڕایەڵییەكە تەواوتر دەبێت و بە مەزن زانینەكە بەرینتر دەبێت، ئەم مەیلە دەبێتە پێویستیی ئیمان، بەڵكو رۆح و كرۆكی ئیمانە، چ شتێك لەوە مەزنترە خودای لە هەموو شتێك زیاتر لەلا خۆشەویست بێت و بە شایستەترین كەسی بزانێت بۆ بە مەزن راگرتن و گوێڕایەڵی و بەندایەتی؟

بەم شێوەیە بەندە شیرینی باوەڕ دەبینێتەوە، وەك لە فەرموودەی سەحیحدا لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ((سێ شت لە هەر كەسدا هەبێت شیرینی باوەڕ دەبینێتەوە:

کەسێك خودا و پێغەمبەر لە لای لە هەرچی شتە زیاتر خۆشبوێت، کەسێك کەسێکی تەنها لەبەر خودا خۆشبوێت، کەسێك پێی ناخۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ ناو بێباوەڕی- دوای ئەوەی خودا رزگاری کرد- وەك چۆن پێی ناخۆشە هەڵیبدەنە ناو ئاگرەوە))

چێژی باوەڕی بە رازیبوون بە پەروەردگاریی "الله"ەوە بەستەوە و شیرینی باوەڕیشی بەستەوە بەوەی لەسەر رازیبوون بە پەروەردگاری خودا دادەمەزرێت و بەو رازیبوونە سەرهەڵدەدات، ئەوەش خۆشویستنی خودا و پێغەمبەرە زیاتر لە هەموو کەس و شتێك. لەبەر ئەوەی ئەم خۆشەویستیە تەواوە و ئەم ئیخلاصە مەزنە-کە بەری رازیبوونە- باڵاترە لە رازیبوون بە پەروەردگاریی "الله"-سبحانه- بۆیە بەروبوومەکەی بەرزتر و باڵاترە ئەوەش بینینەوەی شیرینی ئیمانە، بەڵام بەری رازیبوون: بریتییە لە چێژی باوەڕ، ئەمەیان بینینەوەی شیرینییە، ئەوەیان تەنها تام کردنە، خودا کۆمەك و یارمەتیدەرە.

ئەم دوانە (تام و شیرینی) لەسەر رازیبوون بە "الله" وەك پەروەردگار و خۆ بەریکردن لە بەندایەتی غەیری خودا وەستاون، هەر بەو جۆرە هەموو مەیلی دڵ بۆ لای خودا و راکێشانی هێزی خۆشەویستی بۆ لای ئەو و رازیبوون بە کار و فەرمانەکانی بەدوای رازیبووندا دێن بە خودا وەك پەروەردگار، هەر کەس رازیبێت بە "الله" وەك پەروەردگار خوداش رازی دەبێت ئەو وەك بەندەی خۆی قبووڵ بکات، هەر کەس رازی بێت لە خودا لە بەخشین و لێگرتنەوە بەڵا و عافییەتیدا: ناگاتە پلەی رازیبوونی خودا لە ئەو گەر رازی نەبێت بە خودا وەك پەروەردگار، و محمد وەك پێغەمبەر و ئیسلام وەك ئایین، لەوانەیە کەسێك رازی بێت لە خودا بەوەی پێی دەبەخشێت و بەوەی لێی دەگرێتەوە، بەڵام رازی نابێت ئەو-سبحانه- بە تاق و تەنها پەرستراو و خودا بێت.بۆ ئەو مەبەستە دەستەبەرکردنی رەزامەندی خودا لە رۆژی دواییدا بۆ کەسێکە رازی بووبێت بەوەی "الله" پەروەردگاری بێت، وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((من قال كل يوم: رضيت بالله ربا، وبالإسلام دينا، وبمحمد نبيا، إلا كان حقا على الله أن يرضيه يوم القيامة))، قورئان باسی ئەم رازیبوونەی کردووە و دەفەرموێت ﴿قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوْمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدْقُهُمْ ۚ لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١١٩﴾﴾ المائدة: ١١٩ هەروەها لە سورەتی "المجادلة"دا دەفەرموێت ﴿وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟

عَنْهُۚ أُوْلَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱللَّهِۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾ المجادلة: ٢٢، لە کۆتایی سورەتی "لم یکن"(البینة)شدا دەفەرموێت ﴿ جَزَآؤُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۖ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِىَ رَبَّهُۥ ﴿٨﴾ ﴾ البینة: ٨.

ئەم چەند ئایەتە پاداشتی ئەوانە لە ئامێز دەگرێت ئەمەش بەهۆی صدق و باوەڕ و کرداری چاکە و تێکۆشان دژ بە دوژمنانی خودا و دۆستایەتی نەکردنیان، بۆیە لێیان رازی بوو و ئەوانیشی رازی کرد، هەموو ئەمانە دوای رازیبوون دێت بە "الله" وەك پەروەردگار و رازیبوون بە محمد(ﷺ) وەك پێغەمبەر و ئیسلام وەك ئایین.

## ۞ پێویستیی جیاکردنەوەی ویست و بڕیار(مشیئة)ی خودا لە خۆشویستنی(محبته)

بزانە خودای موتەعال قسەی ئەوانەی بە ناڕاست داناوە کە ویست و بڕیار و بە ئەنجام گەیاندن لە لایەن خوداوە بە پێویست دادەنێن بۆ خۆشویستنی و رازیبوون لێی ﴿ سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَىْءٍۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ حَتَّىٰ ذَاقُواْ بَأْسَنَاۗ قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَآۖ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ ﴿١٤٨﴾ ﴾ الأنعام: ١٤٨، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ نَّحْنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾ النحل: ٣٥، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَقَالُواْ لَوْ شَآءَ ٱلرَّحْمَٰنُ مَا عَبَدْنَٰهُمۗ مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ﴾ الزخرف: ٢٠، ئەوانە بەڵگەیان لەسەر خۆشویستن و رازیبوونی خودا لە هاوەڵدانان هێنایەوە بە ویست و بڕیاری خودا، بەم بۆچوونە پووچەیان بەرهەڵستکاری ئەمر و نەهی ئایینەکەی وەستانەوە، رۆشنترین بەرپەرچدانەوە بۆ ئەو قسەیە بوونی هەیە، ئەو بانگەشەی ویست و بڕیاری خودا بە خۆشویستن و رازیبوونی ئەوەوە گرێ دەدات، ئاڵۆزبوونەکەی ئەوان لەو جێگەدایە کە ویست و بڕیار لەگەڵ خۆشویستندا جیاناکەنەوە و بە یەك شت تەماشای دەکەن، لەوێوە ئەو وەهمەیان بۆ دروست بووە کە خودا هاوەڵدانانی خۆشدەوێت و پێی رازییە و ئەوانیش پابەندن بەو رازیبوونەی خوداوە.

ئەوەی ئەم تەمومژە دەڕەوێنێتەوە وچاوڕۆشنی دەبەخشێت و مانای دروستی رازیبوون بە قەزای خودایی رۆشن دەکاتەوە بریتییە لە جیاکاری نێوان ئەوەی خودا

جیاکاری خستۆتە نێوانیانەوە، ئەوەش بریتییە لە ویست و بڕیار لەگەڵ خۆشەویستن(المشیئة و المحبة)، ئەو دوانە یەك شت نین و بۆ یەکتریش پێویست نین، بەڵکو هەندێ جار دەیەوێت و بڕیاری لێدەدات و خۆشیناوێت، و هەندێ جار خۆشیدەوێت و نایەوێت ببێت و بڕیاری لێ نادات.

نموونە بۆ یەکەم: وەك بوونی ئیبلیس و سەربازەکانی(خودا بوونیانی خۆشناوێت و ویست و بڕیاریشی لەسەر بوونیان داوە)، هەروەها ویست و بڕیاری گشتی لە گەردووندا لەگەڵ رق لێبوون لە هەندێکی.

نموونە بۆ دووەمیان (خۆشی دەوێت و نابێت) وەك خۆشویستنی باوەڕهێنانی بێباوەڕان و گوێڕایەڵی خراپەکاران و دادپەروەری ستەمکاران و تەوبەی لادەران، گەر لەگەڵ ئەم خۆشویستنەدا ویست و بڕیاری لەگەڵ بوایە هەموو ئەوانە روویان دەدا، چونکە کە ویستی و بڕیاری دا دەبێت و نەشیەوێت نابێت.

گەر ئەم بنەمایە بڕیاری لێدرا و کردار بە بەرکار نەزانرا و بڕیار بە بڕیارلەسەردراو تەماشا نەکرا و لەوە گەیشت کە خودای موتەعال فەرمانی بە بەندەکانی نەکردووە رازی بن بە هەموو ئەوەی دروستی کردووە و ویستوویەتی و بڕیاری لێداوە: ئەو کات تەمومژەکان دەڕەوێنەوە، و ئاڵۆزییەکان چارەسەر دەبن، ستایش هەر بۆ خودایە، ئەو کات لەنێوان شەرعی پەروەردگار و قەدەرە گەردوونییەکەیدا دژایەتی بوونی نابێت، بەجۆرێك یەکێکیان ئەویتریان پووچ بکاتەوە، بەڵکو قەدەر شەرع سەردەخات و شەرعیش تەصدیقی قەدەر دەکات، هەر یەکێك لەو دوانە پشتی ئەویتر قایم دەکات.

گەر ئەمە زانرا رازیبوون بە بڕیاری ئایینی شەرعی واجبە، ئەوە بنچینەی ئیسلام و پایەی ئیمانە، بۆیە پێویستە لەسەر بەندە بەبێ هیچ دوودڵی و کێبەرکێ و بەرهەڵستکاری و ململانێیەك پێی رازی بێت، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ ﴾ النساء: ٦٥

خودای موتەعال سوێند دەخوات کە باوەڕ ناهێنن تا پێغەمبەر نەکەن بە حەکەم، و تا دوودڵی لە دەروونیادا لەمەڕ بڕیاری ئەو نەڕەوێننەوە، هەروەها تا بە تەواوی خۆیان رادەستی حوکمی خودا نەکەن، ئەمە بریتییە لە حەقیقەتی رازیبوون بە حوکمی خودا.

تەحكیم (بە حاكم كردن) لە مـەقامی ئیسـلامدایە، رەواندنـەوەی دوودڵـی لـە مـەقامی ئیماندایە، خۆرادەست كردنیش لە مەقامی ئیحساندایە.

هەر كات نووری باوەڕ تێكەڵ بە دڵ بوو و چاوی رۆشنی دڵ بە كلی یەقین خۆی رشت و بە رۆحی وەحی زیندوو بوویەوە و سروشـتی سـاز و رەوان بـوو، ئـەو كاتـە نەفسـی فەرمانكەر بە خراپە دەگۆڕێت بۆ نەفسێكی رازی لە خودا و بڕیاری خودا، بڕیارەكـانی خودا بە سنگی فراوان و واڵا و تەسلیم بوو وەردەگرێت، بە تـەواوی رازی دەبێـت لـەو بڕیارە ئاینییە خۆشەویستە لەلای خودا و پێغەمبەرەكەی.

رازیبـوون بـە بڕیـاری گـەردوونی و قـەدەری و تـەبا لەگـەڵ خۆشویسـتن و ویسـت و رازیبـوونی بەنـدەدا-وەك تەندروسـتی و لەشسـاغی و دەوڵەمەنـدی و سـەلامەتی و چێژوەرگرتن- كـارێكی پێویسـتە بـەپێی سروشـتی مـرۆڤ، چـونكە گونجـاون لەگـەڵ كەسەكەدا و لەلای خۆشەویستن، بۆیە رازیبـوون پێیـان بەندایـەتی تێـدا نییـە، بـەڵكو بەندایەتی لەوەدایە بەرانبەریان شوكر بكەی و دان بە نیعمەتەكەدا بنێی و هەسـت بـە منەتی خودایی بكەیت لەسەر خۆت و پاشان نیعمەتەكە لەو شوێنەدا بەكار بهێنیت كە خودا بۆی داناوە و پێیخۆشە، هەروەها بـەو نیعمەتانـە لـە خـاوەن نیعمەتەكـە یـاخی نـەبیت، و كـەموكورتی و كەمتەرخـەمی خـۆت لـە هـەموو ئەوانـەدا-بەرانبـەر بـە نیعمەتەكان- هەست پیٚ بكەیت.

رازیبوون بە بڕیاری گەردوونی قەدەری پێچەوانە بە ویست و خۆشویستنی بەندە باش و "مستحب"ە، وەك رازیبوون بە نەخۆشی و هەژاری و ئازارخواردن لەدەست خـەڵكی و گەرما و سەرما و جۆرەكانی ئازار و مەینەتی، بەوەی ناگونجێن لەگەڵی و ناچنە ژێر هەڵبـژاردنی ئـەوەوە، ئـەو رازیبوونـە یەكێكـە لـە مەقامـەكانی ئـەهلی بـاوەڕ، لەمـەڕ واجبوونی ئەم جۆرە لە رازیبوون دوو بۆچوون هەیە.

رازیبوون بە قەدەری گوزەركەر بە ویست و هەڵبژاردەی مرۆڤ -لەوانـەی لـەلای خـودا باشنین و پێـی تـوورە دەبێـت و نـەهی لێكـردوون- وەك جۆرەكـانی سـتەم و لادان و یاخیبوون حەرامن و كەسەكە سزای لەسەر وەردەگرێت، و پێچەوانەی ویست و بڕیاری شـەرعی خـودای موتـەعالن، خـودا نـە بەوانـە رازییـە و نـە خۆشـی دەون، چـۆن خۆشویسـتن و رازیبـوون بەوانـە لەگـەڵ رقلێبـوونی خـودا پێكدێنـەوە؟ لـە بابـەتی رازیبوون بە قەزا زۆرتر قسە لەم بارەیەوە دەكەین.

گەر بڵێیت: چۆن خودا کارێکی دەوێت و پێی رازی نییە و خۆشی ناوێت؟ ئەی چۆن بڕیاری لێ دەدات و دەیهێنێتە بوون؟ چۆن ویستی خودا لەگەڵ رقلێبوون و بەباش نەزانین کۆدەبێتەوە؟

بزانە: ویستراو(المراد) دوو جۆرە: ویستراو بۆ خودی خۆی (المراد لنفسه)، لەگەڵ ویستراو بۆ غەیری خۆی(المراد لغيره).

ویستراو بۆ خودی خۆی: داواکراو و خۆشەویستە لە خودی خۆیدا بەهۆی ئەو خێرەی کە تێیدایە، ئەو ویستنە وەك ویستنی دەرئەنجام و مەرامەکان وایە.

ویستراو بۆ غەیری خۆی: لەوانەیە لەلای کەسی خاوەن ویست لە خودی خۆیدا مەبەست نەبێت و بە لێ وردبوونەوەی خودی شتەکە لەناویدا بەرژەوەندییەك نەبینێتەوە، با هۆکارێکیش بێت بۆ ویست و مەبەستی خۆی، ئەو شتە لەلای وەك خودی شتەکە ناپەسەند و ناباشە، بەڵام لەو رووگەیەوە کە وەك وەسیلەیەك بە مەرام و مەبەستی دەگەیەنێت لەلای کەسەکە ویستراوە، بۆیە هەردوو بارەکەی تێدا کۆدەبێتەوە: رقلێبوون لە خودی شتەکە و ویستنی شتەکە وەك هۆکارێك، هیچ کامیان نەرێی ئەویتریان ناکات بەهۆی وابەستەبوونی هەریەکەیان بەوی تریانەوە، ئەمە وەك دەوایەك کە بێزراو و ناخۆشە(لە خودی خۆیدا)، بەڵام گەر کەسەکە زانی شیفای ئەوی تێدایە دەیخواتەوە، هەروەها وەك برینی پارچەیەك لە جەستە گەر بزانێت ئەو برینە ژیانی جەستەی پێوە بەستراوە، هەروەها وەك برینی رێگەی دوور و درێژ و پڕ لە دژواری گەر کەسەکە بزانێت دەیگەیەنێت بە موراد و خۆشەویستەکەی، بەڵکو کەسی ژیر و هۆشمەند شان دەداتە ژێر ئەو ناخۆشی و ئازارانە و ویستیان دەکات بە گومانێکی زاڵ، با سەرئەنجامەکەش نادیار بێت و لێی شارابێتەوە، ئەی دەبێت ئەو کەسە چۆن بێت کە هیچ سەرئەنجامێك لای شاراوە نییە(خودا)؟ خودا شتێکی لا ناپەسەندە و لە خودی شتەکەدا رقی لێیەتی، بەڵام پێچەوانە نییە لەگەڵ ویستنیدا بۆ مەبەستێکی تر، بەوەی دەبێتە هۆ بۆ شتێك کە بوونی لەلای خودا خۆشەویستترە لە نەبوون و تیاچوونی.

نموونەی ئەمە: خودای موتەعال ئیبلیسی دروست کردووە کە سەرچاوەی تێکدانی ئیمان و کرداری چاکە و بیر و باوەڕ و ویستە باشەکانە، ئەو هۆی بەدبەختی مرۆڤە

لەگەڵ ئەو کاروکردەوەیان کە پەروەردگار -تبارك وتعالى- تووڕە دەکات، ئەو- نەفرەتی خودای لێ بێت- لە ئەوپەڕی هەوڵیدا و بە فێڵ و پیلانەکانی دەیەوێت ئەوەی پێچەوانەی خۆشویستنی خودا و رازیبوونییەتی رووبدات، بۆیە ئیبلیس جێگەی رق و خەشمی خودایە، خودا نەفرەتی لێ کردووە و بوغزاندوویەتی، خەشمی خودای لێگیراوە و لە بەزەیی دوورخراوەتەوە، لەگەڵ ئەمەشدا دروستکردنی ئیبلیس وەسیلەیەکە بۆ زۆرێك لەو کارانەی جێگەی خۆشویستنی پەروەردگارن، کەوابوو زۆرێك لە کاری خێر و چاکە لەسەر خەلقی ئیبلیس وەستاوە، کە بوونی ئەو خۆشویستراوانە لەلای خودا باشترە لە نەبوونیان، بۆیە بوونی بە ئیبلیس بەخشیوە.

لەو حیکمەتانەی لە خەلقی ئیبلیسدا بوونی هەیە: ئەوەیە هێز و دەسەڵات و توانینی خودا بۆ دروستکراوەکانی دەربکەوێت لەسەر دروستکردنی دژ یەکەکان و بەرانبەرەکان، بۆیە ئەو خودەی دروست کردووە -کە پیسترین و شەڕترین خودە و هۆی هەموو شەڕێکە- بەرانبەر خودی جبریل کە باڵاترین و پاکترین و خاوێنترین خودە و سەرچاوەی هەموو خێرێکە، تبارك الله لە دروستکردنی ئەوە و ئەمەدا! وەك چۆن توانای تەواوی خۆی لە دروستکردنی "شەو و رۆژ و تاریکی و روناکی و دەوا و نەخۆشی و ژیان و مردن و گەرم و سارد و جوان و ناشیرین و زەوی و ئاسمان و نێر و مێ و ئاو و ئاگر و خێر و شەڕ"دا نیشان بەندەکانی دەدات.

ئەوانە رۆشنترین بەڵگەن لەسەر کەماڵی توانین و عیززەت و دەسەڵات و موڵکی ئەو، ئەو-سبحانە- ئەم دژانەی خولقاندووە و هەندێکیانی رووبەرووی هەندێکیان کردۆتەوە، بەشێکی بەسەر بەشێکی تردا زاڵ کردووە و کردوونی بە جێگەی دەستێوەردان و تەگبیر و کارهەڵسوڕاندن و حیکمەتی خۆی، خاڵیبوونەوەی وجود لە بوونی هەندێك لەوانە بەتەواوی پەکخستنی حیکمەتی خودا و کەماڵی کارکردن و تەگبیرکردنی مەملەکەتەکەیەتی.

لەو حیکمەتانە: دەرکەوتنی ناوە زاڵەکانی، وەك ((القهار، المنتقم، العدل، الضار، شديد العقاب، سريع الحساب، ذي البطش الشديد، الخافض، المذل))-زاڵ، تۆڵەسێن، دادپەروەر، زیانبەخش، تۆڵە توند، حساب خێرا، خاوەنی دەستوەشاندنی سەخت، نزمکەرەوە، زەلیلکەر، هەموو ئەم ناو و کردارانە لە کەماڵدان، بۆیە دەبێت

وابەستەبوونیان بۆ هەبێت، گەر هەموو دروستكراوەكانی خودا لەسەر سروشتی فریشتە بوونایە ئەوا ئاسەواری ئەم ناو و كردارانە دەرنەدەكەوتن (بۆ نموونە: گەر ستەمكار بوونی نەبێت خودا تۆڵە لە كێ بسێنێت؟ بۆیە بوونی ستەمكار دەبێتە وابەستەی ناوی "المنتقم")

لەو حیكمەتانە: دەركەوتنی ئاسەواری ناوە جوانەكانی خودا كە حیلم و لێبووردەیی و لێخۆشبوون و داپۆشین و چاولێخشان و رزگاركردنی كۆیلەكانی لەئامێز دەگرن، گەر دروستكردنی ئەو هۆ ناپەسەند و بێزراوانە نەبوونایە كە دەبنە هۆی دەركەوتنی ئەو ناوە جوانانە ئەوا ئەو حیكمەت و سوودانە پەكیان دەكەوت و نەدەهاتنە دی، پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی بەمە كردووە بە فەرموودەی ((گەر ئێوە گوناه نەكەن، خودا ئێوە لادەبات و دەستەیەك دەهێنێت گوناه بكەن و داوای لێخۆشبوون لە خودا بكەن، ئەو كات خوداش لێیان خۆشدەبێت))

لەو حیكمەتانە: بەدەستهێنانی بەندایەتی جۆراوجۆر، گەر بوونی ئیبلیس نەبوایە بەدەست نەدەهاتن، بەڵكو هەندێكی بەدەست دەهات نەك هەمووی.

بەندایەتی جیهاد خۆشەویسترین بەندایەتییە لەلای خودا -سبحانە-، گەر هەموو خەڵكی باوەڕدار بوونایە ئەم بەندایەتییە و ئەوەی بەدوایدا دێت پەكیان دەكەوت: لە دۆستایەتی كردن لەگەڵ خودا بەو تێكۆشانە، هەروەها دوژمنایەتی كردنی ئیبلیس لە تێكۆشانەكەیدا، هەر بەو جۆرە خۆشەویستی و رق تیایدا، بەخشینی رۆح لە جەنگان دژ بە دوژمنەكەی، هەروەها بەندایەتی فەرمان بە چاكە و رێگری لە خراپە، بەندایەتی ئارامگرتن و پێچەوانە جووڵانەوە لەگەڵ حەز و ئارەزوودا، لە كۆتایشدا هەڵبژاردنی خۆشویستنەكانی خودا بەسەر خۆشویستنەكانی خۆدا.

هەروەها لەو حیكمەتانە: بەندایەتی تەوبەكردن و گەڕانەوە بۆ لای و داوای لێخۆشبوونە، خودا -سبحانە- تەوبەكاران و تەوبەكەیانی خۆشدەوێت، گەر ئەو هۆیانە كە تەوبەی لێ دەكات پەكبخرێن ئەو كاتە بەندایەتی تۆبەكردن و داوای لێخۆشبوون پەكی دەكەوت.

لەو حیكمەتانە: بەندایەتی سەرپێچی لە فەرمانەكانی دوژمنی خودا، لەبەر خودا پاشقوولی لێبدەی و بیبوغزێنی، خۆشەویسترین بەندایەتی لەلای خودا ئەم جۆرە

بەندایەتییەیە، خودا دەیەوێت دۆستەكەی خۆی دوژمنەكەی ببوغزێنێ و پاشقوولی لێبدات و تووڕە و بێزاری بكات، ئەم جۆرە بەندایەتییە تەنها ژیر و هۆشمەندەكان دەیزانن و پەی پێ دەبەن.

لەو حیكمەتانە: بەندایەتی خودا بكات بە پەناگرتن پێی لە دوژمنەكەی كە شەیتانە، داوای لێ بكات پەنا و دالدەی بدات لەدەستی، رزگاری بكات لە فێڵ و ئازاری.

لەو حیكمەتانە: بەندەكانی خودا پاداشتی سەرپێچی و دوژمنایەتی كردنی شەیتان وەردەگرن كە بەدەستهێنانی ئەو پاداشتە بە مەرجگیراوە بە دوژمنایەتی شەیتان و سەرپێچی لە فەرمانەكانی، زۆربەی بەندایەتییەكانی دڵ و ئەندامەكان لەسەر سەرپێچی لە فەرمانەكانی شەیتان دامەزراون.

لەو حیكمەتانە: بە دوژمن كردنی شەیتان لە گەورەترین و بالآترین بەندایەتییەكانە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ﴾ فاطر: ٦، بە دوژمن زانینی شەیتان قازانجترین و بەسوودترین شتە بۆ بەندە، ئەو كارەش لەلای خودا خۆشەویستە.

لەو حیكمەتانە: سروشتی مرۆیی خێر و شەڕ و چاك و خراپ و پاك و پیس لەخۆ دەگرێت، ئەو ئامادەییە لە دەروونـدا شاراوەتەوە وەك شاردنەوەی ئاگر لە بەردی چەخماخدا، شەیتان دروستكرا تاكو ئەوەی لە سروشتی ئەهلی شەڕدایە بێتە دەرەوە، واتە لە ئامادەیی و هێزەوە ببێت بە كردار، پێغەمبەران رەوانەكران بۆ ئەوەی ئەو هێز و ئامادەیی خێرە لە نەفسی ئەهلی خێر و چاكەدا بگۆڕن بۆ كردار، خاوەن حوكمی براوە(خودای موتەعال) ویستی هێنانە دەرەوەی هێزی خێری ئەوانەی كرد تاكو ئاسەوارەكانی لەسەر پەیدا ببێت، هەروەها ویستی هێنانە دەرەوەی شەڕی ئەوانەی كرد تاكو ئاسەوارەكانی لێوە سەرهەڵبدات، حیكمەتی خودا لەسەر دوو دەستەكە دەربكەوێت و حوكم و بڕیاری خۆی بەسەر هەردوو دەستەكەدا جێبەجێ بكات، ئەوەی لە زانستی پێشینەی خۆیدایە و لەلای خۆی ئاشكرایە دەربكەوێت و بێتە بوونەوە.

ئەو دوانەش جێگەی پرسیاری فریشتەكان بوو لە خودا كاتێك لێیان پرسی ﴿أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا

تَعۡلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ البقرة: ٣٠، فریشتەكان وا گومانیان برد بوونی كەسانێك كە تەسبیحات و ستایشی خودا دەكەن و لە گوێڕایەڵیدان و بەندایەتی دەكەن لەپێشترە لە بوونی كەسانێك كە یاخی دەبن و سەرپێچی دەكەن، خودا –سبحانه– وەڵامی دانەوە بەوەی حیكمەت و بەرژەوەندی و ئامانجی ستایشكراوی دروستكردنی ئەم مەخلوقە (ئادەم) هەر بۆ خۆی دەیزانێت و ئەوان نایزانن.

لەو حیكمەتانە: دەركەوتنی زۆرێك لە ئایات و دروستكراوی سەیروسەمەرە: بەهۆی ڕوودانی بێباوەڕی و خراپەی نەفسە بێباوەڕەكان و ستەمكارەكانەوە پەیدابوون، وەك ئایەتی تۆفانەكەی نوح (عليه السلام) و ئایەتی ڕەشەبای توند و تیابردنی قەومی لوط و ئایەتی وەرگەڕانی ئاگر بۆ ساردی و سەلامەتی بۆ ئیبراهیم و ئەو ئایەتانەی كە لەسەر دەستی موسا خودای موتەعال جاری كردن، و زۆرێك لە ئایاتی تر كە خودای موتەعال دوای ئاماژە بە هەر یەكێكیان لە قورئاندا دەفەرموێت ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٨﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٩﴾ ﴾ الشعراء: ٨ – ٩، گەر بێباوەڕی بێباوەڕان و سەرپێچی سەرپێچیكەران نەبوایە ئەم ئایەتە مەزن و ڕوون و ئاشكرانە دەرنەدەكەوتن، كە خەڵكی نەوە لەدوای نەوە قسەی لەبارەوە دەكەن.

لەو حیكمەتانە: دروستكردنی هۆكەلێكی ڕووبەڕووبوونەوە كە هەندێكیان زاڵ دەبن بەسەر هەندێكی تریاندا و هەندێكیان هەندێكی تریان تێكوپێك دەشكێنن: لە شكۆمەندی كەماڵی پەروەردگاریی خودای موتەعالە، هەروەها لە توانای جێبەجێ بووی ئەو و حیكمەتی تەواو و كەماڵی موڵكییەتی –هەرچەند شكۆمەندی پەروەردگاریی لە خودی خۆیدا كامڵە با هیچ كام لەو هۆكارانەش نەخولقێنێت– بەڵام دروستكردنیان لە پێویستییەكانی كەماڵ و موڵك و توانین و حیكمەتی خودان، دەركەوتنی كاریگەرییەكانیان و حوكمەكانیان لە جیهانی شەهادەتدا (ئەم جیهانە): تەحقیق بوونی ئەو كەماڵەیە، و یەكێكە لە پێویستبوونەكانی، ئاوادانكردنەوەی ئاستەكانی پەنهان و بینراو بە ئەحكامی سیفەتەكانی خودای موتەعال لە ئاسەواری كەماڵی ڕەهای خوایەتی خودایە لە هەموو ڕوویەكەوە و لە گشت بەشەكانیدا.

بە كورتی و بە پوختی: بەندایەتی و ئایات و شتە سەیروسەمەرەكان كە لەسەر ئەو دروستكراوانە پەیدا دەبن كە خۆشیناون و پێیان ڕازی نییە و لەگەڵ ئەوەشدا

ئەندازەگیرییان دەكات و ویست و بڕیار بۆ هەبوونیان دەردەكات، هەموو ئەوانە خۆشەویستترە لەلای -سبحانە- لە نەبوون و تیاچوون و پەككەوتنی هۆكارەكانیان.

گەر بڵێیت ئایا ئەو ئەحكامانە بەبێ ئەو هۆیانە بوونیان دەبێت؟

دەڵێم: ئەمە پرسیارێكی پووچە، چونكە گریمانەی مەلزومێكە بەبێ لازم، وەك گریمانەی بوونی رۆڵەیەك بەبێ باوك، یان گریمانەی جووڵە بەبێ بزوێنەر، یان تۆبەكردن بەبێ تۆبەكار.

چۆن خودا شتێك رازییە بۆ بەندەكەی و یارمەتی نادات لەسەری؟

دەڵێم: چونكە بە یارمەتیدانی لەوانەیە خۆشویستراوێكی مەزنتر لەدەست بدات، خۆشویستراوێك گەورەتر بێت لەو گوێڕایەڵییەی بۆ بەندەكەی پێی رازییە، لەوانەیە روودانی ئەو گوێڕایەڵی و كارە چاكە لە بەندەكەی مەفسەدەیەك لەخۆ بگرێت كەلای خودا ناپەسەندتر بێت لە خۆشویستنی ئەو گوێڕایەڵییە لە بەندەكەیەوە، بەجۆرێك كارە چاكەكە ببێتە هۆ و پێویستبوون بۆ مەفسەدەیەكی گەورە و تیاچوونی بەرژەوەندییەكی مەزنتر، خودای موتەعال ئاماژەی بەم حەقیقەتە كردووە و دەفەرموێت ﴿وَلَوْ أَرَادُوا الْخُرُوجَ لَأَعَدُّوا لَهُ عُدَّةً وَلَٰكِن كَرِهَ اللَّهُ انبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ وَقِيلَ اقْعُدُوا مَعَ الْقَاعِدِينَ ﴿٤٦﴾ لَوْ خَرَجُوا فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا وَلَأَوْضَعُوا خِلَالَكُمْ يَبْغُونَكُمُ الْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ سَمَّاعُونَ لَهُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ ﴿٤٧﴾﴾ التوبة: ٤٦ - ٤٧، خودای موتەعال رایدەگەیەنێت: كە هەستانەوەی ئەوانەی بۆ چوونە غەزا پێناخۆش بووە كە غەزا گوێڕایەڵی و نزیكبوونەوە لە خودایە و بۆخۆی فەرمانی پێ كردووە، كە ئەوەی پێ ناخۆش بوو لەوان بێ توانای كردن و بە زەوییەوە لكان و لەو كارە پاشگەز بوونەوە، پاشان خودا -سبحانە- هەندێك لەو مەفاسیدانە باس دەكات گەر ئەوانە لەگەڵ پێغەمبەر و لە سوپای موسڵمانانندا بوونایە، دەفەرموێت (لَوْ خَرَجُوا فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا)،"خبالا" واتە فەساد و خراپە، (وَلَأَوْضَعُوا خِلَالَكُمْ)، واتە هەوڵیان دەدا لە نێوانتاندا تۆوی فەساد و خراپە بچێنن، (يَبْغُونَكُمُ الْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ سَمَّاعُونَ لَهُمْ) واتە قسەیان لێ وەردەگرن وەڵامیان دەدەنەوە، لە هەوڵی ئەوانە بۆ فەساد و قبووڵی ئەمانە بۆ وەرگرتنی قسە و باس لێیان شەرێك لەدایك دەبوو زۆر گەورەتر لە بەرژەوەندی هاتنە دەرەوەیان بۆ غەزا، بۆیە حیكمەت و بەزەیی داوا دەكات: رێگرییان لێ بكرێت لە چوونە دەرەوە و لە ماڵەوە دایان بنێت لەو كارە خێرە.

ئەم نموونەیە بکە بە بنچینەیەك بۆ ئەم دەروازەیە و پێوانەی شتەکانی تری لەسەر بکە.

## ۞ بەری پێگەیشتووی رازیبوون

زۆرێك بەری ئیمانیی بۆ رازیبوون بوونی هەیە کە لێیەوە بەرهەم دێت، کەسی رازیبوو بەهۆیەوە بۆ بەرزترین مەنزیلە بەرزدەبێتەوە:

لەوانە: کەماڵی بەندایەتی لە جاریبوونی ئەو حوکمانەدایە لێیان بێزارە و بەسەریدا جاری دەبێت، گەر تەنها ئەوانەی خۆشی دەون بەسەریدا جاریببوایە ئەوا دوورترین شت دەبوون لە بەندایەتی پەروەردگار، بەندایەتی بۆ کامڵ نابێت-لە ئارامگرتن و تەوەکول و رازیبوون و پاڕانەوە و نیشاندانی هەژاری و گەرنکەچی و فەرمانبەرداری و شتانی تریش- بە رێگەی جاریبوونی قەدەر نەبێت بەو شتانەی لێیان بێزارە، باری رازیبوون بە قەزا شیاو نییە لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا، بەڵکو حاڵ لەگەڵ قەزای ئازاربەخشدا بێزاری و ناخۆشییە بۆ سروشتی مرۆڤ.

لەوانە: بزانێت رازیبوونی لە پەروەردگاری(ﷻ) لە هەموو حاڵەتەکاندا رازیبوونی خودا لە ئەو بەرهەم دەهێنێت، گەر لە ئەو(لە خودا) بە کەمێك رۆزی رازی بوو: ئەوا پەروەردگار بە کەمێك لە کردار لە ئەو رازی دەبێت، گەر لە هەموو حاڵ و بارەکاندا لە خودا رازی بوو و هەموو ئەو حاڵ و بارانەی لا یەکسان بوو ئەمە دەبێت بەخێراترین شت بۆ بەدەستهێنانی رازیبوونی خودا گەر داوای رەزامەندی لێ کرد و لێی پاڕایەوە.

لەوانە: ناڕازیبوون دەرگای خەم و پەژارە و نیگەرانییە، دڵ پەرت و پەرێشان دەکات، حاڵ و باری مرۆڤ تێکدەدات، و گومانی خراپ بە خودا دەبات لە جێگەی گومانی باش، رازیبوون لە هەموو ئەوانە رزگاری دەکات، و دەرگای بەهەشتی دونیای بەڕوودا دەکاتەوە بەر لە بەهەشتی دواڕۆژ.

رازیبوون دڵنیایی و ئارامی دەکات بە بەشی، دڵ فێنك دەکاتەوە سوکون و ئاسوودەیی بەسەردا دادەبارێنێت، ناڕازی بوون شڵەژانی دڵ و تێکچوون و گومان و بێزاری و ناجێگیری بۆ دروست دەکات.

هەر بەو جۆرە رازیبوون سووکنایی و ئارامی بەسەریدا دادەبەزێنێت کە هیچ شتێك بە ئەندازەی ئەوە بەسوود نییە، هەر کات ئەو سووکنایی و ئارامییە داباری: دڵ دێتە

راستە و بە دروستی رادەوەستێت، و حاڵ و باری چاك دەبێت، نارازیبوون لە هەموو ئەوانە دڵ دوور دەخاتەوە بەپێی کەم و زۆرییەکەی، گەر سووکنایی و ئارامی کۆچی لێکرد ئەوا خۆشی و ئاسوودەیی و ژیانی چاك و پاك کۆچی لێ دەکات، لە مەزنترین نیعمەتەکانی خودا لەسەر بەندەکەی دابەزینی سەکینە و ئارامییە بۆ سەری، لە مەزنترین هۆی دابەزینی ئەو سەکینەیە: رازیبوونە لە خودا لە هەموو حاڵ و بارەکاندا.

لەوانە: رازیبوون بەندە قوتار دەکات لە ململانێکردن بەرانبەر حوکم و بڕیارەکانی خودا، نارازیبوون لەو حوکم و بڕیارانە بریتییە ململانێی ئەو شتانەی کە بەندە پێی رازی نابێت، بنەمای ململانێی ئیبلیس لەگەڵ پەروەردگاری: لە نارازیبوونەوەیە بە حوکم و بڕیاری ئایینی و گەردوونی خودا.

لەوانە: حوکمی پەروەردگار بەسەر بەندەکەیدا گوزەری کردووە و بڕیارەکانیشی بەسەر بەندەکەیدا لە دادپەروەرییەوەیە، وەك لە فەموودەدا هاتووە ((**ماض في حكمك، عدل في قضاؤك**)) هەر کەس بەو عەدلە خواییە رازی نەبێت ئەوا لە ئەهلی ستەم و زۆردارییە.

"عدل في قضاؤك" گشتییە و هەموو بڕیارێك دەگرێتەوە، بڕیاری گوناه لەسەر نووسین و بڕیاری سەرئەنجامی گوناه لە ئاسەوار و سزادانی، هەردووکیان (گوناهکردن، سزاوەرگرتن) لە بڕیاری خودای موتەعالن، ئەو لەو بڕیارەدا چ بە نووسینی گوناه و چ بە سزا و تۆڵە لە هەموو دادپەروەرەکان دادپەروەرترە.

دادپەروەری خودا بە سزادان: ئاشکرایە، بەڵام دادپەروەری خودا لە بڕیاری گوناهدا چونکە گوناه سزایەکە لە خوداوە روو دەکاتە ئەوانەی لە پەرووەردگار بێئاگا دەبن، و دڵیان پشت لە خودا دەکات، هەر کات دڵ پشتی لە پەروەردگار و دۆستەکەی خۆی کرد و ئیخلاصی کەم بوویەوە: شایستە دەبێت بەو سزادانە (سزای نووسینی گوناه لەسەری)، چونکە دڵی بێئاگایان کانزای گوناهە، سزاش(واتە گوناه) لە هەموو لایەکەوە بەسەریدا دادەبارێت، ئەگەر نە، لەگەڵ کەماڵی ئیخلاص و یادی خودا و رووکردنە خودادا(ﷻ) هەرگیز گوناه سەرهەڵنادات، وەك دەفەرموێت ﴿كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوٓءَ وَالْفَحْشَآءَ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ ﴿٢٤﴾﴾ یوسف: ٢٤

گەر بڵێیت بڕیاری خودا بەوەی بەندەکەی پشتی تێبکات و خودای لەبیر بچێت و ئیخلاصی بۆی نەبێت، ئەمە سزای چ گوناهێکە؟

دەڵێم: ئەمە سروشتی نەفس و شانوشکۆیەتی، ئەو -سبحانه- گەر خێری بۆ بەندەکەی نەوێت کەسەکە دەداتە دەست نەفس و سروشت و ئارەزووی خۆی، ئەمەش ئاسەواری بێئاگایی و لەبیرچوونەوە و نەبوونی ئیخلاص و شوێنکەوتنی حەزەکانی لێوە پەیدا دەبێت، ئەم هۆکارانەش ئازار و لەدەستدانی خێر و خۆشی بەدوای خۆیاندا دەهێنن، وەك هەر هۆکارێکی تر کە سەرئەنجامی لێوە پەیدا دەبێت.

گەر بڵێیت ئەی بۆچی خودا لەسەر سیفەتێکی تر دروستی نەکرد؟

دەڵێم: ئەم پرسیارێکی بێجێیە، ناوەرۆکەکەی ئەوەیە کە دەڵێت: بۆچی بە فریشتە دروستی نەکرد و بە مرۆڤ دروستی کرد؟

گەر بڵێیت: ئەی بۆ کۆمەکی و یارمەتی نەدا لە شەڕی نەفس تاکو لە تاریکی سروشتی ئەو نەفسە رزگاری ببێت؟

دەڵێم: ناوەرۆکی ئەم پرسیارە ئەوەیە کە دەڵێت: بۆچی لەنێوان هەموو دروستکراوەکانیدا یەکسانیی نەکرد؟ بۆ دژیەکەکان و رووبەڕووەکانی دروست کرد؟ ئەمە خراپترین پرسیارە؟ پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە چۆن حیکمەت و پەروەردگاریی و موڵکداری داوای ئەوە دەکەن.

لەوانە: ناڕازیبوون یان بەهۆی لەدەستچوونی شتێکەوەیە کە دەیەوێت و خۆشیدەوێ و حەزی لێ دەکات، یان بەهۆی تووشبوون بە شتێکەوەیە کە حەزی لێ ناکات و لێی بێزارە و رقی لێیەتی، گەر یەقینی هەبوو بەوەی ئەوەی بەدەستی نەهێناوە بەشی ئەو نییە و ناتوانێت بەدەستی بهێنێت، ئەوەش تووشی بووە هەر دەبوا تووشی ببێت، ئیتر لەدوای ئەوە سوودێك بۆ ناڕازیبوون نامێنێتەوە جگە لە تیابردنی ئەوەی سوودی بۆی هەیە و بەدەستهێنانی ئەوەی زیانی پێدەگەیەنێت.

لەوانە: رازیبوون دەرگای سەلامەتی بەڕوودا دەکاتەوە، دڵی لە غەش و نەخۆشی سەلامەت و خاوێن دەکات، هیچ کەسێکیش لە سزای خودا رزگاری نابێت مەگەر کەسێك بە دڵێکی سەلامەتەوە رووی لە خودا کردبێت، لەگەڵ ناڕازیبووندا هەرگیز دڵ سەلامەت نابێت، تا بەندە زۆرتر و زیاتر رازی بێت دڵی سەلامەتترە، غەش و پیسی و لێڵی دڵ هاوملی ناڕازیبوونن، سەلامەتی و تەندروستی و چاکی دڵیش هاوملی رازیبوونن، هەر بەو جۆرە: حەسوودی، بەری درەختی ناڕازیبوونە، سەلامەتی دڵیش لە حەسوودی بەری درەختی رازیبوونە.

ـەوەنە: ناڕازیبوون دەرگای گومان بە خودا و گومان لە بڕیار و قەدەر و حیکمەت و ـزانستی خودا دەکاتەوە، زۆر کەم لە ناڕازیبووان لە شك و گومان بە خودا رزگاریان ـدەبێت، شك و گومان بەسەر دڵیدا دادەبارێت و بە زەوی ناخیدا شۆڕ دەبێتەوە، با خۆشی هەستی پێ نەکات، گەر بە وردی ناخی خۆی بپشکنێت دەبینێت یەقینەکەی ـەخۆشە و تێکەڵ بە شك و گومان بووە، رازیبوون و یەقین دوو برا و دوو هاوەڵی ـیەکترن، شك و ناڕازیبوونیش هاوڵ و هاوتای یەکترن، ئەمەش مانای ئەو فەرموودەیە کە لە سونەنی "الترمذي" و کەسانی تریشدا هاتووە ((گەر توانیت بە رازیبوون لەگەڵ ـیەقین کار بکەیت ئەنجامی بدە، گەر نەوتوانی ئەوا ئارامگرتن لەسەر ئەو شتانەی ـەفس لێی بێزارە خێرێکی زۆری تێدایە))

ـەوتە: هەر کەس دڵی خۆی پڕ کرد لە رازیبوون بە قەدەر ئەوا خودا سنگی پڕ دەکات ـە دەوڵەمەندی و ئارامی و قەناعەت، دڵی بۆ خۆشەویستی خۆی و گەڕانەوە بۆ لای و ـپشتپێبەستنی یەکلا دەکاتەوە، هەر کەس بەشی خۆی لە رازیبوون لەدەست بدات ـنی بە پێچەوانەی ڕازیبوون(واتە ناڕازیبوون) پڕ دەبێت و پشت لەو کار و کردەوانە ـدەکات کە بەختەوەری و رزگاری ئەوی تێدایە.

ـڕازیبوون دڵ یەکلا دەکاتەوە بۆ خودا، ناڕازیبوونیش دڵ لە خودا خاڵی دەکاتەوە.

ـەوتە: رازیبوون شوکر بەرهەم دەهێنێت کە بەرزترین مەقامی باوەڕە، بەڵکو شوکر حەقیقەتی باوەڕە، ناڕازیبوونیش دژی شوکر بەرهەم دەهێنێت کە بریتییە لە کوفری نیعمەتەکان، لەوانەیە کوفری خاوەن نیعمەتەکەشی بەدوادا بێت(واتە بێباوەڕی بە خودا)، گەر بەندە لە هەموو حاڵەتەکان لە پەروەردگاری رازی بوو ئەوە شوکری بۆ دەستەبەر ـدەکات، ئەو کات دەبێت بە یەکێك لە رازیبووان و شوکرکەران، گەر رازیبوونی لەدەست چوو: دەچێتە ریزی ناڕازییەکانەوە و رێگەی بێباوەڕان دەگرێتە بەر.

ـەوانە: شەیتان زۆرجار لە کاتی ناڕازیبوون و شەهوەتدا زەفەر بە مرۆڤ دەبات، لەو ـوو شوێنەدا راوی مرۆڤ دەکات بەتایبەت کاتێك ناڕازیبوونەکەی زاڵ ببێت بە سەریدا، ئەو کاتە شتێك دەڵێت کە پەروەردگار پێی رازی نییە، و کارێك ئەنجام دەدات کە خودا پێی ناخۆشە، هەروەها نییەتێك دەهێنێت کە تیایدا خودا رازی ناکرێت، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر مردنی ئیبراهیمی کوڕی فەرمووی ((دڵ حوزن رووی تێدەکات و

چاو فرمێسك دەڕێژێت و تەنها ئەوە دەڵێین كە خودا پێی رازییە))، مردنی رۆڵە لەو پێشهاتانەیە كە نارازیبوون لە قەدەر بەدوای خۆیدا دەهێنێت، پێغەمبەر(ﷺ) رایگەیاند: كە لەم جۆرە مەقامانەدا-كە زۆربەی خەڵكی لێی نارازین و شتێك دەڵێن و كارێك دەكەن كە خودا پێی رازی نییە- شتێك ناڵێت پەروەردگاری پێی نارازی بێت، بەڵكو ئەوە دەڵێت كە خودا پێی رازییە.

لەوانە: رازیبوون حەز و ئارەزوو لە دڵ دەردەكات، حەز و ئارەزووی كەسی رازی شوێنی ئەوە دەكەوێت كە پەروەردگاری داوای لێ كردووە، مەبەستم ئەوەیە پەروەردگار خۆشیدەوێت و پێی رازییە، رازیبوون و شوێنكەوتنی حەز و ئارەزوو هەرگیز لە یەك دڵدا كۆنابێتەوە، گەر بەشێك لەمە و بەشێك لەوەی تێدا بوو ئەوا ئەو دڵە بەشی ئەوەیانە كە زاڵە و تیایدا زۆرترە.

## ۞ كۆڕێكی نایاب لەسەر بابەتی رازیبوون

لەوانە: كەسی رازی رادەوەستێت لەگەڵ هەڵبژاردەی خودادا بۆ ئەو، پشت لە هەڵبژاردنی نەفسی خۆی دەكات، ئەمەش لەهێزی ناسینی پەروەردگاری و ناسینی نەفسی خۆیەوەیە.

وەهەیبی كوڕی وەرد لەگەڵ سوفیانی سەوری و یوسفی كوڕی ئەسبات كۆبوونەوە، سەوری فەرمووی: بەر لە ئەمڕۆ رقم لە مردنی ناكاو و كوتوپڕ بوو، بەڵام ئەمڕۆ ئاوات دەخوازم بمرم.

یوسفی كوڕی ئەسبات فەرمووی: بۆچی؟ فەرمووی: چونكە لە فیتنە دەترسم.

یوسف فەرمووی: بەڵام تەمەنی درێژم پێ ناپەسەند نییە.

سەوری فەرمووی: بەڵام بۆ لە مردن بێزاریت؟

فەرمووی: بەڵكو رۆژێكم تووشبێت تەوبەی تێدا بكەم و كارێكی چاكەی تێدا ئەنجام بدەم.

وترا بە وەهەیب تۆ چی دەڵێیت؟

فەرمووی: من هیچ هەڵبژاردەیەك ناكەم، كامیان لای خودا خۆشەویست بوو ئەوە لای من خۆشەویستە.

سوفیان ناوچاوانی وهەیبی ماچ کرد و فەرمووی: ئەمە رۆحانییەتە سوێند بە خودای کەعبە.

ئەمە بریتییە لە حاڵی بەندەیەك کە ژیان و مردنی بۆ خودا لەلا یەکسان بووە، لە هەردووکیاندا لەگەڵ هەڵبژاردەی خودادایە بۆ ئەو، وهەیب -رەحمەتی خودای لێ بێت- مەقامی بەرزی لە رازیبوون و مەقامەکانی تریشدا بەدەست هێنا بوو.

## ۞ رازیبوونی خودا لە بەندەکەی مەزنترین پاداشتە

لەوانە: رازیبوونی خودا لە بەندەکەی لە بەهەشت و ئەوەی تێیدایە گەورەترە، چونکە رازیبوون سیفەتی خودایە و بەهەشت خەلقی خودایە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ أَكْبَرُ﴾التوبة: ٧٢، ئەمەش لەدوای ئەوەی کە دەفەرموێت ﴿وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ ۚ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٧٢﴾﴾ التوبة: ٧٢، ئەم رازیبوونە پاداشتی ئەو رازیبوونەی ئەوانە لە دونیادا، لەبەر ئەوەی ئەو پاداشتە مەزنترین پاداشتە کەوابوو هۆی پاداشتەکە(رازیبوون) مەزنترین کاروکردەوەیە.

لەوانە: کە بەندە لە هەموو حاڵ و بارێکیدا رازی دەبێت لە خودا و لە بڕیارەکانی خودا: هەڵبژاردەی نابێت و رازیبوونی لەو بەشەی بۆی دیاریکراوە و لەو کار و بارانەی خودا بەسەریدا دەهێنێت لە هەڵبژاردن بێنیازی دەکات، یادی خودا بۆ ئەو جێگەی داوا لە خودا دەگرێتەوە، گەر داوایەکی بوو داواای کۆمەکی و یارمەتییە بۆ یادی خودا و بەردەوام بوون لەسەری و گەیشتن بە رەزامەندی ئەو، ئەم کەسە شتێکی پێدەدرێت کە لەو باشترین شتانەیە بە داواکەرێك بەخشرابێت، وەك لە فەرموودەیەکی قودسیدا هاتووە ((هەر کەس یادی من سەرقاڵی بکات لە داواکردن لێم، باشترین ئەوەی بە داواکەران دەبەخشرێت پێی دەبەخشم))، داواکاران داوایان لێکرد حوداش ئەو فەزڵەی پێدان کە داوایان کرد، رازیبووان لە خودا رازیبوون بۆیە رازامەندی خۆیی پێبەخشین، رازیبوون لە خودا رێگری ناکات لەوەی داوای هۆکاری بەدەستهێنانی رازیبوون لە خودا بکەیت، بەڵکو ئەهلی رازیبوون لەو داوایەدا پێداگرن.

لەوانە: رازیبوون سرووری دڵ بە قەدەرە بڕاوەکان لە هەموو کار و بارێکدا بەرهەم دەهێنێت، هەر بەو جۆرە ئاسوودەیی نەفس و ئارامبوونی لە هەموو حاڵێکدا،

هەروەها دڵنیایی لە رووبەڕووبوونەی هەر ترس و هەڕەشەیەكی كاروباری دونیا، فێنكی قەناعەت و حەزی بەندە بە بەشی براوەی خودا بۆ ئەو و دڵخۆشبوونی بەوەی مەولای حەق كاروبارەكانی بۆ رادەپەڕێنێت و خۆڕادەستكردن بە دۆستەكەی لە هەموو بارێكدا و رازیبوونی لە ئەو بەوەی بەسەریدا جاری دەبێت و تەسلیمكردنی حوكم و بڕیار بەو-سبحانه-، باوەڕی بە تەگبیری باشی خودا و كەماڵی حیكمەتی ئەو، سكاڵای پەروەردگار نەباتە لای كەس و ناڕەزایی لە بڕیارەكانی دەرنەبڕێت، بۆیە هەندێ لە عاریفان رازیبوونیان بە ئەخلاق جوانی لەگەڵ خودا لێكداوەتەوە.

عومەری كوڕی عبدالعزیز-رەحمەتی خودای لێبێت- دەفەرموێت: رۆژم لێ بوویەوە و سروورم تەنها لە رووداني قەدەرەكاندایە.

ئیبن مەسعود-خوا لێی رازی بێت- دەفەرموێت: ((هەژاری و دەوڵەمەندی دوو وڵاخن باكم نییە سواری كامیان دەبم، گەر هەژاری بوو ئارامگرتنی تێدا هەیە، گەر دەوڵەمەندی بوو بەخشینی تێدا هەیە)).

لەوانە: "رازیبوون بە قەدەر" مرۆڤ رزگار دەكات لەوەی خەڵكی بە تووڕەكردنی خودا رازی بكات، یان زەمیان بكات لەسەر شتێك كە خودا بۆ ئەوی نەبڕیوەتەوە، یان ستایش و حەمدیان بكات بە شتێك كە فەزڵی خودایە لەسەر ئەو، بۆیە لە یەكەمیاندا- كە بریتییە لە رازی كردنیان و زەم كردنیان- ستەمكار دەردەچێت، لە دووەمیاندا- حەمد و ستایشیان- هاوەڵدانەر دەردەچێت، گەر رازی بوو بە قەزای خودایی لە زەم و حەمدیان رزگاری دەبێت، بۆیە رازیبوون لە هەموو ئەوانە قوتاری كرد.

### ۞ دڵی رازی فێنكە

لەوانە: رازیبوون دڵی بەندە خاڵی دەكاتەوە و خەم و پەژارەی كەم دەكاتەوە، بۆیە بۆ بەندایەتی پەروەردگاری یەكلا دەبێتەوە بە دڵێكی سووك و دوور لە قورسایی و خەم و پەژارەی دونیا، وەك "ئیبن ئەبی دونیا" لە بیشری كوڕی بەشاری موجاشیعییەوە باس دەكات-كە یەكێك بووە لە زانایان- دەڵێت: وتم بە عابیدێك، ئامۆژگاریم بكە، وتی: نەفسی خۆت بخە بەردەم قەدەر بۆ هەر كوێت دەبات، ئەوە دڵت خاڵی دەكاتەوە و خەم و پەژارەت كەم دەكاتەوە، وریابە ناڕازیبوون لە قەدەر

دەرنەبڕیت، چونكە ناڕازیبوونی خودا بەسەرتدا دادەبارێت و تۆش لێی بێئاگای و هەستی پێ ناكەیت، ئەو كات هەڵتدەداتە ناو ئەوانەی كە خودا لێیان ناڕازییە.

عومەری كوڕی عبدالعزیز-رەحمەتی خودای لێ بێت- دەفەرموێت: ((هەموو ئەو دلوایانە وازیان لێهێنام و لێم دووركەوتنەوە، پێویستیم بە هیچ شت نەماوە، تەنها پێویستیم بە قەدەری خودایە، زۆرجار ئەم دوعایەی دەكرد: خودایە رازیم بكە بە قەزای خۆت، بەرەكەت بخە ناو قەدەرەكانتەوە بۆم، تا ئەوەی تۆ دوای دەخەیت حەزم بە پێشكەوتنی نەبێت و ئەوەی تۆ پێشی دەخەیت حەزم بە دواخستنی نەبێت))

لەوانە: خودا نەهی كردووە لە پێشكەوتنی خودا و پێغەمبەر لە حوكمی ئایینی شەرعیدا، ئەوەش بەندایەتی كردنی ئەو فەرمانەیە، بەندایەتی فەرمانە گەردوونییە قەدەرییەكانیش: ئەوەیە كە پێش خودا نەكەویت مەگەر بەرژەوەندییەكی پارسەنگ لەو شتەدا بوونی هەبێت، بۆیە پێشكەوتن لە هەردوو بارەكەدا نەهی لێكراوە لە بڕیاری گەردوونی و قەدەریدا و لە بڕیاری ئایینی و شەرعیدا، گەر ئارامگرتن فەرز بێت یان پەسەند بێت، یان رازیبوون فەرز بێت و كەسەكە وازیان لێ بهێنێت ئەوە لە قەدەر و لە شەرعدا پێشی خودا و پێغەمبەر كەوتووە.

### ۞ كاری دڵ كۆتایی بۆ نییە

لەوانە: كاری ئەندامەكان تا رادە و سنوورێكی تایبەت و زانراو زیاد دەكرێت، بەڵام زیادكردنی كاری دڵ كۆتاهاتنی بۆ نییە، ئەوەش چونكە كاری ئەندامەكان رادە و سنوورێك هەیە تیایدا كۆتایی پێ دێت و دەوەستێت، ئەو كات پاداشتەكەی بەپێی سنوور و رادەكەیەتی، بەڵام كارەكانی دڵ: هەمیشەیی و بەردەوام و دانەبڕاون، با بەندە بۆ خۆی نەیبینێت و پێی نەزانێت.

نموونەكەی: خۆشەویستی و رازیبوون حاڵی كەسی خۆشەویست و رازییە، هەرگیز لێی جیانابنەوە، با حوكمەكەشی لەبەرچاو بزر ببێت، خاوەنەكەی لە زیادبوونی پەیوەستبووندایە، زیادبوونی خۆشەویستی پەیوەستە بە بەردەوامی ئەو حاڵەوە، ئەوەش هەردەم لە زیادبووندایە با ئەندامەكانیشی لە خاوبوونەوە و ساردبوونەوەدا بن، بەڵكو زیادبوونی ئەو خۆشەویستییە هەندێ جار لە دۆخی خاوبوونەوە و

ساردبوونەوەدا زۆرتر و زیاترە لە زیادبوونی خۆشەویستی ئەهلی نەوافل کە بە پەتی خۆشەویستی گرێ نەدراون.

گەر نەرێی ئەمە دەکەیت تێرابمێنە لە زیادبوونی خۆشەویستی کەسێك کە بە خوداوە دەنوێت لەگەڵ زیادبوونی خۆشەویستی کەسێك کە شەونوێژ دەکات و لەخودا بێئاگایە، خودای موتەعال تەماشای دڵ و هیممەت و لێبڕان دەکات، بەها و نرخی بەندە بریتییە لە هیممەت و ویست و لێبڕانی، هەر کەس بە هیچ شت رازی نەبوو جگە لە خودا -با هەموو دونیای پێ ببەخشن- ئەو کەسە خاوەن شانوشکۆیە، ئەو کەسەش کە بە کەمترین بەشی دونیا رازی دەبێت، شکۆی تایبەت بە خۆی هەیە، با کاروکردەوەکانیشیان لە یەك شێوە و قاڵبدا بن، لەوانەشە کاروکردەوەی ئەو کەسەی لادەکاتەوە بەلای بەشە دونیاییەکاندا زۆرتر و گرانتر بن، ئەمە فەزڵێکە خودا بە هەر کەسی دەدات بیەوێت، ئەو خاوەنی فەزڵی مەزنە.

## ۞ پێداگری لە دوعادا چاوگەی بەندایەتییە

داوا و دوعا نەرێی رازیبوون ناکات، بەڵکو گەر بەندە پێداگری کرد لەسەر دوعا بەتایبەت داوایەك رازیبوون و نزیکبوونەوەی لە خودا تێدا بوو ئەو دوعایە نەنگی بۆ مەقامی رازیبوون دروست ناکات، لە ئەسەردا هاتووە ((خودا لە دوعادا کەسی پێداگری خۆشدەوێت))، ئەبوبەکری صدیق -خوا لێی رازی بێت- لە رۆژی بەدردا بە پێغەمبەری فەرموو ((ئەی پێغەمبەری خودا، زۆر پێداگریت کرد لەسەر پەروەردگارت، هەندێ لە داوات بەسە بۆ لای پەروەردگارت))، ئەم پێداگرییە چاوگەی بەندایەتییە.

لە سونەنی ئیبن ماجەدا لە ئەبی صالح لە ئەبی هورەیرەوە -خوا لێی رازی بێت- فەرمووی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی ((هەر کەس داوا لە خودا نەکات خودا خەشمی لێ دەگرێت))، گەر داوالێکردن خودا رازی بکات، ئەوا پێداگری لە داوادا نەرێی رازیبوونی خودا ناکات.

حەقیقەتی رازیبوون: بریتییە لە تەبایی لەگەڵ خودای موتەعالدا لەو کار و بڕیارانەی خودا پێیان رازییە، ئەوەی نەرێی رازیبوون دەکات و دژ بە رازیبوونە ئەوەیە پێداگری بکەیت لەسەر شتێك و شتێك بەسەر ئەودا هەڵبژێری کە نەزانیت ئایا ئەو شتە خودا

پێی رازییە یان لێی ناڕازییە، وەك ئەو كەسەی پێداگری دەكات لە دوعادا بۆ ئەوەی كەسێك دەسەڵات بگرێتە دەست، یان خودا دەوڵەمەندی بكات، یان فلان كاری بۆ جێبەجێ بكات، هەموو ئەمانە پێچەوانەی رازیبوونن، چونكە یەقینی نییە ئەوانە رازامەندی خوایان لەسەرە یان نە.

لەوانەیە حاڵی داوا بە جۆرێك ناسینی خودا و خۆشویستنی و گەردنكەچی و فەرمانبەرداری بەرووی دڵیدا بكاتەوە دلوای پێویستییەكانی خۆی لەبیر بچێتەوە، ئەو كاتە ئەوەی لە دوعاكەوە دەستی كەوتووە لای خۆشەویستتر بێت لە پێویستییەكانی، بە جۆرێك حەز دەكات لەناو حاڵەدا بمێنێتەوە و حاڵەتەكەی بۆ بەردەوام بێت، بۆیە ئەوەی لەلایەتی هەڵدەبژێرێت بەسەر پێویستییەكانیدا، دڵخۆشی بەوانە مەزنترە لە دڵخۆشی بە پێویستییەكانی، بۆی پێش بخرێت یان لەدەستی بچێت لەلای یەكسانە.

هەندێ لە عاریفان دەڵێن: هەندێ جار پێویستییەكم لەلای خودا هەیە، داوای لێ دەكەم، لەو كاتەدا دەرگای موناجات و ناسینی خودا و گەردنكەچی و لالانەوەم بەروودا دەكرێتەوە بۆیە حەز دەكەم پێویستییەكەم بۆ جێبەجێ نەكرێت تاكو لەو حاڵەتەدا بمێنمەوە.

❁ ❁ ❁

## (٣٠) (منزلة الشكر)

# مەنزیلەی شوكر

لە مەزنیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی شوكرە.

ئەم مەنزیلەیە بالأترین و بەرزترین مەنزیلەیە، لەسەرو مەنزیلەی "رازیبوون"ەوەیە و زیاتریش، رازیبوون لەناو شوكردایە، بەبێ شوكر رازیبوون بوونی نییە.

شوكر نیوەی ئیمانە-وەك پێشتر باسكراوە-، باوەڕ دوو نیوەیە: نیوەی یەكەمی شوكرە و نیوەكەی تری ئارامگرتنە.

خودای موتەعال فەرمانی بە شوكركردن كردووە و نەهی كردووە لە دژ و پێچەوانەكەی، مەدح و سەنای ئەهلی شوكری كردووە و بەندە تایبەتەكانی پێ وەسف كردووە، شوكری كردووە بە ئامانجی بوون و بڕیار(خەلق و ئەمر)، بەڵێنی داوە بە ئەهلی شوكر بە باشترین پاداشتن، شوكری كردووە بە هۆی زیادبوونی فەزڵ و نیعمەتی خودا بۆ بەندەكەی، هەروەها پاسەوان و پارێزەری نیعمەتەكانی، رایگەیاندووە كە تەنها ئەهلی شوكر كەڵك و قازانج لە ئایەتەكانی خودا دەبینن، ناوێكی لە شوكر بۆ خۆی داتاشیوە ((الشكور)) كە یەكێكە لە ناوە جوانەكانی خودای موتەعال، ئەم ناوەیە شوكركەر بە شوكركراوەوە دەبەستێتەوە و دەیگەنێت، بەڵكو ئەو شوكرە بۆ بەندەی خودا دەگەڕێتەوە و لە شوكركەرەوە دەیكات بە شوكركراو، شوكر ئامانجی خودایە لە بەندەكەیدا، ئەهلی شوكریش كەمێكی زۆر كەمن لە بەندەكانی خودان﴿ وَٱشۡكُرُواْ لِلَّهِ إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ ﴿١٧٢﴾ ﴾ البقرة: ١٧٢، هەروەها دەفەرموێ ﴿ وَٱشۡكُرُواْ لِي وَلَا تَكۡفُرُونِ ﴿١٥٢﴾ ﴾ البقرة: ١٥٢، دەربارەی خەلیلی خۆی ئیبراهیم دەفەرموێ﴿ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمۡ يَكُ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٢٠﴾ شَاكِرًا لِّأَنۡعُمِهِ ﴾النحل: ١٢٠ - ١٢١، هەروەها دەربارەی نوح (عليه السلام) دەفەرموێ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ عَبۡدًا شَكُورًا ﴿٣﴾ ﴾ الإسراء: ٣، هەروەها دەفەرموێ﴿ وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿٧٨﴾ ﴾ النحل: ٧٨، هەروەها دەفەرموێ ﴿ وَٱعۡبُدُوهُ وَٱشۡكُرُواْ لَهُۥٓۖ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ العنكبوت: ١٧، هەروەها دەفەرموێ ﴿ وَسَيَجۡزِي ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾

آل عمـــران: ١٤٤، هـــەروەها دەفـــەرموێ ﴿وَٱعۡبُدُوهُ وَٱشۡكُرُواْ لَهُۥٓۖ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿١٧﴾﴾ العنكبوت: ١٧، هەروەها دەفەرموێ ﴿وَإِذۡ تَأَذَّنَ رَبُّكُمۡ لَئِن شَكَرۡتُمۡ لَأَزِيدَنَّكُمۡۖ وَلَئِن كَفَرۡتُمۡ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٞ ﴿٧﴾﴾ إبـراهيم: ٧، هـەروەها دەفـەرموێ ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٖ ﴿٣١﴾﴾ لقمان: ٣١.

خودا ناوی خۆی بە "شاكر" و "شكور" هێناوە، هەر بەو جۆرە ئەوانەی شـوكری خـودا دەكەن بەو دوو ناوە ناوی هێناون، لە وەسفی خۆی بەشـی داون و بـەناوی خـۆی نـاوی هێناون، ئەمە بەسە بۆ تۆ تاكو خۆشەویستی و فەزڵی شوكركەرانت بۆ روون ببێتەوە.

خودا شوكری شوكركەرانی بۆ خۆیـان گێڕاوەتـەوە، وەك دەفـەرموێت ﴿إِنَّ هَٰذَا كَانَ لَكُمۡ جَزَآءٗ وَكَانَ سَعۡيُكُم مَّشۡكُورًا ﴿٢٢﴾﴾ الإنسـان: ٢٢، پـەروەردگار بـە شـوكر لـە بەندەكـەی رازی دەبێت﴿وَإِن تَشۡكُرُواْ يَرۡضَهُ لَكُمۡ﴾الزمر: ٧، كەمی شوكركەران بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كـە شـوكركەران كەسـانی تایبـەتی خـودان﴿وَقَلِيلٞ مِّنۡ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾﴾ سـبأ: ١٣، لـە هەردوو سەحیحەكەدا لە پێغەمبەری خـوداوە(ﷺ) ((پێغەمبـەر شـەونوێژی دەكـرد تـا هەردوو پێیەكانی وەرەمیان تووش بوو، پێی وترا: ئـاوا دەكـەیت و خـودا لـە گونـاهی ئەوەڵ و ئاخرت خۆشبووە؟! فەرمووی: ئەی نابێت بەندەیەكی شوكركەر بم؟))

فەرمووی بە مـەعاز ((سـوێند بـە خـودا ئـەی مـەعاز، مـن تـۆم خۆشـدەوێت، لـەبیرت نەچێت لەدوای هەر نوێژێك بڵێیت: **اللهم أعني على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك**))

لـە مەسـنەدی "الترمـذي" لـە ئـیبن عەباسـەوە –خـوا لـە خـۆی و بـاوكی رازی بێـت– پێغەمبەر(ﷺ) دوعای دەكـرد بـە وتـنی ئـەم كەلیماتانـە ((**اللـهم أعـني ولا تعـن علـي، وانصرني ولا تنصر علي، وامكر لي ولا تمكر بي، واهدني ويسر الهدى لي، وانصرني على من بغى علي، رب اجعلني لك شاكرا، ذكارا لك، رهابا لك، مطاوعا لـك، مخبتـا إليـك، أواهـا منيبا، رب تقبل توبتي، واغسل حوبتي، وأجب دعوتي، وثبـت حجـتي، واهـد قلـبي، وسـدد لساني، واسلل سخيمة صدري**)).

## ۞ رێساكانی شوكر

بنچینەی شوكر لە زمانەوانیدا: شـوكر لـە زمانەوانیـدا بریتییـە لـە كاریگـەری خـواردن لەسەر جەستەی ئاژەڵان بە دەركەوتنێكی ئاشكرا و دیـار، دەوترێـت "شـكرت الدابـة تشكر شكرا" لەسەر كێشی "سمنت تسمن سمنا": ئەگەر كاریگەری خـواردنی ئـالفی بـە

قەڵـەوبوون لەسـەر دەربكـەوێت، "دابـة شـكور" ئەگـەر ئـەو ئاژەڵـە قەڵـەوی لەسـەر دەركەوت زیاتر لەو ئالفەی دەیخوات.

لە سەحیحی "مسلم"دا ((حتى أن الدواب لتشكر من لحومهم))، "لتشـكر"واتە "لتسـمن" قەڵەو دەبێت بەهۆی زۆری ئەوەی دەیخوات.

حەقیقەتی شوكر لـە بەندایەتیـدا هـەر بـەو جۆرەیـە، بریتییـە لـە دەركـەوتنی ئاسـەواری نیعمەت لەسەر زمانی بەندەی خـودا، بـە سـەناكردنی خـودا و داننـان بـە نیعمەتەكانیـدا، هەروەها دەركەوتنی ئاسەواری نیعمەت لەسەر دڵی: بە بینینی دڵ و خۆشویستنی خاوەن نیعمەت، هەروەها دەركـەوتنی لەسـەر ئەندامـەكان: بـە گەردنكەچـی و فەرمانبـەرداری و گوێڕایـەڵی، "شـوكر" لەسـەر پێـنج ڕێسـا دامـەزراوە: گەردنكەچـی شـوكركەر بـۆ شوكركراو(خودا)، خۆشەویستی بۆی، داننان بە نیعمەتەكانیدا، مـەدح و سـەنا و سـتایش كردنی بەو نیعمەتانە، بەكارنەهێنانیان لە شوێنێكدا كە خودا پێی ناخۆشە.

هەر كەس قسەی لە شوكر كردووە و سنوور و مەرزی دیاری كردووە قسەكەی بۆ ئـەم پێنجە دەگەڕێتەوە و لەسەر خولگەی ئەو پێنجە دەسوڕێتەوە.

وتراوە: سنوورەكەی بریتییە لە دانپیادانان بە نیعمەتی خاوەن نیعمەت بەشێوەیەكی گەردنكەچانە.

هەروەها وتراوە: سەنا و ستایشی چاكەكار بە باسكردنی چاكەكانی.

هەروەها وتراوە: شوكر بریتییە لە مانەوەی دڵ لەسەر خۆشەویستی خاوەن نیعمـەت، هەروەها مانەوەی ئەندامەكان لەسەر گوێڕایەڵی و جاریبوونی شوكر بە زماندا و سـەنا و ستایشی.

هـەروەها وتـراوە: شـوكر بریتییـە لـە بینـینی منـەتی خـودایی و پارێزگـاری لـە سنوورەكانی خودا.

چەند ورد و جوانی فەرمووە حمدون القصار كە دەفەرموێت: شوكری نیعمەت ئەوەیە خۆت لەناو نیعمەتەكەدا بە مشەخۆر بزانیت.

ئەبو عثمان دەفەرموێت: شوكر ئەوەیە زانستی ئەوەت بۆ دروست ببێت كە تۆ ناتوانی و دەستەوسانی لە شوكر كردنی خودا.

جونەید دەفەرموێت: شوكر ئەوەیە خۆت بە خاوەن و شایستەی نیعمەتەكە نەزانی.

لێرەدا مانای قسەکەی حمدون القصار دەردەکەوێت کە دەفەرموێت خۆت بە مشەخۆر بزانیت لە نیعمەتەکەدا.

رووەیم دەفەرموێت: شوکر بریتییە لە بەکارهێنانی هەموو تواناکانت.

شوکری خەڵکی بە گشتی: شوکر کردنی خودایە لەسەر خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و رۆزی جەستە.

شوکری کەسانی تایبەت: شوکرکردنە لەسەر یەکتاپەرستی و باوەڕ و رۆزی دڵ.

السري السقطي پرسیاری لە جونەید کرد دەربارەی شوکر-جونەید لەو کاتەدا منداڵ بوو- فەرمووی: شوکر ئەوەیە هیچ نیعمەتێکی خودا لە یاخیبوونی خودادا بەکارنەهێنێت، لێی پرسی ئەمە لە کێیەوە فێربووی؟ فەرمووی: لە کۆڕی دانیشتنەکانی تۆوە.

وتراوە: هەر کەس دەستی بە کۆمەك و یارمەتی کورت بوو، با زمانی بە شوکر کردن درێژ بێت.

شوکر هەمیشە زیاد بوونی لەگەڵدایە بەپێی فەرموودەی خودای موتەعال﴿لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ﴾إبراهيم: ٧، هەر کات حاڵی خۆت لە زیادبووندا نەبینی ئەوا روو لە شوکر بکە.

لە ئەسەرێکی قودسییەوە ((ئەهلی یادکردن ئەهلی مەجلیسی خۆمن، ئەهلی شوکرم ئەهلی رێز و حورمەتن، ئەهلی گوناه و یاخیبوون لە بەزەیی خۆم بێهیوایان ناکەم، گەر تەوبە بکەن من خۆشەویستیانم، گەر تەوبە نەکەن من پزیشکیانم، موسیبەتیان بۆ دەنێرم تاکو لە نەنگی و خراپە پاکیان بکەمەوە))

وتراوە: هەر کەس نیعمەتێك بشارێتەوە ئەوا کوفری بەو نیعمەتە کردووە، هەر کەس دەریبخات و بڵاوی بکاتەوە ئەوە شوکری کردووە.

ئەمە لە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) وەرگیراوە ((کە خودا نیعمەتێکی بە بەندەکەی بەخشی پێی خۆشە ئاسەواری نیعمەتەکەی لەسەر ببینێت))

بۆ ئەم مەبەستە وتراوە:

ومن الرزية أن شكري صامت عما فعلت وأن برك ناطق

وأرى الصنيعة منك ثم أسرها إني إذا لندى الكريم لسارق

## ✿ نیعمەتی پەروەردگار دەناسین و قبووڵی دەکەین و باسی لەبارەوە دەکەین

ناسـینی نیعمـەت: بریتییـە لـە ئامـادەکردنی نیعمەتەکـە لـە زەینـدا و بینـینی و جیاکردنەوەی.

بۆیە ناسینی واتە بەدەستهێنانی لە زەیندا وەك چۆن لـە دەرەوە بەدەسـتی هێنـاوە، زۆربەی خەڵکی خودا چاکەی لەگەڵ کردووە و بەخۆی نازانێت، بۆیە شوکر لەو جـۆرە کەسانە ناوەشێتەوە.

قبووڵ کردنی شوکر: بریتییە لە وەرگرتنی نیعمەتەکە لە خاوەن نیعمەت بە دەرخسـتنی هەژاری و پێویستی بەو نیعمەتە، ئەوە بزانێت هاتنی ئەو نیعمەتە بە شایستەبوونی ئـەو نەبووە و هیچ بەها و نرخێکی بەرانبەر ئـەو نیعمەتـە بـە خـاوەن نیعمـەت نەبەخشـیوە، بەڵکو خۆی وەك مشەخۆرێك لەسەر نیعمەتەکە تەماشا بکات، گەر بەو جۆرە بـوو ئـەوە شایەتی بۆ دەدا کە بە دروستی قبووڵی نیعمەتەکەی کردووە.

شوکر کردنی خاوەن نیعمەت و ئەوەی وابەستەی نیعمەتەکەیە دوو جـۆرە: تایبـەت و گشتی، گشتییەکە: بریتییە وەسفکردنی خاوەن نیعمەت بە بەخشین و بەخشـندەیی و چاکەکاری و فراوانی بەخشین، و هاوشێوەکانی ئەمانە.

تایبەتەکەی: بریتییە لە باس کردنی نیعمەتـەکانی، راگەیانـدنی ئـەوەی ئـەو نیعمەتـە لـەلای خـوداوە بـەو گەیشـتووە، وەك خـودای موتـەعال دەفـەرموێت ﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴿١١﴾﴾ الضحى: ١١

لەم باسکردنی نیعمەتەدا ئەوەی فەرمانی پێکراوە دوو بۆچوون هەیە لەسەری:

یەکەمیان: بریتییە لە باسکردنی نیعمەتەکە و هەواڵ دان لەبارەیـەوە، و وتـنی: خـودا بەو نیعمەتە و بەو نیعمەتە چاکەی لەگەڵ کردووم، "مقاتل" لەسەر ئایەتەکە دەڵێـت: واتە شوکری خودا بکە لە نیعمەتی خودا لەسەرت لەوەی لـەم سـوورەتەدا باسـکراوە: لە پڕکردنەوەی هەتیوی و بێ بابی بـۆت و هیدایەتـدانت دوای وێڵـی و سـەرگەردانی و دەوڵەمەند کردنت دوای هەژاری و نەبوونی.

باسکردنی نیعمـەتی خـودا شـوکر کردنـی خودایـە، وەك لـە فەرموودەکـەی جابر کـە بەرزکراوەتەوە ((هەر کەس چاکەیەکی لەگەڵ کرا بە پاداشتی کەسەکە بداتـەوە، گـەر نەیتوانی با سەنای بکات، گەر سەنای کەسەکەی کرد ئـەوە شـوکری کـردووە، ئەگـەر

چاكەكەی بشارێتەوە كوفری بەو چاكەیە كردووە، هەر كەس وا دەربخات بە شتێك رازاوەتەوە و بەو جۆرەش نەبێت ئەوە وەك لەبەركردنی دوو پۆشاكی زوورە))

لێرەدا باسی سێ بەشەكەی خەڵكی كرد: كەسێك شوكری نیعمەت دەكات و سەنای دەكات، كوفركەر بە نیعمەت و بزركەر و داپۆشەری نیعمەت، لەگەڵ كەسی خۆدەرخەر كە وانیشان دەدات پێیدراوە و لە راستیشدا پێی نەدراوە، ئەو كەسە بە شتێك خۆی دەڕازێنێتەوە كە پێی نەدراوە.

لە ئەسەرێكی بەرزكراوەی تردا ((هەر كەس شوكری شتە كەمەكان نەكات شوكری شتە زۆرەكانی پێ ناكرێت، هەر كەس شوكری خەڵكی نەكات شوكری خودای نەكردووە، باسكردنی نیعمەتی خودا شوكرە، وازلێهێنانی كوفرە، كۆمەڵ بەزەییە، و دابڕان و دەستەگەرایی ئازار و سزایە))

دووەمیان: باسكردنی نیعمەت كە لەم ئایەتەدا(ئایەتی ١١ سورەتی الضحى) فەرمانی پێكراوە: بریتییە لە بانگەواز بۆ لای خودا و گەیاندنی پەیامەكەی و فێركردنی ئوممەت بە زانست و زانیاری، "موجاهید" دەڵێت: ئەو شوكرە فەرمانپێكراوە لە ئایەتەكەدا بریتییە لە پێغەمبەرایەتی، "الزجاج" دەفەرموێت: واتە ئەوەی تۆی پێ رەوانەكراوە بیگەیەنە و باسی ئەو پێغەمبەرایەتییە بكە كە خودا پێیداوی، "الكلبي" دەڵێت: بریتییە لە قورئان، فەرمانی پێكردووە بیخوێنێتەوە.

دروست ئەوەیە: هەردوو جۆرەكە لەخۆ دەگرێت، چونكە هەردووكیان نیعمەتن و فەرمان بە باسكردن و شوكر كردنیان كراوە، دەرخستنی نیعمەتەكە جۆرێكە لە شوكركردنی.

شوكر كردن رێگەی پێغەمبەرانی خودایە -صلى الله عليهم أجمعين- كە تایبەترین خەلقی خودان و نزیكترینن لە خوداوە.

هیچ مەقامێك لە شوكر بەرزتر و باڵاتر نییە، هەرچی مەقامەكانی ئیمانە لەژێریدا جێگەیان دەبێتەوە، تەنانەت مەقامی خۆشەویستی و رازیبوون و تەوەكول و غەیری ئەوانەش، شوكر دروست نابێت تا بەدەست نەهێنرێت، سوێند بە خودا هیچ رێگەیەك لەبەردەم تایبەتان لە دۆستانی خودا و ئەهلی نزیكبوون لە خوداوە بوونی نییە بەرزتر و باڵاتر بێت لە رێگەی شوكر.

نیعمەتی پەروەردگار لەسەر بەندەكەی: چاكەكردنە لەگەڵی، و پێدانی فەزڵی خۆیەتی، تەنها منەتێكی خوداییە بۆ ئەو، نەك خودا پێویستییەكی بە بەندەكەی هەبێت، شتێكی لە بەرانبەردا بوێت، و بیەوێت كۆمەكی لێ داوا بكات، بۆ ئەوە نییە بە هۆی كەمییەوە خۆی بە بەندەكەی زۆر بكات، یان لە زەلیلیدا عیززەتی لێ داوا بكات، یاخود لە لاوازیدا خۆی پێ بەهێز بكات، پاكێتی و ستایش هەر بۆ خودایە.

فەرمانی پێ كردووە بە شوكر: نیعمەتێكی ترە لەسەری، و چاكەیەكی ترە لە خوداوە بۆ ئەو، چونكە سوود و قازانجی شوكركردن لە دونیا و دوارۆژدا بۆ كەسەكە دەگەڕێتەوە، بەندە سوود و قازانج لە شوكر دەبینێت نەك خودا، وەك دەفەرموێت ﴿وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ﴾النمل: ٤٠، شوكری بەندە بۆ خودا چاكەیەكە لەگەڵ نەفسی خۆیدا ئەنجامی دەدات لە دونیا و دوارۆژدا، ئەو بە شوكر چاكەیەكی لەگەڵ نەفسی خۆی كردووە نەك وابزانێت بەو شوكرە بەها و نرخی نیعمەتەكەی داوە بە خودا، چونكە هیچ كەس ناتوانێت بەها و نرخی نیعمەتەكانی پەروەردگار بدات، تەنانەت كەمێك لە نیعمەتەكانی، بەڵكو بچووكترین نیعمەت لە نیعمەتەكانی، خودای موتەعال خاوەن نیعمەت و خاوەن فەزڵە، دروستكەری شوكر و كەسی شكوركەر و ئەوەش شوكری لەسەر دەكرێت، بۆیە كەس ناتوانێت هەژماری نیعمەتەكانی بكات و لەسەریان سەنا و ستایشی خودا بكات، ئەو بەو نیعمەتە چاكەی لەگەڵ بەندەكەی كردووە، هەروەها چاكەی لەگەڵ كردووە كە توانای شوكركردنی پێبەخشیوە، شوكرەكەش نیعمەتێكی ترە و خودا بەوی بەخشیوە و پێویستی بە شوكرێكی ترە، ئیتر بەم جۆرە تا ناكۆتا لە نیعمەت و ناكۆتا لە شوكر.

لە تەواویی نیعمەتەكانی خودا و مەزنیی چاكە و بەخشندەیی خودا ئەوەیە: كە لەسەر ئەو شوكرە خۆشەویستی و رازیبوون بە بەندەكەی دەبەخشێت، و مەدح و سەنای دەكات لەسەری، لە كاتێكدا سوود و قازانج و كەڵكی نیعمەت و شوكركردنەكە بۆ كەسەكە خۆیەتی، سوود و قازانجی بۆ خودا ناگەڕێتەوە، ئەمەش لوتكەی بەخشندەییە كە هیچ بەخشندەییەكی ناگاتێ، نیعمەتت پێ دەبەخشێت، پاشان توانای شوكر كردنی نیعمەتەكەت پێ دەبەخشێت، و لێت رازی دەبێت، ئەوجا سوود و قازانجی شوكركردنەكەت بۆ دەگێڕێتەوە و دەیكات بە هۆیەك بۆ هاتنی نیعمەتی زۆرتر و زیاتر بۆت.

تەنها ئەم رووە بەسە بۆ کەسی هۆشیار بۆ ئەوەی لەوانی تر بەئاگا بێت.

## ۞ هەندێ شوکر باڵاترە لە هەندێکی تری

شوکر لەسەر ناخۆشییەکان: گرانتر و دژوارترە لە شوکر لەسەر خۆشییەکان، بۆیە ئەوەی یەکەمیان پلەی باڵاترە لەمەی دووەم، ئەم جۆرە شوکرەش لە یەکێك لەم دوو کەسە دەوەشێتەوە:

یان پیاوێکە جیاوازی ناکات لەنێوان حاڵەتەکاندا، بەڵکو خۆش و ناخۆشی لا یەکسانە، شوکری ئەم کەسە دەرخستنی رەزامەندییە بەوەی بەسەریدا دابەزیوە، ئەمەش بریتییە لە مەقامی رازیبوون لە خودا و بڕیارەکانی.

پیاوی دووەم: کەسێکە جیاوازی دەکات لەنێوان ئەحواڵدا، ئەو حەزی بە ناخۆشییەکان نییە، و رازیش نییە لە داباریینیان بەسەریدا، گەر ناخۆشییەك بەسەریدا دابەزی شوکری خودا دەکات لەسەری، شوکرەکەی وەك خۆخواردنەوەیەتی بۆ ئەو سەختی و دژوارییەی تووشی هاتووە، و شاردنەوەی سکاڵایە و رەچاوکردنی ئەدەبە لە خزمەتی خودادا و گرتنەبەری رێگەی زانستە، چونکە زانست و ئەدەب فەرمان دەکەن بە شوکری خودا لە خۆشی و ناخۆشیدا، ئەو بەو شوکرە رێگەی زانستی گرتۆتەبەر، چونکە شوکری خودا دەکات وەك شوکری کەسێك کە رازییە بە قەزا و بڕیاری خودا، هەروەك حاڵی کەسی یەکەم، بەڵام ئەوەی یەکەم بەرزتر و باڵاترە.

۞ ۞ ۞

## (٣١) (منزلة الحياء)

# مەنزیلەی حەیا

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی حەیایە.

خوای موتەعال دەفەرموێت ﴿ أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ﴿١٤﴾ ﴾ العلق: ١٤، هەروەها دەفەرموێت ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾ النساء: ١، هەروەها دەفەرموێت ﴿ يَعْلَمُ خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِى ٱلصُّدُورُ ﴿١٩﴾ ﴾ غافر: ١٩.

لە فەرمودەی سەحیحدا لەو فەرموودەی ئیبن عومەر-خوا لە خۆی و باوكی رازی بێت- ریوایەتی دەكات، پێغەمبەر(ﷺ) بە پاڵ پیاوێكدا تێپەڕی كە ئامۆژگاری براكەی دەكرد دەربارەی شەرمكردن، پێی فەرموو ((وازی لێ بهێنە، حەیا لە ئیمانەوەیە))

لە دوو سەحیحەكەدا لە "عیمرانی كوڕی حوصەین"ەوە-خوا لێی رازی بێت- پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی ((حەیا هەر خێر بەدوایدا دێت))

لە دوو سەحیحەكەدا لە ئەبو هورەیرەوە-خوا لێی رازی بێت- لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی ((باوەڕ حەفتا و ئەوەندە بەشە-یاخود شەست و ئەوەندە بەشە- مەزنترینیان وتنی: "لا إله إلا الله"یە و نزمترینیان لابردنی ئەو شتانەیە كە لەسەر رێگە خەڵكی ئازار دەدەن، حەیاش بەشێكە لە ئیمان))

هەروەها لە دوو سەحیحەكەدا لە ""أبي سعيد الخدري"ەوە-خوا لێی رازی بێت- پێغەمبەر فەرمووی ((ئەوەی بە خەڵكی گەیشتوە لە كەلامی پێغەمبەرایەتی پێشوو: گەر حەیات نەكرد هەرچیت دەوێ بیكە)) لەمەدا دوو قسە هەیە:

یەكەمیان ئەوەیە كە فەرمانە هەڕەشەیە(أمر تهديد) و ماناكەی هەواڵدانە، واتە كەسێك شەرم نەكات لەوەی ئەنجامی دەدات.

دووەمیان: فەرمانە موباحە (أمر إباحة)، واتە سەیری ئەو كارە بكە كە دەتەوێت ئەنجامی بدەیت، گەر لەو كارانە بوو كە شەرمی لێ ناكەیەوە ئەنجامی بدە، ئەوەی یەكەمیان دروستترە كە بۆچوونی زۆرینەیە.

لە سونەنی "الترمذي"دا لە فەرموودەیەكی بەرزكراوە، پێغەمبەر فەرموویەتی ((بە تەواوی لە خودا شەرم بكەن، وتیان ئێمە شەرم دەكەین ئەی پێغەمبەری خودا،

فەرمووی: شەرم ئەوە نییە کە لەلای ئێوەیە، بەڵام هەر کەس دەیەوێت بە تەواوی شەرم لە خودا بکات: با سەر و ئەوەی بە دەوریدایە بیپارێزێت، با سك و ئەوەی دەیگرێتە خۆ بیپارێزێت، با بیر لە مردن و رزینی ناو خاك بکاتەوە، هەر کەس دوارۆژی بوێت جوانی و رازاوەی دونیا واز لێ دەهێنێت، هەر کەس ئەوە بکات بەراستی شەرمی لە خودا کردووە))

## ۞ زیندەگی دڵ لە حەیادایە

حەیا لە "حیاة" وەرگیراوە، بۆیە بە باران دەوترێت "الحیا" بەڵام بە ئەلفی مەقصورە واتە ((الحیی))، بەپێی زیندەگی دڵ هێزی ئەخلاقی حەیای تێدایە، کەمی حەیا لە مردنی دڵ و رۆحەوەیە، تا دڵ زیندووتر بێت حەیا تیایدا تەواوترە.

جونەید-رەحمەتی خوای لێ بێت- دەفەرموێ: حەیا بریتییە لە بینینی نیعمەتەکان، و بینینی کەموکوڕی و کەمتەرخەمییەکان، لەنێوان ئەو دوانەدا حاڵەتێك لەدایك دەبێت پێی دەوترێت حەیا، حەقیقەتی حەیا بریتییە لە ئەخلاقێك کە کەسەکە هان دەدات بۆ وازهێنان لە کارە خراپ و ناشرینەکان، رێگەی لێ دەگرێت لە کەمتەرخەمی بەرانبەر خاوەن حەق کە خودایە.

"السري"دەفەرموێت: حەیا و هۆگربوون بە خوداوە تەقە لە دەرگای دڵ دەدەن، گەر زوهد و وەرعییان تیا بینییەوە دەمێننەوە، ئەگەر نە، کۆچی لێ دەکەن.((کە زوهد نەبوو واتە هەڵپەی دونیا لە دڵدایە بۆیە ئەو دڵ ناتوانێت بە خوداوە هۆگر ببێت، هەر بەو جۆرە کە وەرع(زیادە خۆپارێزی) بوونی نەبوو، واتە کەسەکە کەوتۆتە ناو گوناهان، ئیتر چۆن حەیا روو لەو دڵە دەکات کە خاوەنەکەی بێشەمانە سنوورەکانی خودا دەبەزێنێت)).

فوزەیلی کوڕی عەیاز دەفەرموێت: پێنج شت نیشانەی بەدبەختین: دڵڕەقی، چاووشکی، کەم شەرمی، حەزکردن لە دونیا، و درێژی ئاوات و خۆزگەی دونیایی.

یەحیای کوڕی مەعاز دەفەرموێت: هەر کەس شەرم لە خودا بکات بە گوێڕایەڵییەوە، خودا شەرمی لێ دەکات لە کاتی گوناه کردنیدا.

مانای ئەم قسەیە:

هەر کەس ئەخلاقی شەرمکردن لە خودا زاڵ بوو بەسەریدا تەنانەت لە حاڵی گوێڕایەڵییدا، دڵی لەبەردەم خودادا سەردادەخات بەسەرداخستنێکی پڕ لە شەرم: ئەو کەسە گەر کەوتە ناو گوناهێکەوە خودای موتەعال شەرم دەکات سەیری بکات لە کاتی گوناهەکەدا بەهۆی بەڕێزی کەسەکە لەلای، خودا شەرم دەکات لە دۆستەکەی و ئەو کەسەی لەلا بەڕێزە و نایەوێت شتێکی لێ ببینێت کەسەکەی لەلا ناشیرین ببێت.

هەروەها ئەوە بریتییە لە حەیای ڕێز و چاکە و بەخشندەیی و شکۆداری، خودای موتەعال "حیی و کریم"ە و شەرم دەکات لە بەندەکەی کاتێك دەستی بۆ لا بەرزدەکاتەوە بە بەتاڵی دەستی بگێڕێتەوە، خودا شەرم دەکات کەسێك لە ئیسلامدا پیر بووبێت سزای بدات.

## ✿ جۆرەکانی حەیا

<u>حەیا دابەش دەبێت بۆ دە بەش:</u> حەیای گوناه و خراپە و حەیای کەمتەرخەمی، و حەیای بەڕێزی و بەخشندەیی، و حەیای خۆداپۆشی، و حەیای بە بچووك زانینی نەفس و بە کەم تەماشا کردنی، و حەیای خۆشەویستی، و حەیای بەندایەتی، و حەیای شەرەف و عیززەت، و حەیای کەسێك کە لەخۆی شەرم دەکاتەوە.

<u>حەیای گوناه و خراپە:</u> وەك شەرم کردنەکەی ئادەم (ﷺ) کاتێك هەڵهات لە بەهەشتدا، خودای موتەعال پێی فەرموو: لەدەستی من رادەکەی ئەی ئادەم؟ فەرمووی: نەخێر، ئەی پەروەردگار، بەڵکو شەرم دەکەم لێت.

<u>حەیای کەمتەرخەمی:</u> وەك حەیای فریشتەکان کە شەو و ڕۆژ تەسبیحاتی خودا دەکەن و ماندوو نابن و سارد نابنەوە، ڕۆژی قیامەت دەڵێن: پاکێتی بۆ تۆ ئەی خودای موتەعال! ئێمە نەمانتوانی بە حەق بەندایەتی تۆ بکەین.

<u>حەیای شکۆمەندی:</u> بریتییە لە حەیای مەعریفە، بە ئەندازەی مەعریفەی مرۆڤ بە پەروەردگاری شەرمی لێ دەکات.

<u>حەیای ڕێز و بەخشندەیی:</u> وەك حەیای پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئەو کۆمەڵە خەڵکەی کە بانگی کردن بۆ وەلیمەی زەماوەندی زەینەبی کچی، زۆر لای دانیشتن، هەستا و شەرمی کرد پێیان بڵێت: بڕۆن.

حەیای خۆداپۆشین: وەك حەیای علی كوڕی ئەبی تالب-خوا لێی رازی بێت- كە شەرمی دەكرد پرسیاری"المذي-ئاوێكە لە ئەندامی نێرینەی پیاو دێتە دەرەوە بەبێ حەز"بەهۆی ئەوەی كچی پێغەمبەری لەلا بوو.

حەیای بە بچووكزانین و كەم تەماشاكردنی نەفس: وەك حەیای ئەو كەسەی پێویستییەكانی لە خودا داوا دەكات بە سووك و بچووك تەماشا كردنی نەفسییەوە لەبەردەم خودادا.

لەوانەیە دوو هۆ بۆ ئەم جۆرە حەیایە بوونی هەبێت:

یەكەمیان: كەسی داواكەر خۆی بە بچووك و كەم تەماشا بكات و گوناه و تاوانەكانی بە گەورە.

دووەم: ئەوەی داوای دەكات زۆر بە گەورەی بزانێت.

حەیای خۆشەویستی: بریتییە لە حەیای خۆشەویست لە خۆشەویستەكەی، تەنانەت لە نادیاری ئەودا كە خۆشەویستی بیر دەكەوێتەوە حەیا لە دڵیدا هەڵدەچێت، و لە روخسارێدا هەستی پێ دەكرێت، نازانێت هۆیەكەی چییە، هەر بەو جۆرە لە كاتی گەیشتن بە خۆشەویستەكەی و بەیەكتر گەیشتنی ناكاو و چاوەڕوان نەكراو كە ترس و شەرمێكی زۆری بۆ دروست دەكات، لێرەوەیە وتراوە "جوانییەكی سەرمەستكەر" هۆی ئەو حەیا و ترس و سەرسامییە زۆربەی خەڵكی نایزانن.

حەیای بەندایەتی: حەیایەكی تێكەڵە لە خۆشەویستی و ترس، و بینینی شایستەنەبوونی بەندایەتییەكەی بە پەرستراوی حەق، بزانێت كە شانوشكۆ و مەزنیی خودای موتەعال گەورەترە لەو بەندایەتییە كەموكورتەی ئەو، بەندایەتی كردنی خودا بەبێ هیچ گومانێك شەرم كردن لە خودا بەرهەم دەهێنێت.

حەیای شەرەف و عیززەت: بریتییە لە حەیای نەفسێكی مەزن كاتێك لە بەخشین و پێدان و چاكەدا بە ئەندازەی گەورەیی و مەزنیی خۆی كارەكەی ئەنجام نەدابێت، لەگەڵ ئەو بەخشین و چاكەدا شەرم لەخۆی دەكاتەوە، چونكە خاوەنی نەفسێكی مەزن و بە عیززەتە، ئەمەش دوو هۆی هەیە:

یەكەمیان: ئەوە بوو ئاماژەی پێدرا.

دووەمیان: شەرمكردنی لە وەرگرتنەكە، وەك ئەوەی ئەو داواكەر بووە و لە كەسی بەرانبەری وەرگرتووە، هەتا هەندێك لە ئەهلی بەخشندەیی پێی خۆش نییە لە كاتی

پێدان بە كەسی بەرانبەر خۆی ئامادە بێت، بەهۆی شەرمكردن لەو شتەی بەخشیوەتی، ئەمە دەچێتە ناو حەیای لۆمەكردنی خۆوە، چونكە خۆی بە شەرمەزار دەبینێت بەرانبەر ئەوەی بەخشیوەتی.

حەیا لە خۆ و نەفسی خۆ: بریتییە لە حەیای نەفسی خاوەن شەرەف و عیززەتە مەزن و باڵاكان، رازی نابێت بە ناتەواوی لە نەفسیدا، و قەناعەتی نییە بە نزمی و پەستی بۆ نەفسی، بۆیە (كە ناتەواوی لە خۆیدا دەبینێت) نەفسی شەرم لە نەفسی دەكات (خۆی شەرم لە خۆی دەكات)، وەك ئەوەی دوو كەس بێت، بە یەكێكیان شەرم لەویتریان دەكات، ئەمە كامڵترین حەیایە، ئەو كەسەی لە خۆی شەرم دەكات بە شەرم كردن لە كەسانی تر شیاوترە.

## ۞ حەیای چاودێری

**یەكەمین حەیا:** حەیایەكە لە زانستی بەندەوە بە سەیر كردنی خودا بۆ ئەو سەرهەڵدەدات، رایدەكێشێت بۆ شاندانە ژێر ئەم تێكۆشانە، وای لێدەكات تاوان و خراپەی پێ ناخۆش بێت و دەستبەرداری سكاڵا ببێت لای غەیری خودا.

هەر كات بەندە زانی پەروەردگار سەرنجی دەدات هەستی ئەم زانینە حەیای لا دروست دەكات و رایدەكێشێت بۆ شاندانە ژێر كۆڵی گوێڕایەڵی.

**باڵاتر لەم پلەیە:** بە ناشیرین تەماشا كردنی كارە خراپەكانە بەهۆی خۆشەویستییەوە، بەناشیرین تەماشاكردن لە خۆشەویستییەوە تەواوتر و كامڵترە لە ناشیرین تەماشا كردن بەهۆی ترسەوە، بۆیە ئەم جۆرە حەیایە بەندە لە سكاڵاكردن لای غەیری خودا رادەگرێت، واتە سكاڵا لەدەستی خودا لای غەیری خودا ناكات، سكاڵاكردن لای خودا-سبحانە- قەدەغە نەكراوە، چونكە سكاڵا لای خودا نیشاندانی هەژاری و زەلیلی و پێویستی و بەندایەتییە، حەیا لە خودا و سكاڵا لای خودا دژ بە یەكتر نین و یەكتر نەرێ ناكەن.

## ۞ حەیا لە خاوبوونەوە(ساردبوونەوە) لەكاتی یەكلابوونەوەدا بۆ خودا

پاشان باڵاتر لەوە: بریتییە لە حەیایەك لە سەرنجدانی زانستی نزیكبوونەوە لەدایك دەبێت، بانگی دەكات بۆ سواربوونی شەپۆلی خۆشەویستی، بە رۆحی هۆگربوونەوە گرێی دەدات و تێكەڵبوونی خەڵكی لا بێزار دەكات.

سەرنجدانی زانستی نزیکبوون لە خودا بریتییە لە بەدەستهێنانی "لەگەڵ خودابوونی تایبەت"، لەگەڵ خودابوون دوو جۆرە:

گشتی: بریتییە لە لەگەڵبوونی زانست و ئابلۆقەدانی خودایی بۆ بەندەکەی، وەك ئایەتی ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ﴾ الحديد: ٤، هەروەها ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَا أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا﴾ المجادلة: ٧، هەروەها ﴿إِنَّ اللَّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَوا وَّالَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ (١٢٨)﴾ النحل: ١٢٨

تایبەت: بریتییە لە لەگەڵبوونی نزیکی، وەك ئایەتی ﴿وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ (٦٩)﴾ العنكبوت: ٦٩، ئەمە بریتییە لە لەگەڵبوونی نزیکی لە خوداوە کە دۆستایەتی و سەرخستن و پارێزگاری لەخۆ دەگرێت، هەردوو ماناکە هاوەڵییە لە خوداوە بۆ بەندەکەی، بەلام ئەوەی یەکەم هاوەڵی کردنی ئاگا لێبوون و ئابلۆقەدان بوو، بەلام ئەمەیان دۆستایەتی و سەرخستن و کۆمەکییە، وشەی "مع" لە زمانی عەرەبیدا هاوەڵی کردنی شیاو و گونجاو دەگەیەنێت، تیایدا هەست بە توانەوە و تێکەڵبوون و ئاوسێیەتی و ئاوێزان بوون ناکرێت، هەر کەس شتێك لە مانە لە مانای "مع" گومان ببات ئەوە لەتێگەیشتنی هەڵەی خۆیەوە هاتووە.

نزیکیش: لە قورئان بە تایبەت باسکراوە، ئەوەش دوو جۆرە: نزیکی بە وەلامدانەوە بۆ ئەو کەسانەی داوا لە خودا دەکەن، هەروەها نزیکی خودا لەو کەسانەی دەیپەرستن بە پاداشتدانەوە.

یەکەمیان وەك ئایەتی ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ (١٨٦)﴾ البقرة: ١٨٦، ئەم ئایەتە بۆ وەلامی هاوەلان-خوا لێیان رازی بێت- دابەزی کە پرسیاریان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد ((ئایا پەروەردگارمان نزیکە ئاخافتنی لەگەڵ بکەین؟ دوورە بانگی بکەین؟ خودای موتەعال ئەم ئایەتەی دابەزاند))

دووەمیان وەك فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) ((نزیکترین کاتی بەندە لە پەروەردگارەوە ئەو کاتەیە کە لە سوژدەدایە، هەروەها نزیکترین کات خودا لە بەندەکەیەوە نزیك بێت: لە شەودایە)) ئەمە نزیکترینیانە بۆ ئەهلی گوێڕایەڵی خودا.

لە فەرموودەی سەحیحدا لە ئەبو موساوە-خوا لێی رازی بێت- فەرمووی ((لە خزمەتی پێغەمبەردا(ﷺ) بووین لە یەکێك لە سەفەرەکاندا، دەنگمان بە "الله أكبر"

بەرز بوویەوە، فەرمووی: خەڵكینە، لەگەڵ خۆتان هێواش بن، ئێوە بانگ لە كەڕ و نادیار ناكەن، ئەو كەسەی بانگی لێدەكەن بیسەر و نزیكە، لە ملی وڵاخەكەی نزیكترە لە هەر یەك لە ئێوە))

ئەمە نزیكییەكی تایبەتە لەوانەوە بانگی دەكەن بە بانگكردنی بەندایەتی و مەدح و سەنا و ستایش، ئەم نزیكییە كەماڵی جیابوونەوەی خودا لە دروستكراوەكانی نەرێ ناكات، هەر بەو جۆرە كەماڵی دەستگرتن بەسەر عەرشدا نەرێ ناكات، بەڵكو هەردووكیان كۆدەكاتەوە و پێویستیان دەكات، ئەو نزیكییە وەك نزیكی تەنەكان نییە هەندێكیان لە هەندێكی تریان، بەرزی و بڵندی بۆ خودا لەو جۆرە نزیكییە، بەڵكو جۆرێكی ترە، بەندە لە ئامادەبوونی دڵیدا رۆحی زۆر نزیك لە خۆشەویستەكەی دەبینێت كە لەنێوانیاندا ناكۆتا ساڵ لە بڕین و تەی كردن هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا لە هاو مەجلیسەكەی نزیكترە لە دڵی.

ئەهلی سوننەت، دۆستەكانی پێغەمبەر(ﷺ) و میراتگر و خۆشەویستانی -كە پێغەمبەریان لە نەفسی خۆیان خۆشتر دەوێت- ئەوان هەرچەند لە وڵاتانی دوورن لە شاری مەدینەوە كەچی وادەبینن پێغەمبەر لە جیرانی ژوورەكەی لە ئەوان نزیكتر بێت، خۆشەویستان و تامەزرۆیانی كەعبە و بیت الحرام دڵ و رۆحیان نزیكتر دەبینن لەو كەسانەی جیرانی كەعبەن و بەدەوریدان، ئەمە لەگەڵ ئەوەی هیچ نزیكییەكی مەكانی لەنێوانیاندا نییە، ئەی دەبێ حاڵی كەسێك چۆن بێت كە چۆنی بوێت دەتوانێت لە بەندەكەی نزیك ببێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا لەسەر عەرشە مەزنەكەی ئیستوای كردووە، ئەهلی چێژ لا ناكەنەوە بەلای شوبهەی كەسێكی پەكخەری ناو و سیفەتەكان كە دوورە لە خوداوە و خاڵییە لە خۆشەویستی و مەعریفەی خودا.

مەبەست: ئەم نزیكییە بانگی خاوەنەكەی دەكات بۆ سواربوونی شەپۆلی خۆشەویستی، تا خۆشەویستی زیاتر بێت نزیكی زیاتر دەبێت، خۆشەویستی لەنێوان دوو نزیكیدایە: نزیكییەك بەر لە خۆشەویستییەكە لەگەڵ نزیكییەك دوای خۆشەویستییەكە، هەروەها خۆشەویستی لەنێوان دوو مەعریفەدایە: مەعریفەیەك بەر لە خۆشەویستییەكە كە پاڵی ناوە و بانگی كردووە و رێنومایی كردووە بۆ سواربوونی شەپۆلی خۆشەویستی، لەگەڵ مەعریفەیەك دوای خۆشەویستییەكە كە ئەنجام و بەری خۆشەویستییەكەیە.

وابەستەبوونی بە رۆحی هۆگرییەوە: بریتییە لە وابەستەبوونی دڵ بە رۆحی هۆگربوونەوە بە خوداوە، وابەستەبوونێكی پێویست كە لێی جیانابێتەوە، بەڵكو لەنێوان دڵ و هۆگربووندا گرێدانێكی پێویست دروست دەكات، گومانی تێدا نییە ئەم هۆگربوونە تێكەڵاوی خەڵكی لا بێزراو دەكات، بەڵكو بە ئەندازەی هۆگربوون و چاو رۆشنبوونەوە بە خۆشەویستی و نزیكی لە خودا نامۆبوونی لەگەڵ خەڵكی بۆ دروست دەبێت، ئەو تەنها لەگەڵ خودادایە، گەر تێكەڵ خەڵكی بوو تەنها بە جەستە و رووڵەتە نەك بە دڵ و رۆح و ناخ، دڵ و رۆحی لە خانەیەكی ترە و جەستە و رووالەتی لە خانەیەكی تر.

❁ ❁ ❁

## (٣٢) (منزلة الصدق)

# مەنزيلەی صدق

لە مەنزيلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزيلەی "صدق"ە.

صدق مەزنترين مەنزيلەی ئەهلی ڕێگەی خودايە، كە هەرچی مەنزيلەی ساليكانە لەم مەنزيلەيەوە سەرهەڵدەدات، ڕاستترين و وەستاوترين ڕێگەيەكە هەر كەس بۆی ئاسان نەبێت دەچێتە ڕيزی دابڕاوان و تياچووانەوە، بە صدق ئەهلی باوەڕ لە دووڕووان جيادەكرێنەوە، هەر بە "صدق"ە دانيشتوانی بەهەشت لە دۆزەخنشينان جيادەبنەوە، ئەو شمشێرەی خودايە لەسەر زەوی لەسەر هەر شتێك دابنرێت لەتی دەكات، ڕووبەڕووی هەر باتڵێك بووبێتەوە بە زەويدا دەكێشێت و ژێری دەخات، هەر كەس بە صدقەوە هێرش بكات و پەلامار بدات هەرگيز هێرشەكەی ناشكێت، هەر كەس قسەی پێكرد دەنگی بەسەر نەياردا بەرز دەبێتەوە، صدق ڕۆحی كاروكردەوەكان و ميزانی ئەحواڵە، بەهۆيەوە مرۆڤ شان دەداتە ژێر كارە سەخت و دژوارەكان، ئەو دەرگايەيە كە گەيشتووان لێيەوە دەچنە ژوورەوە بۆ لای خودای خاوەن مەزنی و شانوشكۆ، صدق بنچينەی كۆشكی ئايينە، پايەی ڕاوەستانی يەقينە، پلەی صدق بەدوای پلەی پێغەمبەرايەتيدا دێت كە مەزنترين و باڵاترين پلەی هەموو جيهانە، لە بەهەشتدا كانياو و ڕوبار هەڵدەقوڵێن و ڕوودەكەنە شوێن و جێگەی صادقان، وەك چۆن لەم دونيايەدا لە دڵيانەوە بۆ دڵيان كۆمەك و يارمەتی بەردەوام و پەيوەستبوو دەگوێزرايەوە.

خودا -سبحانه- فەرمانی بە ئەهلی باوەڕ كردووە لەگەڵ صادیقاندا بن، ئەهلی نيعمەتی تايبەت كردووە بە پێغەمبەران و صاديقان و شوهەدا و صاڵحان، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾ التوبة: ١١٩، هەروەها ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّـٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُو۟لَـٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ﴾ النساء: ٦٩، ئەوان باشترين دۆست و هاوەڵن بۆيە لە كۆتايی ئايەتەكەدا دەفەرموێت ﴿ وَحَسُنَ أُو۟لَـٰٓئِكَ

رَفِيقًا ﴾، خودای موتەعال بەردەوام بە نیعمەت و لوتف و چاكەی زیاتر لەگەڵ كردن كۆمەكی و یارمەتییان دەدات، ئەوان پلەی "لەگەڵ خودا بوون"یان هەیە (المعیة مع الله)، خودا لەگەڵ صادیقاندایە و مەنزیلەی نزیكییان لە خوداوە پێدراوە، چونكە پلە و پایەیان دووەمە و دەكەوێتە دوای پلەی پێغەمبەرایەتییەوە.

خودای موتەعال هەواڵی داواوە هەر كەس خودا بەڕاست بزانێت ئەوە باشترین كارە بۆ ئەو ﴿ فَإِذَا عَزَمَ ٱلۡأَمۡرُ فَلَوۡ صَدَقُواْ ٱللَّهَ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ ﴿٢١﴾ ﴾ محمد: ٢١

هەروەها خودای موتەعال هەواڵی دەربارەی ئەهلی چاكە داوە و مەدح و سەنای باشترین كار و كردەوەی كردوون: لە ئیمان و ئیسلام و صەدەقە و ئارامگرتن بەوەی ئەهلی صدقن﴿ وَلَٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلۡكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلۡمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلۡمُوفُونَ بِعَهۡدِهِمۡ إِذَا عَٰهَدُواْۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِي ٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلۡبَأۡسِۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ ﴾ البقرة: ١٧٧، ئەمە روون و ئاشكرایە كە صدق بە كاروكردەوەی دەرەوە و ناوەوەیە، و صدق مەقامی ئیسلام و باوەڕە.

خودای موتەعال خەڵكی دابەشكردووە بۆ صادق و دووڕوو، دەفەرموێت ﴿ لِّيَجۡزِيَ ٱللَّهُ ٱلصَّٰدِقِينَ بِصِدۡقِهِمۡ وَيُعَذِّبَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ إِن شَآءَ أَوۡ يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡ ﴾الأحزاب: ٢٤

بنچینەی باوەڕ بریتییە لە صدق و بنچینەی دووڕوویش بریتییە لە درۆ، درۆ و ئیمان هەرگیز كۆنابنەوە، گەر كۆبوونەوە یەكێكیان دژ بەویتر دەجەنگێت، دەفەرموێت ﴿ هَٰذَا يَوۡمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدۡقُهُمۡۚ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١١٩﴾ ﴾ المائدة: ١١٩، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَٱلَّذِي جَآءَ بِٱلصِّدۡقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ الزمر: ٣٣، ئەو كەسەی صدقی هێنا: ئەو كەسەیە كە لە قسە و كردار و حاڵیدا خاوەنی شانوشكۆی صدقە، چونكە صدق لەو سیانەدایە.

صدق لە قسە و گوفتاردا: بریتییە لە راستبوونەوەی زمان لە وتندا، وەك راستبوونەوەی گوڵەگەنم لەسەر قەدەكەی، صدق لە كاروكردەوەدا: بریتییە لە راستبوونەوەی كاروكردەوەكان لەسەر فەرمانە خواییەكان و شوێنكەوتنی پێغەمبەر(ﷺ)، وەك راستبوونەوەی سەر لەسەر جەستە، صدق لە لە حاڵدا: بریتییە لە راستبوونەوەی حاڵی دڵ و ئەندامەكان لەسەر ئیخلاص بۆ خودا و خاڵیكردنەوەی

هەوڵ و كۆششی خۆ و بەختكردنی تواناكان، بەو سیانە مرۆڤ دەبێت بەو كەسەی كە صدقی هێناوە، بەپێی كەماڵی ئەو كارانە و هەستان پێیان: صدیقییەت بەرهەم دێت، بۆیە بوو بە بەشی ئەبوبەكری صدیق-خوا لێی رازی بێت- لوتكەی هەموو كارەكان بریتییە لە صدیقییەت، بە "صدیق" ناوبرا بەهۆی رەهابوونی صدقەوە تیایدا، چونكە وشەی "صدیق" لە "صدوق" كاریگەرتر و پڕ ماناترە، وشەی "صدوق"یش لە "صادق" كاریگەرتر و پڕ ماناترە.

بەرزترین ئاستی صدق: بریتییە لە "صدیقییەت" كە بریتییە لە كەماڵی شوێنكەوتن و جێپێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خودا(ﷺ) و كەماڵی ئیخلاص بۆ خودا.

خودای موتەعال فەرمانی بە پێغەمبەرەكەی كردووە كە داوای لێ بكات بۆ ئەوەی چوونە ژوورەوە (مدخل) و چوونە دەرەوە (مخرج)ی لەسەر صدق بێت، دەفەرموێت ﴿ وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَاجْعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلْطَانًا نَّصِيرًا ﴿٨٠﴾ ﴾ الإسراء: ٨٠، دەربارەی خەلیلی خۆی ئیبراهیم (ﷺ) رایگەیاندووە كە داوای لێ كردووە لە پاشینانیدا زمانی صدقی پێ ببەخشێت ﴿ وَاجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ ﴿٨٤﴾ ﴾ الشعراء: ٨٤، مژدەی بە بەندەكانی داوە كە لەلای خودا شوێن و مەنزیلەی صدقیان هەیە، دەفەرموێت ﴿ وَبَشِّرِ الَّذِينَ آمَنُوا أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِندَ رَبِّهِمْ ﴾ یونس: ٢، هەروەها دەفەرموێت ﴿ إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَهَرٍ ﴿٥٤﴾ فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ ﴿٥٥﴾ ﴾ القمر: ٥٤ — ٥٥

لەو چوار ئایەتەی پێشوودا ئاماژە بە پێنج وەسفی صدق دراوە: "مدخل الصدق" و "مخرج الصدق" و "لسان الصدق" و "قدم صدق" و "مقعد الصدق".

راستێتی صدق لەو ئاماژە بۆكراوانەدا: راستییەكی جێگیرە و پەیوەستە بە خوداوە و مرۆڤ بە خودا دەگەیەنێت، ئەوەی لە خوداوەیە و بۆ لای خودایە لە گوفتار و كردار و پاداشتیان لە دونیا و دوارۆژدا.

چوونە ژوورەوەی صدق (مدخل الصدق) و چوونە دەرەوەی صدق(مخرج الصدق): بەوە دەبێت كە چوونە ژوورەوە و هاتنە دەرەوەی راست و جێگیر بێت و بۆ خودا و رازیكردنی خودا بێت، ئەوەش بەهۆی لەگەڵ خودابوون و بەدەستهێنانی داوای باڵا، پێچەوانەی چوونە ژوورەوەی درۆ و چوونە دەرەوەی درۆیە كە هیچ ئامانجێكی تێدا نییە بیەوێت پێی بگات و قەدێكی جێگیری نییە لەسەری رابوەستێت، وەك هاتنە

دەرەوەی دوژمنانی خودا لە ڕۆژی "بەدر"دا، هاتنە دەرەوەی صدقیش وەك هاتنە دەرەوەی پێغەمبەر و هاوەڵانی لەو غەزوەدا.

هەر بەو جۆرە چوونە ژوورەوەی پێغەمبەر بۆ شاری مەدینە: چوونە ژوورەوەی صدق بوو بە خودا و لەپێناو ڕازامەندی خودادا، بۆیە پاڵپشتی و كۆمەك و یارمەتی و سەركەوتنی بۆ هات، ئەوەی لە دونیا و دواڕۆژدا داوای دەكرد بەدەستی هێنا، بەپێچەوانەی چوونە ژوورەوەی درۆ كە دوژمنانی خودا و پێغەمبەر بە خەیاڵی خۆیان دەیانویست پێیەوە بچنە مەدینە لە شەڕی ئەحزابدا، ئەو چوونە ژوورەوەیان بە خودا و بۆ خودا نەبوو، بەڵكو دەستدرێژی كردنە سەر خودا و پێغەمبەر بوو، بۆیە جگە لە ڕسوایی و زیانۆمەندی شتێكی تریان درووێنە نەكرد.

هەر بەو جۆرە چوونە ژوورەوەی درۆ وەك چوونە ژوورەوەی یەهودی بەنی قورەیزە بۆ ناو قەڵاكەیان، لەبەر ئەوەی چوونە ژوورەوەیەكی درۆ بوو: ئەوەیان تووش بوو كە تووشیان هات.

هەر چوونە ژوورەوە و چوونە دەرەوەیەك لەسەر صدق بێت بە خوداوەیە و بۆ خودایە، ئەو كات خاوەنەكەی لەژێر پارێزگاری خودادایە.

هەندێ لە پێشین كە لە ماڵەكەی دەردەچوو: سەری بەرز دەكردەوە بۆ ئاسمان و دەیوت "خودایە، پەنات پێدەگرم بە چوونە دەرەوەیەك كە لەژێر پارێزگاری تۆدا نەبم" مەبەستی ئەوە بوو: چوونە دەرەوەكەی چوونە دەرەوەی صدق نەبێت، بۆیە "مدخل الصدق" و "مخرج الصدق" بە دەرچوونی پێغەمبەر(ﷺ) لە مەككە و چوونە ژوورەوەی بۆ مەدینە تەفسیر كراوە، گومانی تێدا نییە ئەوە تەنها نموونەیەكە، ئەو چوونە دەرەوە و چوونە ژوورەوەیە لە مەزنترینیانە بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ)، ئەگینا هەموو چوونە ژوورەوەیەكی پێغەمبەر(ﷺ) و چوونە دەرەوەیەكی لەسەر صدق بووە، چونكە ئەو بۆ خودا و بە خودا و ئەمری خودا و ڕەزامەندی خوداوە بووە.

هیچ كەس لە ماڵەوە دەرنەچووە و چووبێتە بازاڕەوە –یان هەر شوێنێكی تر– لەسەر صدق نەبووبێت یان لەسەر درۆ، چوونە دەرەوە و چوونە ژوورەوەی هەر كەسێك یان صدقە یان درۆ، خودا كۆمەك و یارمەتیدەرە((لە ڕاستیدا ڕۆیشتنە ناو هەر كاروبارێك و چوونەدەرەوە لێی یان لەسەر صدقە یان لەسەر درۆ، گەر بۆ خودا لێی چوویە

پێشەوە ئەوە چوونە ژوورەوەی صدقە، گەر بۆ خودا لێی هاتییە دەرەوە ئەوە چوونە دەرەوەی صدقە، بە پێچەوانەشەوە پێچەوانە دەردەچێت)).

زمانی صدق (لسان الصدق): بریتییە لە مەدح و سەنای باش بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەلایەن گەلان و ئوممەتانی پێشوو بە صدق، نەك مەدح و سەنا بە درۆ، وەك چۆن ئیبراهیم و نەوەكانی لە پێغەمبەران-علیهم صلوات الله وسلامە- دەفەرموون ﴿وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا ﴿٥٠﴾﴾ مریم:٥٠، مەبەست بە زمانی صدق لێرەدا: بریتییە لە سەنای باش و بە چاك ناوهێنان، لەبەر ئەوەی صدق بە زمانە و زمان جێگەی صدقە، خودا زمانی بەندەكانی بە مەدح و سەنای باش لەسەر كەسی صادق پژاندووە، ئەمەش وەك پاداشتێك لەسەر صدقی ئەهلی صدق، و دەربڕینی صدق بە زمان دەربارەیان.

سێ مانا بۆ زمان كراوە: ئەمەی پێشوو كە ئاماژەمان پێدا، دووەم زمانی قسەكردن (اللغة)، وەك لە ئایەتی﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ ﴾ إبراهيم: ٤، هەروەها ئایەتی ﴿وَٱخْتِلَٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ﴾ الروم: ٢٢، هەروەها ﴿لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾﴾ النحل: ١٠٣، سێیەم مانا بۆ زمان مەبەستی ئەو پارچە گۆشتەیە لەناو دەمدایە، وەك لە ئایەتی﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾﴾ القيامة: ١٦

**پێشكەوتەی صدق(قدم الصدق):** بە بەهەشت تەفسیر كراوە، هەروەها بە محمد(ﷺ) تەفسیر كراوە، هەر بەو جۆرە بە كاروكردەوەی باش لێكدراوەتەوە.

راستێتی پێشكەوتە ((قدم)) ئەوەی پێش خۆیان خستووە و ئەوەی لە رۆژی دواییدا رووی تێدەكەن و پێشوازی دەكەن، ئەوان بەهۆی محمد(ﷺ)ەوە باوەڕ و كاروكردەوەی چاكیان پێشخست، لە رۆژی دوایشدا روو دەكەنە ئەو بەهەشتەی كە پاداشتی كارەكانیانە.

هەر كەس بە بەهەشت تەفسیری كردووە مەبەستی ئەو پاداشتەیە كە رووی تێدەكەن، هەر كەس بە كاروكردەوەی باش و بە پێغەمبەر(ﷺ) تەفسیری كردووە: لەبەر ئەوەی كاروكردەوەی باشیان پێشخستووە و باوەڕیان بە پێغەمبەر(ﷺ) بەر خۆیان خستووە، هەر سێكیان بریتین لە پێشكەوتەی "قدم الصدق"

**كورسی صدق(مقعد الصدق):** بریتییە لە بەهەشت لەلای خودا-تبارك وتعالى-.

وەسفی هەموو ئەوانە بە صدق جێگیربوون و قەرارگرتنیان داواکراو و پێویستن، ئەو وەسفکردنە حەقە و بەردەوامبوون و سوود و قازانجی راست و دروستە، کەماڵی بەری صدقیش راست و دروستە و گومانی تێدا نییە، صدق پەیوەستە بە خوداوە –سبحانە– بە خوداوە بوونی هەیە و بۆ ئەویش دەگەڕێتەوە، صدق راستییە نەك درۆ، حەقە نەك باتڵ، بەردەوام و هەتاهەتاییە نەك تیاچوو، بەسوود و قازانجە نەك زیانبەخش، باتڵ و وابەستەکانی باتڵ رێگە و چوونە ژوورەوەیان بۆ لای صدق لێگیراوە و نایگەنێ.

لە نیشانەکانی صدق دڵنیایی و ئارامی دڵە بەلایەوە، لە نیشانەکانی درۆ: سەرهەڵدانی شك و گومانە، وەك لە سونەنی "الترمذي"دا لە حەسەنی کوڕی عەلییەوە –خوا لە خۆی و باوکی رازی بێت– لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی ((صدق رێنومایی دەکات بۆ چاکە، چاکەش رێنومایی دەکات بۆ بەهەشت، کەسێك بەردەوام راست دەکات تا لەلای خودا بە صدیق دەنوسرێت، درۆ سەردەکێشێت بۆ خراپە و بەدکاری، خراپە و بەدکاریش سەردەکێشێت بۆ ئاگر، کەسێك بەردەوام درۆ دەکات تا لەلای خودا بە درۆزن دەنوسرێت))، لەم فەرموودەدا "صدق"ی کرد بە کلیلی "صدیقییەت" و سەرەتای هەنگاو هەڵگرتن بۆ ناوی، بەڵکو بریتییە لە دەرئەنجامی صدق، هەرگیز درۆزن بەو پلەیە ناگات، نە لە وتن و نە لە کردار و نە لە حاڵیدا، بە تایبەت ئەوانەی لە ناو و سیفەتەکانی خودادا درۆ بەدەم خوداوە دەکەن و نەرێی ئەوە دەکەن کە جێگیری کردووە و ئەوە جێگیر دەکەن کە لە خۆی نەرێی کردووە، لەناو ئەوانەدا هەگیز صدیق هەڵناکەوێت.

هەر بەو جۆرە درۆ کردن بەدەم خوداوە لە دین و شەرعیدا، بە حەڵاڵ کردنی ئەوەی حەرامی کردووە و حەرام کردنی ئەوەی حەڵاڵی کردووە، لادانی ئەوەی واجبی کردووە و پێویست کردنی ئەوەی واجبی نەکردووە، یاخود بە ناپەسەند زانینی ئەوەی لای پەسەندە و بە پەسەند زانینی ئەوەی ناپەسەندە، هەموو ئەوانە نەرێی صدیقییەت دەکەن.

هەر بەو جۆرە درۆکردن لەگەڵ خودا لە کاروکردەوەکاندا: بەوەی پۆشاکی صادیقان و موخلیصان و زاهیدان و پشتبەستووان بە خودا بەبەر خۆیدا بکات و حەقیقەت و راستێتی ئەو کەسە بەو جۆرە نەبێت.

بۆیە صدیقییەت بریتییە لە کەماڵی ئیخلاص و فەرمانبەرداری و شوێنکەوتنی بڕیارەکان لە ناوەوە و دەرەوەدا، تەنانەت صدقی ئەو دوو کەسەی لەگەڵ یەکتر کڕین و فرۆشتن دەکەن بەرەکەت دەخاتە ناو مامەڵەکەیانەوە،، وەك لە دوو سەحیحەکەدا هاتووە لە حەکیمی کوڕی حوزامەوە-خوا لێی ڕازی بێت-: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ((کڕین و فرۆشتن بە هەڵبژاردنێکی ئازادانەیە تا لەیەکتر جیانەبنەوە، گەر ڕاستیان کرد و شتەکانی خۆیان وەکو پێویست خستەڕوو بەرەکەت دەکەوێتە ناو مامەڵەکەیانەوە، گەر درۆیان کرد و ڕووی خراپی شتەکانیان شاردەوە بەرەکەی مامەڵەکەیان دەپوکێتەوە))

## ۞ کۆمەڵێك وتە لەسەر صدق

عبدالواحدی کوڕی زەید دەڵێت: صدق بریتییە لە وەفاداری بۆ خودا بە کردارەکان.

وتراوە: صدق بریتییە لە تەبایی نهێنی و پەنهانی مرۆڤ لەگەڵ قسەکانیدا.

وتراوە: هاوتابوون و یەکسانبوونی پەنهان و ئاشکرای مرۆڤ، واتە درۆزن ئاشکرای باشترە لە نهێنی و پەنهانی، وەك کەسی دووڕوو کە دەرەوەی باشترە لە ناوەوەی.

وتراوە: صدق بریتییە لە وتنی حەق لە شوێنێکدا وتنی ئەو حەقە مایەی تیاچوون بێت.

وتراوە: صدق بریتییە لە وتنی حەق لەلای کەسێك لێی دەترسی یان ڕجای شتێکی لێ دەکەیت.

جونەید دەفەرموێت: کەسی صادق لە ڕۆژێکدا چل جار وەردەگەڕێت(واتە چل تەکانی ڕۆحی بەرەو پێش بەخۆی دەدات)، درۆزن چل ساڵ لە دۆخێکدا دەمێنێتەوە و جێگیر دەبێت.

ئەم قسەیە پێویستی بە هەندێك شیکردنەوەیە: لە زەیندا پێچەوانەی ئەوە بەڕاست دەزانرێت، درۆزن هەزار ڕەنگە و بە ڕەنگی دەوروبەر ڕەنگ دەگرێت و صادقیش لەسەر یەك حاڵە، چونکە صدق لە نەفسیدا یەك شتە، بۆیە خاوەنەکەی هەزار ڕەنگ نابێت و ناگۆڕێت.

بەڵام مەبەستی ئەبی القاسم (جونەید) ڕاستە و ئەوە نییە کە زەین بۆی دەچێت، ئەو واریداتەی(شەپۆلی مەعنەوی لە خوداوە بۆ بەندەکەی) ڕوو دەکەنە کەسی صادق ڕوو

لە کەسی درۆزن و ریاباز ناکەن، بەڵکو ئەو خاڵییە لە واریدات، بە ئەندازەی جیاوازی نێوان صادیقان و درۆزنان لەو واریداتە کەم و زیاد دەکات، شەیتان ململانێ و بەرهەڵستکاری کەسی درۆزن ناکات وەك چۆن بەرهەڵستکاری کەسی صادق دەکات، ئەو-نەفرەتی خوای لێ بێت- چییەتی لە کەلاوەیەکی وێرانە کە هیچ شتێکی تێدا نییە؟! هاتنی ئەو واریداتە وەرگەڕان لە کەسەکەدا دروست دەکات بەپێی جیاوازی و جۆریان، بۆیە کەسەکە لە شوێنێکەوە بەدوای خێردا دەچێت بۆ شوێنێکی تر و لە کارێکەوە دەچێت بۆ کارێکی تر، و لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی تر و لە هۆیەکەوە بۆ هۆیەکی تر، چونکە دەترسێت لە هەر حاڵێك لا بەلایدا بکاتەوە و دڵنیایی پێی هەبێت، هەروەها دەترسێت هەر شوێن و جێگەیەك تووشی دابڕانی بکات لە داوا باڵاکەی کە خودایە، ئەو جگە لە داواکەی مەیل و سوکنایی بەلای هیچ شتێکی تردا نییە، وەك گەڕۆکێك وایە کە هەمیشە لە گەشتدایە و ئاسۆکان دەپشکنێ و بەدوای دەوڵەمەندبوونەوەیە و دەیەوێت دەوڵەمەندییەکەی لە هەمووان زۆرتر بێت، بەڵکو باڵاتر لەو کەسە گەڕۆکە سەرقاڵی گەڕانە، حاڵ و هۆ دەیخەنە گەڕ و وەریدەگێڕن و هەڵیدەسوڕێنن، رایدەوەستێنن و دایدەنیشێنن، دەیبزوێنن و لە جووڵەی دەخەن، تا لە هەموو ئەو بارانەدا ئەوەی کۆمەکی دەکات بە بینینەوەی داوایەکەی بیدۆزێتەوە، ئەو بەشەش تیایاندا زۆر دەگمەنە، دڵی لە وەرگەڕان و جووڵەی سەرومڕدایە بەپێی بەرینی و مەزنی داوایەکەی، هیممەت و لێبڕانی بەرزتر و باڵاترە لەوەی بە رووالەت و حاڵێکەوە بلکێت و نەیگەیەنێت بە داواکەی، یان سوکنایی بە شتێك بێت جگە لە خودا، ئەو وەك خۆشەویستێکی صادق وایە کە هەموو داوا و لێبڕانی گەڕانە بەدوای خۆشەویستەکەیدا، هەر بەو جۆرە حاڵی کەسی صادق لە داواکردنی زانست، حاڵی کەسی صادق لە داوای دونیا، هەرچی صادقە لە داوای ئەوەی بە دوایدا وێڵە قەرار بە خۆی ناگرێت و لەسەر یەك حاڵ بەردەوام نابێت.

هەروەها: کەسی صادق داوایەکەی بریتییە لە رەزامەندی خودا و جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی و شوێنکەوتنی ئەو شتانەی خۆشیدەوێت، ئەو لەگەڵ ئەو کارانەدا دەڕوات روو لە هەر جێگەیەك بکەن، لە هەر جێگەیەك رەشماڵیان هەڵدا رەشماڵ هەڵدەدات، کە لەناو نوێژدایە لەناو یادی خودادا دەیبینیتەوە، پاشان لە تێکۆشان یان فەرمان بە

چاكە یان رێگری لە خراپە، یان هەر كارێك ئاوەدانی دین و دونیای پێوە بێت، یان لە سەردانی نەخۆش، یان بەرێكردنی جەنازە، یان سەرخستنی كەسێكی ستەملێكراو، -گەر بتوانێت- شتانی تریش لە كاروكردەوەگەلێكی بەسوود و نزیككەرەوە لە خودا.

ئەو هەمیشە بۆ خودا و لەسەر خودا لە نێوان دابڕان(الفرق) و كۆبوونەوە(الجمع)دایە، نە رووالّەت و خووخدە و نە هیچ دۆخ و بارێك نایكات بە كۆیلەی خۆی، وابەستەی هیچ كۆت و بەند و ئاماژەیەك نابێت، بە شوێنێكەوە بۆ نوێژكردن نابەسترێتەوە، بە پۆشاكێكەوە كە جگە لەوە شتی تر نەپۆشێت گیرۆدە نابێت، یەك جۆر بەندایەتی كۆت و بەندی ناكات و لا بەلای بەندایەتییەكانی تردا نەكاتەوە، لەگەڵ فەزڵی ئەو عیبادەتانە بەسەر ئەوەی ئەودا، یان بەرزتر بن لە عیبادەتەكەی ئەو لە پلە و پایەدا، جیاوازی نێوانیان وەك جیاوازی نێوان ئاسمان و زەوی وایە.

بەڵا و ئافات و ریا و زۆر لەخۆكردن و بەندایەتی نەفسی خۆ و هەڵبژاردنی حەزەكانی و ئاماژە بۆ كردنی هەر هەموو ئەمانە لەو رووالّەتكاری و رسومات و بەندوباوانەن كە لاكردنەوە بەلای ئەوانەدا مرۆڤ پەكدەخات و ناهێڵێت بگاتە دڵی خۆی، چجای گەشتی بەرەو خوداچوون، گەر یەكێك لەوانە لە بەندوباو و جلوبەرگ و كۆت و بەند و شێوەكاری و رووالّەتكاری بێتە دەرەوە -یا بۆ لای باشتریش بێت لەوەی لای خۆیەتی- ئەو دۆخە بە كەم دەزانێت و خۆی وادەبینێت لەبەرچاوی خەڵكی كەوتبێت و پلە و پایەی دابەزیبێت لەلایان، كە لە راستیدا ئەو بەو حاڵەی لەبەر چاوی خودا كەوتووە و نرخ و بەهای دابەزیوە.

لەوانەیە كەسێكیان ئەو دۆخە لە نەفس و حاڵی خۆی ببینێت، بەڵام بەندوباو و كۆت و بەند و رووالّەتكارییەكەی رێگەی پێ نەدا خۆی چاك بكات و لەو دۆخە دووربكەوێتەوە، ئەمە شانوشكۆی كەسی درۆزن و ریابازە كە شتێك بە خەڵكی نیشان دەدات لە خۆیدا پێچەوانەی ئەوەیە خودا لەسەر ئەو دەیزانێت لەمەڕ ناخ و دەروونی، ئەو كەسێكە سەرقاڵی خزمەتی نەفس و دەروونی خۆیەتی، ئەمەش لەخۆیدا نیفاقی راستەقینەیە، گەر لەسەر موورادی خودا كاری بكردبایە و لەسەر صدق مامەڵەی خودای بكردبایە ئەو كۆت و بەندەی لا قورس و گران دەبوو، گوێی نەدەدا چ جۆرە پۆشاكێك دەپۆشێت و چ جۆرە كارێك ئەنجام دەدات ئەگەر مورادی خودای موتەعالی تێدا بێت.

قسەکەی ئەبی القسم (جونەید) راست و تەواوە، قسەی کەسێکە لە صدقدا ریشەی داکوتیوە و دامەزراوە، زانایە بە وردەکارییەکانی صدق و ئافاتەکانی و شوێنی تەمومژەکانی.

هەروەها: هەڵگرتنی صدق وەك هەڵگرتنێکی چیایەکی مەزن وایە، تەنها خاوەن عەزم و لێبڕان دەتوانن شان بدەنە ژێری، ئەوان بەو کۆڵە مەزنەوە وەك بارهەڵگرێك بە بارێکی قورسەوە دەسوڕێنەوە، ریا و درۆ سووك و ئاسانە وەك پەڕێك کە هەڵگرتنی هیچ ئەرك و ماندووبوونێکی تێدا نییە، ئەو لە هەر جێیەك بۆی رێکبکەوێت بەبێ ماندبوون و دژواری و تێچوون دەستی بۆ دەبات و بەکاری دەهێنێت، ئەو لەژێر ئەو کۆڵی ریا و درۆدا ماندوو نابێت و هەراسان نابێت.

هەندێکی تر لە عاریفان دەڵێن: بۆنی صدق ناکات کەسێك بۆ نەفسی خۆی و خەڵکانی تر بچەمێتەوە.

إبراهیم الخواص دەڵێت: صادق هەمیشە یان لە جێبەجێ کردنی فەرزدایە یان لە ئەنجامدانی خێر و چاکەیەکی پەسەند و "مستحب"دایە.

جونەید دەفەرموێت: راستێتی صدق ئەوەیە لە شوێنێکدا خاوەن صدق بێت کە تەنها بە درۆ تیایدا رزگار دەبێت.

وتراوە: سێ شت لەدەستی صادق دەرناچێت: تام و شیرینی، روخساری شیرین و جوان، و رێز و هەیبەت و شکۆ.

## ۞ صدقی پەیپێبردن

یەکەمین صدق صدقی مەبەست و مەرامە: بەم جۆرە صدقە هەرچی کەمتەرخەمی و کەمڕەوییە کۆتایی پێ دێت، و هەرچی لەدەستچووە بەدەستی دەهێنێتەوە، و هەرچی وێرانەیە ئاوەدانی تێدەخاتەوە، نیشانەی صدقی ئەو صادیقە: وەڵامی بانگکەرێك نەداتەوە بانگ بۆ شکاندنی پەیمان دەکات، هەروەها دان بەخۆدا نەگرێت لە هاوەڵی کردنی دژی ئەو صدقە، لە هیچ بارێکدا لە سووربوون و لێبڕان ساردنەبێتەوە و دانەنیشێت.

ئەوەش: بریتییە لە کەماڵی سووربوون و لێبڕان، و هێزی ویست بەوەی لە دڵدا بانگەرێکی راستگۆ بۆ گرتنەبەری رێگەی سلوك بوونی هەبێت، و مەیلێکی زۆر

سەرھەڵبدات تا پەنھان و نھێنی مرۆڤ ژێر دەستە بكات بۆ ئاراستە وەرگرتنی دروست، ئەوە داوایەكە ریا و ساردبوونەوە تێكەڵ نابێت پێی، و لە هیچ بارێكدا دابەشبوون رووی تێناكات، چوونە ناو سەفەر بەرەو خودا و ئامادەباشی بۆ لیقای ئەو-سبحانە- تەنھا بەم جۆرە لە صدق دەبێت.

ئەم صدقە هەڵگری هەموو هۆیەكی گەیشتنە بە خودا، و لادەری هەر هۆیەكە لە خودا دووری دەخاتەوە، هیچ هەلێك لەدەست نادات و ئەو هەلانەش لەدەستچوون بەپێی توانا بەدەستی دەهێنێتەوە، ئەوەی دەستی بێئاگایی و شەهوەت لە دڵدا وێرانیان كردووە چاكی دەكاتەوە، ئەوەی دەستبەتاڵی و بێكاری بە كەلاوەی كردووە ئاوەدانی دەكاتەوە، ئەوەی حەزەكانی دەروون كپ و خامۆشی كردووە دایدەگیرسێنێتەوە، ئەوەی كەمتەرخەمی تێكوپێكی داوە رێكی دەخاتەوە، ئەوەی دزەكان و تالانچییەكان بردوویانە لێیان وەردەگرێتەوە، زەوی بورە و وشكی دەكێڵێت و سەوزی دەكاتەوە، بژاری زەوی دڵ دەكات هەموو ئەو رووەكە زیانبەخشانەی كە تیایدا رواون دەستكەنە دەكات، خۆی لە موادی بێهیوایی و دەستەئەژنۆبوون كە دڵیان پڕ كردووە خاڵی دەكاتەوە، ئەو موادانەی كە ناباش و تێكدەرن و كەسەكە بەرەو تیاچوون و پەككەوتن دەبەن، ئەو برینانەی ریا كردوویەتە دڵ چارەسەر دەكات، لیتە و پیسی كە بە تێپەڕبوونی زەمەن لەناو دڵدا كۆمابوون خاوێن دەكاتەوە، كاتێك سەرنجی رەشیی ئەو گشتە لیتە و پیسییە دەدات خەم دایدەگرێت، بۆیە بە ئاوی ساردی كانیاوی صدق خاوێنی دەكاتەوە و لە هەرچی لیتە و پیسییە پاكی دەكاتەوە، بەر لەوەی دۆزەخ بە ئاگرەكەی خاوێنی بكاتەوە، چونكە دڵێكی پیس بە پیسی حەز و ئارەزوو و ریا ناتوانێت ئاوسێیەتی خودا بكات، هەر دەبێت پاك ببێتەوە، مرۆڤی ژیر و هۆشیار ئاسانترین پاككردنەوە هەڵدەبژێرێت كە پاكبوونەوەیە لەم دونیایەدا بەر لە گەیشتنە رۆژی دوایی، كۆمەك و یارمەتی هەر لەلای خودایە.

كەسی صادق بە حەق: ئەو كەسەیە كە هەموو هێزەكانی رۆحی بۆ لای ویست و داوا و رۆیشتن بەرەو خودای موتەعال و ئامادەیی بۆ لیقای رادەكێشێت، هەر كەس ئەمە حاڵی بێت: ئەگەرێكی نییە ئەو كەسە هەڵگری هۆیەك بێت بانگی بكات بۆ هەڵوەشانەوەی پەیمانەكەی لەگەڵ خودا.

هەر بەو جۆرە ئارام ناگرێت لەسەر هاودەمی و هاوەڵی نەیار، كە بریتین لە ئەهلی بێئاگایی، و رێگرەكانی رێگەی بەرەو خوداچوون، زیانبەخشترین شت بۆ كەسی

صادق هاودەمی و هاوەڵی ئەو جۆرە کەسانەیە، بەڵکو هەرگیز ناتوانێت ئەوانە بە هاودەم و هاوەڵ بکات، مەگەر بۆ پێویستی و ناچاری، هاوەڵی کردنیان لەو بارەدا بە ئەندازەی پێویست و دەگمەنە، بەبێ ئەوەی بە دڵ و رۆح تێکەڵیان ببێت، ئەم دوورییە لە کەسانێکە کە بە تەواوی بێئاگایی زاڵ بووە بەسەریدا، وەك چۆن صدق زاڵ دەبێت بەسەر کەسی صادقدا و رۆحی هەست بە غەریبی و نامۆبوون دەکات لەنێوان خۆی و ئەوانەی دژ بە صدقن، دووری لێیانەوە زیاد دەکات و راکردن لێیان زیاتر دەبێت، بە ئەندازەی ئەم نامۆبوون و غەریبکەوتنە و هەستی کەسی صادق بەو نامۆبوونە دوورکەوتنەوە و هەڵهاتنی لە دژەکان زیاد دەکات، ئەو دژە گەر قسە بکات دڵی کەسی صادق هەست دەکات ئەو کەسە بە زمانی بێئاگایی قسە دەکات، کەسێکە ریا و لوتبەرزی و داوای پلە و پایەی تێدایە، یا کەسێکی زاکیر یان خوێنەری قورئانیش بێت، یاخود نوێژکەر و حەجکەر بێت، یات شتانی تر، ئەو بە دڵی هەست بە بێزاری و دوورکەوتنەوە دەکات لەو کەسە، سەرباری بەندایەتی و کاری چاکەی، گەر بێدەنگ ببێت دڵی هەست دەکات ئەو بێدەنگبوونەی ئامادەیی دڵی تێدا نییە و لەسەر خودا کۆنەبووەتەوە، و بەدڵ رووی لە خودا نەکردووە، و پەنهانی خۆی ئاراستەی خودا نەکردووە، بۆیە بە بێدەنگیبوونەکەشی دیسان بێزاری و هەڵهاتنی بۆ دروست دەبێت، چونکە دڵی کەسی صادق بەهێز و پڕ لە هەستە.

ئەو نامۆبوون و بێگانەبوون لە دژەکاندا دەبینێت، دڵ دەتوانێت بۆنی دڵ بکات وەك چۆن بۆنێکی پیس هەست پێدەکات، و رووی لێ وەردەچەرخێنێت، و رووی لێ گرژ دەکات، مەگەر زۆر لەخۆی بکات هۆگری ببێت، و بۆ ناچاری هاوەڵی بکات، هاودەمی کردنیان لای ئەو بە ئەندازەی پێویستە، وەك هاوەڵی کردنی بۆ کڕینی شتێك لێی یان ئاتاجییەك کە بەرژەوەندی تێدایە، وەك هاوسەرگرتن و خزمەتکاری و هاوشێوەی ئەمانە.

### ۞ زۆری تۆ کەمە

ئەم مەنزیلەیە پێشەوایەتی دەکات بۆ ئەوەی بە ئەندازەی پێویست خۆزگەی بۆ ژیان هەبێت، هەمیشە ئاسەواری ناتەواوی لە خۆیدا دەبینێت، ئەو نایەوێت بژی مەگەر بۆ تێربوون لە رازیبوونی خۆشەویستەکەی، و هەستان بە بەندایەتی کردنی، هۆکاری زۆر بۆ نزیکبوونەوە لە خودا دەگرێتە بەر، نەك بۆ هۆیەك لە هۆیەکانی دونیا و حەزێك لە حەزەکانی، وەك عومەری کوڕی خەتتاب –خوا لێی رازی بێت– دەفەرموێت ((گەر

سێ شت نەبوونایە حەزم بە مانەوە لە دونیادا نەبوو، ئامادەكردنی ئەسپ بۆ جیهاد لە پێناوی خودادا، خەریكبوونی شەو، و دانیشتن لەگەڵ كەسانێكدا كە وتە و قسەی جوان و باش هەڵدەبژێرن وەك چۆن خورمای باش هەڵدەبژێررێت))

مەبەستی ئەم سیانە بوو-خوا لێی رازی بێت-: جیهاد و نوێژ و زانستی بە سوود، ئەمە پلەكانی كاری چاكەیە، ئەهلی ئەم پلانە ئەهلی پلە و پایەی بەرز و نزیكین لە خوداوە.

مەعاز-خوا لێی رازی بێت- لە سەرەمەرگیدا فەرمووی ((خودایە، تۆ دەزانی من مانەوەی دونیام پێ خۆش نەبوو لەبەر جاریبوونی روبار و ناشتنی دار و درەخت و هێنانی ژن، بەڵكو لەبەر تینوێتی رۆژانی گەرم و خەریكبوونی شەو و تەنگەهەڵچنین بە زانایان بە ئەژنۆ لە حەڵقەی زیكردا مانەوەی ژیانم پێخۆش بووە))

ئەو لەوانەدا خۆی بە كەمتەخەم دەزانێت، و ئەوەی بۆ ئەو پێویستە لەم بینینەدا: بە مەزن زانینی داواكەی و بچووك تەماشاكردنی نەفسی خۆی و سەرنجدان لە ئەنگییەكانی و كەمی توێشوو لەبەر چاوی، هەر كەس خودا و خۆی ناسی: هەمیشە خۆی بە چاوی ناتەواو سەرنج دەدات.

هەروەها: كەسی صادق ناچارە-بە ئەوپەڕی ناچاری- لە شوێنكەوتنی فەرمان و بریار و تەسلیمبوون بە پێغەمبەر(ﷺ) لە دەرەوە و ناوەوەیدا و شوێنكەوتن و بەندایەتی خودا بە گوێڕایەڵی كردنی لە هەموو جووڵە و وەستانێكدا، لەگەڵ ئیخلاصی مەبەست و مەرام بۆ خودای موتەعال، خودا جگە لەمە بە شتێكی تر رازی نابێت لە بەندەكەی، جگە لەم رێگەیە هەر شتێكی تر خۆراك و بەشی نەفسە و قەڵەوكردنییەتی، و شوێنكەوتنی حەز و ئارەزووە، با موجاهەدە و وەرزشی دەروونی و "خەڵوەنشین"یشی لەگەڵ بێت، خودا(ﷻ) هیچ كردارێك لە بەندەكەی قبووڵ ناكات و پێی رازی نابێت گەر شوێنكەوتنی پێغەمبەری لەگەڵ نەبێت و تەنها لەبەر خودا ئەنجامی نەدابێت.

ئا لێرەدا كەسی صادق لە زۆربەی سالیكان جیادەبێتەوە، بەڵكو لەسەر رێگەكە نامۆ دەبێت و تەنها دەكەوێت، ئەمەش بەهۆی كەمی سالیكی رێگەی صدقەوە، زۆربەی سالیكان بەپێی چێژی خۆیان رێگە دەگرنە بەر و هەناسەكانیان بۆ خۆیان تەرخان كردووە، كەسی صادق لە دۆڵێكە و ئەوانی تر لە دۆڵێكی تر.

## (٣٢) (منزلة الإيثار)

# مەنزیلەی ئیسار

لە مەنزیلەکانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی ئیسارە(فەزڵدان بەسەر خۆدا).
خودای موتـەعال دەفـەرموێت ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾﴾ الحشر: ٩

فەزڵدان بەسـەر خـۆدا(الإيثـار) پێچـەوانەی زیـادە چـرووکی و دەستنوقاوییە(الشـح)، کەسێك خاوەنی "الإيثـار" بێـت دەسـتبەرداری ئـەوە دەبێـت کـە ئاتاجییـەتی، بـەڵام کەسی چرووك و دەروون پڕ لە ژەنگوژار "الشحيح"هەڵپە دەبـات بـۆ ئـەو شـتەی ئـەو خاوەنی نییە و لەدەستیدا نییە، کـە شتێکیشـی بەردەسـت دەکـەوێت زۆر بـە تونـدی دەستی بەسـەردا دەگرێـت و بـەخیل دەبێـت بـە دەرچـوونی شـتێك لـە چنگی، بۆیـە فەرمان بە چرووکی و دەستنوقاوی دەکات، وەك پێغەمبـەر(ﷺ) دەفـەرموێت ((إيـاكم والشح، فإن الشح أهلك من كان قبلكم، أمرهم بالبخل فبخلوا، وأمرهم بالقطيعة فقطعوا)).

بۆیە کەسی بەخیل"البخيل": ئەو کەسەیە وەڵامی بانگکەری چرووکی و دەست نوقـاوی و زیادە بوخل "الشح" دەداتەوە، بەڵام ئەو کەسـەی بـەهۆی سـەخاوەتەکەیەوە فـەزڵی ئاتـاجی کەسـی بەرانبـەر بەسـەر خۆیـدا دەدات(المـؤثر) ئـەو کەسـە وەڵامـی بـانگی بەخشـندەیی و سـەخاوەتی داوەتـەوە، هـەر بـەو جـۆرە سـەخاوەت لـەوەی لەدەسـتی خەڵکیدایە کە مەزنترە لە سەخاوەتی بەخشین لەلایەن خۆیەوە.

عەبـدوڵای کـوڕی موبـارەك دەفـەرموێت (سـەخاوەتی نـەفس لـەوەی لـە دەسـتی خەڵکیدایە (واتە دەروونی ئاسوودە بێت بەوەی خەڵکی لەلایەتی) باشتر و چاکترە لـە سەخاوەتی نەفس بە بەخشین.

ئەم مەنزیلەیە بریتییە لە مەنزیلەی بەخشین و سەخاوەت و ئیحسان.

ناوی مەنزیلـەی "الإيثـار"ی لێنـراوە چـونکە بـاڵاترین پلـەی سـەخاوەتە، ئاسـتەکانی سیانن:

یەکەمیان: لە بەخخشین کەمی نییە و لەلاشی گران نییە، ئەمە بریتییـە لـە مەنزیلـەی سەخاوەت.

دووەم: زۆر دەبەخشێت و کەم بۆ خۆی دەهێڵێتەوە، یان بە ئەندازەی ئەوەی دەیبەخشێت بۆ خۆی دەیهێڵێتەوە، ئەمەیان مەنزیلەی بەخشندەیی(الجود)ە.

سێیەمیان: ئەوەیە کەسی بەرانبەر بە ئاتاجتر و پێویستر لەخۆی ببینێت لەگەڵ ئەوەی کە خۆی پێویستییەتی، ئەمەش بریتییە لە "الإیثار"، پێچەوانەکەی بریتییە لە بۆخۆیی"الأثرة" کە بریتییە لە خۆپێشخستن لە ئاتاجییەکاندا و پێنەدانی بە براکەت کە ئاتاجییەتی، ئەمەش ئەو ئاستەیە پێغەمبەر(ﷺ) تیایدا بە ئەنصاری فەرموو ((ئێوە لەدوای من بۆخۆیی"الأثرة" دەبینن، ئارام بگرن تا لەسەر حەوزەکە پێم دەگەن))، ئەنصار ئەوانە بوون خودا بە "الإیثار" وەسفی کردن﴿ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ﴾، خودای موتەعال بە باڵاترین ئاستی سەخاوەت وەسفی کردن، ئەو سیفەتە لەوانەدا روون و ئاشکرابوو

قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە-خوایان لێ رازی بێت- لە کەسە زۆر بەخشندەکان بوو، تەنانەت جارێك نەخۆش کەوت براکانی درەنگ هاتن بۆ سەردانی، پرسیاری لێ کردن؟ وتیان: شەرم دەکەین لەو قەرزەی لەسەرمانە، فەرمووی: خوا ماڵ و داراییەك رسوا بکات رێگە لە سەردانی براکانم بگرێت، پاشان فەرمانی بە بانگکەرێك کرد بانگ بکات: هەر کەس قەرزی قەیسی لەلایە ئەوە گەردنی ئازاد کردووە، ئەو ئێوارەیە خەڵکێکی زۆر هاتن بۆ ماڵیان تا ئەوەندە زۆربوون خەڵك لە دەرگاکەدا بۆ چوونەژوورەوە دەوەستا.

سەرنجی نهێنی خودای موتەعال بدە، ئەو کەسەی کە "قدیر و حکیم"ە وادەکات خەڵکی بە سیفەتی بۆخۆیی(الأثرة) مامەڵە لەگەڵ ئەنصاردا بکەن کە ئەهلی سەخا و بەخشندەیی بوون، بۆ ئەوەی بەرانبەر ئەو بەخشندەییەی لە دونیادا بەرانبەر براکانیان هەیانبوو لە رۆژی دواییدا و لە بەهەشتی عەدندا پاداشت بدرێنەوە و پلەیان بەرزتر بێت لە هەموو خەڵکی، لەو رۆژەدا گەورەیی و پلە و پایەی بەخشندەیی ئەوان دەردەکەوێت، ئەوانەی لە دونیادا بە سیفەتی بۆخۆیی لەگەڵیان جوڵانەوە لەو رۆژەدا خۆزگەیان پێ دەخوازن، ئەوەش فەزڵی خودای موتەعالە و بە هەر کەسێکی دەبەخشێت کە خۆی بیەوێت، خودا خاوەنی فەزڵی مەزنە.

گەر خەڵکیت بینی بۆخۆییت لەگەڵ بەکاردەهێنن-لەگەڵ ئەوەی کە تۆ ئەهلی بەخشندەیی بووی- بزانە بەهۆی خێرێکەوەیە کە بۆت دانراوە، خودا(ﷻ) بۆ تۆ پێی ئاگادارترە.

## ۞ بەرزبوونەوەکانی بەخشندەیی(الجود)

**بەخشندەیی دە پلەیە:**

**یەکەمیان** بەخشندەیی بە نەفس، کە بریتییە لە باڵاترین پلەی، وەك شاعیر دەڵێت:

**یجود بالنفس إذا ضن البخیل بها          والجود بالنفس أقصی غایة الجود**

**دووەم:** بەخشین بە سەرۆکایەتی: کە دووەم ئاستی بەخشندەییە، بەخشندەیی کەسی بەخشندە هەڵدەنێت بۆ کەم تەماشاکردنی سەرۆکایەتی و بەخشینی بە کەسێك کە ئاتاجییەتی.

**سێیەم:** بەخشین بە ئاسودەیی و رەفاهییەت و خۆگرتنەوە، ماندووبوون و شەکەتی بەسەر پشوو و خۆشگوزەرانی خۆیدا هەڵدەبژێرێت لە پێناوی بەرژەوەندی کەسی بەرانبەردا، لەوانە بەخشندەیی مرۆڤ بە خەو و چێژی، وەك شاعیر دەڵێت:

**متیم بالندی لو قال سائله:          هب لي جمیع کری عینیك، لم ینم**

**چوارەم:** بەخشندەیی بە زانست و بەخشینی: کە لە باڵاترین ئاستەکانی بەخشندەییە، بەخشندەیی لە زانستدا چاکتر و باشترە لە بەخشندەیی لە ماڵ و داراییدا، چونکە زانست بەرزتر و باڵاترە لە ماڵ و دارایی.

خەڵکی لە بەخشندەییدا لە پلەی جۆراوجۆردان، حیکمەتی خودا و ئەندازەگیرییە وردەکەی وا داوا دەکات کەسی بەخیل بە هیچ کام لەو پلانە سوودمەند و بەهرەمەند نەبێت.

لە بەخشندەیی بە زانست ئەوەیە کە بیبەخشیت بەو کەسەی داوای لێ نەکردووی، بەڵکو تۆ زانستەکەی بۆ واڵا بکەیت و بەسەریدا بخوێنیتەوە.

هەروەها لە بەخشندەیی بە زانست: گەر پرسیارکەرێك لەسەر بابەتێك پرسیاری لێ کردی وەڵامی تێر و تەواوی بۆ ئامادە بکەی و پێی ببەخشیت، وەڵامەکەت بە

ئەنـدازەی لادانــی پێویسـتیی ئـەو نـەبێت، وەك هەنـدێكیان لـە وەڵامـی فتوایەكـدا دەیاننووسی "بەڵێ" یان "نەخێر" بەڵكو وەڵامێكی تێر و تەواو بێت.

لە شێخولئیسلام ئیبن تەیمیە –قدس الله روحه– شتی سەیر و سەمەرەم دەبینی: كاتێك پرسـیاری حـوكمی بابـەتێكیان لـێ بكردبایـە، لـە وەڵامەكەیـدا راو بۆچـوونی چـوار ئیمامەكەی دەخستە روو –گەر بیتوانیبایە– هەروەها جێگەی ناكۆكی نێوانیـان، پاشـان بڕیاری پارسەنگ لەنێوانیاندا، ئەوجا وابەستەكان(المتعلقات)ی ئەو بابەتە كـە لەوانـەبوو بۆ پرسیاركەر لە وەڵامی پرسیارەكەی بەسوودتر بێت، بۆیە بە باسی ئەو وابەسـتەبوون و پێویستیانە دڵخۆشتر دەبـوو لـە وەڵامـی پرسـیارەكەی، ئـەو –رەحمـەتی خـودای لـێ بێت– بەم جۆرە لەناو خەڵكیدا فتواكانی دەدا، هەر كەس دەیەوێت با بەو جۆرە بكات.

لە بەخشندەیی مرۆڤ بە زانست: تـەنها لەسـەر پرسـیاری پرسـیاركەرەكە ناوەسـتێت: بــەڵكو هاوشــێوەكان و وابەســتەبوونەكانی و جێناكۆكــەكان و رەخنــەلێگیراوەكانی دەخاتە روو، بەجۆرێك بۆ پرسیاركەر ببێت بە شیفا و بەس بێت بۆی.

هـاوەڵان –خوایـان لـێ رازی بێـت– پرسـیاریان لـە پێغەمبـەر(ﷺ) كـرد دەربـارەی دەستنوێژ لە ئاوی دەریا؟ فەرمووی: ((دەریا ئاوەكەی زۆر پاكە و مردارەوەبووەكەی حەڵاڵـە))، وەڵامـی پرسـیارەكەی دانـەوە و لـەوەش زیـاتر زانسـتی پێبەخشـین كـە لەوانەیە لە هەندێ كاتدا پێویستییان پێی لە پرسیارەكەیان زیاتر بێت.

كاتێك هاوەڵان پرسیاری حوكمێكیان لێ دەكرد پێغەمبەر(ﷺ) لە هۆ و حیكمەتی ئـەو حوكمـە ئاگـاداری دەكردنـەوە، وەك ئـەو كاتـەی پرسـیاریان لـێ كـرد لـە فرۆشـتنی خورمـای تـەڕ (رطـب) بـە خورمـای گـەیو(تمـر)؟ فـەرمووی: ((ئەگـەر خورمـای تـەڕ وشكببێتەوە كێشەكەی كەم دەكات؟ وتیان بـەڵێ: فـەرمووی: كـەوابوو نـەخێر))، لای پێغەمبەر(ﷺ) كەمكردنی كێشی خورمـای تـەڕ بـە وشـكبوونەوە نادیـار نـەبوو، بـەڵام دەیویست لە هۆی حوكمەكە ئاگاداریان بكاتەوە، لەم جۆرە وەڵامانەی پێغەمبـەر(ﷺ) زۆرن، وەك فەرموودەكەی ((ئەگەر بـەروبوومێكت بـە برادەرەكـەت فرۆشـت و پاشـان بەڵایەكی بۆ پەیدابوو بۆت حەڵاڵ نییە شتێك لە ماڵی براكـەت(كڕیارەكـە) وەربگریـت، بەچ شتێك مـاڵی براكـەت وەردەگریـت؟ بـەبێ هـیچ حـەقێك؟)) لـە دەربڕینێكـی تـردا ((ئـەی ئەگـەر خـودا ئـەو بەروبوومـەی نـەدا، یـەكێك لـە ئێـوە بـە چ حـەقێك مـاڵی

براکەی(ماڵی کڕیارەکە) داوا دەکات، بەبێ هیچ حەقێك؟))، ئەو هۆیەی دیاری کرد کە لە پێناویدا پابەندبوون بە نرخەکە دیاری کراوە، ئەوەش ڕێگری کردنی خودایە لە بوونی ئەو بەروبوومە کە هیچ دەستێکی کڕیارەکەی تێدا نییە.

پێنجەم: بەخشین بە پلە و پایە، بەوەی بەهۆیەوە سوود بە خەڵکی بگەیەنیت، وەك شفاعەت کردن بۆ کەسێك، ڕۆیشتن لەگەڵ کەسێك بۆ لای دەسەڵاتدارێك بۆ ئەوەی کارێکی ڕەوای بۆ ئاسان بکەیت، ئەوەش بریتییە لە زەکاتی پلە و پایە کە لە بەندە داواکراوە، وەك چۆن فێرکردنی خەڵکی و بەخشینی زانست بریتییە لە زەکاتی زانست.

شەشەم: بەخشین بەسوودی جەستە بە جیاوازی جۆرەکانییەوە، وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((ڕۆژدەبێتەوە، لەسەر هەر جومگەیەکی جەستەی ئێوە صەدەقەیەکی لەسەرە، هەر ڕۆژێك کە خۆری تیا هەڵدێت، نێوانخۆشی لە نێوان دوو کەسدا دروست دەکات صەدەقەیە، کۆمەکی پیاوێك دەکات لە وڵاخەکەیدا تاکو سوار ببێت یان بارەکەی بۆ بار بکات صەدەقەیە، قسەی باش و پاك و جوان صەدەقەیە، هەر هەنگاوێك مرۆڤ بۆ چوون بۆ نوێژ هەڵیدەگرێت صەدەقەیە، لابردنی شتێك ئازاری خەڵك دەدات لەسەر ڕێگە صەدەقەیە))متفق علیه

حەوتەم: بەخشندەیی بە حورمەتی خۆت، وەك بەخشندەییەکەی "أبي ضمضم"-خوا لێی ڕازی بێت- کە ڕۆژی لێدەبوویەوە دەیفەرموو ((خودایە، من ماڵم نییە ببیبەخشم بە خەڵکی، حورمەتی خۆمم کردووە بە صەدەقە بۆ ئەوان، هەر کەس جنێوم پێدەدات یان تۆمەتم بۆ دروست دەکات، گەردنی ئازاد بێت)) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((کێ لە ئێوە دەتوانی وەك أبي ضمضم وابێت؟!))

ئەم بەخشندەییە لە سەلامەتی سینەوە و دڵگوشادی و ڕزگاربوون لە دوژمنایەتی خەڵکی بەو شتانەی تێیاندایە.

هەشتەم: بەخشندەیی بە ئارامگرتن و خۆڕاگری و چاولێخشان، ئەمەش پلەیەکی باڵایە لە پلەکانی، بۆ خاوەنەکەی لە بەخشندەیی بە ماڵ سوود و قازانجی زیاترە، پشتیوانییەکی مەزن و سەرخەرێکی گەورەیە بۆی، شان و شەوکەت و شکۆ بە خاوەنەکەی دەبەخشێت، تەنها خاوەن نەفسە مەزنەکان دەتوانن ئەم جۆرە لە بەخشندەییان هەبێت.

هەر كەس بەخشین بە ماڵ و دارایی لا گران بێت با ئەم جۆرە بەخشندەییەی هەبێت، چونكە بەری پڕ لە فەڕی لە دونیادا بەر لە دوارۆژ دەچنێتەوە، ئەمە بریتییە لە بەخشندەیی جوامێری ﴿وَٱلۡجُرُوحَ قِصَاصٞۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٞ لَّهُۥۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٤٥﴾ المائدة: ٤٥، لەم ئایەتەدا سێ مەقامی باس كرد: مەقامی عەدل و مۆڵەتی بە ئەنجامدانی تۆڵە دا، مەقامی فەزڵ (لێخۆشبوون) و بە پەسەند و شیاوی دانا، لەگەڵ مەقامی ستەم بە حەرام وەسفی كرد.

نۆیەم: بەخشندەیی بە رەوشتی جوان و رووخۆشی و كراوەیی: ئەم جۆرە بەخشندەییە لەسەر و بەخشندەیی ئارامگرتن و خۆڕاگری و لێبووردنەوەیە، ئەم جۆرەیە خاوەنەكەی دەگەیەنێتە پلەی رۆژووگری شەونوێژكەر، گرانترین شتێكە لە میزانی كردەوەكاندا، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((شتێك لە چاكە بەكەم تەماشا مەكە، تەنانەت گەر بگەیت بە براكەت و رووت خۆش و كراوە بیت لەگەڵی))، لەم جۆرە بەخشندەییەدا سوود و قازانج و دڵخۆشكردنێكی زۆری تێدایە، هەر بەو جۆرە چەندین جۆر بەرژەوەندی لەناویدا كە مرۆڤ ناتوانێت بەدەستیان بهێنێت و لەئامێزیان بگرێت بەهۆی رەوشت و ئارامگرتنەوە، تەنها بە رێگەی رووخۆشی و كراوەییەوە بەرچنگ دەكەون.

دەیەم: بەخشندەیی بەوەی لەدەستی خەڵكیدایە لەسەریان، لاناكاتەوە بەلایدا و بەدڵ سەرنجی نادات و حاڵی پێی كاریگەر نابێت و زمانی باس لەبارەیەوە ناكات، ئەمە ئەوەیە عەبدوڵای كوڕی موبارەك فەرمووی: كە مەزنترە لە بەخشین بە ماڵ و سامان.

زمانی حاڵی قەدەر بە هەژاری بەخشندە دەڵێت: گەر ماڵ و سامانت پێنەدراوە بە خەڵكی ببەخشیت ئەوا بە زوهدی خۆت لە ماڵ و سامانیان و ئەوەی لەژێر دەستیاندایە پێیان ببەخشە، چاكەیان لەگەڵ بكە و بە بەخشندەیی سینەی خۆت تەكیان پێهەڵبچنە و بە ئاسوودەبوونیشت تەنها ببەرەوە.

بۆ هەر یەكێك لەم ئاستانەی بەخشندەیی زیادبوون و كاریگەری تایبەت لەسەر دڵ و حاڵ بوونی هەیە، خودای موتەعال زیادبوونی بۆ كەسی بەخشندە دەستەبەر كردووە، و تیابردنیش بۆ ئەو كەسەی دەست دەگرێت بەسەر بەهرە و نیعمەتەكاندا، خودا كۆمەك و یارمەتیدەرە.

## ❁ بەرینی تەنگەلانی

سەرەتای بەرزبوونەوە بە پێپلەکانی بەخشندەییدا ئەوەیە فەزڵی خەڵکی بدەیت بەسەر خۆتدا لەو شتانەدا کە ئایین حەرامی نەکردوون و ڕێگەی بەرەو خوداچوونت لێ ناگرن و کاتی لەگەڵ خودابوونت لێ تێکنادەن، ئەوەش وەك پێشخستنی ئەوان بەسەر بەرژەوەندییە زۆر پێویستەکانی خۆتدا، بۆ نموونە تێریان بکەی و خۆت زۆرت برسی بێت، پۆشتەیان بکەیەوە و خۆت رووت و گەدا بی و تێرئاویان بکەیت و خۆت لە تینوێتیدا لە تیاچووندا بیت، ئەمەش تا ئەو سنوور و رادەیە کە تووشی تیاچوون نەبیت، چونکە لەڕووی شەرعەوە ناپەسەندە، وەك پێدانی هەموو ماڵ و سامانەکەت بەجۆرێك لە ماڵەوە دابنیشی و پەکت بکەوێت و بگەیتە ئەوەی داوا لە خەڵکی بکەیت.

ئەو قسەش کە دەڵێت: ڕێگەی بەرەو خوداچوونت لێ نەبڕێتەوە: ئەو ڕێگەیە بریتییە لە ڕێگەی داوا و ڕۆیشتن بەرەو خودا، وەك ئەوەی فەزڵی مانەوە لەگەڵ هاومەجلیسەکەت بدەیت بەسەر فەزڵی یادکردنی خودا و کۆبوونەی دڵ لەسەر خودا و ئاراستە وەرگرتن بەرەو خودا، لەو بارەدا ئەو کەسەت بەسەر خودادا هەڵبژاردووە، بەخشندەییت بە بەشی خۆت لە خودا کردووە، نموونەی تۆ وەك نموونەی ئەو کەسە وایە کە بە ڕێگەیەکدا دەڕۆیشت و بە پیاوێك گەیشت و رایگرت، دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵی و خۆخەریك کردن پێیەوە تا هامسەفەرەکانی ڕۆیشتن و لەدەستی چوون، ئەمە حاڵی زۆرینەی خەڵکییە لەگەڵ کەسی صادق و ڕۆیشتوو بەرەو خودا، هەڵبژاردنی خەڵکی بەسەر خودادا سەرچاوەی زیانۆمەندییە، مەگەر دانیشتن بێت لەگەڵ میوان و هاوشێوەی ئەوە، ئەو کات ئەوە دەبێتە کەماڵی بەخشندەیی وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا.

ئەوەش کە دەڵێت "کاتی لەگەڵ خودابوونت لێ تێکنادەن": بەهەمان شێوە هەر شتێك کاتەکانت لەگەڵ خودا دەشێوێنن ناباش و ناشیرینە، یان لە بارێکدا کە دڵ و هیممەت کۆبوونەتەوە لەسەر خودا بە کارێك ئەو کۆبوونەوە و هیممەتە لە خۆت تێکبدەی و ناخت پەرت بکەیت، ئەمەش دیسان کارێکی پەسەند و شیاو نییە.

هەر بەو جۆرە هەڵبژاردنی خەریك کردنی دڵ و بیر لە کاروبارەکانیاندا کە لەسەر تۆ پێویست نەکراوە و بۆت دیاری نەکراوە بەسەر بیرکردنەوەی بەسوود و خەریك کردنی

دڵ بە خوداوە، مەگەر سەرخستنی ستەملێکراوێکی تێدا بێت، یان بەهاناوەچوونی کەسێك کە داوای هانات لێ دەکات، یان شفاعەت کردنێکی پەسەند و باش.

لێرەدایە فەقیهەکان قسەیان لەم جۆرە بەخشندەیی کردووە کاتێك رووبەرووی نزیکبوونەوە ببێتەوە لە خودا، دەڵێن: یان مەکروهە یان حەرام، وەك ئەوەی کەسێك لە ریزی یەکەمی نوێژدایە و کەسێکی تر دەخاتە جێگەی خۆی و خۆی دەچێتە دواوە، یان شوێنی نزیکی خۆی لە ئیمامەوە لە رۆژی هەینی بە کەسێکی تر دەبەخشێت، یان بانگ و قامەت بە کەسێکی تر دەبەخشێت، هەموو ئەمانە لای فەقیهەکان بە مەکروه و حەرام لێکدراونەتەوە.

### ۞ لەبەر خودا لە لۆمەی لۆمەکران مەترسە

رێبواری رێگەی خودا بەردەوام بەرز دەبێتەوە تا رازیبوونی خودا بەسەر هەموو رازیبوونەکانی تردا هەڵدەبژێرێت، با بەڵا و میحنەتی زۆریش رووی تێ بکات، و کۆڵی تێچوونی قورس ببێت، و هێز و توانا و جەستەی لاواز ببێت.

ئەو ئەوەی دەوێت و ئەوە ئەنجام دەدات کە رەزامەندی خودای تێدایە با هەموو خەڵکیش لێی تووڕە بن، ئەمەش پلەی پێغەمبەرانە، و بەرزترین پلەیە بۆ ئەوان – علیهم صلوات الله وسلامه– بەرزترین پلەیە بۆ خاوەن عەزمەکان لە پێغەمبەران، – صلی الله علیه وسلم وعلیهم–، ئەو(ﷺ) بەرەنگاری هەموو جیهان بوویەوە، خۆی بۆ بانگەواز بۆ لای خودا یەکلا کردەوە، لەبەر خودا شانیدایە ژێر دوژمنایەتی نزیك و دوور، لە هەموو روویەکەوە رەزامەندی خودای دا بەسەر رەزامەندی خەڵکیدا، لە هەڵبژاردنی رەزامەندی خودادا لە لۆمەی لۆمەکەران نەترسا، بەڵکو لێبڕاو و سووربوون و هەوڵ وکۆششی هەر هەموو بۆ هەڵبژاردنی رەزامەندی خودا و گەیاندنی پەیامەکەی و بەرزکردنەوەی کەلیمەی "لا إله إلا الله" و تێکۆشان لە پێناویدا بوو، تا ئایینی خودا بەسەر هەموو ئایینەکاندا سەرکەوت و بەڵگەی خودا بەسەر هەموو جیهاندا خوێنرایەوە، نیعمەتی خۆی لەسەر باوەڕداران تەواو کرد، پەیامی گەیاند و ئەمانەتی گەیاندە جێگە و ئامۆژگاری ئوممەتی کرد و لە پێناوی خودادا بە باشترین شێوە تێکۆشا و بەندایەتی خودای کرد تا لە پەروەردگارەوە یەقین(مردن)ی بۆ هات،

هیچ کەس بە ئەندازەی پێغەمبەر لەم پلەی بەخشندەییەی بەرنەکەوتووە و پێی نەگەیشتووە، صلوات الله وسلامه علیه.

میحنەت و بەڵا لەسەر خاوەنی ئەم جۆرە لە بەخشندەیی زۆر مەزنە، تاکو ئەوانەی ئەهلی ئەم پلەیە نین بچنە دواوە، گەر بتوانێت شان بداتە ژێری و بێتە پێشەوە: ئەو بەڵایانەی بۆ دەبێت بە پاداشت و پێبەخشین، کۆڵی قورس دەبێت بە یارمەتیدەر، ئەمە بە ئەزموونی تایبەت و گشتی ناسراوە و دەرکەوتووە، هەر بەندەیەك رازیبوونی خودا بەسەر رازیبوونی خەڵکدا هەڵبژێرێت و شان بداتە ژێر کۆڵی قورسی ئەو بڕیارە و ئارام بگرێت لەسەر بەڵا و ناخۆشییەکان خودای موتەعال لەو بەڵا و ناخۆشییانەوە نیعمەت و دڵخۆشی بۆ دروست دەکات، هەر بەو جۆرە جۆرێك لە کۆمەك و یارمەتی پێ دەبەخشێت تا بتوانێت شان بداتە ژێر کۆڵی رازیکردنی خودا، ئەو کاتە ترسەکانی دەگۆڕێت بە ئاسایش، گومانی تیاچوونی دەبێت بە رزگاربوون، هەر بەو جۆرە ماندوویتی بۆ پشوو و کۆڵی بۆ کۆمەك و بەڵای بۆ نیعمەت و میحنەت بۆ مینحەت(پێبەخشین) و ناڕازیبوون بۆ رازیبوون دەگۆڕێت، هاوار بۆ بێهیوابوونی دواکەوتووان و هاوار بۆ زەلیلی ترساوەکان!

ئەمە و سوننەتی خودا وا جاری بووە–کە گۆڕان نییە لە سوننەتیدا– هەر کەس رەزامەندی خەڵك بە رەزامەندی خودا داوا بکات: خەڵکی وا لێدەکات لێی ناڕازی بن، و لەلای خۆیەوە شەرمەزار و رسوای دەکات و بەدەستی ئەو کەسانە بەڵا و ئازاری بەسەردا دەهێنێت، ئەو کات ستایشکەرەکەی دەست دەکات بە زەمکردن، هەر کەس رەزامەندی خەڵکی بوێت بە تووڕەکردنی خودا هەرگیز لەوانەوە ناگات بەوەی بەدوایدا عەودالە، و پاداشتی خوداشی لەدەست دەچێت، ئەو جۆرە کەسانە پەستترین مرۆڤ و بێئەقڵترینیانن.

ئەمە و رازیبوونی خەڵکی نە لە توانادایە و نە فەرمانی پێکراوە بەڵکو کارێکی بێ سەرئەنجامە و روونادات، بەڵکو هەر دەبێت لێت ناڕازی بن، گەر ئەوان لێت ناڕازی بن و رەزامەندی خودا بەدەست بهێنیت دەبێت لات خۆشەویستر و باشتر بێت لەوەی ئەوان لێت رازی بن و تووڕەبوون و خەشمی خودا بەو رازیبوونە بەدەست بهێنیت، گەر ناچاربوویت یەکێك لەو دوو ناڕازیبوونە هەڵبژێریت ئەوا ناڕازیبوونی ئەوان هەڵبژێرە کە

رازیبوونی خودای پێ بەدەست دەهێنیت، گەر دوای ئەوە لێت رازیبوون كارێكی باشە، ئەگەر نە، ئاسانترین شت بۆ لەدەستدان بریتییە لە رازیبوونی كەسێك كە رازیبوونەكەی هیچ سوود و قازانجێك یان زیان و زەرەرێكت پێ ناگەیەنێت، نە لە ئایین و نە لە باوەڕتدا و نە لە دوارۆژدا شتێكی لێ درووێنە ناكەیت، گەر لە شتێكی كەمی دونیاییدا زیانی پێگەیاندی ئەوا تووڕەبوون و خەشمی خودا گەورەتر و مەزنترە، تایبەتمەندی ژیری ئەوەیە كە شان دەداتە ژێر بچووكترن مەفسەدە بۆ پاڵپێوەنانی گەورەترین مەفسەدە، بۆیە تۆش بە ژیری خۆت كێشانە و پێوانە بكە، پاشان تەماشا بكە و بزانە كام لەو دوانە بۆ تۆ خێر و باشە هەڵیببژێرە، و كامەیان خراپترە لێی دووربكەوە، ئەمە بورهانێكی بڕاوە و پێویستە لە هەڵبژاردنی رەزامەندی خودا بەسەر رازیكردنی خەڵكدا.

ئەمە و گەر كەسەكە رەزامەندی خوای هەڵبـژارد خودا قورسی كۆڵی تووڕەبوونی خەڵكی لە كۆڵ دەكاتەوە، بەڵام گەر رازیكردنی ئەوانی هەڵبژارد ئەوان ناتوانن خەشم و تووڕەبوونی خودای لێ بگرنەوە.

شافعی-خوا لێی رازی بێت- دەفەرموێت: رازیكردنی خەڵكی ئامانجێكی بەدەست نەهاتووە، ئەوەی چاككردنی خۆت و ژیانی خۆتی تێدایە پێیەوە پابەند ببە، ئاشكرایە ئەو كەسەی رەزامەندی خودا هەڵدەبژێرێت رووبەڕووی دەستدرێژی خەڵكی و ئازاریان دەبێتەوە، هەوڵدەدەن بە هەر نرخێك بووە تووشی تیاچوونی بكەن، ئەمە سوننەتی خودایە لەناو خەڵكیدا، ئەگەر وا نییە دەبێت گوناه و تاوانی پێغەمبەران چی بووبێت؟! هەروەها ئەو كەسانەی فەرمان بە دادپەروەری دەكەن و بە كاروباری ئایین هەڵدەستن و بانگ بۆ لای خودا دەكەن و بەرگری لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خودا دەكەن، هەموو ئەمانە دەبێ گوناهیان چی بێت؟!

هەر كەس رەزامەندی خودای هەڵبـژارد بوودەڵە و روخاو و نەفام و ئەهلی بیدعە و خراپە و ئەهلی دەسەڵاتی بێبنەما و پڕوپووچ و هەموو ئەوانەی رێگەیان جیایە لە رێگەكەی ئەو پەلاماری دەدەن، تەنها ئەو كەسەی داوای گەڕانەوە بۆ لای خودا دەكات و كار دەكات بۆ بیستنی وتاری ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ ﴾ دەتوانێت بەرەنگاریان ببێتەوە، ئەو كەسەش خاوەن ئیسلام و ئیمانێكی پۆڵاین و كامڵە و بە هێرش و پەلاماری پیاوان تووشی لەرزە نابێت و چیا لە ئاستیدا

خۆی بە نزم ڕادەگرێت و بەڵا و میحنەت و ترس و ناخۆشییەکان سووربوون و لێبڕان و ئارامگرتنی ناپسێنن.

بەدەستهێنانی ئەم پلەیەش بە دوو شتە:

زوهد لە دونیا و زوهد لە مەدح و سەنای خەڵك: هەر کەس لاوازی ڕووی تێکردبێت و لە کاروان دواکەوتبێت بەهۆی خۆشەویستی دونیا و مانەوە لە دونیا و حەزی مەدح و سەناوە ئەوا بە زەمکردنی ئەهلی دونیا بۆ ئەو بێزاری ڕووی تێدەکات، هەر کەس لەم دوو شتە (زوهد لە دونیا و زوهد لە مەدح و سەنای خەڵك) زوهدی کرد هەرچی شتە لێی دوور دەکەوێتەوە.

گرتنە دەستی ئەم دوو شتەش بە دوو شتی تر دەبێت: دروستیی یەقین و هێزی خۆشەویستی.

ئەو دوانەش دیسان بە دوو شتی تر: بە صدق لە پەنابردن و داواکردندا و دەستبردن بۆ ئەو هۆیانەی بەو دوانەی دەگەیەنن.

هەتا ئێرە مەعریفەی خەڵکی و تواناییان کۆتایی پێ دێت، کۆمەك و یارمەتیش بەدەستی کەسێکە کە هەرچی کاروبارە لەدەستی خۆیدایە ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٣٠﴾ يُدۡخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمَۢا ﴿٣١﴾﴾ الإنسان: ٣٠ – ٣١.

❁ ❁ ❁

## (٣٤) (منزلة الخلق)

# مەنزیلەی رەوشت

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی رەوشتی جوانە.

خودای موتەعال بە پێغەمبەرەكەی دەفەرمویٚ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ القلم: ٤، ئیبن عباس و موجاهید دەربارەی ئایەتەكە دەفەرموون: لەسەر ئایینێكی مەزن، هیچ ئایینێك بە قەدەر ئەو ئایینە لام خۆشەویست نییە و بەقەدەر ئەو ئایینە پێی رازی نیم، ئەوەش ئایینی ئیسلامە.

حەسەن–خوا لێی رازی بێت– دەفەرموێت: بریتییە لە ئادابی قورئان.

قەتادە دەفەرمویٚ: ئەوە ئەو فەرمانانە بوو كە لە خوداوە رایدەگەیاند و ئەو نەهیلێكراوانە بوو لە خوداوە نەهی لێدەكرد، ماناكەی: تۆ لەسەر ئەو ئەخلاقەی كە خودا لە قورئاندا پێی بەخشیویت.

لە هەردوو سەحیحەكەدا: هشامی كوڕی حەكیم ((پرسیاری لە عائشە كرد–خوا لێی رازی بێت– دەربارەی ئەخلاقی پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟فەرمووی: ئەخلاقی پێغەمبەر قورئان بوو، دەڵێت دەمویست هەستم و ئەو پرسیارە نەكەم)).

خودای موتەعال هەرچی رەوشتی بەرزە لەم ئایەتە پیرۆزەدا كۆی كردۆتەوە ﴿ خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ ﴿١٩٩﴾ ﴾ الأعراف: ١٩٩، جەعفەری كوڕی محمد دەفەرموێت: خودای موتەعال فەرمانی بە پێغەمبەرەكەی كردووە دەربارەی رەوشتی بەرز و بڵند، هیچ ئایەتێك بەقەدەر ئەم ئایەتە رەوشتی بەرز و بڵندی لەخۆیدا هەڵنەگرتووە. باسی ئەوە كراوە: كاتێك ئەم ئایەتە دابەزی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بە جبریل ((ئەمە چییە؟ فەرمووی: نازانم تا پرسیار نەكەم، پرسیاری كرد، پاشان گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر، و فەرمووی: خودای موتەعال فەرمانت پێ دەكات ئەوەی لێت دادەبڕێت تۆ سەردانی بكەی، ئەوەی بێبەشت دەكەت تۆ پێی ببەخشیت، ئەوەی ستەمت لێ دەكات تۆ لێی ببووریت))

ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەو كەسەی گوێی لێ دەگیرێت(زانا و بانگخوازی خێر) لەگەڵ خەڵكیدا سێ حاڵەتی هەیە:

یەكـەمیان: فـەرمان پێكردنیـان بـە شـتانێك بەرژەوەنـدی ئـەوانی تێـدابێت و نەهیلێكردنیان لە شتانێك رووبەڕووی زەرەریان بكاتەوە.

دووەم: وەرگرتنی ئەو شتانەی كە دەیبەخشن و لەسەریان واجبە و گێڕانـەوەی بـۆ دەستی ئەهلی خۆی.

سـێیەم: خـەڵكی لەگـەڵی دەبـن بـە دوو بەشـەوە: كەسـی تـەبا و دۆسـت لەگـەڵی، دووەمیان كەسی ناتەبا و نەیار و بەرهەڵستكار و دژ بە ئەو، بۆ هەر یەكێك لەم دووانە كەسەكە ئەركی تایبەت بەخۆی هەیە.

واجبەكەی لە فەرمان پێكردن و نەهی لێكردنیاندایە: ئەوەش ئەوەیە فەرمان بە چـاكە بكـات، چـاكەیەك چاكسـازی لـە خۆیـان و كاروبـاری ژیانیانـدا بـەرپابكات، هـەروەها نەهیكردن لێیان لە دژی چاكە و چاكسازی، واتە نەهیكردن لە مونكەر.

واجبی كەسەكە بەرانبەر ئەوەی ئەوان دەیبەخشن و ئـەنجامی دەدەن لـە گوێڕایـەڵی: ئـەوەی ئاسـانە لەسـەریان و دەروونیـان بـۆی ملكـەچ دەبێـت بـە سـینەفراوانی و دڵگوشادییەوە لێیان وەربگرێت، شتێك نەدا بە كۆڵیاندا كە بارگرانی و نەتوانینی تێـدا بێت و سەرئەنجام لە جێگەی چاككردن بیانڕوخێنێت.

واجـبی كەسـەكە بەرانبـەر نـەفامی نـەفامان دەرحـەق بـە ئـەو: پشـت تێكردنیـان، و رووبەڕوونەبوونەوە لەگەڵیان بە هەمان خراپەی ئەوان و تۆڵەسەندنەوە لێیان، خـودای موتـەعال بـە پێغەمبەرەكـەی(ﷺ) دەفـەرمویت ﴿ خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ ﴿١٩٩﴾ ﴾ الأعـراف: ١٩٩، عەبـدوڵای كـوڕی زوبێـر-خوایـان لـێ رازی بێـت- دەفەرمویت: خودای موتەعال فەرمان بە پێغەمبەرەكەی دەكات كە لێبووردنی هەبێت بەرانبـەر هەڵسـوكەوتی خـەڵكی، موجاهـد دەفـەرمویت: لێبووردنـت هـەبێت بەرانبـەر هەڵسوكەوت و كاروكردەوەی خەڵكی بەبێ كەم تەماشا كردنیان، وەك قبـووڵ كردنـی پاساوهێنانەوە، و لێبـووردن و ئاسـانكاری و وازهێنـان بەدواداچـوون و لێكۆڵینـەوە و پشكنین لە حەقیقەت و ناوەوەی شتەكان.

ئیبن عباس-خوا لە خۆی و باوكی رازی بێت- دەفەرمویت: ئەو ماڵە زیادەی كە هەیانـە لێیان وەربگرە كە بریتییە لەو ماڵەی لە منداڵ و خانـەوادەی زیـاترە، ئەمـە مانـای ئـەو ئایەتە پیرۆزەیە كە دەفەرمویت ﴿وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ ﴾البقرة: ٢١٩.

پاشان خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ﴾ الأعراف: ١٩٩، ئەوەش بریتییە لە هەموو مەعروفێك، مەزنترین مەعروفیان بریتییە لە: یەکتاپەرستی، پاشان مافی بەندایەتی و مافی بەندە.

پاشان خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ١٩٩﴾ الأعراف: ١٩٩، واتە گەر نەفامێك بەرانبەرت نەفامی ئەنجامدا تۆ بە هەمان شێوە رووبەڕووی مەبەرەوە، وەك ئایەتی﴿وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ٦٣﴾ الفرقان: ٦٣، بینا لەسەر ئەمە ئەو ئایەتە نەسخنەکراوە، بەڵکو پشتی تێدەکات لەگەڵ جێبەجێ کردنی حەقی خودا لەسەری، بەبێ تۆڵەسەندنەوەی خۆی.

ئەخلاقی پێغەمبەر(ﷺ) ئا بەو جۆرە بوو: ئەنەس دەفەرموێت ((پێغەمبەر لە هەموو کەسێك ئەخلاقی بەرزتر و جوانتر بوو))، هەروەها دەفەرموێت ((دەستی پێغەمبەر(ﷺ) لە ئاورشم و دیباج نەرمتر بوو، هیچ بۆنێکم نەکردووە لە بۆنی پێغەمبەر(ﷺ) خۆشتر بێت، دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەرم کرد، هەرگیز جارێك پێی نەوتم: ئۆف، هیچ کارێکم ئەنجام نەداوە پێغەمبەر(ﷺ) پێم بفەرموێت: بۆ ئەوەت ئەنجام دا؟ هەروەها کارێك ئەنجام نەدابێت پێم بفەرموێت: بۆ ئەنجامت نەدا؟)) متفق علیه

پێغەمبەر(ﷺ) رایگەیاندووە کە ((چاکە بریتییە لە ئەخلاقی باش و جوان))

لە سەحیحی "مسلم"دا لە نەواسی کوڕی سمانەوە-خوا لێی رازی بێت- فەرمووی ((پرسیارم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد دەربارەی چاکە و خراپە؟ فەرمووی: چاکە بریتییە لە ئەخلاق جوانی و خراپەش ئەوەیە کە بە سینەدا گوزەر دەکات و پێتناخۆشە خەڵکی پێی بزانێت))

بەرانبەری چاکە "البر" بریتییە لە خراپە "الإثم"، رایگەیاند چاکە بریتییە لە ئەخلاقی جوان و باش، و خراپەش بریتییە لە ختووکەی ناخ و دڵ و دەروون، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەخلاقی باش و جوان بریتییە لە هەموو ئایین، ئەوەش حەقیقەتی باوەڕ و شەریعەتی ئیسلامە، بۆیە لە بەرانبەریدا وشەی "الإثم"ی هێنا.

لە فەرموودەیەکی تردا ((چاکە ئەوەیە نەفس بەلایدا ئارام دەبێتەوە و دڵنیا دەبێت، خراپەش ئەوەیە ختووکەی سینە(دڵ)ت دەدات))، ئەخلاقی جوانی بە چاکە لێکداوەتەوە، ئاماژەی بەوەدا کە ئەخلاقی جوان نەفس و دڵ پێی دڵنیا و ئارامن،

خراپـە خـوران و ختووكـەی دەروونـە و گومـان و شـك بەرهـەم دەهێنێـت، ئەمـەش جیاوازە لە باشی ئـەخلاق و خراپـەی ئـەخلاق كـە لـەلای خـەڵكی بـاوە، وەك لـە دوو سـەحیحەكەدا لـە پێغەمبـەری خـوداوە((باشـترینی ئێـوە ئـەو كەسـەیە رەوشـتی لـە هەمووتان جوانتر و باشترە)).

لە سونەنی "الترمذي" لـە "أبـي الـدرداء"ەوە-خـوا لێـی رازی بێـت- لـە پێغەمبـەری خـوداوە(ﷺ) ((لـە رۆژی دواییـدا هـیچ شـتێك بـە قـەدەر رەوشـتی جـوان لـە میزانـی بـاوەڕداردا قـورس نییـە، خـودای موتـەعال كەسـی خراپـەكار و زمـان پیسـی خـۆش ناوێت)) ئیمامی "الترمذي" دەفەرموێت فەرموودەیەكی "حسن صحيح"ە.

هەر لە سونەنی"الترمذي"دا-بە صحیحی داناوە- لە ئـەبو هـورەیرەوە-خـوا لێـی رازی بێت- ((پرسیار لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) كرا دەربارەی ئەو شتەی كە زۆربـەی خـەڵكی دەباتە بەهەشتەوە؟ فەرمووی: تەقوای خودا و ئەخلاقی جوان، پرسیاری لێكرا لەسـەر ئەو شتەی زۆربەی خەڵكی دەباتە ناو ئاگرەوە؟ فەرمووی: دەم و داوێن)).

هەر لە سونەنی"الترمذي"دا-بە صەحیحی داناوە- لـە "عائشـة"ەوە-خـوا لێـی رازی بێت- لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ((كامڵترین ئیمان ئیمانی ئەوانەیە كە رەوشتیان لـە هەموو كەس جوانترە، باشترینی ئێوە باشترینتانە بۆ هاوسەرەكانیان))

لە فەرموودەیەكی سەحیحدا لە "عائشـة"ەوە-خـوا لێـی رازی بێـت- لـە پێغەمبـەری خـوداوە(ﷺ) ((كەسـی بـاوەڕدار بـە ئـەخلاقی جـوانی دەگاتـە پلـەی رۆژووگـری شەونوێژكەر)) رواه أبو داوود.

لە ئیبن عومەرەوە-خوا لە خـۆی و بـاوكی رازی بێـت- لـە پێغەمبـەری خـوداوە(ﷺ) ((من دەبمە كەفیلی بەدەستهێنانی كۆشێك لە دەوروبەری بەهەشتدا بـۆ ئـەو كەسـەی چەلەحانێ (جیدالی بێ بنەما و بێ سەروبەر)واز لێ دەهێنێت با لەسەر حەقیش بێـت، هەروەها بە كۆشكێك لە ناوەڕاستی بەهەشـتدا بـۆ كەسـێك واز لـە درۆ بهێنێـت بـا بـە شۆخیشەوە بێت، هەروەها بە كۆشـكێك لـە بـەرزترین شـوێنی بەهەشـتدا بـۆ كەسـێك ئەخلاقی جوان بێت))

كۆشكە بەرز و باڵاكەی كرد بە پاداشتی بـەرزترین مـەقام لـەو سیانە كـە بریتییـە لـە ئـەخلاقی جـوان و بـاش، هـەروەها كۆشـكە ناوەنییەكـە بـۆ مەقامـە ناوەنییەكـە كـە

وازهێنانە لە درۆ، و نزمەکەشیان بۆ نزمەکە کە وازهێنانە لە چەلەحانێ، با لەسەر حەقیش بێت، گومانی تێدا نییە کە ئەخلاقی جوان هەموو ئەوانە لەخۆ دەگرێت.

لە سونەنی "الترمذي"لە جابرەوە-خوا لێی رازی بێت- لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ((خۆشەویستترین کەس لەلای من و نزیکترین کەس لە مەجلیسم لە رۆژی دواییدا ئەوانەتانە کە رەوشتیان لە هەمووتان جوانترە، بێزراوترین و دوورترین کەسی ئێوە لە منەوە لە رۆژی دواییدا بریتین لە: دەمدرێژارن(الثرثارون) و درێژدادڕان(المتشدقون) و موتەفەیهیقەکان، وتیان ئەی پێغەمبەری خودا ئەو دوانەمان زانی ئەی "موتەفەیهیقەکان" کێن؟ فەرمووی: لوتبەرزەکان)) الثرثار: کەسێکە قسە زۆر بکات بەبێ سوودێکی ئایینی، المتشدق: کەسێکە بە زمان پاراوی دەمی پڕ دەکات لە قسە و خۆی پێ گەورە دەکات و درێژدادڕی دەکات و گەورەیی خۆی بەسەر دەوروبەردا نیشان دەدات، المتفیهقون: بنچینەکەی لە "الفهق"ەوە وەرگیراوە کە بریتییە لە پڕبوون(واتە پڕبوون بە لوتبەرزی).

## ❁ ئەخلاقە بنچینەییەکان

ئەخلاقی جوان لەسەر چوار پایە وەستاوە، وەستانی لاقەکانی بەو چوارەوەیە، ئەوانەش: ئارامگرتن(الصبر)، پاکی لە زمان و داوێن و رۆزیدا (العفة)، ئازایەتی (الشجاعة)، میانەگیری (العدل).

ئارامگرتن(الصبر): کەسەکە هەڵدەنێت بۆ خۆڕاگری و خواردنەوەی رق و دەستگرتنەوە لە ئازاردانی بەرانبەر، هەروەها هەڵیدەنێت بۆ حیلم و لەسەرخۆیی و نەرمونیانی و دەستنەوەشاندن و پەلە نەکردن.

عیففەت(العفة): هانی دەدات بۆ دوورکەوتنەوە لە کارە خراپ و ناباشەکان لە قسە و کرداردا و هانی دەدات بۆ شەرم و حەیا کە سەری هەموو خێرێکە، هەروەها رێگری لێ دەکات لە کاری خراپە و زمان پیسی و چرووکی و درۆ و غەیبەت و دووزمانی.

ئازایەتی(الشجاعة): پاڵی دەنێت بۆ عیززەتی نەفس و هەڵبژاردنی ئەخلاق و رەفتاری بەرز و جوان و بەخشین و سەخاوەت کە بریتییە لە ئازایەتی و رۆزی دەروون لە هاتنە دەرەوە لەو شتەی خۆشیدەوێت، هەروەها هانی دەدات بۆ رقخواردنەوە و حیلم، ئەو

بەهۆی هێزی دەروون و ئازایەتییەوە جڵەوی نەفسی گرتووە و بە لەغاوێكی توند لە سەركێشی و دەستوەشاندن رایگرتووە، وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((كەسی زۆر بەهێز ئەو كەسە نییە زۆرانباز بێت، بەڵكو كەسی بەهێز ئەو كەسەیە لەكاتی تووڕەبووندا خۆی دەگرێت))، ئەوەش بریتییە لە راستێتی ئازایەتی، و مەلەكەیەكە بەندە بەهۆیەوە دەتوانێت نەیارەكەی خۆی ژێردەستە بكات.

**میانەگیری(العدل):** پاڵیدەنێت بۆ میانەگیری لە ئەخلاقیدا و وەستان لە ناوەندی هەردوو بەرەی زیادەڕەوی و كەمڕەویدا، بۆیە هانی دەدات بۆ بەخشندەیی و سەخاوەت كە ناوەندێكە لە نێوان زەلیلی و چرووكیدا، هەروەها هانی دەدات بۆ ئازایەتی كە ناوەندی ترسنۆكی و تیانەوەستاوییە، هەر بەو جۆرە بۆ ئەخلاقی حیلم كە لەنێوان تووڕەبوون و سوكی و رووخانی دەرووندایە.

سەرهەڵدانی هەرچی ئەخلاقی جوانە لەم چوار ئەخلاقەوەیە.

سەرهەڵدانی هەرچی <u>ئەخلاقی نزمە</u> كۆشكوتەلاری لەسەر چوار پایەیە: نەزانی، ستەم، حەز و ئارەزوو، تووڕەبوون.

**نەزانی(الجهل):** جوانی بە ناشیرین پێ نیشان دەدات، و ناشیرینیش بە جوان، كەماڵی بە ناتەواو و ناتەواوی بە كەماڵ پێ نیشان دەدات.

**ستەم(الظلم):** هانی دەدات شتەكان لە شوێنی خۆیان دانەنێت، لە جێگەی رازیبووندا تووڕە دەبێت، لە شوێنی تووڕەبووندا رازی دەبێت، نەفامی لە شوێنی وردبوونەوەدا لێ دەوەشێتەوە، لە شوێنی بەخشیندا چرووكە و لە جێگەی گرتنەوەدا بەخشندەیە، لەو شوێنەی كە دەبێت هێرش بەرێت پاڵدەداتەوە و لەو شوێنەی پێویستە بوەستێت هێرش دەبات، لەو جێگەی پێویستە توند بێت نەرمی نیشان دەدات و لەو شوێنەی پێویستە نەرم بێت توندی رووی تێدەكات، لە شوێنی عیززەتدا تەوازوع دەنوێنێ و لە شوێنی تەوازوعدا لوتبەرزی نیشان دەدات.

**ئارەزوو(الشهوة):** هانی دەدات بۆ هەڵپە و دەستنوقاوی و چرووكی، هەروەها نەبوونی عیففەت و چڵێسی ورگ و داوێن و چاوچنۆكی و بەرچاوتەنگی و زەلیلی و نەفسنزمی.

**تووڕەبوون(الغضب):** هەنای دەدات بۆ لوتبەرزی و كینەلەدڵی و حەسوودی و دوژمنكاری و بێئەقڵی و نەزانی.

لەنێوان هەر دوو دانە لەم ئەخلاقانەدا کۆمەڵێك ئەخلاقی ناشیرین و ناباشی تر دروست دەبن.

**بنچینەی ئەم چوار ئەخلاقە دوو شتە:** زیادەڕەوی نەفس لە لاوازیدا و زیادەڕەوی نەفس لە هێزدا، لە زیادەڕەوی نەفس لە لاوازیدا ئەم سیفەتانە لەدایك دەبن: سوکی و چروکی و نەفسنزمی و دەغەڵی و بەدکاری و زەلیلی و هەڵپەکردن و دەستنوقاوی و کار و ئەخلاقی نزم و بێبایەخ.

**لە زیادەڕەوی لە هێزدا ئەم سیفەتانە لەدایك دەبن:** ستەم و تووڕەبوون و توندوتیژی و خراپەکاری و زمان پیسی و پەلامار و پیاداکێشان.

ئەخلاقە ناپەسەندەکان هەندێکیان دەبن بە سەرچاوە بۆ لەدایکبوونی هەندێکی تریان، وەك چۆن ئەخلاقە پەسەندەکان هەندێکیان دەبن بە سەرچاوە بۆ هەندێکی تریان.

هەر ئەخلاقێکی پەسەند بە دوو ئەخلاقی ناپەسەند دەورەدراوە، ئەو لە ناوەندی ئەو دوانەدایە، و دوو لایەکەی بریتییە لە دوو ئەخلاقی ناپەسەند، وەك بەخشندەیی کە لە دوو لایەکەیدا چرووکی و دەستنوقاوی(البخل) و دەستپژاوی(التبذیر) هەیە، هەروەها سیفەتی تەوازوع (التواضع) کە لە دوو بەرەکەیدا لوتبەرزی و خۆ بەزلزانین(الکبر والعلو) و زەلیلی و سوکی(الذل والمهانة) بوونی هەیە.

هەر کات نەفسی مرۆڤ لە میانەگیری و ناوەندگیری لایدا دەکەوێت بەلای یەکێك لەو دوو سیفەتە ناپەسەندەدا، گەر لە ئەخلاقی تەوازوع لایدا یان دەکەوێت بەلای لوتبەرزی و خۆبەزلزانیندا یان دەکەوێت بە لای زەلیلی و سووکیدا، هەر بەو جۆرە گەر لە ئەخلاقی حەیا لایدا یان دەکەوێت بەلای بێشەرمیدا یان بەلای شەرمنیدا بەجۆرێك دوژمن تەماعی تێدەکات و زۆرێك لە بەرژەوەندییەکانی لەدەست دەچن.

هەر بەو جۆرە کاتێك لە ئارامگرتنێکی پەسەند لادەدات یان دەکەوێت بەلای بێزاری و وەڕسی و نیگەرانی و پەرتبووندا، یان دەکەوێت بەلای توندوتیژی و دڵڕەقی و بە بەردبوونی سروشتی مرۆییدا.

کاتێك لە ئەخلاقی حیلم لادەدات یان دەکەوێت بەلای پیاداکێشان و پەلامار و تێکشکاندن و توندوتیژیدا یان بەلای زەلیلی و سووکی و رسواییدا، جیاوازی زۆرە لەنێوان کەسێك حیلمەکەی سووکی و زەلیلییە لەگەڵ کەسێك حیلمەکەی توانین و عیززەت و شەرەفە، وەك وتراوە:

كل حلم أتى بغير اقتدار حجة لاجيء إليها اللئام

(هەر حیلمێك توانا و دەسەلاتی لەگەڵ نەبوو، تەنها بەڵگەیەكە خەڵكی بەدكار و رسوا پەنای بۆ دەبەن)

گەر لە ئەخلاقی لەسەرخۆیی و نەرمونیانی لایدا: یان لادەدا بەلای پەلەكردن و توندی و سەرشێتی یان بەلای كەمڕەوی و تیابردندا، نەرمونیانی و لەسەرخۆیی لەنێوان ئەو دوو بەرەدایە.

گەر لە ئەخلاقی عیززەت و سەربەرزی لایدا كە خودا بە باوەڕدارانی بەخشیوە، یان لادەدات بەلای لوتبەرزیدا یان بەلای زەلیلیدا، عیززەتی پەسەندیش لەنێوانیاندایە.

گەر لە ئازایەتی لایدا یان بەلای تیانەوەستاوی و پەلاماردا لادەدات یان بەلای ترسنۆكی و دواكەوتندا.

گەر لە ئەخلاقی پێشبڕكێ و بەدەست هێنانی ئاستی بەرز لایدا و كشایەوە یان لادەدات بەلای حەسادەتدا یان بەلای سووكی و رسوای و دەستەوسانی و زەلیلی و رازیبوون بە ئاستی نزمدا.

گەر لە قەناعەت لایدا یان دەكەوێت بە دیوی هەڵپە و پەلامار یان سووكی و زەلیلیدا.

گەر لە ئەخلاقی بەزەیی لایدا لادەدات بەلای: یان لاوازی دڵ و ترسنۆكی نەفس وەك ئەو كەسەی ناتوانێن بەرخێك سەرببڕێت، یان حوكمی حەد بەسەر كەسێكدا جێبەجێ بكات یان ئەدەبی منداڵەكەی دابدات، وا بانگەشە دەكات بەزەیی وای لێدەكات نەتوانێت ئەو كارانە ئەنجام بدات، بە بەزەییترین خەلقی خودا كە پێغەمبەری خودایە(ﷺ) لە یەك شوێندا شەست و سێ وشتری سەربڕی، دەستی پیاو و ژنی لەسەر دزی بڕیوە، گەردنی پەڕاندووە، حوكمی خودای جێبەجێ كردووە، بە بەرد رەجمی كەسێكیان كرد هەتا مرد، لەگەڵ ئەوەشدا بە بەزەییترین و دڵنەرمترین خەلقی خودا بوو.

هەر بەو جۆرە ڕووخۆشی و كراوەیی: ناوەندە لەنێوان روگرژی و ناوچاوتاڵی و روو وەرچەرخان لە خەڵكی، و لەگەڵ كرانەوە و ڕووخۆشی لەگەڵ هەموو كەسێكدا بەجۆرێك حورمەت و ویقار لەدەست بدات، وەك چۆن لادانی یەكەم نامۆبوون و بوغز و دووركەوتنەوەی خەڵك لەو كەسە دروست دەكات، هەر بەو جۆرە ئەمەی دووەمیان سنووربەزێنی و بێرێزی و تەماع تێكردن دروست دەكات.

خـاوەنی ئـەخلاقی میانـەگیر: ڕێـزدار و خۆشەویسـتە، لانـەی عیززەتـە و بینـینی خۆشەویستە، لە سیفەتی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتووە ((هەر کەس یەکەم جار دەیبینێت سام دایدەگرێت، و هەر کەس پێی تێکەڵ بوو خۆشیدەوێت)) خودا زاناترە.

## ✿ پایەبەرزی زاڵبوون بەسەر خۆدا

بزانە گرانترین شت لەسەر سروشتی مرۆیی بریتییە لـە گـۆڕینی ئـەخلاقێك کـە نـەفس دەقی پێوەگرتبێت و لەسەری بارهاتبێت، خاوەن وەرزشە دەروونییەکان و تێکۆشانە سەختەکان کاریان لەسەر ئەم گۆڕینەیە، زۆربەی هەرە زۆریان لە گۆڕینی ئـەو نەفسـە سەرکەوتوو نەبوون، لە جێگەی سەرقاڵ بوون بە دەسـەڵاتی دەرکەوتـەی دەروونـەوە نەفس خەریك و سەرقاڵ بوو بە وەرزشەوە، کاتێك دەسەڵاتی ئەو ئەخلاقە ناپەسەندە دێت و دەردەکەوێت سوپای وەرزش تێکدەشـکێنێت و پـەرتوبڵاوی دەکـات و دەسـت بەسەر مەملەکەتی سروشتی مرۆڤدا دەگرێت.

لێرەدا بەشـێك بـاس دەکـەین کـە سـالیك بەهۆیـەوە بگاتـە مـەنزڵ بـە بـوونی ئـەو ئەخلاقەش لەگەڵی (واتە بوونی ئەخلاقە ناباشەکە لەگەڵی)، بۆیە ئاتاج بـە چارەسـەر و سڕینەوەی ئەو ئەخلاقـە ناکـات، ئـەو کاتـە ڕۆیشـتنەکەی بـۆ لای خـودا بـەهێزتر و خێراتر دەبێت لـە ڕۆیشـتنی ئـەو کەسـەی کـار بـۆ سـڕینەوە و ریشـەکەند کردنـی ئـەو ئەخلاقە دەکات.

بەر لەوە نموونەیەك دەهێنینـەوە کـە پڕاوپـڕ بێـت لەگـەڵ ئـەوەی ئێمـە دەمانـەوێت: ئەوەش ڕووبارێکی جارییووە لە هەڵقوڵان و پێچاوپێچـەکانی و کۆتاییەکـەی کـە نـوقم کردنی زەوی و ئاوەدانی و دەوروبەرە، خەڵکی دەزانن ئەم ڕووبارە کۆتایی نایـەت تـا ماڵ و خانووەکانیان وێران نەکات و زەوی و ماڵ و سامانیان نـەکات بـەژێرەوە، بۆیـە دابەشبوون بۆ سێ دەستە:

دەستەیەك سەرقاڵبوون بـە بەنـداوکردن و وەسـتاندنی ڕووبارەکـەوە، ئـەم دەسـتەیە کارێکی گەورەیان ئەنجام نەدا، کە ئاوەکە کۆکرایـەوە و پـەنگی خـواردەوە لـە ناکـاو تەقی و زیان و زەرەری لە یەکەمجار زۆرتر بوو.

دەستەیەکیان ئەم کارەی دەسـتەی یەکـەمیان بـینی و زانیـان هـیچ سـوودێکی نییـە، بۆیە وتیان: بۆ ڕزگـاربوون لـە زیـانی ئـەم ڕووبـارە دەبێـت لـە چـاوگەکەیەوە وشـکی

بکەین، هەوڵیاندا لە چاوگەکەوە وشکی بکەن، بەڵام نەیانتوانی و سروشتی رووبار رێگەی نەدا بەو کارەیان، ئەوان هەر خەریکی بڕینی سەرچاوەکە بوون، بەڵام چەندیان لادەدا ئەوەندەی تر دەهاتەوە جێگەی، کە کونێکیان لێ دەگرت لە کونێکی ترەوە هەڵدەقوڵی، بۆیە ئەمانە بەهۆی سەرقاڵبوونیانەوە بە رووبارەکەوە لە کشتوکاڵ و ئاوەدانی و درەخت چاندن دواکەوتن.

دەستەی سێیەم هات و رێگەی پێچەوانەی دوو دەستەکەی تری گرتە بەر، زانیان ئەم رووبارە بەم جۆرە زۆرێك لە بەرژەوەندییەکانیان دەخاتە بەر مەترسی و لەدەستیان دەدات، بۆیە دەستیان کرد بە لادانی مەجرای رووبارەکە بە جۆرێك لە خزمەتی ئاوەدانیدا بێت، ئاراستەیان کرد بۆ شوێنێك سوود لە هاتنی ببینن، و زیانیان پێ نەگەیەنێت، بۆیە لایاندا بۆ زەوییەك بەکاری کشتوکاڵ بێت و رووبارەکە ئاوی بدات، سەرئەنجام چەندین جۆر لە رووەك و گژوگیا و لەوەڕگا و بەروبوومی هەمەرەنگ سەریانهەڵدا، ئەم دەستەیە راسترین دەستەبوون دەربارەی کاروباری ئەم رووبارە.

کە ئەم نموونەت بۆ روون بوویەوە، حیکمەتی خودای موتەعال وا داوا دەکات: کە مرۆڤ-و گیاندارانی تریش- لەسەر سروشتێك باربهێنێت کە دوو هێزی تێدایە: هێزی تووڕەیی و هێزی شەهوانی ئەم دووانەش لەژێر "ویست"دایە.

ئەم دوو هێزە هەرچی ئەخلاق و سیفاتی نەفسە لەخۆ دەگرن، ئەو دوو سیفەتە بە سروشت و هەویری هەرچی گیانداردایە ریشەی داکوتیوە، بەهێزی شەهوەت و ویست: سوود و قازانجەکان بۆ لای خۆی رادەکێشێت، بە هێزی تووڕەبوون و ویست: زەرەر و زیانەکان لەخۆی دووردەخاتەوە، گەر شەهوەتی بەکارهێنا بۆ داوای ئەوەی پێویستییەتی: هەڵپە و پەلاماری لێوە پەیدا دەبێت، گەر تووڕەبوونیشی بەکارهێنا بۆ لادانی زەرەر و زیان لەخۆی: ئەوا هێز و غیرەتی لێوە سەرهەڵدەدات، گەر لە لادانی ئەو زیانە دەستەوسان بوو: هێزی رق و کینەی لەلا دروست دەبێت، گەر دەستەوسان بوو لە گەیشتنە ئەوەی پێویستییەتی و بینی غەیری ئەو دەستی بەسەردا گرتووە حەسەدی لەلا دروست دەبێت، خۆ گەر بەدەستی هێنا شەهوەتی زۆرتر و ویستی زۆرتری لەلا گەڵاڵە دەبێت: ئەم دووانەش لە رێگەی خۆیانەوە دەستنوقاوی و چرووکی دروست دەکەن، کە هەڵپە و شەهوەی بۆ شتێك زیادی کرد و نەیتوانی بەدەستی

بهێنێت بەهێزی تووڕەبوون نەبێت ئەوا تیایدا بەکاردەهێنێت: ئەوەش دوژمنایەتی و دەستدرێژی و ستەمی لێوە پەیدا دەبێت، لەوانەشەوە: لوتبەرزی و فەخر و لەخۆباییبوون سەرهەڵدەدەن، هەموو ئەوانە کۆمەڵە ئەخلاقێکن کە لە نێوان هێزی شەهوەت و هێزی تووڕەبووندا پەیدادەبن.

کە ئەمەت بۆ دەرکەوت: رووبارەکە نموونەی ئەو دوو هێزەیە، لە جۆگەلەکانی سروشتەوە دەچۆڕێنە ناو دڵ و ئاوەدانیەکانی، وێرانی دەکەن و تێکوپێکی دەدەن، نەفسی نەفام و ستەمکار لەخۆ واز لە رووبارەکە دەهێنن و لێیدەگەڕێن بە مەجرای خۆیدا جاری ببێت، بۆیە مەملەکەتی ئیمان و قەڵای شوێنەوارەکانی وێران دەکات و ئاوەدانییەکانی هەڵدەگێڕێتەوە و لە جێگەیدا درەختی پیس و بێبەر و زیانبەخش دەڕوێنێت، لە گوژاڵکە و وشترخۆرە و زەقوم و دڕکەزی، ئەوەش ئەو رووەکانەن لە رۆژی دوایدا ئەهلی ئاگر نۆشی دەکەن.

بەڵام نەفسی پاك و پاکژکراو: دەبینێت ئەم رووبارە چ کارەساتێك بەدوای خۆیدا دەهێنێت، بۆیە بوون بە سێ دەستەوە:

خاوەن وەرزشە دەروونییەکان و خاوەن هەوڵ و تێکۆشانەکان و خاوەن خەڵوە و راهێنانەکان: ویستیان لە چاوگەکەیەوە وشکی بکەن، بەڵام حیکمەتی خودای موتەعال ئەوەی نەویست و نەیانتوانی، هەروەها ئەوەی لەسەر سروشتی مرۆڤ هەڵکۆڵراوە و نەقش بووە نەیویست ئەوان بگەنە هیچ سەرئەنجامێك لە ریشەکەندکردن وسڕینەوەی، سروشتی مرۆیی ملی نەدا، جەنگەکە گەرم بوو و شەڕەکە درێژەی خایاند و کڵپەی سەند، جەنگ لە نێوانیاندا بە نۆرە بوو، رۆژێك ئەم لا سەردەکەوت و رۆژێك ئەو لا، ئەم دەستەیە هەموو هێزی خۆیان تەرخان کرد بۆ تێکۆشان لەگەڵ نەفس و سڕینەوەی ئەو سیفاتانە.

دەستەیەك پشتیان لەم دەستەیە کرد و خۆیان بە کار کردنەوە سەرقاڵ کرد، وەڵامی ئەو سیفەتانەیان نەدایەوە و لە مەجرای خۆی خاڵییان کردەوە، نەیانتوانی رووبارەکە وا لێ بکەن ئاوەدانییەکان وێران نەکات، تەنها سەرقاڵی چاککردنی ماڵ و خانووبەرەکانیان بوون، بە بینا و بناغەی تۆندوتۆڵ، وایان بینی ئەو رووبارە هەر دەگاتە خانووەکانیان، بەڵام گەر بگاتە بینایەکی بەرز و دامەزراو ناتوانێت بیڕوخێنێت، بەڵکو بەلای چەپ و راستدا خۆی لێ لادەدا، بۆیە ئەوانە هێزی ویست و

لێبڕان و سووربوونیان لە بینا و ئاوادانکردنەوە و دامەزرانی توندوتۆڵدا بەخت کرد، ئەوانی تریش تواناکانیان لە بڕینی سیفەتی خراپ و ناپەسەندا بەخت کرد نەبادا بینای باوەڕیان بڕوخێنێت.

لە چەندین شێخی ئەم ڕێگەیە پرسیاری ئەم بابەتەم کرد؟ پێیان وتم: نموونەی ئافەتەکانی نەفس وەك مار و دووپشك وان کە دێنە سەر ڕێگای موسافیر، گەر کەسەکە ڕوویکاتە پشکنینی ڕێگە بۆ دۆزینەوەیان(بۆ دۆزینەوەی ئەو مار و دووپشکانە کە بریتین لە سیفەتە ناباشەکان) ئەوا لە ڕێگە دادەبڕێت و ناتوانێت سەفەرەکەی تەواو بکات، بەڵام با هیممەتی تۆ تەنها ڕۆیشتن بێت و پشت لەو کارانە هەڵبکە، و لا بەلایاندا مەکەرەوە، گەر یەکێك لەوانە هاتە سەر ڕێگەکەت بیکوژە و پاشان دەست بە سەفەرەکەت بکەرەوە.

گەر ئەمەت بۆ ڕۆشنبوویەوە، ئەمە دەستەی سێیەمە: وادەبینن ئەو سیفەتانە هەروا و بێ حیکمەت دروست نەکراون، ئەوانە وەك ئاوێك وان کە گوڵ و درك و داری بەری و بێبەریشی پێ ئاو دەدرێت، ئەوانە نیهێنی و گەوهەری مەزن لە پشتیانەوەیە، ئەوەی ئەوان لێی دەترسان خودی سەرفرازی و سەرکەوتن بووە، بینییان سیفەتی تووڕەبوون ڕووبارێکە لوتبەرزی و خۆبەزلزانین و خۆبالاکردن و فەخر و لەخۆدەرچوون و ستەم و دوژمنکاری بەرهەم دەهێنێت، هەر بەو جۆرە هیممەتی بەرز و غیرەت و پیاوەتی و جوامێری و ئازایەتی و دوژمن بەزاندن و ژێر دەستکردنیان بەرهەم دەهێنێت، ئەمەش مرواریيەکە لە قاوغەکەیدا، بۆیە مەجرای ئەو سیفەتانەیان بەرەو ئەم چاندنانە لادا و ئەو مرواریيەیان لە قاوغەکەی پێ دەرهێنا، وەك خۆی لە ناخیاندا هێڵایانەوە، بەڵام بەکاریان هێنا بەجۆرێك بەکارهێنانەکەی سوود بگەیەنێت، پێغەمبەر(ﷺ) "أبا دجانة"ی بینی لەنێوان دوو ڕیزی سوپادا لەنجە و لاری دەکرد، فەرمووی: ((ئەوە ڕۆیشتنێکە خودا ڕقی لێیەتی، جگە لەم شوێنە))

سەرنج بدە چۆن مەجرای ڕووبارەکە لەم سیفەتە خاڵیکرایەوە، و ئەو ئەخلاقە بە باشترین مەجرای خۆیدا گوزەری کرد؟

لە فەرموودەیەکی تری -مەسنەدی ئیمام ئەحمەددا- پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((هەندێ لارولەنجە هەیە خودا خۆشی دەوێت، هەیانە خودا ڕقی لێیەتی، ئەوەی خودا خۆشی دەوێت لارو لەنجەی پیاوێك لە جەنگدا، هەروەها کاتی صەدەقە و خێرکردن))

سەرنج بدە چۆن سیفەتێکی ناپەسەند بوو بە بەندایەتی؟ هەروەها ببینە چۆن ئەو کەسەی دەیویست سیفەتەکە بسڕێتەوە و لە ریشەی بهێنێت لە رێگە دابڕا؟

خاوەنی وەرزشی دەروونی و کارکەر بە رێگەی وەرزش و تێکۆشان و خەڵوەنشینی: زۆر دوورن لە گەیشتن، بەڵکو ئەو کارەیان تووشی نەخۆشی و تەمومژ و گومڕاییان دەکات، پاککردنەوەی دڵ و دەروون بە پێغەمبەران سپێرراوە، خودای موتەعال بۆ ئەو پاککردنەوەیە ئەوانی رەوانە کردووە و کاری داوەتە دەستیان، بانگەواز و فێرکردن و بەیان و رێنومایی لەسەر دەستیان راگەیاندووە، ئەوان نێرراون بۆ چارەسەری دەروونی گەلان، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢﴾ ﴾ الجمعة: ٢، هەروەها دەفەرموێت ﴿ كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُواْ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ ﴿١٥١﴾ فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ وَٱشْكُرُواْ لِى وَلَا تَكْفُرُونِ ﴿١٥٢﴾ ﴾ البقرة: ١٥١ — ١٥٢.

پاککردنەوەی دەروون: زۆر گرانترە لە چارەسەری جەستە، هەر کەس بە وەرزش و تێکۆشان و خەڵوەنشینی نەفسی خۆی خاوێن کردەوە کە پێغەمبەران نەیانهێناوە و رایاننەگەیاندووە: ئەو کەسە وەك ئەو نەخۆشە وایە بە بۆچوونی خۆی خۆی چارەسەر دەکات، بۆچوونی نەخۆش لە کوێ و بۆچوونی پزیشك لە کوێ؟ پێغەمبەران پزیشکی دڵانن، تەنها لە رێگەی ئەوانەوە و لەسەر دەستی ئەوان و فەرمانبەرداری بۆ ئەوان و خۆڕادەست کردن پاکبوونەوەی نەفس و چاککردنی بەدەست دێت. خودا پەنا و کۆمەکە.

## ۞ هەر کەس بەپێی توانای خۆی

بنچینەی ئەخلاق: ئەوەیە کە مەقام و پلە و پایەی ئەخلاق بزانیت، تێبگەیت مرۆڤ وابەستەی قەدەرەکانیان و لە سنووری تواناکانیاندا بەندن وەستاوی سەر حوکمەکانن، بەم مەعریفەیە سێ شت بەدەست دەهێنێت: خەڵکی لەدەستت سەلامەت دەبن و خەڵکی خۆشیان دەوێت و بە تۆوە خەڵکی رزگاری دەبێت.

بۆیە بەم پلەیە: لە مامەڵەکردنی لەگەڵ خەڵکیدا رەوشتی جوان دەبێت و دەزانێت چۆن هاوەڵیان دەکات، تۆ گەر مەقامی ئەخلاق و ئەندازەی ئەخلاقت ناسی و لە جاریبوونی حوکمەکانی قەدەر بەسەریاندا گەیشتیت و حاڵی بوویت ئەوان بە قەدەرەکانیانەوە بەستراونەتەوە، و ناتوانن لێی دەربچن، و لەناو وزە و تواناياندا بەند کراون کە ناتوانن بگوێزنەوە بۆ دۆخێکی تر، هەروەها حاڵی بوویت لەوەی مرۆڤ بەندکراوە لەسەر حوکمە گەردوونییە قەدەرییەکان و لێی لانادەن، بەم مەعریفەیە سوود لە سێ شت دەبینێت:

پارێزگاری خەڵکی لە تۆ: ئەمەش: گەر بە چاوی حەقیقەت سەرنجیان بدات داوای شتێکیان لێ ناکات کە لە تواناياندا نییە، ئەو فەرمانەی خودا کە پێغەمبەری فەرموو بەسەریاندا جێبەجێ دەکات کە بریتییە لە وەرگرتنی عەفو لێیان"أخذ العفو منهم"، بەو جۆرە سەلامەت دەبن لە داوالێکردن و پابەندکردنێك کە لە هێز و توانا و دەسەڵاتیان بەدەرە.

هەروەها لە لۆمەکردنی تۆ بۆ ئەوان سەلامەت دەبن: چونکە لەو بارەدا پاساو و بیانوویان بۆ دەهێنێتەوە بەو حوکمانەی بەسەریاندا گوزەر دەکات کە شەرع داوای جێبەجێ کردنیانی نەکردووە لە ناویاندا، چونکە گەر ئەوان لەناو توانای خۆیاندا بەندکرابن پێویستە ئەو داوایان لێ بکەین کە لە بەندکراوێك دەکرێت، و ئەو پاساوەیان بۆ بهێنینەوە کە بۆ بەندکراوێك دەیهێنینەوە، گەر لە حەقی تۆدا کەمتەرخەمییەك، خراپەیەك یاخود کەمرەوییەکیان لێوەشایەوە نایدەی لە روویان و نەیارییان ناکەی، بەڵکو لێیان خۆش دەبیت و بیانوویان بۆ دەهێنیتەوە، بەهۆی جاریبوونی حوکمی قەدەرەوە بەسەریاندا، وایان دەبینی ئەوان تەنها ئامێرێك بن لەدەست قەدەردا، لێرەدا فەنابوون لە بینینی خراپەکانیان بەرانبەرت بە بینینی حەقیقەت قازانجت پێ دەگەیەنێت، وەك ئەو عاریفەی پیاوێك دەستدرێژی کردە سەری و ستەمی لێ کرد، پێی فەرموو: گەر تۆ ستەمکار بیت ئەوا ئەو کەسەی تۆی زاڵ کرد بەسەرمدا ستەمکار نییە.

لێرەدا یازدە دیمەن لە دیمەنی ئازار و خراپەی خەڵك بۆ سەر بەندەی خودا دەخەینە روو:

## ۞ میحنەتی بانگکەران سوننەتێکی گەردوونییە و خودا بڕیاری لەسەر داوە

**یەکەم:** ئەمەیە کە بریتییە لە دیمەنی "قەدەر"، ئەوەی بەسەریدا گوزەری کردووە بە ویستی خودا و بڕیار و قەدەری بووە، ئەو ڕووداوە هەروەك ئازارخواردن بە گەرما و سەرما و نەخۆشی و ئێش و هەڵکردنی با و نەبارینی باران تەماشا دەکات، هەر هەموو ئەمانە ویست و بڕیاری خودا هێناونییە ئاراوە، ئەوەی خودا ویستی کردبێت دەبێت و بوونی واجب دەبێت، ئەوەش نەیەوێت نابێت و بوون پەیدا ناکات، گەر ئەم دیمەنەی بینی: ئاسوودە و ئارام دەبێت، دەزانێت دەبوا ئەو ڕووداوە هەر ببوایە، بۆیە نیگەرانی و پەشێواوی هیچ مانایەکی بۆ نامێنێتەوە، ئەوە وەك نیگەرانی و پەشێواوی وایە لە گەرما و سەرما و نەخۆشی و مردن.

## ۞ لە میحنەتدا ئارامگرتن چێژی تێدایە

**دیمەنی دووەم:** دیمەنی ئارامگرتن، ئارامگرتن و واجبوونی ئارامگرتن و سەرئەنجامی باش و پاداشتی ئارامگرتووان دەبینێت، هەروەها ئەوەی لە ئارامگرتنەوە سەر هەڵدەدات لە دڵخۆشی و سروور، هەر بەو جۆرە ڕزگاری دەکات لە پەشیمانی ڕووبەڕووبوونەوە و تۆڵەسەندنەوە، هیچ کەسێك بۆ نەفسی خۆی تۆڵەی نەسەندووە پەشیمان نەبووبێتەوە، زانراوە ئەوەی بە ویست و هەڵبژاردنی خۆی لەسەر شتی بچووك-کە پەسەندە- ئارام نەگرێت ئەوا بە ناچاری لەسەر شتی گەورەتر ئارام دەگرێت کە ئارام گرتنەکەی لەسەری لەو بارەدا کارێکی ناپەسەندە.

## ۞ عیززەتی لێبوردن

**دیمەنی سێیەم:** دیمەنی لێبوردن و چاوڵێخشاندن و حیلم: هەر کات ئەوانە و فەزڵ و شیرینی و عیززەتی ئەوانەی بینی: ناتوانێت لێیان لابدات مەگەر شتێك کەوتبێتە ناو چاوانییەوە، چونکە ((خودا بۆ بەندەیەك کە لێدەبووڕێت عیززەت زیاد دەکات)) وەك لە فەرموودەی سەحیحدا لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ڕیوات کراوە، بە ئەزموون و واقیعیش سەلمێنراوە، و هەر کەس بۆ نەفسی خۆی تۆڵەی سەندبێت زەلیل بووە.

ئەمە لە لێبووردن و حیلم و چاولێخشاندا: شیرینی و ئارامی و دڵنیایی و سوكنایی و عیززەت و باڵابوونێك بوونی هەیە كە حەق نییە بە شیفای تۆڵەسەندنەوە لەبار ببرێن، ئەو ئاماژە بۆكراوانە لە رووبەڕووبوونەوە و تۆڵەسەندنەوەدا بەدەست ناهێنرێن.

### ۞ رازی دەبین بۆ ئەوەی رازی بێت

دیمەنی چوارەم: بریتییە لە رازیبوون، كە لەسەرو دیمەنی لێبوردن و لێخۆشبوونەوەیە، ئەمەیان تەنها بۆ ئەو دەروونانەیە كە ئارامیان گرتووە، بە تایبەت گەر بە هۆی كارێك كە بۆ خودا پێی هەستاوە رووبەڕووی ئەو میحنەتە بوویەوە، گەر ئەوەی تووشی بوو لەبەر خودا و رازی كردن و خۆشەویستی ئەو بوو: لەبەر خودا رازی دەبێت بەوەی كە تووشی هاتووە، ئەمەش حاڵی هەموو خۆشەویستێكی صادقە، رازی دەبێت بەوەی تووشی دەبێت لە ناخۆشی لەبەر رەزامەندی خۆشەویستەكەی، هەر كات سكاڵای كرد و لێی بێزار و تووڕە بوو ئەوە نیشانەی درۆزنی ئەوە لە بانگەشەی خۆشەویستیدا.

### ۞ چاكە دەكەین لەگەڵ كەسێك كە خراپە دەكات

دیمەنی پێنجەم: دیمەنی ئیحسانە، لە هەموو ئەوانەی پێشتر باڵاتر و بەرزترە، ئەوەش ئەوەیە خراپەی خراپەكار بە چاكە بەرپەرچ بدرێتەوە، هەر كات ئەو خراپەیە دەكات ئەم چاكەیەكی لەگەڵ ئەنجام دەدات، ئەوەی وا دەكات بتوانێت ئەو كارە بكات زانستێتی بەوەی ئەو قازانجی كردووە و كەسی دەستدرێژكار چاكەكانی خۆی بە هەدیە بۆ رەوانە دەكات و خراپە لە دەفتەری گوناهەكانیدا دەسڕێتەوە، و لە لاپەڕەی ئەو كەسەی خراپەی لەگەڵ دەكات تۆمار دەكرێن، بۆیە دەبێ شوكری ئەو كەسە بكەیت و چاكەی لەگەڵ بكەیت كە چاكەكەی تۆ بەرانبەر ئەوەی بە تۆی بەخشیوە بەراورد پێناكرێت.

لێرەدا ئامادەكردنی داوای پاداشت سوودی زۆری دەبێت، ئەو داماوە چاكەی خۆی بۆ رەوانە كردووی، گەر تۆش كەسێكی بەخشندەی پاداشتی بدەرەوە لەسەری، بۆ ئەوەی بەخششەكە جێگیر ببێت و كەسی خاوەن بەخشش لە تۆوە ئاسایش و ئارامی پێ بگات.

لەم دەروازەیەدا بەسەرهاتی زۆر هەیە دەربارەی ئەهلی بەخشندەیی و ئەهلی لێبڕان.

ئەوەی دیسان لەسەرت خراپەکە ئاسان دەکات: زانستە بەوەی پاداشت لە جۆری کارەکەیە، گەر ئەمە بەشت بێت لە خراپەی خەڵکی لەگەڵ تۆدا ئەوا لێیان دەبووری و چاکەیان لەگەڵ دەکەیت، لەگەڵ پێویستی و لاوازی و هەژاری و زەلیلیتدا بۆ خودا، هەر بەو جۆرە خودای"القادر، العزیز، الغنی، المحسن" لەگەڵ خراپەکانی تۆدا مامەڵە دەکات، تۆ چۆن لەگەڵ خراپەی بەندەیەکدا رووبەڕووبوویەوە خوداش هەر بەو جۆرە مامەڵەی تۆ دەکات، ئەمە هەر دەبێت وابێت.

## ❁ نیازی تۆڵەسەندنەوە دڵ وێران دەکات

**دیمەنی شەشەم:** دیمەنی سەلامەتی و فێنکی دڵ و دەروونە، ئەمە دیمەنێکی زۆر بەرز و بڵندە بۆ کەسێك بیزانێت و بیناسێت، و چێژی شیرینییەکەی کردبێت، ئەوەش ئەوەیە دڵ و پەنهانی خەریك نەبێت بەوەی تووشی هاتووە لە ئازار و داوای گەیشتن بە تۆڵەسەندنەوە و شیفادانی سینە و دەروون، بەڵکو دڵی لە هەموو ئەوانە خاڵی دەکاتەوە، وادەبینێت کە سەلامەتی و فێنکی و خاڵیبوونی لە رق و تۆڵە قازانجی زۆرتر و بەتامتر و باشتری تێدایە و یارمەتیدەرە لەسەر بەرژەوەندییەکانی، خەریکبوونی دڵ بە شتێکەوە لەدەستی چووبێت و خەریکنەبوون بەوەی زۆر لەوە گرنگتر و چاکترە نیشانەی زیانۆمەندییە و کەسی کامڵ و رەشید بەو کارە رازی نابێت، و وادەبینێت ئەو کارە هەڵسوکەوتی کەسی گێل و نەزان بێت، سەلامەتی دڵ لە کوێ و پڕبوونی بە رق و کینە و وەسوەسە و بیر لە تۆڵەسەندنەوە لە کوێ؟

## ❁ لێبووردن نەفام لە پێداگری لەسەر ستەم رادەگرێت

**دیمەنی هەشتەم:** بریتییە لە مەشهەدی ئاسایش: ئەو کە رووبەڕووبوونەوە و تۆڵەی واز لێهێنا سەلامەت دەبێت لە خراپتر لەوە، گەر تۆڵەی کردەوە: ترس دایدەگرێتەوە بەبێ هیچ گومانێك، چونکە ئەو کارەی دوژمنایەتی دەچێنێت، کەسی ژیر دوژمنەکەی ناخاتە ناو ئاسایشەوە، با زۆر بچووکیش بێت، زۆرن ئەو بچووکانەی دوژمنی گەورەیان بەزاندووە! گەر لێی ببووڕێت و تۆڵە نەکاتەوە و رووبەڕووی نەبێتەوە:

سەلامەت دەبێت لە سەرهەڵدانی دوژمنایەتی، یان زیادکردنی دوژمنایەتی، گومانی تێدا نییە لێبووردن و حیلم و لێخۆشبوون هێز و پێزی دوژمنەکەی ناهێڵێت، و لە نیگەرانی و پەرێشانی خۆشی رزگار دەکات، بە پێچەوانەی تۆڵەسەندنەوەوە، واقیع شایەتی ئەم راستییە دەدات.

## ۞ مامەڵەیەکی پڕ لە قازانج......... نرخەکەی: خوێن و شەرەفە

**دیمەنی هەشتەم:** دیمەنی جیهادە: ئەوەش بریتییە لە بینینی ئازاری خەڵکی بۆ ئەو لە کاتی تێکۆشاندا لەپێناوی خودا و فەرمان بە چاکە و رێگری لە خراپە و راوەستان و گەیاندنی ئاین و بەرزکردنەوەی کەلیمەی خودا.

خاوەنی ئەم مەقامە خودا نەفس و ماڵ و عیرزی لێ کڕیوە بە مەزنترین نرخ، گەر دەیەوێت نرخەکە بەدەست بهێنێت با شمەکەکەی رادەست بکات تاکو شایستەی نرخەکە ببێت، هیچ حەقێکی نییە لەسەر ئەو کەسەی ئازاریداوە و هیچ شتێکیشی بۆ نییە لەلای ئەوەوە گەر رازیبووبێت بە گرێبەستی ئەو کڕین و فرۆشتنە، ئەو پاداشتەکەی لەسەر خودایە و لەلای خودایە.

ئەمە بە دەق و کۆدەنگی هاوەڵان -خوایان لێ رازی بێت- ساغبووەتەوە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) رێگری کرد لە کۆچکەرانی دانیشتووی شاری مەککە ئەو خانوو ماڵ و سامانەی بێباوەڕان لێیان داگیرکردبوون بۆیان بگەڕێتەوە، هەروەها خوێنی بڕیار نەدا بۆ ئەوانەی لە پێناوی خودادا بەدەستی بێباوەڕانی مەککە شەهید بووبوون.

کاتێك ئەبوبەکری صدیق -خوا لێی رازی بێت- بڕیاریدا خوێنی ئەوانەی شەهیدبووبوون لە موسڵمانان بکاتە گەردنی ئەهلی پاشگەزبوونەوە لە ئیسلام، عومەری کوڕی خەتتاب -خوا لێی رازی بێت- بە ئامادەبوونی کۆمەڵێك لە هاوەڵان پێی فەرموو ((ئەوە کۆمەڵێك خوێن و ماڵە لەبەر خودا رۆیشتووە، پاداشتەکەی لەسەر خودایە، خوێن بۆ شەهید نییە))، هاوەڵان -خوایان لێ رازی بێت- پاڵپشتی قسەکەی عومەریان کرد و ئەبوبەکری صدیقیش لەسەری رازی بوو.

هەر کەس لەبەر خودا بەکارێك هەستێت و لەو پێناوەدا ئازار درا: خودا تۆڵەسەندنەوەی لەسەر حەرام کردووە، وەك لوقمان بە کوڕەکەی دەفەرموێت

﴿ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٧﴾ ﴾ لقمان: ١٧

## ۞ هەڵوەرینی گوناه بە بەڵا و میحنەت نیعمەتە

**دیمەنی تۆیەم:** دیمەنی نیعمەت ئەمەش لە چەند رووییەکەوە:

**یەکەم:** نیعمەتی خودا ببینێت لەسەر خۆی بەوەی ئەوی کردووە بە ستەملێکراو و چاوەڕوانی کۆمەك و سەرکەوتن لە خوداوە دەکات، نەیکردووە بە ستەمکارێك چاوەڕوانی رق و تۆڵەی خودایی بکات، گەر مرۆڤی هۆشمەند لەنێوان ئەم دوو هەڵبژاردەدا سەرپشك بکرێت-کە هەر دەبێ یەکێکیان بێت- ئەوا ستەملێکراویی هەڵدەبژێرێت.

**دووەم:** نیعمەتی خودا لە هەڵوەرینی گوناهەکانی ببینێت، چونکە هەر باوەڕدارێك تووشی خەم و پەژارە و ئازار ببێت خودا بەوانە گوناهی لێ هەڵدەوەرێنێت، لە راستیدا ئەو ناخۆشییانە دەوایەکن کە دەردی گوناه و خراپەی لێ دەردەکەن، هەر کەس رازی بێت بە خزمەتی خودا بگات بەو گشتە دەرد و نەخۆشییانەوە و لەم دونیایەدا چارەسەریان نەکات بە دەوایەك کە شیفای بۆ بهێنێت ئەوا ئەو کەسە گێل و زیانۆمەندە، ئازاردانی خەڵکی بۆت وەك دەوایەکی تاڵ و بێزراو وایە کە لەلای پزیشکێکی بەبەزەییەوە بۆ تۆ نووسراوە، تەماشای تاڵی و بێزراوی دەواکە مەکە و سەرنج مەدە بەوەی بۆت بەدەستەوە دەگرێت، بەڵکو سەرنجی بەزەیی و میهری پزیشکەکە بدە کە دەواکەی بۆ نووسیویت و بە کەسێکدا بۆت رەوانە دەکات کە لە تاڵی و ناخۆشییەکەی قازانج دەبینی.

**سێیەم:** ئەو بەڵایە ئاسانتر و سووکتر لە بەڵای تر ببینی، چونکە هیچ بەڵا و میحنەیەك نییە بەهێزتر و گەورەتر و تاڵتر لە پشتییەوە نەبێت، گەر لەسەروویەوە میحنەی جەستە و ماڵی تێدا نەبوو با سەرنجی سەلامەتی ئایین و ئیسلام و یەکتاپەرستییەکەی بدات، هەرچی بەڵا و میحنەت هەیە لەخوار بەڵا و میحنەتی ئایینەوە بچووکە، بەڵکو لە حەقیقەتدا نیعمەتن، بەڵای راستەقینە بەڵایە لە ئاییندا.

ئەمە و لە رۆژی دواییدا مرۆڤ زۆر خۆشحاڵ دەبێت بەو مافانەی لە ماڵ و نەفس و حەیا و حورمەت لەلای خەڵکی هەیەتی، کەسی ژیر و هۆشمەند ئەوا دەکات بە

زەخیرەیەك بۆ ڕۆژی هەژاری و نەبوونی، هەموو چاكەكانی بە تۆڵەسەندنەوە پووچ ناكاتەوە كە هیچ سوودێكی پیّ ناگەیەنێت.

## ✿ لەسەر هەمان ڕەوگە....نموونە نوێدەكەینەوە

**دیمەنی دەیەم:** دیمەنی بوون بە قودوە و پێشەنگ كە دیمەنێكی زۆر بەرز و باڵایە، كەسی ژیر و هۆشیار ڕازی دەبێت بەوەی پێشەنگی هەبێت لەوەی پێغەمبەران و دۆستانی خودا و تایبەتانی ئەڵقەی خودایی ئەنجامیانداوە، ئەوان لە هەموو كەس زیاتر بە خەڵكی تاقیكراونەتەوە، ئازاردانی خەڵكی بۆ ئەوان لە لێشاوی لافاو بە سەرەوژێرەدا خێراتر بووە، بەسە خوێندنەوەی چیرۆكی پێغەمبەران لەگەڵ ئوممەتاندا، پێغەمبەری ئێمە و ئازاردانی دوژمنانی بۆی كە هیچ كەس بەر لە ئەو بەو ئەندازەیە ئازار نەدراوە، وەرەقەی كوڕی نەوفەل پێی وت ((بەدرۆدەخرێیتەوە، و دەردەكرێیت و ئازاردەدرێیت))، هەروەها پێی وت ((هەر كەس ئەوەی تۆ هێناوتە هێنابێتی دەستدرێژی كراوەتە سەر))، ئەمە لە میراتگرەكانیدا بەردەوامە وەك لە میراتلێگیراوەكەوە(ﷺ) بۆیان بەجێماوە.

ئایا بەندە ڕازی نابێت بەوەی شوێنی مەزنترین و خێرترین خەلقی خودا بكەوێت؟ بەندە تایبەتەكان یەك لە دوای یەك بۆ یەكتری دەبنە نموونە،

هەر كەس دەیەوێت ئەم ڕاستییەی بۆ دەربكەوێت با لەسەر میحنەی زانایان بوەستێت و تەماشای ئازاری نەفامان بكات بۆیان، بن عبدالبر كتێبێكی لەم بارەیەوە داناوە و ناوی ناوە "محن العلماء"

## ✿ ڕێبواری ڕێگەی خودا دڕكوداڵ ڕایناگرێت

**دیمەنی یازدەیەم:** دیمەنی یەكتاپەرستییە كە مەزنترین و باڵاترینە، كە دڵی پڕ بوو لە خۆشەویستی خودا و ئیخلاص بۆی و مامەڵە لەگەڵی و هەڵبژاردنی ڕەزامەندی ئەو و نزیكبوونەوە لێی و چاوڕۆشنبوونەوە پێی و هۆگربوون لەگەڵی و دڵنیایی بۆ لای، و سوكنایی پێی و تامەزرۆبوون بۆ دیداری و كردن بە تەنها دۆستی خۆ بەجۆرێك هەموو كاروبارەكانی ڕادەست بكەیت و ڕازیبوون بە خودا و بڕیارەكانی و فەنابوون بە

خۆشەویستی و ترس و رجا و یاد و پشتبەستن پێی، گەر ئاوابوو لە دڵیدا هیچ جێگەیەك نامێنێتەوە جێگەی بینینی ئازاری خەڵك بێت، چجای دڵ و بیر و پەنهانی خەریك بکات بۆ گەڕان بەدوای تۆڵەسەندنەوە و رووبەڕووبوونەوە، تۆڵەسەندنەوە تەنها لە دڵێك دەوەشێتەوە کە ئەو شتەی تێدا نییە بێنیازی بکات لەو کارە و باربووی بۆ بکاتەوە، بەڵام کەسێك دڵی بە باڵاترین و پاکترین خۆراك پڕبووبێت لا ناکاتەوە بۆ لای خوارتر لەوانە، ئەوەش فەزڵێکە لە خوداوە دەیبەخشێت بە هەر کەسێك خۆی بیەوێت، ئەو خاوەنی فەزڵی مەزنە.

## ۞ بەدوای داوای لێبوردندا بگەڕێ...... وشوکر بکە

ئەم دیمەنانە کامڵ نابن بە چاککردنی ئەخلاقت نەبێت لەگەڵ خودای موتەعال، بەوەی بزانیت هەرچی لە تۆوە سەرهەڵدەدات پێویستی بە پاساوە و هەرچی لە خوداوە بێت پێویستی بە شوکرە.

ئەم پلەیە لەسەر دوو رێسا دەمەزراوە:

یەکەمیان: بزانیت کە تۆ ناتەواویت، و هەرچی لە ناتەواوە سەرچاوە بگرێت ناتەواوە، ئەمەش بەبێ هیچ گومانێك پێویستی بە داوای لێبوردنە، لەسەر بەندە پێویستە داوای لێبوردن لە خودا بکات بەرانبەر هەموو ئەو کاروکردەوانەی لە خێر و شەڕ لێیدەوەشێتەوە،، داوای لێبوردن بۆ شەڕ ئاشکرایە، بەڵام داوای لێبوردن بۆ کاروکردەوەی خێر: بەهۆی ناتەواوییەکەی و شایستەنەبوونی بە پەروەردگار.

ئەو لە چاکەکانیدا داوای لێبووردن بۆ ناتەواوی ئەو چاکانە دەکات، بۆیە خودای موتەعال مەدحی دۆستەکانی دەکات بەوەی لێی دەترسن لەگەڵ ئیحسان و چاکەکانیاندا، دەفەرموێت ﴿وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوا وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ﴾ المؤمنون: ٦٠، گەر بترسێت ئەوە بە داوای لێبووردن لەپێشترە.

ئەوەی هانی دەدات بۆ ئەو داوای لێبووردنە دوو شتە:

<u>یەکەم:</u> بینینی کەموکورتی و کەمتەرخەمی و ناتەواوی خۆی.

<u>دووەم:</u> صدق لە خۆشەویستیدا بۆ خودا، چونکە کەسی خۆشەویستی صادق لە ئەوپەڕی هەوڵی خۆیدا دەیەوێت لە خۆشەویستەکەی نزیك ببێتەوە.

ئەو داوای لێبووردنی لێدەكات و شەرمی لێدەكات بەو جۆرە كارانەوە رووبەڕووی خودا ببێتەوە، ئەو گەورەیی و مەزنی خودای موتەعال باڵاتر و مەزنتر لە خۆی و هەر شتێكی تر دەبینێت، ئەمە لە خۆشەویستی دروستكراوەكان لەگەڵ یەكتر هەست پێدەكرێت.

**ڕێسای دووەم:** بە مەزن زانینی هەموو ئەوەی لە خوداوە روو لە تۆ دەكات، دان بنێیت بەوەدا كە ئەوە شوكر لەسەرت واجب دەكات، تۆش لەو شوكردنە دەستەوسانیت، ئەمەش تەنها لە خۆشەویستییەكی راستگۆیانەدا ساغدەبێتەوە، كەسی خۆشەویست ئەوەی لە خۆشەویستەكەیەوە بۆی بێت بە زۆری دەزانێت، ئەو سروور و خۆشییەكەی بەوەی یادی كردووە و ئامادەی كردووە پێی ببەخشێت زۆرتر و زیاترە لە سروور و خۆشی بە خودی شتەكە، بەڵكو سرووری بەوەی خودا یادی كردووە خودی شتەكەی لەبیر دەباتەوە.

## ۞ دوو خۆدارنینی یەكتر تەواوكار

خولگەی ئەخلاقی جوان و باش لەگەڵ خودا و لەگەڵ خەڵكدایە، لەگەڵ خەڵكیدا بە دوو وشە-وەك عبدالقادری گەیلانی باسی كردووە-: لەگەڵ حەقدا-سبحانە- ببە بەبێ خەڵك، و لەگەڵ خەڵكدا ببە بەبێ نەفس.

تێڕابمێنە و بیربكەرەوە، چەند ئەم دوو وشەیە جوانن لەگەڵ ئامادەكردنیان لەناو دڵ و بیردا، چەندە پوخت و كۆكەرەوەی ڕێساكانی سلوك و ئەخلاقی جوانن؟! تیاچوونی ئەخلاق لەو شوێنەدایە كە مرۆڤ دەكەوێتە نێوان تۆ و خوداوە، هەروەها نەفس دەكەوێتە نێوان تۆ و خەڵكەوە، هەر كات خەڵكت لادا لە بوونت لەگەڵ خودا و نەفست لادا لە بوونت لەگەڵ خەڵكی ئەوا هەموو ئەوەی ئەهلی ڕێگە ئاماژەی پێ دەكەن و خۆیان بۆ یەكلاكردۆتەوە و بەدەوریدا دەسوڕێنەوە تۆ بەدەستت هێناون، كۆمەك و یارمەتی هەر لە خوداوەیە.

۞ ۞ ۞

# (٣٥) (منزلة التواضع)

## مەنزيلەی تەوازوع

لە مەنزيلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزيلەی تەوازوعە.

خـودای موتـەعال دەفـەرموێت ﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا ﴾ الفرقـان: ٦٣، واتە بە ئارامی و سەكینەت و ویقارەوە بەسـەر زەویـدا گـوزەر دەكـەن، نـەك بـە كەشـوفش و لوتبەرزییـەوە، حەسـەن لەسـەر وشـەی (هونـا) دەفـەرموێت: زانايانـە و حەليمانـە، محـد بـن حەنەفيـە دەفـەرموێت: خـاوەن ويقـار و عيففـەتن و نـەفامييان لێناوەشێتەوە، و گەر بەرانبەريان نەفامی كرا حەليم دەبن.

وشەی "الهون" (پيتی "هاء"ەكە بە فەتحە) لە زماندا: بريتييە لە نەرمونيانی، بەڵام وشـەی "الهون" (بە "ضمة"ی پيتی "هاء") بريتييە لە: رسوايی، بۆيە بە فەتحـە دەبێتـە سـيفەتی ئەهلی باوەڕ و بە "ضمة" دەبێتە سيفەتی بێباوەڕان و سزايان لە خوداوە بە ئاگر.

هەروەها خودای موتـەعال دەفـەرموێت ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ المائـــدة: ٥٤ زەليلـــی لـــە باوەڕدارانەوە بەزەيی و سۆز و شەفەقەت و تەختبوونە بۆيە فەرمانەكەی بـە "علـی" لە تێنەپەڕەوە كرد بە تێپەڕ، چـونكە مەبەسـتی زەليلـی سـوكی و رسـوايی نييـە كـە خاوەنەكەی لە خۆيدا رسـوا و زەليلـە(ذليـل) بـەڵكو زەليلـی نـەرمونيانی و ملبـۆدان و فەرمانبەرداريە كە خاوەنەكەی رامهاتووە(ذلـول)، بۆيـە بـاوەڕدار رامهـاتووە، وەك لـە فەرموودەدا هاتووە ((المؤمن كالجمل الـذلول، والمنـافق والفاسـق ذليـل))-بـاوەڕدار وەك وشتری رامكراو وايە، دووڕووش سوك و رسوايە. چوار جۆر مرۆڤ زۆر بە توندی سـووك و رسوايی عاشقيان دەبێت: درۆزن، و دووزمان، و بەخيل، و ستەمكار.

ئەو بەشەی ئايەتەكە (أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ) بريتييە لە عيززەتی هێـز و رێگـری و زاڵبـوون بەسـەرياندا، عطـاء-خـوا لێـی رازی بێـت- دەفـەرموێت: "للمـؤمنين" وەك بـاوك بـۆ كوڕەكەی، بەڵام "علی الكافرين" وەك دڕندە بۆ سەر نێچيرەكەی، وەك لـە ئايـەتێكی تردا دەفەرموێت ﴿أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ﴾الفتح: ٢٩

لە سەحیحی "مسلم"دا لە فەرموودەكەی "عیاض بن حمار"-خوا لێی رازی بێت- فەرمووی: پێغەمبەری خودا فەرمووی ((خودا وەحی بۆ ناردم كە تەوازوع بنوێنن، تا كەس فەخر بەسەر كەسدا نەكات، و كەس دەستدرێژی بەسەر كەسی تردا نەكات))

هەر لە سەحیحی "مسلم"دا لە ئیبن مەسعوودەوە-خوا لێی رازی بێت- فەرمووی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی ((هەر كەس بە ئەندازەی گەردیلەیەك لوتبەرزی لە دڵیدا بێت ناچێتە بەهەشتەوە))

لە هەردوو سەحیحەكەدا-بەرزكراوەتەوە- ((دەتانەوێت هەواڵتان پێ بدەم دەربارەی ئەهلی ئاگر؟ هەر كەسێكی فرەخۆری زەبەلاحی دەستنوقاوی لوتبەرزن))

لە فەرموودەكەی گفتوگۆی بەهەشت و دۆزەخ ((ئاگر دەڵێت: من چیمە(من بۆچی) تەنها ستەمكاران و لوتبەرزان دێنە ناومەوە؟ بەهەشت دەفەرموێت: چیمە(من بۆچی) تەنها لاوازان لە خەڵكی و كەم دەسەڵاتەكان دێنە ناومەوە؟)) ئەم فەرموودەیە لە سەحیحدایە.

لە سەحیحی "مسلم"دا لە "أبي سعيد وأبي هريرة"ەوە-خوایان لێ رازی بێت- دەڵێن: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((خودا-عزوجل- دەفەرموێت: عیززەت مێزەرمە، كبریاء(واتە شان و شكۆ و مەزنی) پۆشاكمە، هەر كەس لەسەریان ململانێم لەگەڵ بكات سزای دەدەم))

لە "جامع الترمذي"-بەرزكراوەتەوە- لە سەلەمەی كوڕی ئەكوەعەوە-خوا لێی رازی بێت- ((بەردەوام كەسێك ستەم لە نەفسی خۆی دەكات تا لەلای خودا لە دیوانی: ستەمكاراندا دەنوسرێت، و ئەوەی تووشی ستەمكاران هات تووشی ئەویش دەبێت))

پێغەمبەر(ﷺ) بە پاڵ منداڵاندا تێدەپەڕی سەلامی لێ دەكردن.

كەنیزەكێك دەستی پێغەمبەری(ﷺ) دەگرت و دەیبرد بۆ هەر شوێنێك بیویستبایە.

پێغەمبەر(ﷺ) كاتێك نانی دەخوارد سێ پەنجەكەی خۆی دەلێسایەوە.

پێغەمبەر(ﷺ) كە لە ماڵەوە بوایە لە خزمەتی خانەوادەی خۆیدا بوو، و هەرگیز بۆ نەفسی خۆی تۆڵەی نەسەندووە.

پێغەمبەر(ﷺ) نەعلەكەی خۆی چاك دەكردەوە، و جلەكانی خۆی پینە دەكرد، و شیری بۆ خانەوادەكەی دەدۆشی، و ئالفی بە وشتر دەدا و لەگەڵ خزمەتكاردا نانی دەخوارد و لەگەڵ بێنەوایاندا دادەنیشت و لەگەڵ هەتیوباراندا بۆ پێویستییەكانی

دەڕۆیشت و بە هەر كەس بگەیشتبایە پێشەكی سەلامی لیّ دەكرد، بانگهێشی ئەوەی بانگی دەكرد پێخۆش بوو با بۆ بچووكترین شتیش بوویێت.

پێغەمبەر(ﷺ) بێ ئەرك و بێ زەحمەت بوو، ئەخلاقی جوان و نەرمونیان بوو، سروشتی بەخشندە بوو، تێكەڵبوونی بە خەڵكی جوان و بێوێنە بوو، رووخۆش و دەم بە خەندە بوو، كەسێكی متەوازع بوو بەبێ زەلیلی، بەخشندە بوو بەبێ دەستپژاوی، دڵ نەرم و بەبەزەیی بوو بەرانبەر هەموو موسڵمانێك، باڵی بەزەیی بۆ باوەڕداران راخست بوو، بە نەرمی مامەڵەی دەكردن.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((دەتانەوێت هەواڵتان پیّ بدەم بەو كەسەی لەسەر ئاگر حەرام كراوە، یان ئاگری لەسەر حەرام كراوە؟ ئاگر حەرامكراوە لەسەر هەر كەسێكی نزیك لە خەڵكی و لەسەرخۆ و نەرمونیان و سووك و ئاسان)) رواه الترمذي وقال حديث حسن.

هەروەها دەفەرموێت ((گەر بانگهێش بكرێم بۆ دەستێك (دەستی ئاژەڵی سەربڕاو)- یان لاقێك- دەچم بەدەم بانگەكەیەوە، گەر دەستێك-یان لاقێك-م هەدیە بكەن قبووڵی دەكەم))

پێغەمبەر(ﷺ) سەردانی نەخۆشی دەكرد و ئامادەی جەنازە دەبوو و سواری گوێدرێژ دەبوو، وەڵامی بانگی كۆیلەی دەدایەوە، لە رۆژی هێرش بۆ سەر "القريظة"دا پێغەمبەر سواری گوێدرێژێك بوو بوو، بە حەبلێك كورتانە پووشینەكەی لێنرابوو كە لە توێكڵ و لقوپۆپی دارخورما دروست كرابوو.

### ۞ بازنەكانی تەوازوع

پرسیاركرا لە فوزەیلی كوڕی عەیاز دەربارەی تەوازوع؟ فەرمووی: ژێرباری حەق دەبێت وملی بۆ دەدات و قبووڵی دەكات لە هەر كەسێكەوە بیڵێت.

وتراوە: تەوازوع ئەوەیە بەها و نرخێك بۆ نەفسی خۆت دانەنێیت، هەر كەس بەها بۆ نەفسی خۆی دادەنێت ئەوە لە تەوازوع بەشی نەدراوە، ئەمە مەزهەبی فوزەیل و كەسانی ترە دەربارەی تەوازوع.

جونەیدی كوڕی محمد دەفەرموێت: بریتییە لە باڵی بەزەیی، و نەرمونیانی.

ئیبن عەتا دەفـەرموێت: بریتییـە لـە قبـووڵ کردنـی حـەق لـە هـەر کەسـێکەوە بێـت، هەروەها بریتیە لە عیززەت لە تەوازوعدا، هەر کەس بە لوتبەرزی داوای عیززەت بکات وەك ئەوە وایە ئاو لە ئاگر داوا بکات.

ئیبراهیمی کوڕی شەیبان دەفەرموێت: گەورەیی و سەربەرزی لە تەوازوعدایە، عیززەت لە تەقوادایە، ئازادی لە قەناعەتدایە.

عوروەی کوڕی زوبێر-خوا لێیـان رازی بێـت- دەفـەرموێت: عومـەری کـوڕی خـەتتابم بینی گۆزەئاوێکی بە شانەوە بوو، وتم ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوە بۆ تۆ شیاو نییە، فەرمووی: کە وەفدەکان هاتن بـۆ لام -گوێیـان لێگـرتم و بـۆم ملکـەچ بـوون- شـتێك چووە ناو نەفسمەوە، ویستم بەم کارە بیشکێنم))

جارێکیـان ئـەبو هـورەیرە ئـەمارەتێکیان پـێ سـپارد، کۆڵـەداری دەنـا لـە پشـتی و دەیفەرموو: رێگە بۆ ئەمیر بکەنەوە.

حەسەنی کوڕی عەلی-خوایان لێ رازی بێت- بـە پـاڵ کۆمـەڵێك منداڵدا تێپـەڕی کـە نانی وشکیان پێ بوو، دەعوەتیان کرد، دابەزی و لەگەڵیان خواردی، دواتر بردنـی بـۆ ماڵی خـۆی خـواردنی پێدان و پۆشـتەی کردنـەوە، پاشـان فـەرمووی: هێشـتا ئـەوان هەیانە بەسەر مندا، چونکە ئەوان تەنها ئەوەیان شك دەبـرد کـە بـە منیـان بەخشـی، بەڵام ئێمە زۆرتر و زیاتر لەوە شك دەبەین کە بەوانمان بەخشیوە.

دەڵـێن ئـەبو زەڕ تانـەی لـە بـیلال دا-خـوا لـە هـەردووکیان رازی بێـت- بـەهۆی رەشپێسـتییەکەیەوە، پاشـان پەشـیمان بوویـەوە، خـۆی لـە بەردەمیـدا راخسـت و سوێندی خوارد هەڵناسێتەوە تا بیلال پێ بە روومەتیدا نەنێت، سەری بەرز نەکردەوە تا ئەو کارەی بە بیلال کرد.

رەجای کوڕی حەیات دەڵێت: جلوبەرگەکانی عومـەری کـوڕی عەبدولعـەزیزم بـە پـارە دانا-کە لەسەر مینبەر وتاری دەدا- نرخەکەیان تەنها دوازدە درهەم بوو.

هەواڵ گەیشت بە عومەری کوڕی عبـدالعزیز کـە کوڕەکـەی ئەنگوسـتیلەیەکی بـە هـەزار درهەم کڕیوە، عومەر بـۆی نووسـی: هـەواڵم پێگەیشـتووە ئەنگوسـتیلەیەکت بـە هـەزار درهەم کڕیوە، کە ئەم نووسینەی منت پێگەیشت ئەنگوستیلەکە بفرۆشە و هـەزار سـکی برسی پێ تێر بکە، ئەنگوستیلەیەك بە نرخی دوو درهەم بکڕە بۆ خـۆت، بـە لـە ئاسـنی

چینی دروست بكرێت، لەسەری بنووسە: ڕەحمەتی خوا لە كەسێك قەدری نەفسی خۆی دەزانێت... خودا باشتر دەزانێت.

## ملدان بە حەق گیانی تەوازوعە

گیانی تەوازوع ئەوەیە مرۆڤ مل بە حەق بدات.

دەسەڵاتی حەق وەربگرێت بە گەردنكەچی و زەلیلی و فەرمانبەرداری و ڕۆیشتنە ژێر نیرییەوە("نیر" ئەو پارچەدارە بوو دەیانخستە سەر ملی گا و لەگەڵ هەوجاڕەكەدا جوتیان پێ دەكرد)، بە جۆرێك حەق دەستكراوە بێت لەودا وەك دەستكراوەیی مەلیكێك لە مەملەكەتەكەیدا، بەم ڕێگەیە ئەخلاقی تەوازوع بۆ بەندە بەدەست دێت، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) لێكدانەوەی بۆ لوتبەرزی كردووە بە دژی قبووڵكردنی حەق، و دەفەرموێت ((لوتبەرزی بریتییە لە"بطر الحق" پێشێل كردنی حەق و "غمض الناس" خەڵكی بەكەم زانین))، "بطر الحق"واتە حەق وەرنەگرێت و ڕەدی بكاتەوە و ئینكاری بكات و دووری بخاتەوە لەڕووی خۆی، "غمض الناس"یش بریتییە لە: بە چاوی كەم و سووك تەماشاكردنی خەڵكی، هەر كات بە سووك و كەم تەماشای خەڵكی كرد مافەكانیان پێشێل دەكات و ئینكاریان دەكات و سووكایەتییان پێ دەكات.

لەبەر ئەوەی خاوەن حەق قسە و هێزی لەلایە: نەفسی لوتبەرز دان بەو هێزەدا نانێن كە لە حەقدایە، بە تایبەت نەفسە پووچ و بوودەڵەكان، بە لوتبەرزی و باتڵی خۆی دەیەوێت بەسەر ئەو هێزەی حەقدا زاڵ ببێت. بۆیە حەقیقەتی تەوازوع بریتییە لە گەردنكەچی و فەرمانبەرداری بەندەی خودا بۆ هێزی حەق و قبووڵ كردنی و ملكەچبوون بۆی، و خۆ زاڵ نەكردن بەسەر حەقدا بە هێزی درۆینەی خۆی.

## بە ڕا و بۆچوون و كێشانە و پێوانە بەرهەڵستكاری بەڵگەی قورئان و فەرموودە ناكەین

گرنگترین پایەی تەوازوع بریتییە لە: تەوازوع بۆ ئایین ئەوەش ئەوەیە بە بەڵگەی مەعقول(بەڵگەی عەقڵی) بەرهەڵستی بەڵگەی مەنقول(بەڵگەی قورئان و فەرموودەی دروست) نەكات، و هیچ بەڵگەیەك لە بەڵگەكانی ئایین تۆمەتبار نەكات، و لە هیچ ڕێگەیەكەوە پێچەوانەی دەق هەنگاو هەڵنەگرێت.

تەوازوع بۆ ئایین: بریتییە لە گەردنکەچی و ملدان و فەرمانبەرداری بۆ ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی، هەروەها خۆڕادەست کردن و یەکلابوونەوە بۆی، ئەوەش بە سێ شت:

**یەکەم: بەرهەڵستکاری شتێك لەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی نەکات بە یەکێك لەم چوار بەرهەڵستکارییە گوزەرکردەی جیهان کە ناودەبرێن بە: مەعقول، و قیاس، و زەوق، و سیاسەت.**

یەکەمیان(مەعقول) لادەران و لوتبەرزان لە ئەهلی کەلام کە بەرهەڵستکاری دەقی وەحی دەکەن بە بەڵگەی ئەقڵی تێکچوو، دەڵێن: گەر ئەقڵ و نقلْ دژایەتی کەوتە نێوانیانەوە ئەقڵ پێش دەخەین و نقلْ وەلا دەنێین.

دووەم(قیاس): لوتبەرزان لە بەناو فەقیهان ئەو ڕێگەیان گرتۆتە بەر، دەڵێن: گەر قیاس و راوبۆچوون لەگەڵ دەقی وەحیدا دژایەتیان کەوتە نێوانەوە، قیاس بەسەر دەقدا پێش دەخەین، ولا بەلای دەقدا ناکەینەوە.

سێیەم(زەوق): لوتبەرزان و لادەران لە بەناو ئەهلی تەصەوف و زوهد، کاتێك زەوق لەگەڵ فەرمانی وەحیدا دژایەتی دەکەوێتە نێوانیانەوە زەوق و حاڵ پێش دەخەن و گوێ بە فەرمانی وەحی نادەن.

چوارەم(سیاسەت): لوتبەرزان و لادەران لە والییەکان و ئەمیرە ستەمکارەکان، کاتێك شەریعەت و سیاسەت لەلای ئەوان دژایەتی کەوتە نێوانەوە سیاسەت پێش دەخەن و لا بەلای حوکمی شەریعەتدا ناکەنەوە.

ئەم چوار دەستەیە ئەهلی لوتبەرزین و تەوازوع ئەوەیە: خۆت لە هەموو ئەمانە بەدوور بگریت.

**دووەم: هیچ بەڵگەیەك لە بەڵگەکانی ئایین تۆمەتبار نەکات: بەجۆرێك ئەو بەڵگەیە بە تێکچوو و ناتەواو و کەموکورت لە ئاماژەیدا وەسف بکات، یان پێیوابێت بەڵگەی کەسانی تر لەو بەڵگەیە لەپێشترە،** هەر کات شتێك لەو جۆرەی بۆ هاتە پێش با تێگەیشتنی خۆی تۆمەتبار بکات، و بزانێت ئافەتی دژایەتییەکە لە بیر و تێگەیشتنی ئەودایە، و بەڵاکە بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، وەك وتراوە:

وكم من عائب قولا صحيحا　　　وآفته من الفهم السقيم

ولكن تأخذ الأذهان منه　　　على قدر القرائح والفهوم

ئەم جۆرە واقیعە راستییەکە: هەر کەس بەڵگەیەکی ئایینی تۆمەتبار کردبێت تۆمەتبارکەرەکە بیر و تێگەیشتنی تێکچوو بووە، لە ژیری و زەینیدا ناتەواوی هەبووە، ئافەتەکە لە زەینی نەخۆشەوەیە نەك لە خودی بەڵگەکەوە.

گەر هەندێ بەڵگەی ئایینت بینی و لێی حاڵی نەدەبووی و تێگەیشتن پەیی پێ نەدەبرد، بزانە لە مەزنی و شەرەف و گەورەیی بەڵگەی ئایینەوەیە کە وایکردووە تۆ لێی حاڵی نەبیت، هەروەها بزانە کە لەژێریدا گەنجینەیەك لە گەنجینەکانی زانستی تێدایە، هێشتا کلیلی ئەو گەنجینەیە بە تۆ نەدراوە، چونکە رێگەی دروستت بۆ نەگرتۆتە بەر لە صدق و ئیخلاص و پاڕانەوە لەبەردەم "مقلب القلوب"دا، هەروەها لەبەر ئەوەی هۆکاری پاڵفتەکەری زەین و پاککەرەوەی دڵت نەگرتۆتە بەر، لە صدقی ئاراستە وەرگرتن بەرەو هیدایەتی پێغەمبەر(ﷺ) تاکو شایستەی ئەو گەنجینەیە ببیت.

لەمەڕ کەسانی تریش: را و بۆچوونی پیاوان تۆمەتبار بکە بۆ دەقی وەحی، با هەمیشە رەدکردنەوەی را و بۆچوونی ئەوانە ئاسانتر بێت لەلات لە رەدکردنەوەی دەقی وەحی، گەر نەتوانی ئەمە بکەیت بزانە کە تۆ لەسەر هیچ شتێك نیت.

شافیعی-قدس الله روحه- دەفەرموێت (موسڵمانان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی هەر کەس فەرموودەی پێغەمبەری بۆ رۆشن بوویەوە بۆی حەڵاڵ نییە بە قسەی هیچ کەسێك وازی لێ بهێنێت و دەستبەرداری ببێت)

**سێیەم: لە هیچ رێگەیەکەوە پێچەوانەی دەق هەنگاو هەڵنەگرێت: نە لە ناوەوەیدا و نە بە زمان و نە بە کردار و نە بە حاڵی**، بەڵکو گەر هەستی بە شتێك لە دژایەتی لەگەڵ دەقی وەحی کرد: ئەوا وەك تاوانی زیناکەر و ئارەقخۆر و مرۆڤکوژ لەخۆی سەرنج بدات، بەڵکو ئەو پێچەوانە بوونە لەگەڵ وەحی -لەلای خودا- لەوانە زۆر گەورەترە، چونکە پەلکێشی دەکات بۆ دووڕوویی کە ئەو دەردەیە مرۆڤە مەزنەکان و ئیمامان بۆ نەفسی خۆیان لێی ترساون.

بزانە، سەرپێچیکەر لە دەق -بەهۆی قسەی شێخەکەی و مامۆستاکەی و تەقلیکراوەکەی، یان بەهۆی زەوق و حاڵەوە یان بەهۆی بەرژەوەندی سیاسەتەوە،

گەر لەلای خودا پاساودار بێت کە سوێند بە خودا پاساوی نییە– سەرپێچی کردن لە را و بۆچوونی ئەوانە بۆ دەقی وەحی پاساوێکی لەپێشترە بۆ لای خودا و پێغەمبەر و فریشتە و باوەڕداران لە بەندەکانی خودا.

هاوار چ سەرسوڕمانێکە ! کاتێك بەتاڵکردنەوەی سەرپێچیکەران بۆ دەق فراوان دەبێت بەهۆی پاساوی کەسێکەوە کە پێچەوانەی دەق دەوەستێتەوە بە تەقلید یان تەئویل. یان شتانی تر.

ئەی بۆ ئەو کەسەی پێچەوانەی را و بۆچوونی ئەوان و شێخەکانیان دەجوڵێتەوە –لە پێناوی دەقی وەحیدا– خاوەنی پاساو و بیانووی خۆی نەبێت؟ چۆن توانیان پیلانی بۆ بگێڕن و شتی خراپی بەسەر بهێنن و بە تاوانی گەورە تۆمەتباری بکەن و لە تاوانبارە گەورەکان خراپتر تەماشای بکەن؟ نەخۆشییەکانی خۆیان دا بەسەر ئەودا و خۆیان لێی کەنارگیر کرد و بە نەهامەتییەکانیان تۆمەتباریان کرد و بە مەزن زانینی شوێنکەوتەکانیان کرد بە پەنا و داڵدەی خۆیان(وا دیارە لێرەدا ئیبن قیم باس لە شێخی ئیبن تەیمیە و ئەو تۆمەت و ئازار و ئەشکەنجانە دەکات کە بەناو زانایانی سەردەمی خۆی دایانە پاڵی)، خودا باشتر دەزانێت.

### ۞ متمانە.....لەسەر رۆشنبینی(بەصیرەت)

ئەمەش بەوە دروست دەبێت کە بزانێت: رزگاربوون لە رۆشنبینیدایە، و ئیستیقامەش لەدوای متمانەوەیە، هەر بەو جۆرە بەڵگەی بەیان(البينة) لەدوای بەڵگەی دەمکوتکردنەوەیە(الحجة).

یەکەمجار بزانێت رزگاربوون لە بەدبەختی و گومڕایی لە رێگەی رۆشنبینیدایە: هەر کەس رۆشنبینی نەبوو لە ئەهلی گومڕاییە لە دونیادا و بەدبەختییە لە رۆژی دواییدا.

رۆشنبینی: نوورێکە خودا لە چاوی دڵدا دایدەنێت بەندەی خودا حەقی لە باتڵ پێ جیادەکاتەوە، دانە پاڵی رۆشنبینی بۆ لای دڵ وەك دانە پاڵی رووناکییە بۆ لای چاوی سەر.

ئەم رۆشنبینییە لە لایەکەوە بەخششی خودایە و لەلایەکی ترەوە هەوڵ و کۆششە و بەدەستهێنراوە، هەر کەس سەرنجی نیشانە و بەڵگەکانی حەق بدات و بۆ خودا لە

حەز و ئارەزوو خۆی دابڕنێت بینینی ڕۆشن دەبێتەوە، ئەو كات جیاكەرەوەیەكی پـێ دەدرێت تاكو حەقی لە باتڵ پێ جیابكاتەوە.

پاشان بزانێت ئیستیقامە لەدوای متمانەوە دێت: واتە ئیستیقامە لـە گوتـار و كـردار و حاڵدا دروست نابێت تا متمانەی تـەواوی بـەو زانسـتە نـەبێت كـە لەلایـەتی،، ئـەوەش بەوە دەبێـت لـە چـرای پێغەمبەرایـەتی وەریگرتبێـت، هـەر كـەس بـەو جـۆرە نـەبێت متمانە و ئیستیقامەی دەست ناكەوێت.

بناغــەی ئەمــەش ئەوەیــە كــە بزانێــت بەڵگــەی بــەیان(البینــة) دوای بەڵگــەی یەكلاكەرەوە(الحجة)یە: "البینة"بریتییە لە: بەیان كردنی حەق و دەركەوتنی، ئەمـەش لەدوای بەڵگەی یەكلاكەرەوە(الحجة) دێت، كە بەڵگەی بەیان هـات حـەق واڵا دەبێـت و دەردەكەوێت و ڕۆشن دەبێتەوە.

مانایەكی تری تێدایە: كاتێك كرداری نەنگ و ناتەواو لە دروست و تەواو جیادەبێتـەوە كە زانستی بەدەست گەیشتبێت ئەو زانستەش بریتییە لە بەڵگەی یەكلاكەرەوە لەسەر بەندەكەی، كاتێك بەڵگەی ناسی ئەوەی لە زانست تەمومـژ بـوو لـە لای و وەڵامەكـەی نەدەزانی بۆی ڕۆشن دەبێتەوە، هەروەها ئەوەی نەنگ و ناتەواوە لە كردارەكان بـۆی ئاشكرا دەبێت.

## ❁ برایەتی هەموو موسڵمانێك دەكەین و عوزری قبووڵ دەكەین

جوانی تەوازوع لەو شوێنەدایە: ڕازی بیت بەوەی چۆن خودا ڕازی بووە كەسێك بكـات بە بەندەی خۆی تۆش ڕازی بیت بیكەیت بە برای خۆت، و هیچ حەقێك لە دوژمنەكەت ڕەد نەكەیەوە، و عوزری خاوەن عوزرەكانت قبووڵ بێت.

❖ گەر خودا ڕازی بووە براكەت بكات بە بەندەی خۆی(وتۆش بەندەی خودای) ئایا تـۆ ڕازی نابیت بیكەیت بە برای خۆت؟ ڕازی نەبوونت بـەوەی بیكـەیت بـە بـرای خـۆ خـودی لوتبەرزییـە، چ شـتێك لـەوە ناشـیرینترە بەندەیـەك بەسـەر بەندەیـەكی تـردا لوتبـەرزی بنوێنێت، ڕازی نەبێت بە برایەتی كردنی لە كاتێكدا خودا ڕازی بووە بە بەندایەتییەكەی؟

❖ پلەی تەوازوعت بۆ بەدەستنایەت تا حەق قبووڵ نەكەیت لەوانەی خۆشـت دەوێن و لەوانەش ڕقت لێیانە، لە دوژمنەكەت قبووڵی بكەیت وەك چـۆن لـە دۆسـتەكەت قبـووڵی

دەكەیت، گەر حەقەكەی رەد ناكەیەوە، ئیتر چۆن رێگری دەكەیت لە حەقێكی ئەو لەسەر خۆت؟ بەڵكو حەقیقەتی تەوازوع ئەوەیە كە حەقت بۆ هات لێی قبوول دەكەی، كە حەقێكی لەسەرت بوو بۆی دەگێڕییەوە، دوژمنایەتییەكەت لەگەڵی رێگری ناكات لە قبوولّ كردنی حەق لە ئەو و گێڕانەوەی ئەو حەقەی كە لەلای تۆیە.

❖ هەر بەو جۆرە هەر كەس خراپەی لەگەڵ كردی پاشان هات و عوزرخوایی بۆ خراپەكەی هێنایەوە تەوازوع پێویستی دەكات لەسەرت كە عوزرخواییەكەی قبوولّ بكەیت، حەق بێت یان ناحەق، پەنهانی رادەستی خودا بكە، وەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ دووڕوواندا ئەنجامی دەدا كاتێك لە غەزا لێی دوادەكەوتن، كە دەگەڕایەوە دەهاتن و عوزرخواییان دەهێنایەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) عوزرەكانی قبوولّ دەكردن و پەنهانی رادەستی خودا دەكردن.

نیشانەی بەخشندەیی و تەوازوع ئەوەیە گەر ناتەواوییەكت لە عوزرەكەیدا بینی نەیوەستێنی لەسەری و بەڵگەبارانی نەكەیت، بەڵكو بڵێیت: لەوانەیە بەو جۆرە بێت تۆ دەیڵێیت، هەر شتێك خودا بڕیاری لێ بدات دەبێ، شتی بڕیار لێدراویش ناگەڕێتەوە، و هاوشێوەی ئەمانە.

## ۞ بەزەیی رزگارمان دەكات

تەوازوعی كامڵ و تەواو: عابید هیچ حەقێكی خۆی لەسەر خودا بەهۆی كردارەكانییەوە نەبینێت، ئەو لە بەندایەتی و هەژاری و زەلیلی و گەردنكەچی تەواودایە، هەر كات حەقێكی خۆی لەسەر خودا بینی: بەندایەتییەكەی تێكدەچێت، و ئافەت و نەخۆشی روو لەو بەندایەتییە دەكات و ترسی ئەوەی لێدەكرێت بەر خەشمی خودا بكەوێت، ئەمە نەرێی ئەوە ناكات كە خودا لەسەر خۆی بۆ بەندەكانی بە حەقی زانیوە، لە پاداشتی بەندەكانی و رێز لێنانیان، ئەوە حەقێكە لەسەر خۆی پێویست كردووە بە بەخشندەیی و چاكە و بەخشین و ئیحسانی خۆی، نەك بە شایستەبوونی بەندەكەی، یاخود ئەوان بە كاروكردەوەكانیان لەسەر خودا واجبیان كردبێت.

لەم بابەتە دەست بە قورئانەوە بگرە كە جیاكەرەوەی هەموو رێگەكانە لەیەكتر.

با وەلامدانەوەت بۆ بانگكەری حەق پاك و بێگەرد بێت، وەلامدانەوەی خۆشەویستی و رەغبەت بێت، داوای خودی خۆشەویستەكەت بكە، و تێكەڵی مەكە بە داوایەك حەز و

بەشی نەفسی تێدا بێت و بۆ شتێکی کەمی دونیایی بێت، چونکە گەر خودات بەدەست هێنا هەرچی حەز و بەشی ترە بەدەست دەهێنیت.

هەر کەس پشت بکات لە داوای شتێك جگە لە خودا، و داواکەی بە شتێکی تر تێکەڵ نەکرد، بەڵکو تەنها خۆشەویستی خودا و ویستی پاکی رووی خودای لە پشتەوە بوو، ئەوە لە راستیدا هەرچی حەز و بەش و مەرامە بەدەستی هێناوە، ئەو کە ئەوانەی نەکردە ئامانجی داوایەکەی ئەوا رێگەی بۆ خۆشکرا تاکو بەدەستیان بهێنێت، ئەو لەگەڵ ئەوەشدا ستایشکراو و سوپاسکراو و نزیکراوەیە لە خودا.

بزانە بەندە بۆی نییە بە هەوڵ و کۆششەکانی رزگاری و سەرفەرازی خۆی لەسەر خودا پێویست بکات، هیچ کەسێك کار و کردەوەکانی نایبەنە بەهەشتەوە، و لە ئاگری دۆزەخ رزگاری ناکەن، خودای موتەعال بە فەزڵ و بەخشندەیی و بەخشش و ئیحسانی خۆی دەیباتە بەهەشتەوە، چاکە و بەخشندەیی خودایە حەقی بەندەکەی لەسەر خۆی داناوە و بەڵێنی بردنە بەهەشتی پێداون، بەڵێنی کەسی بەخشندە دەبرێتە سەر با بەڵێنەکەشی "عسی و لعل"–هیواوایە، رجاوایە– بێت.

بۆ ئەو مەبەستە ئیبن عباس–خوا لە خۆی و باوکی رازی بێت– دەفەرموێت ((وشەی"عسی" لە خوداوە واجبە))

بەڵام بەڵێنی مرۆڤی بەدکار بێبەڵێنییە، با پەیمان و سوێندیشی لەگەڵ بێت.

مەبەستەکە: نەبینینی نەفسی خۆ لەلایەن بەندەی خوداوە وای کردووە خودا لەسەر خۆی پێویست بکات کە نەرێی ئەوە نەکات لەسەر خۆی واجبی کردووە و کردوویەتی بە حەقی بەندەکەی، پێغەمبەر(ﷺ) بە مەعازی کوڕی جەبەلی فەرموو –خودا لێی رازی بێت– ((ئەی مەعاز، دەزانی حەقی خودا چییە لەسەر بەندەکان؟ فەرمووی: خودا و پێغەمبەرەکەی زاناترن. فەرمووی: حەقی خودا لەسەر ئەوان ئەوەیە بیپەرستن و هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن، ئەی مەعاز دەزانی حەقی بەندەکان لەسەر خودا چییە گەر ئەوەیان ئەنجام دا؟ وتم: خودا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: حەقیان لەسەر خودا ئەوەیە کە بە ئاگر سزایان نەدات))

هیچ کەس لەسەر پەروەردگار–سبحانە– حەقێکی نییە، و هیچ هەوڵ و کۆششێکیش لەلای خودا بزر نابێت، وەك وتراوە:

| | |
|---|---|
| ما للعباد عليه حق واجب | كلا، ولا سعي لديه ضائع |
| إن عذبوا فبعدله أو نعموا | فبفضله، وهو الكريم الواسع |

## (٣٦) (منزلة الفتوة)

# مەنزیلەی جوامێری

لە مەنزیلەکانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی جوامێری(الفتوة)یە.

ئەم مەنزیلەیە لە راستیدا بریتییە لە مەنزیلەی چاکە لەگەڵ خەڵکی، و خۆ گرتنەوە لە ئازاردانیان، ئەم مەنزیلەیە بریتییە لە بەکارهێنانی ئەخلاقی جوان لەگەڵیان، لە راستیدا بەری درەختی ئەخلاقی جوان و بەکارهێنانیەتی.

جیاوازی نێوان جوامێری(الفتوة) و پیاوەتی(المروءة): پیاوەتی لە جوامێری گشتگیرترە، جوامێری جۆرێکە لە جۆرەکانی پیاوەتی، پیاوەتی بریتییە لە بەکارهێنانی ئەوەی تایبەتە بە بەندە بە جوانکردن و رازاندنەوەی، هەروەها ئەوەی تێدەپەڕێت بۆ سەر کەسانی تر، هەر بەو جۆرە وازهێنان لەوەی تایبەتەکانی بەندە پیس و ناشیرین دەکات، یان تێدەپەڕێتە سەر کەسانی تر.

((جوامێری)) بریتییە لە بەکارهێنانی ئەخلاقی بەخشندە لەگەڵ خەڵکی.

کەوابوو سێ مەنزیلەیە: مەنزیلەی خۆڕازاندنەوە بە ئەخلاق و نیشاندانی ئەخلاقی جوان، مەنزیلەی جوامێری و مەنزیلەی پیاوەتی، پێشتر باسی مەنزیلەی ئەخلاق کراوە.

ئەم مەنزیلەیە مەنزیلەیەکی بەرز و باڵایە و شەریعەت بە وشەی "الفتوة" ناوی نەهێناوە، بەڵکو بە ناوی رەوشتی جوان و بەرز(مكارم الأخلاق) ناوی هێناوە، وەك لەو فەرموودەی یوسفی کوڕی محمدی کوڕی منکەدیر لە باوکییەوە لە "جابری کوڕی عبدالله"وە-خوا لێی رازی بێت- ریوایەتی کردووە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ((خودا ناردوومی بۆ ئەوەی ئەخلاقی بەرز و جوان و کاروکردەوەی چاك و باش تەواو بکەم)).

بنچینەی "الفتوة" لە "الفتی"وە هاتووە، کە بریتییە لە لاوێکی تازە تەمەن، خودای موتەعال دەربارەی یارانی ئەشکەوت دەفەرموێت ﴿إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُوا بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى ۝١٣﴾ الكهف: ١٣

فوزەیلی کوڕی عەیاز دەفەرموێت: جوامێری بریتییە لە لێبووردن لە هەڵە و خراپەی برایان.

ئیمامی ئەحمەد-خوا لێی رازی بێت- -لە ریوایەتێكی كوڕەكەیدا بەناوی عبدالله- دەفەرموێت: كە پرسیاری جوامێری لێ كرا؟ فەرمووی: وازهێنان لەوەی حەزی لێدەكەی بۆ ئەوەی(لە پێناوی ئەوەی) لێی دەترسیت.

عومەری كوڕی عوسمانی مەكی دەفەرموێت: جوامێری بریتییە لە ئەخلاقی جوان.

جونەید دەفەرموێ: بریتییە لە گرتنەوەی ئازاری خۆت لە خەڵكی و بەخشینەوەی چاكە بەسەر خەڵكیدا.

سەهل دەفەرموێت: بریتییە لە شوێنكەوتنی سوننەت.

وتراوە: فەزیلەیەكە(چاكەیەكە) ئەنجامی دەدەیت نەفسی خۆتی تیا نابینییەوە، هەروەها وتراوە: دەست بەڕووی ئەو كەسەوە نەنێیت كە رووت تێدەكات.

دیسان وتراوە: هەڵنەیەیت(رانەكەی) گەر كەسێك داوای چاكەیەكی لێ كردی، هەروەها وتراوە: دەرخستنی نیعمەت و شاردنەوەی میحنەت، دیسان وتراوە: هیچ لانەخەی و پاساو و بیانوو نەهێنیتەوە.

## ۞ لاو........ زەوی خێر

بنچینەكەی: بەردەوامبوونی خەڵكی لە چاكەی تۆدا، گەر تۆ خۆتدایە دەمیان و جڵەوی خۆتت لەوان نەگرتەوە لە چاكەی تۆ بەهرەمەند دەبن، ئەو كات خۆدانەدەمی تۆ بۆ ئەوان دەبێتە هۆیەك بۆ بەدەستهێنانی فەزڵی تۆ و گرتنەوەی جڵەویش دەبێتە هۆیەك بۆ بێبەشبونیان لە فەزڵ و چاكەت.

پاشان بە ئەخلاقت لە ئامێزیان دەگریت، بە شاندانە ژێر ئەوەی لێیان دەوەشێتەوە لە خراپی تێكەڵبوون، تۆش ئەوە وەربگرە لە پێغەمبەر لە ئەخلاقی خەڵكی وەریگرت، ئەوەش وەرگرتنی لێبووردنە(خذ العفو)

لێیان بگەڕێ پێت لێ بنێن، واتە بتخە ژێر پێ بەهۆی نەرمونیانی و تەوازوع و راخستنی باڵی بەزەییتەوە، بەجۆرێك لە نێوانیاندا پلەیەك بە خۆت نەبەخشیت وایان لێ بكات بەهۆیە رێزت لێ بگرن.

بەڵام لەگەڵ هەستان و راستبوونەوە بە زانستەوە: بەوەی ئەو خۆدانە دەمە تەبابێت لەگەڵ شەرعدا و لە سنوور و ئادابەكانی دەرنەچێت، بەجۆرێك هانی بدەیت بۆ

دەستدرێی کردنە سەر سنووری خودا و تیابردنی حەقی خودا و حەقی بەندەکانی، دڵت لەگەڵ خودا پارێزراو بێت و بە هەمیشەیی رووی تێبکەیت، تۆ بە رووالەت و وێنە و جەستە لەگەڵیاندای و بە دڵ و بە پەنهانت لەوان جیابوویتەوە، ئاگاداری رۆیشتنی خۆتی لە مەداریجەکانی ((إياك نعبد وإياك نستعين))دا، ئەم ئاگاداربوونە زیندەگی دڵ و رۆحە، گەر رێبواری رێگەی خودا ئەم ئاگاداربوونەی لەدەست بچێت و لێی بێئاگا بێت: پەستی و شەکەتی رووی تێدەکات و خەم و پەژارە و حوزن دایدەگرێتەوە، و دڵی لە دۆڵ و شیوەکاندا وێڵ و سەرگەردان دەبێت.

## ✿ ناتەواوی........و بەخشندەیی

خاوەنی کتێبی "منازل السائرين" شێخولئیسلام الهروي–رەحمەتی خوای لێ بێت– دەفەرموێت ((خاڵی جوامێری ئەوەیە فەزڵی خۆت نەبینی و حەقی خۆت نەکەوێتە پێش چاو))

هەروەها دەفەرموێت ((دڵ و کرۆکی جوامێری و مرۆییبوونی خودی جوامێری بریتییە لەوەی: بە هۆی ناتەواوی و نەنگییەکانتەوە لە بینینی فەزڵی خۆت فەنابییت، و بەبینینی حەقی خەڵکی لەسەر تۆ لە بینینی حەقی خۆت بزربییت))

خەڵکی لەم بابەتەدا لە ئاستی جۆراوجۆردان، باڵاترینیان: ئەهلی ئەم ئاستەن، و نزمترین و پەسترینیان: پێچەوانەی ئەوەی یەکەمن، واتە ئەوانەن بەهۆی بینینی چاکەکانی خۆیانەوە نەنگی و ناتەواوییەکانی خۆیان نابینن.

ناوەندەکەیان: ئەو کەسەیە کە هەردوولا دەبینێت، نەنگی و کەماڵ دەبینێت و حەقی خەڵکی لەسەر خۆی و حەقی خۆی لەسەر خەڵکی دەبینێت.

لە دەرکەوتەکانی لەلای ((وازهێنان لە ناحەزی و دوژمناکاری، و خۆبێئاگاکردن لە هەڵە و تێکەوتنەکانی دەوروبەر و لەبیربردنەوەی ئازاری خەڵك کە بەرانبەر بە تۆ ئەنجامیانداوە))

بە زمانی(بە هۆی زمانییەوە) ناحەزی و دوژمنکاری ناکات و بە دڵیش نێتی ناحەزیشی نییە، و وەك خەیاڵیش بەسەریدا گوزەر ناکات، ئەمە لە حەقی نەفسی خۆی.

لە حەقی پەروەردگاریشی: جوامێری ئەوەیە بە خوداوە و لە پێناوی خودادا ناحەزی بكات، و بگەڕێتەوە بۆ لای ئەحكامی خودا، وەك پێغەمبەر لە دوعای كردنەوەدا دەیفەرموو ((وبك خاصمت وإليك حاكمت)) ئەمە پلەی جوامێری زانایانی بانگكەرن بۆ لای خودای موتەعال.

خۆبێئاگاكردن لە هەڵە و تێكەوتنەكانی دەوروبەر: گەر خراپە و تێكەوتنێكی لە كەسێك بینی كە شەرع پێویستی كردووە لەسەر ئەو كارە رایبگرێت: وانیشان دەدات كە نەیبینیوە، بۆ ئەوەی خاوەنەكەی تووشی نامۆبوون و كەناگیری نەبێت لە تۆ.

جوامێری خۆبێئاگاكردن بەرزتر و باڵاترە لە جوامێری شاردنەوە لەگەڵ بینیندا.

لەبیربردنەوەی ئازارێك كە بەرانبەرت ئەنجام دراوە: ئەوەیە كە ئەو ئازار و ئێشە لەبیر خۆت ببەیەوە كە لە خەڵكییەوە رووبەڕووت بووەتەوە، تاكو دڵت بۆ ئەو كەسە ساز و خاوێن ببێت، و هەست بە نامۆیی نەكەیت لەگەڵی، لەو پێناوەدا وتراوە:

ينسى صنائعه، والله يظهرها ... إن الجميل إذا أخفيته ظهرا

## ۞ پێچەوانەبوونێكی بیناكار

پاشان لە دەركەوتەكانی لەلای ((ئەو كەسەی تۆ دووردەخاتەوە تۆ نزیكی بكەیەوە، رێزی ئەو كەسە بگریت ئازارت دەدات، داوای لێبووردن لەو كەسە بكەیت دەستدرێژی دەكاتە سەرت، بەسینگفراوانی نەك خواردنەوەی رق، بە خۆشەویستی نەك دان بەخۆداگرتن)) چاكە و خراپە لەنێوان تۆ و ئەودا دوو بەش بێت: بەشی تۆ چاكەكردن بێت و بەشی ئەو خراپەكردن.

هەر كەس دەیەوێت وەك پێویست لەم پلەیە تێبگات با تەماشای سیرەی پێغەمبەر(ﷺ) بكات لەگەڵ خەڵكیدا ئەمە وەك خۆی دەبینێتەوە، كەماڵی ئەم پلەیە بۆ هیچ كەس بەدەست نەهاتووە جگە لە پێغەمبەر، پاشان بۆ میراتگرەكانی بەپێی بەشی خۆیان لەو میراتە، هیچ كەسێكم نەبینیوە وەك شێخولئیسلام ئیبن تەیمییە -قدس الله روحه- ئەم سیفاتە بەرز و بڵندانەی لەخۆیدا كۆكردبێتەوە، هەندێ لە هاوەڵە مەزنەكانی دەڵێن: هیوام دەخواست من بۆ هاوەڵەكانم وەك ئەو بوومایە لەگەڵ نەیار و دوژمنەكانیدا، هەرگیز نەمبینیوە دوعا لە هیچ كام لە نەیارەكانی بكات، بەڵكو دوعای خێری بۆ دەكردن.

رۆژێك هاتم و مژدەی مردنی یەكێك لە هەرە دوژمنە گەورەكانیم پێدا كە زۆر ئازار و نەیاری لەدەست چەشتبوو، هەڕەشەی لێ كردم و خۆی لێ توندكردم و فەرمووی: "إنا لله وإنا إليه راجعون"، پاشان هەستا و چوو بۆ لای ئەهلی مردووەكە و سەرخۆشی لێكردن، و پێی وتن: من لە جێگەی ئەوم بۆ ئێوە، هەر كارێك ئێوە تیایدا پێویستتان بە یارمەتی بوو من یارمەتیتان دەدەم، و هاوشێوەی ئەم قسانە، ئەوانیش زۆر پێی دڵخۆش بوون و دوعایان بۆ كرد و ئەو هەڵوێستەیان بە گەورە راگرت، رەحمەتی خودای لێ بێت و لێی رازی ببێت.

مانای داوای لێبووردن بۆ ئەو كەسەی دەستدرێژی دەكاتە سەرت: تۆ خۆت لە شوێنی خراپەكارەكەدا دابنێ و خراپەكارەكە بخەرە جێگەی خۆت و داوای لێبووردنی لێ بكە.

ئەوەی ئەم دیمەنەت نیشان دەدات: بزانیت ئەو كەسە بەهۆی گوناهێكی تۆوە زاڵ كراوە بەسەرتدا، وەك خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ﴿٣٠﴾ ﴾ الشورى: ٣٠

گەر زانیت ئەوە تۆی یەكەمجار بە خراپە هەستاوی و خودا بەدەستی ئەو تۆڵەت لێدەكاتەوە: ئەوا لە راستیدا تۆ لەپێشتری بە داوای لێبووردن كردن.

جوامێری، هەموو جوامێری: لەوەدایە كە لۆمەكردنت بۆ ئەو كەسە لێ نەوەشێتەوە و گۆڕانت بەسەردا نەیەت و وەك ئەو كاتە بیت كە هێشتا دەستدرێژی نەكردبووە سەرت و رووی خۆش و چاكەی خۆتی لێ نەگریتەوە، گەر شەرمەزار نەبیت لە هەستانی ئەو بە داوای لێبووردن ئەوا لە جوامێری بەشت نەدراوە.

ئەوەی هەموو ئەمانەت لەسەر ئاسان دەكات: بینینی هەموو ئەو دیمەنانەی تێكەڵبوونە كە پێشتر ئاماژەمان پێكردوون، بۆیە لێیان بەئاگا بە، چونكە گەنجینەی مەعریفە و چاكەیان تێدایە.

ئەوەش كە دەفەرموێت ((بە سنگفراوانی نەك رقخواردنەوە، و بە خۆشەویستی نەك دان بەخوداگرتن))

واتە: ئەو مامەڵانەی ئەنجامی دەدەیت با لە سنگفراوانی و نەفس پاكی و سینەسافییەوە بێت، نەك لە رقخواردنەوە و سنگگوشین و دان بەخۆداگرتن بێت، ئەوانە بەڵگەی ئەوەن كە جوامێری نەبووە بە ئەخلاق لەلات، بەڵكو تەنها زۆر لەخۆكردنێكە و

خەریکە لەدەستت دەچێت، ئەو کات حوکمی ئەخلاقی راستەقینەت دەردەکەوێت و رسوادەبیت، ئەوەی مەبەستە تەنها چاککردنی ناوەوە و پەنهان و دڵە.

ئەمەی کە شێخی الهروي فەرمووی: ناتوانرێت بەدەست بێت تا لەسەر پردی دان بەخۆداگرتن و خواردنەوەی رق نەپەڕیتەوە، گەر توانی بپەڕێتەوە پەلکێشی دەکات بۆ ئەم مەنزیلەیە بە کۆمەکی و یارمەتی خودا، خودا بۆ خۆی باشتر دەزانێت.

چاکەکانی "پیاوەتی" تەبا و هاوتان لەگەڵ چاکەکانی"جوامێری"دا.

## ۞ باڵابوونی پیاوەتی

پیاوەتی (المروءة) لەسەر وەزنی "فعولة"یە لە وشەی "المرء"–مرۆڤ یان پیاو – وەرگیراوە، وەك "الفتوة" لە "الفتى"وە، هەروەها وەك "الإنسانية" لە "إنسان"وە، بۆیە حەقیقەتەکەی بریتییە لە: خۆڕازاندنەوەی نەفس بە سیفاتی مرۆیی کە لە ئاژەڵێکی بێ فام و شەیتانێکی رەجمکراو جیای دەکاتەوە.

**لە نەفسی مرۆڤدا سێ بانگکەری پەلکێشکەر بوونی هەیە:** بانگەرێك بانگی دەکات خۆی بە ئەخلاقی شەیتان برازێنێتەوە، لە لوتبەرزی و حەسودی و خۆ بە زلزان و دەستدرێژی و دوژمنایەتی و شەڕ و خراپە و ئازاردانی خەڵك و غەش و ناپاکی.

بانگەرێك بانگی دەکات بۆ ئەخلاقی ئاژەڵی ئەوەش بریتییە لە بانگکەری شەهوەت.

بانگەرێکیش بانگی دەکات بۆ ئەخلاقی فریشتە: لە چاکە و ئامۆژگاری و زانست و گوێڕایەڵی.

**حەقیقەتی پیاوەتی(مرۆڤدۆستی):** ئەوەیە کە رقت لە دوو بانگکەرەکەی تر بێت و وەڵامی بانگکەری سێیەم بدەیەوە، کەمی پیاوەتی یان نەبوونی پیاوەتی: بریتییە لە خۆدانە دەم ئەو دوانە و رووکردنە بانگەوازەکەیان لە هەر کوێیەك بن.

**مرۆڤدۆستی و پیاوەتی و جوامێری:** هەر هەموو لە یاخیبوون لەو دوانەوەو وەڵامدانەوەی سێیەمیان سەر هەڵدەدەن، وەك هەندێك لە پێشین دەفەرموون: فریشتەکان ژیر و بێ شەهوەت دروست کران، ئاژەڵانیش بە شەهوەت و بەبێ ژیری دروستکران، مرۆڤ دروستکرا و ژیری و شەهوەتی تیادانرا، هەر کەس ژیری بەسەر شەهوەتیدا زاڵ ببێت دەگات بە کۆڕی فریشتەکان، هەر کەس شەهوەتی بەسەر ژیریدا زاڵ ببێت دەچێتە ئاستی ئاژەڵانەوە.

بۆیە دەربارەی سنوور و مەرزی پیاوەتی وتراوە بریتییە لە زاڵبوونی ئەقڵ بەسەر شەهوەتدا.

فەقیهان دەربارەی سنوور و مەرزی دەڵێن: بەکارهێنانی هەموو ئەوەی بەندە جوان دەکات و دەیڕازێنێتەوە و وازهێنان لە هەموو ئەوەی پیسی دەکات و پێی ناشیرین دەبێت.

وتراوە: پیاوەتی بریتییە لە بەکارهێنانی هەموو ئەخلاقێکی جوان و باش و دوورکەوتنەوە لە هەرچی ئەخلاقی نابوود و ناشیرینە.

**حەقیقەتی پیاوەتی:** بریتییە لە دوورکەوتنەوە لە ئەخلاقی نزم و ناپەسەند لە قسە و گوفتار و ڕەفتار و کاروکردەوەدا.

**پیاوەتی زمان:** بریتییە لە شیرینی و پاکی و نەرمونیانی، و چنینەوەی بەری شیرین نیی بە ئاسانی.

**پیاوەتی ئەخلاق:** بریتییە لە: بەرینی و وەلاکردنی بۆ کەسی خۆشەویست و بۆ غەیری خۆشەویست.

**پیاوەتی ماڵ:** لە جێگەیەك بیبەخشی کە ئەقڵ و عورف و شەرع بە پەسەندی دەبینێت.

**پیاوەتی پلە و پایە:** بەخشین و بەکارهێنانی بۆ کەسی ئاتاج.

**پیاوەتی ئیحسان:** پەلەپێکردن و ئاسانکردن و فەراهەمهێنان و نەبینین و سەرنجنەدانی چاکەکە لەکاتی ڕوودانی چاکەکەدا، هەروەها لەبیری خۆ بردنەوە دوای ڕوودانی، ئەمە بریتییە لە پیاوەتی بەخشین و چاکە.

**پیاوەتی دەستبەرداربوون و وازهێنان:** بریتییە لە وازهێنان لە ناحەزی و دوژمنایەتی و لۆمەکردن و داوالێکردن و دەمەقاڵێ و چەلەحانێ و هەروەها وازهێنان لە دەرخستنی ئەنگی و ناتەواوی ئەو کەسانەی حەقێکت دەخۆن و نەگەڕان بەدوای عەیبەکانیدا و خۆبێئاگاکردن لە هەڵە و تێکەوتنەکانی مەردوومان و وایان لێ بکەیت وابزانن کە تۆ هیچ جۆرە هەڵەیەکت نەبینیوە، هەروەها ڕێزنان لە کەسی بە تەمەن و پارێزگاریی لە حورمەتی هاوتەمەنی خۆت و چاودێری ئەدەبی کەسی منداڵ و بچووك، ئەمەش لە سێ پلەدایە:

**پلەی یەکەم:** پیاوەتی مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا، ئەوەش ئەوەیە خۆی ناربهێنێت لەسەر خۆجوان کردن و خۆڕازاندنەوە و وازهێنان لەوەی پیس و ناشیرینی دەکات، بۆئەوەی

لە ئاشكرادا ئەو سیفەتانە تیایدا ببێت بە مەلەكە، هەر كەس شتێكی لە پەنهان و تەنهاییدا ویست لە ئاشكرا و دەركەوتەیدا بەدەستی دەهێنێت، لە تەنهاییدا نەنگییەكانی دەرناكەون، لە پەنهاندا دەنگ بەرز ناكاتەوە هەتا بەدەنگی نزم كارەكانی جێبەجێ بێن، و چاوچنۆكی و فرەخۆری ناكات لە تەنهاییدا وەك چۆن لەگەڵ خەڵكیدا ئەو كارە ناكات.

بە كورتی و پوختی: هیچ شتێك لە تەنهاییدا ناكات وەك چۆن پێی ناخۆشە لەناو خەڵكیدا ئەنجامی بدات، مەگەر كارەكە شەرع و ئەقڵ تەنها لە پەنهاندا بە ڕەوایان بینیبێت، وەك چوونە لای هاوسەر و چوونە سەر ئاو، و هاوشێوەی ئەوانە.

**پلەی دووەم:** پیاوەتی لەگەڵ خەڵك: بەوەی مەرجی ئەدەب و حەیا و ئەخلاقی جوانیان لەگەڵ بەكاربهێنێت، ئەوەی بۆ خۆی ناخۆشە لەگەڵی بكرێت لەگەڵ خەڵكیدا ئەنجامی نادات و ناینوێنێت، هەموو ئەوەی بە خراپ و ناپەسەندی دەبینێت لە قسە و كردار و ڕەفتار با لێی دووربكەوێتەوە، ئەوەی پێیخۆشە بۆ خۆی و بەجوانی دەبینێت با بۆ خەڵكی نیشان بدات.

خاوەنی ئەم جۆرە لە ڕۆشنبینی سوود و قازانج لە هەموو ئەوانە دەبینێت كە تێكەڵیان دەبێت و دۆستایەتییان دەكات لە كەسی كامڵ و تەواو و ناكامڵ و ناتەواو، كەسی ڕەوشت ناپەسەند و كەسی ئەخلاق جوان، هەروەها كەسی خاوەن پیاوەتی و كەسی بێ هەڵوێست.

زۆرێك لە خەڵكی: پیاوەتی فێردەبن و ئەخلاقی جوان بەدەست دەهێنن لەو كەسانەوە كە دژەكانی ئەوانەیان هەڵگرتووە، وەك لە هەندێ لە گەورەكانەوە دەگێڕنەوە: خزمەتكارێكی ڕەفتار خراپ و ناپەسەندی هەبوو، كەسێكی وشك و توندوتیژ و ڕقاوی، كەسێكی نەشیاو نەگونجاو، پرسیاریان لێكرد بۆ لای خۆت ڕاتگرتووە ؟ فەرمووی: لێكۆڵینەوەی ئەخلاقی مەزن و جوانی لەسەر دەكەم.

زانینی دژەكان ئەخلاقی باش و پەسەند لەلای مرۆڤ تۆخدەكاتەوە، ئەوەش بە خۆڕاهێنان لەسەر هاوەڵی كردنی كەسە بەدكارەكە و تێكەڵبوونی و ئارامگرتن لەسەری.

**پلەی سێیەم:** پیاوەتی لەگەڵ خودای موتەعالدا: بەوەی شەرم بكەیت لە سەیركردنی ئەو-سبحانە- بۆت، هەروەها ئاگاداربوونی لێت لە هەموو چركە و هەناسەیەكدا،

چاككردنی نەفسی خۆت تا دەتوانيت، چونكە خودا ئەو نەفسەی لێكڕيوت، تۆش دەبێ هەوڵبدەی فرۆشراوەكەی رادەست بكەيت، و نرخەكەی وەربگريت، لە پياوەتی ناژمێررێت: بەو گشتە عەيب و عارەوە نەفسەكەی تەسليم بكەيت و داوای نرخی تەواويش لە خودا بكەيت، هەروەها دەبێت منەتی خودايی لەو خۆچاككردنەدا ببينيت، چونكە ئەو سەرۆكاری چاككردنەكەيە، نەك تۆ، بۆيە حەياكردن بێنيازت دەكات لە ڕێوڕەسمی سروشت، هەروەها خەريكبوونت بە چاككردنی نەنگييەكانی خۆتەوە بێنيازت دەكات لە لاكردنەوە بەلای نەنگی خەڵكييەوە، لە كۆتايشدا بينينی حەقيقەت بێنيازت دەكات لە بينينی كار و كردەوە باشەكانی خۆت و كاری چاككردنی خۆت.

هەموو ئەوەی باسكرا لە مەنزيلەی ((ئەخلاق)) و ((جوامێری)) هەر هەموو لە دەروازەی ((پياوەتی))يەوەيە.

❁ ❁ ❁

## (٣٧) (منزلة الإرادة)

# مەنزیلەی ئیرادە

لە مەنزیلەکانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی ئیرادەیە.

خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ﴾ الأنعام: ٥٢، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰٓ (١٩) إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِ ٱلْأَعْلَىٰ (٢٠) وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ (٢١) ﴾ الليل: ١٩ – ٢١، هەروەها ئایەتی ﴿ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا (٢٩) ﴾

دەربڕینی ئەهلی ڕێگەی بەرەو خوداچوون بۆ ئەم مەنزیلەیە جۆراوجۆرە، زۆربەیان وادەگەیەنن بریتی بێت لە وازهێنان لە خووخدە و دەقپێوەگرتن.

مانای ئەمە ئەوەیە: کە عادەتی خەڵکی بەزۆری کۆچکردنە بۆ نیشتمانی بێئاگایی و وەڵامدانەوەی بانگکەری شەهوەت و لکان بە زەوی سروشتەوە، کەسی مورید(ئەو کەسەی خودای دەوێت) لە هەموو ئەمانە هاتۆتە دەرەوە، دەرچوونی لەوانە بەڵگە و نیشانەی دروستیی ویست و لێبڕانییەتی، بۆیە هاتنە دەرەوە و دەرچوون لێیان بە "ئیرادە" ناوبراوە.

وتراوە: ئیرادە بریتییە لە ڕاستبوونەوەی دڵ بۆ گەڕان بەدوای حەقدا–سبحانه–.

دەوترێت: ئیرادە تامەزرۆبوون و کڵپە و گڕێکە هەموو ترس و شڵەژانێك ئاسان دەکات.

دەقاقی دەڵێت: ئیرادە تامەزرۆبوون و کڵپە و گڕێکە لە فوئاددا، گەستنێکە لە دڵدا، خۆشەویستییەکە لە ویژداندا، بێزاربوونێکە لە ناوەوە، گڕێکە بەربووەتە دڵ و دەروون.

وتراوە: لە سیفەتەکانی مورید: خۆ خۆشەویستکردنە لەلای خودا بە نەوافیل (سوننەتەکان)، دڵسۆزی لە ئامۆژگاری ئوممەتدا، و هۆگربوون بە تەنهاییەوە، هەڵبژاردنی فەرمانی خودای موتەعال، حەیا لە سەیرکردنی خودا بۆ ئەو، و بەختکردنی هەموو هەوڵ و تواناکان، دەستبردن بۆ هەر هۆکارێکی شەرعی مرۆڤ بە خودا بگەیەنێت، قەناعەت، و ئارامنەگرتنی دڵ تا نەگات بە دۆست و مەعبوودی حەقی خۆی.

وتراوە: حوكمی مورید بەم جۆرەیە: خەوی: دەبێت خەو زاڵبێت بەسەریدا، خواردنی: دەبێت ئەوپەڕی برسێتی بێت، و قسەكردنی: بۆ پێویست بێت.

ئەبو عوسمانی حیری دەڵێت: هەر كەس هەر لە سەرەتاوە ئیرادەكەی راست و دروست نەبێت چەند رۆژێك بەسەریدا گوزەر دەكات و پشت دەكاتە رێگە و ئەهلی رێگە.

هەروەها دەڵێت: مورید گەر شتێك لە زانستی ئەهلی رێگەی وەرگرت و كاری پێ كرد لە دڵیدا دەبێت بە حیكمەتێك كە تا دواین رۆژی تەمەنی سوودی لێ دەبینێت، هەر كات قسە دەكات ئەوانەی دەیبیستن سوودی لێ دەبینن، هەر كەس شتێك لە زانستی ئەهلی رێگەی بەردەست بكەوێت و كاری پێ نەكات ئەوە تەنها حكایەتێكە چەند رۆژێك لەبەریەتی و پاشان لەبیری دەچێتەوە.

یەحیای كوڕی مەعاز دەڵێت: ناڕەحەتترین شت لەسەر مورید تێكەڵبوون و مامەڵەكردنی دژەكانە.

زانستی سلوك لەسەر ئیرادە بیناكراوە، ئیرادە بنچینە و راگری كۆشكەكەیەتی، سلوك وردەكارییەكانی ئەحكامی ئیرادە لەخۆدەگرێت كە بریتییە لە كار و جووڵەی دڵ، وەك چۆن فیقە وردەكارییەكانی ئەحكامی ئەندامەكان لەخۆدەگرن.

مورید سەرنجی ئەو كار و جووڵانە دەدات لەو گۆشەنیگاوە كە یان بە مورادی خۆی دەگەیەنن، یان لە موراد دایدەبڕن، دڵی دەهێننە راستە، یاخود رووبەڕووی تێكچوونی دەكەنەوە.

لەمەدا سێ شت پێویستە: دەروونێكی ئامادە و شایستە كە تەنها بانگكەرێكی پێویستە، و بانگێكی گوێبۆگیراو، و چۆڵكردنی رێگە لە هەر رێگرێك.

هەر كەس رووبەڕووی دابڕان بووبێتەوە لە یەكێك لەم سێ رووەوە تووشی دابڕان بووە.

لە پێشەكییەكانی: كۆچكردن لە عادەت بە دروستیی زانست)، لەگەڵ صدق لە مەبەست و مەرامدا، و خۆدارنین لە هەرچی شتێك مرۆڤ خەرۆ و خەریك دەكات، ئەمە تەبایە لەگەڵ قسەی ئەوانەی كە سنووری ئیرادە لەلایان بریتی بوو لە: پێچەوانەی عادەت، كە وازهێنانە لە دەقپێوەگرتووەكانی نەفس، و حەز و مەیل و بەتاڵییەكانی، ئەو كارەش ئەنجام نادرێت بەم شتانە نەبێت كە بریتین لە: هاوەڵی كردنی زانست و

دەستکردنە ملی، زانست نوورێکە بەهۆیەوە بەندە ئەو شوێنانەی پێ دەناسێتەوە کە پێویستە داوای بکات و بەدوایدا عەودالْ بێت، هەروەها ناسینەوەی ئەو شوێنانەی کە دەبێت لێی دووربکەوێتەوە، هەر کەس هاوەڵی زانست نەکات "ئیرادە"ی بۆ نایەتە راستە بە کۆدەنگی قسەی راستگۆیان، قسەی رێگرانی رێگەی خودا نابێت بە بەڵگە.

ئەوەی کۆمەکی سالیك دەکات لەسەر دووركەوتنەوە لە عادەت بریتییە لە دووركەوتنەوە لەو رێگر و کۆسپ و لەمپەرانەی دێنە سەر رێگەی سلوك، لە هاوەڵی کردنی نەیار و ئەهلی بەتاڵە، هیچ شتێك بۆ مورید لە هاورێی رێگر بۆ لای خودا زیان بەخشتر نییە، با ئەوپەڕی هەوڵبدات خۆی لێیان نامۆ بکات.

کە ئەو پێشەکییانە بۆ مورید هاتە راستە: رادەستی ئاسوودەیی هۆگربوونی دەکەن بە خوداوە، و رۆیشتن لە نێوان گرژبوون(القبض) و کرانەوە (البسط)دا، بۆیە لە مەقامی رێورەسمی کاروکردەوەکانەوە دەگوێزێتەوە بۆ مەقامی حەقائق و حاڵ و زەوق، لە ئیسلامەوە بۆ ئیمان بەرز دەبێتەوە، و لە ئیمانەوە دەچێت بۆ ئیحسان، سالیك لە سەرەتاوە ماندوێتی و گرانی ئەنجامدانی کاروکردەوەکان دەچێژێت بەهۆی نەبوونی هۆگربوون لە دڵدا بە خوداوە، کە لە دڵدا رۆحی هۆگربوون بە خوداوە سەریهەڵدا ئەو ماندووبوون و گرانییەی لەسەر نامێنێت، ئەوکات دەبنە بیلبیلەی چاو و هێز و چێژ بۆی، نوێژ دەبێت بە رۆشنکەرەوەی چاو، پاش ئەوەی کە کارێکی گران بوو لەسەری، پێی ئاسوودە دەبێت دوای ئەوەی داوای ئاسوودەیی دەکرد لەدەست نوێژ، بەشە میراتی لە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بەردەکەوێت کە بە بیلالی دەفەرموو ((بە بانگدان بۆ نوێژ ئاسوودەمان بکە ئەی بیلال))، هەروەها دەیفەرموو((بیلبیلەی چاوم لە نوێژدایە))، ئەوەش بەپێی ئیرادە و خۆشەویستی و هۆگربوونی بە خوداوە(ﷻ) هەروەها بەپێی نامۆبوون و غەریبکەوتنی لە هەرچی شتە جگە لە خودا.

"رۆیشتن لە نێوان گرژبوون (القبض) و کرانەوە (البسط)دا:

گرژبوون و کرانەوە دوو حاڵەتن روودەکەنە هەموو سالیکێك: تاوێك لە ترسان لە خودا و تاوێك لە هیوا و رجا بە خوداوە سەرهەڵدەدەن، ترس گرژی دەکات و هیوا و رجاش کرانەوەی بۆ دروست دەکەن.

هەروەها تاوێك لە وەفاوە و تاوێك لە جەفاوە سەرهەڵدەدەن، وەفا كرانەوەی پێدەبەخشێت و جەفاش گرژبوون، هەندێ جار گرژبوونێك هێرش دەهێنێت بۆ سەر دڵی سالیك و نازانێت هۆیەكەی چییە، حوكمی خاوەنی ئەم جۆرە گرژبوونە دوو شتە:
یەكەم: تەوبەكردن و داوای لێخۆشبوون، چونكە ئەو گرژبوونە بەهۆی خراپەیەكەوە هێرشی هێناوە، یان بەهۆی جەفا و بێئاگاییەكەوە كە هەستی پێ ناكات.
دووەم: خۆڕادەستكردن و تەسلیمبوون بەو حاڵە تا ئەو كاتە بەسەریدا گوزەر دەكات، خۆی بە لادانی گرژبوونەكەوە خەریك ناكات و كاتەكانی بەوەوە بەخت ناكات تا وای لێبێت گرژبوونەكە زاڵببێت بەسەریدا، لە نیوەشەودا بەدوای بەرەبەیاندا ناگەڕێت، با كەسەكە بۆخۆی رابكشێت تا بەشێكی زۆری شەو دەڕوات و بەرەبەیان نزیك دەبێتەوە، و سپێتی دڕ بە شەوەزەنگ دەدات، بەڵكو ئارام دەگرێت تا مەلیك بۆخۆی هێرش دەكاتە سەری، چونكە گرژبوون و كرانەوە لەلای خودایە و لەدەستی ئەودایە.
هەر بەو جۆرە گەر واریدێكی كرانەوە(البسط) هێرشی كردە سەری: با خۆی لە جووڵە و لەرزین بپارێزێت با بە سكونایی و خۆگرمۆڵەكردن خۆی لێ دووربخاتەوە، كەسی ژیر لەسەر راخەر(البساط)ە و خۆی لە والآكردن (الإنبساط) بەدووردەگرێت، ئەمە شانوشكۆی كەسە ژیرەكانە لە ئەهلی دونیا و سەركردەكانیان كاتێك شتێكیان بۆ هات كە دڵخۆشیان بكات و كرانەوەیان تووش بكات و خۆشحاڵییان رووبەڕووی هەڵچوون بكاتەوە، لەو بارەدا بە سكون و جێگیری و نەبزوان رووبەڕووی دەبنەوە، تا وەك ئەوەی هیچ كرانەوەیەك رووی تێنەكردبن، كەعبی كوڕی زوهەیر لە مەدحی كۆچكەراندا دەڵێت:

لیسوا مفاریح إن نالت رماحهم قوما    وليسوا مجازيعا إذا نيلوا

كرانەوە لە ئیستیقامە و وەستان بە ئەدەبەوە لەبەردەم پەروەردگاردا دووری ناخاتەوە.

❁ ❁ ❁

## (٣٨) (منزلة الأدب)

# مەنزیلەی ئەدەب

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی ئەدەبە.

خـــودای موتـــەعال دەفـــەرموێت ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ ﴾ التحريم: ٦، ئیبن عـەباس و كەسـانی تـریش دەڵـێن: ئـەدەبیان دابـدەن و فێریان بكەن.

ئەم گوزارەیە رێگە دەدات بە كۆبوونەوەی مرۆڤ لەگەڵ یەكتر، ئەدەبیش كۆبوونەوەی خەسڵەتی خێرە لە مرۆڤدا، لەوانە كۆبوونەوەی سەرسفرە و خوان(المأدبة) كـە بریتییـە لەو خواردنەی خەڵك لەسەری كۆدەبێتەوە.

زانستی ئەدەب: بریتییە لە زانسـتی چـاككردنی زمـان و گوفتـار، و بـەكارهێنانیان لـە شـوێنی خۆیـان، و جـوانكردنی وشـە و دەربـڕین و پارێزگـاری لـێ كردنـی لـە هەڵـە و تێكەوتن، ئەوەش بەشێكە لە ئەدەبی گشتی، خودا باشتر دەزانێت.

### ۞ رێگەكانی ئەدەب

ئـەدەب سـێ جـۆرە: ئـەدەب لەگـەڵ خـودای موتەعالـدا، ئـەدەب لەگـەڵ پێغەمبـەری خودادا(ﷺ)، ئەدەب لەگەڵ خەڵكیدا.

**ئەدەب لەگەڵ خودادا سێ جۆرە:**

**یەكەم:** پارێزگاری لە ئەدەبی مامەڵەكردن لەگەڵ خودا تاكو كـەم ئـەدەبی تێكـەڵ بـە مامەڵەكەی نەبێت.

**دووەم:** پاراستنی ئەدەب لە دڵدا تاكو لا بەلای كەسی تردا جگە لە خودا نەكاتەوە.

**سێیەم:** پاراستنی ئەدەب لە ئیرادەدا تاكو وابەستەی هیچ شـتێكی تـر نـەبێت كـە بـە هۆیەوە خودا رقت لێ هەڵبگرێت.

یەحیای كوڕی مەعاز دەفەرموێت: هەر كەس بە ئەدەبی خـودا خـۆی ئـەدەب دابـدات دەبێت بە ئەهلی خۆشەویستی خودا.

ئیبن موبارەك دەفەرموێت: ئێمە بە كەمێك ئەدەب ئاتاجترین لە زۆرێك لە زانست.

پرسیار لە حەسەنی بەصری كرا لە بەسوودترین ئەدەب؟ فەرمووی: تێگەیشتن لە دین، و زوهد لە دونیا، و زانینی ئەو ئەركانەی لەسەر شانتە.

سەهل دەفەرموێت: ئەهلی خودا داوای كۆمەكیان لە خودا كرد بۆ جێبەجێ كردنی ئەو شتانەی خودا پێیخۆشە و دەیەوێت، بۆ خوداش لەسەر ئادابی خودا ئارامیان گرت.

دیسان ئیبن موبارەك دەفەرموێت: كاتێك بەدوای ئەدەبدا گەڕاین كە ئەدەب دادەرانمان لەدەست چوو.

هەروەها دەفەرموێت: ئەدەب بۆ كەسی عاریف وەك تەوبەكردن وایە بۆ ئەو كەسەی تێهەڵدەچێتەوە(جارێكی تر تەوبە لە تەوبەكەی دەكات).

كاتێك جونەید بە ئەبو حەفصی فەرموو: هاوەڵەكانت بە ئەدەبی سوڵتانەكان ئەدەب داداوە، فەرمووی: ئەدەبی جوان لە دەرەوەدا نیشانەی ئەدەبی جوانە لە ناوەوە، ئەدەب لەگەڵ خودا بریتییە لە هاوەڵی كردنی باش لەگەڵی، بەوەی جووڵەی ناوەوە و دەرەوە بەپێی داواكاری بە مەزن زانین و شكۆ و حەیا بێت، وەك حاڵی دانیشتی مەلیكەكان و هاوەڵی كردنیان.

سەهل دەفەرموێت: هەر كەس زاڵ بێت بەسەر نەفسی خۆیدا ئەو كەسە خودا بە ئیخلاصەوە دەپەرستێت.

عەبدوڵای كوڕی موبارەك دەفەرموێت: خەڵكی قسەی زۆریان لە ئەدەب كردووە، ئێمە دەڵێین: بریتییە لە ناسینی نەفس و نەزانی و كەمتەرخەمیەكەی، و دووركەوتنەوە لەو نەزانی و كەمتەرخەمیانە.

ئەبو عوسمان دەفەرموێت: كە خۆشەویستی دروست بوو لەسەر خۆشەویست پێویست دەبێت بە ئەدەبەوە پابەند بێت.

سەرنجی حاڵی پێغەمبەران بدە -صلوات الله وسلامه علیه- لەگەڵ خودا، تێڕابمێنە لە گوفتار و پرسیاریان، هەر هەموو دەبینییەوە لێوانلێوە بە ئەدەب و وەستاو بە ئەدەبەوە.

مەسیح (عليه السلام) لە ڕۆژی دواییدا بە خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿إِن كُنتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ﴾ المائدة: ١١٦، واتە گەر وتبێتم من و دایكم لەخوار خوداوە بپەرستن تۆ

دەتزانــی و زانـا و ئاگـاداری پێـی، نافــەرموێت "نـەموتووە"، جیـاوازی نێـوان دوو وەڵامەکە لە حەقیقەتی ئەدەبدایە، پاشان کارەکەی تەحویل کردە سەر زانستی خـودا بە حاڵ و بە پەنهان، و فەرمووی﴿ تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي ﴾المائدة: ١١٦، پاشان نەفسی خۆی بەریکرد لە زانست بە پەنهانی پەروەردگار و ئەوەی تایبەتمەندی خودای موتەعالـە، و فەرمووی﴿ وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَ ﴾المائدة: ١١٦، پاشان سەنای پەروەردگاری خۆی کـرد و بە تاکو تەنهایی لە زانستی پەنهان وەسفی کرد و فـەرمووی ﴿ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ﴾ المائدة: ١١٦، پاشان نەریی ئەوەی کرد شتێکی پـێ وتـبن جیـا لـەوەی پـەروەردگاری فەرمانی پێ کردبوو کە بریتیی بوو لە یەکتاپەرستی، دەفـەرموێت ﴿ مَا قُلۡتُ لَهُمۡ إِلَّا مَآ أَمَرۡتَنِي بِهِۦٓ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡ ﴾المائـدة: ١١٧، پاشـان شـایەتی خـۆی لەسـەر ئـەوان رادەگەیەنێت لەو ماوەیەی کە لە ناویاندا بووە و دوای مردنی هیچ ئاگاییـەکی نـەبووە لەسەریان، تەنها خودای موتەعاله لە دوای مردنی کەسەکان ئاگـایی لەسـەر زینـدووان هەیـە، دەفــەرموێت ﴿ وَكُنتُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا مَّا دُمۡتُ فِيهِمۡۖ فَلَمَّا تَوَفَّيۡتَنِي كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيۡهِمۡ ﴾ المائدة: ١١٧، پاشان وەسـفی خـودای موتـەعالی کـرد کـە شـەهادەتی لەسـەر هـەموو شەهادەتێکەوەیە و گشتگیرترە لە هـەموو شـەهاتێکی تـر، دەفـەرموێت ﴿ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴾ المائدة: ١١٧، پاشان فەرمووی﴿ إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَ ﴾المائدة: ١١٨، ئەمە جـوانترین و رەوانتریـن ئەدەبـە لـە خزمـەتی خـودادا و لـەم جـۆرە مەقامـەدا، واتــە شانوشکۆی سەردارێك کە بەزەیی و چاکەی هەیە بە بەندەکانی، ئەوانە بەندەی خۆتن و بەندەی هیچ کەسێکی تر نین، گـەر سـزایان بـدەی-لەگـەڵ ئـەوەی ئـەوان بەنـدەی تۆن- گـەر بەنـدەی خـراپ و پـیس نەبوونایـە لـە خـراپترین و پیسـترین بەنـدەکان و یاخیبووترین لەگەڵ سەردارەکەیان: ئەوا تۆ سزات نەدەدان، چونکە نزیکی بەندایـەتی چـاکە و بـەزەیی سـەردارەکە بـەدوای خۆیـدا دەهێنێـت بـۆ بەنـدەکانی، بۆچـی بەبەزەیترین خاوەنی بـەزەیی و بەخشـندەترین خـاوەن بەخشـندەیی و چـاکەکارترین خـاوەن چـاکە دەبێـت سـزای بەنـدەکانی بـدات؟ گـەر زیـادەڕەوی لـە یـاخیبوون و سەرپێچی و شایستەبوون بە سزا نەبێت.

فەرموودەی کە پێشتر هات ﴿ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ﴾ المائدة: ١١٦، واتە ئەوانە بەنـدەی تۆن، تۆ زاناتری بە نهێنی و پەنهان و ئاشکرایان، بۆیە گەر سزایان بدەی: لەسەر ئـەو

زانستە سزایان دەدەی کە لەلای خۆتە بەوەی سزایان بدەی لەسەری، ئەوانە بەندەی تۆن و تۆ زاناتری بەوەی درۆینەیان کردووە و بەدەستیان هێناوە.

ئەوەش مەدح و سەنایە بۆ خودا و دانپیانان بە حیکمەت و دادپەروەری ئەودا، و کەماڵی زانستی بە حاڵی بەندەکانی و شایستەبوونیان بە سزا.

پاشان فەرمووی﴿ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ المائدة: ١١٨، نەیفەرموو (الغفور الرحیم) ئەمەش رەوانترین ئەدەبە لەگەڵ خودا–سبحانه– ئەو قسەی لە کاتێکدا کرد کە کاتی تووڕەبوونی پەروەردگار بوو لە شوێنکەتووانی مەسیح (عليه السلام)، کاتی دەرکردنی فەرمان بوو بۆ چوونە ناو ئاگریان، ئەو کاتە کاتی داواکردنی بەزەیی و شفاعەت نییە، بەڵکو مەقامی خۆبەریکردنە لێیان، گەر بویتبا (فإنك أنت الغفور الرحیم) هەست بەوە دەکرا کە دەیەوێت داوای سۆز و بەزەیی خودا بکات بۆ دوژمنانی خودا کە تووڕەبوونی خودا لەسەریان زۆر توند بووەتەوە، مەقامەکە مەقامی تەباییە لەگەڵ تووڕەبوونی خودادا لەسەر ئەو کەسانەی کە پەروەردگار لێیان تووڕە بووە، بۆیە خۆی لادا لە باسکردنی ئەو دوو سیفەتەی کە سۆز و بەزەیی و لێبووردنی تێدایە و دوو سیفەتی تری هێنا کە عیززەت و حیکمەتە و کەماڵی توانین و کەماڵی زانست لەخۆ دەگرن.

ماناکەی: گەر لێیان ببووریت لێبووردنەکەت لە کەماڵی دەسەڵات و زانستەوەیە، بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە نەتوانیت تۆڵەیان لێبکەیەوە، یان بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە تاوان و خراپەکانیان لە تۆ شارابێتەوە، ئەمە لەبەر ئەوەی بەندە هەندێ جار لە کەسێك خۆشدەبێت بەهۆی دەستەوسانی لە تۆڵەسەندنەوە، و نەزانینی بە بڕی ئەو تاوانەی دەرحەقی کراوە، کەماڵ لە لێبووردنی کەسی خاوەن دەسەڵات و خاوەن زانینیدایە، ئەوەش تەنها پەروەردگاری عەزیز و حەکیمە.

باسکردنی ئەو دوو سیفەتە، یان ئەو دوو ناوە (العزیز، الحکیم) لەو مەقامەدا خودی ئەدەبە لە قسە و گفتوگۆ لەگەڵ خودادا.

لە هەندێ ئاساردا هاتووە ((هەڵگری عەرش چوارن: دوانیان دەڵێن: "سبحانك اللهم ربنا وبحمدك لك الحمد على حلمك بعد علمك، دوانەکەی تر دەڵێن: "سبحانك اللهم ربنا وبحمدك، لك الحمد على عفوك بعد قدرتك")) بۆیە هەر یەکێك لەم دوو سیفەتە بە

سـیفەتێكی تـرەوە وابەسـتە بـووە، وەك ئایـەتی﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴾ النسـاء: ١٢، هەروەها﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ﴾ النساء: ٩٩.

هەر بەو جۆرە فەرموودەكەی ئیبراهیم خەلیل(ﷺ) ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَنِى فَهُوَ يَهْدِينِ ﴿٧٨﴾ وَٱلَّذِى هُوَ يُطْعِمُنِى وَيَسْقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾ ﴾ الشعراء: ٧٨ — ٨٠، نەیفەرموو كاتێك نەخۆشم دەخات، ئەمەش بۆ پارێزگاری ئەدەب لەگەڵ خودا.

هەر بەو جۆرە وتنەكەی "خضر"(عليه السلام) دەربارەی كونكردنی كەشتییەكە دەفەرموێت ﴿ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا ﴾ الكهف: ٧٩، نەیفەرموو"پەروەردگارت ویستی كەشتییەكە عەیبدار بكـات"، دەربـارەی دوو منداڵـە هەتیوەكـەش دەفـەرموێت ﴿ فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبْلُغَآ أَشُدَّهُمَا ﴾ الكهف: ٨٢.

هەر بەو جۆرە قسـەی بـاوەڕدارە جنییەكـە﴿ وَأَنَّا لَا نَدْرِىٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا ﴿١٠﴾ ﴾ الجن: ١٠

وردتر لە هەموو ئەمانە داوایەكەی موسا(عليه السلام) ﴿ رَبِّ إِنِّى لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَىَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴿٢٤﴾ ﴾ القصص: ٢٤

هـەروەها داوای لێخۆشـبوونەكەی ئـادەم(عليه السلام) ﴿ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأعراف: ٢٣

هـەروەها نـزا و پاڕانـەوەكانی ئـەیوب(عليه السلام) ﴿ وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾ الأنبياء: ٨٣

هەر بـەو جـۆرە داواكـەی یوسـف(عليه السلام) ﴿ وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأْوِيلُ رُءْيَٰىَ مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّى حَقًّا وَقَدْ أَحْسَنَ بِىٓ إِذْ أَخْرَجَنِى مِنَ ٱلسِّجْنِ ﴾ یوسف: ١٠٠، نەیفەرموو لە چاڵەكە دەریهێنام، بۆ پارێزگاری ئەدەب لەگەڵ براكانی، تاكو شەرمەزار نەبن بەوەی لە چاڵەكەدا روویدا، فـەرمووی ﴿ وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلْبَدْوِ ﴾ یوسـف: ١٠٠، نەیفـەرموو ((برسـێتی و مانـدووبوونی لەسـەر هـەڵگرتن)) بـەهۆی ئـەدەب لەگـەڵ خانەوادەكـەی، ئـەوەی روویـدا دایـە پـاڵ هۆكارەكە، نەیدایە پاڵ راستەوخۆكە كە ئەوە لێی نزیكترە، بۆیـە فـەرمووی ﴿ مِنۢ بَعْدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيْطَٰنُ بَيْنِى وَبَيْنَ إِخْوَتِىٓ ﴾یوسف: ١٠٠، بۆیە یوسف (عليه السلام) حـەقی بەخشـندەیی و جوامێری و ئەدەبی بە جوانترین شێوە ئەدا كرد، بۆیە كـەماڵی ئـەم ئەخلاقـە تـەنها بۆ پێغەمبەرانە—علیهم صلوات الله وسلامه—.

لێرەوەیە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی بە پیاوێك كرد كە عەورەتی داپۆشێت با چۆڵیش بێت و كەس نەیبینێت، وەك ئەدەبێك لەگەڵ خودا، و بەپێی نزیكی ئەو كەسە لە خوداوە، و بە مەزن زانین و شانوشكۆدانە پاڵی، لەوێشەوە حەیایەكی زۆر لێی و ناسینی ویقار لەگەڵی.

هەندێك لە عاریفان دەڵێن: لە دەرەوە و ناوەوە بە ئەدەبەوە پابەند ببە، هەر كەس ئەدەبی دەرەوە بشكێنێت بە دەرەوە سزا دەدرێت، هەر كەس ئەدەبی ناوەوە بشكێنێت بە ناوەوە سزا دەدرێت.

عەبدوڵای كوڕی موبارەك –رەحمەتی خودای لێ بێت– دەفەرموێت: هەر كەس بە كەم تەماشای ئەدەب بكات بە بێبەشبوون لە سوننەتەكان سزا دەدرێت، هەر كەس بەكەم تەماشای سوننەتەكان بكات بە بێبەشبوون لە فەرزەكان سزا دەدرێت.

وتراوە: ئەدەب لە كاردا نیشانەی قبووڵ بوونی ئەو كارەیە.

حەقیقەتی ئەدەب بریتییە لە بەكارهێنانی ئەخلاقی جوان، بۆ ئەو مەبەستە ئەدەب دەرهێنانی ئەوەیە كە لە سروشتی مرۆڤدایە لە كەماڵ لە دۆخی هێزەوە بۆ دۆخی كردار.

خودای موتەعال مرۆڤی ئامادە كردووە بۆ ئەوەی كەماڵی قبووڵ بێت بەوەی پێی بەخشیوە لە ئەهلییەت و ئامادەیی كە تیایدا شاراونەتەوە وەك ئاگر لە بەردی چەخماخدا، ئیلهامی مرۆڤی كردووە و توانای پێبەخشیوە و شتی پێناساندووە و ڕێنومایی كردووە، هەروەها پێغەمبەرانی بۆ رەوانە كردووە و كتێبەكانی بۆ دابەزاندووە.

بۆ دەرهێنانی ئەو هێزە كە ئیلهامی مرۆڤ كراوە لە كەماڵی هێز و ئامادەییەوە بۆ كەماڵی كردار و واقیع، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ۝٧ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ۝٨ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا ۝٩ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا ۝١٠﴾ الشمس: ٧ – ١٠، دروستكردنی نەفسی بە "التسوية"–ڕێككردن ناوهێنا تاكو ئاماژە بێت بۆ "الإعتدال والتمام"–میانەگیری و تێروتەواوی، پاشان هەواڵیدا كە چۆن ئەو نەفسە هێزی "الفجور"–خراپە و هێزی "التقوى"–چاكەی قبووڵ كردووە، بەدەستهێنانی ئەو دوانەش وەك ئامادەیی بۆ تاقیكردنەوە و ئەزموونكردنیەتی، پاشان بە رزگاری و سەرفرازی هانی ئەوانەی دا كە پاكیدەكەنەوە و گەشەی پێدەدەن و باڵای دەكەن، ئەو نەفسە بەرزیكەنەوە بەو ئەدەبەی خودا پێغەمبەران و دۆستەكانی خۆی پێ

ئەدەب داداوە، کە بریتییە لە تەقوا، پاشان حوکمی بەدبەختی و شەقاوەتی ئەوانەی دەرکرد کە ئەو نەفسە پشتگوێ دەخەن و دەیشارنەوە و سووك و کەم تەماشای دەکەن و بچووکی دەکەنەوە و وێرانی دەکەن بە ئەنجامدانی کاری خراپە(الفجور)، خودای موتەعال زاناترە.

## ۞ ڕەوشتی بەرزی پێغەمبەرایەتی

عادەتی ئەهلی ڕێگە وا جاری بووە: باسی ئەو ئایەتە پیرۆزەکە بکەن دەربارەی پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك لە شەوی میعراجدا کۆمەڵێك ئایەتی مەزنی نیشان دا، ئایەتەکە﴿ مَازَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴿١٧﴾ ﴾ النجم: ١٧، ئەبو قاسمی قوشەیری لە ریسالەکەیدا(الرسالة القشیریة) دەروازەی ئەدەب(باب الأدب)ی بەم ئایەتە کردۆتەوە، کەسانی تریش جگە لە ئەو هەر بەو جۆرە ئەم ئایەتەیان هێناوە.

وەك ئەوەی قسەی هەندێ لە ئەهلی تەفسیریان وەرگرتبێت کە دەڵێن: ئەم ئایەتە وەسفی ئەدەبی پێغەمبەرە لەو مەقامەدا، چونکە لای بەلایەکدا نەکردۆتەوە و ئەوەی بینیویەتی لاینەداوە لێی، ئەمەش کەماڵی ئەدەبە، تێکدانی ئەم ئەدەبە: ئەوەیە کە تەماشاکەر سەیری چەپ و ڕاست بکات، یان لەبەردەم سەیرکراوەکەدا زیادەڕەوی بکات و سەری بۆ هەندێ شتی تر بەرزبکاتەوە، بۆیە لاکردنەوە لادانە(زیغ)، سەرکێشانیش زیادەڕەوی (طغیان)ە، کەماڵی ڕووتێکردنی تەماشاکەر بۆ تەماشاکراو ئەوەیە: کە چاوی چەپ و ڕاست نەکات و زیادەڕەوی نەکات لە تەماشاکردن.

ئەم مانایە لە شێخی ئیبن تەیمیەوە دەستم کەوت-ڕەحمەتی خودای لێ بێت-.

لەم ئایەتەدا نهێنی سەرسامکەری تێدایە، ئەوە یەکێکە لەو ئادابە نهێنیانەی شایستە بە کاملترین مرۆڤ (ﷺ): لەو شوێنەدا بەصەر و بەصیرەت لەگەڵ یەکتر ڕێکەوتوون، هەردوو تەبابوون و تەصدیقی ئەوەیان کردووە کە بەصەر بینیویەتی، بۆیە بەصیرەتیش لەگەڵیدا ڕێکەوتووە، بۆ ئەو مەبەستەیە خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ﴿١١﴾ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ﴿١٢﴾ ﴾ النجم: ١١ - ١٢، واتە ئەوەی بەصەر بینی دڵی گرسەندوو(فؤاد)ش بینی(لێرەدا "فؤاد" مانای "بەصیرەت"ی هەیە)

بۆیە ئەبو جەعفەر ئایەتەکەی بەم جۆرە دەخوێندەوە(ما کذّب الفؤاد) شەددەی لەسەر پیتی "ذال"ەکە دادەنا، واتە "فؤاد"ی بەصەری بەدرۆ نەخستەوە، بەڵکو تەصدیقی

كردوو و لەگەڵی ڕێككەوت بەهۆی دروستی "فؤاد" و بەصەرەوە، یان هاتنە ڕاستەی "بصیرة" و "بصر"و بینینی بینراوەكە بە"بصر"و "بصیرة"، جمهور ئایەتە بەبێ شەددە "ذال"ەكە دەخوێننەوە و وەك فرمانێكی تێپەڕ و "وما رأی" دەكەن بە بەركارەكە(مفعولەكە)ی: واتە دڵی ئەوەی چاوەكانی بینی بەدرۆ ناخاتەوە، بەڵكو ڕێك و تەبا بوو لەگەڵی، تەبابوون و ڕێكبوونی دڵ لەگەڵ قاڵب و دەرەوە لەگەڵ ناوەوە و "بصر" لەگەڵ "بصیرة" بریتییە لە بەدرۆنەزانینی "فؤاد" بۆ "بصر"، چاو سنووربەزێنی نەكرد لە ڕادەی خۆی تاكو تووشی زیادەڕەوی(طغیان) ببێت، تووشی مەلەل و شەكەتیش نەبوو تا دەست بە سەیركردنی چەپ و ڕاست بكات و ڕووبەڕووی لادان(زیغ) ببێتەوە، هەر بەو جۆرە دڵ لە ڕووكردنە خودا و پشتهەڵكردن لە هەرشتێكی تر جگە لە ئەو لە ئەوپەڕی تەواویدا بوو، بە هەموو دڵەوە ڕوویكردە خودا، دڵ بۆی هەیە ڕووبەڕووی لادان(زیغ) و زیادەڕەوی(طغیان) دەبێتەوە، بەڵام هەردوو ئەو دانە لە دڵ و چاوی پێغەمبەر نەڕێكراون، دڵی لاینەداوە بە لاكردنەوە بەلای شتی تردا جگە لە خودا، هەر بەو جۆرە زیادەڕەوی نەكردووە بە تێپەڕاندنی ئەو مەقامەی تیایدا دانرابوو.

ئەمەش لوتكەی كەماڵی ئەدەبە لەگەڵ خودا كە جگە لە پێغەمبەر هیچ كەس پێی ناگات.

عادەتی دەروون بەو جۆرەیە گەر لە مەقامێكی بەرز و بڵندا دابنرێت: هەوڵدەدات سەیری باڵاتر و بەرزتر لەو مەقامە بكات، نابینی موسا(ﷺ) كاتێك لە مەقامی ئاخافتن(التكلیم)دا دانرا: نەفسی داوای مەقامی بینینی(الرؤیة) كرد؟

بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) كاتێك لەو مەقامەدا دانرا حەقی مەقامەكەی دا: چاوەكانی و دڵی لایان نەكردەوە بەلای شتێكی تردا جگە لەو مەقامەی تیایدا دانرابوو.

لەو پێناوەدا هیچ كۆسپێك نەهاتە ڕێگەی و هیچ مورادێك ڕاینەگرت تا هەر حەوت ئاسمانەكەی بڕی، هەتا موسا (ﷺ) گلەیی كرد لە خزمەتی پەروەردگاری بۆ سەرخستنی پێغەمبەر بۆ مەقامێكی سەروتر لەوەی ئەو(موسا) تێیدا بوو، دەستی بە گریان كرد، ((پێی وترا: بۆ دەگری؟ فەرمووی: گەنجێك لەدوای من دەكرێت بە پێغەمبەر و ئەوانەی لە ئوممەتی ئەو دەچنە بەهەشتەوە زۆرترن لە ئوممەتی من كە دەچنە بەهەشتەوە))، پاشان حەوت ئاسمانەكەی تێپەڕاند و گەیشتە لوتكە و هیچ ویستێك كۆسپ و لەمپەری بۆ دروست نەكردو هیچ لێبڕانێك لە كەماڵی بەندایەتی ڕاینەگرت.

بۆیە لەو شەوەدا ئەوەی سواری بوو بوو تاکو بیگەیەنێتە مەنزڵ(بوراق) هەنگاوەکانی پێش چاوترووکان دەکەوتن، پێیەکانی لە کۆتایی لاکانیدا دادەنا تاکو گونجاو بێت لەگەڵ حاڵی بوراقەکە و دووری ڕۆیشتنەکە کە لە خێراییدا پێشی هەرچی جیهان دەکەوتەوە، جیاوازی نەبوو لە نێوان پێی بوراق و بینینی شوێنی دووردا، هەر وەك چۆن پێیەکانی لە شوێنی زانراو دوانەئەکەوتن، (واتە بینین و زانین و ڕۆیشتن و گەیشتن بوون بە یەك حەقیقەت)

بەردەوام پێغەمبەر لە ئێشگری کەماڵی ئەدەبدا بوو لەگەڵ خودای موتەعال و تەواوکردنی مەقامی بەندایەتی تا هەرچی پەردەی ئاسمانەکانە پێچرایەوە و حەوت تەبەقەکەی تێپەڕاند و لەوێشەوە کەوتە سەرەوەی "سدرة المنتهى" و گەیشتە مەنزڵگای نزیکبوون لە خودا(قرب) و پێشی ئەوانەی پێش خۆی و ئەوانەی دوای خۆی کەوت، لەو شوێنەدا بەشەکانی نزیکی (قرب) لە خوداوە بە جوانترین شێوە بە سەریدا داباڕین و بۆی ملکەچ بوون، هەرچی هەوری پەردەکانە لە دەرەوە و لە ناوەوە بەدوای یەکتردا دانە بە دانە لادران و ڕەوانەوە، لە مەقامێکدا دانرا هەرچی پێغەمبەرانە خۆزگەی پێ دەخوازن، کە ڕۆژی دوایش دێت بۆ جاری دووەم مەقامێکی نزیکی تری لە خوداوە پێدەدرێت پێشینەکان و پاشینەکان خۆزگەی پێ دەخوازن، لەو شوێنەدا لە کەماڵی ئەدەبییەوە لەگەڵ خودا لەسەر شارێگەی ڕاست و دروست ڕاوەستا، چاوی لاینەدا و زیادەڕەوی نەکرد لە خزمەتی خودادا، لەو جیهانەدا خودای موتەعال لەسەر ڕاستترین ڕێگەی حەق و هیدایەت ڕاوەستاو و پایەداری کرد، بە کەلامی خۆی لە قورئاندا سوێندی لەسەر ئەوە خواردووە و دەفەرموێت ﴿يسٓ ① وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ ② إِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ③ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ④﴾ یس: ١ – ٤، کە ڕۆژی زیندووبوونەوە و گەیشتنەوە بە خزمەتی خودا دێتە بەرەوە لەسەر "صراط" ڕاوەستاوی دەکات و داوای سەلامەتی بۆ شوێنکەوتووان و ئەهلی سوننەتەکانی دەکات تا دەپەڕێنەوە بۆ بەهەشتی خودا، ئەوەش فەزڵی خودایە و دەیدات بە هەر کەسێك بیەوێت، خودا خاوەنی فەزڵی مەزنە.

## ❁ ئەدەب بەندایەتی جوان دەكات

ئەدەب بریتییە لە هەموو ئایین، داپۆشینی عەورەت لە ئەدەبەوەیە، دەستنوێژ و غوسڵی لەشپیسی لە ئەدەبەوەیە، خۆپاككردنەوە لە پیسی لە ئەدەبەوەیە، تاكو بە پاكی لە بەردەم خودادا بوەستێت.

جۆرێكی تر لە ئەدەب ئەوەیە كە پێغەمبەر(ﷺ) نەهی كردووە لە نوێژكەر ((چاوی بۆ ئاسمان بەرز بكاتەوە)).

گوێم لە شێخولئیسلام ئیبن تەیمیە بوو-قدس الله روحه- دەیفەرموو: ئەوە لە كەماڵی ئەدەبی نوێژكردنە، بەوەی بەندە لەبەردەم خودادا سەردابخات و سەیركردنی بۆ زەوی بێت، و چاوەكانی بۆ سەرەوە بەرز نەكاتەوە.

لەو ئەدەبانەی لەگەڵ خودادا رەچاو دەكرێت ئەوەیە كە: لە كاتی چوونە سەر ئاودا روو و پشتی نەكاتە ماڵەكەی خودا(كەعبەی پیرۆز)، وەك لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ساغبوەتەوە لە فەرموودەكەی "ئەبی ئەیوب و سەلمان و ئەبی هورەیرە"-خوایان لێ رازی بێت-.

دروستەكەی ئەوەیە: كە ئەم ئەدەبە(چوونە سەر ئاو) دەشت و سارا و ناو چوارچێوەش دەگرێتەوە.

هەروەها لەو ئەدەبانە: سوكنایی و لە جووڵەكەوتن لە نوێژدا: ئەوەش ئەو بەردەوامبوونەیە لەسەری دەڕۆن، خودای موتەعال دەفەرموێت﴿ ٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ دَآئِمُونَ (٢٣) ﴾ المعارج: ٢٣، عەبدوڵای كوڕی موبارەك لە ئیبن لەهیعەوە دەفەرموێت: یەزیدی كوڕی ئیبن ئەبی حبیب بۆی باسكردم: "ئەبو خێر" هەواڵی پێداوە، دەڵێ پرسیارمان لە عوقبەی كوڕی عامر كرد دەربارەی ئەم ئایەتە ﴿ ٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ دَآئِمُونَ ﴾ ئایا ئەوانەن بە هەمیشەیی نوێژ دەكەن؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵام كە نوێژ دەكەن لا بەلای راست و چەپ و دوادا ناكەنەوە.

دەڵێم دوو شتە: دانەبڕان لە نوێژدا، و بەردەوامبوون لەسەر نوێژ، ئەم دانەبڕان و بەردەوامبوونەش لە نوێژدا وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە﴿ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ (٣٤) ﴾ المعارج: ٣٤، دانەبڕانی بە لە جووڵەكەوتنی جەستە و ئەندامەكان و ئارامی و دڵنیایی لێكدایەوە.

هەروەها ئەدەبی نوێژکەر لە گوێگرتن لە خوێندنی قورئان لەناو نوێـژدا: بـەوەی گـوێ بگرێت و دڵی ئامادە ببێت.

ئەدەبی لە رکوعدا: بەوەی جوان رکوع ببات و خودای موتەعال بە مەزن رابگرێـت، تـا شتێك لە دڵیدا نەمێنێتەوە مەزنتر بێت لە خودا، هەرچی شتە لـەلای بچووك و بێبـەها بێت، تا کەمتر لە تۆزی بەر با.

مەبەستەکە: ئەدەب لەگـەڵ خـودای موتـەعالدا بریتییـە لـە هەسـتان بـە دینەکـەی، و خۆڕازاندنەوە بە ئەدەب لە ناوەوە و دەرەوەدا، هیچ کەس ئەدەبی بـۆ نایەتـە راسـتە بە سێ شـت نـەبێت: ناسـینی نـاو و سـیفەتەکانی خـودای موتـەعال، ناسـینی دیـن و شـەرعی خـودا و ئـەوەی پێیخۆشـە و ئـەوەی پێیناخۆشـە، لەگـەڵ بـوونی نەفسـێکی ئامادە و شایستە و نەرم کە ئامادەباشی تێدا بێت بۆ وەرگرتنی حەق لە رووی زانست و کردار و حاڵەوە، خودا کۆمەك و پەنایە.

## ✿ نیوەی یەکتاپەرستی و ئەدەب بریتییە لە شوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ).

ئەدەب لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ): قورئان لێوان لێوە بەم جۆرە ئەدەبە.

لوتکەی ئەدەب لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) کـەماڵی تەسـلیمبوونە پێـی و فەرمانبـەرداری لێکردنی و وەرگرتنی قسەکانی بە قبووڵ و تـەصدیقەوە، بەبێ ئەوەی خـەیاڵی پووچ بەرهەڵستی فـەرموودەکانی پێبکـات و نـاوی بنێـت مـەعقول، یـان تەمومـژ و شـك و گومـان بەرهەڵسـتی پـێ بکـات، یـاخود رای پیـاوان و خاشـاکی زەینیـان بەسـەر فـەرموودەدا پـێش بخـات، پێغەمبـەر تاکبکاتـەوە لـە بیروبۆچـوونی پیـاوان بـە تەسلیمبوون پێی و گێڕانـەوەی حـوکم بـۆ لای و فەرمانبـەرداری و گەردنکەچـی بـۆ بڕیارەکانی، هەروەك چۆن خودای موتەعال بە بەندایەتی و گەردنکەچی و زەلیلـی و گەڕانەوە بۆ لا و تەوەکول تاکوتەنها دەکاتەوە.

کەوابوو ئەدەبەکە دوو یەکتایی(توحید)ە، بەندە رزگاربوونی نییە لە سزای خودایی بـەو دوانە نەبێت: یەکتایی نێرەر(خـودا) لەگـەڵ یـەکتایی لـە شـوێنکەوتنی پێغەمبـەر(ﷺ)، حوکم نابات بۆ لای غەیری پێغەمبەر(ﷺ) و رازیش نابێـت بـە حـوکمی غـەیری ئـەو، لـە جێبەجێ کردنی فەرمانەکان و تەصدیقی بڕیارەکانی راناوەستێت بەوەی فەرموودەکانی

لەگەڵ قسەی شێخەکەی و ئیمامەکەی و پیاوانی مەزهەب و دەستە و پێڕەکەی و بە مەزندانراوەکانی بەراورد پێ بکات، گەر ئەوانە مۆڵەتیان دا فەرمانەکەی پێغەمبەر(ﷺ) جێبەجێ دەکات و قبووڵی دەکات، ئەگەر نە، گەر سەلامەتی بوێت: پشت لە ئەمرەکەی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات و کارەکە دەداتە دەستی ئەوان، خۆ گەر وانەکات ئەوا فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) تەحریف دەکات و تەحریفەکەشی ناو دەنێت "تەئویل" و "تحمیل" و دەڵێت تەئویلی دەکەین و تەحمیلی دەکەینە سەر ئەوەی باوەڕیان پێهێناوە، هەموو ئەم کارانەشی بۆ ئەوەی فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ مەزهەب و بۆچوونی پیاوانی مەزهەبەکەیدا بگونجێنێت، نەك بە پێچەوانەوە.

گەر بەندە بە هەرچی گوناهەوە-جگە لە هاوەڵدانان بۆ خودا- بە خزمەتی پەروەردگاری بگات سووکتر و ئاسانتر و بچووکترە لە گوناهی ئەو کەسەی بەم حاڵەوە بە خزمەتی خودا دەگات.

ڕۆژێك لەگەڵ سەرانی هەندێك لەوانەدا گفتوگۆیەکم کرد، وتم بە یەکێك لەوانە: بە خودا سوێندت دەدەم، گەر وا دابنێین پێغەمبەر(ﷺ) زیندووە و لەناوماندا دەژی، ڕووبەڕووی کەلام و گوتاری پێغەمبەر بووینەوە: ئایا لەسەرمان فەرزە شوێنی قسەکانی بکەوین بەبێ ئەوەی قسەکانی بەراورد پێ بکەین لەگەڵ ڕا و بۆچوونی پیاوان و قسە و مەزهەبیان؟ یان شوێنی ناکەوین تا ئەو قسانەی لێی دەبیستین بەراوردی پێ نەکەین لەگەڵ ڕا و بۆچوون و ئەقڵی پیاواندا؟

وتی: فەرز ئەوەیە یەکسەر قسەکانی وەربگرین و جێبەجێی بکەین و لانەکەینەوە بەلای هیچ کەسێکی تردا.

وتم: دەی چی هەیە ئەم فەرزەی لەسەر ئێمە نەسخ کردبێتەوە(سڕیبێتەوە)، پەنجەی خستە سەر دەمی و ماوەیەك سەرسام و حەپەسا و لێی وەستا و تەنانەت وشەیەکی پێ نەوترا.

ئەمە ئەدەبی بەندە تایبەتەکانە لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ)، نەك سەرپێچی لە فەرمانەکانی و هاوەڵ بۆ دانانی (پیاوان بە بۆچوونەکانیان بهێنیتە ریزییەوە) و دەنگ بەسەر دەنگیدا بەرز بکەیەوە، هەروەها بێزارکردنی ئەندامەکان بە صەلاوات لێدان لەسەری، و یەقین دابڕنیت لە فەرموودەکانی و دڵنیانەبیت لەوەی مەعریفەی خوایان

ـێوە بەدەست بێت، لە مەعریفەی خودادا شان لەسەر ئەقڵی شەکەت و سەرسام و دژ بەیەکتر دابدەیت، لە ئەحکامدا شان لەسەر تەقلیدی پیاوان و بیروبۆچوونیان دابدەیت، قورئان و سوننەت تەنها بۆ تەبەڕوك بخوێنرێنەوە، ئەسڵ و فەرعی ئاینییان ـێوە وەرنەگیرێت، هەر کەس گەڕایەوە بۆ سەر ئەو دوانە دوژمنایەتی لەگەڵ بکەین و دەستدرێژی بکەینە سەر و هەوڵبدەین دوابڕاوی بکەین، و لە رەگ و ریشە دەریبهێنین

﴿ بَلْ قُلُوبُهُمْ فِي غَمْرَةٍ مِّنْ هَٰذَا وَلَهُمْ أَعْمَالٌ مِّن دُونِ ذَٰلِكَ هُمْ لَهَا عَامِلُونَ ﴿٦٣﴾ حَتَّىٰ إِذَا أَخَذْنَا مُتْرَفِيهِم
بِالْعَذَابِ إِذَا هُمْ يَجْأَرُونَ ﴿٦٤﴾ لَا تَجْأَرُوا الْيَوْمَ ۖ إِنَّكُم مِّنَّا لَا تُنصَرُونَ ﴿٦٥﴾ قَدْ كَانَتْ آيَاتِي تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُمْ
عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ تَنكِصُونَ ﴿٦٦﴾ مُسْتَكْبِرِينَ بِهِ سَامِرًا تَهْجُرُونَ ﴿٦٧﴾ أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا الْقَوْلَ أَمْ جَاءَهُم مَّا لَمْ يَأْتِ
آبَاءَهُمُ الْأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾ أَمْ لَمْ يَعْرِفُوا رَسُولَهُمْ فَهُمْ لَهُ مُنكِرُونَ ﴿٦٩﴾ أَمْ يَقُولُونَ بِهِ جِنَّةٌ ۚ بَلْ جَاءَهُم بِالْحَقِّ
وَأَكْثَرُهُمْ لِلْحَقِّ كَارِهُونَ ﴿٧٠﴾ وَلَوِ اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْوَاءَهُمْ لَفَسَدَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ بَلْ
أَتَيْنَاهُم بِذِكْرِهِمْ فَهُمْ عَن ذِكْرِهِم مُّعْرِضُونَ ﴿٧١﴾ أَمْ تَسْأَلُهُمْ خَرْجًا فَخَرَاجُ رَبِّكَ خَيْرٌ ۖ وَهُوَ خَيْرُ
الرَّازِقِينَ ﴿٧٢﴾ وَإِنَّكَ لَتَدْعُوهُمْ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٧٣﴾ وَإِنَّ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ عَنِ الصِّرَاطِ
لَنَاكِبُونَ ﴿٧٤﴾ ﴾ المؤمنون: ٦٣ — ٧٤

ئامۆژگاریکەر بە نەفسی خۆی و کارکەر بۆ رزگارکردنی: لەم ئایەتانە بە دروستی رادەمێنێت و دایاندەبەزێنێتە سەر واقیع: شتی سەرسوڕهێن دەبینێت، وا گومان نابات ئەم ئایەتانە تایبەت بوون بە کۆمەڵێك کە گوزەریان کردووە و کۆتاییان پێهاتووە ((قسەم لەگەڵ تۆیە، گوێبگرە جیرانەکەم))، خودا کۆمەك و پەنایە.

لەو ئەدەبانەی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) رەچاو دەکرێت ئەوەیە کە: لە ئەمر و نەهیدا پێشی نەکەویت، هەر بەو جۆرە لە مۆڵەت و پشتهەڵکردندا، تا پێغەمبەر بۆخۆی فەرمان دەکات و نەهی دەکات یان مۆڵەت دەدات، وەك خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ ﴾ الحجرات: ١، ئەمە تا رۆژی دوایی بەردەوامە و نەسخ نەبووەتەوە، پێشکەوتن لە سوننەتەکانی لەدوای مردنی وەك پێشکەوتن وایە لە پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتی زیندووبووندا، لای خاوەن ژیری تەندروست ئەو دوانە جیاوازی لە نێوانیاندا نییە.

موجاهید-رەحمەتی خوای لێ بێت- لەسەر ئایەتەکە دەفەرموێت: لە جێگەی پێغەمبەر قسە مەکەن و بڕیار مەدەن.

ئەبو عوبەیدە دەفەرموێت: عەرەب دەڵێن"لا تقدم بين يدي الإمام و بين يدي الأب" واتە لە ئەمر و نەهیدا بەبێ ئەوان پەلە مەکەن.

کەسانی تر دەڵێن: فەرمان مەکەن تا فەرمان دەکات و نەهی لە شتێك مەکەن تا نەهی دەردەکات.

هەروەها لەو ئەدەبانەی دەبێت لەگەڵی رەچاو بکرێت ئەوەیە کە: دەنگ بەرز نەکەیەوە بەسەر دەنگیدا، چونکە ئەو کارە هۆیەکە بۆ بەتاڵبوونەوەی کردارە چاکەکان، ئەی دەبێت گومانت چی بێت بە بەرزکردنەوەی بیروبۆچوونێك بەسەر کەلام و سوننەتی پێغەمبەردا(ﷺ)؟ ئایا پێت وایە ئەو کارە ببێتە هۆی قبووڵ بوونی کاروکردەوەکانت لە کاتێکدا دەنگ بەرزکردنەوەیەك دەبێتە هۆی پووچبوونەوەی کاروکردەوەکان؟

هەروەها لەو ئەدەبانە ئەوەیە: "بانگکردن و دوعاکردن"ی پێغەمبەر(ﷺ) وەك بانگکردن و دوعاکردنی کەسانی تر تەماشا نەکەیت﴿ لَّا تَجْعَلُوا دُعَاءَ الرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَاءِ بَعْضِكُم بَعْضًا ﴾النور: ٦٣، ئەهلی تەفسیر لەسەر ئایەتەکە دوو بۆچوونیان هەیە:

یەکەمیان: ئێوە بەناوی خۆی ناوی مەهێنن، وەك چۆن هەندێکتان ناوی هەندێکتان دەهێنن، بەڵکو بڵێن: "يا رسول الله"، "يا نبي الله" بینا لەسەر ئەمە چاوگەکە(دعاء) خراوەتە پاڵ بەرکارەکە(مفعولەکە)، واتە"دعاءكم الرسول"بانگ کردنتان لە پێغەمبەر.

دووەم: واتاکەی بەم جۆرەیە: بانگکردنی ئەو بۆ ئێوە وەك بانگکردنی هەندێکتان بۆ هەندێکی ترتان تەماشا مەکەن، گەر ویستان وەڵام بدەنەوە و گەر نەتاویست وەڵامدانەوە واز لێ بهێنن، بەڵکو کە بانگی کردن هیچ رێگەیەکی تر لەبەردەمتاندا نییە جگە لە وەڵامدانەوە، دواکەوتن لە بانگی ئەو بە هاناتانەوە نایەت، بینا لەسەر ئەمە: چاوگەکە دراوەتە پاڵ بکەرەکە، واتە"دعاءه لكم" دوعاکردن یان بانگکردنی ئەو(پێغەمبەر) بۆ ئێوە.

هەروەها لەو ئەدەبانە لەگەڵی: ئەوان کاتێك لەسەر بریارێکی کۆدەنگ لەگەڵی کۆبوونەوە لە خوتبە و جیهاد و سەنگەرگیری(رباط)دا کەسێك لەوانە پێغەمبەری بەجێنەدەهێلا و نەدەرۆیشت تا مۆڵەت لە پێغەمبەر وەرنەگرێت، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَإِذَا كَانُوا مَعَهُ عَلَىٰ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا

﴿حَتَّىٰ يَسْتَأْذِنُوهُ﴾ النور: ٦٢، گەر رۆیشتنێك بوویێت بەهۆی پێویستییەکی پێشهاتەوە نەیان دەتوانی بەبێ مۆڵەتی ئەو بەجێی بهێڵن، ئەی دەبێ رۆیشتن بۆ لای مەزهەبێکی رەها لە ئوسول و فروع و ورد و درشتدا چۆن بێت؟ ئایا بەبێ مۆڵەتی پێغەمبەر دروستە شوێنی بکەویت؟ ﴿فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾﴾ النحل: ٤٣.

هەروەها لەو ئەدەبانەی لەگەڵی دەبێت رەچاو بکرێت: تەمومژ لەسەر فەرموودەی پێغەمبەر دروست نەکات بەڵکو تەمومژ بخاتە سەر بیروبۆچوونی پیاوان، بەرهەڵستکاری دەق نەکات بە قیاس، بەڵکو کێشانە و پێوانەکان وەلابنێت و دەقی فەرموودەی پێغەمبەر وەربگرێت، حەقیقەتی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) تەحریف ناکات بەهۆی خەیاڵێکەوە کە هاومەشرەبەکانی ناویان لێناوە "مەعقول"، بەڵێ راستە مەعقولەکەیان نەناسراوە و لە راستییەوە کەنارگیرە، هیچ فەرموودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر رازیبوونی هیچ کەسێك نەوەستاوە، هەموو ئەوانە لە کەمی ئەدەبەوەن لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)، ئەوەش بوێرییەکی گەورەیە لەلایەن ئەوانەوە بۆ سەر پێغەمبەر.

### ۞ هەموو ژیان ئەدەب رێکی دەخات

ئەدەب لەگەڵ خەڵكدا: بریتییە لە مامەڵە کردنیان بەپێی جیاوازی ئاستیان بەوەی شایستەیانە، بۆ هەر ئاستێك ئەدەبێکی تایبەت هەیە، لەناو ئاستەکاندا ئەدەبی تایبەت هەیە، لەگەڵ دایك و باوکدا ئەدەبێ تایبەت هەیە و لەگەڵ باوکیش جۆرە ئەدەبێکی تر، لەگەڵ زانادا ئەدەبێکی تایبەت و لەگەڵ خاوەن دەسەڵاتدا جۆرە ئەدەبێکی تر، لەگەڵ هاودەمەکاندا ئەدەبێك پێیان شایستە بێت، لەگەڵ کەسی بێگانە و نەناسراودا جۆرە ئەدەبێك جیا لەوەی لەگەڵ برادەران و هاودەماندا ئەنجامی دەدات.

بۆ هەر حاڵێك جۆرێك لە ئەدەب هەیە: خواردن ئادابی خۆی هەیە، خواردنەوە ئادابی خۆی هەیە، سواربوون ئادابی خۆی هەیە، دەرچوون بۆ سەفەر و مانەوە و خەو ئادابی تایبەت بەخۆیان هەیە، چوونە سەر پێشاو ئادابی خۆی هەیە، قسەکردن و بێدەنگی و گوێگرتن ئادابی تایبەت بەخۆیان هەیە.

ئەدەبی مرۆڤ ناونیشانی بەختەوەری و سەرفرازییەتی، کەمی ئەدەبی: ناونیشانی بەدبەختی و زیانۆمەندییەتی.

هیچ شتێك وەك ئەدەب خێری دونیا و دوارۆژ بەدوای خۆیدا ناهێنێت، هیچ شتێکیش وەك کەمی ئەدەب بێبەشبوون لە خێری دونیا و دوارۆژ بەدوای خۆیدا راناکێشێت.

سەیری ئەدەب لەگەڵ دایك و باوك بکە: چۆن بەردە زەبەلاحەکەی لە دەرگای ئەشکەوتەکە دوورخستەوە کاتێك کەسەکە لە ئەشکەوتەکەدا گیری خواردبوو؟ هەر بەو جۆرە سەرنج بدە چۆن بەناوی رووکردنە نوێژ و یادی خوداوە گوێنەدان بە دایك مرۆڤ رووبەرووی تاقیکردنەوەی قورس دەکاتەوە، وەك چۆن "جورەیج"ی راهیب تاقیکرایەوە، خەڵوەگاکەیان رووخاند و دەستیان کرد بە لێدانی و بە زیناکردن تۆمەتباریان کرد؟

لە حاڵی هەر مرۆڤێکی بەدبەخت و لەخۆبایی و پشتهەڵکەر لە خودا سەرنج بدە: دەبینیت چۆن کەمی ئەدەب بە سەرئەنجامی بێبەشبوونی گەیاندووە؟

سەرنجی ئەدەبی ئەبوبەکری صدیق بدە-خوا لێی رازی بێت- لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) کە بۆی هەبوو لە نوێژدا: پێش بکەوێت لێی، صدیق فەرمووی ((کوڕەکەی ئیبن ئەبی قوحافە بۆی نییە لە پێغەمبەر(ﷺ) پێش بکەوێت)) سەرنج بدە چۆن ئەو ئەدەبە مەقامی صدیقیی پێ بەخشی و لەدوای پێغەمبەر کردی بە ئیمام، ئەو دواکەوتن و هاتنە دواوە-لەگەڵ ئەوەی ئاماژەی پێدا لە شوێنی خۆت بوەستە- چەندین هەنگاو بردییە پێشەوە، بە هەر هەنگاوێك کە لە پێغەمبەر پێش ناکەوی و بەدوایدا دەڕۆیت چەندین هەنگاو پێش دەکەویت. خودا باشتر دزانێت.

### ✿ ئادابی شێوازی میانەڕەوی

هەندێ لە پێشین دەفەرموون: دینی خودا لەنێوان زیادەڕەوان و کەمرەواندایە.

تیابردنی ئەدەب بە جەفا و کەمرەوی: وەك ئەوە وایە بەشێك لە ئەندامەکانی دەستنوێژی نەشۆری بێت، ئەو کەسە وەفای بەنوێژ و ئادابی نوێژ نەکردووە کە پێغەمبەر(ﷺ) بۆی دیاری کردووین و پێی هەستاوە، کە نزیکە لە سەد ئەدەبەوە، لەنێوان واجب و موستەحەبدا.

تیابردنی دەستنوێژ بە زیادەڕەوی: وەك بوونی وەسوەسە لە نیەتهێنان، یان دەنگ بەرزکردنەوە لە نیەتدا، هەروەها دەنگ بەرزکردنەوە لە یاد و دوعادا کە شەرع بە

نەهێنی بەرەوای دەبینێت، یان درێژکردنەوەی ئەوەی سوننە بە کورتی بەرەوای دەبینێت، وەك تەحیاتی یەکەم و سەلام کە لادانیان سوننەتە، یان درێژکردنەوە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەنجامی داوە، ئەوەش نەك وەك ئەو کەسانەی دزی لە نوێژ دەکەن و دەنووك بە زەویدا دەکێشن و بە ئارەزووی خۆیان ئەنجامی دەدەن.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی بە کارێك نەکردووە خۆی ئەنجامی نەدابێت، خودای موتەعال لەوە پاراستبووی، فەرمانی بە ئاسانکاری دەکرد و بە سورەتی "الصافات" ئیمامەتی بۆ دەکردن، و فەرمانی بەوانیش دەکرد کارئاسانی بکەن، قامەت بۆ نوێژی نیوەڕۆ دەکرا و یەکێك لەوان دەچووە بەقیع و سەرئاوی دەکرد و پاشان لە ماڵەوە دەستنوێژی دەگرت و دەهات بۆ مزگەوت و فریای رکاتی یەکەم دەکەوت لەدوای پێغەمبەرەوە، ئەمە ئەو کارئاسانییە بوو کە فەرمانی پێ کردبوو، نەك دەنووك کوتین بە زەویدا و دزیکردن لە نوێژ.

کورتکردنەوە و کەمکردنەوەی نوێژ وەك خواردنی گۆشتی حەرام وایە لەکاتی پێویستیدا (واتە زۆری برسی بێت) ئەوەش بەپێی پێویست، خۆزگە تێری لێ بخواردبایە لەسەر بۆچوونەکەی تر کە بە رەوای دەبینێت، ئەو وەك برسییەك وایە کە خواردنێکی زۆر خۆشی دێتە لا و تەنها پارووییەك دوو پاروی لێ دەخوات، دەبێ چ سوودێکی پێ بگەیەنن؟ ئەو کەسە گەر هەستی بە برسێتی بکردبایە لەسەر خواردنەکە بەرز نەدەبوویەوە، بەڵام دڵی لە شتێکی تر پڕبووە.

بەڵێ، سوێند بە خودا، نوێژ خۆراکی رۆح و دڵە، ئەو ئاتاجی ئەو خۆراکەیە بەوەی تیایدا دادەبەزێت لە رەحمەتی خودا وەك چۆن جەستە ئاتاجی خۆراکێکە لە زەوی دێتە دەرەوە، لەبەر ئەوەی هەریەکێك لەو دوانە (دڵ و جەستە) خۆراکی خۆیان هەرس دەکەن، بۆیە ئاتاجی خۆراکێکی تر دەبێت لە فەزڵ و رەحمەتی خوداوە، هەر بۆیە نوێژی دابەش کردووە بەسەر بەشەکانی شەو و رۆژدا، ئەو دابەشکردنە پڕ لە حیکمەتە تاکو رۆح و دڵ –مرۆیی و مەعنەوی بەخشندە– ژەمە خۆراکی خۆیان وەربگرن دوای ئەوەی رووبەڕووی شڵەژان و هەژان دەبنەوە بەهۆی کاروبار و فیتنەی ژیانەوە کە خۆراکەکەی تیادا هەرس کردووە، بە وێنەی جەستە بەبێ زیاد و کەم، بە هەمان شێوە زانست و تەواوی ئەوەی پەروەردگاری بەخشندەمان پێی بەخشیوین لە عیبادەت و کاروکردەوەی چاکە.

نموونەی ئەدەب لە حەقی خەڵكدا: ئەوەیە كە زیادەڕەوی نەكات لە حەقیاندا و بە تەواوی ڕۆنەچێت تیایدا، بەجۆرێك حەقەكانی خودای پێ جێبەجێ نەكرێت، یان نەتوانێت بە كامڵی بەجێیان بگەیەنێت یان بەرژەوەندی دینی یان دڵی بخاتە بەر مەترسییەوە، هەر بەو جۆرە پشت لەو حەقانە نەكات بە جۆرێك نەتوانێت هیچیان جێبەجێ بكات، هەردوو بەرەكە(زیادەڕەوی و كەمڕەوی) زیانبەخشن، لەسەر ئەم ناوەندە حەقیقەتی ئەدەب بریتییە لە: میانەگیری، خودا زاناترە.

## ۞ كێشانەی حاڵ و مەقامەكان بە ئەدەب

هەروەها لەو ئەدەبانە: ڕێگری كردن لە ترس تاكو سەرنەكێشێت بۆ بێهیوابوون، و ڕێگری كردن لە نەمانی ڕجا: تاكو نەچێتە ناو ئەمن و ئاسایشەوە، هەروەها داستگرتن بەسەر سروردا: تاكو زیادەڕەوی نەكات و پێڕانەكێشێت(ئەدەب لە خزمەتی خودادا نەشكێنێت).

كەسی خاوەن ئەدەب ڕێگە نادات ترس پەلكێشی بكات بۆ بێهیوابوون لە بەزەیی خودا و دەستەئەژنۆ بوون، ئەو جۆرە ترسە ناپەسەندە.

گوێم لە شێخولئیسلام ئیبن تەیمیە بوو-ڕەحمەتی خودای لێ بێت- دەیفەرموو: سنووری ترس ئەوەیە لە گوناه و یاخیبوون بتگێڕێتەوە، لەوە زیاتر پێویستی پێی نییە.

ئەو ترسەی مرۆڤ بۆ بێهیوایی پەلكێش دەكات: كەم ئەدەبییە بەرانبەر ڕەحمەتی خودای موتەعال كە پێش تووڕەبوونەكەی كەوتووە، هەر بەو جۆرە نەزانییە بە ڕەحمەتی خودا.

ڕجای بە خودا: زیادەڕەوییەكەی ئەوەیە ئەمن و ئاسایش بۆ خۆی بڕیار بدات و پاڵی لێبداتەوە و سزای خودا لەخۆی بەدوور بگرێت، تەنها خەڵكە زیانۆمەندەكانن لە مەكری خودا ئەمین دەبن، ئەمەش لە لایەكی ترەوە نوقمبوون و لادانە.

بەڵكو سنووری ڕجا لەو شوێنەدایە كە عیبادەت خۆش و بەتام بكات و هانت بدات بۆ ڕۆیشتن بەرەو خودا، ڕجا وەك ئەو بایە وایە كە كەشتی پاڵدەنێت و ئاراستەی دەكات، هەركات بایەكە كۆتایی پێ هات كەشتییەكە دەوەستێت، خۆ گەر زیادیش بكات كەشتییەكە ڕووبەڕووی تیاچوون دەكاتەوە، بەڵام گەر بە ئەندازەی پێویست بوو دەیگەنێتە ڕۆخی ڕزگاری.

دەست بەسەردا گرتنی سروور: تەنها کەسە بەهێزەکان و خاوەن توانا و لێبڕانەکان توانایان بەسەریدا هەیە، ئەوانەی خۆشییەکان نایانهرووژێنێت تا رادەی زاڵبوون بەسەر شوکردا، هەر بەو جۆرە زیان و زەرەر و ناخۆشییەکان لاوازیان ناکات تا رادەی زاڵبوون بەسەر ئارامگرتنیاندا، وەك وتراوە:

لا تغلب السراء منهم شکرهم          کلا ولا الضراء صبر الصابر

(نە خۆشییەکان شوکریان لەبیر دەباتەوە و نە ناخۆشییەکان ئارامگریی ئارامگرانیان لیّ داگیر دەکات)

نەفس لە شەیتانەوە نزیکە و هاوڕێی شەیتانە، و لە سیفەتەکانیدا لەو دەچێت، بەهرە خواییەکانیش بۆ سەر دڵ و ڕۆح دادەبەزن، نەفس گوێدزە(تسترق السمع) دەکات، کە ئەو بەهرانە دادەبەزنە سەر دڵ: رادەپەڕێت بۆ ئەوەی بەشی خۆی لەو بەهرە خواییانە ببات و بیکات بە چەکی دەستی خۆی و بەری دەستی خۆی، ئەو کەسەی خۆی دەداتە دەم نەفس و نەزانە بە نەفسی خۆی: لێی دەگەڕێت تاکو بەشی خۆی ببات، لە کاتێکدا ئەو بەهرانە بەهرەی دڵ و ڕۆحن و چەك و هێزی دڵ و ڕۆحن لەگەڵ ئەوەشدا هەر هەمووی دەبێت بە بەشی نەفس و ئامێری دەستی نەفس و چەك و زەخیرەی، بەو هۆیەوە بە ویستی خۆی دێت و دەچێت و سنوورەکان تێدەپەڕێنێت، چونکە بەو چەك و هێزەوە بێنیاز بووە، مرۆڤ ڕووبەڕووی توغیان دەبێتەوە کاتێك لە ماڵ بێنیاز بوو، ئەی دەبیّ ئەوە چۆن بێت کە ترس و هەڕەشەکەی زۆر زۆر گەورەترە و قەدری لە ماڵ باڵاترە؟ ئەو شتانەی لەگەڵ ماڵ و دارایی بەراورد ناکرێن لە زانست و حاڵ و مەعریفە، کە ئەو شتانە بوو بە بەدەستهاتووی ئەو: بەهۆیەوە بەندە لادەدات بەلای یەکێك لە دوو لا ناپەسەندەکەدا (زیادەڕەوی و کەمڕەوی)، پێڕاکێشان یان لە سنووردەرچوون، یاخود ئاماژەکردن بە خۆ و کاری خۆ، و هاوشێوەکانی ئەمانە.

سوێند بە خودا زۆرن ئەوانەی لەو مەیدانەدا کوژراون و لەداردراون و بریندار کراون، دەڵێت: لە کوێوە هێنرام؟ بۆ کویّ دەبرێم؟ لە کویّ تووشهاتی؟ کەمترین سزادانی بێبەشبوون بەو پرسیارانە: ئەوەیە دەرگای موریدیی لیّ دابخرێت، بۆیە عاریفان و خاوەن بینینی ڕۆشن: ئەگەر شتێك لەوەیان بۆ پێشهات لادەدەن بەلای بەرەی

گەردنكەچی و زەلیلی و لارەملی و تەماشاكردنی نەنگییەكانی دەروونـدا، پاسـەوانی ترس بـانگ دەكـەن و پابەند دەبـن بـە سـەنگەرگیرییەوە لـە سـەنگەری نێوان دڵ و نەفسدا، تەماشای نزیكترین خەلقی خودا دەكەن، ئـەو كەسـەی كـە بـەڕێزترین كـەس لای خودا و نزیكترین وەسیلە لە خـوداوە و مـەزنترین خـاوەن پلـە و پایـە لـەلای(ﷺ) چووە ناو شاری مەككە –لە ڕۆژی فەتحدا– ئەوەندە سەری نزم كردبووەوە چەناكەی لەسەر زینی وڵاخەكەی دانابوو، ئەمەش وەك خۆنزمكردنەوە و نیشاندانی گەردنكەچی و تـەوازوع بـۆ پـەروەردگاری لـە ئـاوا حاڵێكـدا كـە عـادەتی نەفسـی مرۆیـی تیایـدا: داگیركردنییـەتی بـە سـروور و دەربـڕینی دڵخۆشـی بـۆ سـەركەوتن و زەفـەر پێبردنـی دوژمن و پاڵپشتی كردنی خودا بۆ ئەو، تا رادەی بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان.

پیـاو ئـەو كەسـەیە فـەتح و بەشـی خـۆی لـە خـوداوە دەپارێزێـت و لـە دزی نـەفس دەیشارێتەوە و بە پێدانی نەفس دەستنوقاو دەبێت، كەسـی پەسـت و دەستەوسـانیش ئەو كەسەیە بە نەفسی دەبەخشێت، هاوار بەو بەخشـینە چـەند ناشـیرینە ! سـنگفراوانی بەرانبەر نەفسی، چەند گێلە ئەو كەسەی ئاوا بیردەكاتەوە ! خودا كۆمەك و یارمەتیدەرە.

❁ ❁ ❁

# (٣٩) (منزلة اليقين)

## مەنزیلەی یەقین

لە مەنزیلەکانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی یەقینە.

ئەم مەنزیلەیە لای ئەهلی ڕێگە وەکو ڕۆح وایە بۆ جەستە، بەم مەنزیلە عاریفان بوون بە خاوەنی فەزڵ و گەورەیی و لەم مەنزیلەیەدا پێشبڕکێکەران پێشبڕکێ دەکەن، بۆ لای ئەم مەنزیلەیە کارکەران خۆیان یەکلاکردۆتەوە و بەسەرومڕی کاری بۆ دەکەن، کاری ئەهلی ڕێگە هەموو لەسەر ئەم مەنزیلەیە و هەموو ئاماژەکانیان بۆ لای ئەم مەنزیلەیە.

خودای موتەعال ئەهلی یەقینی بە سوودبینین لە ئایات و بەڵگە و بورهان تایبەت کردووە، بۆیە دەفەرموێت ﴿ وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ۝٤ أُولَٰئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ۝٥ ﴾ البقرة: ٤ – ٥

هەروەها ئەهلی یەقینی بە هیدایەت و سەرفرازی لە خەڵکانی تر جیاکردۆتەوە ﴿ وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَالسَّاعَةُ لَا رَيْبَ فِيهَا قُلْتُم مَّا نَدْرِي مَا السَّاعَةُ إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ ۝٣٢ ﴾ الجاثية: ٣٢

بۆیە "یەقین" ڕۆحی کردەوەکانی دڵە کە دەبێتە ڕۆحی کاروکردەوەکانی ئەندامەکانی جەستە، ئەوەش بریتییە لە حەقیقەتی صدیقییەت، یەقین دەبێتە جەمسەری هەموو ئەمانە و خولگەکەیان بە دەوریدایە.

خالیدی کوڕی یەزید لە "سوفیانەین"ەوە ئەویش لە تەیمییەوە ئەویش لە خەیسەمەوە لە عەبدوڵای کوڕی مسعودەوە –خوا لێی ڕازی بێت– لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی ((هیچ کەس بە تووڕەکردنی خودا ڕازی مەکە، حەمد و ستایشی هیچ کەسێك مەکە لەسەر فەزڵ و چاکەی خودا لەسەرت، زەمی هیچ کەس مەکە بۆ شتێك کە خودا پێی نەداوی، ڕزقی خودا ویست و هەوڵی خاوەن ویست و هەوڵەکان بۆتی نانێرن، ناحەزیی خاوەن ناحەزییەکان لێتی ناگرنەوە، خودا بە عەدل و "قسط"ی خۆی ڕۆح و ئاسوودەیی لە ڕازیبوون و یەقیندا داناوە، و خەم و پەژارەشی لە شك و ناڕازیبووندا داناوە))

راستییەكەی ئەوەیە كە تەوەكول بەر و سەرئەنجامی یەقینە، بۆیە هیدایەت هاوتای تەوەكول كراوە﴿ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ إِنَّكَ عَلَى ٱلْحَقِّ ٱلْمُبِينِ ﴿٧٩﴾ ﴾ النمل: ٧٩، حەق بریتییە لە یەقین، پێغەمبەرانی خودا فەرموویانە﴿ وَمَا لَنَآ أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنَا سُبُلَنَا ﴾إبراهیم: ١٢

هەر كاتێك یەقین گەیشتە دڵ پڕ دەبێت لە نوور و درەوشانەوە، هەرچی شك و ناڕازیبوون و خەم و پەژارەیە لێی پاك دەبێتەوە، پڕ دەبێت بە خۆشەویستی خودا و ترس و ڕازیبوون و شوكر و تەوەكول و گەڕانەوەی بەردەوام بۆ لای، یەقین ماددەی خاوی هەموو مەقامەكانی ترە و هەڵگری هەموو مەقامەكانە.

جونەید دەفەرموێت: یەقین بریتییە لە لەنگەرگرتنی زانست كە وەرناگەڕێ و لانادات و ناگۆڕێت لە دڵدا.

ئەبوبەكری وەراق دەفەرموێت: یەقین بریتییە لە هەموو دڵ و كەماڵی ئیمانی پێوەیە، بە یەقین خودا ناسراوە، بە ژیریش شت لە خوداوە ژنەوراوە.

دیسان دەفەرموێت: یەقین سێ ڕووی هەیە: یەقین بە هەواڵەكان، یەقین بە ئاماژەكان و یەقین بە بینینەكان.

مەبەستی بە یەقینی هەواڵ بریتییە لە سوكنای و لە جووڵەكەوتنی دڵ بۆ هەواڵی هەواڵدەر و متمانەی تەواو پێی، یەقینی ئاماژە: لەسەرو یەقینی هەواڵەوەیە، ئەوەش ئەوەیە كە لەگەڵ بوونی یەقین بە هەواڵ بەڵگە و بورهانی لەسەر بهێنێت بەوەی هەواڵی لە بارەوە دراوە.

ئەمەش وەك هەواڵەكانی ئیمان و یەكتاپەرستی و قورئان، خودای موتەعال–لەگەڵ ئەوەی ڕاستگۆترینی ڕاستگۆیانە– بەڵگە و نموونە و بورهان بۆ بەندەكانی لەسەر ڕاستی هەواڵەكانی دەهێنێتەوە، بۆیە لە دوو ڕووەوە یەقینیان بۆ بەدەست دێت: لە ڕووی هەواڵەكەوە (كە ڕاستگۆترین كەس هەواڵی لەبارەوە داوە)، و لەڕووی بەڵگە و بورهانەوە. لەم ئاستی دووەمەوە(یەقینی بەڵگە و بورهان) بەرز دەبنەوە بۆ ئاستی سێیەم كە بریتییە لە ((یەقینی پەردە لەسەر لادان))، بۆیە هەواڵەكان بۆ دڵیان وەك بینینی چاوی سەری لێ دێت، ئەو كاتە پەیوەندی ئیمان بە پەنهان بۆ دڵ وەك پەیوەندی شتی بینراوی لێ دێت بۆ چاو.

هەندێ لە عاریفان دەفەرموون: بەهەشت و ئاگرم بە حەقیقەت بینی، پێی وترا: چۆن؟ وتی: بە دوو چاوی پێغەمبەر(ﷺ) بینیمن، بینینی من بە دوو چاوی ئەو(ﷺ) لەلام لەپێشتر بوو لە بینینی چاوی خۆم بۆ ئەو دووانە، چاوی من زیادەڕەوی و لادان رووی تێدەکات، بە پێچەوانەی چاوی پێغەمبەر کە زیادەڕەوی"طغیان" و لادان"زیغ" رووی تێناکات (ئاماژەی بە ئایەتی "مَازَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ" کردووە)

پایەکانی زانستی یەقین: بریتییە لە قبووڵ کردنی ئەوەی لە حەقەوە -سبحانە- دەردەکەوێت، ئەوەش کە لەوەوە دەردەکەوێ: بریتییە لە بڕیارەکان و نەهییەکانی، واتە شەرعی خودای موتەعال و ئەو ئایینەی کە لەسەر زمانی پێغەمبەرانەوە بەیان کراوە و دەرکەوتووە، ئێمەش بە قبووڵ و گەردنکەچییەوە وەریدەگرین و پێی تەسلیم دەبین و فەرمانبەرداری بۆ پەروەردگاریی خودای موتەعال دەکەین و دەچینە ژێر نیری بەندایەتییەوە.

دووەم: ((قبووڵ کردنی ئەوەی پەنهانە)) واتە باوەڕهێنان بە پەنهان(غیب) کە خودای موتەعال لەسەر زمانی پێغەمبەران هەواڵی لەبارەوە راگەیاندووە لە زیندووبوونەوە و بەهەشت و ئاگر و پردی سیرات و میزان و دادگایی، هەروەها ئەوەی پێش ئەوانە دەکەوێت: لە شەقبردنی ئاسمان و پارچە پارچەبوونی، و پەرش و بڵاوبوونی هەسارە و ئەستێرەکان و بوون بە تۆزی شاخەکان و پێچانەوەی هەموو جیهان، پێش ئەمەش بەرزەخ و نیعمەتەکانی و سزاکانی.

قبووڵ کردنی هەموو ئەمانە بە باوەڕ و تەصدیق و دڵنیاییەوە بریتییە لە یەقین، بە جۆرێك تەمومژ و شك و لەبیربردنەوە و بێئاگایی دەربارەیان تێکەڵ بە دڵ نەبێت، چونکە ئەوانە گەر یەقینەکەی تیانەبەن، ئەوا تێکی دەدەن و لاوازی دەکەن.

سێیەم: ((وەستان لەسەر ئەوەی بە حەقەوە -سبحانە- وەستاوە و پایەدار بووە)) لە ناو و سیفات و کرداری خودای موتەعال، لە بریتییە لە زانستی یەکتاپەرستی کە بنچینەکەی بریتییە لە جێگیرکردنی ناو و سیفەتەکان.

یەقین بریتییە لە وەستان لەسەر ئەوەی بە حەقەوە وەستاوە لە ناو و سیفاتی کەماڵ و یەکتاپەرستی، ئەم سیانە پیرۆزترین و باڵاترین زانستی مرۆڤایەتین: زانستی فەرمان و نەهی لێکردن، و زانستی ناو و سیفات و یەکتاپەرستی، و زانستی رۆژی دوایی و زیندووبوونەوە، خودا باشتر دەزانێت.

## ❁ مەقامی هۆگربوون بە قورئان

هەر كەس یەقینەكەی بەهێز بوو: هۆگری لەگەڵ قورئان بەدەست دەهێنێت كە بۆ كەسی یەقین لاواز بەدەست نایەت.

هەر بەو جۆرە هۆگربوون بەری گوێڕایەڵی و خۆشەویستییە، هەموو كەسێكی گوێڕایەڵ هۆگربووە، هەموو كەسێكی یاخیبووش نامۆبووە.

سالیك گەر خۆشەویست و راستگۆ بێت و خودا مەبەست و داوای بێت و لەسەر رەزامەندی ئەو و بۆ رەزامەندی ئەو كار بكات خۆراكەكەی دەبێتە گوێگرتن لە قورئان كە خۆراكی سەروەرانی عاریفانی ئەم ئوممەتەیە، ئەوانەی خاوەنی چاكترین دڵ و دروستترین حاڵن، كە بریتین لە هاوەڵانی پێغەمبەر -خوایان لێ رازی بێت-

ئەم گوێگرتنە قورئانییە گوێگرتنی ئەهلی مەعریفەیە بە خودا و راوەستان لەسەر راستە شەقامی ئیسلام، لەو گوێگرتنەوە مانا و ئامـاژە و مەعاریف و زانستی جۆراوجۆر بۆ زەینە پاك و بێگەردەكان بەدەست دێت، دڵە گەشاوەكان بە نووری هۆگری خۆراكی لێوەردەگرن، لەزەتێكی رۆحانی لێ دەبینێت، نیعمەتەكەی دەگاتە دڵ و رۆح، لەوانەیە لێشاو بهێنێت و بگاتە سەر جەستە، جۆرێك چێژی لێ دەبینێتەوە كە چێژی بەرهەستی لەو جۆرەی نەبینیوە.

كە رۆح خۆی دارنی لە رووالەتە مادییەكان و ئامادەیی تەواوی تێدا بوو، و دڵیش رۆیشتە ناو رۆحی مانای قورئانەوە، و بە هەموو بوونی خۆیەوە رووی لە دەنگی قورئان كرد، و دەنگخۆشی قورئانخوێنەكە یارمەتیدەر بوو: لەو بارەدا دڵ خەریكە ئەم جیهانە بەجێدەهێڵێت و دەچێتە ناو جیهانێكی ترەوە، لەزەت و حاڵێكی بۆ دروست دەبێت كە لە هیچ شتێكی تردا نایبینێتەوە، ئەوەش نەسیمێكە لە نەسیمەكانی حاڵی ئەهلی بەهەشت لەناو بەهەشتدا.

چەندە خۆراكێكی بەسوود و سوودبەخشە بۆ دڵ و رۆح و جەستەی مرۆڤ! ئەو تام و چێژەی قورئان حەرامكراوە لە دڵێك كە لەسەر بیستنی شەیتانیی پەروەردەكراوە.

هیچ نیعمەتێك لە نیعمەتەكانی ئەهلی بەهەشت باڵاتر و بەرزتر نییە لەو نیعمەتەی كە رووی جوانی خۆشەویستەكەیان(ﷻ) بەئاشكرا دەبینن و گوێ لە قسەكانی دەگرن.

دڵ بە گوێگرتن کاریگەر دەبێت بەپێی ئەو خۆشەویستییەی تێیدایە، کە پڕ بوو بە خۆشەویستی خودا و گوێی لە کەلامی خۆشەویستەکەی گرت-واتە بە هاوەڵی کردن و ئامادەبوونی لە دڵدا- ئەوە شانوشکۆیەکی تایبەتی دەبێت و گوێگران لە شتی تریش شانوشکۆیەکی تر. خودا زاناتر.

## ❁ دڵی زیندوو ئامێری گوێگرتنە

خەڵکی لە گوێگرتندا سێ بەشن:

**یەکەمیان:** ئەو کەسانەی کە دڵیان سیفەتەکانی نەفس وەرگرن، بەجۆرێك دڵیان دەبێت بە نەفسێکی تەواو، ئافاتی حەز و بانگکەری ئارەزوو بەسەریدا زاڵ دەبن، ئەم کەسە بەشی لە گوێگرتن: وەك بەشی ئاژەڵان وایە، تەنها دەنگ دەبیستێت، جیاوازی نێوان ئەو و ئاژەڵ زۆر نییە.

**بەشی دووەم:** هەر کەس نەفسی بە سیفەتی دڵی برازێتەوە، ئەو کاتە نەفسی دەبێت بە دڵێکی تەواو، و مەعریفە و خۆشەویستی بەسەریدا زاڵ دەبێت، دەبێتە خاوەنی عەقڵ و کرۆك، و عاشقی سیفاتی کەماڵ دەبێت، نەفسی بە نووری دڵ رووناك دەبێتەوە، و بە دڵنیاییەوە پاڵ دەداتەوە بەلای پەروەردگاریدا، و چاوەکانی بە بەندایەتی رۆشن دەبێتەوە، نیعمەتی خۆی لە خۆشەویستی و نزیکی لە خوداوە دەبینێتەوە، ئەم کەسە بەشی لە بیستن وەك-یان نزیك بەوە- بەشی فریشتەی لێ دێت، گوێگرتنەکەی خۆراکی دڵ و رۆحییەتی، و رۆشن بوونەوەی چاوی و نیعمەتی دونیایەتی، گوێگرتنەکەی ئەو باخچەیە کە بەناویدا گەشتوگوزار دەکات، ئەو زیندەگییەیە کە راوەستانی بوونی خۆی تیا دەبینێتەوە.

**بەشی سێیەم:** ئەو کەسەی مەنزیلەکەی لە نێوان ئەو دوو مەنزیلەدایە، دڵی لەسەر فیترەتە خۆرسك و سەرەتاییەکەی ماوەتەوە، بەڵام کارێك لەسەر نەفسی ناکات سیفەتەکانی دڵ وەربگرێت، و رێورەسمەکانی تێکبشکێنێت و تاریکییەکانی بڕەوێنێتەوە، نەفسی ئەوەندە بەهێز نییە زاڵ ببێت بەسەر دڵدا، و دەستی تێبخات و نوور و تەندروستی و فیترەتی بشێوێنێت.

لەنێوان دڵ و نەفسدا جەنگێکی بەردەوام هەیە، جەنگ لە نێوانیاندا بەردەوامە و هەر رۆژێك لایەکیان سەردەکەوێت، رۆژێك نەفس جەنگەکە دەباتەوە و رۆژێك دڵ.

ئەمە بەشی ئەو کەسەیە لە بیستن: بەشی لەنێوان دوو بەشەکەدایە، بەشی دڵ و بەشی نەفس، گەر گوێگرتنەکەی لە کاتی سەرکەوتنی دڵدا بێت بەشەکەی بەشێکی مەزنە، گەر لە کاتی سەرکەوتنی نەفسدا بێت بەشەکەی بەشێکی کەم و لاوازە.

لێرەوە جیاوازی سەرهەڵدەدات لە زانینی ورد لە خوداوە، و تێگەیشتن لێی و گەشانەوە و چێژ وەرگرتن بە بیستنی کەلامی خودا.

خاوەن ئەم حاڵە-لە حاڵی گوێگرتنیدا- دڵ خەریك دەکات بە جەنگان لەنێوان ئەو و نەفسدا، بۆیە رۆحی بیستنەکە و نیعمەت و چێژی لەدەست دەچێت بە ئەندازەی خەریکبوون و سەرقاڵبوونی بەو جەنگەوە، هیچ رێگەیەك بۆ بەدەستهێنانی ئەو چێژە بە تەواوی شك نابات هەتا ئەو جەنگە کۆتایی پێ نەیەت، لەوانەیە لە کاتی گوێگرتندا واریدێکی مەعنەوی رووی لێ بکات یان مانایەکی دەست بکەوێت کە فیکر نەتوانێت لە هەموو کاتێکدا راوی بکات، بەرچنگی دەکەوێت و تیایدا نوقم دەبێت و ئەوەش خەریکی دەکات لە گوێگرتن لەوانەی کە بەدوای ئەوەدا دێت، هەر ئەوەش وا دەکات دەستەوسان بێت لە راوکردنی ماناکانی تر، هاتنی ماناکان بە لێشاو سەرسامی دەکەن و لەرزەیەکی سەرسامبوون لە دڵ دەدەن، دەگێڕنەوە پیاوێکی عەرەب: راوچییەکی نارد بۆ راوکردن، نێچیرەکان لە پێشەوە و لە دواوە و لە راستەوە و لە چەپەوە دەرکەوتن و هەڵهاتن، ئەویش سەرسام و دەستەوسان لێی وەستا و هیچی پێ راونەکرا، وتی:

تكاثرت الظباء على خراش فما يدري خراش ما يصيد

کاری ئەو لەم حاڵەتانەدا: ئەوەیە کە دڵی وابەستەی قسەکەرەکە(خودای موتەعال) بکات، وەك ئەوەی قسەکان لەوەوە دەبیستێت، دڵی بکات بە روبارێك بۆ جاریبوونی ئەو مانانە و خاڵیبکاتەوە لە تێگەیشتنێك جگە لە مەبەستی خودای موتەعال، دەچۆڕێتە ناوی و ماناکانی لێوە بەدەست دێت، وەك پێشوازی کردنی خۆشەویست لە دەستەیەك خۆشەویست بۆ لای، هیچ خۆشەویستێك لە خۆشەویستەکەی تر خەریکی ناکات، بەڵکو حەقی هەر یەکێك لەوانە بە تەواوی دەدات، وەك بەخێرهاتنی میوان و سەردانیکەر، ئەمە کاتێك دەبێت فراوانی دڵ و هێزی ئامادەیی و کەماڵی ئامادەبوونی لەگەڵ بێت.

كە گوێی لە گوتاری هاندان و تامەزرۆكردن و لوتف و چاكەی خودا بوو: بەهۆیەوە بێئاگا نابێت لە گوتاری ترساندن و هەڕەشە و دادپەروەری خودا كە بەدوای ئەوەی یەكەمدا دێت، بەڵكو گوتاری دووەم بە هاوەڵی حوكمی گوتاری یەكەمەوە گوێ لێ دەگرێت، هەردووكیان بە یەكتر تێكەڵ دەكات، بە هەردووكیانەوە و لەگەڵ هەردووكیاندا بەرەو خودا هەنگاو هەڵدەگرێت، دڵی روودەكاتە قسەكەرەكە و سیفەتەكانی -سبحانە- .

ئەمە بریتییە لە رۆیشتن لەبەر خودا: كە جۆرێكی ترە باڵاتر و بەرزتر لە تەنها رۆیشتن بۆ لای خودا، بەهۆی ئەوەوە رۆیشتنی كەسەكە بۆ لای خودا راناوەستێت، بەڵكو زیاتر بەرزی دەكاتەوە، ئەوە رۆیشتنی دڵە لە مانای ناو و سیفەت و یەكتاپەرستی و ناسینی خودا.

هەركات لەوەدا مەلەكەیەك لە دڵدا مایەوە و بە توندی پێیەوە وابەستە بوو ئەوا مانای بیستراو و سیفاتی قسەكەر هەندێكی پەردە نادات بەسەر هەندێكی تریدا، لەسەرەتاوە ئەم كارە لەسەری گران دەبێت، لە ناوەڕاسدا لەسەری ئاسان دەبێت، بەڵام كۆتاییەكەی دیار نییە.

ئەوەش: چونكە ئەم هۆگربوونە ئاماژەبۆكراوە سەرەتاكەی پەردە لادانە لەسەر ناوی سیفەتەكان كە هۆگربوونی لێوە بەدەست دێت، و پێیەوە وابەستە دەبێت، وەك ناوی ((الجميل، والبر، واللطيف، و الودود، والحليم، والرحيم)) هاوشێوەكانیان.

پاشان وابەستەبوون پێیانەوە بەهێزتر و توندتر دەبێت تا وای لێدێت هەموو خۆشییەكانی ژیانی لەناودا دەبینێتەوە، چاوی پێ رۆشن دەبێتەوە و دڵ چێژی لێ دەبینێت و رۆح پێی دەگەشێتەوە، لەگەڵ كەمالی عافییەت بەبێ میحنەت و كەماڵی هیدایەت بەبێ فیتنە، بۆیە كۆڵی رۆیشتن بەرەو خودا سووك دەبێت، و پەستی و شەكەتی خاوبوونەوە و ساردبوونەوە نامێنێت، دڵ هەمیشە لە زیادبووندا دەبێت بۆ بەدەستهێنانی مانای خێر و چاكە.

❁ ❁ ❁

## (٤٠) (منزلة الذکر)

# مەنزیلەی یاد

لە مەنزیلەکانی ((إیاك نعبد وإیاك نستعین))مەنزیلەی یادە.

مەنزیلەیەکی مەزنی ڕێبوارانی بەرەو خوداچوونە، لەم مەنزیلەیەوە توێشوو وەردەگرن و بۆ ئەم مەنزیلەیە خۆیان ساغدەکەنەوە، و هەمیشە بۆ سەرچاوەکەی دەگەڕێنەوە.

زیکر دەسەڵاتێکی بەربڵاوی هەیە، هەر کەس پێی ببەخشرێت دەبەسترێتەوە بە خوداوە، هەرکەسیش لێی قەدەغە بکرێت لە ڕێگەی بەرەو خوداچوون کەنارگیر دەکرێت، ئەم مەنزیلەیە خۆراکی دڵی ئەهلی ڕێگەیە، هەرکات لێی جیابوویەوە جەستە دەبێتە گۆڕی دڵ، پەککەوتنی دڵ لە زیکر ئاوەدانی وڵاتەکەی دەکات بە وێرانە، زیکر ئەو چەکەیە لەگەڵ ڕێگرانی ڕێگەی بەرەو خوداچوون جەنگی پێدەکرێت، ئەو ئاوەیە گڕی کڵپەسەندووی پێ دادەمرکێننەوە، دەوای دەردەکانیانە و هەرکات لێی جیابوونەوە دڵیان شکست دەهێنێت، یاد هۆی گەیشتنە بە خودا و ئەو پەیوەندییەیە کە لەنێوان ئەوان زانای پەنهاندا–سبحانە– بوونی هەیە.

بە یادی خودا ئافاتەکان پاڵ پێوەدەنێن، و ناخۆشییەکان دەڕەوێننەوە، و بەڵاکان لەسەریان ئاسان دەبێت، گەر "السلام" بە سێبەری خۆی دایان بپۆشێت، پەنایان بۆ لای خودایە، و کاتێك دژوارییەك بەسەریاندا داباری هەڵدێن بۆ لای یادی خودا، یاد ئەو باخچەیە تیایدا گەشتوگوزار دەکەن، ئەو سەرمایەیە کە بازرگانی پێ دەکەن، دڵی خەمناك و دڵتەنگ دەهێنێتە سروور و پێکەنین، یادکەر دەگەیەنێتە یادکراو، بەڵکو یادکەر لەلای خودا دەکات بە یادکراو(مەبەستی ئایەتی "فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ "ە).

بۆ هەریەکێك لە ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ بەندایەتییەك بوونی هەیە کە بەستراوەتەوە بە کاتێکی تایبەتەوە، بەڵام "زیکر" بەندایەتی دڵ و زمانە و نەبەستراوەتەوە بە کاتێکی دیاریکراوەوە، بەڵکو ئەوان فەرمانیان پێکراوە بە زیکری پەرستراو و خۆشەویستەکەیان لە هەموو کات و بارێکدا: بەپێوە، لە کاتی ڕاکشان و لەسەر تەنیشت کاتی پاڵ کەوتن، دڵ وێرانەیە و یادی خودا ئاوەدانکەر و بنچینەیە بۆی.

بە یادی خودا دڵ لە ژەنگوژار پاك دەبێتەوە، ئەو دەرمانەیە كە دەرد و نەخۆشییەكان چاك دەكاتەوە، هەركات یادكەر لە یادەكەیدا زۆرتر و زیاتر رۆچوو یادكراو خۆشەویستی و حەز و شەوقی بۆ لیقای بەندەكەی لا زۆرتر دەبێت، كە دڵ لەگەڵ زمان یادی خودای كرد: هەرچی شتە لەپاڵ یادەكەیدا لەبیر دەچێتەوە، خودا هەموو شتێكی بۆ دەپارێزێت و دەبێتە جێگرەوەی هەموو شتێك بۆی.

بە یادی خودا قورسی ناو گوێ نامێنێت و لاڵی زمان كۆتایی پێ دێت و تاریكی لە چاوان دەرەوێتەوە.

خودا بەهۆی یادەوە زمانی یادكەران جوان دەكات، وەك چۆن بە رووناكی چاوی تەماشاكەران رووناك دەكاتەوە، زمانی كەسی بێئاگا لە خودا: وەك چاوی كوێر و گوێی كەڕ و دەستی شەلەل وایە.

زیكر دەرگای كراوەی مەزنی خودایە لەنێوان خۆی و بەندەكانیدا، مەگەر بەندە بەهۆی بێئاگاییەوە دەرگاكە بەرووی خۆیدا دابخات.

حەسەنی بەصری–رەحمەتی خوای لێ بێت– دەفەرموێت: لە سێ شتدا بەدوای شیرینیدا بگەڕێن: لە نوێژ و لە یادی خودا و لە خوێندی قورئاندا، گەر دۆزیتانەوە ئەوە باشە، ئەگەر نە بزانن دەرگاكە بە رووتاندا داخراوە.

بەهۆی یادەوە مرۆڤ شەیتان بە زەویدا دەدات، وەك چۆن شەیتان ئەهلی بێئاگایی و لەبیرچوونەوە دەدات بە زەویدا.

یادی خودا رۆحی كاروكردەوەكانە، گەر كاروكردەوەكان یادی خودایان تێدا نەبێت وەك جەستەیەكی بێ رۆحیان لێ دێت، خودا زاناترە.

لە قورئاندا یادی خودا "دە"رووی هەیە:

یەكەم: بە رەهایی فەرمان پێكردنی.

دووەم: نەهیكردن لە پێچەوانەی یاد كە بریتییە لە بێئاگایی و لەبیرچوونەوە.

سێیەم: وابەستەكردنی سەرفرازی بە هەوڵی بەردەوامبوون لەسەر زیكر و زۆر ئەنجامدانی.

چوارەم: مەدح و سەنای ئەهلی زیكر و هەواڵدان بەوەی كە بەهەشت و لێخۆشبوونی خودایان بۆ ئامادە كراوە.

پێنجەم: هەواڵدان بە زیانۆمەندی ئەو کەسەی بە شتێکی تر جگە لە یادی خودا سەرقاڵ دەبێت.

شەشەم: خودا –سبحانە– یادی ئەوان دەکات بەهۆی یادکردنی کردنی ئەوان بۆ خودا.

حەوتەم: هەواڵدان بەوەی زیکر لە هەموو شتێك گەورەترە.

هەشتەم: زیکری کردووە بە کۆتایی هەموو کاروکردەوەیەکی چاکە وەك چۆن کلیلی هەموو کاروکردەوەیەکی چاکەیە.

نۆیەم: هەواڵدان لەمەڕ ئەهلی زیکر بەوەی ئەوان ئەهلی سوودبینینن لە ئایاتی خودا، و ئەوان خاوەن ژیری و کرۆکن(أولو الألباب) نەك کەسانی تر.

دەیەم: زیکر کراوە بە هاوتا و هاودەم و ڕۆحی هەموو کاروکردەوەیەکی چاکە، هەرکات ئەو یادە لەناو کاروکردەوەکاندا نەما وەك جەستەیەکی بێ ڕۆحیان لێ دێت.

یەکەمەکەیان (فەرمان کردن بە زیکر) وەك ئایەتی ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَـٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴿٤٣﴾﴾ الأحزاب: ٤١ – ٤٣، هەروەها ئایەتی ﴿وَٱذْكُر رَّبَّكَ فِى نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً﴾ الأعراف: ٢٠٥، ئایەتەکە دوو قسەی لەسەرە: یەکەم، لە نهێنی و پەنهان و لەناو دڵتدا، دووەم، بە زمانت بە جۆرێك خۆت بیبیستی.

دووەم: نەهی کردن لە پێچەوانەکەی وەك ئایەتی ﴿وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْغَـٰفِلِينَ ﴿٢٠٥﴾﴾ الأعراف: ٢٠٥، هەروەها ئایەتی﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْ ﴾الحشر: ١٩

سێیەم: وابەستەکردنی سەرفرازی بە یادی زۆرەوە، وەك ئایەتی﴿وَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٤٥﴾﴾ الأنفال: ٤٥

چوارەم: مەدح و سەنای ئەهلی زیکر، وەك ئایەتی﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَـٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ وَٱلْقَـٰنِتِينَ وَٱلْقَـٰنِتَـٰتِ وَٱلصَّـٰدِقِينَ وَٱلصَّـٰدِقَـٰتِ وَٱلصَّـٰبِرِينَ وَٱلصَّـٰبِرَٰتِ وَٱلْخَـٰشِعِينَ وَٱلْخَـٰشِعَـٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَـٰتِ وَٱلصَّـٰٓئِمِينَ وَٱلصَّـٰٓئِمَـٰتِ وَٱلْحَـٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَـٰفِظَـٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٣٥﴾﴾ الأحزاب: ٣٥

پێنجەم: زیانۆمەندی ئەوانەی بە شتێکی تر جگە لە یادی خودا سەرقاڵ دەبن، وەك ئایەتی﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَـٰدُكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴿٩﴾﴾ المنافقون: ٩

**شەشەم:** خودا-سبحانه- یادی ئەوان دەكات بەهۆی یادی ئەوانەوە بۆ خودا، وەك ئایەتی﴿ فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونِ ﴿١٥٢﴾ ﴾ البقرة: ١٥٢

**حەوتەم:** هەواڵدان بەوەی زیكر لە هەموو شتێك گەورەترە، وەك ئایەتی﴿ اتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ وَأَقِمِ الصَّلَاةَ ۖ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ ۗ وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ ﴾العنكبوت: ٤٥، چوار قسە لەسەر "وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ" هەیە:

**یەكەم:** یادی خودا لە هەرچی شتە گەورەترە، یاد باشترین كاری چاكەیە، چونكە مەبەست لە هەرچی گوێڕایەڵی و كرداری چاكەیە هەستانە بە زیكری خودا، بۆیە یاد نهێنی و رۆحی كاروكردەوە چاكەكانە.

**دووەم:** ماناكەی: ئێوە گەر یادی خودا بكەن یادتان دەكات، بۆیە یادكردنی خودا بۆ ئێوە گەورەترە لە یادكردنی ئێوە بۆ خودا، بینا لەسەر ئەمە: چاوگەكە دراوەتە پاڵ بكەرەكە، بەڵام بۆ خاڵی یەكەم چاوگەكە دراوەتە پاڵ یادكراوەكە(خودا).

**سێیەم:** ماناكە: یادی خودا گەورەترە لەوەی خراپە و مونكەری لەگەڵ بمێنێتەوە، بەڵكو گەر یادی خودا بە تەواوی ئەنجام درا هەرچی گوناه و خراپەیە دەیسڕێتەوە، ئەمە ئەوەیە ئەهلی تەفسیر باسیان كردووە.

گوێم لە شێخولئیسلام ئیبن تەیمیە بوو-رەحمەتی خوای لێ بێت- دەیفەرموو: مانای ئایەتەكە، لە نوێژدا دوو سوودی زۆر مەزن هەیە: یەكەم: نەهی كردن لە "الفحشاء و المنكر"، دووەم: گرتنەئامێزی زیكری خودا و لەخۆگرتنی، بۆیە گرتنەئامێزی یادی خودا مەزنترە لە نەهیكردن لە "الفحشاء و المنكر".

**چوارەم:** لەوانەیە لە ئایەتەكەدا مانایەكی تر بوونی هەبێت: نوێژ گەورەترین زیكری خودایە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي ﴿١٤﴾ ﴾ طە: ١٤، نوێژ گەورەترین و بەهێزترین و توندترین نەهیكەرێكە لە "الفحشاء و المنكر"

**هەشتەم:** زیكری كردووە بە كۆتایی هەموو كاروكردەوەیەكی چاكە وەك چۆن كلیلی هەموو كاروكردەوەیەكی چاكەیە، وەك ئایەتی﴿وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٨٥﴾ ﴾ البقرة: ١٨٥، لە كۆتایی حەجدا لە ئایەتی﴿ فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَاسِكَكُمْ فَاذْكُرُوا اللَّهَ كَذِكْرِكُمْ آبَاءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا ﴾البقرة: ٢٠٠، لە كۆتایی نوێژدا لە ئایەتی﴿ فَإِذَا قَضَيْتُمُ الصَّلَاةَ فَاذْكُرُوا اللَّهَ

﴿قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمۡ﴾ النساء: ١٠٣، لە كۆتایی نوێژی هەینیدا لـە ئایـەتی﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ١٠﴾ الجمعة: ١٠، بۆ ئەو مەبەستە زیكر كراوە بە كۆتـایی ژیـانی دونیـا، گـەر كۆتا قسەی بەندەی خودا یادی خودا بێت خودا دەیباتە بەهەشتەوە.

نۆیەم: هەواڵدان لەمەڕ ئەهلی زیكر بەوەی ئەوان ئەهلی سوودبینینن لە ئایاتی خـودا، و ئەوان خاوەن ژیری و كرۆكن(أولو الألباب) نـەك كەسـانی تـر، وەك ئایـەتی﴿ إِنَّ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١٩٠ ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ﴾ آل عمران: ١٩٠ – ١٩١

دەیـەم: كـراوە بـە هاوتـا و هـاودەم و ڕۆحـی هـەموو كاروكردەوەیـەكی چـاكە، وەك ئایەتی﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ١٤﴾ طه: ١٤، هەر بەو جۆرە كردوویـەتی بـە هاوتـا و هاودەمی ڕۆژ و حەج و مەناسیك، بەڵكو زیكری خـودا ڕۆح و كـرۆك و مـەرامی حەجـە، وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفـەرموێت ((تـەواف بـەیت و ڕۆیشـتنی نێـوان سـەفا و مـەروە و هەڵدانی جمار(ڕەجمی شەیتان) بۆ ئەنجامدانی یادی خودایە))

هەر بەو جۆرە كردوویەتی بە هاودەم و هاوتای جیهاد و فەرمانی كردووە بـە یـادی خـودا لە كاتی گەیشتن بە دوژمـن و قەلاچۆكردنیان، خـودای موتـەعال دەفـەرموێت ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمۡ فِئَةٗ فَٱثۡبُتُواْ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٤٥﴾ الأنفال: ٤٥.

### ۞ یادكەرانی پێشڕشەوان

یادكەرانی خودا ئەهلی پێشڕەوانن، وەك ئەو فەرموودەی "مسلم" ڕیوایەتی كردووە لـە سەحیحەكەیدا لە عەلائەوە لە باوكییەوە لە ئـەبو هـورەیرەوە–خـوا لێـی ڕازی بێـت– دەفەرموێت ((لە ڕێگەی مەكە دەڕۆیشـت، پێغەمبـەر(ﷺ) بـە پـاڵ چـیایەكدا تێپـەڕی پێـی دەوترێـت "جمـدان"، فـەرمووی: ئەمـە "جمـدان"ە، پێشـكەوتن "مفـردون"، فەرموویان "مفردون" چییە ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: ئەو پیاو و ژنانـەی زۆر یادی خودا دەكەن)).

"المفردون" یان مانای یەكتاپەرستانی هەیە، یان ئەوانەی تاك و تەنهان لە بەندایـەتی و یادی خودادا.

لە مەسنەدی ئیمام ئەحمەددا-بەرزكراوەتەوە- لە فەرموودەكەی ئەبی دەردا-خوا لێی رازی بێت-، پێغەمبەر فەرموویەتی ((دەتانەوێت هەواڵتان پێ بدەم بە باشترین كاروكردەوەتان و پاكترین و خاوێنترینیان لەلای مەلیكەكەتان، باڵاترینیان لە پلە و پایەتان، باشتر بێت بۆ ئێوە لە بەخشینی زێڕ و زیو و رووبەڕووبوونەوەی دوژمن، لە گەردنتان بدرێ و بدەن لە گەردن؟ وتیان ئەوە چ كار و كردەوەیەكە ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی زیكری خودا-عز و جل-))

شوعبە لە ئەبی ئیسحاقەوە فەرمووی: گوێم لە "ئەغەڕ" بوو فەرمووی شایەتی دەدەم لە ئەبی هورەیرە و ئەبی سەعیدەوە-خوا لێیان رازی بێت- كە شایەتی دەدەن لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی ((هەر دەستەیەك دانیشتن بۆ یادی خودا فریشتەكان دەورەیان دەدەن و رەحمەت دایان دەپۆشێت، و سوكنایی دایان دەگرێتەوە، خودا باسیان دەكات لای ئەوانەی كە لای خۆین))ئەم فەرموودە لە سەحیحی "مسلم"دایە.

بەسە بۆ گەورەیی یادی خودا: خودای موتەعال ئەهلی زیكر نیشانی فریشتەكان دەدات و شكۆ و مەزنی خۆی بەوانەوە بە فریشتەكان نیشان دەدات، لە سەحیحی "مسلم"دا لە موعاویەوە-خوا لێی رازی بێت- پێغەمبەر(ﷺ) ((هاتە دەرەوە بۆ لای كۆڕێكی یارانی، فەرمووی چی داینیشاندوون(چی كۆی كردوونەتەوە)؟ فەرموویان بۆ یادی خودا دانیشتووین، ستایشی دەكەین بەوەی هیدایەتی داین بۆ ئیسلام و منەتی خۆی بەسەردا كردین، فەرمووی: هەر بۆ ئەوە دانیشتوون؟ فەرموویان: سوێند بە خودا تەنها بۆ ئەوە دانیشتووین، فەرمووی: من سوێندم نەدان وەك تۆمەتباركردنتان، بەڵام جبریل هات بۆ لام و هەواڵی پێدام: كە خودا بە ئێوە شكۆ و مەزنی خۆی بە فریشتەكان نیشان دەدات))

پیاوێكی ئەعرابی پرسیاری لە پێغەمبەری خودا كرد(ﷺ) و پێی وت ((چ كار و كردەوەیەك باشترین كاروكردەوەیە؟ فەرمووی: دونیا بەجێبهێڵی و زمانت بە یادی خودا تەڕ و پاراو بێت))

پیاوێك پێی فەرموو ((شەرعی ئیسلام زۆربووە لەسەرم، فەرمانم پێ بكە بە كارێك دەستی پێوە بگرم، فەرمووی: با بەردەوام زمانت بە یادی خودا تەڕ و پاراو بێت))

مەسەند و شوێنانی تریش لە فەرموودەکەی جابرەوە، فەرمووی ((پێغەمبەر(ﷺ) هاتە دەرەوە بۆ لامان، فەرمووی: ئەی خەڵکینە، سەرێك بکێشنە باخچەکانی بەهەشت، وتمان ئەی پێغەمبەری خودا، باخچەکانی بەهەشت چین؟ فەرمووی: مەجلیسی یادی خودا)).

هەروەها فەرمووی ((بەیانی بکەنەوە و ئێوارەتان بەسەر بێت و یادی خودا بکەن، هەر کەس دەیەوێت مەنزیلەی خۆی لەلای خودا بزانێت، با تەماشا بکات و بزانێت مەنزیلەی خودا لەلای ئەو چۆنە؟ خودا بەندە لەو مەنزیلەیەدا دادەنێت کە بەندە لە خۆیدا خودای تیاداناوە))

پێغەمبەر(ﷺ) لە باوکییەوە ئیبراهیم(ﷺ) دەگێڕێتەوە لە شەوی میعراجدا پێی فەرموو ((سەلامی من بەسەر ئومەتەکەتدا بخوێنەوە، هەواڵیان پێ بدە بەهەشت خاکەکەی زۆر پاك و بۆنخۆش و جوانە، ئاوەکەی سازگار و شیرینە، بەهەشت زەوییەکەی تەخت و تەڕو پاراوە، و رووەندنی دارەکانی بریتییە لە: "سبحان الله، والحمد لله، ولا إله إلا الله، والله أكبر")) ئیمامی "الترمذي" و ئیمامی ئەحمەد و کەسانی تریش ریوایەتیان کردووە.

لە دوو سەحیحەکەدا لە فەرموودەکەی ئەبی موساوە –خوا لێی رازی بێت– لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی ((نموونەی ئەو کەسەی یادی پەروەردگاری دەکات و ئەو کەسەی یادی ناکات وەك: زیندوو و مردوو وان))

بە دەربڕینی "مسلم" ((نموونەی ئەوماڵەی یادی خودای تیا دەکرێت و ئەو ماڵەی یادی خودای تیا ناکرێت وەك: زیندوو و مردوو وان))

ماڵێك زیکری تیابکرێت لە مەنزیلەی ماڵێکی زیندوودایە، ماڵی بێئاگاش لە مەنزیلەی مردوودایە، ئەوەش بریتییە لە گۆڕ.

لە دەربڕینی یەکەمدا: یادکەری کرد بە زیندوویەك لە ماڵێکی زیندوودادا، بێئاگاشی کرد بە مردوویەك لە ماڵێکی مردوودا، گومانی تێدا نییە جەستەی بێئاگایان گۆڕی دڵەکانیانە، دڵیان وەك مردووی ناو ئەو گۆڕانە وان، وەك وتراوە:

فنسيان ذكر الله موت قلوبهم وأجسامهم قبل القبور قبور

وأرواحهم في وحشة من جسومهم وليس لهم حتى النشور نشور

لە فەرموودەیەکی سەحیحدا: لەو ئەسەرەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) لە پەروەردگارییەوە –تبارك وتعالى– دەیگێڕێتەوە ((هەر کەس لە نەفسی خۆیدا یادم بکات لە نەفسی

خۆمدا یادی دەكەم، هەر كەس لەناو كۆمەڵێكدا یادم بكات لە كۆمەڵێكی باشتر لەو كۆمەڵە یادی دەكەم))

لە كتێبی "الوابل الصیب ورافع الكلم الطیب"دا نزیكەی سەد سوودی یادی خودامان باس كردووە، هەروەها لەو كتێبەدا باسی نهێنییەكانی یادی خودامان كردووە، هەروەها باسی مەزنی قازانجەكانی و بەروبوومی باش و پاكی، لەو كتێبەدا باسی ئەوەمان كردووە كە یادی خودا سێ جۆرە:

یەكەم: یادی ناو و سیفات و ماناكانیان، و سەناكردنی خودا بەو ناو و سیفەتانە، و بەكتاپەرستی خودا پێیان.

دووەم: یادی فەرمان و نەهی و حەڵاڵ و حەرام و یادی بەهرە و نیعمەتەكان و دەستی خودا، ئەمەش سێ جۆرە:

- یادێك دڵ و زمان تیایدا یەكدەگرن، ئەمەیان باڵاترینیانە.
- یادێك تەنها بە دڵ، ئەمەش لە پلەی دووەمدایە.
- یادێك تەنها بە زمان، لە پلەی سێیەمدایە.

سێیەم: یادی بەندە بۆ خودا بە دوو یاد لەلای خوداوە دەورەدراوە: یادێك بەر لە یادەكە: كە بە هۆیەوە كەسەكە دەستی بە یادكردنی خودا كردووە، یادێك لە دوای یادەكە كە بەندە بەهۆیەوە دەبێت بە یادكراو لەلای خوداوە، وەك ئایەتی﴿ فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ ﴾ البقرة: ١٥٢، هەروەها لە فەرموودەیەكی قودسیدا كە پێغەمبەر(ﷺ) لە پەروەردگارییەوە دەیگێڕێتەوە فەرموویەتی ((هەر كەس لە نەفسی خۆیدا یادم بكات لە نەفسی خۆمدا یادی دەكەم، هەر كەس لەناو كۆمەڵێكدا یادم بكات لەناو كۆمەڵێكی چاكتر لەو كۆمەڵە یادی دەكەم))

## ۞ جۆرەكانی زیكر

جۆرەكانی زیكر سیانن: مەدح و سەنا، و دوعا، و چاودێری.

مەدح و سەنای خودای موتەعال، وەك ((سبحان الله، والحمد لله، ولا إله إلا الله، والله أكبر))

یادی دوعا، وەك ئایەتی﴿ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأعراف: ٢٣، هەروەها ((یا حي، یا قیوم، برحمتك أستغیث)) و هاوشێوەكانی ئەمانە.

زیكری چاودێری، وەك قسەی یادكەر بڵێت: "خودام لەگەڵە"، "خودا سەیرم دەكات"، "خودا دەمبینێت" و هاوشێوەكانی ئەمانە كە بەكاردەهێنرێن بۆ بەهێزكردنی ئامادەبوون لەگەڵ خودا–سبحانه– چاودێری بەرژەوەندی دڵی تێدایە، هەروەها بۆ پارێزگاری ئەدەب لەگەڵ خودا و رزگاربوون لە بێئاگایی و خۆپاراستن لە شەیتان و نەفس.

ئەزكارە نەبەوییەكان هەر سێ جۆرەكەی یاد لە خۆیاندا كۆدەكەنەوە، سەنای خودایان تێدایە و دوعا و داوا لەخۆ دەگرن و راگەیاندنیشیان پێدەكەن، وەك لەو فەرموودەی كە دەفەرموێت ((**أفضل الدعاء الحمد لله**)) وترا بە سوفیانی كوڕی عویینە، چۆن "الحمد لله" كراوە بە دوعا؟ فەرمووی: ئەی گوێت لە شیعرەكەی ئومەیەی كوڕی صەلت نەبووە بۆ عەبدوڵای كوڕی جودعان كە رجای چاكەی لێ دەكات:

**أأذكر حاجتي أم قد كفاني ... جباؤك؟ إن شيمتك الحباء**

**إذ أثنى عليك المرء يوما ... كفاه من تعرضه الثناء**

ئەوە مەخلوقێكە تەنها سەناكردن بەسە بۆ ئەوەی داواكانی بگەیەنێت پێی، ئەی دەبێ "رب العالمين" چۆن بێت؟

ئەزكارە نەبەوەییەكان لەپاڵ سەنا و دوعادا كەماڵی چاودێریان تێدایە، هەروەها بەرژەوەندی دڵ و رزگاربوون لە بێئاگایی و خۆپاراستن لە وەسوەسەی شەیتان، هەروەها فێركردنی موناجاتی پەروەردگاری تێدایە بۆ دڵ، تاوێك بە پاڕانەوە و تاوێك بە گەردنكەچی و تاوێك بە سەناكردن، تاوێك بە مەزن راگرتن و شتانی تریش جگە لەمە لە جۆرەكانی موناجات بە نهێنی و بە دڵ.

## (٤١) (منزلة الفقر)

# مەنزیلەی هەژاری

لە مەنزیلەکانی ((إیك نعبد وإیاك نستعین)) مەنزیلەی هەژارییە.

ئەم مەنزیلەیە باڵاترین و بەرزترین مەنزیلەیە لەلای ئەهلی ڕێگەی بەرەو خوداچوون، بەڵکو ڕۆح و نهێنی و ئامانجی هەموو مەنزیلەکانە.

ئەمەش بە زانینی حەقیقەتی "هەژاری" بەدەست دەهێنرێت، ئەوەی عاریفان مەبەستیانە لە مانای ئەم مەنزیلەیە تایبەترە لە مانا بنچینەییەکەی.

وشەی "الفقر"–هەژاری لە قورئاندا لە چەند جێگەیەکدایە:

یەکەمیان: لە ئایەتی ﴿ لِلْفُقَرَاءِ الَّذِينَ أُحْصِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِي الْأَرْضِ يَحْسَبُهُمُ الْجَاهِلُ أَغْنِيَاءَ مِنَ التَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَاهُمْ لَا يَسْأَلُونَ النَّاسَ إِلْحَافًا وَمَا تُنفِقُوا مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ (٢٧٣) ﴾ البقـرة: ٢٧٣، واتە صەدەقە بۆ ئەوانە، هەژارە کۆچکەرەکان نزیکەی چوارسەد کەس بوون، نە ماڵ و خانوویان هەبوو و نە کەسوکار و خزم، خۆیان بۆ جیهاد لە پێناوی خودادا یەکلا کردبووەوە، ئەوان بۆ ئەو سریانە تەرخان کرابوون کە پێغەمبەر(ﷺ) دەیناردنە دەرەوەی مەدینە، ئەوانەش ئەهلی "صوفة" بوون، یەکێکە لەو قسانەی کە لەسەر تەرخان کردنیان لە ڕێگەی خودادا (أُحْصِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ) وتراوە.

هەروەها وتراوە: ئەوانە خۆیان بۆ گوێڕایەڵی و ئەنجامدانی بەندایەتی و کاری چاکە تەرخان کردبوو، دیسان وتراوە: هەژاری و نەبوونی لە جیهادکردن پەکیخستن.

وتراوە: کە سەرقاڵی هێرش کردنە سەر دوژمنانی خودا و جیهاد کردن بوون لە پێناویدا ڕێگەیان لە بازرگانی و گەڕان بەدوای ژیاندا لەسەر زەوی لێگیرا، بۆیە ناتوانن بۆ کاری ژیان ڕوو لە وڵاتان بکەن.

دروستەکەی ئەوەیە: ئەوانە بە هۆی هەژاری و دەستەوسانی و لاوازییانەوە ناتوانن بچن بەدوای ژیانی خۆیاندا، بەهۆی کەماڵی عیففەت و خۆپارێزییانەوە خەڵکانێکی نەزان بە حاڵیان وایان دەزانی دەوڵەمەند بن.

هەروەها ئایەتی﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٦٠﴾﴾ التوبة: ٦٠

هەروەها ئایەتی﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِۖ﴾ فاطر: ١٥

هەژارە وەسفكراوەكانی ئایەتی یەكەمیان﴿لِلۡفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحۡصِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ بریتین لە هەژارە تایبەتەكان، بەلاّم لە ئایەتی دووەمدا ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ﴾بریتین لە هەژارانی موسڵمان تایبەتەكان و گشتییەكان، ئایەتی سێیەمیان ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِۖ﴾ بریتییە لە هەژاری گشتی هەموو ئەهلی سەر زەوی: دەوڵەمەندان و هەژاران، و باوەڕداران و بێباوەڕان.

هەژارە وەسفكراوەكانی ئایەتی یەكەم بەرانبەریان خاوەنانی ماڵ و پارە و سامانن، ئەوانەی كە لە ڕێگەی خودادا بەند نەكراون و دەستیان ئاوەڵایە، ئەو كەسانەش كە هەژاری خۆیان بە هۆی عیففەتەوە ناشارنەوە بەرانبەرن لەگەڵ جۆری یەكەم زیاتر لە بەرانبەر بوون لەگەڵ جۆری دووەم.

**پۆلی دووەم:** دەوڵەمەند و ئەهلی كاروكەسابەت بەرانبەریانن، ئەهلی تەعفوف و دەستگیراوان لە پێناوی خودادا و كەسانی تریش لەخۆ دەگرێت.

**پۆلی سێیەم:** بەرانبەریان نییە، تەنها خودای موتەعال دەوڵەمەندە و هەموو ئەوانەی لەخوار خوداوەن هەژارن.

مەبەستی ئەهلی ڕێگە بە هەژاری(الفقر): شتێكە تایبەتتر لە هەموو ئەمانە، بەڵكو بریتییە لە دەستەبەركردنی بەندایەتی و هەژاری و ئاتاجی بۆ لای خودای موتەعال لە هەموو كات و بارێكدا.

ئەم مانایە مەزنترە لەوەی ناوی هەژاری لێ بنرێت، بەڵكو بریتییە لە حەقیقەت و كرۆكی بەندایەتی، و كەنارگرتنی نەفس لە تەنگهەڵچنین بە پەروەردگاریی خودای موتەعال.

حەقیقەتی هەژاری و كەماڵی هەژاری: -وەك هەندێك لە عاریفان دەڵێن- كاتێك پرسیاری لێ كرا: چ كاتێك هەژار شایستە دەبێت بە ناوی هەژاری "الفقر"؟ فەرمووی: ئەو كاتەی هیچ هەژاری لەسەر نەمێنێت، وتیان ئەوە چۆن دەبێت؟ فەرمووی: گەر

ئەو بۆ هەژاری بێت خودا بۆ ئەو نابێت(إذا کان لـه فلیس لـه) ئەگـەر ئـەو بـۆ هـەژاری نەبێت ئەوا خودا بۆ ئەو دەبێت(واتە گەیشتن بە مەقامی هـەژاری ئـەو کاتەیـە کـە بـە هۆی خوداوە هەست بە هەژاری نەکەیت).

ئەمە باشترین و وردترین دەربڕینێکە لەسەر مانای "الفقر" کـە ئـەهلی ڕێگـە ئامـاژەی پـێ دەدەن، ئەوەش بەوە دەبێت هەموو بوونی بۆ خودا بێت، شتێك لە بەشـی نـەفس و حەز و ئارەزووی تیانەمێنێتەوە، هەتا شتێك لە بڕیارەکانی نەفسی لە ئـەودا بـوونی هەبێت هەژارییەکەی بۆ خودا تێکەڵ بە شتی تر کراوە.

پاشان ئەوەی بە وتـنی"إذا کان له فلیس له" تەفسـیر کـرد، واتـە گـەر ئـەو کەسـە بـۆ نەفسی بێت بۆ خودا نابێت، گەر بۆ نەفسی نەبێت ئەوە بۆ خودایە.

حەقیقەتی "الفقر" ئەوەیە بۆ نەفسی خـۆت نـەبیت، نەفسـت لـە تـۆدا هـیچ بەشـێکی نەبێت، بەجۆرێك کە هەموو بوونت بۆ خودا بێت، گەر بۆ نەفسـی خـۆت بوویـت ئـەوە موڵك و بێنیازبوونێك بوونی هەیە کە نەرێی هەژاری دەکات.

ئەم "هەژارییەی کە ئـەهلی ڕێگـە ئامـاژەی پـێ دەدەن: سەروسـامان و موڵـك و مـاڵ نەرێی ناکات، هەندێك لـە پێغەمبـەران لـە لوتکـەی دەسـەڵات و سـەروەت و سـامان و موڵکـدا بـوون، وەك ئیبراهیمـی خـەلیل(عليه السلام) کـە مـاڵی زۆر و مـەڕ و مـاڵاتی هـەبوو، هەروەها وەك سلیمان و داوود-علیهمـا السـلام-، هـەر بـەو جـۆرە پێغەمبـەرمان(ﷺ) وەك خودای موتـەعال دەفـەرموێت ﴿ وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ ﴿٨﴾ ﴾ الضحی: ٨، ئـەوان لـە هەژارییاندا دەوڵەمەند بوون و هەژاربوون لە دەوڵەمەندییاندا.

**هەژاری ڕاستەقینە:** بریتییە لە بەردەوامبوونی هەژاری بۆ لای خودا لە هەموو کات و حاڵ و بارێکدا، بەنـدەی خـودا لـە هـەر گەردیلەیـەك لـە گەردیلـەی بوونیـدا-لـە نـاوەوە و لـە دەرەوە- هەژاری و نەداریی تەواوی خۆی بۆ لای خودا ببینێت لە هەموو ڕوویەکەوە.

بۆیە هەژاری بەندەی خودا لە ناخیدایـە، ئـەم هەژارییـەی بـۆ نـوێ دەبێتـەوە بـەهۆی بینینی بوون و حاڵی خۆیەوە، ئەگەر نـە، هـەژاری ڕاسـتەقینەیە، وەك شێخولئیسـلام ئیبن تـەیمیە-قدس الله روحه- دەفەرموێت:

والفقر لي وصف ذات لازم أبدا كما الغنى أبدا وصف له ذاتي

هـەژاریی ئاسـەوار و نیشـانە و داواكـاری و هـۆی تایبـەت بـە خـۆی هەیـە كـە زۆربـەی ئاماژەكانی ئەهلی ڕێگە بۆ ئەوانەیە، وەك هەندێكیان دەڵێن: پایەكانی هـەژاری چـوارن: زانستێك كەسەكە بەڕێوە ببات، و وەرعێك رایبگرێت، و یەقینێك شانی پێ بداتـە ژێـری، و یادێك هۆگری ببێت.

پرسیار لە سەهلی كوڕی عەبدوڵا كرا: كەی هەژار ئیسراحەت دەكات؟ فەرمووی: تەنها ئەو دەم و كاتە كە ئەوی تێدایە بۆ نەفسی خۆی ببینێت.

ئەبو حفص دەڵێت: باشترین شتێك بەندە بیكات بـە وەسـیلە بـۆ لای خـودا: بریتییـە لـە بەرداوامبوونی هەژاری و ئاتاجی لە هەموو بارەكاندا، هەروەها پابەندبوون بە سوننەتەوە لە گشت كاروكردەوەكاندا و داوا و گەڕان بەدوای ڕۆزیدا لە ڕێگەی حەڵاڵەوە.

هەژاری سـەرەتا و كۆتـایی هەیـە، هـەروەها دەرەوە و نـاوەوەی هەیـە، سـەرەتاكەی بریتییە لە: زەلیلی بۆ خودا، كۆتاییەكەی بریتییە لە: عیززەت بە خـوداوە، دەرەوەی بریتییە لە: نەبوونی هەژاری، ناوەوەی بریتییە لە: دەوڵەمەندی، وەك ئەو پیاوەی بـە پیاوێكی تری وت: هەژاری و زەلیلی؟ فەرمووی: نە، هەژاری و عیززەت.

كە مانای هەژاریت زانی لەوە دەگەیت بریتییە لە دەوڵەمەنـدی بـە خـوداوە، مانـا بـۆ پرسیاری ئەو كەسە نامێنێتەوە: كام لەم دوو حاڵەتە كامڵترە؟ هـەژاری و ئاتـاجی بـۆ لای خودا یان بێنیازبوون بە خوداوە؟

ئەم پرسـیارە پرسـیارێكی دروسـت نییـە، بێنیـازبوون بـە خـوداوە خـودی هـەژاری و ئاتاجییە بۆ لای خودا.

لەو بارەیەوە پرسیار لە محمد كوڕی عەبدوڵای فەرغانی كرا؟ فەرمووی: ئەگەر هەژاری و ئاتاجی بۆ لای خودا دروست بێت ئەوا بێنیازی بە خـوداوە دروسـت دەبێـت، ئەگـەر بێنیازبوونیش بە خوداوە تەواو بێت ئەوا دەوڵەمەنـدبوون بـە خـوداوە كامـڵ دەبێـت، ناوترێت كامیان باشـترە، هـەژاری یـان بێنیـازی؟ چـونكە دوو حاڵـەتن هیچیـان بـەبێ ئەویتریان تەواو نابێت.

قسە كردنیـان دەربـارەی هـەژاری ئـارامگر(الفقـیر الصـابر) و دەوڵەمەنـدی شـوكركەر (الغـني الشــاكر) و پارســەنگ كردنــی یــەكێكیان لەســەر ئــەویتریان، لــەلای ئــەهلی بەدواداچوون و مەعریفە: باشتر ناگەڕێتەوە بۆ خودی هـەژاری و دەوڵەمەنـدی، بـەڵكو

دەگەڕێتەوە بۆ کار و کردەوەکان و حاڵ و راستییەکان، باشتر لەلای خودا بە تەقوا و حەقیقـەتی باوەڕەیـە، نـەك بـە هـەژاری و دەوڵەمەندییـەوە، وەك خـودای موتـەعال دەفەرموێت ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ﴾ الحجرات: ١٣، نەیفەرموو هەژارترینتان، یان دەوڵەمەندترینتان.

شێخولئیسـلام ئـیبن تەیمیـە –قـدس الله روحـە– دەفـەرموێت: هـەژاری و دەوڵەمەنـدی تاقیکردنەوەی خودایە بۆ بەندەکەی، وەك خودای موتەعال دەفـەرموێت ﴿فَأَمَّا الْإِنسَانُ إِذَا مَا ابْتَلَاهُ رَبُّهُ فَأَكْرَمَهُ وَنَعَّمَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَكْرَمَنِ ﴿١٥﴾ وَأَمَّا إِذَا مَا ابْتَلَاهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَهَانَنِ ﴿١٦﴾ كَلَّا﴾ الفجـر: ١٥ – ١٧، واتـە هـەموو ئەوانـەی پێمبەخشـیون و بـۆم فـراوان کـردوون مانـای وا نییـە رێـزم لێگرتـوون، هـەروەها هـەموو ئەوانـەی لـێم بەرتەسـك کردوونەتەوە و نەدارم کردوون سووکایەتیم پێ نەکردوون، رێزلێنان: ئەوەیە خودا بـە گوێڕایەڵی بەندەکەی رێزی لێ بگرێت، هەروەها بە بـاوەڕ پێهێنـان و خۆشەویسـتی و ناسینی، سوکایەتیش ئەوەیە کە ئەوانەی نەبێت.

ئـیبن تەیمیـە دیسـان دەفـەرموێت: باشـتر و چـاکتر بـە دەوڵەمەنـدی و هـەژاری دەرناکەوێت، بەڵکو بە تەقوا، گەر هەردوو کەسەکە لە تەقوادا یەکسان بوون لە پلـەدا یەکسان دەبن، گوێم لێ بوو ئەم قسەیەی کرد.

ئـەم بابەتـە لـەلای یـەحیای کـوڕی مـەعاز باسـکرا، فـەرمووی: سـبەینێ هـەژاری و دەوڵەمەندی ناپێورێت، بەڵکو صبر و شوکر دەپێورێت.

### ❁ بنەمای هەژاری: دانەدەستە

یەکەمین هەنگاوی هەژاری بریتییە لـە: دەرچـوون لـە نـەفس و تەسـلیمکردنەوەی بـە خاوەنەکەی و سەردارەکەی خـۆی، لـەو بەشـەدا ململانێـی لەگـەڵ ناکـات، بـۆ نـەفس پشت بە هـیچ شـتێك نابەسـتێت، بـۆ نـەفس بەڵگـە ناهێنێتـەوە و نەفسـی خـۆی پـێ سەرناخات، بەڵکو هەموو ئەوانە رادەستی مالیك و سەردارەکەی دەکاتەوە.

بنداری کوڕی حوسەین دەڵێت: بۆ نەفست ململانێ مەکە، چونکە خۆت خـاوەنی نەفسـت نیت، لێیگەڕێ مالیکەکەی هەرچی دەوێت و هەرچۆنی دەوێت با وای لێ بکات.

## ۞ شكاندنی بتەكان

لە پێویستییەكانی ئەو كارە: دەست كێشانەوە لە دونیا نەبادا دەستی بەسەردا بگرێت یان بەدوایدا بگەڕێیت(قبض اليد عن الدنيا ضبطا أو طلبا)، و بێدەنگ كردنی زمان بە مەدح كردنی(و إسكات اللسان عنها مدحا) و سەلامەتی لە دونیا چ بەدوایدا بگەڕێیت چ وازی لێبهێنیت(والسلامة منها طلبا أو تركا).

دونیا لای ئەهلی رێگە بریتییە لە هەر شتێك جگە لە خودای موتەعال، لە ماڵ و سامان و دەسەڵات و پلە و پایە و رووالَّەت.

لەبەر ئەوەی دونیا وابەستەبوونی بە ئەندامەكان و دڵ و زمانەوە هەیە، كەوابوو حەقیقەتی هەژاری بریتییە لە: پەكخستنی ئەو سیانە لە وابەستەبوون بە دونیاوە و داگیركردنیان لەیەن دونیاوە، كە دەستی گرتەوە لە دەستگرتن بەسەر دونیادا دەتوانێت بیبەخشێت، گەر بۆی بەدەست نەهاتبوو دەست لە گەڕان بەدوایدا دەكێشێتەوە، واتە داوای نەبوونەكەی ناكات و بەخیل نییە بەوەی هاتۆتە دەستی لە دونیا(واتە بوون و نەبوونی دونیا لای ئەو یەكسانە)

**پەكخستنی دونیا لە زمان:**

ئەوەیە كە مەدحی دونیا نەكات، چونكە خەریكبوون بە مەدحی دونیاوە بەڵگەی خۆشویستنی دونیا و حەز و ئارەزوو كردنییەتی، هەر كەس شتێكی خۆشویست زۆر یادی دەكات.

وەك چۆن داوا لە هەژار دەكرێت خۆی سەلامەت رابگرێت لە ئافەتەكانی گەڕان بەدوای دونیادا، هەر بەو جۆرە داوای سەلامەتیەكی تری لێ دەكرێت لە كاتی وازهێنان و دەستبەرداربوون لە دونیا، چونكە لە وازهێنانیش لە دونیا جۆرێك ئافەت بوونی هەیە، و لە گەڕان و داواكردنیشی هەر بەو جۆرە، هەژاری بریتییە لە سەلامەتی دڵ لە داواكردنی دونیا و لە وازهێنان لێی، بەجۆرێك لە هیچ روویەكەوە لە ناوەوە و لە دەرەوە پەردە نەخاتە نێوان ئەو و پەروەردگارییەوە، نە لە گەڕان بەدوای دونیادا و بەدەستهێنانی، نە لە وازهێنان لە دونیا و پشت تێكردنی.

گەر دەڵێیت: ئافەتی دونیا لە گەڕان بەدوایدا و بەدەستهێنانی دەزانم، بەڵام رووی ئافەت لە وازهێنان لە دونیا چییە و كامەیە؟

دەڵێم لە چەندین ڕووەوە:

یەكەم: كاتێك واز لە دونیا دێنێت-ئەو هێشتا مرۆڤە و فریشتە نییە-دڵی وابەستە دەبێت بەوەی ڕاوەستاوی دەكات و ڕۆزی پێدەدات و دەیژیەنێت، هەروەها هەموو ئەوانەی كە پێویست و ئاتاجە بۆی، بۆیە لە تێكۆشان و جەنگانێكی توندا دەبێت لەگەڵ نەفسی خۆی، بەهۆی وازهێنان لەوەی زانراوی دونیایە و بەشی خۆیەتی لە دونیا، ئەمەش بریتییە لە كەمی فیقه لەسەر ڕێگەی بەرەو خوداچوون، بەڵكو فەقیهی عاریف: هەموو ئەو پێویستییانە بە یەك لوقمە ڕەد دەكاتەوە، وەك چۆن وەڕینی سەگێك بە لەتە نانێك ڕەد دەكاتەوە، كاتی خۆی بەخت ناكات بە تێكۆشان لەگەڵ ئەوە و بەرپەرچدانەوەی، بەڵكو بەشی خۆی بە نەفسی خۆی دەدات و ئەوجا ئەو حەقە دەكات كە لەسەر نەفسی پێویست كراوە.

ئەمە ڕێگەی پێغەمبەرانە-صلوات الله وسلامە علیهم- و ڕێگەی عاریفانی خاوەن سلوكن، وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((نەفست حەقی لەسەرت هەیە، پەروەردگارت حەقی لەسەرت هەیە، هاوسەرەكەت حەقی لەسەرت هەیە، میوانەكەت حەقی لەسەرت هەیە، حەق بدە بە هەموو خاوەن حەقێك)).

عاریفی ڕۆشنبین(البصیر) لە جێگەی تێكۆشان بۆ وازهێنان لە حەز و ئارەزووی موباح تێدەكۆشێت دژ بە دوژمنانی خودا لە شەیاتینی ئینس و جین و چەتەكانی سەر ڕێگەی دڵ، وەك ئەهلی بیدعەی خاوەن زانست و خاوەن ویست و لێبڕان، هەموو هێزی خۆی بۆ جەنگان دژ بە جەنگ و هەوڵ و كۆشانیان بەخت دەكات، بۆ ئەوەی بتوانێت ئەو جەنگە بباتەوە خۆی بەهێز دەكات بە پێدانی هەندێك لە حەزی موباح بە نەفسی، بەڵام خۆی پێوە سەرقاڵ ناكات.

هەروەها لە ئافەتەكانی وازهێنان: سەیركردنی ئەوەی لە دەستی خەڵكدایە بەتایبەت ئەو كاتانەی پێویستی بەو شتە بێت كە وازی لێ هێناوە، بەردەوامبوون لەگەڵی باشتر بوو لەو وازهێنانە.

هەروەها لە ئافەتی وازهێنان و دەست بۆنەبردن: هاتنی لوتبەرزی و خۆپەسەندی و خۆشحاڵییە بەهۆی وازهێنانەكەوە، ئەمەش ڕووبەڕووی زوهد لە شتەكە و وازهێنان لێی دەكاتەوە.

بۆیە هەژاری دروست و تەندروست ئەوەیە لە ئافەتی وەرگرتن و وازهێنانی لە دونیا سەلامەت بیت، ئەمەش تەنها بە تێگەیشتنێکی ورد لە هەژاری بەدەست دەهێنرێت.

## ۞ جگە لە فەزڵ چیتر هەیە؟

هەروەها لە یاسا و رێساکانی ئەم تێگەیشتنە وردە لە هەژاری بریتییە لە: گەڕانەوە بۆ بڕیاری پێشینە بە سەرنجدان و خوێندنەوەی فەزڵ(الرجوع إلى السبق بمطالعة الفضل)، ئەوە لە بینینی کاروکردەوەکان رزگاری دەکات(وهو يورث الخلاص من رؤية الأعمال)، و لە تەماشاکردنی ئەحواڵ دایدەبڕێت(ويقطع شهود الأحوال) و لە پیسی سەرنجدانی مەقامات پاڵفتەی دەکات(ويمحص من أدناس مطالعة المقامات).

گەرانەوە بۆ بڕیاری پێشینە: بریتییە لە لاکردنەوە بەلای ئەو بڕیارە پێشینانەی کە خودا دەریکردوون ئەوەش بە خوێندنەوەی فەزڵ و منەت و بەخشندەیی خودای موتەعال، بەندەی خودا-و هەموو ئەو خێرانەی کە تێیدایە- تەنها لە بەخشندەیی و چاکەی خوداوە سەرچاوەیان گرتووە، بەندە لە خودی خۆیدا و بۆخۆی تەنها نەبوون بەشییەتی، خودی بەندە و سیفات و باوەڕ و کاروکردەوەکانی هەرهەموو لە فەزڵی خوداوەیە لەسەر ئەو، گەر ئەمەی بینی و دڵی ئامادەی کرد و خۆی پێرازاندەوە: رزگاری دەکات لە تەماشاکردنی کاروکردەوە چاکەکانی خۆی، ئەو تەنها لە خوداوە و بە خوداوە سەرنجی کارەکانی خۆی دەدات، هیچ شتێکی لەخۆیەوە نییە و بەوەوە نەوەستاوە.

عاریفانی رێگە کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی کە بینینی کاروکردەوە چاکەکان پەردەیەکە لەنێوان بەندە و خودادا، ئەوەی لێی رزگار دەکات بریتییە لە: بینینی بڕیارە پێشینەکانی خودا و وردبوونەوە و خوێندنەوەی فەزڵی خودا لەسەر خۆی.

گەر بڕیاری پێشینەی خودای خوێندەوە لەوە دەگات هەموو ئەوەی بۆی بەدەستهاتووە لە حاڵ و هاوشێوەکانی ئەوە تەنها بە بەخشندەیی خوداوەیە، بۆیە لەگەڵ خودادا هیچ حاڵ و مەقامێك بۆ خۆی نابینێت، وەك چۆن هیچ کاروکردەوەیەکی چاك ناداتە پاڵ خۆی، هەژاری لە کارەکان و حاڵی خۆیدا کردووە بە توێشوویەك بۆ لیقای پەروەردگاری، ئەو تەنها بە هەژاریی رووتەوە روو لە

پەروەردگاری دەكات، هەژاری باشترین نیشانەی نێوان خۆی و پەروەردگارییەتی، ئەو راستییەیە خۆی دەداتە پاڵی و ئەو دەرگایە لێوەی دەچێتە ژوورەوە.

جیاوازی نێوان حاڵ و مەقام: ((حاڵ)) مانایەكە روو لە دڵ دەكات، بە ویست و كەسپ و هەوڵی مرۆڤەوە نەبەستراوە، ((مەقام)) مرۆڤ بە جۆرێك لە كەسپ و داوا دەیگاتێ.

ئەحواڵەكان بەهرەی خوداین، بەڵام مەقامەكان بەری دەستی مرۆڤن و بە كەسپی مرۆڤ بەدەست دێن، واتە مەقام بە بەختكردنی هەوڵ و توانا و كۆشش بەدەست دێت، بەڵام حاڵ لە بەخشندەیی خوداوەیە.

پرسیار لە هاوەڵانی ئەبی عوسمانی حیری كرا: شێخەكەتان بە چی فەرمانی پێدەكردن؟ وتیان: فەرمانی دەكرد بە پابەندبوون بە گوێڕایەڵی و كاروكردەوەی چاكە و بینینی ناتەواوی و كەموكورتی لەو كاروكردەوانەدا.

ئەوە بریتییە لە حەقیقەتی حەنەفییەت، كاتێك كارێكی چاكە بۆ خودا و بەخوداوە ئەنجام دەدات ئەو كارە لە هاوەڵدانان بۆ خودا دەیپارێزێت، كاتێكیش كەمتەرخەمی و كەموكورتی خۆی تیا دەبینێت لە خۆپەسەندی و لوتبەرزی دەیپارێزێت، ئەو كاتە كەسەكە بە "إياك نعبد وإياك نستعين"ەوە راوەستاوە.

ئەو ئەبو عوسمانە: بریتییە لە سەعیدی كوڕی ئیسماعیلی نەیسابووری یەكێكە لە عاریفان و شێخە مەزنەكانی ئەهلی بەرەو خوداچوون، دەوترا: لە دونیادا سێ كەس هەیە و چوارەمیان نییە: ئەبو عوسمان نەیسابووری لە نەیسابوور، جونەید لە بەغداد، ئەبو عەبدوڵای كوڕی جەلا لە شام، ئەبو عوسمانی نەیسابوری قسەی زۆر باڵا و بڵندی هەیە، زۆر وەسێتی بە شوێنكەوتنی سوننەت دەكرد، هەروەها گێڕانەوەی حوكم بۆ لای سوننەت و پابەندبوون پێیەوە، كە كەوتە سەرەمەرگ كوڕەكەی كراسەكەی بەری خۆی دڕاند، ئەبو عوسمان چاوی كردەوە كە لە كۆتا هەناسەدا بوو، فەرمووی: كوڕم لە دەرەوە ئەو كارەت پێچەوانەی سوننەتە، لە ناوەوەش نیشانەی ریایە.

## ۞ هەژاری دەوڵەمەندترین دەوڵەمەندییە

هەر كەس هەژاری و ئاتاجی خۆی بۆ خودا دەرببڕێت لە هەموو شت بێنیاز دەبێت.

دەوڵەمەندی دوو جۆرە: دەوڵەمەندییەك بە خوداوە، لەگەڵ بێنیازبوون لە غەیری خودا، ئەم دوانەش بریتین لە حەقیقەتی هەژاری.

شـێخی هـەرەوی بەڵگـە دەهێنێتـەوە لەسـەری بـە ئایـەتی﴿ وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ ﴿٨﴾ ﴾ الضحى: ٨

لەسەر ئەم ئایەتە سێ قسە هەیە:

**یەکەمیان:** خودا بە ماڵ دەوڵەمەندی کرد لەدوای هەژاری: ئەم قسـەی زۆربـەی هـەرە زۆری ئەهلی تەفسیرە، چـونکە وشـەی "عـائلا" بەرانبـەر "أغنـی" دانـراوە، العائـل: بریتییـە لـە کەسـی موحتـاج، نـەك خـاوەن مـاڵ و منـداڵی زۆر، بۆیـە خـودا بـە مـاڵ دەوڵەمەندی کرد.

**دووەم:** خودا رازی کرد بەوەی پێیبەخشی، و لە غەیری خودا بێنیـازی کـرد، ئەمـەش بریتییە لە دەوڵەمەندی دڵ و دەروون، نـەك دەوڵەمەنـدی مـاڵ و دارایـی، هەرئـەوەش بریتییە لە حەقیقەتی دەوڵەمەندی.

سێیەم-کە دروستەکەیانە- هەردوو جۆرەکە لەخۆدەگرێت، دوو جۆرەکەی دەوڵەمەندی: دڵی بە خودا دەوڵەمەند بوو، هەروەها بە ماڵ و دارایی دەوڵەمەندی کرد.

دەوڵەمەندی دڵ بە دەوڵەمەندییـەکی تـر کامـڵ دەبێـت کـە بریتییـە لـە دەوڵەمەنـدی نەفس، بەڵگە و نیشانەکەی: (سـەلامەتبوونە لـە حـەزەکان) و (بـەریبوونی نـەفس لـە خۆنمایش کردن یان ریابازی).

ئاشـکرایە کاروبارەکـانی دڵ کـاملتر و بـەهێزترن لـە کاروبارەکـانی نـەفس، بـەڵام لـەم رێکخستنەدا خاڵێکی ورد هەیە: نەفس یەکێکە لە سەربازەکانی دڵ و لـە رەعییەتـەکانی دڵە، لە هەرچی سەربازەکانی ترە زیاتر ناکۆکی و کێبەرکێی لەگەڵ دڵدا هەیـە، بـەهۆی نەفسەوە ئاژاوە لە مەلەکەتەکەی دڵدا دروسـت دەبێـت، خـەڵکانی نـامۆ دێنـە ژوورەوە، کاتێك دڵ بە دەوڵەمەندی کەماڵی بۆ دروست دەبێـت، ئـەو کەماڵـەی بـۆ تـەواو نابێـت و کامڵ نابێـت بـە دەوڵەمەنـدبوونی نـەفس نـەبێت، هـەرکات نـەفس هـەژار بێـت حـوکمی هەژارییەکەی دەدات بەسەر دڵدا، و دەوڵەمەندییەکەی لێ تێکدەدات، بۆیە دەوڵەمەنـدی نـەفس تـەواوکار و کاملکـاری دەوڵەمەنـدی دڵـە، لـە بنچـینەدا دەوڵەمەنـدی دڵ بـە دەوڵەمەندی نەفسەوە بەستراوە، لە دڵەوە دەوڵەمەندی دەچێت بۆ نەفس، لە نەفسەوە هەژاری و زیان و زەرەر و تەنگەلانی روو لە دڵ دەکات.

گەر ئەمەت زانی بزانە دەوڵەمەندی نەفس بە دوو شتەوەیە:

**یەکەم** ((سەلامەتبوونی لە حەزەکان)) کە بریتییە لە وابەستەبوونی دەرەوە و ناوەوە بە غەیری خوداوە.

**دووەم** ((بەریبوون لە خۆنمایش کردن یاخود ریابازی)) ئەوەش بریتییە لە ویستی غەیری خودا بە شتێك لە کاروکردەوە و قسە و گوفتارەکانی، ریابازی نەفس بەڵگەیە لەسەر هەژاری زۆری ئەو، هەر بەو جۆرە وابەستەبوونی بە حەزەکانەوە بەڵگەی هەژاری نەفسە.

## (٤٢) (منزلة الإجتباء

# مەنزیلەی هەڵبژاردن و پاڵفتەکردن

لە مەنزیلەکانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی هەڵبژاردن و پاڵفتەکردنە.

کەسی باوەڕدار هەرکات گەیشتە لوتکەی باوەڕ، خودای موتەعال هەڵیدەبژێرێت و پاڵفتەی دەکات و رایدەکێشێت بۆ لای خۆی.

پێغەمبەران -عليهم السلام- بەم مەنزیلەیە تایبەت کراون، تا رادەی قۆرخ کردن، شوێن و جێگەی ئەم مەقامەیان داگیرکردووە، جگە لە مەجالێکی کەم کە خودای موتەعال وەقفی کردووە و هەڵیگرتووە بۆ ئەوەی بیدات بە دەستەیەك لە باوەڕداران لە هەر جیلێکدا کە بە خۆشەویستی لەگەڵ خودا راست دەکەن، بۆیە خوداش ئەوانی خۆشدەوێت، ئەوان خودایان دەوێت و خوداش بۆ ئەوان زیاد دەکات.

لە هەڵبژاردنی پێغەمبەران: خودای موتەعال کتێبی خۆی بۆ سەر محمد(ﷺ) دابەزاند، بە رێز و گەورەیی تایبەتی کرد و شایستەیی پێ بەخشی بۆ پەیام و پێغەمبەرایەتی، بەبێ ئەوەی پێغەمبەر رۆژێك لە رۆژان هیوا و ئاواتی بۆ خواستبێت، یان بە هەوڵ و کۆششی خۆی پێیگەیشتبێت، یان کردارێکی کردبێت بە وەسیلە بۆ بەدەستهێنانی، بەڵکو ئەوە تەنها بڕیارێکی خودایی بوو بۆ ئەو، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَمَا كُنتَ تَرْجُوٓاْ أَن يُلْقَىٰٓ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ﴾القصص: ٨٦

هەروەها لەو هەڵبژاردنە: هەڵبژاردنی موسا(عليه السلام) کە بۆ خۆیی هەڵبژارد و پاڵفتەی کرد، ئەوی کرد بە کەسی تایبەتی خۆی بەبێ هیچ هۆ و وەسیلەیەك لە موساوە بۆ لای خودا، دەرچوو بۆ ئەوەی ئاگرێك بهێنێت، گەڕایەوە بوو بوو بە کەلیمی خودای موتەعال و بەرێزترین دروستکراوی خودا، هەموو ئەوانەوە لە خودا خۆیەوەیە، بەبێ ئەوەی کاروکردەوەیەکی شایستەبوون بوونی هەبێت، یان وەسیلەیەك پێشخرابێت، بۆ ئەم مەبەستە وتراوە:

أيها العبد كن لما لست ترجو | من صلاح أرجى لما أنت راج
إن موسى أتى ليقبس نارا | من ضياء رآه والليل داج
فانثنى راجعا وقد كلمه | الله وناجاه وهو خير مناج

موسای لە نەفسی دەرهێنا و بۆ خۆی دروستی کرد و لەنێوان هەموو جیهاندا هەڵیبژارد و بە کەلامی خۆی تایبەتی کردەوە.

پێغەمبەران-عليهم السلام- جیاوازیان لە نێواندا هەیە(مەبەستی ئەو جیاوازییە نییە قورئان نەهی لێکردووە بخرێتە نێوان پێغەمبەرانەوە) وەك جیاوازی شوێنکەوتوانیان.

لەوانە چیرۆکەکەی موسا(ﷺ) کاتێك لەوحەکانی تەوراتی بەسەریەوە هەڵدا -کەلامی خودایان تێدا بوو- و شکاندنی، ریشی براکەی خۆی راکێشا کە پێغەمبەرێك بوو وەك خۆی، لەگەڵ ئەوەشدا خودا لەسەر ئەو کارانەی لۆمەی نەکرد وەك چۆن لۆمەی ئادەمی کرد(ﷺ) بۆ خواردنی شتێك لە بەری درەختەکە.

جگە لە پێغەمبەران چەندین جۆر هەڵبژاردنیان بۆ هەیە: خودا بەندەکەی بپارێزێت لە کاتێکدا لە لێواری تیاچووندایە، ناچاری بکات و حەز و ئارەزووەکانی لێ تاڵ بکات و کۆسپ و تەگەرە بخاتە شوێنی گوناهەکەوە و هەرچی دەرگای ئەنجامدانی ئەو گوناهەیە لێی دابخات.

کاتێك بەندەی خودا نەفسی بەرەو جەفا و گوناه و خراپە دەچێت و ساردی دەکەوێتە نێوان ئەو و خوداوە بەهۆی حەز و ئارەزووەکانییەوە لە یەك چرکەی بێئاگاییدا: خودای موتەعال ناچاری دەکات و لە گوناه دەیپارێزێت، حەز و ئارەزووەکانی لێ تێکدەدات، بۆی رێك ناکەوێت و تامی لێ ناکات، بەڵکو گوناهەکە تێکەڵ دەبێت بە چەندین جۆر لە تاڵکردن و لە بەرچاوکەوتن، گەر ئەوانە نەبوونایە لەوانە بوو چێژی لە گوناهەکەی ببینیبایە و تووشی تیاچوونی بکردبایە، بەجۆرێك چێژ لە گوناه لە پاڵ لێ تاڵکردندا وەك بێئاگاییەکی کەم و کورتی لێ دێت، لەوێوە گوناهەکانی لێ دەبێزرێت، هەر بەو جۆرە پەنای بۆ گوناه کردن لەدەست دەچێت تاکو لە گوناهەکە دوور بکەوێتەوە، و مەیل بە گوناه نەدات و ئارامی و دڵنەوایی لە گوناهدا نەبێت، بۆیە لە هۆی بەدەستهێنانی گوناهیش دووری دەخاتەوە.

## ۞ محمد مرۆڤە كاملەكە(ﷺ)

كاملترين كەسێك لە پێغەمبەران خودا هەڵیبژاردبێت محمدە(ﷺ)

موسا (عليه السلام) لە دەركەوتەی سیفەتی "الجلال"دا بوو بۆیە شەریعەتەكەی شەریعەتی جەلال و زاڵبوون بوو، لە هەرچی دروستكراوی خودایە هەیبەت و ویقاری زیاتر بوو، لە هەموویان زیاتر بۆ خودا و لەبەر خودا تووڕەبوون و توندوتیژی و دەستوەشانی لە دوژمنانی خودا هەبوو.

عیسا(عليه السلام) لە دەركەوتەی "جمال"دا بوو: شەریعەتەكەی شەریعەتی فەزڵ و ئیحسان بوو، لەگەڵ كەس بەشەڕ نەدەهات و نەدەجەنگا، شەریعەتەكەی "قتال"ی تێدا نەبوو، نەصاراكان ئاینەكەیان جەنگی لێ حەرام كردوون، هەر كەس ئەو كارە بكات لە شەریعەتیان یاخی بووە، ئینجیل فەرمانیان پێ دەكات ((هەر كەس زللەیەكی دا لە روومەتی راستت رووومەتی چەپی تێبكە بۆ زللەیەكی تر، هەر كەس دەیویست پۆشاكەكەت لێ داگیر بكات كراسەكەی بەرتی پێبدە، هەر كەس میلێك بە سوخرەی گرتی و بەكاری هێنای دوو میل لەگەڵی برۆ))

بەڵام پێغەمبەری ئێمە(ﷺ) لە دەركەوتەی كەماڵدا بوو، كۆكەرەوەی ئەو هێز و عەدل و توندییەی ئاینی موسا و ئەو نەرمونیانی و بەزەیی و سۆزەی ئاینی مەسیح بوو، شەریعەتەكەی كاملترین شەریعەتە، و ئوممەتەكەشی كاملترین ئوممەتە، ئەحواڵ و مەقامیان تەواوترین حاڵ و مەقامە، بۆیە شەریعەتەكەی عەدل دەهێنێت وەك واجب و فەرز، فەزڵیش دەهێنێت وەك موستەحەب و پەسەنكراو، توندی لە شوێنی توندیدا و نەرمی لە شوێنی نەرمیدا، شمشێر لە شوێنی خۆیدا و لوتف و بەزەییش لە جێگەی خۆیدا، ستەم باس دەكات و حەرامی دەكات و عەدل ناودەبات و واجبی دەكات، باسی فەزڵ هەندێ جار بە پێویست و هەندێ جار بە پەسەند ئاماژە پێ دەدات ﴿ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَاۖ ﴾الشورى: ٤٠، ئەمە بریتییە لە عەدل ﴿ فَمَنۡ عَفَا وَأَصۡلَحَ فَأَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۚ ﴾الشورى: ٤٠، ئەمەیان بریتییە لە فەزڵ، ﴿ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ٤٠ ﴾ الشورى: ٤٠، ئەمە بریتییە لە حەرام كردنی ستەم، ﴿ وَإِنۡ عَاقَبۡتُمۡ فَعَاقِبُواْ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبۡتُم بِهِۦۖ ﴾ النحل: ١٢٦، ئەمە بریتییە لە واجبوونی عەدل و حەرام كردنی ستەم، ﴿ وَلَئِن صَبَرۡتُمۡ لَهُوَ خَيۡرٞ لِّلصَّٰبِرِينَ ١٢٦ ﴾ النحل: ١٢٦، فەزڵی بە پەسەند زانی، هەروەها

ئایـەتی﴿ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ ﴾ البقـرة: ٢٧٩، حـەرام كردنـی سـتەمە، ﴿ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ ﴾البقـرة: ٢٨٠، عەدلـە، ﴿ وَأَن تَصَدَّقُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ البقرة: ٢٨٠، ئەمەش بریتییە لە فەزڵ.

## ۞ ئوممەتی كامڵی محمد....خێرترین ئوممەتە

هەر بەو جۆرە حەرام كردنی ئەوەی پێغەمبەر لە ئوممەتەكەی حەرام كردووە بریتییـە لە پاراستن و خۆپارێزی.

هەرچی پیس و زیانبەخشە لێی حەرام كردوون، و ئەوەی پاك و بەسوودە بۆی موبـاح و حەڵاڵ كـردوون، حـەرام كردنـی ئـەو شـتانە لەسـەریان رەحمـەتی خودایـە، لەسـەر ئومەتانی پێشوو لە سزادان خـاڵی نـەبوو، هیدایـەتی دان بـۆ سـەر ئـەوەی ئومـەتانی پێشوو تیایدا گومڕا و سەرگەردان بوون، لە عیلم و حیلمی خۆیی پێ بەخشین، كردنی بە باشترین ئوممەتێك بۆ مرۆڤایەتی، بـۆ پێغەمبەرەكـەیان هەرچـی چاكەی پـەرش و بڵاوی ئومەتانی ترە كامـڵ بـوو، ئـەوەی لـە كتێبـەكانی تـردا پـەرش و بـڵا و بـوو لـە كتێبەكەیدا(قورئان) كۆكرایەوە و كامڵ بوو، هەر بەو جۆرە شەریعەتەكەی.

ئەوانە هەڵبـژاردە و پاڵفتـەی خـودان و خـودا بـۆ خـۆی تایبـەتی كردوونەتـەوە، وەك دەفەرموێت ﴿ هُوَ ٱجْتَبَىٰكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ﴾الحج: ٧٨، كردنی بە شاهید لەسەر خەڵكی و لەو كارەیانـدا لـە مـەقامی پێغەمبەرانـدا داینـان كـە شـایەتی لەسـەر ئوممەتەكانیان دەدەن.

ئەوەش فەزڵێكە خودا دەیدات بە هەر كەس بیەوێت، والله ذو الفضل العظيم.

۞ ۞ ۞

## (٤٣) (منزلة الإحسان)

# مەنزیلەی ئیحسان

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی ئیحسانە.

بریتییە لە كرۆك و رۆح و كەماڵی ئیمان، ئەم مەنزیلەیە هەرچی مەنزیلەكانی ترە لەخۆ دەگرێت، هەرچی مەنزیلەكانی ترە تیایدا شاراونەتەوە، هەرچی لە سەرەتای كتێبەكەوە(مەبەستی كتێبی "المدارج"ە) تا ئێرە باسكراوە بەشێكە لە ئیحسان.

لەسەر ئەم مەنزیلەیە بەڵگە بە ئایەتی ﴿ هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ ٦٠ ﴾ الرحمن: ٦٠، هێنراوەتەوە، هەروەها بەڵگە بە فەرموودەی ((أن تعبد الله كأنك تراه)) هێنراوەتەوە.

ئیبن عباس و ئەهلی تەفسیر دەفەرموون: ئایا پاداشتی ئەو كەسەی كە وتی"لا إله إلا الله" و كاروكردەوەی كرد بەوەی محمد هێنابووی چیترە جگە لە بەهەشت؟

ریوایەت كراوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) كە ئەم ئایەتەی خوێندۆتەوە﴿ هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ ﴾ پاشان فەرموویەتی ((ئایا دەزانن پەروەردگارتان چی دەفەرموێت؟ فەرموویان: خودا و پێغەمبەرەكەی دەیزانن، فەرمووی: دەفەرموێت: پاداشتی ئەو كەسە چییە كە نیعمەتی یەكتاپەرستیم پێ بەخشیوە جگە لە بەهەشت))

فەرموودەكەی پێغەمبەر(ﷺ) ((أن تعبد الله كأنك تراه)) ئاماژەیە بۆ كەماڵی ئامادەبوونی دڵ لەگەڵ خودای موتەعال، چودێرییەكی كۆكەرەوە بۆ ترس و خۆشەویستی و ناسینی خودا و گەڕانەوەی بەردەوام بۆ لای و ئیخلاص بۆ ئەو- سبحانه- لە هەموو مەقامەكانی باوەڕدا.

شێخولئیسلام هەرەوی دەفەرموێت:

یەكەمین پلەی ئیحسان: پاڵفتەكردنییەكی لەڕووی زانستەوە، بەوەی بیكاتە شوێنكەوتەی زانست و بەپێی زانست بێت و بە زانست پوختە و پاك كرابێت، پاڵفتە بووبێت لە خەوشی بەشی نەفس و حەزەكانی، هیچ مەبەستێكی تری نەبێت جگە لەوەی زانست بە رەوای زانیوە، ((زانست)) بریتییە لە شوێنكەوتنی شەرع و بڕیار.

پلەی دووەم: توندوتۆڵكردن و تۆكمەكردن(الإبـرام) بـە سـووربوون و لێبڕان، وشـەی "الإبرام"واتە "الإحكـام و القـوة"توندوتۆڵ كـردن و تۆكمـەكردن، واتـە سـووربوون و لێبڕانێك لە زانست نزیك ببێتەوە جێبەجێی بكات، ساردبوونەوە و خاوبوونەوە هاوەڵی نەكات ببێتە هۆی لاوازبوون و دارمانی.

## ۞ فیقهی كاری نهێنی

هەروەها لە پلەكانی ئیحسان: ئیحسان لە حاڵدا، بە شاردنەوەی ئەوەی خودا پێیداوە لە پارێزگاری و پاراستن و هەڵبژاردن، تا بتوانێت لە خەڵكی دەیشارێتەوە، بۆ ئـەوەی پێی نەزانن، تەنها مەگـەر بـۆ كەسـی حوجـە دەری بخـات، یـان بـۆ بەرژەوەندییـەكی پارسەنگ، چونكە دەرخستنی بەبێ هۆ چەندین ئافـەتی تێدایـە، لەگـەڵ خسـتنە بـەر مەترسی دز و چەتە و هێرشبەران و ئەهلی حەسەد.
دەرخستنی حاڵ بۆ خەڵكی لای ئەهلی صدق: گێلـێتی و دەستەوسـانییە، لـە بـەش و حەزی نفس و شەیتانە، ئەهلی صدق و لێبڕان لە هـەموو كـەس زیـاتر دەیشـارنەوە، و پەردەی بەسـەردا دەدەن، تەنانـەت لـەو كەسـانە زیـاتر كـە گەنجینـە و مـاڵ و دارای خۆیان دەشارنەوە.

## ۞ كۆچكەران بە هەمیشەیی

باڵاترین ئیحسان: ئیحسانە لە كاتدا، ئەوەش ئەوەیە كە كۆچـكردنەكەت بـۆ لای حـەق– سبحانه– هەرهەری بێت، چـونكە هـەر كەسـێك كـە بـە صـدق و ئـیخلاص روو لـە خـودا دەكات لەوانەیە كە كۆچ بۆ لای خودا دەكات، بۆیە نابێت لەم كۆچە دوابكـەوێت، بـەڵكو دەبێت بە هەمیشەیی و هەرهەری هاوەڵی بێت، تا بە خزمەتی خودای موتەعال دەگات:

فما هي إلا الساعة، ثم تنقضي ويحمد غب السير من هو سائر

لەسەر هەر دڵێك دوو كۆچكردن بۆ خودا پێویسـتە: ئـەو دوانـەش فـەرزێكی بـەردەوام دەبێت لەسەری و پێویستە تا دوا هەناسە وابەستە بێت پێیانەوە.
كۆچێك بۆ لای خودا بە یەكتاپەرستی و ئیخلاص و گەڕانەوەی بەردەوام و خۆشەویستی و ترس و رجا و بەندایەتی، كۆچی دووەم: كۆچكردن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) بە كردنی بە

حەكەم و خۆڕادەست كردن و گێڕانەوەی كارەكان بۆ لای، و گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری بۆ بڕیارەكانی و وەرگرتنی ئەحكامی دەرەوە و ناوەوە لە چرای پێغەمبەرایەتی ئەو(ﷺ) پەرستنی خودا بە شوێنكەوتنی پێغەمبەر مەزنتر و زۆرتر بێت لە شوێنكەوتنی دەلیلێكی شارەزا لە تاریكی شەو و رێگەی پێچ و پەنا و هەزار بەهەزاردا.

گەر ئەو دوو كۆچە لە دڵیدا نەبێت با خاك بەسەر خۆیدا بكات، و لە بنچینەوە بیاچوونەوە بۆ باوەڕی بكات، با بگەڕێتەوە بۆ دواوە بۆ وەرگرتنی نوور، بەر لەوەی پەردە بكەوێتە نێوان ئەو و نووری باوەڕەوە، لەسەر "صراط" و لە پشتی پەردەكەوە پێی بوترێت: بگەڕێرەوە و لەدواوە نوور بەدەست بهێنە. خودا كۆمەك و یارمەتیدەرە.

۞ ۞ ۞

## (٤٤) (منزلة العلم)

# مەنزیلەی زانست

لە مەنزیلەکانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی زانستە.

ئەم مەنزیلەیە گەر هاوەڵی سالیك نەکات لە یەکەم هەنگاوەوە تا دوایین هەنگاو ئەوا سلوکەکەی لەسەر رێگەیەکی ترە، رێگەی گەیشتن بە مەبەستی لیٚ دەبڕێتەوە، رێگەی هیدایەت و سەرفرازی لەبەردەمدا دادەخرێت، دەرگاکان کلۆم دەبن، ئەمە کۆدەنگییەکە لەنێوان عاریفە مەزنەکاندا، تەنها چەتە و رێگرەکانی رێگەی بەرەو خوداچوون و جێگرەکانی ئیبلیس نەهییان لە زانست کردووە.

سەرداری ئەهلی رێگە و شێخی هەموویان جونەیدی بەغدادی-رەحمەتی خودای لیٚ بێت- دەڵێت: هەرچی رێگەیە بە رووی خەڵکدا داخراوە جگە لەو کەسەی شوێنپێی پێغەمبەری(ﷺ) هەڵگرتووە.

هەروەها دەفەرموێت: هەر کەس قورئان لەبەر نەکات و فەرموودە نەنوسێت نابێت کەس شوێنی بکەوێت لەم رێگەی بەرەو خوداچونەدا، چونکە زانستی ئێمە بە کیتاب و سوننەت بەستراوەتەوە.

هەروەها دەفەرموێت: ئەم مەزهەبەی ئێمە بە کیتاب و سننەت چوارچێوەدار کراوە.

ئەبو حفص-رەحمەتی خوای لێی بێت- دەفەرموێت: هەر کەس بەردەوام کردارەکانی و ئەحواڵەکانی بە کیتاب و سوننەت هەڵنەسەنگێنێت و خەیاڵ و ختوورەکانی تۆمەتبار نەکات لە دیوانی پیاواندا ناوی نانوسرێت و سەرژمێر ناکرێت.

سەهلی کوڕی عەبدوڵای توستەری-رەحمەتی خوای لیٚ بێت- دەفەرموێت: هەر کردارێك بەندە ئەنجامی دەدات بەبیٚ شوێنکەوتنی پێغەمبەر تەنها حەزی نەفسە.

ئەحمەدی کوڕی ئەبی حواری-رەحمەتی خوای لیٚ بێت- دەفەرموێت: هەر کەس کارێك ئەنجام بدات بەبیٚ شوێنکەوتنی سوننەت کارەکەی باتڵە.

ئەبو عوسمانی نەیسابوری-رەحمەتی خوای لیٚ بێت- دەفەرموێت: هاوەڵی خودا: بە ئەدەبی باش و جوان و بەردەوام بوونی هەیبەت و چاودێری، هاوەڵی لەگەڵ پێغەمبەر

بە شوێنكەوتنی سوننەتەكانی و پابەندبوون بە زاهیری زانستەوە، هاوەڵی لەگەڵ دۆستانی خودا: بە ڕێزلێگرتن و خزمەت كردن، هاوەڵی خانەوادە: بە ئەخلاقی جوان، هاوەڵی برایان: بە ڕووی خۆش و كرانەوە، تا ئەو رادەیەی نەبێتە گوناه، لەگەڵ نەزانان و نەفامانیشدا بە دوعا بۆ كردن و بەزەیی پیاهاتنەوەیان.

هەندێكیان بۆیان زیاد كردووە: لەگەڵ ئەوانەی قورئان و فەرموودەیان لەبەرە: بە ڕێزلێگرتنیان و نووسینەوە لەبەریان تا چاكەت بۆ بنوسرێت، لەگەڵ نەفس: بە سەرپێچی كردن لە بڕیارەكانی، لەگەڵ شەیتان: بە دوژمنایەتی كردنی.

دیسان ئەبو عوسمان دەفەرموێت: هەر كەس سوننەت بسەپێنێت بەسەر خۆیدا لە قسە و بە كردار: بە حیكمەت قسە دەكات، هەركەسیش ئارەزوو بەسەر خۆیدا بڕێت بە قسە و بە كردار: بە بیدعە قسە دەكات، خودای متەعال دەفەرموێت ﴿وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا﴾ النور: ٥٤

عەمری كوڕی عوسمانی مەكی دەفەرموێت: زانست پێشەوایە، ترس پاڵنەرە، نەفس لەنێوان ئەو دوانەدا دەخولێتەوە، سەركەشی دەكات، فێڵ ئەنجام دەدات، پێچ لێ دەدات، هۆشیاری بە و بە بەڕێوەبردنی زانست بەڕێوەی ببە و چاودێری بكە، بە هەڕەشەی ترس پاڵی پێوە بنێ، ئەوەی دەتەوێت بۆت بەدەست دێت.

## ۞ "أخبرنا"-هەواڵیان پێداین.... سەرەتای زانستمانە

ئەو قسانەی لە هەندێكیانەوە دەگێڕێنەوە: لە بێبایەخ تەماشاردنی زانست و بێنیاز بوون لێی وەك قسەی ئەو كەسەی كە دەڵێت ((ئێمە زانستەكەمان لەو كەسە زیندووەوە وەردەگرین كە هەرگیز نامرێت، ئێوە لە كەسێكەوە وەریدەگرن كە زیندووە و دەمرێت))

هەروەها قسەی ئەوەی كە دەڵێت، كاتێك پێی وترا: سەفەر ناكەیت بۆ ئەوەی بچیت لە عبدالرزاق گوێبگریت؟ وتی: كەسێك چی لە گوێگرتن بكات لە عبدالرزاق، لە كاتێكدا زانست وەردەگرێت لە خەلاق(الخلاق)؟

هاوشێوەی ئەم قسانە: هەمووی نەزانییە و قسەی شەیتانە، ئەگینا ئەگەر عبدالرزاق و شاوشێوەكانی ئەو نەبوونایە لە ریوایەتكارانی فەرموودە ئەوە شتێك لە ئیسلام نەدەگەیشتە ئەو و هاوشێوەكانی ئەو.

هـەر کـەس لـە "أخبرنـا" و "حـدثنا" لات دەدات ئـەوا لایـداوی بـۆ سـەر خـەیاڵی سۆفییەکان و قیاسـی بـەناو فەقیهـەکان و فەلسـەفەی ئـەهلی کـەلام، یـان بـۆ لای بۆچوونێك لە نەفسی خۆیەوە، جگە لە قورئان و "أخبرنا" هیچ شتێکی تر نییە مەگەر تەمومژ و شوبهە و گومان، هەر کەس لە بەڵگە جیاببێتـەوە ڕێگـەی ڕاسـت و ڕەوانـی بزر کردووە، هیچ بەڵگە و ڕێنیشاندەرێك نییە بـۆ لای خـودا و بـۆ گەیشـتنە بەهەشـت جگە لە قورئان و سوننەت، هەر ڕێگەیـەك بەڵگـەی کیتـاب و سـوننەی لەسـەر نـەبێت ڕێگەیەکە سەری لە دۆزەخ و شەیتانی نەفرەتییەوە دەردەچێت.

((زانست)) باشترە لە ((حاڵ))، سوودی حاڵ تەنها بۆ خاوەنەکەیەتی، بـەڵام سـوودی زانست وەك لێزمەی باران وایە کە دەشت و شیو و دۆڵ دەگرێتەوە.

بازنەی زانست دونیا و دواڕۆژ لەئامێز دەگرێت، بازنەی حاڵ بەرتەسك دەبێتەوە تەنها بۆ خاوەنەکەی، بەڵکو بەرتەسك تریش لە خاوەنەکەی.

زانست هیدایەتدەرە و حاڵی دروستیش وەرگری هیدایەتە، زانست میراتی پێغەمبەرانە و لەوانـەوە بـەجێماوە، ئـەهلی زانسـت کۆمـەڵی شـوێنکەوتەی پێغەمبـەرانن و میراتگریـانن، زانسـت زینـدەگی دڵ و نـووری ڕۆشـنبینی و شـیفای دڵ و دەروون و باخچەی بـیر و ژیـری و چـێژی ڕۆح و هـۆگری نامۆیـان و دەلیلـی سـەرگەردانانە، ئـەو میزانەیە قسە و کاروکردەوە و حاڵی پێ دەپێورێت.

زانسـت دادوەری جیاکـەرەوەی نێـوان شـك و یـەقین و نـەزانی و ڕوشـد و هیدایـەت و گومڕاییە.

بە زانست خودا دەناسرێت و دەپەرسترێت، بە زانست یادی خودا دەکرێت و یـەکتایی بۆ بڕیار دەدرێت، و ستایش دەکرێت و گـەورەیی و مـەزنی دەدرێتـەپاڵی، بـە زانسـت سـالیکان ڕێگـەی خودایـان دۆزیوەتـەوە و گرتوویانەتـە بـەر، لـە ڕێگـەی زانسـتەوە گەیشتووان بە خودا گەیشتوون، لە دەرگای زانستەوە مەرامداران چوونە ژوورەوە.

بە زانست شەریعەت و ئەحکام دەناسرێت، حەڵاڵ و حەرام لەیـەکتر جیادەبنـەوە، بـە زانست سیلەی ڕەحم بەجێدەهێنرێت و ڕازیبوونی خۆشەویست جێبەجێ دەکرێت، بـە ناسینی زانست و شوێنکەوتنی زانست لە نزیکەوە بە خودا دەگەیت.

زانسـت ئیمامـە و کاروکردەوەکـان مـەئمومن، زانسـت پێشـەوایە و کاروکردەوەکـان شوێنکەوتەن، لە غەریبیدا هاودەمە و لە تەنهاییـدا قسـەکەر و لـە وەحشـەتدا کەسـی

هۆگر، زانست رەوێنەری تەمومژەکانە، ئەو دەوڵەمەندییەیە کە هەر کەس بەدەستی هێنا هەرگیز هەژار نابێت، ئەو پەنایە هەر کەس رووی تێکرد تیاناچێت.

یادکردنەوەی تەسبیحە و لێکۆڵینەوە تیایدا جیهادە، و داواکردنی نزیکبوونەوەیە لە خودا و بەخشینی صەدەقەیە و توێژینەوەی بە ئەندازەی رۆژوو و شەونوێژە، پێویستی بە زانست لە خواردن و خواردنەوە پێویستترە.

ئیمامی ئەحمەد –خوا لێی رازی بێت– دەفەرموێت: پێویستی خەڵك بە زانست زۆرتر و زیاترە لە خواردن و خواردنەوە، چونکە کەسێك لە شەو و رۆژێکدا جارێك دوو جار پێویستی بە خواردن و خواردنەوە دەبێت، بەڵام بە ژمارەی هەناسەکانی پێویستی بە زانستە.

ریوایەتمان کردووە لە شافیعییەوە –خوا لێی رازی بێت– کە فەرموویەتی: گەڕان بەدوای زانستدا باشترە لە نوێژی سوننەت.

ئیمامی ئەبو حەنیفە –خوا لێی رازی بێت– هەمان ئەو فتوایەی داوە.

ئیبن وەهب دەڵێت: لە خزمەتی مالیکدا بووم(ئیمامی مالیك) –خوا لێی رازی بێت– لەوحی نووسینەکانم لابرد و هەستام بۆ نوێژکردن، فەرمووی: ئەوەی بۆی هەستای لەوە چاکتر نییە کە لێی هەستای. "ئیبن عەبد بەڕ" و کەسانی تریش باسیان کردووە.

خودای موتەعال ئەهلی زانست دەکات بە شایەت لە مەزنترین مەشهەددا کە بریتییە لە یەکتاپەرستی، شایەتی ئەوانی لەگەڵ شایەتی خودا و فریشتەکاندا هاوتاکردووە، لە ئامێزی ئەو شایەتیدانەدا دادپەروەری ئەهلی زانست دەردەکەوێت، چونکە خودای موتەعال کەسی بریندار(ناعادل) ناکات بە شایەت.

ئالێرەوەیە –خودا زاناترە– ئەو فەرموودە ناسراوە وەردەگیرێت ((ئەم زانستە لە هەر پاشینێکدا(لە هەر نەوەیەکدا) عادیلەکان هەڵیدەگرن، تەحریفی زیادەڕەوان و تەئویلی ئەهلی باتڵی لێ لادەبەن))

زانست حوججەی خودایە لە زەویدا و نووری ئەوە لەنێوان بەندەکانیدا، پێشەوا و رێنیشاندەریانە بۆ بەهەشت، و نزیککەرەوەیانە لە رێزلێنانی خودا بۆ ئەوان، بەسە بۆ شکۆی زانست: کە فەزڵی ئەهلی زانست لەسەر بەندەکان وەك فەزڵی مانگ وایە لە شەوی چواردەدا بەسەر هەسارەکانی تردا، فریشتەکان باڵیان بۆ دادەخەن و دەیانهێننە ژێر باڵی خۆیانەوە.

كەلیمی رەحمان موسای كوڕی عمران-علیه الصلاة السلام- بەدوای زانستدا گەڕاوە، خۆی و ئەو گەنجەی كە لەگەڵی بوو، تا رووبەڕووی ماندووبوونێكی زۆربوونەوە لەپێناوی بەدەستهێنانی زانستدا، تا سێ بابەتی زۆر گرنگی بەدەستهێنا، لەگەڵ ئەوەشدا موسا بەڕێزترین و زاناترین خەلقی خودا بوو.

خودا فەرمانی بە پێغەمبەرەكەی كردووە كە داوای زانستی زۆرتر بكات لە خودا و پێی دەفەرموێت ﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا ١١٤﴾ طه: ١١٤

## ۞ جۆرەكانی زانست

زانست دوو جۆرە:

<u>یەكەم:</u> زانستێكی ئاشكرا كە بە بینین پەی پێ دەبرێت، یان بە لێشاوێكی دەنگیی دروست، یاخود ئەزموونێكی دروستی پێشتر.

واتە ئەم زانستە ئاشكرا سێ جۆرە:

یەكەم: ئەوەی بەرچاو دەكەوێت كە بە رێگەی بینینە.

دووەم: ئەوەی دەدرێتە پاڵ گوێ كە لە رێگەی بیستنی دەنگەوەیە.

سێیەم: ئەوەی دراوەتە پاڵ ژیری كە بریتییە لە زانستی ئەزموون.

ئەم سێ رێگەیە-كە بریتییە لە بیستن و بینین و ژنەوتن- گرنگترین رێگە و دەرگای زانستن، بەڵام هەموو رێگاكانیان تیا كۆنابنەوە، چونكە هەستەكانی تریش دەتوانن زانست بەرچنگ بخەن، هەندێك لەو هەستانە پەیوەندیان بە ناوەوەی مرۆڤەوەیە وەك هەستی ویژدان، هەر بەو جۆرە بە هەواڵی هەواڵدەرێكی راستگۆوە با تەنها یەك كەسیش بێت، بە هەمان شێوە ئەوەی بە بیركردنەوە و هەڵهێنجان بەدەست دەهێنرێت با لە ئەزموونیشەوە نەبێت.

<u>دووەم:</u> زانستێكی شاراوەیە لە دڵێكی پاك و جەستەیەكی خاوێندا دەڕوێت، بە ئاوی وەرزشێكی تایبەت، بۆ كەسانی خاوەن هیممەت و لێبڕانی باڵا دەردەكەوێت لە دەمە تەنهاییەكان و بیستنە ئارامەكاندا.

ئەم زانستە شاراوەیە لای ئەهلی زانستی جۆری یەكەم و بە "مەعریفە"ش ناودەبرێت، لە دڵانێكی پاكبووەوە لە لیلّی دونیا و سەرقاڵی بە دونیاوە دەڕوێت، دڵێك رزگاری

بوو‌بێت لەو وابەستەبوونانە کە کۆسپ و لەمپەر بۆ ڕۆح دروست دەکەن تاکو بەرەو مەملەکەتی شادییەکان هەنگاو هەڵنەگرێت، هەموو ئەوانە دەبنە لێڵی و تۆز و غوبار لەسەر ڕووی ئاوێنەی پاکی دڵ و ڕۆح، وەك پێویست وێنەی "حەقائق"ی لەسەر دەرناکەوێت و هەمیشە نەفس فووی دەمی خۆی لە ڕەغبەت بە دونیا و ترسان لە تیاچوونی دەکات بە ڕووی ئاوێنەی دڵدا، کاتێك ئەو ئاوێنەیە پاکبوویەوە بە ڕۆیشتنی لێڵی و تەپوتۆزەکان ئەوا حەقائق و مەعاریفی تیا دەردەکەوێت.

ئەم دڵانە تەنها جەستە خاوێن و پاکژەکان دەتوانن هەڵیان بگرن، ئەو جەستانەی بە تاعەتی خودا پاکبوونەتەوە و بە خواردنی حەڵاڵ ڕوواون، هەر کات جەستە لە حەرام ڕزگاری بوو و دوورکەوتەوە لە پیسییە مرۆییەکان -کە ئەقڵ و دین و پیاوەتی نەهی لێ دەکەن- و نەفس لە وابەستەکانی دونیا پاکبوویەوە: زەوی دڵ خاوێن دەبێتەوە، ئەو کات تۆوی زانست و مەعاریف قبووڵ دەکات، گەر لەدوای ئەوە بە ئاوی وەرزشی شەرعی و نەبەوی و موحەمەدی ئاودرا -ئەوەش ئەوەیە کە وەرزشەکە لە زانست دەرنەچێت لە واجب دوورنەکەوێتەوە و سوننەت پەکنەخات- ئەوا تۆوەکان سەوز دەبن و دێنەبەر لە زانست و حیکمەت و سوود و ناسین، بۆیە خاوەنەکەی و ئەوەی لەگەڵ ئەو دادەنیشێت چەندین جۆر سوود و بەروبوومی هەمەڕەنگ و تام و چێژ دروێنە دەکەن.

((هیممەتی بەرز)) ئەو هیممەتەیە بە هیچ شتێکەوە گل ناخواتەوە تا بە خودا نەگات، بەرز نابێتەوە بۆ لای هیچ شتێك بۆ لای خودای موتەعال نەبێت، بەرزترین و فروانترین هیممەت ئەو هیممەتەیە کە چاککردنی خەڵکی تێدایە، ئەوەش هیممەتی پێغەمبەران و شوێنکەوتەی پێغەمبەرانە.

لە ((دەمە تەنهاییەکان و بیستنە ئارامەکاندا)): ئەو بیستنەیە لە وابەستەبوون بە باتڵ و ژاوەژاو ڕزگاری بووە، وەلامی بانگی حەق و بانگکەری باوەڕی داوەتەوە.

دەتوانی بڵێی: ئەم زانستە شاراوەیە بریتییە لە تێگەیشتنێکی تایبەت کە بەری بەندایەتی و شوێنکەوتنی پێغەمبەر و صدقە لەگەڵ خودادا، هەروەها بەری هەوڵ و کۆشش لە وەرگرتنی نووری زانست لە چرای پێغەمبەری خودا و کەماڵی تەسلیمبوون پێی، وەك علی کوڕی ئەبی تالب -خوا لێی ڕازی بێت- دەفەرموێت: کاتێك پرسیاری

لێكرا: ئایا پێغەمبەر –جیا لە خەڵكی– ئێوەی بە شتێك تایبەت كردووە؟ فەرمووی ((نەخێر، سوێند بەو كەسەی چەكەرە بە تۆو دەكات و رۆح بەبەردا دەكات، مەگەر تێگەیشتنێك لە قورئان خودا بیدات بە یەكێك لە بەندەكانی)).

یان دەتوانی لەسەر ئەم زانستە بڵێی: بریتییە لە رۆشنبینی(بینینی رۆشن واتە بەصیرەت) كە تیایدا پەیوەندی زانست بۆ دڵ وەك پەیوەندی بینراوەكان وایە بۆ بینین، ئەمە ئەو تایبەتمەندییەیە كە هاوەڵانی پێغەمبەری لە ئوممەت پێ تایبەت كراوە كە بەرزترین پلەی زانایانە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى ﴾یوسف: ١٠٨، واتە من و شوێنكەوتوانم لەسەر بینینی رۆشنین.

وتراوە (وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى) بە مەرفوعی عەتفكراوەتە سەر (أَدْعُوٓا۟) واتە من بانگ دەكەم بۆ لای خودا لەسەر بینینی رۆشن، ئەوانەش شوێنم دەكەون هەر بەو جۆرە بانگ دەكەن بۆ لای خودا لەسەر رۆشنبینی.

لەسەر هەردوو قسەكە ئایەتەكە: ئەوە نیشان دەدات كە شوێنكەوتوانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەهلی رۆشنبینین و بانگكەرن بۆ لای خودا لەسەر بینینی رۆشن، هەر كەس لەوان نەبێت ئەوە لەسەر حەقیقەت و تەبایی لە شوێنكەوتەی پێغەمبەر(ﷺ) نییە، با بە بانگەشە و خۆدانەپاڵ خۆی بە شوێنكەوتەی ئەو(ﷺ) بزانێت.

یان دەتوانی بڵێی ئەو زانستە شاراوەیە بریتییە لە ((حیكمەت)).

خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿يُؤْتِى ٱلْحِكْمَةَ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِىَ خَيْرًا كَثِيرًا ﴾البقرة: ٢٦٩، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُن تَعْلَمُ ۚ وَكَانَ فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا ﴿١١٣﴾ ﴾ النساء: ١١٣، دەربارەی مەسیح(عليه السلام) دەفەرموێت ﴿وَيُعَلِّمُهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴿٤٨﴾ ﴾ آل عمران: ٤٨

((حیكمەت)) لە كتێبی خودادا دوو جۆرە: یەكەم: بە تەنها لە قورئاندا هاتووە، دووەم: "حیكمەت" كە لەگەڵ "الكتاب"دا هاتووە.

تەنهاكە: بە پێغەمبەرایەتی تەفسیر كراوە، هەروەها بە زانستی قورئانیش تەفسیر كراوە، ئیبن عەباس–خوا لە خۆی و باوكی رازی بێت– دەفەرموێت ((بریتییە لە

زانستی قورئـان، ناسـخ و مەنسـوخ، و موحکـەم و موتەشـابیە، و پێشـکەوتوو و دواکەوتوو، حەڵاڵ و حەرام، و ئەمسال))

زەححاك دەڵێت: بریتییە لە قورئان و تێگەیشتن لـە قورئـان، موجاهیـد دەفـەرموێت: بریتییە لە قورئان و زانست و فیقه، لە ریوایەتێکی تردا لە موجاهیـدەوە: بریتییـە لـە پێکان لە گوفتار و کرداردا.

نەخەعی دەڵێت: بریتییە لە مانای شتەکان و تێگەیشتن لێیان.

حەسەن دەفەرموێت: بریتییە لە وەرع لە دیـنی خـودادا، وەك ئـەوەی بـە بـەروبوومی حیکمەت تەفسیری کردبێت.

"حیکمەت" کە لەگەڵ "الکتاب"دا هاتبێت: بریتییە لە سوننەت، شـافیعی و ئیمامـانی تریش وایان فەرمووە.

جوانترین شتێك لەسەر حیکمەت وترابێت: قسـەکەی موجاهیـد و مالیکـە: بریتییـە لـە ناسینی حەق و کارکردن بە حەق، و پێکان لە گوفتار و کرداردا.

ئەمەش تەنها بە تێگەیشتن لە قورئان دەبێت، هەروەها بە فیقه لە شەریعەتی ئیسلام و حەقائیقی باوەڕ.

((حیکمەت)) دوو حیکمەتە: زانستی و کرداری، زانستی: وردبوونەوە و سـەرنجدان لـە ناخ و ناوەوەی شتەکان و زانینی بەستنەوەی هۆ و هۆکارەکان بـە سەرچـاوەی هـۆ و هۆکارەکانەوە، لـە ڕووی بـوون و بڕیـار و قـەدەر و شـەرعەوە، حیکمـەتی کرداریش: بریتییە لە دانانی شت لە جێگەی خۆیدا.

بنچینەی حیکمەت: ئەوەیە کە هەر شتێك حەقی خۆی پێ ببەخشـیت، و لـە سـنووری تێنەپەڕێنیت، و لە کاتی خۆی نە پەلەی لـێ بکـەیت، نـە دوای بخـەیت، ئەمـە کاتێـك شتەکان ئاست و حقوقی هەبوو کە شەرع و قەدەر داوای دەکردن، هەروەها سـنوور و کۆتاییەکیان هەبوو کە پێی دەگەن و لێی تێپـەڕ ناکـەن، کـاتی تایبـەتیان هـەبوو کـە پاش و پێش نەدەکەوتن، حیکمەت بریتییە لە چاودێری ئەو سـێ ئاراسـتەیە: بـەوەی حەق بە هەر ئاستێك بدەی کە خودا بە شەرع و قـەدەری دیاریکردووە، لـە سـنووری خـۆی تێیـان نەپـەڕێنی کـە ببێتـە سـنووربەزێنی و پێچـەوانەی حیکمـەت، و هـەوڵی پەلەکردن نەدەی کە دژی حیکمەتە، لێشی دوانەکەوی و ببێتە هۆی تیاچوونی.

ئەمە بریتییە لە حوکمێکی گشتی بۆ هەموو هۆ و هۆکارەکان لەگەڵ سەرچاوەکانیان لەڕووی شەرع و قەدەرەوە، بەفیڕۆدانیان پەکخستنی حیکمەتە وەك بەفیڕۆدانی تۆو و ئاو نەدانی تۆوەکە وایە.

سنووربەزاندنی حەق: وەك ئاودانی زۆری تۆوەکە وایە زیاد لە پێویستی، بەجۆرێك تۆوەکە و کشتوکاڵەکە لەخۆیدا نوقم دەکات و دەبێتە هۆی تیاچوونی، پەلەکردنیش لە کاتی: وەك دروێنەی کشتوکاڵەکە وایە بەبێ ئەوەی وەرزی دروێنەکردنی هاتبێت و گەیشتبێتە پێگەیشتن و کەماڵ.

بۆیە حیکمەت بریتییە لە: ئەنجامدانی ئەوەی پێویستە، لەو رووەوە کە پێویستە و لەو کاتەیدا کە پێویستە.

خودای موتەعال حیکمەتی بە میرات بە ئادەم و نەوەکانی بەخشی، پیاوی کامڵ: ئەو کەسەیە کە میراتی تەواوی لە باوکییەوە پێدەگات، بەڵام نیوپیاو-ئافرەت- نیوەی میراتی بەدەست دەگات، جیاوازی نێوان کەسەکان لە وەرگرتنی حیکمەت مەگەر تەنها خودا خۆی بیزانێت.

کامڵترین خەلقی خودا لە وەرگرتنی میراتی حیکمەتدا: بریتین لە پێغەمبەران-علیهم صلوات الله وسلامه- کامڵتر لەوان بریتین لە پێغەمبەرانی خاوەن عەزم(أولوالعزم)، کامڵترین پێغەمبەری ناو"أولوالعزم" بریتییە لە محمد(ﷺ) بۆیە خودا منەتی کردووە بە سەر خۆی و ئوممەتەکەیدا بەو حیکمەتەی پێی بەخشیون، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمۡ تَكُن تَعۡلَمُ﴾النساء: ١١٣، هەروەها دەفەرموێت ﴿كَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِيكُمۡ رَسُولٗا مِّنكُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمۡ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمۡ تَكُونُواْ تَعۡلَمُونَ ١٥١﴾ البقرة: ١٥١

هەموو نیزامی بوون بەم سیفەتەی خودای موتەعالەوە بەستراوەتەوە، هەرچی هەڵەیەك لە بووندا و لە مرۆڤدا هۆیەکەی بریتییە لە کەمتەرخەمی بەرانبەر بە حیکمەت، کامڵترین مرۆڤ: ئەو کەسەیە کە بەشی لە حیکمەتدا لە هەموو کەس زیاترە، ناتەواترین و دوورترین کەس لە کەماڵ: بریتییە لەو کەسەی کەمترین میراتی حیکمەتی پێگەیشتووە.

حیكمەت سێ پایەی هەیە: زانست و حیلم و ئەزموونیانی.

ئافـەت و دژەكـانی حیكمـەت بـریتین لـە: نـەفام و نـەزان، و هەڵچـوو، و پەلەكـەر و تیانەوەستاو.

حیكمەت نە بۆ نەفام، نە بۆ هەڵچوو، نە بۆ پەلەكەر بوونی نییە. خودا زاناترە.

كاتێك حیكمەت كامڵ دەبێت "تەماشای بەڵێنەكانی خودا بكەیت" و "عەدالەتی خودا لە حوكمیدا بناسیتەوە"، و "چاكەی خودا لە لێگرتنەوەدا سەرنج بدەیت".

واتە حیكمەت لە بەڵێن و هەڕەشەكانی خودا ببینیت، حـوكمی خـودا تەماشـا بكـەیت وەك لــە ئایــەتی ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا ۝٤٠ ﴾ النساء: ٤٠، عەدلی خودا لە هەڕەشەكانی و چاكەی خودا لە بەڵێنەكانی تەماشا بكەیت.

هەر بەو جۆرە دادپەروەری خودا لە ئەحكامە شەرعی و گەردوونییە جارییەكانیـدا بـە سەر دروستكراوەكاندا ببینیت، ئەو ئەحكامانە ستەمیان تێدا نییە بـا لەسـەر دەسـتی ستەمكارانیش تێیان بپەڕێنێت، خودا دادپەروەرترین دادپەروەرە، بەڵام ئـەو كەسـەی كە لەسەر دەستی جاری دەبێت پێی دەوترێت ستەمكار.

هەر بەو جۆرە ((چاكەی خودا لە لێگرتنەوەدا ببینیت))

خودای موتەعال بەخشندەیە و بە بەخشین گەردیلەیەك لـە گەنجینـەی خـودا كـەم ناكات، بەرینیی بەخشینی خودا كەم ناكات، لێگرتنەوەی بەخشین و فەزڵ لـە هـەر كەسـێك بـۆ حیكمـەتێكی كامـڵ دەگەڕێتـەوە لـەو لێگرتنـەوەدا، چـونكە خـودا بەخشندەی حەكیمە، حیكمەتەكـەی لەگـەڵ بەخشـینیدا دژ ناوەسـتنەوە، خـودای موتەعال چاكە و فەزڵی خۆی لـە شـوێن و كـاتی خۆیـدا دادەنێـت، بـەو ئەنـدازەی حیكمەت داوای دەكات، گەر خودا رۆزی بـۆ بەنـدەكانی فـراوان بكـات تێكدەچـن و تیادەچن، گـەر بیزانیبایـە بێبـاوەڕان خێریـان تێدایـە و قبـووڵی نیعمـەتی ئیمـان دەكەن و شوكر دەكەن لەسـەری و خۆشەویسـتی و دانپیانانیـان بـۆ خـودا دەبێـت ئـەوا هیدایــەتی دەدان بــۆ بــاوەڕ، بــۆ ئــەو مەبەســتە كاتێــك وتیــان بــە بـاوەڕداران﴿ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ﴾الأنعـام: ٥٣، خـودای موتـەعال وەڵامـی دانەوە و فەرمووی﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ۝٥٣ ﴾ الأنعام: ٥٣

گوێم لە شێخولئیسلام ئیبن تەیمیە بوو-قدس الله روحه- لەسەر وشەی "الشاكرين"ی ئایەتەكە دەیفەرموو: ئەوانە بریتی بوون لەو كەسانەی كە بەرزی نیعمەتی ئیمانیان دەزانی و شوكری خودایان لەسەر دەكرد.

خودای موتەعال بە حیكمەت دەبەخشێ و بە حیكمەت دەگرێتەوە، بە حیكمەتیش كەسێك گومڕا دەكات.

# (٤٥) (منزلة (الفراسة)

## مەنزیلەی فیراسەت

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی فیراسەتە.

خـودای موتـەعال دەفـەرموێت ، خـودای موتـەعال دەفـەرموێت ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾ الحجـر: ٧٥، موجاهیـد –رەحمـەتی خـوای لـێ بێـت– دەڵێـت: "للمتوسمين" واتە "للمتفرسين" فیراسەتدارەكان، ئیبن عباس–خوا لە خۆی و باوكی رازی بێـت– دەفـەرموێت: "للنـاظرين"واتـە تەماشـاكەران، قـەتادە دەفـەرموێت: "للمعتبرين"واتە ئەوانەی پەند وەردەگرن، موقاتل دەفەرموێت: "للمتفكرين"واتـە بـۆ ئەوانەی بیردەكەنەوە.

دژایەتی لەنێوان ئەم قسانەدا نییە، تەماشاكەر هەر كـات تەماشـای ئاسـەواری وڵات و شـوێنی بێبـاوەڕانی كـرد و تێڕامـا ئـەو سـەرئەنجامەی ڕووبـەڕوویان بوویـەوە: ئـەوا فیراسەت و پەند و هۆشی لەلا دروست دەبێت، خودای موتـەعال دەربـارەی دووڕووان دەفەرموێت ﴿ وَلَوْ نَشَاءُ لَأَرَيْنَاكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَاهُمْ ۚ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِي لَحْنِ الْقَوْلِ ﴾ محمد: ٣٠، یەكەمیان فیراسەتی بینین و چاوە، دووەمیان فیراسەتی گوێ و بیستنە.

ئـاوازی قسـە (لحـن القـول) دوو جـۆرە: هەڵـە و راسـت، ئـاوازی دروسـت دوو جـۆرە: یەكەمیان: زیرەكی و هۆشیاری، لەوانە ئەو فەرموودەی دەفەرموێت ((ولعل بعضكم أن يكون ألحن بحجته من بعض))–لەوانەیە هەندێكتان لەحنی قسەی زۆرتـر و بـەهێزتر بێـت لە هەندێكی ترتان، واتە زمان پاراوتر بێت.

دووەم: ئاماژە و هێمابۆكردنی شاراوە كە نزیكە لە كینایەوە، لەوانە قسەی شاعیر:

وحديث ألذه وهو مما ‌‌ ‌ يشتهي السمعون يوزن وزنا

منطق صائب وتلحن أحيانا ‌ ‌ ‌ وخير الحديث ما كان لحنا

سـێیەم: تێكچـوونی گـۆكردن لـە ئیعرابـدا، حەقیقەتەكـەی: گـۆڕینی كـەلام لـە ڕەوگـەی دروستی خۆی: یان بۆ لای هەڵە، یان بۆ لای مانایەكی شاراوە كە وشەكەی بۆ دانەنراوە.

مەبەستەکە ئەوەیە: خودای موتەعال سوێندی خواردووە لەسەر ناسینیان لە ئاوازی گوفتاریانەوە، ناسینی قسەکەر و ئەوەی لە ویژدانییەتی لە مەرامی قسەکەی: نزیکترە لە ناسینی بە سیمایدا و ئەوەی لەسەر روخساریەتی، ئاماژەی قسەکردن لەسەر مەبەستی کەسی قسەکەر و ویژدانی ئاشکراترە لە سیما و روخساری بینراوی کەسەکە. فیراسەت وابەستەی هەردوو جۆرەکەیە بە بینین و بە بیستن، لە سوننەنی "الترمذي"دا لە فەرموودەکەی ئەبی سەعیدی خودری-خوا لێی رازی بێت- لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی ((إتقوا فراسة المؤمن فإنه ینظر بنور الله)) پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾ الحجر: ٧٥، فیراسەتی باوەڕدار راست و هەمیشەییە.

هۆیەکەی: نوورێکە خودا هەڵیدەداتە ناو دڵی بەندەکەیەوە، بەهۆیەوە حەق لە باتڵ و صادق لە درۆزنی پێ جیادەکاتەوە.

حەقیقەتی فیراسەت: بریتییە لە خاتیرەیەك کە هێرش دەکاتە سەر دڵ و نەرێی دژەکەی دەکات، پەلاماری دڵ دەدات وەك چۆن شێر پەلاماری نێچیرەکەی دەدات، بەڵام "الفریسة" لەسەر کێشی "فعیلة"یە بە مانی "مفعولة"، بینای "الفراسة" وەك بینای "الولایة" و "الإمارة" و "السیاسة" وایە.

ئەم ((الفراسة))یە بەپێی هێزی ئیمانە، هەر کەس باوەڕی بەهێزتر بێت فیراسەتی تیژتر دەبێت.

عەمری کوڕی نوجەید دەڵێت: شاه کەرەمانی فیراسەتێکی تیژی هەبوو، لە فیراسەتدا هەڵەی نەدەکرد و دەیپێکا، دەیفەرموو: هەر کەس چاوەکانی لە حەرام دەبخات، و نەفسی لە شەهەوات بگرێتەوە، و ناوەوەی بە چاودێری، و دەرەوەی بە شوێنکەوتنی سوننەت برازێنێتەوە، و خواردنی حەڵاڵ بێت: فیراسەتی هەڵە ناکات.

ئەبو جەعفەری حەداد دەفەرموێت: فیراسەت یەکەمین خاتیرەیە بەبێ بەرهەڵستکار، گەر بەرهەڵستکارێکی تر لە رەگەزی خۆی بەرهەڵستی کرد، ئەوە بریتییە لە خاتیرە و قسەی دەروون.

شێخی هورری دەفەرموێت: هیچ فیراسەتێك راست نییە تەنها ئەو فیراسەتە نەبێت لە درەختی باوەڕەوە بەرەکەی دەچنرێتەوە.

باوەڕی بە چاندن چواند، چونکە زیاد دەکات و گەشە دەکات، بە ئاودان دەگەشێتەوە، هەموو کات بە مۆڵەتی پەروەردگار بەری بەتام و شیرین دەبەخشێت، ریشەی بە زەویدا داکوتیوە، و لق و پۆپەکانی لە ئاسماندان، هەر کەس ئیمانی لە زەمینەی دڵی پاك و خاوێندا چاند و بە ئاوی ئیخلاص و صدق و شوێنکەوتنی پێغەمبەر ئاوی دا ئەوا بەشێك لەبەرەکەی دەبێت بە فیراسەت.

ئیبن مەسعود –خوا لێی رازی بێت– دەفەرموێت: بە فیراسەترین کەس سێ کەسن: عەزیزی مصر لە یوسفدا، کاتێك بە هاوسەرەکەی وت﴿أَكۡرِمِي مَثۡوَىٰهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوۡ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدٗا﴾یوسف: ٢١ ، کچەکەی شوعەیب دەربارەی موسا وتی بە باوکی ﴿يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُۖ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ ٢٦﴾ القصص: ٢٦، هەروەها فیراسەتی ئەبوبەکر لە هەڵبژاردنی عومەر بە خەلیفە –خوا لە هەردووکیان رازی بێت– لە ریوایەتێکی تردا فیراسەتی ژنەکەی فیرعەون کاتێك دەربارەی موسا بە فیرعەونی وت﴿قُرَّتُ عَيۡنٖ لِّي وَلَكَۖ لَا تَقۡتُلُوهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوۡ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدٗا﴾ القصص: ٩.

ئەبوبەکری صدیق لە هەموو ئوممەت فیراسەتی مەزنتر بوو، بەدوایدا عومەری کوڕی خەتتاب–خوایان لێ رازی بێت، رووداوی فیراسەتی عومەری کوڕی خەتتاب بەناوبانگە، بە شتێکی نەفەرمووە ((وا گومان دەبەم)) وادەرنەچووبێت، وەك دەوترێت، بەسە لە فیراسەتی ئەودا: لە چەندین شوێنی قورئاندا لەگەڵ ئەمری پەروەردگاری تەبا بووە، لەوانە دیلەکانی بەدر و چەند شوێنی تریش.

سەوادی کوڕی قارب بە پاڵیدا گوزەری کرد، نەیناسی، فەرمووی ((لەوانەیە گومانم بە هەڵەداچووبێت، ئەم کابرایە کاهین نەبوو، یان کەهانەی نەدەزانی لە سەردەمی نەفامیدا؟)) کە لەبەردەمیدا دانیشت، عومەر ئەوەی پێفەرموو، ئەویش وتی ((سبحان الله، ئەی ئەمیری باوەڕداران، رووم لە هیچ کەسێك لە ئەهلی مەجلیست نەکردووە بەو جۆرەی کە تۆ پێشوازیت لێکردم، عومەر–خوا لێی رازی بێت– پێیفەرموو: ئەوەی لە نەفامیدا لەسەری بووین گەورەترە لەوە، بەڵام هەواڵم پێبدە لەوەی پرسیارم لێکردی، وتی: راستدەکەیت، ئەی ئەمیری باوەڕداران، من لەسەردەمی نەفامیدا کاهین بووم، دواتر چیرۆکەکەی باس کرد))

فیراسەی هاوەڵانی پێغەمبەر راسترین فیراسەت بووە.

بنچینەی ئەم جۆرە لە فیراسەت: لە زیندەگی و نووریكەوەیە كە خودا بە هەندێك لە بەندەكانی دەبەخشێت، دڵ بەوە زیندوو دەبێتەوە و نوورانی دەبێت، ئەو كاتە فیراسەتی هەڵە ناكات، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿أَوَمَن كَانَ مَيۡتٗا فَأَحۡيَيۡنَٰهُ وَجَعَلۡنَا لَهُۥ نُورٗا يَمۡشِي بِهِۦ فِي ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ لَيۡسَ بِخَارِجٖ مِّنۡهَا﴾الأنعام: ١٢٢، بە بێباوەڕی و نەزانی و نەفامی مردبوو، خودای موتەعال بە ئیمان و زانست زیندووی كردەوە، بە قورئان و باوەڕ نووریكی پێبەخشی كە لەناو خەڵكیدا نووری لێوەردەگرێت و ڕێگەی پێ ڕۆشن دەكاتەوە، ڕێگەی ڕاست و ڕەوانی لە شەوەزەنگدا پێدەدۆزێتەوە و لەسەری دەڕوات، خودا زاناترە... فیراسەتی خاوەن فیراسەت وابەستەی سێ شت دەبێت: بە چاو و گوێ و دڵ، چاوی بۆ سیمای نیشانەكان، گوێی: بۆ قسە و ئاماژە و نهێنی و ئاشكرای گوفتار، تێگەیشتن و شاراوە و مەرامی قسە، هەروەها ئاواز و هێمای قسە و هاوشێوەكانی ئەوانە.

دڵی بۆ پەڕینەوە: واتە ئەوەی بینراو و بیستراوە بكرێتە بەڵگە و نیشانە بۆ ئەوەی لە ناوەوەیە و پەنهان و نادیارە، بۆیە دەگاتە ئەودیوی ئەوەی دەركەوتووە، وەك پەڕینەوەی ئەوانەی لە ڕواڵەتی نەقش و سكەی پارەوە دەپەڕێنەوە بۆ ناوەوەی پارەكە تاكو بزانن سكەیەكی ڕەسەنە یان تەزویرە؟ هەر بەو جۆرە پەڕینەوەی كەسی خاوەن فیراسەت لە ڕواڵەتی دەرەوە و نیشاندانی زەلیلی بۆ ناوەوەی ڕۆح و دڵی كەسەكە، جیاكردنەوەی ئەشباح لە ئەرواح لەلای كەسی خاوەن فیراسەت وەك جیاكردنەوەی پارەی تەزویر وایە لە پارەی ڕەسەن لەلایەن كەسی شارەزاوە، لە ڕواڵەتی سكەكەوە جەوهەری مادەكەی دەخوێنێتەوە.

هەر بەو جۆرە ڕەخنەی ئەهلی فەرموودە، ئیسنادێكی ڕوون و ئاشكرا وەك خۆر دانراوە بۆ مەتنێكی درۆ، بۆیە ڕەخنەگران دەریدەهێنن، وەك چۆن كەسی مەصرەفی لە ڕواڵەتی سكەكەوە جەوهەری زیوەكە دەخوێنێتەوە.

هەر بەو جۆرە فیراسەتی جیاكردنەوە لەنێوان صادق و درۆزندا لە قسە و كردار و حاڵیدا.

دوو هۆ بۆ فیراسەت هەیە:یەكەمیان: بەهێزی و بەپیتی زەینی كەسی خاوەن فیراسەت، و تیژی دڵ و ژیری و هۆش و زیرەكی ناوەوە.

دووەم: دەرکەوتنی نیشانە و بەڵگە بۆ کەسی خاوەن فیراسەت لەو شتەی فیراسەتی تیادا دەکات، گەر ئەو دوو هۆیە لە کەسێکدا کۆبوویەوە هیچ فیراسەتێکی بە هەڵەدا ناچێت، گەر ئەو دوانەی تێدا نەبوو هیچ فیراسەتێکی بۆ نایەتە راستە، گەر یەکێکیان بەهێز بوو ئەویتریان لاواز ئەوا فیراسەتەکەی ناوبەناو دەردەچێت.

ئیباسی کوڕی موعاویە لە هەموو خەڵکی فیراسەتی مەزنتر بوو، رووداوی زۆری لەو جۆرە لێدەگێڕنەوە، هەر بەو جۆرە ئیمامی شافعی –رەحمەتی خوای لێ بێت– وتراوە: چەندین کتێبی لەو بارەوە داناوە.

## (46) (منزلة التعظیم)

# مەنزیلەی مەزنراگرتن

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی "مەزنراگرتن"ە.

ئەم مەنزیلەیە شوێنكەوتەی مەعریفەیە، بە ئەندازەی ناسینی خودا(واتە بە ئەندازەی بوونی مەعریفە) مەزنیی پەروەردگار لەدڵدا سەرهەڵدەدات، زاناترین كەس بە خودا لە هەموویان زیاتر خودا بە مەزن و شكۆمەند رادەگرێت، خودای موتەعال زەمی ئەوانە دەكات كە ماق بە مەزنراگرتنی خودایان نەداوە و وەك پێویست نەیان ناسیوە و بە شایستەی سیفەتەكانی وەسفی ناكەن و قسەكانیان بە دەوری ئەمانەدا دەسوڕێنەوە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴿١٣﴾﴾ نوح: ١٣، ئیبن عباس و موجاهید دەفەرموون: رجای مەزنی و شكۆمەندی بۆ خودا ناكەن، سەعیدی كوڕی جوبەیر دەفەرموێت: چیتانە بۆ حەقی مەزنیی خودا نادەن و شكۆمەندیی پێویست نادەنە پاڵی؟ كەلبی دەفەرموێت: لە مەزنی خودا ناترسن.

ئیبن كەیسان دەفەرموێت: رجای خێرتان نییە بە پەرستنی خودا بەوەی پاداشتان بداتەوە لەسەر ئەو بە گەورەزانینە.

رۆحی بەندایەتی: بریتییە لە بە مەزنزانین و خۆشەویستی، گەر یەكێكیان واز لەویتریان بهێنێت ئەو بەندایەتییە تێكدەچێت، گەر مەدح و سەنا بۆ خۆشەویستی مەزن هاوتای ئەم دوانە بوو(واتە هاوتای بە مەزن زانین و خۆشەویستی) ئەوە بریتییە لە حەقیقەتی حەمد. خودا-سبحانە- زاناترە.

یەكەمین بە مەزنزانین بریتییە لە بە مەزنزانینی ئەمر و نەهی شەرعی، ئەوەش ئەوەیە كە بە "روخسەتی وشك بەرهەڵستی نەكات" و بە "توندییەكی زیادەڕەو رووی تێنەكات".

لێرەدا دوو كار هەیە كە پێچەوانەی بە مەزنڕاگرتنی ئەمر و نەهییە:

یەكەمیان: روخسەت كە خاوەنەكەی بەرەو پشتهەڵكردن لە كەماڵی جێبەجێ كردنی ئەمر و نەهی دەبات.

دووەم: زیادەڕەوی كە خاوەنەكەی لە سنووری ئەمر و نەهی تێدەپەڕێنێت.

یەكەمیان كەمڕەوییە و دووەمیان زیادەڕەوییە.

خودای موتەعال فەرمانی بە هەر ئەمرێك كردبێت شەیتان دوو تێكدانی بۆ هەیە: یان بۆ لای كەمتەرخەمی و كەمڕەوی و تیابردنی ئەمرەكەی دەبات، یان بۆ لای زیادەڕەوی و غلوكردن تیایدا، ئایینی خودا میانەگیرە لەنێوان كەسی كەمتەرخەم و كەسی زیادەڕەو، وەك دۆڵێكی نێوان دوو چیا وایە، و وەك هیدایەتی نێوان دوو گومڕایی، یان ناوەندی نێوان دوو لای زەمكراو، وەك چۆن كەسی كەمتەرخەم تیابەری ئەمرەكەیە، كەسی زیادەڕەویش هەر بەو جۆرەیە، ئەوەیان بەهۆی كەمتەرخەمییەكەیەوە لە سنووری ئەمرەكە و ئەمەشیان بەهۆی تێپەڕاندنی سنووری ئەمرەكەوە.

خودای موتەعال نەهی لە زیادەڕەوی و غلوكردن كردووە لە ئایەتی﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ ﴾ المائدة: ٧٧، "الغلو" دوو جۆرە: جۆرێكیان دەریدەكات لەوەی كەسێكی گوێڕایەڵ بێت، وەك ئەو كەسەی ركاتێك بۆ نوێژەكەی زیاد دەكات، یان بە هەمیشەیی بەڕۆژوو دەبێت بەو ڕۆژانەشەوە نەهیان لێكراوە، یان ڕەجمكردن لە حەجدا بە بەردی زۆر گەورە وەك ئەوەی بۆ هەڵدان دەخرێتە ناو مەنجەنیقەوە، یان لەنێوان سەفا و مەروەدا دە جار هاتوچۆ بكات، هاوشێوەی ئەمانە بە زانینەوە.

جۆری دووەم زیادەڕەوییەكە ترسی دابڕان و خاوبوونەوەی لێ دەكرێت وەك شەونوێژ لە هەموو شەودا، یان ڕۆژووی دەهر جگە لە ڕۆژە نەهیلێكراوەكان، یان ستەمكردن لە نەفس لە پەرستن و ئەورادەكاندا، كە پێغەمبەر(ﷺ) تیایدا فەرموویەتی ((ئەم ئایینە سووك و ئاسانە، هەر كەس دین لەخۆی توند بكاتەوە دین بەسەریدا زاڵ دەبێت، ئامانجەكان بپێكن و نزیكببنەوە لە ئامانج و ئاسانكاری بكەن، كۆمەك لە بەیانیان و ئێواران وەربگرن لەگەڵ كەمێك لە شەو)) واتە كۆمەك وەرگرن بۆ گوێڕایەڵی كردنی خودا بە كاركردن لەو سێ كاتەدا، كەسی موسافیر بۆ بڕینی ڕێگەی سەفەر پەنا بۆ ئەو سێ كاتە دەبات.

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((هەر كەس لە ئێوە با لە كاتی چالاكیدا نوێژەكانی بكات، گەر خاوبوویەوە با رابكشێت)) ئەم دوو فەرموودەیە ئیمامی بوخاری ریوایەتی كردوون.

لە سەحیحی "مسلم"دا لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی ((ئەوەندە کار ئەنجام بدەن کە دەیتوانن، سوێند بە خودا خودا شەکەت و وەڕس نابێت تا شەکەت و وەڕس نەبن))

لە سوننەندا لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی ((ئەم دینە توندوتۆڵە، بە نەرم و نیانی تێی بچن، عیبادەتی خودا لای نەفست بێزراو مەکە))یان بەو جۆرەی کە فەرموویەتی.

مەزنترین بە مەزنزانین بریتییە لە بە مەزنزانینی خودای موتەعال، ئەوەش ئەوەیە کە لە خوار خوداوە هۆیەك بڕیار نەدەیت و حەقێکی خۆت لەسەر خودا نەبینیت.

ئەم پلەیە بە مەزن زانینی خودای خاوەن ئەمر و نەهی لەخۆ دەگرێت، ئەوەی یەکەمیان(کە پێشتر باس کرا) بە مەزن زانینی ئەمر و نەهی خودا بوو، بەڵام ئەمەیان بە مەزن زانینی خاوەن ئەمر و نەهییەکەیە.

ئەمەش بە خاڵ دەبێت:

یەکەمیان: لە گەیشتنت بە خودا هیچ هۆیەك لە خوار خوداوە بڕیار نەدەیت، بەڵکو ئەوە خودا خۆیەتی بەندەکەی بە خۆی گەیاندووە، تەنها خودا بەندە بە خودا دەگەیەنێت، هەر بەو جۆرە تەنها خودایە بەندە نزیکدەکاتەوە و نەك شتێکی تر و کەسێکی تر، گەیشتن بە ڕەزامەندی خودا بە خوداوە بەندە، خودا خۆیەتی بووە بە دەلیل بۆ لای خۆی، کەس ناتوانێت جگە لە خۆی هیدایەتی کەسێك بۆ لای خودا بدات، ئەوە خودایە هۆی کردووە بە هۆ، هۆ و هۆکار و گەیشتن هەر هەموو دروستکراون و کاری خودان.

دووەم: هیچ حەقێك بۆ خۆت و بۆ کەسانی تر لەسەر خودا بڕیار نەدەیت، بەڵکو حەق بۆ خودایە لەسەر دروستکراوەکانی.

حەقی کۆیلەکانی خودا لەسەر خودای موتەعال لە جێگیر کردنی پاداشت بۆ گوێڕایەڵان، و وەڵامدانەوەی داواکانیان: ئەوانە کۆمەڵە حەقێکن خودا بۆ خۆی لەسەر خۆی داناوە، بە حوکمی بەڵێن و چاکەی خۆی، نەك کۆمەڵە حەقێك بێت بەندەکانی لەسەر خودا پێویستیان کردبێت، حەق لە ڕاستیدا بۆ خودایە لەسەر بەندەکەی، حەقی بەندەکەی لەسەر خودا بەخشندەیی و چاکەی خودا داوای کردووە، چاکەکردنی خودا بەرانبەر بەندەکەی تەنها بەخشندەیی و کەرەمی خودای موتەعالە، نەك شتێکی تر.

# (٤٧) (منزلة السكينة)

## مەنزیلەی سەكینە

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی سەكینەیە.

ئەم مەنزیلەیە لە مەنزیلەی بەخششەكانە، نەك مەنزیلەی بەدەستهاتووەكان، خودای موتەعال باسی "السكينة"ی لە قورئاندا كردووە كە مانای "الطمئنينة"–دڵنیایی هەیە لە پێنج جێگەدا:

یەكەم: لە ئایەتی﴿ ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ التوبة: ٢٦

دووەم لە ئایەتی﴿ إِذْ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا ﴾ التوبة: ٤٠

سێیەم لە ئایەتی﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِى قُلُوبِ ٱلْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِيمَٰنًا مَّعَ إِيمَٰنِهِمْ ۗ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٤﴾ ﴾ الفتح: ٤

چوارەم لە ئایەتی﴿ لَّقَدْ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِى قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ ﴾ الفتح: ١٨

پێنجەم لە ئایەتی﴿ إِذْ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ الفتح: ٢٦

شێخولئیسلام ئیبن تەیمیە–رەحمەتی خوای لێبێت– كە كاروبارەكانی لەسەر گران بوونایە ئایەتەكانی "السكينة"ی دەخوێند(واتە ئەو پێنج ئایەتە)، من بۆخۆم ئەو پێنج ئایەتەم لە كاتی ترس و شڵەژاندا ئەزموون كردووە بینیم كاریگەرییەكی زۆر مەزنی هەیە لە سوكنایی و ئارامی و دڵنیایی.

بنچینەی سەكینەت بریتییە لە دڵنیایی و ویقار، و ئەو سوكناییەی خودای موتەعال لە كاتی شڵەژان و ترس و پەشۆكاندا دایدەبەزێنێت بۆ ناو دڵی بەندەكەی، دوای ئەو دابەزینە هەست بە بێزاری و نائارامی ناكات، ئەوەش ئیمانی بۆ زیاد دەكات و هێزی یەقین و جێگیربوونی پێ دەبەخشێت.

بۆیە خودای موتەعال رایگەیاندووە كە ئەو سەكینە و ئارامییەی بۆ سەر پێغەمبەرەكەی(ﷺ) و باوەڕداران دابەزاندووە لە شوێنی نیگەرانی و پەشۆكاوی و

شـــڵەژاندا، وەك ڕۆژی كۆچـــكردنی پێغەمبـــەر لـــە مەكـــەوە بـــۆ مەدینـــە، ئـــەو و هاوەڵەكەی(واتە ئەبوبەكری صدیق) لە غارەكەدا بوون و دوژمن لەسەریانەوە بوو، گەر یەكێكیان سەیری ژێر پێی خۆی بكردبایە دەیبینین، هەروەها لە ڕۆژی غەزوەی "حونەین"دا كاتێك هەموو هاوەڵان جگە لە چەند كەسێك هەڵهاتن بەهۆی توندوتیژی بێباوەڕانەوە، كەس لای بەلای كەسدا نەدەكردەوە، هەروەها وەك ڕۆژی سوڵحی حودەیبییە، كاتێك دڵیان هاتە لەرزە لە حوكمی بێباوەڕان بەسەریانەوە و چوونە ژێر مەرجەكانی ئەوان(بێباوەڕانی مەككە) كە نەفس لەژێریدا خۆی پێڕانەدەگیرا، بەسە بۆ تۆ دیمەنەكەت بێتە پێش چاو كاتێك عومەری كوڕی خەتتاب-بەو هەموو هێز و توانایەوە- هەست بە لاوازی بكات بەرانبەر پەیمانی حودەیبییە، تا خودا لە ڕێگەی ئەبوبەكری صدیقەوە دامەزراوی كرد-خوایان لێ ڕازی بێت-

لە دوو سەحیحەكەدا لە بەرائی كوڕی عازبەوە-خوا لە خۆی و باوكی ڕازی بێت- فەرمووی ((پێغەمبەری خوام بینی خۆڵی خەندەقەكەی (ئەو خەندەقەی بە دەوری مەدینەدا لێیان دا) دەگواستەوە، تا خۆڵ پێستی سكی داپۆشی، شیعرەكەی عەبدوڵای كوڕی ڕەواحەی-خوا لێی ڕازی بێت- دەوتەوە:

| | |
|---|---|
| لا هم لولا أنت ما اهتدينا | ولا تصدقنا ولا صلينا |
| فأنزلن سكينة علينا | وثبت الأقدام إن لاقينا |
| إن الألى قد بغوا علينا | وإن أرادوا فتنة أبينا)) |

دەربارەی سیفەتی پێغەمبەر(ﷺ) لە كتێبە پێشینەكاندا ((من پێغەمبەرێكی نەخوێندەوەر ڕەوانە دەكەم، دڵڕەق و توندوتیژ و سروشت وشك نییە، گاڵەبەدەمی ناو بازاڕەكان نییە، خۆی بە كاری خراپ ناپارێزێنێتەوە، قسەی خراپی نییە، بۆ هەرچی شتی جوانە ڕاوەستاوی دەكەم، هەرچی ڕەوشتی بەرز و بەخشندەییە پێی دەبەخشم، سەكینەت دەكەم بە پۆشاكی، چاكە دەكەم بە دروشمی، تەقوا دەكەم بە ویژدانی، حیكمەت دەخەمە قسەكانییەوە، صدق و وەفا دەكەم بە سروشتی، لێبووردن و لێخۆشبوون دەكەم بە ڕەوشتی، دادپەروەری دەكەم بە ژیانی، حەق دەكەم بە شەریعەتی، هیدایەت بە ئیمامی، ئیسلام بە ئایینی و میللەتی، ناوی بە "أحمد" ستایشدار دەكەم))

## ۞ زمانی حیکمەت سەکینەت دەیهێنێتە گۆ

گەر سەکینەت دابەزی بۆ ناو دڵێك پێوەی ئارام و دڵنیا دەبێت، ئەو کاتە ئەندامەکان پێیەوە سوکنایی وەردەگرن، و ویقاریان بەسەردا دادەبارێت، زمان بە راست و بە حیکمەت دەکەوێتە گۆ، دووردەکەوێتەوە لە قسەی خراپ و ناباش و پڕوپووچ و گاڵتەوگەپ و هەموو جۆرەکانی باتڵ، ئیبن عباس–خوایان لێ رازی بێت– دەفەرموێت ((باسی ئەوەمان دەکرد کە سەکینەت لەسەر زمان و دڵی عومەر دێتە قسە))

زۆرجار خاوەنی سەکینەت قسەیەك دەکات کە لەسەر بیر نەیکردووە و بە ریوایەت وەرینەگرتووە و لە خوداوە پێینەدراوە دەکەوێتە داوای لێخۆشبوون بۆ ئەو قسەیە لە ناخی خۆیدا، کەسی گوێگر سەری سوڕدەمێنێت، لەوانەیە جارێکی تر ئەو قسەیەی لێ نەبیستییەوە.

قسەی ئەهلی سەکینەت لە کاتی پێویستیدایە، هاورێ لەگەڵ صدقی حەزی پرسیارکەرەکە و مەجلیسەکە، هەروەها صدقی رەغبەتی ئەو بۆ لای خودا و پەلەکردن بە دڵی بۆ خزمەتی خودا و ئامادەبوونی، لەگەڵ خۆدارنین لە حەز و ئارەزوو و خاوێنکردنەوەی نەصیحەت بۆ خودا و پێغەمبەر و بەندە باوەڕدارەکان.

## ۞ سەکینەت نوور و هێز و رۆحە

شێخولئیسلام ئەبو ئیسماعیلی هوروی دەفەرموێت:

((سەکینەت ئەوە بوو بۆ سەر دڵی پێغەمبەر(ﷺ) دابەزی، هەروەها بۆ سەر دڵی باوەڕداران، ئەوەش شتێکە کە هێز و رۆح کۆدەکاتەوە کە کەسی ترساو پێی ئارام دەبێتەوە و خەم و پەژارە و بێزاری پێ دەڕەوێتەوە، کەسی یاخی و سەرکەش و سەرسەخت لەلای دادەمرکێتەوە))

ئەمە لە چاوگەی قسەکانی شێخولئیسلامەوەیە و ئەو مرواریانەیە کە دەبێت بۆ بەدەستهێنانیان دڵ راستبێتەوە و جەستە بکەوێتە گەڕ.

باسی ئەوەی کرد: ئەو شتەی کە خودای موتەعال دایبەزاند بۆ ناو دڵی پێغەمبەر(ﷺ) و بەندە باوەڕدارەکانی سێ شت لەخۆ دەگرێت: نوور، و هێز، و رۆح.

سێ بەری نایابی بۆ باس کرد: سوکنایی کەسی ترساو بۆ لای خودا، و دڵنەوایی کەسی خاوەن خەم و پەژارە و بێزاری و نیگەرانی، و زەلیلی و گەردنکەچی خاوەن یاخیبوون و کەسی سەرکەش لەسەر سەرپێچی کردن و هەڵهاتوو لە خودا.

بەو رۆحەی لە سەکینەتدایە: زیندەگی دڵ بەدەست دێت، بەو نوورەی تێیدایە: نوورانی دەبێت، و رۆشن و بە شەوق دەبێت، بەو هێزە: جێگیربوون و لێبڕان و چالاکی تێدا سەرهەڵدەدات.

نوور بەڵگەکانی باوەڕ و حەقیقەتی یەقینی بۆ دەردەخات، و جیاوازی دەخاتە نێوان حەق و باتڵ و هیدایەت و گومڕایی و سەرلێشێوان و روشد و شك و یەقینەوە.

زیندەگی: کەماڵی ئاگایی و زیرەکی و هۆشیاری پێ دەبەخشێت، هەروەها ئامادەبوونی دڵ و بەئاگاهاتن لە خەوی بێئاگایی و راپەڕین بۆ لیقای خودا.

هێز: صدق و دروستیی مەعریفەتی بۆ دەهێنێت، بانگکەری گومڕایی و لادان و سەرلێشێوان ژێردەستە دەکات، نەفس رادەگرێت لە نیگەرانی و هەڵچوون و خەم و پەژارە، هەروەها ناهێڵێت لە ناتەواوییەکان و نەنگییەکاندا پێ ڕابکێشێت، بۆیە بە سەکینەت ئیمان لە پاڵ ئیماندا زیاد دەکات.

ئیمان: "نوور و زیندەگی و هێز"ی بۆ بەرهەم دەهێنێت، ئەم سیانەش بەری شیرینی خۆیان دەدەن، و دەبنە زیادبوونی ئیمان، ئیمان پێش سەکینەت و دوای سەکینەت دەکەوێت و دەورەی دەدات.

بە کورتی: نوور: بەڵگەکانی ئیمان دەخاتە روو، بە زیندەگی: لە خەوی بێئاگایی رادەپەڕێت و دەبێت بە کەسێکی بەئاگا، و بەهێزیش: حەز و ئارەزووەکانی نەفس و شەیتان دەپسێنێت، وەك وتراوە:

وتلك مواهب الرحمن ليست    تحصل باجتهاد أو بكسب
ولكن لا غنى عن بذل جهد    بإخلاص و جد لا بلعب
وفضل الله مبذول ولكن    بحكمته، وعن ذا النص ينبي
فما من حكمة الرحمن وضع ال    كواكب بين أحجار و ترب
فشكرا للذي أعطاك منه    فلو قبل المحل لزاد ربي

گەر ئەم سیانە بە سەکینەت بەدەست هات-کە بریتین لە نوور و زیندەگی و ڕۆح- کەسی یاخی بۆ لایان دادەمرکێتەوە، کەسی یاخی بوو ئەو کەسەیە: کە سوکنایییەکەی بەهۆی یاخیبوون و گوناه و سەرپێچییەوەیە، بەهۆی نەبوونی سەکینەتی ئیمان لە دڵیدا، بۆ پڕکردنەوەی ئەو سەکینەتی ئیمانە پەنا بۆ دامرکاندنەوەی شەهەوات و سوکنایی سەرپێچیکردن دەبات، لەوانەدا ونبووی خۆی دەبینێتەوە، ئەویش ئەو چێژەیە کە لە یاخیبوون وەریدەگرێت و ناتوانێت بە شتێکی تر بارببوی بکاتەوە، گەر سەکینەی باوەڕ بەسەریدا داباری و بە چێژ و ڕۆح و خۆشییەکەی بێنیاز دەبوو لە چێژی گوناهکردن، ئەوا نەفسی پێی ئارام دەبێتەوە و دڵی پێی دەگەشێتەوە، ڕۆح و ئاسوودەیی و چێژێکی وای تیادەبینییەوە کە بەراورد ناکرێت بە چێژی جەستەیی و نەفسیی، ئەو کات چێژەکەی ڕۆحانی و قەلبی دەردەچێت، دوای ئەوەی کە جەستەیی بوو، خۆی لێ دوورخستەوە و نەفسی خۆی لێ گرتەوە و ڕزگاری بوو لەدەستی، کە بە جوانی و گەشاوەیی سەکینە جوان و ڕەونەقدار دەبێت دەڵێت:

تألق البرق نجديا فقلت له　　　　يا أيها البرق إني عنك مشغول

گەر لە شەوانی تاریکی شەهەواتدا تریفەی نوورە خەیاڵییەکەی دونیا و حەزی دونیا تەقەی لە دەرگای دا زمانی حاڵی بانگی لێدەکات، وەك ئەم نموونەی لێ دێت:

طرقتك صائدة القلوب، وليس ذا　　　　وقت الزيارة، فارجعي بسلام

کە خواحافیزی لێکرد و لێبرا بۆ کۆچکردن، بڕیاری وەفاداری بۆ دا، ئەم نموونە دەهێنێتەوە:

قالت وقد عزمت على ترحالها　　　　ماذا تريد؟ فقلت أن لا ترجعي

کە ئەم سەکینەیە گەیشتە دڵی ترسی دادەمرکێتەوە، ئەوەش ئەو قسەیەتی کە دەفەرموێت ((کەسی ترساو پێی ئارام دەبێتەوە)) و خەم و پەژارە و نیگەرانییەکەی دڵنەوایی دەکرێت، چونکە سەکینە حوزنی لەگەڵ نییە، ئەو دڵنەوایی خەمگینان و لابەری خەم و پەژارەیە، هەر بەو جۆرە پەستانی نیگەرانییەکانی لەسەر لادەبات،

ویستی لێبڕان زیندوو دەکاتەوە، ڕێگە نادات سەرکەشییەکەی سەرپێچی پێ بکات، و ویقار و خشوعی بەسەردا دادەبارێنن.

هەروەها لە ماناکانی سەکینە: سەکینە لە کاتی مامەڵەکردندا بە دادگایی کردنی نەفس و نەرمونیانی لەگەڵ خەڵك و چاودێری حەق.

ئەم مانایە کە سالیکان لە خولگەیدا دەسوڕێنەوە، ئەو مەشخەڵەیە کە ڕووی تێدەکەن بۆ ئەو مامەڵەکردنەی لە نێوان ئەوان و لە نێوان خودایە، هەروەها لە نێوان ئەوان و لە نێوان خەڵکی تر، ئەوەش بە سێ شت بەدەست دەهێنرێت:

یەکەم: دادگاییکردنی نەفس، تا بزانێت چ ئەرکێکی لەسەرە و چ مافێکی هەیە، ڕێگەی نادات پێشێلکاری مافەکان بکات، مافەکان تیاببات و پشتگوێیان بخات.

پاکبوونەوەی نەفس و خاوێنبوونەوەی نەفس لەسەر دادگاییکردنەکە وەستاوە، نە پاك دەبێتەوە، نە خاوێن دەبێتەوە مەگەر تەنها بە دادگایی کردن.

حەسەن-خوا لێی ڕازی بێت- دەفەرموێت: باوەڕدار-سوێند بەخوا- هەمیشە لەسەر نەفسی خۆی ڕاوەستاوە: بۆچی ئەو قسەت کرد؟ مەبەستت چی بوو؟ بۆچی ڕووت لەوە کرد و بۆچی لەو کارە هاتییە دەرەوە؟ بۆ ئەو کارەت کرد؟ من بۆ ئەو کارەم کرد؟ سوێند بە خودا ناگەڕێمەوە بۆ ئەو کارە، و هاوشێوەی ئەم قسانە.

بە دادگایی کردنی نەفس نەنگی و ناتەواوییەکانی نەفسی بۆ دەردەکەوێت، لەوێوە دەتوانێت چاکسازی لە نەفسی خۆیدا بکات.

دووەم: نەرمونیانی لەگەڵ خەڵکی: ئەوەش بریتییە لە مامەڵەکردنیان بەو جۆرەی کە پێویستە مامەڵەیان بکرێت، بە توندوتیژی و وشکی و ڕەقی مامەڵەیان ناکات، چونکە ئەو کارە خەڵکی لێ دووردەخاتەوە، و نامۆیان دەکات لێی، ئەو کاتە دڵ و حاڵی لەگەڵ خودا تێکدەدات، هیچ شتێك بە قەدەر مامەڵەکردنی جوان لەگەڵ خەڵکی دڵ نەرم ناکات، مامەڵەی خەڵکی بە نەرمونیانی گەر کەسێکی بێگانە بێت خۆشەویستی بەلای خۆتدا ڕادەکێشێت، گەر دۆستێکی خۆشەویستیش بێت دەبێتە هۆی بەردەوامبوونی دۆستایەتی لەگەڵی، گەر دوژمنێك بێت کە ڕقی لێتە ئەوا بەو مامەڵە کردنەت ئاگری ڕق دادەمرکێنەوە و خۆت لە شەڕی دەپارێزی، ئەو کاتە شان دانە ژێر

ناخۆشی ئەو مامەڵەیە لەگەڵ دوژمن باشترە لە شاندانە ژێر زەرەری تووڕەبوون و توندوتیژیت لەگەڵی.

سێیەم: چاودێری حەق -سبحانە- بۆ هەموو چاککردن و خێرێکی درەنگ یان زوو پێویستە، دوو پلەکەی پێشوو تەنها بەم پلەی سێیەمە دێتە راستە، ئەم پلەی سێیەمە لەخۆیدا پێویستە، ئەو دوانەی پێشتر وەسیلەن بۆ لای خودا و یارمەتیدەرن بۆی، بۆیە چاودێری حەق(ﷻ) چاککردنی نەفس و لوتفی خەڵك بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

❁ ❁ ❁

## (٤٨) (منزلة الطمئنينة)

# مەنزیلەی دڵنیایی

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی دڵنیاییە.

خــودای موتــەعال دەفــەرموێت ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾ الرعـد: ٢٨، هــەروەها﴿ يَـٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ فَٱدْخُلِى فِى عِبَـٰدِى ﴿٢٩﴾ وَٱدْخُلِى جَنَّتِى ﴿٣٠﴾ ﴾ الفجر: ٢٧ — ٣٠

دڵنیـایی بریتییـە لـە سـوكنایی و ئـارامی دڵ بـۆ لای شـتێك، و نەشـڵەژان و نیگـەران نەبوون، لە ئەسەرێكی بەناوبانگدا ((صدق دڵنیاییە، و درۆش شك و دڵكرمێنی))، واتـە صـدق دڵـی گـوێگر دڵنیـا دەبێـت بەلایـەوە، و سـوكنایی دەبینێتـەوە لـەلای، درۆش شـڵەژان و هــەژان و دڵكـرمێنی پەیـدا دەكـات، لەوانـە فەرموودەكـەی پێغەمبـەر(ﷺ) ((چاكە ئەوەیە دڵ بەلایەوە دڵنیـا دەبێـت)) واتـە سـوكنایی هەیـە بـۆ لای و هــەژان و نیگەرانی ناهێڵێت.

دەربارەی یادی خودا لەم جێگەدا دوو قسە هەیە:

یەكـەمیان: بریتییــە لــە یــادی پــەروەردگار لەلایــەن بەنــدەی خــوداوە، دڵــی یادكــەر بەلایەوە ئارام دەبێتەوە و سوكنایی بۆ دێت، گەر دڵ تووشی هــەژان و نیگـەرانی بـوو هیچ ڕێگەیەكی تری لەبەردەمدا نییە جگە لە یادی خودا.

قسەی دووەم: كە ڕاسترینیانە: زیكری خودا لەم ئایەتەدا بریتییە لە قورئان، ئـەوەش ئەو زیكرەیە كە خودا دایبەزاندۆتە سەر پێغەمبەرەكەی(ﷺ)، بەو زیكـرە دابـەزێنراوە دڵنیایی دڵی باوەڕداران سەرهەڵدەدات، چونكە دڵ تەنها بە باوەڕ و یـەقین دڵنیـایی و ئارامی بەدەست دەهێنێت، تەنها لە قورئانەوە ئیمـان و یـەقین بەدەسـت دەهێنـرێن، سوكنایی و دڵنیایی دڵ لە یەقینەكەیدایە، هەژان و نیگەرانیشی لە شك و گومانەوەیە، قورئـان یـەقینی لێـوە بەدەسـت دێـت، و شـك و گومـان و وەهـم دەسـڕێتەوە، دڵـی باوەڕداران تەنها بە قورئان ئارام و دڵنیا دەبێتەوە.

گەر لە قورئـان تێنەگـەیت و ڕانـەمێنیت لـە ئایەتـەكانی و بـە شـێوەیەكی شایسـتە و دروست نەیخوێنێتەوە ئەوا سوود لە قورئان و هیدایەتی قورئـان نابینیـت، تـەنها ئـەو كەسە دەتوانێت سوود لـە قورئـان و هیدایـەتی قورئـان ببینێـت كـە دڵـی بـە ڕۆشـنی

دەبینێت و لەگەڵ پەروەردگاری ئامادە دەبێت ئەوەش بە ئاساری ناو و سیفەتەکانی لە سونەنە گەردوونییەکانیدا چ لە ئاسۆی ناخی خۆیدا چ ئەوەی لە دەوری دەبینرێت لە جووڵە و وەستان و دیاردەکان.

هەر بەو جۆرە دوو قسە لەسەر ئەم ئایەتە پیرۆزە هەیە ﴿ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ الرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ ﴿٣٦﴾ ﴾ الزخرف: ٣٦

دروستەکەیان: ئەو زیکرەی دابەزاندۆتە سەر پێغەمبەرەکەی -کە بریتییە لە کتێبەکەی- هەر کەس پشتی تێبکات: شەیتانێکی بۆ دادەنرێت تا زیاتر گومڕای بکات و ڕێگەی چاکە و هیدایەتی لێبگرێت، ئەو کەسە وادادەنێت لەسەر هیدایەتە.

هەر بەو جۆرە دوو قسە لەسەر ئەم ئایەتە پیرۆزە هەیە﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ ﴾ طه: ١٢٤.

دروستەکەیان: ئەو زیکرەی دابەزاندووە بۆ سەر پێغەمبەرەکەی -کە بریتییە لە کتێبەکەی- بۆیە کەسی پشتهەڵکەر لەو زیکرە دەڵێت﴿ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ الْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾ ﴾ طه: ١٢٥ – ١٢٦.

خودای موتەعال دڵنیایی و ئارامی و لە دڵ و دەروونی باوەڕدارانـدا داناوە، مژدە و دڵخۆشی و مەدحی ئەهلی دڵنیایی کردووە بە چوونە بەهەشت، خۆزگە بە حاڵیان بۆ ئەو سەرئەنجامە باشە کە چاوەڕوانیان دەکات.

هەروەها لە ئایەتی﴿ يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ارْجِعِي إِلَىٰ رَبِّكِ ﴾ الفجر: ٢٧ – ٢٨، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو دڵە ناگەڕێتەوە بۆ لای خودا مەگەر دڵنیا و ئارام بێت، تەنها لەو بارەدا دەگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگاری، و دەچێتە ناو بەندەکانی خوداوە و لەوێشەوە دەچێتە ناو بەهەشتەوە، لە دوعای هەندێ لە پێشین ((أللهم هب لي نفسا مطمئنة إليك)).

### ۞ کۆتاییەکەی.... ئاسایش

بەرهەمی دڵنیایی: سوکنایییەکە کە ئاسایشێکی دروست بەهێزی دەکات، هاوشێوەی شتێکی بینراوە.

دڵنیایی بەدەستهاتووی سەکینەیە، ئاسەوارێکە لە ئاسەوارەکانی سەکینە، وەك ئەوەی دڵنیایی کۆتایی سەکینە بێت، دڵنیایی بریتییە لە سوکنایی دڵ لەگەڵ هێزی

ئاسایشی دروست، نەك ئاسایشێکی فریودەر، بەڵام دڵ بەو ئاسایشە فریودەرە دڵنیا نابێت چونکە سوکنایی لێی جیابووەتەوە، ((دڵنیایی)) لە سوکنایی جیانابێتەوە، چونکە لە "مانەوەی هەمیشەیی" وەرگیراوە، دەوترێت "إطمأن بالمكان والمنزل" إذا أقام فيه– لە شوێنەکەدا یان ماڵەکەدا دڵنیابوو، واتە تیایدا مایەوە.

هۆی دروستیی ئەم ئاسایشە بەهێزکەرەی سوکنایی: لێکچوونەکەیەتی بە شتێکی بینراو (واتە تەشبیهکردنی بە بینراو کراوە)، بەجۆرێك شتێك لە ئەگەر و نەگەر و گومان و وەهمی لەگەڵدا نەمێنێتەوە، وەك ئەوەی خاوەنەکەی ئەو شتەی لێی دڵنیایە ببینێت، ئەو کاتە لە لەرزینی دڵ و نیگەرانی و گومان سەلامەت دەبێت.

جیاوازی نێوان ئەو "ئاسایشە بەهێزکەرەی سوکنایی" لەگەڵ "سەکینە": سەکینە دەسەڵات پەیدا دەکات بەسەر ئەو هەیبەتە بەدەستهاتووەی لە دڵدایە، هەندێ جار دایدەمرکێنێتەوە، دڵ لە بێزاری ئەو هەیبەتە تاڕادەیەك هێوردەبێتەوە و هەندێ سوکنایی وەردەگرێت، ئەوەش لە هەندێ کاتدا، واتە حوکمێکی هەمیشەیی بەردەوامی نییە، ئەمەش هەردەم بۆ ئەهلی ((دڵنیایی))ە، بە بوونی "هۆگربوون" ئاسایش و ئاسوودەیی هاوەڵی دەکەن، ئاسوودەیی لە ((سەکینە))دا لەوانەیە لە ترس و هەیبەتەوە بێت، ئاسوودەیی لە مەنزیلەی ((دڵنیایی))دا هەندێ جار لە زیادە هۆگربوونێکەوەیە، ئەوەش زیاترە لە تەنها ئاسایش، یانی بڕێکی زیاترە لەسەری.

هەر بەو جۆرە ((دڵنیایی)) گشتگیرترە، دڵنیایی لە زانست و هەواڵ پێداندایە، هەروەها لە یەقین و بەدەستهێنانی زانراودا، بۆیە دڵ بە قورئان دڵنیا دەبێت بەهۆی ئەو ئیمانەی کە بەهۆی قورئانەوە دەستەبەری کردووە، هەروەها ئەو مەعریفە و هیدایەتەی لە تاریکی بیروبۆچوون و مەزهەبەکاندا لێوەی بەدەست دێت، بە قورئان بێنیاز بوو لە بیروبۆچوون و مەزهەب، قورئانی کرد بە حاکم بەسەریاندا و کەنارگیری کردن، ویلایەتی تەواو بە قورئان دەدات وەك چۆن خودا پێیداوە، بە قورئان بەربەرەکانێ دەکات، شتەکان بۆ لای قورئان دەگێڕێتەوە، بە قورئان هێرش دەبات و بە قورئان گومان و تەمومژەکان دەرەوێنێتەوە.

سەکینە: بریتییە لە جێگیربوونی دڵ لە کاتی هێرش هێنانی ئەو شتانەی ترس و هەڕەشەیان هەیە، سوکنایی دڵ و لاچوونی نیگەرانی و شڵەژان و لەرزین، وەك ئەوەی

بۆ دەستەی خودا بەدەست دێت لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن و هێرش هێنـانی، خودا زاناترە.

ساردترین دڵنیایی لەسەر بەندەی خودا بۆ کەسانێکە کە بێزاری و شەکەتی لـە هێـزی تەکلیفە خواییـەکان و کۆڵی قورسـی فەرمانـەکان ڕووی تێکـردوون، بـە تایبـەت ئـەو کەسانەی لە مەقامی گەیاندنی بانگەوازدان لـە خـوداوە و سـەرقاڵی تێکۆشـانن دژ بـە دوژمنانی خودا و ڕێگرانی ڕێگەی هیدایەت، ئـەوەی ئـەو کەسـانە هەڵیـدەگرن و شـان دەدەنە ژێری زۆرتر و زیاترە لەوەی خەڵکانی تـر دەچـنە ژێـری و هەڵیـدەگرن، بۆیـە بێزاری ڕووی تێدەکات، و ئارامگرتنەکەی لاواز دەبێت، گەر خـودا ویسـتی ئاسـوودەی بکات و کۆڵەکەی بۆ هـەڵبگرێت: سـەکینە بەسـەریدا دادەبارێنێـت، بۆیـە دڵنیـایی لـە حوکمی ئایینی و حوکمی قەدەری ڕووی تێدەکات، دڵنیایی بۆ ئەو کەسە نییە تـا ئـەو دوو حوکمـە نـەبینێت، بـەپێی موشـاهەدە کردنـی ئـەو دوو حوکمـە دڵنیـایی ڕووی تێدەکات، چونکە گەر دڵنیـایی بـۆ لای حـوکمی دیـنی هـەبوو دەزانێـت کـە دینەکـەی حەقە کە بریتییە لە شارێگەی ڕاست و ڕەوان، خودا سەرخەری حەق و ئەهلی حەقـە، ئەو بەسە بۆ کۆمەك و تەنها دۆست و سەرپەرشتیکاریانە.

گەر دڵنیایی هەبوو بۆ حوکمی گەردوونی(قەدەری): دەزانێت کە هـیچ شـتێك تووشـی نابێت تەنها ئەوە نەبێت کە خودا لەسەری نووسیوە، هەرچی ئـەو-سـبحانە- بیـەوێت دەبێت و هەرچی نەوێت نابێت، بۆیـە مانایـەك بـۆ نیگـەرانی و پەرێشـانی نامێنێتـەوە مەگەر تەنها لاوازی یەقین و باوەڕ بێت، ئەوەی لێی دەترسێ و خـۆی لـێ دەپارێزێـت گـەر لای خـودا نوسـرابێت ئـەوا هـیچ ڕێگەیـەك بـۆ لادانـی نییـە دوای ئـەوەی بڕیـاری لێدراوە، ئەو کاتە نیگەرانی و پەرێشـانی نـە بـۆ ئـەوەی بڕیـاری لەسـەر دراوە نـە بـۆ ئەوەی بڕیاری لەسەر نـەدراوە بـوونی نییـە، بـەڵێ، گـەر لـەو بەڵایـەدا هـەوڵ و بـەری دەستی ئەوی تێدا بوو ئەو کات پێویست بە بێزاری ناکات لێی، گەر هیچ دەسەڵاتێکی ئەوی تێدا نەبوو دیسان پێویست بە نیگەرانی ناکات.

هەر بەو جۆرە ساردترین شتێك دەبێت لەسـەر کەسـی تووشـبوو: گومـانی تێـدا نییـە کەسی تووشبوو گەر بینینی پاداشت لەلای بەهێز بوو دڵ سـوکنایی بـۆ دێـت و دڵنیـا دەبێت بە باربووکردنەوەکە(پاداشتەکە)، ئەوەی بەڵا توند دەکاتەوە ئەوەیە پاداشت

نەبینێت، لای هەندێ کەس بە جۆرێك بینینی پاداشت بەهێز دەبێت کە تام و چێژ لە بەلا دەکات و بە نیعمەت سەیری دەکات، ئەمە بەدوور مەزانە، زۆر لە ژیر و هۆشمەندەکان گەر سوودی دەوای تاڵ و ناخۆش لەلایان بەڕاستگەڕا لە خواردنی تام و چێژ دەبەن، سەیرکردنی سوودی دەواکە یارمەتی دەدات بۆ سەرنج نەدان لە تاڵی و ناخۆشییەکانی، یان لای کەم دەکاتەوە، ئەو جۆرە کارانە تەنها بۆ ئەهلی بینینی ڕۆشنە، خودا زاناترە.

## (٤٩) (منزلة الهمة)

# مەنزیلەی هیممەت

لە مەنزیلەکانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی "هیممەت"ە.

"الهمة" لەسەر کێشی "فعلة" لە "الهم" وەرگیراوە کە بریتییە لە سەرەتای ویست، بەڵام تایبەتیان کردووە بە کۆتایی ویست، کەوابوو"الهم" بریتییە لە سەرەتای ویست، و "الهمة" بریتییە لە کۆتایی ویست.

خەڵکی بە گشتی دەڵێن: نرخ و بەهای هەر مرۆڤێك ئەو باشەیە ئەنجامی دەدات، بەڵام خەڵکی تایبەت دەڵێن: نرخ و بەهای هەر مرۆڤێك لەوەدایە کە داوای دەکات، واتە بەهای مرۆڤ هیممەت و داواکەیەتی.

مەبەستەکە: هیممەتی مرۆڤ گەر وابەستە بوو بە خوداوە بە داوایەکی راستگۆیانە و دڵسۆزانە و تەواو ئەوە بریتییە لە هیممەتی بەرز کە لەگەڵیدا ناتوانێت کەمتەرخەمی بکات، ناتوانێت دان بە خۆیدا بگرێت بەهۆی زاڵبوونی سوڵتانی خودای موتەعال بەسەریدا، هەروەها بەهۆی توندی پەیوەستبوونی بە داوای مەبەستەکەیەوە، لا بە هیچ لایەکی تردا ناکاتەوە، جگە لە ئەحکامی هیممەتی بەرز، خاوەنی ئەم هیممەتە: بەخێرایی بە داواکەی خۆی دەگات و بەدەستی دەهێنێت گەر کۆسپ و لەمپەر رێگەی لێ نەگرن و پەیوەستبوون و پەیوەندییەکانی کۆتوبەندی نەکەن... خودا زاناترە.

### ۞ ئەم دونیایە.... پڕە لە نامۆیی

یەکەمین تریەی هیممەت: هیممەتێکە دڵ دەپارێزێت لە وەحشەتی حەز لە شتی فانی، هانی دەدات بۆ حەز لە شتێك بمێنێتەوە، هیممەتێکە لە لێڵی تەمبەڵی پاڵفتەی دەکات.

((فانی)) بریتییە لە دونیا و ئەوەی لەسەریەتی، واتە دڵ زوهد لە دونیا و ئەهلی دونیا دەکات، رەغبەت بۆ دونیا ((وەحشەت))ە، چونکە دونیا و ئەهلی دونیا وەحشەت دەدەن بە دڵی ئەوانەی حەزیان لە دونیایە و ئەوانەی پشتی تێدەکەن.

ئەوانەی حەزی لێدەكەن: دڵ و ڕۆحیان لە وەحشەتدایە لەگەڵ جەستەیان، چونكە ئەوەی لە پێناویدا بۆی دروستكراوە(عیبادەت) لەدەستی چووە، ئەو لە وەحشەتدایە بەهۆی ئەو لەدەستچوونەوە.

ئەوانەی لە دونیا زاهیدن: دەبینن دونیا جێگەی ئەوان نییە و تیایدا نامۆن، چونكە دەبێتە هۆی لادانی ئەوان لە داواكراو و خۆشەویستەكەیان، هیچ شتێك بە قەدەر ئەو لادانە دڵ ڕووبەڕووی وەحشەت ناكاتەوە، بۆیە ئەو كەسانەی ململانێی ماڵ و دارایی خەڵكی دەكات و لێیان وەردەگرێت و داگیری دەكات خراپترین و نامۆترین مرۆڤە لەلایان.

هەروەها: زاهیدان لە دونیا، بە ڕۆشنبینی(بصیرة) تەماشای دەكەن، بەڵام ئەوانەی حەزی لێدەكەن: بە چاوی سەر (بصر) تەماشای دەكەن، ئەوەی كەسی خاوەن حەز هۆگرییەتی كەسی زاهید ڕووبەڕووی وەحشەت دەكاتەوە، وەك وتراوە:

وإذا أفاق القلب واندمل الهوى رأت القلوب ولم تر الأبصار

هەر بەو جۆرە ئەم هیممەتە هانی دەدات بۆ ڕەغبەت لە كەسێك كە باقییە و بە هەتا هەتایی دەمێنێتەوە و مانەوەكەی بە خۆیەوە بەستراوە ئەوەش تەنها خودای موتەعالە، هەروەها ڕەغبەت بۆ ئەو شتەی كە بە خوداوە دەمێنێتەوە ئەوەش بەهەشت و خانەی دوارۆژە.

پاشان پاڵفتە بوون لە لێڵی تەمبەڵی: واتە پاكی بكاتەوە و پاڵفتەی بكات لە پیسی خاوبوونەوە و ساردبوونەوە كە دەبێتە هۆی تیابردن و تیاچوون و كەمڕەوی، خودا زاناترە.

هیممەت بەرزدەبێتەوە تا خۆبەرزراگرتنی بۆ دروست دەبێت لە لاكردنەوە بەلای عیللەتدا و متمانە بە هیوا و ئاوات.

"عیللەت" لێرەدا بریتییە لە عیللەتی كاروكردەوەكان، بەوەی بە چاوی مەزن تەماشایان بكات و بیانبینێت، و هاوشێوەی ئەمە.

خاوەنی ئەم هیممەتە: بەهۆی هیممەتەكەیەوە خۆی بەرزرادەگرێت لەلاكردنەوە بەلای "عیللەت"دا، هیممەتی ئەو لەسەرو بینینی كاروكردەوە چاكەكانی خۆیەوەیە، لاكردنەوە بە لایاندا و بیركردنەوە لێیان دابەزینە لەو هیممەتە بەرزە.

نەبوونی ئەم لاكردنەوە: یان بەهۆی ئەوەوەیە كە "عیللەت" بوونی نییە، چونكە هیممەتی بەرزی ئەو ڕێگەی نەداوە لا بەلای كاروكردەوەكاندا بكاتەوە، ئەو كات لاناكاتەوە بە لای شتێكدا كە بوونی نییە، یان لەبەر ئەوەی هیممەتەكەی داوایەكەی بۆ بەدەست هێناوە، و بەرزبوونەوەكەی دێت بەسەر ئەو عیللەتانەدا و لە ریشە دەریان دەهێنێت، ئەو گەر هیممەتی وابەستە كرد بە شتێكەوە كە لەخۆی بالاَتره هیممەتی بەرز لەئامێزی دەگرێت، ئەو كاتە حوكمەكەی دەچێتە خانەی حوكمی هیممەتی بەرزەوە، ئەم بابەتە بابەتێكی زۆر دەگمەن و غەریبە.

كەسی خاوەن هیممەت نایەوێت لە ئاسمانی داوای بەرزەوە دابەزێتە خوارەوە، ئەو لە سەفەرێكی هەمیشەییدایە بە دڵی بۆ لای خودا، بۆ ئەوەی رەزامەندی ئەو بەدەست بهێنێت و پێیەوە سەركەوتن مسۆگەر بكات، ئەو داواكەری خودایە بە داواكردنێكی تەواو بە هەموو مانا و مەرامێك لە كار و عیبادەت و موناجات و خەو و ئاگایی و جوولە و وەستان و كەنارگیری و تێكەڵبوون و تەواوی كاروباری تریاندا، دڵی رەنگی گرتووە بە رەنگی رۆیشتن بەرەو خودا، ئەم دۆخەش تەنها بۆ ئەهلی خۆشەویستی راستگۆیان بەدەست دێت، ئەوان تەنها بە رێوڕەسمی كاروكردەوەكان رازی نابن و لە پای پاداشت و پلەدا ناوەستن، ئەوە دابەزینە لە هیممەتی بەرزیان، داوایان بالاَتره لەوە، خاوەنی ئەم هیممەتە هیممەتی خۆی لەسەر داوای بالاَ و مەزن كورت كردۆتەوە، كە هیچ شتێك لەو داوایە بالاَتر نییە، پاداشت و پلە لەخوار ئەوەوەیە، ئەو دەزانێت گەر ئەو داوایەی بەدەست هێنا هەرچی پاداشت و پلە و پایەی بەرزە بۆی بەدەست دێت.

۞ ۞ ۞

## (٥٠) (منزلة المحبة)

# مەنزیلەی خۆشەویستی

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإيك نستعين)) مەنزیلەی خۆشەویستییە.

ئەو مەنزیلەیە كە پێشبڕكێكەران پێشبڕكێی تیادا دەكەن، كاركەران چاویان بڕیوەتە خۆشەویستی، پێشكەوتووان بۆ لای مەشخەڵەكەی تەكان بە خۆیان دەدەن، بۆ ئەم مەنزیلەیە خۆشەویستان خۆیان فەنا كردووە، عابیدان بە ڕۆحی نەسیمی ئاسوودە دەبن، خۆشەویستی ڕۆزی دڵانە، و خۆراكی ڕۆحەكان و نووری چاوانە، ئەو زیندەگییەیە هەر كەس لێی بێبەش بێت دەچێتە ریزی مردووانەوە، ئەو نوورەیە هەر كەس لەدەستی بدات دەچێتە ناو دەریای تاریكییەوە، ئەو شیفایە هەر كەس ونی كرد هەرچی نەخۆشییە روو لە دڵی دەكات، ئەو چێژەیە هەر كەس بەدەستی نەهێنێت ژیانی پڕ دەبێت لە خەم و پەژارە و ئازار.

خۆشەویستی سیمای دەستەی موسافیرانی ڕێگەی خودایە، ئەوانەی باڵی سەفەریان بۆ لای پەروەردگار گرتەوە، دواتر ڕێگەیان چۆڵ نەكرد تا گەیشتن بە لیقا، ئەوانە بوون لەسەر حەقیقەت كۆبوونەوە و جگە لە ئەوان خەڵكانی تر لەسەر ڕێورەسم كۆبوونەوە.

خۆشەویستی ناونیشانی ڕێگەكەیان و ڕێنیشاندەریەتی، ناونیشان بەڵگەیە لەسەر كتێب، خۆشەویستی ئاماژە بە صدقی داواكەر دەكات و رایدەگەیەنێت ئەو كەسە یەكێكە لە ئەهلی ڕێگە.

هەر بەو جۆرە خۆشەویستی ((گرێبەستی خۆدانەپاڵە)) واتە ئەو پەیوەندییەی لەنێوان پەروەردگار و بەندەكەیدا هەیە، هیچ پەیوەندییەك لە نێوان خودا و بەندەكانیدا نییە جگە لە پەیوەندی بەندایەتی لە بەندەوە و پەروەردگاریی لە خوداوە، لە بەندەدا شتێك لە پەروەردگاریی بوونی نییە، لە پەروەردگاریشدا كەمترین بەش لە بەندایەتی بوونی نییە، بەندە لە هەموو ڕوویەكەوە بەندەیە، پەروەردگاریش خودای حەقە لە هەموو ڕوویەكەوە، "گرێبەستی خۆدانەپاڵ" بریتییە لە

خۆشەویستی، بەندایەتی بەم خۆشەویستییەوە دادەمەزرێت، بەجۆرێك هەر كات خۆشەویستی هەڵوەشایەوە بەندایەتی هەڵدەوەشێتەوە، خودا زاناترە.

خۆشەویستی رۆحی ئیمان و كاروكردەوەكانە، هەر بەو جۆرە رۆحی مەقامەكان و ئەحواڵەكانە، هەر كات خۆشەویستی لەوانەدا نەما دەبن بە جەستەیەكی بێ رۆح، كۆڵی قورسی رێبوارانی رێگەی خودا هەڵدەگرێت كە بە ئەرك و ماندووبوونێكی زۆر نەبوایە نەیاندەتوانی پێیەوە بگەنە مەنزڵ، گەیشتنیان بە مەنزیلەكان هەرگیز بەبێ خۆشەویستی بەدەست نەدەهاتن، راوەستان لەسەر صدق كۆمەڵێك مەقامیان بۆ دەستەبەر دەكات گەر چوونە ناو خۆشەویستی نەبوایە بۆیان دەستەبەر نەدەبوو، خۆشەویستی ئەو وڵاخەیە كە رێبواری رێگەی خودا بە بەردەوامی سوار پشتی دەبێت بۆ گەیشتن بە خۆشەویستەكەی، خۆشەویستی باشترین و راسترین رێگەیەكە ئەهلی باوەڕ بە نزیكی بۆ گەیشتنەوە بە نیشتمانی یەكەمیان دەیگرنە بەر، سوێند بە خودا ئەهلی خۆشەویستی گەورەیی و مەزنی دونیا و دوارۆژیان بەدەست هێنا، چونكە لەگەڵ خۆشەویست بوون و زۆرترین بەشی بۆ دابین كردن، ئەو رۆژەی خودا بڕیاری لە قەدەری دروستكراوەكانی دا بە ویست و حیكمەتی رەهای خۆی تۆماری كرد "مرۆڤ لەگەڵ خۆشەویستەكەیدایە"، ئەوەش باشترین نیعمەتێكە بەسەر خۆشەویستاندا دابارێوە.

سوێند بە خودا خۆشەویستان پێش كۆششكەران كەوتوون لە كاتێكدا لەسەر جێگەی نووستنیان خەوتوون، ئەوان پێش قافڵەكە كەوتن بە چەندین قۆناغ لە كاتێكدا لە رۆیشتن وەستاون.

من لي بمثل سيرك المدلل      تمشي رويدا؟ وتجي في الأول

وەڵامی بانگی شەوقیان دایەوە كە بانگی لێكردن"حي على الفلاح"، نەفسی خۆیان بەخشی لە داوای گەیشتن بە خۆشەویستەكەیان، سوێند بە خودا كاتێك گەیشتنە بەرەوە حەمدی ئەو كەسەیان كرد رێگەكەی پێبڕین و شوكری مەولایان كرد لەسەر ئەوەی پێیداون، عاریفان لە بەرەبەیاندا حەمدی ئەو كەسە دەكەن كە رێگەی پێبڕیون.

فحيلا إن كنت ذا همة فقد — حدا بك حادي الشوق فاطو المراحلا
وقل لمنادى حبهم ورضاهم — إذا ما دعا ((لبيك)) ألفا كواملا
ولا تنظر الأطلال من دونهم فإن — نظرت إلى الأطلال عدن حوائلا
ولا تنتظر بالسير رفقة قاعد — ودعه، فإن الشوق يكفيك حاملا
وخذ منهم زادا إليهم وسر على — طريق الهدى والفقر تصبح واصلا
وخذ قبسا من نورهم ثم سر به — فنورهم يهديك ليس المشاعلا
وخذ يمنة عنها على المنهج الذي — عليه السرى وفد المحبة آهلا
وقل: ساعدي، يا نفس بالصبر ساعة — فعند اللقا ذا الكد يصبح زائلا
فما هي إلا الساعة ثم تنقضي — ويصبح ذو الأحزان فرحان حاذلا

یەكەمین نرخ بۆ بەهای خۆشەویستی بریتییە لە بەخشینی رۆح، كەسی موفلیس و ترسنۆك و دەستنوقاو ئەو نرخەی پێ نادرێت.

بدم المحب يباع وصلهم — فمن الذي يبتاع بالثمن؟

(بە خوێنی خۆشەویست گەیشتنیان دەفرۆشرێت، كێ هەیە با بێت بەو نرخە بیكرێت) سوێند بە خودا نرخەكەی دانەبەزیوە تاكو مفلیسەكان بتوانن بیكڕن، بازاڕی نەشكاوە تاكو دەستتەنگان بتوانن بە پارەی دواكەتوو بیكڕن، لە بازاڕ مەزاد كراوە و كێ نرخی زیادە دەدات با هەڵیبگرێت، هیچ نرخێكیش ناگاتە نرخی خۆی جگە لە بەخشینی نەفس و رۆح، دەست بەتاڵەكان هاتنە دواوە، خۆشەویستان راستبوونەوە و سەیریان كرد تاكو بزانن كامیان شایستەیە ببێت بە نرخی خۆشەویستی، شمەكەكە لەنێوانیاندا هاتوچۆی كرد تا دواجار كەوتە دەستی ﴿أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ المائدة: ٥٤ كە بانگەشەكەرانی خۆشەویستی زۆر بوون داوای راستكردنەوەی بەڵگەیان لەسەر دروستیی داواكەیان لێكرا، گەر خەڵكی بە بانگەشەكانیان پێیان بدرێت ئەوا كەسی خاڵی لە ئازار بانگەشەی سوتان و هەڵكزانی دەكرد، ئەو كات بانگەشەكەران لە ئامادەبوون جۆراوجۆر دەبوون، وترا: ئەم بانگەشانەی ئێوە بەڵگەی پێویستە، بەڵگەكەش بریتییە لە ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ﴾ آل عمران: ٣١

هـەموو خـەڵكی هاتنـە دواوە، شـوێنكەوتووانی خۆشەویسـت لـە كـردار و گوفتـار و ئەخلاقیدا ناویـان تۆمـار كـرا، داوای عەدالـەتی بەڵگەكـەیان لێكـرا بـە بەڵگـەی پـاك و بێگەردی ﴿يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖ﴾المائدة: ٥٤.

زۆربەی خۆشەویستان چوونە دواوە و موجاهیدان هەستانە سەرپێ، پێیان وتـرا: نـەفس وماڵی خۆشەویسـتان بـۆ خۆیـان نییـە، وەرن بـۆ بەیعـەت (گرێبەسـتی فرۆشـتنیان بـە خودا)﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَ﴾التوبة: ١١١

كە مەزنیی شتە فرۆشـراوەكەیان بـۆ دەركـەوت و بـەرزی نرخەكـە و شـكۆمەندی ئـەو كەسەی گرێبەستەكەی لەسەر دادەمەزرێت بـۆ ئاشـكرابوو بۆیـان دەركـەوت چ نـرخ و بەهایەكە و چ شان و شكۆیەكی تایبەت بە خۆی هەیە، بۆیە بینیـان گـەورەترین زیـان ئەوەیـە دەسـتبەرداری بـبن و بـە نرخێكـی هـەرزان بـە خـەڵكی تـری بفرۆشـن، بۆیـە هەرهەموویان لە كڕینەكـە نەچـوونە دواوە و بـە كـۆدەنگ و بـە ڕازیبـوونی هـەموویان بەیعەتی ڕیزوانیان(رضوان) دامەزرانـد بـەبێ دیـاریكردنی هەڵبژاردنەكـە بـۆ كەسـێك و وتیان ((سوێند بە خودا تۆ بە كەس نادەین و داواش ناكەین بۆ تەنها كەسێك بیت))

كـە گرێبەسـتەكە تـەواو بـوو و فرۆشـراوەكەیان ڕادەسـتكرد پێیـان دەوترێـت: لـەو كاتەوەی نەفس و ماڵتان بووە بە هی ئێمـە بۆتـان دەگێڕینـەوە بـە باشـترین شـێوە، بـەڵكو زیـاتر و زۆرتـر لـەوە﴿ وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢاۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ ١٦٩ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾ آل عمران: ١٦٩ – ١٧٠.

كـە درەخـتی خۆشەویسـتی لـە دڵـدا چـێنرا و بـە ئـاوی ئـیخلاص و شـوێنكەوتنی پێغەمبـەر(ﷺ) ئـاودرا چـەندین جـۆر بـەردەگرێت، و لـە هـەموو وەرزەكانـدا بـە بڕیـاری پەروەردگاری بەر دەدات، ڕەگ و ڕیشەی لە زەوی دڵدا جێگیرە و پەلوپۆكانی گەیشتۆتە "سدرة المنتهى".

بەردەوام هەوڵی خۆشەویست بۆ لای خۆشەویستەكەی بـەرز دەبێتـەوە و هـیچ شـتێك نابێتە پەردە لە نێوان ئـەو خۆشەویسـتەكەیدا ﴿إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرۡفَعُهُۥ﴾فاطر: ١٠

### ۞ هەر كەس تامی خۆشەویستی كرد..... دەیناسێت

خۆشەویستی بە سنوورێك سنووردار نەكراوە ڕۆشنتر بێت لە خۆی، بوونی سنوور شاردنەوە و لێڵی بۆ خۆشەویستی دروست دەكات، بۆیە سنووری خۆشەویستی بریتییە لە بوونی خۆشەویستی، خۆشەویستی بە وەسفێك وەسف نەكراوە ڕۆشنتر بێت لە "خۆشەویستی".

خەڵكی (ئەهلی ڕێگەی بەرەو خوداچوون) لە هۆ و بەدواهات (الأسباب و الموجبات) و نیشانە و گەواهییەكان(العلامات والشواهد)ی قسە دەكەن، هەروەها قسە لە بەروبووم و ئەحكامەكانی(الثمرات والأحكام)، بۆیە سنوور و ڕێورەسمیان قسە لەسەر ئەو شەش خاڵە دەكەن، دەربڕینەكانیان جۆراوجۆرە، ئاماژەكانیان فرە ڕەهەندە، ئەمەش بەپێی پەیبردنی كەسەكە و مەقام و حاڵ و توانای دەربڕینی.

ئەم مادەیە(المحبة) لە زمانەوانیدا بە دەوری پێنجە شتدا دەسوڕێتەوە:

یەكەم: پاكێتی و سپێتی، لەوانە ئەو قسەیانە كە بۆ سپێتی زمان و درەوشانەوەی دەڵێن "حبب الأسنان".

دووەم: بەرزبوونەوە و دەركەوتن، لەوانە "حبب الماء و حبابه" ئەو ئاوەی لە كاتی باراندا بەرز دەبێتەوە، هەروەها "حبب الكأس منه"كاتێك كاسەكەی لێ پڕ بێت.

سێیەم: پێوەلكان و جێگیربوون: لەوانە "حب البعير و أحب"كاتێك وشترەكە بەچۆكدا بێت و هەڵنەسێتەوە.

شاعیرێك دەڵێت:

حلت عليه بالفلاة ضربا ضرب بعير السوء إذا أحبا

چوارەم: كرۆك، لەوانە"حبة القلب" كرۆكی دڵ، "لبه" واتە ناوەوەی، هەروەها "الحب"بۆ یەك دانە تۆوی ڕووەك، چونكە دانەوێڵە بریتییە لە بنچینەی شتەكە و مادە و كرۆكی.

پێنجەم: پارێزگاری و گرتن: لەوانە"حب الماء" ئەو دەفرەی كە ئاوی تیا هەڵدەگیرێ و دەپارێزرێت، هەروەها مانای جێگیربوونیشی تێدایە.

گومانی تێدا نییە ئەم پێنج مانایە لە پێویستییەكانی خۆشەویستییە، خۆشەویستی بریتییە لە پاك و بێگەردیی مەوەدەت، و هەروەها هەڵچوونی ویستنی دڵ بۆ مەحبوب و

بەرزبوونەوە و بالآبوونی بەهۆی وابەستەبوونی بە خودای موتەعالەوە، و هەروەها جێگیربوونی ویستی دڵ بە مەحبوبەوە و هەر بەو جۆرە پەیوەستبوون بە پەیوەستییەك کە لێی جیا نابێتەوە، دواجاریش پێدانی کرۆکی دڵ بە مەحبوب لەلایەن خۆشەویستەکەوە، پێدانی بەرزترین شت لەلای بە خۆشەویستەکەی کە بریتییە لە دڵی، هەر بەو جۆرە کۆبوونەوەی هیممەت و لێبڕانی لەسەر مەحبوب و سووربوون بۆ بەدەستهێنانی.

## ✿ ئاسەوارەکانی خۆشەویستی و نیشانەکانی

وتراوە: خۆشەویستی مەیلێکی هەمیشەییە لە دڵێکی عەودالّدا.

ئەم برە جیاکاری تێدا نییە لە نێوان خۆشەویستی تایبەت و خۆشەویستی هاوبەش و تەندروست و نەخۆش.

هەروەها وتراوە: خۆشەویستی بریتییە لە هەڵبژاردنی مەحبوب لەناو هەموو هاوەڵان و هاوڕێیاندا.

ئەمە حوکمێکە لە حوکمەکانی خۆشەویستی و ئاسەوارێکە لە ئاسەوارەکانی.

هەروەها وتراوە: تەبایی لەگەڵ خۆشەویست لە ئاشکرا و پەنهاندا.

ئەمەش دیسان خوازراو و داواکارییەتی، و کامڵترە لە دوو رادەکەی پێشووتر(واتە ئەو دوو قسەی پێشووتر"خۆشەویستی مەیلێکی هەمیشەییە لە دڵێکی عەودالّدا" هەروەها "خۆشەویستی بریتییە لە هەڵبژاردنی مەحبوب لەناو هەموو هاوەڵان و هاوڕێیاندا")، چونکە ئەمەی سێیەم خۆشەویستی راستگۆیانە و دروست و تایبەت لەئامێز دەگرێت، بە پێچەوانەی تەنها مەیل و هەڵبژاردن بە ویستەوە، چونکە گەر ئەوانە تەباییان لەگەڵدا نەبێت خۆشەویستییەکەی عیللەتدار و ناتەواوە.

هەروەها وتراوە: خۆشەویستی بریتییە لە بەزۆرزانینی گوناه و خراپەکانت و بەکەم زانینی گوێڕایەڵی و چاکەکانت.

وتراوە: بریتییە لە دەست ملانبوونی گوێڕایەڵی و جیابوونەوە لە سەرپێچی.

ئەم قسەیە بۆ سەهلی کوڕی عەبدولا دەگەڕێتەوە، کە بریتییە لە حوکمی خۆشەویستی و پێویست بوونی.

هەروەها وتراوە: خۆشەویستی ئەوەیە كە هەموو بوونی خۆت بدەیت بەو كەسەی خۆشت دەوێت، شتێك لە خۆت نەمێنێتەوە نەیبەخشی، ئەمەش قسەی ئەبی عەبدوڵای قورشییە.

ئەمەش دیسان لە پێویستییەكانی خۆشەویستی و حوكمەكانییەتی، مەبەستەكە: ئەوەیە كە ویست و لێبڕان و كردار و نەفس و ماڵ و كاتت ببەخشیت بەو كەسەی خۆشت دەوێت، هەموو ئەوانە بۆ رەزامەندی و خۆشەویستی خودا تەرخان بكەیت.

ئەوەندە لە نەفست بۆ خۆت بێت كە خۆشەویستەكەت پێت ببەخشێت، واتە لەوەوە(لە خۆشەویستەوە) خۆت بۆ خۆت بگەڕێتەوە.

## ۞ خۆشەویستی.... عێراقی

جوانترین شتێك لەسەر خۆشەویستی وترابێت: ئەوەیە كە ئەبوبەكر كەتانی باسی كردووە، دەڵێت: بابەتێك دەربارەی خۆشەویستی لە مەككە-خودا عیززەتی بۆ زیاد بكات- لە مەوسیمی حەجدا تاوتوێ كرا، چەندین زانا قسەیان تێدا كرد، "جونەید" لە هەموویان بچووكتر بوو، زانایان پێیان وت: ئەی عێراقی، تۆ چیت لەلایە پێمان بڵێ، ئەویش سەری داخست و چاوەكانی فرمێسكی لێ باری و پاشان وتی: بەندەیەك كە لە نەفسی خۆی دەرچووە، پەیوەست بووە بە یادی خوداوە، هەستاوە بە جێبەجێ كردنی حەقەكانی، بە دڵ تەماشای دەكات، گەر قسەی كرد بە خوداوە قسە دەكات، كە دەمی كردەوە لە خوداوە دەم دەكاتەوە، گەر جوڵا بە فەرمانی خودایە، گەر وەستا لەگەڵ خودادایە، ئەو بە خودا و بۆ خودا و لەگەڵ خودایە.

زانایان دەستیان بە گریان كرد و وتیان: لەسەرو ئەو قسانەی تۆوە زیادەیەك بوونی نییە، خودا پاداشتت بداتەوە ئەی تاجی عاریفان.

## ۞ چۆن خۆشەویستی فێرببین؟

لەو هۆیانەی سەردەكێشێت بۆ خۆشەویستی و بەدوای خۆیدا دەیهێنێت، "دە" هۆیە:

یەكەم: خوێندنەوەی قورئان بە تێڕامان و تێگەیشتن لە ماناكانی و ئەو مەبەست و مەرامەی تێیدایە.

دووهم: نزیکبوونەوە لە خودا بە سوننەتەکان لـە دوای جێبـەجێ کردنـی فـەرزەکان، چونکە بەرزی دەکاتەوە بۆ پلەی مەحبوبییەت لەدوای مەحەبەت.

سێیەم: بەردەوامی یادی خودا لە هەموو بارێکدا، بـە زمـان و بـە دڵ، بـە کـردار و بـە حاڵ، بەشی ئەو لە خۆشەویستی بە ئەندازەی بەشی ئەوە لە یادی خودا.

چوارەم: هەڵبژاردنی ئەوەی ئەو خۆشیدەوێت بەسەر ئەوەی خۆت دەتەوێت لە کـاتی زاڵبوونی حەز و ئارەزوودا، خۆڕادەست کردن بە خۆشویستنی ئەو بـا بەرزبوونـەوەش بۆ ئەو حاڵەتە گران بێت.

پێنجـەم: بـەدڵ تەماشـاکردنی نـاو و سـیفەتەکانی، موشـاهەدەیان و ناسـینیان، هەڵسوکەوت لە باخچەی ئەو ناو و سیفەتانەدا، هـەر کـەس خـودا بـە نـاو و سـیفات و کردارەکانی بناسێت بە ناچاری خۆشی دەوێت.

شەشـەم: موشـاهەدەکردنی چـاکە و فـەزڵ و نیعمـەتی خـودا، هـەروەها نیعمەتـە شـاراوەکان و ئاشـکراکان لـە نـاوەوە و دەرەوەدا، ئـەو موشـاهەدەیە بـانگ بـۆ خۆشویستنی خودا دەکات.

حەوتەم: -لە هەموویان سەرسوڕهێنتر- گەردنکەچ بـوونی دڵ بـە هـەموو بوونیـەوە لەبەردەم خودای موتەعالدا، تەعبیر لەم مانایە تـەنها وشـەیە، ئـەگینا حەقیقەتەکـەی شتێکی ترە.

هەشتەم: تەنهاکەوتنەوە لە خزمەتیدا کاتی دابەزینی خودای موتـەعال، بـۆ موناجـات لەگەڵی و خوێندنەوەی کەلامی شیرینی، وەستان بـە دڵ و خۆڕازاندنـەوە بـە ئـەدەبی بەندایەتی لەبەردەستیدا، پاشان کۆتاهێنانی ئەو تەنهاکەوتنە بە داوای لێخۆشـبوون و تەوبەکردن.

نۆیەم: دانیشتن لەگەڵ ئەوانەی خۆشەویستی صادقن بۆ خودای موتەعال، چنینەوەی بەری شیرینی قسەکانیان وەك چنینەوەی بەری درەختێك، قسە لە خزمەتیانـدا مەکـە مەگـەر بەرژەوەندییـەکی پارسـەنگ داوای بکـات، و بزانیـت حاڵـت زیـاد دەکـات و سوودێکی بۆ کەسانی تر تێدایە.

دەیەم: دوورکەوتنەوە لە هەر هۆیەك دەبێتـە هـۆی دابـڕان و دوورکەوتنـەوەی دڵ لـە خودا-عزوجل-.

لەم دە هۆیەوە: خۆشەویستان گەیشتنە مەنزیلەی خۆشەویستی، چوونە ژوورەوە بۆ لای خۆشەویست، پوختەی هەموو ئەوانە دوو شتە: ئامادەیی ڕۆح بۆ شان و شکۆی خۆشەویستی لەگەڵ خودا، و کرانەوەی چاوی بەصیرەت. کۆمەك و یارمەتی تەنها بە خودایە.

قسە کردن لەم مەنزیلەیە بەستراوە بە دوو بەرەوە: بەرەی خۆشەویتی بەندە بۆ پەروەردگاری، لەگەڵ بەرەی خۆشەویستی پەروەردگار بۆ بەندەکەی، ئەوەی عاریفان لەسەری کۆدەنگن: خودا ئەوانی خۆشدەوێت، ئەوانیش خودایان خۆشدەوێت، ئەمەش بریتییە لە جێگیرکردن و سەلماندنی هەردوو بەرەکە، خۆشەویستی بەندە بۆ پەروەردگاری لەسەرو هەرچی خۆشەویستی ترەوەیە، خۆشەویستی خودا بە هیچ خۆشەویستییەکی تر بەراورد ناکرێت، ئەوەش بریتییە لە حەقیقەتی ((لا إله إلا الله))، هەر بەو جۆرە خۆشەویستی خودا بۆ دۆستان و پێغەمبەرانی لەلایان: سیفەتێکی زیاترە لە ڕەحمەت و چاکە و بەخشینی، ئەوە ئاسەواری خۆشەویستی و داخوازییەکانییەتی، کە خودا خۆشیویستن لە بەزەیی و ئیحسان و چاکەی خۆی بەشیدان بە تەواوترین بەش.

هەرچی ڕێگەی بەڵگەیە –لە ئەقڵ و نقڵ و فیترەت و قیاس و دانان و زەوق و وەجد– بەڵگەن لەسەر جێگیرکردنی خۆشەویستی بەندە بۆ پەروەردگار و پەروەردگار بۆ بەندەکەی.

لەسەر ئەو ڕاستییە نزیکەی سەد ڕێگەمان لە کتێبی ((روضة المحبين))دا باس کردووە، لەو کتێبەدا باسی سوودەکانی خۆشەویستیمان کردووە، و ئەوەی بۆ خاوەنەکەی بەرهەم دێت لە کەماڵات، هەروەها هۆ و پێویستییەکانی خۆشەویستی، و بەرپەرچدانەوەی ئەوانەی نەرێی خۆشەویستی دەکەن، و بەیانکردنی تێکچوونی بیروبۆچوونەکەیان، نەرێکارانی خۆشەویستی تایبەتمەندی بوون و بڕیار(خەلق و ئەمر) نەرێ دەکەن، هەروەها نەرێی ئەو ئامانجە دەکەن لە پێناویدا دروستکراون، بوون و بڕیار و پاداشت و سزا: لە خۆشەویستییەوە سەریان هەڵداوە و لەوپێناوەدان، خۆشەویستی ئەو حەقەیە ئاسمانەکان و زەوی لە پێناودا دروستکراون، ئەو حەقەیە ئەمر و نەهی لەخۆ دەگرێت، خۆشەویستی نهێنی بە خودازانینە، یەکتاپەرستییەکەی بریتییە لە شەهادەتی "لا إله إلا الله".

بەو جۆرە نییە وەك نەریکاران بانگەشەی بۆ دەکەن: گوایە "إلـه" بریتییە لە پەروەردگاری دروستکەر، هاوەڵدانەران دانیان بەوەدا دەنا کە هیچ پەروەردگارێك بوونی نییە جگە لە "الله"، هیچ دروستکەرێك جگە لە ئەو بوونی نییە، ئەو لە دروستکردن و پەروەردگارییدا تاك و تەنهایە، بەڵام دانیان بە یەکتایی خوایەتیدا نەدەنا، کە بریتی بوو لە خۆشەویستی و بە مەزنزانین، ئەوان لەگەڵ خودادا کەسێك یان شتێکی تریان دانابوو بە خودایان دەزانی و دەیانپەرست، ئەوە ئەو هاوەڵدانانەیە کە خودا لێی خۆش نابێت، خاوەنەکەی ئەو کەسەیە لەخوار خوداوە ئەندادی بۆ خودا بڕیارداوە.

خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ﴾البقرة: ١٦، رایگەیاند ئەو کەسەی لەخوار خوداوە شتێکی تری بە ئەندازەی خودا خۆشبوێت: ئەو لەو کەسانەیە ئەندادی بۆ خودا بڕیارداوە، ئەمە بریتییە لە نەیار یان دژ(ند) لە خۆشەویستیدا، نەك لە دروستکردن و پەروەردگارییدا، هیچ کەسێکی ئەهلی سەر زەوی ئەو نەیارەیان لە پەروەردگارییدا(الربوبية) بڕیار نەداوە، بەڵکو لە خوایەتی خودادا(الألوهية) هاوەڵیان داناوە، بە پێچەوانەی بڕیاردانی نەیار لە خۆشەویستیدا، زۆربەی خەڵکی سەر زەوی نەیاریان بۆ خودا لە خۆشەویستی و بە مەزن زانیندا بڕیار داوە، پاشان دەفەرموێت ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ﴾البقرة: ١٦٥، لە لێکدانەوەی ئەم ئایەتەدا دوو قسە هەیە:

یەکەمیان: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ﴾ئەوانەی باوەڕیان هێنا خۆشەویستییەکی زیاتریان هەیە بۆ خودا لە خاوەنی ئەنداد بۆ خوداکانیان کە خۆشیان دەوێن و بە مەزنیان دەزانن لەخوار خوداوە.

دووەم: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ﴾ئەوانەی باوەڕیان هێنا خۆشەویستییەکی زیاتریان هەیە لە خۆشەویستی هاوەڵدانەران بۆ خودا، خۆشەویستی باوەڕداران پاك و بێگەردە و بەشی هیچ کەسێکی تێدا نییە جگە لە خودا، بەڵام خۆشەویستی هاوەڵدانەران نەیارەکان(أنداد) بەشێك لە خۆشەویستییەکەیان بردووە، خۆشەویستی پاك و بێگەرد زۆرتر و زیاترە لە خۆشەویستی هاوبەش(بۆ خودا و بۆ نەیار)، هەردوو بۆچوونەکە لەسەر دوو قسەیە کە دەربارەی﴿ يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ﴾کراوە، دوو قسەکە:

یەكەمیان: ئەیارەكانیان خۆش دەوێت وەك چۆن خودایان خۆشدوێت، بەم پێیە خۆشەویستی خودای بۆ جێگیركردن، بەڵام خۆشویستنێك كە ئەندادیان كردووە بە هاوبەش لەگەڵیدا.

دووەمیان: مانای"خودایان خۆشدەوێت(كحب الله)" واتە "وەك چۆن باوەڕداران خودایان خۆشدەوێت"، پاشان بەیانی ئەوەی كرد كە خۆشەویستی باوەڕداران بۆ خودا زۆرتر و زیاترە لە خۆشەویستی خاوەن ئەنداد بۆ ئەندادەكانیان.

شێخولئیسلام ئیبن تیمیە-رەحمەتی خوای لێ بێت- قسەی یەكەمی پێ پەسەندتر بوو، دەیفەرموو: بۆیە زەمیان كراوە، چونكە لە خۆشەویستیدا هاوبەشییان كرد لەنێوان خوا و "ئەنداد"دا، خۆشەویستییەكەیان بۆ خودا تایبەت نەكرد و پاك و بێگەرد نەبوو وەك خۆشەویستی باوەڕداران بۆ خودا.

ئەم یەكسان كردنە ئاماژەبۆكراوە لەم ئایەتەدا: لە ئەوانەوە باس دەكات و دەگێڕێتەوە، ئەوان لە ئاگردان و بە خواكانیان دەڵێن كە لە ئاگردا ئامادەبوون لەگەڵیان﴿ تَاللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذۡ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾﴾ الشعراء: ٩٧ - ٩٨، ئاشكرایە ئەوان یەكسانیان نەكردن بە "رب العالمين" لە خەلق و پەروەردگارییدا، بەڵكو لە خۆشەویستی و بە مەزن زانیندا یەكسانیان كردن بە "رب العالمين"، ئەمەش ئەو "عدل" باسكراوەیە لە ئایەتی﴿ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ يَعۡدِلُونَ ﴿١﴾﴾ الأنعام: ١، واتە جگە لە خودا كەسانی تر لە عیبادەتدا بە خودا یەكسان دەكەن، عیبادەتیش بریتییە لە خۆشەویستی و بە مەزن زانین.

لە ئایەتەكەدا مانایەكی تری تێدایە-خودا زاناترە- ئەوەش ئەوەیە كە ئەندادەكانیان خۆشدەوێت لە رەگەزی ئەو خۆشویستنەی باوەڕداران بۆ خودا هەیانە، ئەوەش خۆشەویستییەكی تێكەڵاوە بە زەلیلی و بەمەزن زانین، هەروەها بەپیرۆزكردنێك كە هەڵیان دەنێت بۆ بەندایەتی كردنیان بە دوعاكردن و شتانی تریش لە جۆرەكانی عیبادەت، هەروەها گوێڕایەڵی كردنیان بۆ تەشریع و ئەحكامی ئەو ئایینە خورافییەی بۆیان داهێناون.

دروستە بوترێت: بەڵكو ئەوان لە تایبەتمەندی پەروەردگارییدا یەكسانیان كردن بە پەروەردگار كە بریتییە لە تەشریع، وەك خودای موتەعال دەربارەیان دەفەرمووێت

﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ﴾ التوبة: ٣١، هەروەها ئایەتی﴿ أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴾ الشوری: ٢١، لە فەرموودەکەی "عدی بن حاتم"دا لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) شەرحی ئەوەی کردووە، بابەتەکە تەنها جیاوازییە لە زاراوەدا لە مانای "الرب" و "الإله"دا

هەروەها خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ ﴾ آل عمران: ٣١، ئەم ئایەتە پێی دەوترێت ئایەتی خۆشەویستی، ئەبو سولەیمانی دارانی دەفەرموێت: کە دڵان بانگەشەی خۆشەویستی خوایان کرد خودای موتەعال ئایەتی "محنة"–تاقیکردنەوەی دابەزاند و فەرمووی﴿ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ ﴾ آل عمران: ٣١

هەندێ لە پێشین دەڵێن: دەستەیەك بانگەشەی خۆشەویستی خودایان کرد، خوداش ئایەتی﴿ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ ﴾ی بۆ دابەزاندن.

فەرمووی (يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ) تاکو ئاماژە بێت بۆ بەڵگەی خۆشەویستی و بەروبوومی خۆشویستن و سوودەکەی، بەڵگە و نیشانەکانی: بریتییە لە شوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ)، سوود و بەروبوومی: خۆشویستنی ئەو کەسەی کە نێراوەکەی بۆ رەوانە کردوون، گەر شوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) بەدەست نەیەت ئەوە خۆشەویستی ئێوە بۆ خودا بەدەست نایەت، ئەو کاتە خۆشەویستی خودا لە ئێوە نەرێ دەکرێت.

خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖ ﴾ المائدة: ٥٤، لێرەدا چوار نیشانەی بۆ باس کردن:

یەکەم و دووەم: بریتین لە زەلیلی و عیززەت، "زەلیلی" وتراوە ماناکەی بریتییە لە: دڵنەرمان و بەبەزەییان و خاوەن شەفەقە بۆ یەکتری و بە سۆزان بەرانبەر باوەڕداران، کە "أذلة" ئەم مانانەی لەخۆگرت بە ئامرازی "على" کردی بە فرمانێکی تێپەڕ، عەتا دەفەرموێت: بۆ باوەڕداران وەك رۆڵە وایە بەرانبەر دایك و باوکی، هەروەها وەك کۆیلە وایە بۆ سەردارەکەی، لەگەڵ بێباوەڕانیش وەك شێر وایە بەرانبەر نێچیرەکەی﴿ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡ ﴾الفتح: ٢٩

نیشانەی سێیەم: تێکۆشان لە پێناوی خودادا بە نەفس و دەست و زمان و ماڵ و دارایی، ئەوەش بانگەشەی خۆشویستنی خودا راست دەکاتەوە.

نیشانەی چوارەم: لەبەر خودا و بۆ خودا لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسێت، ئەمە نیشانەی دروستی خۆشەویستییە، هەر خۆشەویستێك لۆمە لە خۆشەویستەکەی بیگرێتەوە ئەو کەسە لە راستیدا خۆشەویست نییە، وەك وتراوە:

لا كان من لسواك بقية    يجد السبيل بها إليه اللوم

خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ ۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا ﴿٥٧﴾ ﴾ الإسراء: ٥٧، لەم ئایەتەدا سێ مەقامەکەی باس کرد، خۆشەویستی: کە بریتییە لە ویستی نزیکبوونەوە لە خودا، و گرتنەبەری تەوەسول بۆ لای بە کاروکردەوەی چاکە، لەگەڵ رجا و ترس، ئەمەش بەڵگەیە کە گرتنەبەری وەسیلە کارێکی زیاترە لە رجای رەحمەت و ترسی سزا.

ئەوەی زۆر ئاشکرایە: تۆ ململانێ ناکەیت بۆ نزیکبوونەوە مەگەر بۆ لای کەسێك بێت کە نزیکبوونەوەت لێی خۆشبوێت، خۆشویستنی نزیکیی لەو کەسە(واتە نزیکبوونەوەت لە کەسەکە خۆشبوێت) بەدوای خۆشەویستی خودی کەسەکەدا دێت، بەڵکو خۆشەویستی خودی کەسەکەیە وای لە تۆ کردووە نزیکبوونەوە لێی لەلات خۆشەویست بێت، چونکە زیندەگی دڵ و خۆشی رۆح و گەشانەوەی نەفس و رۆشنی چاو و بەرزترین نیعمەتی دونیا و دوارۆژی تێدایە.

خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَلَا تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ ﴾ الأنعام: ٥٢، خۆشەویستان و دۆستانی خودا دەفەرموون﴿ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا ﴿٩﴾ ﴾ الإنسان: ٩.

خودای موتەعال دەفەرموێ﴿ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰ ﴿١٩﴾ إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِ الْأَعْلَىٰ ﴿٢٠﴾ ﴾ الليل: ١٩ – ٢٠، لوتکەی ئامانجی چاکان و نزیکان و خۆشەویستانی خودا بریتییە لە ویستنی رووی خودای موتەعال.

خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ فَإِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾ ﴾ الأحزاب: ٢٩، لێرەدا ویستنی خودا جیایە لە ویستنی دوارۆژ، ئەم ویستنی رووی خودایە چێژی سەیرکردنی خودا لە رۆژی دواییدا بەدوای خۆیدا دەهێنێت، وەك لە "مستدرك الحاكم" و "صحيح ابن حبان" لە

فەرموودەیەكی بەرزكراوەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ئەم دوعانەی دەكرد((**أللهم بعلمك الغيب وقدرتك على الخلق: أحيني إذا كانت الحياة خيرا لي، وتوفني إذا كانت الوفاة خيرا لي، وأسالك خشيتك في الغيب والشهادة، وأسألك كلمة الحق في الغضب والرضا، وأسألك القصد في الفقر والغنى، وأسألك نعيما لا ينفد، واسألك قرة عين لا تنقطع، وأسالك الرضا بعد القضاء، وبرد العيش بعد الموت، وأسألك لذة النظر إلى وجهك، وأسالك الشوق إلى لقائك في غير ضراء مضرة ولا فتنة مضلة، أللهم زينا بزينة الإيمان، واجعلنا هداة مهتدين**)) فەرموودەكە چێژی سەیركردنی رووی خودای موتەعالی جێگیر كرد، هەروەها جێگیركردنی شەوق بۆ لیقای ئەو-**سبحانه**-.

لە فەرموودەیەكی سەحیحدا لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە-خوا لێی رازی بێت- فەرمووی: ((پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: سێ شت هەر كەس تیایدا بێت شیرینی ئیمانیان پێ دەبینێتەوە: خوا و پێغەمبەری لە هەرچی شت و كەسی ترە خۆشتر بوێت، كەسێكی تەنها لەبەر خودا خۆشبوێت، پێیناخۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ بێباوەڕی-دوای ئەوەی خودا رزگاری كرد لێی- وەك چۆن پێیناخۆشە هەڵبدرێتە ناو ئاگرەوە))

لە سەحیحی بوخاریدا لە ئەبو هورەیرەوە-خوا لێی رازی بێت- فەرمووی پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: ((خودای موتەعال دەفەرموێت: هەر كەس دەستدرێژی بكاتە سەر دۆستێكم جەنگم دژ بەو كەسە راگەیاندووە، باشترین و خۆشەویسترین شتێك لەلام بەندەكەم بەهۆیەوە لە من نزیك ببێتەوە بریتییە لە جێبەجێ كردنی ئەوەی لەسەری فەرزم كردووە، بەندەكەم بەردەوام بە نەوافل لێم نزیك دەبێتەوە تا خۆشم دەوێت، كە خۆشمویست دەبم بەو گوێیەی پێی دەبیستێت، دەبم بەو چاوەی پێی دەبینێت، دەبم بەو دەستەی دەیوەشێنێت، دەبم بەو لاقەی پێی دەڕوات، گەر داوای لێكردم پێی دەبەخشم، گەر پەنای پێگرتم پەنای دەدەم))، لە هەردوو سەحیحەكەدا لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ((كە خودا بەندەیەكی خۆشویست جبریل بانگ دەكات و دەفەرموێت: من فلانم خۆشدەوێت تۆش خۆشتبوێت، بۆیە جبریل خۆشیدەوێت، پاشان بە ئاسماندا بانگ دەكات: خودا فلان بەندەی خۆشدەوێت ئێوەش خۆشتانبوێت، ئەهلی ئاسمانیش خۆشیاندەوێت، پاشان قبوولی لە زەوی بۆ دادەمەزرێت)) لەسەر رقی خودا لە بەندەیەك پێچەوانەی ئەوە هاتووە.

لە دوو سەحیحەکەدا لە عائشەوە –خوا لێی رازی بێت– لە فەرموودەکەی ئەمیری ئەو سریەی کە (﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾)ی لە هەموو نوێژەکاندا بۆ هاوەڵانی دەخوێند و دەیوت: چونکە سیفەتی رەحمانە، من پێمخۆشە بیخوێنم، پێغەمبەر فەرمووی ((هەواڵی پێبدەن خودا ئەوی خۆشدەوێت))

لە "جامع الترمذي"دا لە فەرموودەکەی ئەبی دەردائەوە –خوا لێی رازی بێت– لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی ((لە دوعاکانی داوود(ﷺ): **اللهم إني اسألك حبك وحب من يحبك والعمل الذي يبلغني حبك، اللهم اجعل حبك احب إلي من نفسي و اهلي ومن الماء البارد**)) لە هەمان سەرچاوەدا لە فەرموودەکەی عەبدوڵای کوڕی یەزید الخطمي: پێغەمبەر(ﷺ) لە دوعاکانیدا دەیفەرموو ((**اللهم ارزقني حبك وحب من ينفعني حبه عندك، اللهم ما رزقتني مما أحب فاجعله قوة لي فيما تحب، وما زويت عني مما أحب فاجعله فراغا فيما تحب**))

قورئان و سوننەت پڕە لە باسکردنی ئەو بەندە باوەڕدارانەی خودا –سبحانه– خۆشیدەوێن، باسی خۆشویستنی کاروکردەوە و گوفتار و ئەخلاقی کردوون:

﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾﴾ آل عمران: ١٤٦

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾﴾ البقرة: ٢٢٢

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَـٰنٌ مَّرْصُوصٌ ﴿٤﴾﴾ الصف: ٤

﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٧٦﴾﴾ آل عمران: ٧٦

هەروەها دژی ئەوانە لەم کۆمەڵە ئایەتەدا:

﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ ﴿٢٠٥﴾﴾ البقرة: ٢٠٥

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿١٨﴾﴾ لقمان: ١٨

﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٥٧﴾﴾ آل عمران: ٥٧

﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٤٠﴾﴾ آل عمران: ١٤٠

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا ﴿٣٦﴾﴾ النساء: ٣٦

زۆر لە سوننەتدا هاتووە ((خۆشەویسترین کار بۆ لای خودا ئەوە و ئەوەیە)) هەروەها ((خودا ئەو کارە و ئەو کارەی خۆشدەوێت))، وەك ((خۆشەویسترین کار بۆ لای خودا: نوێژە لە سەرەتای کاتەکانیاندا، پاشان چاکە لەگەڵ دایك و باوك، پاشان جیهاد لە

پێناوی خودا)) هەروەها ((خۆشەویسترین کار بۆ لای خـودا: ئیمـان بـە خـودا، پاشـان جیهـاد لـە پێنـاوی خـودا، و ئـەوجا حـەجێکی مـەبرور)) هـەروەها ((خۆشەویسـترین کـاروکردەوەلای خـودا: ئەوەیـە کـە خاوەنەکـەی لەسـەری بـەردەوام بێـت)) هـەروەها ((خودا پێیخۆشە روخسەت لە کاروکردەوەکاندا دەستی بۆ ببرێت))

زۆرتـر و زۆرتـر لـەو شـێوەیە، خۆشـحاڵی مـەزنی خـودای موتـەعال بـە تەوبـەکردنی بەندەکـەی کـە گـەورەترین خۆشـحاڵییەکە بەنـدەکانی هـەیانبێت، ئـەوەش لـە خۆشەویستی خوداوەیە بۆ تەوبە و تەوبەکار.

گەر بابەتی خۆشەویستی بەتاڵ بکرێتەوە، ئەوا سەرجەم مـەقاماتی ئیمـان و ئیحسـان بەتاڵ دەکرێنەوە، ئەو کاتـە مەنزیلـەکانی رۆیشـتن بـۆ لای خـودا بـەتاڵ دەبوونـەوە، خۆشەویسـتی رۆحـی هـەموو مـەقام و مەنزیلـە و کردارێکـە، گـەر خـاڵی بـن لـە خۆشەویسـتی ئـەوا دەبـن بـە مردوویـەکی بـێ رۆح، نێـوانی خۆشەویسـتی لەگـەڵ کاروکردەوەکانـدا وەك نێـوانی ئـیخلاص وایـە لەگـەڵ کاروکردەوەکانـدا، بـەڵکو خۆشەویسـتی بریتییـە لـە حەقیقـەتی ئـیخلاص، بـەڵکو خـودی ئیسـلامە، چـونکە خۆشەویستی بریتییە لە تەسلیمبوون بە زەلیلی و خۆشەویستی و گوێڕایەڵی بۆ خودا، هـەر کـەس خۆشەویسـتی نـەبێت ئیسـلامی نابێـت، بـەڵکو خۆشەویسـتی بریتییـە لـە راستێتی شەهادەتی ((لا إله إلا الله))، "إله" ئەو کەسـەیە کـە بەنـدەکانی دەیکـەن بـە خودا لە خۆشەویستی و زەلیلی و تـرس و رجـا و بـە مـەزن زانـین و گوێڕایـەڵی بـۆی، "إله" بە مانای "مألوه" دێت کە کەسێکە دڵی بە خودا داوە، واتە خۆشیدەوێت و بۆی زەلیل دەبێت.

ژیری بڕیار دەدات بە پێویسـتبوونی پێشخسـتنی خۆشەویسـتی خـودا بەسـەر نـەفس و خانەوادە و ماڵ و دارایی و منداڵ و نەوەدا، بەڵکو بەسەر هەرچی شـتە جگـە لـە خـودا، هەر کەس ئەقڵی ئەم بڕیارەی پێ نەدات ئەوە بە سەلیم و تەندروسـتی مەزانـە، چـونکە ئەقڵ و فیترەت و شەریعەت و ئەزموون و تێڕامـان هـەر هـەموو بـانگ بـۆ خۆشەویسـتی خودای موتەعال دەکەن، بـەڵکو بـانگ بـۆ یەکتاپەرسـتی خۆشەویسـتی خـودا دەکـەن، پێغەمبەران هاتوون بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەوەی لە فیترەت و ئەقڵدایە. وەك وتراوە:

هب الرسل لم تأت من عنده — ولا أخبرت عن جمال الحبيب
أليس من الواجب المستحق — محبته في اللقا و المغيب
فمن لم يكن عقله آمرا — بذا ما له في الحجي من نصيب
وإن المعقول لتدعو إلى — محبة فاطرها من قريب
أليس على ذاك مجبولة — ومفطورة لا بكسب غريب
أليس الجمال حبيب القلوب — لذات الجمال وذات القلوب
فيا منكرا ذاك والله أن — ت عين الطريد و عين الحريب
ويا من يوجد محبوبه — ويرضيه في مشهد أو مغيب
حظيت وخابوا فلا تبتئس — بكيد العدو وهجر الرقيب

***

بنچینەی "التأله" بریتییە لە "التعبد" كە دوایین ئاستی خۆشەویستییە، دەوترێت: "عبده الحب وتيمه" گەر ببێت بە خاوەنی و زەلیل ببێت بۆ خۆشەویستەكەی.

بۆیە ((خۆشەویستی)) بریتییە لە حەقیقەتی بەندایەتی، ئایا گەڕانەوە بۆ لای خودا بەبێ خۆشەویستی و رازیبوون و حمد و شوكر و ترس و رەجا دێتە دی؟ ئایا ئارامگرتن چیترە جگە لە ئارامگرتنی خۆشەویستان؟ بەندەی خودا تەوەكول بە مەحبوبەكەی دەبەستێت بۆ جێبەجێ كردنی ئەو كاروبارانەی خودا خۆشی دەون و جێگەی رازامەندی ئەون.

هەر بەو جۆرە حەقیقەتی ((زوهد)): بریتییە لە شەرمی خۆشەویستان، سیفەتێكە لە نێوان خۆشەویستی و بە مەزن زانیندا لەدایك دەبێت، بەلام ئەوەی لە خۆشەویستییەوە نەبێت: بریتییە لە ترسی رووت.

هەر بەو جۆرە مەقامی ((هەژاری)) لە حەقیقەتدا بریتییە لە هەژاری رۆح بۆ لای مەحبووبەكەی، ئەوەش بالاترین جۆری هەژارییە، هیچ هەژارییەك نییە تەواوتربێت لە هەژاری دڵ بۆ لای ئەو كەسەی خۆشیدەوێت، بە تایبەت گەر بە خۆشەویستی تاك و تەنهای بكات، جگە لەو كەسێك یان شتێكی تر نەبێت تەنگ بە خۆشەویستی مەحبوبەكەی هەڵبچنێت، ئەمە بریتییە لە حەقیقەتی هەژاری لەلای عاریفان.

هەر بەو جۆرە ((دەوڵەمەندی)) كە بریتییە لە دەوڵەمەندبوونی دڵ بە بەدەستهێنانی خۆشەویستەكەی، بە هەمان شێوە شەوق و تامەزرۆبوون بۆ گەیشتن

بە خودا و لیقای ئەو-سبحانە- ئەوەش كرۆك و نهێنی خۆشەویستییە، وەك دواتر باسی لەبارەوە دەكەین.

نەرێكەر و پەكخەری ئەم بابەتە(واتە بابەتی خۆشەویستی) لە دڵدا: پەكخەر و نەرێكەری هەموو ئەوانەیە(هەموو ئەو سیفەتانەی بە خۆشەویستییەوە بەندن)، پەردەی دڵی ئەو كەسانە چڕترین پەردەیە، و دڵیان ڕەقترین دڵە، و دوورترین كەسن لە خوداوە، ئەوانە نەرێكەری خەلیلیی ئیبراهیم خەلیلن(ﷺ) لەگەڵ خودا، چونكە "خلة" بریتییە لە كەماڵی خۆشەویستی، ئەوانە وشەی "الخليل" بە "المحتاج"-ئاتاج لێكدەدەنەوە، خەلیلی خودا لەلای ئەوانە بریتییە لە كەسی ئاتاج، بەپێی قسەی ئەوانە بێت خودا زۆرێك لە خەلیلی موحتاجی چاك و خراپی هەیە، بەڵكو خەلیلی باوەڕدار و بێباوەڕ، كەسانێك كە هەموو ئاتاجییەكانیان بە گەورە و بچووكەوە لەبەر دەرگای خودا دادەنێن، نەفسیان خۆی بە ئاتاجترین شتێك بۆ لای خودا لە هەموو كاتێكدا دەبینێت.

نەرێكاران دانیان نەناوە بە "خلة"-كەماڵی خۆشەویستی و بەندایەتی و تەنانەت یەكتاپەرستی لە خوایەتیدا، هەروەها دانیان نەناوە بە حەقیقەتی ئیسلام و ئیمان و ئیحساندا، بۆ ئەو مەبەستە بوو خالیدی كوڕی عەبدوڵای قەسری سەرۆكی ئەوانە(جەعدی كوڕی درهەم)ی كرد بە قوربانی، لە ڕۆژی جەژنی قوربانددا لە دوای وتاری جەژن وتی: ((خەڵكینە، قوربانی بكەن، خودا قوربانییەكانتان لێ وەربگرێت، من جەعدی كوڕی درهەم دەكەم بە قوربانی، ئەو وا بانگەشە دەكات خوا ئیبراهیمی نەكردووە بە خەلیلی خۆی، و لەگەڵ موسادا ئاخافتنی نەكردووە، مەزنی و شكۆ بۆ خودای گەورە لەوەی جەعد دەیڵێت لەسەر خودا، پاشان دابەزی و سەریبڕی، موسڵمانان شوكری كارەكەیان كرد و خودا ڕەحمی پێكرد و لێی قبووڵ كرد))

### ❁ ئاستەكانی خۆشەویستی

<u>یەكەمین ئاستی:</u> ((پەیوەندی)) بە "پەیوەندی" ناونراوە بەهۆی وابەستەبوونی دڵ بە مەحبووبەوە.

<u>دووەم ئاستی:</u> بریتییە لە ((ویست))، ئەوەش بریتییە لە مەیلی دڵ بۆ لای خۆشەویستەكەی و داواكردنی.

**سـێیەم ئاسـتی:** داچـۆڕان و شـۆڕبوونەوە ((الصـبابة)) بریتییـە لـە داچـۆڕان و شۆڕبوونەوەی دڵ بۆ لای خودا، بەجۆرێك خاوەنەكەی هیچ لەدەستیدا نەبێت، وەك شـۆڕبوونەوەی ئـاو لـە شـوێنی لێـژەوە، نـاوی سـیفەتەكە بریتییـە لـە ((صـب)) فەرمانەكەشی بریتییە لە ((صبا إليه يصبو صبا و صبابة))، كەوابوو "الصبا" بریتییـە لـە بنچینەی مەیل، "الصبوة" لەسەرو مەیلەوەیە، "الصبابة" بریتییە لە مەیلی پێویست، و شۆڕبوونەوەی هەموو دڵ بەلایدا.

**چوارەم:** پێوەنووسان ((الغـرام)) بریتییـە لـە خۆشەویسـتی دانـەبڕاو بـۆ دڵ كـە لێـی جیانابێتـەوە، بـەڵكو پێیـەوە دەنووسـێت، وەك نووسـاندنی قـەرزار بـە قـەرزارەوە ﴿إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾﴾ الفرقان: ٦٥

**پێنجەم:** خۆشەویستی پاڵفتە(الـوداد) خۆشەویسـتی پـاك و پاڵفتـە و كـرۆك، نـاوی "الـودود" بریتییـە لـە یـەكێك لـە نـاوە جوانـەكانی خـودای موتـەعال، دوو قسـە لەسەری هەیە:

**یەكەمیان:** خودای موتەعال "مودود"ە، ئیمامی بوخاری –رەحمەتی خوای لێ بێـت– دەفەرموێت "الودود الحبيب".

**دووەم:** مانـای ئەوەیـە كـە خـودا "الـواد لعبـاده"خـاوەنی خۆشەویسـتی پاڵفتەیـە بـۆ بەنـدەكانی، واتـە خۆشـیانی دەوێـت، بـە نـاوی ((الغفـور)) بـەراوردكراوە، بـۆ زانـینی ئـەوەی كـە خـودا لـە گوناهـان خۆشـدەبێت، تەوبـەكاری خۆشـدەوێت و وددی خـۆی پێدەدات، بەشی تۆبەكار: بریتییە لە لە بەدەستهێنانی لێخۆشبوون لە خوداوە.

لەسەر قسەكەی یەكەم: ((الودود)) لە مانادا بریتییە لە نهێنی نزیكبوونەوەی ئـەو دوو ناوە لەیەكتر ((الودود الحبيب)) داواكردن و راكێشانی مەوەدەتی بەندەكانی بۆ ئـەو– سبحانه– و خۆشەویستیان بۆی بە ناوی ((الغفور))

**شەشەم:** شەغەف ((الشغف))، دەوترێت "شغف بكذا" كەوابوو ئـەو كەسـە "مشـغوف بـە" یـان "شـغفه المحبـوب" واتـە خۆشەویسـتییەكەی گەیشـتۆتە پـەردەی دڵـی، وەك ئافرەتـەكان بـە ژنەكـەی عـەزیزی مصـریان وت ﴿قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا﴾یوسـف: ٣٠، سـێ قسەی لەسەرە:

**یەكەم:** شەغەف ئـەو خۆشەویسـتییەیە كـە دەسـت بەسـەر دڵـدا دەگرێـت، بـەجۆرێك دابڕێت لـە خـەڵكانی تـر، كـەلبی دەفـەرموێت: خۆشەویسـتییەكەی بـە جۆرێـك دڵـی داپۆشیوە كە هەست بە كەسی تر ناكات.

دووەم: مانای خۆشەویستی بەدڵ گەیشتووی هەیە، خاوەنی ئەم قسەیە دەڵێت: خۆشیویست تا خۆشەویستییەکە گەیشتە دڵی، واتە چووە ناو دڵی.

سێیەم: بریتییە لە خۆشەویستییەك كە دەگاتە پەردەی دڵ، چونكە "الشغاف" بریتییە لە پەردەی دڵ، كە خۆشەویستی بگاتە دڵ دەچێتە ناو دڵەوە، سەدی دەفەرموێت: "الشغاف" پێستێكی نەرمە لەسەر دڵ، دەڵێت: خۆشەویستی چووە ناوی تا گەیشتە دڵ.

هەندێ لە پێشین بە "شعفها" دەیخوێننەوە، ماناكەی بەم جۆرەی لێ دێت: خۆشەویستی هەموو ڕێگەیەكی پێگرتۆتە بەر و گەیاندوویەتییە بالآترین ئاست، لەوانە"شعف الجبال" واتە لوتكەی چیاكە.

حەوتەم عیشق(العشق) كە بریتییە لە زیادەڕەوی لە خۆشەویستیدا كە هەڕەشە لە خاوەنەكەی دەكات بۆ تیاچوونی.

لە داتاشینی ئەو وشەیەدا دوو قسە هەیە:

یەكەمیان: لە وشەی "العشقة" وەرگیراوە كە بریتییە لە رووەكێكی زەرد خۆی دەپێچێت بە درەختدا، عاشق بەو رووەكە شوبهێنراوە.

دووەم: لە مانای "الإفراط" وەرگیراوە.

لەسەر ئەم دوو قسەیە: ئەم ناوە(عیشق) خودای پێ وەسف ناكرێت، هەروەها بەندەشی پێ وەسف ناكرێت لە خۆشەویستی پەروەردگاری.

هەشتەم: زەلیلی و بەندایەتی ((التتیم))، دەوترێت: "تیمه الحب" واتە زەلیلی كرد و كردی بە بەندە، "تیم الله" واتە بەندەی خودا(عبد الله)، لە نێوان ئەو وشە و وشەی "الیتم"–كە مانای تەنهاكەوتنەوەی هەیە– نزیكییەك لە مانادا هەیە، كەسی "المتیم" واتە بە خۆشەویستی و حەز و ئازاری خۆشەویستی تەنهاكەوتەوە، وەك تەنهاكەوتنەوەی منداڵی هەتیو بە دابڕان لە باوك و دایكی، هەردووكیان شكاو و زەلیلن، منداڵە هەتیوەكە "یتم" زەلیلی كرد و شكاندی، ئەویتریان "تتیم" شكاندی و زەلیلی كرد.

نۆیەم: مانای "التعبد"–پەرستنی هەیە، كە لەسەرو "التتیم"ەوەیە، بەندە ئەو كەسەیە كە كەسی مەحبوب كردوویەتی بە كۆیلەی خۆی، شتێك لە نەفسی بۆ خۆی نەماوەتەوە، بەڵكو هەموو بوونی بووە بە بەندە بۆ مەحبووبەكەی لە دەرەوە و لە ناوەوە، ئەمە حەقیقەتی بەندایەتییە، هەر كەس ئەوەی تەواوكرد ئەوا ئاستەكەی كامڵ كردووە.

كاتێك سەرداری ڕۆڵەكانی ئادەم ئەم ئاستەی كامڵ كرد: خودای موتەعال لە بالاترین مەقامدا وەسفی دەكات كە مەقامی "الإسراء"دا وەك ﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِ﴾ الإسراء: ١، هەروەها لە مەقامی بانگەوازدا﴿وَأَنَّهُ لَمَّا قَامَ عَبْدُ اللَّهِ يَدْعُوهُ﴾ الجن: ١٩، هەروەها لە مەقامی پێكوڵیدا﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا﴾ البقرة: ٢٣، بۆیە پێغەمبەر شایستە بوو پێشبخرێت بەسەر هەموو دروستكراوەكاندا لە دونیا و لە دوارۆژدا.

مەسیح(عليه السلام) هەر بەو جۆرەیان پێ دەفەرموێت كە داوای شفاعەتی لێ دەكەن-دوای كۆمەڵێك لە پێغەمبەران- ((بچن بۆ لای محمد، بەندەیەكە خودا لە گوناهی ئەوەڵ و ئاخری خۆشبووە))

گوێم لە شێخولئیسلام ئیبن تەیمیە بوو-قدس الله روحه- دەیفەرموو: ئەو مەرتەبە بۆ پێغەمبەر بەهۆی بەندایەتییەكەیەوە بووە بۆ خودا و كەماڵی لێخۆشبوونی خودا بۆ ئەو.

حەقیقەتی بەندایەتی: بریتییە لە خۆشەویستی تەواو لەگەڵ زەلیلی تەواو و گەردنكەچی تەواو بۆی، عەرەب دەڵێت ((طريق معبد))واتە ڕێگەیەكی تەخت كە پیادا ڕۆیشتن تەختی كردووە و ئاسانی كردووە بۆ پیا ڕۆیشتن.

دەیەم: مەرتەبەی خۆشەویستی پاڵفتە و پاك و بێگەرد(مرتبة الخلة) كە دوو خەلیلەكەی خودای پێی تەنها بووەتەوە-ئیبراهیم و محمد(عليهما الصلاة والسلام)- لە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ)ی سەحیحدا فەرموویەتی ((خودا منی كردووە بە خەلیل، وەك چۆن ئیبراهیمی كردووە بە خەلیل))

((الخلة)) بریتییە لە خۆشەویستی كە ڕۆیشتۆتە ناو ڕۆح و دڵی خۆشەویستەوە، تا شوێنێك لە دڵیدا نەمێنێتەوە خۆشەویست داگیری نەكردبێت.

ئەمە ئەو نهێنییەیە لە پێناویدا-خودا زاناترە- فەرمان بە خەلیل كرا كوڕەكەی سەرببڕێت، ئەو منداڵەی بەری دڵ و پارچەیەك لە جگەری بوو.

چونكە كاتێك داوای كوڕی لێ كرد خودا پێی بەخشی، بەشێك لە دڵی وابەستەی خۆشەویستی كوڕەكەی بوو، مەقامی"الخلة" پلە و پایەیەكە شەریكایەتی و دابەشبوون قبووڵ ناكات، خەلیل غیرەتی بۆ خەلیلەكەی بزوا، و ڕێگەی نەدا شوێنێك لە دڵیدا هەبێت جێگەی كەسی تری تێدا بێت، بۆیە فەرمانی پێكرد سەریببڕێت، تاكو ئەو تەكهەڵچنینە لە دڵیدا بسڕێتەوە، كە نەفسی ئیبراهیم گەیشتە بڕیاری تەواو لەو

كارەدا، و بە تەواوی لێبڕا ئەوەی خودا ویستی هاتە دی، بۆیە بەرژەوەندییەك نەما بۆ سەربڕینی كوڕەكەی، سەرئەنجام دەستی لە كارەكە گرت و بەرانێكی گەورەی بۆ ڕەوانە كرد تاكو لە جێگەی كوڕەكەی سەریببڕێت، پێی وترا﴿ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (٨٠) ﴾ الصافات: ٨٠، پاداشتی هەر كەسێك دەدەینەوە دەستپێشخەری گوێڕایەڵی ئێمە بكات، چاوی ئەو كەسەش ڕۆشن دەكەینەوە وەك چۆن چاوی تۆمان ڕۆشن كردەوە بە هێڵانەوەی كوڕەكەی و ڕزگاركردنی﴿ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ الْبَلَاءُ الْمُبِينُ (١٠٦) ﴾ الصافات: ١٠٦، ئەوە بریتییە لە تاقیكردنەوەی مەحبوب بۆ خۆشەویستەكەی، تاقیكردنەوەی تاكو ڕەزامەندی ئەو هەڵببژێرێت، ئەو كاتە نیعمەتی خۆی بەسەردا تەواو دەكات، ئەو كارە تاقیكردنەوەی "محنة" و "منحة" بوو لە یەك كاتدا.

ئەم بانگەوازە خەڵكە تایبەتەكانی خودا و ئەهلی ژیری و بینینی ڕۆشن دەچن بەدەم بانگەكەیەوە، هەموو كەسێك ناتوانن وەڵامی بدەنەوە، و هەموو چاوێك پێی ڕۆشن نابێتەوە.

فما كل عين بالحبيب قريرة ... ولا كل من نودي يجيب المناديا
ومن لا يجب الداعي هداك فخله ... يجب كل من أضحى إلى الغي داعيا
وقل للعيون الرمد: إياك أن ترى ... سنا الشمس فاستغشي ظلام اللياليا
وسامح نفوسا لم يهبها لحبهم ... ودعها وما اختارت ولا تك جافيا
وقل للذي غاب: يكفي عقوبة ... مغيبك عن ذا الشأن لو كنت داعيا
ألم تر آثار القطيعة قد بدت ... على حاله، فارحمه إن كنت رائيا
فكن أبدا حيث استقلت ركائب ال ... محبة في ظهر العزائم ساريا
وأدلج ولا تخش الظلام فإنه ... سيكفيك وجه الحب في الليل هاديا

## ۞ خۆشەویستییەكی....هورەوییانە

بۆ ئەو مەبەستە شێخولئیسلام ئەبی ئیسماعیل هوروی-ڕەحمەتی خوای لێ بێت- ڕێگەیەكی تری هەیە بۆ پێناسەی خۆشەویستی، دەفەرموێ ((خۆشەویستی: وابەستەبوونی دڵە لە نێوان هیممەت و هۆگریدا (المحبة تعلق القلب بين الهمة والأنس))).

ئەمەش واتە: وابەستەبوونی دڵ بە مەحبووبەوە بە وابەستەبوونێك کە هاوڕێیە لەگەڵ هیممەتی کەسی موحیب و هۆگربوونی بە مەحبووبەوە، لە هەردوو حاڵەتی بەخشین و لێگرتنەوەدا(البذل والمنع)، تەنهاکردنەوەی خودا بەو وابەستەبوونە(إفراده بذالك التعلق)، بەجۆرێك بۆ هیچ کەسێکی تر بەشی لەو وابەستەبوونەدا تیانەبێت.

ئاماژەی بەوەدا کە خۆشەویستی ((لەنێوان هیممەت و هۆگربووندایە)) لەبەر ئەوەی خۆشەویستی کۆتایی لوتکەی پێداگریی داوایە(نهایة شدة الطلب) و کەسی خۆشەویست(المحب) رەغبەت و داوای زۆر زۆرە: بۆیە هیممەت لە راستکەرەوەکانی خۆشەویستی ئەوە و کۆی سیفەتەکانییەتی، لەبەر ئەوەی هەندێ جار داوا بە هیممەتەوە رووتدەبێتەوە لە هۆگری، هەمیشە خۆشەویست هۆگری جوانیی مەحبووبەکەیەتی، و چاویبڕیوەتە گەیشتن بە دیداری، لەم دووانەوە هۆگربوون لەدایك دەبێت، خۆشەویست دەبێت هۆگریی سیفەتی بێت، بۆیە خۆشەویستی لە نێوان هیممەت و هۆگریدا راوەستاو دەبێت.

بە خۆشەویستی خەیاڵی کەسی خۆشەویست لە وابەستەبوون بە غەیری خوداوە فانی دەبێت، یەکەمین شتێك لە کەسی خۆشەویست فەنا دەکات: بریتییە لەو خاتیرانەی کە وابەدەستە دەبێت بە هەرچی شتێکەوە جگە لە مەحبووبەکەی، چونکە کە هەموو دڵی راکێشرا بۆ لای مەحبووبەکەی خاتیرەکانیشی بە ناچاری بەدوایدا دەڕۆن.

## ✿ بیبەستەرەوە.... و دەست بە خۆشەویستی بکە

سەرەتاکانی خۆشەویستی لای شێخی هەرەوی بریتییە لە ((خۆشەویستییەك کە وەسوەسە ناهێڵێت، لە مەینەتییەکاندا دڵنەوایی خاوەنەکەی دەداتەوە)).

وەسوەسە و خۆشەویستی دژ بە یەکن، چونکە خۆشەویستی زاڵبوونی یادی مەحبووب بەسەر دڵدا پێویست دەکات، وەسوەسە ئەو یادە لە دڵدا بزر دەکات، تا وای لێ دێت یادی کەسی تر بەسەریدا زاڵ دەبێت، لەنێوان خۆشەویستی و وەسوەسەدا دژایەتییەکی زۆر توند هەیە، وەك لە نێوان یادی خودا و بێئاگاییدا، لێبڕانی خۆشەویستی: نەرێی ئەوە دەکات دڵ لەنێوان مەحبووب و کەسانی تردا دڵەڕاوکێی

هەبێت، ئەوە هۆی وەسوەسەیە، زۆر دوورە کەسی خۆشەویستی صادق بۆشاییەك بۆ کەسانی تر لەناو دڵیدا ببینێتەوە، بەهۆی نغرۆبوونی دڵی لە ئامادەبوون لەبەر دەستی مەحبووبەکەیدا، وەسواس تەنها بۆ ئەهلی بێئاگایی و ئەوانەیە کە پشتیان لە خودا کردووە، ئیتر دەبێت لە کوێوە خۆشەویستی وەسوەسە لەگەڵ یەکتر کۆببنەوە؟

لا كان من لي سواك فيه بقية فيها يقسم فيكره و يوسوس

هەر بەو جۆرە کەسی خۆشەویست لە چێژی خۆشەویستیدا مەینەتییەکانی لەبیردەچێتەوە، لە تووشبوونیدا ئەو ئازارە ناچێژێت کە خەڵکانی تر دەیچێژن، تا وای لێ دێت وەك ئەوەی سروشتێکی تری هەبێت جیا لە سروشتی خەڵکی، بەڵکو دەسەڵاتی خۆشەویستی بەهێز دەبێت، تا کەسی خۆشەویست چێژ لە زۆرێك لە مەینەتییەکان وەردەگرێت کە خۆشەویستەکەی بۆی رەوانە دەکات، چێژێکی مەزنتر لە چێژبینینی ئەوانەی تەنها دەکەونەوە بە بەش و حەز و ئارەزووی خۆیان.

ئەو جۆرە خۆشەویستییە خۆشەویستییەکە لە خوێندنەوە و بینینی منەتی خوداوە سەوز دەبێت و بە شوێنکەوتنی سوننەت جێگیر دەبێت.

واتە ئەو خۆشەویستییە بە بینینی منەتی خودا و نیعمەتی دەرەوە و ناوەوە سەوز دەبێت، بە ئەندازەی خوێندنەوەی ئەوانە هێزی خۆشەویستی گەورە دەبێت، دڵ راهاتووە لەسەر خۆشەویستی ئەو کەسانەی کە چاکەی لەگەڵ دەکەن، و رقی ئەوانەی خراپەی لەگەڵ دەکەن، بەندە هیچ چاکەیەکی نییە لە خوداوە نەبێت، هیچ خراپەیەکیشی نییە لە شەیتانەوە نەبێت.

لە مەزنترین خوێندنەوەی منەتی خودا لەسەر بەندەکەی: ئامادەکردن و شایستەکردنییەتی بە خۆشەویستی خۆی و ناسینی خۆی، هەروەها ویستی رووی پاکی خودا و شوێنکەوتنی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی(ﷺ)، بنچینەی ئەمە: نوورێکە خودا هەڵیدەداتە ناو دڵی بەندەکەیەوە، گەر ئەو نوورە لەناو دڵ و ناخی بەندەکەدا هەڵسووڕا: ناخ و ناوەوەی نوورانی دەکات، نەفسی خۆی لەناو ئەو نوورەدا دەبینێتەوە، هەروەها ئەوەی شایستەی کراوە لە کەمالات و سیفەتی پاك و جوان، بەوەش هیممەتی بەرز دەبێتەوە، و لێبڕانی بەهێز دەبێت، و تاریکاییەکانی نەفس و سروشتی دەڕەوێنەوە، چونکە نوور و تاریکی کۆنابنەوە، لە هەر جێگەیەك

ڕووبەڕووی یەکتر بوونـەوە یـەکێکیان ئـەویتریان دەسـڕێتەوە، ڕۆح بەرزدەبێتـەوە بـۆ نێوان هەیبەت و هۆگری بۆ خۆشەویستی یەکەمجار.

نقل فؤدك حيث شئت من الهوى ... ما الحب إلا للحبيب الأول

كم منزل في الأرض يألفه الفتى ... و حنينه أبدا لأول منزل

ئەو نووره وەك خۆر وایه له دڵی نزیكانی پێشڕەواندا (المقربين السـابقين)، و وەك مـانگی چوارده وایه له دڵی ئەبرار و "أصحاب اليمين"دا، وەك ئەستێره وایه له دڵی باوەڕدارانـدا به گشتی، جیاوازی نێوانیان وەك جیاوازی هەسارەی زوهره و ئەستێرەی سوها وایه.

ڕیشەداربوونی ئەم خۆشەویستییه و جێگیربوونی له دڵدا به شـوێنكەوتنی پێغەمبـەر(ﷺ) دەبێـت لـه هـەموو كاروكردەوەكـان و قسـه و گوفتـار و ئەخلاقیـدا، بـه ئەنـدازەی ئـەو شوێنكەوتنه خۆشەویستی و جێگیربوونی خۆشەویستی و هێز و پێزی سەرهەڵدەدات، بـه ئەندازەی ناتەواوییەكەی ناتەواو دەبێت، وەك پێشتر باسمان كرد: ئـەم شـوێنكەوتنه لـه یـەك كاتـدا خۆشەویسـتی و خۆشەویسـتبوون دەسـتەبەر دەكـات، بـەو دوانەشـەوه خۆشەویستی تێر و تەواوه، كارەكه ئەوه نییه تۆ خودات خۆشبوێت بەڵكو ئەوەیه خـودا تۆی خۆشبوێت، خوداش كاتێك تۆی خۆشدەوێت له دەرەوه و ناوەوه شوێنی پێغەمبەره خۆشەویستەكەی(ﷺ) بكەویت، هەواڵەكانی بەڕاست بزانیت، گوێڕایەڵی ئەمرەكانی ببیت، بچیت بەدەم بانگەوازەكەیەوه، به ویستی خۆت ئەو هەڵبژێریت، به حـوكمی ئـەو بێئاگا ببیت له حوكمی كەسانی تر، به خۆشەویستی ئەو بێئاگا ببیت له خۆشەویستی كەسـانی تر، گەر بەو جۆره نیت خۆت ماندوو مەكه له كوێوه هـاتووی بگـەڕێوه بـۆ ئـەو شـوێنه و لەوێ داوای نوور بكه، تۆ لەسەر هیچ شتێك نیت.

سەرنجی فـەرموودەی خـودای موتـەعال بـده ﴿فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ﴾ آل عمـران: ٣١، واته كارەكه ئەوەیه خودا ئێوەی خۆشبوێت نەك ئێوه خوداتان خۆشـبوێت، ئـەوەش تەنها به شوێنكەوتنی خۆشەویست(ﷺ) بەدەست دێت.

خۆشەویستی سەردەكەوێت تا دەگاته ئەوەی حەق–سـبحانه– بەسـەر هەرچـی شـتی تردا هەڵبژێریت، زمان هەمیشه بـه یـادی ئـەوەوه پاراوبێـت، خۆشەویسـتی–بـەهۆی كەماڵ و هێزییەوه– داوا له كەسی خۆشەویست دەكـات دەسـتبەرداری هەرچـی شـته

ببێت جگە لە مەحبووب، ئەو هەڵببژێرێت بەسەر شتەكانی تردا، كەسی تر بەسەر مەحبوویدا هەڵنەبژێرێت، زمان بە یادی تەڕ و پاراو بێت، هەر كەس شتێكی خۆشویست زۆر ناوی دەهێنێت، تا وای لێ دێت وەك ئەوەی هیچ كەسی تر و هیچ شتێكی تر نەبینێت.

ئەم جۆرە خۆشەویستییە لە خوێندنەوەی سیفاتەوە(سیفەتەكانی خودای موتەعال) دەردەكەوێت، یەكەمجار بە جێگیركردنیان، دووەمجار بە ناسینیان و سێیەم: نەرێكردنی تەحریف و پەكخستن لە دەقەكانیان، چوارەم: نەرێكردنی لێكچوون و چۆنێتی لە ماناكانیان، خوێندنەوەی سیفەتەكان كە زیندووكەرەوەی خۆشەویستی دروستن تەنها بەو چوار خاڵە دروست و دەستەبەر دەبێت، هەتا دڵ زۆرتر خوێندنەوە بۆ ئەو سیفەتانە بكات و ماناكانیان بزانێت: خۆشەویستی بۆ خودا كە وەسفكراوە بەو سیفەتانە زۆرتر دەبێت.

خۆشەویستی سەردەكەوێت بە وردبوونەوە لە ئایات: وردبوونەوەیەكی بیرئامێز و پەندوەرگر لە ئایەتە بینراوەكان و ئایەتە بیستراوەكان، هەر یەك لەو دوانە بانگكەرێكی بەهێزن بۆ خۆشەویستی خودای موتەعال، چونكە بەڵگەن لەسەر سیفاتی كەماڵ و جەلالی خودا و یەكتایی لە پەروەردگاریی و خوایەتییدا، هەروەها بەڵگەن لەسەر حیكمەت و چاكە و لێبووردن و حیلمی ئەو-**سبحانه**-، هەر بەو جۆرە وەرزش بە مەقامەكان: هەر كەس وەرزش و مەلەكەی لە مەقامەكانی ئیسلام و ئیماندا هەبوو خۆشەویستییەكەی بەهێزتر دەبێت، چونكە خۆشەویستی خودا بۆ ئەو تەواوترە، كاتێك خودا بەندەیەكی خۆشویست خۆشەویستی خۆی لە دڵیدا دروست دەكات.

ئەم برە لە مانا ئەو برە رێگەپێدراوەیە كە دەربڕین لە ئامێزی دەگرێت، ئەگینا وەسفی خۆشەویستی كۆتایی پێنایەت، چونكە لە هەر مەقامێك لە مەقامەكاندا بەراورد و وابەستەبوونی بۆ هەیە، خۆشەویستی رۆحی هەرچی مەقامە، و هەڵگری مەقامەكەیە، هەنگاوەكانی سالیكان بە خۆشەویستی دەجوڵێن، وابەستەبوونی بە هەموو هەنگاو و حاڵ و مەقامێكەوە هەیە، بۆیە وەسفەكانی هەرگیز تەواو نابێت.

## ۞ شەوق و تامەزرۆبوون بەری خۆشەویستییە

لە ئاسەوارەکانی خۆشەویستی بریتییە لە شەوق.

خـــودای موتـــەعال دەفـــەرموێت ﴿ مَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَأٓتٍۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ۝٥ ﴾ العنكبوت: ٥

وتراوە: ئەم ئایەتە سەرەخۆشی موشتاقان دەکات، و دڵنەواییان دەداتەوە، واتـە مـن دەزانم ئەو کەسەی رجای لیقای من دەکات ئەو کەسێکی تامـەزرۆ و موشـتاقە بـۆ لای من، منیش کاتێکی نزیکم بۆ ئـەو بەیەکگەیشـتنە دانـاوە، ئـەو کاتـە دیـاریکراوە هـەر دێت، هەموو هاتوویەکیش نزیکە.

لەتیفەیەکی تری تێدایە خۆبەستنەوەی موشتاقان بە رجای لیقاوە.

لولا التعلل بالرجاء لقطعت ... بنفس المحب صبابة وتشوقا
ولقد يكاد يذوب منه قلبه ... مما يقاسي حسرة وتحرقا
حتى إذا روح الرجاء أصابه ... سكن الحريق إذا تعلل باللقا

پێغەمبەر(ﷺ) لە دوعاکانیدا دەیفەرموو ((داوای چێژی سەیرکردنی رووی تـۆ دەکـەم، داوای شەوقی لیقای تۆ دەکەم))

شەوق ئاسەوارێکە لە ئاسەواری خۆشەویستی، حوکمێکە لە ئەحکامەکانی، بریتییە لە سەفەری دڵ لە هەموو بارێکدا.

وتراوە: شەوق بریتییە لە هەڵچوونی دڵ بۆ لیقای مەحبووب.

((خۆشەویسـتی)) بـەرزترە لـە شـەوق، چـونکە شـەوق لـە خۆشەویسـتییەوە لـەدایك دەبێـت، بـە ئەنـدازەی خۆشەویسـتی و لەگـەڵ خۆشەویسـتیدا بـەهێزدەبێت و لاواز دەبێت، یەحیای کوڕی مـەعاز دەفـەرموێت: نیشـانەی شـەوق بریتییـە لـە گرتنـەوەی ئەندامەکان لە حەز و ئارەزوو.

## ۞ شەوق بۆ بەهەشت.......راستییە

یەکەمین مانای شەوق لای شێخی هەروی بریتییە لـە: ((شـەوقی عابیـد بـۆ بەهەشـت، بۆئەوەی کەسی ترساو ئارام بکاتەوە، و کەسی حەزین دڵخۆش بکـات، و خۆزگـەدار و خاوەن ئاواتەکان بە مەرامی خۆیان بگەیەنێت))

واتە شەوقی عابید بۆ بەهەشت ئەم سێ حوکمەی تێدایە:

یەکەم: بەدەستهێنانی ئارامی و ئاسایشتێك کە هیوا و ئاوات دەڕوێنێتەوە، ترس بەبێ ئارامی و ئاسایش لە هەموو روویەکەوە خاوەنەکەی هان نادات بۆ کاروکردەوەی چاکە گەر هیوا سەرهەڵنەدات و هاورێیەتی نەکات، بۆیە خۆ دوورخستنەوە لە هیوا و خۆزگە مرۆڤ هیوابڕاو دەکات و دەبێت بە کەسێکی رەشبین و دەستەئەژنۆ.

دووەم، دڵخۆشی کەسی حەزین: حوزن بە تەنها گەر دڵخۆشی لەگەڵ نەبێت خاوەنەکەی دەکوژێت، گەر رۆحی دڵخۆشی نەبوایە هێزی حوزن پەکی دەخست و تووشی شەلەل و دانیشتنی دەکرد، گەر حوزن کەسەکە بێ پەلەپۆ بکات و داینیشێنێت، ئەوا رۆحی دڵخۆشبوون گیانێکی بە بەردا دەکاتەوە و دەیخاتەوە سەر پێی خۆی.

سێیەم: رۆحی زەفەرپێبردن: کەسی هیواخواز گەر رۆحی زەفەربردن هاوەڵی نەکات هیوا و خۆزگەکانی دەمرن، خودا زاناترە.

## ۞ هەڵهاتن بۆ لای خودا

لە جۆرەکانی شەوق: شەوق بۆ لای خودا-عزوجل- و وابەستەبوونی دڵ بە سیفاتە پیرۆزەکانییەوە.

ئەم شەوقە نەرێی شەوق بۆ بەهەشت ناکات، چونکە خۆشترین نیعمەتی بەهەشت نزیکییە لە خوداوە و بینینی رووی پاکی و گوێگرتن لە کەلامی و ژیان لەژێر باڵی رازیبوونیدا.

بەڵێ شەوق بەتەنها بۆ خواردن و خواردنەوە و حۆرلعەین ناتەواوە بەراورد بە شەوقی خۆشەویستان بۆ لای خودای موتەعال و شەوق بۆ لای سیفەتە تایبەتمەندەکانی بە منەت و ئیحسانەوە، وەك "البر، المنان، المحسن، الجواد، المعطي، الغفور، الوهاب، اللطيف"هاوشێوەکانیان.

## (٥١) (منزلة الغيرة)

# مەزنزیلەی غیرەت

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی غیرەتە.

خـودای موتــەعال دەفــەرموێت ﴿ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ﴾ الأعـراف: ٣٣، لە فەرموودەیەكی سەحیحدا لە "أبي الأحوص" ئەویش لە ئیبن مەسعودەوە -خوا لێی رازی بێت- دەفەرموێت پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: ((هـیچ كـەس لـە خـودا بەغیرەتتر نییە: فەواحشی دەرەوە و ناوەوەی حەرام كردووە، هیچ كـەس بـە قـەدەر خودا مەدح و سەنای پێخۆش نییە، بۆیە لەو پێنـاوەدا: خـۆی مـەدح و سـەنای خـۆی كردووە، هیچ كەس بە قەدەر خودا عوزرهێنانـەوەی لا خۆشەویسـت نییـە، بۆیـە لـەو پێناوەدا: پێغەمبەرانی وەك مژدەدەر و ترسێنەر رەوانە كردووە))

هەروەها لە فەرموودەیەكی سەحیحی تردا، لە ئەبی سەلەمەوە لە ئەبی هـورەیرەوە- خوا لێی رازی بێت- پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی ((خـودا غـیرەت دەكـات، بـاوەڕداریش غیرەت دەكات، غیرەتی خودا: ئەوەیە كە بەندەكەی روو لەو كاروكردەوانە بكـات كـە حەرامی كردووە)).

هەر لە فەرموودەی سەحیحدا: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ((لە غیرەتـی سـەعد سـەرتان سوڕدەمێنێت؟ من لەو بەغیرەت ترم، خوداش لە من بەغیرەتترە))

هەروەها ئەوەی دەچێتە نـاو باسـی غیرەتـەوە ئایـەتی﴿ وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا ﴿٤٥﴾ ﴾ الإسراء: ٤٥

"السري" بـە هاوەڵـەكانی خـۆی فـەرموو: دەزانـن ئـەو حیجابـە -كـە لـە ئایەتەكـەدا ئاماژەی پێدراوە- چییە؟ بریتییە لە حیجابی غیرەت، هیچ كەس لە خـودا بـەغیرەتتر نییە، خودای موتەعال غیرەتی رێگەی نەداوە بێباوەڕان لە كەلامەكەی تێبگـەن، هـەر بەو جۆرە رێگـەی نـەداوە بـبن بـە ئـەهلی مەعریفـە و یەكتاپەرسـتی و خۆشەویسـتی خودا، بۆیە پەردەیەكی ئەستووری خستۆتە نێوان چاوانی ئـەوان و پێغەمبەرەكـەی و كەلامەكـەی و یەكتاپەرسـتییەوە، ئەمـەش وەك غیرەتێـك تـاكو ئەوانـەی ئـەهل نـین بەدەستی نەهێنن.

غیرەت دوو جۆرە: غیرەت لە شت و غیرەت لەسەر شت.

غـیرەت لـە شـت: بریتییـە لـە پێناخۆشـبوونی خـودای موتـەعال لـە هاوبـەش بـۆ پەیداكردنی و ململانێ كردن و تەنگپێهەڵچنینی مەحبووبەكـەت (واتـە لـە بەندایـەتی و خۆشەویستییەكەت بەشی كەسی تر بدەیت)

غیرەت لەسەر شت: بریتییـە لـە هـەوڵی زۆرت بـۆ مەحبووبەكـەت تـاكو خـەڵكانی تـر بەدەستی نەهێنن، یان نەبن بە هاوبەش لەگەڵت.

دیسان غیرەت دوو جۆری تری هەیە: غیرەتـی بەنـدە لـە خـۆی بـۆ سـەر خـۆی، وەك غیرەتی نەفسی لەسەر دڵی، هەروەها غیرەتـی پشـتهەڵكردنی لـە رووكردنـە خودایـدا، هەر بەو جۆرە غیرەتی سـیفاتی ناپەسـەندی لـە سـیفاتی پەسـەندی، ئـەم جـۆرە لـە غیرەت تایبەتمەندی نەفسێكی خاوێنی باڵایە، نەفسی نزم و رسوا بەشـی لـەم كـارەدا نییە، بە ئەنـدازەی بـەرز و بڵنـدی نـەفس و گـەورەیی هیممـەتی كەسـەكە غیرەتەكـە سەرهەڵدەدات و زیاد دەكات.

پاشان غیرەت دوو جۆری تری هەیە: غیرەتی خـودای موتـەعال لەسـەر بەندەكـەی، و غیرەتـی بەنـدە بـۆ پـەروەردگاری، نـەك لەسـەر پـەروەردگاری (چـونكە پـەروەردگار پەروەردگاری هەمووانە، نەك تەنها پەروەردگاری ئـەو)، غیرەتـی پـەروەردگار لەسـەر بەندەكەی: ئەوەیە كە خودا بەندەكەی نەكات بە بەندەی هیچ كەسێك، بـەڵكو تـەنها بەندەی خۆی بێت، لەو بەندایەتییەدا كۆمەڵێك شەریكی ناتەبا لەگـەڵ یـەكتر بوونیـان نەبێت، بەڵكو بـۆ نەفسـی خـۆی تـەنهایی بكاتـەوە، و بەشـی كەسـی لێنـەدات، ئەمـە باڵاترین غیرەتی ئەو دوو غیرەتەیە.

غیرەتـی بەنـدە بـۆ پـەروەردگاری دیسـان دوو جـۆرە: غیرەتێـك لـە نەفسـی خـۆی و غیرەتێك لە كەسانی تر، ئەوەی نەفسی خۆی: ئەوەیە كـە شـتێك لـە كـار و گوفتـار و كات و هەناسەی بۆ غەیری پەروەردگاری نەبێت، غیرەت لە كەسـانی تـر: توورەببێـت بۆ سنورەكانی خـودا گـەر دەسـتدرێژیكارێك دەسـتدرێژییان كـردە سـەری، هـەروەها غیرەت بۆ حەقی خودا گەر بێڕێزی پێكرا و پێشێلكرا.

هەر هەموو ئیسلام هاندانـە بـۆ گرسـەندی ئـەم غیرەتـە و ئینكـاری مونكـەر، بـۆ ئـەو مەبەستە پێغەمبەران رەوانەكراون و كتێبەكان دابەزێنراون.

هەر کەس لە حاڵی پێغەمبەران و ئوممەتەکانیان رابمێنێت: دەبینێت هەستاون بە ئینکاری مونکەر بە باشترین و دروستترین شێوە لەو رۆژەوە رەوانەکراون تا ئەو رۆژەی بە لیقای خودا گەیشتوون، وەسێتیان کردووە بۆ ئەوانەی دوای خۆیان هەروەکو ئەوان ئینکاری مونکەر بکەن، پێغەمبەر(ﷺ) رایگەیاندووە هەر کەس یەکێك لەو سێ مەقامەی ئینکاری مونکەری تێدا نەبێت(دەست، زمان، دڵ) ئەوا بەقەدەر دەنکە رەشکەیەك ئیمان لە دڵیدا نییە، زۆرترین پێداگری کردووە لەسەر ئەمر بە مەعروف و نەهی لە مونکەر، تا دەفەرموێت ((گەر خەڵکی واز لە ئەمر بە مەعروف و نەهی لە مونکەر بهێنن نزیکە خودا هەرهەموویان بە سزایەك دابگرێتەوە))

هەروەها رایگەیاندووە: وازهێنان لە ئەمر بە مەعروف و نەهی لە مونکەر وادەکات دوعای پیاوچاکان قبوولْ نەبێت و خراپەکاران دەسەڵات بگرنە دەست.

هەروەها رایگەیاندووە: کە وازلێهێنان لە ئەمر بە مەعروف و نەهی لە مونکەر جیاوازی نێوان دڵ و رواڵەت دروست دەکات(واتە نیفاق دروست دەکات)، نەفرەتی خودا دادەبارێنێت، وەك چۆن خودا نەفرەتی خۆی بەسەر بەنی ئیسرائیلدا باراند بەهۆی وازهێنانیان لە ئەمر بە چاکە و نەهی لە مونکەر))

## ۞ غیرەتی پیاگەیشتن

یەکەمین پلەی بریتییە لە: ((غیرەتی عابید لەسەر لەدەستچوویەك، دەیەوێت لەدەستچووەکە بیگێڕێتەوە(یسترد ضياعه)، بە تیاچوونیدا بگات(یستدرك فواته) و بە هێزی خۆیدا بگات(يتدارك قواه)))

عابید: ئەو کەسەیە-بەپێی زانستی بەسوود- کاروکردەوەی چاکە ئەنجام دەدات، غیرەتی بۆ ئەو کاروکردەوە چاکانە هەیە کە لەدەستی چووە، ئەو لەدەستچووەکان بە هاوشێوەی ئەوانە دەگێڕێتەوە، بۆ نموونە لەدەستچوونی ئەوراد و نەوافل و کارە باشەکانی تر بە ئەنجامدانی هاوشێوەکانی ئەوانە باربوو دەکاتەوە، جا لە رەگەزی ئەوانە بن کە لەدەستی چوون، یان کارێکی چاکەی تر(بۆ نموونە خوێندنی ئەورادی لەدەستچووە بە خوێندنی ئەورادی تر یان بە خێر و صەدەقە کردن بەدەستیان دەهێنێتەوە)، ئەوەی قەزا بکرێتەوە قەزای دەکاتەوە ئەوەش بە شتێکی تر باربوو بکرێتەوە باربووی دەکاتەوە، چەند بتوانێت جەبری ئەو لەدەستچووەی خۆی دەکاتەوە.

**جیاوازی لە نێوان (إسترداد الضائع)–بەدەستهێنانەوەی تیاچوو، و (إستدراك الفائت)– پیاگەیشتنی لەدەستچوو:** یەکەمیان لەوانەیە بتوانی خودی شتەکە بەدەست بهێنیتەوە، وەك ئەوەی کەسێك لە ساڵێکدا حەجی لەدەست دەچێت و ساڵی ئاییندە حەجەکەی دەکات، تیاچوونی لەو ساڵەدا بە ساڵی ئاییندە بەدەستهێنرایەوە، هەر بەو جۆرە ئەگەر کاتی زەکات لە کاتی دیاریکراو و واجبی خۆی دوابخات لەدوای ئەو کاتە زەکاتەکەی دەدات، و هاوشێوەی ئەمانە.

**ئەوەی دووەمیان (إستدراك الفائت):** ئەوەیە کە بە هاوشێوەی ئەو کردارە باربووی کارە لەدەستچووەکە بکاتەوە، وەك قەزاکردنەوەی واجبێك کە لە کاتی خۆیدا ئەنجام نەدراوە، یان بە تەوبەکردن و پەشیمانی باربوو بکرێتەوە.

**ئەوەش کە فەرمووی(یتدارك قواه) کە رەگەزی سێیەم بوو:** ئەوەیە کە هێزی خۆی لە کاروکردەوەی چاکەدا بەکاربهێنێت بەرلەوەی لاوازی رووی تێبکات و نەتوانێت ئەو کارە چاکانە ئەنجام بدات، ئەو غیرەتی بۆ هێز و توانای خۆی هەیە، هەروەها فریای هێزی ئەو کاروکردەوانە دەکەوێت کە ساردبوونەوە و خاوبوونەوە رووی تێکردوون بەوەی پۆشاکی هێز و چالاکی بکات بە بەریاندا بەهۆی ئەو غیرەتەی کە هەیەتی لەسەریان.

ئەمە بریتییە لە غیرەتی عابیدان بەرانبەر کاروکردەوە چاکەکانیان..خودا زاناترە.

### ۞ خاڵیبوونی دڵ...... بەتاڵیی دەکوژێت

هەروەها لەو غیرەتانە: ((غیرەت بۆ کاتێك کە لەدەستچووە، چونکە ناتوانی خۆت لە کات لابدەی و بەهێواشی دەگەڕێتەوە))، کات بەنرخترین شتە بۆ عابید، غیرەتی هەیە بەرانبەری و نایەوێت هەروا بەفیڕۆ بڕوات، گەر کاتێکی لەدەستچوو ناتوانێت جارێکی تر بەدەستی بهێنێتەوە، چونکە کاتی دووەم بەدوایدا هاتووە و شایستەیە بە واجبی تایبەت بەخۆی(واتە کاتی دووەمیش کاری تایبەت بەخۆی هەیە تیایدا ئەنجام بدرێت) گەر کاتێك لەدەستچوو رێگەیەك نییە بۆ بەدەستهێنانەوەی، وەك لە "مەسنەد"دا فەرموودەیەکی بەرزکراوە هاتووە ((هەر کەس رۆژێك لە رەمەزان بەمەبەستەوە و بە بێ عوزر بشکێنێت، رۆژووی هەموو ژیان قەزای ناکاتەوە با تیایدا بەرۆژووش بێت))، کات بۆخۆی گوزەر دەکات و بۆخۆیپشتهەڵدەکات، هەر کەس لەخۆی بێئاگابێت کاتەکانی دەڕۆن و لەدەستچووەکانی زۆر دەبن، و پەشیمانییەکەی مەزن دەبن،

دەبێ حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت کاتێك بڕی گەورەیی لەدەستچووەکانی خۆی دەزانێت و، داوای گەڕانەوەیان دەکات و دەیەوێ لەدەستچووەکان بارببوو بکاتەوە، بەڵام ڕێگەی پێ نادرێت بگەڕێتەوە، چۆن دوێنێ لە ڕۆژێکی نوێدا دەگەڕێتەوە و دووبارە دەبێتەوە؟﴿وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٍ ﴿٥٢﴾﴾ سبأ: ٥٢، ڕێگەی لێگیرا لەوەی بگەڕێتەوە بۆ لای ئەوەی خۆشیدەویست و پێی ڕازی بوو، تێدەگات ئەوەی بەدەستی هێناوە و دروێنەی کردووە کەسی ژیر و هۆشمەند -لە ژیانی دونیادا- ئەو کارانەی ئەنجام نەدەدا، بۆیە پەردەیەك دەکەوێتە نێوان ئەو و ئەوەی ئارەزووی دەکات(کە بریتییە لە گەڕانەوە بۆ ژیانی دونیا تاکو کاری چاکە ئەنجام بدات)

دەوترێت: سەختترین حاڵی پچڕاو بریتییە لە پچڕانی هەناسەکان، کەسانی خاوەن غیرەت کە هەناسەیەك بەرزدەبێتەوە سەریدەخەن بۆ لای مەحبووبەکەیان، بەرزدەبنەوە بۆ لای و پۆشاکی خۆشەویستی و شەوق لەبەردەکەن، گەر بیانەوێت ئەو نەفەسەی یەکەم بۆ سەرەوە و بۆ لای خودا پاڵبنێن ئەوا نەفەسێکی تر بەدوایدا بەرەو لای خودا دەنێرن، بۆیە هەموو هەناسەکانیان بەخوداوەیە و بۆ لای خودایە، پۆشاکی خۆشەویستی و شەوق و هۆگرییان پۆشیوە، هەناسەیەك لە هەناسەدانیان بەفیڕۆ ناچێت مەگەر ئەو کاتانەی کە خەو زاڵ دەبێت بەسەریاندا، زۆربەی ئەو کەسانە خەوتنیش هەر بەو جۆرە دەبینن: بەهۆی تێکەڵبوونی دڵ و ڕۆحیان بەیەکتر، بۆیە پارێزگاری لە کاتی خەو و ئاگاهیی دەکەن و لەدەستیان ناچێت، ئینکاری ئەم حاڵە ناکرێت، چونکە گەر خۆشەویستی زاڵ بوو بەسەر دڵدا و داگیری کرد: بەبێ هیچ گومانێك ئەو حاڵەتەی بۆ دەهێنێتە پێش(واتە خەوتنەکەشی وەك کاتی ئاگاهی لێ دێت).

مەبەستەکە: هاتوو لەلای خوداوە(واردات) بەخێرایی لەبەین دەچێت، لە هەور خێراتر تێدەپەڕێت، کات ئەوەی تێیدایە لەگەڵ خۆیدا ڕامالی دەکات، تەنها ئاسەوار و حیکمەتەکەی بۆ تۆ دەمێنێتەوە، بۆیە هەوڵبدە کاتەکانت بەجۆرێك گوزەر بکات کە بۆ تۆ و لە بەرژەوەندی تۆ بگەڕێتەوە، چونکە گومانت نەبێت -گەر وانەکەیت- ئەوا بەسەر تۆدا دەشکێتەوە، بۆ ئەو مەبەستە بە بەختەوەران دەوترێت ﴿كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا بِمَآ أَسْلَفْتُمْ فِى ٱلْأَيَّامِ ٱلْخَالِيَةِ ﴿٢٤﴾﴾ الحاقة: ٢٤، هەروەها بە بەدبەختان دەوترێت ﴿ذَٰلِكُم بِمَا كُنتُمْ تَفْرَحُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَمْرَحُونَ ﴿٧٥﴾﴾ غافر: ٧٥

# (٥٢) منزلة الوجد

## مەنزیلەی وەجد

لە مەنزیلەکانی ((إیاك نعبد وإیاك نستعین)) مەنزیلەی وەجدە.

لـە دوو سـەحیحەکەدا لـە فەرموودەکـەی ئەنەسـەوە -خـوا لێـی رازی بێـت- لـە پێغەمبـەری خـوداوە(ﷺ) فەرموویـەتی ((سـێ شت لـە هـەر کەسـێکدا بێت شـیرینی باوەڕیان پـێ دەبینێتـەوە: خـوا و پێغەمبـەری لـە هەرچی شـتی تـرە خۆشـتربوێت، کەسێکی تەنها لەبەر خودا خۆشبوێت، پێیناخۆشبێت بگەڕێتەوە بۆ بێباوەڕی -دوای ئەوەی خودا رزگاری کرد لێی- وەك چۆن پێیناخۆشە هەڵبدرێتە ناو ئاگرەوە)).

خاوەنی کتـێبی (منـازل السـائرین) -بـۆ قسـەکردن لـە مـەقامی وەجـد- بەڵگـە بـەم ئایەتەی سـورەتی "الکهـف" دەهێنێتـەوە﴿ وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا فَقَالُوا رَبُّنَا رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَن نَّدْعُوَ مِن دُونِهِ إِلَٰهًا ۖ لَّقَدْ قُلْنَا إِذًا شَطَطًا ﴿١٤﴾ ﴾ الکهـــف: ١٤، ئەمـــە باشـترین بەڵگەهێنانەوەیـە لەسـەر "وەجـد" ئـەو کۆمەڵـە لـەنێوان هـۆز و نەتـەوە بێباوەڕەکەی خۆیان و لە خزمەتی مەلیکە بێباوەڕەکەی خۆیاندا بوون، ئا لەو بـارەدا حەقیقـەتی ئیمـان و هیدایـەتیان دۆزییـەوە و چـێژی شـیرینی باوەڕیـان کـرد و بـاوەڕ چۆڕایە ناخیانەوە، لەناو هۆزەکەیانـدا هەسـتانە سـەرپێ و وتیـان﴿ رَبُّنَا رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَن نَّدْعُوَ مِن دُونِهِ إِلَٰهًا ۖ لَّقَدْ قُلْنَا إِذًا شَطَطًا ﴿١٤﴾ ﴾ الکهف: ١٤.

"الـربط علـی قلـوبهم"-بەسـتنەوە و گرێـدانی دڵیـان: توندبوونـەوەی دڵیـان بـە جێگیربـوون و ئـارامگرتن و دامەزرانـدنیان لـەخۆدەگرێت، هـەروەها بـەهێزکردن و پشتیوانیکردنیان بە نووری باوەڕ تا ئارامیان گرت لەسەر کۆچکردن لە خاك و وڵاتی هۆز و نەتەوەکەیان، هەروەها دوورکەوتنەوە لە خۆشگوزەرانی و هەڵهاتن بـە دینـی خۆیانەوە بۆ ناو ئەشکەوتێك.

بەستنەوە و گرێدانی دڵ: پێچەوانەی شەرمەزاربوونە، شەرمەزاربوونی دڵ بریتییـە لـە دوورکەوتنەوەی لە هیدایەت، بەجۆرێك لە یادی پەروەردگاری بێئاگا دەبێت و شـوێنی ئارەزووەکانی خۆی دەکەوێت، ئەو کات کاروباری دەبێت بە زیادەڕەوی.

بەستنەوە و گرێدانی دڵ: بەستنەوەیەتی بە حەبلی هیدایەتەوە و وابەستبوون بە یادی خوداوە و شوێنکەوتنی رەزامەندی خودا و کۆکردنەوەی هەموو دڵ لەسەر خودا، بۆیە شێخی هەرەوی ئەو ئایەتەی کردە بەڵگەی وەجد.

## ❁ ئاستەکانی وەجد

وەجد چوار ئاستی هەیە:

لاوازترینیان بریتییە لە "التواجد" ئەوەش لە جۆری تەکەللوف و زۆرلەخۆکردن بۆ ئەو کارە و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی.

جیاوازی کەوتۆتە نێوان پیاوانی رێگەی بەرەو خوداچوون: ئایا "التواجد" دەبێت بە سیفەتێکی کەسەکە یان نە؟ لەسەر ئەمە دوو قسە هەیە:

دەستەیەك دەڵێن: نابێت بە سیفەتی کەسەکە و بە پەسەند نازانرێت بۆی، چونکە زۆرلەخۆکردن و تەکەلوفی تێدایە کە لەگەڵ رێگەی صادیقان جودایە، بینای وەجد لەسەر صدقێکی تەواو دروست دەبێت.

دەستەیەکی تر دەڵێن: دەبێت بە سیفەتی کەسەکە و بۆی حساب دەکرێت گەر مەبەستی بەدەستهێنانی حەقیقەت بێت، نەك لاسایی ئەهلی حەقیقەت بکاتەوە، بە قسەکەی عمر-خوا لێی رازی بێت- بەڵگە دەهێننەوە: ((کە پێغەمبەری خودا و ئەبوبەکری صدیقی بینی لەسەر دیلەکانی بەدر و ئەوەی لە فیدیە لێیان وەرگیرا دەگریان، پێی فەرموون: چی دەتان گریەنێت؟ گەر گریانم تیابینی دەگریم، ئەگەر نە، خۆم دەهێنمە گریان)) (لێرەدا خۆهێنانە گریان زۆر لەخۆ کردنە بۆیە گەر کارێکی خراپ بوایە عومەر-خوا لێی رازی بێت- نەیدەویست ئەنجامی بدا).

(پیاوانی بۆچوونی دووەم)دەڵێن زۆرلەخۆکردن و تەکەلوف لە سەرەتای سەیر و سلوکەوە بوونی هەیە، چونکە کەسی سەرەتا تەکلیفی کەسی خاوەن حاڵی لێناکرێت، هەر کەس بە نێتی بەدەستهێنانی حەقیقەت لێی رابمێنێت -بۆ ئەوانەی بۆ وەجد لە شکاردان- کارەکەیان بە ناپەسەند نابینرێت.

ئاستی دووەم: ((المواجید)) بریتییە لە ئەنجام و بەروبوومی جێبەجێکردنی ئەورادەکان.

ئاستی سێیەم ((الوجد)) بریتییە لە بەروبوومی کارەکانی دڵ لە خۆشەویستی بۆ خودا و رقلێبوون بۆ خودا، کە پێغەمبەر(ﷺ) کردوویەتی بە بەری کاری ئەو دڵەی کە خودا و پێغەمبەری لە هەرچی کەس و شتی ترە خۆشتر دەوێت، هەروەها کردوویەتی بە بەری خۆشەویستی لە دڵدا و رقبوون لە گەڕانەوە بۆ بێباوەڕی وەك چۆن پێی ناخۆشە هەڵبدرێتە ناو ئاگرەوە، ئەم جۆرە لە وەجد بەری ئەو کاروکردەوانەی دڵە کە خۆشویستن و رقلێبوونی لەبەر خودای موتەعالە.

ئاستی چوارەم: ((الوجود)) بریتییە لە باڵاترین لوتکەی مەقامی ئیحسان، لە مەقامی ئیحسانەوە بۆ ئەو لوتکەیە بەرزدەبێتەوە، ئەو کە موشاهەدەی پەروەردگار بەسەر دڵیدا زاڵ دەبێت هەتا وەك ئەوەی ببینێت–و لەنگەری گرت لەو مەقامەدا– ئەوا وەجد تیایدا دەبێت بە مەلەکە و ئەحکامەکانی دەروونی دادەمرکێنێتەوە و بە ئەحکامی تر دەیانگۆڕێت و دەبێت بە سروشتێکی تر، هەتا وەك ئەوەی سەرلەنوێ دروستبوونێکی تری بۆ دروستبووبێتەوە، و جارێکی تر لەدایك بووبێتەوە.

## ❁ تێڕامان سەردەکێشێت بۆ وەجد

وەك وەجدێکی لابەلای تازەبووەوە سەردەردەهێنێت(ویبزغ کوجد عارض متجدد)، شایەتی بیستن بۆی دێتەوە هۆش(یستفیق له شاهد السمع)، یان شایەتی بینین، یان شایەتی بیر(أو شاهد البصر أو شاهد الفكر).

ئەوەش بە بەئاگاهاتنی گوێیە لە خەوی بێئاگایی گەر ئاگادارکەرەوە گوتارێك بێت لە دەرەوە یان لە خودی خۆیدا، یان بەوەی دەیبینێت و بەرچاوی دەکەوێت لە ئایەتەکانی خودا، لەو ئایەتانەوە دەگوێزێتەوە بۆ ئەو شتەی کە ئایەتەکەی لە پێناودا و لەسەری خراوەتە روو، ئەوەش تێکەڵ دەبێت بەو مانایانەی بۆی واڵا دەبن بەهۆی بیر و تێڕامانەوە.

ئەم سێ شایەتە(شایەتی بیستن و بینین و بیرکردنەوە و تێڕامان) کە خودای موتەعال بانگ بۆ واڵاکردن و بەڵگە پێهێنانەوەیان دەکات، هەروەها بانگ دەکات بۆ قبووڵ کردنی ئەو حەقەی کە شایەتی پێدەدەن و رێکخستنی حوکمی ئەو شایەتیدانە لەسەری لە یەکتاپەرستی و دانپیانان و ئیمان، خودای موتەعال

دەفەرموێت ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ۖ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَٰكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ ﴿٤٦﴾ ﴾ الحج: ٤٦، هەروەها دەفەرموێت ﴿ أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا الْقَوْلَ ﴾ المؤمنون: ٦٨، هەروەها ئایەتی ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا ﴿٢٤﴾ ﴾ محمد: ٢٤، هەروەها ﴿ قُلِ انظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾ یونس: ١٠١، هەروەها ﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا فِي أَنفُسِهِم ۗ مَّا خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾ الروم: ٨، هەروەها ﴿ بِالْبَيِّنَاتِ وَالزُّبُرِ ۗ وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ النحل: ٤٤، قورئان پڕە لەم جۆرە ئایەتانە.

کە شایەتی بیستن و بینین و بیر هۆشیان بەرهاتەوە و دڵ شیرینی مەعریفە و ئیمانی بینییەوە لە ریزی خەتووان و بێئاگایان دێتە دەرەوە.

ئەم وەجدە لابەلایە هەندێ جار ئاسەواری لەسەر کەسەکە دەمێنێتەوە تەنانەت دوای دابڕانیش لێی، لەوانەشە ئاسەواری نەمێنێتەوە، ئەوەی ئاشکرایە: پێویستە ئاسەوارێکی بمێنێتەوە، بەڵام هەندێ جار بزر دەبێت و لەو شتانەدا نوقم دەبێت کە بەدوایدا دێن و بە دژەکان جێگەی دەگیرێتەوە.

## ❁ ئاسۆکانی رۆح بەرزترە لە ئاسۆی بیر

جۆرێکی تر لە وەجد هەیە کە دەرکەوتنی بەرزترە لەوەی یەکەمجار، شوێنی بەئاگاهاتنەوە تیایدا بریتییە لە رۆح، بەڵام شوێنی بەئاگاهاتنەوە لەوەی یەکەمدا بریتییە لە بیستن و بینین و بیر، رۆح هەڵگر و پاڵنەری بیستن و بینین و بیرە، ئەم دیاردانە(بیستن و بینین و بیر) لە سیفەتەکانی رۆحن.

بۆ باڵابوونی وەجدی رۆح هۆیەکی تر هەیە، ئەوەش باڵابوونی وابەستەی رۆحە، وابەستەی بیستن و بینین و بیر بریتییە لە ئایەت و رۆشنبینییەکان(الآيات والبصائر)، بەڵام وابەستەی وەجدی رۆح بە زاتی مەحبووبەوەیە(خودای موتەعال).

خودا ئامۆژگاریکەرێکی لە دڵی هەر باوەڕدارێکدا داناوە فەرمانی پێدەکات و نەهی لێدەکات و بانگی لێدەکات و ئاگاداری دەکاتەوە، مژدەی پێدەدات و دەیترسێنێت، ئەو بانگکەرە بانگکەری سەر "فوق الصراط"، بانگکەری لەسەر سەری"علی رأس الصراط"بریتییە لە کتێبەکەی خودا، وەك لە مەسنەدی "الترمذي"دا لە فەرموودەکەی

نەواسەوە لە ئیبن سمعانەوە -خوا لێی رازی بێت- لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی ((خودای موتەعال نموونەی شارێگەیەكی راست و دروست دەهێنێتەوە، لە دوو لاكەی"صراط" دوو شورا بوونی هەیە، لە هەر شورایەكدا چەندین دەرگای كراوەی تێدایە، لەسەر دەرگاكان پەردەی شۆڕەوەبوو هەیە، بانگكەرێك لەسەر سەری"صراط" ەوە بانگ دەكات، شارێگە راست و دروستەكە بریتییە لە ئیسلام، دەرگا كراوەكان بریتین لە حەرامكراوەكانی خودا، هەر كەس كەوتە ناو سنوورێك لە سنوورەكانی خوداوە پەردەكە لادەدات، بانگكەرەكە لەسەر سەری "صراط": بریتییە لە كتێبەكەی خودا، بانگكەرەكەی سەر شارێگەكە بریتییە لە ئامۆژگاریكەری خودا لە دڵی هەر باوەڕدارێكدا)) هیچ گوتارێك بوونی نییە لە یەكێك لەم دوو رێگەیەوە نەبێت: گوتاری قورئان، لەگەڵ گوتاری ئامۆژگاریكەر لە دڵی باوەڕداردا.

### ۞ كەماڵی ئازادی لە وەجدی پاكدایە

تیشكی هەتاوی وەجد زیاد دەكات و دەدرەوشێتەوە تا عابیدەكە لە پیسییەكانی بەشی نەفس پاك دەكاتەوە، و لە كۆیلایەتی ئاو و قوڕ (مەبەستی جەستە و حەزەكانییەتی) رزگاری دەكات، ئەو كات بەندایەتییەكەی پاك و بێگەرد دەبێت، حەقیقەتی ئەو پیسییە لە حەز و ئارەزووەكانی نەفس و ویستی نەفسەوەیە، كە لەگەڵ ویستی پەروەردگاری دەجەنگێت، بۆیە دەستەبەركردنی بەندایەتی -كە حەقیقەتی بەندەیە- بەجێنایەت تا ئەو نەفسە ون نەكەیت كە هەڵگری حەز و ئارەزووەكانە.

هەر كات لە حەز و ئارەزووەكانی دووركەوتەوە بەندایەتییەكەی پاڵفتە دەبێت، هەركات حەزێك دەمرێنێت بەندایەتی و مانایەك زیندوو دەكاتەوە، هەر بەو جۆرە هەركات حەزێك زیندوو دەكاتەوە بەندایەتییەك دەمرێنێت، هەتا كارەكە لەسەر دوو نەفس و دوو رۆح و دوو دڵ ساغ دەبێتەوە: دڵێكی زیندوو و رۆحێكی زیندوو بە مردنی نەفسێك و حەزەكانی، لەگەڵ دڵێكی مردوو و رۆحێكی مردوو بە ژیانی نەفسێك و حەزەكانی، لەنێوان ئەو دوانەدا ئاستی جۆراوجۆر هەیە لە تەندروستی و نەخۆشی، لە نێوان و نێواندا مەگەر تەنها خودا بۆخۆی بتوانێت هەژماریان بكات.

پاشان له بەندایەتی ئاو و قوڕ رزگاری دەكات: واتە رزگاری دەكات و ئازادی دەكات لە كۆیلایەتی سروشت و جەستە و پێكهاتەكانی لە ئاو و قوڕ بۆ بەندایەتی "رب العالمین" ئەو كەسەی دەبێتە خزمەتكاری جەستەیەكی بەدبەخت بە خزمەتكەی بووە بە كۆیلەی ئاو و قوڕ، وەك وتراوە:

يا خادم الجسم كم تشقى بخدمته　　　فأنت بالروح لا بالجسم إنسان

خەڵكی لەم مەقامەدا سێ جۆرن: بەندەیەكی تەواو، و ئازادێكی تەواو، لەنێوان ئەو دوانەدا.

بەندەی تەولو: ئەو كەسەیە بووە بە بەندەی ئاو و قوڕ، كەسێكە بووە بە كۆیلەی نەفس و شەهوەتی، بۆیە ئەو دوانە بەسەریدا زاڵبوون و بوون بە خاوەنی كەسەكە، ئەویش بۆیان گەردنكەچ بووە و شوێنیان كەوتووە.

كەسی ئازادی تەولو: ئەو كەسەیە زاڵ بووە بەسەر شەهوەت و نەفسی خۆیدا و بووە بە خاوەنیان، ئەو دوانە بۆی گەردنكەچ بوون و شوێنی بڕیارەكانی ئەو كەوتوون، هەردوو زەلیل بوون بۆی و چوونەتە ژێر كۆیلایەتی بڕیارەكانییەوە.

سێیەم: لەنێوان ئەو دوانەدا: كەسێكە هۆی ئازادی بۆ بەدەستهاتووە و هەوڵی كەماڵی ئازادی دەدات، ئەو كەسە لە روویەكەوە ئازادە و لە روویەكی ترەوە كۆیلەیە تا حەزێك لە حەزەكانی نەفسی تێدا مابێت.

ئازاد ئەو كەسەیە لە كۆیلایەتی ئاو و قوڕ رزگاری بووبێت، و بە بەندایەتی پەروەردگار سەركەوتنی بەدەست هێنابێت، واتە ئازادی و بەندایەتی بۆ كۆبووبێتەوە، بەندایەتییەكەی لە كەماڵی ئازادییەوەیە، ئازادییەكەشی لە كەماڵی بەندایەتییەوەیە، ئەو كەسە بەردەوام لەبەرەو پێشچووندا دەبێت، هەر كات تەماشای ئاسەواری لوتف و نیعمەتی خودا دەكات لەسەر خۆی -بەوەی شایستەی كردووە بۆ شتێك كە ئەهلی بەلا پێی شایستە نەبوون، ئەوانەش ئەهلی بێئاگایی و پشەهەڵكردنن لە خودا- ئەو تەماشاكردنی لوتف و نیعمەتە سەرسامییەكی بۆ دروست دەكات كە زیاتر دەیباتە ناو هەرێمی وەجدەوە، لە ئەسەرێكدا هەندێ لە عاریفان دەڵێن: ((هەر كات ئەهلی بەلا دەبینن، داوای عافییەت لە خودا بكەن))

ئەوەی ئەم حاڵە بەهێز دەكات ئەوەیە كەسەكە نزمیی نەفسی خۆی ببینێت، بە بچووك سەیركردنی ئەو نەفسە لەوەی شایستە بێت بەوەی خودا شایستەی كردووە، هەر بەو جۆرە بینینی دابەزینی پلە و پایە و كەمی بەها و نزمی و سووكی نەفسی خۆی.

كۆی هەموو ئەمانە: كەم تەماشاكردنی نەفسی خۆی و بە مەزن سەیركردنی لوتفی پەروەردگاری بۆ ئەو، بەوەی شایستەی كردووە بە ئیمان، لەنێوان ئەم دوو جۆرە بینینەدا خۆشەویستی و حەمد و شوكر و لێبڕان و ئیخلاص بۆ خودا لەدایك دەبن، هەر بەو جۆرە گەردنكەچی لە بەندایەتی و خۆشی و سروور بە پەروەردگار و هۆگری پێیەوە.

❁ ❁ ❁

## (٥٣) (منزلة البرق)

# مەنزیلەی بروسكە

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين))مەنزیلەی بەرقە.

ئەم بروسكەیە لە سەرەتای چوونە ناو ڕێگەی بەرەو خوداچوونەوە بۆ كەسەكە دەردەكەوێت.

بریسكانەوەیەكە دڵ ڕۆشن دەكاتەوە وەك بریسكانەوەی هەورە ترشقە.

خاوەنی (منازل السائرين) دەفەرموێت: "بروسكە: سەرەتایەكە بۆ كەسەكە دەبریسكێتەوە و بانگی دەكات بۆ چوونە ناو ئەم ڕێگەیە" ((البرق: باكورة تلمع للعبد وتدعوه إلى الدخول في هذه الطريق ))

ئەم ئایەتەی كردووە بە بەڵگە لەسەر ئەم مەنزیلەیە﴿ وَهَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ۝٩ إِذْ رَءَا نَارًا فَقَالَ لِأَهْلِهِ ٱمْكُثُوٓا۟ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا ﴾ طه: ٩ – ١٠

ڕووی بەڵگە هێنانەوەكە: ئەو ئاگرەی كە موسا(عليه السلام) بینی سەرەتایەك بوو لە ڕێگەی پێغەمبەرایەتی ئەودا.

((بروسكە)) سەرەتایە لەسەر ڕێگەی ویلایەت كە میراتی پێغەمبەرایەتییە.

ئەوەی كە دەفەرموێت ((باكورة)) بریتییە لە سەرەتای هەر شتێك، وەك سەرەتای بەروبووم، كە بریتییە لەو بەرەی پێش بەرەكانی تر پێدەگات.

ئەم بروسكەیە سەرەتای ڕێگەی ئەهلی سەرەتاكانی باوەڕ نییە، بەڵكو سەرەتای ئەو كەسانە بریتییە لە بەئاگاهاتنەوە(اليقظة) كە وەك یەكەمین مەنزیلە باسكرا، بەڵكو ئەم بروسكە سەرەتای ڕێگەی ئەو كەسانەیە كە لە ناوەڕاست و كۆتاییەكاندان.

ئەو بروسكەیە نوورێكە خودا هەڵیدەداتە دڵی بەندەكەیەوە و بۆی دەردەخات و بەوەش بانگی دەكات بۆ چوونە ناو ڕێگەی بەرز و باڵا، ڕێگەی صادیقان.

## ۞ کەمی ئەو زۆرە، زۆری ئێمە کەمە

یەکەمین ڕۆشنایی ئەو گوزە نوورە: لە بەڵێنەکانی خوداوە لەناو ئاسۆی ڕجاوە دەبریسکێتەوە، بەو هۆیەوە بەندە کەمێك لە بەخشینی خودایی بۆ ئەو بە زۆر دەزانێت و زۆرێك لە ئەرك و ماندووبوون لە خۆیەوە بۆ خودا بەکەم دەبینێت، و تاڵاوی بڕیار بە شیرین دەزانێت.

بەڵێن(العدة"بكسر العين") بریتییە لەو بەڵێنانەی خودا بە دۆستانی خۆی داوە لە چەندین جۆر کەرامات لەم خانەی دونیایەدا و لە دواڕۆژدا، لەم ڕووگەیەوە بریسکەکە دەدرەوشێتەوە، ئەمەش وادەکات بەندە کەمی لێ ببێت بە زۆر- کە لەلای خوداوە هیچ شتێك کەم نییە- ئەوەی کەمی لا دەگۆڕێت بە زۆر چوار شتە:

یەکەم: تەماشاکردنی شکۆمەندی و مەزنیی بەخشەرەکە(خودا).

دووەم: بێزکردنەوە لە نەفسی، چونکە کەم تەماشاکردنی دەبێتە هۆی بە زۆر بینینی ئەوەی بەدەستی هێناوە.

سێیەم: خۆشەویستی بۆ خودا، کە خۆشەویستی لە کەسێکدا ڕیشەی داکوتی دەبێتە هۆی بەزۆر بینینی ئەو شتەی لە مەحبووبەکەیەوە بەدەستی دەهێنێت.

چوارەم: ئەمەیان-پێش پێبەخشینەکەیە- ئولفەتی پێوە نەگرتووە و بە بەخششەکەوە پەیوەست نەبووە کە لەناکاو پێیدرا بەزۆری دە زانێت.

بەکەم بینینی زۆری ئەرك و ماندووبوونی خۆی: ئەمە بریتییە لە خۆ ماندووکردن و خۆ شەکەتکردن لەپێناوی ئەنجامدانی کاروکردەوەی چاکەدا، لەبەر ئەوەی بریسکەی بەڵێنی لە ئاسۆی ڕجاوە بۆ دەردەکەوێت: ئەوە هانی دەدات بۆ تێکۆشان و کاری سەرومڕ، هەروەها سەختی و دژواری کۆڵی ڕۆیشتن بەرەو خودا لە کۆڵی دەکاتەوە، ئەوانەی شەکەت و ماندوو دەبن ڕێگەیەك بۆ کارئاسانی نابیننەوە گەر بۆنی ئەمەیان نەکردبێت.

هەر بەو جۆرە بەشیرین زانینی تاڵاوی بڕیار-لەم بریسکانەوەیەدا-: تاڵاوی بڕیار بریتییە لە: هەموو ئەو بەڵا و ناخۆشییانەی کە خودا-عزوجل- بەندەکانی خۆی پێ تاقیدەکاتەوە، تاکو تاوتوێیان بکات و دەربکەوێت کامیان ئارامگرتر و صادقترە، هەر بەو جۆرە دەربکەوێت کامیان خاوەنی باوەڕی مەزن و خۆشەویستی و تەوەکول و گەڕانەوەی بەردەوامە بۆ لای خودا، کە ئەم بریسکانەوەیە بۆ سالیك دەرکەوت: تاڵاوی بڕیارەکانی لا شیرین دەبێت.

## ئاماژەی ئامادەباشی

گوزرەیـەکی تـری نـوور لـە ئاسـۆی هەڕەشـەکانی خـوداوە دەردەکـەوێت بەچـاوی حەزەرەوە، بۆیە هیوا و ئاواتی درێژی بەنـدە کـورت دەبێتـەوە، و زوهـد لـە خـەڵکی دەکات لەگەڵ نزیکیان.

ئەم ئاسۆی بریسکانەوە جیایـە لـە ئاسـۆی بریسـکانەوەکەی پێشـوو(ئاسـۆی رجـا)، ئەمەیان لە ئاسۆی حەزەر و ئەویتریان لە ئاسۆی رجاوە، کە ئەم بریسکانەوە گەردنی لـە ئاسـۆوە دەرهێنـا ئـاواتی درێـژی سـالیك کـورت دەبێتـەوە، لـە هـەموو سـاتێکدا لەبیریدایە مردن دەرگای پێدەگرێت و کۆتایی پێدەهێنێت، بۆیە حەزەر و ئاگاهیی لـە هێرشی مردن زیـاد دەکـات، ترسـی ئـەوەی هەیـە سـزای خـودایی بەسـەردا دابـارێ و پەردە بخاتە نێوان ئەو و سەرەکۆنەی خۆ و هەسـتانەوە و خۆئامـادەکردن بـۆ لیقـای خودا، دەترسێت بە خزمەتی خودا بگات بەر لە پاکبوونەوەی تەواو، ئەو کاتە رێگـەی نـادەن بچێتە خزمـەتی بـەبێ خۆپاککردنـەوە، وەك چـۆن لـە ژیـانی دونیـادا رێگـەی پێنەدرا بەبێ دەستنوێژ بچێتە ناو نوێژەوە بۆ گفتوگۆ لەگەڵ خودا.

ئەمە پاکبوونەوە دەهێنێتەوە بیری بەندەکان بۆ کاتی وەفات و رۆیشتن بۆ لای خـودا و چوونەناو کاتی لیقاوە بـۆ کەسـێك لـە خـوداوە بڕنـەوێت و لـە نهێنی عیبادەتـەکان گەیشتبێت، گەر بەندە ناتوانێت بچێتە خزمەتی خودا تا روو نەکاتە ماڵەکەی(کەعبـە) و عــەورەتی خــۆی دانەپۆشــێ و جەســتە و جلوبەرگــەکانی و شــوێنی وەســتانی لەبەردەستی خودا خاوێن نەکاتەوە و پاشان نێتێکی پاکی بۆ نەهێنێت، کاتی رۆیشتن بۆ لیقای خوداش هەر بەو جۆرەیە، ناتوانێت بچێتە خزمەتی تا بـە هـەموو دڵـەوە روو لە خودا نەکات و عەورەتی ناوەوەی بە پۆشاکی تەقوا دانەپۆشێت، ئـەوجا دڵ و رۆح و ئەندامەکانی لە پیسی دەرەوە و ناوەوە پاك بکاتەوە و بە تەواوی بـۆ خـودا خـاوێن ببێتەوە، بە ئەوپەڕی ئامادەباشییەوە خۆی ئامادە بکات، کاتەکانی نوێژ هاوشـێوەی کاتی مردن و گەیشتن بە لیقای خودان.

کە بەندە بەر لە کاتەکە ئامادەباشی کرد: کاتەکە دێتە بەرەوە و ئەو بـۆی ئامادەیـە، دەچێتە خزمەتی خودا، گەر کەمتەرخەمی کرد لە ئامادەباشی ترسی ئەوە هەیـە بـەر لە خۆئامادەکردن کاتەکەی لەدەست بچێت، چونکە هێرشـی کـاتی مـردن مـەودابڕە و

قبـووڵی درێژكردنـەوە ناكـات، بۆیـە لـە كـاتی هێرشـی مردنـدا بەنـدە پاكبوونـەوە و ئامادەباشی پێناكرێت، بـەڵكو پێـی دەوترێـت "هیهـات، هیهـات"-ئـەوە زۆر دوورە و ئـەوەی لەدەستچـوو رۆیشـت و ناگەڕێتـەوە، دوورییـەكی زۆر كەوتۆتـە نێـوان تـۆ و خۆپاككردنەوە، هەر كەس بە كورتی ئەمـەل لـە بریسـكەی هیـوا پێشـوازی كـرد ئـەوا بەردەوام لەسەر پاكێتی دەمێنێتەوە.

زوهدكردن لە خەڵكی لەگەڵ نزیكیان: با خزم و كـەس و دۆسـت و ناسـراو و جیرانـیش بن، ئـەوەش بـۆ كـەماڵی حـەزەری سـالیك دەگەڕێتـەوە، هـەروەها بـۆ ئامادەكـاری و خەریكبوونی بەوەی لەبەردەمیدایە و تێبینی كردنی هەڕەشـە خوداییەكـە لـە ئاسـۆی بریسكەكەوە كە بریسكەی فریودەر نییە، بەڵكو راستترین بریسكەیە.

## ۞ رەنگەكانی وێنای لوتفی خودا

گوڕزەی سـێیەمی نـوور لـە ئاسـۆی "لوتـف"ەوە دەردەكـەوێت لـە چـاوی هـەژاری و ئاتاجییـەوە، هـەوری سـروور هەڵـدەكات و بـارانی خۆشـی دادەبـارێ و لـە رووبـاری شانازیەوە جاری دەبێت.

ئەم گوڕزە نوورە لە لوتفی پەروەردگارەوەیە بۆ بەندەكەی بە چـەندین جـۆری لوتـف، سەرەتای دەركەوتنی ئەم بریسكانەوەیە لە چاوی هەژاری و ئاتاجییەوەیە كـە دەرگـای سـلوكە بـۆ لای خـودای موتـەعال، بـەڵكو مـەزنترین رێگەیـە كـە تـەنها لـەو رێگەیـەوە دەتوانێت بچێتە ژوورەوە، هەرچی دەرگـای تـرە جگـە لـەم دەرگایـە داخـراوە، لەگـەڵ ئەوەشدا مرۆڤ ناگاتە ئەم دەرگایە مەگـەر بـە شـوێنكەوتنی راسـتەقینە، هـیچ رێگەیـەك نییە بۆ لای خودا-با وردكارەكـان وردببینـەوە و ئاواتخوازەكـان خۆزگـەی بـۆ بخـوازن- جگـە لـە رێگـەی نیشـاندانی هـەژاری و ئاتـاجی بـۆ لای خـودا و شـوێنكەوتنی پێغەمبەر(ﷺ)، با كەسی سالیك جگە لەم رێگەیە لە هیچ رێگەیـەكی تـردا خـۆی ماندوو نەكات، چونكە لەسەر هیچ شتێك نابێت، بەڵكو دەبێتە نێچیری وەحشی و دڕندەكان.

ئـەم سـلوكە -هەسـتكردن بـە هـەژاری و ئاتـاجی- دەتوانێـت سـرور و خۆشـییەكی تایبەت بە پەروەردگار بۆ كەسەكە دروست بكـات كـە هـەرگیز خۆشـی و سـروری وای نـەبینیوە و هاوشـێوەی لـە دونیـادا نییـە، هـەتا وەك ئـەوەی نەسـیمێك بێـت لـە

نەسیمەکانی بەهەشت، کە ئەوەی بۆ دروست بوو: ناوەوە و پەنهانی دەکەوێتە خۆشی و ئاهەنگگێڕان بەهۆی ئەو شتەی لەلای مەولاوە بۆ ئەو رەوانەکراوە، کە لێشاوی ئەو خۆشییە سەری کرد رووباری شانازی لێیەوە سەرهەڵدەدات.

لەو شانازییانە: شانازی کردن بەسەر شەیتاندا، ئەمەش بیرکردنەوەیەکی ستایشکراوە، ئاهەنگگێڕان و شانازی بەسەریدا، خودا ئەوەی لا ناپەسەند نییە، بۆ ئەو مەبەستەیە لە کاتی جەنگدا کەشخەلێدانی لەنێوان ریزی باوەڕداران و بێباوەڕاندا پێخۆشە، چونکە سەرشۆڕکردنی دوژمنی تێدایە، هەروەها لە کاتی صەدەقەکردندا خۆبادانی پێخۆشە، -وەك چۆن لە فەرموودەدا هاتووە و ئاشکرای کردووە- ئەمەش بۆ نهێنییەکی سەرسوڕهێن دەگەڕێتەوە کە تەنها خاوەن صەدەقە و بەخشین و خێرخوازەکان لە ناخی خۆیاندا دەیبیننەوە لە ئاسوودەیی کاتی بەخشین، و گەشانەوە و خۆشحاڵ بوون، هەر بەو جۆرە خۆبادانیان بەسەر نەفسی چرووك و ژەنگگرتوو و فەرمانکەر بە بوخل و دەستنوقاوی، هەروەها سەرکەوتن بەسەر شەیتانی جوانکەری دونیا و حەزەکان، ئەم شانازیە لە کەماڵی بەندایەتییەوەیە.

هەروەها لەو شانازییانە: هەستکردنە بەوەی جێگەی شانازییە بەهۆی جیاکردنەوەی لە هاوڕەگەزەکانی خۆی بەو تایبەتمەندییەی خودا پێیبەخشیوە، با ئەم شانازیەش دەرنەبڕێت و دەرینەخات بۆ ئەوەی لەسەر بەندایەتی و هەژاری خۆی لە دەرگانەی پەروەردگاردا بمێنێتەوە.

نهێنی ئەوە: بەندە کە تێبینی ئەو لوتفانەی خودای لەخۆیدا کرد و لە چاوی منەت و بەخشینی خوداوە تەماشای کرد: لەگەڵ ئەوەدا ئاتاجی و هەژاری خۆی لە هەموو کات و ساتێکدا دەبینێت، لەوە دەگات تەنها چاوتروکانێکیش ئەو لە پەروەردگاری بێنیاز نییە و نابێت، ئەوەش لە مەزنترین دەروازەی شوکر و هۆی زیادبوونی نیعمەتەکان و هاتنیانە بەدوای یەکتردا، هەرکات نیعمەتێك بەدوای نیعمەتێکی تردا دێت لە دڵیدا هەوری سروور سەرهەڵدەدات، کە ئەو هەورە لە ئاسمانی دڵیدا پەرش و بڵاو بوویەوە و ئاسۆکانی پڕکرد لێزمەبارانی خۆشی و ئاهەنگگێڕان بەسەریدا دادەبارێت بە هۆی ئەو سرووره بەتامەوە کە لەخۆی گرتووە، گەر لێزمە باران نەیگرێتەوە ئەوا نەرمە بارانێکی بەسەردا دادەبارێت، ئەو کاتە لەسەر زمان و لە

دەرەوەی روباری شانازی جاری دەبێت بەبێ لە خۆبایبوون و فەخرکردن، بەڵکو دڵخۆشبوون بە فەزڵی خودا و رەحمەتی﴿ قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ ﴾ یونس: ٥٨، شانازی لەسەر دەرەوەی و هەژاری و ئاتاجی لە ناوەوە یەکێکیان ئەویتریان نەریّ ناکات و دژ بەیەکتر ناوەستنەوە.

لە فەرموودەکەی پێغەمبەر رابمێنە ((من سەرداری رۆڵەکانی ئادەمم بەبێ فەخر)) فەزڵ و منەتی خودای لەسەر خۆی راگەیاند و فەرمووی ئەو قسەیە وەك فەخرکردن نەیفەرمووە، بەڵکو وەك دەرخستنی نیعمەتی خودا لەسەر خۆی بەیانی کردووە، ئوممەتەکەی لە قەدر و گەورەیی ئەو ئیمام و شوێنکەوتووە ئاگادار بکاتەوە و لە بەرزی مەنزیلەی خۆی تێیان بگەیەنێت کە ئەوان شوێنی کەوتوون، بۆ ئەوەی ئوممەت نیعمەتی خودا لەسەریان ببینن و شوکری خودای لەسەر بکەن.

ئەم فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) هاوشێوەی فەرموودەکەی یوسفە(عليه السلام) کە بە مەلیکی مصری فەرموو﴿ قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ﴾ یوسف: ٥٥، هەواڵدان دەربارەی خۆی بەو دوو سیفەتە بەهۆی بەرژەوەندییەکەوە بوو کە مەلیکی میصر و گەلەکەی قازانجیان لێدەکرد، بۆیە لەسەر نەفسی وتنی ئەو قسەیە بە بارێکی باش دەشکایەوە، چونکە مەبەستی فەخرکردن نەبوو بەسەریاندا، سەرچاوەی وتنەکە و پاڵنەری وتنەکە ئەو قسەیە یان بەباش لە قەڵەم دەدات یان بە خراپ، بەڵام وێنەی دەرەوەی هەردووکیان یەك وێنەیە.

❁ ❁ ❁

## (٥٤) (منزلة الذوق)

# مەنزیلەی چێژ

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی چێژە.

چێژ دەستپێكردنی هەستی ناوەوە و دەرەوەیە بۆ گونجا و نەگونجاو، ئەم چێژە تایبەت نییە هەستی زمان لەناو دەمدا لە زمانی قورئاندا، بەڵكو تەنانەت لە زمانی عەرەبیشدا، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ﴾ الأنفال: ٥٠، هەروەها دەفەرموێ ﴿فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ﴾ آل عمران: ١٠٦، دیسان دەفەرموێ ﴿هَٰذَا فَلۡيَذُوقُوهُ حَمِيمٞ وَغَسَّاقٞ﴾ ص: ٥٧، هەروەها ﴿فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلۡجُوعِ وَٱلۡخَوۡفِ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ﴾ النحل: ١١٢.

تێڕابمێنە چۆن چێژ و پۆشاكی پێكەوە كۆكردەوە، بۆئەوەی بەڵگە بێت لەسەر دەستپێكردنی چێژ و ئابڵۆقەدان و گشتگیری، هەواڵیدا لە پێ"چەشتن"ی كە واقیعێكی راستەوخۆ و بێ چاوەڕوانییە، بەڵام ترس بۆی هەیە پێشبینی بكرێت روونەدات، هەواڵیدا لە پێ"پۆشین": كە ئابڵۆقەدەر و گشتگیرە وەك پۆشاكی جەستە.

لە فەرموودەیەكی سەحیحدا لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ((چێژی باوەڕی كردووە: كەسێك رازی بێت "الله" پەروەردگاری بێت، ئیسلام ئایینی بێت، و محمد(ﷺ) پێغەمبەری بێت)) رایگەیاند كە باوەڕ چێژی هەیە، دڵ ئەو چێژە دەكات وەك چۆن دەم و زمان چێژی خواردن و خواردنەوە دەكەن.

پێغەمبەر(ﷺ) تەعبیری كردووە لە حەقیقەتی باوەڕ و ئیحسان و بەدەستهێنانی بۆ دڵ و دەستپێكردنی بۆی جارێك بە "چێژ" و جارێك بە "خواردن و خواردنەوە" و جارێكیش بە "شیرینی"، وەك دەفەرموێت ((چێژی باوەڕی كردووە)) یان دەفەرموێت ((سێ شت هەر كەس تێیدا بێت شیرینی باوەڕی پێ دەبینێتەوە: هەر كەس خوا و پێغەمبەری لە هەرچی كەس و شتی ترە خۆشتر بوێت، كەسێكی تەنها لەبەر خودا خۆشبوێت، و پێیناخۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ بێباوەڕی-دوای ئەوەی خودا رزگاری كرد لێی- وەك چۆن پێی ناخۆشە هەڵیبدەنە ناو ئاگرەوە))

كە نەهی لێكردن لە ڕۆژووی دانەدەمیەك(ویصال) فەرموویان ((تۆ ڕۆژوو دەدەیە دەم یەكتر، فەرمووی من وەك ئێوە نیم، من خواردن و خواردنەوەم پێدەدرێت)) لە دەربڕینێكی تردا ((من لە خزمەتی خودادا دەمێنمەوە و خواردن و خواردنەوەم پێدەدات))، وەڵامی ئەو جیاوازییەی نێوان خۆی و ئەوانی دایەوە، گەر پێغەمبەر(ﷺ) بە دەمی موبارەكی خواردن و خواردنەوەی بخواردبایە، وەڵامەكەی بەم جۆرە دەبوو ((منیش ڕۆژووی ویصال ناگرم))، كە پێغەمبەر(ﷺ) دانی نا بە وتنەكەی ئەواندا(تۆ ڕۆژوو دەدەیە دەم یەكتر)) زانرا كە پێغەمبەر(ﷺ) خۆی لە خواردن و خواردنەوە گرتۆتەوە، بەو خواردن و خواردنەوە بەرز و ڕۆحانییە ژیاوە كە بێنیازی كردووە لە خواردن و خواردنەوەی هاوبەشی بەرهەست.

ئەم چێژە بوو هیرەقل كردی بە بەڵگەی دروستیی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر(ﷺ) كە وتی بە ئەبو سفیان ((ئایا كەس لە دینەكەی بەهۆی بێزاربوونەوە لێی پاشگەز دەبێتەوە؟)) وتی ((نەخێر)) هیرەقل وتی ((ئیمانیش بەو جۆرەیە، كاتێك تام و شیرینییەكەی دەگاتە دڵ))

بەڵگەی هێنایەوە بەو چێژی ئیمانەی دەگاتە دڵی شوێنكەوتووانی و پێی تێكەڵ دەبێت و وای لێدەكات لێی بێزار نەبێت لەسەر بانگەوازی پێغەمبەرایەتی و پەیام نەك بانگەشەی موڵك و دەسەڵات و سەرۆكایەتی.

مەبەستەكە: چەشتنی شیرینی ئیمان و ئیحسان كارێكە دڵ دەیبینێتەوە، پێویستی ئەو چێژە بۆ دڵ وەك پێویستی خواردن و خواردنەوەیە بۆ دەم و زمان.

باوەڕ تام و شیری هەیە كە چێژ و وەجد پێیەوە وابەستە دەبن، تەمومژ و شك و گومان لە دڵدا كۆتایی پێنایەت تا كەسەكە نەگاتە ئەم حاڵە، باوەڕی ڕاستەقینە تێكەڵ بەدڵ ببێت و دڵ تام و چێژ و شیرینی ئەو باوەڕە بكات.

مەبەست بە وەجدی شیرینی باوەڕ ئەو وەجدە نییە كە كڵپەی دڵە، چونكە چاوگی "وجد بالشيء وجدا"ە، بەڵام ئەوە لە بوون-"وجود"ەوەیە كە مانی -جێگیربوون- "ثبوت"ی هەیە، چاوگی ئەم فرمانە: "الوجود والوجدان"ە، "وجد الشيء يجده وجدانا" كاتێك بۆی بەدەستهاتوو جێگیر بوو، وەك كەسێك كە ونبووەكەی دەدۆزێتەوە دواى ئەوەی لێی دوور بوو، وەك ئایەتی ﴿ أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَىٰ ﴿٦﴾

﴿وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ۝٧ وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ ۝٨﴾ الضحى: ٦ – ٨، هەروەها ﴿إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًا﴾ص: ٤٤، هەموو ئەمانە لە "وجود"ەوەیە كە مانای "لبوت"ی هەیە، هەر بەو جۆرە فەرموودەكەی پێغەمبەر(ﷺ) ((وجد بهن حلاوة الإيمان))

## ۞ ئەوانە كاروكردەوەن........ نەك خۆزگە و ئاوات

یەكەمین شتێك كە عابید دەیچێژێت ئەوەیە كە دڵی–بە تەصدیق– تامی بەڵێنەكانی خودا بچێژێت، گومان راینەگرێت و ئەمەل داینەبڕێت و ئاوات و خۆزگە نەبێتە لەمپەر لەبەردەمیدا.

بەندەی تەصدیقكەر گەر تامی بەڵێنەكانی كرد لە خوداوە لەسەر باوەڕ و تەصدیق و گوێڕایەڵییەكەی: لەسەر حوكمی بەڵێن جێگیر دەبێت و رادەوەستێ.

گومان راینەگرێت(لا يعقله ظن) واتە گومان بەندی نەكات، دەڵێت: "عقلت فلانا عن كذا" واتە "منعته عنه وصددته"، هەر لەو وشەوە "عقال البعير"وەرگیراوە، ئەوەی وشتری پێ دەبەسترێتەوە و رێگری دەكات لە وێڵبوونی، هەروەها لە هەمان وشەوە "العقل"–ژیری وەرگیراوە، چونكە خاوەنەكەی بەند دەكات لە ئەنجامدانی كارێك كە باش و جوان نییە، هەروەها لە هەمان وشەوە "عقلت الكلام" و "عقلت معناه"وەرگیراوە، كاتێك قسەكە یان ماناكە لە سنگی خۆتدا بهێڵیتەوە و بەدڵ بەدەستت هێنا بێت دوای ئەوەی كە لە دڵدا ئەو مانایە بوونی نەبوو، هەروەها لەو وشەیەوە "العقل" بۆ پێدانی خوێن بەكاردەهێنرێت، چونكە رێگری دەكات لە لایەكیان دەستدرێژی بكاتە سەر تاوانبارەكە و دارودەستەكەی.

مەبەستەكە: چەشتنی تامی باوەڕ بە بەڵێنەكانی خودا رێگری دەكات لە چێژكەرەكە گومان بەندی بكات لە سووربوون و تێكۆشان بۆ بەدەستهێنانی داواكەی و رۆیشتن بەرەو پەروەردگاری، "گومان" وەستانە لە سووربوون لەسەر دروستیی بەڵێنەكان و هەڕەشەكان، بەجۆرێك لای تەصدیقی بۆ پارسەنگ ناكرێت.

چێژكەر بەهۆی تەصدیقی تامی بەڵێنەوە گومان ناتوانێت بەرهەڵستی بكات تاكو لە صدقی داواكەی بەندی بكات، و لێبڕانی پەكبخات لە سووربوون و یەكلابوونەوە تیایدا، لە فەرموودەكەی "سيد الإستغفار"دا دەفەرموێت ((وانا على عهدك و وعدك ما

استطعت))-من چەند بتوانم لەسەر پەیمان و بەڵێنی تۆم، واتە راوەستاوم لەسەر تەصدیق بە بەڵێنەکانت و هەستان بە پەیمانەکەت بەپێی توانای خۆم.
ماندەر بۆ سەر ئەم راوەستان و جێگیربوونە: بریتییە لە چەشتنی تامی باوەڕ و شۆڕبوونەوە بۆ ناو دڵ، گەر ئیمان مەجاز بوایە و حەقیقەتی نەبوایە دڵ لەسەر حوكمی بەڵێن جێگیر نەدەبوو، هەر بەو جۆرە وەفای بە پەیمان نەدەكرد، تەنها چەشتنی تامی باوەڕ لەم شوێنەدا بەدەرد دەخوات.
هەندێك لە هاوەڵان "لبیك اللهم لبیك"یان لە ئیحرامدا زۆر دەكرد، پاشان دەیانفەرموو"لبیك، گەر ریابێت دەپوكێتەوە"، خودای موتەعال نەرێی باوەڕ دەكات لە كەسانێك كە بانگەشەیان بۆ دەكرد، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ چێژێكی تێدا نەبوو، دەفەرموێت ﴿قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡۖ﴾ الحجرات: ١٤، ئەوانە موسڵمان بوون، بەڵام باوەڕدار نەبوون، چونكە لەوانە نەبوون كە ئیمان گەیشتبووە دڵیان و چێژی شیرینی و تامەكەیان كردبوو، ئەمە حاڵی زۆربەی ئەوانەیە كە خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام، ئەوانە لە بێباوەڕان نین، خودای موتەعال ئیسلامی بەم ئایەتە بۆ جێگیر كردوون(وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا)، نەیفەرموو: بە زمانتان بیڵێن كە دڵتان لەگەڵی نییە، جیاوازی كرد لە نێوان وتنی (ءَامَنَّا) و وتنی (أَسۡلَمۡنَا)، بەڵام لەبەر ئەوەی كە تا ئێستا تامی باوەڕیان نەكردووە فەرمووی (لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ)لەگەڵ ئەوەشدا بەڵێنی پێدان كە لەسەر چاكەكانیان شتێك لە پاداشتیان كەم نابێتەوە.
پاشان باسی ئەهلی باوەڕی كرد كە تامی باوەڕیان كردووە، ئەوانە باوەڕیان بە خودا و بە پێغەمبەرەكەی هێناوە، پاشان لە باوەڕەكەیاندا شك و گومانیان بۆ دروست نەبوو، بەڵكو كەمترین شك لە ناخیاندا بوونی نەبوو، چونكە باوەڕ گەیشتبووە دڵیان و نوور و رۆشناییەكەی تێكەڵ بە دڵیان بووبوو، بۆیە بۆ شك و گومان شوێنێك لە دڵدا نەمابوو، ئەوەی تەصدیقی ئەو چێژەی كرد: بەخشینی خۆشەویسترین شتە لە لایان بۆ رەزامەندی پەروەردگاریان، ئەوەش بریتی بوو لە ماڵ و گیانیان، بەبێ چەشتنی تامی باوەڕ بوونی شیرینی و بەخشینی ماڵ و گیان كارێكی ئەستەمە، ئەو كارە بە راستێتی لە چەشتن و وەجددا بەدەست دێت، وەك حەسەن دەفەرموێت ((ئیمان بە خۆزگە و ئاوات و خۆڕازاندنەوە نییە، بەڵكو ئەوەیە لە دڵدا قەرار دەگرێت و كاروكردەوەی چاكە تەصدیقی دەكات))

چەشتن و وەجد: کارێکی ناوەکین، و کاروکردەوەکان بەڵگەن لەسەری و تەصدیقی دەکەن، وەك چۆن رەیب و شك و نیفاق کارێکی ناوەکین، و کاروکردەوە ناباشەکان بەڵگەن لەسەریان، کاروکردەوەکان بەری زانستەکان و بیروباوەڕە، یەقین: جیهاد و مەقامەکانی ئیحسان بەرهەم دەهێنێت، بەپێی هێزی یەقین بەروبووم و ئەنجامی زۆرتر دەبێت، رەیب و شك: کاروکردەوەگەلێك بەرهەم دەهێنن کە گونجاون لەگەڵیاندا، کۆمەك لە خوداوەیە.

لە نیشانەکانی چەشتن: ئەوەیە هیوا و ئاواتی دونیا و چاوبڕینە شتێك لە شتەکانی خاوەنی چێژ لە داواکەی دوورنەخاتەوە، چونکە هیوا و ئاوات و چاوتێبڕینی دونیایی رێگە لە دڵ دەبڕنەوە تاکو نەڕوات بەرەو داوایەکەی.

نافەرموێت ئەمەلی نەبێت دەفەرموێت ((ئەمەل داینەبڕێت)) گەر کەسەکە ئەمەلی هەبوو لە رێگە داینەدەبڕی زیانی پێناگەیەنێت، لەوانەیە کەمێك کۆسپ بخاتە بەردەم رۆیشتنی، بەڵا و گرفتارییی لە ئەمەلێکدایە کە دڵی کەسەکە لە رۆیشتن بەرەو خودا دادەبڕێت.

لەلای فوقەهای دڵ و دەروون: ویستنی هەر شتێك جگە لە خودا بریتییە لە ئەمەلێکی دابڕ و هەڵوێر، هەرچییەك بێت، هەر کەس ئەمەلەکەی ببێت بە کۆتایی داوا و هەوڵی لە ئەهلی تام و چێژی باوەڕ نییە، هەر کەس شیرینی مەعریفەی خودا و نزیکیی لە خودا و هۆگربوون لە خوداوە چەشت هیچ ئەمەلێکی نابێت جگە لە خودا، گەر ئەمەلی بە جگە لە خوداوە وابەست بوو ئەوە بۆ یارمەتیدانیەتی لە بەدەستهێنانی رەزامەندی خودا و خۆشەویستی ئەو، واتە ئەمەلی بەو شتە یان بەو کەسە هەیە لە پێناوی خودادا نەك لەگەڵ خودادا.

گەر بڵێی بەندەی خودا بەچی ئەو ئەمەلە دەبڕێت و کۆتایی پێدێنێت؟

دەڵێم: هێزی رەغبەتی لە داوای بڵنددا کە هیچ شتێك بەرزتر نییە لە ئەو داوایە، هەروەها ناسینی بێنرخی و کەم بەهایی ئەوەی لەخوار خوداوە ئەمەلی پێی هەیە، خێرایی رۆیشتنی ئەو شتە و تیاچوونی، کە دابڕان لێی زۆر نزیکە، لەراستیدا ئەو داوایە وەك خەیاڵێك وایە، یان وەك هەورێکی هاوین وایە، سێبەرێکی گوزەرکەردە، و ئەستێرەیەك لە ئاوابوون نزیك کەوتۆتەوە، پاش ماوەیەکی تر ئاوا دەبێت و لەبەرچاوان

بزر دەبێت، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((من چیمە لە دونیا؟ من وەك سوارێك وام پێشنیوەڕۆیەك لە سێبەری درەختێكدا كەمێك دەمێنێتەوە پاشان دەڕوات و بەجێی دەهێڵێت)) هەروەها دەفەرموێت ((دونیا بەراورد بە دواڕۆژ وەك ئەوە وایە یەكێكتان پەنجەیەكی بكات بە دەریایەكدا، با تەماشا بكات چەند ئاو بەدەستییەوە دێت؟)) دونیای بەرانبەر بە دواڕۆژ شوبهاند بەو تنۆكە ئاوەی كە هێنانە دەرەوەی پەنجەیەك لە دەریا پێیەوە دەگیرسێت(دەریاكە دواڕۆژە و تنۆكە ئاوەكە دونیایە).

عومەری كوڕی خەتتاب –خوا لێی رازی بێت– دەفەرموێت ((گەر دونیا لە ئەوەڵەوە تا ئاخر بدرێت بە یەك كەس، پاشان مردنی بەدوادا بێت، وەك ئەوە وایە كەسێك لە دونیا خەونێكی بینیبێت دڵی پێی خۆش بووبێت، پاشان بەئاگا بێت و هیچ شتێك لە دەستیدا نەبینێتەوە))

موترف كوڕی عەبدوڵا دەفەرموێت –یان كەسانی تر– ((هەموو نیعمەتەكانی دونیا لەپاڵ نیعمەتەكانی دواڕۆژدا كەمترن لە گەردیلەیەك لەپاڵ هەموو چیاكانی سەر زەویدا))

هەر كەس بە وردی لە دونیا و دواڕۆژ ورد ببێتەوە تێدەگات بەو جۆرەیە.

ئیتر كەی شیاوە كەسی ژیر و خاوەن مەعریفە: ئەمەل لەم بەشە كەمەی دونیادا– رێگەی لێ بگرێت لە گەیشتن بە نیعمەتێكی هەتاهەتایی و تیانەچوو؟ چجای رێگەی لێبڕێتەوە لە گەیشتن بە نیعمەتی مەعریفە و خۆشەویستی و هۆگری و خۆشی بینین لە نزیكیی خودا، كە جیاوازی نێوانیان وەك جیاوازی نیعمەتی دونیا وایە بەرانبەر نیعمەتەكانی بەهەشت؟ خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً فِى جَنَّٰتِ عَدْنٍ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ﴾التوبة: ٧٢، كەمێك لە ریزوانی خودای موتەعال–كە پێی ناوترێت كەم– مەزنتر و گەورەترە لە هەموو بەهەشت و ئەوەی تێیدایە.

لە فەرموودەكەی بینینی خودای موتەعالدا ((سوێند بە خودا، خودا نیعمەتێكی پێنەداون مەزنتر بێت لە تەماشاكردنی رووی پاكی خودا))، لە فەرموودەیەكی تردا ((ئەوان كە خودا دەبینن–سبحانه– لا ناكەنەوە بەلای هیچ نیعمەتێك لەو نیعمەتانەی كە تیایدان، تا لەبەرچاویان ون دەبێت))

هەر كەس ئەمەل لەو بينينە دابيبڕێت ئەوە بێبەشی بەدەستهێناوە و بە زيانۆمەندی بۆ خۆی رازی بووە، خودا كۆمەككار و يارمەتيدەرە و هەر ئەو پشتوپەنايە و هەرچی ئەو بيەوێت دەبێت.

هەر بەو جۆرە ئاوات (أمنية) كۆسپی بۆ دروست ناكات، ئاوات ئەو بەش و حەزانەيە بەندە خۆزگەی بۆ دەخوازێت، كۆكراوەكەی بريتييە لە (أماني)–ئاواتەكان، جياوازی نێوان (أمنية) و(أمل): "أمل" وابەستەيە بەو شتانەوە كە رجای بوونی دەكرێت، "أمنية" هەندێ جار وابەستە دەبێت بە شتێكەوە كە رجای بەدەستهێنانی ناكرێت، وەك كەسی دەستەوسان داوای پلە و پايەی بەرز بكات.

**ئاواتی پووچ (الأماني الباطلة):** بريتييە لە سەرمايەی خەڵكە موفليسەكان، كاتەكانی خۆيان بەو ئاواتانەوە دەكوژن و چێژيان لێ دەبينن، وەك چێژی ئەو كەسانەی بە خواردنەوەی ئارەق ئەقڵی خۆيان دەسڕنەوە، يان وەك ئەو كەسانەی خەياڵ دەكەن.

لە فەرموودەيەكی بەرزكراوەدا ((ژير ئەو كەسەيە سەرەكۆنەی نەفسی خۆی دەكات و كار بۆ دوای مردن دەكات، دەستەوسان كەسێكە كە نەفسی شوێنی ئارەزووەكانی كەوتووە و ئاواتگەلێك بۆ لای خودا دەخوازێت))

رازی نابێت بە ئاوات لە جێگەی حەقيقەت مەگەر كەسەكە خاوەنی نەفسێكی نزم و پەست و كەوتوو بێت، وەك وتراوە:

**واترك منى النفس لا تحسبه يشبعها إن المنى رأس أموال المفاليس.**

ئاواتی مرۆڤ نيشانەی بەرزی هيممەت يان نزمی و پووچييەتی.

### ۞ دڵی دابەشبوو: دەلەرزێ و دەترسێت

پاشان لە رێگەی "ويست"ەوە تامی هۆگربوون دەكات، نە خەريككەر و خەرۆكەر وابەستەی دەكات و نەكاری لابەلا ئيشەكەی لێی تێكدەدات، و نە جيابوونەوە لێڵی دەكات (ثم يذوق بالإرادة طعم الأنس، فلا يعلق به شاغل، ولا يفسده عارض، ولا تكدره تفريقة).

"**ويست**": وەسفی كەسی موريدە، جياوازی نێوان ئەم پلەيە و پلەكەی پێشوو، ئەوەی پێشوو وەسفی دۆخ و حاڵی خوداپەرستە كە لە رێگەی تەصديقەكەيەوە تامی

بەڵێنەكانی پەروەردگاری كردووە، بۆیە سووربوون و كۆشانی سەروموڕی لە عیبادەت و كاری چاكەدا بەكارهێناوە بەهۆی ئەو متمانەی كە هەیەتی بە سەرئەنجامەكەیان، بەڵام خاوەن ئەم پلەیە (كە لێرەدا باسی دەكات) "ویست"ی كەسەكە تامی هۆگربوونی كردووە، بەڵكو بووە بە حاڵی موریدەكە.

هۆگربوون بە خوداوە باڵاترە لە هۆگربوون لەوەی عابید هیوای دەكات لە نیعمەتەكانی بەهەشت، كە مورید تامی هۆگربوونی كرد لە "ویست"ەكەیدا كۆشانی سەروموڕ دەكات، هەوڵدەدات هۆگربوونەكەی پارێزگاری لێ بكات، هەوڵی بەدەستهێنانی هۆكاری بەهێزكردنی ئەو "ویست"ە دەدات.

وای لێ دێت خەریككەرێك یان خەڕۆكەرێك پێیەوە نالكێت، واتە شتێكی پێوە نالكێت لە سەیر و سلوك بۆ لای خودا سەرقاڵ و خەریكی بكات، بەهۆی ئەو داوا زۆرەی پاڵنەری هۆگربوون بۆی دروست كردووە كە تامی چەشتووە و چێژی لە شیرینییەكەی بینیوە.

هۆگربوون بە خوداوە: حاڵەتێكی یەكتاپەرستییە و لە مەقامەكانی ئیحسانە، بە سێ شت بەهێز دەبێت: بەردەوام بوون لە یادی خودا، و صدق لە خۆشەویستی خودادا و ئیحسان لە كاروكردەوەدا.

هێزی هۆگربوون و لاوازییەكەی: بەپێی هێزی نزیكبوونەوەیەتی لە خودا، هەتا دڵ لە پەروەردگارەوە نزیكتر بێت هۆگربوونەكەی بەهێزتر دەبێت، هەتا لێیەوە دوورتر بێت وەحشەتی نێوان ئەو و پەروەردگاری توندتر دەبێت، بۆیە بەرهەڵستكار تێكی دەدات.

بەرهەڵستكاری تێكدەر: ئەو شتەیە لۆمە و سەرەكۆنەی كەسی خۆشەویست دەكات لەسەر چالاك بوونی لە رازیكردنی خۆشەویستەكەی و گوێڕایەڵی بۆی، بانگی سالیك دەكات بۆ لاكردنەوە بە لای ئەودا و وەستان لەسەر ئەو و بەبێ رووكردنە داوا بەرز و بڵندەكەی، ئەو بەرهەڵستكارە وەك ئەو شتە وایە دێتە بەردەم رێبواری سەر رێگە و لای پێدەكاتەوە بە لایەكدا و لە مەبەستەكەی دووری دەخاتەوە.

هەرچی شتە جگە لە خودا بەرهەڵستكارە، ویستی كەسان و شتانی جگە لە خودا: سالیك رادەوەستێنێ و داواكەر لە داواكەی شكستخوارد دەكات و پەردە دەخاتە نێوان خودا و كەسی گەیشتوو بە خودا، بۆیە وریابە لە ویستی جگە لە خودا با بەرز و بڵندیش بێت، بە ئەندازەی ویستت بۆ غەیری خودا پەردە دەكەوێتە نێوان تۆ و

خوداوە، خودای موتەعال هەواڵ لەمەڕ بەندە نزیکەکانی خۆی دەدات و دەفەرموێت ﴿إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا ﴿٩﴾﴾ الإنسان: ٩، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَلَا تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ﴾الأنعام: ٥٢، هەروەها ﴿وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰ ﴿١٩﴾ إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِ الْأَعْلَىٰ ﴿٢٠﴾﴾ الليل: ١٩ — ٢٠.

ئەوەش کە دەفەرموێت "جیابوونەوە لێڵی ناکات"، چونکە جیابوونەوە دژی کۆبوونەوە(الجمعية)یە، کۆبوونەوە: بریتییە لە کۆبوونەوەی دڵ و هیممەت لەسەر خودا بە ئامادەبوون لەگەڵیدا لەباری هۆگربووندا، خاڵی بێت لە جیابوونەوەی ختوورەکان(الخواطر)، ((جیابوونەوە)) خراپترین و گەورەترین لێڵکەری دڵە، ئەو پاك و بێگەردییەی ئیسلام و ئیمان و ئیحسان بەرهەمی هێناوە ئەو دێت و لێڵی دەکات، دڵ بەو سیانە پاڵفتە دەبێت و پاك دەبێتەوە، جیابوونەوە دێت و ئەو سەفا و پاکێتییەی لێ تێك دەدات و دڵ پەرتەوازە دەکات، کەسی راستگۆ ئازاری ئەو پەرتبوون و دابڕانە لە سەفا و پاکێتی هەست پێ دەکات، هەوڵی چارەسەر و رێکخستنەوەی دەدات، دڵ رێکناخرێتەوە و لەو پەرتبوونە رزگاری نابێت تەنها بە رووکردنە خودا و پشت هەڵکردن لە شتەکانی تر و کەسەکانی تر نەبێت، بەو رێگەیە پەرتبوون و پژانی کۆدەکاتەوە و لێڵی لە بەین دەبات و سەفەرەکەی دێتەوە راستە و رۆحی زیندەگی بۆ دەگەڕێتەوە و تامی ژیانی فریشتەیی دەکاتەوە و هیممەتی چێژی "کۆبوونەوە" لەگەڵ خودادا دەکات.

ئەوەش ئاسەواری جیلوەکردنی مانای ناوە جوانەکانی خودایە لەسەر دڵی بەندە، پەردەی بێئاگایی و شك و گومان و پشت هەڵکردن دەپێچرێتەوە و سوڵتانی مەعریفە بەسەر دڵدا دەسەڵات پەیدا دەکات.

ئەو لەم پلەیەدا لە موشاهەدەی ناوە جوانەکان و سیفەتە بەرز و بڵندەکاندا نوقم بووە، نووری باوەڕ بەو ناو و سیفەتانە و ناسینیان دەسەڵاتی بەسەر دڵدا پەیدا کردووە، هەروەها بەردەوامی لە یادی خودادا و سەیرکردنی "الواحد، الفرد، الأول" کە شتێك لە پێشییەوە بوونی نییە، و "الآخر" کە شتێك لەدوای ئەو بوونی نییە، و "الظاهر" هیچ شتێك لە سەریەوە بوونی نییە و "الباطن" هیچ شتێك لە خوارییەوە بوونی نییە، بە "یەکەمینبوونی" پێشی هەموو بوونێك کەوتووە، بە

"دواهـەمینبوونی" ماوەتـەوە لـە دوای تیاچـوونی هـەموو شـتێك، بـە "دەركـەوتنی" بالآبووە بەسـەر هـەموو بووندا، بە"شـاراوەبوونی" ئابلۆقـەی هـەموو بـوونێكی داوە، ئەمە بابەتێكە دوو دەستە تیایدا بە هەڵەداچوون:

یەكەمیان: زیادەڕەوی تێدا كردووە، تا وای لێهاتووە كۆبوونەوەی دڵ لەگـەڵ خـودادا بەسـەر فـەرز و سـونەتەكاندا پێشـخراوە، وادەبینێـت دابـەزین لـەو كۆبوونەوەیـە بـۆ جێبەجێ كردنی فەرمانەكان دابەزینە لە بالآوە بۆ نزم، تا وتراوە بە هەنـدێك لەوانـەی كە تامی ئەو كۆبوونەوەی لەگەڵ خودادا بینیوە"هەسـتە بـۆ نوێژەكـەت" ئـەویش لـە وەلآمدا وتوویەتی:

يطالب بالأوراد من كان غافلا فكيف بقلب كل أوقاته ورد؟

(داوای خوێندنی ئەوراد لە كەسێك دەكرێت كە بێئاگایە، ئەی دەبێ دڵێـك چـۆن بێـت كە هەموو كاتەكانی ویردە و لەگەڵ خودایە ؟)

ئەوانە لەنێوان بێباوەڕ و ناتەواودان.

هەر كەس هەستان بە فەرزەكان-گـەر كۆبوونـەوەی بـۆ فەراهـەم بـوو- بـە پێویسـت نـەزانێت ئـەو كەسـە بێبـاوەڕ(كـافر)ە، و لـە دیـن چـووەتە دەرەوە، هـەر كەسـیش بەرژەوەندییـەكی پارسـەنگ بـەهۆی "كۆبوونـەوە"وە لەگـەڵ خـودا بفـەوتێنێت وەك: سوننەتەكان، و زانستی بەسوود، و جیهاد، و ئەمر بە مەعروف و نـەهی لـە مونكـەر و سوودی گەورەی فرە رەهەند، ئەوا ئەو كەسە ناتەواو(ناقص)ە.

دەسـتەی دووەم: گـوێ بـە كۆبوونـەوەی دڵ لەگـەڵ خـودا نـادەن و كاریشـی لەسـەر ناكەن، لەوانەیە مانا و ناوەڕۆك و حەقیقەتی نەزانن چییە.

ڕێگەی دۆسـتانی خـودا و ئـەهلی وەسـتان لەسـەر شـاڕێكە بریتییـە لـە: هەسـتان بـە "كۆبوونەوە" لە باری "جیابوونەوە"دا تا دەتوانێت، كەسێك لەوانـە بـە ئەنجامـدانی عیبادەت هەڵدەستێت، هەر بەو جۆرە هەستان بە كارێك سوودی خەڵكی تێدا بێـت و چاكە بێت لەگەڵیان، لەگەڵ كۆبوونەوەی دڵی لەسەر خودا، گـەر نـەیتوانی ئـەو دوانـە لەخۆیـدا كۆبكاتـــەوە و دژواری رووی تێكـرد و تەنگـــەلان بـوو: هەڵدەســتێت بـــە ئەنجامدانی فەرزەكان و دەسـتبەرداری "كۆبوونـەوە" دەبێـت و لا بەلایـدا ناكاتـەوە، گەر بـەو جـۆرە بـوو كـە "كۆبوونەوە"كـەی بـۆ دەسـتەبەر نـەدەبوو بـە پەكخسـتن و

وەلانانی فەرزەكان نەبێت، پەروەردگاری ئەدای فەرزەكانی لێ داوا دەكات و نەفسی داوای "كۆبوونەوە"ی لێ دەكات بەهۆی ئەو ئاسوودەیی و چێژەوە كە تێیدا دەیبینێتەوە، و لە ئازاری دابڕان و پەرتبوون رزگاری دەبێت، فەرزەكان حەقی پەروەردگارن و "كۆبوونەوە" بەشی كەسەكە خۆیەتی.

بەڵكو واقیع ئەوەیە كە: نوێژ پەیوەندی بەندەیە بە پەروەردگارییەوە، تاكو لە نوێژەكانیدا پێویستییە دونیایی و دواڕۆژییەكانی بۆ لای خودا بەرزبكاتەوە، نوێژ رۆشنایی چاوی باوەڕدارە، وەك چۆن رۆشنایی چاوی پێغەمبەری خودا بوو(ﷺ)، نوێژ كۆمەككارە بە هەموو كاروبارەكانیان، هەر بەو جۆرە رۆژوو: قەڵایەكی بەهێزە و خۆتی تێدا دەپارێزی، خودا بەڕۆژوو بەندەكەی پەروەردە دەكات، چونكە لە رۆژوودا هێزی لێبڕان و ویستی راستگۆیانە و بینینی رۆشن بوونی هەیە، باوەڕدار بە هەموو ئەوانە خۆی دەپارێزێت لەو شتانەی لە دونیا و دواڕۆژدا لێیان دەترسێت، تەواوی فەرزەكان: هەر بەو جۆرەن، هۆكارگەلێكن بۆ ئاسوودەیی و بەختەوەری و پارێزگاری لێكردنی بەندە لە هەر شتێك لە دونیادا بەر لە دواڕۆژی، كاروبارەكانی مرۆڤ لەناو خانەوادە و مزگەوت و كێڵگە و كارگە و مەیدانی جەنگ: هەموو ئەوانە بۆ خێری مرۆڤە لە دونیادا بەر لە دواڕۆژ، ئەو بەو كارەی ژیانی خۆی مسۆگەر و سەلامەت دەكات و لە رووی ئەخلاق و شەرعەوە رادەستی پەروەردگاری دەكات، ئەو كاتە هەموو جووڵەی لە خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و خەو و ئاگاهی: دەبێتە بەندایەتی بە ملكەچبوون و خۆشەویستییەكی صادیقانەوە، هەنگاوەكانی بەخێرایی هەڵدەگرێت بۆ لیقای پەروەردگاری و رۆیشتن بۆ لای ئەو، رازی لە خودا و خوداش لە ئەو رازی لە گۆڕەكەیدا، هەنگاوەكانی بەخێرایی هەڵدەگرێت بۆ ئەوەی بچێتە ریزی "عباد الرحمن"ەوە، هەر بەم جۆر بوو شانوشكۆی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەوانەی باوەڕیان پێهێنا و شوێنی ئەو نوورە كەوتن كە لەگەڵی دابەزی بوو، پاشان كە شتە نامۆكان هاتنە ناو ئیسلامەوە بیدعە و كاری پڕ و پووچ دونیای داگیر كرد و شەیتانی ئینس و جین ئەو كارانەیان لا شیرین كردن و بۆیان رازاندنەوە: خەڵكی گۆڕانی بەسەردا هات، كارەكان و ئەركەكان گۆڕانیان بەسەردا هات، تا باوەڕیان بەوە هێنا كە "زیكر": دانیشتنە لە خەڵوەدا و ژماردنی سەدان "لا إلـه إلا الله"یە، یان هەزار ركات نوێژكردنە، یان

ئەنجامدانی هەزار خەتمەی بێئاگاییە، و هاوشێوەی ئەمانە کە عیبادەت دەگۆڕێت بۆ شێوە و وێنە و نواندن و رووالەت، بە پێچەوانەی ئەوەی هاوەڵانی پێغەمبەر -خوایان لێ رازی بێت- لەسەری بوون، وەك ئیبن مەسعود -خوا لێی رازی بێت- دەفەرموێت ((کە ئایەتێکمان لەبەردەکرد بەجێمان نەدەهێڵا تا بەجوانی جێبەجێی نەکەین و نەیکەین بە کردار))، یان هاوشێوەی ئەمەی فەرموو.

بەندایەتی دروست: لەسەر کەسەکە پێویست دەکات یەکێك لەم دوو ئەمرە بەسەر ئەویتریاندا پێشبخات: ئەگەر هات بۆ نەوافل و دوو ئەمرەکە(کۆبوونەوەی دڵ لەگەڵ خودا، و ئەنجامدانی نەوافل(سوننەت)) پێچەوانەی یەکتر وەستانەوە هەندێ لە عاریفان "کۆبوونەوە"یان لە ئەنجامدانی نەوافل پێ باشترە.

هەندێکیش ئەنجامدانی نەوافلی لا باشترە، هەندێکیش "کۆبوونەوە" لە کاتێکدا و "نەوافل" لە کاتێکی تردا بە گونجاو دەزانێت (واتە کات بڕیار دەدات کامیان ئەنجام بدات).

راستییەکەی -گەر خودا بیەوێت-: ئەگەر ئەو نەوافیلانە بەرژەوەندییەکەیان پارسەنگتر بوو لە "کۆبوونەوە" و "کۆبوونەوە" نەیدەتوانی باربووی بکاتەوە و جێگەی ئەو بگرێتەوە: ئەوا بە نەوافیلەوە خەریك دەبێت با "کۆبوونەوە"شی لەدەست بچێت، وەك بانگکردن بۆ لای خودا، و فێرکردنی زانستی بەسوود، و هەستان بۆ شەونوێژ، و زیکری سەرەتای شەو و کۆتایی شەو، و خوێندنەوەی قورئان بە تێگەیشتنەوە، و جیهادی سوننەت و چاکە لەگەڵ کەسی ناچار و پەککەوتە و پەنادانی کەسی هانابەر، و هاوشێوەی ئەمانە، هەموو ئەمانە بەرژەوەندییەکەیان پارسەنگترە لە "کۆبوونەوە".

گەر بەرژەوەندی ئەو نەوافیلانە لەخوار "کۆبوونەوە"وە بوو وەك نوێژی چێشتنگاو و سەردانی برایان، و خۆشۆرین بۆ ئامادەبوونی جەنازە، و سەردانی نەخۆش و چوون بەدەم بانگهێشتەوە، و میوانداری دۆستان، و هاوشێوەکانی ئەمانە- ئەمە درێژبوونەوەی زۆری تێدایە.

گەر "کۆبوونەوە"کەی بەهێز بوو و کاریگەری لەسەر کەسەکە دەردەکەوت ئەوا لە ئەنجامدانی نافیلەکە لەپێشترە و بۆی بەسوودترە، گەر "کۆبوونەوە" لاواز بوو و ئیخلاصی لە کارە نافیلەکەدا بەهێز بوو ئەوە نافیلەکە بۆی قازانجتر و چاکترە لە "کۆبوونەوە".

پێوەر لە هەڵبژاردندا ئەوەیە بزانیت كام ئەمریان لەلای خودا خۆشەویستترە.
ئەوەش بە زانینی سوودی كارەكە و بەرووبوومەكەی دەبێت، هەروەها چەندە دەبێتە هۆی زیادبوونی باوەڕ و چەندە دەرئەنجامی باشی لێدەكەوێتەوە، هەر بەو جۆرە چەندە شوێنكەوتنی پێغەمبەری(ﷺ) تێدایە، بەوەی پێغەمبەر گرنگی زۆری پێدابێت و وەسێتی بە ئەنجامدانی كردبێت و هەواڵی لەبارەوە دابێت: وەك ئەوەی فەرموویێتی خودا ئەو كەسەی خۆشدەوێت..."، "یان خودا شانازی دەكات بە بەندەكەیەوە بەسەر فریشتەكانیدا..."و هاوشێوەی ئەمانە.
خاڵ و پیتی بابەتەكە: كەسی صادق لە داواكەیدا رازیبوونی خودا بەسەر حەزی نەفسیدا هەڵدەبژێرێت، گەر رازیبوونی خودا لە ئەنجامدانی ئەو كارەدا بوو، بەڵام حەزی كەسەكە لە "كۆبوونەوە"دا بوو، ئەوا لێگەڕێ با كۆبوونەوە بڕوات، و هەستە بەو كارەی رەزامەندی خودای تێدایە، هەر كات لە نێوان دوو ئەمرەكەدا بەدوای رەزامەندی خودادا دەگەڕای و نەتئەزانی كامیان رەزامەندی زۆرتری تێدایە، ئا لەو بارەدا كە خودا دەبینێت تۆ بەدوای رەزامەندی ئەودا دەگەڕێیت حاڵەتێكی بەرز و بڵندت پێدەبەخشێت، تەنانەت با لە هەڵبژاردنەكەشدا نەتپێكابێت، لەبەر ئەوەی گومانت وابردووە ئەمەیان لەلای خودا خۆشەویستترە و زیاتر لەمەیان رازییە ئەوا ئەو نێت و ئیخلاص و ویستەت بۆ دەگەڕێتەوە و باربووی هەموو كارە باشە لەدەستچووەكانت بۆ دەكاتەوە، كۆمەك هەر لای خودایە.
"كۆبوونەوە" موشاهەدەی فەردانییەت و تاقوتەنهایی خودایە كە هەرچی رێورەسمی مەشهەدەكانی ترە تیایدا فانی دەبێت، ئەمە بریتییە لە "كۆبوونەوە" لە پەروەردگارێتیدا (جمع في الربوبية).
باڵاتر لەمە: "كۆبوونەوە"یە لە خوایەتی خودادا (جمع في الألوهية) كە بریتییە لە كۆبوونەوەی دڵ و هیممەت و پەنهانی كەسەكە لەسەر مەحبووب و مورادەكەی كە خودای موتەعالە، وەستانە بە هەموو دڵەوە لەسەر خودای موتەعال، بەلای چەپ و راستدا لاناكاتەوە، كە هیممەتی بەندە تامی ئەم كۆبوونەوە"ی كرد: ئەوا تامەزرۆبوونی خاوەنەكەی پەیوەست دەبێت بە خوداوە و ئاگری خۆشەویستی داوا لە دڵیدا بڵێسە دەسێنێت، ئارامگرتن بۆ گەیشتن بە مەحبووب دەبێت بە گرانترین شت لەلای، وەك وتراوە:

والصبر يحمد في المواطن كلها إلا عليك فإنه لا يحمد

هاوار بۆ هیممەتی دەرونێك كە گەردەشی هەموو گەردوونی كردووە و ئاسمانەكانی بڕیوە، گۆچانی ڕۆیشتن بەرەو خودای لە هیچ شوێنێك دانەنا تا گەیشتە خزمەتی "الرحمن"-تبارك وتعالى- سوژدەیەكی شوكری لەبەردەمدا برد بۆ ئەو گەیشتنە بە دیداری، ئەو بەردەوام لە سوژدەدا بوو تا پێی وترا﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ فَٱدْخُلِى فِى عِبَٰدِى ﴿٢٩﴾ وَٱدْخُلِى جَنَّتِى ﴿٣٠﴾ ﴾ الفجر: ٢٧ - ٣٠

پاكێتی بۆ ئەو خودایە جیاوازی خستۆتە نێوان دروستكراوەكانییەوە لە هیممەت و لێبڕاندا، تا دەبینی جیاوازی نێوان دوو هیممەت وەك دووری نێوان دوو خۆرهەلات و دوو خۆرئاوا وایە، بەلكو دوورترە لە ماوەی نێوان نزمترین خال و بەرزترین بەرزی، هەموو ئەوانەش بەخششی خودایەكن كە "عزیز و حكیم"ە﴿ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٤﴾ ﴾ الجمعة: ٤.

بەم جۆرە و بەم دوو "كۆبوونەوە"یە چێژێكی بێوێنە لە موناجاتی پەروەردگاری دەبینێت، هۆگری دەبێت و لێی نزیك دەبێتەوە، تا وای لێ دێت وەك ئەوەی قسەی لەگەلدا بكات و لەگەلی دانیشتبێت، تاوێك عوزرخوایی بۆ دەهێنێتەوە و تاوێك لێی دەپاڕێتەوە و تاوێكیش مەدح و سەنای دەكات، تا دلی بەم موناجاتە دەكەوێتە قسە و دەلێت ((أنت الله الذي لا إله إلا أنت)) بەبێ ئەوەی لە وتنی ئەوەدا دل هیچ زۆرێك لەخۆی بكات، بەلكو ئەوە وەك حال و مەقام تیایدا دەمێنێتەوە، وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((**الإحسان أن تعبد الله كأنك تراه**)) بەم جۆرەیە قسەكردن و موناجاتی بەندە لەگەل پەروەردگاری، وەك ئەوەی ببینێت لە بەردەستی پەروەردگاریدایە، ئارام دەبێتەوە و بەلایەوە دلنیا دەبێت، بۆیە كلپەی دوعا و پاڕانەوەی زیاد دەكات، خۆی زەلیل و گەردنكەچ دەكات بۆ خودایەكی دەولەمەند-**سبحانه**- هەروەها بەندایەتی خۆی لە بەردەستی پەروەردگاردا دەردەبڕێت، خودا-**سبحانه**- پێیخۆشە بەندەكەی داوای لێبكات و ڕەغبەتی هەبێت بۆ لای ئەو، چونكە گەیشتنی چاكە و ئیحسانی خودا بە داواكردنی بەندەوە بەستراوە، بەلكو ئەو لە سەرەتاوە بە فەزلی خۆی و بەبێ داواكاری بە بەندەكەی بەخشیوە، بەبێ دوعا و پاڕانەوە و بوونی ناوەند لە نێوان خۆی و داواكەیدا، بەلكو ئەو فەزلەی بۆ بڕیار دراوە بەبێ هۆیەك لە بەندەكەیەوە، پاشان فەرمانی كردووە بەندەكانی داوای لێبكەن و لێی بپاڕێنەوە،

تاكو پلەی بەندایەتی و هەژاری و ئاتاجی خۆیـان دەربخـەن، و دانبنـێن بـە عیززەتـی پەروەردگارییدا و كەماڵی دەوڵەمەندی ئـەو و تاكوتـەنهابوونی لـە فـەزڵ و ئیحسـاندا، بەندە چـاوتروكانێك بێنیـازیی لـە پـەروەردگاری نییـە، بۆیـە داوا و پاڕانـەوەی خـۆی دەكات وەك كەسێك كە دەزانێت: بەو داوا و پاڕانەوەیە شایستەی هیچ شتێك نییە لـە خوداوە، بەڵام پەروەردگاری پێیخۆشە داوای لێبكرێت و بەندەكانی رەغبەتیان بۆ لای ئەو هەبێت و لێـی بپاڕێنـەوە، خـودای موتـەعال دەفـەرموێت ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ ﴾غـافر: ٦٠، هـەروەها دەفـەرموێت ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾ ﴾ البقـــــرة: ١٨٦، هەروەها ﴿ وَاسْأَلُوا اللَّهَ مِن فَضْلِهِ ﴾النسـاء: ٣٢، هـەروەها ﴿ قُلْ مَا يَعْبَأُ بِكُمْ رَبِّي لَوْلَا دُعَاؤُكُمْ ﴾الفرقـان: ٧٧، هـەروەها ﴿ ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ﴾الأعـراف: ٥٥، هەروەها ﴿ وَادْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا ﴾الأعراف: ٥٦.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((با هەر یەك لە ئێوە هەموو شتێك لە خودا داوا بكات، تـا چاككردنەوەی قوڵفی نەعلەكەی كاتێك دەپچڕێت، چـونكە گـەر خـودا ئاسـانی نـەكات ئاسان نابێت)) هەروەها دەفـەرموێت ((هـەر كـەس داوا لـە خـودا نـەكات لێـی تـووڕە دەبێت)) ئیمامی "الترمذي" لە ئیبن مەسعودەوە-خوا لێی رازی بێت- لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە فەرموویەتی ((لە فەزڵی خودا داوا بكەن، خودا پێیخۆشە لە فەزڵی داوابكرێت)) هەروەها دەفەرموێت ((بـۆ پـەروەردگارتان لـە رۆژەكـانی دەهـردا هەناسەی رەحمەت بوونی هەیە، خۆتان بدەنە بەر ئـەو هەناسـەی رەحمەتـە، داوا لـە خـودا بكـەن عـەیب و عارتـان داپۆشـێت و ترسـەكانتان بـۆ بگۆڕێـت بـە ئاسـایش)) هەروەها دەفەرموێت ((هەر كەس بە داوایەك داوا لە خودا بكات یـەكێك لـەم سیانەی بـۆ دێـت: یـان پێویسـتییەكەی بـۆ پێشـدەخات، یـان بـە ئەنـدازەی ئـەوە خێـری پێدەبەخشێت، یان بە ئەندازەی ئەوە شـەڕی لەسـەر لادەبـات، فـەرموویان: كـەوابوو دوعا زۆر دەكەین ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: خودا زۆرتر و زیـاترە)) هـەروەها دەفەرموێت ((هیچ شتێك بە ئەندازەی دوعا لەلای خودا بەرێز نییە)).

خودای موتەعال لە فەرموودەیەكی قودسیدا فەرموویەتی لە ئەبی زەڕەوە-خـوا لێـی رازی بێت- لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ((بەندەكانم هەمووتان برسـین جگـە لەوانـەی خۆراكم پێداون، داوای خواردنم لێبكەن خواردنتان پێدەبەخشم، بەندەكانم هـەمووتان رووتن جگە لەوانەی پۆشتەم كردوونەتەوە داوای پۆشتەكردنەوەم لێبكەن پۆشـتەتان

دەكەمەوە، بەندەكانم هەمووتان گومڕان جگە لەوانەی هيدايەتم داون داوای هيدايەتم لێبكەن هيدايەتتان دەدەم، بەندەكانم ئێوە بە شەو و بە ڕۆژ هەڵە دەكەن، من لە هەموو گوناهەكان خۆشدەبم، باكێكم نييە، داوای لێخۆشبوونم لێبكەن لێتان خۆشدەبم)) هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((سوژدە: دوعای زۆری تێدا بكەن، يەقينتان هەبێت وەڵامتان دەدرێتەوە))

عومەری كوڕی خەتتاب-خوا لێی ڕازی بێت- دەفەرموێت ((من خەمی وەڵامدانەوەی خودا هەڵناگرم، بەڵكو خەمی دوعا هەڵدەگرم، هەركات ئيلهامی دوعا دەكرێم دەزانم وەڵامدانەوەی لەگەڵە))

لەسەر ئەمە كەسێك دەڵێت:

لو لم ترد بذل ما أرجو وأطلبه      من جود كفك ما عودتني طلبا

خودا(ﷻ) زەليلی بەندەكانی لەبەردەستيدا پێخۆشە، هەروەها داواكردنی ئەوان لە خودا و داوای پێويستييەكانيان لە ئەو و سكاڵايان بۆ لای ئەو، و پەناگرتنيان بە ئەو و هەڵهاتنيان بۆ لای ئەو، وەك وتراوە:

قالوا: أتشكو إليه      ما ليس يخفى عليه

فقلت: ربي ربي      يرضى ذل العبيد لديه

## ۞ بە خودا دڵخۆشين، و داوای جێگيربوون و ڕاوەستاويی لێ دەكەين

كە ئەم زەليلی و گەردنكەچييە بۆ كەسەكە تەواو بوو: زانستی بۆ پەيدا دەبێت بەوەی فەزڵی پەروەردگاری بۆی پێشكەوتووە بەر لە دروستكردنی كەسەكە، لەگەڵ زانستی خودا بەو و بە كەمتەرخەمی و كەموكورتييەكانی ئەو، زانستی خودا بە كەموكورتی بەندەكەی ڕێگەی لێنەگرتووە لەوەی فەزڵ و چاكەی لەگەڵدا بكات.

گەر بەندە ئەمەی بينی: سرووری بە پەروەردگاری و شوێنەواری فەزڵ و ئيحسانی زياد دەكات، ئەمە خۆشييەكی پەسەندە و ناپەسەند نييە ﴿قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٥٨﴾﴾ يونس: ٥٨، فەزڵی خودا: بريتييە لە ئيسلام و ئيمان، ڕەحمەتی خودا: زانست و قورئانە، خودا پێی خۆشە بەندەكەی بەوە دڵخۆش و مەسرور بێت، بەڵكو پێويستە لەسەر بەندەكەی بە ئەنجامدانی چاكە دڵخۆش و

مەسروور بێت، ئەوەش لە حەقیقەتدا خۆشحاڵی بەندەیە بە فەزڵی خودا بەوەی کۆمەکی کرد و یارمەتی دا و کار ئاسانی بۆ کرد لە ئەنجامدانی ئەو چاکەدا، راستییەکە ئەوەیە کە بەندە دڵخۆشە بە فەزڵ و رەحمەتی خودا.

لە مەزنترین مەقامەکانی باوەڕ: سروور و دڵخۆشبوونە بە خودا، دڵخۆشە بەوەی "الله"–سبحانە– پەروەردگار و خودا و خاوەن نیعمەت و پەروەردەکارییەتی.

بەڵام کەسی ژیر و فامیدە لەگەڵ ئەو سروورەدا لە مەکری خودا دەترسێت، سروور نەفس دەکاتەوە و گەشەی پێدەدات و ئافات و نەنگی و ناتەواوییەکانی لەبیر دەباتەوە، چونکە گەر ئەوانە ببینرێن و بکەونە بەرچاوی لە خۆشی و سروور بێئاگای دەکەن و خەریکی دەکەن بە خۆیانەوە(بە ناتەواوییەکانییەوە).

هەر بەو جۆر دڵخۆشبوون بە نیعمەت هەندێ جار خاوەن نیعمەتەکەی لەبیر دەباتەوە، بەو پۆشاکی نیعمەتەوە خەریك دەبێت و لە خودا بێئاگا دەبێت، سروور و خۆشی دایدەگرێتەوە، تا وای لێ دێت بە نیعمەتی خودا بێئاگادەبێت لە خودا، ئالێرەوە مەکری خودایی لەو کەسە لە دەستەوە بۆ دەم نزیکترە.

زۆرن ئەوانەی خودا بە عیززەت و حیکمەتی خۆی نیعمەتیان لێ وەردەگرێتەوە، لەوانەیە ئەوە بۆ ئەوان رەحمەت بێت، چونکە گەر لەسەر ئەو حاڵەتە بەردەوام بوونایە ترسی لادان و لەسنوور دەرچوونی لێدەکرا﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَيَطْغَىٰٓ ﴿٦﴾ أَن رَّءَاهُ ٱسْتَغْنَىٰٓ ﴿٧﴾ ﴾ العلق: ٦ – ٧، گەر لادان و توغیان بە شتێکی کەمی دونیاییەوە سەرهەڵبدات، ئەی دەبێت بە دەوڵەمەندییەکی مەزنتر و گەورەترەوە حاڵی کەسەکە چۆن بێت؟(بۆیە خودا هەندێ حاڵی بەرز لە دۆستەکەی خۆی دەگرێتەوە تاکو بەو حاڵە بێنیاز نەبێت لە خودا و سنووربەزێنی بکات)

ئەو "مەکر"ەی کە دەبێت بەندە لە خوداوە لێی بترسێت: ئەوەیە کە بەندە بترسێت خودا–سبحانە– بینینی فەزڵ و منەتی پێشینەی لێ بزر بکات، نەزانێت ئەو نیعمەتانە تەنها منەتی خودایە لەسەر ئەو، ئەو تەنها بە خوداوەیە و لە خوداوە بوونی هەیە، بۆیە لە بینینی حەقیقەتی ئەم ئایەتە پیرۆزە بزر دەبێت ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ﴾ النحل: ٥٣، هەروەها﴿ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ ﴾آل عمران: ١٥٤، هەروەها﴿ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَهُوَ

﴿ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ۝١٠٧﴾ یونس: ١٠٧، هەروەها﴿وَمَا كُنتَ تَرۡجُوٓاْ أَن يُلۡقَىٰٓ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبُ إِلَّا رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۖ﴾القصص: ٨٦، هەروەها﴿وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُۗ﴾النور: ٢١، هاوشێوەكانی ئەم ئایەتانە، ئەو مەكرە خوداییە لە بینینی هەموو ئەم ئایەتانە بزری دەكات، لە كەسپ و داوایدا دەیداتە دەست مەعریفەی خۆی، دەیداتە دەست نەفسی خۆی كە لە خودی خۆیدا ئاتاجە بە خودا، پەردە دەخاتە نێوان ئەو و ئەو زاتە مەزنەی كە بە زات پڕە لە دەوڵەمەندی و وەفاداری بە بەڵێنی خۆی، ئەمەش لە مەزنترین هۆ و هۆكاری مەكری خودایە، خودا تەنها كۆمەككارە.

توانا و لێبڕانی بەندە هەرچییەك بێت و هەرچەندە بێت نابێت لەم ترسە جیاببێتەوە، باشترین دروستكراوەكان و هەڵبژاردەكانی خودا لێی ترساون، شوعەیب(ﷺ) دەفەرموێت –كاتێك هۆزەكەی پێیان وت–﴿لَنُخۡرِجَنَّكَ يَٰشُعَيۡبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَكَ مِن قَرۡيَتِنَآ أَوۡ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَاۚ قَالَ أَوَلَوۡ كُنَّا كَٰرِهِينَ ۝٨٨ قَدِ ٱفۡتَرَيۡنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا إِنۡ عُدۡنَا فِي مِلَّتِكُم بَعۡدَ إِذۡ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنۡهَاۚ وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَاۚ وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًاۚ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَاۚ﴾ الأعراف: ٨٨ – ٨٩، ئەمرەكەی گێڕایەوە بۆ ویست و زانستی خودا، وەك ئەدەبێك لەگەڵ خودا و ناسینی حەقی پەروەردگاری و وەستان لە سنووری بەندایەتیدا، ئیبراهیم(ﷺ) هەر بەو جۆرەی فەرموو بە هۆزەكەی–كاتێك ئەوان بە خواكانیان ئیبراهیمیان دەترسان–﴿وَلَآ أَخَافُ مَا تُشۡرِكُونَ بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّي شَيۡـٔٗاۚ وَسِعَ رَبِّي كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًاۚ﴾الأنعام: ٨٠، ئەمرەكەی گێڕایەوە بۆ لای ویست و زانستی خودا، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿أَفَأَمِنُواْ مَكۡرَ ٱللَّهِۚ فَلَا يَأۡمَنُ مَكۡرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ۝٩٩﴾ الأعراف: ٩٩.

پێشین جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە: ئایا ناپەسەندە ئەگەر بەندە لە دوعاكانیدا بڵێت **"اللهم لا تؤمني مكرك"**–خودایە لە مەكری خۆت بێئاگام مەكە و ئاسایشم پێ مەدە.

هەندێ لە پێشین ئەو دوعایەیان دەكرد و مەبەستیان ئەوە بوو: كە شەرمەزارم مەكە تا لە مەكری تۆ بێئاگا ببم و لێی نەترسم، بەڵام موتریفی كوڕی عەبدوڵای كوڕی شەخیر دوعاكە بە پەسەند نازانێت.

ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێت: لە عەبدولوەهابەوە لە ئیسحاقەوە لە موتریفەوە: لای پەسەند نەبوو بوترێت (("خودایە یادی خۆتم لەبیرمەبەرەوە و لە مەكری خۆت ئەمینم

مەكە" بەڵكو دەڵێم: خودایە یادی خۆتم لەبیرمەبەرەوە و پەنات پێدەگرم گەر لە مەكری تۆ ئەمین بم تا ئەو كاتەی تۆ ئەمن و ئاسایشم پێدەبەخشی))

پوختەكەی ئەوەیە هەر كەس رەوانەی لای نەفسی خۆی بكرێت ئەوە مەكری خودایی لەسەرە.

هەروەها ئیمام ئەحمەد دەفەرموێت: ئەبو سەعید-مەولای بەنی هاشم- بۆی باس كردین لە صەلتی كوڕی طريفي مەعولییەوە لە غەیلانی كوڕی جوبەیرەوە لە موتریفەوە فەرموویەتی ((مرۆڤم بینییەوە لە نێوان خودا و شەیتاندا پاڵكەوتبوو، گەر خودا خێر لە دڵیدا ببینێت بۆ لای خۆی رایدەكێشێت، گەر خێری تیا نەبێت: دەیداتە دەست نەفسی خۆی، هەر كەسیش بدرێتە دەست نەفسی خۆی تیادەچێت))

جەعفەری كوڕی سولەیمان دەفەرموێت سابت لە موتریفەوە بۆمان دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: گەر دڵم دەربهێنن و بیخەنە دەستی چەپمەوە و خێریش بهێنن لە دەستی راستم دایبنێن، پاشان لەیەكتر نزیك بكرێنەوە، ناتوانم شتێك لەو خێرە بخەمە ناو دڵمەوە تا خودا-عزوجل- نەیخاتە دڵمەوە.

ئەوەی بەڵگەیە لەسەر بوونی مەكری خودا لە خۆشحاڵیدا گەر ترسی لەگەڵ نەبێت ئەم ئایەتە پیرۆزەیە ﴿ فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّىٰ إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ الأنعام: ٤٤، هەروەها هۆزەكەی قارون بە قارونیان دەیانوت ﴿ لَا تَفْرَحْ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْفَرِحِينَ ﴿٧٦﴾ ﴾ القصص: ٧٦، هەر كاتێك دڵخۆشی بە خوداوە بێت و بەو شتەوە بێت كە خودا بە منەتی خۆی بە بەندەكەی بەخشیوە و هاوڕێ بێت لەگەڵ ترس و ئاگاهیی ئەوا زیان بە خاوەنەكەی ناگەیەنێت، هەر كات خاڵی بوو لەوە بەبێ هیچ گومانێك بە زیان بەسەریدا دەشكێتەوە.

ئەوەی یارمەتی دەدات لە پاڵفتەكردنی سروور و دڵخۆشی لە خەوشوخاڵی لادان و زیادەڕەوی: ئەوەیە كە زیادەڕەوی لە شوكردا بكات و شوكری زۆری خودا بكات، لەگەڵ ئەوەشدا یەقینی هەبێت بەوەی كە ناتوانێت بە تەواوی شوكری خودا بكات، شوكری بەندە بۆ پەروەردگاری: نیعمەتێكە و بە بەندەكەی داوە بۆیە ئەو شوكركردنە پێویستی بە شوكرێكی ترە، ئەو شوكرەی تریش دیسان نیعمەتێكی ترە، ئیتر بەو جۆرە، رێگەیەك نییە بۆ شوكری خودا بە تەواوی كەس ناتوانێت شوكری خودا بكات

مەگەر خۆی، خودای موتەعالە نیعمەت ببەخشێ و شوكر دەكات، ئەو خاوەنی ناوی "الشكور"ە و هەر خۆی دەتوانێت شوكری خۆی بكات، با بەندەكەشی ناوی "الشكور"ی بۆ بەكاربهێنرێت، مەدحی شوكریش لە راستیدا: تەنها بۆ خودا دەگەڕێتەوە و لەسەر ئەو وەستاوە، ئەو شكوری نەفسی خۆی دەكات بەوەی شوكری بە بەندەكەی بەخشیوە، بۆیە جگە لە ئەو كەس شكور ناكرێت.

شوكر سیفەتی پەروەردگار و كاری ئەوە، ئەو خۆی ناو ناوە "الشكور" وەك دەفەرموێت ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ۝١٤٧﴾ النساء: ١٤٧، ئەهلی بەهەشت دەڵێن ﴿إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ ۝٣٤﴾ فاطر: ٣٤، كە بەندە تێبینی پێشینە فەزڵی خودای كرد: دەزانێت خودا -سبحانە- ئەو كارەی بەهۆی خۆشەویستییەوە بۆ شوكر ئەنجامداوە، خودای موتەعال پێیخۆشە شوكر بكرێت، وەك موسا(ﷺ) فەرمووی ((پەروەردگار، بۆ هەموو بەندەكانت یەكسان نەكرد؟ فەرمووی: دەمەوێت شوكرم بكرێت))

بۆیە خودا شوكری پێخۆشە و ئەو -سبحانە- لەپێشترە پێی وەسف بكرێت، هەر وەك ئەوەی خودا ویترە و ویتری خۆشدەوێت، لێبوردەیە و لێبوردنی خۆشدەوێت، باوەڕداری بەهێز لای خۆشەویستترە لە باوەڕداری لاواز، هەر بەو جۆرە خودا "الشكور"ە و شوكركەرانی خۆشدەوێت، سەرنجی بەندە بۆ پێشینە فەزڵی خودا سیفەتی شوكری نیشان دەدات و هانی دەدات بۆ ئەنجامدانی كاری شوكر.

### ۞ یاوەرییەكانی سەرەتا دەگێڕێتەوە بۆ شكور دوای خاوبوونەوە و ساردبوونەوە

كاتێك سالیك نەفسی خۆی لەبیرچوویەوە و دڵخۆشییەك رووی تێكرد كە ترسی لەگەڵ نەبوو، با پێداچوونەوە بۆ یادەوەرییەكانی سەرەتای سلوكی خۆی بكات، و توندوتۆڵی داوای خۆی بهێنێتەوە پێش چاوی، بەڵكو بگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمە لە رۆیشتنی بەرەو خودا كە ترس هانی دەدا و پاڵی پێوە دەنا، دەرئەنجام ئەو خاوبوونەوە و ساردبوونەوەیە كۆتایی پێ بهێنێت كە لە سروورەوە پەیدا دەبێت.

چوونە ناو خاوبوونەوە و ساردبوونەوە بۆ سالیكان: كارێكە بەبێ هیچ گومانێك رووی تێدەكات، هەر كەس خاوبوونەوەكەی بۆ لای نزیكبوونەوە و پێكان بێت و لە فەرزەكان دەرینەكرد و نەیبردە ناو حەرامەوە: رجای بۆ دەكرێت بگەڕێتەوە سەر باشتر لەوەی لەسەری بوو.

عومەری کوڕی خەتتاب-خوای لیّ رازی بێت- دەفەرموێت ((ئەم دلانە رووتێکردن و پشتهەڵکردنیان بۆ هەیە: گەر دلان روویان تێکرد(واتە حەزی رۆیشتنیان بۆ لای خودا تیادا دروست بوو) ئەوا نەوافیلەکانیان پیّ ئەنجام بدەن، گەر پشتیان هەڵکرد فەرزەکانیان پیّ جێبەجیّ بکەن))

لە خاوبوونەوە و تەمومژ و پەردە کە روو لە سالیکان دەکەن حیکمەتیکی گەورەی تێدایە کە تەنها خودا وردەکارییەکانی دەزانێت، بەوەش(بەو خاوبوونەوانە) راستگۆ لە درۆزن جیادەبێتەوە.

درۆزن پاشگەز دەبێتەوە و دەچێتەوە سەر رێوڕەسمی سروشت و حەز و ئارەزووی خۆی.

راستگۆش: چاوەڕوانی دەروو دەکات و لە رەوحی خودا بێهیوا نابێت، و نەفسی خۆی بە زەلیلی و گەردنکەچی و هەژارییەوە دەخاتە بەر دەرگانەی ئەو-سبحانە- وەك ئەو دەفرە بەتاڵەی کە هیچی تێدا نییە، چاوەڕوانە خاوەن دەفرەکە و دروستکەرەکەی شتێکی تیا دابنێت بۆی گونجاو بێت، نەك بە هۆیەکەوە لە بەندەوە-هەرچەند نیشاندانی هەژاری و ئاتاجی مەزنترین هۆیە- بەڵام ئەوەش دیسان لە تۆوە نییە، ئەوە خودایە ﴿يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ﴾ الأنفال: ٢٤.

کە بینیت خودا لەو مەقامەدا تۆی دانا: بزانە ئەو دەیەوێت رەحمت پێبکات و دەفرەکەت پڕ بکات، گەر دڵت لەو شوێنە گونجاوەدا دانەنا بزانە ئەو دڵە دڵێکی وێڵ و بزربووە، داوا لە پەروەردگاری ئەو دڵە بکە -کە لەنێوان پەنجەکانیدایە- ئەو دڵەت بۆ بگێڕێتەوە و پێکەوە کۆببنەوە و بەیەکتر شادببنەوە.

پێغەمبەر(ﷺ) رایگەیاندووە ((بۆ هەر کردارێك لوتکەی سووربوون و گەشە هەیە، و بۆ هەر لوتکەیەکی گەشە و سووربوونیش خاوبوونەوە و ساردبوونەوە هەیە))

داوای کەسی لێبڕاو: خاوبوونەوە رووی تێدەکات، لەو خاوبوونەوەیەدا تامەزرۆیی بۆ کاتی داوا و کۆشانی خۆی بۆ دروستدەبێت.

لەوانەیە سالیك سەرەتایەکی خاوەن چالاکی هەبووبێت، لەو سەرەتاوە هیممەتێکی بەرزی بۆ پەیدابووبێت، لە کاتی خاوبوونەوەیدا بیرکردنەوە لەو سەرەتا باش و تایبەتە خزمەتی پێدەکات، لێبڕانی نویّ دەبێتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ سەر باری شوکرکردن بۆ خودا.

جونەید-رەحمەتی خوای لێ بێت- زۆر باسی سەرەتای سەیر و سلوكی خۆی دەكرد، هەر كات باسی دەكرد دەیفەرموو: هاوار بۆ شەوق و تامەزرۆیی سەرەتاكان!
واتە: چێژی كاتەكانی سەرەتای سەیر و سلوك و كۆبوونەوەی هیممەت لەسەر داواكەی(واتە لەسەر خودا) و رۆیشتن بەرەو خودا و پشتهەڵكردن لە خەڵكی.
هەر بەو جۆرە چەندین سەرەتای فەردار بۆ كەسی باوەڕداری شوكركەری راستگۆ هەیە، نەك تەنها یەك سەرەتا، كاتەكەی ئاوەدان و پڕ لەخێر بووە، بۆ هەر كاتێك ئەوەی بۆی شیاو و گونجاوە ئەنجامی داوە، تەنانەت كۆمەك رووی تێدەكات بۆ هەر كارێك كە نێتی كردنی هەیە لەو كاتە دیاریكراوەی پێی شیاو و شایستەیە، و لە كاتی زۆربوونی پێویستی سالیك بەو جۆرە كارانە.
چونكە ئەو شتەی كە لە كاتی خۆیدا دێتە پێشەوە كە شایستەترین كاتە بۆ ئەنجامدانی: چاكتر و باشتر و گونجاوترە، هەروەك داباریینی ئەو بارانەی كە لە كاتی وشكەساڵیدا دادەبارێت، یان وەك ئەو دەرووەی كە لە كاتی شیاوی خۆیدا بەرووی كەسێكدا دەكرێتەوە.
هەر كەس لە ئەقدارەكانی پەروەردگار رابمێنێت، و سەرنجی جاریبوونیان بەسەر خەڵكدا بدات، دەزانێت لە شیاوترین كاتیاندا روویانداوە، شێخی هەروی بەڵگە لەسەر ئەم راستییە دەهێنێتەوە بە ئایەتی﴿ ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَا مُوسَىٰ ۝٤٠ ﴾ طه: ٤٠.
رووی بەڵگەهێنانەوەكەی بە ئایەتەكە: خودا(ﷻ) هاتنی موسای لە پێویستترین كاتدا تەقدیر كرد، عەرەب دەڵێن: فلان كەس بەسەر قەدەردا هات، گەر لە كاتی پێویست بوون بەو كەسە هاتبێت، جەریر دەڵێت:

نال الخلافة إذ كانت على قدر كما أتى ربه موسى على قدر

خودای موتەعال موسای رەوانە كرد كە خەڵكی زۆر پێویستی بەو رەوانە كردنە هەبوو، هەر بەو جۆرە ناردنی عیسا(عليه السلام) .
هەروەها ناردنی محمد(ﷺ): هەموو مرۆڤایەتی لە ئاتاجترین كاتدا بوون بۆ رەوانەكردنی.
بەم جۆرە بەندە كاتەكانی خۆی لەگەڵ خودا بە بەسوودترین كار پڕ دەكاتەوە، كار و كردەوەیەك كە پێویسترین كار و كردەوەن بۆ پڕكردنەوەی كاتەكان.

گەر خودا خێری بۆ بەندەیەك ویست: بە كات یارمەتی دەدات، وادەكات كاتەكەی یارمەتیدەری بێت، گەر شەڕ بۆ بەندەیەك ویسترا: كاتەكە دژی دەبێت، و كاتەكەی تاڵاو دەخاتە ناو ژیانییەوە، هەر كات دەیەوێت ئامادەباشی بۆ ڕۆیشتن وەربگرێت: كات یارمەتی نادات، ئەوەی یەكەمیان هەر كات دەیەوێت پاڵبداتەوە كاتەكەی ڕاستی دەكاتەوە و یارمەتی دەدات.

## ۞ ڕجای پاك و بێگەرد ئەوەی پێیەوە هۆگر دەبیت نیشانت دەدات

كە پاك و بێگەردیی هاوتای شوكر بوو: كات دەبێت بە كاتی وەجدی ڕاستگۆیانە، بەبێ زۆر لەخۆكردن بۆی و بەبێ كاركردن بۆ بەدەستهێنانی، ئەم وەجدە: هۆگری پێدەبەخشێت بەوەی دەیبینێت لە فەزڵی خوداوەیە بەسەر ئەوەوە.

خـودای موتـەعال دەفـەرموێت ﴿فَلَمَّا قَضَىٰ مُوسَى ٱلْأَجَلَ وَسَارَ بِأَهْلِهِۦٓ ءَانَسَ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ نَارًا قَالَ لِأَهْلِهِ ٱمْكُثُوٓا۟ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا﴾ القصص: ٢٩

ئەو بینینە بینینی چاوی ڕووت نەبوو: بەڵكو بینینێك بوو كە دڵ هۆگری بوو بوو، موسا ئارامی خۆی لەو شوێنە دەبینییەوە، چونكە كەسێك دوژمنەكەی ببینێت یان ترسێك ببینێت ناوترێت: "آنسە"-هۆگری بوو.

مەبەستەكە: ئەو كاتە كاتی وەجدە، خاوەنەكەی ڕاستگۆیە تیایدا بەهۆی بینینی ڕۆشنایی فەزڵی خودا و منەتی ئەو لەسەری، "فـەزڵ" ئـەو بەخششـەیە كـە كەسـەكە شایستەی پێدانی نییە، یان زیاد لە حەقی خۆی پێی دەدرێت، كە هۆگری ئـەو فەزڵـە بوو و بەدڵ هەستی پێكرد و بینی: لـە ناخیدا وەجدێكی تـر دروست دەكـات، هـانی خۆشویستنی خاوەن فەزڵەكە دەدات و شەوق بۆ لیقا دروست دەكات، چـونكە نـەفس لەسەر خۆشەویستی ئەوانەی چاكەی لەگەڵ دەكەن بارهاتووە.

سەردانی هەندێ لە دۆستانم كرد، وەجدێكی بۆ بەدەست هـاتبوو هێنابوویـە گریـان، پرسیارم لێكرد دەربارەی؟ وتی: یادی ئەو منەتە خۆییەم كردەوە كە لـە سـوننەت و ناسینی سوننەت پێـی بەخشـیوم، و ڕزگـاربوون لـە تەمومـژی دەسـتەكانی تـر، واتـە ئەهلی بیدعە، و ڕێسا و یاسا پووچەكانیان، هەروەها ئـەوەی مـن لەسـەری دەڕۆم لـە تەبایی نێوان ئەقڵی دروست و فیترەتی سـەلیم و ئـەوەی پێغەمبـەر هێناویـەتی، ئـەو حاڵە زۆر دڵخۆشی كردم تا هێنامییە گریان.

ئەم وەجدە هۆگربوون بە فەزڵ و منەتی خوداوە دروستی کرد.

ئەم وەجدە، یان ئەم هۆگربوونە، یان ئەم فەزڵە رجایەکی پاك و بێگەردی بێ لێڵـی و تەومژ رایدەکێشێت کە هاوتایە لەگەڵ شوکردا، رجای پاك و بێگەرد ئەوەیە لێڵی ئەندێشەی خستنەبری و باربووکردنەوەی لە تۆوە تێکـەڵ نـەبێت، بـەڵکو رجایـەکی رووتە بەو کەسەی کە لە ئەزەلەوە نیعەمەتی بـۆ دیـاری کـردووی بـەبێ ئـەوەی تـۆ شایستەی بیت، فەزڵ هەر هەموو بۆ ئەوە و لە ئەوەوەیە، هۆکارەکان و ئامانجەکان هـەر هـەموو لەدەسـتی ئەودایـە، بەنـدە ناتوانێـت شـتێك بەدەست بهێنێـت بـەبێ کۆمەکی و مۆڵەت و ویستی ئەو(ﷻ)

بەرانبەر بەمە: جۆرە وەجدێك بوونی هەیە کە راستگۆیی سالیکەکە لە ترسان لە خودا سەری پێهەڵدەدات، یەکەمیان هۆیەکەی رجایە و ئەمەیان هۆیەکەی ترسە.

یان وەجدێك کە خۆشەویسـتی کێشـی دەکـات، هـەر کـات خۆشەویسـتی بـەهێز بـوو: ئاگرەکەی لە دڵدا گڕ دەگرێت، ئەو کاتە کڵپەی تامەزرۆبوون بـۆ لیقـای خۆشەویسـتی لێوە پەیدا دەبێت.

ئەم سیانە: خۆشەویستی و ترس و رجا، ئەو سـیانەن کـە هـانی کەسـەکە دەدەن بـۆ ئاوەدان کردنەوەی کاتەکان بە شتێك کە لەپێشـتر و قـازانجتر بێـت بـۆ خاوەنەکـەی، ئەوەش بنچینەی سەیر و سلوکە بـۆ لای خـودا، خـودای موتـەعال ئـەو سـیانەی لـەم ئایەتــەدا کۆکردۆتــەوە﴿ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ ۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا ﴿٥٧﴾ ﴾ الإسراء: ٥٧

❁ ❁ ❁

## (٥٥) (منزلة الصفاء)

# مەنزیلەی صەفا ( پاڵفتەبوون و پاک و بێگەردی )

لە مەنزیلەکانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی صەفایە.

خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ ٱلْمُصْطَفَيْنَ ٱلْأَخْيَارِ ﴿٤٧﴾ ﴾ ص: ٤٧.

"الصفا" ناوێکە بۆ بێگردبوون لە لێڵی.

رووی بەڵگە هێنانەوە بە ئایەتەکە: "المصطفى" لەسەر کێشی "مفتعل" لە "الصفوة"ەوە هاتووە کە بریتییە لە پوختەی شتێك و پاڵفتەکردنی لەو شتەی تێکەڵی بووە، لەوەوە: "إصطفى الشيء لنفسه" واتە پاڵفتەی کرد لە بەشی خەڵتەی کەسانی تر تیایدا، هەر لەوەوە: "الصفي" ئەو بەشە بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) جیای دەکردەوە لە غەنیمە بۆ خۆی، لەوەوە: "الشيء الصافي" ئەو شتەیە کە لە لێڵی و خەوشی شتی تر پاکبووەتەوە و پاڵفتە بووە.

### ۞ مۆڵەتی گوزەرکردن.... مەرجەکەی خۆداڕنینە

بنچینەکەی: پاڵفتەبوونی زانستێك کە مرۆڤ پاك بکاتەوە بۆ گرتنەبەری رێگە و لەوێشەوە هیممەتی خاوەن مەبەست راستبکاتەوە.

ئەو زانستە پاڵفتەیە بریتییە لەو زانستەی پێغەمبەر(ﷺ) بە دیاری بۆ مرۆڤایەتی هێنا.

جونەید هەمیشە دەیفەرموو: ئەم زانستەی ئێمە بە کیتاب و سوننەتەوە کۆتوبەندە، هەر کەس قورئانی لەبەر نەبێت و فەرموودە نەنوسێت و قووڵنەبێتەوە لە تێگەیشتنندا: شوێنی ناکەوین.

هەروەها دەیفەرموو: ئەم زانستەی ئێمە لەگەڵ فەرموودەی پێغەمبەردا(ﷺ) چنراوە.

ئەبو سولەیمانی دارانی دەیفەرموو: بەدڵمدا خاڵێك لە خاڵەکانی ئەم دەستەیە(مەبەستی ئەهلی زوهد و تەصەوف بووە) گوزەر دەکات وەریناگرم بە دوو شایەتی دادپەروەر نەبێت لە کیتاب و لە سوننەت، نەصر ئابادی دەڵێت: بنچینەی

ئەم مەزهەبە (تەصەوف) پابەندبوونە بە كیتاب و سوننەتەوە و وازهێنان لە حەز و ئارەزوو و بیدعە، و شوێنكەوتنی پێشین و دەستبەرداربوونی ئەوەی خەڵكانی تر دایانهێناوە، وەستان لەسەر ئەوەی جیلی یەكەم لەسەری وەستابوون.

ئەم زانستە پاڵفتەیە، وەرگیراو لە چرای وەحی و پێغەمبەرایەتی: كەسەكە پاڵفتە دەكات بۆ گرتنەبەری رێگەی بەندایەتی، حەقیقەتەكەی بریتییە لە: ئەدەب وەرگرتن لە ئادابەكانی پێغەمبەر(ﷺ) لە ناوەوە و لە دەرەوە و بەحەكەم كردنی پێغەمبەر لە ناوەوە و لە دەرەوە، وەستان لەگەڵی لە هەر شوێنێك تۆی وەستان، و رۆیشتن لەگەڵی بۆ هەر كوێیەكی بردیت.

هەرگیز سەرپێچی لێ مەكە، بەڵكو پێغەمبەر(ﷺ) بكە بە ئیمام و پێشەوا و حەكەم، وەڵامی بدەرەوە گەر بانگی لێ كردی، بوەستە لەگەڵی گەر داوای وەستانی لێكردی، لەگەڵی برۆ بۆ هەر كوێ دەڕوات، بمێنەرەوە لەگەڵی گەر مایەوە، لە كوێ چادری هەڵدا چادر هەڵبدە، بە توورەبوونی ئەو تووڕە ببە و بە رازیبوونی رازی ببە، گەر هەواڵی بە شتێك پێدای وابزانە بە چاوەكانت دەیبینی، گەر هەواڵێكی لە خوداوە پێ گەیاندی وا دابنێ خۆت لە خوداوە بە گوێیەكانت بیستووتە.

بە كورتی: پێغەمبەر بكە بە مامۆستا و پەروەردەكەر و ئەدەبدادەرت، واسیتە لابە لەنێوان خۆت و ئەودا جگە لە تەبلیغی پەیام، وەك چۆن واسیتەت لابردووە لەنێوان خۆت و خودادا جگە لە بەندایەتی، هیچ ناوەندگیرییەك ساغ نەبووەتەوە جگە لە گەیشتنی ئەمر و نەهی و پەیامەكەی بۆ تۆ.

ئەم دوو جۆرە خۆدارنینە: بریتین لە شەهادەتی "أن لا إلـه إلا الله وان محمدا عبـده ورسوله"، خودا بە تەنها خۆی پەرستراوە و هیچ كەس لەخوار ئەوەوە شایستەی پەرستن نییە، پێغەمبەرەكەی: گوێبۆگیراو و شوێنپێ هەڵگیراوە، ئەو كەسەیە دەتگەیەنێت بە هیدایەت و كەس شایستەی گوێ بۆگرتن نییە جگە لە ئەو، كەسانێك جگە لە پێغەمبەر: گوێیان بۆ دەگیرێت ئەگەر پێغەمبەر فەرمانی بە گوێگرتن بۆیان كردبێت، بۆیە بەپێی بنچینەكە گوێ بۆ ئەوانیش دەگیرێت.

زانستی بەدەستهاتوو بە شایەت و بەڵگە بریتییە لە زانستی راستەقینە، بەڵام ئەوەی بەبێ شایەت و بەڵگە بانگەشەی بۆ دەكرێت جێگەی متمانە نییە و پێی ناوترێت

زانست، بەڵێ زانستی بەدەستهاتوو لەوانەیە بەهێزببێت و زیاد بکات، تا وای لێ دێت زانراو ببێت بە بینراو، و نادیار ببێت بە بەرچاو، و زانستی یەقین ببێت بە حەقی یەقین، کارەکە لەسەرەتاوە تەنها شعور بێت، پاشان "ئەگەر" بێت، دواتر گومان بێت، ئەوجا"زانست" و بەدوایدا "مەعریفە"، پاشان"زانستی یەقین"، ئەوجا"چاوی یەقین" پاشان "حەقی یەقین"، هەموو ئەمانە لە پلەی سەروتر بەخۆیان دەپوکێنەوە، بەجۆرێك حوکم بۆ ئەو دەبێت (واتە ئەوەی سەروتر و بالآتر)نەك بۆ ئەمانەی خوارەوە، ئەمە حەق و راستییە بیزانە.

بانگەشەی جۆرێك لە زانست بەبێ هۆیەك لە بەڵگەهێنانەوە: دروست نییە، خودای موتەعال ناسین و پێناسەکانی بە "هۆ"کانەوە گرێداوە، بۆ هیچ مرۆڤێك زانستێك بەدەست نایەت مەگەر بە بەڵگەیەك کە ئاماژەی بۆ بکات، خودای موتەعال پشتیوانی پێغەمبەرانی کردووە بە چەندین جۆر لە بەڵگە و بورهان کە بۆی ساغکردوونەتەوە ئەوەی بۆیان هاتووە لە خوداوەیە، و بووە بە بەڵگەش بۆ ئوممەتەکانیان، مەزنترین بەڵگە و بورهانیان لەگەڵ بووە کە سەلماندوویانە ئەوەی بۆیان هاتووە لەلای خوداوەیە، بورهانەکان بەڵگە و شایەتن بۆ خۆیان و بۆ ئوممەتەکانیان، ئەو بەڵگە و شایەتانەی کە پێغەمبەران هەیان بوو و لەگەڵیان بوو مەزنترین شایەت و بەڵگە بوون، خودای موتەعال شایەتی راستێتی ئەوانی داوە بەو شایەتیانەی لەسەریان دەیدات، هەر زانستێك شان لەسەر بەڵگە دانەدات بانگەشەیەکە و هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نییە، حوکمێکە بێژەرەکەی هیچ بورهانێك لەسەری شك نابات، هەر شتێکیش بەو جۆرە بێت زانست نییە(بەڵکو وەهم و خەیاڵ و وەحی شەیتانییە).

سوودی ئەم باسە و تێگەیشتن لێی لە حەقیقەتی زانستی لەدونی"العلم اللدني"دا دەردەکەوێت کە هەندێك بانگەشەی ئەوە دەکەن خودا وەك ئیلهامێك و بەبێ هۆیەك لە ئەوانەوە و بەبێ بەڵگەهێنانەوە دەیخاتە ناو دڵیانەوە، ئێمە دەڵێین: زانستی لەدونی ئەوەیە کە بەڵگەی دروستی لەسەر بێت: ئەوەش ئەوەیە لەلای خوداوە هاتووە و لەسەر زمانی پێغەمبەران راگەیەنراوە، جگە لە ئەو زانستە هەر زانستێکی تر "لەدونی"ە لەلای مرۆڤەوە، لە مرۆڤەوە دەست پێدەکات و هەر لە مرۆڤدا کۆتایی پێدێت، بەناوی زانستی لەدونی شەقیبرد و نرخەکەی دابەزی، تا وای لێهاتووە هەر

دەستەیەك بۆخۆی بانگەشەی زانستی لەدونی دەكات، كەسانێك قسە لە حەقیقەتی باوەڕ و سلوك و دەروازەی ناو و سیفەتەكانی خودا دەكەن بەو جۆرەی خۆیان پێیان خۆش بێت و شەیتانەكەیان هەڵیبداتە ناو دڵیانەوە و دواتر بانگەشە دەكەن گوایە زانستەكەیان لەدونییە.

ئەوانە راست دەكەن و درۆش دەكەن، وشەی ((اللدني)) مەنسوبە بۆ لای ((لدن)) بەمانی ((عند)) وەك ئەوەی بڵێن "زانستەكەی خۆم یان لەلای خۆم"، واتە ئەو كەسەی كە زانستەكە لای خۆیەتی و هی خۆیەتی، خودای موتەعال لە كتێبەكەیدا زەمی ئەوانەی كردووە و دەفەرموێت ﴿وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٨﴾﴾ آل عمران: ٧٨، هەروەها دەفەرموێت ﴿ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَـٰبَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَـٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ﴾ البقرة: ٧٩، هەروەها﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ قَالَ أُوحِىَ إِلَىَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَىْءٌ ﴾ الأنعام: ٩٣، هەر كەس بڵێ: ئەم زانستە لەلای خوداوەیە -درۆ بكات لەو دانە پاڵ خودا- ئەوا بەشێكی گەورەی لەم زەمە بەركەوتووە، ئەم شێوەیە لە قورئاندا زۆرە، خودای موتەعال زەمی ئەوانە دەكات شتێك دەدەنە پاڵ خودا و زانستیان پێی نییە، هەروەها شتێك لەسەر خودا دەڵێن كە نایزانن، بۆیە خودا -سبحانە- حەرامكراوەكانی بۆ چوار ئاست دابەش كردووە، خراپترینیان بریتییە لە قسەكردن لەسەر خودا و بەدەم خوداوە بەبێ زانست، ئەوەی كردووە بە كۆتا ئاستی حەرامكراوەكان كە لە هیچ بار و دۆخێكدا حەڵاڵ ناكرێت، بەڵكو لەناو هەموو گەل و نەتەوە و ئایینەكاندا حەرامكراوە، هەر بەو جۆرە لەسەر زمانی هەموو پێغەمبەران، بۆیە ئەو كەسەی كە دەڵێت "ئەم زانستە "لەدونی"ە لەبەر ئەوەی نازانێت ئەوە لەلای خوداوەیە یان نە، هیچ بورهانێكی لە خوداوە لەسەر بانگەشەكەی پێ نییە بۆیە كەسێكی درۆزنە و درۆی بەدەم خوداوە كردووە، بەڵكو ئەو ستەمكارترین ستەمكار و درۆزنترینی درۆزنەكانە.

هەرچی دەرگایە داخراوە جگە لە یەك دەرگا ئەوەش شوێن پێهەڵگرنی پێغەمبەری خودایە(ﷺ)، بۆیە دەبێت لە ناوەوە و لە دەرەوە شوێن پێی هەڵبگیرێت.

كەسی سالیك جگە لەم رێگەیە گرنگی بە هیچ رێگەیەكی تر نادات، چونكە بەشی لەو رێگەیە تەنها ماندووبوونە و كردارەكانی وەك قورئان دەفەرموێت ﴿كَسَرَابٍۭ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ

ٱلظَّمْـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمْ يَجِدْهُ شَيْـًٔا وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٣٩﴾ ﴾ النور: ٣٩.

سالیك تەنها ئەم ڕێگەیە دەگرێتە بەر، ئەم ڕێگەیە بە ئەنجامی دەگەیەنێت با بە گاگۆڵكێش بڕوات، شوێنكەوتووانی پێغەمبەر(ﷺ) كە لە كاركردن ساردبوونەوە هیممەت و لێبڕان و شوێنكەوتنیان بۆ پێغەمبەرەكەیان ڕاستیان دەكاتەوە، وەك وتراوە:

من لي بمثل سيرك المدلل تمشي رويدا وتجيء في الأول

لادەران لە ڕێگەكەی پێغەمبەر(ﷺ) گەر كار و كردەوە و ئیجتیهادەكانیان ڕاستیان بكاتەوە ئەوا لادانیان لە شوێنكەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) دایان دەنیشێنێت و بە هیچ ئەنجامێكیان ناگەیەنێت.

بەڵكو كاروكردەوە و ئیجتیهادات بەبێ هیدایەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بریتین لە كاروكردەوەی نەفامی، با كاركەرانی ناوی ئیسلامیشی بۆ دابنێن، وەك ئەهلی نەفامی پێش هاتنی ئیسلام كارە نەفامییەكانی خۆیان ناو دەنا "ئیبراهیمی" یان "حەنەفی"، كاروكردەوەی نەفامانە تەنها شكست و پاشگەزبوونەوە بەسەر كاركەرانیاندا دەهێنن، بەڕوودا كەوتن و كوێربوون و لاڵی و كەڕی و دوژمنایەتی خودا و پێغەمبەر و دۆستایەتی شەیتان بەشی ئەوانەیە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُوا۟ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَـٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾ ﴾ الفرقان: ٢٣

## ۞ هیممەتی فەلەكی باڵا

ئەم صەفا زانستییە هیممەتی كەسی خاوەن مەبەست (ئەو كەسەی خودای بە مەبەست گرتووە) ڕاست دەكاتەوە، هەر كات هیممەت ڕاستبوویەوە بەرز و بڵند لێی دەوەستێت، بەربوونەوە و نزمبوونەوەی زانست بەهۆی نەخۆشی و ناتەواوی هیممەتەوەیە، ئەگینا وەك كڵپەی ئاگرێك وایە كە داوای بەرزبوونەوە دەكات گەر ڕێی لێ نەگیرێت.

بەرزترین هیممەت: هیممەتێكە بە خوداوە بەستراوەتەوە بە داوا و مەبەست و مەرام، خەڵكیش بە خوداوە پەیوەست دەكات بە بانگەواز و ئامۆژگاری، ئەمە هیمەتی پێغەمبەران و شوێنكەوتوانیانن، دروستیی هیممەت: پاككردنەوەیەتی لە دابەشبوونی داوا، هەروەها دابەشبوونی داواكراو، و دابەشبوونی ڕێگەی هیممەت، داواكراوەكەی بە

ئیخلاص یەكدەخات، هەروەها داواكەی بە صدق یەكلا دەكاتەوە و ڕێگەی هیممەتیش بە گرتنەبەری ڕێگە لەدوای دەلیلێكەوە كە خودا بە دەلیلی داناوە، نەك كەسەكە خۆی خۆی بە دەلیل دانابێت.

گەر دەتەوێ ئاستەكانی هیممەت بزانیت تەماشای هیممەتی ڕەبیعەی كوڕی كەعبی ئەسلەمی -خوا لێی ڕازی بێت- بكە، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: ((پرسیارم لێ بكە)) فەرمووی ((داوای هاوڕێیەتی تۆ دەكەم لە بەهەشتدا)) جگە لەو داوای تێركردنی سك و داپۆشینی پێستیان دەكرد.

تەماشای هیممەتی ئیبراهیم و ئیسماعیل -علیهما السلام- بكە، ئیبراهیم و كوڕەكەی گەیشتنە ئەو ئاستە بەرزەی تەسلیمبوون و لێبڕان كە ئامادە بێت سەری كوڕەكەی ببڕێت، كوڕەكەی لەسەر چیاكە بەسەر لادا خست و چەقۆكەی بەدەستەوە گرت و ویستی سەری ببڕێت، لەو حاڵەتەدا پشتی لە سۆزی باوكایەتی بۆ كوڕەكەی هەڵكرد و لە ئەمری خودادا فەنا بوو، دەریای كۆبوونەوەی نهێنی و دڵ و ویست لەسەر خودا یەكانگیر بوون، سنووری دابڕان و جیابوونەوەی -ڕێگر لە جێبەجێ كردنی بڕیاری خودا- تێپەڕاند.

ئایەتی ﴿فَلَمَّآ أَسْلَمَا﴾ الصافات: ١٠٣، واتە هەردوو تەسلیمبوون، و بۆ فەرمانی خودا گەردنكەچ بوون، ململانێ وملپێچی بۆ فەرمانی خودا لەلای ئەوانەوە بوونی نەبوو، بەڵكو خۆڕادەستكردنێكی تەواو و تەسلیمبوونێكی بێ چەندوچوون.

﴿وَتَلَّهُۥ لِلْجَبِينِ ﴿١٠٣﴾﴾ الصافات: ١٠٣: واتە لەسەر ڕوومەتی و لەسەر لا خستی، "جبین" ئەو بەشەی ڕوومەتە كە لە كاتی خەودا دەخرێتە سەر سەرین، ئەو شێوازەی سەربڕینە كە بەكاردەهێنرێت.

تەماشای هیممەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بكە كاتێك كلیلی گەنجینەی هەموو سەرزەوی پێدرا، بەڵام نەیویست، ئاشكرایە گەر وەریبگرتبایە لە گوێڕایەڵی خودادا خەرجی دەكرد، بەڵام ئەو هیممەتە بەرزەی ڕێگەی نەدا بە شتێكەوە بلكێت جگە لە خودای موتەعال و ئەو شتانەی ئەو پێیخۆشە، بۆیان خستە ڕوو تا وەك مەلیكێك هەڵسوكەوت بە مەملەكەتەی بكات، بەڵام دیسان نەیویست، تەنها بەندایەتی بۆ خودا هەڵبژارد، "لا إلـه إلا الله" بەدیهێنەری ئەو هیممەتە و دروستكەری نەفس و

تواناكانیەتی، هەروەها خولقێنەری هیممەتی هەندێ كەسە كە هیممەتیان لە هیممەتی ئاژەڵان تێناپەڕێت.

## ۞ مۆڵەتی مانەوە..... مەرجەكەی خاوێنییە

لەو صەفایانە: صەفای حاڵە.

حاڵ بەری زانستە، حاڵ پاڵفتە نابێت بە زانستێك نەبێت كە بەرهەمی بهێنێت، بەپێی تێكەڵاوی ڕاست حاڵ تیكەڵی تێ دەكەوێت، كە حاڵ پاڵفتە بوو كەسەكە شیرینی موناجات دەچێژێت.

هەر كات حاڵی لە خەڵتە پاڵفتە بوو شیرینییەكە پاڵفتە دەبێت لە تاڵاوی موناجات.

لە حاڵی موناجاتیدا ئەو شیرینییە دەچێژێت، گەر حاڵ تێكەڵ و لێڵ بێت شیرینی موناجات نابینێتەوە، حاڵی ئیسنادكراو بۆ لای وارید كە شیرینی موناجاتی پێ چێژدەكرێت لە ئامادەیی ناوە جوانەكانی خودا و سیفەتەكانییەوەیە، بەپێی دەركەوتن و پەردە لادان لەسەر ماناكانی.

هەر كەس-بۆ نموونە- ناوی ((الودود))ی بۆ دەركەوت، پەردە لەسەر هەندێك لە مانای ناوەكە و لوتفی ناوەكە لادرا و پەیوەستبوونی بە دەرەوە و ناوەوەی بەندەوە ڕۆشن بوویەوە: ئەوا حاڵی بەدەستهاتوو بۆ كەسەكە لە خزمەتی ئەو ناوەدا گونجا و شیاوە لەگەڵ ناوەكە، حاڵی كەسەكە دەبێت بە سەرقاڵبوون بە خۆشەویستی و شەوق و چێژی موناجات، كە هیچ شتێك بە قەدەر ئەوە شیرین و خۆش نییە، ئەوەش بەپێی ڕۆچوونی لە موشاهەدەی مانای ئەو ناوەدا و بەپێی بەشی كەسەكە لە ئاسەواری ناوەكە.

بۆیە ((الودود)) -گەر بە مانای "المودود" بێت وەك ئیمامی بوخاری لە سەحیحەكەیدا دەفەرموێت ((الودود)) واتە "الحبیب"- كەسەكە لە وردبوونەوەی سیفاتی كەماڵدا ڕۆبچێت كە بانگی دەكات بۆ خۆشەویستی كەسی وەسفكراو بە ناوەكە(واتە خودای موتەعال): ئەمەش صەفای زانستی بەو ناوە بۆ بەرهەم دەهێنێت، هەروەها صەفای حاڵی لە بەندایەتیدا بۆ دەستەبەر دەكات لە سروور و گەشانەوە بەپێی ناوەكە.

هەر بەو جۆرە گەر ناوی ((الودود)) ناوی بكەر(إسم فاعل)بێت بە مانای "المحب" واتە خۆشەویست دێت: لەم بارەشدا حاڵێكی گونجاو بە ماناكەی بۆ بەرهەم دێت.

ئەو كە بە دڵ موشاهەدەی ناوەكانی (غني، كريم، جواد، عزيز، قادر) دەكات و تێدەگات هەموو كەسێك لە خودی خۆیدا ئاتاجی خودایە و خودا لە زاتیدا بێنیازە لە هەموو دروستكراوەكانی، لەگەڵ ئەوەشدا بەندەكانی خۆشدەوێت و لای ئازیزن، بە چاكە و فەزڵی زۆری لەلای ئەوان خۆی خۆشەویست و شیرین دەكات، لەم موشاهەدەوە حاڵەتێكی پاڵفتە و پوخت و دوور لە خەڵتە و تێكەڵەی بۆ دروست دەبێت.

هەر بەو جۆرە تەواوی ناو و سیفەتەكانی خودای موتەعال، بۆیە صەفای حاڵی كەسەكە بەپێی صەفای زانست و مەعریفەیەتی بەو ناوانە.

❁ ❁ ❁

## (٥٦) (منزلة الفرح)

# مەنزیلەی فەرەح

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی فەرەحە.

خـــودای موتـــەعال دەفـــەرموێت ﴿ قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾ یونس: ٥٨

هێنانی ئەم ئایەتە لەسەرەتای دەروازەكەوە لە لوتكەی جوانی و باشیدایە، خودای موتەعال فەرمانی بە بەندەكانی كردووە بە خۆشحاڵبوون و دڵخۆشبوون بە فەزڵ و رەحمەتی، ئەوەش وەك بەدواداهاتنی خۆشحاڵبوون و دڵخۆشبوون بە خاوەن فەزڵ و رەحمەتەكە، ئەو كەسەی دڵخۆشە بەوەی لە "جەواد و كەریم و موحسین"ەوە پێی دەگات دڵخۆشبوونی بەو كەسەی نیعمەتەكەی پێبەخشیوە لەپێشترە.

هەندێ لە مانای ئەو ئایەتە باس لێوە دەكەین:

ئیبن عباس قەتادە و موجاهید و حەسەن، كەسانی تریش دەفەرموون ((فضل الله)) واتە "ئیسلام"، ((رحمته)) بریتییە لە قورئان، ((رحمته)) تایبەترە لە ((فضله))، فەزڵی تایبەتی خودا: گشتییە بۆ هەموو ئەهلی ئیسلام، بەزەیی خودا بە فێركردنی هەندێكیان بە كتێبەكەی، بە فەزڵی خۆی ئەوانی كرد بە موسڵمان و كتێبەكەی بۆ دابەزاندن بە رەحمەتی خۆی، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَمَا كُنتَ تَرْجُوٓا۟ أَن يُلْقَىٰٓ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ﴾القصص: ٨٦، ئەبو سەعیدی خدری -خوا لێی رازی بێت- دەفەرموێت (("فضل الله": بریتییە لە "القرآن"، "رحمته" ئەوەیە كە ئێمەی كردووە بە ئەهلی قورئان))

دەڵێم: مەبەستی ئەوەیە كە دوو ئەمر هەیە:

یەكەم: فەزڵ لە خودی خۆیدا. دووەم: ئامادەیی جێگە بۆ وەرگرتنی ئەو فەزڵە، وەك ئەو بارانەی بەسەر زەویەكدا دادەبارێت كە توانای سەوزبوونی گژوگیای هەیە، مەبەست بە فەزڵ تەوادەبێت و قبووڵی شوێنی بۆ دەكرێت، خودا زاناترە.

((فەرەح))چێژێكە دەكەوێتەوە دڵەوە بەهۆی پەیبردن بە مەحبووبەكەی، و گەیشتن بەو شتەی ئارەزووی دەكات، لە پەیبردنی پێی حاڵەتێك لەدایك دەبێت پێی دەوترێت

فەرەح و سروور، خودای موتەعال فەرمان دەكات بە "فـەرەح بـە فـەزڵ و رەحمـەتی" لەدوای ئـەم ئایەتـەوە﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٥٧﴾ ﴾ یـونس: ٥٧، هـیچ شـتێك بـە قـەدەر فـەزڵ و رەحمـەتی خـودا شایستەی دڵخۆش بوونی بەندەی خودا نییە، كە دەوای "موعظة و شفاء"ی تێدایە بە "هیدایـەت و رەحمـەت"ی خـۆی، بۆیـە خـودا-سـبحانە- هەواڵیـداوە ئـەو ئامۆژگاری"موعظة"یەی بە بەندەكانی بەخشیوە-كە بریتییە لە ئـەمر و نـەهی و حـەز و تـرس(الترغیـب والترهیـب) و شـیفای سـینە- ئـەو ئامۆژگارییـە چارەسـەری نەخۆشـی نـەفامی و نـەزانی و سـتەم و دەسـتدرێژی و سـەرگەردانییە، ئامۆژگارییەكـە كاریگـەری قوڵتری هەیـە لەسـەر دڵ و دەروون لـە كاریگـەری دەوا بـۆ سـەر جەسـتە، بـەڵام لەبـەر ئەوەی لەسـەر ئـەو دەرد و نەخۆشـییانە راهـاتووە هەسـت بـە ئازاریـان ناكـات، كاتێـك هەسـتی بـەهێز دەبێـت-كـاتی مـردن و بـەجێهێڵانی دونیـا- ئـا لـەو بـارەدا هـەموو ئازاربەخشێكی حوزنبەخش ئامادە دەبن، ئەوەش لە پەروەردگارییەوە بۆی هـاتووە لـە هیدایەت كە فێنكەرەوەی سینە بە یەقین دەگرێتە خۆ، هەروەها ئارامی دڵ و سـوكنایی نەفس و زیندەگی ناخی مرۆڤ لـەئامێز دەگرێـت، ((الرحمـة)) كـە هەرچـی خێـر و چـێژە بەدوای خۆیدا دەهێنێت و هەرچی شەڕ و ئازارە لێی بەدوور دەگرێت.

ئەوەش چاكتر و باشـترە لـە هەرچـی شـتێك خـەڵكی لـە دونیـا و جوانییـەكانی دونیـا كۆیدەكەنەوە، واتە ئەوە شایستەیە كە دڵتان پێیخۆش ببێت، هەر كەس پێی دڵخۆش ببێـت ئـەوا بـە مـەزنترین شـت دڵخـۆش بـووە، نـەك ئـەوەی ئـەهلی دونیـا لـە دونیـا كۆیدەكەنەوە، ئەوانە جێگەی دڵخۆشبوون نین، چونكە ئافات روویان تێدەكات، و زوو روو لە تیاچوون دەكەن، و دەرئـەنجامی خراپیـان لێدەكەوێتـەوە، دونیـا خـەیاڵێكـە و بووە بە خەونی كەسێك و پاشان بەئاگادێت و ئەوەی بینیویەتی بـوونی نییـە و تـەنها كۆچ و دابڕان ماوەتەوە.

لە قورئاندا "فەرەح" بە دوو جۆر هاتووە: رەها و سنووردار.

فـەرەحی رەهـا: لـە زەمـدا هـاتووە، وەك ئایـەتی﴿ لَا تَفۡرَحۡۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَرِحِينَ ﴿٧٦﴾ ﴾ القصص: ٧٦، هەروەها﴿ إِنَّهُۥ لَفَرِحٞ فَخُورٌ ﴿١٠﴾ ﴾ هود: ١٠

فەرەحی سنووردار: ئەمەش دیسان دوو جۆرە: سنووردار بە دونیا کە خاوەنەکەی فەزڵ و منەتی خودای لەبیر دەچێت، ئەمەیان زەمکراوە، وەك ئایەتی﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُواْ بِمَآ أُوتُوٓاْ أَخَذۡنَٰهُم بَغۡتَةٗ فَإِذَا هُم مُّبۡلِسُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ الأنعام: ٤٤

دووەمیان: بە فەزڵ و رەحمەتی خودا سنووردارکراوە، ئەمەش دیسان دوو جۆرە: فەزڵ و رەحمەت بە هۆ(واتە نیعمەتەکە)، لەگەڵ فەزڵ و رەحمەت بە خاوەن هۆ(واتە خودا)، یەکەمیان وەك ئایەتی﴿ قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ هُوَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾ یونس: ٥٨، دووەمیان وەك ئایەتی﴿ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾ آل عمران: ١٧٠.

فەرەح بە خودا و بە پێغەمبەرانی و بە ئیمان و بە سوننەت و بە زانست و بە قورئان لە باڵاترین مەقامەکانی عاریفانە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ فَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمۡ زَادَتۡهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنٗاۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَهُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ ﴾ التوبة: ١٢٤.

هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَفۡرَحُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ ﴾الرعد: ٣٦

دڵخۆشبوون بە زانست و ئیمان و سوننەت بەڵگەی بە مەزن راگرتنی ئەوانە و خۆشەویستییان و هەڵبژاردنیانە بەسەر هەموو شتێکدا لای خاوەنەکەی، دڵخۆش بوونی بەندە بە شتێك لە کاتی بەدەستهێنانیدا: بە ئەندازەی خۆشەویستی ئەو کەسەیە بۆ شتەکە و رەغبەتی تیایدا، هەر کەس رەغبەتی لە شتێك نەبوو بەدەستهێنانی دڵخۆشی ناکات، و تیاچوونی خەمی بۆ دروست ناکات.

فەرەح شوێنی خۆشەویستی و حەز دەکەوێت.

جیاوازی نێوان "فەرەح" و لەگەڵ "الإستبشار"- سەرەتای بەشارەت: فەرەح دڵخۆشبوونە بەو شتەی خۆشتدەوێ و حەزی لێدەکەی دوای بەدەستهێنانیەتی، "سەرەتای بەشارەت" خۆشحاڵییە بەر لە بەدەستهێنانی شتەکە، ئەمەش ئەگەر متمانەی تەواوی هەبوو بۆ بەدەستهێنانی، بۆیە خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ وَيَسۡتَبۡشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمۡ يَلۡحَقُواْ بِهِم مِّنۡ خَلۡفِهِمۡ ﴾ آل عمران: ١٧٠.

"فەرەح" سیفەتی کەماڵە، بۆیە پەروەردگار بە بەرزترین و کاملترینی فەرەح وەسف دەکرێت، وەك فەرحەتی بە تەوبەی کەسی تەوبەکار کە مەزنترە لە فەرحەتی ئەو

کەسەی وڵاخەکەی خۆی دەبینێتەوە و هەموو خواردن و خواردنەوەکەی لەسەرە و ئەویش لە بیابان و دەشتی تیاچووندایە لە دوای ونکردنی، و بێهیوابوون لە دۆزینەوەی.

مەبەستەکە: ((فەرەح)) باڵاترین نیعمەتی دڵ و چێژ و گەشانەوەیەتی، فەرەح و سروور نیعمەتی دڵ و دەروونە و خەم و پەژارەش سزادانی ئەو دڵەیە، دڵخۆشی بەشتێك لەسەرو "رازیبوون"ە بەو شتە، رازیبوون دڵنیایی و سوکنایی و والابوونی سینەیە، بەڵام "فەرەح" چێژ و گەشانەوە و سرووره، هەموو فەرەحێك رازیبوونی لەگەڵە، بەڵام هەموو رازیبوونێك فەرەحی لەگەڵ نییە، بۆیە فەرەح دژی خەم و پەژارەیە(الحزن)، بەڵام رازیبوون دژی "السخط"–ناڕازی، خەم و پەژارە خاوەنەکەی ئازار دەدات، بەڵام "السخط"ئازاری نادات، جگە لەو کاتەی دەستەوسان بێت لە تۆڵەسەندنەوە.

((سروور)): چاوگی "سره سرورا و مسرة"، وەك ئەوەی مانای "سره" بریتی بێت لە ئاسەواری خەتی روخساری، لەو ئاسەوارەوە هێڵەکانی روخسار دەدرەوشێنەوە، وەك شاعیرێك دەڵێت:

وإذا نظرت إلى أسرة وجهه          برقت كبرق العارض المتهلل

((الإستبشار))–سەرەتای مژدە و بەشارەت لە "البشری"–مژدەوە وەرگیراوە، "البشارة"بریتییە لە یەکەمین هەواڵی راستگۆی دڵخۆشکەر.

((البشری))–مژدە دوو مانای مەبەستە: یەکەم: مژدەی هەواڵدەرەکە، دووەم: سرور و دڵخۆشبوونی هەواڵپێدراوەکە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ ﴾یونس: ٦٤، وشەی ((البشری)) بە هەردوو ماناکە تەفسیر کراوە، لە فەرموودەکەی عوبادەی کوڕی صامت و ئەبی دەردا–خوا لێیان رازی بێت– لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی ((ئەوە خەوی چاك و پاکە کە موسڵمان دەیبینێت، یان پێیەوە دەبینن))

ئیبن عەباس دەفەرموێت ((مژدەی ژیانی دونیا: لە کاتی مردندایە، فریشتەکانی رەحمەت بە مژدەوە لەلای خوداوە دێن بۆ لایان، لە دواڕۆژیشدا: لە دوای دەرچوونی نەفسی باوەڕدار کە دەردەچێت بەرزی دەکەنەوە بۆ لای خودا، ئاهانگی بۆ دەگێڕن وەکو زاوا، مژدەی پێدەدرێت بە ریزوانی خودا))

حەسەن دەفەرموێت: مژدە بریتییە لە بەهەشت، هەردوو"الزجاج و الفراء" وەك حەسەن تەفسیریان كردووە، هەروەها مژدەی دونیا بە ناوی باش و سەنای باش تەفسیر كراوە، ناوی باشی بەسەر زمانی خەڵدا جاری دەبێت، هەموو ئەوانە راستە.

سەنای باش: بەشێكە لە "البشری"–مژدە، خەونی خۆش بەشێكە لە مژدە، مژدەی فریشتەكان لە كاتی مردندا بەشێكە لە مژدە، بەهەشتیش لە مەزنترین مژدەكانە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾البقرة: ٢٥، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾﴾ فصلت: ٣٠.

وتراوە: مژدە بەو ناوە(البشری) ناونراوە چونكە كاردەكاتە سەر پێستی روخسار، بۆیە دوو جۆرە: ((مژدەی دڵخۆشكەر)) كاردەكاتە سەر گەشانەوەی دەموچاو و بریقانەوەی، لەگەڵ ((مژدەی دڵتەنگكەر)) كاردەكاتە سەر روخسار و گرژ و مۆنی دەكات، بەڵام گەر مژدە بە رەها باس بكرێت تەنها مەبەستی مژدەی خۆشە، گەر مژدە سنووردار كرا بەپێی سنووردار‌كردنەكەیە، خۆش و ناخۆش.

خودای موتەعال فەرەحی داوەتە پاڵ كاروباری دونیا لە ئایەتی﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُواْ بِمَآ أُوتُوٓاْ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً﴾ الأنعام: ٤٤، هەروەها ﴿لَا تَفْرَحْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ ﴿٧٦﴾﴾ القصص: ٧٦، هەروەها﴿إِنَّهُۥ لَفَرِحٌ فَخُورٌ ﴿١٠﴾﴾ هود: ١٠، دونیا خۆشییەكانی لە ناخۆشی و مەینەتییەكانی جیانابێتەوە، بەڵكو هیچ خۆشییەك نییە ناخۆشییەك پێشی یان لەگەڵی یان دوای نەكەوتبێت، خۆشی پوختە ناكرێت، بەڵكو هەر دەبێت مەینەتییەكی لەگەڵ بێت، بەڵام هەندێ جار خۆشییەكە بەسەر ناخۆشییەكەدا بەهێز دەبێت حوكم و ئازاری مەینەتییەكە نوقم دەكات لەگەڵ ئەوەی كە بوونی ماوە، هەر بەو جۆرە بەپێچەوانەشەوە.

قورئان باسی فەرەحی دوارۆژ دەكات و دەفەرموێت ﴿فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ﴾ آل عمران: ١٧٠، هەروەها﴿فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُواْ﴾ یونس: ٥٨

ناوی "السرور" لە دوو شوێنی قورئاندا هاتووە دەربارەی حاڵی ئەهلی دوارۆژ، ئەو دوانەش ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴿٧﴾ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ﴿٨﴾ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ﴿٩﴾﴾ الانشقاق: ٧ – ٩، شوێنی دووەم ﴿وَلَقَّىٰهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا ﴿١١﴾﴾ الإنسان: ١١

"السرور"دەربارەی حاڵی دونیا لەچەند شوێنێکدا هاتووە کە زەمکراوە، وەك﴿ وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهْرِهِۦ ﴿١٠﴾ فَسَوْفَ يَدْعُوا۟ ثُبُورًا ﴿١١﴾ وَيَصْلَىٰ سَعِيرًا ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ كَانَ فِىٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ﴿١٣﴾ ﴾ الانشقاق: ١٠ – ١٣

هاتنی وشەی "الفرح" و "السرور"م لە قورئاندا بۆ حاڵی دونیا و حاڵی دوارۆژ بینیوە. پارسەنگ بۆ فەرەحە، چونکە خودای موتەعالی پێ وەسفکراوە، هەروەها وشەی فەرەح بە رەهایی هاتووە، بەڵام وشەی سرور بەو جۆرە نەهاتووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە مانای فەرەح کامڵترە لە مانای سروور، هەروەها خودای موتەعال فەرمانی بە فەرەح کردووە لە ئایەتی ﴿ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا۟ ﴾ یونس: ٥٨، هەروەها وەسفی بەختەوارانی بە فەرەح کردووە لە ئایەتی﴿ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ﴾ آل عمران: ١٧٠.

## ۞ پەیوەستبوونێکی ئاوازدار

سووری دڵی باوەڕدار دوو شت دەیهەژێنێت: یەکەم: هەژانی سرووری چێژ کە سێ حوزن دەبنە هۆی سڕینەوەی ئەم جۆرە لە سروور: حوزنێك کە ترسی دابڕان دروستی دەکات، حوزنێك کە تاریکی نەزانی هێرش دەهێنێت، لەگەڵ حوزنێك کە وەحشەتی جیابوونەوە رەوانەی دەکات.

لەبەر ئەوەی سروور دژی حوزنە، و حوزن لەگەڵ سروور کۆنابنەوە: بۆیە دەبێتە هۆی تیابردنی، چونکە سروور هۆیەکەی: چەشتنی شتێکی دڵخۆشکەرە، بۆیە هەتا چێژەکە تەواوتر بێت: سوورەکە بەو چێژە کامڵتر دەبێت.

ئەم سرووره سێ حوزن دەیسڕێتەوە:

حوزنی یەکەم: حوزنێکە ترسی دابڕان دروستی دەکات، ئەم حوزنە حوزنی دواکەوتووانە لە قافڵەی خۆشەویستان و وەفدی خۆشەویستی، بۆیە ئەهلی دابڕان ئەوانەن کە دواکەوتوون لە کاروانی خۆشەویستی و ئەو وەفدە باڵایە، ئەوانەن کە خودای موتەعال دەرحەقیان دەفەرموێت ﴿ كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ وَقِيلَ ٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْقَٰعِدِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾ التوبة: ٤٦، خودای موتەعال لێبڕان و هیممەتی پسانن تاکو نەچن بەرەو خودا و بەرەو بەهەشتەکەی، فەرمانی بە دڵیان کرد بە فەرمانێکی

گەردوونی قەدەری: کە دابنیشن لەگەڵ دانیشتوان و دواکەوتووان لە هەوڵ و کۆشش بۆ بەدەستهێنانی هەموو ئەوانەی خودا پێی خۆشە، گەر تەماشای دڵیانت بکردبایە- کاتێك فەرمانیان پێکرا بە دانیشتن لە هاوەڵی کردنی وەفدەکە، دەبینی پڕ لە خەم و پەژارەن و هەوری بەڵا دەوری داون، بۆیە هەرچی خەم و پەژارەیە لە ناو ئەو دڵانەدا ئامادەبووە، شەپۆلی نیگەرانی و پەشیمانی دەیاندا بەسەر یەکتردا، و هەرچی خۆشییە تیایاندا نەماوە و حوزن داگیری کردوون- گەر تەماشای دڵیانت بکردبایە ئەو کات بۆت دەردەکەوت و دەتزانی کە چاکانی ئەم خانەی دونیایە لە بەهەشتدان و دواکەوتووان لە هاوەڵی چاکان لە دۆزەخدان.

چێژ و تامی باوەڕ ئەم حوزنە دەسڕێتەوە، کەسی صدیق تامی بەڵێن دەکات کە لەسەر زمانی پێغەمبەر راگەیەنراوە، بۆیە گومان راپێچی ناکات، و ئەمەل دایناپڕێت، و خۆزگە و ئاوات-وەك پێشتر باس کرا- کۆسپ و لەمپەری بۆ دروست ناکەن، دڵی دەچێتە ناو حەقیقەتی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە﴿ أَفَمَن وَعَدْنَاهُ وَعْدًا حَسَنًا فَهُوَ لَاقِيهِ كَمَن مَّتَّعْنَاهُ مَتَاعَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ثُمَّ هُوَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنَ الْمُحْضَرِينَ ﴿٦١﴾ ﴾ القصص: ٦١، هەروەها دەفەرموێت ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِاللَّهِ الْغَرُورُ ﴿٥﴾ ﴾ فاطر: ٥، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَقَدِّمُوا لِأَنفُسِكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّكُم مُّلَاقُوهُ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٢٣﴾ ﴾ البقرة: ٢٢٣، ئەمانە و نموونەی تری ئەم ئایەتە پیرۆزانە.

### ۞ رووخۆشی زانست

حوزنی دووەم: کە سرووری چێژ ناهێڵێت بریتییە لە حوزنی تاریکیی نەزانی.

نەزانی دوو جۆرە: نەزانی زانست و مەعریفەت، لەگەڵ نەزانی کار و سەرلێشێوان، هەردووکیان لە دڵدا تاریکی و وەحشەتیان هەیە، وەك چۆن زانست نوور و هۆگربوون بەدوای خۆیدا دەهێنێت دژەکەشی(نەزانی) تاریکی و وەحشەت بەدوای خۆیدا دەهێنێت، خودای موتەعال ئەو ((زانست))ەی کە پێغەمبەری(ﷺ) پێ رەوانە کردووە بە ((نور)) و ((هدى)) و ((حياة)) ناودەبات، دژی ئەو زانستەش بە ((ظلمة)) و ((ضلال)) و ((موت)) ناودەبات، دەفەرموێت ﴿اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ ﴾

البقرة: ٢٥٧، هەروەها دەفەرموێت ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا﴾ الأنعام: ١٢٢، هەروەها دەفەرموێت ﴿قَدْ جَآءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيرًا مِّمَّا كُنتُمْ تُخْفُونَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَيَعْفُوا۟ عَن كَثِيرٍ ۚ قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ وَكِتَٰبٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ يَهْدِى بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِهِۦ وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٦﴾﴾ المائدة: ١٥ - ١٦، هەروەها دەفەرموێت ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُم بُرْهَٰنٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا ﴿١٧٤﴾﴾ النساء: ١٧٤، هەروەها دەفەرموێت ﴿فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾﴾ الأعراف: ١٥٧، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا﴾ الشوری: ٥٢، قورئانی بە ((ڕۆح)) باس كرد لەبەر ئەو زیندەگییەی بە دڵ و بە ڕۆحی دەبەخشێت، هەروەها بە ((نور)) ناوی هێنا لەبەر ئەو هیدایەت و ڕێنومایییەی لێوەی پەیدا دەبێت.

نموونەی ئەو نوورەی لە دڵی باوەڕداردا بەم جۆرە هێنایەوە ﴿كَمِشْكَوٰةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ ۖ ٱلْمِصْبَاحُ فِى زُجَاجَةٍ ۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّىٌّ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِىٓءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ ۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ ۗ يَهْدِى ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ﴾ النور: ٣٥.

نموونەی حاڵی ئەو كەسەی كە نوور بزر دەكات بە كەسێك هێنایەوە كە لەناو ﴿كَظُلُمَٰتٍ فِى بَحْرٍ لُّجِّىٍّ يَغْشَىٰهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ سَحَابٌ ۚ ظُلُمَٰتٌۢ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَآ أَخْرَجَ يَدَهُۥ لَمْ يَكَدْ يَرَىٰهَا ۗ وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ﴿٤٠﴾﴾ النور: ٤٠.

## سەكینەی كۆبوونەوە

حوزنی سێیەم: حوزنێكە كە وەحشەتی جیابوونەوە ڕەوانەی دەكات، ئەوەش بریتییە لە پەرتبوون و جیابوونەوەی دڵ و ویستی دڵ لە خودا -عزوجل- بۆ ئەم جیابوونەوەیە حوزنێكی قووڵ دروست دەبێت، حوزن بۆ تیاچوونی كۆبوونەوەی دڵ لەسەر خودا و چێژ و خۆشییەكانی، گەر هەرچی خۆشیی ئەهلی دونیایە كۆبكرێتەوە و بدرێت بەو كەسە -بەراورد بەو چێژەی لە كۆبوونەوەی دڵ لەسەر خودا و خۆشی و هۆگربوون و

نزیکی و تامەزرۆبوون بۆ لیقای خودا بەدەستی دەهێنێت– کەمە و هیچ نییە، ئەم کارە تەنها ئەوانە باوەڕیان پێیەتی کە چەشتوویانە، کەسێك بە راستت دەزانێت ئەو شتەی تۆی رۆشن کردۆتەوە ئەویشی رۆشن کردبێتەوە، چەند جوانی وتووە:

أيا صاحبي، أما ترى نارهم؟ فقال: تريني مالا أرى

سقاك الغرام ولم يسقني فأبصرت ما لم أكن مبصرا

گەر لەو جیابوونەوە ئاماژەبۆکراوەدا تەنها وەحشەت و تاڵاوی پەرتبوون و تەپوتۆزی شپرزی بوونیان هەبێت ئەوە بەسە بۆ سزادانی کەسەکە، ئەی دەبێت چۆن بێت؟ کەمترین سزای: ئەوەیە تووشی هاوەڵی کردنی دابڕاوان ببێت و تێکەڵیان ببێت و خزمەتیان بکات، ئەو دەمە کاتەکانی–کە مادە و کەرەستەی ژیانی ئەوە– هیچ بەهایەکی نامێنێت، لە جێبەجێ کردنی کاروبارەکانی ئەواندا و بەدەستهێنانی مەبەستەکانیاندا نوقم دەبێت، ئەمە سزادانی دڵێکە کە شیرینی باوەڕ و کۆبوونەوەی دڵ لەگەڵ خودا و هۆگربوون پێی چەشتووە، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا کەسان و شتانی تری بەسەر خودادا هەڵبژارد، و رازی بوو بە رێگەی هاوڕەگەزەکانی خۆی و ئەوەی تیایدا بوون، هەر کەس کەمترین زیندەگی و نوور لە دڵیدا بوونی هەبێت ئەوا پەنای دڵی خۆی لەو وەحشەتی جیابوونەوەیە دەدات.

لە دڵدا شپرزی بوونی هەیە، تەنها رووکردنە خودا ئەو شپرزییە ناهێڵێت و رێکی دەخاتەوە، هەروەها وەحشەتی تێدا هەیە کە تەنها هۆگربوون بە خوداوە لە تەنهاییدا دەیڕەوێنێتەوە.

حوزنی تێدا هەیە: تەنها سروور و مەعریفە و صدقی مامەڵەکردن کۆتایی پێ دەهێنێت.

نیگەرانی تێدا هەیە: کە تەنها کۆبوونەوەی دڵ لەگەڵ خودا و هەڵهاتن بۆ لای ئەو نایهێڵێت.

گڕی پەشیمانی تێدا هەیە: کە تەنها رازیبوون بە ئەمر و نەهی و قەزای خودایی و ئارامگرتن تا گەیشتن بە لیقا دایدەمرکێنێتەوە.

داوای زۆری تێدا هەیە: ئەو داوایانە ناوەستن و تەواو نابن تاکو خودا نەکرێتە تەنها داوای دڵ.

ئاتاجی و هەژاری تێدا هەیە: كە تەنها خۆشەویستی و گەڕانەوەی بەردەوام و یادی خودا و صدق و ئیخلاص پڕی دەكاتەوە، گەر هەموو دونیا و ئەوەی تێیدایە پێی ببەخشرێت كەمترین بەشی ئەو ئاتاجی و هەژارییەی بۆ پڕ نابێتەوە.

جیابوونەوە و پەرتبوون پەردە دروست دەكات و وەحشەت بەدوای خۆیدا دەهێنێت، ئازاری ئەو پەردە و وەحشەتە لە ئازاری سزای جەستەیی قورسترە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ۝١٥ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا۟ ٱلْجَحِيمِ ۝١٦ ﴾ المطففین: ١٥ – ١٦، ئەوانە دوو سزا بەسەریاندا داباری: سزای پەردەكەوتنە نێوان ئەوان و خودا، لەگەڵ سزای دۆزەخ.

حوزن لە جیابوونەوەی مەحبووبەوە سەرهەڵدەدات، هیچ هۆیەكی تری نییە جگە لەوە، گەر لە ڕوودانی ناپەسەندێكەوە حوزن سەریهەڵدا، ناپەسەندییەكەی بەهۆی لەدەستدانی مەحبووبەوەیە، بۆیە حوزن و خەم و پەژارە و ئازار و ناڕەحەتی هەر هەموو بەهۆی جیابوونەوە و دابڕانەوەیە لە مەحبووب، حوزنی هەژاری و نەخۆشی و ئازار و نەزانی و تەمبەڵی و تەنگەلانی و حاڵ خراپ، و هاوشێوەكانی ئەمانە: هۆیەكەیان دابڕانە لە مەحبووب، لە ماڵ و دارایی و تەندروستی و زانست و خۆشگوزەرانی، و حاڵی باش، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ كَمَا فُعِلَ بِأَشْيَاعِهِم مِّن قَبْلُ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ فِى شَكٍّ مُّرِيبٍۭ ۝٥٤ ﴾ سبأ: ٥٤، فەرەح و سروور: بە بەدەستهێنانی مەحبووبەوەیە، خەم و پەژارە و حوزن و پەشیمانیش بە تیاچوونی مەحبووبەوەیە، خۆشترین زیندەگی: زیندەگی كەسێكە بە مەحبووبەكەی گەیشتووە، تاڵترین زیندەگی: ژیانی ئەو كەسەیە لە خۆشەویستەكەی جیابووەتەوە و دابڕاوە.

## ۞ گەلی برا: وەڵامی بانگخواز بۆ لای خودا بدەنەوە

هەژانی ئاوازداری دووەم: بریتییە لەهەژانی سرووری بیستنی وەڵامدانەوە، ئەو سروورەیە ئاسەواری وەحشەت دەسڕێتەوە، ئەوەش بەستراوەتەوە بە بیستنی وەڵامدانەوە((سماع الإجابة))، كەوابوو بیستنێكە سوودی لێ دەبینێت، نەك تەنها بیستنی پەیبردن((سماع الإدراك))، بەڵكو هاوبەشە لەنێوان وەڵامدانەوە و پشتەهەڵكردن، بەڵگەش لەسەر بەندەكان بەوە ڕاستدەبێتەوە، و بیانووش بەوە

دەبڕێت، بۆیە خودای موتەعال دەربارەی بیسەرانی ئەو جۆرە بیستنە دەفەرموێت ﴿سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا﴾ النساء: ٤٦، پێغەمبەر(ﷺ) بە یەهودییەکی فەرموو کاتێك پرسیاری کاروباری پەنهان(غیب)ی لێکرد ((سوودت پێدەگەیەنێت گەر باست بۆ بکەم؟ وتی: بە گوێم دەبیستم))، بەلام بیستنی وەلامدانەوە: لەم ئایەتە پیرۆزەدایە﴿وَفِيكُمْ سَمَّاعُونَ لَهُمْ﴾التوبة: ٤٧، واتە وەلامیان دەدەنەوە، هەروەها لە ئایەتی﴿سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ﴾ المائدة: ٤٢، واتە مەلامەدرەوەن بۆی(ئەم جۆرە وەلامدانەی دوو ئایەتەکە ئاماژەیان پێدەکەن بریتین لە وەلامدانەوەیەکی ناباش و گومڕاکەر)، هەر ئەوەش لە ئایەتەکەدا مەبەستە، ئەو مەبەستەی لە وتنی نوێژکەردا کە دەلێت ((سمع الله لمن حمده)) واتە خودا وەلامی هەر کەس دەداتەوە کە ستایشی کردووە، ئەوە ئەو بیستنەیە کە خودا نەرێی دەکات لە کەسێك خێری بۆی نەوێت، لە ئایەتی﴿وَلَوْ عَلِمَ اللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ﴾الأنفال: ٢٣، واتە گەر خێرییان تێدابوایە وای لێ دەکردن ببیستن بە بیستنێکی وەلامدانەوە و گەردنکەچبوون، وتراوە مانای"لأسمعهم"واتە "لأفهمهم" واتە تێیدەگایاندن، لەسەر ئەو تەفسیرە مانای (لأسمع قلوبهم)–خودا بەدڵیان دەبیستێ هاتووە، چونکە بیستن بە دڵ مانای "تێگەیشتن" لەخۆدەگرێت.

لە راستیدا هەردوو ماناکە مەبەستە، گەر خێریان تێدا بوایە تێیدەگایاندن و وای لێدەکردن وەلامی ئەوە بدەنەوە کە دەیبیستن و تێیدەگەن.

مەبەستەکە: ((بیستنی وەلامدانەوە)) بریتییە لە بیستنی گەردنکەچبوونی دڵ و ڕۆح و ئەندامەکان بۆ ئەوەی گوێ بیستوویەتی، ئەو بیستنە ئەوەی لە وەحشەت ماوەتەوە –کە بەهۆی ملنەدانی تەواوە سەریهەڵداوە– کۆتا پێدەهێنێت و دەیسڕێتەوە، بەپێی لەدەستدانی گەردنکەچبوون وەحشەت زیاد دەکات، کۆتاهتنی تەواوی وەحشەت بە گەردنکەچبوونی تەواوەیە.

خودای موتەعال ڕێگەی بەدەستهێنانی ئەم مەعریفەیەی بەیان کردووە﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴿٣٧﴾﴾ ق: ٣٧

کەلامی خودای موتەعال بەیادهێنانەوەیە، تەنها کەسانێك سوودی لێ دەبینن کە سێ سیفەتیان لە خۆیاندا کۆکردبێتەوە:

یەكەم: خاوەنی دڵێكی زیندووی هۆشیار بێت، گەر ئەو دڵەی لەدەستدا سوود لە بیرهێنانەوە و یادخستنەوە نابینێت.

دووەم: بەگوێی گوێبگرێت، هەموو بوونی رووبكاتە قسەكەر، گەر وا نەكات سوود لە گوێگرتن نابینێت.

سێیەم: دڵ و زەینی ئامادەببێت لەگەڵ ئەو كەسەی قسەی لەگەڵ دەكات، ((وهو شهيد)) واتە بە دڵ و بیر ئامادە ببێت و بزر نەبێت، گەر دڵی بزر بوو و رووی لە شوێنێكی تر كرد: ئەوا سوود لە گوتارەكە نابینێت.

وەك چۆن بینەر ناتوانێت حەقیقەتی بینراو تێبگات تا هێزی بینینی نەبێت و رووی بینینی نەكاتە بینراوەكە و دڵی بە شتێكی ترەوە خەریك نەكات، گەر هێزی بینینی لەدەست دا و سەیری بینراوەكەی نەكرد و دڵی لە شوێنێكی تر بوو: ئەوا پەی بە بینراوەكە نابات، زۆر جار كەسێك لە نزیكتەوە گوزەر دەكات و دڵت بە شتێكی ترەوە خەریكە و لەو بارەدا تۆ هەست بە گوزەركردنی ناكەیت، ئەم كارەش(واتە ئامادەبوون بە دڵ و هۆش) داوای دروستیی دڵ و ئامادەبوونی و كەماڵی گوێگرتن دەكات.

گەر لەگەڵ ئامادەبوونی دڵ و هۆشدا بیستنی وەڵامدانەوە لە پەروەردگارەوە((سماع الإجابة من الرب)) كۆببوویەوە: سروور تێر و تەواو دەبێت، بەندە گەر داوای لە پەروەردگار كرد و پەروەردگار گوێی بۆ داواكەی گرت و وەڵامیدایەوە، و ئەوەی داوای دەكرد پێیبەخشی –بەپێی مەبەست و داواكەی، و باشتر لەوەی پێدا كە داوای كردبوو–: ئەوا بەو وەڵامدانەوەیە سروورێكی بۆ دروست دەبێت كە ئاسەواری وەحشەتی دووری لە دڵ دەسڕێتەوە، بەخشین و وەڵامدانەوە دەبێتە هۆی سروور و هۆگری و شیرینی، هەر بەو جۆرە لێگرتنەوە دەبێتە هۆی وەحشەت و تاڵی، كە دوعاكانی دووبارە بوونەوە و لە پەروەردگارەوە بیستن و وەڵامدانەوەی بۆ هەبوو ئەوا ئاسەواری وەحشەتی دەڕەوێتەوە و بە هۆگری و شیرینی جێگەی دەگیرێتەوە.

❁ ❁ ❁

# (٥٧) (منزلة السر

# مەنزیلەی نهێنی

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی نهێنییە.

خاوەنی كتێبی ((منازل السائرين)) دەفەرموێت:

((دەروازەی نهێنی: خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا فِيٓ أَنفُسِهِمۡ﴾هود: ٣١، خاوەن نهێنی: ئەوانەن كە شاراوەن، ئەوانەی هەواڵ لەسەریان دراوە.

بەڵگەهێنانەوە بەو ئایەتە لە چەند روویەكەوە: شوێنكەوتەی پێغەمبەران بریتین لەوانەی پێغەمبەرانیان بەڕاست زانی، و خودا و خانەی دوارۆژیان هەڵبژارد بەسەر هۆز و گەل و هاوەڵ و دۆستانیاندا: خودا نهێنییەكی لە نهێنیەكانی مەعریفە و خۆشەویستی و باوەڕ بە خودا لە دڵیاندا داناوە كە لە دوژمنانی پێغەمبەران شاراوەیە، ئەوان تەماشای دەرەوەی پێغەمبەرانیان دەكرد و كوێربوون لە بینینی ناوەوەیان، بۆیە بێڕێز و سووك تەماشایان كردن، و بە پێغەمبەریان(ﷺ) وت((ئەوانە(واتە هەژارانی باوەڕداران) دەربكە لە دەورت تا ئێمە بێین بۆ لات و گوێت بۆ بگرین)) وتیان ﴿أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنۢ بَيۡنِنَآ﴾الأنعام: ٥٣، نوح(عليه السلام) فەرمووی بە هۆزەكەی﴿ وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ وَلَآ أَقُولُ إِنِّي مَلَكٞ وَلَآ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزۡدَرِيٓ أَعۡيُنُكُمۡ لَن يُؤۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيۡرًاۖ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا فِيٓ أَنفُسِهِمۡ إِنِّيٓ إِذٗا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٣١﴾ هود: ٣١، زەجاج دەفەرموێ: ماناكەی ئەوەیە گەر ئێوە بانگەشەی ئەوە دەكەن ئەوانەی شوێن من كەوتوون لە دەرەوە خەڵكانێكی سادە و ساویلكە و گەمژە و نەزانن، ئەوا من بۆن نییە سەرنجی ناوەوەیان بدەم، كە بینیم كەسێك لە دەرەوە خودا بەتاكوتەنها دەپەرستێت و حەقیقەتی ئەوەی لە ناخیاندایە گێڕامەوە بۆ لای خودا ئەوە كارێكی پەسەند و باشم كردووە.

ئەوەی لە ئایەتەكەوە دەردەكەوێت: خودا دەزانێت چی لە دەروونیاندایە بەوەی شایستەی كردوون بە قبووڵی ئایین و یەكتاپەرستی، و بەڕاستزانینی پێغەمبەرانی، خودا(ﷻ) زانا و دانایە، بەخشینەكان لە شوێنی خۆی دادەنێت، ئەو ئایەتە هاوشێوەی ئەم ئایەتە پیرۆزەی ترە كە دەفەرموێت ﴿وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ

لِّيَقُولُوٓا۟ أَهَـٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿٥٣﴾ ﴾ الأنعـــــام: ٥٣،

بێباوەڕان نەریی ئەوەیان کرد ئەو هەژارانە خودا –سبحانه– شایستەی کردبن بە هیدایەت و حەق و سەرانی کوفر و ئەهلی عیززەت و سەروەتی بێبەش کردبێت، وەك ئەوەی بەڵگە بە بەخششی دونیا بهێننەوە لەسەر بەخشینی دوارۆژ، خودای موتەعال رایدەگەیەنێت کە ئەو زاناترە بەو کەسەی شایستەی دەکات بە هیدایەت، ئەوەش بەهۆی نهێنییەکەوە کە لەلای خۆیەتی لە ناسینی قەدرزانی نیعمەت و بینینی فەزڵ و گەورەیی خاوەن نیعمەتەکە و خۆشویستن و شوکرکردنی، هەموو کەسێك ئەو نهێنییە خوداییە لە ناخیدا نییە، بۆیە هەموو کەسێك شایستەی ئەو بەخششەی ئیمان نابێت.

ئەوەی کە شێخی هەرەوی دەفەرموێت ((خاوەن نهێنی: ئەوانەن کە شاراوەن، ئەوانەی هەواڵ لەسەریان دراوە))

لەوانەیە مەبەستی پێی: فەرموودەکەی سعدی کوڕی ئەبی وەقاص بێت کە کوڕەکەی پێی وت ((تۆ لێرەی و خەڵکیش خەریکی کێبەرکێیە لەسەر ئەمارەت؟! ئەویش پێی فەرموو: گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو دەیفەرموو: خودا بەندەیەکی لەخواترسی دەوڵەمەندی شاراوەی خۆشدەوێت))

یان لەوانەیە مەبەستی ئەو فەرموودەی پێغەمبەر بێت کە دەفەرموێت ((لەوانەیە مرۆیەکی قژشێواو و تۆزاوی کە لەبەر دەرگاکاندا دەست بەڕوویدا دەنرێت و کەس نایگرێتە خۆ: گەر سوێند لەسەر خودا بخوات سوێندەکەی نەخات و جێبەجێی بکات))

ئەمانەش دوو چینن:

چینی یەکەم: دەستەیەکن کە هیممەتیان بەرزە و مەبەست و مەرامیان پاك و پاڵفتە بووە و سلوکیان راست و تەندروست بووە، تا پێش رێبوارانی رێگە کەوتن، لەسەر رێورەسمێك ناوەستن و نادرێنە پاڵ ناوێك و بە پەنجە ئاماژەی بۆ ناکەن.

واتە سێ سیفەتی ئەرێ و سێ سیفەتی نەرێیان بۆ جێگیردەکرێت:

یەکەم ((هیممەتی بەرز)) هیممەتی بەرز: نەوەستی تا لای خودا، کەسێك یان شتێك نەخرێتە جێگەی خودا، بە هیچ کەس رازی نەبێت جگە لە خودا، بەشی خۆی لە خودا بە هیچ شتێکی تر نەفرۆشێت، و نزیکی لە خودا و هۆگری و فەرەح و سروور و گەشانەوەی تەنها بە خوداوە بێت و بە شتێکی کەمی دونیایی نەدات، هیممەتی بەرز

لەسەر هیممەتەكانی تر وەك باڵندەی بەرز وایە بەسەر باڵندەكانی تردا، ئەو بە ئاستی نزمی ئەوان و كارە بچووكەكانیان رازی نابێت، ئەو ئافەتانەی روو لەوان دەكات روو لەم ناكەن،، هەتا هیممەت بەرزتر بێت لە ئافات دوورتر دەبێت، هەتا نزم بێتەوە ئافەت لە هەموو لایەكەوە دەورەی دەدەن، ئافەتەكان رێگر و راكێشەرن، ئەو ئافەتانە نەگەنە شوێنە بەرزەكان تا كەسەكە كێش بكەن، بەڵكو تەنها لە شوێنی نزمەوە كەسەكە بۆ لای خۆیان رادەكێشن، بۆیە بەرزیی هیممەتی مرۆڤ ناونیشانی رزگاری ئەوە و نزمی هیممەتی ناونیشانی بێبەشبوونییەتی.

نیشانەی دووەم: ((پاڵفتەبوونی مەبەست)) ئەوەش بریتییە لە رزگار بوونی مەبەست و مەرام لە هەر خەڵتەیەك دەبێتە لەمپەر لەبەردەم مەبەستەكەیدا، بۆیە پاڵفتەبوونی مەبەست و مەرام: بریتییە لە رووتكردنەوەی مەبەست لە هەر داوایەك كە بۆ خودا نەبێت، ئەم دوو ئافەتە لە مەبەست و مەرامدا بوونیان هەیە: یەكەم، ئەوەیە بۆ مەبەستەكەی رووت نەبێتەوە یان یەكلا نەبێتەوە، دووەم، داوای مەبەستەكە بۆ شتێكی تر نەبێت نەك بۆ خودی مەبەستەكە.

مەبەست پێی: پاكردنەوە و پاڵفتەكردنی مەرام و مەبەستە لە هەر ویستێك كە ململانێی مەبەست و موورادی پەروەردگار بكات، بەڵكو مەرام و مەبەست وای لێبێت رووتبووبێتەوە لە موراد و مەبەستی ئایینی و بڕیارەكانی.

نیشانەكەی: ئەوەیە كە بەشی بەندە و حەزەكانی لەژێر حەقی پەروەردگاردا بێت، بەجۆرێك بەش و حەزی ببێتە هەمان حەقی پەروەردگار كە لەسەریەتی، بەرزیی ئەم مەنزیلەیە لای خاوەن بینینی رۆشن و صادق نادیار نییە.

نیشانەی سێیەم: ((سلوكی دروست)) ئەمەش سەلامەتییە لە ئافەت و لەمپەرەكان و رێگرەكان و پەردەكان، ئەوەش بە سێ شت دروست دەبێت:

یەكەمیان: ئەوەیە كە لەسەر شارێگەی مەزن بێت، شارێگەی پێغەمبەر محمد(ﷺ)، نەك لەسەر شتە دانراوەكان و رێورەسمە زاراوەییەكان، با قسەكانی بۆ برازێننەوە و ئاماژەكانی بۆ وردبكەنەوە و دەربڕینەكانی بۆ جوان بكەن، هەموو ئەوانە لە نەفسەوەیە و بەخۆیان نازانن.

دووەم: لەسەر رێگەكە وەڵامی بانگكەری بەتاڵی و وەستان و تەمبەڵی نەداتەوە.

سێیەم: لە سلوكەكەیدا تەماشای مەبەستەكە بكات، ئەمەمان پێشتر باس كردووە.

بەم سیانە سلوك دروست و تەندروست دەبێت، بە دەربڕینێكی پوخت دەبێت یەك بێت بۆ یەك، لەسەر یەك رێگە، نە داوا و نە داواكراوی دابەش نەبێت، داواكەی رەنگاورەنگ نەبێت، بەڵكو دەكۆشێت بۆ رزگاركردنی مەبەستەكەی لە پەیوەستەكان و لەمپەرەكان، وەك داوا و گەیشتن بە راستییەكان(الحقائق)، بۆیە لە عادەتەكانی خۆی بزر دەبێت، تاكو لەو رێگەیەوە پەیوەستەكان و پەیوەندییەكانی كۆتا پێبهێنێت، ئەوەش ئەو شتانەیە بە دڵ و جەستە و هەستەكانییەوە دەلكێن لە ئولفەت پێوەگیراوەكان، هەر بەو جۆرە پێش كۆسپ و لەمپەرەكان دەكەوێت تاكو پێی نەگەن و زەفەری پێ نەبەن.

ئەم بزربوونە(بزربوون و دووركەوتنەوە لە عادەتەكانی) بە مەبەستی گەڕان بەدوای راستییەكان(الحقائق)دا، ((لەمپەرەكان)) ئەو دووردەخەنەوە لە داوا و مەرام و وای لێدەكەن دژ و پێچەوانەی داوا و مەرامی بەدەست بهێنێت.

راستییەكان ((الحقائق)) كۆی وشەی "حقيقة"یە، مەبەست پێی: حەق تەعالا(خودا) و ئەوەی دەدرێتە پاڵی، ئەو-سبحانه- بۆ خۆی حەقە و قسەكانی حەق و بەڵێنەكانی حەق و لیقای حەق و پێغەمبەرەكەی حەق و تەنها بۆ ئەو بەندایەتی حەقە و بەندایەتی جگە لە ئەو باتڵە. هەموو شتێك جگە لە "الله" باتڵە.

مەبەستەكە: مورید گەر داوا و مەبەستەكەی لەو خەرۆكەر(خەریككەر) و رێگرانەی كۆسپ و لەمپەری بۆ دروست دەكەن پاڵفتە نەكات: ئەوا ناگاتە مەبەستەكەی، گەر بگاتە مەبەست لەدوای رەنج و مەینەتی و ئازارێكی زۆرەوە پێیدەگات، ئەمەش بەهۆی ئەو خەریككەرانەوە كە رووی تێدەكەن، هیچ دەستەیەك ناگەنە داواكەیان بە بڕینی كۆسپ و لەمپەرەكان و دووركەوتنەوە نەبێت لە سەرقاڵییەكان.

سلوكی دروست بەیەكجاریی نەفس و سروشتی مرۆیی نامرێنێت، گەر ئەو سروشت و نەفسە نەبوونایە بازاڕی تاقیكردنەوەی خودایی دانەئەنرا و لەم جیهانەدا تەكلیف لە مرۆڤ نەدەكرا، بەڵكو سروشت و نەفس بە دەسەڵاتی زانست و مەعریفە و باوەڕ و خۆشەویستی ژێردەستە دەكرێن، ژێردەستەی بەزیو هەر دەبێت جووڵەیەك بكات با كەمیش بێت، بەڵام جووڵەی دیلێكی ژێردەستە، دوای ئەوەی جووڵەكەی جووڵەی ئەمیرێكی زاڵ بوو بەسەر مرۆڤدا.

لە تەواوبوونی ئیحسانی پەروەردگار بە بەندەکەی و ناساندنی قەدری نیعمەتەکەی: ئەو نەفسەی پێنیشان داوە بە ژێردەستەیی و زەلیلی دوای ئەوەی حاکم و زاڵ بوو بەسەریدا، ئەو کاتە بەندە هانا و پەنا بۆ پەروەردگار و دۆستی خۆی و مالیکی هەموو کاروبارەکانی دەبات: ((**یا مقلب القلوب ثبت قلبي على دينك، يا مصرف القلوب صرف قلبي على طاعتك**)).

هەروەها لە ئیحسانەکانی خودا لەگەڵ بەندەکەی: لە دڵیدا ئافاتی پاڵدانەوە بەلای نەفس و کردار و حاڵیدا ناهێڵێت و دەیسڕێتەوە، وەك وتراوە: گەر پاڵدەدەیەوە بە لای زانستدا لەبیرتی دەبەینەوە، گەر پاڵدەدەیەوە بەلای حاڵدا لێت وەردەگرینەوە، گەر پاڵ دەدەیەوە بەلای مەعریفەدا لێت دەشارینەوە، گەر پاڵ دەدەیەوە بەلای دڵتدا: لێتی تێکدەدەین، بۆیە بەندە دەبێ پاڵ بەلای خودادا بداتەوە، هەر کات هەستی کرد مەیلی دڵی بەلای غەیری خودادا چووە با بزانێت ڕەوانەی لای موفلیسێك کراوە، بەڵکو ڕەوانەی لای نەبوونێك کراوە، ئەو کەسە دەرگای مەکری خودای بەڕوودا کراوەتەوە با خۆی بپارێزێت لە چوونەژوورەوە.

بزانە هەرچییەك لە تۆوە بێت حیجابە بۆ داواکەت، گەر لەگەڵی وەستای ئەوە تۆ لەخوار حیجابەوەی، گەر ئەوەت بڕی بە ڕووتکردنەوەی داوایەکەت لە هەرچی شتە جگە لە خودا ئەوە تۆ لەسەرو حیجابەوەی، داوا و ویست و تەوەکول و حاڵ و کردارت هەر هەموو حیجابن گەر لە پایاندا بوەستی، یان مەیلت پێدان، گەر هەموو ئەوانەت بڕی بۆ لای ئەوەی تۆ دەتەوێ و بۆی دەژیت، ئەو کەسەی تۆ لەبەر دەستیدای و لەژێر بڕیار و ویستی ئەودای و تەنها گەردیلەیەکت نییە ئەو خاوەنی نەبێت و لەوەوە سەرچاوەی وەرنەگرتبێت، ئەوا تۆ لەسەرو حیجابەوەی، هەروەها گەر لە ویست و کۆشانتدا لە پای داوەکەتدا نەوەستای: ئەوا تۆ لەسەرو حیجابی داواکەتەوەی.

مەزنترین زیان و زەرەر حیجابی دڵە لە پەروەردگاری، ئەوەش سزاکەی لە سزای دۆزەخ قورسترە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ كَلَّآ إِنَّهُمۡ عَن رَّبِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّمَحۡجُوبُونَ ١٥ ثُمَّ إِنَّهُمۡ لَصَالُواْ ٱلۡجَحِيمِ ١٦ ﴾ المطففين: ١٥ – ١٦.

دڵی عاریف لە خودا مەحجوب نابێت، بەڵکو لەناو نووری زەفەربردندا دەژی بەوەی دڵی ڕووی لە خودای موتەعال کردووە، و هەموو ویستی خۆی لەسەر خودا کۆکردۆتەوە، بە

موورادی خۆی لە موورادی نەفسی فەنای کردووە، بۆیە ئەوەی زۆربەی خەڵکی بزری کردووە ئەو دۆزیویەتەوە، نووری ئەو بوونە بەبەر دڵیدا کراوە، تا ئەوەندە زۆر بووە لێشاوی لەسەر زمان و ئەندامەکان و جووڵە و وەستانی جاری دەبێت، گەر قسە دەکات نووری لێ بەرز دەبێتەوە، گەر بێدەنگ دەبێت نووری لێ بەرز دەبێتەوە.

حیجابەکان دە دانەن:

یەکەم: حیجابی پەکخستن (التعطیل)، و نەرێکردنی حەقیقەتی ناو و سیفەتەکانی خودای موتەعال(کە لە هەموویان چڕترە)، خاوەنی ئەم حیجابە هەرگیز ئامادەیی پەیدا ناکات بۆ ئەوەی خودا بناسێت، و هەگیز بە خودا ناگات، مەگەر بەردێك ئامادەیی پەیدا بکات و بۆ سەرەوە بەرز ببێتەوە.

دووەم: حیجابی هاوەڵدانان بۆ خودا: ئەوەش ئەوەیە دڵی غەیری خودا ببپەرستێت.

سێیەم: حیجابی بیدعەی قەولی: وەك حیجابی ئەهلی ئارەزوو و وتاری فاسید بە هەموو جۆرەکانییەوە.

چوارەم: حیجابی بیدعەی کرداری: وەك حیجابی ئەهلی سلوکی بیدعەکران لە رێگە و سلوکیاندا.

پێنجەم: حیجابی ئەهلی گوناهە دیارە گەورەکان، حیجابی ئەمانە نەرمترە لە حیجابی ئەهلی تاوانە شاراوە گەورەکان، لەگەڵ زۆری عیبادەت و زوهد و کۆشانیان، گوناهی گەورەی ئەوانە نزیکترە لە تەوبەوە تا ئەوانەی تاوانی گەورەی ناوەوەیان هەیە، چونکە ئەو گوناهانە لایان بووە بە مەقامات و حاشای لێ ناکەن لە دەرخستن و خستنە دەرەوەی لە قالبی عیبادەت و مەعریفەدا، بۆیە ئەهلی گوناهە ئاشکرا گەورەکان: نزیکترن لە سەلامەتییەوە لە گوناهی ئەوانە، دڵی ئەوانە چاکتر و باشترە لە دڵی ئەوان.

حەوتەم: حیجابی ئەهلی گوناهی بچووك.

هەشتەم: حیجابی ئەهلی زیادەکان و پێڕاکێشان لە موباحاتدا.

نۆیەم: حیجابی ئەهلی بێئاگایی لە ئامادەکردنی ئەوەی لە پێناویدا دروستکراون و داوایان لێکراوە، هەروەها ئەوەی لە سەریانە لە بەردەوامی یادی خودا و شوکر و بەندایەتی.

دەیەم: حیجابی موجتەهیدان و سالیکان، ئەوانەی خۆیان یەکلاکردۆتەوە بۆ رۆیشتن بۆ لای مەبەستەکەیان(واتە بۆ لای خودا).

ئەمە دە حیجابە لەنێوان دڵ و خودادا(ﷻ) کە دەبنە لادانی کەسەکە لە گەیشتنی تەواو بە مەبەستەکەیان، ئەم حیجابانە لە چوار رەگەزەوە سەر هەڵدەدەن: رەگەزی نەفس، و رەگەزی شەیتان، و رەگەزی دونیا، و رەگەزی ئارەزوو، مرۆڤ ناتوانێت ئەو دە حیجابە بڕەوێنێتەوە گەر چوار رەگەزەکە لەناو دڵیدا بمێننەوە.

ئەم چوار رەگەزە: گوفتار و کار و مەبەست و رێگە تێکدەدەن، بەپێی زۆری و کەمیان.

ئەم چوار رەگەزە رێگەی گوفتار و کار و مەبەست دەبڕنەوە تا نەگەنە دڵ، ئەوەش کە دەگاتە دڵ رێگە لە سالیك دەبڕنەوە تاکو نەگات بە پەروەردگاری، لەنێوان گوفتار و کردار و دڵدا دوورییەك هەیە کە بەندە لێیەوە سەفەر بۆ لای دڵی خۆی دەکات تاکو لەوێ شتە سەیر و سەمەرەکان ببینێت، لەو ماوە و لەو دوورییەدا ئەو چوار جۆرە لە چەتە و رێگر هەن، گەر لەگەڵیان جەنگا و کار پاکبوویەوە بۆ دڵ ئەوا تیایدا دەمێنێتەوە و دەیکات بە خانەی خۆی، داوای کۆمەك و یارمەتی لە خودا دەکات، ئەو ئارامی بۆ نییە تا نەگاتە پەروەردگاری﴿ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلۡمُنتَهَىٰ ﴿٤٢﴾ ﴾ النجم: ٤٢، کە گەیشتە خودای موتەعال ئەوا ئیمان و یەقین و ژیری زۆرتری پێدەبەخشێت و دەرەوە و ناوەوەی خۆی پێ جوان دەکات، بەو گەیشتن بە خودایە دەگاتە باشترین ئەخلاق و کردەوە، و خراپەکانی ئەخلاق و کردەوە ناباشەکانی لێدەکاتەوە، بەو کارەش خودای موتەعال سەربازگەلێك لە دڵدا دادەنێت کە دژ بە چەتە و رێگرەکان دەجەنگن تاکو نەگەنە دڵ، لەگەڵ دونیا دەجەنگێت بە زوهدکردن تیایدا و دەرکردنی لە دڵ، زیانی پێناگەیەنێت گەر لە دەست وماڵیدا بێت، هەروەها رێگری ناکات لە هێزی یەقینی بەدوارۆژ، لەگەڵ شەیتان دەجەنگێت بە وازهێنان لە وەڵامدانەوەی بانگکەری ئارەزوو، شەیتان لە ئارەزوو جیانابێتەوە، لەگەڵ ئارەزوو دەجەنگێت بەوەی ئەمرەکان بە رەهایی وەردەگرێت، و لەسەریان دەوەستێت، بەجۆرێك ئارەزوو لەوەی ئەنجامی دەدات و ئەنجامی نادات بوونی نییە، هەر بەو جۆرە بە هێزی ئیخلاص دژ بە نەفسی خۆی دەجەنگێت.

هەموو ئەمانە گەر کار و کردەوە دەروازەیەك لە دڵەوە بۆ لای پەروەردگار ببینێتەوە، گەر بەناو دڵدا گەڕا و دەرچەیەکی نەبینییەوە و نەفس تیایدا نیشتەجێ بوو بوو ئەو کاتە نەفس دڵ داگیر دەکات و دەیکات بە سەربازی خۆی، بەو هۆیەوە هێز و بەرزبوونەوە و توغیانی بۆ دروست دەبێت، دەبینیت زۆر زاهید و عابیدە و زۆر تێدەکۆشێت لەگەڵ ئەوەشدا دوورترین کەسە لە خوداوە، خاوەنی گوناهە گەورەکان دڵیان لە خوداوە نزیکترە لە دڵی ئەو، بەڵکو ئەوان لە ئیخلاص و رزگارییەوە نزیکترن تاکو ئەو.

سەرنجی کەسی سوژدەبەری عابید بدە(ئاماژە بە کەسێکی تایبەت دەکات کە بەهۆی زیادەڕەوی و رۆچوونەوە گومڕابووە)، ئەو زاهیدەی لەناو چاوانیدا ئاسەواری سوژدە دیار بوو، خاوەنی قەدێکی تەمیمی باریك لە دەرەوە، ببینە چۆن توغیانی کارەکانی: وای لێکرد ئینکاری پێغەمبەر(ﷺ) بکات، هاوەڵان و شوێنکەوتوانی ئەو کەسە موسڵمانان بە کەم تەماشا دەکەن، تا شمشێریان لە موسڵمانان راکێشا و خوێنیان حەڵاڵ کردن.

سەرنجی ئارەقخۆرە سەرخۆشەکەش بدە، کە زۆرجار دەیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر و لەسەر خواردنەوەی ئارەق داری حەدی لێدەدا چۆن هێزی باوەڕ و یەقین و خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) و خۆبەکەمزانین و گەردنکەچی بۆ خودا بەجۆرێك راستی کردەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) نەهی بکات لەوەی نەفرەتی لێ بکرێت، ئەو هاوەڵەی پێغەمبەر "عیاض بن حمار" بوو-خوا لێی رازی بێت- بەمە بۆمان دەردەکەوێت: توغیانی گوناە سەرئەنجامی باشترە لە توغیانی گوێڕایەڵی و عیبادەت.

سێ سیفەتە باشەکەی چینی یەکەم لە چاکان، یەکەمیان: پێشکەوتن لە رێبوارانی رێگە، بەجۆرێك لەسەر رێورەسمێك ناوەستن، ئەوان بەهۆی بەرزی هیممەتیانەوە پێشی خەڵکی کەوتن و لەگەڵیان نەوەستان، ئەوان کەسانی تەنها و پێشکەوتووەکانن، بەهۆی زۆر پێشکەوتنیان ئاسەواریان لەسەر رێگە بەجێنەماوە، دواکەوتووان نازانن ئەوان چ رێگەیەکیان گرتۆتە بەر، بەڵام ئەوانەیان کە زۆر لێبڕاوانە کەوتوونەتە رێ ئاسەواری نووریان زۆر لەدوورەوە دەبینن، وەك چۆن هەسارەیەك دەبینن، لەوانەی ئەوانیان بینی پرسیار دەکەن: لە کوێ ئەوانت بینی؟ حاڵی ئەو کەسانە وەك وتراوە:

أسائل عنكم كل غادر و رائح          وأومي إلى أوطانكم وأسلم

نیشانەی دووەم: ئەوان خۆیان نەداوەتە پاڵ ناوێك، واتە بە ناوێك نەناسران لای خەڵك ئاشنابێت وەك ئەو ناوانەی بوون بە ناونیشانی ئەهلی رێگە.

هەروەها: ئەوان بە ئەنجامدانی یەك جۆر كار خۆیان سنووردار نەكردووە، ناوەكەیان بەسەردا بسەپێ و بەو كارە بەناوبانگ بن، ئەو ناو و نیشانانە ئافەتی بەندایەتییە، و بەندایەتییەكی سنوورداره، بەندایەتی رەها: خاوەنەكەی یەكێك لە ناوەكانی بەسەردا ناسەپێت، ئەو وەلامی بانگی هەموو كاروكردەوە باشەكان دەداتەوە، لەگەڵ هەر دەستەیەك لە ئەهلی بەندایەتی ئەو بەشێكی هەیە، بۆیە پابەند نابێت بە رێورەسم و ئاماژە بۆكردن، هەر بەو جۆرە بە ناو و جلوبەرگ و رێگەیەكی دانراوی زاراوەییەوە پابەند نابێت، بەڵكو گەر پرسیاری شێخەكەی لێ بكەیت؟ دەفەرموێت: پێغەمبەر(ﷺ)، گەر پرسیاری رێگەكەی لێ بكرێت؟ دەفەرموێت: شوێنكەوتنی پێغەمبەر، پرسیاری پۆشاك؟ دەفەرموێ: پۆشاكی تەقوا، مەزهەب؟ بە حەكەم كردنی سوننەتی پێغەمبەر، گەر پرسیاری مەبەست و داوای لێ بكرێت؟ دەفەرموێت ﴿يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ﴾الأنعام: ٥٢، گەر پرسیاری شوێنی كۆبوونەوە و گردبوونەوەی لێ بكرێت؟ دەفەرموێت ﴿فِى بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْـَٔاصَالِ ﴿٣٦﴾ رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ﴾النور: ٣٦ – ٣٧، لە نەسەبەكەی؟ دەفەرموێ:

أبي الإسلام لا أب لي سواه          إذا افتخروا بقيس أو تميم

نیشانەی سێیەم: ئەوان–بەهۆی شاراوەییان لە خەڵكی– لە ناویاندا نەناسرێن تا بە پەنجە ئاماژەیان بۆ بكەن، ئەوانە لە هەر شوێنێك بن زەخیرەی خودان، كاتێك ئەوان لە خەڵكی شاراوە بوون بە هۆكارەكانیان و ئاماژەیان پێ نەدرا و بە رێورەسمێك لە خەڵكی جیانەبوونەوە، و خۆیان نەدایە پاڵ رێگەیەك، مەزهەبێك یان شێخێك: ئەوان كە بەم جۆرە بوون كەوابوو وەك زەخیرەیەكی شاراوە وان، ئەوانە دوورترین خەڵكن لە ئافەتەوە، چونكە هەر هەموو ئافەت لە رێورەسم و پابەندبووندایە پێیەوە، و هەروەها لە لكان بە رێگە زاراوەییەكان و دۆخە باو و تازەكان، ئەمە ئەوەیە كە زۆربەی خەڵكی لە خودا دابریوە، بەبێ ئەوەی هەست بە خۆیان بكەن، ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە: ئەهلی ئەو رێگانە بە ویست و داوا و لێبڕان و رۆیشتن بۆ لای

خودا بەناوبانگن، مەگەر تاك تاكەیە ئەگینا هەر هەموو لە رێگە دابڕاون بەهۆی رێورەسم و كۆتوبەندیانەوە.

پرسیار لە هەندێ لە ئیمامان كرا دەربارەی سوننەت؟ فەرمووی: ئەو شتەیە كە هیچ ناوێكی نییە جگە لە ((سوننەت)).

واتە ئەهلی سوننەت ناوێكیان نییە خۆیانی بدەنە پاڵ.

هەندێ خەڵك هەن جۆرە پۆشاكێك دەپۆشن كە خەڵكی نایپۆشێت، یان لە شوێنێك دادەنیشن و كۆدەبنەوە كە خەڵكی تیایدا دانانیشێ، یان رۆیشتنێك كە خەڵكی وا ناڕۆن، یان خۆڕازاندنەوە و شێوازێك كە خەڵكی بەو جۆرە نین، یان عیبادەتێكی دیاری كراو كە خەڵكی پێیەوە پابەند نییە با بەرزتریش بێت لەوەی ئەو ئەنجامی دەدات، یان خۆگرێدان بە شێخێكەوە و لانەكردنەوە بەلای كەسی تردا، با كەسەكە لەو شێخەی ئەو لە خودا و پێغەمبەرەوە(ﷺ) نزیكتریش بێت، هەموو ئەوانە مەحجوبن لە زەفەربردن بە داوای باڵا و رێگەیان لێگیراوە، ئەوان عادەت و رێورەسم كۆتوبەندی كردن، و بار و دۆخ و زاراوەكان سنووورداری كردن لەوەی خۆیان بۆ شوێنكەوتنی پێغەمبەر یەكلا بكەنەوە، بۆیە لە شوێنكەوتن دابڕان و مەنزیلەیان لە شوێنكەوتنەوە دوورترین مەنزیلەیە، دەیبینی سەرقاڵی بەندایەتییە بە وەرزش و خەڵوەكێشانەوە و خاڵیكردنەوەی دڵ لە ئەغیار، وا تەماشای زانست دەكەن كە رێگربێت لە رۆیشتن بۆ لای خودا، گەر باسی دۆستایەتی و دوژمنایەتی لە پێناوی خودا و ئەمر بە مەعروف و نەهی لە مونكەری بۆ بكەی لەلای ئەوان شەڕ و زیادەیە، گەر یەكێك لەوانە لە نێوانیاندا بەو كارانە هەستا ئەوا لەنێوان خۆیان دەیكەنە دەرەوە و بە غەریب و نامۆ لە خۆیان تەماشای دەكەن، ئەوانە دوورترین كەسن لە خوداوە با ئاماژەی زۆریشیان بۆ بكرێت...خودا زاناترە.

### ۞ خاوەنی نهێنی قووڵ

چینی دووەم: دەستەیەكن ئاماژە بە مەنزیلەیەك لە باوەڕ دەدەن، بەڵام خۆیان لە باڵاتر لەو مەنزیلەدان، خۆیان لە كاروبارێكدا نیشان دەدەن، بەڵام ئەوان لە كارێكی باڵاتردان، بانگ لەسەر شانوشكۆیەك دەكەن، بەڵام لەسەر شانوشكۆی ترن، ئەوان لە نێوان غیرەتێكن لەسەریان دایان بپۆشێت لەگەڵ ئەدەبێك بیانپارێزێت و زەریفییەك رەوشتیان بەرز رابگرێت.

ئەهلی ئەم چینی دووەمە بە هەڵبژاردن و ویست خۆیان لە پەنهان ناوە، تاكو حاڵی خۆیان و كەماڵی دەسەڵاتیان بپارێزن، مەقامی ئەوانە بەرزە و چاو نایبینێت و گومان نایگاتێ، لەگەڵ قسەكەراندا ئاماژە بەو مەقامانە دەدەن كە دەیزانن و دەیناسن لە مەقامی موریدان و سالیكانی سەرەتای رێگە، ئەوەی پەروەردگار بەوانی بەخشیوە لە خەڵكی دەشارنەوە لە حاڵی خۆشەویستی و وەجد و ئاسەواری مەعریفە و یەكتاپەرستی، ئەم جۆرە خۆشاردنەوەیە لە زمانی عەرەبیدا پێی دەوترێت ((التورية))–خۆپەنادان.

وا خۆیان نیشان دەدەن بۆ قسەكەر وەك ئەوەی ئەهلی سەرەتای رێگە بن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان لە پلە باڵاكانی باوەڕدان، قسەیان لەگەڵ دەكەن لەسەر سەرەتا و ویست و سلوك، مەقامەكەشیان لەسەرو ئەوەوەیە، ئەوان لە هەردوو حاڵەتەكەدا راست دەكەن بەڵام باڵاترین حاڵ و مەقامی خۆیان لە خەڵكی دەشارنەوە.

**بە كورتی:** ئەوان بە دەرەوەیان لەگەڵ خەڵكیدان: بەپێی ئەقڵ و تێگەیشتنیان قسەیان لەگەڵ دەكەن، بە شتێك لەگەڵیان نادوێت كە ژیرییان پێی ناگات، و سەرئەنجام ئینكاری بكەن و وادابنێن قسەكەرێكە وەكو ئەوان، خەڵكی لەلای ئەوانە، ئەوان لەلای هیچ كەس نین، ئاماژە بە مەنزیلەی ((تەوبە)) و ((خۆدادگایی)) دەكەن(ئەم دوانە لە مەنزیلەكانی سەرەتای رێگەن)، بەڵام لەڕاستیدا ئەوان لە مەنزیلەی ((خۆشەویستی)) و ((وەجد)) و ((شەوق))دان(ئەم سیانە لە مەنزیلەكانی نزیك بە كۆتایی رێگەن، كە هەرگیز رێگە كۆتایی پێنایەت).

**خۆپەنادان(التورية):** ئەوەیە وشەیەك باس بكات كە گوێگر مانایەك تێبگات و ئەویش مەبەستێكی تری هەبێت، نموونەكەی، یەكێك بڵێت: "من دەوڵەمەندم" كەسی گوێگر وا تێبگات كە ئەو بە شتومەك دەوڵەمەندە، بەڵام قسەكەر مەبەستێكی تری بە وشەی"دەوڵەمەندی" هەبێت، وەك دەوڵەمەندی بە خودا، وتراوە:

**غنيت بلا مال عن الناس كلهم وإن الغنى العلي عن الشيء لا به**

ئەوان لە نێوان غیرەتێكن لەسەریان تاكو دایان بپۆشێت: واتە خودا لەسەریان غیرەت دەكات، بۆیە لە خەڵكی دەیانشارێتەوە، ئەوانیش غیرەیان لەسەر حاڵ و مەقامی خۆیان هەیە، بۆیە دەیانشارنەوە لە بینینی خەڵك، "لەنێوان ئەدەبێك تیایاندا بیانپارێزێت و زەریفییەك رەوشتیان بەرز رابگرێت": ئەمەش ئەوەیە كە كەسەكە لە

خۆشاردنەوەکەدا ئەدەبێك بهێڵێتەوە تاکو گومانی خراپی پێنەبرێت و خۆی بپارێزێت لە رەوشت و ئاکاری نزم-بە مەبەستی خۆ شاردنەوە- تاکو پارێزراو بێت، ئەدەبەکەیان حاڵیان دەپارێزێ و هیممەتی باڵا بەرزی دەکاتەوە و ئەدەبەکەشی لەگەڵ خاکدا تەختی دەکات، وەك وتراوە:

أبلج سهل الأخلاق، ممتنع    يبرزه الدهر وهو يحتجب

إذا ترقت به عزائمه    إلى الثريا رسا به الأدب

ئەدەبی مورید و سالیك: دەبێتە پارێزەر و تاجی سەری.

زەریفی ((**الظرف**)): لەناو ئەم دەستەیەدا لە هەرچی شیرینە شیرینتر، و لە هەرچی جوانە جوانتر بوونی هەیە، هیچ شتێك نەخراوەتە پاڵ شتێکی تر جوانتر بێت لە زەریفی لە پاڵ صدق و ئیخلاص و نهێنی و کۆبوونەوە لەگەڵ خودادا، تەنها گرنگی بەوە دەدات کە بە ئامانجی گرتووە و نەفسی لە شتی لابەلا بەدوور دەگرێت، زۆربەی ئەوانەی ئەو مەقامانە بەدەست دەهێنن سینە و ئەخلاقیان لە غەیری ئەوانە بەرتەسك دەبێتەوە و قورسی لەسەر خانەوادە و ئەهلی مەجلیسیان بەجێدەهێڵن و رووی خۆش و کرانەوە و نەرم و نیانیان لێدەگرنەوە، سوێند بە خودا لەو کارەیاندا ئەوان عوزریان هەیە، با لەسەریشی شوکر نەکرێن، چونکە هەموو خەڵکی ئەغیارن، جگە لە کەسانێك کۆمەکیت دەکەن لەسەر کارەکەت و یارمەتیت دەدەن بۆ بەدەستهێنانی داوایەکەت.

کاتێك کەسەکە لە حاڵیدا قوڵدەبێتەوە و رووکردنە خودای زۆر دەبێت و کۆبوونەوەی دڵی لەگەڵ خودا دەبێت بە مەلەکە و مەقامێکی ریشەدار لەو بارەدا هۆگری بە خەڵك دەبێت و خەڵکیش هۆگری ئەو دەبن، بۆیان دەکرێتەوە، و لە ئامێزیان دەگرێت، بەهۆی لوتف و زەریفییەوە دڵان لەسەری کۆدەبنەوە، شەڕی لێ دوور دەخەنەوە، ئەوەی بۆ خەڵکی ون و نادیارە بۆ ئەو ئاسان دەبێت، رەزاقورس و ئێسککرانی تایبەتمەندی دۆستانی خودا نییە، هەر کەسێك لە دڵی صادیقان و موخلیصاندا قورس بێت ئەوە ئافاتێك لەو کەسەدا بوونی هەیە، ئەگینا ئەم رێگەیە پۆشاکێکی شیرینی و جوانی و زەریفی بە بەر شوێنکەوتەکانیدا دەکات، صادیق تیایدا شیرینترین و جوانترین و زەریفترین مرۆڤە، قورسی نەفسی و لێڵی سروشتی لەسەر سڕاوەتەوە، بووە بە کەسێکی رۆحانی ئاسمانی، دوای ئەوەی کەسێکی ئاژەڵی زەمینی بوو،

بەڕێزترین كەسە لە تێكەڵبووندا و نەرمترینیان لە هەڵسوكەوتدا، جوانترینیانە بە دڵ و بە ڕۆح، ئەمانە تایبەتمەندی خۆشەویستین، دەبێتە هۆی ئەوەی كەسەكە جوان و نەرم و زەریف و خۆشەویست بێت.

هەروەها لە زەریفییەكانی ئەهلی ئەم چینە: حاڵ و مەقامی خۆی بۆ هیچ یەكێك لە ئەهلی مەجلیسی دەرناخات و كاتێك بە یەكێكیان دەگات بە حاڵی خۆی مامەڵەی لەگەڵ ناكات، بەڵكو بە نەرمونیانی و ڕاخستنی باڵی بەزەیی و ڕووی كراوە، فەرشی هۆگری بۆ ڕادەخات و كەسەكە پەلكێش دەكاتە سەری و دایدەنیشێنێت، ئەو فەرشە خۆشەویستترە لە فەرشی گران و پانوپۆڕ.

بە كورتی: ئەم ڕێگەیە نەرێی لوتف و زەریفی ناكات.

بەڵام لێرەدا وردەكارییەكی ڕێگر هەیە ئەوەش ئەوەیە كە خۆدانە دەم ئەم جۆرە كاروبارانە خراپترین شتە بۆ مورید و سالیكی ڕێگەی خودا، هەر كەس خۆی دایە دەمی لە ڕێگە لایدەدات، هەر كەس بە تەواوی وازی لێ بهێنێت ڕێگەی سلوكی لێ سەخت و دژوار دەبێت، هەر كەس بە ئەندازەی پێویست دەستی بۆ ببات و كۆمەكی لێ وەربگرێت لەسەر ڕێگە ئاسوودەی دەكات، و كەسانی تریش پێیەوە ئاسوودە دەبن، كۆمەك تەنها لای خودایە.

❁ ❁ ❁

# (58) (منزلة الغربة)

## مەنزیلەی غوربەت

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی غوربەتە.

شێخولئیسلام هەرەوی دەفەرموێت (( (دەروازەی غوربەت) خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿فَلَوْلَا كَانَ مِنَ ٱلْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُو۟لُوا۟ بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْفَسَادِ فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ﴾هود: ١١٦))

بەلگەهێنانەوەی بەم ئایەتە لەم دەروازەیەدا: بەلگەی قووڵی زانست و مەعریفە و تێگەیشتنی شێخی "هەرەوی"یە لە قورئان، غەریبانی جیهان خاوەنی ئەم سیفەتەن كە لەو ئایەتەدا ئاماژەی پێكراوە، ئەوانەن پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی پێكردوون لەم فەرموودەیەدا ((ئیسلام بە غەریبی دەستی پێكرد، لە داهاتوودا غەریب دەكەوێتەوە وەك دەستی پێكرد، خۆشبەخت ئەو غەریبانە، وترا: ئەو غەریبانە كێن ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: ئەوانەن كە ئیصلاح دەكەن كاتێك خەڵكی تێكدەچن))

ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێت: عبدالرحمانی كوڕی مەهدی لە زوهەیری كوڕی عەمری كوڕی ئەبی عەمرەوە -مەولای موتەلیبی كوڕی حەلتەب- لە موتەلیبی كوڕی حەتەبەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی ((خۆشبەختی بۆ غەریبەكان، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا غەریبەكان كێن؟ فەرمووی: ئەوانەن كە زیاد دەكەن كاتێك خەڵكی كەم دەكەن))

گەر ئەم فەرموودەیە بەم شێوەیە پارێزراوبێت -راوییەكە لەفزەكەی نەگۆڕیبێت- ئەوەش ئەوەیە كە بفەرموێت ((الذين ينقصون إذا زاد الناس))- ئەوا ماناكەی بریتییە لە: ئەوانەی خێر و ئیمان و تەقوا زیاد دەكەن كاتێك خەڵكی لەو خێرانە كەم دەكەنەوە))، (گەر راوییەكە لەفزەكەی لێ تێكچوویێت و ئەسڵەكەی ئەوە بێت كە دەفەرموێ: ئەوانەی كەم دەكەن كاتێك خەڵكی زیاد دەكەن، ئەوا مەبەستی ئەوەیە ئەو غەریبانە ژمارەیان لە كەمی دەدات كاتێك ژمارەی خەڵكی زیاد دەكات)...خودا زاناترە.

لە فەرموودەكەی ئەعمەش لە ئەبی ئیسحاقەوە لە ئەبی ئەحوەسەوە لە عەبدوڵای كوڕی مەسعودەوە -خوا لێی رازی بێت- فەرمووی، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی

((ئیسلام بە غەریبی دەستی پێکرد، غەریب دەکەوێتەوە وەك چۆن دەستی پێکرد، خۆشبەختی بە حاڵی ئەو غەریبانە، وترا: ئەو غەریبانە کێن ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: هەڵبژاردە و دەرهێنراوەکانی هۆز و قەبیلەکانن))لە فەرموودەکەی عەبدوڵای کوڕی عومەر فەرمووی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆژێك کە ئێمە لە خزمەتی بووین– فەرمووی ((خۆشەویسترین کەس لەلای خودا غەریبەکانن، وترا: غەریبەکان کێن؟ فەرمووی:خەڵکانێکی صاڵحی کەمن لەناو خەڵکیدا زۆرن، ئەوانەی لێیان یاخی دەبن زۆرترن لەوانەی گوێڕایەڵیان دەکەن))

ئەحمەد دەفەرموێت: هەیسەمی کوڕی جەمیل بۆی باسکردین لە محمدی کوڕی مەسلەمەوە لە عوسمانی کوڕی عەبدوڵاوە لە سولێمانی کوڕی هورمزەوە لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی ((خۆشەویسترین کەس لەلای خودا غەریبەکانن، وترا: غەریبەکان کێن؟ فەرمووی: ئەوانەی بە دینەکەیانەوە هەڵهاتوون، لەسەر عیسای کوڕی مەریەم کۆدەبنەوە لە ڕۆژی قیامەتدا))

لە فەرموودەیەکی تردا ((ئیسلام بە غەریبی دەستی پێکرد، غەریب دەکەوێتەوە وەك یەکەمجاری، وترا: غەریبەکان کێن ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: ئەوانەی سوننەتەکانم زیندوو دەکەنەوە و خەڵکی پێ فێردەکەن))

نافع دەفەرموێت لە مالیکەوە ((عومەری کوڕی خەتتاب هاتە ژوورەوە بۆ مزگەوت، مەعازی کوڕی جەبەلی بینی لە تەنیشت ماڵەکەی پێغەمبەردا دانیشتبوو دەگریا، عومەر پێی فەرموو: چی ئەتگریەنێت، ئەی باوکی عبدالرحمن؟ براکەت تیاچووە؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵام بەهۆی فەرموودەیەکەوە کە خۆشەویستەکەم(ﷺ) بۆی باسکردم کە من ئەو کاتە لەم مزگەوتەدا بووم، فەرمووی: کام فەرموودەیە؟ فەرمووی: خودا کەسی شاراوەی پێپەتی لەخوداترسی بێگوناهی خۆشدەوێت، ئەوانەی کە گومدەبن کەس بەدوایاندا ناگەڕێت، کە ئامادە دەبن کەس نایان ناسێت، دڵیان چرای هیدایەتە، لە هەر فیتنەیەکی کوێری تاریك دێنە دەرەوە))

ئەوانە بریتین لە غەریبانی مەدحکراوی جێخۆزگەی خەڵکانی تر، بەهۆی زۆر کەمیان لەناو خەڵکیدا بە "غەریبان ناونراون"، زۆربەی خەڵکی ئەو سیفەتانەیان نییە، ئەهلی ئیسلام لەناو هەموو خەڵکیدا غەریبن، و باوەڕداران لەناو ئەهلی ئیسلامدا غەریبن، و

ئـەهلی زانسـت لـەناو باوەڕدارانـدا غـەریبن، و ئـەهلی سـوننەت–كـە هـەوا و بیدعـەت جیادەكەنەوە– لـەناو ئـەهلی زانسـتدا غـەریبن، بانگكـەران بـۆ سـوننەت و ئـارامگران لەسەر ئازاری سەرپێچیكەرانیان زۆرترین غوربەتیان بـەر دەكـەوێت، بـەڵام ئەوانـە بـە حەق ئەهلی خودان، غوربەتیان بۆ نییە، بەڵكو غوربەتەكـەیان لـەناو زۆرینەدایـە، كـە خودای موتەعال دەربارەیـان دەفـەرموێت ﴿ وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِي الْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ ﴾الأنعام: ١١٦، ئەمانە كە ئایەتە پیرۆزەكە ئاماژەیـان پێـدەدات لـە خـودا و پێغەمبەرەكەی و ئایینەكەی غەریب كەوتوون، غوربەتەكـەیان وەحشـەتێكی گـەورەی لەگەڵدایە، هەرچەند ناسراون و ئاماژەیان پێدەكرێت، وەك وتراوە:

فليس غريبا من تناءت دياره ولكن من تنأين عنه غريب

((غوربەت)): غوربەتی ئەهلی خودا و ئەهلی سوننەت لەنێوان خەڵكیدا ئەو غوربەتەیـە كە پێغەمبەر(ﷺ) مەدحی ئەهلەكەی كردووە، هەواڵی دەربـارەی ئایینەكـەی داوە كـە ((بـە غـەریبی دەسـتی پێكـردووە)) و جـارێكی ((غـەریب دەكەوێتـەوە وەك دەسـتی پێكرد)) ئەوكاتە ((ئەهلی ئیسلام دەبنە غەریبان))

ئەم غوربەتە لەوانەیە لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی تر و لە كاتێكەوە بۆ كـاتێكی تـر و لە دەستەیەكەوە بۆ دەستەیەكی تر جیاوازی هەبێت، بـەڵام ئـەهلی ئـەم غوربەتـە بـە حەق ئەهلی خودان، ئەوان پەنایان بۆ غەیری خودا نەبردووە، و خۆیان نەداوەتە پـاڵ هیچ كەسێك جگە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ)، بانگ بۆ هیچ شتێك ناكەن بۆ ئەوە نەبێت كە پێغەمبەر هێناویەتی، ئەوانە ئەو دەستەیەن لە خەڵكی جیادەبنەوە لـە ئاتـاجترین كاتیاندا بە خەڵكی، كە ڕۆژی قیامەت خەڵكی لەگـەڵ خواوەنـدەكانیان دەڕۆن، ئـەوان لە شوێنی خۆیاندا دەوەستن، پێیان دەوترێت ((ئێوە بۆچی لەگـەڵ خەڵكیـدا نـاڕۆن؟ دەڵێن: ئێمە لە خەڵكی دابڕاین، لە دونیـادا لـە ئـەمڕۆ زیـاتر پێویسـتمان پێیـان بـوو، بـەڵام شـوێنیان نەكـەوتین، ئـەمڕۆ چـۆن شـوێنیان دەكـەوین؟! ئێمـە چـاوەڕوانی پەروەردگارین كە دەمانپەرست))

ئەم ((غوربەتە))هـیچ وەحشـەتێك لەسـەر خاوەنەكـەی دروسـت ناكـات، بـەڵكو ئـەوە هـۆگرترین شـتە بـۆ ئـەوان كاتێـك خـەڵكی وەحشـەت روویـان تێـدەكات، خـەڵكی وەحشـەتی دەكاتـە لوتكـە كاتێـك ئـەوان لـە لوتكـەی هۆگربووندان، ئـەوان خـودا و

پێغەمبەر و ئەوانەی باوەڕیان هێنا دۆست و سەرپەرشتیکاریانە، با هەموو خەڵکی دەستدرێژییان بکەنە سەر و جەفایان لەگەڵیان هەبێت.

لەو غەریبانە ئەوانەن کە ئەنەس لە فەرموودەکەیدا لە پێغەمبەری خوداوە ریوایەتی کردووە دەفەرموێت ((لەوانەیە کەسێکی قژشێواوی تەپوتۆزاوی، خاوەن دوو لەتە پۆشاکی پوواو کە کەس فەرمووی لێناکات گەر سوێند لەسەر خودا بخوات خودا سوێندەکەی ناخات))

لە فەرموودەکەی ئەبی ئیدریس خەولانی لە مەعازی کوڕی جەبەلەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی ((دەتانەوێ هەواڵتان پێبدەم دەربارەی مەلیکەکانی ئەهلی بەهەشت؟ فەرمویان: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: هەموو لاوازێکی تەپوتۆزاوی، خاوەن دوو لەتە جلی پوواو کە کەس فەرمووی لێ ناکات، گەر سوێند لەسەر خودا بخوات خودا سوێندەکەی ناخات))، حەسەن دەفەرموێت: باوەڕدار لە دونیادا وەك غەریب وایە، لە زەلیلی دونیا تووشی نیگەرانی نابێت، و لە عیززەتیشی موناقەسە ناکات، خەڵکی حاڵێکی بۆ هەیە و ئەویش حاڵێك، خەڵکی لەدەست ئەو لە ئاسوودەییدان، ئەویش لە دەست نەفسی لە ماندووبووندایە.

هەروەها لە سیفەتەکانی ئەو غەریبانە: کە پێغەمبەر(ﷺ) غیبتە(شێوە خۆزگەیەك)ی پێبردوون: دەستگرتن بە سوننەتەوە کاتێك خەڵکی پشتی تێدەکەن، هەروەها دوورکەوتنەوە لەوەی ئەوان دایانهێناوە با ئەوەش بووبێتە مەعرووف لەلای خەڵکی، هەروەها رووتکردنەوەی یەکتاپەرستی با زۆرینەی خەڵکی ئینکاری بکەن، وازهێنان لە خۆدانەپاڵ هەر کەس و شتێك جگە لە خودا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) بەڵکو ئەو غەریبانە بە بەندایەتی خۆیانداوەتە پاڵ خودای موتەعال بەتەنها، و پاڵ پێغەمبەرەکەی(ﷺ) بە شوێنکەوتنی ئەوەی ئەو لە خوداوە هێناویەتی، ئەوانە بە حەق پشکۆیان لەناو دەستی خۆیان داناوە، زۆربەی خەڵکی-بەڵکو هەر هەموویان-لۆمەیان دەکەن، بەهۆی غوربەتیانەوە لەنێوان خەڵکدا بە ئەهلی توندڕەوی و بیدعە سەرژمێرییان دەکەن، هەروەها تۆمەتباریان دەکەن بە جیابوونەوە لە زۆرینەی مەزن.

مانای فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) ((ئەوانە کەسانێکن لە هۆز و قەبیلەکان هەڵبژێرراون، یان دەرهێنراون، یاخود راکێشراونەتە دەرەوە))خودای موتەعال

پێغەمبەرەکەی رەوانەکرد و ئەهلی سەر زەوی لەسەر دیانەتی جۆراوجۆر بوون، ئەوان لە نێوان بەندەی بت و ئاگر و وێنە و صەلیب، و یەهود و صابیئە و فەلاسفەدا بوون، ئیسلام لە یەکەم دەرکەوتنیەوە غەریب بوو، ئەوانەی موسڵمان دەبوون و دەچوون بەدەم بانگی خودا و پێغەمبەرەوە لە گەڕەك و قەبیلە و خانەوادە و عەشرەتەکەیاندا غەریب بوون.

بۆیە ئەوانەی وەڵامی بانگی ئیسلامیان دەدایەوە لە قەبیلەکان دەرهێنرابوون، بەڵکو تاکە تاکەی ئەو قەبیلانە بوون، لە قەبیلە و عەشرەتیان غەریب کەوتنەوە، و هاتنە ناو ئیسلامەوە، ئەوانە بەڕاستی غەریب بوون، تا ئیسلام ئاشکرا بوو و بانگەکەی بڵاوەی کرد و خەڵکی پۆل پۆل هاتنە ناو ئیسلامەوە، ئەو غوربەتەیان لێڕەوایەوە، پاشان ئیسلام دەستی بە غەریبکەوتنەوە و رۆیشتن کرد تا غەریب کەوتەوە وەك یەکەمجار، بەڵکو ئیسلامی دروست –کە پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی لەسەری بوون– لە ئەمڕۆدا غوربەتەکەی لە دەرکەوتنی یەکەمجاری زۆرترە، هەرچەند بەیداخ و رێورەسمی دیاریی بەناوبانگ و ناسراوە، ئیسلامی راستەقینە زۆر غەریبە، ئەهلی ئیسلامیش لەناو خەڵکیدا زۆرترین غوربەتیان هەیە.

چۆن تەنها یەك دەستە زۆر کەم و غەریب نییە لە نێوان حەفتا و دوو دەستەدا کە خاوەنی شوێنکەوتە و سەرۆکایەتی و پلە و پایە و ویلایەتن، دەستەگەلێك کە بازاڕیان گەرم بووە بە سەرپێچیکردن لەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی؟ ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی دژی ئارەزوو و چێژی ئەوان و ئەوەی ئەوان لەسەرینی لە شوبوهات و بیدعە کە بووە بە کۆتا چاکە و کرداریان، هەروەها دژی حەز و ئارەزوویان کە دەرئەنجامی مەبەست و مەرام و ویستی ئەوانە؟

چونکە باوەڕداری رێبوار بۆ لای خودا لەسەر رێگەی شوێنکەوتن غەریب ناکەوێتەوە لە نێوان ئەوانەی کە شوێنی ئارەزووەکانیان کەوتن و گوێڕایەڵییان لە ژەنگ و ژاری دەروونی خۆیان کرد و هەریەکەیان بە بۆچوونی پووچی خۆیەوە سەرسام بوو؟

بۆ ئەو مەبەستە پاداشتی موسڵمانی صادق لەم سەردەمەدا–گەر دەست بە ئایینی خۆیەوە بگرێت– بە پاداشتی پەنجا هاوەڵی پێغەمبەر دانراوە، لە سونەنی ئەبی داوود و "الترمذي"دا لە فەرموودەکەی ئەبی سەعلەبەی خوشەنیدا فەرمووی ((پرسیارم لە

پێغەمبەر(ﷺ) كرد دەربارەی ئەم ئایەتـە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡ ﴾فەرمووی: مەعروف ئەنجام بدەن و لـە مونكـەر دووربكەونـەوە، تـا چوچنۆكییەكی گوێیـۆگیراو، و ئارزوویـەكی شـوێنكەوتە، و دونیایـەكی هەڵبـژێرراو، و خۆپەسەندی هەر خاوەن رایەك بـە رایەكـەی خۆیـەوە دەبیـنن، لـەو بـارەدا خـەریكی تایبەتی خۆت بە و خەڵكی عەوام واز لێ بهێنە، لـەدوای ئێـوەوە رۆژگـاری ئـارامگرتن هەیە، ئـارامگرتن لـەو رۆژگارانـەدا وەك گووشـینی پشـكۆ وایـە لـەناو لـەپی دەسـتدا، كاركەر لەو رۆژەدا پاداشتی پەنجا پیاوی هەیە كـە وەك كارەكـەی ئـەو كاربكـەن، وتم ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) پاداشتی پەنجا لەوان؟ فەرمووی: پاداشتی پەنجا پیـاو لـە ئێوە)) ئەم پاداشتە مەزنە بەهۆی غەریبكەوتنەوەیەتی لەناو خەڵكیدا و دەستگرتن بە سوننەتەوە لەنێوان تاریكستانی ئارەزوو و بۆچوونەكانیاندا.

گەر باوەڕدار–كە خودا لە ئایینەكەیدا بینینی رۆشـنی پێـداوە و فیقهـی لـە سـوننەتی پێغەمبەرەكەیدا پێبەخشیوە و نیشانی داوە خەڵكی لەناو چیدان لە ئـارەزوو بیدعـە و گومڕایی و لادانیان لە شاڕێگەی راست و دروسـت كـە پێغەمبـەر و هـاوەڵانی لەسـەری بوون– گەر دەیەوێت ئەم رێگەیە بگرێتە بەر با نەفسی خـۆی قـایم بكـات لـە تـوانجی نەفامان و ئەهلی بیدعە، و تانەدانیان لێی و بەسووك تەماشاكردنی لەلایەن ئەوانەوە و گۆڕانی خەڵكی بەرانبەر بە ئەو و هەڕەشەیان لێی، وەك پێشـینەكانیان لـە بێبـاوەڕان لەگەڵ ئیمام و پێشەواكەیدا(ﷺ) ئەنجامیان دەدا.

ئەو لە ئایینەكەیدا غەریبە بەهۆی فەسادی ئایینەكەی ئەوانەوە، غەریبە لـە دەسـتگرتن بە سـوننەتەوە بـەهۆی دەسـتگرتنی ئـەوان بـە بیدعـەوە، غەریبـە لـە باوەڕیـدا بـەهۆی فەسـادی ئـەوان لـە بیروباوەڕیـان، غەریبـە لـە نوێژەكەیـدا بـەهۆی خراپـی نوێژەكـەی ئەوانەوە، غەریبە لە رێگەكەی بەهۆی گومڕایی و فەسـادی رێگەكانیانـەوە، غەریبـە لـە خۆدانەپاڵیدا بەهۆی سەرپێچی لـە خۆدانـەپاڵی ئـەوان، غەریبـە لـە ماڵـەوە و تێكـەڵاوی لەگەڵیان، چونكە بە شتێك تێكەڵیان دەبێت كە ئارەزووەكانی ئەوان حەزی پێناكەن.

بە كـورتی: ئـەو غەریبـە لـە كاروبـاری دونیـا و دواڕۆژیـدا، لـە خەڵكییـەوە بـە گشـتی یاریدەدەر و كۆمەككاری بۆ نییە، ئەو لـەناو نەزانەكانـدا زانایـە، و خـاوەنی سـوننەتە لەناو ئەهلی بیدعەتدا، بانگ بۆ لای خودا و پێغەمبەرەكەی دەكات لەنێوان بانگكـەران

بۆ ئارەزوو و بیدعە، ئەمر بە مەعروف دەكات و نەهی لە مونكەر دەكات لەنێوان خەڵكێكدا كە مەعروف لە لایان بووە بە مونكەر و مونكەر لەلایان بووە بە مەعروف.

پاشان هەموو خەڵكی لەم خانەی دونیایەدا غەریبن، ئێرە خانەی مانەوەی هەتاهەتایی نییە، ئەو خانەیە نییە كە لە پێناویدا دروستكراون، پێغەمبەر(ﷺ) بە عەبدوڵای كوڕی عومەری-خوا لە خۆی و باوكی رازی بێت- فەرموو ((لە دونیادا بژی وەك ئەوەی غەریبێك بیت یان رێبوارێكی رێگە)) ئەو-عەبدوڵا- بەو جۆرە بوو، چونكە بەدڵ تەماشای فەرمانەكەی پێغەمبەری كرد و بە دروستی تێیگەیشت.

لێرەدا چەند دێڕە هۆنراوەیەكم هەیە:

وحي على جنات عدن فإنها ... منازلك الأولى وفيها المخيم
ولكننا سبي العدو فهل ترى ... نعود إلى أوطاننا ونسلم
وأي اغتراب فوق غربتنا التي ... لنا أضحت الأعداء فينا تحكم
وقد زعموا أن الغريب إذا نأى ... وشطت به أوطانه ليس ينعم
فمن أجل ذا لا ينعم العبد ساعة ... من العمر، إلا بعد ما يتألم

چۆن بەندە لەم خانەی دونیایەیەدا غەریب نابێت كە ئەو لەسەر سەفەرە و تەنها لە نێوان ئەهلی گۆڕستاندا لە وڵاخەكەی دادەبەزێت؟ ئەو لە وێنەی دانیشتوویەكدا لە سەفەردایە، وتراوە:

وما هذه الأيام إلا مراحل ... يحث بها داع إلى الموت قاصد
وأعجب شيء-لو تأملت- انها ... منازل تطوى، والمسافر قاعد

❁ ❁ ❁

## (59) (منزلة التمكن)

# مەنزیلەی دامەزراوی

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی دامەزراویی(التمكن)ە.

خاوەنی "منازل السائرين" دەفەرموێت:

(("دەروازەی دامەزراویی(التمكن) خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ الَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ (٦٠)﴾ الروم: ٦٠)).

رووی بەڵگەهێنانەوەی بە ئایەتەكە لە لوتكەی ئاشكراییدایە، ئەویش ئەوەیە كەسی دامەزراو گوێ بە زۆری مەشغەڵەت و كاروبار نادات، هەر بەو جۆرە گوێ بە سەرپێچی خەڵگە بێئاگاكان و تێكەڵاوی دەستبەتاڵەكان نادات، بەڵكو بە ئارامگرتن و یەقین توانیویەتی كاریگەرییەكانی ئەوان و بێزاركردنیان لەسەر خۆی نەهێڵێت، بۆیە خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ ﴾الروم: ٦٠، هەر كەس حەقی ئارامگرتن بدات و یەقینی بەوە بوو كە بەڵێنەكانی خودا حەقن: ئەهلی بەتاڵ لەسەر بیروباوەڕی خۆی لاینادەن، هەر بەو جۆرە ئەوانەی یەقینیان نییە ناتوانن لایبدەن، هەر كات ئارامگرتن یان یەقینی -یان هەردووكیان- لاوازی رووی تێكرد ئەوانە دەتوانن بێزاری بكەن و لایبدەن، راكێشانی بۆ لای ئەوان بەپێی لاوازی هێزی ئارامگرتن و یەقینییەتی، هەتا ئەو دوانە(ئارامگرتن و یەقین) لاوازتر بن راكێشانەكە بەهێزتر دەبێت، هەتا (ئارامگرتن و یەقین) خۆكشانەوەی لە دەستیان بەهێزتر و راكێشانی ئەوان بە لای ئەمدا زۆرترە.

دامەزراویی((التمكن)): بریتییە لە توانای بڕیاردان لە ئەنجامدان و ئەنجام نەدان، ((مكانة))شی پێ دەوترێت،، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ قُلْ يَا قَوْمِ اعْمَلُوا عَلَى مَكَانَتِكُمْ إِنِّي عَامِلٌ ﴾الأنعام: ١٣٥، هەروەها دەفەرموێت ﴿ قُلْ يَا قَوْمِ اعْمَلُوا عَلَى مَكَانَتِكُمْ إِنِّي عَامِلٌ ﴾الزمر: ٣٩.

دامەزراویی لەسەرو دڵنیایی ((الطمأنينة)وەیە، چونكە دڵنیایی لەگەڵ جۆرێك لە كێبەركێدایە تا دڵ دڵنیا دەبێتەوە بەلای ئەوەدا كە سوكنایی پێ دەبەخشێت و

دایدەمرکێنێتەوە، هەندێ جار لە دڵنیاییدا دامەزراویی وەردەگرێت، هەندێ جاریش وا نییە، بۆیە دامەزراویی(التمكن) لوتکەی جێگیربوونە، "التمكن"لەسەر کێشی "التفعل" لە شوێن و جێ، وەك ئەوەی مەقامەکەی بووبێت بە شوێن و جێگە بۆ دڵی و کردبێتی بە مەنزڵگای خۆی و شوێنی نیشتەجێبوونی، و وای لێهاتووە دەستی پێوە گرتووە و لێی نابێتەوە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَٱعْتَصِمُواْ بِٱللَّهِ هُوَ مَوْلَىٰكُمْ فَنِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ ﴿٧٨﴾﴾ الحج: ٧٨، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٠١﴾﴾ آل عمران: ١٠١، وە دەفەرموێت ﴿وَٱعْتَصَمُواْ بِٱللَّهِ وَأَخْلَصُواْ دِينَهُمْ لِلَّهِ﴾ النساء: ١٤٦، هەروەها ﴿وَٱعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا﴾ آل عمران: ١٠٣.

دەستگرتن(إعتصام) بە خودا دوو جۆرە: دەستپێوەگرتنی تەوەکول و داوای کۆمەکی و رادەستکردن و پەناپێگرتن و نەفس دانە دەست و گەردنکەچبوون بۆ خودا-سبحانه-

دووەم: دەستگرتن بە وەحییەکەیەوە، بەبێ بیروبۆچوون و کێشانە و پێوانە و مەعقول و چێژ و کەشف و وەجدی پیاوان، هەر کەس وانەبێت ئەوە دەستگرتنی خۆیدا پساوە، هەموو دین بریتییە لە دەستگرتن بە خودا و بە ئایینەکەیەوە، لەڕووی زانست و حاڵ و کردار و ئیخلاص و داوای کۆمەك و شوێنکەوتن و بەردەوامبوون لەسەر هەموو ئەوانە تا رۆژی دوایی، ئەوە بریتییە لە حەقیقەتی دامەزراویی(التمكن).

## ۞ ئیخلاص.... لە رێگەیەکی بەرینەوە

لە نموونەی دامەزراویی: دامەزراویی موریدە، ئەوەش بریتییە لە کۆبوونەوەی مەبەستێکی دروست کە بۆ پێشەوەی ببات لەگەڵ رێگەیەکی بەرین کە ئاسوودەی بکات(أن يجتمع صحة قصد يسيره و سعة طريق تروحه).

دروستیی مەبەست(صحة القصد): مەرامی بەرەو خوداچوونی راست و رەوان دەکات، و بە دروستیی و تەواویی زانست رێگەکەی بۆ رۆشن دەبێتەوە، بە فراوانی رێگەش(سعة الطريق) رۆیشتن لەسەری ئاسان دەبێت، هەر داواکارێك پێویستە داوا و ئامانجەکەی دیاری بکات، ئەو ئامانجەش بە مەبەست دەگیرێت، هەر بەو جۆرە زانین و ناسینی رێگەی گەیشتن بەو داوا و ئامانجە، هەر کات یەکێك لەم سیانەی لەدەستچوو: نە ئامانجەکەی و نە رۆیشتنەکەی بۆ لای ئامانجەکەی دروست و تەواو نابن.

گەر بەندە تەنها پەروەردگاری هەڵبژارد: ئامانجەکەی دیاری کردووە، کاتێك کەوتە هەوڵ و کۆشش بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکەی: داوا و مەبەستەکەی تەواو و دروست دەبێت، کە خۆی بە شوێنکەوتنی فەرمانەکان و دوورکەوتنەوە لە نەهیلێکراوەکان رازاندەوە: ئەوا رێگەکەی دروست و تەواو دەبێت، دروستیی مەرام و دروستیی رێگە(صحة القصد وصحة الطريق) لەسەر دروستیی داواکراو(المطلوب) و دیاری کردنی وەستاوە.

حوکمی مەرام(حكم القصد) لە حوکمی مەبەست(حكم المقصود)ەکە وەردەگیرێت، هەر کات مەبەستەکە شایستەی هەڵبژردن بوو، ئەوا مەرامی جێبەجێ کردن پێییەوە وابەستە دەبێت، کەوابوو مەرامی جێبەجێ کردن و رێگەکە شوێنی مەبەستەکە دەکەون.

بەندایەتی تێروتەواو: ئەوەیە کە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) تەبا بێت لە مەبەست و مەرام و رێگەکەیدا، مەبەستەکەی(واتە ئامانجەکەی): تەنها "الله" بێت، مەرامەکەی جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی ئەو بێت لە خودی خۆی و لە دروستکراوەکانیدا، رێگەکەی: بریتییە لە شوێنکەوتنی ئەو وەحییەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دابەزیوە و هاوەڵان–خوا لێیان رازی بێت– لەسەر ئەوە بوون هەتا بە خودا گەیشتن، پاشان شوێنکەوتوان بەدوای ئەواندا بە ئیحسان هاتن و شوێنپێی ئەوانیان هەڵگرت.

پاشان رێگەی جۆراوجۆر خەڵکی دابەش کرد، باشترین خەڵك: ئەوانەن لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) تەبان لە "ئامانج" و "رێگە"دا، دوورترینیان لە خودا و لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەوانەن لە مەبەست و رێگەدا سەرپێچییان لە پێغەمبەر(ﷺ) کردووە، ئەوانەش بریتین لە ئەهلی شیرك لە "پەرستراو"دا و ئەهلی بیدعە لە "پەرستن"دا، هەیانە لە مەبەست و ئامانجدا لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) تەبان، بەڵام لە "رێگە"دا سەرپێچییان لە پێغەمبەر(ﷺ) کردووە، هەشیانە لە رێگەدا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) تەبان، بەڵام لە ئامانج و مەبەستدا سەرپێچییان کردووە.

هەر کەس مورادەکەی خودا و بەدەستهێنانی خانەی دوارۆژ بێت، ئەوا لە مەبەست و ئامانجدا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) تەبا بووە، گەر خودای پەرست بەوەی لەسەر زمانی پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە: ئەوە لە "رێگە"دا لەگەڵی تەبا بووە، گەر بە شتانێکی تر جگە لەوە خودای پەرست: ئەوا لە "رێگە"دا سەرپێچی لە پێغەمبەر(ﷺ) کردووە.

هەر كەس-لە ئەهلی زانست و عیبادەت و زوهد لە دونیا- مەبەستی سەرۆكایەتی كردن بێت، ئەوا لە مەبەستدا سەرپێچی لە پێغەمبەر(ﷺ) كردووە با پابەندی ئەمر و نەهیش بێت.

گەر لە پاڵ سەرپێچی كردن لە پێغەمبەر لە مەبەستدا پابەندی ئەمر و نەهیش نەبێت ئەوا لە رێگەشدا سەرپێچی لێ كردووە.

((فراوانی رێگە)) دوو شتە:

یەكەم، فراوانییەكەی: تا لێی بەرتەسك نەبێتەوە بەجۆرێك نەتوانێت بیگرێتە بەر و بەسەریدا گوزەر بكات، دووەم، راستی و رەوانی رێگەكە: تا نەبێتە هۆی لادانی بەرەو رێگەی تر، رێگەی حەق "فراوان" و "رێك"ە، رێگەی باتڵیش "بەرتەسك" و "لار و خوار"ە.

## ۞ بە لابردنی حیجابی وابەستەكان(حجاب العلائق) نوور دەچێتە ژوورەوە

هەروەها لە نموونەی دامەزراویی: دامەزراویی سالیكە، ئەوەش ئەوەیە كەسەكە دروستیی دابڕان(صحة إنقطاع) و بروسكەی كەشف(برق كشف) و روناكی حاڵ(ضیاء حال)ی بۆ كۆببێتەوە.

ئەم پلەیە تەواوتر و كامڵترە لە پلەكەی پێش خۆی، ئەوەی پێشووتر بریتی بوو لە دامەزراویی راستكردنەوەی مەرامی كاروكردەوەكان، بەڵام ئەم پلەیە بریتییە لە دامەزراویی لە حاڵی دامەزراویدا، وەك ئاشكرایە دامەزراویی لە حاڵدا كامڵترە لە دامەزراویی لە مەرامدا.

مەبەست لە ((دروستیی دابڕان)) بریتییە لە دابڕانی دڵ لە نەیارەكان و سەرقاڵكەرەكان كە لێڵی بەدوای خۆیاندا دەهێنن.

هۆی ئەو نوورە(مەبەستی نووری كەشفە) ئەوەیە كە نووری یەقین بەهۆی ناو و سیفەتەكانی خودای موتەعالەوە بەسەر دڵیدا رژاوە، بۆیە نوورێكی تایبەت لە دڵیدا بەهۆی مەعریفە و ئیمان و چێژی ئەوانەوە سەرهەڵدەدات، جگە لە نووری عیبادەت و ویست و لێبڕان و سلوك.

گەر كەسەكە لە مەقامی مەعریفەدا گەیشتە سنوورێك وەك ئەوەی تەماشای پەروەردگاری دەكات كە رازاوەتەوە بە سیفاتی كەماڵ و جەلال، و دڵی هەستی بە

نزیكییەكی تایبەت كرد نەك وەك نزیكی شتی بەرهەست لە یەكترەوە، نزیكییەك تا حیجاب هەڵبگیرێت لە نێوان دڵ و ڕۆح لەگەڵ پەروەردگاری، حیجابی كەسەكە بریتییە لە نەفسی، خودای موتەعال بەهێز و دەسەڵاتی خۆی ئەو حیجابەی لەسەر لاداوە، ئەو كات دڵ و ڕۆح ڕوویان لە خودا كردووە، بۆیە كەسەكە خودا دەپەرستێت وەك ئەوەی بیبینێت.

خودای موتەعال بینینی ناو و سیفەتەكانی كردووە بە ڕێگەیەك بۆ ئەم مەعریفەیە، هەر كەس سیفەتێكی موشاهەدە كرد دەبێت وابەستەكان(المتعلقات)ی ئەو سیفەتە موشاهەدە بكات، سەرنجدان لە وابەستەكانی ئەو سیفەتە سەردەكێشێت بۆ بە مەزن دانانی ئەو كەسەی خاوەنی سیفەتەكەیە.

هەر كەس بۆ نموونە سیفەتی كەلام ببینێت: مەزنی خودای موتەعال لە دڵیدا دروست دەكات، چونكە گەر دەریا و بەدوایدا حەوت دەریای تر ببن بە مەرەكەب و هەرچی دار و درەختە ببن بە قەڵەم بۆ ئەوەی كەلامی خودا بنووسنەوە ئەوا دەریاكان تەواو دەبن و درەختەكان كۆتاییان پێدێت و كەلامی پەروەردگار نە كۆتایی پێدێت و نە تەواو دەبێت.

هەر كەس سیفەتەكانی تر وەك ئەم سیفەتە ببینێت لە زانست و قودرەت و ئەوانی تر و دڵی بكەوێتە ناو مەزنیی ئەو سیفەتانەوە: ئەوا ناسینی خودا و بەمەزن ڕاگرتنی بۆ زیاد دەبێت و نوور و ڕۆشنایی لە دڵ و ڕۆحدا پەرەدەسێنێت.

هەتا مەعریفەی بە سیفەتەكانی خودای موتەعال زۆرتر بێت و زیاتر بۆ خودا جێگیریان بكات و بەرهەڵستكارانی جێگیركردنی ناو و سیفەتەكان نەرێ بكات، ئەوا موشاهەدەی زۆرتر دەبێت، بۆیە كامڵترین خەڵقی خودا لە موشاهەدەی ناو و سیفەتەكاندا ئەو كەسەیە كە بە خودا دەفەرموێت(ﷺ) ((من ناتوانم مەدح و سەنای تۆ هەژماربكەم، تۆ بەو جۆرەی كە خۆت وەسفی خۆتت كردووە))

بەهۆی كەماڵی مەعریفەیەوە بە ناو و سیفەتەكان: ئاماژەی كرد بەوەی ناسیبووی(زانیبووی) لەو ناو و سیفەتانە، چونكە ئەو كارە لەسەرو ئەوەوەیە بتوانێت هەژماری بكات.

بینینی سیفاتی خودای موتەعال: موشاهەدەی پێغەمبەران و میراتگرانیان بووە، هەر کەس بەو ناو و سیفەتانە عاریفتر بوو بێت بە خودا زاناتر بووە، مەشهەدەکەی بەپێی ئەوە بووە کە ناسیویەتی، تەوبەکاری صادق لە تەوبەکەیدا گەر تەوبەی کرد بۆ لای خودا ئەوا خودا دەبینێت کە "الغفور و الرحیم"ە، ئەو کەسەی تەوەکول بە خودا دەبەستێت خودا دەبینێتەوە وەك"الحسیب و الكافي"، ئەوەی داوا لە خودا دەکات و بانگی لێ دەکات خودا دەبینێتەوە وەك "القریب و المجیب"، ئەو کەسەی لە خۆشەویستییەکەیدا بۆ خودا راست دەکات خودا وەك "الودود و الحبیب" دەبینێتەوە، کەسی هانابەر و بەگیرهاتوو گەر راست بکات لە هانا بردنیدا خودا دەبینێتەوە وەك"الكاشف و المخلص للكرب"–لابەر و رزگارکەر لە ناخۆشی و تەنگەلانییەکان، کەسی ناچار گەر لە ناچارییەکەیدا راست بکات وەك "الرحیم و المغیث" خودا دەبینێتەوە، ئەو کەسەی لەناو ترسدایە گەر لە پەنابردنەکەی بۆ لای خودا راست بکات خودای موتەعال وەك"المؤمن"–رەوێنەری ترس و بیم دەبینێتەوە، رجاکەر گەر لە رجاکەیدا راست بکات: ئەوا بەپێی گومانی باشی بە خودا لەگەڵی دەجوڵێتەوە.

ئەوانەی خودایان خۆشدەوێت و داوای خودا دەکەن و موریدی ئەون وجگە لە ئەو کەسێکی تریان ناوێت و بە کەسێکی تر رازی نابن گەر لە خۆشەویستی و ویستیاندا صادق بوون، ئەوا خودا دەبینێتەوە وەك بوونێکی تایبەتتر لەو بوونانە، گەر موریدی داواکاری شت لە خودا بەشی بدرێت ئەی دەبێت بەشی ئەو کەسە چۆن بێت کە موریدی خودایە و تەنها خودای دەوێت نەك داوای شت لە خودا؟ ئەو جۆرە موریدە زەفەر بە خۆی و بە پەروەردگاریشی دەبات.

((زەفەربردن بە نەفسی خۆ)): ئەوەیە کە نەفس بۆی ملکەچ و گوێڕایەڵ دەبێت، شوێنی رەزامەندی خودا دەکەوێت و ملپێچی ناکات و فەرمان دەرناکات بە خراپە، بەڵکو دەبێت بە خزمەتکار و کۆیلە، دوای ئەوەی خزمەتی دەکرا و سەردار بوو.

((زەفەربردن بە پەروەردگار)) بریتییە لە نزیکی لە خودا و هۆگربوون پێیەوە و ئاوەدان کردنەوەی پەنهانی خۆ بە خودا، فەرەح و سروور بە خودا بە مەزنترین فەرەح و سروور.

کەسی یەکتاپەرست–بە باوەڕ و یەقینەکەی– زاتێکی کۆکەرەوەی ناوە جوانەکان و سیفاتە بەرزەکان دەبینێت کە هەموو سیفەتێکی کەماڵ و هەموو ناوێکی جوان و

باشی هەیە، ئەوەش کێشی دەکات بۆ کۆبوونەوەی هەناسەی ویست و لێبڕانی لەسەر خودا و هەستان بە فەرزەکان.

ڕێگەکە –لە کۆیدا– لەم دوو هۆیە دەرناچێت با دەربڕینەکان دووروودرێژ بن و ئاماژەکانیش وردبن، هەموو کارەکە لەسەر کۆبوونەوەی هیممەت لەسەر خودا و ئەوپەڕی کۆشش بە مەبەستی نزیکبوونەوەی تەواو لە خودا بە سوننەتەکان(النوافل)، هەڵبەت لەدوای تەواوکردنی فەرزەکان...گەر خۆت درێژەی پێ نەدەی خودا لەسەرت درێژی ناکاتەوە.

۞ ۞ ۞

## (٦٠) (منزلة المعاينة)

# مەنزیلەی بینین

لە مەنزیلەكانی ((إیاك نعبد وإیاك نستعین)) مەنزیلەی بینینە.

بینین دوو جۆرە: بینینی چاو (بصر) لەگەڵ رۆشنبینی (بصیرة)، بینینی "بصر": بینینی خودی بینراوەكە یان نموونەی دەرەكی بینراوەكە(وقوعه علی نفس المرئي أو مثاله الخارجي)، وەك بینینی وێنەی شتەكە لە ئاوێنەدا یان لە ئاودا، بینینی"بصیرة": هێزی عاقڵ بكەوێت بەسەر نموونەی زانستی پڕاوپڕ بە دەرەوە(وقوع القوة العاقلة علی المثال العلمي المطابق للخارجي)، ئەو كاتە پەیبردنەكەی(واتە بینینی بەصیرەت) وەك پەیبردنی كەسانی ترە بە وێنەی دەرەكی، هەندێ جار هێز و دەسەڵاتی ئەم پەیبردنە ناوەكییە بەهێز دەبێت بەجۆرێك حوكم بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە، ئامادەكردنی هێزی عاقڵ بۆ پەیپێبراوەكان بەهێز دەبێت بەجۆرێك تیایدا نوقم دەبێت، لەو بارەدا حوكمی دڵ بەسەر حوكمی هەست و بینینی دەرەوەدا زاڵ دەبێت، بۆیە دەست بەسەر بیستن و بینیدا دەگرێت بەجۆرێك دەبینێ و لە دەرەوە گوتار دەبیستێ لەگەڵ ئەوەشدا ئەو لە ناو نەفس و زەینی خۆیدایە، بەڵام زاڵبوونی موشاهەدە و هێزی ئامادەبوونی دڵ و توانای دڵ بۆ دەستگرتن بەسەر هێزەكاندا وەك ئەوەی لێهاتووە بە چاو ببینرێت و بە گوێ ببیسترێت، تا ئەو رادەیەی كەسی پەیبەر شك و گومانی نامێنێت و لەوەدا دڵكرمێن نابێت و جێگەی رەخنە و لۆمە نامێنێتەوە.

حەقیقەتی ئەم كارە(واتە بینینی دڵ): هەموو ئەوانە شایەت و نموونەگەلێكی زانستین كە شوێنی باوەڕ دەكەون، ئەوەی بە چاوی دڵ و رۆح دەبینرێت شاهید و ئاماژەكەرە بۆ حەقیقەتێك نەك خودی حەقیقەت بێت، بینینی نووری جەلالی زاتی خودای موتەعال لە دڵی كەسەكەدا ئەو نوورەی زاتی خودای موتەعال نییە كە ئاسمانەكان و زەوی ناتوانن ببینن، گەر ئەو نوورە بۆیان دەربكەوێت وردوخاش دەبن و ئەوەی تووشی چیاكەی موسا(عليه السلام) بوو تووشی ئەوانیش دەبێت، هەر بەو جۆرە بینینی نووری مەزنیی و شكۆمەندی خودای موتەعال ناتوانین بڵێین زاتی خودای موتەعالە.

لای ئەهلی رێگە تەنها بینین و نموونەی زانستی بوونیان هەیە، هەروەها بوونی وتە ناسکەکان کە بەری نزیکیی دڵ و هۆگربوون و خۆشەویستی و یادن لە خوداوە، هەر بەو جۆرە زاڵبوونی دەسەڵاتی مەعریفەکەی بەسەریدا، پەروەردگار-تبارك وتعالى- لە پشتی هەموو ئەمانەوەیە، ئەو-سبحانه- پاك و بێگەرد و پیرۆزە لەوەی مرۆڤ بتوانێت بیبینێت، یان نووری زاتی ئەو-سبحانه- ببینێت، یان سیفاتی یان نووری سیفاتی، ئەوە تەنها موشاهەدەیە لە دڵی کەسەکەدا وەك موشاهەدەیەك کە لە وێنەی بەهەشت و دۆزەخ بەدڵیدا تێدەپەڕێت، بەڵام بینینی خودا بە چاو، یان بینینی خودا و نووری خودا-هەردوو پێکەوە- هەرگیز لەم خانەی دونیایەدا بەدینایەت.

ئەوە ئەو نوورە بوو کە عەبدوڵای کوڕی حەرامی ئەنصاری رۆژی ئوحد بینی، کاتێك فەرمووی ((هاوار بۆ بۆن و نەسیمی بەهەشت، سوێند بە خودا من لە ئوحد دەیبینمەوە))، هەروەها فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) ((گەر بەپاڵ باخچەکانی بەهەشتدا گوزەرتان کرد سەرێك بکێشنە ناوی، فەرموویان: باخچەکانی بەهەشت چین؟ فەرمووی حەلقەلّی یادی خودا)) هەر بەو جۆرە فەرموودەکەی پێغەمبەر((بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێردایە))

بۆیە کردار: لەسەر شاهیدەکانە، کردارەکە بەپێی شاهیدی کەسەکە دەبێت.

ئێمە بە پشتیوانی خودا ئاماژە بەو شاهیدانە دەکەین بە ئاماژەیەك کە راستێتی ئەمرەکەی پێ بزانرێت.

یەکەم شاهیدی رێبواری رێگەی خودا و رۆژی دوایی: ئەوەیە کە شاهیدێکی لەسەر کەمی و بێنرخی دونیا و نەبوونی وەفا و زۆری جەفا و نەفس نزمی شەریکەکانی دونیا و خێرا تیاچوونی بۆ کەسەکە راستببێتەوە، کەلاکی ئەهلی دونیا و عاشقەکانی بە دەوری دونیادا ببینێتەوە، ببینێت چۆن بە چەندین سزا سزای داون، و تاڵترین تاڵاوی پێچەشتوون، کەمێك هێنانیە پێکەنین و زۆرێك گریاندنی، کاسی ژەهری خۆی دوای کاسی شەراب دەرخوارددان، بۆیە بە خۆشەویستی دونیا سەرخۆش بوون و بە کۆچکردنی مردن.

گەر ئەم شاهیدە بۆ کەسەکە راستبوویەوە: دڵی لە دونیا کۆچ دەکات و ئەکەوێتە داوای خانەی دواڕۆژ، ئەو کات شاهیدێك لە دواڕۆژ و بەردەوامبوونی لە دڵدا راست

دەبێتەوە، تێدەگات ژیانی دوارۆژ ژیانی كامڵ و تێروتەواوە، خەڵكەكەی لەوێ كۆچ ناكەن و بارگە و بنەیان ناپێچنەوە، چونكە ئەو خانەیە خانەی مانەوەیی هەتاهەتاییە، و سەفەر لەو جێگە كۆتایی پێدێت، و كۆتایی گەشت و كاروانی مرۆڤە، دونیا بەراورد بە دوارۆژ وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت – ((دونیا بەراورد بە دوارۆژ وەك ئەوە وایە یەكێك لە ئێوە پەنجەیەكی بخاتە ناو دەریایەك، با تەماشا بكات چەندە ئاوی لەگەڵ دەگەڕێتەوە)) هەندێ لە پێشین دەفەرموون: دونیا بەراورد بە دوارۆژ وەك گەردیلەیەك وایە بەرانبەر چیاكانی دونیا.

پاشان لە دڵیدا شاهیدێك لە ئاگر راستدەبێتەوە، كڵپە و گڕ و بڵێسەی، قووڵی بنكەكەی و گەرمای زۆری و توندی سزای، پیشانیان دەدات چۆن بە روخساری رەش و چاوی شینی دەرتۆقیو و كۆتوزنجیر لە دەست و پێ و گەردندا بۆ ناو ئاگر دەدرێنە بەر، كە دەگەنە ناو دۆزەخ دەرگاكانی دۆزەخ بە رووياندا دەكرێنەوە، ئەو دیمەنە ترسناكە ببینن كە دڵیان بە پەشیمانی و حەسرەتەوە پارچە پارچە بووە﴿ وَرَءَا ٱلْمُجْرِمُونَ ٱلنَّارَ فَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمْ يَجِدُواْ عَنْهَا مَصْرِفًا ﴿٥٣﴾ ﴾ الكهف: ٥٣.

پاشان بانگێك لەلای پەروەردگارەوە دەكرێت﴿ هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٤﴾ أَفَسِحْرٌ هَٰذَآ أَمْ أَنتُمْ لَا تُبْصِرُونَ ﴿١٥﴾ ٱصْلَوْهَا فَٱصْبِرُوٓاْ أَوْ لَا تَصْبِرُواْ سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ الطور: ١٤ – ١٦، دۆزەخیان نیشان دەدرێت و پاڵیان پێوە دەنرێت بۆ ناو ئاگر، لە گەرماوی دۆزەخدا بەڕوودا رادەكێشرێن، و لە گڕەكەیدا وەك چڵوچێو دەسوتێنرێن﴿ لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ ﴾الأعراف: ٤١، خراپترین پەتو و خراپترین ژێرەخەر، گەر لە تینوێتیدا هانا ببات﴿ يُغَاثُواْ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ ﴾الكهف: ٢٩، پەنا بۆ ئاوێك دەبات كە هەڵمەكەی دەموچاو دەسوتێنێت، ئەی دەبێ خواردنەوەكەی چۆن بێت؟! كە لێی دەخۆنەوە ریخۆڵەیان و هەناویان پارچە پارچە دەبێت، هەرچی لەناو سكیاندایە دەیتوێنێتەوە، خواردنەوەیان ئاوی كوڵاوە، خواردنیان بریتییە لە بەری داری زەقوم﴿ لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُواْ وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى كُلَّ كَفُورٍ ﴿٣٦﴾ وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ ۚ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ ۖ فَذُوقُواْ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٣٧﴾ ﴾ فاطر: ٣٦ – ٣٧.

گەر ئەم شاهیدە لە دڵی بەندەدا راستبوویەوە: خۆی لە گوناه و یاخیبوون دادەڕنێت، و لە شوێنکەوتنی شەهەوات دووردەکەوێتەوە، و پۆشاکی ترس و ئاگاهی لەبەر دەکات، زەمینەی دڵی بە بارانی چاوی تەڕدەبێتەوە، هەرچی بەڵا و ناخۆشییە لای سووك و ئاسان دەبێت گەر بەڵای دین و دڵی نەبێت.

بەپێی هێزی ئەو شاهیدەی ناو دڵی لە یاخیبوون و سەرپێچیەکان دووردەکەوێتەوە، ئەم شاهیدە خاشاك و موادی تیاچوون لە دڵدا ناهێڵێت، وردوخاشیان دەکات و لەدڵ دەریان دەکات، دڵ چێژی عافییەت و سروو دەچێژێت.

پاش ئەو شاهیدە لە ئاگر شاهیدێك لە بەهەشت لە دڵیدا راستدەبێتەوە، ئەوەی خودا ئامادەی کردووە لە بەهەشتدا بۆ بەندەکانی، نە چاو بینیویەتی، و نە گوێ بیستوویەتی، و نە بەدڵی مرۆڤدا گوزەری کردووە، سەرای ئەوەی لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) لە وردەکارییەکانی نیعمەت باسکراوە، بەرزترین تام و چێژ لە خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و دیمەن و گەشانەوە و سروور، شاهیدی ئەو خانەیە لە دڵیدا راستدەبێتەوە کە خودای موتەعال کردوویەتی بە خانەی هەتاهەتایی نیعمەت و خۆشییەکان، خاکەکەی میسکە، چەوەکەی دوڕە، بیناکانی خشتی زێڕ و زیون، قامیشی مروارییە، خواردنەوەکانی شیرینتر لە هەنگوین، بۆنەکەی لە میسك بۆنخۆشتر، و لە کافور سپیتر و ساردتر، بەتامتر لە زەنجەبیل، ئافرەتەکانی حۆرلعەین، گەر یەکێك لەوان روو لەسەر زەوی بکات نووری روخساری نووری خۆر دەکوژێنێتەوە، پۆشاکەکانیان لە حەریری سندوس و ئیستەبرەقن، خزمەتکارەکان منداڵگەلێکن وەك مرواری تازە لە قاوغ دەرهاتوو، میوەکانیان هەمیشەیین، نە کۆتاییان پێدێت نە لێیان قەدەغە دەکرێ، فەرش و راخەری بەرز و بڵند، خۆراکیان گۆشتی ئەو باڵندانەیە حەزیان لێدەکەن، شەراب بەسەر خۆراکدا نە سەرئێشەی تێدایە و نە بێئاگایان دەکات، میوە لەوەی هەڵیدەبژێرن، هاوسەرەکانیان حورلعەین وەك مرواری پاکی شاراوە، لەسەر قەرەوێڵە پاڵیان داوەتەوە، لەناو ئەو باخچانەدا خۆشحاڵ دەبن و دەگەشێنەوە، ئەوەی نەفس حەزی لێبکات و چاو چێژی لێببینێت تیایدایە، بە هەتاهەتایی تیایدا دەمێننەوە.

گەر ئەم شاهیدە خرایە پاڵ شاهیدەكانی پێشوو: دڵ بەرەو پەروەردگاری دەكەوێتە ڕێ خێراتر لە ڕۆیشتنی با لە شوێنی هەڵكردنییەوە، لەسەر ڕێگە بەلای ڕاست و چەپدا لانادات.

ئەمە و لەسەر و ئەوەوە: شاهیدێكی تر هەیە هەموو ئەو شاهیدانەی تیا دەپوكێتەوە، و بەندە بەهۆیەوە لە شاهیدەكانی تر بزر دەبێت، ئەوەش بریتییە لە شاهیدی جەلالی پەروەردگار و جەمال و كەماڵ و عیززەت و سوڵتانی، ڕاگریی و بڵندیی و مەزنیی لەسەر عەرش و قسەكردنی لەگەڵ فریشتەكان و پێغەمبەرانی.

گەر شاهیدەكە نیشانی دڵی دا كە ئەو-سبحانه- "قیوم و قاهر"ە لەسەر بەندەكانی، و لەسەر عەرشەكەی ئیستیوای كردووە، تاك و تەنهایە لە هەڵسووڕاندنی مەملەكەتەكەیدا، و ئەمردەركەر و نەهیكەر، پێغەمبەرانی ڕەوانە كردووە، و كتێبەكانی دابەزاندووە، و ڕازی دەبێت و تووڕە دەبێت و پاداشت و سزای لەلایە، و دەبەخشێت و لێدەگرێتەوە، عیززەت بە كەسێك دەدات و كەسێك زەلیل دەكات، خەشم دەگرێ، و بەزەیی دەبەخشێ گەر داوای بەزەیی لێ بكرێت، لێدەبورێ گەر داوای لێبووردنی لێبكرێت، دەبەخشێت گەر داوای لێبكرێت، وەڵامدەداتەوە گەر بانگ و داوای لێ بكرێت، داڵدە دەدات گەر داوای داڵدەی لێ بكرێت، لە هەرچی بوونە گەورەترە، لە هەرچی شتە مەزنترە، لە هەرچی خاوەن عیززەتە بە عیززەتترە، لە هەرچی خاوەن قودرەتە بە قودرەتترە، لە هەرچی خاوەن زانستە زاناترە، گوێی لە هەرچی دەنگەوەیە بە زمانی جۆراوجۆر و پێویستی جۆراوجۆر، بیستنێك لە بیستنێكی تر خەریكی ناكات، داواكارییەكان هەڵەی پێ ناكەن، لە پێداگری خاوەن داواكان بێزار نابێت، لای خودا یەكسانە كەسێك قسەكەی بە نهێنی بكات یان ئاشكرای بكات، نهێنی لای ئەو ئاشكرایە، پەنهان لای ئەو شەهادەیە، گوێی لە تەپەی پێی مێرووولەیەكی ڕەشە لە شەوێكی تاریكدا لەسەر تاشە بەردێك و دەشی بینێت، ڕەگەكانی ئەو مێرووولەیە دەبینێت، جاریبوونی خۆراك بە جەستەیدا دەبینێت.

گەر ئەم شاهیدە لە دڵی كەسەكەدا ڕاستبوویەوە: شاهیدەكانی پێش خۆی دەپوكێنێتەوە، بەبێ ئەوەی شاهیدەكانی تر كۆتاییان پێبێت و نەمێنن، بەڵكو ئەم شاهیدە زاڵتر دەبێت بەسەر ئەوانی تردا، شاهیدەكانی تر دەكەونە خوار ئەمەوە، هەر

کەس ئەم شاهیدە ببێت بە شاهیدی: ڕۆیشتن و سلوکێکی تایبەتی بۆ دروست دەبێت کە کەسانی تری بێئاگا لەم شاهیدە یان خاوەن مەعریفەیەکی کورت بۆیان دروست نابێت.

خاوەنی ئەم شاهیدە: لە ئاگاهی و لە خەودا بەرەو لای خودا دەچێت، هەر بەو جۆرە لە جوڵە و دانیشتن و ڕۆژوو و تەواوی کاروکردەوەکانی تردا، ئەو شانوشکۆیەکی هەیە و خەڵکیش شتێکی تر، ئەو لە دۆڵێکە و خەڵکی لە دۆڵێکی تر.

مەبەستەکە: بینین و کەشف و موشاهەدە لەم خانەی دونیایەدا: بەسەر شەواهید و نموونەی زانستیدا دەکەون، ئەوەش بریتییە لە باڵاترین نموونە(المثل الأعلى) کە لە سێ شوێنی کتێبەکەیدا باسی کردووە، لە سورەتی"النحل، الروم، الشورى"دا

لە سورەتی"النحل"دا﴿ وَلِلَّهِ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٦٠﴾ ﴾ النحل: ٦٠

لە سورەتی"الروم"دا﴿ وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ ﴾ الروم: ٢٧

لە سورەتی "الشورى"دا﴿ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴿١١﴾ ﴾ الشورى: ١١

ئەو نموونە باڵا ئەوەیە کە لە دڵی عابیدەکانی و خۆشەویستانی ڕاستبووەتەوە، ئەوانەی بەردەوام بۆ لای خودا دەگەڕێنەوە بە هۆی ڕاستبوونەوەی ئەو شاهیدەوە، ئەو شاهیدەیە هانیان دەدات بۆ عیبادەت و خۆشەویستی و ترس و گەڕانەوە، جیاوازیان لەم شاهیدەدا هەردوو جەمسەرەکەی دیار نییە، هەر یەك لەوانە مەقامێکی دیاریکراوی هەیە و لێی تێناپەڕێت، ئەو کەسەی زۆرترین بەشی لەم شاهیدە بەرکەوتووە دان بەوەدا دەنێت کە "ناتوانێت مەدح و سەنای پەروەردگار بە ئەندازەی پێویست بکات"، ئەو-سبحانە- لەسەرو سەنای سەناکەران و ستایشی ستایشکەرانەوەیە، وەك وتراوە:

| | |
|---|---|
| وما بلغ المهدون نحوك مدحة | وإن أطنبوا، إن الذي فيك أعظم |
| لك الحمد كل الحمد لا مبدا | له ولا منتهى والله بالحمد أعلم |

پاکێتی دڵ و خاوێنبوونەوەی لە سیفەتە ناپەسەندەکان و ویستە نزمەکان، و خاڵیبوونەوە و بەتاڵبوونەوەی لە وابەستەبوون بە غەیری خوداوە-سبحانە-: بریتییە لە کورسی ئەم شاهیدە کە لەسەری دادەنیشێت و تیایدا جێگیر دەبێت، حەرامکراوە

لەسەر دڵێکی پیس و پڕ بوو بە ئەخلاقی خراپ و سیفاتی ناپەسەند و لکاو بە شتە نزمەکانەوە ئەم شاهیدەی تیادا راست ببێتەوە، و ببن بە ئەهلی ئەم شاهیدە.

نزه فؤدك عن سوانا، وأتنا فجنابنا حل لكل منزه

والصبر طلسم لكنز لقائنا من حل ذا الطلسم فاز بكنزه

کاتێك خۆری یەکتاپەرستی هەڵهات و رۆحی رۆشن کردوەوە و نووری بە بینین بەخشی ئەو کاتە تاریکی نەفس و سروشتی مرۆڤ دەرەوێتەوە، رۆح دەکەوێتە جووڵە بۆ داوای ئەو کەسەی ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ بۆیە دڵ سەفەر دەکات بۆ سەرەتاکانی ئەمر، و لە مەنزڵگای بەندایەتیدا دادەبەزێت، مەنزڵ بە مەنزڵ سەردەکەوێت، ئەو لە عادەتەوە(نەرێت و خووخدە) دەگوێزێتەوە بۆ عیبادەت، لەسەر یەك تاکە مەعبود رادەوەستێت، بەردەوام شایەتەکانی سیفات لە دڵیدا راوەستاون، بیری دەخاتەوە کاتێك بێئاگا دەبێت، رێنومایی دەکات کاتێك سەفەر دەکات، بەرزی دەکاتەوە کاتێك لێی دانیشت، گەر شاهیدی پەروەردگاریی و راگریی(الربوبية والقيومية) لە دڵیدا راستبوویەوە دەبینێت هەرچی ئەمرە بۆ خودایە و لەلای خودایە، هیچ کەس لەگەڵ خودا هیچی بەدەست نییە ﴿مَا يَفْتَحِ اللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُ مِن بَعْدِهِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ (٢) يَا أَيُّهَا النَّاسُ اذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ هَلْ مِنْ خَالِقٍ غَيْرُ اللَّهِ يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ (٣)﴾ فاطر: ٢ - ٣ ﴿وَإِن يَمْسَسْكَ اللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُ إِلَّا هُوَ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَادَّ لِفَضْلِهِ يُصِيبُ بِهِ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ (١٠٧)﴾ یونس: ١٠٧ ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ قُلْ أَفَرَأَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ إِنْ أَرَادَنِيَ اللَّهُ بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَاشِفَاتُ ضُرِّهِ أَوْ أَرَادَنِي بِرَحْمَةٍ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَاتُ رَحْمَتِهِ قُلْ حَسْبِيَ اللَّهُ عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ الْمُتَوَكِّلُونَ (٣٨)﴾ الزمر: ٣٨ ﴿قُل لِّمَنِ الْأَرْضُ وَمَن فِيهَا إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ (٨٤) سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ (٨٥) قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ (٨٦) سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ (٨٧) قُلْ مَن بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ (٨٨) سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ (٨٩)﴾ المؤمنون: ٨٤ - ٨٩

گەر شاهیدێك لە خواوەندی خودا(**الإلهية**) لە دڵیدا راستبوویەوە ئەوا بەوشاهدە ئەمر ونەهی و پێغەمبەرایەتی و کتێبەکان و شەریعەت و خۆشەویستی و رازیبوون و کەراهەت و بوغز و پاداشت و سزا دەبینێت، ئەمری خودایی دەبینێت کە لە عەرشەوە

نازڵ دەبێت و خودا لەسەر عەرشەكەی ئیستیوای كردووە، كاروكردەوەی بەندەكان بۆ لای بەرزدەبنەوە و دەخرێنە بەردەمی، كردەوە چاكەكان لەم دونیایەدا پاداشت دەداتەوە و لە دوارۆژیشدا گەشانەوە و سروور و خۆشی، ئەو كردەوانەش كە لەسەر ئەمر و شەرعی ئەو نین خودا دەیكات بە تۆزی بەربا.

گەر لە دڵیدا شاهیدێكی رەحمەت راستبوویەوە هەموو بوون دەبینێت كە بەو سیفەتە راوەستاوە، ئەو كەسەی سیفەتی رەحمەت و زانستی ئابلۆقەی هەموو بوونی داوە زۆر مەزن و فراوانە، رەحمەتی خودا دەگاتە ئەو شوێنەی كە زانستی پێگەیشتووە، بە رەحمەتی خۆی لەسەر عەرشەكەی ئیستیوای كردووە، بۆ ئەوەی رەحمەتەكەی هەموو شتێك لەئامێز بگرێت، وەك چۆن عەرشی خودا هەموو شتێكی لەئامێز گرتووە.

گەر لە دڵیدا شاهیدی عیززەت و كبریاء و مەزنی و شكۆداری راستبوویەوە لەو بارەدا بەندە شانوشكۆیەكی تری دەبێت.

هەر بەو جۆرە تەواوی شاهیدی سیفەتەكان، ئەوەی باسمان كرد كەمترین ئاگاداركردنەوەیە، بۆیە كەشف و بینین و موشاهەدە هەرگیز لە شاهیدەكان تێناپەڕن.

❁ ❁ ❁

## (٦١) (منزلة الحياة)

## مەنزيلەی زيندەگی

لە مەنزيلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزيلەی زيندەگييە.

خاوەنی(منازل السائرين) دەفەرموێت:

((دەروازەی زيندەگی: خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ﴾ الأنعام: ١٢٢))

بەڵگە هێنانەوەی شێخی هەروی بەم ئايەتە -لەم دەروازەيەدا- زۆر رۆشنە، مەبەست بە ئايەتەكە: هەر كەس دڵمردوو بێت بەهۆی نەبوونی رۆحی زانست و هيدايەت و باوەڕەوە، ئەوا پەروەردگار ئەو كەسە بە رۆحێكی تر دەژيەنێت، ئەو رۆحە نييە كە زيندەگی بە جەستەی بەخشيوە، بەڵكو رۆحی ناسينی خودا و يەكتاپەرستی و خۆشەويستی و عيبادەت كردنيەتی بە تاكوتەنهايی، چونكە زيندەگی رۆح تەنها بەوانەوەيە، گەر وانەبێت ئەو كەسە لە ريزی مردووانە، بۆ ئەو مەبەستە خودای موتەعال وەسفی ئەو كەسانە بە مردوو دەكات و دەفەرموێت ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ﴾ الأنعام: ١٢٢، هەروەها دەفەرموێت ﴿إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ الصُّمَّ الدُّعَاءَ ﴿٨٠﴾﴾ النمل: ٨٠، وەحيەكەی بە رۆح ناوبرد بەهۆی ئەو زيندەگييەكەی بە دڵ و رۆحی دەبەخشێت، بۆيە دەفەرموێت ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَٰكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَن نَّشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا﴾ الشورى: ٥٢، رايگەياند كە ئەو وەحييە ((رۆح))ێكە ژيان و زيندەگی پێوەيە، و ((نوور))ێكە رۆشنايی دەبەخشێت، هەروەها دەفەرموێت ﴿يُنَزِّلُ الْمَلَائِكَةَ بِالرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ أَنْ أَنذِرُوا أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاتَّقُونِ ﴿٢﴾﴾ النحل: ٢، هەروەها دەفەرموێت ﴿رَفِيعُ الدَّرَجَاتِ ذُو الْعَرْشِ يُلْقِي الرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ لِيُنذِرَ يَوْمَ التَّلَاقِ ﴿١٥﴾﴾ غافر: ١٥، وەحی زيندەگی رۆحە وەك چۆن رۆح زيندەگی بەدەنە، بۆيە هەر كەس ئەو رۆحە بزربكات ئەوا ژيانی بەسوودی لە دونيا و دوارۆژدا بزركردووە، لە دونيادا: ژيانی وەك ژيانی

ئازەلانی لێ دێت، و زیندەگییەكی پڕ لە تەنگەلانی بەسەر دەبات، لە دوارۆژیشدا: دۆزەخی بۆ ئامادەكراوە، كە تیایدا نەدەمرێت و نە دەژی.

خودای موتەعال ژیانی پاك و خۆشی بۆ ئەهلی مەعریفە و خۆشەویستی و عیبادەتی خۆی داناوە، دەفەرموێت ﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾ ﴾ النحل: ٩٧، "الحياة الطيبة"تەفسیركراوە بە قەناعەت و رازیبوون و رۆزی پاك و چاك و شتانی تریش.

راستییەكەی: "الحياة الطيبة"بریتییە لە ژیان و زیندەگی دڵ و خۆشی و نیعمەتەكانی و سروور و گەشانەوە بە ئیمان و مەعریفەی خودا و خۆشەویستی و گەڕانەوەی بەردەوام بۆ لای خودا و تەوەكول لەسەری، هیچ ژیانێك بە ئەندازەی خاوەنی ئەو سیفەتانە خۆشتر و كاملتر نییە، نیعمەتێك نییە بكەوێتە سەر ئەو نیعمەتەوە، مەگەر نیعمەتی بەهەشت، وەك هەندێ لە عاریفان دەڵێن: هەندێك كات بەسەرمدا گوزەر دەكات، تیایدا دەڵێم: گەر ئەهلی بەهەشت لەم جۆرە ژیانەدا بن بەراستی ئەوانە لە ژیانێكی خۆشدان، كەسانی تر دەڵێن: هەندێ كات بەسەر دڵدا گوزەر دەكات تیایدا دڵ ئاهەنگ دەگێڕێت.

گەر ژیانی دڵ ژیانێكی خۆش بێت ژیانی ئەندامەكان بەدوایدا دێن، چونكە موڵكی دڵن، بۆیە خودای موتەعال ژیانی تەنگەلانی(معيشة الضنك) بۆ ئەوانە بڕیوەتەوە كە پشت لە یادی خودا دەكەن، ئەوەش پێچەوانەی ژیانی خۆش و پاك و بەتامە(الحياة الطيبة).

ژیانی خۆش لە هەر سێ سوڕەكەدایە: خانەی دونیا، خانەی بەرزەخ، و خانەی هەتاهەتایی و دوارۆژ، هەر بەو جۆرە ژیانی تەنگەلانیش لە هەرسێ سوڕەكەدا بوونی هەیە، چاكان(أبرار) لێرە و لەوێش لە نیعمەتدا دەژین، خراپانیش(الفجار) لێرە و لەوێ لە دۆزەخدا دەژین، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ ۚ وَلَدَارُ ٱلْءَاخِرَةِ خَيْرٌ ۚ﴾النحل: ٣٠، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَأَنِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَيُؤْتِ كُلَّ ذِى فَضْلٍ فَضْلَهُۥ ﴾هود: ٣، یادی خودا(ﷻ) و خۆشویستن و گوێڕایەڵی كردنی و روو تێكردنی دەستەبەری خۆشترین ژیان دەكەن لە دونیا و دوارۆژدا، پشت تێكردنی و بێئاگایی و یاخیبوون لێی: بەسە بۆ ژیانێكی تاڵ و تەنگەلان لە دونیا و دوارۆژدا.

## ✿ پاراوبوونی زانایان

ژیان ئاستی هەیە:

لەوانە: ژیانی زانست لە مردنی نەزانی، نەزانی مردنی خاوەنەكانیانە، وەك وتراوە:

| | |
|---|---|
| وفي الجهل–قبل الموت– موت لأهله | وأجسامهم قبل القبور قبور |
| وأرواحهم في وحشة من جسومهم | فليس لهم حتى النشور نشور |

كەسی نەزان دڵ و ڕۆحی مردووە، با جەستەی زیندوو بێت، جەستەی گۆڕێكە بۆ ڕۆح و دڵی و بەسەر زەویدا دەڕوات، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا﴾الأنعام: ١٢٢، هەروەها دەفەرموێت ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْءَانٌ مُّبِينٌ ۝٦٩ لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيًّا وَيَحِقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ۝٧٠﴾ یس: ٦٩ – ٧٠، هەروەها دەفەرموێت ﴿فَإِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ﴾ الروم: ٥٢، هەروەها دەفەرموێت ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَآءُ وَمَآ أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِى ٱلْقُبُورِ ۝٢٢﴾ فاطر: ٢٢، لە مردنی دڵیاندا تەشبیهی كردن بە ئەهلی گۆڕستان، ئەوانە ڕۆحیان مردووە، جەستەكانیان بووە بە گۆڕی ڕۆحەكانیان، وەك چۆن ئەهلی گۆڕستان نابیستن هەر بەو جۆرە ئەوانەش نابیستن، گەر ژیان بریتی بێت لە هەست و جووڵە و دیاردەكانی تری زیندەگی، ئەوا ئەو دڵانە لەبەر ئەوەی هەست بە زانست و ئیمان ناكەن و بەرەورووی ناجوڵێن: كەوابوو ئەوانەش لە حەقیقەتدا مردوون، ئەمە تەشبیه نییە لە مردنیان بە مردنی جەستە، بەڵكو مردنی دڵ و ڕۆحە.

ئەحمەد لە "كتاب الزهد"دا هەندێ لە قسەی "لقمان" دەگوێزێتەوە كە بە كوڕەكەی فەرمووە ((كوڕەكەم لەگەڵ زانایاندا دابنیشە و بە ئەژنۆ تەنگەتاویان بكە، خودا بە نووری حیكمەت دڵان زیندوو دەكاتەوە، وەك چۆن زەوی بە لێزمەی باران زیندوو دەكاتەوە))، مەعازی كوڕی جەبەل–خوا لێی ڕازی بێت– دەفەرموێت ((فێری زانست بن، فێربوونی بۆ خودا ترسانە لە خودا، و داواكردنی عیبادەتە، و پیاداچوونەوەی تەسبیحە و لێكۆڵینەوەی جیهادە و فێركردنی بەوانەی نایزانن صەدەقەیە، و پێدانی بە ئەهلی خۆی نزیكبوونەوەیە لە خودا، چونكە مەشخەڵی حەڵاڵ و حەرامە، و تەپۆڵكەی نووریی ڕێگەی ئەهلی بەهەشتە، زانست لە وەحشەتدا كەسێكی هۆگرە و لە غوربەتدا هاوەڵە و لە تەنهاییدا قسەكەرە و ڕێنیشاندەرە، لە كاتی خۆشی و ناخۆشیدا چەك و

شمشێرە بۆ سەر دوژمن و جوانی نێوان خۆشەویستانە، خودا كۆمەڵێكی پێ بەرز دەكاتەوە و لە خێردا دەیانكاتە پێشەوا و ئیمام و شوێن پێیان هەڵدەگیرێت و چاو لە كاروكردەوەكانیان دەكرێت و خەڵكی دەگەڕێنەوە بۆ لای راكانیان، فریشتەكان حەزیان بە دۆستایەتییانە، بە باڵەكانیان دەیانسڕنەوە، و هەرچی تەڕ و وشكە داوای لێخۆشبوونیان بۆ دەكەن، هەر بەو جۆرە حوتی دەریاكان و گیاندارانیان، و درندەی وشكانی و ئاژەڵەكانی، چونكە زانست زیندەگی دڵە لە نەزانی و چرای بینینە لە تاریكیدا، مرۆڤ بە زانست دەگاتە مەنزیلەی هەڵبژاردەكان، و پلەی باڵا لە دونیا و دوارۆژدا، بەهۆیەوە سیلەی رەحم بەجێدەهێنرێت و حەڵاڵ لە حەرام جیادەكرێتەوە، زانست ئیمامی كاروكردەوەكانە و كردار بەدوای زانستدا دێت، كەسی بەختەوەر بە زانست ئیلهام دەكرێت، و كەسی بەدبەخت لە زانست مەحروم دەكرێت)) "الطبراني" و ئیبن عبد البر و كەسانی تریش ریوایەتیان كردووە، بە بەرزكراوەیی (مرفوع) بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ریوایەت كراوە، وەستان(وقف) دروستترە.

### ✿ هیممەتەكان وەك ترپەن

ئاستی دووەمی ژیان: زیندەگی ویست و هیممەتە، بەرانبەر لاوازی ویست و داوا بەهۆی لاوازی ژیانی دڵەوە، هەتا دڵ زیندەگییەكەی تەواوتر بێت هیممەتەكەی بەرزترە و ویست و خۆشەویستییەكەی بەهێزترە، ویست و خۆشەویستی شوێنی هەستكردن بە مورادی خۆشەویست دەكەون، هەروەها شوێنكەوتنی سەلامەتیی دڵ لە ئافەت كە لە داوا و ویستی باڵا دووری دەخەنەوە، بۆیە لاوازیی داوا و خاوبوونەوەی هیممەت: یان بەهۆی كەمی هەست و شعورەوەیە، یان بەهۆی بوونی ئافەتێكەوە كە زیندەگی لاواز دەكات، هێزی شعور و هێزی ویست: بەڵگەی هێزی زیندەگین، لاوازییەكەشیان بەڵگەی لاوازی زیندەگییە، وەك چۆن هیممەتی بەرز وصدق لە ویست و داوادا لە كەماڵی زیندەگین هەر بەو جۆرە هۆیەكن بۆ بەدەستهێنانی كامڵترین و خۆشترین زیندەگی، ژیانی خۆش و باش (الحیاة الطیبة) بە هیممەتی بەرز و خۆشەویستی راستگۆیانە و ویستێكی بێ خەوش بەدەست دەهێنرێت، ژیانی خۆش و باش بەپێی ئەمانەیە، نزمترین ئاستی ژیانی كەسێك بۆ نزمترین هیممەت و لاوازترین خۆشەویستی و داوا دەگەڕێتەوە، ژیانی ئاژەڵی باشترە لە ژیانی ئەو، وەك وتراوە:

نهارك يا مغرور سهو وغفلة وليلك نوم والردى لك لازم
وتكدح فيما سوف تنكر غبه كذالك في الدنيا تعيش البهائم
تسر بما يفنى وتفرح بالمنى كما غر باللذات–في النوم– حالم

مەبەستەکە ئەوەیە کە زیندەگی دڵ بە زانست ویست و هیممەتەوەیە، خەڵکی گەر ئەوەیان لە کەسێك بینی، دەڵێن: ئەو دڵی زیندووە، زیندەگی دڵ بە بەردەوامی یادی خودا و وازهێنانە لە گوناه، وەك عەبدوڵای کوڕی موبارەك–رەحمەتی خوای لێ بێت– دەفەرموێت:

رأيت الذنوب تميت القلوب وقد يورث الذل إدمانها
وترك الذنوب حياة القلوب وخير لنفسك عصيانها
وهل أفسد الدين إلا الملو ك وأحبار السوء و رهبانها؟
وباعوا النفوس ولم يربحوا ولم يغل في البيع أثمانها
فقد رتع القوم في جيفة يبين لذي اللب خسرانها

وەك چۆن خودای موتەعال ژیانی جەستەی بە خواردن و خواردنەوەوە گرێداوە ژیانی دڵیش بە بەردەوامی یادی خودا و گەڕانەوەی بەردەوام بۆ لای خودا و وازهێنان لە گوناه زیندەگی پێ دەبەخشن، بێئاگایی داباریو بەسەر دڵدا و لکان بە کاری خراپ و شەهەواتی دوابڕاوەوە ئەو زیندەگییە لاواز دەکەن، بەردەوام لاوازی روو لە دڵ دەکات تا دەبێتە هۆی مردنی، نیشانەی مردنی دڵ: مەعروف بە مەعروف نازانێت و مونکەر بە مونکەر تەماشا ناکات، وەك عەبدوڵای کوڕی مەسعود دەفەرموێت ((دەزانن کێ دڵ مردووە، ئەو کەسەی دەربارەی وتراوە:

ليس من مات فاستراح بميت إنما الميت ميت الأحياء

وتیان: ئەو کەسە کێیە؟ فەرمووی: ئەو کەسەی مەعروف بە مەعروف نازانێت و مونکەر بە مونکەر تەماشا ناکات))

پیاو ئەو کەسەیە: ترسی مردنی دڵی خۆی هەیە نەك مردنی جەستەی، چونکە زۆربەی خەڵکی ترسی مردنی جەستەیان هەیە و گوێ بە مردنی دڵیان نادەن و تەنها ژیانە سروشتییەکە بە ژیان دەزانن، ئەوەش لە مردنی دڵ و رۆحەوەیە، ئەم ژیانە

سروشــتییە وەك ســێبەرێكی گــوزەركردە وایــە یــان وەك رووەكێــك كــە زوو وشــك هەڵدەگــەڕێت، خەوێكــە و وادەزانێــت لــەناو حەقیقەتدایــە، كــە بــەئاگا هــات دەزانێــت خەونی بینیوە و خەیاڵێكە، عومەری كوڕی خەتتاب-خوا لێی رازی بێت- دەفەرموێت ((گەر ژیانی دونیا -لە سەرەتایەوە تا كۆتایی- بدرێت بە یەك كەسێك و پاشان مردن رووی لێ بكات وەك ئـەوە وایـە لـە خـەودا خـەونێكی ببینیبێـت و خۆشـحاڵی بكـات، و پاشان بـەئاگا بێـت و ببینێـت هـیچ لـە دەسـتیدا نییـە)) وتـراوە ((مـردن دوو مردنـە: مردنێكی ئیرادی، لەگەڵ مردنێكی سروشـتی، هـەر كـەس نەفسـی مرانـد بـە ویسـت و ئیرادەی خۆی، ئەوا ئەو كەسە مردنی سروشتی دەبێتە ژیان بۆی)) مانای ئەم وتەیـە: مردنــی ئــیرادی بریتییــە لــە قەلاچــۆكردنی شــەهەواتی نــزم و كپكردنــەوەی ئــاگرە ســوتێنەرەكەی و دامركاندنــەوەی بڵێســە تیابەرەكــەی، ئــەو كــات دڵ و رۆح یــەكلا دەبنەوە بۆ بیركردنـەوە لـەوەی كـەماڵی كەسـەكەی تێدایـە، ناسـینی و سـەرقاڵبوون پێیەوە، هەروەها لەوە تێدەگات كە هەڵبژاردنی سـێبەرێكی گـوزەركردە لـە نزیكـەوە بەسەر ژیانێكی هەمیشەیی پڕ لە چێژدا گەورەترین زیانۆمەندییە.

ئەگەر شەهەوات بەدوای یـەكتردا دەهـاتن و حـەز و لـەزەت هەڵبـژاردەی نـەفس بـوو، عادەت بەسەر كەسەكەدا خـۆی سـەپاندبوو و سروشـت حـاكم بـوو بەسـەریدا دڵ لـەو بـارەدا دیـل و ئەسـیر و زەلیلـە، یـان شكسـتخواردوە و لـە نیشـتمان و زێـدی خـۆ دەركراوە، ئەو نیشتمانەی كە بەبێ ئەو ئارام ناگرێت، یان ئەو دڵە كوژراوە و برینیش لە جەستەی مردوودا ئازاری نییە، باشترین حاڵی ئەو دڵە: ئەوەیە كە لە جەنگدا بێت، جارێك سەریكەوێ و جارێك شكسـت بخـوات، كاتێك بەنـدە بـە مردنـە سروشـتییەكە دەمرێـت لـە بەردەمیـدا ژیـانی رۆح بەدەسـت دەهێنێـت بـەو زانسـتە بەسـوودانەی وەریگرتووە، و ئەو كاروكردەوە چاكانەی ئەنجامی داوە و ئەو ئەحواڵە بەرزانـەی بـە مردنـی نەفسـی بەدەسـتی هێنـاوە، ژیـانی لـە بـەرزەخ و دواڕۆژدا بـەپێی "مردنـی ئیرادی"یەتی لەم ژیانی دونیادا.

ئەمـە بابەتێكـە تـەنها كەسـانێكی خـاوەن ژیـری و فامـدار دەیـزانن، و تـەنها ئـەهلی هیممەتی بەرزو نەفسی خاوێن بە داواكارییەكانی كار دەكەن.

## حەیا جووڵەیە

ئاستی سێیەم لە ئاستەكانی ژیان:

بریتییە لە ژیانی ئەخلاقی و سیفەتە بەرز و پەسەندەكان، كە بریتییە لە ژیانێكی ریشەداری قووڵ بۆ ئەو كەسەی پێی دەڕازێتەوە، ئەو لە بەرزبوونەوەیدا بە پلەكانی كەماڵدا زۆر لەخۆكردن و گرانیی لەسەر نییە، چونكە ئەخلاق و سیفەتەكانی داوای ئەوە دەكەن، بەجۆرێك گەر ئەو بەرزبوونەوە بێ ئەركەی لێ جیاببێتەوە ئەو شتەی لە سروشت و ئەخلاقییەتی لێی جیادەبێتەوە، ژیان و زیندەگی ئەو كەسەی لەسەر حەیا و عیففەت و بەخشندەیی و سەخاوەت و پیاوەتی و جوامێری و صدق و وەفا و هاوشێوەكانی ئەمانە بارهاتووە تەواوتر و كامڵترە لە ژیانی كەسێك كە بە كۆشش كردن بەسەر نەفسی خۆیدا زاڵ دەبێت تا بەو جۆرە دەردەچێت كە ئاماژەی پێكرا، ئەمەیان وەك ئەو كەسە وایە نەخۆشی رووی تێدەكات و بە هۆكارەكانی دەوا چارەسەری دەكات و زاڵ دەبێت بەسەر نەخۆشییەكەدا، بەڵام ئەوەی تریان وەك كەسێكی لەشساغ وایە كە دوورە لە دەرد و نەخۆشی.

هەتا ئەم ئەخلاقانە لە خاوەنەكەیدا كامڵتر بێت ژیانەكەی بەهێزتر و تەواوتر دەبێت، بۆیە ئەخلاقی "حەیا" لە وشەی "حیاة"-ژیان یان زیندەگی بە ناو و حەقیقەت داتاشراوە، كامڵترین كەس لەڕووی ژیانەوە كامڵترینیانە لە سیفەتی حەیادا، ناتەواوی لە حەیای كەسەكەدا ناتەواوییە لە ژیان و زیندەگییدا، رۆح كاتێك دەمرێت هەست بە ئازاری شتە ناشیرینەكان ناكات و شەرمیان لێ ناكات، گەر حەیای كەسەكە دروست و رەوان بێت هەست بە ناشیرینی و ناپەسەندی كاروكردەوەكان دەكات و حەیایان لێ دەكات، هەر بەو جۆرە تەواوی ئەخلاقە بەرز و پەسەندەكان و سیفەتە مەدحكراوەكان شوێنكەوتەی هێزی ئەو ژیان و زیندەگییەن، دژی ئەمانە لە ناتەواوی ژیان و زیندەگی ئەو كەسەیە، بۆیە ژیانی مرۆڤی ئازا و بوێر كامڵترە لە ژیانی مرۆڤی ترسنۆك، و ژیانی كەسی سەخی تەواوترە لە ژیانی كەسی بەخیل، و ژیانی كەسی زیرەكی دانا كامڵترە لە ژیانی مرۆڤی ساویلكە و گێل و تەمبەڵ، بۆیە پێغەمبەران- صلوات الله وسلامە علیهم- كامڵترین مرۆڤن لەڕووی حەیاوە، تەنانەت هێزی ژیان و زیندەگییان رێگە دەگرێت لە زەوی جەستەیان بڕزێنێت، ئەوان لەم ئەخلاقەدا كامڵترین بوون و پاشان هاوشێوەی ئەوان و هەتا دوایی.

ئێستا تەماشای ژیانی سوێندخۆری سوكی تانەدەری دووزمانی رێگر لە خێر و دەستدرێژكار و تاوانبار و دەستنوقاو و لەسەرو هەموو ئەمانەوە زۆڵ بكە و بەراوردی پێبكە لەگەڵ ژیانی بەخشندەی ئازای چاكەكار و عادل و خاوەن عیففەت و چاكەخواز دەبینی یەكەمیان بەراورد بەمەی دووەم مردووە و ژیان و زیندەگی لێبڕاوە.

((كرانەوە-البسط)) لە مەزنترین ئەو ئەخلاقانەیە و بەهێزترینە لە سیفەتەكانی حەیادا، ئەو ئەخلاقانەی پێغەمبەری خودا و هاوەڵان و خانەوادە و دوور و نزیك لەسەری بوون، ئەوەش بریتییە لە سنگفراوانی و رووخۆشی بەردەوام و ئەخلاقی جوان و سەلام كردن لە هەر كەس پێی دەگەیشت، و وەستان لەگەڵ ئەو كەسەی رایدەوەستان و هەندێ جار شۆخیكردن بە حەق لەگەڵ گەورە و بچووك و چوون بەدەم بانگهێشكردنەوە و نەرمونیانی، تا هەریەك لە هاوەڵانی وا گومانیان دەبرد پێغەمبەر(ﷺ) ئەوی لە هەموو كەس زیاتر خۆشدەوێت، ئەم مەیدانە واجب و "موستەحەب"ی تێدا دەبینیتەوە یان موباحێك كە كۆمەكی ئەو دوانە(واجب، موستەحەب) دەكات.

هەندێ كەس خودا كۆمەكی دەكات و بەشێكی گەورەی لە كرانەوەی پێغەمبەری كەریمی بەردەكەوێت و كرانەوەی لەگەڵ خەڵكیدا دەبێت بە رەحمەت بۆیان، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ﴾آل عمران: ١٥٩، خودا سیفەتی كرانەوەی بەوانە بەخشیوە تاكو لەگەڵ خەڵكیدا بكرێنەوە و سالیكان شوێنیان بكەون و سەرگەردانەكان بەهۆیانەوە رێنومایی وەربگرن و نەخۆشەكان چارەسەر ببن، بە نووری هیدایەت و ئامۆژگاری و مەعریفەیان لە ناو تاریكی شەوەزەنگی سروشتی نەفس و ئارەزووەوە رێگەیان بۆ رۆشن بكەنەوە، كاتێك بێدەنگ دەبن سالیكان چاویان لێدەكەن، و كاتێك قسە دەكەن سوود لە وشەكانیان دەبینن، لەبەر ئەوەی جووڵە و بێدەنگ بوونیان بەخودا و بۆخودا و لەسەر ئەمری خودایە دڵی صادیقان بەلای خۆیاندا رادەكێشن، وێڵ و سەرگەردانەكان شوێنیان دەكەون، وەستاوەكان پێیان دەكەونە جووڵە، و خواروخێچەكان پێیان راست دەبنەوە، پشتهەڵكردووەكان دەگەڕێنەوە و ناتەواوەكان پێیان كامڵ دەبن و پشگەزەكان دەگەڕێنەوە و لاوازەكان پێیان بەهێز دەبن.

ئەوانە بە حەق جێنشینی پێغەمبەران و خاوەن بینینی ڕۆشن و یەقین و میراتگری ئەنبیاکانن، ئەوان "بصر" و "بصيرة"یان لە خۆیاندا کۆکردۆتەوە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ (٢٤) ﴾ السجدة: ٢٤، ئیمامەتیان لە ئاییندا بە ئارامگرتن و یەقین بەدەست هێنا.

زانایان سیانن: زانایەك دەستی بە نوورەکەیەوە گرتووە و خەڵکیش دەستی بە نووری ئەوەوە گرتووە، ئەم کەسە جێنشینی پێغەمبەرانە و میراتگری ئەنبیایە، زانایەك کە دەستی بە نووری خۆیەوە گرتووە و خەڵکی دەستیان بە نووری ئەوەوە نەگرتووە، ئەم کەسە گەر زیادەڕەوی نەکات سوودەکەی تەنها بۆ خۆیەتی، جیاوازی زۆر هەیە لەنێوان ئەم و ئەوەی یەکەمدا، سێیەمیان زانایەکە دەستی بە نووری زانستەکەی خۆیەوە نەگرتووە و کەسیش دەست بە نوورەکەیەوە ناگرێت، ئەم جۆرەیان زانستەکەی بەڵایەکی گەورەیە بەسەریەوە و کرانەوەی بۆ خەڵکی فیتنەیە، وەك چۆن کرانەوەی زانای یەکەم ڕەحمەت بۆیان.

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ئەوانە نهێنییەکانی خۆیان دەپارێزن و پەنهانی خۆیان ئاشکرا ناکەن بۆ ئەو کەسانەی بۆیان دەکرێنەوە با کرانەوەش ئولفەتی تێدابێت و داوابکات کەسە کراوەکان پەنهانەکانیان بۆ یەکتر ئاشکرا بکەن، زۆر بەئاگابە نهێنییەکانت لەگەڵ خودا بەهۆی کرانەوە لەگەڵ دەوروبەر ئاشکرا نەکەیت، بەڵام کەسەکە رابکێشە و تامەزرۆی بکە و ئەمانەتی خودا لەلات بپارێزە و مەیخەرە روو بە گێڕانەوە و باسکردنی.

## ۞ چێژی گەیشتن بانگ دەکات بۆ تێهەڵچوونەوەی ڕۆیشتن بەرەو لای خودا

ئاستی چوارەم لە ئاستی ژیان و زیندەگی: ژیان و زیندەگی فەرەح و سروور و ڕۆشنبوونەوەی چاو بە خودا، ئەم ژیانە دوای زەفەربردن دێت بە داوا و مەبەست کە چاوی داواکارەکە ڕۆشن دەکاتەوە، بەبێ مەبەست و داواکەی هیچ ژیانێك بۆ ئەو مانای نییە، هەموو خەڵکی بەدەوری ئەم ژیانەدا خول دەخۆن، هەموویان ڕێگەکەیان لێ بزر بووە و تولە ڕێگەیەکیان گرتۆتەبەر کە نایانگەیەنێت بەم جۆرە ژیان و زیندەگییە، بەڵکو دووریان دەخاتەوە، مەگەر کەمێکی زۆر کەم، بۆیە هەمووان هەوڵ دەدەن بۆ ئەم جۆرە زیندەگییە و زۆرینەشیان لێی مەحروم دەبن.

هۆی مەحروم بوونیان لەم زیندەگییە: لاوازی ئەقڵ و جیاكردنەوە و بینـینی ڕۆشـن، و لاوازی هیممـەت و ویسـت و لێبڕانـە، كەرەسـتەی ئـەم جـۆرە زیندەگییـە بریتییـە لـە بینینی ڕۆشن و كڵپەسەندو و هیممەتی بەرز، "بصيرة"ش وەك "بصر" تووشی كوێری دەبێـت، هـەروەك چـۆن دەگـونجێ لـە ئەوپـەڕی ڕۆشـنی و تیـژی بینینـدا بێـت، ئافەتـەكانی"بصـيرة" لەوانەیـە لـە سروشـت و بۆمـاوەیی كەسـەكەدا بـوونی هـەبێت، لەوانەشە بەهۆی هۆكارە دەرەكییە لابەلاكانەوە ڕووی تێبكات.

مەبەستەكە: ئەم ئاستە لە زیندەگی بەرزترین ئاستی زیندەگییە، بەڵام چـۆن كەسـێك پێبیگات كە ژیرییەكەی لە وڵاتی شەهەواتدا بە كۆیلە كراوە، هـەموو ئـاواتی بـووە بـە گەران بـەدوای چـێژ و لەزەتـدا، ژیـانی لەسـەر خـراپترین عـادەت بەڕێوە دەچـێت، و دینەكەی بە یاخیبوون و سەرپێچی كردن تیابردووە، هیممەتی لەسـەر شـتە نزمـەكان ڕاوەستاندووە و بیروباوەڕەكەی لە چرای پێغەمبەرایەتییەوە وەرنەگرتووە.

ئەو لەناو شەهەواتدا ڕۆچووە و لە شوبوهاتدا نـوقم بـووە و لـە ئامۆژگاریكـەر پشـتی هەڵكردووە و لە ڕێنشاندەر پەڕی سەندووە، و لـە بـارە خۆشـەكاندا خـەوتووە و دڵـی وێڵ و سەرگەردان بووە، گەر خۆی لـە نەفسـی بـەدوور بگرتبایـە و بەشـداری خراپـی هاوڕەگەزەكانی خۆی نەكردبایە و لە تەنگەلانی نەزانییەوە بڕۆیشتبا بۆ نووری زانست و لە بەندیخانەی ئارەزووەوە بۆ مەیدانی هیدایەت و لـە پیسـی نەفسـەوە بـۆ پـاكی و بێگەردی: گەر هەموو ئەم كارانەی بكردبایە، ئەوا هۆگربوونی بە خوداوە دەبینییـەوە كە بە گەورەبوونی ئەو گەورە دەبوو و بە زیادبوونی زیـاد دەبـوو و بەبـەهێزی بـەهێز دەبوو، هـەر كـات چـاوی "بصـيرة"ی لێڵـی ڕووی تێكـرد و حەلقـەی بـاوەڕی پچـڕانی تێكەوت و نەخۆشی هێرشی كردە سەر ئیتر ئەو كەسە لە لێواری تیاچووندایە.

گەر بڵێت: ئاماژەت بە جۆرێك ژیان و زینـدەگی كـردووە كـە بـۆ مـردووە زینـدووەكان ئاشنا نییە، ئایا دەتوانی وەسفی ڕێگەكەی بكەیت تا بگەمە شتێك لـە تـام و چـێژی؟ بۆم ڕۆشن بووەتـەوە ئەمـەی ئێمـە تیایـدا دەژیـن ژیـان و زیندەگییـەكی ئاژەڵانەیـە، لەوانەیە ئاژەڵەكان لە ئێمە باشتر بن بـەهۆی خاڵیبوونیـان لـە مونكـەرات و تێكـدان و سەلامەتی سەرئەنجامەوە.

دەڵێم: سوێند بە خودا، تامـەزرۆبوونت بـۆ ئـەو ژیـان و زیندەگییـە و داوای زانسـت و مەعریفەی: بەڵگەی زیندەگی تۆیە و تۆ لە ڕیزی مردووان نیت.

یەكەمین ڕێگەی ئەو زیندەگییە: ئەوەیە كە خودا بناسیت، ڕێگەیەك بدۆزیتەوە بەو ئامانجەت بگەیەنێت، تاریكی سروشتی نەفس بە تیشكی "بصيرة" بسوتێنێت، شاهیدێك لە شاهیدەكانی دوارۆژ لە دڵدا راستدەبێتەوە، بە هەموو بوونییەوە ڕوو لە دوارۆژ بكات، لێرەوە كەسەكە لە وابەستە فانییەكانی دونیا زوهد دەكات، دەست دەكات بە ڕاستكردنەوەی تەوبە، و هەستان بە فەرمانە دەرەكی و ناوەكییەكان، و وازهێنان لە نەهیلێكراوەكانی دەرەوە و ناوەوە، پاشان پاسەوانێك لە دڵیدا ڕاست دەبێتەوە و ڕێگەی پێ نادات بە گرتنەبەری مەترسییەك كە خودا پێی ناخۆش بێت، هەروەها خۆی ناخاتە بەر هەڕەشەی ئەنجامدانی شتێك كە سوودی پێ ناگەیەنێت، بەوەش دڵی لە ورتە ورتی نەفس و وەسوەسە پاك دەبێتەوە، و لە دیلی قوتاری دەبێت، سەربەست و ئازاد دەبێت، ئەوكات دڵی خاڵی دەبێتەوە بۆ یادی خودا و خۆشەویستی و گەڕانەوەی بەردەوام بۆ لای، لە خانەكانی سروشت و نەفس دێتە دەرەوە بەرەو فەزای تەنهاكەوتنەوە لەگەڵ پەروەردگاری و یادكردنی، وەك وتراوەك

وأخرج من بين البيوت لعلني أحدث عنك النفس في السر خاليا

ئەو كاتە دڵ و خەیاڵ و ورتەورتی نەفسی لە ویستنی پەروەردگار و داوا و تامەزرۆبوون بۆ لای كۆدەبنەوە.

گەر لەوەدا ڕاستی كرد ئەوا خۆشەویستی پێغەمبەری خودای(ﷺ) پێدەبەخشرێت، ڕۆحانییەتی پێغەمبەری خودا دەست بەسەر دڵیدا دەگرێت، دەیكات بە ئیمام و مامۆستا و پێشەوای خۆی وەك چۆن خودای موتەعال كردی بە پێغەمبەر و هادی بۆ لای خۆی، سەرنجی سیرەی پێغەمبەر و سەرەتای دەستپێكردنی دەدات، چۆنێتی دابەزینی وەحی بۆ سەری، سیفات و ئەخلاقی پێغەمبەر(ﷺ) دەناسێت، بە ئاداب و جووڵە و وەستان و ئاگاهی و خەوی و عیبادەت و تێكەڵاوی خەڵك و خانەوادەی ئاشنا دەبێت، تا وای لێ دێت وەك ئەوەی لەگەڵیدا بێت هەروەك هاوەڵەكانی.

كە دڵی لەوەدا قووڵبوویەوە و ریشەی داكوتی دەرگای تێگەیشتنی وەحی دابەزیو لە پەروەردگارەوە بەڕوویدا دەكرێتەوە، بەجۆرێك گەر سورەتێك بخوێنێتەوە دڵی ئەو مانانە وەردەگرێت كە لە سورەتەكەدا دابەزیوە و ئەو مەبەست و مەرامانەی بۆی دابەزیوە، هەروەها بەشی تایبەتی خۆی لە سورەتەكە لە سیفات و ئەخلاق، هەروەها

کاروکردەوەی خراپ و ناپەسەند کە هەوڵدەدات خۆی لێیان بەدوور بگرێت، هەوڵی چارەسەری نەخۆشییە ترسناکەکانی خۆی دەدات، هەر بەو جۆرە بەشی خۆی لە سیفات و کردەوەی پەسەند کە هەوڵی تەواوکردن و بەهێزکردنیان دەدات.

گەر لەسەر ئەمە دامەزرا: لە دڵیدا چاوێکی تر دەکرێتەوە کە موشاهەدەی سیفاتی پەروەردگاری پێ دەکات، تا موشاهەدەکان بۆ دڵی وەك بینینی چاوی لێ دێت بۆ شتی بینراو، بەرز و بڵندی پەروەردگاری دەبینێت لەسەرو دروستکراوەکانییەوە و لەسەر عەرشی مەزنی ئیستوای کردووە، دابەزینی ئەمری خودا لە عەرشەوە بۆ بەڕێوەبردنی سەر مەملەکەتەکەی، قسەکردنی خودا بە وەحی، قسەکردن لەگەڵ بەندەکەی خۆی جیبریل و ناردنی بە وەحیەوە بۆ لای هەر کەسێك کە خودا هەڵیبژاردبێت، هەر بەو جۆرە بەرزبوونەوەی کاروبارەکان بۆ لای خودا و خستنە بەردەم خودای موتەعال.

دڵی پەروەردگارێکی زاڵ بەسەر بەندەکانیدا دەبینێت، فەرمان دەردەکات و نەهی دەکات، کتێبەکانی دادەبەزێنێت و دەپەرسترێ و گوێڕایەڵی لێ دەکرێت، نە هاوەڵ و نە هاوشێوە و نە هاوتای هەیە، هیچ کەس لەوانەی لەلای ئەون هیچیان بەدەست نییە، بەڵکو هەموو ئەمرەکان بەدەستی ئەوە، پەروەردگاری دەبینێت بە کاری موڵك و بەڕێوەبردن هەڵدەستێت، جووڵ و وەستان، و قازانج و زیان، و بەخشین و لێگرتنەوە، و داخستن و کرانەوە هەموو بە توانا و تەگبیری ئەوە، هەموو گەردوون بە ئەمری ئەو هەڵدەسوڕێت، بەڵام راوەستاویی خودا بە خودی خۆیەوەیە، و هەرچی بوونە بە بوونی ئەوەوە وەستاوە.

کە دڵی لەوەدا قووڵبوویەوە: ئەو سیفەتە دەبینێت کە هەرچی سیفەتەکانی ترە بەوەوە راوەستاوە، ئەو سیفەتەش بریتییە لە "حیاة"-ژیان و زیندەگی، کەماڵی سیفەتی "ژیان" کەماڵی سیفەتەکانی تر لە بیستن و بینین و قودرەت و ئیرادە و کەلام، و تەواوی سیفەتەکانی تر لەخۆ دەگرێت، هەر بەو جۆرە سیفەتی "القيومية" بۆ هەموو سیفەتەکان، کەسی "الحي القيوم" کەسێکە کە هەموو سیفەتی کەماڵی هەیە و هەرچییەکی بوێت دەتوانێت ئەنجامی بدات.

کە دڵی لەمەشدا قووڵبوویەوە: مەشهەدی نزیکی(القرب) و لەگەڵ خودابوون (المعية)ی بەڕوودا دەکرێتەوە، خۆی لەگەڵ خودادا دەبینێتەوە و خودای لێ بزر نابێت، نزیکە و

دوور نییــە، لەگــەڵ ئــەوەی لەســەرو ئاسمانــەكان و عەرشــی مەزنەوەیــە، لــە دروستكراوەكانی جیابووەتەوە، بە دروستكردن و بەڕێوەبردن هەڵدەستێت، بوون و بڕیار بەدەستی ئەوە، لەگەڵ -بە مەزن زانین و شكۆدانەپاڵی- هۆگربوونی بەم سیفەتە بۆ دروست دەبێت، هۆگری بۆ پەیدا دەبێت دوای ئەوەی لەناو وەحشەتدا بوو، خۆی پێ بەهێز دەكات دوای ئەوەی كە لاواز بوو، پێی دڵخۆش دەبێت لە دوای حوزن و خەم و پەژارە، دەیدۆزێتەوە دوای ونكردنی، ئەو كاتە تامی فەرموودە قودسییەكە دەكات كە دەفەرموێت ((بەردەوام بەندەكەم بە نەوافل لێم نزیك دەبێتەوە تا خۆشم دەوێت، كە خۆشمویست دەبم بەو بیستنەی پێی دەبیستێت، دەبم بەو بینینەی پێی دەبینێت، دەبم بەو دەستەی دەیوەشێنێت، دەبم بەو لاقەی پێی دەڕوات، گەر داوای لێكردم پێی دەبەخشم، گەر پەنای پێگرتم پەنای دەدەم))

خۆشترین ژیان بە ڕەهایی ژیانی ئەو بەندەیە، ئەو خۆشەویست و مەحبوبە، لە پەروەردگارییەوە نزیكە، و پەروەردگاریشی لەوەوە نزیكە، ئەو-سبحانه- بووە بە خۆشەویستی بەهۆی داگیركردنی مەملەكەتی دڵ و پاراوبوونی دڵ و زمانی بە یادی خودا، هەروەها وەستانی هیممەتی لەسەر ڕەزامەندی خودا وەك بیستن و بینین و دەست و لاقی وایە، ئەمانە ئامێرەكانی پەیبردن و كردار و كۆششی ئەون، كە دەبیستێت بە خۆشەویستەكەیەوە دەبیستێ، كە دەبینێت بەوەوە دەبینێ، كە دەستدەوەشێنێت بە پەروەردگارییەوەیە و كە دەڕوات هەر بەو جۆرەیە.

گەر تێگەیشتنی ئەم مانایە لەسەرت گران بوو، ئەوەی خۆشەویستی كامڵ بە مەحبووبەكەیەوە دەبیستێ و دەبینێ و دەوەشێنێ و دەڕوات و خودی خۆی لەو كارانەدا نادیارە، ئەوا بیركردنەوە لەم مانایە بخەلاوە و بەجێی بهێڵە بۆ ئەهلی خۆی.

خل الهوى لأناس يعرفون به قد كابدوا الحب حتى لان أصعبه

سالیك بۆ لای خودا بەردەوام هیممەتی لەسەر دوو شتە: خاڵیكردنەوەی دڵ لەپێناو صدقی خۆشەویستیدا لەگەڵ تێكۆشان بۆ جێبەجێ كردنی ئەمرەكان، ئەو بەبەردەوامی لەسەر ئەم دوو بنەما دەمێنێتەوە تا شاهیدەكانی ناسینی خودا و ئاسەواری سیفەتەكان و ناوەكانی لەسەر پەنهانی ئەو كەسە سەرهەڵدەدەن، بەڵام هەندێ جار پشتی تێدەكات و هەندێ جار دەردەكەوێت، دەركەوتنەكەی بە بەخشینی

خوداوەيە و پشتهەڵکردنەکەی بەهۆی خاوبوونـەوە و ساردبوونەوەی کەسـەکەوەیە، خاوبوونـەوە کـارێکی پێویسـتە بـۆ کەسـەکە، هـەموو کارکـەرێك لوتکـەی چـالاکی و تێکۆشانی هەیە، هەموو لوتکەیەکی چالاکیش خاوبوونـەوە و سـاردبوونەوەی بـەدوادا دێت، بەرزترینیان پچڕانی وەحییە لە پێغەمبەران و بڕینی حاڵی تایبەتە لە عاریفان، و خاوبوونەوەی هیممەتە لە موریدان و ساردبوونەوە لە کردار لە عابیدانـدا، لـەو مـاوەی سـاردبوونەوە و خاوبوونـەوەدا چـەندین جـۆر حیکمـەت و رەحمـەت بوونیـان هەیـە، هەروەها بوونی ناسینە خوداییەکان و ناسینی قەدری نیعمەت و تازەبوونەوەی شەوق و تامەزرۆبوون بۆ لای و خۆئامادە کردن بۆی.

بەردەوام ئەو شاهیدانە: دووبارە دەبنەوە و زیاد دەکەن تا جێگیر دەبـن و دڵ پێیـان رەنگ دەگرێـت، تـا وای لـێ دێـت سـاردبوونەوە و خاوبوونـەوە نابێتـە هـۆی دابڕانـی کەسەکە، بەڵکو دەبێتە نیعمەتێك لەسەری و ئاسوودەییەك بۆی و پشوو و نەفەسێك.

هیممـەتی کەسـی خۆشەویسـت –گـەر رۆح وابەسـتە بێـت بـە خۆشەویسـتەکەیەوە– خەریکی زیادکردنی خۆشەویستی و هۆی بەهێزکردنی دەبێـت، ئـەو لەسـەر ئەمـە کـار دەکات، پاشان لـەوەوە بەرزدەبێتـەوە بـۆ لای داوای خۆشویسـتنی خـودا بـۆ ئـەو، و کاردەکـات بـۆ بەدەسـتهێنانی ئـەو پلەیـە، داوای یەکـەم ون نابێـت و هـەرگیز لێـی جیانابێتـەوە، بـەڵکو لـەژێر ئـەم داوای دووەمـەدا جێیدەبێتـەوە، بۆیـە هیممـەتی وابەستەی هەردوو ئەمرەکە دەبێت، ئـەو بـەم ئـەمری دووەمـە مەنزیلـەی ((دەبم بـەو بیستنەی پێی دەبیستێت، دەبم بەو بینینەی پێی دەبینێت)) بەدەستهێناوە، ئەوەش بەوە دەبێت کە بووە بە مەحبووبی خۆشەویستەکەی، وەك لە فەرموودەکەدا هـاتووە دەفـەرموێت ((کاتێـك خۆشمویسـت دەبم بـەو بیسـتنەی پێـی دەبیسـتێ، دەبم بـەو بینینەی.....هتد..)) ئەو لە پەروەردگاری نزیك دەبێتەوە، لەپێناوی پارێزگاری کردن لە خۆشەویستی ئەو، و داواکردنی خۆشەویستی پەروەردگار بۆ خۆی.

ئەو کاتە خـۆی یەکلادەکاتـەوەبۆ داوای خۆشەویسـتی خۆشەویسـتەکەی بـە چـەندین جۆر لە کاروکردەوەی چاکە، بۆیە دڵی:تەرخان دەکـات بـۆ خۆشەویسـتی و گەڕانـەوە بۆ لای خودا و تەوەکول و ترس و رجا، زمانی تەرخان دەکات بۆ: یاد و خوێندنـەوەی کەلامی خۆشەویستەکەی، ئەندامەکانی: تەرخان دەکات بۆ گوێڕیەڵی، ئەو کولنابێت و ساردنابێتەوە لە نزیکبوونەوە لە خۆشەویستەکەی.

ئەمە ئەو ڕۆیشتنەیە کە سەردەکێشێت بۆ ئەو دەرئەنجامە کە تەنها بەوە بەدەست دێت، کەس پێی ناگات لەم دەرگایە و لەم ڕێگەیەوە نەبێت، ئەو کاتە لە ڕۆیشتنەکەیدا هەموو بەشەکانی سلوك كۆدەكاتەوە لە: ئامادەبوونی دڵ، و هەیبەت، و چاودێری، و بنبڕکردنی خایلە و ختورە و ڕازاندنەوەی ناوەوە.

کەسی خۆشەویست یەکەمجار بە کاروکردەوە دەرەکییەکان لە خودا نزیك دەبێتەوە، ئەو کردارانە نزیکبوونەوەن لە خودا بە رووالەت و دەرەوە(ظاهر التقرب)، پاشان لەو نزیکبوونەوەوە بەرزدەبێتەوە بۆ حاڵی نزیکبوونەوە(حال التقرب)، ئەوەش بریتییە لە ڕاکێشان بەرەو خۆشەویست بە هەموو ڕۆح و دڵ و ئەقڵ و جەستەیەوە، پاشان لەوەوە بەرز دەبێتەوە بۆ حاڵی ئیحسان(حال الإحسان)، خودا دەپەرستێت وەك ئەوەی بیبینێت، ئیتر لەو دەمەوە خودا دەپەرستێت –لە ناوەوە– بە کارەکانی دڵ: لە خۆشەویستی و گەڕانەوە و بەمەزن زانین و بەشکۆمەندکردن و ترس و ڕازی بوون و هتد..، بۆیە لە ناخیدا سیفەتی بەخشندەیی بە بەخشینی ڕۆح سەرهەڵدەدات، بەخشندەیی لەپێناو خۆشەویستدا هیچ زۆر لەخۆکردنێکی تێدا نییە، ڕۆح و نەفسی دەبەخشێت، هەناسە و ویستی دەبەخشێت، کارەکانی بۆ خۆشەویست حاڵە و زۆر لەخۆکردنی تێدا نییە، گەر کەسی خۆشەویست ئەمەی دۆزییەوە ئەوا زەفەری بە حاڵ و نهێنی و ناوەوەی نزیکبونەوە بردووە، گەر ئەمەی نەدۆزییەوە ئەوا تەنها بە زمان و جەستە و دەرەوەی نزیك دەبێتەوە، با لەسەر ئەوە بەردەوام بێت، با زۆر لەخۆی بکات بۆ نزیکبوونەوە بە یادکردنی خودا و کاروکردەوەی چاکە بە بەردەوامی، بەڵکو لەو ڕێگەیەوە بگاتە حاڵی نزیکبوونەوە.

لە پشتی ئەمەوە نزیکبوونەوەی ناوەوە(القرب الباطن) هەیە، ئەمەش ئاستێکی ترە لە نزیکبوونەوە، ئەوەش شتێکە هیچ کەس ناتوانێت وەك پێغەمبەر تەعبیری بکات کە بە جوانترین و کورتترین وشە تەعبیری لەو مانایە داوە، لە خودای موتەعالەوە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت ((هەر کەس بستێك لە من نزیك ببێتەوە من باڵێك لەو نزیك دەبمەوە، هەر کەس باڵێك لە من نزیك ببێتەوە من دوو باڵ لەو نزیك دەبمەوە، هەر کەس بە ڕۆیشتن بەرەو لای من بێت من بە نەرمە ڕاکردن بەرەو لای ئەو دێم))کەسی خۆشەویست لە ناوەوەیدا چێژ لە مانای ئەم فەرموودەیە دەکات بە چێژکردنێکی ڕاستەقینە.

لەم فەرمودەدا سێ ئاست لە نزیکبوونەوە دیاری کراوە، باسی خوارتر و سەروتری کردووە، باسی نزیکبوونەوەی بەندەی کردووە لە خودا بە "بست" بەرانبەر بەمە نزیکبوونەوەی پەروەردگار لە بەندەکەی بە"باڵ" کە کەسەکە حەقیقەتی ئەم نزیکبوونەوەی چەشت دەگوێزێتەوە بۆ نزیکبوونەوەیەکی تر ئەویش نزیکبونەوەی بەندەیە لە خودا بە"باڵ" و نزیکبوونەوەی پەروەردگار لەو بە "دوو باڵ" کە شیرینی ئەم نزیکبونەوەی دووهەمەی چەشت دەگوێزێتەوە بۆ نزیکبوونەوەی "رۆیشتن" لە بەندەوە و "هاتن بە نەرمە راکردن" لەلایەن پەروەردگارەوە، لێرەدا کۆتایی فەرموودەکەیە، ئاگادارمان دەکاتەوە کە ئەگەر بەندە بە "نەرمە راکردن" بەرەو خودا چوو ئەوا نزیکبوونەوەی خودا لەسەرو "نەرمە راکردن"ەوەیە بۆ لای بەندەکەی، یان بەهۆی مەزنیی پاداشتەکەیەوە خودای موتەعال لەم ئاستەی تر لە نزیکی بێدەنگ بووە، یان پاداشتەکەی لەلای خودا پاداشتێکە گوێ نەیبیستووە، و بەدڵدا وەك خایلە و ختوورە گوزەری نەکردووە، یاخود رەوانەمان دەکات بۆ ئاستی باڵاتر و باڵاتر بەپێی ئەوەی خۆی بۆی باس کردووین، وەك ئەوەی پێی بوترێت: لەسەر ئەمە بۆ خۆت پێوانە بکە، بە ئەندازەی ئەوەی دەیبەخشیت بۆ نزیکبوونەوە لە پەروەردگار ئەوا ئەو-**سبحانە**- زۆرتر و زیاتر لە تۆ نزیك دەبێتەوە، بینا لەسەر ئەمە هەموو نزیکبوونەوەکانی تر کێشانە و پێوانە بکە، واتە هەر کەس بە رۆح و هەموو هێزی خۆی و ویست و قسە و کرداری لە خۆشەویستەکەی نزیك ببێتەوە پەروەردگاریش لەو نزیك دەبێتەوە بە خۆی بەرانبەر نزیکبوونەوەی بەندەکەی لە ئەو.

نزیکبوونەوە لە هەموو ئەم ئاستانەدا نزیکبوونەوەی دوور و ماوە و بەرهەست و بەریەککەوتن نییە، بەڵکو پەروەردگار لەسەرو ئاسمانەکانەوەیە لەسەر عەرشی مەزنی، بەندە لەسەر زەوییە.

ئەم بابەتە نهێنی سلوك و حەقیقەتی بەندایەتییە، ئەوەش مانای گەیشتنە کە ئەهلی سلوك بە دەوریدا دەخولێنەوە، خولگەی ئەم کارە: یەکەم: مەبەستە نزیکبوونەوە(قصد التقرب) و دووەم: نزیکبوونەوە، پاشان سێیەم: حاڵە نزیکبوونەوە، ئەوەش بە تەواوی راستبوونەوە و رووکردنە لە خودا.

حەقیقەتی ئەو راستبوونەوەیە: ئەوەیە کە بۆ مورادی ئەو-**سبحانە**- لە ئارەزووەکانت فانی ببیت، هەروەها بەوەی لەلای ئەوەوەیە لە بەشی خۆت فانی ببیت، بەڵکو ببێت

بە موراد و بەش و حەزت، ئەوەت زانی هەر كەس لە خۆشەویستەكەی بە شتێك نزیك ببێتەوە پاداشتی دەدرێتەوە بە نزیكبوونەوەی چەندجارە، ئەوەشت زانی ئەهلی جۆرەكانی نزیكبوونەوە: كەسەكە بە ناوەوە و دەرەوە و هەموو بوونییەوە لە پەروەردگاری خۆشەویستی نزیك دەكاتەوە، هەر كەس ئەوەی كرد بە دڵنیاییەوە بە هەموو بوونی لە خودا نزیك بووەتەوە و شتێك لەودا نەماوەتەوە بەشی كەسێكی تر بێت جگە لە تەنها خۆشەویستەكەی، وەك وتراوە:

**لا كان من لي سواك فيه بقية     يجد السبيل بها إليه العذل**

گەر ئەو كەسانەی بە كاروكردەوەكان لێی نزیك دەبنەوە چەند بەرانبەری ئەو نزیكبوونەوەیان پێبدرێت، دەبێ گومانت چی بێت بە كەسێك حاڵ و زەوق و وەجدی نزیكبوونەوەی پێبەخشراوە؟ ئەی دەبێ گومانت چی بێت بە كەسێك بە رۆح و كۆی ویست و هیممەت و گوفتار و كرداری لە خودا نزیك ببێتەوە؟.

بینا لەسەر ئەمە وەك چۆن نەفسی خۆی بە خۆشەویستەكەی بەخشیوە كەوابوو ئەویش ئەهلە بۆ ئەوەی پێیببەخشرێت، بەوەی پەروەردگاری ببێت بە بەشی لە جێگەی هەموو شتێك، پاداشتێكی پڕاوپڕ، پاداشت لە شێوەی كردارەكەیە، بەڵگە لەسەر ئەمە زۆرە، لەوانە ئایەتی ﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ۝٢ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ﴾ الطلاق: ٢ – ٣، جیاوازی خستە نێوان دوو پاداشتەكەوە وەك دەبینی، پاداشتی ئەو كەسەی تەوەكولی پێ دەبەستێت ئەوەیە كە خودا بۆ ئەو دەبێت بە "حسيب" و "كافي"، واتە خودا بەسە بۆ ئەو.

هەروەها لەو بەڵگانە: شەهید كە ژیانی خۆی بە خودا بەخشیوە خودا بۆ ی دەگۆڕێت بە ژیانێكی كامڵتر لەلای خۆی لە خانەی نزیكی و رێزلێنانی خۆیدا.

هەروەها: هەر كەسێك شتێك بە خودا ببەخشێت خودا بە شتێكی تر باشتر لەوە بۆی قەرەبوو دەكاتەوە.

هەروەها: ئایەتی ﴿ فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لِى وَلَا تَكْفُرُونِ ۝١٥٢ ﴾ البقرة: ١٥٢

هەروەها: ئەو فەرموودە قودسییەی كە دەفەرموێت ((هەر كەس بستێك لێم نزیك ببێتەوە باڵێك لێی نزیك دەبمەوە))

بەندە بەردەوام لە قازانجدايە لەگەڵ پەروەردگاری چاكتر و باشتر لەوە دروێنە دەكات كە پێشكەشی كردووە، ئەم كەسە كە بە دڵ و ڕۆح و كردارەكانی لە خودا نزيك دەبێتەوە: خودا ژيانێكی بە روودا دەكاتەوە شێوەی ئەو جۆرە ژيانانە نييە كە خەڵكی تيايدا دەژين، بەڵكو ژيانی ئەوانە بەراورد بە ژيانە تايبەتەكەی ئەو وەك ژيانی كۆرپەلەيەك وايە بەراورد بە ژيانی دونيا و چێژ و خۆشييەكانی، بەڵكو مەزنترە لەوە.

ئەمانە نموونەگەلێكن لە بەيانكردنی بەرزی و شكۆی ئەو جۆرە ژيانە، گەر تەنها زانست بەم ژيانە زيندەگييەكی خۆش و باڵا بە مرۆڤ ببەخشێت، ئەی دەبێ زيندەگی ئەو كەسە چۆن بێت كە دڵی بەو ژيانە رەنگی گرتووە و بووە بە حاڵێك لەگەڵێدايە و لێی جيانابێتەوە؟ خودا كۆمەك و يارمەتيدەرە.

ئەو جۆرە ژيانە لەراستيدا لەناو ژيانی دونيادايە و بەشێكە لە نيعمەتەكانی هەر كەس لەدەستی بچێت ئەوا لەدەستدانی ژيانە سروشتييەكەی بۆی لەپێشترە، واتە مردن باشترە تا لەدەستدانی ئەو جۆرە زيندەگييە.

هذه حياة الفتى فإن فقدت ففقده للحياة أليق به

هيچ ژيانێك ژيان نييە جگە لە ژيانی خۆشەويستان، ئەوانەی چاويان بە خۆشەويستەكەيان رۆشن بوويەوە و نەفسيان لەلای سوكنايی بۆ هات و دڵيان ئارام بوويەوە و هۆگری نزيكيی ئەو بوون و بە خۆشەويستی ئەو خۆشييان بينی، لە دڵی مرۆڤدا ئاتاجی و برسێتييەك بوونی هەيە تەنها بە خۆشەويستی خودا و رووكردنە خودا و گەڕانەوە بۆ لای ئەو پڕدەبێتەوە، پەرتبوونی دڵ تەنها بەوانە چارەسەر دەبێت، هەر كەس ئەمە بەدەست نەهێنێت هەموو ژيانی خەم و پەژارە و ئازار و پەشيمانييە، ئەو گەر كەسێكی خاوەن هيممەتی بەرز بێت ئەوا نەفسی لە حەسرەتەكانی دونيا دادەبڕێت، چونكە هيممەتی بە شتی نزم رازی نابێت، خۆ گەر شتێكی نزم و قێزەونی ناو دونيای نزم و بێبايەخ بێت، ئەوا ژيانی لە ژيانی ئاژەڵان نزمترە، چاوی مرۆڤ تەنها بە خۆشەويستی يەكەم روون دەبێتەوە.

نقل فؤدك حيث شئت من الهوى ما الحب إلا للحبيب الأول
كم منزل في الأرض يألفه الفتى وحنينه أبدا لأول منزل

بەڵکو کەسی پشتهەڵکەر و ڕێگر لە چوون بۆ لای خودا بەو خەم و پەژارە و حەسرەتانە خودای موتەعال سزای دەدات﴿ وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ ﴾آل عمران: ٢٨ ڕووی ئاماژە بە ئایەتەکە: خودا–سبحانه– "نزیککەرەوە" و "دوورخەرەوە"یە: با کەسی نزیک لە دوورخستنەوە بترسێت و کەسی پەیوەست بە خودا لە دابڕان بترسێت، خودا–جل جلاله– خاوەن غیرەتە ڕازی نابێت کەسێك ناسیبێتی و شیرینی ناسینەکەی چەشتبێت و دڵی بە خۆشەویستی و هۆگربوون بەو وابەستە بووبێت، و ڕۆحی بە ویستی ڕووی پاکی خودای موتەعالەوە پەیوەست بووبێت لەگەڵ ئەوەشدا لا بەلای شتێکی تردا بکاتەوە.

لە غیرەتەکانی خودا(ﷻ) فاحیشەی حەرام کردووە ئەوەی دەرکەوتووە و ئەوەی شاراوەیە، خودای موتەعال بە توندترین غیرەت غیرە لە بەندەکەی دەکات گەر لا بەلای کەسێك و شتێکی تردا بکاتەوە، گەر شیرینی خۆشەویستی خۆی و چێژی تامەزرۆبوون بۆ لیقا و هۆگری بە مەعریفەیەوە دەرخوارد دا و پاشان–لەگەڵ هەموو ئەمانەدا– لەلای غەیری خودا سوکنایی بۆ هات ئیتر خودا ئەو کەسە لەخۆی دووردەخاتەوە، نزیکی دەگۆڕێت بە دووری، گەیشتنی دەگۆڕێت بە دابڕان، پەنهانی پڕ دەکات لە وەحشەت و دڵی پەرت دەکات و ژیانی ڕوو لە کەمی دەکات و پۆشاکی زەلیلی و سوکایەتی و ڕسوایی بەبەردا دەکات، ئەو کات حاڵی بانگی لێ دەکات–گەر زمانی بانگی لێ نەکات–: ئەمە پاداشتی ئەو کەسەیە شتێکی تر و کەسێکی تری خستە شوێنی دۆست و خۆشەویست و دروستکەر و پەرستراوی خۆی ، ئەو کەسەی کە ژیان و زیندەگی بەوەوە بوو، خەڵکی تری لە جێگەی خودا هەڵبژارد، کەسی تری کرد بە خۆشەویستی خۆی، ڕازی بوو بەوەی جگە لە خودا کەسانی تر ببن بە هۆگر و هاودەمی، کەسی تری کرد بە دۆست و سەرپەرشتیاری خۆی، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا ﴿٥٠﴾ ﴾ الکهف: ٥٠.

کاتێك بە قەمچی دوورخستنەوە و حیجاب لەو دڵە درا، کەسانێك زاڵ کرا بەسەریدا کە بە خراپترین شێوە سزای بدەن، ئەو کات پڕ بوو لە خەم و پەژارە و حوزن و، هۆگربوونی گۆڕا بۆ وەحشەت و عیززەتی بۆ زەلیلی و قەناعەتی بۆ هەڵپە و نزیکیی

بـە دووری و دەركـردن و كۆبوونـەوەی بـە دابـڕان و پـەرتبوون، ئـەوە هەنـدێك لـە سزاكانییەتی، لەو كاتەوە ئازاربەخشەكان تەقە لە دەرگای دەدەن و وەفدی حـوزن و پەژارە رووی لێ دەكەن لەدوای رۆیشتنی وەفدی سروور و خۆشییەكان.

گەر دەتەوێت بزانیت چ بەڵایەكی جیابوونەوە و دابڕانت بەسـەردا هـاتووە شـەوان كـە دەچییە ناو جێگە تەماشا بكە و بزانە دڵت لەو شەوەدا لە كوێ دەمێنێتـەوە و كاتێـك لەناو جێگە دێیە دەرەوە بزانە بۆ كوێ دەفرێت و روو لە كوێ دەكات؟

لا إله إلا الله! چـەندە زیانۆمەنـدە ئـەو كەسـەی كـە خۆشـترین ژیـان و زینـدەگی ئـەم دونیایـەی بـە ژیـانێكی تـاڵ و پـڕ لـە ئـازار و سـزا و مەینـەتی فرۆشـت، ژیـان و زیندەگییەكی لەدەستی خۆیدا كـە پەیوەسـت بـوو بـە ژیـان و زینـدەگی پاشـەڕۆژ و نیعمەتە هەتاهەتاییەكانییەوە، كاتەكەی ئەم دونیا ساتێكە لە رۆژ یا لە ئێوارە یان لـە چێشـتەنگاو، یـان رۆژێـك یـان بەشـێك لـە رۆژێـك، لـەو كاتـە كەمـەدا یـان قـازانجی هەتاهەتایی یان زیانی هەتاهەتایی.

## ۞ مردن قۆناغە نەك كۆتایی

لە ئاستەكانی ژیان: ژیانی رۆحەكانە دوای جیابوونـەوە لـە جەسـتە و رزگـاربوون لـەم بەندیخانـە و تەنگەلانییـە، لـە پشـتی ئـەم ژیانـەوە ژیانێكـە پـڕە لـە چـێژی رۆحـی و تێركردنــی هەســتەكان و چــێژی مــادی و جەســتەیی(رەوح و رەیحــان و راحــەت)، بەراوردی ئەم دونیایە بەو ژیانـە وەك سـكی دایـك و ئـەم ژیـانی دونیایـە وایـە، بـەڵكو نزمتر لەوەش، هەندێ لە عاریفان دەڵێن: با پێشوازیت لە دەرچوون لەم دونیایـە وەك دەرچوون وابێت لە بەندیخانە بۆ لای خۆشەویستان و دۆستان، و كۆبوونەوە لەگەڵیان لە بـاخ و بێسـتانە رازاوەكانـدا، خـودای موتـەعال دەربـارەی ئـەو ژیانـە دەفـەرموێت ﴿ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴿٨٩﴾ ﴾ الواقعة: ٨٨ – ٨٩.

بەسە بۆ خۆشی ئەو ژیانە: هاودەمی دۆستی باڵا(خودای موتـەعال) و جیابوونـەوە لـە هاوەڵی ئازاربەخش و بێزاركەر و زیانبەخش بە مرۆڤ، كەسانێك كە بینینیان ژیان تـاڵ و وێران دەكەن، چجای تێكەڵبوون و هاودەمی كردنیان، رۆیشتن بـۆ لای دۆسـتی بـاڵا كە نیعمەتی خۆی بەسەر پێغەمبەران و صـدیقان و شـوهەدا و صـاڵحاندا دابارانـدووە،

بەڕاستی خۆشترین و باشترین دۆستایەتی لەگەڵ ئەوانەدایە ! لە پەنای پەروەردگارێكی ڕەحمان و ڕەحیمدا.

گەر لە مردندا هیچ خێرێك نەبوایە جگە لە دەرگای چوونە ژوورەوە بۆ ناو ئەو ژیانە و بوون بە پردی پەڕینەوە بۆ ئەو جیهانە ئەوا بەس بوو تاكو مردن وەك هەدیەیەك بۆ باوەڕدار تەماشا بكرێت.

جزى الله عنا الموت خيرا فإنه أبر بنا من بر وألطف

يعجل تخليص النفوس من الأذى ويدني إلى الدار التي هي أشرف

كۆشش لەم تەمەنە كورتە و ماوە كەمەدا، و هەوڵدان و ماندووبوون و هەڵگرتنی كۆڵی قورس و شەكەتی و گرانی: هەموو ئەمانە بۆ ئەم ژیانی دونیایەیە، بەڵام زانست و كاروكردەوەكان: وەسیلەیەكن بۆ ئەو ژیانە باڵای دواڕۆژ، ئەو ژیانە بەئاگاهاتنەوەیە و ژیانی ئێرە وەك خەو وایە، ژیانی ئەوێ سەرچاوەیە و ئێرە تەنها ئاسەوارێكە، ژیانی ئەوێ كۆكەرەوەیە لە نێوان: كۆتاهێنانی ناخۆشییەكان لەگەڵ بەدەستهێنانی مەحبوب و مەقامی هۆگری و ئامادەبوون لە خزمەتی خودادا كە ئیتر هەموو داواكان دێنە جێ و مەحبوب لەدەست ناچێت، دڵنیایی و ئاسودەیی و ئارامی، گەشانەوە و سروور، كە دەبڕینێك بوونی نییە مرۆڤ بتوانێت دەریان ببڕێت، چونكە لە مەملەكەتێكدایە هیچ ئەزموونێكی لەبارەوە نییە، هیچ ئولفەتێكی پێشینەمان لەگەڵ خەڵكی ڕەسەنی ئەو مەملەكەتەدا نییە، نەفس بەهۆی ئولفەت گرتنییەوە بۆ ماوەیەكی زۆر بەم بەندیخانە بەرتەسكە دژوارەوە پێی ناخۆشە لێرە بگوێزێتەوە بۆ وڵاتێكی تر، و وەحشەت رووی تێدەكات كاتێك هەست بە جیابوونەوە دەكات لێی.

بەدەستهێنانی زانست بەو ژیانە: بە هەواڵی خودایی بەدەستمان گەیشتووە، لەسەر دەستی كامڵترین و زاناترین و ئەمینترین خەلقی خودا(ﷺ)، شاهیدەكانی لە دڵی ئەهلی باوەڕدا راست بوونەتەوە، تا لە مەنزیلەی بینیندا دەیبینن و تەماشای دەكەن، بۆیە نەفسیان لە ژیانی ئەم سێبەرە گوزەركەردە هەڵهات، ژیانێك كە وەك خەیاڵێكی پووچ و پووكاو وایە، ژیانێكی فانی و تێكەڵ بە ناخۆشییەكان و جۆرەكانی تاڵاو و مەینەتی، حەزیان بە ژیانەكەی تر لا پەیدا بوو، شەوقیان بۆ مەلەكوت گری سەند و وەجدیان بۆ سروور سەریهەڵدا، دڵ كەوتە ئاهەنگ گێڕان بۆ ئەو جیهانە و تامەزرۆبوون بە نەسیمی دڵڕفێنی و هەڵكردوو لە خانەی نیعمەتە هەمیشەییەكانەوە.

سوێند بە خودا ئەو کەسەی سەفەری ولاَتی عەدل و خۆشگوزەرانی و ئاسایش و سروور بکات لەو ڕێگەدا لەسەر هەموو ناڕەحەتی و پێویستی و سیاساڵییەك ئارام دەگرێت، لە دواکەوتووان جیا دەبێتەوە لە کاتێکدا کە پێویستی زۆری بەوانە، وەلاَمی ئەو بانگە دەداتەوە کە بانگی لێدەکات: "وەرن بۆ سەرفرازی"، نەفس و ڕۆحی خۆی دەبەخشێت لە پێناوی گەیشتندا هەروەك ئەو کەسەی کە بە ئەوپەڕی ڕەزامەندی و لێبوردەییەوە دەبەخشێت، بەیانیان و ئێواران ڕێگە دەبڕێت و لە گەشتەکەی بەردەوام دەبێت، لە کاتی گەیشتن ستایشی ڕۆیشتنەکەی خۆی دەکات، ڕێبوار ڕۆیشتنی بەیانیانی لاپەسەندە.

عند الصباح يحمد القوم السري     وفي الممات يحمد القوم اللقا

سوێند بە خودا ئەوە سەخت و دژوار نییە لەگەڵ ئەم ژیانە کەموکورتەدا کە بەراورد بە خانەی دواڕۆژ تەنها ساتێکە لە ڕۆژ﴿ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍ ﴾ الأحقاف: ٣٥ ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَن لَّمْ يَلْبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةً مِّنَ ٱلنَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ ﴾ یونس: ٤٥ ﴿ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوٓاْ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا ﴿٤٦﴾ ﴾ النازعات: ٤٦ ﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقْسِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُواْ غَيْرَ سَاعَةٍ ﴾ الروم: ٥٥ ﴿ قَٰلَ كَمْ لَبِثْتُمْ فِى ٱلْأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُواْ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ فَسْـَٔلِ ٱلْعَآدِّينَ ﴿١١٣﴾ قَٰلَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا لَّوْ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١١٤﴾ ﴾
المؤمنون: ١١٢ — ١١٤

دەبێ پەشیمانی ئەو "بصيرة"یە چۆن بێت کە هەردوو ژیانەکە و ئەهلی هەردوو ژیانەکەی بینی، دەبێ پەشیمانی ئەو هیممەتە چۆن بێت کە نزم بەسەر بەرز و باڵادا هەڵدەبژێرێت؟ هەموو ئەوانەش تەنها بە کۆمەکی ئەو کەسە دەبێت کە هەموو شتەکانی بەدەستە، شتەکان لەوەوە دەست پێدەکەن و لەودا کۆتاییان پێدێت، ئەو نەفسانەی شەقاوەت زاڵ بوو بەسەریاندا لە سەفەرکردن بۆ ئەو خانەیە داینیشاندن، ئەو دڵانەش بڕیاری چاکە بۆیان پێشکەوتوو بوو بەرەو ئەو خانەیە ڕایکێشان و لەسەر ڕێگە ڕایوەستاندن، و سواربوونی شەپۆلی ترس و هەڕەشەکانی لەسەر ئاسان کردن، بۆیە ئەوانە قۆناغەکانی تەمەنیان لەگەڵ دواکەتووان بەسەر برد و ئەوانی تریش لەگەڵ ڕێبوارانی ڕێگەی خودا، تەپوتۆز ڕێگەی داگیرکرد و ڕێبواران و دواکەوتوانی لێ

بزر بوو، بەم نزیكانە هەموو شتێك ڕۆشن دەبێتـەوە، كاركـەران سـەركەوتن بەدەسـت دەهێنن و ئەهلی پووچی و بەتاڵییش زیانۆمەندی دروێنە دەكەن.

لە تام و چێژەكانی ئەم ژیانە: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((هەر نەفسێك كە دەمرێ و —خێر لەلای خودا دەبینێتەوە— پێیخۆش نییە بگەڕێتەوە بۆ دونیا جگـە لـە شـەهید، ئـەو ئـاوات دەخوازێـت بگەڕێتـەوە بـۆ دونیـا بـەهۆی ئـەو ڕێـز و پلـە و پایـەی خـودا پێیبەخشیوە)) واتە دەیـەوێت جـارێكی تـر لـە دونیـادا شـەهید ببێتـەوە، هەنـدێ لـە عاریفان گوێیان لە كەسێك بوو دەیوت:

إنما العيش في بهيمية الل ذة وهو ما يقوله الفسفي

حكم كأس المنون: أن يتساوى في حساها البليد والألمعي

ويصير الغبي تحت ثرى الأر ض كما صارت تحتها اللوذعي

فسل الأرض عنهما إن أزال الش ك والشبهة السؤال الجلي

ئەویش فەرمووی: خودا بیكوژێت، چەندە سەرپێچی توندە لـە ئـایین و ژیـری! ئەمـە هەناسەی كەسێكە دوژمنی فـیترەت و شـەریعەت و ئـەقڵ و بـاوەڕ و حیكمەتـە، ئـەی هەژار: ئایا لەبـەر ئـەوەی مـردن چاكان و خراپـان و زانایـان و نـەزانان بـە یەكسـانی دروێنە دەكات و هەموویان دەباتە ناو خاكـەوە دەبێـت لـە سەرئەنجامیشـدا یەكسـان بن؟ ئایا كۆمەڵێك كە لە وڵاتێكەوە بۆ وڵاتێكی تر سـەفەر دەكـەن لـە سـەفەرەكەیاندا یەكسان نـین؟ بـەڵام كـە گەیشـتنە بـەرەوە هـەر كەسـە و دەچـێت بـۆ ئـەو شـوێنەی مەبەسـتییەتی و بـۆی ئامـادەكراوە، بـەجۆرێك پێشـوازی لێـدەكرێت كـە جیایـە لـەو پێشوازییەی لە هاوەڵانی ڕێگەكەی كراوە، ئایا هەر كۆمەڵێك خانەیەكیان نییە كە هەر كەسە و لە شوێنێك دادەنرێت كە شایستەی بێت، ئەمەیان بەجۆرێك قبووڵ دەكرێت و ئەوەیان بەپێچەوانەوە، ئایـا كەسـانێك نـەهاتوون بـۆ لای مـەلیكێك كـە یـەكێكیان بـە شتێكەوە هاتبێت مەلیك خۆشیبوێت و سەرئەنجام ڕێزی لێ گرتبێت، ئەو كەسەش بـە خراپەیەكەوە ڕووی لە مەلیك كردبێت كە جێگەی ناخۆشی ئەو بووبێـت مـەلیك سـزای داوە؟ ئایا كاروانێك ڕووی لە شارێك نەكردووە، هەندێكیان لە كۆشـك و تـەلار و بـاخ و بێستانەكانیدا نیشتەجێ بووبن و هەندێكی تریان لەسەر شەقامەكان و ڕێگاوبانەكان و

ناو هاتوچۆی سەگەكان نیشتەجێ بووبن؟ ئایا دوو كەس(دوانەیەك) لەیەك رەحمەوە لەدایك نەبوون و ئەمەیان بەرەو دەسەلاَت و دەوڵەمەندی و ئەوەیان بەرەو دیلی و ئەسارەت و زەحمەتەكانی ژیان؟

ئەو قسەش كە دەڵێت: (سل الأرض عنهما- پرسیار لە زەوی بكە دەربارەی ئەو دوو جۆرە مرۆڤە) ئێمە پرسیارمان لە زەوی كرد و هەواڵی پێداین: كە زەوی جەستە و پێشە و ئێسك و پروسكی ئەوانی لەئامێز گرتووە نەك بێباوەڕی و ئیمانەكەیان، و نەسەب و رەچەڵەك، و خەون و نەفامی، و گوێڕایەڵی و یاخیبوون، و یەقین و شك، و یەكتاپەرستی و شیرك، و ستەم و دادپەروەری، و زانست و نەزانییان، هەواڵی پێداین دەربارەی جەستە پواوەكانیان و ئێسكە رزیو و پارچە پارچەكانیان و وتی: ئەمە ئەو هەواڵەیە لەلای منەوە.

دەربارەی هەواڵی رۆحەكان و ئەو سەرئەنجامەی تووشیان هات: پرسیار لە كتێبەكانی پەروەردگاری جیهانەكان و پێغەمبەرە راستگۆكان و خەلیفە راشیدەكانیان بكەن، پرسیار بكەن لە قورئان، هەواڵی یەقین لەلای قورئانە، پرسیار لەو كەسە بكە قورئانی پیادا رەوانەكرا، ئەو مەزنترین زانا و عاریفە بەو هەواڵانە، پرسیار لە زانست و ئیمان بكەن، ئەو دوانە دوو شاهیدی وەرگیراون، پرسیار لە ژیری و فیترەت بكەن، حەقیقەتی هەواڵەكە لەلای ئەوە﴿ أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الجاثیة: ٢١، مەزنی و بالاَبوون بۆ خودای موتەعال لەو گومان و بۆچوونەی دەیدەنە پاڵی و شایستەی نەفامترین نەفام نییە.

پاشان وتی: سەرنجدەر لەم دەروازەیەوە دوو كەسە: پیاوێك سەیری شتەكان دەكات(ينظر إلى الأشياء) و پیاوێك سەیری ناو شتەكان دەكات(ينظر في الأشياء)، یەكەمیان تیایدا سەرسام و سەرگەردان دەبێت، وێنەكان و شێوەكان و هێڵەكان زەین و هەستی بەتاڵ دەكەنەوە و بیر و دڵی پەرتەوازە دەكەن، سەیركردن بۆ شتەكە بە چاوی هەست كەڵكی نییە و بەری وانەوەرگرتنی لێوە ناچنێتەوە و پوختەی هەڵبژاردنی لێوە فێرنابێت، لەبەر ئەوەی یەكەمجار وانەوەرگرتنی لەدەستچوو، بۆیە دواجار هەڵبژاردنی لەدەستدا.

سەرنجدەری ناو شتەكان: سەیركردنەكەی هانیدەدات لە وێنە و شێوە و ڕووالەتەوە بپەڕێتەوە بۆ حەقیقەت و كرۆك و جەوهەر و ئەوەی بوونی شت لە حیكمەتی باڵا و زانستی كامڵ داوای دەكات، ئەم سەرنجدانە سوودی ئەوەی لێدەبینێت كە ئاستەكانی جیابكاتەوە، و بەسوودەكانی لە زیانبەخشەكان هەڵاوەردە بكات، هەر بەو جۆرە دروست لە نادروست و هەمیشەیی لە كاتی و هەربوو لە فانی و توێكڵ لە كرۆك و وەسیلە لە ئامانج و وەسیلەی شتێك لە وەسیلەی دژ جیابكاتەوە، ئەو كاتە تێدەگات كە دونیا توێكڵە و دواڕۆژ كرۆكە، دونیا شوێنی چاندنە و دواڕۆژ كاتی دروێنە، دونیا ڕێگوزەر و ڕاڕەوە و دواڕۆژیش شوێنی جێگیربوون و مانەوەی هەتاهەتاییە.

كە زانی دونیا ڕێگوزەر و ڕاڕەوە: ئەوا پێویستە لەسەری توێشوو بۆ شوێنی نیشتەجێی هەتاهەتایی ئامادە بكات، ئەو كاتە دەزانێت و تێدەگات بۆ نیشتەجێ بوون و مانەوەی هەتاهەتایی نەهاتۆتە ناو ئەم خانەی دونیایەوە، بەڵكو بۆ گوزەركردن بۆ جیهانێكی تر، ئەو شوێنەش دەبێتە مەنزڵگا و شوێنی هەتاهەتایی، لە هەرچی شەریعەتەكاندایە مرۆڤ بانگكراوە بۆ ئەو جێگەیە، هەر بەو جۆرە لەسەر زمانی هەموو پێغەمبەران بە هەموو ئاماژە و بەڵگەیەكەوە، بەیداخێكی لەسەر ئەو ڕاستییە بۆ هەڵكراوە، و لەو پێناوەدا هەرچی نموونەیە بۆی هێنراوەتەوە، لە سەرەتای دورستبوونی ئاگادار كراوەتەوە، هەر بەو جۆرە هەموو كاروبارەكانی تری، و خواردن و خواردنەوە و زەوی و ئاسمان، بەجۆرێك تەمومژ و شوبهەكانی لێ ڕەواوەتەوە، و بەڵگەی بۆ ڕۆشنكراوەتەوە، و حوججەی بەسەردا سەپێنراوە، و پاساو و بیانووی بڕاوە، و مۆڵەتی تەواوی لە ژیانی دونیادا بۆ بیركردنەوە و بڕیار پێدرا، بۆ كەسێكی ژیری تەندروست و فیترەت سەلیم ڕوون بوویەوە: كۆچكردن و باركردن لەم شوێنە پێویستە، گواستنەوە لێرە حەقێكە و گومانی تێدا نییە، ئەو جێگەیەكی تر چاوەڕوانییەتی، بۆ ئەو شوێنە سەریهەڵداوە و خولقێنراوە و ئامادەكراوە، سەرئەنجامی بۆ ئەو شوێنەیە، گومانی تێدا نییە سەرئەنجام دەگەڕێتەوە بۆ ئەو جێگەیە، ئەم خانەی دونیایە مەنزڵێكی ڕێگوزەرە و ڕاڕەوێكە لێیەوە دەپەڕێتەوە، ئێرە مەنزڵگای هەتاهەتایی نییە.

بە كورتی و پوختی: هەر كەس سەرنجی بوونەوەرەكان بدا و تەنها بە سەیركردنێكی ڕواڵەتی ڕازی نەبێت بەڵگە دەبینێتەوە كە لە پشتی ئەم ژیانەوە ژیانی تر بوونی هەیە

کاملتر و تێروتەواوتر لەم ژیانە، ئەم ژیانە بەراورد بەو ژیانەی تر وەك خەو و ئاگاهی وایە، یان وەك سێبەر و خاوەن سێبەرەکە وایە، سەرجەم ئەو بانگەی بیست کە پەروەردگار و دروستکەر و بەدیهێنەر بانگی بۆ کردووە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٥﴾ ﴾ فاطر: ٥، بە زمانی حالّ بانگ دەکات بەو بانگەی کە پەروەردگاری بە زمانی وتن رایگەیاند ﴿ وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ ٱلرِّيَٰحُ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقْتَدِرًا ﴿٤٥﴾ ﴾ الكهف: ٤٥، هەروەها ﴿ إِنَّمَا مَثَلُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلْأَنْعَٰمُ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلْأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَآ أَنَّهُمْ قَٰدِرُونَ عَلَيْهَآ أَتَىٰهَآ أَمْرُنَا لَيْلًا أَوْ نَهَارًا فَجَعَلْنَٰهَا حَصِيدًا كَأَن لَّمْ تَغْنَ بِٱلْأَمْسِ ۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ یونس: ٢٤، هەروەها ﴿ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌۢ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ ۖ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمًا ۖ وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٌ ۚ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿٢٠﴾ ﴾ الحديد: ٢٠، پاشان هانیدان بۆ پێشبڕکێ بۆ گەیشتنە خانەی دوارۆژ کە تیاچوون رووی تێناکات﴿ سَابِقُوٓا۟ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢١﴾ ﴾ الحديد: ٢١

کەسێکی عاریف گوێی لێبوو کە زەندیقێك لە کاتی مردندا(ئەو کەسە محمد کوڕی زەکەریای رازی پزیشك بوو) ئەم هۆنراوەی دەوتەوە:

لعمري ما أدري وقد أذن البلى    بعاجل ترحالي–إلى أين ترحالي؟
وأين محل الروح بعد خروجه    عن الهيكل المتحلي والجسد البالي؟

عاریفەکە فەرمووی: نەزانینی ئەو لەسەر ئێمە نییە گەر نەزانێت روو لە کوێ دەکات و سەفەر بۆ کوێ دەکات؟ بەلاّم ئێمە دەزانین خۆمان بۆ کوێ دەچین و ئەویش بۆ کوێ دەچێت؟

رۆیشتنی ئەو: بۆ خانەی بەدبەختانە، بۆ شوێنی ئەوانەی ئینکاری قودرەت و حیکمەتی خودایان کرد، ئەو درۆزنانەی کە کەلیمەی پێغەمبەرانیان لە پەروەردگاریانەوە بەسەریاندا سەپا﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلْأَغْلَٰلُ فِىٓ أَعْنَاقِهِمْ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٥﴾ ﴾ الرعد: ٥ ﴿ وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا ضَلَلْنَا فِى ٱلْأَرْضِ

أَءِنَّا لَفِي خَلْقٍ جَدِيدٍۭ بَلْ هُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمْ كَٰفِرُونَ ﴿١٠﴾ ۞ قُلْ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴿١١﴾ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلْمُجْرِمُونَ نَاكِسُوا۟ رُءُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ رَبَّنَآ أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا فَٱرْجِعْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ ﴿١٢﴾ ﴾ السجدة: ١٠ – ١٢.

ڕۆیشتنی ئێمە، موسڵمانان، ئەی ئەوانەی لیقای خودا و کتێبەکان و پێغەمبەرانتان بەڕاستزانی بۆ بەهەشت و ژیانی هەتاهەتایی و مەقامی پڕ لە ڕێز و شکۆیە، بەهەشتێك کە پانتاییەکەی لە ئاسمان و زەوی بەرینترە و لە ئاوسێیەتی پەروەردگارێکدا کە خاوەنی بەزەیی و دەسەڵات و بڕیارە، ئەو کەسەی بوون و بڕیار و قازانج و زیان لەدەستیدایە، ئەو یەکەمینە بە حەق و بوونێکی پێویستە کە بە فیترەت ناسراوە و بە ژێری دانی پیادا نراوە، و هەرچی بوونە بەڵگە و نیشانەن لەسەری و هەرچی دروستکراوەکانە شایەتی یەکتاپەرستی و پەروەردگاریی ئەو دەدەن، فیترەت دان بە بوونیدا دەنێت، بوون و ڕاگریی ئەو-سبحانە- لە هەموو جووڵە و وەستانێکدا دەبینرێت، لەسەر ئەوەی بووە و دەبێت ڕەنگی داوەتەوە، ئەو کەسەی ئاسمان و زەوی دروست کردووە و لە ئاسمانەوە ئاوی دابەزاندووە و باخچە و باخ و بێستانی گەشاوە و جۆراوجۆری پێڕوواوە، هەموو ئاژەڵان بەهۆیەوە بەسەر زەویدا بڵاوەیان کردووە ﴿ أَمَّن جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنْهَٰرًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَٰسِىَ وَجَعَلَ بَيْنَ ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا ﴾ النمل: ٦١، پەروەردگار: ئەو کەسەی کە وەڵامی کەسی ناچار دەداتەوە کاتێك داوای لێدەکات، پەنای کەسی پەنابەر دەدات کاتێك بانگی دەکات، خراپەکان دەڕەوێنێتەوە و تەنگەلانییەکان ناهێڵێت و فراوانیان دەکات، و هەڵەکان ڕاستدەکاتەوە، ئەو کەسەی لە تاریکی وشکانی و دەریادا هیدایەتی دروستکراوەکانی خۆی دەدات، و لەپێش ڕەحمەتییەوە(پێش بارینی باران) با ڕەوانە دەکات، زەوی بە لێزمەی باران زیندوو دەکاتەوە، ئەو کەسەی خەلق دەست پێدەکات و پاشان دەیگێڕێتەوە، ڕۆزی هەموو ئەوانە دەدات کە لە ئاسمان و زەویدان لە دروستکراو و بەندەکانی، ئەو خودایەی کە بیستن و بینین و ژنەوتن لەدەستیدایە، زیندوو لە مردوو دەردەهێنێت، و مردووش لە زیندوو دەردەهێنێت، و کارەکانی بەڕێوە دەبات ﴿ قُلْ مَنۢ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ ﴾ المؤمنون: ٨٨ ﴿ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾ ﴾

الفرقان: ٢، ئەو كەسەی لە هەموو ناخۆشی و بەلاّ و تەنگەلانییەكدا داوای كۆمەك و یارمەتی لێدەكرێت، خودایەك كە هەموو چاكەیەكی لێوە چاوەڕوان دەكرێت، روخسارەكان بۆی ملكەچ دەبن و دەنگەكان بۆی خاشع دەبن، ئاسمان و زەوی و هەموو بوون تەسبیحاتی دەكەن، ئەو كەسەی كە رۆحەكان تەنها بە خۆشەویستی ئەو سوكنایيان بۆ دێت، و دڵەكان بە یادی ئەو ئارام دەبنەوە و ژیرییەكان بە مەعریفەی ئەو پاك دەبنەوە و سەركەوتن بە كۆمەكی ئەو بەدەست دێت، و دڵەكان بە نەسیمی لوتف و نزیكیی ئەو زیندوو دەبنەوە و كارەكان بە مۆڵەتی ئەو روودەدەن و گومڕایان بە هیدایەتی ئەو هیدایەت دەدرێن، راگرتن و راوەستان بەهۆی ئەوەوەیە و تێگەیشتنی هەر كەسێك بەهۆی خوداوەیە، بە رەحمەتی ئەو رزگاربوون لە ناخۆشییەكان بەدەست دێت، شتەكان بەو پارێزراون و دەرگاكان بە ئەو دەكرێنەوە و بە ستایشی ئەو تەواو دەبن، ئاواتەكان بە ئەو بەدیدێن و بە ئەو ئاسان دەبن، بەختەوەری بە گوێڕایەڵی ئەوەوەیە و ژیان بە یاد و خۆشەویستی و مەعریفەتی خوداوەیە، بەهەشت بە بیستنی گوتاری خودا و بینینی ئەوەوەیە، ئەو كەسەی هەموو شتێكی بە رەحمەت و زانست داگیركردووە، و فەزڵ و چاكەی بەسەر دروستكراوەكانیدا داباراندووە، ئەو خودای حەق و پەروەردگاری حەقە.

ئەو مەلیكی حەقە و خاوەنی كەماڵی رەهایە لە هەموو روویەكەوە، لە ناتەواوی و نەنگی لە هەموو روویەكەوە دوور و بەرییە، سەناكەران-با هەمو كاتیان مەدح و سەنای ئەو بێت- ناگەنە مەدح و سەنای ئەو، بەڵكو سەنای ئەو لە هەموو سەناكردنێك مەزنترە، ئەو بەو جۆرەیە كە خۆی سەنای خۆی كردووە، ئەمە چەند قسەیەك بوو دەربارەی ئاوسێی بەهەشت.

خانەی هەتاهەتایش: هیچ نەفسێك جوانی و رازاوەیی بەهەشت نازانێت، بەرینی و نیعمەتەكانی نازانێت، گەشانەوە و رەوح و ئاسوودەییەكەی نازانێت، ئەوەی چاو نەیبینیوە و گوێ نەیبیستووە و بە خەیاڵدا گوزەری نەكردووە لە بەهەشتدا بوونی هەیە، ئەوەی نەفس و چاو چێژی لێ دەبینێت لە بەهەشتدا بوونی هەیە، بەهەشت كۆكەرەوەی هەموو خۆشی و سرورێكە، هەرچی ناخۆشی و بێزارییە لەو خانەیەدا بوونی نییە، رێحان و گوڵوگوڵزاری شەكاوە، و كۆشكی بەرز و ئافرەتی جوان و میوەی پێگەیو.

بۆيــە گەشــتەكەمان ئــەی راســتگۆيان و بــاوەڕداران بــۆ ئــەو خانەيــە بــە مۆڵــەتی پەروەردگار و كۆمەك و چاكەی ئەو.

ڕۆيشتنی درۆزنانيش بۆ ئەو خانەيە كە ئامادەكراوە بـۆ بێبـاوەڕان بـە خـودا و ليقـای خودا و كتێبەكانی و پێغەمبەرانی.

خودای موتەعال هەرگيز يەكتاپەرستان و داواكەرانی رەزامەندی خودا و هەوڵدەران لە گوێڕايــەڵی و خزمــەتی ئــەودا و تێكۆشــەران لــە پێنــاوی خــودادا لەگــەڵ لادەران و كۆششكاران لە نارازيكردنی خودا و بەتاڵكەرەوەی هەوڵ و توانايان لە پێناوی حـەز و ئـارەزوودا و ڕۆچـووان لـەناو ياخيبوونـدا يەكسـان ناكـات و لـە يـەك خانـەدا كۆيـان ناكاتەوە، مەگەر بۆ تێپەڕين و گوزەركردن وەك چۆن لەم دونيايـەدا كـۆی كردنـەوە و لە مەيدانی دوارۆژيشدا كۆيان دەكاتەوە، حاشا لەو گومانە خراپە بە خودا كـە لەگـەڵ حيكمەتی ئەودا پێكنايەتەوە.

لەم پلەيەدا ژيانی شەهيدەكان دەزانرێت و ئەوان لـەلای پـەروەردگاريان ڕۆزييـان پـێ دەدرێت، ئەو ژيانەيان لەم ژيانی دونيايەيان كاملتر و تـەواوترە، بـا جەستەكانيشـيان رزابێـت و گۆشــتەكانيان پوابێــت و بەشــەكانی جەســتەيان لەيــەكتر جيابووبنــەوە و ئێسكەكانيان رزابێت، كارمان بە جەستە نييە، بەڵكو ئەوەی لـە جەسـتەدا نيشـتەجێ بـووە، خـودای موتــەعال دەفــەرموێت ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾ آل عمــــران: ١٦٩﴿ وَلَا تَقُولُواْ لِمَن يُقْتَلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتٌۢ ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ وَلَٰكِن لَّا تَشْعُرُونَ ﴿١٥٤﴾ ﴾ البقرة: ١٥٤، گەر شەهيدەكان بە شوێنكەوتنی پێغەمبـەران و لەسەر دەستی پێغەمبەران گەيشتبنە ئەو ژيانـە باڵايـە، دەبـێ گومانـت چـی بێـت بـە ژيانی پێغەمبەران لە جيهانی بەرزەخدا؟ جوانی فەرمووە كە دەڵێت:

فالعيش نوم والمنية يقظة والمرء بينهما خيال ساري

پێغەمبەران و شوهەدا و صديقان لەم دونيايەدا كـاملترين و تـەواوترين ژيانيـان هەيـە، بەپێی ژيـانی بەندەكـە لـەم جيهانـەدا شـەوق و تامـەزرۆبوون و هـەوڵ و كۆششـی بـۆ بەدەستهێنانی ئەو ژيانەی تر بۆ دروست دەبێت، خودا كۆمەك و يارمەتيدەرە.

## تێر و تەواوی و پاداشتی کامڵ لەوێیە

پاشان لە ئاستەکانی ژیان:

ژیانی هەمیشەیی و هەتاهەتاییە لە خانەی ژیان و زیندەگی کامڵدا پاش پێچانەوەی ئەم جیهانە و رۆیشتنی دونیا و ئەهلی دونیا، ئەوەش ئەو ژیانەیە کە خۆیەکلاکەرەوان خۆیان بۆ یەکلاکردۆتەوە و پێشبڕکێکەران پێشبڕکێی بۆ دەکەن و کێبەرکێکەران کێبەرکێی لەسەر دەکەن، ئەو ژیانەیە کە قسەمان لەبارەوە کردووە، و کتێبە ئاسمانییەکان و تەواوی پێغەمبەران بانگیان بۆ کردووە، ئەو ژیانەیە کە ئەوانەی خۆیان بۆ ئامادە نەکردبوو دەڵێن ﴿كَلَّآ إِذَا دُكَّتِ ٱلْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا ﴿٢١﴾ وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا ﴿٢٢﴾ وَجِاْىٓءَ يَوْمَئِذٍۭ بِجَهَنَّمَ ۚ يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكْرَىٰ ﴿٢٣﴾ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِى قَدَّمْتُ لِحَيَاتِى ﴿٢٤﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٢٥﴾ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٢٦﴾﴾ الفجـر: ٢١ – ٢٦، ئەو ژیانەیە کە خودای موتەعال دەربارەی دەفەرموێت ﴿وَمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ ۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ لَهِىَ ٱلْحَيَوَانُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٦٤﴾﴾ العنكبوت: ٦٤.

ژیانی پێش ئەو ژیانە بەراورد پێی وەك تەنها رۆژێکە، هەموو ئەوەی پێشتر باسمان کردووە –لە وەسفی رۆیشتن بەرەو خودا و مەنزیلەکانی و ئەحواڵی گەشتیاران و بەندایەتی دەرەوە و ناوەوەیان– وەسیلەن بۆ ئەو ژیانە، ژیانی دونیا کە ژیانێکی نزمە بەراورد بەو ژیانە وەك پێغەمبەر دەفەرموێت ((دونیا بەراورد بە دواڕۆژ وەك ئەوە وایە یەکێك لە ئێوە پەنجەی خستبێتە ناو دەریایەك، با تەماشا بکات چی بە پەنجەکانییەوە دێت))

وەك وتراوە: ژیانی دواڕۆژ هەناسەی دا و یەکێك لە هەناسەکانی ژیانی دونیایە، ئەهلی سەعادەت هەناسە و نەسیمی نیعمەتەکانی ئەو جیهانەیان بەرکەوت و لەسەر ئەو هەناسەیە کاردەکەن، بەڵام ئەهلی شەقاوەت هەناسەی سزا و ئازاری ئەو ژیانەیان بەرکەوت و لەسەر ئەو نەفەسە کار دەکەن.

گەر ژیانی ئەهلی ئیمان و کرداری چاکە لەم خانەی دونیایەدا ژیانێکی خۆش و چاك و پاك بێت، ئەی دەبێت گومانت بە ژیانی بەرزەخیان چۆن بێت لە کاتێکدا لە بەندیخانەی دونیا و تەنگەلانییەکەی رزگاریان بووە؟ ئەی دەبێ گومانت بە ژیانیان لە خانەی هەتاهەتاییدا چۆن بێت کە ژیانێکی کامڵ و نەبڕاوەیە؟ ئەوان بەیانیان و ئێواران رووی پاکی خودای موتەعال دەبینن و گوێ لە گوتار و کەلامی دەگرن؟

گەر بڵێی: هۆی ئەوە چییە نەفس لە داوای ئاوا ژیانێك كە هیچ مەترسییەكی تێدا نییە دوادەكەوێت، یان بۆ لە ئاوا ژیانێك زوهدی هەیە؟ ئەی هـۆی چـییە نـەفس حـەزی لـە ژیانێكی كەموكورتە كە دەڵێی خەیاڵی كەسێكی خـەوتووە؟ ئایا هۆیەكـەی فەسـادی بینش و هەست و نەستییەتی؟ یان ئەو ژیانەی تر بـەدرۆ دەزانێـت؟ یـان ئافـەتێك لـە ژێرییدایە و تووشی كوێربوونی كـردووە؟ یـان هەڵبـژاردنی بینراوێكـە بـە چـاو بەسـەر نادیار و زانراوێكە بە ئیمان؟

وتراوە: هەموو ئەو هۆیانە كۆبوونەتەوە و كەسەكەیان بەو دەردە بردووە.

بـەهێزترین هـۆ لـەوەدا: لاوازی ئیمانـە، ئیمـان رۆحـی كاروكردەوەكانـە و هانـدەری ئەنجامدانیانە و فەرمانكەرە بە چاكترینیان و نەهیكەرە لە خراپترینیان، ئیمان بـەپێی بەهێزیی خۆی فەرمان و نـەهیكردن لـە كەسـەكە دەكات، هـەر بـەو جـۆرە جێبـەجێ كردنی فەرمانـەكان و دەستكێشـانەوە لـە خراپـەكان، خـودای موتـەعال دەفـەرمووێت ﴿ قُلْ بِئْسَمَا يَأْمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩٣﴾ ﴾ البقرة: ٩٣.

بە كورتی و بە پوختی: گەر ئیمان بەهێز بـوو شـەوق و تامـەزرۆبوون بـۆ ئـەو جیهانـە بـەهێز دەبێـت و خاوەنەكـەی بەتونـدی دەكەوێتـە داوا و بیركردنـەوە لـە ژیـانی ئـەو جیهانە.

هۆی دووەم: چۆكدادانی بێئاگایی لەسەر دڵ، بێئاگـایی بریتییـە لـە خـەوی دڵ، بۆیـە زۆر كەس لـە هەسـتدا بـەئاگان و لـە واقیعـدا نوسـتوون، وادادەنێیـت بـەئاگان، بـەڵام پاڵكەوتوون (وتحسبهم أيقاظا وهم رقـود)، دژی حـاڵی ئـەو كەسـەی كـە دڵـی بەئاگایـە، هـەردەم ژیـان و زینـدەگی تیایـدا بـەهێز دەبێـت دڵـی ناخـەوێت كاتێـك جەسـتەی دەخەوێت، پێغەمبەرمان خاوەنی كەماڵی ئەو جۆرە ژیان و زیندەگییە بووە، هەر بـەو جۆرە ئەوانـەی خـودا دڵـی زینـدوو كردنـەوە و لەسـەر بەصـیرەت شـوێنی ریسـالەتی پێغەمبەر(ﷺ) كەوتن.

بێئاگایی و ئاگاهی لە هەست و ئـەقڵ و دڵـدا روودەدەن، بـەئاگای دڵ و بێئاگـای وەك بەئاگا و بێئاگای جەستە وایە، وەك چۆن بەئاگای هەست دوو جـۆرە هـەر بـەو جـۆرە بەئاگای دڵ دوو جۆرە.

جۆری یەكەمیان لە بەئاگایی هەست: خاوەنەكەی دەچێتە ناو كاروبارە بەرهەستەكانەوە، لەناویان رۆدەچێت بە هەوڵ و زیرەكی خۆی و پیلان و باشی تەگبیری.

جۆری دووەم: روو لە نەفس و دڵ و زاتی خۆی دەكات و هەوڵی بەدەستهێنانی كەماڵیان دەدات، كارە بەرز و بڵندەكان و نزمەكان دەبینێت، لەنێوان دوو خێردا باشترینیان هەڵدەبژێرێت، لەنێوان دوو شەڕدا سوكترینیان دیاری دەكات لە ترسی بەدەستهێنانی بەهێزترینیان، خۆی بە ئەخلاقی بەرز و بڵند دەڕازێنێتەوە، دەرەوەی جوان و ناوەوەی جوانتر و نهێنی چاكتر و پاكتر لە ئاشكرای، خاوەن پلە و پایە بەرزەكان پێشبڕكێ بۆ بەدەستهێنانی ئەو پلە باڵایە لە ئاگاهی دەكەن وەك چۆن ئەهلی دونیا ململانێ لەسەر دینار و درهەم دەكەن، بەو ئاگاهییە كەسەكە ئامادەباشی وەردەگرێت بۆ دوو جۆری تر لە ئاگاهی:

جۆری یەكەم: ئاگاهییەك زیندووی دەكاتەوە و هانی دەدات بۆ وەرگرتنی بەشێك لە نووری ئەو ژیانە هەمیشەییە -كە هیچ ترس و هەڕەشەیەكی تێدا نییە- لەم ژیانە كۆتا و فانییەوە كە بەها و نرخێكی ئەوتۆی نییە.

گەر دەڵێی: نموونەم بۆ بهێنەوە، چۆن ژیانی هەمیشەیی لەم ژیانە فانییەوە وەردەگیرێت؟ چۆن ئەوە روودەدات؟ من تێیناگەم.

دەڵێم: ئەمەش دیسان لە خەوتنی دڵەوەیە، بەڵكو بەهۆی مردنی دڵەوەیە، ژیانی هەمیشەیی هەر دەبێت لەم ژیانی دونیاوە بەدەستبهێنرێت و وەربگیرێت، تۆ چراكەت لە چرایەكی ترەوە هەڵدەكەیت كە خەریكە دەكوژێتەوە، چرای دووەم دەگرێت و نوور و رووناكی بە خۆی و دەوروبەری دەبەخشێت و چرای یەكەم دەكوژێتەوە، ئەو كەسەی ژیانی هەمیشەیی لە ژیانی پچڕ پچڕ وەردەگرێت لە خانەیەكی پچڕاوەوە دەگوێزێتەوە بۆ خانەیەكی هەمیشەیی، مردنیش لەنێوان ئەو دوو خانەدایە، مردن دەراوێكە(دەرچەیەكە) دەبێت پیایدا گوزەر بكەیت بۆ ئەو خانەیە، دەرگایەكە دەبێت لێوەی بچییە ژوورەوە، دوو ژینە لە دوو خانەدا كە مردن لە نێوانیاندایە، وەك چۆن نووری ئەو خانەیە لە نووری ئەم خانەیە وەرگیراوە هەر بەو جۆرە هەموو ژیانەكەی لەم ژیانە وەرگیراوە، بە ئەندازەی نووری ئیمان لەم ژیانەدا نووری كەسەكە لەو خانەی دواڕۆژەدا بوونی هەیە، بە ئەندازەی ژیانی ئێرە ژیانی ئەوێی بەرجەستە دەبێت.

بەڵێ ئەم نوور و ژیانەیە ئەو نوور و ژیانەی لێوەرگیراوە، لێی نابڕێت، بەڵكو لە بەرزەخیش بۆ كەسەكە دەدرەوشێتەوە، هەر بەو جۆرە لە رۆژی قیامەتدا، لەسەر

صراط، لێی جیانابێتەوە تا خانەی پڕ لە زیندەگی، نووری خۆر دەکوژێتەوە و ئەو نوورە خامۆشبوونی بۆ نییە، ژیانی بەرهەست کۆتایی پێدێت و ئەو ژیانە هەر دەمێنێتەوە، ئەمە یەکێکە لە دوو جۆرەکەی ئاگاهی دڵ.

جۆری دووەم: ئاگاهییەك زیندەگی بەدوای خۆیدا دەهێنێت کە دەربڕین پەی پێنابات و خەیاڵی مرۆڤ نایگاتێ و هەرگیز وشە لەگەڵ ماناکەی پڕاوپڕ نابێت، ئەوەی دەتوانرێت ئامـاژەی پێبکرێـت لەسـەری بریتییـە لـە ژیـانی کەسـی خۆشەویسـت لەگـەڵ خۆشەویستەکەی، کـە راوەسـتانی دڵ و رۆح و ژیـانی بـەو خۆشەویستەوەیە و تـەنها چـاوترووکانێکیش لێـی بێنیـاز نابێـت، رۆشـنایی چـاو و ئـارامی دڵ و سـوکنایی رۆح و زیندەگی و ژیانی بە خۆشەویستەکەیەوە، خۆشەویستەکەی لە بیستن و بینین و هێز و توانای بۆ ئەو پێویستترە، سزای حیجـابی نێوانیـان مـەزنترین ئـازارە و هـیچ ئـازارێکی ناگاتێ، وەك چۆن نیعمەتی دڵ و رۆحـی بـە لادانـی ئـەو حیجابـە مـەزنترە لـە نیعمـەتی خـواردن و خواردنـەوە و چـێژوەرگرتن لـە حورلعـەین، ئـازاری حیجـاب بـەو جۆرەیـە، گـەورەترە لـە ئـازار و سـزای دۆزەخ، بۆیـە خـودای موتـەعال ئـەو دوو نیعمەتـەی بـۆ دۆستانی خۆی لەم ئایەتە پـیرۆزەدا کۆکردۆتـەوە ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ﴾یونس: ٢٦، "الحسنی" بریتییە لە بەهەشت، "الزیادە" بریتییە لە بینـینی رووی پـاکی خـودای موتـەعال لـە بەهەشـتی عەدنـدا، هـەر بـەو جـۆرە هـەردوو سـزاکەی لـەم ئایەتـەدا کۆکردۆتەوە بۆ دوژمنانی خۆی﴿ كَلَّا إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا الْجَحِيمِ ﴿١٦﴾ ﴾ المطففین: ١٥ – ١٦.

مەبەسـتەکە: بێئاگـایی بریتییـە لـە خـەوتنی دڵ لـە داوای ئـەو ژیانـە، ئـەو بێئاگاییـە حیجابێکـە لەسـەر دڵ، گـەر بـە یـادی خـودا ئـەو حیجابـە رەوایـەوە، ئەگـەر نـە، چڕدەبێتەوە تا ژیانی کەسەکە دەبێتە بەتاڵە و یاری و خەریکبوون بـە شـتێکەوە کـە سوودی نییە، گەر هەوڵی لادانی ئەو حیجابەی دا، ئەگەر نە، چڕ دەبێتەوە تـا دەبێـت بە حیجابی یاخیبوون و گوناهە بچووکەکان و لەخودا دووری دەخەنـەوە، گـەر هـەوڵی لادانی دا، ئەگەر نە، چڕ دەبێتەوە تا دەبێت بە حیجابی گوناهە گەورەکان و خەشم و تووڕەیی خودا و نەفرەت بەدوای خۆیدا دەهێنێت، گەر هـەوڵی لادانـی دا، ئەگـەر نـە، دەبێت بە حیجابی بیدعەی قەولی لە بـاوەڕدا، کـە درۆ بـەدەم خـودا و پێغەمبـەرەوە

لەخۆ دەگرێت، هەروەها بەدرۆزانینی ئەو حەقەی پێغەمبەر هێناویەتی، گەر هەولّی لادانی دا، ئەگەر نە، چڕ دەبێتەوە تا دەبێتە حیجابی شك و بەدرۆزانین كە پێنج بنەماكانی ئیمان عەیبدار دەكات، ئەوانەش: باوەڕ بە خودا و فریشتە و كتێبەكان و پێغەمبەران و لیقای خودان، بەهۆی چڕی و تاریكی و ڕەشی ئەو حیجابە حەقیقەتی ئیمان نابینێت، بۆیە شەیتانی بەسەردا زالّ دەبێت، بەلّێنی پێدەدات و ئاواتی بۆ دەخولقێنێت، نەفسی فەرمانكەریش بە خراپە ئارەزوو دەكات و حەزی بۆ نیشان دەدات، دەسەلاّتی سروشتی نەفس زالّ دەبێت بەسەر دەسەلاّتی ئیماندا، بەدیلی دەگرێت و لە بەندیخانەی دەنێت، ئەگەر نەلّێین دەیكوژێت، ئەو كاتە دەست بەسەر مەملەكەتدا دەگرێت و سەربازی شەهواتی بۆ دەخاتە گەڕ، دەكەوێتە ناو حەزەكانییەوە، و دەرگای بەئاگاهاتنی لیّ دادەخرێت و دەرگاوانێكی بێئاگایی لەسەر دادەنێت و دەلّێت: بە هیچ جۆرێك نەهێلّیت ئاگاهی لەم دەرگایەوە بێتە ژوورەوە، ئارەزوو دەكات بە دەرگاوانی خۆی و پێی دەلّێت: مەهێلّە هیچ كەس بگاتە لام لە ڕێگەی تۆوە نەبێت و لەگەلّ تۆدا نەبێت، ئەمری ئەم مەملەكەتە لە دەستی تۆ و دەرگاوانەكەی تردایە، ئەی هەردوو دەرگاوان با هەریەك لە ئێوە سەنگەری خۆی بزانێت و چۆلّی نەكات، گەر چۆلّی بكەن ئەمری مەملەكەتەكەتان تێكدەچێت و دەولّەتەكە دەكەوێتە دەست كەسانێكی تر، ئەو كاتە سولّتانی ئیمان بە خراپترین سزا و ڕسواكردن سزامان دەدات و هەرگیز بەم شار و مەملەكەتە دلّخۆش نابین.

"لا إله إلا الله" گەر ئەو سەربازانە لەسەر دلّ كۆببنەوە، لەگەلّ نەرمی ئیمان و كەمی كۆمەككار و پشتهەلّكردن لە یادی ڕەحمان و چوونە ناو سلكی ڕۆلّەی زەمانە و ئاواتی دووروودرێژی تێكدەری مرۆڤ-بەوەی ژیانی گوزەركردەی ئامادەی بەسەر ژیانی بەلّێن پێدراوی هەتاهەتاییدا هەلّبژارد- خودا كۆمەككارە و تەوەكول لەسەر ئەوە.

لەبەرئەوەی هەموو گیاندارێك خاوەن هەناسەیە و هەناسەش مانای ژیان دەگەیەنێت و نیشانەكەشی پێنجە هەناسەیە:

هەناسەی ترس: سەرچاوەكەی بریتییە لە هەستكردن بە هەڕەشەكانی خودا بۆ ئەوانەی ژیانی دونیایان بەسەر ژیانی دواڕۆژدا، و مەخلوق بەسەر خالیقدا، و ئارەزوو بەسەر هیدایەتدا، و سەرلێشێوان بەسەر ڕێنومایيدا هەلّبژارد.

هەناسەی رجا: سەرچاوەکەی بریتییە لە هەستکردن بە وەعدی خودا و گومانی باش بە پەروەردگار و ئەوەی خودا ئامادەی کردووە بۆ ئەوانەی خودا و پێغەمبەر و خانەی دوارۆژیان هەڵبژارد، ئەوانەی هیدایەتیان بەسەر ئارەزوودا سەپاند و وەحییان بەسەر بۆچوون و سوننەت بەسەر بیدعە و ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی لەسەری بوون بەسەر عادەت و نەریتی خەڵکیدا هەڵبژارد.

هەناسەی خۆشەویستی: سەرچاوەکەی بریتییە لە خوێندنەوە و تێگەیشتن لە ناو و سیفەتە جوانەکانی خودای موتەعال، و موشاهەدەی نیعمەت و بەهرە خوداییەکان.

کاتێك بیر لە گوناهەکانی دەکاتەوە هەناسەیە بە ترس دەدات، کاتێك بیر لە رەحمەتی پەروەردگار و بەرینی لێخۆشبوون و لێبووردنی دەکاتەوە بە رجا هەناسە دەدات، کاتێك بیر لە جەلال و جەمال و کەماڵی خودا و نیعمەتەکان و بەهرەکانی دەکاتەوە بە خۆشەویستی هەناسەیەك دەدات، هەناسەی سەرچاوەگرتوو لە خوێندنەوە و تێگەیشتن لە ناو و سیفەتەکانی خودای موتەعال باڵاترین و پیرۆزترین هەناسەیە، هەناسەی کەسی تامەزرۆ و خۆشەویستی خودا لە کوێ و هەناسەی ئەو کەسە لە کوێ کە ترس و رجای هەیە؟ بەڵام ئەم هەناسەیەی بۆ دروست نابێت لە رێگەی ئەو دوو هەناسەی پێشترەوە نەبێت(هەناسەی ترس و هەناسەی رجا)، یەکێکیان بەری وازهێنانە لە سەرپێچییەکان و ئەویتریان بەری ئەنجامدانی گوێڕایەڵییەکانە، لەم دوو هەناسەوە دەگاتە هەناسەی سێیەم(هەناسەی خۆشەویستی)

هەناسەی چوارەم هەناسەی ناچارییە: ئەوەش بەهۆی دابڕانی لە هیوا بە غەیری خودا، ئەو کاتە-بە دڵ و رۆح و نەفس و جەستەی- ناچاردەبێت بە تەواوی روو لە پەروەردگاری بکات، بەجۆرێك هەست دەکات هەموو تاڵەموویەکی لە ئاتاجی و پێویستییەکی تەواودایە بۆ پەروەردگار و مەعبوودی خۆی، ئەم هەناسەیە هەناسەی کەسێکی ناچارە بۆ لای کەسێك کە تەنها چاوتروکانێك بێنیاز نییە لێی، پێویستی ئەو بەو کەسە لەو رووەوە کە پەروەردگار و دروستکەر و بەدیهێنەر و سەرخەر و پارێزەر و کۆمەککار و رۆزیدەر و رێنوماییکار و عافییەتبەخش و هەڵسووڕێنەری بەرژەوەندییەکانییەتی، هەروەها لەڕووی ئەوەی کە ئەو کەسە: پەرستراو و ئیلاه و خۆشەویستێکە کە ژیان کامڵ نابێت و سوودێکی تێدا نییە تا ئەو کەسە لەلای لە

هەرچی شتی تر و کەسی ترە خۆشەویستتر نەبێت و شەوق و تامەزرۆیی بۆ لای لە هەرچی شتی تر و کەسی ترە زیاتر بێت.

کە ئەم هەناسانە بەرزبوونەوە نزیکیی لە خوداوە بەدەست دەهێنێت و هۆگری دەبێت و بەو دڵخۆش دەبێت و بەو پۆشاکەی پەروەردگاری کردوویەتی بە بەر دڵ و ڕۆحیدا دڵخۆش دەبێت، کە هەموو دونیا بە کەمێکی زۆر کەمی ئەو خۆشییەدا ناگات، ئەو کاتە هەناسەیەکی تر دەدات پێی دەوترێت: هەناسەی فەخرکردن کە بەهۆیەوە دەروو و ئارامی و ئاسوودەیی و دڵاوایی بەدەست دەهێنێت لە هەندێ ڕووەوە لە هەناسەی ئەو کەسە دەچێت کە پەتێك لە گەردنی توندکراوە تاکو بخنکێت بمرێت، بەڵام لە هۆی مردنەکە ڕزگاری دەبێت.

گەر دەڵێی بەندە چییەتی لە فەخرکردن؟ و بەندایەتی و فەخرکردن چۆن کۆدەبنەوە؟

دەڵێین: مەبەستمان ئەوە نییە کاتێك بەندە فەخر بەوەوە دەکات خۆی بەسەر هاوڕەگەزەکانی خۆیدا با بدات، بەڵکو ئەوە فەرەح و سرورێکە کە ناتوانێت لە خۆی دوور بخاتەوە بەهۆی ئەوەی پەروەردگاری بە ڕوویدا واڵای کردووە و پێی بەخشیوە و تایبەتی کردووە بە ئەو، یەکەمین شتێك بەندە پێی دڵخۆش دەبێت بریتییە لە فەزڵی پەروەردگاری لەسەری، خودای موتەعال پێیخۆشە ئاسەواری نیعمەتەکانی لەسەر بەندەکەی ببینێت، پێیخۆشە بەندەکانی بە نیعمەتەکانی دڵخۆش بن، چونکە ئەو بینینی ئاسەوار و دڵخۆشبوونە بەشێکە لە شوکری نیعمەتەکە، هەر کەس بە نیعمەتەکانی خودا دڵخۆش نەبێت لە شوکرکەران سەرژمێر ناکرێت، ئەوە بریتییە لە شانازی کردن بەوەی نیعمەتی پەروەردگارە لەسەر بەندەکەی، نەك شانازی کردن بەوەی لە بەندەوەیە، ئەمەیان نەرێی بەندایەتی دەکات، نەك ئەو شانازی کردنە.

لێرەدا نهێنێکی ورد هەیە: ئەم هەناسەیە فەخر بەسەر هەناسەکانی تردا دەکات کە بەو جۆرە نین، وەك چۆن ژیان شانازی بەسەر مردندا دەکات، زانست شانازی بەسەر نەزانیدا دەکات و بیستن بەسەر کەڕیدا و بینین بەسەر کوێریدا، بۆیە هەناسەیەك شانازی بەسەر هەناسەیەکدا دەکات نەك مرۆڤ بەسەر مرۆڤەکانی تردا، خودا زاناترە.

## (٦٢) (منزلة المعرفة)

# مەنزیلەی مەعریفە

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی مەعریفەیە.

خودای موتەعال دەفەرمویێت ﴿وَإِذَا سَمِعُوا مَا أُنزِلَ إِلَى الرَّسُولِ تَرَىٰ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا مِنَ الْحَقِّ﴾المائدة: ٨٣

عاریفان قسەیان لەسەر مەعریفە كردووە بە ئاسەوار و بەڵگەكانی، هەندێكیان دەڵێن: لە نیشانەكانی مەعریفە بە خودا بەدەستهێنانی هەیبەتە لە خودا، هەر كەس مەعریفەی بە خودا زیاد بكات هەیبەتی بە خودا زیاد دەكات.

هەروەها دەفەرموون: مەعریفە سوكنایی دەهێنێت، هەر كەس مەعریفەی زیاد بكات سوكنایی زیاد دەكات.

هەندێ لە هاوەڵانمان پێیان وتم: نیشانەی ئەو مەعریفەیە كامەیە كە ئێوە ئاماژەی بۆ دەكەن؟ پێم وت: هۆگریی دڵ بە خوداوە، پێی وتم: نیشانەكەی ئەوەیە هەست بكات دڵی نزیكە لە خوداوە و خوداش بە نزیك لە خۆی دەبینێتەوە.

ئەحمەدی كوڕی عاصم دەڵێت: هەر كەس بە خودا عاریفتر بێت زیاتر لێی دەترسێت، ئەوەی بەڵگەیە لەسەر ئەمە ئەم ئایەتە پیرۆزەیە ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾ فاطر: ٢٨.

كەسێكی تر دەڵێت: هەر كەس خودای موتەعال بناسێت بەرینیی ئەم دونیایەی لێ بەرتەسك دەبێتەوە.

كەسێكی تر دەڵێت: هەر كەس خودا بناسێت تەنگەلانییەكانی بۆی فراوان دەبن.

ئەو دوو قسەیە دژایەتییان لەگەڵ یەكتردا نییە، قسەی یەكەمیان ئەوە دەگەیەنێت كە هەرچی شوێن و جێگەیەك یارمەتی نەدات و كۆمەكی نەبێت بۆ داوا و ئامانجەكەی لەلای تەنگەلانە، قسەی دووەمیش ئەوەی لە خەڵكی بەرتەسك بووەتەوە بۆ ئەو بەرین دەبێت، چونكە ئەو لەناو ئەو شتەدا نییە و بەدڵی نەچووەتە ناو ئەو شتەوە، واتە دڵی لەناویدا بەند نەكراوە.

ئەوەی یەكەمیان لە سەرەتای مەعریفەدایە، و ئەوەی دووەمیان لە كۆتاییەكەیدایە كە بەندە دەیگاتیّ.

یەكێكی تر دەڵێت: هەر كەس خودا بناسێت زیندەگی بۆ پاڵفتە دەبێت، و ژیانی بۆ خۆش دەبێت و هەرچی شتە هەیبەتی لیّ دەكات و ترسی دروستكراوەكانی لەسەر نامێنێت و هۆگریی بە خوداوە پەیدا دەكات.

خەڵكانی تریش دەڵێن: هەر كەس خودا بناسێت چاوی بە خودا و بە مردن رۆشن دەبێتەوە، و هەرچی چاوە بەو رۆشن دەبێتەوە، هەر كەس خودا نەناسێت دڵی بە حەسرەتی دونیا پارچە پارچە دەبێت، هەر كەس خودا بناسێت رەغبەتی بۆ غەیری خودا نامێنێت، هەر كەس بانگەشەی ناسینی خودا بكات و رەغبەتی بۆ لای غەیری خودا بێت، ئەوا رەغبەتەكەی خودا ناسینەكەی بەدرۆ دەخاتەوە، هەر كەس خودا بناسێت ئەوا بە ئەندازەی ناسینەكەی خۆشیدەوێت، و لێی دەترسێت و رجای پێیەتی و تەوەكولی پێدەبەستێت و بۆ لای دەگەڕێتەوە، و زمانی بە یادی ئەو پاراو دەبێت و تامەزرۆ دەبێت بۆ لیقای و حەیای لیّ دەكات و بە مەزن و شكۆمەند رایدەگرێت.

لە نیشانەكانی مەعریفە: ئەوەیە كە شاهیدێكت بۆ دەربكەوێت، و هەموو شایەتەكانی ترت لەلا بزر بێت و پەیوەستبوونەكان هەڵبوەشێنەوە و كۆسپەكان تەخت بن و لەبەردەم پەروەردگاردا دابنیشی، و خۆت ئامادە بكەی و لە ئامادەباشیدا بیت بۆ لیقای، وەك ئەو كەسەی كۆڵ و بارگە و بنەی كۆكردۆتەوە و لەسەری دانیشتووە و پاڵی پێوە داوە و چاوەڕوانی دەستپێكردنی سەفەرەكەیەتی، وەك ئەو موسافیرەی لە مەنزڵە و پاڵی داوەتەوە بەلای كۆڵەكەیدا و ئامادەی سەفەرە.

وترا بە جونەید: خەڵكانێك بانگەشەی مەعریفە دەكەن و دەڵێن: ئەوان بە وازهێنان لە كار و جووڵە لە دەروازەی چاكە و تەقواوە بە خودا دەگەن؟ جونەید فەرمووی: ئەوە قسەی ئەوانەیە كە وازیان هێناوە لە ئەنجامدانی كاروكردەوەكان، ئەوە لەلای من كارێكی زۆر خراپی گەورەیە، ئەوەی دزی و زینا دەكات حاڵی باشترە لەوانەی ئەو قسانە دەكەن، عاریفان بە خودا كاروكردەوەكانیان لە خوداوە وەرگرتووە، لەناو ئەو كاروكردەوانەوە بۆ لای خودا دەگەڕێنەوە، گەر هەزار ساڵ بژیم بە ئەندازەی گەردیلەیەك لە كاروكردەوەكان كەم ناكەمەوە مەگەر رێگەم پێنەدرێت.

لە نیشانەكانی عاریف: نە داوا دەكات نە ململانێ و نە لۆمەكردن، فەزڵی خۆی لەسەر هیچ كەس هەست پێ ناكات، حەقی خۆی لەسەر هیچ كەسێك نابینێت.

هەروەها لە نیشانەكانی: ئەسەف بۆ لەدەستچوو ناخوات و بە هاتوو دڵخۆش نابێت، ئەو بە چاوی فەنا و تیاچوون تەماشای شتەكان دەكات، چونكە لە حەقیقەتدا وەك سێبەر و خەیاڵ وان، جونەید دەفەرموێت: عاریف نابێت بە عاریف تا وەك زەوییەكی تەخت چاك و خراپ پێی پیانەنێن، یان وەك هەور كە سێبەری بەسەر هەموو شتێكەوەیە، یاخود بارانێك كە ئاو بە هەموو ئەوانە دەدات پێیانخۆشە و پێیان ناخۆشە، یەحیای كوڕی مەعاز دەفەرموێت: عاریف لە دونیا دەردەچێت لە دوو شت تێرنەبووە: گریان بەسەر خۆیدا، و سەنای پەروەردگاری. ئەمە جوانترین قسەیەكە وترابێت، بەڵگەی مەعریفەی ئەو كەسەیە بە نەفسی خۆی و نەنگی و ئافەتەكانی، هەروەها بەڵگەی مەعریفەیەتی بە پەروەردگار و كەماڵ و جەلالی، ئەو زۆر قێزەون تەماشای نەفسی خۆی دەكات و زمانیشی بە سەنای پەروەردگاری پاراو بووە.

كەسێكی تر دەڵێت: عاریف نابێت بە عاریف هەتا گەر هەموو موڵكی سولەیمانی پێ بدرێت چاوتروكانێك لە خودا بێئاگا نەبێت، ئەمە پێویستی بە رونكردنەوە هەیە، هەرچی لەخوار ئەوەوە بێت دڵ بە خۆیەوە خەریك دەكات، بەڵام خەریكبوونەكەی بە غەیری خوداوە بۆ خودا بێت، ئەوە بریتیە لە خەریكبوون بە خوداوە –سبحانە– چونكە بە غەیری خوداوە بۆ خودا و لەبەر خودا خەریك بووە، ئەو لە خودا بێئاگا نەبووە.

هەروەها لە نیشانەكانی: عاریف كەسێكی هۆگرە بە پەروەردگارییەوە، نامۆیە لەوەی لە خودا دایدەبڕێت، بۆ ئەو مەبەستە وتراوە: عاریف كەسێكە هۆگربووە بە خوداوە و خوداش وەحشەتی بۆ خەڵكی لا دروست كرد، هەژاری بۆ خودا نیشان دا و خودا لە خەڵك بێنیازی كرد، بۆ خودا زەلیل بوو و خوداش ئەوی لەناو خەڵكیدا خاوەن عیززەت كرد، بۆ خودا تەوازوعی نیشان دا و خوداش ئەوی لە ناویاندا بەرز كردەوە، بە خودا بێنیاز بوو و خوداش خەڵكی ئاتاجی ئەو كرد.

وتراوە: عاریف بە بەشەكانی بەندایەتی رەنگ دەگرێت، لە كاتێكدا دەیبینی نوێژ دەكات دەیبینی یادی خودا دەكات، یان قورئان دەخوێنێت یان خەڵكی فێر دەكات، یان موجاهیدە یان حەج دەكات یان كۆمەكی لاوازان دەكات یان پەنای پەنابەران

دەدات، لە هەر يەكێك لـەو غەنيمانـەدا سـەهمێكی هەيـە، ئـەو لەگـەڵ فێرخوازەكانـدا فێرخـوازە، لەگـەڵ غەزاكەرانـدا غەزاكـەرە، لەگـەڵ نوێژخوێنانـدا نوێژخوێنـە، لەگـەڵ خێرخوازاندا خێرخوازە، لە مەنزيلەكانی بەندايەتيدا لە مەنزيلەيەكەوە بۆ مەنزيلەيەكی تر بەرز دەبێتەوە، ئەو لەسەر يەك مەعبود و بـۆ يـەك مـەعبود كـە خـودای موتەعالـە راوەستاوە، لە مەنزيلەكانی بەندايەتييەوە بۆ لای شتی تر و كەسی تر ناگوێزێتەوە.

يەحيای كوڕی مەعاز دەفەرموێت: عاريف "لەگەڵ" و "جيابوەوە"يە(كائن و بائن) لـە خەڵكی، ئەمە لە چەند روويەكەوە تەفسير دەكرێت:

لەوانـە: عـاريف بـە دەرەوەی لەگـەڵ خەڵكيدايـە(كـائن) و بـە نهـێنی و دڵـی لێيـان جيابووەتەوە(بائن)

هەروەها لەو تەفسيرانەی بـۆی كـراوە: لەگـەڵ رۆڵـەكانی خانـەی دواڕۆژدا هەيـە و لـە رۆڵەكانی خانەی دونيا جيابووەتەوە.

هەروەها لەو تەفسيرانە: عاريف لەگەڵ خودادا بـە تـەبابوون لەسـەر فەرمانـەكانی بـوونی هەيە و لە خەڵكی جيادەبێتەوە لە هەموو ئەو شتانەی سەرپێچی پەروەردگاری تێدايە.

وتراوە: لە نيشانەكانی عـاريف ((بـاوەڕێكی زانسـتی لـە نـاوەوە نـەبێت كـە رووالـەتی حوكم(حوكمی شەرعی) هەڵيبوەشێنێتەوە، هـەروەها زۆری نيعمەتـەكانی خـودا هـانی نەدەن بۆ بەزاندنی پەردەی سنوورەكانی خودا))

ئەمەش لە باشترين ئەو قسانەيە لەسەر مەعريفە وتراوە.

ئەوەی كە دەڵێت ((بـاوەڕی زانسـتی نـاوەوەی رووالـەتی حـوكم هەڵيبوەشـێنێتەوە)) ئاماژەيە بـەوەی كـە لادەران لەسـەری دەڕۆن، ئەوانـەی خۆيـان داوەتـە پـاڵ سـلوك، ئەوان چێژ و وەجد و "واريدات"يان بۆ روودەدات كـە پێچـەوانەی حـوكمی شـەرعييە، ئەوە زانراوێكە بۆ ئەوان و نـاتوانن نـەرێی بكـەن، بۆيـە بـاوەڕی پێـدەهێنن و زاهـيری حوكم واز لێدەهێنن، ئەمەش زۆر زۆرە، ئـەو رەخنـە لـە ئيمامـانی تەريقـەت دەگرێـت لەسەر ئەو جۆرە كەسانە، لە هەموو سوچێكەوە هاواريان لێ دەكـات، و بيدعـەكانيان دەخاتە روو و گومڕاييەكانيان نيشان دەدات.

ئـەوەش كـە دەڵێـت ((زۆری نيعمەتـەكانی خـودا هـانی نـادەن بـۆ بەزانـدنی پـەردەی سنوورەكانی خودا)) زۆری نيعمـەت بەنـدە گـومڕا دەكـات، وای لێـدەكات لـە جێگـەی

خۆی بەكاریان نەهێنێت، نیعمەتەكان بانگی لێ دەكەن كەسەكە دەستیان بۆ ببات بە حەڵاڵ و بە نا حەڵاڵ، زۆربەی خاوەن نیعمەتەكان لە شوێنی خۆیدا و بە ئەندازەی حەڵاڵ نیعمەتەكان بەكارناهێنن، بەڵكو دەستدرێژی دەكەن بۆ شتی تر، نەفسی فێڵی لێدەكات و لای جوان دەكات كە مەعریفەی ئەو بە خودا وادەكات شەهەوات و سەرپێچییەكان زیانی پێ نەگەیەنن، دەڵێت: كەسی عاریف گوناھ زیانی پێناگەیەنێت وەك چۆن زیان بە كەسی نەزان دەگەیەنێت، لەوانەیە نەفسی بە جۆرێك فێڵی لێ بكات تا پێی بڵێت گوناهەكانی ئەو چاكترە لە گوێڕایەڵی خەڵكی نەزان، ئەمەش مەزنترین مەكرە رووبەرووی ئەو كەسە بووەتەوە، لە راستیدا كارەكە بە پێچەوانەوەیە، لە نەزان زۆر شت قبووڵ دەكرێت كە لە عاریف قبووڵ ناكرێت، گەر نەزان جارێك سزا بدرێت ئەوا عاریف دوو جار سزا دەدرێت، شەرعی خودا بەڵگەی رۆشنی لەسەر ئەم راستییە تێدایە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأۡتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ يُضَٰعَفۡ لَهَا ٱلۡعَذَابُ ضِعۡفَيۡنِ﴾ الأحزاب: ٣٠، كە نیعمەت لەسەر بەندە كامڵ بوو و بە خراپە و یاخیبوون مامەڵەی ئەو نیعمەتەی كرد ئەوا سزاكەی زۆر گەورەیە، پلەكەی باڵایە و سزاكەیشی مەزنە.

هەروەها وتراوە: دانیشتن لەگەڵ عاریفدا لە شەش شتەوە بۆ شەش شت بانگت دەكات: لە شكەوە بۆ یەقین، و لە ریاوە بۆ ئیخلاص، و لە بێئاگاییەوە بۆ یادی خودا، و لە رەغبەت بە دونیا بۆ رەغبەت بە دوارۆژ، و لە لوتبەرزییەوە بۆ تەوازوع، و لە ناخی پیسەوە بۆ پاكبوونەوە.

## ۞ سیفەتەكانی خودای موتەعال جێگیر دەكەین بەبێ تەئویل و شوبهاندن

شێخولئیسلام الهروی دەفەرموێت ((مەعریفە: بریتییە لە مەعریفەی سیفات كە ناوەكانیان لە ریسالەتدا هاتووە، بەڵگەكانیان لە دروستكراوەكاندا دەركەوتووە، ئەو سیفەتانەش لەسەر چوار پایەن: جێگیركردنی سیفەتەكان بە ناوەكانیان بەبێ شوبهاندن، و نەرێكردنی تەشبیە لەو سیفەتانە بەبێ پەكخستن(تعطيل)، و بێهیوابوون لە دەرك كردنی حەقیقەتیان و هەوڵی تەئویلیان، و لەگەڵ لادانی جیاكاری لە نێوان سیفات و زاتی خودای موتەعال))

ئەمە لە باشترین قسەکانە و بەڵگەی پایەبەرزی شێخی "هەرەوی"یە.

پێی مەعریفەی کەسەکە جێگیر نابێت-بەڵکو لەناو ئیمانیشدا- تا باوەڕی بە سیفاتی پەروەردگار نەبێت، بەجۆرێك خودا بناسێت لە سنووری نەزانی بە پەروەردگاری دەریبهێنێت، ئیمان بە سیفات و ناسینیان: بریتییە لە بنچینەی ئیسلام و ئیمان، و درەختی ئیحسان، هەر کەس ئینکاری سیفات بکات ئەوا بنچینەکانی ئیسلامی روخاندووە، و پایەکانی ئیمان و بەری درەختی ئیحسانی وێران کردووە، چجای ئەوەی ئەهلی عیرفان بێت، خودای موتەعال نەرێکەرانی سیفاتی بە گومانبەری خراپ بە خودا ناوبردووە، هەڕەشەی بە جۆرێك لێکردوون کە هەڕەشەی لەو جۆرەی لە ئەهلی شیرك و بێباوەڕی و گوناهی گەورە نەکردووە، دەفەرموێت ﴿وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَا أَبْصَارُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ اللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٢﴾ وَذَٰلِكُمْ ظَنُّكُمُ الَّذِي ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ أَرْدَاكُمْ فَأَصْبَحْتُم مِّنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٢٣﴾﴾ فصلت: ٢٢ - ٢٣، خودای موتەعال رایدەگەیەنێت: ئینکار کردنی ئەم سیفەتە لە سیفەتەکانی ئەو کەسانەیە گومانی خراپ بە خودا دەبەن، ئەو گومانەش بوو بە هۆی تیابردنیان، دەربارەی ئەو ستەمکارانەش کە گومانی خراپیان بە خودا برد دەفەرموێت ﴿عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ ۖ وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلَعَنَهُمْ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَهَنَّمَ ۖ وَسَاءَتْ مَصِيرًا ﴿٦﴾﴾ الفتح: ٦، ئەم هەڕەشەیە تەنها بۆ ئەوانە هاتووە کە گومانی خراپیان بە خودا بردووە، ئینکاری سیفاتی خودا و حەقیقەتی ناوەکانی خراپترین گومانی خراپە بە خودای موتەعال.

لەبەر ئەوەی خۆشەویسترین کار لەلای بریتییە لە حەمد و مەدح و سەنای بە ناوەکان و سیفەت و کردارەکانی، بۆیە ئینکارکردنیان گەورەترین لادان و بێباوەڕییە بە خودا، ئەو ئینکارکردنە خراپترە لە هاوەڵدانان، حاڵی کەسی پەکخەری سیفەتەکان لە موشریك خراپترە، ئینکارکردنی سیفاتی مەلیك و حەقیقەتی موڵکی و تانە لە ئەوسافەکانی بەراورد بە شەریکدانان بۆ خودا لە موڵکدا یەکسان نییە، پەکخەرانی سیفاتی خودا دوژمنانی پێغەمبەرانن، بەڵکو هەرچی شیرکە لە جیهاندا بنچینەکەی پەکخستنی سیفاتە (تعطيل الصفات)، چونکە گەر پەکخستنی کەماڵی خودا-یان بەشێك لە کەماڵی خودا- و گومانی خراپ بە خودا نەبوایە هاوەڵیان بۆ دانەدەنا، وەك ئیمامی حونەفا و ئەهلی یەکتاپەرستی(ئیبراهیم-علیه السلام-) بە هۆزەکەی فەرموو ﴿أَئِفْكًا آلِهَةً دُونَ

﴿أَئِفْكًا آلِهَةً دُونَ اللَّهِ تُرِيدُونَ ﴿٨٦﴾ فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٨٧﴾﴾ الصافات: ٨٦ – ٨٧، واتە چ گومانێکتان بە خودا هەیە: پاداشتان بداتەوە لە کاتێکدا لەگەڵ خودا کەسانی تر دەپەرستن؟ ئێوە چ گومانێکتان بە خودا بردووە تا واتان لێهاتووە هاوەڵی بۆ دابنێن؟

ئایا وا گومانتان برد: خودا ئاتاجی هاوەڵە تاکو لە موڵکدا کۆمەککاری بن وەك مەلیکەکان؟ یان وا گومانتان برد خودا بە تەنها ناتوانێت کاروبارەکانی ئێوە تەگبیر بکات و پێویستییەکانتان بۆ جێبەجێ بکات؟ یان خوایەکی دڵڕەقە و پێویستی بە شفاعەتکار تاکو هەیە سۆز و بەزەی بۆ بەندەکانی ببزوێنێت؟ یان زەلیلە و پێویستی بە سەرپەرشتکارێکە کەمی و لاوازییەکەی بۆ پڕبکاتەوە و زەلیلییەکەی بۆ بگۆڕێت بە عیززەت؟ یان پێویستی بە کوڕە و دەبێت دۆستێك بگرێت تا کوڕێکی لێی ببێت؟ مەزنی و شکۆمەندی بۆ خودا لە هەموو ئەو وەهم و گومانە خراپانەی بە خودای موتەعال دەبرێت.

مەبەستەکە: پەکخستن(التعطیل) بنەما و بنچینەی شەریکدانانە بۆ خودا، هەموو پەکخەرێك شەریکدانانەکەی بەپێی پەکخستنەکەیەتی، هەیانە زۆر هەیانە کەم.

### ۞ ناسینی سیفات: ڕۆحی سلوکە

پێغەمبەران لە یەکەمیانەوە تا خاتەمیان-سەلات و سەلامی خودایان لەسەر بێت- بە بانگەوازەوە ڕەوانەی لای خەڵکی کران، هەستان بە بەیانی ڕێگەی گەیشتن بە خودا و ڕونکردنەوەی حاڵی بانگکراوان دوای ئەوەی کە بە خودا دەگەن، ئەم سێ ڕێسایە لە هەموو گەل و نەتەوەیەکدا و لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیان پێویستن، پەروەردگاریان بە ناو و سیفەت و کارەکانی بە بانگراوان ناساند بە ناساندنێکی دووروودرێژ، تا وەك ئەوەی بەندەکان خودا-سبحانە- ببینن، و تەماشای بکەن لەسەرو ئاسمانەکانەوە و لەسەر عەرشی مەزنی، ئاخافتن لەگەڵ فریشتەکانی دەکات، و ئەمری مەملەکەتەکەی رادەپەڕێنێت و دەنگی دروستکراوەکانی دەبیستێ و کردار و جووڵەیان دەبینێ و سەیری ناخیان دەکات وەك چۆن تەماشای دەرەوەیان دەکات، فەرمان دەردەکات و نەهی دەکات، و رازی دەبێت و تووڕە دەبێت، خۆشیدەوێت و خەشم دەگرێت، لە بێهیوابوونیان و نزیکی لێبووردنی ئەو پێدەکەنێ، دەچێت بەدەم بانگی هانابەرانەوە

و پـەنای پەنابـەرانیان دەدات، كۆمـەكی ئاتاجـەكانیان دەكـات و تێكشـكاوەكان راستدەكاتەوە، هەژارەكانیان دەوڵەمەند دەكات و دەمرێنیٚ و دەژیەنێت، دەگرێتەوە و دەبەخشێت، حیكمەت دەبەخشیٚ بە هەر كەسێك خۆی بیەوێت، خاوەنی موڵكە و بە هەر كەس بیەوێت موڵك دەبەخشێت، و لە هەر كەسیش بیەوێت موڵك دەگرێتـەوە، عیـززەت دەدات بـە هـەر كەسـێك خـۆی بیـەوێت، و زەلیلـیش دەدات بەسـەر هـەر كەسێكدا بیەوێت، هەرچی خێرە لەدەستی ئەودایە، و ئـەو دەسـەڵاتی بەسـەر هـەموو شتێكدا زاڵ و سەپاوە، هـەر ڕۆژێك لـە شـان و شـكۆیەكدایە، لـە گونـاه دەبورێـت و ناڕەحەتییـەكان دەڕەوێنێتـەوە، و دەستبەسـراوەكان دەكاتـەوە، و سـتەملێكراوان سـەردەخات و سـتەمكاران پشتدەشـكێنێت، بـەزەیی بـە هەژارانـدا دێتـەوە و پـەنای ناچاران دەدات، قەدەرەكان بۆ كاتەكانی خۆیان ڕەوانە دەكات، و بەپێی یاسای خۆی جارییـان دەكـات، هـەر كەسـی بوێـت پێشـی دەخـات، و هـەر كەسیشـی بوێـت دوای دەخات، هەموو كارەكان لەدەستیدایە، و هەڵسوڕندنی هـەموو مەملەكەتـەكان لەسـەر ئەوە، ئەمەیە مەبەست لە بانگەواز و پوختەی ریسالەت.

ڕێسای دووەم: پێناسەی حاڵ دوای گەیشتن: ئەوەش بریتییە لەوەی ڕۆژی دوایـی لـە ئامێزی دەگرێت لـە بەهەشـت و لـە دۆزەخ، و پـێش ئـەوەش دادگـاییكردن و حـەوز و میزان و صراط.

بـاوەڕ بـە سـیفات و ناسـینیان و جێگیركردنـی حەقیقەتـەكانیان و وابەسـتەبوونی دڵ پێیانەوە و بینینیان بریتییە لە سەرەتا و ناوەڕاست و كۆتایی ڕێگە، ئەوەش بریتییـە لـە ڕۆحـی سـالیكان، ڕێنماكاریـان بـۆ گەیشـتن، بزوێنـەری توانـا و لێبڕانیـان كاتێـك خاودەبنەوە، و هاندەری هیممەتیان كاتێك كەمتەرخەمی دەكەن، ڕۆیشتنی ئـەوان بـۆ لای خودا لەسەر شاهیدە، هەر كەس شاهیدی نەبێت ڕۆیشتنی نییە، هـەر بـەو جـۆرە نە داوا و نە سلوكی هەیە، مەزنترین شاهید بریتییە لە سـیفەتی خۆشەویستەكەیان و كۆتایی داواكـەیان، ئـەوەش ئـەو ئاڵایـە لەسـەر ڕێگـەی ڕۆیشـتن بـۆ لای خـودا بۆیـان هەڵكراوە و ئەوانیش خۆیان بۆ لای یەكلاكردۆتەوە، وەك عائشە-خوا لێی ڕازی بێت- دەفەرموێت ((هەر كەس پێغەمبەری خودای ببینیبایە، دەیبینی بەیانیان و ئێواران لە جووڵە و كۆششدا بوو، خشتێكی نە نا سەر خشتێك لە دونیا، بەڵام ئاڵای بۆ هەڵدەكرا

و خۆی بۆ ڕۆیشتن بـۆ لای و گەیشـتن پێـی یـەکلادەکردەوە)) بـەردەوام کەسـەکە لـە ساردبوونەوە و خاوبوونەوە و تەمبەڵیدا دەبێت تا خودای موتەعال بە فەزڵ و منـەتی خۆی ئالآیەکی بۆ هەڵدەکات و بەدڵ نیشانی دەدات بۆ ئـەوەی ڕووی تێبکـات و خـۆی بۆ لای یەکلا بکاتەوە، و کاری لەسەر بکات.

گـەر شـاهیدەکانی سـیفات پـەکیان کـەوت و بەیداخـەکانیان لـە دڵـدا داگـیران، و ئاسـەوارەکانیان کوژانـەوە و بـە قەمچـی دوورخسـتنەوە کەسـەکە دوورخرایـەوە، و پەردەی دەرکردن بەڕوویدا دادرایەوە و لەگەڵ دواکەوتوواندا دواکەوت ئەو کاتە قەدەر پێـی دەڵێـت: لەگـەڵ دانیشـتواندا دابنیشـە، ئەوسـاف خـودا و کـەماڵ و حەقیقـەتی ناوەکانی کێشکەری دڵن بـۆ لای خۆشەویسـتی خـودا و داوای گەیشـتن پێـی، چـونکە دڵان ئەوەی خۆشدەوێت و لێی دەترسێت و ڕجای لێدەکات و بۆی تامەزرۆ دەبێت کە دەیناسێت، چێژ لە نزیکی وەردەگرێت و بە یادکردنی ئارام دەبێتەوە، ئەمەش بەپێی ناسـینی سـیفەتەکان، گـەر پـەردە کەوتـە نێـوان ئـەو و ناسـینی سـیفەتەکان و جێگیرکردنیان و دان پیانانیان، ئەوا ئەوەی بە مەعریفەوە بەمەرجگیراوە نایەتـە دی، چونکە بوونی پێویستکراو(ملزم) بەبێ پێویست(لازم) و بوونی بەمـەرجگیراو(مشـروط) بەبێ مەرج(شرط) هەرگیز بەدینایەت.

حەقیقەتی خۆشەویستی و گەڕانـەوە بـۆ لای خـودا و تـەوەکول و مـەقامی ئیحسـان بـۆ کەسـی پەکخـەری سـیفەتەکان نایەتـە دی، چـۆن دڵ دەناڵێنێـت بـۆ خودایـەك ناڵـە و فوغانی نەبیستێ و شوێنەکەی نەبینێ و کەسی خۆش نەوێ و کەس ئەوی خۆش نـەوێ و هیچ جۆرە کارێك ئەنجام نەدات، نە قسە بکات و نە قسەی لەگەڵ بکرێت، نە لە شتێك نزیك ببێتەوە و نە شتێك لە ئەو نزیك ببێتەوە، نـە دڵنـەرمی و نـە حـەنان و نـە بـەزەیی لەخۆی نەگرێت، نە حیکمەتی هەبێت و نە ئامانجێك لە پێناویدا فەرمان دەربکات؟

چۆن لەسـەر هـەموو ئەوانـەوە خۆشەویسـتی و گەڕانـەوە بـۆ لای و شـەوقی لیقـای و بینـینی ڕووی جـوانی لـە بەهەشـتدا –لەسـەر عەرشـەکەی و لەسـەرو هـەموو دروسـتکراوەکانییەوە ئیسـتیوای کـردووە– وێنـا دەکـرێن، چـۆن دڵ بـۆ کەسـێك دەناڵێنێت کە نە کەسـی خۆشـدەوێت و نـە کەسـیش ئـەوی خۆشـدەوێت، و نـە ڕازی دەبێت و نە تووڕە دەبێت، و نە فەرەحی هەیە و نە پێدەکەنێت؟

پاكێتی بۆ خودا لە نێوان پەكخەرانی سیفات و خۆشەویستی و ناسین و سروور و دڵخۆشی بە خودا و شەوق بۆ لیقای و چاوەڕوانی چێژی سەیركردنی ڕووی پاكی خودا و چێژوەرگرتن لە گوتاری لە بەهەشتی بەرین و خانەی پاداشتیدا، گەر ئەوانە(پەكخەرانی سیفات) ئەهلی هەموو ئەو نیعمەتانە بوونایە خودا شایستەی دەكردن و ڕێزی لێ دەنان، چونكە ئەوە مەزنترین ڕێزلێنانێكە خودا بە بەندەكەی ببەخشێت، خودا زاناترە بەوەی ڕێز و گەورەیی و نیعمەتەكانی لای كێ دادەنێت و بە كێی دەبەخشێت﴿ وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوا أَهَٰؤُلَاءِ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّن بَيْنِنَا ۗ أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ ﴿٥٣﴾ ﴾ الأنعام: ٥٣ ﴿ وَإِذَا جَاءَتْهُمْ آيَةٌ قَالُوا لَن نُّؤْمِنَ حَتَّىٰ نُؤْتَىٰ مِثْلَ مَا أُوتِيَ رُسُلُ اللَّهِ ۘ اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ ﴾الأنعام: ١٢٤ ﴿ أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ ۚ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ۚ وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا ۗ وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾ الزخرف: ٣٢، لە ڕاستیدا ئینكاركردنی سیفەتەكانی –سبحانە– و حەقیقەتی ناوەكانی بریتی نییە لە پاكێتی دانە پاڵ خودا(تنزیە)، بەڵكو حیجابێكە و بە ڕوویاندا دراوە و وا گومانیان برد ئەو كارەیان بریتییە لە پاكێتی دانە پاڵ خودا، وەك چۆن حیجابی شیرك و بیدعەی گومڕاكەر و شەهەواتی هەڵدێر بەسەر دڵی خاوەنەكانیاندا درا، و كارە خراپەكانیان لا جوان بوو و بە باش تەماشایان كرد.

ئەم سیفەتانە وەحی –كە لەسەر زمانی پێغەمبەر(ﷺ) لە خوداوە هاتووە– بەڵگەیە لەسەریان، هەر بەو جۆرە هەستەكان كە كەسی چاوساغ ئاسەواری دروستكراوەكانی پێ دەبینێت، هەستەكان ئەو ئاسەوارانە دەكەن بە بەڵگەی سیفاتی خاوەن ئاسەوارەكان، بە هەمان شێوە ژیری كە ژیانی بە درەختی بیرەوە خۆش دەبێت، لە كۆتایشدا دڵ كە بە سەرنجی وردی نێوان بە مەزنزانین و پەندوەرگرتن دەبوژێتەوە.

ریسالەتیش: سیفەتەكانی خودای موتەعالی بە جۆرێك جێگیر كردووە كە هەرچی گومان و تەمومژە دەیڕەوێنێتەوە، پەردەی لاداوە و زانستی یەقینی بەخشیوە و شك و گومانی سڕیوەتەوە، سینە فێنك دەبێتەوە و دڵان ئارام دەبنەوە و ئیمانیش لە ڕادەی خۆیدا جێگیر دەبێت، ریسالەت سیفەتەكان و كردارەكانی زیاتر لە ئەمر و نەهی درێژە پێداوە، جێگیركردنی سیفەتەكان بە جوانترین جێگیركردن و ڕەوانترین

وشە دەربڕیوە، لە كورتكردنەوە و گریمانە دووری خستوونەتەوە، ڕێگەی گرتووە لە قبووڵ كردنی تەئویل، هەر بەو جۆرە تەئویلی ئایەتەكانی سیفات و فەرموودەكانیان بە شتێك دووریان بخاتەوە لە حەقیقەتیان لە شێوازی تەئویلی ئایاتی زیندووبوونەوە و هەواڵەكانی، بەڵكو لە چەندین ڕووەوە لێی بەدوور گرتووە، لە كتێبی "الصواعق المرسلة على الجهمية والمعطلة"دا باسم لەبارەوە كردووە، بەڵكو تەئویل كردنی ئایاتی سیفات-بەجۆرێك لە حەقیقەتی ئەو سیفەتانە دەریان بكات- هەروەكو تەئویلی ئایاتی ئەمر و نەهی وان و یەكسانن، هەموو بابەتەكان یەك دەروازەن، و سەرچاوەكەیان یەكێكە و مەرامەكانیان بە هەمان شێوە، ئەوەش بریتییە لە جێگیركردنی حەقیقەتیان و باوەڕ پێهێنانیان.

هەر بەو جۆرە دەستەیەك دایانە بەسەر ئایەتەكانی زیندووبوونەوەدا و دەڵێن: هەروەك كاری ئەهلی كەلام و مامەڵەیان لەگەڵ ئایاتی سیفاتدا كارمان كردووە، بەڵكو پاساو و بیانوو بۆ ئێمە زۆرترە لە ئەوان، گرتنەئامێزی سیفات و بەرزی و بڵندی و هەستان بەكار لەلایەن كتێبە ئاسمانییەكانەوە زۆر مەزنترە لە دەقەكانی زیندووبوونەوەی جەستە، گەر تەئویلی ئەوانە بۆ ئێوە گونجاو بێت ئەی بۆ دەبێت تەئویلی ئایاتی زیندووبوونەوە بۆ ئێمە حەرام بێت؟

هەر بەو جۆرە دەستەیەكی تر داویانە بەسەر تەئویلی ئایاتی ئەمر و نەهیدا، و دەڵێن: ئێمەش هەروەكو ئەوانەی تەئویلی ئایاتی سیفاتیان كردووە-لەگەڵ زۆربوون و هەمەچەشنیاندا- تەئویلی ئایاتی ئەمر و نەهیمان كردووە، ئایاتی ئەحكام نزیكەی پێنج سەد ئایەتێكە.

بە گومانی خۆیان دەڵێن: گوایە بەڵگە ئەقڵییەكان بەرهەڵستی دەقەكانی سیفات دەكەن، ئەوا لای ئێمە بەرهەڵستكارێكی ئەقڵییە بۆ دەقەكانی زیندووبوونەوە، لە هەمان بەڵگە، بەڵكو بەهێزتر لەو بەڵگانە.

تەئویلكەرانی ئایاتی ئەحكام -بە جیاوازی حەقیقەت و دەركەوتنیان- دەڵێن: ئەوەی ئەم تەئویلەی بۆ ئێمە گونجاندووە بریتییە لەو ڕێسایانەی كە بۆ ئێمە داتانرشتووە، و كردووتانە بە بنەما و بنچینەگەلێك بۆ ئەوەی ئێمە بگەڕێینەوە بۆ لایان، كە بەكارمان هێنان گەیشتینە ئەم سەرئەنجامەی كە خودا كەلامی نییە و قسە ناكات، ئەمر و نەهی

ناكات و سیفەتێكی نییە پێیەوە وەستابێت، هیچ كارێك ناكات، بۆیە ناچاربووین تەئویلی ئایەتەكانی ئەمر و نەهی و وەعد و وەعید و پاداشت و سزا بكەین.

لە كتێبی "الصواعق"دا باسی ئەوەمان كردووە كە تەئویلكردنی ئایاتی سیفات و هەواڵەكانیان–بەجۆرێك لە حەقیقەتیان دەربكات– بریتییە لە بنچینەی فەساد و تیاچوونی مەملەكەتەكان و زاڵبوونی دوژمنانی ئیسلام بەسەریاندا، هەموو ئەمانەش بەهۆی تەئویلەوە بووە، ئەو كەسەی ئاگاهی و ئەزموون و شارەزایی لە جیهان ببێت لەمە تێدەگات، بۆیە فەیلەسوفە ئاقڵەكان تەئویل بە حەرام دەزانن لەگەڵ باوەڕیان بە دروستیی تەئویل، چونكە هۆی فەسادی جیهان و پەكخستنی شەریعەتە.

هەر كەس تێڕامان بكات بۆ ئایەتەكانی سیفات لە قورئان و فەرموودەدا: بەبێ هیچ گومانێك تێدەكات و دەزانێت كە تەئویلكردنیان بەجۆرێك لە حەقیقەتیان دەربكات پووچ و بەتاڵە، چونكە ئەو سیفەتانە بە ڕێگەیەك هاتوون كە تەئویل كردن قبووڵ ناكەن لە ڕێگەیەكی ترەوە.

سەرنجی ئەم ئایەتە پیرۆزە بدە ﴿هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأۡتِيَهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَوۡ يَأۡتِيَ رَبُّكَ أَوۡ يَأۡتِيَ بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَۗ يَوۡمَ يَأۡتِي بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ﴾ الأنعام: ١٥٨، ئایا ئەم دابەشبوون و هەمەچەشنییە تەئویلی هاتنی پەروەردگار بە هاتنی فریشتە و ئایاتی پەروەردگار قبووڵ دەكات؟ ئایا لە دووتوێی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا هیچ شوبهە و گومانێك دەمێنێتەوە كە هاتنەكە هاتنی خودی خودای موتەعالە؟ هەر بەو جۆرە ئایەتی ﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ﴿١٦٣﴾ وَرُسُلٗا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ وَرُسُلٗا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ﴿١٦٤﴾﴾ النساء: ١٦٣ – ١٦٤، جیاوازی لە نێوان وەحی كرد بە ناردنی نیگای گشتی(الإيحاء العام) و ئاخافتنی تایبەت(التكليم الخاص) لەگەڵ موسادا(عليه السلام)، وەحی كرد بە دوو جۆر و پاشان فرمانی"كلم"ی بە چاوگەكەی(تكليم) تەئكید كردەوە تاكو ئەوەی لادەران دەیڵێن بڕەوێتەوە(چونكە لە زمانی عەرەبیدا هەر فرمانێك بە چاوگەكەی تەئكیدی لێكرایەوە مەبەستی حەقیقەتە نەك مەجاز)، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحۡيًا أَوۡ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ أَوۡ يُرۡسِلَ رَسُولٗا فَيُوحِيَ بِإِذۡنِهِۦ مَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ عَلِيٌّ

حَكِيمٌ ﴾ الشورى: ٥١، جۆری ئاخافتن(تكليم)ەكەی كرد بە دوو بەشەوە ئاخافتن بە هۆيەكەوە لەگەڵ ئاخافتن بەبێ هۆ، هەر بەو جۆرە فەرموودەی خودای موتەعال بۆ موسا ﴿ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي ﴾ الأعراف: ١٤٤، جياوازی خستە نێوان ريسالە و كەلامەوە، رسالەت بە كەلامەوەيە، هەر بەو جۆرە فەرموودەكەی پێغەمبەر(ﷺ) ((ئێوە بە ئاشكرا و بەچاو پەروەردگارتان دەبينن، وەك چۆن مانگی چواردە لە شەوێكی سامالّی بێ هەوردا دەبينن، يان وەك چۆن خۆر لە نيوەڕۆدا و لە رۆژێكی سامالّی بێ هەوردا دەبينن)) ئاشكرايە ئەم بەيان و پەردە لەسەر لادان و رونكردنەوەيە بە تەواوی نەرێی ويستی تەئويل دەكات، هيچ گومانێك لەمەدا نامێنێت بۆ كەسێك ژيری و ئايينی هەبێت.

رێگەی دووەم لە رێگەكانی جێگيركردنی سيفات: بريتييە لە بەڵگەی دروستكراوەكان لەسەريان، مەخلوق بەڵگەيە لەسەر بوونی خاليق، هەروەها بەڵگەيە لەسەر ژيان و توانا و زانست و ويستی ئەو خاليقە، كرداری ئيختياريی ئەو بەڵگەيە پێويست دەكات بە پێويستبوونێكی ناچاری، ئەوەی لە مەخلوقدايە لە وردەكاری و ياسا و روودانی بە كامڵترين شێوە بەڵگەيە لەسەر حيكمەتی بكەرەكەی و چاودێری كردنی، ئەوەی كە تێيدايە لە ئيحسان و سوود و گەيشتنی قازانجی مەزن بە دروستكراو بەڵگەيە لەسەر رەحمەت و ئيحسان و بەخششی ئەو دروستكەرە.

ئاسەواری كەماڵ: بەڵگەيە لەسەر ئەوەی كە خاليقەكەی لەو كامڵترە، چونكە بەخشەری كەماڵ شايستەترە بە كەماڵ، خاليقی بيستن و بينين و قسەكردن شايستەترە بە بيستن و بينين و ئاخافتن(سمع و بصر و كلام)، پەروەردگاری ژيان و زانست و توانا و ويست شايستەترە بەوەی لە زاتی خۆيدا لەو سيفەتانەدا كامڵ بێت، ئەوەی لە مەخلوقاتدايە لە تايبەتمەندی رۆشنترين بەڵگەيە لەسەر ويست و حيكمەتی پەروەردگار-**سبحانە**- كە تايبەتمەندی بەخشيوە.

بەدەستهێنانی وەڵام لەدوای پرسياری داواكەر و بە جۆرێكی گونجاو بەڵگەيە لەسەر زانستی پەروەردگار بە جوزئيات(بەشەكی) و بيستنی داوای بەندەكانی، و دەسەڵاتی بۆ جێبەجێ كردنی ئاتاجييەكانيان و بەزەيی و سۆزی بەرانبەريان، هەر بەو جۆرە چاكە لەگەڵ گوێڕايەڵان و نزيككردنەوە و رێزلێنانيان و بەرزكردنەوەی پلە و پايەيان بەڵگەيە

لەسەر خۆشەویستی و رازیبوونی، سزای یاخیبووان و ستەمکاران و دوژمنانی پێغەمبەران بە چەندین جۆر سزای بینراو و ئاشکرا بەڵگەن لەسەر سیفەتی تووڕەیی و خەشمی پەروەردگار، دەرکردن و دوورخستنەوە بەڵگەیە لەسەر رق و بوغزی خودا لەو کەسانە.

ئەم بەڵگە و نیشانانە هەموو لە یەك جۆرن گەر تێرامانیان بۆ بکرێت، بۆیە پەروەردگار لە کتێبەکەیدا بەندەکانی بانگ دەکات بۆ بەڵگەهێنانەوە بەوانە لەسەر سیفەتەکانی، خودا زانست بە پەروەردگاریی و یەکتایی خۆی و سیفاتی کەماڵی بە ئاسەواری سیفەتە بینراوەکانی جێگیر دەکات، قورئان پڕە لەم شێوازە.

شاهیدی ناوی خالیق لە خودی مەخلوقەوە دەردەکەوێت، و شاهیدی ناوی "الرزاق- رۆزیدەر" لە بوونی رۆزییەوە بۆ رۆزیدراوەکان دەردەکەوێت، شاهیدی ناوی "الرحيم" لە بوونی رەحمەتی پەرش و بڵاو لە جیهاندا دەردەکەوێت، هەروەها ناوی "المعطي" لە پێدانی بەخششەوە کە خولگەیەکە و تەنها ساتێکیش راناوەستێت، هەر بەو جۆرە ناوی "الحليم" لە حیلمییەوە دەردەکەوێت بەرانبەر تاوانباران و یاخیبووان و پەلە لێنەکردنیان لە تۆڵەسەندنەوەدا.

ناوی "الغفور" و "التواب" لە لێخۆشبوونی گوناه و قبووڵی تەوبەوە، هەروەها دەرکەوتنی شاهیدی ناوی "الحكيم" لە زانست بەوەی لەناو بوون و بڕیاری خودادایە لە حیکمەت و بەرژەوەندی و رووی قازانج، هەر بەو جۆرە هەر ناوێك لە ناوە جوانەکانی خودای موتەعال لەناو بوون و بڕیار(الخلق و الأمر)دا شاهیدێکی بۆ هەیە، هەندێك دەیناسنەوە و هەندێکی تر نایزانن، بوون و بڕیار لە مەزنترین شاهیدەکانی ناو و سیفەتەکانی خودای موتەعالن.

هەر کەسێکی ئەقڵ تەندروست و فیترەت سەلیم پلە و پایەی بەدیهێنەر و زانایی و دەرکەوتنی بەسەر هەموو بوونەکانی تردا دەناسێتەوە، هەروەها تەنهابوونی بە کەماڵ کە کەسی تر لەگەڵی هاوبەشی ناکات لە بینینی بەدیهاتووەکانییەتی، ئیتر چۆن سیفاتی کەسێك ناناسیت کە جیهانی باڵا و جیهانی نزم و ئەم گشتە دروستکراوانە بەشێك بن لە بەدیهاتووەکانی؟

گەر بە چاوی ئیعتیبار و پەند وەرگرتن لە مەخلوقات و مەئمورات(بوون و بڕیار) بڕوانیت دەبینیت هەر هەموو ئاماژە و بەڵگەن بۆ سیفەتەکان و حەقیقەتی ناوە جوانەکانی

خودا، ئەو کات دەبینیت پەکخەرانی سیفات(المعطلة) کوێرترین کەسن لەناو خەڵکیدا بەهۆی لوتبەرزییانەوە، بەسە بۆ تۆ دەرکەوتنی شاهیدی بەدیهاتن لە خودی خۆتدا، وەك خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَفِىٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الذاريات: ٢١، بوونەوەرەکان هەر هەموو شاهیدی سیفات و ناوە جوانەکانی پەروەردگارن–جل جلالە– هەر هەموو ئاماژە بە ناوە جوانەکان و حەقیقەتیان دەکەن و بانگیان بۆ دەکەن و ئاماژەن بۆ سەریان و زمانی حاڵ و گوفتار هەواڵیان لێ دەدات، وەك وتراوە:

تأمل سطور الكائنات فإنها — من الملك الأعلى إليك رسائل

وقد خط فيها–لو تأملت خطها– — ألا كل شيء ما خلا الله باطل

تشير بإثبات الصفات لربها — فصامتها يهدي، ومن هو قائل

هیچ شتێك نییە بەڵگە بێت لەسەر شتێکی تر ڕۆشنتر و ڕوونتر لە بەڵگەی مەخلوقات لەسەر سیفاتی خالیق و وەسفی کەماڵ و حەقیقەتی ناوە جوانەکانی، بەپێی جۆراوجۆری ناو و سیفەتەکان بەڵگەکان جۆراوجۆرن، هەموو ئەوانە لەڕووی ئەقڵ و هەست و فیترەت و سەرنج و تێڕامانەوە دەبنە بەڵگە لەسەریان.

هەتا نوور لە دڵی بەندەدا بەهێزتربێت بینینەکەی تەواوتر و کامڵترە، هەتا بەشی لە نوور کەمتر بێت و چراکەی لە دڵدا کوژاوە بێت ئەوا نووری تەصدیق(بەڕاستزانین) بە سیفات و جێگیرکردنیان لە دڵدا دەکوژێتەوە، چونکە بەو نوورە دەبینرێن، کە ئەو نوورەی بزر کرد نایانبینێت، ئەو کاتە شوبهەی باتڵ لەگەڵ ئەو تاریکییەدا سەرهەڵدەدات و دەرئەنجام تەنها ئینکارکردنی ناو و سیفەتەکان بەشی دەبێت.

بیرکردنەوە یارمەتی ئەم پەیبردنە دەدات، بۆیە لە سیفەتی باوەڕداران ئەوەیە کە بیردەکەنەوە لە ئایەتەکان، و دەیانکەنە بەڵگە لەسەر یەکتایی و سیفەتی کەماڵ و صدقی پێغەمبەرانی و زانست بە لیقای، هەروەها بیردەکەنەوە لە دونیا و کۆتاپێهاتنی، پوکانەوە و ئافەتەکانی، هەر بەو جۆرە بیرکردنەوە لە دواڕۆژ و بەردەوامی و پلەوپایەی، بۆیە خودا بەوە وەسفی کردوون و دەفەرموێت ﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا لِّتَسۡكُنُوٓاْ إِلَيۡهَا وَجَعَلَ بَيۡنَكُم مَّوَدَّةٗ وَرَحۡمَةًۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الروم: ٢١، بیری دروستی پاڵپشتکراو بە زیندەگی و ژیانی دڵ و نووری بەصیرەت بەڵگەن لەسەر سیفاتی کەماڵ و وەسفی جەلالی خودا، بەڵام بیرێکی هاوتا

لەگەڵ مردنی دڵ و کوێریی بەصیرەت نەرێکردنی سیفەتەکان و پەکخستنیان بۆ کەسەکە بەرهەم دەهێنێت، نووری بەصیرەت و زیندەگی باشی ژێری دەخرێنە سەر زیندەگی دڵ بە سەرنج و تێڕامانی وردی خولخواردوو لەنێوان بەمەزن راگرتنی خالیق -جل جلاله- و پەندوەرگرتن بە بەدیهاتووەکانی خودا کە بەڵگەن لەسەری، پێویستە ئەم دوو ئەمرە بوونیان هەبێت: گەر بەهۆی بەمەزن زانینەوە لە پەندوەرگرتن بێئاگا بوو ئەوا بەڵگەی لەسەر سیفات بەرچنگ ناکەوێت، گەر پەندوەرگرتنی بۆ بەدەست هات بەبێ مەزن راگرتنی خالیق -سبحانه- ئەوا سوودی لێ نابینێت بۆ جێگیرکردنی سیفەتەکان، گەر مەزنڕاگرتن و پەندوەرگرتن و سەرنجدانی ورد لە دروستکراوەکانی بۆ کۆبوویەوە ئەوا بێ هیچ گومانێك جێگیرکردنی سیفاتی کەماڵی بۆ بەدەست دێت، لەگەڵ ئەوەی کە ئەستەمە بە مەزن زانینی پەروەردگار بۆ دڵ دروست بێت لە رێگەی تێڕامان لە ئاسەواری ناو و سیفەتەکانی خودای موتەعال و تێڕامان لە ئایەتە قورئانییەکان لەگەڵ ئەوەشدا بەو تێڕامانەوە بێئاگا ببێت لە پەندوەرگرتن و وردبونەوەی بەدیهاتووەکان، هەروەك چۆن پەندوەرگرتن بەبێ مەزنزانین بەدەست نایەت.

((پەندوەرگرتن-الإعتبار)) ئەوەیە کە سەرنجی لە ئاسەوارەوە بچێت بۆ لای خاوەنی ئاسەوارەکە، و لە بەدیهاتووەکانەوە بچێت بۆ بەدیهێنەر، هەروەها لە بەڵگەوە بچێت بۆ بەڵگە لەسەرهێنراوەکە، بیری دەگوێزێتەوە بۆ لای خاوەن ئاسەوار و بەدیهێنەر بەپێی خێرایی لوتفی پەیبردن، بۆیە زەینی لە پابەند(الملزم) ەوە دەچێت بۆ پێویست(اللازم)ەکەی، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿فَٱعۡتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ۝٢﴾ الحشر: ٢، پەندوەرگرتن(الإعتبار) لەسەر کێشی "إفتعال"ە لە "العبور"-پەڕینەوە وەرگیراوە، ئەوەش پەڕینەوەی دڵە لە پابەندەوە(الملزم) بۆ پێویست(اللازم)، هەروەها لە هاوشێوەوە بۆ هاوشێوەی تری.

ئەم پەندوەرگرتنە لاواز دەبێت و بەهێز دەبێت، تا کەسەکە بەڵگە بە سیفات و کەماڵی خودا لەسەر کردارەکانی دەهێنێتەوە، ئەمەش بەهۆی پەندوەرگرتنی باش و دروستی سەرنجییەوە، ئەم جۆرە پەندوەرگرتنە پەندوەرگرتنی کەسە تایبەتەکان و بەڵگەهێنانەوەیانە، بەڵگە بە ناو و سیفەت دەهێننەوە لەسەر کرداری خودای موتەعال، خودا ئەو کارە دەکات و ئەو کارە ناکات، ئەوەی حیکمەت و زانست و دەوڵەمەندی و حەمدی خودا داوای دەکات ئەنجامی دەدات، ئەوەش کە دژی ئەو

سیفەتانەیە ئەنجامی نادات، خودا –سبحانه– هەردوو ڕێگەكەی لە قورئاندا بەكارهێناوە، لەسەر ڕێگەی یەكەم(واتە ئاسەوار و ئایات بكرێتە بەڵگە بۆ ناو و سیفەتەكانی خودای موتەعال) دەفەموێت ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾فصلت: ٥٣، پاشان دەربارەی ڕێگەی دووەم دەفەرموێت ﴿أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾ فصلت: ٥٣، بۆیە دروستكراوەكانی بەڵگەن لەسەر زات و ناو و سیفاتی، ناو و سیفەتەكانیشی بەڵگەن لەسەر كردارەكانی و ئەمرەكانی، هەروەها بەڵگەن لەسەر ئەو كردار و ئەمرانەی كە ئەنجامیان نادات.

نموونەی ئەوە ناوی ((الحمید)) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە فەرمان بە "الفحشاء و المنكر" ناكات، هەروەها ناوی ((الحكیم)) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە خودا بە هەوانتە و هەروا مەخلوقات دروست ناكات، ناوی ((الغني)) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە خودا هاوسەر و كوڕی ناوێت و پێویستی نییە، ناوی ((الملك)) بەڵگەیە لەسەر پێویستییەكانی موڵكداری، لەوانە: دەسەڵات و تەگبیر و بەخشین و لێگرتنەوە و پاداشت و سزا و بڵاوەپێكردنی نێراوەكانی بە مەملەكەتەكەیدا و ئاگاداركردنەوەی بەندە و كۆیلەكانی بەو مەراسیمانەی دەریدەكات و ئەو پەیمانانەی لەگەڵ ئەوان هەیەتی، هەروەها ئیستیواكردنی لەسەر عەرشی مەجیدی، هەر كات لە دڵی كەسەكەدا مەزنیی حەق –جل جلاله– و سەرنجی ورد و دروست لە بەڵگەكان راستبوویەوە و بینینی ڕۆشنی لێوە بەدەستهێنا و پەندی لێ وەرگرت ئەو كاتە سیفەتەكان بۆ دڵ بەدەردەكەون و دەبنە رووگەیەك بۆی.

پایەكانی ئەم مەعریفەیە:

یەكەم: جێگیركردنی ئەو سیفەتە، واتە بە نەرێكردن و ئینكاركردن مامەڵەی لەگەڵ ناكات.

دووەم: تێیناپەڕێنێت بۆ سەر ناوە تایبەتەكەی كە خودا ناوی لێناوە، بەڵكو ڕێز لە ناوەكە دەگرێت وەك چۆن ڕێز لە سیفەتەكە دەگرێت، سیفەتەكە پەكناخات و ناوەكە ناگۆڕێت بە ناوێكی تر، وەك جەهمییەكان و پەكخەران(المعطلة) دەیانوت: بیستن و بینین و توانا و ژیان و كەلام بۆ خودا سیفەتی لابەلان، و ڕوو و دەست و پێی خوداشیان بە ئەندام و بەشی جەستە ناودەبرد و حیكمەت و ئامانجی كرداری پێویستیشیان ناو دەنا هۆ و مەرام، و ئەو كردارانەش بە خوداوە وەستاون بە ڕووداو

ناویان دەبردن، بەرزی و بڵندی خودا لە مەخلوقات و ئیستیواکردنی لەسەر عەرش بە لایەنگری ناویان دەبرد، بەم مەکرە گەورەیان نەرێی ئەوەیان دەکرد کە وەحی و فیترەت و ئەقڵ و ئاسەواری بەدیهاتووەکان لە سیفەتی خودا بەڵگە بوون لەسەری، بەم جۆرە ناوانە کە خۆیان و باپیرانیان دروستیان کرد بوو نەرێی سیفات و حەقیقەتی ناوەکانی خودایان دەکرد.

بزانە خودای موتەعال هەندێ کرداری داوەتە پاڵ خۆی کە ناوی بکەر(إسم فاعل)ی بۆ بەیان نەکردووە، وەك کرداری"أراد، شاء، أحدث" کە ناوی بکەری "المريد" و "الشائي" و "المحدث"یان بۆ بەیان نەکراوە، هەر بەو جۆرە ناوی "الصانع" و"الفاعل" و "المتقن"نەهاتوون، ناوی تریش کە فرمانەکانیان بۆ خودای موتەعال بەکارهاتوون، دەروازەی کردارەکان کە بۆ خودا بەکارهاتوون بەرینترن لە دەروازەی ناوەکان(یان بکەری ناوەکان).

بە خراپرین و ناشیرینترین شێوە هەڵەیان کرد ئەوانەی لە هەر کردار(فعل)ێك ناوێکیان بۆ خودای موتەعال داتاشی، بەو جۆرە ناوەکانی خودای موتەعالیان لە هەزار تێپەڕاندووە، بۆیە ناوی "الماكر، المخادع، الفاتن، و الكائد"یان لە خودا نا، هەر بەو جۆرە دەروازەی هەواڵدان دەربارەی خودا بە ناوێك فراوانتر لە ناونانی بەو ناوە، هەواڵ دەدات کە ئەو بوونێکی"موجود و مذكور و ومعلوم و مراد"ە، لەگەڵ ئەوەشدا بە هیچ یەکێك لەو ناوە خودای موتەعال ناونانرێت.

ناوی "الواجد" ناوەکەی تەنها لە فەرموودەدا هاتووە کە ناوەکەی لەناو ریزی ناوە جوانەکانی خودای متەعالدایە، دروستەکەی ئەوەیە: ریزکردنی ئەو ناوانە قسەی پێغەمبەر(ﷺ) نییە، و مانەکەی دروستە، خودای موتەعال خاوەنی بوون و دەوڵەمەندییە، خودا شایستەترە بە ئەو ناوە، نەك ناوبنرێت بە "الموجود" و "الموجد"–بكسر الجيم وەرگیراوە، بەڵام وشەی "الموجد"–بفتح الجيم دابەش دەبێت بۆ کامڵ و ناکامڵ(ناتەواو) و خێر و شەڕ، هەر ناوێك ناولێنراوەکەی دابەش ببێت ناچێتە ناو ناوە جوانەکانی خودای موتەعالەوە، وەك "الشيء" و "المعلوم"، بۆیە بە "المريد" و "المتكلم" ناونابرێت، بەڵام ناوی "الموجد" خودا بە کامڵترین جۆریان خۆی ناوناوە کە "الخالق" و "الباريء" و "المصور"ە، بۆیە "الموجد" وەك "المحدث" و "الفاعل" و "الصانع" وایە.

ئەمە لە وردەكارييەكانی ناوە جوانەكانی خودايە لێرابمێنە.

سێيەم: تەشبيە نەكردنی خودا بەوەی بۆ مەخلوقات هەيە، خودای موتەعال "ليس كمثله شيء"-هيچ شتێك وەك خودا بوونی نييە و پێيناچێت، نە لە زاتيدا و نە لە سيفات و كرداريدا، عاريفان بە خودا و تەصديقكەرانی پێغەمبەران و داننەران بە كەماڵيدا ناو و سيفەتی بۆ جێگير دەكەن و نەفی هاوشێوەی مەخلوقاتی لێدەكەن، بۆيە جێگيركردنی سيفات و نەرێكردنی تەشبيە كۆدەكەنەوە، هەروەها پاكڕاگرتن(التنزيه) و پەكخستن(التعطيل) كۆدەكەنەوە، مەزهەبەكەيان چاكەيەكە لەنێوان دوو خراپەدا و هيدايەتێكە لەنێوان دوو گومڕاييدا، ڕێگەكەيان ڕێگەی ئەوانەيە نيعمەتی خودايان بەسەردا داباری، ئيمامی ئەحمەد-ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت- دەفەرموێت ((هيچ سيفەتێك لە سيفەتەكانی خودا لە خودا ناسڕينەوە لەپێناو كارێكی بەدی دوو لايەنە بەدكارەكەدا)) هەروەها دەفەرموێت ((تەشبيە ئەوەيە بڵێيت: دەستی وەك دەستمە)) مەزنی و شكۆمەندی بۆ خودا لەوەی دەدرێتە پاڵی، ئەقڵ بێهيوا بووە لە ناسينی كونە و حەقيقەتی سيفەت و چۆنێتی سيفەت، تەنها خودا خۆی دەزانێت خۆی چۆنە، ئەمەش مانای وتەكەی پێشينە كە دەفەرموون: بەبێ چۆنێتی ((بلا كيف)) واتە بەبێ چۆنێتييەك كە مرۆڤ بيژنەوێت و لێی تێبگات، ئەو كەسەی حەقيقەتی زات و ماهييەتی زاتی خودای موتەعال نەزانێت چۆن حەقيقەت و ماهييەتی سيفەتەكانی دەزانێت؟ ئەم نەزانينەش باوەڕبوون بەو ناو و سيفەتانە و ناسينی ماناكانيان عەيبدار و ناتەواو ناكات، چونكە چۆنێتی لەپشتی ئەوەوەيە، وەك چۆن مانای ئەوانەی خودا دەربارەی ڕۆژی دوايی ڕايگەياندووە تێدەگەين و لە حەقيقەتی چۆنێتييەكەی هيچ حاڵی نابين، لەگەڵ نزيكی نێوان دروستكراو لە دروستكراوەوە، هەر بەو جۆرە دەستەوسانيمان لە ناسينی چۆنێتی خاليق و سيفەتەكانی مەزنتر و مەزنترە.

چۆن ئەقڵی دروستكراو و چوارچێوەدار و سنووردار دەتوانێت ئەو كەسەی كە هەموو كەماڵ و جەماڵ و زانست و توانين و مەزنی و شكۆمەندييەكی هەيە بناسێت؟ ئەو كەسەی گەر پەردە لابدرێت لەرووی پاكی حەوت ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی تێياندايە و لەپشتی ئەوانەوەيە گڕ دەگرن؟ ئەو كەسەی ئاسمانەكانی بەدەستی خۆی

گرتووە، هەروەك دەنكە رەشكەیەك لەدەستی یەكێكماندا، ئەو كەسەی بەراوردی زانستی هەموو مرۆڤەكان بە زانستی ئەو وەك دەنوكی باڵندەیەك وایە بیخاتە ناو دەریاكان، ئەو كەسەی گەر هەموو دەریاكان و حەوت دەریای تریشی بچێتە سەر و هەموو درەختەكان-لەو كاتەوەی ژیان دەستی پێكردووە تا رۆژی دوایی- ببن بە قەڵەم ئەوا مەرەكەب و قەڵەم كۆتاییان پێدێت و هێشتا كەلیماتی خودا كۆتاییان پێنایەت و نانوسرێنەوە.

خودا جەهمی و پەكخەران(المعطلة) بكوژێت، لێرەدا تەشبیه لە كوێدایە؟ نموونادن(التمثيل) لە كوێدایە؟ لێرەدا هەرچی بوونە جگە لە ئەو دەپوكێتەوە، چجای لەو كەماڵە وەك ئەو وابێت و لە ئەو بچێت، پاكێتی بۆ ئەو خودایەی پەردەی داوە بەسەر ئەقڵی ئەوانەدا لە ناسینی خۆی، وێڵی كردن لەگەڵ وەستان لەسەر وشە و مانایەك كە حەقیقەتی بۆ نییە.

كاتێك ئەم دەستەیە سیفاتی خودایان هەر وەك سیفاتی دروستكراوەكانی ناسی هەڵهاتن بەرەو ئینكاری حەقیقەتی ئەو سیفەتانە بە مەبەستی لادانیان و تەحریف كردنیان، ئەو كارەشیان ناو لێنا "تەئویل"، پاشان سیفەتەكەیان پەكخست و گومانی خراپیان بە پەروەردگار و كتێبەكەی و پێغەمبەرەكەی و شوێنكەوتووانی برد.

گومانی خراپ بە پەروەردگار: سیفاتی كەماڵی خودای پێ پەكخرا، پێیان وابوو خودا كتێبێكی دابەزاندووە كە رووالەتی كوفر و باتڵ لەخۆ دەگرێت، بۆیە دەرەوە و حەقیقەتی ئەو كتێبە مەبەست نییە.

گومانی خراپ بردنیان بە پێغەمبەر(ﷺ) چونكە قسەی لەسەر ئەوە كردووە و تەئكیدی لێ كردۆتەوە، و بۆ ئوممەتی بەیان نەكرد كە حەق لە رووالەتی ئەو كتێبەدا نییە، بەڵكو لە تەئویل و شتی تردایە.

گومان بردنیان بە شوێنكەوتووانی پێغەمبەر: بەوەی ئەوانیان دایە پاڵ تەشبیه و نموونادن(التمثيل) و نەزانی و زیادەڕەوی.

چوارەم: لادانی جیاكردنەوە لەنێوان سیفات و زاتی خودای موتەعالدا لە بووندا ئەستەمە، لە بینیندا دەگونجێت بەوەی سیفەتەكە ببینێت و لە بینینی وەسفكراوەكە بێئاگا ببیت، یان وەسفكراوەكە ببینێت و لە سیفەتەكەی بێئاگا ببێت، دارنینی زات

یان سیفات تەنها لە زەیندا راستە، مەعریفە لەم پلەیەدا: وابەستەی هەموو زات و سیفات بووە، زانست و بینین ناتوانێت لە یەکیان جیابکاتەوە، گومانی تێدا نییە ئەمە کامڵترە لە بینینی تەنها سیفەت یان تەنها زات.

مەبەست ئەوە نییە لە دەرەوە و لەناو زانستدا جیاوازی نەکەیت لەنێوان زات و سیفاتدا، بەجۆرێك سیفاتت لێ ببێت بە خودی زات، کەسی یەکتاپەرست ئەو قسەیە ناکات، هەرچەند هەندێك لە ئەربابی ئەهلی کەلام دەڵێن: سیفات بریتییە لە زات، مەبەستیان ئەوە نییە کە زات لە خودی خۆیدا سیفەت بێت، کەسی ئاقڵ ئەم قسەیە ناکات، بەڵکو مەبەستیان: سیفەتەکانی ئەو زاتە شتێکە غەیری زاتەکە، گەر مەبەستیان ئەوە بێت کە مەفهومی سیفەت هەمان مەفهومی زاتە ئەوا ئەو بڕیارەیان لوتبەرزی نواندنە، گەر مەبەستیان ئەوە بێت هیچ شتێکی تر بوونی نییە جگە لە زات و سیفەتەکان دراونەتە پاڵی و بەو زاتەوە راوەستاون ئەوە قسەیەکی حەقە.

راستییەکەی: سیفاتی پەروەردگار-جل جلالە- دەچنە ناو ناوەکەی، ناوی "الله، الرب، الإله" نە ناون بۆ زاتێکی داڕنراو(مجردة)، نە سیفەتن بۆی، هەبوونی زاتێکی داڕنراوی لەو جۆرە بوونەکەی ئەستەمە، تەنها لە زەیندا وەك گریمانەیەك لە گریمانە بەدینەهاتووەکان بوونی هەیە و پاشان حوکمی لەسەر دەردەکات، ناوی "الله، الرب، الإله" ناون بۆ زاتێك کە هەرچی سیفاتی کەماڵ و وەسفی جەلالە بۆ ئەوە، وەك زانست، و توانین، و ژیان، و ویست، و کەلام، و بیستن، و بینین، و مانەوە، و دێرینی، و تەواوی کەماڵ کە "الله" لە زاتی خۆیدا شایستەیەتی، سیفەتەکانی لەناو ناونراوی ناوەکەیدایە، داڕنینی سیفات لە زات و زات لە سیفات تەنها گریمانە و خەیاڵێکی زەینییە و حەقیقەتی نییە، ئەمرێکی ئیعتیبارییە و سوودێکی تێدا نییە، هیچ جۆرە مەعریفەیەکی لێوە سەرهەڵنادات، هەر بەو جۆرە نە ئیمان و نەزانست لێیەوە پەیدا نابن، و لە خودی خۆیدا زانستێك نییە، بەم شێوازە پێشین وەڵامی جەهەمییەکانیان دایەوە کاتێك بەڵگەیان لەسەر خەلقی قورئان هێنایەوە، بەو ئایەتە کە دەفەرموێت ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ ﴾الزمر: ٦٢، وتیان قورئان شتە، کەوابوو مەخلوقە.

پێشین وەڵامیان دانەوە کە قورئان کەلامی خودایە، کەلامی خوداش لە سیفەتەکانییەتی، سیفەتەکانیشی دەچنە ناو ناولێنراوەکەی ناوەکەیەوە، وەك زانست

و توانین و ژیان و بیستن و بینین و روو و هەردوو دەست، "الله" ناوێك نییە بۆ زاتێك كە وەسف و سیفەت و كردار و روو و دوو دەستی نەبێت، ئەو جۆرە خودایە تەنها لە زەیندا لە شێوەیەكی گریمانەدا بوونی هەیە و لەناو بینراوەكاندا نابینرێتەوە، ئەو جۆرە خودایە خودای جەهمییەكانە كەوایان دانا خودایەكە نە لە دەرەوەی جیهانەوەیە و نە لەناو جیهاندایە، نە پەیوەستە بە جیهانەوە و نە لێی جیابووەتەوە، یان وەك خودای فەیلەسوفەكان كە وەك بوونێكی رەها گریمانەیان كرد، بوونێك تایبەتمەندی سیفەت و وەسف و ویست و توانین و كەلامی بۆ نییە، یان وەك خودای ئتیحادییەكان كە وایان دانا بریتی بێت لە بوونێكی گوزەركردوو بەناو دروستكراوەكاندا و دەركەوتوو تیایاندا، ئەو خودایە دەبێتە سەرچاوەی بوونیان، یان وەك خودای نەصاراكان كە وایان دانا هاوسەر و كوڕی بۆ خۆی گرتبێت، زرێپۆشێكی بە ناسووتی كوڕەكەی بۆ لاهوتی خۆی دروست كردووە، واتە كوڕەكەی كردووە بە حیجابێك لە نێوان خۆی و دروستكراوەكانیدا، هەموو ئەم خواوەندانە بەری دەستی بیری مرۆڤن، خودای بەحەقی جیهانەكان: ئەو خودایە پێغەمبەران بانگیان كردووە بۆ لای، و بە ناو و سیفەت و كردارەكانی ناساندوویانە، لەسەرو ئاسمانەكانەوەیە لەسەر عەرشەكەی، لە دروستكراوەكان جیابووەتەوە، و بە هەموو كەماڵێك رازاوەتەوە، لە هەرچی ناتەواوییە پاك و بێگەردە، نموونەی لە بووندا نییە و هاوەڵ هاودەم و پشتیوانی بۆ نییە، هیچ كەس ناتوانێت لەلای شفاعەت بكات هەتا مۆڵەت وەرنەگرێت﴿ هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ (٣) ﴾ الحديد: ٣، لە هەرچی بوونە جگە لە خۆی بێنیازە و هەرچی بوونە لەخوار خوداوە لە زاتی خۆیاندا هەژاری دەرگای خودان.

كە مرۆڤ تاكو تەنهایی پەروەردگاری ناسی بە ئەزەل و مانەوەی هەتاهەتایی و كردارەكانی، هەروەها لەوە تێگەیشت كە جگە لە خودا دەستەوسانە لە هێنانەبوونی گەردیلەیەك یان بەشێك لە گەردیلەیەك، هەروەها تێگەیشت كە لە خودی خۆیدا بوونی نییە، واتە بوونەكەی بوونی خۆی نییە و بەو بوونەی خۆیەوە بوونی نییە و لێیەوە بوونی پەیدا نەكردووە، هاتنی ئەم زانستە بۆ سەر دڵ یادی كەسانی تر لە بیر و ناخدا دەسڕێتەوە، هەر بەو جۆرە دەوڵەمەندی و پەروەردگار و موڵك و قودرەت لە خۆی و

غەیری خۆی نەرێ دەکات و بەو جۆرە پەروەردگار بە تاکوتەنها رادەگرێت و دەبێت بە مەعبوود و بینراو و یادکراو، وەك چۆن تاکوتەنهایە خالیق و مالیك و دەوڵەمەندە و بە هەمیشەیی و هەتاهەتایی بوونی هەیە و بوونەکەشی بە خودی خۆیەوەیە، بەڵام دروستکراوەکان بوونەکەیان پاشکۆی بوونی خودایە و بە خودی خۆیانەوە نەبەستراوەتەوە، هەر کات بەندە لە یاد و بینینی دروستکراوەکان فانی دەبێت ئەو مەعریفەیە لە دڵیدا پاڵفتە دەبێت، و رۆحی بەرەو خودای تاکوتەنها رادەکێشێت، ئەو لە مەیدانێکی بەرینتر لە ئاسمان و زەوی گەشت دەکات، دوای ئەوەی لە بەندیخانەی دروستکراوەکاندا بەندکرابوو، کە دڵی لەسەر خودا بە بەردەوامی راوەستا و دڵی وەك ئەوەی ببینێت سەیری خودای کرد، بینی کە خودا لە بوون و بڕیار و قازانج و زیاندا تاکوتەنهایە، ئەو کاتە مەعریفەی کامڵ و تەواو دەبێت، پەروەردگار کە هەنگاو بە هەنگاو بەندەکەی بەرز دەکاتەوە ناوەوە و ژیری بە زانست نوورانی دەکات، دەبینێت کە جگە لە خودا خالیقێکی تر و پەروەردگارێکی تر بوونی نییە، جگە لە ئەو زیان و قازانج و بەخشین و لێگرتنەوە بەدەستی کەس نییە، هیچ کەس شایستە ئەوە نییە بە کۆتایی گەردنکەچی و خۆشەویستییەوە بپەرسترێت جگە لە خودا، هەرچی مەعبوودی ترە جگە لە رووی پاك و جوانی خودا پووچ و باتڵە، ئەمە بریتییە لە یەکتاپەرستی زانستی.

پاشان کە خودا پلەیەکی تر بەرزی کردەوە: گەڕانەوەی ئەنجامدراوەکان (ئاسەوارەکان) بۆ لای ئەنجامدەرەکە(واتە خودا) دەبینێت، هەروەها گەڕانەوەی کردارەکان بۆ لای ناو و سیفەتەکانی، و وەستانی سیفەتەکانیش بە زاتی خودای موتەعالەوە، ئەو کاتە بینینی غەیری خودا لە دڵیدا دەپوکێتەوە.

پاشان پلەیەکی تر باڵای دەکات: دەبینێت هەموو جیهان بە خوداوە وەستاوە، واتە راگرتنیان و مانەوەیان تاکو تیانەچن، ئەو ـسبحانهـ ئاسمانەکان و زەوی دەگرێت تاکو بەرەو زەوال و تیاچوون نەڕۆن، دەریاکانی گرتووە تاکو بەسەریەکتر و بەسەر جیهاندا قلْپ نەبنەوە، ئاسمانی راگرتووە تاکو بەسەر زەویدا نەکەوێت، باڵندەکانی لە ئاسماندا راگرتووە کە پۆل پۆل لە شەقەی باڵ دەدەن، دڵە تازەکان بە باوەڕ رادەگرێت تاکو لانەدەن و لە باوەڕ خاڵی نەبنەوە، ژیانی گیانداران رادەگرێت تاکو تیانەچن و بگەنە ئەجەلی تایبەت بە خۆیان، بوونی هەموو بوونەوەرەکان رادەگرێت،

گەر بوونی خودا نەبوایە بوونەوەرەکان دەپووکانەوە و بزردەبوون، هەموو شتێك بە کردار و سیفاتی ئەوەوە راوەستاوە، ئەو کردار و سیفەتانەی لە پێویستییەکانی زاتی خودای موتەعالن، بوونی حەقیقی تەنها بوونی خودایە، مەبەستم ئەو بوونەیە کە لە هەرچی شتی ترە بێنیازە، و هەرچی شتی ترە لە زاتیاندا ئاتاج و هەژاری دەرگانەی ئەون، بوونەکان چاوتروکانێك ناتوانن لەسەر بوونی خۆیان رابوەستن، هەتا بەندە خێراتر روو لە خودا بکات خودا خێراتر بەرزی دەکاتەوە، چونکە کاتێك بەندە روو لە خودا دەکات و حاڵی خۆی دەپشکنێ و دەبینێت کە پەروەردگاری لەسەریەتی، لە سەرەتای کارەکەیەوە: ماندووەبێت و ئارامدەگرێت و لە سەنگەردا دەبێت، کە ئارامیگرت و خۆی راگرت و چووە سەنگەرەوە–ئارامیگرت لە نەفسی خۆیدا، و خۆڕاگر بوو بەرانبەر دوژمن، و لە سەنگەری دڵی خۆیدا دانیشت تاکو هیچ جۆرە خەیاڵ و ختوورەیەکی پیادا گوزەر نەکات کە پەروەردگار و دۆستەکەی پێیخۆش نەبێت– و قولاپەکانی شەهەوات و شوبوهاتی لەخۆکردەوە، ئەو کاتە رووکردنە خودای بۆ پاڵفتە دەبێت و نووری چاودێری دەست بەسەر بەشەکانی ناوەوەیدا دەگرێت، و ئەو کات دڵی بە نووری رووتێکردن پڕ دەبێت و لەو نوورەدا نوقم دەبێت، و ستری دەکات لە هەرچی شتە جگە لە خودا، پاشان ئەو نوورە لە ناوەوە بەرەو دەرەوە جاری دەبێت، ئەو کات ناوەوە و دەرەوەی وەك یەکی لێ دێت، و ئاسەواری جەلال و جەمالی پیرۆز لە دڵ و رۆحیدا دەبینێتەوە، بەندایەتی و خۆشەویستی و دوعا و هەژاری و تەوەکول و ترس و رجا و تەواوی کردارەکانی تری دڵ لە ناخی خۆیدا دەبینێتەوە، هیچ شتێك لە مەشهەدی رۆح خەریکی ناکات و مەشهەدی رۆحیش لەو دانابڕێت، سەرنجی بۆ ئەمر و نەهی لە قوڵایی دڵدا دەبینێتەوە، ئەو قوڵاییەی کە ئەمانەتی تیا جێگیر دەبێت، بۆیە مەشهەدی رۆحی نوقم بوو خەریکی ناکات، هەر بەو جۆرە مەشهەدی دڵ لە سەرنجی رەزامەندی پەروەردگار و ئەو شتانەی خۆشیدەوێت و ئەو حەقەی لەسەر بەندەکەی هەیەتی خەریکی ناکات

وازهێنان لە تەگبیر و هەڵبژاردن و دروستیی دانەدەست لە نەفسی خۆیدا دەبینێتەوە، بۆیە بەوە مامەڵە لەگەڵ خودادا دەکات بەجۆرێك موشاهەدەی یەکەم خەریکی ناکات لێی، و هەڵدەستێت بە سەرنجدانی ژێری خۆی بۆ نهێنییەکانی حیکمەتی خودا لە

بوون و بڕیار (خەلق و ئەمر)دا، هەموو ئەوانەش خەریکی ناکات لە سەرنجی بەندایەتی خۆی بۆ پەروەردگاری، بۆیە دەمێنێتەوە بە ڕۆحێکی نوقم بوو لە تاکوتەنهایی خودا و جەلال و کەمالّ و جەمالی ئەودا–سبحانه– خۆشەویستی و شەوق بۆ لیقای نغرۆی کردووە، دڵی ئاوەدانە بە بەندایەتییەکانی دڵ ئەوەش بە سەرنجی حیکمەتی مانای گوتاری خودا، دڵی پاکبووەتەوە لە ئەخلاقە نزمەکان، لەگەڵ خودا و لەگەڵ خەڵك، بووە بە بەندەیەکی تەواو بۆ پەروەردگاری بە ڕۆح و دڵ و ئەقڵ و نەفس و ئەندامەکانی، هەریەکەیان هەڵدەستێت بەو بەندایەتییەی لەسەریەتی، بەجۆرێك بەندایەتی بەشێکیان نابێتە حیجاب بۆ بەشێکی تر و خەریکی ناکات.

## ۞ بە یەکتایی وەك پەروەردگار و خودا دەیپەرستین

کەوابوو ئەهلی یەکتاپەرستی و ئیستیقامە بەرزدەبنەوە بۆ ئەم مەنزیلانە بە دوو شت: یەکێکیان لەویتریان بەرزترە.

یەکەمیان: بینینی پەروەردگاریی و ڕاگریی خودا(الربوبية والقيومية)، تاکوتەنهایی خودا بە ڕاگریی و بەڕێوەبردن دەبینێت، هەر بەو جۆرە بینینی دروستکردن وپێدانی ڕۆزی و پێبەخشین و لێگرتنەوە و زیان و قازانج، هەروەها دەبینێت کە هەموو بوونەوەر کارتێکراوە نەك بکەر و کارتێکەر، ئەوانەش کرداریان هەیە لەناو کردارەکەیاندا کارتێکراون، ئەو شوێنێکە بۆ جاریبوونی ئەحکامی پەروەردگار لەسەری، هیچ شتێکی بۆ خۆی و بۆ غەیری خۆی بەدەست نییە، نە زیان و نە قازانجی لەدەستدا نییە، کە بەندە ئەم مەشهەدەی دەستەبەر کرد: خەیاڵ و ختووورە و ویستی خامۆش دەبێت، بەهۆی سەرنجی بۆ لای ئەو ڕاگر(القيوم)ەی کە تەگبیری هەموو کارەکانی لەدەستدایە، و هەروەها بەهۆی چاوبڕینە ویست و حیکمەتی خودا، ئەو لەو سەرنجانەوە و لە خوداوە بۆ لای خودا تەماشا دەکات، بە بینینی سیفەتەکانی خودا لە بینینی شتەکانی تر فانی بووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەوڵی گەیشتن بە خودا دەدات، و بە واجبەکان و نەوافلەکان هەڵدەستێت.

ئەمری دووەم: بینینی خوایەتی خودایە(الإلهية)، حەقیقەتەکەی: خوداویستی و خۆشویستنی و گەڕانەوەی بەردەوام بۆ لای و تەوەکول لەسەری و ترس و ڕجا لە خودا و

بۆ لای خودا، بە خۆشەویستی خودا لە خۆشەویستی هەموو شتەکانی تر فانی بووە، بە ترس و رجای لە ترس و رجای کەسانی تر فانی بووە، حەقیقەتی ئەم بینینە: بریتییە لە سودوەرگرتن لە ئامۆژگاری و ترس و رجا و بە مەزنزانینی خودا و شکۆدانەپاڵی، ئێمە ئاماژە بە سەرەتا و ناوەند و دەرئەنجامی ئەم بینینە دەکەین و دەڵێین:

بزانە گەر دڵ خاڵی ببێتەوە لە گرنگیدان بە دونیا و وابەستەبوون بە ماڵ و دارایی و ریاسەت و شانوشکۆ، لە جێگەی ئەوە بە دوارۆژەوە وابەستە بوو و گرنگی بۆ دوارۆژ بە ئامادەکردنی توێشوو زیادی کرد و خۆی ئامادە کرد بۆ رۆیشتن بەرەو خودا ئەوە دەبێتە یەکەمین فەتح بۆی و هەڵهاتنی بەرەبەیان، ئەو کات دڵی دەکەوێتە جووڵە بۆ ناسینی ئەوەی خودا پێی رازییە و داوای دەکات لە ئەو، هەروەها ناسینی ئەوەی خودا توورە دەکات و دوورکەوتنەوە لێی، ئەمە بریتییە لە ناونیشانی صدقی کەسەکە لە ویست و لێبڕانیدا، هەر کەس یەقینی هەبوو بە لیقای خودا و زانی کە دوو وشەی لێ دەپرسێت، ئەو دوو وشەش لە پێشین و پاشین دەپرسرێت کە بریتین لە: چیتان دەکرد؟ و چ وەڵامێکی پێغەمبەرانتان دایەوە؟ هەر دەبێت لابکاتەوە بەلای داوای ناسینی مەعبوودەکەی و ئەو رێگەیەی بە ئەوی دەگەیەنێت، کە دەستەبەری ئەوەی کرد: دەروازەی هۆگربوون بە خەڵوە و تەنهایی و شوێنی چۆڵ کە جووڵە و دەنگیان تێدا نامێنێت بۆ پەیدا دەبێت، بەجۆرێك هیچ شتێك بە ئەندازەی ئەوە تامەزرۆی ناکات، چونکە هێزەکانی دڵ و ویستی لەسەر کۆدەبێتەوە و دەرگای پەرتبوون و شڵەژانی دڵی لێ دادەخات و پێیەوە هۆگردەبێت و وەحشەتی لە خەڵك بۆ دروست دەبێت.

## ۞ بەرزبوونەوە بۆ لوتکە

پاشان دەرگای شیرینی عیبادەتی بەروودا دەکرێتەوە بەجۆرێك ناتوانێت لێی تێر ببێت، چێژ و ئاسوودەییەکی وای تیادا دەبینێتەوە کە بارەهای ئەو تام و چێژەیە لە گاڵتە و گەپ و بەدەستهێنانی شەهەواتدا دەیبینێتەوە، بەجۆرێك کاتێك دەچێتە ناو نوێژەوە حەز ناکات لێی بێتە دەرەوە، پاشان دەروازەی شیرینی بیستنی کەلامی خودای بەڕوودا دەکرێتەوە، لێی تێر نابێت، کە دەیبیستێت دڵی ئارام دەبێتەوە، وەك ئەو منداڵەی کە ئارام دەبێتەوە بە پێدانی ئەو شتەی کە زۆر خۆشیدەوێت، پاشان

دەروازەی بینینی مەزنی و شکۆمەندی خودا کە بەو کەلامە قسە دەکات بەڕوویدا دەکرێتەوە، هەروەها دەروازەی کەماڵی سیفەت و حیکمەتی خودا و مانای گوتاری خودا، بەجۆرێك دڵ تیایدا ڕۆدەچێت تا تیایدا بزر دەبێت، بەدڵ هەست دەکات چووەتە ناو جیهانێکی ترەوە جیا لە جیهانەکەی خەڵك.

پاشان دەروازەی حەیا لە خودای بەڕوودا دەکرێتەوە کە یەکەمین شاهیدی مەعریفەیە، ئەوەش نوورێکە دەکەوێتە ناو دڵەوە، ئەو نوورە نیشانی دەدات کە لەبەردەستی خودای متەعالدایە، بۆیە لە خەڵوە و تێکەڵبوونیدا حەیای لێدەکات، لەو بارەدا: بەردەوامیی چاودێری خودای "الرقیب"ی پێ دەبەخشرێت، هەروەها بەردەوامیی سەرکێشان بۆ ئامادەبوون لە خزمەتی خودای موتەعالدا، تا وەك ئەوەی بیبینێت لەسەرو ئاسمانەکانەوە و لەسەر عەرشی مەزنی، تەماشای خەڵکی دەکات و گوێ لە دەنگەکانیان دەگرێت و لە ناخ و ناوەوەیان دەڕوانێت، گەر ئەم شاهیدە دەستی بەسەردا گرت زۆرێك لە خەم و پەژارەی دونیای لێدەکاتەوە، ئەو لە بوونێکدایە و خەڵکیش لە بوونێکی تردا، ئەو لە بوونی وەستان لە بەردەمی خودا و دۆستەکەیدا و خەڵکیش لەژێر پەردەی جیهانی شەهادەی دونیادا، ئەو دەیان بینێت و ئەوان نایبینن، تەنها ئەوەندە لە ئەو دەبینن لەگەڵ جیهان و بوونی خۆیاندا گونجاو بێت.

پاشان دەروازەی شعوری بینینی ڕاگریی خودا بەڕوویدا دەکرێتەوە، هەموو گۆڕانکارییە گەردوونییەکان و هەڵسوڕانە وجودییەکان تەنها لە دەستی خودای موتەعالدا دەبینێت، خودا دەبینێت وەك مالیکی قازانج و زەرەر دروستکردن و ڕۆزیدان و ژیانەوە و مراندن، بۆیە خودا دەکات بە وەکیل و پێی ڕازی دەبێت وەك پەروەردگار و کارهەڵسوڕێنەر و کافی بۆ کاروبارەکانی، لەو بارەدا کاتێك سەرنجی بۆ لای شتێك لە دروستکراوەکان ڕادەکێشرێت دروستکەر و بەدیهێنەری پێ نیشان دەدات و سیفاتی کەماڵ و جەلالی دەخاتە پێش چاو، دروستکراوەکان نابنە حیجاب لە نێوان ئەو خودادا، بەڵکو هەر دروستکراوێك لە دروستکراوەکان بە زمانی حاڵ هاوار دەکات و دەڵێت: من دروستکراو و دەستکردی ئەو کەسەم کە هەموو شتێکی بە وردترین شێوە خولقاندووە.

گەر ئەوەی بۆ بەردەوام بوو: هەموو گەردوون لە دڵیدا دەپێچرێتەوە بەجۆرێك تەنها خودای "الواحد القهار" لە دڵیدا دەمێنێتەوە، نووری مەعریفە و مامەڵە و صدق و

ئیخلاص و خۆشەویستی لە دڵییەوە قوڵپ دەدەن، وەك چۆن نووری خۆر لە خۆرەوە قوڵپە دەكات و پەخش دەبێتەوە، ئەو كاتە لەناو نووردا نغرۆ دەبێت وەك چۆن كەسێك لە دەریادا نوقم دەبێت، ئەوەش بە وەرزش و تێكۆشانێكی زۆر دەبێت، هەروەها لادانی حوكمەكانی سروشتی مرۆیی و وەستانی زۆر لە بەردەم دەرگای خودادا.

گەر وەستانی لەبەردەم دەرگای دۆستدا بەردەوام بوو لا بەلای راست و چەپدا ناكاتەوە و تەنها وەڵامی ئەو كەسە دەداتەوە كە بانگی لێ دەكات، دەزانێت كارەكە لە پشتی ئەوەوەیە و هێشتا نەگەیشتۆتە بەرەوە، هەر كات وەهمی گەیشتنی بۆ دروست بوو ئەوا "بۆ زیادكردن"ی لێ دەگێڕێتەوە، ئەو رجای وایە فەتحێكی تر بە روویدا بكرێتەوە كە لەسەرو ئەوەوە بێت كە تێیدایە، دڵی رۆدەچێت لەناو نووری بینینی جەلالی خودای موتەعالدا لەدوای دەركەوتنی نووری بوونی حەق -سبحانە- ئەو كاتە دڵی دەمێنێتەوە لەناو مەلەكردن لە دەریای نووری ئاسەواری جەلالدا، و دڵی بالاتر لە هەموو ئەوانە دەبینێتەوە، بەرز دەبێتەوە بۆ لای ئەو كەسەی هیچ كەس لە سەریەوە نییە، پاشان خودا -سبحانە- بەرزی دەكاتەوە، نووری ئیكرامی دوای نووری جەلال پێ نیشان دەدات، لە ناو نوورێك لە ئەنواری تیشكی جەمالدا نوقم دەبێت، لەم مەشهەدەدا تامی خۆشەویستی تایبەت و بڵێسەسێنی رۆح و دڵ دەكات، دڵ دەبێتە ئەسیری دەستی خۆشەویستەكەی و دۆستەكەی و بەخۆشەویستی ئەوەوە گیرۆدە دەبێت.

هاوار بۆ ئەو دڵە گیرۆدە و نوقم و نغرۆبووەی ناو تیشكی ئەنواری جەمالی یەكتایی خودا! خەڵكیش گیرۆدە و مەفتوون لە ناو شتە فانییەكاندا لە ماڵ و دەسەڵات و شتە رواڵەتییەكان، بەر لەوەی بەدەستی بهێنن ئازاری بۆ دەخۆن و كە بەدەستی دەهێنن ئازار دەچێژن و دوای بەدەستهێنانیش هەر بەو جۆرەن، پایەدارترینیان: كەسێكە عاشقی حۆرلعەین بووە، یان كار دەكات بۆ ئەوەی لە بەهەشتدا بخوات و بخواتەوە و بپۆشێت و هاوسەریی بكات، بەڵام خۆشەویست(المحب)ی نوقم بوو لە تیشكی ئەنواری جەمالدا هەندێ جار لە پلەی خۆشەویستیدا بەسەر ئەهلی مەقاماتدا بەرز دەبێتەوە، لە بەهەشتدا وەك چۆن تەماشای هەسارەیەكی پرشنگداری ئاسۆ دەكرێت ئاوا تەماشای پلە و پایەی ئەو كەسە دەكرێت، ئەمەش بەهۆی بەرزیی پلە و نزیكیی مەنزیلەی لە خۆشەویستەكەیەوە، مرۆڤ لەگەڵ خۆشەویستەكەیدایە، بۆ هەر

كـرداریكیش پاداشـتیك هەیـە، پاداشـتی خۆشەویسـتی خۆشەویسـتی و نزیكییـە لـە خوداوە، ئەمە ئـەو كەسـەیە كـە چاكسـازی دەكـات، بەسـە شـەرەف و گـەورەیی بـۆ كەسێك ئەمە حاڵی بێت لە دونیای گوزەركردەدا، دەبێ گومانت چۆن بێت بە مـەقامی ئەو كەسـانە لـەلای مـەلیكی خـاوەن دەسـەڵات؟ دەبـێ چـۆن بێـت كـە لـە وەسـتانی قیامەتدا دەیانبینی بانگكەرێك بانگ دەكات ((با هەر دەستەیەك بچن بـۆ لای ئـەوەی دەیانپەرسـت)) ئـەوان لـە شـوێنی خۆیـان دەوەسـتن و چـاوەڕوانی مـەعبوود و خۆشەویستی خۆیانن كە خۆشەویسترین كەس بووە لەلایان، پەروەردگاریان دێت بـۆ لایان و ئەوانیش تەماشای دەكەن و ئەویش جیلوە دەكات و بۆیان پێدەكەنێت.

مەبەستەكە: ئەو بەندەیە بەردەوام لە ئاستێكەوە بۆ ئاستێكی تر و لە مەنزیلەیەكەوە بۆ مەنزیلەیەكی تر پەروەردگار بەرزی دەكاتەوە تا بەخۆی دەگەیەنێت، لـەلای خـۆی جێگیری دەكات، یاخود لە رێگەدا دەمرێت، و پاداشتەكەی دەكەوێت بەسەر خـودادا، بەختەوەر و سەركەوتوو كەسێكە بـەلای راسـت و چـەپدا لـە پـەروەردگاری لانـادات، كەسێكی تر ناكات بە پەروەردگار و وەكیل و خۆشەویست و كارهەڵسوڕێن و حـاكم و سەرخەر و رۆزیدەر.

كـۆی ئـەوەی باسـكرا لـە مـەقاماتی گەیشـتن بـە خـودا: شـاهید و نموونـەن گـەر حەقیقەتەكان-بەپێی ئامادەیی و لوتف و نەرمی دڵـی بـەجۆرێك كـە نایانبینێـت- لـە پەنهانەوە بۆی دەركەوتن، ئەوا لەو جیلوەكردنەوە شـاهیدێك لـە دڵدا دەردەكـەوێت، ئەو شاهیدە ئاماژەیە بەو حەقیقەتانە نەك خودی حەقیقەتەكان بن، نووری جەلال لـە دڵدا خودی نووری خاوەن جـەلال نییـە لـە دەرەوەدا، چـونكە نـووری خـاوەن جـەلال ئاسمانەكان و زەوی خۆیان لەبەردەمیـدا رانـاگرن، گـەر ئـەو نـوورە بـۆ هـەموو بـوون دەربكەوێت تەخت دەبێت، بەڵكو شاهێكە و بەڵگەیە لەسـەر نـووری خـاوەن جـەلال، وەك چۆن نموونەی باڵا (المثل الأعلى) شاهیدە لەسەر زاتـی خـودای موتـەعال، حـەق- سبحانە- لەو دیو هەموو ئەمانەوەیـە، ئـەو-سـبحانە-پـاك و بێگـەردە لـە چـوونە نـاو شـتەكان و توانـەوە تیایانـدا(الحلـول) و تێكـەڵاوبوون و یـەككرتن (الإتحـاد) بـە دروستكراوەكانی، بەڵكو ئەوانە شاهیدگەلێكن لە دڵی عاریفدا راست دەبنەوە، بەڵگەن لەسەر نزیكیی لوتفی خودا لە ئەوەوە و لەناو ئەو جیهانە پەنهانەی كە دەیبینێت.

گەیشتن بە خودای موتەعال حەقە، کەسی گەیشتوو ئاسەواری جیلوەکردنی سیفات لە دڵیدا دەبینێتەوە، هەر بەو جۆرە ئاسەواری جیلوەکردنی حەق لە دڵیدا، دڵ لەسەرو هەموو گەردوونەکانەوە و لەبەردەم خودادا رادەوەستێت، ئەو-سبحانه- لەسەر عەرشی مەزنی خۆیەتی، بەندە لەو شوێنەوە ئاسەواری جەلال و ئیکرام دەبینێتەوە، عەرش و کورسی لەژێر مەشهەدی دڵیدا لە رووی حوکمەوە دەبینێت، ئەوەی دەیبینێت بریتی نییە لە حەقیقەتی عەرش و کورسی، بەڵکو تەنها شاهید و نموونەی زانستین، بەڵگەیە لەسەر نزیکیی دڵی لە پەروەردگارییەوە و نزیکیی پەروەردگاری لە دڵی ئەوەوە، لەنێوان ئەو دوو چێژەدا جیاوازی زۆر هەیە، گەر پەروەردگار لە دڵی بەندەکەی نزیك ببێتەوە هەموو گەردوونەکان لەژێر مەشهەدی دڵیدا دەمێنێتەوە، ئەو کاتە سەیری خۆری یەکتاپەرستی دەکات و دەگات بە سەرئەنجام(وينال التحقيق)، بە جیاکردنەوەی ئەوەی لەگەڵیدایە لە حەق، بە حەق و لە پێناوی حەقدا(بتخليص مصحوبه من الحق، بالحق وفي الحق)، وەك شێخی هەروی دەفەرموێت و بەم ئایەتە بەڵگە دەهێنێتەوە ﴿أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي﴾ البقرة: ٢٦٠

رووی ئاماژەی ئایەتەکە: ئیبراهیم(ﷺ) داوای گواستنەوەی کرد لە ئیمانی زانستییەوە بە زیندووکردنەوەی مردوو بۆ ئیمانی شهودی(واتە بینینی زیندووکردنەوەی مردوو بە چاو ببینێت)، دوای بەدەستهێنانی زانستی زەینی داوای تەحقیقی دەرەکی کرد، ئەو جۆرە بینینە کاریگەری زۆرتری هەیە لەسەر دڵنیایی، هەروەها لەبەر ئەوەی لەنێوان ((زانست)) و ((بینین))دا مەنزیلەیەکی تر هەیە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((ئێمە لەپێشترین بە شك لە ئیبراهیم)) کاتێك فەرمووی ((خودایە پێمان نیشان بدە چۆن مردوو زیندوودەکەیەوە)) ئیبراهیم(ﷺ) شکی نەبوو، هەر بەو جۆرە پێغەمبەر(ﷺ) شکی نەبوو، بەڵام ناوی "شك"ی بۆ ئەو ئاستە زانستییە بەکارهێنا بەهۆی ئەو جیاوازییەی لەنێوان ئەو ئاستە و ئاستی بینیندا هەیە لە دەرەوە(جیاوازی نێوان هەر مەنزیلەیەکی نزم بەراورد بە مەنزیلەکەی سەرەوەی خۆی وەك جیاوازی نێوان شك و یەقینە، بۆیە گەر ئیمانی زەینی و زانستی بەراورد بە ئیمانی شهودی بە شك ناوببرێت مەبەست ئەوە نییە گومان لە باوەڕدا بوونی هەیە)، هەروەها لەبەر ئەوەی ئەم ئاستە پێیدەوترێت زانستی یەقینی-بەر لە بینینی

زانراوەكەی- بە گومان، وەك خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿٤٦﴾ ﴾ البقرة: ٤٦، هەروەها ئایەتی﴿ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ ﴾ البقرة: ٢٤٩، ئەم گومانە وەهم و شك و دڵەڕوكێ و دڵكرمێنی نییە بەڵكو زانستی تەواوە، وەك لەم ئایەتەدا هاتووە ﴿ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُ ﴾ البقرة: ٢٢٣، بەڵام لەنێوان هەواڵ و بینیندا جیاوازی هەیە، لە مەسنەدی ئیمام ئەحمەددا لە فەرموودەیەكی بەرزكراوەدا هاتووە ((هەواڵ وەك بینین نییە)) بۆیە كاتێك خودا هەواڵی بە موسا(عليه السلام) دا: كە قەومەكەی تووشی فیتنە كردووە و "سامری" گومڕای كردوون لەو كاتەدا تووڕەیی بۆ پەیدا نەبوو، لەوحەكانی هەڵنەدا تا گەڕایەوە و بە چاوی خۆی بینی، بە بینینەكە تووڕەبوون داگیری كرد و لەوحەكانی تەوراتی هەڵدا.

## ۞ تەحقیق ترازووی كەسی یەكتاپەرستە

كاتێك ئەمەمان زانی: ئەوا -گەر خودا بیەوێت- ئاسان دەبێت تەحقیقی ئەم جۆرە ناسینە بكەی.

{لێرەدا ڕونكردنەوە لەسەر قسە پێشووەكەی شێخی هەروی دەدات كە فەرمووی: "دەگات بە سەرئەنجام(وينال التحقيق)، بە جیاكردنەوەی ئەوەی لەگەڵیدایە لە حەق، بە حەق و لە پێناوی حەقدا(بتخليص مصحوبه من الحق، بالحق وفي الحق)"}

وشەی "التحقيق" لەسەر كێشی "التفعيل"ە لە "حقق شيئا تحقيقا"ەوە هاتووە، كەوابوو دەبێتە چاوگ(مصدر) و فرمانەكەی "حقق الشيء" واتە "أثبته وخلصه من غيره"-جێگیری كرد و لە شتی نامۆ پاكیكردەوە.

وشەی"المصحوب"هەموو ئەو شتانەیە كە هاوەڵی مرۆڤ دەكات لە مەبەست و مەعریفەی كەسەكەدا لە زانراو و موراددی.

وشەی "الحق" بریتییە لە "الله"-سبحانه- و ئەوەی مرۆڤ بە خودا دەگەیەنێت و مرۆڤ لە ڕەزامەندی خودا نزیك دەكاتەوە.

كە ئەمەی زانی ئەو كاتە هاوەڵی كەسەكە لە حەق: بریتی دەبێت لە مەعریفە و خۆشەویستی و ویستی ڕووی پاك و بێگەردی خودای موتەعال، و ئەوەی كۆمەكی دەكات لەسەر گەیشتن بە خودا، هەروەها هەموو ئەو شتانەی لە سلوكەكەیدا ئاتاجە

پێیان، بۆیە "تحقیق" بریتییە لە رزگارکردنی لەو شتانەی تێکدەرن و رێگەی لێ دەبڕنەوە، و وادەکەن دڵ نەگاتە ئەوەی مەبەستییەتی و بە ئامانجی گرتووە، هەروەها پارێزگاری لێ کردنی لە تێکەڵ کردن و رزگارکردنی لە شپرزکەرەکان، هەموو ئەوانە رێگرن لەبەردەم سالیکدا بۆ هاوەڵی کردنی حەق و دووری دەخەنەوە.

خاوەنی مەقامی تەحقیق: لەگەڵ شتە لابەلاکاندا ناوەستێت، چونکە ئەوانە رێگەی لێ دەبڕنەوە، دەبێت هەتا دەتوانێت خۆی لێیان لابدات، چونکە بە خۆلادان زۆر بەخێرایی گوزەر دەکەن و تێدەپەڕن، با هەوڵبدات بازنەی ئەو شتە لابەلانە فراوان نەکات، چونکە هەر کات فراوانی دەکات ئەوانیش بەرینتر دەبن، و مەیدانی فراوانتر دەبیننەوە، گەر بەرتەسکی بکاتەوە-بەپشتتێکردن و خۆبێئاگا کردن لێیان- ئەوا دەپووکێنەوە و لەبەین دەچن، کەسی خاوەن مەقامی تەحقیق: ئەو شتە لابەلانە لەبیر دەباتەوە و ئاسەواریان دەسڕێتەوە، و دەزانێت ئەوانە لە خانەی تاقیکردنەوە و ئافاتدا(واتە دونیا) بە حوکمی قەدەرەکان هاتوون.

شێخولئیسلام ئیبن تەیمیە-رەحمەتی خوای لێ بێت- جارێکیان پێی فەرمووم- لەمپەرەکانی رێگە و میحنەتەکان وەك گەرما و سەرما وان، گەر کەسەکە زانی ئەو دۆخە هەر دەبێت ببن، ئەوا بە هاتنیان تووڕە نابێت و خەم و پەژارە و دڵتەنگی رووی تێناکات.

گەر بەندە لەسەر ئەو کۆسپ و لەمپەرانە ئارامی گرت و رێگەکەی لێ نەگیرا و دانەبڕا لە کاروان ئەوا هیوا وایە ئەو کەسە بگاتە مەقامی تەحقیق، بە تەنها لەگەڵ "هاودەمی حەق"ی خۆیدا دەمێنێتەوە، نەفسی پاڵفتە دەبێت و لەگەڵ خودا ئارام دەبێتەوە و لە خۆوخدە و دەقپێوەگیراوە خراپەکان خۆی دوور دەخاتەوە، تا خۆشەویستی خودا دڵ و رۆحی نوقم دەکات، و ئەندامەکانی شوێنی فەرمانەکان دەکەون، لەو کاتەوە بەدڵ هەست دەکات کە لەگەڵ خودابوون و سەرپەرشتیاری خودایی بۆ پەیدا بووە، بۆیە لە جووڵە و سەکەناتیدا لەگەڵ خودایە نەك لەگەڵ نەفسی، ناسینە خواییەکان دادەبارێنە سەر نەفسی، و موشاهەدەی خوایەتی و راگری و تاکوتەنهایی(الإلهیة و القیومیة و الفردانیة) خودای موتەعال دەکات، خولگەی ناسینی خودا و گەیشتن بە خودا لەسەر ئەو سێ مەشهەدەیە.

مەبەستەكە: خاوەنی مەقامی تەحقیق: حەق دەناسێت و لە باتڵ جیای دەكاتەوە، دەست بە حەقەوە دەگرێت و باتڵ دەسڕێتەوە، ئەمە ئاستێك، پاشان بۆی ڕووندەبێتەوە: كە ئەو ئاستە یان ئەو پلەیە بەدەستی خۆی نییە، بەڵكو بە خودای موتەعالەوەیە، ئەو كات لە هەوڵ و هێزی خۆی دێتە دەرەوە، و دەزانێت هەوڵ و هێزی ئەو بە خوداوەیە، پاشان لەو مەقامەدا قووڵ دەبێتەوە و دادەمەزرێت، و لە دڵیدا ریشە دادەكوتێت، ئەو كاتە تەحقیقەكەی بەخودا و لەناو خودادا دەبێت.

لە یەكەمدا: داواكەی خۆی لە شتی تر پاك دەكاتەوە و لە هەرچی شتێك لەخوار خوداوە خۆی دادەڕنێت.

لە دووەمدا: لە خۆدانە پاڵ هەر كەس و شتێك جگە لە خودا رزگاری دەبێت، ئەو تەنها خۆی دەداتە پاڵ خودا–سبحانە–

سێیەم: شهودی ڕووت دەبێتەوە بەجۆرێك تەنها لە پێناوی داواكەیدا دەبێت.

یەكەمیان سەفەرە بۆ لای خودا، و دووەمیان سەفەرە بە خوداوە، و سێهەمیان سەفەرە لەناو خودادا.

گەر مانای ((سەفەر لەناو خودا)) تەمومژی بۆ دروست كردی، ئەوە بزانە جیاوازی لەنێوان ئەوە و ((سەفەر بۆ لای خودا)) بریتییە لە جیاوازی نێوان حاڵی عاریفی زاهیدی ڕۆیشتوو بۆ لای خودا–كە لە ناوە جوانەكان و سیفەتەكان و ناسینی تایبەت دەروازەی بەڕوودا واڵا نەبووە– لەگەڵ حاڵی ئەو عاریفەی كە دەروازەی ناسینی ناوە جوانەكان و سیفات و تێگەیشتن لێیان بەڕوویدا واڵاكراوە و لە كەسانی تر داخراوە.

گەر زانست دەدەیە پاڵ خۆت بەر لە گەیشتن بە مەقامی تەحقیق، ئەوا لە حاڵەتی گەیشتن بە مەقامی تەحقیقدا دانەپاڵی زانست بۆ مامۆستاكەی دەگەڕێتەوە كە پێی بەخشیوە، ئەو كەسەش خودای موتەعالە، لەوانەیە ئەمە مانای قسەی پێغەمبەران بێت–صلوات الله وسلامه علیهم أجمعین– كاتێك پەروەردگار كۆیان دەكاتەوە پێیان دەفەرموێت ﴿مَاذَآ أُجِبۡتُمۡۖ قَالُواْ لَا عِلۡمَ لَنَآ﴾المائدة: ١٠٩، وتراوە: وەك ئەدەبێك لە خزمەتی خودادا ئەو قسەیان كردووە، كاتێك ویستویانە زانست بۆ خودا بگێڕنەوە، هەروەها وتراوە: ئێمە زانستمان نییە بە حەقیقەتی ناوەوە، بەڵكو ئەوانەی وەڵامیان

داینەوە بە دەرەوە وەڵامیان داینەوە و ناوەوە لە ئێمە پەنهان بوو، تۆش بۆ خۆت "علام الغيوب"یت.

راستییەکەی:–گەر خودا بیەوێت–: ئەوەیە کە زانستەکەیان لەناو زانستی خودادا بزر بووە و پووکاوەتەوە، بەراورد بە زانستی خودا زانستەکەیان وەك نازانستی لێهاتووە، بۆیە هەموو زانستیان گێڕایەوە بۆ لای خاوەن زانست و ئەهلی زانست، کە لە هەموو کەس بە زانست لەپێشترە، زانستی ئەوان و زانستی هەموو دروستکراوەکان بەراورد بە زانستی خودا وەك دەنووك خستنە ناو دەریاکانی جیهان وایە لە لایەن باڵندەیەکەوە، دەبێت چەندە ئاو بە دەنووکییەوە بلکێت؟!

۞ ۞ ۞

## (٦٣) (منزلة رعاية الأسباب)

# مەنزیلەی ڕەچاوکردنی هۆکارەکان

لە مەنزیلەکانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی ڕەچاوکردنی هۆکارەکانە.

یەکتاپەرستی داوا دەکات بە هۆکارە ئاشکراکان هەڵبستێت، وەك جووڵە و کار و گرنگی پێدان و پشتگوێ نەخستن و پەکنەخستنیان، بەڵام لەگەڵ ئەوەی بەو جووڵە و کارانە هەڵدەستێت بە سەرچاوەی سەرکەوتن و ڕزگاربوونی خۆی تەماشایان ناکات، وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((کار بکەن و بزانن: هیچ کەس لە ئێوە بە کاروکردەوەکانی خۆی ڕزگاری نابێت)).

هەر بەو جۆرە بە هۆکارە ناوەکییەکان هەڵدەستێت، وەك ئیمان و تەصدیق و خۆشەویستی خودا و پێغەمبەر(ﷺ) کە ڕزگاربوون پێیانەوە بەستراوەتەوە، خودی یەکتاپەرستی لەو هۆکارانەیە، بەڵکو مەزنترین هۆکاری ناوەکییە.

هەستان بە هۆکارەکان و گرنگی پێدانیان و دانانیان لەو شوێنەی کە خودا تیایدا دایناون: بریتییە لە خودی یەکتاپەرستی و بەندایەتی، بە تەصدیقی بەڵێن و هەڕەشەکان و بە مەزنڕاگرتنی ئەمر و نەهی، وەك لە فەرموودەیەکی سەحیحدا لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ((هیچ کەس لە ئێوە نییە شوێنەکەی لە بەهەشت و لە دۆزەخ نەزانرابێت، ئەی پێغەمبەری خودا: ئایا کردار وازلێبهێنین و شان لەسەر نووسراوەکە دابدەین؟ فەرمووی: نەخێر، کار بکەن، هەر کەس بۆی ئاسانکراوە بگات بەو شتەی لەپێناویدا خولقێنراوە)) هەروەها لە فەرموودەیەکی سەحیحی تردا لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) پێی وترا: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەم ماندووبوون و کارکردنەی خەڵکی لەم ژیانەدا چۆن دەبینیت، ئایا ئەمر و بڕیارێکە بەسەریاندا گوزەری کردووە، یان لەوەی ڕووبەڕووی دەبنەوە لە کاروکردەوەگەلێك کە خودا تیایاندا حوجەی پێداون؟ فەرمووی: ئەمر و بڕیارێکە بەسەریاندا گوزەری کردووە، وتیان ئەی پێغەمبەری خودا کردار واز لێ بهێنین و شان لەسەر نووسراوەکەمان دابدەین؟ فەرمووی: نەخێر، کار بکەن، هەر کەس ئاسانکاروی بۆ کراوە بۆ گەیشتن

بەو شتەی لەپێناویدا خولقێنراوە)). لە "السنن"دا لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) پێی وترا((بەکارهێنانی دەرمان بۆ چارەسەر چۆن دەبینی، یان بەکارهێنانی روقیە(الرقیة) و خۆپارێزی(التقاة) کە خۆمانی پێ بپارێزین، ئایا شتێك لە قەدەری خودا رەد دەکەنەوە؟ فەرمووی ئەوانە لە قەدەری خودان))، هەر بەو جۆرە فەرموودەکەی عمر بۆ ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراح-خوا لێیان رازی بێت- ئەبو عوبەیدە بە عومەری فەرموو: ئایا لە قەدەری خودا هەڵدێیت؟-واتە لە تاعونەکە- عومەر فەرمووی: لە قەدەرێکی خوداوە هەڵدێین بۆ قەدەرێکی تری خودا.

ئەوەش لە سەفەرەکەی عومەردا بوو بۆ شام کە لەوێ تاعوونی "عمواس" هەبوو، عومەر گەڕایەوە، ئەبو عوبەیدە پێیفەرموو: ئایا لە قەدەری خودا هەڵدێیت؟ فەرمووی: گەر کەسێکی تر ئەو قسەی بکردبایە ئەی ئەبو عوبەیدە؟ لە قەدەرێکی خوداوە هەڵدێم بۆ قەدەرێکی تری خودا، پاشان بانگی لە سوپاکە کرد: ئایا کەسێك هەیە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) دەربارەی تاعوون شتێکی بیستبێت؟ عبدالرحمنی کوڕی عەوف هات کە لە دواوەی سوپاکەوە بوو فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو دەیفەرموو: گەر لە ولاتێك بوون تاعوونی تێدا بوو لێی دەرمەچن، گەر هەواڵتان بیست لە ولاتێکدایە و ئێوە لە دەرەوەی ئەو ولاتەوە بوون ئەوا رووی تێمەکەن، مانای ئایەتی ﴿ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَائِنُهُ وَمَا نُنَزِّلُهُ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴿٢١﴾ ﴾ الحجر: ٢١، وەك ئایەتەکەی پێش خۆی وایە ﴿وَأَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْزُونٍ ﴿١٩﴾ ﴾ الحجر: ١٩، هەروەها ئایەتی ﴿ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾ ﴾ القمر: ٤٩، هەروەها ئایەتی ﴿ وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ ﴾ یس: ٣٩، هەروەها ئایەتی ﴿ وَاللَّهُ يُقَدِّرُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ ﴾ المزمل: ٢٠، هەروەها ئایەتی ﴿ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا ﴿٣﴾ ﴾ الطلاق: ٣، هەروەها ئایەتی ﴿ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾ ﴾ الفرقان: ٢، هەروەها ئایەتی ﴿ مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ ﴿١٩﴾ ﴾ عبس: ١٩، هەروەها ئایەتی ﴿ وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ ﴾ المؤمنون: ١٨، هەروەها ئایەتی ﴿ وَلَوْ بَسَطَ اللَّهُ الرِّزْقَ لِعِبَادِهِ لَبَغَوْا فِي الْأَرْضِ وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَّا يَشَاءُ ﴾ الشوری: ٢٧، مانا لە هەموو ئەمانەدا رۆشنە: خودای موتەعال بە نیزام و رێکخستنێکی تایبەت رێکیخستوون کە هۆ و دەرئەنجامیان تێدایە، هیچ شتێکی بەهەوانتە و بەبێ مانا و حیکمەت نەخولقاندووە و هەموو شتێك تەقدیرێکی پێشینەی زانست و حیکمەتی لەگەڵە،

نەخۆشی بە قەدەری هۆیەکەوەیە و شیفاش بە قەدەری هۆیەکی ترەوە، لەوانە دەوا و هێزی میزاجە، هیچ شتێك ڕێکەوت و هەوانتە نییە، وەك نەفامان بانگەشەی بۆ دەکەن، ئەو کەسانەی کە خودا بە ناو و سیفەت و ئاسەواری زانست و حیکمەت و ڕەحمەت ناناسن.

خودای موتەعال دەربارەی هەور دەفەرموێت ﴿فَأَنزَلْنَا بِهِ الْمَاءَ فَأَخْرَجْنَا بِهِ مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ﴾ الأعراف: ٥٧، هەروەها خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ الجاثية: ٥، هەروەها ﴿يَهْدِي بِهِ اللَّهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلَامِ﴾ المائدة: ١٦، هەروەها ﴿بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٠٥﴾﴾ المائدة: ١٠٥، هەروەها ﴿بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٣٩﴾﴾ الأعراف: ٣٩، هەروەها ﴿ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٥١﴾﴾ الأنفال: ٥١، قورئانە پڕە لە ڕێکخستنی ئەحکامە گەردوونییە شەرعییەکان و پاداشت و سزا لەسەر هۆکارەکان بە ڕێگەی جۆراوجۆر، جارێك بە پیتی "باء"ی سەبەبی و جارێك بە "لام" و جارێك بە "أن" و جارێك بە "کی" و جارێك وەسفی داواکراوەکە باس دەکات و جارێکی تر هۆ ڕاشکاوەکە ئاماژە پێدەدا، وەك بفەرموێت "ذالك بأنهم...." ئەوەیان ئەنجامدا و ئەوەیان وت، جارێکیش پاداشت و سزا ئامارە پێدەدات، وەك ئایەتی ﴿وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الظَّالِمِينَ ﴿٢٩﴾﴾ المائدة: ٢٩، هەروەها ﴿وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْمُحْسِنِينَ ﴿٨٥﴾﴾ المائدة: ٨٥، هەروەها ﴿وَهَلْ نُجَازِي إِلَّا الْكَفُورَ ﴿١٧﴾﴾ سبأ: ١٧، داواکاری و ڕێگر لە حوکمەکە باس دەکات ﴿وَمَا مَنَعَنَا أَن نُّرْسِلَ بِالْآيَاتِ إِلَّا أَن كَذَّبَ بِهَا الْأَوَّلُونَ﴾ الإسراء: ٥٩، لەلای نەرێکارانی هۆ و حیکمەتەکان تەنها ویستی پەتی خۆی ڕێگری لێ دەکات، هەروەها دەفەرموێت ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُم بِإِيمَانِهِمْ﴾ یونس: ٩، هەروەها دەفەرموێت ﴿كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ﴾ إبراهيم: ١، هەروەها دەفەرموێت ﴿كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا أَسْلَفْتُمْ فِي الْأَيَّامِ الْخَالِيَةِ ﴿٢٤﴾﴾ الحاقة: ٢٤، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ﴾ الطلاق: ٢ – ٣، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ وَيُعْظِمْ لَهُ أَجْرًا ﴿٥﴾﴾ الطلاق: ٥، هەروەها دەفەرموێت ﴿إِن تَتَّقُوا اللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا﴾ الأنفال: ٢٩، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَإِن تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُوا بِهَا وَإِن تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئًا﴾ آل عمران: ١٢٠، هەروەها دەفەرموێت ﴿فَبِظُلْمٍ

﴿مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرًا ﴿١٦٠﴾ وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰاْ وَقَدْ نُهُواْ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ﴾ النساء: ١٦٠ – ١٦١

## لا بەلای هۆکارەکاندا دەکەینەوە بەبێ ئەوەی مەیلیان پێ بدەین

کەسی یەکتاپەرستی خاوەن تەوەکول دڵی لەلای هۆکارەکان پاڵناداتەوە، نە رجای پێیانە و نە لێیان دەترسێت، بەڵام پێیان هەڵدەستێت و لایان بەلادا دەکاتەوە و سەرنجی موسەبیب(المسبب)ی یەکەم و جاریکەری هۆیەکان –سبحانه– دەدات، لە رووی شەرع و ئەقڵەوە تەوەکول تەنها بە خودای موتەعال دەبەسترێت، لە بووندا هۆ(السبب)یەکی تەواو و پێویست بوونی نییە جگە لە ویستی خودای موتەعال، ئەوە خودایە هۆی کردووە بە هۆ و هێز و سەرکێشانی تێدایە بۆ ئاسەواری هۆیەکان، خودا "هۆ"ی نەکردووە بە تەنها هۆیەك بۆ سەرکێشان بۆ ئاسەوارەکەی، بەڵکو دەبێت هۆیەکی تر بوونی هەبێت بەشداری لەگەڵدا بکات و کۆمەڵێك هۆی تر هەبن دژایەتی بکەن و رێگری لێ بکەن، بە پێچەوانەی ویستی خودای موتەعالەوە کە ئاتاجی هیچ ئەمرێکی تر نییە، و هیچ هۆگەلێکی تر ناتوانێت ئەو ویستە بالایە پووچ بکاتەوە و دژی بوەستن، هەرچەند خودا حوکمی ویستێکی بە ویستێکی تری خۆی دەسرێتەوە، ویستی ئەمرێك دەکات و پاشان ویستی ئەمرێکی تر دەکات کە دژ بەو ئەمرەیە و رێگە لە روودانی دەگرێت، هەر هەموویان بە ویست و هەڵبژاردنی خودا خۆیەتی –سبحانه– تەوەکول تەنها بەو دەکرێت و پەنا تەنها بۆ لای ئەو دەبرێت، ترس و رجا هەر لە ئەوە و بۆ لای ئەوە، چاویش تەنها لە رەحمەتی ئەو دەبڕێت، وەك چۆن عاریفترین دروستکراوی خودا(ﷺ) دەفەرموێت ((پەنا دەگرم بە رازیبوونت لە تووڕەیت، و پەنا دەگرم بە موعافاتت لە سزات، و پەنا دەگرم لە خۆت بە خۆت)) هەروەها دەفەرموێت ((نە پەنا و نە رزگارکەر بوونیان نییە جگە لە خۆت))

کاتێك یەکتاپەرستی و جێگیرکردنی "هۆ"ت کۆکردەوە: دڵت رێگەی راست وەردەگرێت بۆ رۆیشتن بەرەو لای خودا، رێگەی مەزنت بۆ رۆشن دەبێتەوە کە پێغەمبەران و شوێنکەوتووانیان گرتوویانەتە بەر و لەسەری رۆیشتوون، ئەوەش بریتییە لە شارێگەی راست و رەوان، شارێگەی ئەوانەی نیعمەتەکانی خودایان بەسەردا داباری، کۆمەك و یارمەتی تەنها لای خودایە.

ئەوەی زانست و حوكمی خودا پێی پێشكەوتووە حەق و راستییە، ئەو پێشكەوتنە نەرێی جێگیركردنی هۆیەكان و هۆكارەكان ناكات، و داوا ناكات هۆیەكان و هۆكارەكان بسڕینەوە، خودا-سبحانه- زانیویەتی و حوكمی دەركردووە كە ئەوە و ئەوە بەهۆی ئەوە و ئەوەوە روودەدەن، زانست و حوكم پێشكەوتووە لە روودانی شتەكان بە هۆیەكانیان، سڕینەوەی هۆیەكان پێچەوانەی داواكاری زانست و حوكمی خودایە، هەر كەس تەماشای رووداو بكات بەبێ هۆیەكانی: ئەو بینین و شهوودەی پڕاوپڕ نییە لەگەڵ حەقدا، بەڵكو شهودەكەی گێلێتی و بینینەكەی كوێرانەیە، گەر زانستی خودا پێشكەوتبێت لە روودانی كارەكان و شتەكان بەهۆی هۆكارەكانیانەوە ئیتر چۆن بەندە كاروبارەكان پێچەوانەی ئەوەی لەسەرینی-لە عیلم و حیكمەت و خەلق و ئەمریدا- موشاهەدە بكات؟

ئەو لادانانەی لەناو "هۆیەكان"دا سەریان هەڵداوە دوو جۆرن:

یەكەمیان: شان دادان لەسەر هۆو هۆكارەكان و تەوەكول پێبەستن و متمانە پێیان و ترس و رجا لێیان، ئەمە جۆرێكە لە هاوەڵدانان بۆ خودا كە گەورە و بچووكی هەیە و زۆر رۆشنە.

دووەم: وازهێنان لە گرتنەبەری ئەو هۆیانەی خودا فەرمانی كردووە بە بەكارهێنان و گرتنەبەریان، ئەمەش دیسان بێباوەڕی و ستەمە و روون و ئاشكرایە.

پێویستە بەندە ئەوەی خودا فەرمانی بە ئەنجامدانی كردووە ئەنجامی بدات و تەوەكول بە خودا ببەستێت، بەو تەوەكولەی كە پێیوایە هەرچی ئەمرە بۆ ویستی خودا دەگەڕێتەوە، زانست و حوكمی خودا بەو كارە پێشكەوتووە، "هۆ" نە زیان دەبەخشێ و نە قازانج دەگەیەنێت، و نە دەبەخشێ و نە دەگرێتەوە، و نە دەبڕێتەوە و نە حوكم دەردەكات، هیچ شتێك بۆ بەندە بەدەست نایەت گەر ویستی خودای موتەعال پێشی نەكەوتبێت، ئەوەش زانست و حوكمی خودا پێشیكەوتووە ناتوانێت هیچ شتێك لێی لابدات، بۆیە هۆیەكان دەگرێتە بەر وەك كەسێك كە رزگاری و سەرفرازی لە هۆیەكاندا دەبینێتەوە، تەوەكول بە خودا دەبەستێت بە تەوەكولێك كە پێیوایە هۆیەكان رزگاركەری نین و سەرفەرازی بۆ بەدەست ناهێنن و نایگەیەنن بە مەبەست و مەرام، بۆیە بەندە لێبڕانی یەكلادەكاتەوە بۆ هەستان بە هۆیەكان بە سووربوون و هەوڵ و

کۆششەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دڵی خاڵیدەکاتەوە لە شاندادان و پشتبەستن بەو هۆیانە و مەیل پێدانیان، بۆ ئەوەی تەوەکولەکەی پاك و بێگەرد بێت و شان دادانی لەسەر خودا کامڵ و تەواو بێت، پێغەمبەر(ﷺ) ئەم دوو بنچینەی لە فەرموودەیەکی سەحیحدا کۆکردۆتەوە، و دەفەرموێت ((هەوڵی تەواو بدە و سووربە لەسەر ئەو شتانەی قازانجت پێدەگەیەنێت و داوای کۆمەکی و یارمەتی لە خودا بکە و دەستەوسان مەبە)) فەرمانی پێکرد بە سووربوون لەسەر گرتنەبەری هۆیەکان و داوای کۆمەك و یارمەتی لە خودای موتەعال کە هەرچی هۆیەکانە لەدەستی ئەودایە و نەهی لێکرد لە دەستەوسانی کە دوو جۆرە: کەمتەرخەمی لە هۆیەکاندا و سوورنەبوون لەسەریان، لەگەڵ کەمتەرخەمی لە داوای کۆمەك و یارمەتی لە خودا و وازهێنان لە رووتکردنەوەی پەنابردن بۆ خودا بەتاکوتەنهایی، هەموو ئایین–دەرەوە و ناوەوە و شەریعەت و حەقیقەتی– لەژێر ئەو چەند کەلیماتەی پێغەمبەری خودادایە(ﷺ).

هۆ و ناوەند و عیللەت جێگەی وردبوونەوەی بیرمەندان و مەعریفەی خاوەن بەڵگەکانن ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾ الحجر: ٧٥، لە قورئاندا نموونەی هاندان بۆ وردبوونەوە و پەندوەرگرتن و بیرکردنەوە لێیان زۆرە و زەمی ئەوانە کراوە پشتهەڵدەکەن و وردنابنەوە و تێنافکرن، قورئان رایدەگەیەنێت کە وردبوونەوە و بەڵگەهێنانەوە دەبێتە هۆی زانست و مەعریفە بە صدقی پێغەمبەرانی، ئەو کارە کۆمەڵێك ئایەتی گەردوونی بینراون کە تەصدیقی ئایاتی قورئانی دەکەن.

خودای موتەعال بە هەوانتە ئاسەوارەکانی بە هۆیەکانەوە نەبەستۆتەوە و داواکاری و ئەحکامەکانی لەسەر هۆیەکان بە باتڵ دانەناوە، بەڵکو ئەو یاسایە نیشانەی کەماڵی خودا و سیفات و وەسفی ئەون–سبحانە– بەو هۆیانەوە پەروەردگاریی و خوایەتی خودا و موڵك و سیفات و ناوەکانی دەناسرێن.

خودای موتەعال لەگەڵ ئەوەشدا وەك ئاتاجی پێیان ئەو هۆیانەی نەخولقاندووە و کەماڵی موقەدەسی خودا بەو هۆیانەوە نییە، بەو هۆیانەی کەمی خۆی زۆر ناکات و لە زەلیلیدا خۆی پێ قایم ناکات، بەڵکو کەماڵی خودا داوا دەکات هەموو کارێك ئەنجام بدات کە دەیەوێت، فەرمان دەربکات و کارەکان هەڵبسورێنێت و بەرێوەیان ببات بەو جۆرەی دەیەوێت، هەروەها ستایش بکرێت و بناسرێت و یادی بکرێت و بپەرسترێت،

سیفاتی کەماڵ و جەلالی خۆی بە دروستکراوەکانی بناسێنێت، بۆیە دروستکراوی دروست کردووە لێی یاخی دەبن و سەرپێچی لە فرمانەکانی دەکەن، تاکو فریشتەکان و پێغەمبەران و دۆستەکانی کەماڵی لێخۆشبوون و لێبووردن و حیلمی مۆڵەت پێدانی خودا بناسن، پاشان دڵی هەرکەسێکی بوێت بۆ لای خۆی رایدەکێشێت، بەخشندەیی خودا لە قبووڵ کردنی تەوبەی بەندەکانیدا دەردەکەوێت، هەر بەو جۆرە چاکە و لوتفی بەو کەسانەی بۆ لای دەگەڕێنەوە لەدوای زەمەنێك لە پشتهەڵکردن، وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((گەر ئێوە گوناه نەکەن، خودا ئێوە دەباتەوە و دەستەیەك دەهێنێت گوناه بکەن و پاشان داوای لێخۆشبوون لە خودا بکەن و خوداش لێیان خۆشببێت)) لێخۆشبوونی خودا بۆ کێ دەبێت گەر هۆکەلێك دروست نەکات لێیان ببوورێت و لێیان خۆشببێت؟ بەندەیەك دروست نەکات لێی خۆشببێت؟ بۆیە بەندەیەکی دروستکردووە لێی خۆشببێت، و گوناهی تەقدیر کردووە کە دەیبورێت، و تەوبەشی تەقدیر کردووە بەهۆیەوە لە بەندەکەی ببورێت، ئەوە خودی عیززەت و حیکمەتی خودای موتەعالە و داواکاری ناوە جوانەکانی ئەوە و سیفەتە بەرز و بڵندەکانییەتی.

بەستنەوەی بەدیهاتووەکان بە هۆیەکانەوە وەك بەستنەوەی سزا و پاداشت وایە بەهۆیەکانەوە، ئەوەش حیکمەتی تەواو و پێویستبوونی کەماڵی خودا، و داواکاری حەمدی تەواو، و دەرخەری سیفەتی عیززەت و قوردرەت مولکی خودایە، هەموو شەریعەتەکان لە یەکەمەوە تا کۆتایی لەسەر بەستنەوەی ئەحکام بە عیللەتەوە بیناکراون، هەروەها لەسەر بابەتەکان بە بەڵگەوە و پاداشت بە گوێڕایەڵی و سزا بە خراپە و تاوانەوە راوەستاون.

❁ ❁ ❁

## (٦٤) (منزلة استئناف التوبة)

# مەنزیلەی تێهەڵچوونەوەی تەوبە

لە مەنزیلەكانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی تێهەڵچوونەوەی تەوبەیە.

ئەمەش بریتییە لە جێگیربوون و دامەزران كە سەردەكێشێت بۆ تێهەڵچوونەوەی تەوبە لەو كەموكورتییانەی هاودەمی كردووە لە مەنزیلەكانی پێشوودا، لەم مەنزیلەیەدا كەسەكە و دڵی لەسەر تەنها یەك مەعبوود كۆكردۆتەوە، هیممەتی یەكلاكردۆتەوە لەسەر جێبەجێ كردنی فەرمانەكانی خودا لەناو خەڵكدا بە بانگەواز و كۆشش، گەر لە ناوەوە بەرهەمی تێكەڵبوون بە خەڵكی گرژ و گێراو بوو،ئەوەش چونكە ئەو دڵی لەگەڵ خودادا كۆبووەتەوە و حەز ناكات بەهۆی خەڵكییەوە لێی دابڕێت ئەوا با هێزی خۆی دەربخات و ناخی لەگەڵ خودا و دەرەوەی بەڕووی خەڵكدا كراوە بێت، بە مەبەستی هیدایەتدانیان بۆ لای حەق-سبحانه- و بانگكردنیان بۆ لای ئەو، عاریف لەیەك كاتدا "لەگەڵ"ەو "جیایە"، هەموو هەست و نەستی لە ژوورەوەیە و لە دەرەوەیە، و "پەیوەست بوو" و "جیابووەوە"یە، واتە لە ناوەوە لەگەڵ خودادایە و لە دەرەوە لەگەڵ بەندەكانی خودا بە مەبەستی هیدایەت و بانگكردنیان كە ئەمەش دیسان لەگەڵ خودابوونە..

وەك چۆن تەوبە سەرەتای مەنزیلەكانی رێبوارانە و یەكەمین مەدرەجە لە مەداریجەكانی سالیكان، هەر بەو جۆرە كۆتایی مەدرەجەكانیشە.

لەوانەیە گوێت لە بیستنی ئەم راستییە بێزار بێت و بڵێت: ئەمە قسەی كەسێكە هیچ شتێك لە رێگەی ئەهلی ئەم رێگەیە نازانێت، قسەی كەسێكە پێی لە مەزیلەیەك لە مەنازیلەكانی ئەهلی رێگە نەناوە، سوێند بە خودا زۆر كەس لەسەر ئەو قسەت لەگەڵت تەبان و دەڵێن: ئێمە لە كوێ بووین و بۆ كوێ چووین؟ ئێمە مەنزیلەی تەوبەمان بڕی و لە نێوان ئێمە و تەوبەدا سەد مەقام هەیە، لەدوای بڕینی سەد مەقام بگەڕێینەوە بۆ لای تەوبە و بیكەین بە لوتكەی ئامانجی مەقامی سالیكان؟!

گوێبگرە و تێبگە و لە نەرێکردن پەلە مەکە و یەکسەر بەرپەرچ مەدەرەوە، زەینت بکەرەوە بۆ ناسینی خۆت و حەقی پەروەردگار و ئەوەی ئەو لە تۆی داوای دەکات و ئەوەی لە حەقی ئەو بەسەر تۆوەیە، پاشان بەراورد بکە لەنێوان کاروکردەوەکان و حاڵ و ئەو مەنزیلە و مەقامانەی بۆ خودا و لەگەڵ خودا پێت تێناوە لەگەڵ مەزنیی جەلالی خودا و ئەوەی شایستەیەتی، گەر بینیت کاروکردەوەکانت بۆ خودا بەسە و توانیوتە حەقی بدەیت ئەو کاتە پێویست بە تەوبەیەکی تر ناکات، ئەو کات گەڕانەوە بۆ تەوبە دابەزینە لە مەقامی باڵاوە بۆ مەقامی نزم، و گەڕانەوەیە لە دەرئەنجامەوە بۆ سەرەتا، ئەمە دوور نییە لە زۆربەی ئەوانەی بەم رێگەوە خەریکن، ئەوانەی بە حاڵ و مەعریفە و ئاماژەکانی خۆیان مەغروور بوون، بزانە گەر چەند بەرانبەری ئەوەی ئەنجامت داوە لە صدق و ئیخلاص و گەڕانەوە و تەوەکول و زوهد و عیبادەت ئەنجام بدەیت کەمترین حەقی خودات لەسەر خۆت جێبەجێ نەکردووە، و بەرانبەر نییە لەگەڵ نیعمەتێك لە نیعمەتەکانی خودا، ئەوەی شایستەی جەلال و مەزنیی خودای موتەعالە گەورەتر و زۆرترە لەوەی خەڵك بۆ خودا پێیهەڵدەستن، ئێستا پێویستی تەوبەت لە کۆتاییدا بۆ روون بوویەوە.

بزانە:تەوبە کۆتایی هەموو عاریفێك و ئامانجی هەموو سالیکێکە، وەك چۆن "سەرەتا"یە "کۆتا"شە، ئاتاج بوون بە تەوبە لە کۆتاوە زۆرتر و زیاترە لە ئاتاجبوون پێی لە سەرەتاوە، بەڵکو لە کۆتاییدا لە جێگەی پێویستیی دادەنرێت.

ئێستا گوێبگرە لەوەی خودا گفتوگۆی پێدەکات لەگەڵ پێغەمبەرەکەی(ﷺ) لە کۆتایی پەیامەکەیدا، بزانە چۆن پێغەمبەر(ﷺ) لە کۆتایی تەمەنیدا زۆرترین "إستغفار"ی دەکرد﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾ ﴾ التوبة: ١١٧، ئەم ئایەتە دوای غەزوەی تەبوك دابەزیوە، ئەوەش دوایین غەزوە بووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەنجامی داوە، خودای موتەعال ((تەوبە لەسەریان))ی کردووە بە شوکرانەبژێری ئەوەی ئەنجامیان داوە لە کاروکردەوە و جیهاد، خودای موتەعال لە کۆتا ئایەتەکانی دابەزیو بۆ سەر پێغەمبەر دەفەرموێت ﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ ﴿١﴾ وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا ﴿٢﴾

﴿فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ٣﴾ النصر: ١ - ٣، لە فەرموودەی سەحیحدا ((پێغەمبەر لە هەموو نوێژێکیدا-دوای ئەوەی ئەو سورەتەی بۆ سەر دابەزی- دەیفەرموو: سبحانك اللهم ربنا وبحمدك اللهم اغفر لي)) ئەوەش لە کۆتایی پەیامەکەیدا بووە(ﷺ) بۆیە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر لەوانە عومەری کوڕی خەتتاب و عەبدوڵای کوڕی عەبباس-خوا لێیان ڕازی بێت- بە نزیکبوونەوەی ئەجەلی پێغەمبەر لە سورەتەکە گەیشتوون کە خودا ئاگاداری کردۆتەوە لەسەری، خودا فەرمانی بە "إستغفار"پێکردووە لە کۆتایی ئەحواڵیدا، دوایین قسەیەك لێی بیستراوە لە کاتی ڕۆیشتنی بەرەو لای پەروەردگاری ئەم دوعایە بوو ((اللهم اغفر لي وألحقني بالرفيق الأعلى))، پێغەمبەر هەر کار و کردەوەیەکی چاکەی بە "إستغفار" کۆتایی پێدەهێنا، وەك ڕۆژوو و نوێژ و حەج و جیهاد، کاتێك لە جیهاد تەواو دەبوو بۆ مەدینە دەگەڕایەوە دەیفەرموو ((آیبون، تائبون، لربنا حامدون)) داوای کردووە کۆتایی مەجلیس بریتی بێت لە "إستغفار"، لە کاتی نوستندا دەیفەرموو ((أستغفر الله الذي لا إله إلا هو الحي القيوم وأتوب إليه)) هەر بەو جۆرە پێغەمبەر لەسەر خوێندنی "سيد الإستغفار" دەنوست.

کەسی عاریف بە خودا ناو و سیفەت و مافی پەروەردگاری دەزانێت، بەندە لە کۆتاییەکاندا لە هەر کاتێك زیاتر پێویستی بە تەوبە کردنە.

بەم تێهەڵچونەوەیە تەحقیقی بەندایەتی دەکرێت، هەروەها دەتوانێت هەڵبستێت بە ئەرکی بەندایەتی و شاندانە ژێر فەرزەکان و سوننەتەکان و جێبەجێکردنیان و جیهاد دژ بە دوژمنانی خودا و بانگەواز بۆ لای خودا و ئەمر بە مەعروف و نەهی لە مونکەر و چوونە ژێر ئازار و مەینەتی لە پێناوی خودا، و ناسینی ناو و سیفەتەکان و هەروەها ناسینی ئەوەی خودا پێیخۆشە و ئەوەی خودا لای خراپ و ناپەسەندە، هەر بەو جۆرە جیاکردنەوەی باشترین خێری دوو خێر و خراپترین شەڕی دوو شەڕ، لە کۆتایشدا زانست بە ئاستەکانی بەندایەتی و مەنزیلەکانی.

لەراستیدا کۆتایی سالیکان بریتییە لە کامڵ کردنی پلە و ئاستی بەندایەتی، ئەمەیان دەستی مرۆڤی ناگاتێ و تەنها تایبەتە بە دوو خەلیلەکەی خوداوە-علیهما الصلاة والسلام- لەناو هەموو خەڵکیدا، ئیبراهیمی خەلیل(ﷺ) خودا شایەتی بۆ دەدات کە وەفای بە بەندایەتی کرد، سەرداری ڕۆڵەکانی ئادەمیش پێغەمبەر(ﷺ) پلەی

بەندایەتی كاملّ كرد و شایستەی پێشخستن بوو بەسەر هەموو دروستكراوەكانی تردا، بوو بە خاوەنی شفاعەت و وەسیلە كە تەواوی پێغەمبەران لێی دوادەكەون، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((لێگەڕێن بۆ من))، بۆیە خودای موتەعال لە بەرزترین مەقامات و بالآترین ئەحوالّدا بە بەندە(عبد) ناوی پێغەمبەری هێناوە ﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِ لَيْلًا﴾ الإسراء: ١، هەروەها﴿وَأَنَّهُ لَمَّا قَامَ عَبْدُ اللَّهِ يَدْعُوهُ﴾ الجن: ١٩، هەروەها ﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا﴾ البقرة: ٢٣، هەروەها ﴿تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِ﴾ الفرقان: ١، بۆ ئەو مەبەستە مەسیح-علیه السلام- دەفەرموێت -كاتێك داوای شفاعەتی لێدەكەن- ((بچن بۆ لای محمد، بەندەیەكە خودا لە گوناهی ئەوەلّ و ئاخری خۆشبووە)) پێغەمبەر(ﷺ) شایستەی ئەو پلە بالآیە بووە بە كاملّ كردنی بەندایەتییەكەی بۆ خودا و كەمالّی لێخۆشبوونی خودا لە ئەو، شوێنكەوتەی پێغەمبەرانیش هاوشێوەی ئەوان و نزیكتر و نزیكتر.

ئەو حالّەی كە بەدەست دێت بۆ ئەو كەسەی بەو كارە هەلّدەستێت(واتە كاری تێهەلّچوونەوەی تەوبە): بریتییە لە حالّی پێغەمبەران و جێنشینەكانیان، ئەوەش بریتییە لە كۆبوونەوەی هیممەت لەسەر خودای موتەعال، بە خۆشەویستی و گەڕانەوەی بەردەوام بۆ لای ئەو و تەوەكول و ترس و رجا و چاودێری و كۆكردنەوەی هیممەت بۆ جێبەجێ كردنی ئەمرەكانی خودا لەناو خەلّكیدا بە جیهاد و بانگ كردنیان بۆ لای خودا، ئەوە دوو حالّەتن: كۆبوونەوەی دلّ لەسەر مەعبود بە تەنها لەگەلّ كۆبوونەوەی هیممەت بۆ خودا بە مەبەستی بەندایەتی پاك بۆ خودا.

گەر دەلّێیت: بەلّگەی ئەم دوو كۆكردنەوەیە كامەیە؟ دەلّێم: هەموو قورئان بەلّگەیە، سورەتی "الفاتحة" بە نموونە وەربگرە لە ئایەتی﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥﴾ الفاتحة: ٥، لە وشەی "إياك" رابمێنە تایبەتكردنی زاتێكی موقەدەس بە بەندایەتی و داوا كردنی كۆمەك، هەروەها رابمێنە لە وشەی "نعبد" كە بۆ ئێستا و بۆ داهاتووە و عیبادەتی ناوەوە و دەرەوە دەگەیەنێت، ئەنجامدانی جۆرەكانی بەندایەتی بە حالّ و رووتێكردن و قسە و كردار، داوای كۆمەك كردن تەنها لە خودا لەسەر ئەو بەندایەتییە، نەك لە كەسێكی تر، بۆیە هەموو رێگەی بەرەو خوداچوون لەو دوو وشەدایە، ئەوەش مانای ئەو قسەیە كە دەفەرموون ((رێگە لەناو "إياك"دا واتە دەمەوێت بەو شتەی تۆ

دەتەوێت)) بۆیە بەندە موورادی خۆی لە یەك كەسدا كۆكردۆتەوە، هەروەها ویستی خۆی لە ویستی ئەودا بۆ هەموو ئەو شتانەی خۆشیدەوێن و پێیان رازییە، بۆ ئەو ئامانجە هەموو پێغەمبەران لە یەكەمەوە تا خاتەم بانگەوازیان كردووە، كاركەران و ئاراستەبووان بۆ لای ئەو مەبەستە تەكان بە خۆیان دەدەن، هەموو ئەحوالّ و مەقامەكان -لە یەكەمەوە تا كۆتایی- لەژێر ئەو ناونیشانەدا جێیان دەبێتەوە و لە بەروبووم و داواكارییەكانییەتی.

بەندایەتی كەمالّی خۆشەویستی لە كەمالّی زەلیلیدا كۆدەكاتەوە، هەر بەو جۆرە كەمالّی گەردنكەچبوون بۆ هەموو ئەو شتانەی جێگەی رەزامەندی ئەون و فەرمانی ئەویان لەسەرە، ئەوەش ئامانجێكە كە هیچ ئامانجێك ناكەوێتە سەریەوە، گەر رێگەیەك بۆ هەستان بە حەقیقەتی ئەو ئامانجە -وەكو پێویست- نەبینرایەوە، ئەوا دەبێت بۆ تەوبەكردن بگەڕێینەوە، بەم برە و بە شتانی تریش دەزانیت كە تەوبەكردن لە كۆتاییەكاندا پێویستترە تا سەرەتاكان، گەر نەسیمی رۆحی تەوبەكردن نەبوایە ئەوا بێهیوایی مرۆڤی لە پەروەردگار دوور دەخستەوە، ئەمە بۆ كەسێكە كە هەستابێت بەوەی سەردارەكەی داوای لیّ كردبێت و جێبەجێی كردبێت، ئەی دەبێت چۆن بێت گەر بێئاگایی و كەموكورتی و كەمرەوی و گوێپێنەدان و هەڵبژاردنی بەشی خۆی بەسەر بەشی پەروەردگاریدا كالاّی بالاّی بێت؟

۞ ۞ ۞

## (٦٥) (منزلة استئناف التوحيد)

# مەنزیلەی تێهەڵچوونەوەی یەکتاپەرستی

لە مەنزیلەکانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) مەنزیلەی یەکتاپەرستییە.

ئەوەش زەفەربردنی سالیکە لە کۆتاییدا بە حەقیقەتی یەکتاپەرستی تەواو، وەك چۆن لە سەرەتاوە زەفەری پێبرد.

یەکتاپەرستی یەکەمین قۆناغی بانگەوازی پێغەمبەران بووە، و یەکەمین مەنزیلەی ڕێگەی بەرەو خوداچوون بووە، و یەکەمین مەقامێك بووە کە سالیك پێی تێناوە لە بەرەو خوداچوونیدا، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ﴾ الأعراف: ٥٩، هود بە قەومەکەی فەرموو﴿يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ﴾الأعراف: ٦٥، صالح بە قەومەکەی فەرموو﴿يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ﴾الأعراف: ٧٣، هەر بەو جۆرە شوعەیب بە قەومەکەی فەرموو﴿يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ﴾الأعراف: ٨٥، هەروەها خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ﴾النحل: ٣٦.

یەکتاپەرستی کلیلی بانگەوازی پێغەمبەران بووە، بۆیە پێغەمبەر بە نوێنەرەکەی خۆی(مەعازی کوڕی جەبەل)ی فەرموو: ((تۆ دەچییە لای خەڵکانێك کە ئەهلی کیتابن، با یەکەمین شتێك بانگیان دەکەی بۆی بەندایەتی کردنی خودا بێت بە تاکوتەنهایی، کە شایەتیاندا بە "لا إله إلا الله و أن محمدا رسول الله" هەواڵیان پێبدە کە خودا پێنج نوێژی لەسەر فەرز کردوون لە شەو و ڕۆژێکدا، بەو جۆرە تا کۆتایی فەرموودەکە))، هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵکی بجەنگم تا شایەتی دەدەن کە "لا إله إلا الله و أن محمدا رسول الله"، بۆ ئەو مەبەستە یەکەمین واجبێك لەسەر داوالێکراو بریتییە لە شایەتیدان بە "لا إله إلا الله".

بەڵام وەك چۆن یەکتاپەرستی یەکەمین شتێکە پێیەوەی بچیتە ناو ئیسلامەوە هەر بەو جۆرە دواین شتێکە کە پێیەوە لە دونیا دەردەچیت، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت

((هەر کەس دوا قسەی "لا إلـه إلا الله" بێـت دەچـێتە بەهەشـتەوە))، "لا إلـه إلا الله" یەکەمین واجب و دواهەمین واجبە، بۆیە یەکتاپەرستی سەرەتا و کۆتایی ئەمرەکەیە.

تەنها پاکڕاگرتنی خودا لـە ڕووداو(الحدث) بەڵگـەی ئـەو یەکتاپەرسـتییە نییـە کـە خـودا پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە کردووە و کتێبەکانی بۆ دابەزاندووە و بەندە بەهۆیـەوە لـە ئـاگر ڕزگاری دەبێت و دەچێتە بەهەشتەوە و لە هاوەڵدانان دێتە دەرەوە، پاکڕاگرتنی خودا لە ڕووداو کۆدەنگی هەموو دەستەکانی لەسەرە، هەر کـەس دان بـە بـوونی خالیقـدا بنێـت دان بەو ڕاستییەدا دەنێت، بتپەرست و مـەجوس و نەصـارا و یـەهود و هاوەڵدانـەران – لەگەڵ جیاوازی بیروباوەڕیان– هەر هـەموو خـودا لـە ڕووداو پـاك ڕادەگـرن و دێرینیـی خـودا دەسـەلمێنن، تەنانـەت گـومڕاترین دەسـتە لـەڕووی هاوەڵـدانان و بێبـاوەڕی و ئیلحادەوە کە دەستەی یەکێتی بوون(وحدة الوجود)ە دەڵێن: خودا بوونێکی ڕەهایـە، و دێرینـە بـە هەمیشـەیی و پاکوبێگـەردە لـە ڕووداو و ڕووداوەکـان لـە بـوونی ئـەوەوە سەرچاوە وەردەگرن و بوونی ئەو لەبەردەکەن و لە خۆیانی دەکەنەوە.

فەیلەسوفان –کە دورترین خەڵکن لەو شەریعەتانەی پێغەمبەران هێناویـانن– "واجـب الوجود" دەسەلمێنن وەك دێرینێکی هەربووی پاك و بێگەرد لە ڕووداو.

هاوەڵدانـەران–بەنـدەی بتـەکان ئەوانـەی لەگـەڵ خـودادا کۆمـەڵێك خـودای تریـان دەپەرست– بوونێکی دێرینی پاك و بێگەرد لە ڕووداو دەسەلمێنن.

پاك و بێگەردی خودا لە ڕووداو حەقە، بەڵام ئیسلام و ئیمان بە کەسەکە نابەخشـێت، و کەسەکە ناهێنێتە ناو شەریعەتەکانی پێغەمبەرانـەوە، بـەڵکو هـەرگیز لـەو ڕێچـکە و ڕێبازە پووچانەی ئەهلی بێباوەڕی دەریناهێنێت.

لەگەڵ ئەوەشدا پرسیار لە سەرداری ئەهلی ڕێ جونەید کرا دەربارەی یەکتاپەرستی؟ فەرمووی: بریتییە لە تەنهاکردنەوەی دێرین لە ڕووداو، جونەید ئاماژە بەوە دەدات کە بانگەشـەی یەکتاپەرسـتی و مـەقام و حـاڵی دروسـت نابێـت و بەنـدە نابێـت بـە یەکتاپەرست تا دێرین لە ڕووداو بە تاکوتەنها نەناسێنێت، زۆرێك لەوانـەی بانگەشـەی یەکتاپەرستی دەکەن خودایان تاکوتەنها نەکردووە لە ڕووداوەکان، هەر کـەس نـەڕێی جیابوونەوەی خودا دەکات لە دروسـتکراوەکانی لەسـەر عەرشـی مـەزنی و بیکـات بـە بوونێـك کـە لـە هـەموو شـوێنێکدا بـە زاتـی ئامـادەیی هەیـە ئـەو کەسـە تاکوتـەنهای

نەكردووە لە رووداو، بەڵكو كردوویەتی بە حاڵێك لە رووداوەكان و پێچەوانە پێیان و ئامادە بە زاتی تیایاندا.

ئەشعەری لە كتێبی "المقالات"دا دەفەرموێت: ئەمە حكایەتی قسەی دەستەیەكە لە ناسیكان، لەم ئومەتەدا دەستەیەك هەن رێبازی عیبادەتیان گرتۆتە بەر، بانگەشەی ئەوە دەكەن كە گونجاوە بۆ خودا بچێتە ناو تەن و جەستەكانەوە، كە شتێك دەبینن لەلایان جوان و باشە دەڵێن: نازانین، لەوانەیە پەروەردگارمان بێت.

دەڵێم: ئەم دەستەیە دوو بەشن، یەكەمیان: بانگەشەكردن بۆ ئەوەی گوایە خودا دەچێتە ناو وێنە و شێوە جوان و باشەكانەوە، دووەمیان: بانگەشەی ئەوە دەكەن كە خودا دەچێتە ناو كامڵانەوە لە مرۆڤ، ئەوانەش ئەو كەسانەن نەفسیان لە شەهەوات دارنراوە، و بە سیفەتە بەرز و بڵندەكان رازاونەتەوە، و لە سیفەتە ناپەسەند و دزێوەكان خاڵیبوونەتەوە، نەصارا باوەڕیان وایە خودا چووتە ناو جەستەی مەسیحەوە و ئەوی كردووە بە دورعێك بۆ خۆی، "یەكێتی بوونیش" بانگەشەی ئەوە دەكەن بوونێكی رەهایە و چییەكان(الماهیات) وەك پۆشاكێك دەیكەن بە بەر خۆیاندا و خودا دەبێتە سەرچاوەی بوونیان.

ئەم دوو دەستەیە خودای دێرینیان لە رووداو بە تاكوتەنها رانەگرت.

### ❁ ئەو خودای دروستكەرە و ........... خاوەنی ناوە جوانەكانە

ئەم بەتاكوتەنها زانینە -كە جونەید ئاماژەی پێكرد- دوو جۆرە: تاكوتەنهایی بیروباوەڕ و هەواڵ، ئەمەش دیسان دوو جۆرە، یەكەمیان:سەلماندن و جێگیركردنی جیابوونەوەی پەروەردگار لە دروستكراوەكانی، و بەرزی و بڵندی ئەو-سبحانه- لەسەرو حەوت ئاسمانەكانەوە، وەك كتێبە ئاسمانییەكان قسەیان لەبارەوە كردووە، لە یەكەمیانەوە تا كۆتا كتێبیان، و هەموو پێغەمبەران هەواڵیان پێداوە لە یەكەمیانەوە تا خاتەمیان، دووەم: تاكوتەنها كردنی خودا بە سیفاتی كەماڵی، و جێگیركردنی ئەو سیفەتانە بۆ خودا بەشێوەیەكی روون و ئاشكرا و فراوان، وەك چۆن خودا بۆ خۆی جێگیری كردوون و پێغەمبەرانیش هەر بەو جۆرە، خودا بە پاك رابگیرێت لە پەكخستن و لادان و نموونا‌ندن و چۆنێتی و لێكچوون(واتە پاك رابگیرێت لە: تعطیل، تحریف، تمثیل، كیفیة، تشبیه)، بەڵكو حەقیقەتەكانی ناو و سیفەتەكان

بۆ خودا جێگیر بکرێن، و هاوشێوەی مەخلوقات لە هەموو روویەکەوە لە خودا نەرێ بکرێت، جێگیرکردن بەبێ نموونانـدن(التمثيـل) و پاکراگرتن بەبێ لادان و پەکخستن﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشورى: ١١، لەم جۆرەیاندا خودا بە تاکوتەنها دەزانرێت لە کۆی قەزا و قەدەری بۆ هەموو دروستکراوەکانی، بینراوەکان و سیفەتەکان و کردارەکان– هەموو ئەمانە بە ویست و قەدەر و زانست و حیکمەتی خودا روودەدەن، خاوەنی ئەم باوەڕی بەتاکوتەنها زانینە لە هەرچی دەستەی پووچ و گومڕایە جیادەبێتەوە، لە "یەکێتی بوون و حلولییەکان و جەهەمییە فیرعەونییەکان" کە دەڵێن: لەسەرو ئاسمانەکانەوە پەروەردگارێك بوونی نییە بپەرسترێت، و لەسەر عەرش خودایەك بوونی نییە نوێژی بۆ بکرێت و سوژدەی بۆ ببرێت، هەروەها قەدەرییەکان کە دەڵێن: خودا کاروکردەوەی بەندەکانی قەدەر نەکردووە، لە فریشتە و ئینس و جین، هەر بەو جۆرە تەواوی گیاندارانی تر، بەڵکو شتێك دێتە ناو موڵکییەوە کە نایەوێت، و شتێکی دەوێت کە نابێت، و شتێك بەبێ ویستی ئەو روودەدات و دەبێت..خودا–سبحانە– زاناترە.

## ۞ ئەو خودایەکی مەعبوودە... سبحانە

جۆری دووەم لە بە تاکوتەنها زانین: تاکو تەنهاکردنی دێرین لە رووداو بە عیبادەت کردنی، لە بەخودازانین و خۆشەویستی و ترس و رجا و بە مەزنزانین و گەڕانەوە و تەوەکول و داوای کۆمەك کردن و گرتنەبەری وەسیلە بۆ لای، ئەم "بەتاکوتەنهازانین"ە و ئەو بەتەنهازانینەی پێشتر هەموو پێغەمبەرانیان پێ رەوانە کراوە و کتێبەکانیان پێ دابەزێنراوە و شەریعەتەکانیان پێ بەیان کراوە، و لەو پێناوەشدا ئاسمانەکان و زەوی و بەهەشت و دۆزەخ خولقێنراون، و پاداشت و سزا دامەزراوە. تاکوتەنها کردنی دێرین لە رووداو لە زات و سیفات و کردارییدا و هەروەها لە خوداویستیدا و خۆشویستن و ترس و رجا لێی و پاشکۆکانی ئەمانە، بۆیە قسەکەی جونەید لەمەڕ پێناسەی یەکتاپەرستی قسەیەکی دروست و پڕاوپڕە.

بۆ نموونە تەوەکول بریتییە لە حەقیقەتی یەکتاپەرستی و یەکتاپەرستی تەنها لەو رێگەوەیە، لە باسی "تەوەکول"دا بەیانی ئەوەمان کردووە و بریتییە لە مەقامی پێغەمبەران.

## ✿ هەر كەس خۆی بە كەسێكی خاوەن تەوەكول بزانێت تووشی وەهم بووە

بۆ تەوەكول سێ عیللەت هەیە كە كار دەكاتە كەماڵی یەكتاپەرستی و لە وەهمگەلێكەوە سەر هەڵدەدەن كە دەبنە هۆی ناتەواوكردنی عیبادەت:

یەكەمیان: وازهێنانە لە هۆیەكان(هۆكارەكان) كە فەرمان بە گرتنەبەریان كراوە، گوایە بەهۆی تەوەكولەكەیەوە لێیان بێنیاز بووە، ئەو جۆرە تەوەكولە دەستەوسانی و گوێپێنەدان و تەمەن بەفیڕۆدانە، نەك تەوەكولی بەندایەتی و یەكتاپەرستی بێت، وەك ئەو كەسەی كە واز لە ئەنجامدانی كردار دەهێنێت كە هۆی رزگاری مرۆڤە و بۆ بەدەستهێنانی داواكان تەوەكول بە خودا دەبەستێت، وازدەهێنێت لە هەستان بە هۆكارەكانی بەدەستهێنلانی رۆزی—لە كار و كشتوكاڵ و بازرگانی و هاوشێوەكانیان— بۆ بەدەستهێنانی ئەوانە تەوەكول بە خودا دەبەستێت، واز لە داوا و گەڕان بەدوای زانستدا دەهێنێت و بۆ بەدەستهێنانیان تەوەكول بە خودا دەبەستێت، ئەم جۆرە كەسە تەوەكولەكەی دەستەوسانی و لێنەهاتن و تەمەن بەفیڕۆدانە، وەك هەندێ لە پێشین دەڵێن: لەوانە مەبە تەوەكولەكەی دەستەوسانی و هیچ لێنەهاتنە، هەروەها لەوانە مەبە دەستەوسانییەكەی كردووە بە تەوەكول.

عیللەتی دووەم: لە بەش و حەزەكانی خۆیدا تەوەكولی هەبێت، بەڵام لە حەقەكانی خودادا بەو جۆرە نەبێت، وەك ئەو كەسەی لە بەدەستهێنانی ماڵ و ژن و دەسەڵاتدا تەوەكول بە خودا دەبەستێت، بەڵام لە سەرخستنی ئایینی خودا و بەرزكردنەوەی كەلیمەی خودا و پشتیوانی سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) و جیهادی دوژمنانی خودا و پێغەمبەر(ﷺ) تەوەكولی تێدا نییە.

عیللەتی سێیەم: تەوەكولەكەی لە خودی خۆیەوە بناسێت، بەو كارەی بینینی فەزڵ و منەتی خودا و دانانی بەندەكەی لە مەقامی تەوەكولدا لەلایەن خوداوە لەبیربچێتەوە، بە تەنها بینینی تەوەكول نابێتە عیللەت، وەك گومان دەبات، بەڵكو پێویستە لەسەری تەوەكولەكەی لە چاوی بەخششی خوداوە ببینێت و تەنها بە منەتێكی ئەوی بزانێت و وەك كۆمەكییەكی خودایی بۆ ئەو تەماشای بكات.

ئەو سێ عیللەتەیە دێنە سەر رێگەی مەقامی تەوەكول و مەقامەكانی تریش، ئەو سێ عیللەتەن كە عاریفان بە خودا و ئەمری خودا هەوڵی بڕین و بنڕكردنیان دەدەن،

ئەمەمان تەنها وەك نموونە بۆ ئەو عیللەتانە كە ئاماژەیان پێ دەدرێت باس كرد، عیللەتی هەر مەقامێك لە مەقامەكانی باوەڕ ئەم سێ عیللەتەن: ئەوەش ئەوەیە بەهۆی ئەم عیللەتانەوە بالاتری لەدەست دەربچێت و مەقامەكە بە حەز و بەشی خۆیەوە ببەستێتەوە، دەرئەنجام لە مەبەستەكەی دابڕێت و دووربكەوێتەوە، هەروەها ئەو مەقامە بە كۆمەك و یارمەتی و بەخشش و بەخشندەیی خودا بۆ ئەو تەماشا نەكات.

## ۞ كەماڵی یەكتاپەرستی مەرجی ئیمامەتە

گومانی تێدا نییە كە ئەهلی یەكتاپەرستی لە یەكتاپەرستییەكەیاندا جیاوازیان هەیە- لەڕووی زانست و مەعریفە و حاڵەوە- بە جیاوازییەك كە تەنها خودا دەیزانێت، كامڵترین كەس لە یەكتاپەرستیدا: بریتین لە پێغەمبەران-صلوات الله وسلامە علیهم-پێغەمبەرانی خاوەن پەیام كامڵترن لەوەدا، خاوەن عەزمەكان(أولو العزم) لە پێغەمبەرانی خاوەن پەیام كامڵترن لە یەكتاپەرستیدا، ئەوانەش نوح و ئیبراهیم و موسا و عیسا و محمد- صلوات الله وسلامە علیهم- كامڵترین یەكتاپەرستی یەكتاپەرستی دوو خەلیلەكەیە(محمد و ئیبراهیم)-صلوات الله وسلامە علیهما- ئەو دوانە لە یەكتاپەرستیدا خاوەنی راوەستانێكن كە بۆ هیچ كەسێكی تر بوونی نییە- لەڕووی زانست و مەعریفە و حاڵ و بانگەوازی خەڵك و جیهادەوە-هیچ یەكتاپەرستییەك كامڵتر نییە لەوەی پێغەمبەران پێیهەستاون و بانگیان بۆ كردووە و جیهادی گەلانیان بۆ ئەنجام داوە، بۆیە خودای موتەعال فەرمانی بە پێغەمبەرەكەی(ﷺ) كردووە كە لەوەدا شوێنیان بكەوێت و چاویان لێ بكات، خودای موتەعال دوای باسی ئیبراهیم و مونازەرەكەی لەگەڵ باوكی و هۆزەكەی دەربارەی پووچیی هاوەڵدانان و دروستیی یەكتاپەرستی و باس كردنی هەندێ لە نەوەكانی لە پێغەمبەران دەفەرموێت ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحُكۡمَ وَٱلنُّبُوَّةَۚ فَإِن يَكۡفُرۡ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ فَقَدۡ وَكَّلۡنَا بِهَا قَوۡمٗا لَّيۡسُواْ بِهَا بِكَٰفِرِينَ ٨٩ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ ﴾الأنعام: ٨٩ - ٩٠، هیچ یەكتاپەرستییەك لەوە كامڵتر نییە كە خودا فەرمانی بە پێغەمبەركەی(ﷺ) كردبێت شوێنی بكەوێت و چاوی لێبكات، كاتێك پێغەمبەران بە حەقیقەتی یەكتاپەرستی هەستان-لەڕووی زانست و مەعریفە و حاڵەوە- خودا كردنی

بە ئیمام بۆ هەموو خەڵكی، بە فەرمانی خودا بەڕێوە دەچوون و هیدایەتیان وەردەگرت و بانگی خەڵكیان دەكرد بۆ سەری و خەڵكیش بوو بوون بە شوێنكەوتەیان و چاویان لێدەكردن و دەستیان لە هەموو ئەو شتانە دەكێشایەوە پێغەمبەران لێی دووردەكەوتنەوە، شوێنكەوتووانیان بە سەرفرازی و رزگاری و هیدایەت و بەختەوەری شاد بوون، هەر بەو جۆرە سەرپێچەیكەرانیان بە شەقاوەت و گومڕایی تایبەت كراونەتەوە، بە ئیمام و شێخیان ئیبراهیم خەلیل دەفەرموێت ﴿إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِي قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ ﴿١٢٤﴾﴾ البقرة: ١٢٤، واتە پەیمانی من بۆ بە ئیمام كردن كەسی موشریك ناگرێتەوە، بۆیە وەسێتی بۆ پێغەمبەرەكەی محمد(ﷺ) كردووە شوێنی رێگە و رێبازی ئیبراهیم—علیه السلام— بكەوێت، ئەویش(ﷺ) هاوەڵانی خۆی فێر دەكرد كاتێك رۆژیان دڵێ دەبێتەوە بڵێن ((**أصبحنا على فطرة الإسلام وكلمة الإخلاص ودين نبينا محمد** (ﷺ) **وملة أبينا إبراهيم حنيفا مسلما وما كان من المشركين**)) میللەتی ئیبراهیم(رێگە و رێبازی) بریتییە لە یەكتاپەرستی، ئایینی محمدیش(ﷺ): ئەوەیە كە لەلای خوداوە هێنای لە گوفتار و كردار و باوەڕ، و كەلیمەی ئیخلاص كە شایەتیدانە بە "لا إله إلا الله"، فیترەتی ئیسلام: بریتییە لەو سروشتەی خودا مرۆڤی لەسەر بارهێناوە لە خۆشەویستی خودا و عیبادەت كردنی بە تەنها و بەبێ هاوەڵ و خۆڕادەست كردن بۆی وەك بەندایەتی و زەلیلی و گەردنكەچی و گەڕانەوە بۆ لای ئەو—**سبحانه**—

ئەمە بریتییە لە یەكتاپەرستی تایبەتی تایبەتەكان كە هەر كەس پشتی تێبكات لە گەوجترین گەوجانە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُ وَلَقَدِ اصْطَفَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا وَإِنَّهُ فِي الْآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ ﴿١٣٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٣١﴾﴾ البقرة: ١٣٠ — ١٣١.

خودای موتەعال دروستكراوەكانی بۆ دوو بەش دابەش كردووە: گەوجێك كە هیچ كەسێكی تر لەو گەوجتر نییە، لەگەڵ كەسێكی رەشیدی خاوەن كەماڵ لە هۆش و ژیریدا، گەوج: ئەو كەسەیە بێنیاز دەبێت لە رێگە و رێبازی ئیبراهیم—علیه السلام— و پشتی تێدەكات و روو لە هاوەڵدانان دەكات، هەر كەس لە شیرك —بە گوفار و كردار و حاڵ— خۆی بەری كرد، ئەوا گوفتار و كردار و حاڵی لەسەر مەنهەجی یەكتاپەرستی دەبێت و بانگەوازی بۆ لای یەكتاپەرستی دەبێت، خوداش بەوە فەرمانی بە تەواوی

پێغەمبەران -علیهم الصلات والسلام- كردووە لە یەكەمیانەوە تا خاتەمیان، دەفەرموێت ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعْمَلُواْ صَٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٥١﴾ وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمْ فَٱتَّقُونِ ﴿٥٢﴾ ﴾ المؤمنون: ٥١ - ٥٢، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِىٓ إِلَيْهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدُونِ ﴿٢٥﴾ ﴾ الأنبیاء: ٢٥، هەروەها ﴿ وَسْـَٔلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلْنَا مِن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ءَالِهَةً يُعْبَدُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾ الزخرف: ٤٥، هەروەها ﴿ أَمِ ٱتَّخَذُوٓاْ ءَالِهَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ هُمْ يُنشِرُونَ ﴿٢١﴾ لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا ۚ فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً ۖ قُلْ هَاتُواْ بُرْهَٰنَكُمْ ۖ هَٰذَا ذِكْرُ مَن مَّعِىَ وَذِكْرُ مَن قَبْلِى ۗ ﴾ الأنبیاء: ٢١ - ٢٤، واتە ئەم كتێبەی كە بۆ سەرم دابەزێنراوە و هەموو كتێبی پێغەمبەران ئایا لەناو یەكێكیاندا شتێكتان بینییەوە بانگ بۆ هاوەڵدانان بكات و بڵێت لەخوار خوداوە ئیلاهێكی تر بپەرستن؟ یان هەر هەموویان بە یەكتاپەرستی هاتوونەتە دەنگ و فەرمانیان پێكردووە؟ هەروەها خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ ﴾ النحل: ٣٦، "الطاغوت" ناوێكە بۆ هەموو ئەو پەرستراوانەی لەخوار خوداوە دەپەرسترێن، هەر هاوەڵدانەرێك خواوەندەكەی بریتییە لە تاغوت.

شێخولئیسلام ئیبن تەیمیە قسەی لەبارەی ئەو یەكتاپەرستییەوە كردووە كە پێغەمبەران هێناویانە لە یەكەمیانەوە تا خاتەمیان و هەموو كتێبە ئاسمانییەكانی بۆ دابەزیوە و خودا فەرمانی بە پێشین و پاشین كردووە و ئایاتگەلێكی لەو بارەوە باس كردووە، پاشان فەرمووی: خودای موتەعال هەواڵیداوە لە بارەی هەر پێغەمبەرێك كە بە قەومەكەی فەرمووە ﴿ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ﴾، ئەمە یەكەمین و دواهەمین بانگەوازی پێغەمبەران بووە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((فەرمانم پێكراوە لەگەڵ خەڵكی بجەنگم تا شایەتی دەدەن"أن لا إلـه إلا الله و أني رسـول الله")) هەروەها دەفەرموێت ((هەر كەس بمرێت و بزانێت كە "لا إلـه إلا الله" دەچێتە بەهەشتەوە))، قورئان پڕە لەم جۆرە یەكتاپەرستییە، و بانگەواز بۆ لای و بەستنەوەی سەرفرازی و رزگاری بەو یەكتاپەرستییەوە، ئەمەش حەقیقەتەكەی بریتییە لە: ئیخلاصی دین هەرموو دین تەنها بۆ خودای موتەعال، فەنا لەم یەكتاپەرستییەدا هاوملی

مانەوە(البقاء) كراوە، ئەوەش بە جێگیر كردنی خوایەتی حەق-سبحانه- لە دڵدا و نەرێكردنی خوایەتی لەخوار خوداوە لە هەر بوونێكی تر، ئەو كاتە نەرێ و جێگیركردن لە دڵدا كۆبكەیەوە، نەرێكردن فەنایە و جێگیركردن مانەوە(بەقا)یە، راستییەكەی: بە بەندایەتی كردنی خودا لە بەندایەتی كردنی هەر كەس و شتێكی تر فەنا بكەیت، هەروەها بە خۆشەویستی ئەو لە خۆشەویستی شتانی تر و كەسانی تر فەنا بكەیت، هەروەها بە ترسی ئەو لە ترسی غەیری ئەو و بە گوێڕایەڵی ئەو لە گوێڕایەڵی غەیری ئەو و بە دۆستایەتی ئەو لە دۆستایەتی غەیری ئەو و بە داوا لە ئەو بێنیازبوون لە غەیری ئەو و بە هەمان شێوە لە تەوەكول و رجا و خۆدانەدەست و بە حاكم كردن و پەنابۆبردن و رەغبەت بۆ ئەوەی لەلای ئەو، خوای موتەعال دەفەرموێت ﴿ قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيًّا فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ الأنعام: ١٤، هەروەها دەفەرموێت ﴿ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا ﴾ الأنعام: ١١٤، هەروەها دەفەرموێت ﴿ قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِي رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيْءٍ ﴾ الأنعام: ١٦٤، هەروەها دەفەرموێت ﴿ قُلْ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ تَأْمُرُوٓنِّيٓ أَعْبُدُ أَيُّهَا ٱلْجَٰهِلُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ٱللَّهَ فَٱعْبُدْ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾ الزمر: ٦٤ – ٦٦، هەروەها دەفەرموێت ﴿ قُلْ إِنَّنِي هَدَىٰنِي رَبِّيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۚ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٦١﴾ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُۥ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٦٣﴾ ﴾ الأنعام: ١٦١ – ١٦٣، هەروەها دەفەرموێت ﴿ فَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْمُعَذَّبِينَ ﴿٢١٣﴾ ﴾ الشعراء: ٢١٣، هەروەها دەفەرموێت ﴿ لَّا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَقْعُدَ مَذْمُومًا مَّخْذُولًا ﴿٢٢﴾ ﴾ الإسراء: ٢٢، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ۘ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ ﴾ القصص: ٨٨، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلْ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَنِيَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَٰشِفَٰتُ ضُرِّهِۦٓ أَوْ أَرَادَنِي بِرَحْمَةٍ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَٰتُ رَحْمَتِهِۦ ۚ قُلْ حَسْبِيَ ٱللَّهُ ۖ عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾ الزمر: ٣٨، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ ﴾ يونس: ١٠٧، هەروەها دەفەرموێت ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ فَٱعْبُدِ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿٢﴾ ﴾ الزمر: ٢، هەروەها دەربارەی یارانی ئەشكەوت دەفەرموێت ﴿ وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا۟ فَقَالُوا۟ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ

﴿وَٱلْأَرْضِ لَن نَّدْعُوَا۟ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهًا ۖ لَّقَدْ قُلْنَآ إِذًا شَطَطًا ﴿١٤﴾﴾ الكهف: ١٤، هەروەها دەربارەی پیاوەکەی سورەتی "یس" دەفەرموێت ﴿إِن يُرِدْنِ ٱلرَّحْمَٰنُ بِضُرٍّ لَّا تُغْنِ عَنِّى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا وَلَا يُنقِذُونِ ﴿٢٣﴾﴾ یس: ٢٣، هەروەها دەفەرموێت ﴿أَمِ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ ۖ فَٱللَّهُ هُوَ ٱلْوَلِىُّ﴾ الشوری: ٩، هەروەها دەفەرموێت ﴿أَمِ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَ ۚ قُلْ أَوَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَمْلِكُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَعْقِلُونَ ﴿٤٣﴾ قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعًا ۖ لَّهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٤٤﴾﴾ الزمر: ٤٣ – ٤٤، هەروەها دەفەرموێت ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُوا۟ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُوا۟ لَهُۥ ۖ وَإِن يَسْلُبْهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيْـًٔا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلْمَطْلُوبُ ﴿٧٣﴾ مَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٧٤﴾﴾ الحج: ٧٣ – ٧٤، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا﴾ النساء: ٣٦

لەم شێوەیە لە قورئاندا زۆرن، بەڵکو زیاترە لەوەی بتوانرێت باس بکرێت، ئەو جۆرە یەکتاپەرستییە یەکەمین و دواهەمین و ناوەوە و دەرەوە و لوتکە و جەمسەری رجای یەکتاپەرستییە، خودای موتەعال فەرمانی پێکردووین چاو لە ئیمامی ئەم جۆرە یەکتاپەرستییە بکەین لە نەرێ و جێگیرکردندا، وەك خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُوا۟ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُا۟ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ﴾ الممتحنة: ٤، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦٓ إِنَّنِى بَرَآءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ ﴿٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِى فَطَرَنِى فَإِنَّهُۥ سَيَهْدِينِ ﴿٢٧﴾﴾ الزخرف: ٢٦ – ٢٧، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُوا۟ نَعْبُدُ أَصْنَامًا فَنَظَلُّ لَهَا عَٰكِفِينَ ﴿٧١﴾ قَالَ هَلْ يَسْمَعُونَكُمْ إِذْ تَدْعُونَ ﴿٧٢﴾ أَوْ يَنفَعُونَكُمْ أَوْ يَضُرُّونَ ﴿٧٣﴾ قَالُوا۟ بَلْ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا كَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴿٧٤﴾ قَالَ أَفَرَءَيْتُم مَّا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٧٥﴾ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمُ ٱلْأَقْدَمُونَ ﴿٧٦﴾ فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّىٓ إِلَّا رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٧﴾ ٱلَّذِى خَلَقَنِى فَهُوَ يَهْدِينِ ﴿٧٨﴾ وَٱلَّذِى هُوَ يُطْعِمُنِى وَيَسْقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾ وَٱلَّذِى يُمِيتُنِى ثُمَّ يُحْيِينِ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِىٓ أَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لِى خَطِيٓـَٔتِى يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿٨٢﴾﴾ الشعراء: ٦٩ – ٨٢، گەر تێرامان لە قورئاندا بکەیت–لە سەرەتاوە بۆ کۆتاییەکەی– دەبینیت لە خولگەی ئەم یەکتاپەرستییەدا دەسوڕێتەوە، هەروەها دانپیادانان و مافەکانی.

شێخمان شێخی هەرەوی دەفەرموێت: هەردوو خەلیلەکە کاملترینی تایبەتی تایبەتەکانن لەم یەکتاپەرستییەدا، ناگونجێت کەسێك لە ئوممەتدا هەبێت

یەكتاپەرستییەكەی لە پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران كاملتر بێت، چجای پێغەمبەرانی خاوەن ریسالەت، چجای پێغەمبەرانی خاوەن عەزم، چجای هەردوو خەلیلەكە!
كەمالی ئەم جۆرە یەكتاپەرستییە: ئەوەیە كە شتێك لە دلدا بۆ غەیری خودا نەمێنێتەوە، بەلكو بەندە لە هەموو شتێكدا لەگەل خودادا بێت، ئەو كەسەی خۆشدەوێت خودا خۆشی دەوێت، ئەو شتەی خۆشدەوێت ئەو خۆشی دەوێت، هەر بەو جۆرە ئەو كەس و شتەی رق لێیە كە خودا رقی لێیانە، دۆستایەتی ئەو كەسانە دەكات كە دۆستایەتی خودا دەكەن، دوژمنایەتی ئەو كەسانە دەكات دوژمنایەتی خودا دەكەن، فەرمان بەوە دەكات خودا فەرمانی پێكردووە، و نەهی لەوە دەكات خودا نەهی لێكردووە.

سوێند بە خودا، بۆ دەركەوتن و جیلوەكردنی ئەم یەكتاپەرستییە خودا پێغەمبەرانی رەوانە كردووە و كتێبەكانی دابەزاندووە و فەرمانی بە پێشینەكان و پاشینەكان كردووە.

دەركەوتنی ئەم یەكتاپەرستییە و جیلوەكردن و رۆشنبوونەوەی و شایەتی فیترەت و ئەقل لەسەری: مەزنترین بەلگەیە لەسەر ئەوەی بالاترین یەكتاپەرستییە و لوتكەكەیەتی، بۆیە شیركی گەورە لەبەریەكتر هەلدەتەكێنێ و لە بنج و بێخی دەهێنێت، هەر شتێك گەورە و مەزن بوو دەبێت گەورە و مەزن كۆتایی پێبهێنێت، گەر شتێك لەم یەكتاپەرستییە مەزنتر بوایە خودای موتەعال شیركی گەورەی پێ پالپێوە دەنا و كۆتایی پێدەهێنا، بەهۆی مەزنی و گەورەیی ئەم یەكتاپەرستییەوەیە: رووگەی بۆ دانراوە و رەوگەی بۆ دامەزراوە، و خانەی كوفری لە خانەی ئیسلام پێ لەیەكتر جیاكراوەتەوە، و خەلكی بۆ ئەهلی بەختەوەری و ئەهلی شەقاوەت و هیدایەتدراو و گومرا دابەش بووە و كتێبەكان و پێغەمبەران بانگیان بۆ كردووە.

## ۞ یەكتاپەرستی تێگەیشتنی دلە نەك رەوانبێژی زمان

ئەم یەكتاپەرستییە لەناو دلی ئەهلی خۆیدا داپۆشراوە هەرچەند زۆربەیان ناتوانن ئاماژەی پێبكەن و رۆشنی بكەنەوە وەلامی پشتهەلكەرانی پێبدەنەوە، و بەرگری بكەن و شوبهەی سەرپێچیكەرانی پێ پەرچبدەنەوە، گومانی تێدا نییە زۆربەی خەلكی ناتوانن ئەو كارە ئەنجام بدەن، دەربرینی ئەو یەكتاپەرستییە قەدەرێكی زیادەیە لەسەر بوونی یەكتاپەرستی لە دلیاندا، مەرج نییە هەر كەسێك شتێكی زانی و

فێری بوو و وردەکارییەکانی زانی بتوانێت ئاماژەی پێبکات و بە زمان دەریببڕێت و شوبهە نابوودکەرەکانی بەرپەرچ بداتەوە، ئەمەیان رەنگێکە و بوونی لەناو دڵدا رەنگێکی ترە.

بەڵگەهێنانەوە و ئاماژە بۆ کردنی هەر کەسێك بەپێی یەکتاپەرستییەکەیەتی، جۆرەکانی بەڵگەهێنانەوە و رووەکانی و ئاستەکانی مەگەر تەنها خودا بۆخۆی بزانێت و هەژماریان بکات، بۆ هەر دەستەیەك هیدایەتدەرێك بوونی هەیە، بۆ هەر زانستێکی دروستی یەقیندار بەڵگەیەك بوونی هەیە پێویستی دەکات و شاهیدێك هەیە دروستییەکەی دەسەلمێنێت، لەوانەیە خاوەنەکەی نەتوانێت بەهۆی دەستەوسانی و کەم هۆشیارییەوە تەعبیری لێبکات، گەر تەعبیریشی لێبدات لەوانەیە نەتوانێت بە وشە و زاراوەی ئەهلی زانست دەریببڕێت، بەڵکو هەر کەس بەدواداچوون بۆ ئەحواڵی خەڵکی بکات دەبینێت، زۆرێك لە ئەهلی ئیسلام-یان زۆرینەیان- خاوەنی مەزنترین یەکتاپەرستین و زۆرترین مەعریفەیان هەیە و ریشەداترین باوەڕیان هەیە قووڵتر لە ئەهلی کەلام و ئەربابی تێڕوانین و جیدال، هەروەها بەڵگەگەلێك لای ئەوانە دەبینییەوە کە ئیمانەکەیانی پێ دروست دەبێت دەرکەوتووتر و رۆشنتر و دروستتر لەوەی لەلای ئەهلی کەلام بوونی هەیە، ئەو ئایەتانەی کە خودای موتەعال هانی بەندەکانی دەدات بۆ سەیرکردن و تێڕامان تیایاندا و کردن بە بەڵگەی یەکتاپەرستییەکەیان و جێگیرکردن و سەلماندنی سیفەت و کردارەکانی خودای موتەعال و صدقی پێغەمبەرانی: ئەوانە ئایاتگەلێکن پەیپێبراون بە هەست و زانراون بە ژیری و جێگیرن لە فیترەتدا، ئەو کەسەی لەم ئایەتانە دەڕوانێت ئاتاجی بارودۆخی ئەهلی کەلام و جەدەل و زاراوە و رێگەکانیان نابێت، هەر کەس هەستێکی سەلیمی هەبێت و خاوەنی ئەقڵێك بێت ئەو ئایەتانە دەناسێتەوە و دانیان پیادا دەنێت و لە زانستەوە بەو ئایەتانە دەگوێزێتەوە بۆ زانست بە ئاماژەکان و مەدلولەکانیان، لە قورئاندا "دەیان هەزار"(ئەم ژمارەیە جێگەی پرسیاری وەرگێڕە) لەو ئایەتە روون و ئاشکرانە بوونیان هەیە، هەر کەس قورئانی لەبەر نەبێت کاتێك ئەو ئایەتانە دەبیستێت و تێیان دەگات و دەیانژنەوێت زەینی لە ئایەتەکانەوە بەخێراترین شێوە دەگوێزێتەوە بۆ مەدلولەکانیان(واتە ئاماژەبۆکراوەکانیان) و دانیان پیادادەنێت.

بە کورتی: مەرج نییە هەر کەسێك شتێکی زانی بتوانێت ئامـاژەی پێبکـات و بەڵگـەی پێبهێنێتەوە، مەرجیش نییە هەر کەسێك توانی بەڵگـە بهێنێتـەوە و ئاماژەیـان پێبکـات بتوانێت بەجوانی بەڵگەکانی ڕێکبخات و دەریانبڕێت و وەڵامی بەرهەڵستکاران بداتەوە.

## ۞ تۆوی یەکتاپەرستی دەڕوێت و گەشە دەکات

شێخولئیسلام ئیمامی هورەوی دەفەرموێت:

یەکتاپەرسـتی بـە ئـەقڵ و بـە بیسـتن سـەلمێنراوە، بـە تـەوفیقی خـودا دەبینرێتـەوە لەدوای پێبینینی، و گەشە دەکات بە وەڵامدانەوەی بانگکەری حەق و وردبوونـەوە لـە شاهیدەکان((ويجب التوحيد بالعقل والسمع، ويوجد بتوفيـق الله بعـد تبصـيره، وينمـو بإجابة داعي الحق والتبصر في الشواهد))

**لێرەدا سێ بابەت هەیە:**

یەکـەمیان: ئـەوەی یەکتاپەرسـتی پێویسـت دەکـات، دووەم: ئـەوەی بەهۆیـەوە دەبینرێتەوە، و سێیەمیش: ئەوەی گەشەی پێدەکات.

بابـەتی یەکـەم: خـەڵکی جیاوازیـان هەیـە تیایـدا، دەسـتەیەك دەڵـێن: بـە ئـەقڵ یەکتاپەرسـتی پێویسـت دەبێـت، کەسـەکە لەسـەر وازلێهێنـانی سـزا دەدرێـت، و بیستنیش دان بەوەدا دەنێت کە ژێری پێویستی کردووە و دووپـاتی کردۆتـەوە، بۆیـە پێویست بوون و سزا لەسەر وازهێنانی بە ئەقڵ سەلماوە و جێگیر بووە.

بیسـتنیش ڕۆشـنکەرەوە و دانپیانـەری ئـەو پێویسـتبوون و سـزایە، ئەمـە بۆچـوونی موعتەزیلە و شوێنکەوتووانی هەندێ لە ئیمامانن لە بابەتی پەسەند و ناپەسەندی ئەقڵی.

دەستەیەکی تر دەڵێن: بـە ئـەقڵ ناسـەلمێت نـە پێویسـتبوون و نـە سـزا لەسـەری، بەڵکو هیچ شتێکی یەکتاپەرستی بە ژێری ساغ نابێتەوە، بەڵکو سەلماندنی تەنها لە ڕێگـەی شـەرعەوەیە، بۆیـە شایسـتەی سـزا دەبێـت لەسـەر وازلێهێنـانی، ئەمـەش بۆچوونی ئەشعەرییەکان و ئەوانەیە کە بۆچـوونی ئـەوانیان هەیـە لەمـەڕ پەسـەند و ناپەسەندی ئەقڵی.

ڕاستییەکەی: پێویست بوونی یەکتاپەرستی بە ئەقڵ و بە بیستن سەلماوە، و قورئـان بەڵگەیە لەسەر ئەم ڕاستییە، قورئان بەڵگـە و بورهـانی ئـەقڵی لەسـەر یەکتاپەرسـتی

دەخاتەڕوو، و پەسەندی یەکتاپەرستی و ناپەسەندی هاوەڵدانان ڕۆشن دەکاتەوە و دەخاتەڕوو، فەرمان بە یەکتاپەرستی دەکات و نەهی لە هاوەڵدانان دەکات، بۆ ئەو مەبەستە خودای موتەعال نموونەگەلێك دەهێنێتەوە کە بریتین لە بەڵگەی ئەقڵی، بەو جۆرە گوتارە گفتوگۆ لەگەڵ خەڵکیدا دەکات بۆ کەسانێك کە پەسەندی و پێویستبوونی یەکتاپەرستی و ناپەسەندی و ناشیرینی هاوەڵدانان لە ئەقڵ و ژیرییاندا جێگیر بووە، قورئان پڕە لە بورهانە ئەقڵییەکان کە ئاماژەن بۆ ئەو ڕاستییە، وەك ئایەتی ﴿ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ شُرَكَاءُ مُتَشَاكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ۚ الْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾ الزمر: ٢٩، هەروەها ﴿ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا عَبْدًا مَّمْلُوكًا لَّا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَيْءٍ وَمَن رَّزَقْنَاهُ مِنَّا رِزْقًا حَسَنًا فَهُوَ يُنفِقُ مِنْهُ سِرًّا وَجَهْرًا ۖ هَلْ يَسْتَوُونَ ۚ الْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا رَّجُلَيْنِ أَحَدُهُمَا أَبْكَمُ لَا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَيْءٍ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوْلَاهُ أَيْنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأْتِ بِخَيْرٍ ۖ هَلْ يَسْتَوِي هُوَ وَمَن يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ ۙ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٧٦﴾ ﴾ النحل: ٧٥ – ٧٦، هەروەها ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُوا لَهُ ۚ إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَن يَخْلُقُوا ذُبَابًا وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ ۖ وَإِن يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئًا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ۚ ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ ﴿٧٣﴾ مَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٧٤﴾ ﴾ الحج: ٧٣ – ٧٤، چەندانەی ئەوانەش لە بەڵگە و بورهانی یەکتاپەرستی ئەقڵی کە قورئان ڕێنومایی دەکات بۆ سەریان و ئاماژەیان پێدەدات.

لێرەدا حاڵێکی تر هەیە ئەوەش ئەوەیە کە سزا لە وازهێنانی ئەو واجبە ئەقڵییە دوادەکەوێت بۆ کاتی هاتنی شەرع، وەك قورئان ئاماژەی پێدەکات﴿ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ ﴾ الإسراء: ١٥، هەروەها﴿ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ الْغَيْظِ ۖ كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ﴿٨﴾ قَالُوا بَلَىٰ قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا ﴾ الملك: ٨ – ٩، هەروەها ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِي أُمِّهَا رَسُولًا يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا ۚ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي الْقُرَىٰ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَالِمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾ القصص: ٥٩، هەروەها ﴿ ذَٰلِكَ أَن لَّمْ يَكُن رَّبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا غَافِلُونَ ﴿١٣١﴾ ﴾ الأنعام: ١٣١، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دوای ناردنی پێغەمبەران دەچنە ڕیزی ستەمکارانەوە، خودا هیچ کەسێك تیانابات بەهۆی ئەو ستەمەوە تا بەڵگە و بورهانیان بەسەردا ساغ نەکاتەوە، ئایەتەکە بەرپەرچی دوو دەستەکە دەداتەوە، هەندێك دەڵێن: ستەم و ناپەسەند تەنها بە بیستن ساغ

دەبێتەوە و جێگیر دەبێت، هەیە دەڵێت: ئەوانە بەبێ بیستنیش سزا دەدرێن، قورئان قسەی هەردوو دەستەکە رەد دەکاتەوە، وەك دەفەرموێت ﴿وَلَوْلَآ أَن تُصِيبَهُم مُّصِيبَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَيَقُولُوا۟ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ ءَايَـٰتِكَ وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾﴾ القصص: ٤٧، رایگەیاند ئەوەی بەر لە ناردنی پێغەمبەران ئەنجامیانداوە هۆیەك بووە لە تووشبوونیان بە بەڵا و سزاکان، بەڵام خودای موتەعال بەر لە ناردنی پێغەمبەران کە دەبنە بەڵگە و حوجەی خودایی لەسەر مرۆڤ ئەو کارەی ئەنجام نەداوە، وەك دەفەرموێت ﴿رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ﴾ النساء: ١٦٥، هەروەها ﴿وَهَـٰذَا كِتَـٰبٌ أَنزَلْنَـٰهُ مُبَارَكٌ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٥٥﴾ أَن تَقُولُوٓا۟ إِنَّمَآ أُنزِلَ ٱلْكِتَـٰبُ عَلَىٰ طَآئِفَتَيْنِ مِن قَبْلِنَا وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمْ لَغَـٰفِلِينَ ﴿١٥٦﴾ أَوْ تَقُولُوا۟ لَوْ أَنَّآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْكِتَـٰبُ لَكُنَّآ أَهْدَىٰ مِنْهُمْ ۚ فَقَدْ جَآءَكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ﴾ الأنعام: ١٥٥ — ١٥٧، هەروەها ﴿أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَـٰحَسْرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِى جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّـٰخِرِينَ ﴿٥٦﴾ أَوْ تَقُولَ لَوْ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِى لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٥٧﴾ أَوْ تَقُولَ حِينَ تَرَى ٱلْعَذَابَ لَوْ أَنَّ لِى كَرَّةً فَأَكُونَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ بَلَىٰ قَدْ جَآءَتْكَ ءَايَـٰتِى فَكَذَّبْتَ بِهَا وَٱسْتَكْبَرْتَ وَكُنتَ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٥٩﴾﴾ الزمر: ٥٦ — ٥٩، ئەم جۆرە ئایەتانە لە قورئاندا زۆرن کە رایدەگەیەنن بەڵگە و حوجەی خودایی بە کتێب و پێغەمبەر لەسەر مرۆڤ ساغ دەبێتەوە، هەروەها ئاگاداریان دەکاتەوە بەوەی لە ئەقڵ و فیترەتیاندایە: لە پەسەندی یەکتاپەرستی و شوکر و ناپەسەندی هاوەڵدانان و بێباوەڕی.

ئەم بابەتە لە کتێبی "مفتاح دار السعادة" لەو کتێبەدا نزیکەی شەست روومان باسکردووە، بۆچوونی ئەوانە بەتاڵ دەکاتەوە کە نەرێی ناپەسەندی ئەقڵی دەکەن و بانگەشەی ئەوە دەکەن پەسەندی و ناپەسەندی هیچ کردارێك بە ژیری دیاری ناکرێت، دەگونجێ خودا فەرمان بە شتێك بکات کە ئەقڵ نەهی لێبکات، یان خودا نەهی لە شتێك بکات ئەقڵ فەرمانی پێبکات، ئەمە لە ئەقڵ دەوەشێتەوە، دەبێت جیاکردنەوەی فەرمانپێکراو و نەهیلێکراو تەنها لە رێگەی شەرعەوە بێت، نەك بە پەسەندی و ناپەسەندی ژیری، گەر شەرع نەهی بکردبایە لە یەکتاپەرستی و ئیمان و شوکر ئەوە ناپەسەند بوون بۆیە نەهی لێکردوون، خۆ گەر فەرمانی بە هاوەڵدانان و بێباوەڕی و

ستەم و فەواحش كرد ئەو پەسەندن بۆیە فەرمانی پێكردوون، ئێمە لەو كتێبەدا بەیانی ئەوەمان كردووە ئەو بۆچوونە پێچەوانەی ژیری و فیترەت و قورئان و سوننەتە.

مەبەستەكە: پێویستبوونی یەكتاپەرستی بە بیستن(شەرع) و بە ئەقڵ هەرچەند جیاوازی لەڕوی پێویستبوونیەوە هەیە، ژیری پێویستی دەكات: بە مانای ئەوەی داوای كردارەكەی دەكات و زەمی وازلێهێنانی دەكات و دژی یەكتاپەرستی ناشرین و نابوود دەكات، بیستن بەم مانایە ئەو یەكتاپەرستییە پێویست دەكات، زیاتر لەمەش: جێگیربوونی سزا لەسەر وازلێهێنانی، و هەواڵدانی خەشم و رقی خودایی بۆ ئەوانەی واز لە یەكتاپەرستی دەهێنن، ئەمەش بە ئەقڵ دەزانرێت، كاتێك نابوودی و ناپەسەندی شتێك بە ئەقڵ دەردەكەوێت ئەوا جێگیركردنی كەماڵی پەروەردگار بۆ خودای موتەعال ساغ دەبێتەوە، ئەمەش جێگیركردنی دوو ئەمر دەخاتە روو: زانینی ژیری بە خەشم و تووڕەیی پەروەردگار بۆ ئەوانەی پشتیان لەو یەكتاپەرستییە كردووە، بەڵام وردەكارییەكانی ئەو سزا و خەشمە خوداییە لە ڕێچكەی بیستن(شەرع)ەوەیە.

بزانە گەر پەسەندی یەكتاپەرستی و ناپەسەندی هاوەڵدانان لەڕێگەی ئەقڵەوە نەزانرێت و لە فیترەتدا جێگیر نەبێت ئەوكاتە هیچ متمانەیەك نامێنێتەوە بە بابەتە ئەقڵییەكان، چونكە ئەم بابەتە لە مەزنترین بابەتە بەڵگەنەویستەكانە، ڕۆشنترین شتێكە خودا لە ئەقڵ و فیترەتدا دایناوە، بۆیە خودای موتەعال لەدوای باسكردنی ئەو یەكتاپەرستییە و دەرخستنی ڕووی خراپی هاوەڵدانان دەفەرموێت ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾، یان ﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾، نەرێی ئەقڵ لە ئەهلی هاوەڵدانان دەكات و هەواڵ دەربارەیان دەدات بەوەی ئەوانە ئەهلی دۆزەخن چونكە نەیاندەبیست و بیریان نەدەكردەوە و تێنەدەگەیشتن، بەڵكو ئەوانە لە داواكارییەكانی بیستن و ژنەوتن هاتوونەتە دەرەوە، دەربارەیان دەفەرموێت ﴿صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٧١﴾﴾ البقرة: ١٧، دەربارەیان دەفەرموێت كە ئەوانە بیستن و بینین و ژنەوتنیان سوودێكی بۆیان نەبوو، گەر لە ئەقڵی مرۆڤدا بەڵگە بوونی نەبێت لەسەر ئەو ڕاستییە قورئان نەیدەفەرموو ((انظروا))، ((اعتبروا))پەند وەربگرن، ((سيروا في الأرض فانظروا))، ئەوان ئەو كاتە دەیانوت: ژیریمان هیچ بەڵگەیەكی لەسەر ئەوە تێدا نییە، ئەوە تەنها قسە و هەواڵی تۆیە، ئەو

سەرنجدان و بیرکردنەوە و گەڕان بەسەر زەوییەدا چ مانایەکی هەیە، ئەم نموونانە چییە دەیهێنێتەوە، و ئەم کێشانە و پێوانە ئەقڵی و بینراوانە چییە ئاماژەی پێدەدەیت؟ ئایا ئەمە ڕۆشنترین بەڵگە نییە لەسەر پەسەندی یەکتاپەرستی و شوکری خودا؟

ناشیرینی و ناپەسەندی هاوەڵدانان و بێباوەڕی لە ئەقڵ و فیترەتدا ریشەی داکوتیوە، ئەوەش بۆ ئەو کەسەی خاوەنی دڵێکی زیندوو و ئەقڵێکی سەلیم و فیترەتێکی تەندروستە روون و ئاشکرایە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾ الزمر: ٢٧، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَا إِلَّا الْعَالِمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ العنكبوت: ٤٣، هەروەها دەفەرموێت ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴿٣٧﴾ ﴾ ق: ٣٧، هەروەها دەفەرموێت ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ۖ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَٰكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ ﴿٤٦﴾ ﴾ الحج: ٤٦، هەروەها دەفەرموێت ﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾ ﴾ البقرة: ٢١٩، هەروەها دەفەرموێت ﴿ قُلِ انظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَمَا تُغْنِي الْآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠١﴾ ﴾ یونس: ١٠١، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَيَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾ إبراهيم: ٢٥

لە هەندێك لەو نموونە ئەقڵییانە: ئەوەی خودا هێڵاویەتەوە لە ئاسەواری سزادانی ئەهلی شیرك و ئاسەواری شار و وڵاتیان و ئەوەی بەسەریان هات لە سزا و بەربادبوون، هەروەها ئەوەی ماوەتەوە لە سەرکەوتنی ئەهلی یەکتاپەرستی و پشتیوانی لێکردنیان و سەرئەنجامی باش بۆیان، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَعَادًا وَثَمُودَ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَاكِنِهِمْ ﴾ العنكبوت: ٣٨، دەربارەی سەموودیش دەفەرموێت ﴿ فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةً بِمَا ظَلَمُوا ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٥٢﴾ وَأَنجَيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾ النمل: ٥٢ – ٥٣، دەربارەی هۆزی لوتیش دەفەرموێت ﴿ إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَىٰ أَهْلِ هَٰذِهِ الْقَرْيَةِ رِجْزًا مِّنَ السَّمَاءِ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ﴿٣٤﴾ وَلَقَد تَّرَكْنَا مِنْهَا آيَةً بَيِّنَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ العنكبوت: ٣٤ – ٣٥، هەروەها دەفەرموێت ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٍ مُّقِيمٍ ﴿٧٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٧٧﴾ وَإِن كَانَ أَصْحَابُ الْأَيْكَةِ لَظَالِمِينَ ﴿٧٨﴾ فَانتَقَمْنَا

مِنْهُمْ وَإِنَّهُمَا لَبِإِمَامٍ مُّبِينٍ ﴿٧٩﴾ ﴾ الحجر: ٧٥ – ٧٩، جارێكی تر دەربارەی هۆزی لوت دەفەرموێت ﴿ وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ ﴿١٣٧﴾ وَبِالَّيْلِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٣٨﴾ ﴾ الصافات: ١٣٧ – ١٣٨، خودای موتەعال لە سورەتی "الشعراء"دا باسی ئەوە دەكات بەسەر هاوەڵدانەراندا هێنای لە چەندین جۆری سزا و رزگاركردنی ئەهلی یەكتاپەرستی لەو سزایە، پاشان دەفەرموێت ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴿٩﴾ ﴾ الشعراء: ٨ – ٩، باسی شیركی ئەوانە دەكات كە بەهۆیەوە شایستە بوون بە بەربادبوون، هەروەها باسی یەكتاپەرستی دەستەیەك دەكات كە شایستە بوون بە رزگاربوون، پاشان هەواڵدەدات كە لەو بەربادبوون و رزگاربوونەدا ئایەت و بەڵگە و نیشانەی تێدایە بۆ باوەڕداران، پاشان سەرچاوەی هەموو ئەوانە باس دەكات كە لە ناو و سیفەتەكانی خودای موتەعالەوەیە، دەرچوونی ئەو بەربادبوونە لە عیززەتی خوداوەیە و رزگاربوونی ئەو دەستەیەش لە رەحمەتی خوداوەیە، پاشان لە كۆتایی سورەتەكەدا پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرەكەی(ﷺ) بە بەڵگەی ئەقڵی و بە باشترین راگەیاندن دەخاتە روو. ئەوجا شوبهەی درۆزنان بە باشترین وەڵام وەڵامدەداتەوە، هەر بەو جۆرە باسكردنی زیندووبوونەوە بە بەڵگەی ئەقڵی و بەرهەست، هەروەها نموونەهێنانە و خستنەرووی كێشانە و پێوانە، بۆیە دەڵێین بەڵگەكانی قورئان بیستن(شەرعی) و ئەقڵین.

بابەتی دووەم: دەبینرێتەوە لەدوای كۆمەكی خودا بە پێبینی((ویوجد بتوفیق الله بعد تبصیره)) واجبوونی شتێك لەڕووی شەرعەوە مەرج نییە بوونێكی بەرهەستی هەبێت، بۆیە باسی پێبینینی كرد دوای ئەوەی باسی پێویستبوونی كرد، ئەوەش بریتییە لە پێبینی حەق –سبحانه– مەبەستەكەی: بینینی تەواو كە هیدایەتی لێ دوانەكەوێت، ئەگینا لەوانەیە بەندە شتێك ببینێت و هیدایەتی پێنەبینرێتەوە، وەك دەفەرموێت ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَاهُمْ فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَىٰ عَلَى الْهُدَىٰ ﴾ فصلت: ١٧، خودای موتەعال بینینی رۆشنی پێدان، بەڵام ئەوان گومراییان بەسەر هیدایەتدا هەڵبژارد، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْمًا بَعْدَ إِذْ هَدَاهُمْ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَ ﴾ التوبة: ١١٥، هەروەها دەربارەی قەومی فیرعەون دەفەرموێت ﴿ وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ﴾النمل: ١٤، ئەم جۆرە پێبینینە رۆشنە هیدایەتی بەدوای خۆیدا

نەهێنا، چونکە خودا-سبحانە- بوونی ئەو هیدایەتەی نەویست، بەڵکو تەنها پێبینینی مەبەست بوو، ئەوەی خودا ویستی بکات دەبێت و ئەوەش ئەو نەیەوێت نابێت.

بەڵام پێبینی تەواو: هیدایەت بەدوای خۆیدا دەهێنێت، ئەوەش ئەوەیە فەرمانمان پێکراوە لە هەموو نوێژێکدا داوای بکەین لە خودا، ئەهلی بەهەشت تیایدا دەڵێن ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهۡتَدِيَ لَوۡلَآ أَنۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ﴾ الأعراف: ٤٣، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَٱللَّهُ يَدۡعُوٓاْ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ۝٢٥﴾ یونس: ٢٥، بەیان و دەلالەتی بە بانگەواز گشتگیر کرد و تەوفیق و ئیلهامیشی بە هیدایەت تایبەت کرد.

بابەتی سێیەم: ئەوەی شێخی هەروی دەفەرموێت: دەڕوێت و گەشەدەکات بە وەڵامدانەوەی بانگکەری حەق((وينمو بإجابة داعي الحق))، تەنها بینینی شاهیدەکان بەس نییە بۆ ڕووان و گەشەی ئەو باوەڕە﴿وَكَأَيِّن مِّنۡ ءَايَةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ يَمُرُّونَ عَلَيۡهَا وَهُمۡ عَنۡهَا مُعۡرِضُونَ ۝١٠٥﴾ یوسف: ١٠٥، کەسەکە بە پاڵیدا گوزەر دەکات نە گەشەی پێدەکات و نە پێی زیاد دەکات، بەڵکو ئیمان و یەکتاپەرستی کەم دەکات، بەڵام گەر وەڵامی بانگکەرەکەی دایەوە و لە شاهیدەکە وردبوویەوە یەکتاپەرستییەکەی گەشە دەکات، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿وَٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ زَادَهُمۡ هُدٗى وَءَاتَىٰهُمۡ تَقۡوَىٰهُمۡ ۝١٧﴾ محمد: ١٧، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ هُدٗى﴾مریم: ٧٦، هەروەها ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا﴾ التوبة: ١٢٤.

قسەکەی شێخی هەروی ئەوەی دەقەکان ئاماژەی پێدەکەن و هاوەڵان و شوێنکەوتووان لەسەری هاوڕان لەخۆ دەگرێت، ئەوەش ئەوەیە کە ئیمان و یەکتاپەرستی زیاد دەکەن و گەشە دەکەن، ئەمەش لە مەزنترین ئەو بنچینانەی ئەهلی سوننەتە کە لە جەهمی و مورجیئەکان خۆیانی پێ جیادەکەنەوە.

## ۞ وابەستەبوونی هیدایەت بە تەوفیقی خوداییەوە نەڕێی پێویستبوونی بانگەواز ناکات

وابەستەبوونی بەندە بە شاهیدەکانەوە کە بریتین لە بەڵگە و ئایات لە بوونی یەکتاپەرستییە، خودای موتەعال بەڵگەی لەسەر یەکتاپەرستی داناوە، و بورهانی راستکردۆتەوە و ئایاتی دەرخستووە، فەرمانی پێکردووین بەڵگە و ئایەتەکان ببینین،

لێیان سەرنج بدەین و بەڵگەیان پێ بهێنینەوە، ئەم جێگیرکردن و ساغیبوونەوە هەرگیز لەگەڵ ئەو نەرێکردنەدا کۆنابنەوە، هەموو دروستکراوەکان ئایاتی یەکتاپەرستین، هەر بەو جۆرە ئایەتە خوێنراوەکان(قورئان) بەڵگەن لەسەر بوونی ئەو یەکتاپەرستییە.

یەکتاپەرستی–هەموو یەکتاپەرستی– ئەوەیە کە هەموو شتێك بکرێتە بەڵگە لەسەری و رێنومایی بۆ لای، پێغەمبەران بەڵگەی یەکتاپەرستین، خودای موتەعال بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێت ﴿وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾﴾ الشوری: ٥٢، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ ﴿٧﴾﴾ الرعد: ٧، "الهادی" بریتییە لەو دەلیلەی کە رێگەیان بۆ لای خودا و خانەی رۆژی دوایی پێ نیشان دەدات، ئەمەش پێچەوانە نییە لەگەڵ ئایەتی﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ ﴾القصص: ٥٦، هەروەها ئایەتی ﴿فَإِنَّ اللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي مَن يَشَاءُ ﴾فاطر: ٨، خودای موتەعال باسی گومڕایی و هیدایەتی کردووە، پێغەمبەرانی هیدایەتدەر هیدایەتەکەیان هیدایەتی دەلالەت و بەیانکردنە، بەڵام خودا هیدایەتدەری تەوفیق و ئیلهامە، بۆیە پێغەمبەران بەڵگەی حەقن، خودای موتەعالیش تەوفیقدەر و ئیلهامکەرە بۆ ئیمان، خولقێنەری هیدایەتە لە دڵی کەسەکاندا.

لە یەکتاپەرستی راستەقینەیە گەر بەندایەتی و هەستان بە بەندایەتی ببینیت و بزانیت لە چاوگەی منەت و فەزڵی خوداوەیە، هەروەها هەژاری و ئاتاجی خۆت ببینیت، پێغەمبەر لە ماڵەوە هاتە دەرەوە بۆ سەیرکردنی ئەڵقەیەك لە دانیشتنی هاوەڵانی کە یادی خودا و منەت و فەزڵی خودایان بەسەر خۆیانەوە دەکرد، فەرمووی ((چی ئێوەی کۆکردۆتەوە؟ وتیان: دانیشتین بۆ یادکردنەوەی ئەوەی خودا منەتی خستۆتە سەرشانمان و بەهۆی تۆوە هیدایەتی ئیسلاممان وەرگرت، فەرمووی سوێندتان دەدەم بە خودا بۆ ئەوە دانیشتبوون؟ وتیان: سوێند بە خودا بۆ ئەوە دانیشتبووین، فەرمووی: من سوێندم نەدان لەبەر تۆمەتبار کردنتان، بەڵام خودا شانازیتان پێوە دەکات لای فریشتەکانی))

لە هۆیەکانی شانازی خودایی بە مرۆڤ لەلای فریشتەکان: پێبینینی هۆی یەکتاپەرستی و وەسیلەی رزگارییانە، خودا منەتی کردووە بەسەر ئەوانەدا و نیعمەتی بەسەردا داباراندوون ﴿لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ ﴾ آل عمران: ١٦٤

ئەم هەستکردنە بە ئاتاجی و هەژاری دژ بەوە نییە باوەڕدار شانازی بکات بە منەتی خودایی بەسەریەوە گەر مەبەستی یادکردن و بڵاوەپێکردن و فێرکردن و پەروەردەی کەسانی تر بێت.

شانازیکردن دوو جۆرە: ناپەسەند و پەسەند، ناپەسەند: دەرخستنی پلە و پایەی خۆی لەسەر هاوشێوەکانی خۆی لە مرۆڤ و خۆبالآکردن بەسەریاندا، ئەم جۆرەیان ناپێویست و داوانەکراوە، پەسەندەکەی: دەرخستنی ئەحواڵی سونییانە و مەقاماتی بەرز و بڵند وەك ئاشکراکردن و راگەیاندنیان، نەك وەك فەخرکردنی ناپەسەند، بەڵکو وەك بە مەزن زانینی نیعمەتی خودا لەسەری، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((من سەرداری رۆڵەکانی ئادەمم بەبێ فەخرکردن)) هەروەها ((من یەکەم کەسم رۆژی دوایی زەویم بۆ شەق دەبات و دێمە دەرەوە بەبێ فەخر)) هەروەها ((من یەکەم شفاعەتکەر و یەکەمین شفاعەت لێوەرگیراوم بەبێ فەخر)) سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس–خوا لێی رازی بێت– دەفەرموێت ((من یەکەم کەسم تیرم لە پێناوی خودادا هاوێشتووە)) ئەبو زەڕ–خوا لێی رازی بێت– دەفەرموێت ((ئەوە و ئەوەم بەسەرهات، من سێیەم کەسم موسڵمانبووم)) عەلی –خوا لێی رازی بێت– دەفەرموێت ((پەیمانی پێغەمبەرێکی ئوممییە بۆ من: تەنها باوەڕدار منی خۆشدەوێت و تەنها دووڕوو رقی لە منە)) عومەر –خوا لێی رازی بێت– دەفەرموێت ((لە سێ بابەتدا لەگەڵ پەروەردگارم تەبابووم)) عەلی کوڕی ئەبی تالب–خوا لێی رازی بێت– ئاماژەی بە سینەی خۆی کرد و فەرمووی ((ئالێرەدا زانستێکی کۆکراوە هەیە، گەر کەسانێك هەبوونایە هەڵیانبگرتبایە)) عەبدوڵای کوڕی مەسعود–خوا لێی رازی بێت– دەفەرموێت ((حەفتا سورەتم لە دەمی پێغەمبەری خوداوە وەرگرتووە، زەید لەو کاتەدا لەگەڵ منداڵان یاری دەکرد)) هەروەها دەفەرموێت ((ئایەتێك نییە لە قورئاندا دابەزیبێت من نەزانم لە کوێ دابەزیوە و مەبەست بەو ئایەتە چی بووە؟ گەر بزانم کەسێك هەیە لە کتێبی خودا لە من شارەزاتر بێت ئەگەر ولآخی سواری بیگاتێ خۆم دەگەیەنمە لای)) هەندێ لە هاوەڵان دەفەرموون ((گەر پیری نوێژم پێبگۆڕێت پیمخۆشترە لەوەی لە نوێژدا لەگەڵ خۆمدا قسە بکەم پێچەوانەی ئەوەی تیایدام و بۆی وەستاوم))

## ئیسلام جیابوونەوەیە

لە کەماڵی یەکتاپەرستی: ئەوەیە کە بەندەکە خاوەنی کۆبوونەوە و جیابوونەوە بێت.
((الجمع-کۆبوونەوە)) لە زمانەوانیدا بریتییە لە گرتنەئامێز و یەکگرتن((الضم)) و ((الإجتماع))یش بریتییە لە "الإنضمام"-دانەپاڵ، ((التفريق-جیابوونەوە)) دژی کۆبوونەوەیە، لە زاراوەی ئەهلی تەسەوفدا: بریتییە لە چاوتێبڕین لەو کەسەی هەموو جیاکارییەکانی لێوە سەرچاوە دەگرێت.

((الفرق))ی ئیسلامی: بریتییە لە جیاکردنەوەی ئەوەی خودا تەشریعی کردووە و فەرمانی پێکردووە و خۆشیدەوێت و پێیڕازییە لەوەی خودا نەهی لێکردووە و بە ناپەسەندی دەزانێت و بکەرەکەی بە خەشملێگیراو لە قەڵەم دەدات، هەر کەس ئەهلی ئەم جیاکارییە نەبێت بۆنی ئیسلامی نەکردووە، خودای موتەعال باسی ئەهلی شەهەوات دەکات کە ئەم جیاکارییە ناکەن، بۆیە ئەوەی فەرمانی پێکراوە لەگەڵ ئەوەی نەهی لێکراوە پێکەوە کۆدەکەنەوە ﴿إِنَّمَا ٱلۡبَيۡعُ مِثۡلُ ٱلرِّبَوٰاْۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْۚ﴾البقرة: ٢٧٥، وتیان هیچ جیاوازییەك لە نێوانیاندا نییە، هەروەها وتیان: مردارەوە بوو وەك سەربڕاو وایە، هیچ جیاوازییەك لەنێوان ئەو دوانەدا نییە، هەروەها وتیان حەڵاڵ و حەرام یەك شتە، ئەمە کۆبوونەوە و جیابوونەوەی ئەو دەستەیە بوو.

## بەندایەتییەکەمان بۆ خودا کۆبوونەوەیە

کۆبوونەوە دوو کۆبوونەوەیە:
کۆبوونەوەی یەکتاپەرستی پەروەردگاریی و یەکتاپەرستی خواوەندی، بەندە راگریی(القيومية) پەروەردگار لەسەر عەرشەکەی دەبینێت کە کاروباری بەنەکانی بەتەنها تەگبیردەکات و بەڕێوەدەبات، دروستکەر و رۆزیدەر و پێدەر و لێگرەوە و مرێنەر و ژێنەر و تەگبیرکەری کاروباری مەملەکەت-لە ناوەوە و لە دەرەوە- بەتەنها خودای موتەعالە، ئەوەی دەیەوێت دەبێت، ئەوەی نەیەوێت نابێت، گەردیلەیەك بە مۆڵەتی ئەو نەبێت نابزوێت، هیچ رووداوێك بە ویستی ئەو نەبێت روونادات، گەڵایەك لە دار ناکەوێتە خوارەوە خودا زانستی پێی هەیە، گەردیلەیەك لە ئاسمانەکان و زەویدا لە خودا بزر نابێت، بچووکتر لەوە و گەورەتریش لەوە لە خودا ون نابێت و زانستی

خـودا ئامـاری کـردووە و دەسـەڵاتی خـودا ئابلۆقـەی داوە و ویسـتی خـودا تیایـدا بەگـەڕخراوە، و حیکمـەتی خـودا داوای دەکـات، ئەمـە بریتییـە لـە کۆبوونـەوەی یەکتاپەرستی لە پەروەردگارییدا(الربوبية).

کۆبوونـەوەی یەکتاپەرسـتی خواوەنـدی خـودا(الإلهيـة): ئەوەیـە کـە دڵ و هیممـەت و لێبڕانی لەسەر خـودا کۆبکاتـەوە، هـەر بـەو جـۆرە کۆبوونـەوەی ویسـت و جووڵـە لـە جێبەجێ کردنی حەقی خودا و هەستان بە بەندایـەتی کـرد بـۆ خـودا-سـبحانه- بۆیـە سالیك باری ویستی خۆی لەسەر موڕادی دینی و شەرعی خودا کۆدەکاتەوە.

ئەمە دوو کۆبوونەوەیە: کە بریتین لە حەقیقەتی ((إياك نعبد وإياك نسـتعين)) بەنـدە لـە وتنی "إياك"دا زاتێکی کۆکەرەوە بۆ هەموو سیفەتەکانی کەماڵ دەبینێت کە خـاوەنی هـەموو نـاوە جوانەکانـە، پاشـان لـە وتـنی ((نعبـد))دا هـەموو جۆرەکـانی بەندایـەتی دەرەوە و ناوەوە و نێت و گوفتار و کردار و حاڵ و ڕووتێکـردن دەبینێـت، پاشـان لـە وتنی ((إياك نسـتعين)) هـەموو جۆرەکـانی کۆمـەك و یارمـەتی خـودایی و تـەوەکول و ڕادەستکردن دەبینێت، لەوێوە هەموو پەروەردگاریی خودای لێوە موشاهادە دەکات، هەر بەو جۆرە لە ((إياك نعبـد)) هـەموو خوایـەتی خـودا دەبینێـت، و لـە (إيـاك))شـدا زاتێکی کۆکەرەوەی ناوە جوانەکان و سیفاتە بەرزەکان موشاهەدە دەکات.

پاشـان لـە ((إهـدنا)) "دە" ئاسـت یـاخود پلـە دەبینێـت، گـەر ئـەو دە ئاسـتەی بەدەستهێنا ئەوا هیدایەتی بۆ بەدەست دێت:

ئاستی یەکەم: هدایەتی زانست و بەیان، ئـەم هیدایەتـە شـارەزای دەکـات بـە حـەق و حەقی پێدەناسێنێت.

ئاسـتی دووەم: خـودا توانـای ئـەو هیدایەتـەی یەکـەمی پـێ بـدات ئـەگینا ناتوانێـت بیناسێت و پەی پێببات.

سێیەم: وای لێبکات بیەوێت ئەو هیدایەتە بگرێتە بەر.

چوارەم: لەدوای ئەوە ویستی خودا وای لێبکات بەو کارە هەڵبستێت.

پێنجەم: لەسەر ئەو هیدایەتە جێگیر و دامەزراوی بکات و بەردەوام بێت لەسەری.

شەشەم: هەموو ئەو ڕێگر و بەرهەڵستییانەی دێنە بەردەمی لێی دووربخاتەوە.

حەوتەم: لەسەر ئەو ڕێگەی هیدایەتە هیدایەتێکی تایبەتی تری پێ ببەخشێت، کە لـە هیدایەتی یەکەم تایبەتترە، یەکەمیان هیدایەتە بۆ سەر ڕێگەکە بە شێوەیەکی گشتی،

ئەمەی دووەمیان هیدایەتە لەسەر ڕێگەکە و مەنازیلەکانی ڕێگە بە شێوەیەکی دووردرێژ.

هەشتەم: لەسەر ڕێگەکە موشاهەدەی مەرام و مەبەستی پێ بکات و ئاگاداری بکاتەوە لەسەری، بۆیە سالیك لە ڕۆیشتنەکەیدا مەبەستەکە دەبینێت و ئاگادارە پێی و لا بەلایدا دەکاتەوە و وەسیلەکان نابنە پەردەی نێوان ئەو و مەبەستەکە کە خودای موتەعالە.

نۆیەم: هەژاری و پێویستی و ئاتاجی خۆی پێ نیشان بدات بۆ ئەو هیدایەتە کە لەسەرو هەموو پێویستی و ئاتاجییەکەوەیە.

دەیەم: دوو ڕێگە لادەرەکە و جیابووەوە لە ڕێگەی هیدایەتی پێ نیشان بدات، ئەو دوانەش ڕێگەی ئەهلی غەزەبە کە حەقیان ناسیوە و قبوولّی ناکەن و سەرپێچی لێ دەکەن، لەگەڵ ڕێگەی ئەهلی گومڕایی و نەزانی کە حەق ناناسن، پاشان کۆکەرەوەی ((الصراط المستقيم))ی پێنیشان بدات لەسەر یەك ڕێگە کە ڕێگەی پێغەمبەران و شوێنکەوتوانیانە لە صدیقان و شوهەدا و صالّحان.

ئەمە ئەو کۆکەرەوەیە کە پێغەمبەران و شوێنکەوتوانی پێغەمبەرانی لەسەرە، هەر کەس ئەم کۆکردنەوەی بۆ بەدەست هات ئەو کەسە لەسەر شاڕێگەی ڕاست و دروستە. خودا زاناترە.

❁ ❁ ❁

## (٦٦) (منزلة الشهادة)

# مەنزیلەی شەهادە

ئەوەش بریتییە لە کۆتـایی گەشـتی کۆچـکردنی بـاوەڕدار بـۆ لای خـودا و پێغەمبـەر، ڕێنومایی دەکات بۆ دووبارەبوونەوەی ڕۆیشتن بۆ لای خودا و بادانەوە بەرەو دەرگای سەرەتای دەستپێکردن.

دواین مەنزیلە لە مەنزیلەکانی ((إياك نعبد وإياك نستعين)) بریتییە لە مەنزیلەی شەهادە.

بزانە ئەو یەکتاپەرستییەی پێغەمبـەران بانگیـان بـۆ کـردووە و کتێبـەکانی لـەپێناودا دابەزیوە، دوو جۆرە: یەکتاپەرستی لە مەعریفە و سـەلماندندا، لەگـەڵ یەکتاپـەرستی لە داوا و مەبەستدا.

یەکـەمیان: بریتییـە لـە حەقیقـەتی زاتـی پـەروەردگار و ناوەکـانی و سـیفەتەکانی و کردارەکانی و باڵابوونی لەسەرو ئاسمانەکانییەوە و لەسەر عەرشـی مـەزنی، هـەروەها ئاخافتن لەگەڵ هەر کەسێك لـە بەنـدەکانی کاتێـك دەیـەوێت، و جێگیرکردنـی قـەزا و قـەدەر و حـوکم و بڕیـاری، قورئـان زۆر بـە ڕوونـی و ڕەوانـی قسـەی لـەم جـۆرە یەکتاپەرسـتییە کـردووە، وەك لـە سـەرەتای سـورەتی "الحديـد" و "طـه" و کۆتـایی سورەتی "الحشر" و سەرەتای سورەتی "السجدة" و سەرەتای سورەتی "آل عمـران" و هەموو سورەتی "الإخلاص" و سورەتانی تریش.

جۆری دووەم: نموونەی ئـەوەی سـورەتی "الكـافرون" لـەئامێزی دەگرێـت، هـەروەها ئایەتی﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ ﴾ آل عمـران: ٦٤، هـەروەها سەرەتای سورەتی "الزمر" و کۆتاییەکەی، سەرەتای سورەتی "يونس" و ناوەڕاست و کۆتاییەکـەی، سـەرەتای سـورەتی "الأعـراف" و کۆتاییەکـەی، کـۆی سـورەتی "الأنعام" و زۆربەی سورەتەکانی قورئان، بەڵکو یەك بـە یـەکی سـورەتەکان ئـەم دوو جۆرە یەکتاپەرستییە لەئامێز دەگرن.

بـەڵکو بـە گشـتی دەڵـێین: یـەك بـە یـەکی ئایەتـەکانی قورئـان یەکتاپەرستی لـەخۆ دەگرێت، و شاهیدە لەسەری و بانگکەرە بۆی، قورئان: یان هەواڵە لەمەڕ خـودا و نـاو

و سیفەت و کردارەکانی کە بریتییە لە یەکتاپەرستی زانستی خەبەری، یان بانگەوازە بۆ بەندایەتی کردنی خودا بە تەنها و بەبێ دانانی هاوەڵ و رووتکردنەوەی هەموو کەس و شتێك لەخوار خوداوە لە بەندایەتی بۆ کردن و پەرستنی، ئەمەش بریتییە لە یەکتاپەرستی ویست و داوا، یان ئەمر و نەهی و پابەندبوون بە گوێڕایەڵییەوە لە نەهی و لە ئەمردا، ئەوەش بریتییە لە مافەکانی یەکتاپەرستی و تەواوکارییەکانی، یان هەواڵە لەمەڕ رێزلێگرتنی خودایی بۆ ئەهلی یەکتاپەرستی و گوێڕایەڵانی و ئەوەی لە دونیا بەدەستی دەهێنن و ئەوەی لەدوارۆژدا پێیان دەبەخشرێت، واتە پاداشتی یەکتاپەرستان، یان هەواڵە دەربارەی ئەهلی شیرك و ئەوەی لە دونیا رووبەڕوویان دەبێتەوە لە تۆڵە و سزا و ئەوەش لە دوارۆژدا بەسەریاندا دەسەپێت لە دۆزەخ و ئازارەکانی، ئەمەش هەواڵدانە لەمەڕ ئەوانەی دەرچوون لە حوکمی یەکتاپەرستی.

هەموو قورئان دەربارەی یەکتاپەرستی و ماف و پاداشت و هاوەڵدانان و ئەهلی هاوەڵدان و سزا و سەرئەنجامیان، بۆیە (الحمد لله) یەکتاپەرستییە (رب العالمین) یەکتاپەرستییە (الرحمن الرحیم) یەکتاپەرستییە (مالك یوم الدین) یەکتاپەرستییە (إیاك نعبد) یەکتاپەرستییە (و إیاك نستعین) یەکتاپەرستییە (إهدنا الصراط المستقیم) یەکتاپەرستییە کە داوای هیدایەت بۆ سەر رێگەی ئەهلی یەکتاپەرستی لەخۆ دەگرێت کە ئەوانەن نیعمەتەکانی خودایان بەسەردا داباری، (غیر المغضوب علیهم والضالین)یش ئەوانەن رێگەی یەکتاپەرستییان واز لێهێنا، بۆیە خودای موتەعال شایەتی بە یەکتایی خۆی داوە و فریشتەکان و پێغەمبەرانی کردووە بە شاهید و دەفەرموێت ﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلۡعِلۡمِ قَآئِمَۢا بِٱلۡقِسۡطِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٨﴾ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُ ﴾آل عمران: ١٨ – ١٩

ئەم ئایەتە پیرۆزە جێگیرکردنی حەقیقەتی یەکتاپەرستی لەخۆ دەگرێت و بەرپەرچدانەوەی هەموو دەستەکان و شایەتیدان بە پووچی و بێبنەمایی بیروبۆچوون و مەزهەب و رێچکەیان، ئەمەش کاتێك رۆشن دەبێتەوە تێگەیشتنێکی قووڵ لە ئایەتەکە بەیانی ئەو مەعاریفە خوایی و حەقیقەتە ئیمانییانە بکات کە ئایەتەکە لە ئامێزیان دەگرێت.

ئەم ئایەتە بەرزترین و مەزنترین و عادلترین و راستگۆترین شەهادە لەخۆ دەگرێت لە مەزنترین و بالاترین شاهیدەوە لەسەر گەورەترین و مەزنترین شایەتی پێدراو،

دەربڕینەکانی پێشین لەسەر و شەی ((الشهادة)) بە دەوری حوکم و قەزا و راگەیاندن و بەیان و هەواڵدان(الحکم و القضاء والإعلان و البیان و الإخبار)دا دەسوڕێتەوە، موجاهید دەفەرموێت: مانای "حکم و قضی"ی هەیە، زەجاج دەفەرموێت: مانای "بین"ی هەیە، دەستەیەك دەڵێن: مانای "أعلم و أخبر"ی هەیە، هەموو ئەم قسانە راستن و دژایەتی لەنێوانیان نییە، چونکە ((الشهادة)) کەلامی شاهیدەکە و هەواڵدان و قسەکەی لەخۆ دەگرێت، هەر بەو جۆرە پێراگەیاندن و هەواڵپێدان و بەیان کردن لەئامێز دەگرێت، شەهادە چوار ئاستی هەیە، یەکەم: زانست، و مەعریفە، و باوەڕ بە دروستیی شایەتپێدراوەکە، و جێگیرکردنی شەهادە، دووەم: کردنی ئەو شەهادە بە قسە و گۆکردنی بە وشە با غەیری ئەویش پێی نەزانیبێت، بەڵکو لەگەڵ نەفسی خۆی قسەی پێبکات و باسی لێوە بکات، جا بە زمان بێت یان بە نووسین بێت، سێیەم: خەڵکانی تر ئاگادار بکات بەوەی شایەتی لەسەر داوە و رایگەیاندووە و بەیانی کردووە، چوارەم: پابەندی بکات بە ناوەڕۆکی شایەتیدانەکە و فەرمانی پێبکات.

بۆیە شایەتیدانی خودا–سبحانه– بە یەکتایی و تاکوتەنهایی خۆی و هەستان بە داد و حەق ئەم چوار ئاستە لەخۆ دەگرێت:

زانستی خودا بە شایەتیدانەکە، و کردن بە کەلام، و راگەیەندن و هەواڵ پێدانی بە دروستکراوەکانی، و فەرمان پێکردنیان و پابەندکردنیان بەو شایەتییە.

ئاستی زانست: شایەتیدان بە حەق بە زەرورەت ئەو زانستەی تێدایە، ئەگەر نە، شاهیدەکە دەبێتە شاهیدێك کە زانستی بە شایەتیدانەکە نییە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾﴾ الزخرف: ٨٦، هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی بەخۆر کرد و فەرمووی ((لەسەر شێوە و رۆشنی ئەو خۆرە شایەتی بدە))

ئاستی کەلام و هەواڵی شەهادە: هەر کەس قسەی بە شتێك کرد و هەواڵی بە شتێك دا ئەوا شایەتی بەو شتە داوە، با شایەتییەکەش وشە و دەنگیشی لەگەڵ نەبێت، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿قُلْ هَلُمَّ شُهَدَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ يَشْهَدُونَ أَنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَ هَٰذَا ۖ فَإِن شَهِدُوا۟ فَلَا تَشْهَدْ مَعَهُمْ﴾الأنعام: ١٥٠، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَجَعَلُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَٰدُ ٱلرَّحْمَٰنِ إِنَٰثًا ۚ أَشَهِدُوا۟ خَلْقَهُمْ ۚ سَتُكْتَبُ شَهَٰدَتُهُمْ وَيُسْـَٔلُونَ ﴿١٩﴾﴾ الزخرف: ١٩، ئەوە لەوانەوە بوو بە شەهادە با بە وشەش دەریان نەبڕیبێت و ئەو شایەتییەیان لای

خەڵكی نەدابێت، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((عدلت شهادة الزور الإشراك بالله)) لێرەدا "شـهادة الـزور" بریتییـە لـە "قـول الـزور"، وەك خـودای موتـەعال دەفـەرموێت ﴿فَٱجْتَنِبُواْ ٱلرِّجْسَ مِنَ ٱلْأَوْثَٰنِ وَٱجْتَنِبُواْ قَوْلَ ٱلزُّورِ ۝٣٠ حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِۦ﴾الحج: ٣٠ – ٣١، كە ئەم ئایەتە پیرۆزە دابەزی پێغەمبەر(ﷺ) فـەرمووی ((عـدلت شهادة الزور الإشراك بالله–واتـە شـایەتی درۆ هاوتـای شـەریكدانانە بـۆ خـودا)) لێـرەدا "قول الزور"ی بە"شهادة" ناوزەد كرد، خودای موتەعال داننانی بەندە بـە كارەكانیـدا بە "شهادة" ناودەبات و دەفـەرموێت ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ﴾ النساء: ١٣٥، شایەتیدانی مـرۆڤ لەسـەر نەفسـی خـۆی: بریتییـە لـە داننان بـە كاروكردەوەكانیـدا، لـە فەرموودەیەكی سـەحیحدا لـە چـیرۆكەكەی مـاعزی ئەسـلەمی هـاتووە ((كـە مـاعز چـوار جـار شـاهیدی لەسـەر خـۆی دا، پێغەمبـەر(ﷺ) رەجمی كرد)) هـەروەها خـودای موتـەعال دەفـەرموێت ﴿قَالُواْ شَهِدْنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَا ۖ وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ۝١٣٠﴾ الأنعام: ١٣٠.

ئەمە و–چەند بارەی ئەمە– بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە شاهید لەلای حاكم و كەسـانی تریش: بۆ قبووڵ كردنی شایەتییەكەی مەرج نییە شایەتییەكەی بـە وشـە دەرببڕێـت، ئەوەش مەزهەبی مالیك و ئەهلی مەدینە و رای ئاشكرای ئیمام ئەحمەدە، لە هیچ كـام لە هاوەڵان و شوێنكەوتووانەوە نـەزانراوە ئـەوەیان بـە مـەرج گرتبێـت، ئـیبن عـەباس فەرموویەتی ((پیاوانی جێگەی رەزامەنـدی زۆر شـایەتییان لـەلام داوە، لـە هـەموویان زیاتر جێی رەزامەندی لـەلام عومـەرە، پێغەمبـەر(ﷺ) نـەهی لـە نوێـژكردووە لـەدوای نوێژی بەیانی هەتا خۆر هەڵدێت، هەروەها دوای نوێژی عەسر هەتا خـۆر ئاوادەبێـت)) ئەوەی ئاشكرایە ئەو هاوەڵانە بـە وشـە شـایەتییەكەیان دەرنـەبڕیوە، پێغەمبـەر(ﷺ) شایەتی دا بۆ ئەو "دە" هاوەڵە بە بەهەشت، لە شایەتیدانەكەیدا وشەی "شەهادە"ی بەكارنەهێناوە، بەڵكو فەرمووی ((أبوبكر في الجنـة، وعمـر في الجنـة، و عثمـان في الجنـة، وعلي في الجنة)) فەرموودەكە.

موسڵمانان كۆدەنگیان هەیە لەسـەر ئـەوەی گـەر بێبـاوەڕ بڵێـت ((لا إلـه إلا الله محمـد رسول الله)) ئەوە هاتۆتە ناو ئیسلامەوە و شایەتی حەقی داوە و ئیسـلامەكەی لەسـەر وشەی "الشهادة" رانەوەستاوە و ئەو دەچێتە ناو فەرموودەكە كە دەفەرموێت ((حتـی

يشهدوا أن لا إله إلا الله)) لە دەربڕینێکی تردا ((حتـى يقولـوا أن لا إلـه إلا الله)) بەڵگەیـە لەسەر ئەوەی کە تەنها وتنی ((لا إله إلا الله)) بە شایەتی لەوان وەردەگیرێت، ئەمـەش زۆرتـرە لـەوەی لـە قورئـان و فـەرموودەدا ئاماربکرێـت، ئەوانـەی مـەرجی وشـەی "شەهادە"یان داناوە هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نییە.

## ۞ ئایەتەکانی خودای موتەعال لە ئاسۆدا شایەتی دەدەن

ئاستی راگەیاندن و هەواڵدان دوو جۆرە: راگەیەنـدن بـە قسـە و راگەیانـدن بـە کـردار، ئەمەش حاڵی هەر فێرکەرێکی خەڵکییە بە شتێك: جارێـك بـە زانسـتەکەی لـە رێگـەی قسەوە و جارێك لە رێگەی کردارەوە.

شایەتی پەروەردگار و بەیان و راگەیاندنی، جارێك بە فەرموودەی و جارێك لـە رێگـەی کرداریيەوەيـە، فـەرموودەی خـودا: ئەوەيـە کـە پێغەمبـەرانی پـێ رەوانـە کـردووە و کتێبەکانی پێ دابەزاندووە، ئەوەی بەڵگە نەویستە ئەوەیە کە تەواوی پێغەمبـەران لـە خودا هەواڵیان داوە، خودا شایەتی داوە کـە ((بأنه لا إله إلا هو)) و هـەروەها ئەوەشـی راگەیانـدووە و هـەواڵی لـەبارەوە داوە و فـەرمانی بـە بەندەکانیشـی داوە کـە ئـەو شایەتییە بدەن، شـایەتییەکەی-سبحانه- ((أن لا إلـه إلا هـو)) ئاشـکرایە لـە رووگـەی هەموو ئەوانەی کە کەلامی خودایان پێگەیشتووە.

بەیان کردن و راگەیاندنی شـەهادەت بـە کردارەکـانی: ئـەوەی هەواڵـەکان لـە ئـامێزی دەگرن لە بەڵگەی ئاماژەکەر بە یەکتایی خودا کە ئاماژەکەی بـە ژیـری و بـە فـیترەت زانراوە، ئەمەش دیسان وشەی "الشهادة"ی تیا بەکاردەهێنرێت، هەروەك چۆن وشەی "الدلالـــة والإرشـــاد و البيـــان"ی تيـــادا بـــەکاردەهێنرێت، بەڵگـــە(الـــدليل) ئامـــاژەبۆکراو(المـدلول عليـــه) بـــەیان دەکـــات و رۆشـــنی دەکاتـــەوە، وەك چـــۆن بينەر(الشاهد) و هەواڵدەر(المخبر) بەیانی دەکەن، بەڵکو هەندێ جار بـەیان کـردن بـە کردار رۆشنتر و بـەهێزتر و کاریگـەرترە، شـاهید حـاڵیش بـە "نطق و قـول و کـلام- گۆکردن و گوفتار و قسە" ناودەبرێت چونکە لە جێگەی ئەوە و کارەکەی ئەو ئـەنجام دەدات و هەمان ئەرکی ئەو رادەپەڕێنێت، وەك وتراوە:

وقالت له العينان سمعا وطاعة    وحدرتا بالدر لما يشقب

كەسێكی تر دەڵێت:

شكا إلي جملي طول السرى    صبرا جميلي فكلانا مبتلى

ئەمەش دیسان بە شاهیدی ناوبرا، وەك لە ئایەتی﴿ مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُوا مَسَاجِدَ اللَّهِ شَاهِدِينَ عَلَىٰ أَنفُسِهِم بِالْكُفْرِ ﴾التوبة: ١٧ ئەمە شایەتیدانی ئەوانە لەسەر خۆیان بەوەی ئەنجامی دەدەن لە كردار و گوفتاری بێباوەڕی، واتە شایەتیدانە بە بێباوەڕییان، ئەوان شاهیدن لەسەر نەفسی خۆیان بەوەی نەفسیان شایەتی پێدا.

مەبەستەكە: خودای موتەعال شایەتی دەدات بەوەی ئایەتە ئەفرێنراوەكانی بەڵگەن لەسەری، بەڵگەكەیان لەوەدایە كە دروستكراون و بەدیهاتوون، هەروەها شایەتی دەدات بە ئایەتە گوفتارییەكان كە تەبا و تەریبن لەگەڵ ئەو ئایەتە ئەفرێنراوانەی شایەتی دەدەن، بۆیە شەیاتیدانی گوفتار و شایەتیدانی كردار لەگەڵ یەكتر تەبابوون، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ ﴾فصلت: ٥٣، واتە قورئان حەقە، رایگەیاند كە ئایەتەكانی ئاسۆی دەروون و گەردوون بەڵگەن لەسەر صدقی ئایاتی خوێنراو و كەلامی خۆی، ئەم شایەتیدانە كردارییە چەندین كەس لە ئیمامانی زمان و تەفسیر ئاماژەیان پێكردووە، ئیبن كەیسان دەڵێت: خودا بە تەگبیر و بەڕێوەبردنی سەرسوڕهێن و كارە موحكەمەكانی لەناو دروستكراوەكانیدا شایەتی دەدات كە ((أنه لا إله إلا هو))

## ❁ هەر شتێك خودای لەگەڵ نەبێت پووچ و بێبنەمایە

ئاستی چوارەم: ئەمەش بریتییە لە فەرمان كردن بەو شایەتیدانە و پابەندبوون پێیەوە، هەرچەند تەنها شایەتیدانەكە كەسەكە پابەند ناكات، بەڵام شایەتی لە ناوا بابەتێكدا ئاماژە بە پابەندبوون دەكات و لەئامێزی دەگرێت، خوای موتەعال شایەتی پێداوە وەك ئەوەی حوكمی پێ دەركردبێت، و فەرمانی پێكردبێت و بڕیاری پێدابێت و بەندەكانی پێوە پابەند كردبێت، وەك دەفەرموێت ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ﴾ الإسراء: ٢٣، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَقَالَ اللَّهُ لَا تَتَّخِذُوا إِلَٰهَيْنِ اثْنَيْنِ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ﴾النحل: ٥١، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ ﴾ البينة: ٥، هەروەها دەفەرموێت ﴿ لَّا تَجْعَلْ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ ﴾ الإسراء: ٢٢، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَلَا تَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ ﴾القصص: ٨٨، هەموو قورئان شاهیدی ئەو راستییە دەدات.

رووی پێویستبوونی شەهادەتی خودای موتەعال بەو راستییە ئەوەیە کە: گەر شایەتی دا کە "أنه لا إله إلا هو" ئەوە هەواڵیداوە و رایگەیاندووە، هەروەها رۆشنی کردۆتەوە و حوکمی پێکردووە و فەرمانی پێ دەرکردووە کە جگە لە خودا هیچ کەس "إله" نییە، و خواوەندی جگە لە خودا پووچترین پووچە و جێگیرکردنی گەورەترین ستەمە، بۆیە هیچ کەس شایستەی بەندایەتی بۆکردن نییە جگە لە خودا، هەر بەو جۆرە خواوەندی شایستەی هیچ کەسێك نییە، ئەمەش پێویستی دەکات فەرمان بکات بە بەندەکانی ئەو بکەن بە"إله"ی خۆیان و دووربکەونەوە لە هەموو خواوەندەکانی تر، ئەم راستییە گوێگر لەو "نەرێ و ئەری"کردنی وشەی "لا إله إلا الله"ەوە تێدەگات، گەر پیاوێکت بینی داوای فتوا و شایەتی و چارەسەری پزیشکی لە کەسێك دەکرد کە ئەهلی ئەوانە نەبوو و پشتی لەو کەسانە دەکرد کە ئەهلی ئەو زانستانە بوو، تۆش پێت دەوت: ئەم کەسە نە موفتییە و نە شاهید و نە پزیشك، موفتی بریتییە لە فلانە کەس، شاهید فلانە کەسە و پزیشك بریتییە لە فلان، ئەم کار و وتنە لەلای تۆوە دەبێت بە ئەمرکردن و نەهی کردن.

بەڵگە ئاماژە بەوە دەکات خودا-سبحانه- بە تەنها شایستەی بەندایەتییە، کاتێك هەواڵی دا ئەو بەتەنها شایستەی بەندایەتییە، ئەم راگەیاندن و هەواڵدانە فەرمان کردن بە بەندەکان و پابەندکردنیانی تێدایە بە جێبەجێ کردنی کارێك کە شایستەی پەروەردگارە، هەستان بەو کارە حەقی پاڵفتەی خودایە لەسەر ئەوان، کە خودا-سبحانه- شایەتی دەدات ((أنه لا إله إلا الله)) شایەتی دانەکەی فەرمان بە یەکتاپەرستی و پابەندبوون لەخۆ دەگرێت.

هەروەها وشەی ((الحکم)) و ((القضاء)) لە رستەی راگەیاندندا(الجملة الخبرية)دا بەکاردەهێنرێن، بە رستە راگەیاندنەکە دەوترێت ((قضية)) و ((حكم))، وەك بوترێت بەوە و بەوە حوکم کرا، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ أَلَآ إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ ﴿١٥١﴾ وَلَدَ ٱللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٥٢﴾ أَصْطَفَى ٱلْبَنَاتِ عَلَى ٱلْبَنِينَ ﴿١٥٣﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿١٥٤﴾ ﴾ الصافات: ١٥١ – ١٥٤، ئەم راگەیاندنەی لەلایەن ئەوانەوە بە حوکم دانا، لە شوێنێکی تر دەفەرموێت ﴿ أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾ القلم: ٣٥ – ٣٦، ئەمە حوکمێکە کە ناچارکردن و پێویست بوونی لەگەڵ نییە، بەڵام حوکم و بڕیار بەوەی خودا((لا إله إلا هو)) پابەندبوون و پێویستبوون لەخۆ دەگرێت..خودا زاناترە.

## ۞ هەستانی خودا بە دادپەروەری داوای پاداشت و سزا دەكات

ئەو بەشەی ئایەتەكە كە دەفەرموێت ﴿قَآئِمَۢا بِٱلۡقِسۡطِ﴾، "القسط" بریتییە لە "العدل"، خودا شایەتیداوە كە ئەو-سبحانه- كار بە عەدل دەكات و بە عەدل هەڵدەستێت لە یەكتایی و تاكوتەنهاییەكەیدا، هەروەها یەكتایی لە دادپەروەرییدا، ((یەكتایی)) و ((عەدل)) كۆكەرەوەی سیفاتی كەماڵن، "یەكتایی" تاكوتەنهایی لە كەماڵ و جەلال و بەمەزن زانیندا لەئامێز دەگرێت كە شایستەی هی كەسێكی تر نییە جگە لە خودا، "عەدل"یش روودانی كردارەكانی خودای موتەعال بە دروستی و تەبا لەگەڵ حیكمەت لەخۆ دەگرێت.

ئەمە بریتییە لە یەكتاپەرستی پێغەمبەران و عەدلیان: جێگیركردنی سیفات و فەرمان بە بەندایەتی كردن بۆ خودا بە تاكوتەنهایی، هەر بەو جۆرە جێگیركردنی قەدەر و حیكمەتەكان و ئامانجە داواكراو و ستایشكراوەكان لە كردار و ئەمریدا، نەك یەكتاپەرستی جەهمی و موعتەزیلە و قەدەرییەكان كە بریتییە لە نەرێ كردنی سیفات و حەقیقەتی ناوە جوانەكانی خودا، "عەدل"ی ئەو دەستانەش بریتییە لە: بەدرۆزانینی قەدەر و نەرێ كردنی حیكمەت و ئامانجی پەسەند و ستایشكراو كە خودا لە پێناویاندا كار دەكات و بڕیار دەردەكات، هەستانی خودای موتەعال بە "قسط" لە شایەتیدانەكەیدا چەندین خاڵ لەئامێز دەگرێت:

یەكەمیان: خودا بە عەدل هەڵدەستێت لەم شایەتیدانەدا كە بەڕەهایی دادپەروەرترین شایەتیدانە و نەرێكردن و گەردنكەچ نەكردن بۆی بەڕەهایی مەزنترین ستەمە، هیچ عەدلێك بە ئەندازەی یەكتاپەرستی عادل نییە و هیچ ستەمێك بە ئەندازەی هاوەڵدانان بۆ خودا گەورە نییە، خودای موتەعال لەم شایەتیدانەدا لەڕووی گوفتار و كردارەوە بە عەدل هەڵدەستێت و بە عەدل وەستاوە بەوەی شایەتی پێدەدات و هەواڵ بە بەندەكانی دەدات و پێیان رادەگەیەنێت، و جێبەجێبوون و دروستیی ئەو شایەتییە بەیان دەكات و بە داواكارییەكانی پابەندیان دەكات و حوكمی پێدەكات، هەروەها پاداشت و سزای لەسەر داناوە و ئەمر نەهی داناوە لە ماف و واجبەكانیدا، هەموو ئایین ماف ئەو شایەتیدانەیە، هەموو پاداشت لەسەر ئەوە وەستاوە و هەموو سزاش لەسەر وازهێنان لەو شایەتیدانە دامەزراوە.

ئەمە ئەو عەدلەیە كە پەروەردگار لەو شایەتیدانەدا پێی هەستاوە، هەموو فەرمانەكانی تەواوكەری ئەو شایەتیدانەیە، و فەرمان كردنە بە جێبەجێ كردنی مافەكانی، و نەهییەكانیشی پارێزەری ئەو شایەتیدانەن لە هەر شتێك تێكی بدات و دژایەتی لەگەڵ بكات، هەموو پاداشتەكەی لەسەریەتی و هەموو سزاكەشی لەسەر وازهێنانە لەو شایەتیدان و هەڵنەستان بە مافەكانی، دروستكردنی ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە بەو شایەتیدانە و لە پێناوی ئەو شایەتیدانەیە، ئەوەش ئەو حەقەیە كە دروستكراوەكانی لەسەر دروستكراوە، پێچەوانەی ئەو شایەتیدانە باتڵە و ئەو پووچییەیە كە خودا خۆی لێ پاك راگرتووە، هەواڵیداوە: كە ئاسمانەكان و زەوی لەسەر باتڵ دروست نەكردووە، خودای موتەعال لە بەرپەرچدانەوەی هاوەڵدانەران و نەرێكارانی ئەو شایەتیدانە دەفەرموێت ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾﴾ ص: ٢٧، هەروەها دەفەرموێت ﴿حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ مَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَمَّآ أُنذِرُوا۟ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾﴾ الأحقاف: ١ - ٣، هەروەها دەفەرموێت ﴿هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلشَّمْسَ ضِيَآءً وَٱلْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا۟ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلْحِسَابَ ۚ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ﴾ يونس: ٥، هەروەها دەفەرموێت ﴿أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِم ۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآئِ رَبِّهِمْ لَكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾﴾ الروم: ٨، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿٣٨﴾ مَا خَلَقْنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ﴾ الدخان: ٣٨ - ٣٩، ئەم شێوەیە لە قورئاندا زۆرە، ئەو حەقەی كە لە پێناویدا ئاسمانەكان و زەوی دروستكراوە بریتییە لە یەكتاپەرستی، مافەكانیشی بریتییە لە ئەمر و نەهی، و پاداشت و سزا، شەرع و قەدەر و بوون و بڕیار و پاداشت و تۆڵە بە عەدلەوە راوەستاون و یەكتاپەرستی لێیەوە سەرچاوەی وەرگرتووە، ئەمەش ئەو شارێگە راست و رەوانەیە كە پەروەردگاری لەسەرە، خودای موتەعال لەسەر زمانی پێغەمبەر هود دەفەرموێت ﴿إِنِّى تَوَكَّلْتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّى وَرَبِّكُم ۚ مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذٌۢ بِنَاصِيَتِهَآ ۚ إِنَّ رَبِّى عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٦﴾﴾ هود: ٥٦، خودای موتەعال لەسەر "صراط مستقيم"ە لە گوفتار و كرداریدا، ئەو حەق دەڵێت و بە عەدل كارەكانی ئەنجام دەدات،، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ

صِدْقًا وَعَدْلًا لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ (١١٥)﴾ الأنعام: ١١٥، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِى ٱلسَّبِيلَ (٤)﴾ الأحزاب: ٤.

مەبەستەكە: ئەو بەشە((قائما بالقسط))ی ئایەتەكەی پێشتر﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْعِلْمِ قَآئِمًۢا بِٱلْقِسْطِ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ (١٨)﴾ آل عمران: ١٨، وەك ئەم ئایەتە وایە كە دەفەرموێت (إِنَّ رَبِّى عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ)، وشەی "قائما" لە زمانی عەرەبیدا پێی دەوترێت "حال" بۆیە "منصوب" بووە، ئەمەش دوو رووی هەیە: یەكەم: وشەكە "حال"ی بكەری "شهد الله"یە كاركەرەكە تیایدا بریتییە لە "فعل"ەكە، مانای ئایەتەكە بینا لەسەر ئەمە بریتییە لە: خودای موتەعال لە حاڵی هەستانیدا بە عەدل شایەتی دا كە "أنه لا إلـه إلا هـو"، دووەم: وشـەكە "حـال"ە بـۆ "هو" كاركەرەكە تیایدا مانای نەرێكردنە، واتە "لا إله إلا هو"، لە حـاڵی هەسـتان بـە عەدل، لـەنێوان ئـەو دوو تەقـدیرەدا جیاوازییـەكی رۆشـن هەیـە، تەقـدیری یەكـەمیان ماناكەی: خودا شایەتی دەدات-عـەدل رادەگەیـەنێت و فـەرمانی پێـدەكات و هـەواڵی لـــەبارەوە دەدات و كـــرداری بـــۆ ئـــەنجام دەدات و پاداشـــت و ســـزای لەســـەر دادەمـەزرێنێت- بـە گوفتـار و بـە كـردار كـە ئـەو-ســبحانه- ((لا إلـه إلا هـو)) لـەم شایەتیدانەشدا راستێتی و جێبەجێكردن بوونی هەیە، چـونكە شـایەتییەكە شـایەتییە بە عەدل، ئەوەش عادلترین شایەیەتیدانە، وەك چۆن شـایەتی پێدراوەكـە عـادلترین و دروستترین راستییەكە.

ئەگەر هەستان بە عەدل لە گوفتار و كرداردا بـوو ئـەوا مانایەكـەی: خـودا-سـبحانه- شایەتی دەدات و لەو شایەتیدانەدا بە عەدل هەڵدەستێت و زانایە پێی، نەك بە ستەم، ئەم شایەتیدانە گوفتار و كردار لەخۆ دەگرێت، هەروەها ئەوەش لەئامێز دەگرێـت كـە تەنها خودا شایستەی بەندایەتی بۆ كردنە و هیچ كەس شایستە نییـە پێـی، ئەوانـەش كە بە تاك و تەنها پەرستشیان بۆ كرد: ئەوانەن كە سەرفرازی و بەختەوەری بەدەست دەهێـنن، ئەوانـەش كـە هاوەڵیـان بـۆ دانـا لـە پەرسـش و هانـا و داوادا گومرایـان و بەدبەختانن، كە خودا شایەتی دا وەك هەستان بە عەدل-كە پاداشتی موخلیصان بـە بەهەشت و بێباوەڕان بە ئـاگر لـە ئـامێز دەگرێـت- ئـەمـە دەبێتـە تـەحقیق و تێـری و تەواوی شایەتیدانەكە، ئەو كاتە ((**قائما بالقسـط**)) ئاگاداركردنەوەیـە لەسـەر پاداشـتی ئەوانەی شایەتی پێدەدەن و سزای ئەوانەی سەرپێچی لێدەكەن..خودا زاناترە.

## ❁ یەکە و تەنهایە....... و خاوەنی عەدلە.........سبحانە

تەقدیری دووەم–ئەوەش ئەوەیە کە وشەی ((قائما)) حاڵی ئەوەی دوای ((إلا)) بێت– ئەو کاتە ماناکەی: خودا "لا إله إلا هو" بە عەدل راوەستاوە، ئەو بە تەنها شایستەی خواوەندییە لەگەڵ ئەوەی کەسێکە بە عەدل هەڵدەستێت.

شێخمان ئیبن تەیمیە دەفەرموێت: ئەم تەقدیری دووهەمەیان پارسەنگ(قورسترە) ترە، چونکە: مانای "فریشتەکان و خاوەن زانستەکان شایەتی دەدەن کە خودا "لا إله إلا هو" هەروەها شایەتی دەدەن کە ئەو کەسێکە بە عەدل هەستاوە" لەئامێز دەگرێت.

دەڵێم: مەبەستی ئەوەیە گەر ((قائما بالقسط)) ببێتە "حال" بۆ ئەو شتەی شایەتی پێدراوە ئەو کاتە وەك سیفەت وایە بۆی، چونکە "حال" لە مانادا سیفەتە بۆ خاوەنەکەی، گەر شەهادەکە لەسەر خاوەن "حال"ەکە و هاوەڵی خاوەن "حال"ەکە بوو، ئەوا هەردووکیان دەبنە شایەتی پێدراو، ئەو کات ((فریشتە و خاوەن زانستەکان)) شایەتییان داوە کە خودا((قائما بالقسط)) وەك چۆن شایەتییان دا کە خودا((لا إله إلا هو))، بەڵام لە تەقدیری یەکەمدا ئەمەی لەئامێز نەدەگرت، گەر تەقدیرەکە: خودا شایەتی دەدات– قائما بالقسط– کە ئەو–سبحانە– ((لا إله إلا هو))، هەروەها فریشتەکان و خاوەن زانستەکانیش شایەتی دەدەن کە خودا((لا إله إلا هو))، ئەو کاتە ((قائما بالقسط)) دەبێتە "حال" بۆ ((الله)) بە تەنها.

هەروەها: لەوەی شایەتی پێدا گەر ((قائما بالقسط)) بێت ماناکەی رەوانتر و کاریگەرترە لەوەی تەنها "حال" بێت لە شایەتیدانەکە.

بوترێت: ئەگەر "حال"ە بۆ ((هو)) ئەی بۆ لە پاڵیدا نییە؟ بۆ وشە کەوتۆتە نێوان خاوەن حالەکە و خودی"حال"ەکەوە بە "معطوف"ێك کە کەوتۆتە نێوان حال و خاوەن حالەوە؟

دەڵێم: سوودەکەی ئاشکرایە، گەر بیفەرمووایە ((شهد الله أنه لا إله إلا هو قائما بالقسط و الملائكة وأولو العلم)) ئەو کاتە "عطف"کرنەوەی" الملائكة وأولو العلم" بۆ سەر جێناوەکە(هو) لە ((قائما بالقسط))دا وەهمی دروست دەکرد، "عطف" کردن لە پێناوی جیاکردنەوەدا بەباش نازانرێت، هەرگیز مانایەکەش لەسەر ئەوە نییە، بەڵکو مانایەکە پێچەوانەی ئەوەیە، ئەوەش ئەوەیە کە ((قائما بالقسط)) تایبەتە بە خودای موتەعال،

وەك چۆن تایبەتە بە خواوەندی خوداوە، ئەو بە تەنها خواوەند و پەرستراو و شایستەیە بە عیبادەت، هەر ئەویشە پاداشت و سزای بە عەدل لەدەستدایە.

ئەو بەشەی ئایەتەكە كە دەفەرموێت ((لا إله إلا هو)) محمدی كوڕی جەعفەر لەسەری دەفەرموێت: یەكەمیان وەسف و یەكتاپەرستییە، دووەمیان ڕێورەسم و فێركردنە، واتە بڵێن ((لا إله إلا هو))، مانای ئەمەش: یەكەمیان ئەم ڕاستییە لەخۆ دەگرێت كە خودا-سبحانه- شایەتی پێداوە و هەواڵی لەبارەوە ڕاگەیاندووە، بۆیە قورئانخوێن هەواڵ لەمەڕ شایەتیدانەكەی ئەو دەدات و شایەتیدانی خودی قورئانخوێنەكەی تێدا نییە، خودای موتەعال جارێكی تر دووبارەی كردەوە تاكو قورئانخوێن بیڵێتەوە و بە وتنەوەیە ئەویش ببێتە شایەت.

هەر بەو جۆرە یەكەم هەواڵێكە لە شەهادەی یەكتاپەرستییەوە، و دووەم: هەواڵێكە لە خودی یەكتاپەرستییەوە، لە كۆتایی ئایەتەكەشدا دەفەرموێت ((العزیز الحكیم)) بۆیە ئایەتەكە یەكتاپەرستی و عەدلی خودا و عیززەت و حیكمەت لەئامێز دەگرێت، ((یەكتاپەرستی)): جێگیر كردنی سیفاتی كەماڵ و وەسفی جەلال هاوشێوەنەبوون لەگەڵ دروستكراوەكانی و ساغبوونەوەی بەندایەتی تەنها بۆ خودا لەئامێز دەگرێت، ((عەدل)) دانانی شتەكان لە جێگەی خۆیاندا و بە ئەندازەی خۆیان لە ئامێز دەگرێت، ئەو-سبحانه- هیچ شتێكی تایبەت نەكردووە بە تایبەتمەندییەك كە پێویست و گونجاو نەبووبێت بۆی، ئەو سزای كەسانێك نادات شایستە نەبن بە سزا و لە كەسێك ناگرێتەوە شایستە نەبێت بەو گرتنەوەیە، هەرچەند هەر خۆیەتی-سبحانه- كەسەكانی شایستە كردووە بە بەخشین، ((عیززەت)) كەماڵی قودرەت و هێز و زاڵبوون لەخۆ دەگرێت، ((حیكمەت)) كەماڵی زانست و شارەزایی و ئاگاهی خودا لەئامێز دەگرێت، هەر ئەوە بە تەنها خاوەنی ئەمر و نەهییە و خەلقی كردووە و ئەندازەگیری تیادا بەكارهێناوە، بەهۆی ئەو حیكمەت و ئامانجە ستایشكراوانەوە كە شایستەی كەماڵی حەمدە لەسەری.

ناوی ((العزیز)) موڵك لەخۆ دەگرێت، ناوی ((الحكیم)) حەمد لەئامێز دەگرێت، سەرەتای ئایەتەكە یەكتاپەرستی لەخۆ دەگرێت، ئەوەش حەقیقەتی ((لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير)) ئەمە باشترین شتێكە

پێغەمبەر(ﷺ) و پێغەمبەرانی پێش ئەویش فەرموویێتیان، ((الحكيم)) کاتێك فەرمان بە شتێك دەکات لە خودی خۆیدا ئەو شتە پەسەند و چاکە، گەر نەهی لە شتێك بکات ئەو شتە لە خودی خۆیدا ناپەسەند و ناشیرینە، گەر هەواڵی بە شتێك دا صدیقە و گەر کارێکی ئەنجامدا راست و دروستە، گەر شتێکی ویست ئەو شتە لە هەموو شتێك لەپێشترە، ئەم وەسفانەی کەماڵ تەنها شایستەی خودای موتەعالن.

ئەم ئایەتە و ئەم شایەتیدانە بەڵگەی یەکتاپەرستی خودا و نەرێکردنی هاوەڵدانان و عەدلی ئەو و ستەم نەکردن و عیززەت و نەرێکردنی دەستەوسانی و هەروەها بەڵگەی حیکمەت و نەرێکردنی نەزانی و نەنگی لەئامێز دەگرێت، شایەتیدانی تێدایە بە یەکتایی خودا و عەدل و قودرەت و زانست و حیکمەت، بۆیە مەزنترین شایەتیدانە.

لەناو هەموو دەستەکاندا تەنها ئەهلی سوننەت بە تێر و تەواوی بەم شایەتیدانە هەڵدەستن، دەستەکانی تر کە ئەهلی بیدعەتن بە حەقیقەتی ئەم شایەتیدانە هەڵنەستاون.

ئەم شایەتیدانە مەزنە: هەموو ئەوەی ئەوان لەسەرینی پووچ دەکاتەوە و دەمکوتیان دەکات، وەك چۆن ئەوەی هاوەڵدانەران لەسەرینی پووچ دەکاتەوە و دەمکوتیان دەکات، ئەم ئایەتە بیروبۆچوونی ئەهلی شیرك و ئەهلی بیدعەت(پەکخەرانی سیفات) پووچ دەکاتەوە، تەنها ئەهلی جێگیرکردن کە هەموو ئەو ناو و سیفەتانە بۆ خودا جێگیر دەکەن کە خودا بۆ خۆی جێگیر کردووە و نەرێی نموونانەدن و هاوشێوەبوونی مەخلوقات لە خودای موتەعال دەکەن و بە تاکوتەنهایی دەیپەرستن و هاوەڵی بۆ بڕیار نادەن.

### ۞ شایەتیدانی خودا بۆ خۆی-سبحانه- تەواوترە لە شایەتیدانی بیدعەچییەکان

بۆیە شایەتیدانی خودا بەیانی تێدایە بۆ بەندەکانی و هەروەها بەڵگە و نیشانە و رێنومایی و ناساندنی ئەو شایەتپێدراوەی تێدایە، ئەگەر نە، ئەو شایەتیدانە شایەتییەکە ئەوان توانای زانستییان پێی نییە و قازانجی لێ نابینن و بەڵگە بەسەریاندا راست ناکاتەوە، هەروەك شایەتیدانی مرۆڤێك گەر شایەتییەکی هەبوو نەیتوانی بەیانی بکات، بەڵکو شاردییەوە و پەردەی بەسەردا دا ئەوا هیچ کەس

سوودی لێ نابینێت و حوجە بەسەر هیچ کەسێکدا ڕاست ناکاتەوە، گەر شایەتیدان بە بەیانکردن بگاتە ئەنجام ئەوا خودا –سبحانە– لە سێ ڕێگەوە بە کاملترین شێوە بەیانی کردووە، ئەوانەش: بیستن و بینین و ژیرییەن(ژنەوتن).

بیستن: بە بیستنی ئایەتە خوێنراوە قەولییەکان کە سیفاتی کەماڵ و وەسفی جەلال بۆ خودای موتەعال جێگیر دەکات، هەروەها باڵابوونی خودا لەسەر عەرشی لەسەرو حەوت ئاسمانەکانەوە و قسەکردن بە کتێبەکانی و ئاخافتنی لەگەڵ هەر کەسێك لە بەندەکانی کە بیەوێت بە قسە و ئاخافتن لەگەڵی بدوێت بە حەقیقەت، نەك بە مەجاز.

لەمەدا قسەی ئەوانە پووچ دەبێتەوە کە دەڵێن: ئەوەی ئایەتە بیستراوەکان(الآیات السمعیة) ئاماژەی پێدەدەن لە جێگیرکردنی ماناکانیان و حەقیقەتەکانیان کە وشەکانیان بۆ دانراوە خودا لە بەندەکانی نەویستووە، ئەم قسەیە دژ بە بەیان و ئاگادارکردن و هەواڵ پێدانە، و مەبەستی شایەتیدان دەشارێتەوە و بەتاڵی دەکاتەوە، خودای موتەعالیش زەمی ئەوانە دەکات کە شایەتییەکیان لەلای خوداوە هەیە و دەیشارنەوە، و ڕایگەیاندووە کە ئەو کەسانە ستەمکارترین ستەمکارن، گەر لەلای بەندە شایەتییەك لە خوداوە بوونی هەیە و تەحقیقی ئەوە دەکات کە پێغەمبەر(ﷺ) لەخوداوە هێناویەتی لە ڕاگەیاندنی پێغەمبەرایەتییەکەی و یەکبوونی پەیامی پێغەمبەران و ڕاگەیاندنی ئەوەی کە ئیبراهیم و ئەهلوبەیتی هەموو لەسەر ئیسلام بوون، گەر ئەم شایەتیدانە بشارێتەوە، ئەوا دەچێتە ڕیزی ستەمکارترین ستەمکارەوە، وەك دوژمنانی پێغەمبەر(ﷺ) لە یەهود ئەنجامیان دا، ئەوانەی پێغەمبەری خودایان وەك ڕۆڵەکانی خۆیان دەناسی، ئیتر چۆن دەبێت گومان بە خودا ببرێت کە شایەتیدانێکی حەقی شاردبێتەوە کە جەهمی و موعتەزیلە و پەکخەرانی سیفات شایەتییان پێ دەدا، خودا شایەتی لەو جۆرە بۆ خۆی نادات پاشان شایەتی بدات بە شتێك کە دژ بەو شایەتییە بێت و هەڵیبوەشێنێتەوە و لە هیچ ڕوویەکەوە لەگەڵیدا کۆنەبێتەوە؟ پاکێتی بۆ تۆ ئەی خودای موتەعال ئەمە بوختانێکی مەزنە!

خودای موتەعال شایەتی لەسەر خۆی داوە کە ئیستیوای لەسەر عەرش کردووە و کەسێکی زاڵە بەسەر بەندەکانیدا، و فریشتەکان لە خودای باڵای خۆیان دەترسن و بە ئەمرەوە بۆ لای سەردەکەون، و لەلای ئەوەوە فەرمان وەردەگرن و پێیەوە

دادەبەزن، كاروكردەوەی چاكە بۆ لای بەرز دەبێتەوە، خودا هاتن و دابەزینی بۆ هەیە و قسە دەكات و رازی دەبێت و تووڕە دەبێت، و خۆشیدەوێت و رقی لێ دەبێت، خۆشحاڵ دەبێت و پێدەكەنێت و دەبیستێت و دەبینێت، لە رۆژی لیقادا باوەڕداران دەیبینن، شتانی تریش كە خودا شایەتی بۆ خۆی داوە لەسەری، هەروەها پێغەمبەران شایەتییان داوە لەسەری، بەڵام جەهەمییەكان بەدژی ئەوە شایەتییان دا و وتیان: شایەتی ئێمە دروستتر و عادلترە لە شایەتی دەقەكان، دەقەكان شارینەوەی حەق و دەرخستنی پێچەوانەی حەق لەئامێز دەگرن.

شایەتی پەروەردگار: ئەوانە بە توندترین شێوە بەدرۆ دەخاتەوە، هەروەها ئەوەش لەئامێز دەگرێت كە ئەوەی شایەتی پێدراوە بەیانی كردووە و رۆشنی كردۆتەوە و دەریخستووە تا گەیاندوویەتییە باڵاترین ئاستی دەركەوتن و بەیان، گەر حەق ببوایە لەوەی موعەتیلە(المعطلة) و جەهەمییەكان دەیانوت ئەوا بەندەكان هیچ سوود و قازانجێكیان لەو شایەتیدانەی خودا وەرنەدەگرت –لەلای ئەوان– خودا بە حەق شایەتی نەداوە بۆ خۆی، واتە ئەوەی شایەتی پێداوە و دەریخستووە و رۆشنی كردۆتەوە حەق نەبووە و دروست نییە حەق و یەقین لەو شەهادەتەوە وەربگیرێت.

ئایەتە بنراوە خەلقییەكانی و سەرنجدان و ئاماژە پێكردنیان ئاماژە بەوە دەكەن كە ئایەتە قەولی و سەمعییەكان ئاماژەی پێدەدەن، ئایەتەكانی پەروەردگار بریتین لە بەڵگە و بورهانگەلێك كە بەندەكان بەهۆیانەوە خودا دەناسن، لە رێگەی ئەو بەڵگانەوە ناو و سیفەتەكان و یەكتاپەرستی و ئەمر و نەهی خودایی دەزانن و دەناسن، پێغەمبەران هەواڵ دەربارەی ئەو كەلامە دەدەن كە خودا فەرموویەتی، ئەوەش بریتییە لە ئایەتە قەولییەكان، بەڵگە دەهێننەوە بە ئاماژەبۆكراوەكانی ئایەتەكان كە شایەتی دەدەن لەسەری، ئەوەش بریتییە لە ئایەتە بینراوەكان، ئەقڵ ئەو جۆرە و ئەم جۆرە كۆدەكاتەوە، بۆیە پێداگری دەكات لەسەر دروستی و رەوایی ئەوەی پێغەمبەران هێناویانە، ئەو كاتە شەهادەتی بیستن و بینین و ئەقڵ و فیترەت لەگەڵ یەكتر تەبا دەبن.

خودا–سبحانه–بەهۆی كەماڵی عەدل و رەحمەت و چاكە و حیكمەت و هەروەها خۆشویستنی پاساو و بیانوو و راگەیاندنی حوجەت– هیچ پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران

ڕەوانە نەکراوە ئایەتێکی لەگەڵ نەبووبێت تاکو ببێتە بەڵگە لەسەر صدقی ئەوەی ڕایانگەیاندووە، خودای موتەعال ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ﴾ الحديد: ٢٥، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِي إِلَيْهِمْ فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ (٤٣) بِالْبَيِّنَاتِ وَالزُّبُرِ﴾ النحل: ٤٣ – ٤٤، هەروەها دەفەرموێت ﴿قَدْ جَاءَكُمْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِي بِالْبَيِّنَاتِ وَبِالَّذِي قُلْتُمْ فَلِمَ قَتَلْتُمُوهُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ (١٨٣) فَإِن كَذَّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ جَاءُوا بِالْبَيِّنَاتِ وَالزُّبُرِ وَالْكِتَابِ الْمُنِيرِ (١٨٤)﴾ آل عمران: ١٨٣ – ١٨٤، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ﴾ فاطر: ٤، هەروەها دەفەرموێت ﴿وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ وَبِالزُّبُرِ وَبِالْكِتَابِ الْمُنِيرِ (٢٥)﴾ فاطر: ٢٥

تەنانەت شاراوەترین ئایەتی پێغەمبەران ئایەتی حەزرەتی هود بوو(عليه السلام) تا هۆزەکەی پێیان وت﴿مَا جِئْتَنَا بِبَيِّنَةٍ﴾ هود: ٥٣، لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆشنبوونی ئایەتەکەی لە دیاترین و ڕۆشنترین ئایەت بوو، کە ئاماژەی بۆکراوە لە ئایەتی﴿إِنِّي أُشْهِدُ اللَّهَ وَاشْهَدُوا أَنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ (٥٤) مِن دُونِهِ فَكِيدُونِي جَمِيعًا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ (٥٥) إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُم مَّا مِن دَابَّةٍ إِلَّا هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا إِنَّ رَبِّي عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ (٥٦)﴾ هود: ٥٤ – ٥٦، ئەمە لە مەزنترین ئایەتەکانە: تەنها پیاوێك قسە لەگەڵ ئوممەتێکی گەورە دەکات بەم ئاشکراو ڕۆشنییە، بەبێ ترس و نیگەرانی، و دابەزینی ورە، بەڵکو متمانەی هەیە بەوەی دەیڵێت و پێداگری دەکات لەسەری، خودای بە شایەت گرت کە ئەو بەرییە لەوەی ئەوان باوەڕیان پێیەتی، وەك کەسێکی بەهێزی خاوەن متمانە، کەسێکی پشتبەستوو بە خودا کە هۆزەکەی ئاگاداردەکاتەوە تەنها خودا دۆست و سەرخەریەتی و هەرگیز خودا ئەوان بەسەر ئەودا سەرناخات.

پاشان ئەوانی کرد بە شایەت–بە شایەتیدانێکی ئاشکرای جیاواز لە ئەوان– کە ئەو بەرییە لە ئایین و خواوەندەکانی ئەوان کە کردوونیان بە دۆستی خۆیان و لەسەر ئەو خواوەندە دۆستایەتی و دوژمنایەتی دەکەن، و خوێن و ماڵیان بۆ سەرخستنیان دەبەخشن.

پاشان تەئکیدی ئەوەی لەسەر کردنەوە وەك سوکایەتییەك بە کاروکردەوەکانیان و کەم تەماشاکردنیان و بێزلێکردنەوەیان، هەروەها گەر هەموو ئەوانە کۆببنەوە لەسەر

پیلانگێری دژ بە ئەو و بیانەوێت شیفای رق و کینـەی خۆیـان بـدەن و پەلـە بکـەن لـەو کارەیان و مۆڵەتی پێنەدەن ئەوا ئەوان هیچیان لەدەست نایە و ناتوانن ئەو کارە بکـەن، ئەوان لاوازتر و دەستەوسانتر و کەمترن لەوەی بتوانن کارێك دژ بە ئەو ئەنجام بدەن.

پاشـان بانگـەوازی خـۆی راگەیانـد بـە جـوانترین شـێوە، ئـەوەی رۆشـن کـردەوە کـە پەروەردگاری ئەو پەروەردگاری ئەوانیشە، ئەو کەسەی ناوچاوانیان بەدەستی ئەوە و لەدەستی ئەودایە، ئەو-سبحانه- دۆست و وەکیلییەتی و هەڵدەستێ بە سەرخستن و پشتیوانی کردنـی، پـەروەردگاری ئـەو لەسـەر شـارێگەی راسـت و دروسـتە(إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ)، ئـەو کەسـەی پشـتی پێدەبەسـتێ و بـاوەڕی پێـدەهێنێت سەرشـۆڕی ناکات و دوژمنانی پێخۆش ناکات، لەگەڵ دوژمنەکانی ئەو دەسـت تێکـەڵ ناکـات و دژ بە پێغەمبەرەکەی بوەستن، شارێگە کە رێگەی راست و دروستە -و خودا لەسەریەتی لە گوفتار و کرداردا- رێگری دەکات لەو کارە و نایەوێت روویدات.

لەژێر ئەم گوتارەدا: لە تایبەتمەندییەکانی شارێگەی راسـت و دروسـت تۆڵەسـەندنە و دابەزاندنی سزا بوونی هەیە، ئەمەش بۆ سەر کەسانێك لەو رێگەیە دەردەچن و کار بە پێچەوانەی ئەو رێگەیە دەکەن، شارێگەی راست و دروست ئـەو عەدلەیـە پـەروەردگار لەسەریەتی، لەوێوە تۆڵە لە ئەهلی تاوان و شیرك و خراپە دەسێنێت، و دۆسـتەکان و پێغەمبـەرانی سـەردەخات بەسـەر دوژمنەکانیانـدا، هـەروەها ئـەوان لادەبـات و دەستەیەکی تر دەهێنێت و دەیانکات بە جێنشین، هەموو ئەو کارانـەش زیانێـك بـە پـەروەردگار ناگەیـەنێت، ئـەو-سـبحانه- راوەسـتاوە بەسـەر هـەموو شـتێکەوە بـە پارێزگاری و چاودێری و بەڕێوەبردن و ئامارکردنیان.

چ ئایـەت و بورهانێـك باشـتر و بـەهێزترە لـە ئایـەت و بورهـان و بەڵگـە و نیشـانەی پێغەمبەران؟ ئەوەش شایەتییە لەلای خـوداوە بـۆ ئـەوان کـە بـە باشـترین و رونتریـن بـەیان-بـە گوفتـار و کـردار- بـۆ بەنـدەکانی بـەیانی کـردووە، لـە فەرموودەیـەکی سەحیحدا لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی ((هەر پێغەمبەرێك لـە پێغەمبـەران ئایاتگەلێکی پێدراوە کە لەسەریان مرۆڤ باوەڕی هێنـاوە، ئـەو ئایەتـەی بـە مـن دراوە بریتییە لە وەحی کە خودا وەحی بۆ کردوون، بۆیە رجام وایە لە هـەموویان زۆرتـر لـە رۆژی دواییدا شوێنکەوتووانم هەبێت))

یەکێك لە ناوە جوانەکانی خودای موتەعال ناوی ((المؤمن))ە، ئەو ناوە-لە یەکێك لە دوو تەفسیرەکەیدا- مانای تەصدیقکەری هەیە کە تەصدیقی صادیقان دەکات بەوەی راستی دەکاتەوە و رایدەگەیەنێت لە شایەتیدانی صدقی ئەوان، خودا تەصدیقی پێغەمبەرانی خۆی کردووە لەو پەیامەی بە مەردوومانیان گەیاندووە، شایەتیداوە کە ئەوانە کەسانێکی صدیقن، ئەمەش بە بەڵگەگەلێك کە نیشانەی راستگۆیی ئەوان بووە لە رووی بوون و بڕیارەوە، خودای موتەعال هەواڵیداوە-هەواڵەکەشی صدقە و گوتاریشی حەق- کە بەندەکان دەبێت ئایەتی ئاسۆکانی دەروون و گەردوون ببینن و بۆیان روون ببێتەوە کە: ئەو وەحییەی پێغەمبەرانی رایانگەیاندووە حەق و راستییە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾فصلت: ٥٣، واتە قورئان، کە ئەم ئایەتەی پێشکەوتووە﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ثُمَّ كَفَرْتُم بِهِۦ ﴾ فصلت: ٥٢، پاش ئەمە فەرمووی﴿ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾ فصلت: ٥٣، خودای موتەعال شایەتی بۆ پێغەمبەرەکەی دا بە وتنی: ئەوەی هێناویەتی لە خوداوە حەقە و بەڵێنی پێداوە ئایاتی کرداری و خەلقی نیشانی بەندەکانی بدات تاکو بەڵگە بێت لەسەر راستێتی پەیامی پێغەمبەرەکەی، پاشان مەزنتر لەوە و گەورەتر لەوە باس لێوە دەکات کە شەهادەتی خودایە لەسەر هەموو شتێك، یەکێك لە ناوەکانی خودای موتەعال ((الشهيد))ە کە هیچ شتێکی لێ بزر نابێت، و گەردیلەیەك لە ئاسمان و لە زەوی لە ئەو ون نابێت، بەڵکو زانا و ئاگادارە لەسەر هەموو شتێك و دەیانبینێ، و وردەکارییەکانی لەبەر چاوە، ئەمەش بەڵگە هێنانەوەیە بە ناو و سیفەتەکانی، یەکەمیان بەڵگەهێنانەوەیە بە گوفتار و کەلیماتی، ئاماژەکردن بە ئایاتی ئاسۆکانی گەردوون و دەروونیش بەڵگەهێنانەوەیە بە کردار و دروستکراوەکانی.

گەر بڵێیت: بەڵگەهێنانەوە بە کەلیماتی خودا و بەڵگەهێنانەوە بە دروستکراوەکانی تێگەیشتم، ئێستا بەڵگەهێنانەوە بە ناو و سیفەتەکانی روون بکەرەوە، چونکە ئەوە بابەتێکە شارەزاییمان تیایدا نییە و لە قسە و کتێبەکانماندا بوونی نییە.

دەڵێم: ئەو بابەتە-سوێند بە خودا- هەر بەو جۆرەیە کە باسمان لەبارەوە کرد، شانوشکۆی مەزنتر و باڵاترە، پەروەردگار دەبێتە ئاماژەبۆکراو(مدلول) و ئایەتەکانی دەبنە بەڵگە و بورهان(دلیل و برهان) لەسەری.

بزانە خودا –سبحانە– بۆخۆی بەڵگەیە لەسەر خۆی بە ئایەتەکانی، ئەو لەڕاستیدا ڕێنیشاندەرە بۆ بەندەکانی بەو بەڵگە و نیشانانەی لەسەر ڕێگە بۆی داناون، لە فیترەتێکدا کە پیس نەبووبێت بە پەکخستن و سەرپێچی: ئەو–سبحانە– زاتێکی کامڵە لە ناو و سیفەتەکانیدا، و هەرچی سیفەتی کەماڵە دەدرێتە پاڵی و پێیان ڕازاوەتەوە، و لە هەرچی نەنگی و ناتەواوییەك پاك و بێگەردە، هەمو کەماڵ و جەماڵ و جەلال و بەها و عیززەت و مەزنی و شکۆمەندییەك تەنها بۆ خودای موتەعالە و لە پێویستییەکانی ئەو زاتە شکۆمەندەیە، نابێت خودا بەم جۆرە نەبێت، هەرچی ژیان و زانست و قودرەت و بیستن و بینین و ویست و بەزەیی و دەوڵەمەندی و بەخشین و چاکەیە هەر بۆ ئەوە–سبحانە– و تایبەتە بە ئەو و بەوەوە وەستاون، ئەوەی لە خەڵك نادیارە لە کەماڵ و مەزنی و شکۆمەندی زۆر زیاترە لەوەی ناسیویانە و بۆیان دەرکەوتووە، بەڵکو ئەوەی بۆیان دەرکەوتووە بەراورد ناکرێت بەوەی لێیان شاراوەتەوە و نایزانن.

لە کەماڵی موقەدەسی خودای موتەعالە کە ئاگاهی تەواوی هەیە بەسەر هەموو شتێکدا و دەیانبینێت، بەجۆرێك وردەکارییەکانی هیچ شتێك لە خودا بزر نابێت، بەڵکو گەردیلەیە لە گەردیلەکان لە ناوەوە و دەرەوە لای خودا پەنهان نییە، هەر کەس ئەمە شانوشکۆی بێت: چۆن گونجاوە بەندەکانی هاوەڵی بۆ دابنێن و جگە لە ئەو کەسێکی تر بپەرستن و خودایەکی تر لەپاڵ ئەودا ڕاست بکەنەوە؟ چۆن شایستەی کەماڵی ئەو دەبێت گەر دانبنێت بە کەسانێکدا مەزنترین درۆ بەدەم خوداوە دەکەن و شتێك بەدەم خوداوە دەڵێن پێچەوانەی ئەوەیە فەرمانی پێکردووە؟ پاشان ئەو کەسە سەربخات و کۆمەکی بکات و پشتیوانی بۆ دەرببڕێت و کەلیمەی بەرزبکاتەوە و شانوشکۆی بڵند بکات و وەڵامی داواکانی بداتەوە و دوژمنەکانی تیاببات و ئایات و نیشانەگەلێك لەسەر دەستی سەرهەڵبدات کە مرۆڤ لە ئاستیدا دەستەوسان بێت، ئەو کەسە لەگەڵ هەموو ئەمانەدا کەسێکی درۆزن بێت و بەدەم خوداوە درۆی کردبێت و فەسادی لەسەر زەویدا نابێتەوە؟!

ئاشکرایە شایەتیدانی خودا لەسەر هەموو شتێك و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا و حیکمەت و عیززەت و کەماڵی موقەدەسی ڕێگە بەو کارە نادات و هەر کەس گومانی

وا دەبات و پێیوایە ئەو كارە بۆ خودا شیاوە: ئەوە دوورترین كەسە لە ناسینی خودا، با هەندێ سیفەتی خوداشی ناسیبێت، وەك سیفەتی قودرەت و ویستی خودا.

قورئان پڕە لەم ڕێگە و شێوازە كە ڕێگەیەكی تایبەتە، بەڵكو تایبەتی تایبەتەكانە، ئەوانەش ئەو كەسانەن خودا دەكەنە بەڵگە لەسەر كردارەكانی و ئەوەی شایستەیە ئەنجامی بدات و ئەنجامی نەدات.

گەر تێڕامان لە قورئاندا بكەیت دەبینی بانگ بۆ ئەوە دەكات، دەریدەخات و دووبارەی دەكاتەوە بۆ كەسانێك تێگەیشتن و دڵێكی هۆشیاریان لە خوداوە پێبەخشراوە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ (٤٤) لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ (٤٥) ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ (٤٦) فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ (٤٧) ﴾ الحاقة: ٤٤ — ٤٧، نابینی چۆن خودای موتەعال رایدەگەیەنێت كە كەماڵ و حیكمەت و قودرەت ڕێگە نادات پشتیوانی كەسێك بكات درۆی بەدەم خوداوە هەڵبەستبێت، بەڵكو دەبێت بیكات بە عیبرەت بۆ بەندەكانی تری، وەك چۆن سوننەتی بەسەر درۆزناندا جاری بووە، هەروەها دەفەرموێت ﴿ أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا ۖ فَإِن يَشَإِ اللَّهُ يَخْتِمْ عَلَىٰ قَلْبِكَ ﴾الشورى: ٢٤، لێرەدا وەڵامی رستە مەرجییەكە تەواو دەبێت، پاشان بە ئەوپەڕی هێز و یەكلاكردنەوەوە دەفەرموێت ﴿ وَيَمْحُ اللَّهُ الْبَاطِلَ وَيُحِقُّ الْحَقَّ ﴾ الشورى: ٢٤، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِذْ قَالُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَيْءٍ ﴾الأنعام: ٩١، رایگەیاند ئەو كەسەی نەرێی ناردنی پێغەمبەران و كەلام لە خودای موتەعال دەكات حەقی گەورەیی و مەزنی خودای موتەعالی نەداوە و وەك پێویست خودای نەناسیوە و مەزن راینەگرتووە، ئەی دەبێ ئەو كەسە چۆن بێت گومان دەبات خودا درۆزن و درۆكەر بەدەم خوداوە سەربخات و پشتیوانی بكات و ئایەت و بەڵگە و نیشانەگەلێك لەسەر دەستی بوەشێنێتەوە؟! ئەم شێوەیە لە قورئاندا زۆرە، بەڵگە بە كەماڵی موقەدەسی خۆی و سیفەتی جەلالی دەهێنێتەوە لەسەر صدقی پێغەمبەران و بەڵێن و هەڕەشەكانی و بەندەكانی بانگ دەكات بۆ ئەو راستییە، هەروەك چۆن بەڵگە دەهێنێتەوە بە ناو و سیفەتی لەسەر یەكتایی خۆی -سبحانە- و پووچی و بەتاڵی هاوەڵدانان، وەك ئایەتی﴿ هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلَامُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ ۚ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ (٢٣) ﴾ الحشر: ٢٣، زۆرتر و زیاتریش لەوە لە قورئاندا.

خودای موتەعال بەڵگە بە ناو و سیفەتەکانی دەهێنێتەوە لەسەر پووچی و بەتاڵی ئەوەی دراوەتە پاڵی لە ئەحکام و شەریعەتی باتڵ، و رایدەگەیەنێت کە کەماڵی موقەدەسی رێگە بەو جۆرە شەرعە نادات، وەك ئایەتی﴿ وَإِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةٗ قَالُواْ وَجَدۡنَا عَلَيۡهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَاۗ قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِۖ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ الأعراف: ٢٨، هەروەها ئەو ئایەتەی دوای ئەوەی نەهی لە هاوەڵدانان و ستەم و فاحیشە و درۆکردن و قسەکردن بەدەم خوداوە بەبێ زانست دەکات دەفەرموێت ﴿ كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكۡرُوهٗا ﴿٣٨﴾ ﴾ الإسراء: ٣٨، ئاگاداری کردینەوە کە ئەو شتەی لە خودی خۆیدا خراپ و ناباشە خودا بە ناپەسەند لە قەڵەمی دەدات، کەماڵی خودای موتەعال رێگە نادات ئەو شتە ناباشانە ببێت بە شەرع و ئایینی، ئەو-سبحانه- بۆ بەندەکانی ناو سیفەتەکانی خۆی دەکات بە بەڵگە لەسەر کاروکردەوەکانی و ئەوەی فەرمانی پێدەکات، هەروەها ئەوەی خۆشی دەوێت و ئەوەی رقی لێدەبێتەوە، و ئەوەی پاداشتی لەسەر وەردەگیرێت و ئەوەی لەسەری سزادەدرێت، بەڵام ئەم رێگەیە تایبەتی تایبەتەکان پێی دەگەن، بۆیە رێگەی جمهوری زانایان بریتییە لە بەڵگەهێنانەوە لەسەر خودا و یەکتایی خودا بە ئایەتە بینراوەکان، ئەو رێگەیە ئاسانتر و بەرینترین رێگەیە بۆ گرتنەبەر و دەست بۆ بردن.

خودای موتەعال فەزڵی هەندێك لە دروستکراوەکانی دەدات بەسەر هەندێکی تریاندا، و پلەی هەرکەسێکی بوێت بەرزی دەکاتەوە..ئەو زانا و حەکیمە.

قورئانی پیرۆز ماناگەلێك لەئامێز دەگرێت کە لە هیچ کتێبێکی تردا بوونی نییە، قورئان بانگەواز و حوجەیە، ئەو دەلیل و نیشانەیە لەسەر خودا، ئەو شاهیدە و شایەت پێدراوە، قورئان حەکەم و رێنیشاندە، داوا و بەڵگەی رۆشنە، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّهِۦ وَيَتۡلُوهُ شَاهِدٞ مِّنۡهُ ﴾ هود: ١٧، واتە شاهیدەکە لە پەروەردگارییەوە دەیخوێنێتەوە کە بریتییە لە قورئان، هەروەها خودای موتەعال بەو کەسانە دەفەرموێت کە داوای ئایەتێکیان دەکرد بەڵگە بێت لەسەر صدقی پێغەمبەرەکەی ﴿ أَوَلَمۡ يَكۡفِهِمۡ أَنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحۡمَةٗ وَذِكۡرَىٰ لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٥١﴾ قُلۡ كَفَىٰ بِٱللَّهِ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡ شَهِيدٗاۖ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ وَكَفَرُواْ بِٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ

ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٥٢﴾ ﴾ العنكبوت: ٥١ – ٥٢، خودای موتەعال رایدەگەیەنێت ئەو كتێبەی كە دایبەزاندووە بۆ سەر پێغەمبەرەكەی مەزنترین ئایەتە، چونكە حوجە و بەڵگەی تێدایە كە دەیسەلمێنن لە خوداوەیە و خودا پێغەمبەرەكەی بەو كتێبەوە رەوانە كردووە، و لەناو قورئاندا بەیانگەلێك بوونی هەیە بۆ كەسانێك بەختەوەری شوێنیان كەوتبێت و لە سزای دواڕۆژ رزگاریان بووبێت، پاشان دەفەرموێت ﴿ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ شَهِيدًا ۖ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾العنكبوت: ٥٢، گەر خودای موتەعال زانا بێت بە هەموو شتێك: ئەوا شایەتیدانەكەی راستگۆترین و عادلترین شایەتیدانە، شایەتیدانێكە لە زانستی تەواوە دەركراوە و ئابلۆقەی تەواوی بەو شتە هەیە شایەتی پێدەدات، بۆیە شایەت پێدراوەكە دەبێتە عادلترین و صادقترین شایەت.

خودای موتەعال لە باسی شایەتیدانی خۆیدا باسی زانستی خۆی دەكات، و لەباسی پاداشت و سزادا باسی قودرەت و موڵك، و لە خەلق و ئەمردا باسی حیكمەت، و لە ناردنی پێغەمبەردا باسی رەحمەت، و لە باسی گوناه و یاخیبوونی بەندەكانیدا باسی حیلم، و لە باسی دوعا و داوای بەندەكانیدا باسی بیستن و لە قەزا و قەدەردا باسی عیززەت و زانست دەكات.

بۆیە تێڕامان بكە لە ناوە جوانەكانی لە قورئاندا و پەیوەستبوونی بە خەلق و ئەمر و پاداشت و سزاوە.

### ۞ خودا بە شایەتیدانی لەسەر خۆی پشتیوانی پێغەمبەرانی دەكات

لەم شێوازە ئایەتی﴿ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَسْتَ مُرْسَلًا ۚ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ وَمَنْ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٤٣﴾ ﴾ الرعد: ٤٣، شایەت بۆ راستێتی پەیامەكەی بریتییە لە شایەتیدانی خودای موتەعال لەسەر راستێتی ئەو پەیامە، پێویستە ئەم شایەتیدانە بزانرێت و حوجەی خوایی لەسەر درۆزنان پێڕاست ببێتەوە، هەر بەو جۆرە ئایەتی ﴿ أَىُّ شَىْءٍ أَكْبَرُ شَهَٰدَةً ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ شَهِيدٌۢ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ﴾الأنعام: ١٩، هەروەها ئایەتی﴿ لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشْهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيْكَ ۖ أَنزَلَهُۥ بِعِلْمِهِۦ ۖ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَشْهَدُونَ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿١٦٦﴾ ﴾ النساء: ١٦٦، هەروەها ئایەتی ﴿ يسٓ ﴿١﴾ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ إِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٣﴾ ﴾ یس: ١ – ٣، هەروەها ئایەتی ﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا

عَلَيْكَ بِالْحَقِّ وَإِنَّكَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴿٢٥٢﴾ ﴾ البقرة: ٢٥٢، هەروەها ئایـەتی﴿ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ ﴾ المنافقون: ١، هەروەها ئایەتی﴿ مُحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ ﴾الفتح: ٢٩، هەموو ئەمانە شـایەتی خودایە بـۆ پێغەمبەرەكـەی(ﷺ)، دەرێخسـتووە و بـەیانی كـردووە، بـەیانی دروستیی ئەو شایەتیدانە بەجوانترین شێوە كردووە، بەجۆرێك بیانووی لەنێوان خـۆی و بەندەكانیدا بڕیوە و حوجـەی لەسـەر ڕاسـت كردوونەتـەوە، بـەوەی خـودا شـایەتی پێغەمبەرەكەیەتی بە چەندین بەڵگـەی تـر ئاشـكرا بـووە، بەڵگـەی ئـەقڵی و نـەقڵی و فیتری و پێویست و بەرچاو.

هەركات سەرنجی ئەو بەڵگانەی دا و تێیانڕاما تێدەگات كە خودا-سبحانه- ڕاسـترین و عادلترین و دیارترین شایەتی بـۆ پێغەمبەرەكـەی داوە، و لـە چـەندین ڕێگـەی تەصدیق كردنەوە تەصدیقی پێغەمبەرەكەی كردووە: بەو گوفتارەی كـە بەڵگـە و بورهـانی تیـادا ڕاست دەبێتەوە، هەروەها بە كردارەكان و نیشـاندانەكانی، هـەر بـەو جـۆرە بـەوەی لـە فیترەتـی بەندەكانیـدا دایناوە: لـە داننـان بـە كـەماڵی پـەروەردگاردا و پـاكڕاگرتنی لـە هـەموو نـەنگی و ناتەواوییـەك كـە شایسـتەی خـودای موتـەعال نـەبێت، لـە هـەموو سەردەمێكدا كۆمەڵێك ئایەت ڕوودەدەن كە بەڵگەن لەسەر صدقی پێغەمبەرەكـەی(ﷺ) و بەهۆیـەوە بەڵگـە لەسـەریان ڕاسـت دەبێتـەوە و بیـانوو و پاسـاو كۆتـایی پێـدێت، و ئەوەی بەڵێنی بە پێغەمبەرەكەی و شـوێنكەوتووانی دابـوو لـە عیـززەت و سـەرفرازی و ڕزگـاری و پشـتیوانی دێتـە دی، هـەروەها ئـەو هەڕەشـانەی لـە دوژمنـانی خـۆی و بەدرۆخەرانی پەیامەكەی كردووە لە سەرشۆڕی و سزای خێرا كە بەڵگەیە لەسـەر سـزای دواڕۆژیان هەرهەموو ڕوودەدەن و دێنە دی، خودای موتـەعال دەفـەرموێت ﴿ هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا ﴿٢٨﴾ ﴾ الفـتح: ٢٨، بە دوو پشتیوانی پشتیوانی لە پێغەمبەرەكەی دەكات: پشتیوانییەك بە بەڵگە و حوجـە و بـەیان و نیشـانە، لەگـەڵ پشـتیوانییەك بـە سـەركەوتن و زەفـەرپێبردن و زاڵبـوون و كۆمەكی كردن، تا سەرییخات بەسەر سەرپێچیكەراندا و بچێتە ڕیزی سەركەوتووانەوە.

هـەروەها ئایـەتی ﴿ لَّٰكِنِ اللَّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ وَالْمَلَائِكَةُ يَشْهَدُونَ ﴾ النساء: ١٦٦، ئەوەی كە تێیدایە لە هەواڵدان لە زانستی خودا كـە تـەنها خـودا دەیزانێـت: دەبێتە مەزنترین شەهادەت لەسەر ئـەوەی كـە ئـەم قورئانـە ئـەو دایبەزانـدووە، وەك لـە

ئایەتێکی تردا دەفەرموێت ﴿أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِعَشۡرِ سُوَرٖ مِّثۡلِهِۦ مُفۡتَرَيَٰتٖ وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٣﴾ فَإِلَّمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلۡمِ ٱللَّهِ وَأَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٤﴾﴾ هود: ١٣ — ١٤، لەم شوێنەدا مەبەستەکە تەنها هەواڵدان نییە بەوەی ئەو دایبەزاندووە، ئەو راستییە لای خودا ئاشکرایە وەك چۆن هەموو شتەکانی تر دەزانێت، هەرچی شتە زانراوە لەلایەن خوداوە لە حەق و لە باتڵ، بەڵکو مانایەکەی ئەوەیە کە ئەم کتێبەی دابەزاندووە کە زانستی خودا لە ئامێز دەگرێت، بۆیە دابەزاندنی زانست لەئامێزگر: ئایەتێکە دەیسەلمێنێت لەلای خوداوەیە و حەق و صدقێکە لەلای ئەوەوە دابەزیوە، هاوشێوەی ئەمە ئایەتی ﴿ قُلۡ أَنزَلَهُ ٱلَّذِي يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾الفرقان: ٦، ئەمەی لە بەدرۆخستنەوە و بەرپەرچدانەوەی ئەوانەدا دابەزاند کە دەیانوت ﴿ٱفۡتَرَىٰهُ﴾ الفرقان: ٤.

### ۞ فیترەتی سەلیم شایەتیدانێکی رەببانییە

دیسان لە شایەتیدانەکانی خودای موتەعال: ئەوەیە کە لە دڵی بەندەکانیدا دایناوە لە تەصدیقی یەکلاکەرەوە و یەقینێکی جێگیر و ئارامی و دڵنیایی بە کەلام و وەحی خودا—سبحانە—عادەت رێگە نادات یەقین پەیدا ببێت بۆ گەورەترین درۆ بەدەم خوداوە و هەواڵدان لە خودا بە پێچەوانەی ناو و سیفەتەکانییەوە، ئەوە نەك یەقین دروست ناکات، بەڵکو گەورەترین شك و گومان بەرهەم دەهێنێت و ژیری و فیترەتی سەلیم دەست بەرووییەوە دەنێن، وەك چۆن فیترەت گیانداران پاڵپێوە دەنێن بۆ خۆ بەدوورگرتن لە خواردنی پیس و زیانبەخش، وەك میز و شتی بۆگەن، خودای موتەعال دڵی لەسەر وەرگرتنی حەق و گەردنکەچبوون بۆی و دڵنیایی پێی و سوکنایی و خۆشەویستی بۆی بارهێناوە، هەر بەو جۆرە باریهێناوە لەسەر رقبوونەوە لە درۆ و باتڵ و هەڵهاتن لێی و گومان پێی و نەبوونی سوکنایی بۆ لای.

گەر فیترەت تێکنەچێت و لەسەر حاڵی خۆی بمێنێتەوە ئەوا جگە لە حەق شتێکی تر هەڵنابژێرێت و سوکنایی پێی نایەت و لێی دڵنیا نابێت، و جگە لە حەق شتێکی تری خۆشناوێت، بۆیە خودای موتەعال هانی بەندەکانی دەدات تاکو تێڕامان لە قورئاندا بکەن، هەر کەس تێڕامان لە قورئاندا بکات تێڕامانەکەی زانستێکی زەروری و یەقینی بۆ

دروست دەكات كە ئەم قورئانە حەق و راستییە، بەڵكو لە هەموو حەقەكان حەقترە و لە هەموو راستییەكان راسترە و ئەو كەسەی هێناویەتی راستگۆترین و چاكترین دروستكراوی خودایە، هەر بەو جۆرە خاوەنی كاملترین زانست و كردار و مەعریفەیە، وەك خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَـٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾ ﴾ النساء: ٨٢، هەروەها دەفەرموێت ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ ﴾ محمد: ٢٤، گەر قوفڵەكانی دڵ بكرێنەوە راستەوخۆ حەقیقەتی قورئانی تێدەچێت و چرای ئیمانی تیا دادەگیرسێت، بە زانستێكی پێویست -وەك هەر زانراوێكی ویژدانیی تر لە دڵخۆشی و ئازار و خۆشەویستی و ترس- تێدەگات كە ئەم قورئانە لەلای خوداوەیە، بە حەق قسەی پێكردووە و جبریلی نێرراوی خودا بە پێغەمبەری خودای(ﷺ) راگەیاندووە، ئەم شایەتەی ناو دڵ مەزنترین شایەتیدانە، بەم شایەتییە هرقل بەڵگەی بەسەر ئەبو سوفیاندا هێنایەوە كاتێك پێی وت ((ئایا هیچ كەس لەوانەی شوێنی محمد دەكەون بەهۆی بێزاربوون و تووڕەبوون لە ئایینەكەی پاشگەز دەبنەوە دوای ئەوەی دەچنە ناو ئایینەكەیەوە؟ وتی: نەخێر، ئەویش وتی: ئیمانیش هەر بەو جۆرەیە، كاتێك شیرینییەكەی دەگاتە ناو دڵ هیچ كەسێك زویری ناكات)) خودای موتەعال لە ئایەتێكدا ئاماژەی بۆ ئەم مانایە كردووە و دەفەرموێت ﴿ بَلْ هُوَ ءَايَـٰتٌۢ بَيِّنَـٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ﴾العنكبوت: ٤٩، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤْمِنُوا۟ بِهِۦ ﴾ الحج: ٥٤، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ ﴾ سبأ: ٦، هەروەها دەفەرموێت ﴿ أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰٓ ﴾ الرعد: ١٩، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۗ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ ﴿٢٧﴾ ﴾ الرعد: ٢٧، واتە: ئەو ئایەتەی ئەوان پێشنیاری دەكەن هیدایەتی لێوە بەدەست نایەت، بەڵكو ئەو خودایە بۆخۆیەتی هیدایەت دەدات و گومڕا دەكات، پاشان ئاگاداری كردنەوە لەمەڕ مەزنترین و باڵاترین ئایەت: كە بریتییە لە دڵنیایی دڵی باوەڕداران بەو یادەی خودا دایبەزاندووە و دەفەرموێت ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ﴾الرعد: ٢٨، واتە بە كتێبەكەی خودا و كەلامی خودا﴿ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾ الرعد: ٢٨، دڵنیایی و ئارامی دڵە تەندروستەكان و

فیترەتـە سـەلیمەكان و سـوكنایی بـۆ لای لـە مـەزنترین ئایەتەكانـە، چـونكە وەك بـاوە ناگونجێت، دڵ دڵنیایی هەبێت لە درۆ و باتڵ و سوكنایی هەبێت بۆ لایان.

## ۞ باسی شایەتی زانایان لە باسی شایەتی پێغەمبەران بێنیازمان دەكات

گەر بوترێت: بۆچـی خـودا لـە ئایەتەكـەدا شـایەتی پێغەمبـەران و فریشـتەكانی بـاس نەكردووە و تەنها شایەتی زانایانی باس كردووە و نەیفەرمووە: "شهد الله أنه لا إلـه إلا هـو والملائكـة والرسـل"، كـە شـایەتی پێغەمبـەران مـەزنترە لـە شـایەتی خـاوەن زانستەكان؟

**وتراوە لەمەدا چەندین سوود هەیە:**

یەكەم: خاوەن زانست(أولو العلم) گشـتگیرترە لـە پێغەمبـەران و فریشـتەكان، بـەڵكو ئەوان و شوێنكەوتووانی ئەوان دەچنە ناو مانای "خاوەن زانست"ەوە.

دووەم: لـە باسـكردنی "خـاوەن زانسـت"دا لـەو شـایەتیدانەدا و بەسـتنەوەی ئـەو شایەتیدانە بەوانەوە: بەڵگەیە كـە ئـەو شـایەتییە لـە داواكارییـەكانی زانسـتە و بـەدوای زانستدا دێت، هەر كـەس خـاوەنی زانسـت بێـت: شـایەتی دەدات بـەو شـەهادەتە، وەك دەوترێت گەر مانگی یەكشەوە دەركەوت و رۆشنبوویەوە ئەوا هەموو كەسێك كە توانـای بینینی هەیە دەیبینێت، هەر بەو جۆرە گـەر بۆنێـك هـەڵبكات هـەموو ئەوانـەی خـاوەنی هەسـتی بـۆنكردنن هەسـتی پێدەكـەن و بـۆنی دەكـەن، خـودای موتـەعال دەفـەرموێت ﴿ وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ ﴿٣٦﴾ ﴾ النازعـات: ٣٦، واتـە هـەر كەسـێك بینـینی هـەبێت لـەو كاتەدا بەئاشكرا دەیبینێت، ئەمە بەیانی ئەوەی تێدایە كە هەر كەس ئەو شایەتییەی بۆ نەدات ئـەوە لـە مـەزنترین نەفامەكانـە یـا لـە كاروبارەكـانی دونیـادا خـاوەنی زانسـت و شارەزاییەك بێت هیچ كەسێكی تر نەیزانێت، ئەو كەسـە دەبێـت بـە "خـاوەنی نـەزانی" نەك "خاوەنی زانست"، باسی ئەوەمان كرد تەنها شوێنكەوتووانی پێغەمبەران و ئـەهلی جێگیربوون بەدروستی بەو شـایەتیدانە هەسـتاون، ئـەوانن خـاوەنی زانسـتن و جگـە لـە ئەوان: خاوەنی نەزانین یا قسەی زۆر و گفتوگۆی بەرینیشیان هەبێت.

سێیەم: شەهادەت لـەلای خـوداوە بـۆ ئـەهلی ئـەم شـایەتیدانە: كـە ئەوانـە "خـاوەن زانسـت"ن، ئـەوا شـەهادەكەی خـودا بـۆ ئـەوان عـادلتر و صـادقترە لـە شـایەتیدانی

جەهمی و پەکخەرانی سیفات و فیرعەونییەکان بۆ ئەوان کە تۆمەتباریان دەکەن بەوەی نەزان و تەشبیهکەر و بەرجەستەکەری خودا و سیفاتی خودان و لە ئاین لایانداوە، شایەتیدانی صادقترینی صادیقەکان(خودا) بەسە بۆ ئەوان(پێغەمبەران) کە بە "خاوەن زانست" ناویان دەبات، چونکە ئەوان شایەتی بۆ خودا دەدەن بە شتێك کە خودا شایەتی بۆخۆی پێداوە، بەبێ تەحریف و پەکخستن (تعطیل)، ئەوان حەقیقەتی ئەو شایەتیدانە و ناوەڕۆکی شایەتیدانەکەیان بۆ خودا جێگیر کرد، نەیارانی ئەوان نەرێی حەقیقەتی ئەو شایەتیدانەیان کرد و تەنها وشەکان و مانای مەجازییان بۆ خودا جێگیر کرد.

لە ئامێزی ئەم شایەتیدانە خوداییەدا: مەدح و سەنای ئەهلی زانستی تێدایە کە شایەتییان بۆ دەدرێت و بە ئەهلی عەدل لە قەڵەم دەدرێن(چونکە شایەت دەبێت عادل بێت)، خودای موتەعال شایەتی ئەوانی لەگەڵ شایەتی خۆی و فریشتەکانی هاوتا کردووە، خودا-جل وعلا- ئەوانی گرتووە بە شایەت لەسەر مەزنترین شایەتی بۆدراو، ئەوانی کردووە بە حوجە بەسەر هەموو ئەوانەوە کە نەرێی ئەو شەهادەتە دەکەن، وەك چۆن بە بەڵگە هێناوە دەمکوتی ئەوانە دەکات نەرێی حەق دەکەن، حوجە لەسەر ئەوانەی ئینکاری ئەم شەهادەتە دەکەن راست بووەتەوە وەك چۆن بەڵگە لەسەر ئینکارکەری حەق راست دەبێتەوە، حوجەت بە راستبوونەوەی پێغەمبەران لەسەری خەڵکی راست بووەتەوە، ئەوانیش جێگرانی پێغەمبەرانن و جێنشینانن وەك حوجەی خودایی لەسەر خەڵك.

"شەهادەتی خاوەن زانست" بە دانپیادانان تەفسیر کراوە، هەروەها بە رونکردنەوە و دەرخستن تەفسیر کراوە، دروستەکەی: ئەوەیە کە هەردوو تەفسیرەکە لەخۆ دەگرێت، شایەتیدانی ئەهلی زانست دان پیادانان و دەرخستن و راگەیاندنە، ئەوان بریتین لە شایەتەکانی خودای موتەعال لەسەر خەڵکی لە رۆژی دواییدا، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴾ البقرة: ١٤٣، هەروەها دەفەرموێت ﴿ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِى هَٰذَا لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ وَتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾الحج: ٧٨، واتە: ناوتان نراوە "موسڵمان" لەو کتێبانەی پێشتر بۆ سەر پێغەمبەران دابەزیون، هەروەها لەم قورئانەدا کە بۆ سەر پێغەمبەرەکەتان دابەزیوە.

بۆیە رایگەیاند: خودا ئەوانی کردووە بە کەسانێکی عادل و هەڵبژاردە، باسی ئەوانی کردووە لە کتێبەکانی پێشوودا بەر لەوەی ئەوان بێنە بوونەوە، بەهۆی ئەو زانستە پێشینەی خودای موتەعال هەیەتی دەربارەی ئەوان کە دەیانکات بە شایەت لەسەر گەلان لە رۆژی دواییدا، هەر کەس بەم شایەتیدانە هەڵنەستێت-بە عیلم و کردار و مەعریفە و دانپیادانان و بانگەواز و فێرکردن و ئیرشاد- ئەوا لە شایەتەکانی خودا نییە..خودا کۆمەك و یارمەتیدەرە.

## ۞ هیچ ئایینێك نییە جگە لە ئیسلام

ئایەتی﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ﴾آل عمران: ١٩، ئەهلی تەفسیر جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە، ئایا سەرەتای کەلامێکی تێهەڵچوونەوەیە، یان لەناو شایەتیدانەکەدایە و بەشێکە لە شایەتی پێدراو؟

ئەم جیاوازییە بینا لەسەر دوو خوێندنەوەکە سەریهەڵداوە ئەوەش لە وشەی (إن)دا ئایا بە"إن" دەخوێنرێتەوە یان بە "أن"، زۆربەی ئەهلی تەفسیر بە "إن"دەیخوێننەوە و کەلامەکە دەکەن بە سەرەتای تێهەڵچوونەوەیەکی تر، "کەسائی" بە تەنها بە "أن" دەیخوێنێتەوە، رووەکەی بریتییە لە "إن" چونکە ئەو کەلامەی لە پێشەوەیەتی تەواوبووە، رستەی دووەم تەئکیدکەرەوە و دانپیانەری ناوەرۆکی ئەوەی پێش خۆیەتی، ئەمەیان رەوانترە لە راگەیاندن و تەواوترە لە مەدح و سەنادا، بۆیە لەم ئایەتەشدا بە "کسر"هاتووە ﴿ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلُ نَدْعُوهُ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْبَرُّ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٨﴾ ﴾ الطور: ٢٨، باشترە لە "فتح"، هەروەها "کسر" لە کەلامی کەسێك کە دەچێت بەدەم بانگەوازەوە و دەفەرموێت ((لبیك، إن الحمد والنعمة لك)) باشترە لە "فتح".

ئەوەی خوێندنەوەکەی کەسائی بە "فتح" پارسەنگ دەکات ئەوەیە کە شەهادەتەکە لەنێوان دوو رستەدا بێت لەگەڵ یەکتر، هەردووکیان شایەتی پێدراو بن لەسەر تەقدیری لابردن و ویستنی "الواو"، تەقدیرەکە: "وأن الدين عنده الإسلام" ئەو کاتە رستەکە بێنیاز بووە لە حەرفی عەتف بەوەی ناوی عەتف لەسەرکراو هاتووە، وەك چۆن لەم ئایەتەدا روویداوە و لێی بێنیاز بووە ﴿ ثَلَٰثَةٌ رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ ﴾ الكهف: ٢٢، لێرەدا هێنانی"واو" و لادانی یەکسانە، وەك

چۆن لێرەدا لادراوە و لەم بەشەی تری ئایەتەکەدا باسکراوە﴿وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾الكهف: ٢٢.

هەروەها ئایەتی﴿ إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ ﴾ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە ئیسلام ئایینی هەموو پێغەمبەران و شوێنکەوتووەکانیان بووە لە یەکەمینەوە تا دواهەمینیان، ئیسلام تەنها ئایینی خودا بووە، یەکەمین پێغەمبەر(نوح) فەرمووی ﴿ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَمَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴿٧٢﴾ ﴾ یونس: ٧٢، ئبراهیم و ئیسماعیل فەرموویان﴿ رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ ﴾ البقرة: ١٢٨، هەروەها﴿ وَوَصَّىٰ بِهَا إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَا بَنِيَّ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَىٰ لَكُمُ الدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٣٢﴾ ﴾ البقرة: ١٣٢، هەروەها یەعقوب لە کاتی مردندا بە کوڕەکانی دەفەرموێت ﴿ مَا تَعْبُدُونَ مِن بَعْدِي قَالُوا نَعْبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ آبَائِكَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ إِلَٰهًا وَاحِدًا وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ ﴿١٣٣﴾ ﴾ البقرة: ١٣٣، موسا –علیه السلام– بە هۆزەکەی فەرمووی﴿ إِن كُنتُمْ آمَنتُم بِاللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوا إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ ﴿٨٤﴾ ﴾ یونس: ٨٤، هەروەها عیسا –علیه السلام– ﴿ فَلَمَّا أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ الْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِي إِلَى اللَّهِ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ اللَّهِ آمَنَّا بِاللَّهِ وَاشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٥٢﴾ ﴾ آل عمران: ٥٢، مەلیکەی سەبەئیش دەلێت﴿ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَانَ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾ النمل: ٤٤

ئیسلام ئایینی ئەهلی ئاسمانەکانە و ئایینی ئەهلی یەکتاپەرستی و ئەهلی سەر زەوییە، خودا هیچ ئایینێکی تر جگە لە ئیسلام لە کەس قبووڵ ناکات، ئایینی ئەهلی سەر زەوی شەش ئایینە، یەکێکیان رەحمانییە و پێنجەکەی تر شەیتانی، رەحمانییەکە بریتییە لە ئیسلام و پێنجەکەی تر بریتین لە: یەهود و نەصارا و مەجوس و صابیئە و ئایینی هاوەڵدانەران بۆ خودا.

ئەمە هەندێکە لە نهێنییەکانی یەکتاپەرستی و مەعاریف کە ئەم ئایەتە پیرۆزە لە ئامێزیان دەگرێت.

کاتێك کەسی سالیك دەچێتە ناو "خاوەن زانست"ەکانەوە و دەبێت بە یەکێك لەو باسکراوانە ئەوا شایەتی بە راگری و عیززەت و حیکمەتی خودای موتەعال دەدات، بەو کارەشی دەگاتە مەبەستی خۆی و لوتکە بەدەست دەهێنێت، لەو لوتکەیەدا دەمێنێتەوە، و بەرز و بڵند لێی رادەوەستێت، هەموو مەنزیلەکانی تر کە پیایاندا

گوزەری كردووە لەبەر دەستی خۆیدا تەماشا دەكات، ئەو مەنزیلانەی لە شیو و دۆڵی تەختبوون و خۆشەویستیدا پەرش و بڵاو بوونەتەوە، هەندێكی تریان لە لاپاڵەكانی تەوەكول و ئارامگرتندان، بۆیە دەچێتە ناو سوژدەوە و حەمد و شوكری خودا دەكات كە بە سەلامەتی و جێگیربوونەوە گەیشتە مەنزڵ و بۆ ئەو مەبەستەش خشوع هەموو بوونی داگیر دەكات.

۞ ۞ ۞

# کۆتایی

﴿ سُبْحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ۝١٨٠ وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ ۝١٨١ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝١٨٢ ﴾ الصافات: ١٨٠ – ١٨٢، ئەم کتێبە بەم ئایەتە پیرۆزە کۆتایی پێدێت، حەمدی خودا دەکەین، سەنای دەکەین بەجۆرێك ئەو شایستەی بێت "والحمد لله رب العلمين حمدا طيبا مباركا فيه كما يحب ربنا و يرضى وكما ينبغي لكرم وجهه و عز جلاله، غير مكفي ولا مكفور، ولا مودع ولا مستغني عنه ربنا"

داوای لێدەکەین توانامان پێ ببەخشێت شوکری بکەین، و سەرکەوتوومان بکات لە جێبەجێ کردنی حەقدا، کۆمەکیمان بکات لەسەر یادی خۆی و شوکری خۆی و باشترین بەندایەتی کردنی، ئەوەی مەبەستمان بووە لەم کتێبە و لە کتێبانی تردا خالیص و پاڵفتە بکات بۆ رووی پاك و بێگەردی خۆی و بیکات بە ئامۆژگاری بۆ بەندەکانی.

ئەی خوێنەری بەرێز:

ئەوەی حەق و دروستە لەم کتێبەدا وەریبگرە و مەیدە پاڵ نووسەرەکەی، بەڵکو سەرنجی ئەوە بدە کە وتراوە، نەك ئەو کەسەی کە دەڵێت، خودای موتەعال زەمی ئەوانە دەکات کە حەق رەد دەکەنەوە گەر بە دڵیان نەبێت، یان قبوڵی دەکەن گەر لە بەرژەوەندییان بێت، ئەم سیفەتە سیفەتی ئوممەتی خەشملێگیراوە(یەهود)، هەندێ لە هاوەڵان دەفەرموون: ((حەق وەریگرە لە هەر کەسێك کە دەیلێت، با بە دڵیشت نەبێت، باتڵ رەد بکەرەوە لە هەر کەسێك کە دەیلێت با لە بەرژەوەندیشت بێت)) ئەوەش کە لە هەڵە و تێکەوتن دەکەوێتە پێش چاوت ئەوە بزانە بێژەرەکەی کۆششی کردووە و نەیپێکاوە، تەنها خودای موتەعالە خاوەنی کەماڵە و هەڵە ناکات:

والنقص في أصل الطبيعة كامن      فبنو الطبيعة نقصهم لا يجحد

چۆن مرۆڤێك "ظلوم و جهول" بێت لە ناتەواوی و هەڵە بەری دەبێت، بەڵكو هەڵەكانی لە راستەكانی زۆرتر دەبێت.

پێویستە لەسەر قسەكەری ئەم دەروازەیە و دەروازەكانی تریش: كە سەرچاوەی كەلامی لە زانستەوە بێت بە حەق، ئامانجەكەشی: نەصیحەت بێت بۆ خودا و كتێبی خودا و پێغەمبەری خودا و برا و خوشكە موسڵمانەكانی، گەر حەقی كرد بە شوێنكەوتەی هەوا و ئارەزوو: ئەو كاتە دڵ و كردار و حاڵ و رێگەی لێ تێكدەچێت، خودای موتەعال دەفەرموێت ﴿ وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلْحَقُّ أَهْوَآءَهُمْ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ﴾المؤمنون: ٧١، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت ((هیچ كام لە ئێوە ئیمان ناهێنێت تا هەوا و ئارەزووی شوێنی ئەوە نەخات كە من هێناومە)) زانست و عەدل: بنچینەی هەموو خێرێكە، ستەم و نەزانی: سەرچاوەی هەموو شەڕێكە، خودای موتەعال پێغەمبەرەكەی بە هیدایەت و ئایینی حەقەوە رەوانە كرد، فەرمانی پێكرد لەنێوان دەستە و كۆمەڵەكاندا عەدالەت ئەنجام بدات و شوێنی حەز و ئارەزووی هیچ كام لەوانە نەكەوێت، دەفەرموێت ﴿فَلِذَٰلِكَ فَٱدْعُ وَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ وَقُلْ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٍ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٥﴾ ﴾ الشورى: ١٥.

**والحمد لله رب العالمين وصلى الله وسلم وبارك على خاتم المرسلين محمد وعلى آله أجمعين.**

الحمد لله

رۆژی هەینی/ ١٥ی شەعبان/ رێكەوت لەگەڵ ٢٠١٤/٦/١٣

كاتژمێر ٠٣:٠٥ دوانیوەڕۆ تەواوبووم.

سلێمانی